# دیوانی کوردی

مستەفا بەگی "کوردی"ی ساحێبقران



لێکۆڵینەوەی:

محەمەد مستەفا "حەمەبۆڕ"



بەرگی دووەم

ناوی کتێب: دیوانی کوردی – بەرگی دووەم
نووسینی: محەمەد مستەفا "حەمەبۆر"
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٩٤٨
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
هێلکاریی بەرگ: وێنەی مستەفا بەگی کوردی بەخەیاڵی هونەرمەند قەرەنی جەمیل
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٩٦ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

# پێڕست

## پێڕست بەرگی یەکەم


پێشـەکی ..... 11
ژیننامـەی کوردی ..... 13
پێڕستی سەرچاوەکان ..... 40


### دیوانی کوردی


پیتی أ: دڵم نایێ کە جێت بێڵم ..... 47
ئەی ڕەفیقان ..... 51
حیرەتم لەم مەستە چاوە ..... 57
ڕۆحی خـۆم لێ زویرە ..... 61
چاوی مەستت ..... 64
بەخ بەخ کە، چ مەوزوونە ..... 71
موشتاقە دڵم... نامەی (کوردی) بۆ (سالم) ..... 77
وەڵامی (سالم) بۆ (کوردی) ..... 80
تەسخیری دڵی کردم ..... 82
تالآنی سەروو ماڵم ..... 91
گرفتارم ..... 104
کوێر بوو دیدەم ..... 108
بەداوی زولف ..... 111
چێشتم ئەمڕۆ ..... 115
شکاندی قیمەتی شەککەر ..... 123
وا؛ لە کانی ساوە ..... 131
خەبەرێکم بدەنێ "کارەساتی ڕووخاندنی مەحموود پاشای بابان" ..... 136
قەوسی ئەبرۆ و موژەت ..... 146


### مۆسیقا و ئاوازی کوردی


دڵ لە میحنەت کەیلە ..... 157
کوللی عالەم ..... 257

تاکەی بکێشم ..... 264
تاکەی ئەم جەور و جەفایەت ..... 271
موتالاّی مەصرەعی ..... 284
جانا وەرە... جەژنە پیرۆزەی (کوردی) بۆ عوسمان بەگی بابان ..... 288
ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم ..... 294
عەزیزم نووری عەینەینم ..... 307
عەزیزم باعیثی عەیش و نیشاطم ..... 313
لە شەوقی ئاتەشی ..... 316
عەزیزم وا لە دووریت ..... 320
کێ دەڵێ دولبەر بەخیلە ..... 323
فەلەک ڕەحمێ ..... 326
دڵم کەیلە ..... 333
تاکی دڵ مابێ ..... 336
ڕەفیقی کونجی میحنەت ..... 338
چاوەکەم ..... 343
توشنە لەب ..... 347
لەیلەکەی بێ مەیلەکە ..... 350
عەزیزا ..... 353
ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان ..... 358
هەڵبەستەکەی کوردی ..... 360
هەڵبەستەکەی نالی ..... 370
ناصیحی موشفیق ..... 382
ئەی دوڕی تاجی ..... 392
چاو ئەگەر یارای ڕوانینی نەبێ ..... 396
کوان ڕەفیقانی طەریقەت ..... 410
من ئەوا بۆ هەجویی پیرێژن ..... 418
تاکی یار فیتنەی جیهان بێ ..... 423
ئەهلی تەقوا ..... 427
ئەی حاریث پێنج خشتەکیی (کوردی) لەسەر هەڵبەستی (نالی) ..... 431
وەفا گەر بوو ..... 442
لە وێرانەی دەروونم ..... 448

دەروون زامدار 456
تەنم چوار باڵی (چوارینە) 462
شـوێنی دڵم هـێناوە 467
لە کونجی بێ کەسیدا 472
عـالەمت 479
شـەوی یـەڵدایە 483
لە غـەم شـاری دەروون 491
ڕەفـیـقـان 498
ئەرێ یاران 501
صـەدای سـەمـتـوور 511
ئەجەل یاران 518
زەمانی فیرقەتی یارانە – چامەی یەکەم 521
زەمانی فـیرقـەتی یارانە ئەمشـەو – چامەی دووەم 526
زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو – چامەی سێیەم 530
لاڵ بم 536
شێخ بۆچی 539
ئاغە گیانا 544
صـەدای کاروانی فـیرقەت دێ 550
لــە دووری 587
تا ڕەقـیب حاضـرە 592
بۆ گەڕانی ئاشی دڵ 595
بەبەرگی خـونچەییدا 605

## پێڕستی بەگی دووەم


چاوەکەم دەرحەق بەمن ........ 11
گەردنم ........ 15
گەر دەبێ لوطفت ببێ ........ 23
ئەمن کەوتوومە ژێر بار ........ 27
گەر دەبێ لوطفت ببێ ........ 33
ئەمن کەوتوومە ژێر بار ........ 37
ئەوا دیسان ........ 42
توخوا ڕاستی بڵێ ........ 47
صەیدی دڵ بووم ........ 50
لە نووری لامیعی ........ 57
ئەمیش هەڵبەستەکەی تری «سالم»ە ........ 66
چا ........ 69
ئەی موسوڵمانینە ........ 73
لەقەبی صالحە ........ 76
تاری کاکۆڵت ........ 81
شۆری ئەمجارەم ........ 90
ڕەنگی گوڵ ........ 93
دەرۆی قوربان ........ 99
ئەوا فەرشی موحیبەت ڕادەخەم ........ 103
دڵ وە چاکە ........ 108
کەی ئەوە مەحبووبەیە ........ 111
ئەو سەرە سەر بۆچە ........ 118
کەوا دارایی ........ 124
لە پاش چەند وەعدە؟ ........ 134
ئەمان مردم ........ 137
لاوی قەد لاولاوی من ........ 145
دڵ گرفتار بوو ........ 151

شـۆخـی دڵ ئازار ..... 158
بۆ فریبی عاشقان ..... 162
مەگەر ناڵینی من ..... 174
بەئەبرۆ و خاڵ و خەت ..... 179
ناوی عەشق ..... 197
نیم نیگای ..... 202
دیسان وا هاتە گەردش ..... 206
ڕوخت وەک گوڵ ..... 215
برا دەر بۆچی وا؟ ..... 232
عەجەب ماوم ..... 243
لە جێگەی شیرکرۆژانی بەبە (شایی دایکی عەبلان) ..... 251
شیختنی ..... 256
تیری عەشقی ..... 266
دەک ڕەقیب ..... 267
ظوهووری تۆیە ..... 269
چاوەکـەم بۆچی ..... 270
چ شـایانم؟ ..... 278
ساقی وەرە ..... 280
دڵ گرفتاری ..... 296
چاوەکەم زانیوتە؟ ..... 302

**هەڵبەستی (کوردی) بە شێوەزاری گۆران**

صـەیدی مـەزانان ..... 309

**بەشی فارسی**

عشـق اگر ..... 317
أیەء قـران ..... 323
خـوبرویـان سنندج ..... 326
خوشا پروانەای ..... 333
زکوە بیستون ..... 338
عبد معبود ..... 342

## چاوەکەم دەرحەق بەمن

١- چاوەکەم دەرحەق بەمن، بەقسەی بەدی، بێ پیر مەکە
بێ خەتا و، سووچ و، قەباحەت، خۆت لە من دڵگیر مەکە
٢- هەرکە لێم عاجز دەبی توخوا وەرە زوو بمکوژە
چونکە قەتڵم خێرە، سا لەم کارە قەت تأخیر مەکە
٣- ڕۆژی دیوانی خودا دەستی من و دامانی تۆ
قەت لە بۆ قەتڵی منی بێکەس بەکەس تەدبیر مەکە
٤- خۆت دەزانی من سوپەر نانێمە بەر تیری جەفات
سا بەمروەت بە، لەگەڵ من شەڕ بەدەست و شیر مەکە
٥- هیجر و، دووریت، بۆ هیلاکی من، بەسە ڕەحمێ بکە،
حەیفە ئیتر قەلبی بیمارم نیشانەی تیر مەکە.
٦- من کە پابەندی کەمەندی عەشقم، ئیتر تووخودا
بۆ گرفتاریم لە (کاکۆڵت)؛ عەبەث زنجیر مەکە.
٧- ئەی ئەوی دەعوای ئەسیری ئەم هەژارەی خۆت دەکرد
فیرقەت و، وەصل و، جەفاکەت، یەک لە یەک تەوفیر مەکە.
٨- تاکە گەنجی فەقر و کونجی عاشقیت بۆ دەست بدا
قەت تەماعی سیمیا و عیلمی (جەڕ) و ئیکسیر مەکە
٩- من وتم دین و دڵی (کوردی) نەبەی، بردووتە خۆ
سا لەمەولا هەرچی پێت مومکین دەبێ تەقصیر مەکە

---

١- دەرحەق: بەرامبەر.
بێ پیر: بێ گەورە، پیریش کەسێکی بەتەمەن یا مەزنێکی کۆمەلایەتی یا مەبەست لە شێخی تەریقەتە.
خەتا (خەطا): هەڵە، ناڕاستی.

سووچ: خراپی، گوناه، تاوان. هەرچەندە واتای (گۆشە)ش دەدات لە بۆ ئێرە نابێ.
قەباحەت: بەدی، خراپی، ناپەسەندی.
سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە (عن، ف، ر، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
بەداخەوە بۆنەی ئەم هەڵبەستەم دەست نەکەوتووە، چونکە وا دیارە کارێکی پەیوەندی پچڕین لە نێوان (کوردی) و یەکێکدا ڕووی داوە و ئەم پاکانە دەکات.
خۆت لە من (گ/٢): لە من – دیارە هەڵەی چاپییە.
٢– عاجز: زویر.
قەتل: کوشتن.
خێر: چاک، ڕەوا، باش.
تاخیر: پێ دز کێ، دواخستن (ئەخیر –ی–عارەبییە).
چونکە (ر): چو – دیارە هەڵەی نووسینە.
تەئخیر (ف): تقصیر.
٣– ڕۆژی دیوانی خودا: قیامەت. لە بارەگای خوادا، (حەشر).
دەستی من و دامانی تۆ: ئەوپەڕی هانا بۆ بردن و پاڕانەوەیە.
بەکەس: بە چ کەسێ، بەخەلق، بەخزمان.
تەدبیر: ڕاوێژ، پرس و ڕا.
دامانی: داوێنی.
دامانی (ر): دامین.
بەکەس تەدبیر مەکە (کم، گ/٢، س، گ/٣): لە کەس خۆت زیز مەکە – ئەمەش نابێ، چونکە لەگەڵ پاشبەندەکان ناگونجێ و ئەشێ (زویر) بێ.
بەکەس تەدبیر مەکە (نم/١): لە کەس خۆت زیر مەکە.
بەکەس تەدبیر مەکە (ف): لە کەس خۆت زویر مەکە.
٤– سوپەر: سپێر، مەتاڵ، قەڵغان، بەرگر.
جەفا: وشکی و ساردیی پەیوەندی و ناخۆشی و خراپە لەگەڵ کردن.
مروەت: ئینصاف.
شەڕ: جەنگ.
بەدەست و شیر مەکە: واتە جەنگ بەفکر (بیر) لەگەڵ منا بکە و ژیری بەکار بهێنە، ئەگەرچی هەرچی بکەیت، دەست نانێم بەڕووتەوە.
خۆ (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): خۆت – ئەمیش لە دەربڕینیدا قورسییەک بەکێشەکەی دەدات.

نانێمه بەر تیغی (ر): نانێمه ڕووی تیغی.

بەمروەت بە (ر): بەمروت.

٥- هیجر: دووری، لێکجیایی، خەفەتی دووری.

هیلاک: کوشتن، لەناوبردن.

ڕەحم: بەزەیی، دڵسۆزی.

حەیف: موخابین.

قەلب: دڵ.

(ڕەحمێ) ئەم وشەیە تەنیا لە (عن)دا بوو، ئەوانی کە هەموو (مروەت)ە، بەڵام دووبارەیە بۆیە (ڕەحمێ)کەم جێگیر کرد، لەم تاکە هەڵبەستی حەوتەمەدا.

٦- پابەند: پێ بەستراوە، دۆستایەتی، یەکێتی.

کەمەند: گوریسێکە بۆ بەیدەسکردنی دوشمن و وڵاخی بەلەسە، لەم وشەیە دواوم.

گرفتاری: گیرۆدەیی.

عەبەث: بێهوودە، بێ سوود.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، ر) دایە و شەشەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

لە کاکۆڵت عەبەث (ر): عبث کاکولکت. دیارە ئەوی ئەم هەڵبەستەی بۆ وتووە، کەسێکی مەزنی کۆمەڵایەتی یا دۆستێکی ڕۆشنبیری خۆی بووە. کە بەداخەوە بۆم یەکلایی نەکرایەوە.

٧- دەعوا: داوا، خواست.

ئەسیر: دیل.

فیرقەت: جیایی، لێکدابڕان.

وەصل: پێکگەیشتن.

جەفا: ئەو ساردی و ناخۆشییەی لە نێوانیاندا پەیا بوو.

یەک لە یەک تەوفیر مەکە: چاکەی یەکێ لەو سێ شتەی (فیرقەت، وەصل و جەفا)یە مەدە بەسەر ئەویترا و لێکیان جیا مەکەوە و لێم مەگرە بەدەستەوە، من هەر دۆستەکەی جارانم. ئەم تاکەش هێشتە چاپ نەکراوە و هەر لە (عن، ر)دایە و لەوانی تردا نییە.

هەژارەی خۆت (ر): پری رویەت.

٨- گەنج: گەنجینەی زێڕ و گەوهەر.

فەقر: هەژاری – ئەمەش نیشانەیە بۆ وتەکی صۆفییانە کە دەڵێن:

(الفقر فخری) واتە: هەژاری مایەی شانازیمە.

کونج: گۆشە، کولبە.

قەت (قط): هەرگیز.

تەماع (طماع): ئارەزوو، چاوبڕینە شتێک.

سیمیا: زانستییەکی کۆنە وەک فیزیا و کیمیای ئێستە وا بووە و بەهۆیەوە کانزا (مەعدەن)ە هەرزان بەهاکانیان پێ کردووەتە زێڕ و زیو.
جەڕ: بەواتە ڕاکێشان – ئەمیش زانستێکی کۆنە و بۆ ڕاکێشانی دڵی خەڵقی بۆ لای خۆ، بەهۆی (دوعا) و ویفقەوە و، وەک عیلمی جەفر وا بووە و، یا هەریەک زانستێکە کە شتی نادیاری پێ دۆزراوەتەوە و وەک دۆزینەوەی دزی و غەزێنە و...
ئیکسیر، ئەو (هەوێنە)یە کە ئاسنی پێ ئەکرێ بەزێڕ و زیو، بەهەوێنی هەموو شتی دەزانن.
ئەم تاکە لە (عن، ر)دا هەشتەمینە و لەوانی تردا شەشەمینە.
تاکە (ف، نم/١، کم): تالە.
تاکە (گ/٢، س، گ/٣): تاکی.
گەنجی (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): کونجی.
کونجی (ف، نم، کم، گ/٢، س، گ/٣): گەنجی.
عاشقیت (ف، نم/١، کم): عاشقت.
تەماعی (ر): تنای.
سیمیا و (ف، نم/١، کم): کیمیا و.
سیمیا و عیلمی جەڕ و (گ/٢، گ/٣): علمی جر و کیمیا و – ئەمیش لەنگە.
سیمیا و عیلمی جەڕ و (س): علمی جبر و کیمیا و – ئەمیش هەڵەیە و لەنگە.
٩– ئەم تاکە لە (عن، ر)دا نۆیەمینە و لەوانی تردا حەوتەمینە و لە هەمووآندا دوا تاکە.
کوردی (ر): هجری – لەگەڵ ئەوەشدا لە ناو (مجموعە اشعار کردی)دا نووسیویانە.

٧٢

## گەردنم

١- گـــەردنم یا طەوقی تۆی تێـــدا بێ ئازادی مـــەكـــە
طەبعی من، ئەم میحنەتەی پێ خۆشە تۆ شادی مەكە
٢- هەوری ڕەحـمەت لازمە یەكسانە بێ بۆ خاص و عام
ڕەعیەتی خۆتە دەخیلە فەرقی ئەفرادی مەكە
٣- چاك چاكی تیــرە بارانی مـــوژەی تۆ، ســینەمـــە
بۆ خــەرابی چاكـــە، ئەم وێرانە، ئابادی مـــەكـــە
٤- زەید و عەمری، بۆ نییە (سەر) گەر، لە ڕێی حەق دەرنەچێ
ئەم وەجاخی كۆنە وا بێهودە ئیخـمادی مەكە
٥- تۆ كە سولْتانی جیـهان و پادیشاهی عالەمی
دادی مەظلوومان بپرسە، حەیفە بێدادی مەكە
٦- خـــاتەمی مـــولْكی ســـولەیمان لایقی ئالی ئەوە
ئەلئـەمان دەرعـوهدەیی (تاران) و (بەغداد)ی مەكە
٧- تیری موژگانت لە بۆ كونكردنی شیشەی دلان
نەشتەری ئەلْماسە تەشبیهی بەپۆلاوی مەكە
٨- جێی دلانە حەلْقە حەلْقەی طوڕەیی كاكۆلەكەت
تووخـــودا ڕەحـــمت بەدلْدا بێت و بەربادی مـــەكـــە
٩- زویر مــەبە كــەوتوومــە داوی زولْف دانەی خــالْی تۆ
یا بە هەر مورغێ ڕەزا بە، یا بە صەییادی مەكە
١٠- یا بەنەشئەی شەربەتی شاییتەوە بیبەینە سەر
یا كـــە زەهرت پێ لەناوئەچێ چ قـــەنناد‌ی مـــەكـــە
١١- نالْە نالْ و شــــیـــوەنی دلْ عـــالەمی هێنایە شین
تووخـودا جاریێ بترسە گوێی لە فریادی (مە)كە

١٢- بەس ببـــارێنە و بیـــڕێژە، دیدە!! خـــوێناوی دەروون
دڵ بەخـــوێن پەروەردەیە بێ قـــووت و بێ زادی مـــەکـــە
١٣- هـەر دڵێ تۆ دەیگرێ پڕ گـــەرووی دەرد و مـــیـــحنەتە
ئەو جـــەلای لای عـارفـــە، ناکـــەس بەئوسـتـــادی مـەکـە
١٤- گـۆشـەیـی چاو و برۆی (بەد)، کـوفـرە بۆ قـەتڵی زەلیل
بیکوژە بۆ خـــۆت، حـــەواڵەی تیـــغـی حـــەللادی مـــەکـــە
١٥- مـەسـتی عـەشـقـە (مـانی)یە یا (کۆهـکەن) (کوردی) بڵێ
دڵ ببنە خـشـێنە، نەکوو (سـەنگ) کاری فـەرهادی مـەکە

.................................................................

١- طەوق: چەمـــەرەیەکی ئاسن یا زنجـــیـــرێکە لە ملی زیندانیی قـــورس و ترسناک کـــراوە و بەزنجیرەوە، تەقەکە بەند کراوە و سـەری زنجیرەکە بەستراوە بەقولفەی ئاسنەوە کە لە دیوار چەسپ کراوە.

طەبع: سروشت، خۆڕسکی، ئارەزوو.

میحنەت: ئەرک و ناخۆشی و ئازار، باری گران.

سـەرچاوەی دەسـتنووسی ئەم پارچە هەڵبەسـتە: (عن، ن، گل/٦، گل/١٠، ر، نم/١، نن)ە و لە چاپکراویشدا (ک) لاپەڕە/٢٢ وە، ڕۆژنـامـەی (عـیراق) پاشکۆی ڕۆژنامـەی (العراق) ژمـارە: ٢٥/ی مـارت و نیسـانی سـاڵی ١٩٧٩- بەغدایە کە (مامـۆسـتا مـحـەمەد عـەلی قـەرەداغی) ئەم هەڵبـەسـتـەی سـەرەوەی لە ژێر نـاوی (چەند شـیـعـرێکی بڵاو نەکـراوەی کـوردی...)دا لەگـەڵ هەڵبەسـتـێکی تریدا بڵاو کردووەتەوە، هەرچـەندە ئەویش دەسنیـشـانـی سـەرچاوەی نەکردووە، بەڵام لـەوە دەچێ کـــە لە (ر)ی وەریگرتبێ. لـە نێـــوان ئەم ســـەرچـاوانەدا (عن)م کـــردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم پارچە هەڵبەستە.

لەم سـەرچاوانەشـدا (گل/٦، نم/١، نن، ک) ئەم هەڵبـەسـتـەیان بەناوی (زەلیل)ەوە، نووسـیـوە و کـە لە تاکی پێش دوا تاکـیـدا لێکی دەدەمـەوە ئـەم (زەلیل)ە لە چیـیـەوە هاتـووە کە زەلیل مـەلا محەمەدی مەلا عەلی خەڵقی سولەیمانی و لە ١٣٠٠ک.دا مردووە.

لە (عن)دا، ئـەم پەڕاوێزە فـارسـیـیـەی خـوارەوە وەک (سـەرەناو) لـە پێـشـی ئەم هەڵبـەسـتـەوە نووسـراوە، کە بۆنەیەکی گرنگی هەڵبـەسـتـەکەمـان لێ ئاشکرا دەکـات و دەیکاتە بەڵگەیەکی مێژووییش، ئەویش:

(در يكي اند انقلا باقي عبدالله پادشاة ببه كه گروهي از هواداران حكم سابقرا زنداني و پس از روزي چند كردي از ميان انان آزاد كرد و او بقصيدة زير خطاب بعبدالله پادشاة رحمها الله

فرمودة – علي).
واتە: (لە یەکێ لە ڕووخـانـدنکارییـەکـانی بـابانی عـەبدوڵڵا پاشـای باباندا، دەسـتـەیەک لە هەوادارانی فـەرمـانڕەوای بەر لە خـۆی هـاویشـتـووەتە زیندانەوە و دوای چەند ڕۆژێک لە نێـوان ئەوانەدا «کـوردی»ی ئازاد کـردووە و ئـەمـیش ئەم چامـەیەی دوایی ڕووبـەڕووی عەبدوڵڵا پاشـا خوا لێیان خۆش بێ فەرمووییەتی – عەلی).
هـەروەهـا لە (ن)یشـدا ئەم (سـەرەنـاو)ەی دوایی نووسـراوە کـە ئەویش پشـتـیـوانیـیـەکی سەرەناوەکەی پێشووە:
(کـردی بعـد از ازادشـدن در زندان سلیـمـانیـە) واتە (کـوردی لە دوای بـەرەڵڵا بوونـی لە بەندیخانەی سولەیمانی). بەڵام بەداخەوە ساڵەکە و بەدرێژتر کارەساتەکەیان نەنووسیوە.
طەوقی (گل/٦، گل/١٠، ن، عن): طوق – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
طەبعی (عن، ن، گل/٦، گل/١٠): طبع – دیسان ڕێنووسی کۆنە.
شادی (ن): شاد. – هەر ڕێنووسی کۆنە.
٢– ڕەحم: مەبەستی لە چاودێری، دڵسۆزییە لە لایەن پاشای ناوبراوەوە.
لازمە: پێویستە.
یەکسانە: چوونیەکە، جیاوازی تیا نەکردن.
خاص: کەسانی تایبەتی.
عام: گشت گەل.
ڕەعیەت: نیشتمانییەکان، مسکێن، ڕەشەگەل.
دەخیلە: هەی پەتان تۆ، هاوارە.
فەرقی: جیاوازیی.
ئەفراد: کەسان، تاکە کەسەکان.
لێـرەدا (کـوردی) داوای بەردانی هـەمـوو بـەندییـەکـانی تریشی کـردووە. ئـەم تاکـە لە (عن، ن، گل/١٠، ک)دا دووەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپ نەکراوە.
یەکسانەیێ بۆ خاص و عام (ن): بو خاص و عام یکسانە بیت.
٣– چاک چاک: لەت لەت، پارچە پارچە، پارە کراو.
سینە: سنگ.
ئاباد: ئاوەدان – مـەبەسـتی تۆ منت پێکاوە، بەبەردانی تـەنیا خـۆم شـادم مـەکە و هەمـووانمان بەر بدە.
موژەی تۆ (گل/٦، نم/١، نن): مژت تو. – ئەمیش لەنگە.
تۆ سینەمە (گل/٦): بو سینمە – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
سینەمە (عیراق): سینگمە.

سینەمە (ر): سینەکەم.
خەرابی (نم/١): خراپی – ئەمیش هەڵەیە و ناگونجێ و مەبەستی لە (وێرانی، کاولی)یە.
ئەم تاکــە لە (گل/٦، ر، نم/١، نن، عـیـراق)دا دووەمـینـە و لەوانی تردا سـێـیـەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.
٤- زەید و عـەمـر: ناوی دوو کـەس لـە دەسـتـووری زمـانـی عـەرەبیـدا، بەواتەی (ئـەم و ئەو) یا دوو کەسی جیاواز بەکار دەبرێن و ئیسلامەکانیش وەریان گرتووە.
مـەبەستی (کـوردی) لەوەیە دڵنیـای عـەبدوڵڵا پاشـا دەکا کە هـەرکـەسێ (سـەر) فەرمـانڕەوا بێ، بەڵای ئەوەوە چوونیەکە بەمەرجێ لەسەر حەق بێ، واتە تۆ ناحەقی.
حەق: ڕاستی، دادپەروەری و بێ لایەنی و پاکی.
وەجـاخ: مـەبەستی بابان و فـەرمـانڕەواییـەکەیەتی، وەجاخـیش ئاگردانە کە ئـەمـەش لەوەوە هـاتووە کە لە کۆندا لە هـەموو مـاڵە کوردێکدا (وەجاخ) هەبـووە کە زەردەشـتی بوون و (نەوە) و (دودمـان)یش وەک (وەجاخ) سـەیر کراوە (لە زەردەشـتی تێدا) کەسێ منـاڵی نێرینەی نەبووبێ وتراوە وەجاخی کوێرە (کوژاوەتەوە).
بێهود: هەروا بەخۆڕایی.
ئیخماد: کوژاندنەوە، مەبەست لە نەمراندنی فەرمانڕەواییەکەی بابان بووە.
ئەم تاکە لە (عن، ن، گل/١٠)دا چوارەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
کۆنە (ن): خوتە = (خۆتە) – ئەمەش دەگونجێ بەوەدا عەبدوڵڵا پاشای بابان بووە.
٥- سوڵتان و شا، ناوی گەورەکانی جیهان بووە و گوایە عەبدوڵڵا پاشا یەکێ بووە وەک ئەوان.
جیهان: گێتی، عالەم.
داد: هاواری مەبەستە (هـی داماوان).
مەظلووم: ستەم لێکراو، بەشخوراو، داماو.
حەیف: موخابن.
ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا سێیەمین و لە (گل/٦، نم/١، نن)دا چوارەمین و لە (عن، گل/١، ن)دا پێنجەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.
تۆ کە سوڵتانی (نن)... لطانی (چونکە دڕاوە).
پادیشاهی عالەمی (نن) پادشا... (چونکە دڕاوە).
بپرسە حەیفە بێدادی مەکە (نن) بپرسە... (چونکە دڕاوە).
٦- خاتەم: ئەموستیلە، ئەنگوشتـەوانە و نیشانەیە بۆ ئەموستیلە (نگین)ەکەی حـەزرەتی سولەیمان کە هەرچی لێ بویستایە بۆی جێبەجێ دەکرد.
موڵکی سولەیمان: هەم نیشانە بۆ ئەموستیلەکە و هەم شاری سولەیمانی و هەم موڵکی بەرەی سولەیمان، پاشای بابان و ئەمەش جوانیی وێژەییە.

لایق: شایان.

ئالی: نەتەوە = مەبەستی لە نەتەوەی سولەیمان پاشا و بەرەی بابانیانە.

ئەلئەمان: ئەی پەنا بەتۆ، هەی هاوار.

دەرعوهدە: سپاردن و مەبەستی ئەوەیە نەیداتە دەست.

تاران: مەبەستی فەرمانڕەواییی ئێرانییە کە پایتەختیان (تاران) بووە.

بەغداد: مەبەستی مەمالیکەکانی بەغدای سەر بەعوسمانییە.

ئەم تاکە لە (عن، ن، گل/١٠)دا شەشەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە و، لە هەرسێ سەرچاوەکەشدا چونیەکە جگە لە (ن) کە (تاران)ی بە(طهران) نووسیوە.

٧- نەشتەر: ئەو چەقۆ نووک باریکە تیژە پۆلای سەختەیە کە لە پزیشکی و پیشەسازیدا بەکار دێت، وەک ئەڵماس شووشە دەبڕێت.

ئەڵماس: گەوهەرێکی هەرە بەنرخی جیهانە.کە هەندێک جار بێ ڕەنگ و هەندێک جار بە ڕەنگەکانی سەوز ، سوور، شین و ڕەش لە کانەکاندا دەدۆزرێتەوە و کە ڕەشەکەی زۆر بە قیمەتە.

تەشبیه: ناوبردنی شتێک بەشتێکی تر، وێکچواندن.

پۆلاد: پۆلا. سەختترین جۆری ئاسن.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا چوارەمین و لە (گل/٦، نم/١، نن، ک)دا پێنجەمین و لە (عن، گل/١٠، ن)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

تیری (ر): تیع. ئەمیش هەڵەیە.

تیری موژگانت (نن)... کانت. چونکە دڕاوە و نیو باڵی دووەمیشی تیا دڕاوە.

تەشبیهی (ر): تشبیە - تەشبیهی (ک): کوشتەی.

پۆلادی (عیراق): فۆلادی.

٨- حەڵقە حەڵقە: قوڵفە قوڵفە، پێچ و خەم، لوولی.

طوڕە: شەقڵ (مۆر)ی سوڵتان و پاشا کونەکان (طوغرا) بەشێوەیەکی جوان و نەخشاو بووە و، (کوردی) پێچ و خەمی کاکۆڵەکەی عەبدوڵڵا پاشای بەوە داناوە، مەبەستی لەوەیە کە ئێمە پەیوەندی تۆین و تۆ لە خۆتمان مەکە.

بەرباد: بەبادان، خاوکردنەوە، تێکچوونی پێچ و خەمەکە، وێرانکردن، من لە خۆت مەکە.

ئەم تاکە لە (گل/٦، نم/١، نن، ک)دا سێیەمین و لە (عن، ن، گل/١٠)دا هەشتەمینە و لە (ر، عیراق)دا پێنجەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

کاکۆڵەکەت (نم/١، نن، ک): کاکولی تو.

تووخودا (نم/١، ک): توخوا.

٩- زویر: زیز، عاجز، دڵشکاو.

زولف: بڕوانن لێرەدا وشەی (زولف)ی بەکارهێناوە کە لە تاکی پێشوودا (کاکۆڵ) بەکارهاتووە، هەردووکیش لە باسی یەک کەسدان کە ئەویش پیاوە و (ئەشێ کاکۆڵی بووبێ)، بەڵام زولفەکە چی؟؟؟ ئەمەش لە وێژەی کۆندا باوە لە ناو هۆنەراندا وەک ڕەمزی (جوانی) نەک جینسی کەسەکە.

مورغ: مەل، باڵندەی نێچیر.

ڕەزا بە: وەربگرە، بتەوێ، قایل بە.

صەییاد: ڕاوچی نێچیروان.

لێرەدا لە عەبدوڵڵا پاشای دووبارە دەکاتەوە: یا هەموو گەلی تێکڕا بووێت و، یا دەس هەڵگرێ، وەک ڕاوچی مەبە، کە هەر بەئارەزووی خۆت نێچیر هەڵبژێت.

ئەم تاکە لە (گل/٦، ک، ر، نم/١، نن، عیراق)دا شەشەمین و لەوانی تردا نۆیەمینە. بەڵام لە (نن)دا تەنیا (ی زلف و دانەی خا)ی ماوە و ئیتر ئەویکەی دڕاوە و لەناوچووە.

ڕەزا بە (ک): روزایە – هەڵەی چاپییە.

١٠- نەشئە: خۆشی، هەوا، سەرخۆش بوون.

شەربەت: شەکراوێکی بۆن و تام خۆشە.

شاییتەوە: پاشاییتەوە و یا (شادیی) بوونی تۆ وە کە ئەمەش جوانکاری و وەستایی و وردەکارییە لە هۆنەریدا، لە وێژەی کۆندا.

بیبەینە سەر: بەسەری بەرین، ڕابوێرین، پایەدار بین، لە درێژەدا بین.

زەهر: ژەهر، مادەیەکی کوشندەیە و مەبەستی لە بێگانە و خراپکاران و گێرەشێوێن ناوچەکە بووە کە عەبدوڵڵا پاشا دۆستایەتیی لەگەڵا گرتووە.

قەنناد: شەکرفرۆش، یا شەکرچی (قەند = شەکر).

ئەمیش دیسان وریاکردنەوەیەکی تری عەبدوڵڵا پاشایە.

ئەم تاکە لە (گل/٦)دا حەوتەمینە و لە (عن، ن، گل/١٠)دا دەیەمینە و لەوانی تردا نییە و لەویدا کە هەیە چونیەکن، جگە لە (ن) وشەی (شاییتەوە)ییە (شاهیتەوە) نووسیوە.

١١- فریاد: هاوار، هانا بردن.

(مە)کە: هی ئێمە بکە (مە = ئێمە) و (کە = بکە) و ئەمەش یاری بەوشەکردن و وەستاییی (کوردی) یەگەیەنێ و سەر لە خەڵقی تێکدانی بەم هونەرە جوانەی.

ئەم تاکە لە (نم/١)دا نییە و لە (نن)دا دڕاوە و لەناوچووە و لە (ر، عیراق)دا حەوتەمینە و لە (گل/٦)دا هەشتەمینە و لە (عن، گل/١، ن)دا یانزەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

جارێ بترسە (عیراق): جارێ

گوێی (عیراق): کەوی!

مە (کە) (عیراق): مەکە!.

١٢- دیده: چاو – لێرەدا (کوردی) ڕووبەڕووی (چاو) دەدوێ، بەڵام هەر مەبەستی عەبدوڵڵا پاشایە و چاودێری هەمووانی لێ دەخوازێ.

قووت: خورشتێ بەری دڵ بگرێ و هێز بەخش بێ.

زاد: ئەمیش هەر خواردەمەنییە.

ئەم تاکە لە (نن)دا دڕاوە و لەناوچووە و لە (نم/١، ک)دا حەوتەمینە و لە (ر، عیراق)دا هەشتەمینە و لە (گل/٦)دا نۆیەمینە و لە (عن، ن، گل/١٠)دا دوانزەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەمووواندا چونیەکە.

١٣- گەرد: تۆز، حاشاک، دەرد و بەڵا کە بەسەر گەلەوە بووە.

میحنەت: ئەرک، ئازار، ناخۆشی، ماندووێتی، خەم لە دڵی خەڵکا.

جەلا: پاکتاو، پاککردنەوە، بریسکە پێ دانەوەی، مشتوماڵ.

عارف: زانا و، دانا و ئەم وشەی (جەلا و عارف)ەش صۆفیانەن.

ناکەس: پیاوخراپان، خراپکارانی بەدسروشت، بەدئەصلان، نارەسەن.

ئوستاد: مامۆستا.

ئەمیش گازندەیەکی تری (کوردی)یە کە دەستوپێوەندان، ئاگەدارکردنی عەبدوڵڵا پاشایە، بۆ وریایی لە کاروباری گەلدا و نەخستنە دەستی دەسوپێوەندەوە.

ئەم تاکە لە (گل/٦)دا دەیەمین و لە (عن، ن، گل/١٠)دا سیانزەهەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لەم سەرچاوانەشدا چونیەکە و لەوانی تردا نییە.

١٤- گۆشە: قەراخ – و مەبەستی لە برۆ و گرژکردن و بەلاچاو ئیشارەت کردنی بەدکارانە لە کاتی فرماندان بەسەر گەل و ستەمکردنیان لە خەڵک.

بەد: خراپکاران، ناکەسان، هەرزە، نەفامان، نادڵسۆزانی گەل.

کوفر: بەدرۆ ناوی خوا و پێغەمبەر بردن و پەیڕەوی نەکردنیان – لێرەشدا (کوردی) ئەو کردەوە نارەوایانەی ئەوانە وەک (کوفر) داناوە.

قەتل: کوشتن، ئەمیش مەبەست چ کوشتنی ڕاستی و، چ ستەم لێ کردنە و بە (پاشا) ڕادەگەیەنێ کە خۆی کار و فرمان بگرێتەوە دەست و بەری نەدا. بۆ بەدکاران.

زەلیل: زەبوون، بێ دەسەڵات، پەککەوتە.

جەللاد: ئەوانەن کە (دار) لە تاوانبارانن دەدەن و دوایی بووەتە باو بۆ ناوی ئەوانەی بەفرمانی گەورەی وڵات سەری کەسان دەبڕن و خەڵک دەکوژن.

ئەم تاکە لە (نن)دا دڕاوە و لەناوچووە و لە (نم، ک)دا هەشتەمینە و لە (ر، عیراق)دا نۆیەمین و لە (گل/٦)دا دەیەمین و لە (عن، ن، گل/١٠)دا چواردەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

بەو کوفرە بۆ قەتڵی (ک)دا مەگرە بۆ کوشتنی – ئەمەش هەڵەیە.

بەد، کوفرە (نم/١، عیراق، ر): وا مەگرە – ئەمەش هەڵەیە و بەهەڵە وەرگیراوە.

زەلیل (گل/٦، ر، عیراق): طفیل – ئەمیش هەڵەیە و ئەشێ لە شێوەی نووسینی شکستەی فارسییەوەدا خوێندرابێتەوە.

لە (ظەلیل)ەوە ناوی (زەلیل)یش کە دوا وشەیە، چونکە دوا تاک بووە لە سەرچاوەکەیدا.

لە دوا دێڕیی ئەم تاکەوە بە هی کەسێکی (زەلیل) ناو، کە هونەرێکمانە دانراوە، لەوانەیە ئەگەر تاکی پێشوو دوا تاک بوایە دەکرا بە هی (عارف) کە تیا هاتووە.

١٥– مانی: وێنەکێشێکی کۆنی شارەزا و، وەستا بووە خاوەنی ڕێبازێکی (فەلسەفیی ئاینی)ش بووە.

کۆهکەن: مەبەستی لە فەرهادی هونەرمەندە کە لە عەشقی شیرین بەردی بێستوونی تاشی.

(ئەمجا ئامۆژگاریی پاشا دەکات کە دڵی خەڵک بلاو ببێتەوە).

ئەم تاکە لە (عن، ن، گل/١٠)دا پانزەیەمین و لە (گل/٦)دا دوانزەیەمین و لەوانی تردا نییە و چاپیش نەکراوە و لەوەیدا هەیە چوونیەکە.

## گەر دەبێ لوطفت ببێ

١- گـەر دەبێ لوطـفت ببێ، وەرنە، جـەفـاكـاری مـەكـە
قـەدری خـەڵقی ڕاگـرە قـەت مـەردوم ئازاری مـەكـە
٢- شـیـر كـرۆژی دەوری سـینی، نابنە جـێگەی هیـوا
پشـتـیـوانت گـەر دەوێ؛ تۆ، تەركی (بازاڕیی) مـەكـە
٣- بـەس بە(دڵ) یاری بكە (یارا)م نـەمـاوە (یار)ەكـەم
مـەرحـەمـەت كە، با ڕەقیـبـان تووخـودا (یاری) مـەكە
٤- تۆ كـە خـزمـانت برەنجـێنی و سـەراژێریان بكەی
قـەت بەیاریكاریی بێگانە هیـوابـاری مـەكـە
٥- حـاكـمی چا بە، طەریقی عـەدل داری پێش گـرە
چونكە حـوكـمت ڕادەبووڕێ حـەیفـە زۆرداری مـەكـە
٦- ئێمە عـەبدی جان فیداین فرصـەت لە دەستت بەرمـەدە
گـوێی لەوە مـەگـرە دەڵێ هەرگـیـز وەفـاداری مـەكـە.
٧- هێندە نـەحسە طالعم سـەرمت فیداكەم هێشتە هەر
پێم دەڵێی: لاچۆ لە پێـشم بەسـیـە لاسـاری مـەكـە
٨- چی دەكا پێم گیانەكەم جەور و جـەفـای دوو چاوەكەت
چاوەكـەم؛ ئەو ظالمە، خـۆت بیكە، مـوخـتـاری مـەكـە
٩- با لەباریدا بێ (كـوردی) یاری سـەخـتت هـەڵگرێ
تۆش كـەمێ مـروەت بكە سـا زێدەتر پاری مـەكـە

---

١- لوطف: بەزەیی، چاودێری، دڵسۆزی، بەتەنگەوە بوون.
جەفاكاری: خراپی، بەدكاری، سزادان.
قەدر: ڕێز.
مەردوم: خەڵكی.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، مس، ن، گل/١، کش، لاپەڕە/٣٥٦)دایە و هەموو دەسنووسی کۆن و باوەڕپێکراون و (کش)یان ئەم هەڵبەستەی لە کەشکۆڵی (مستەفا بەگی کوردی) دانراوە، لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی و هێشتا چاپیش نەکراوە. بەڵام (کش) ناوی نووسەری لەسەر نییە لە هی دوا دوای چەرخی (٢٠) دەکات لە (عن، مس، ن، گل/١)دا لە سەرەناوی ئەم هەڵبەستەدا نووسراوە: (نامەء کردی برای عبدالله پادشا ببە) واتە: (نامەی «کوردی» بۆ عەبدوڵڵا پاشای بابان) دیارە، ئەمەش کە ئەو لەسەر حوکم بووە لە پێش و پاش ڕووخانی باباندا دانراوە.

قەت (کش): تو.

٢- شیر کرۆژی دەوری سینی: نانخۆری فشەکەر، وشەی(شیر) بە(شێر)یش دەخوێندرێتەوە کە دەبێ بە(شێرکرۆژ).

تەرک: وازهێنان، دەسبەرداری.

بازاڕی: مەبەستی لە تێکڕای گەلە (ڕەشەگەل) نەک دەستوپێوەند و چێشتە و هەندێ گەورەپیاوان.

ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لەوانی تردا دووەمینە.

٣- یاری بکە: گەمە بکە و مەبەستی یاریی بە(دڵ) کردنە.

یارا: توانایی، وزە.

یار: خۆشەویست، دۆست.

مەرحەمەت: بەخشندەیی، دڵسۆزی، چاودێری.

با ڕەقیبان: لەگەڵ ناکەساندا و نەیاراندا.

یاری مەکە: هاوکاری مەکە، یاریکاری مەکە، هاوکاریان مەبە.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لەوانی تردا سێیەمینە و لە هەمووواندا چونیەکە و جوانکاری وشەبازی لەم تاکەدا هەیە کە پەسندی وێژەی کۆنە.

٤- سەراژێر: سەرەوژێر واتە بیانشکێنی و ڕەهەندەیان بکەی، بیانڕووخێنی. (هەڵگێڕاندنەوە)

ئەم تاکەش دیسان هەمووی لە (کش)دا نییە و لەوانی تردا چوارەمینە.

بڕەنجێنی (گل/١، ن): دەرنجینی.

بکەی (گل/١، ن): دکەء.

بکەی (مس): بکەء.

کێشی ئەم تاکە سووکە و دەبێ وشەی (بێگانە)کەی درێژتر دەرببڕدرێ، ئەگەر نا وەک لەنگ بێ وەهایە.

لەم تاکە هەڵبەستە ڕەوشتی بێگانەپەرستیی عەبدوڵڵا پاشای بابان ئاشکرا دەکات کە

هەمیشە دژ بەخزمان و نەتەوەکەی و دژ بەرژێمی بابان بووە و وازی نەهێناوە هەتا ئەو ڕژێمەی ڕووخاندووە. خۆیشی مایە پووچ دەرچووە. سەرەڕای ئەوەی بەدکردەوانەی مۆری ناپاکیی ناوە بەناوچەوانی خۆیەوە.

٥- حاکم: فەرمانڕەوا، گەورەی وڵات.
طەریق: ڕێگە، ڕێباز، بەرنامە.
عەدل: دادپەروەری.
حوکم: فەرمانڕەوایی.
حەیفە: موخابن.
ئەم تاکە لە (کش)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمینە.
طەریقی (کش، مس): طریق - ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

٦- عەبد: بەندە، کۆیلە.
جان فیدا: ئەوی گیان بەخت دەکا.
فرصەت: هەل، دەرفەت، دەرەتان.
وەفا: بەئەمەکی، چاکە لەبەرچاو بوو، پێزان.
ئەم تاکە لە (کش)دا بەم جۆرەیە:
«چاوکم کیفت اگردینی بەجنت شادببی»
کوی مکە تو کسەء دپژی وفاداری مکە
هەرگیز (ن): جانا.
بەرمەدە (مس): درمکە.
ئەم تاکە لە (کش)دا دووەمینە و لەوانی تردا شەشەمینە.

٧- نەحس: تووش، خراپ، بەد.
طالع: چارە، بەخت.
فیدا: بەخت کردن، قوربانیدان.
ئەم تاکە لە (کش)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا حەوتەمینە.
نەحسە (کش، ن): خراپە.
سەرمت فیداکەم (کش، مس): گر سر فداکم.
هێشتە هەر (ن، کش): یار دلی.
پێم دەڵێ (ن، کش): بس بلی.
بەسیە لاساری مەکە (کش): هندە بیعاری مکە.

٨- جەور و جەفا: سزا و ئازاردان و خراپی کردن.
ظالم: ستەمگەر، زۆردار.

موختاری مەکە: خۆی سەربەخۆ مەکە، ڕێگەی مەدە، دەسەڵاتی مەدەرێ، سەرپشکی مەکە.

ئەم تاکە لە (کش)دا شەشەمینە و دوا تاکە و لەوانی تردا هەشتەمینە.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (کش)دا بەم جۆرەیە:

«کر دکا پرست دو چاوت بو جفا و جور من»

ئەو ظالمە (کش): تویی خدا.

ئەم هەڵبەستەم لە کەشکۆڵستاندا جز و بەند کردووە، بەناوی (کەشکۆڵی کۆن)ەوە و لە پێڕستی کەشکۆڵستاندا لە لاپەڕە (٥٠ و ٥١)دا جێگرم کردووە.

ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لەوانی تردا نۆیەمینە و دوا تاکە.

لەباریدا بێ: لە توانایا بێ، بتوانێ.

مروەت: ئینصاف.

زێدەتر: زۆرتر.

زێدەتر باری مەکە (مس): زیدە سر باری مکە.

**تێبینی**: پایەی ئەم هەڵبەستە بەراستی نزمە هەرچەندە تام و چێژ و دروشم و مۆرکی (کوردی)ی تێدایە، بەڵام لە زۆر جێیدا لاوازە، لەوانەشە دەماودەم و دەسکاری لە ئاکامی نەخوێندنەوەی ڕاستیدا وای بەسەر هێنا بێ.

٧٥

## ئەمن کەوتوومە ژێر بار

١– ئەمن کەوتوومە ژێر (بار)ی، خەمی دووریت و (بار)یکە
بەخوای حەیفە ببم؛ دەست و نەوایی پشت و (باریک)ە
٢– بەخوێنی من حەنایی کە، عەزیزم دەست و کاکۆڵت،
بەموژگانی دوو دیدەی نەرگسینم، تار تاریکە
٣– لە بەندی عوقدی کاکۆڵت بەگرفتارە دڵی زارم،
وەکو مورغی قەفەس بیبەخشە، بەم چەشنە قوتاریکە
٤– دەکا مەنعم لە گریان ئەم ڕەقیبەی ئەحمەق و کەودەن
مەڵێ ئینسانە، ئەو بێ پیرە، هەروەک سەگ قەتارێکە
٥– غەمی دووری لەسەر شانم وەکو کێوی دەماوەندە
ئومێدی وەصل وەک موورە، میان و سەروی باریکە
٦– بەیانی حەسرەت و شەرحی غەمی دووری لە هیجرانت
بەکاغەز، قەت تەواو نابێتوو، ئوشتر بێنە باریکە
٧– ئەگەر ئەمجارە بێ دەستم بەدامانی بگا (کوردی)
سەعاتەن و عەقڵ و ڕۆح و دین و دڵ بێنە نەثارێکە

---

١– ژێر باری: بن باری – مەبەستی لەوەیە کە خەمی دوورییەکەی یار وەکو (کۆڵ = بار)ێک وایە کە خەڵکی بەشان = پشت هەڵی دەگرن یا لە وڵاخیی دەکەن و ئەوەتا (کوردی) کەوتووەتە ژێر ئەو بار (کۆڵ)ەوە. کە (بار)ی خەمی دوورییەکەیە واتا چۆنیەتی خەمەکەیە.
(بار)ی کە: باری بکە، لێی بارکە – واتا ئەی یارەکەم من بەم حاڵەشەوە کە لە بن باری خەمی دووریی تۆ دام سا تۆش فەرموو دیسان (باری تری بکە) وە یا مەبەستی ئەوەیە دەڵێ سەرەڕای ئەوە کە بوومەتە ژێر باری خەمی دووریتەوە کەچی یار (حاڵ)ی تریشی ئاوقام بووە و کردوومیەتە بن خۆیەوە، کە ئەم وشەی (بار)ە جیناس ئارایییە، جاری تریش بەکاری دێنێتەوە، وەستایی تیا دەنوێنێ.
حەیفە: موخابنە.

دەست و نەوا: ئاتاج (موحتاجی) پێویست بوون، چاوەنوارِ، کە لە (دەست)ی (دەستەوخوار، دەستدرێژکردن، دەست پان کردن)ەوە.
(نەوا)ی = موحتاجێتی و (هیوابارِی) واتە بێ هیوایی (دەست و نەوا) یا ئەم (پشت)ە (پوشت) واتە نامەردە، کە (کوردی) موحتاجی بووە و پێی بلێن: وەک کە (بار)ی بکە.
ئەمجا دەست و نەوایی پشت یا واتەدار و گۆچان بەدەستەوە گرتن بۆ یاریدە و پشوودانی پشت یا مەبەستی لە موحتاج بوونە بۆ (پشت)ی خۆی کە ئەو بار = (کۆڵ)ە هەڵبگرێ. بۆیەش وتوویە: (حەیفە)، چونکە لە کوردەواریدا بەکەسی نامەرد دەڵێن (پشت دەر) و ئەمیش دەڵێ: من چونکە مەردم و (پشت دەر) نیم، حەیفە موحتاجی پشت بم.
(باریک)ە = واتە ئەستوور نییە و لەبەر ئەم باریکییەی پشتی خۆیەتی کە بێ هێز و ناتوانا بێ بۆیە دەڵێ، حەیفە گوایە ناتوانێ و لەباریا نییە ئەو بارەی تر بەرێ. ئەمەش جارێکی تر حساس ئاراییە و، وردەکارییە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە نایابە تەنیا کەشکۆڵێکی پەرِاوی خانەی مەلای گەورەی کۆیەیە و ئێستە لای خانەوادەی جەلی زادەیە و بۆیە لێرەدا بەکورتکراوەی (جلی) ناوی دێت و نوسخەیەکی ئەم کەشکۆڵ لای هێرۆ خان و نوسخەیەکی تری لای مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخییە.
سەرەتا ئەوەی کە بوونی ئەم هەڵبەستەی ئاشکرا کردووە (مامۆستا عەبدولرەزاق بیمار)ە کە لە گوتاری نووسەری کورد و ژمارە/٣ی ساڵی/١ی ئابی ١٩٧١ز.ی بەغدادا لە ژێر ناوی (دەسنووسێکی غەزەلی کورد)دا وتارێک و سێ پارچە هەڵبەستی (کوردی)ی تیا پێشکەش کردووە کە لە شوێنی خۆیاندا لەو هەڵبەستانەدا نیشانەم بۆ ئەمە کردووە، بەڵام ئەوی بۆ ئەم شوێنە لێ دوانی، پێویستە ئەوەیە کە لەو وتارەیدا نووسیویە: (گەنجینەی سامانی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی»مان مزگەوتەکان و کتێبخانەی مەلاکان و ماڵی بنەماڵە زاتین پەروەر و ناودارەکان بووە، کە خاوەنەکانیان تا رادەیەک دڵسۆزانە پارێزگارییان کردووە. کتێبخانەی بنەماڵەی جەلی زادە لە کۆیە، یەکێکە لەو گەنجینانە، کە لە ناو کتێبی کۆن و دەسخەتی نایاب و کتێبی بەنرخی زانیارییە ئاینییەکاندا، چ پەرِە پەرِە، چ بەکۆمەڵ شیعری شاعیرانی کوردت دەبینی...) دوای ئەمە مامۆستا بیمار نووسیویە:
«ئێستا وا کۆمەڵە دەسنووسێکم لایە کە گەوهەرێکی ئەو گەنجینەیە، خوشکی ئەدەبپەروەر و تێگەیشتوو (نەجیبە خانی جەلی زادە) پێی کەرەم کردووم کە بەوپەرِی دڵسۆزییەوە لە ساڵی ١٩٦٣دا بەر لەوەی کتێبخانەکە تووشی پشکنینەوە و، وێران و تاڵان کردن بێت، رزگاری کردووە. لەم ساڵە تووشەدا ئەوەی لای بەنرخ بووە لە دەستخەتەکان و لە دانراوەکانی باب و باپیرانی و ئەوەی توانیبێتی بیکا بەسەر باری کەلوپەلی و پێداویستی کۆچی ئاوارە و هێلانەوازی، لەگەلێتی سنووقێکا ئەم چەند لاپەرِە شیعرانەشی هەڵگرتووە کە ئەگەر گیانی نرخ زانی ئەدەبیی ئەو خوشکە بەرِێزە نەبوایە ئێستا لە بیرەوەری زەمانی و دەنگدانت

بووبوو).
من زۆر ڕوونكردنەوەم لەسەر ئەم كەشكۆڵە كردووە و پەراوێزم لەسەر نووسیوە. جا ئەو چەند لاپەڕە شیعرەش كە (مامۆستا بیمار) لێی دواوە هەمان كەشكۆڵە كە لە سەرەتاوە پەنجەم بۆ كێشا كەوا سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیە و ئێستە لەگەڵ سێ پاشماوەی كەشكۆڵی تردا بەرگی تێگیراوە و لای زانای توانا و بەرێز (مامۆستا مەسعوود محەمەد چەلی زادە)یە كە شایانی سوپاسە ناردی لە (كۆیە)وە، بۆی هێنام و لەگەڵ (٢٩) پارچە هەڵبەستی تری (كوردی)دا كە لەم پەراویەدان بەراوردم كردن و كەڵكم لێ وەرگرتن و ئەم پارچە هەڵبەستەشم لێ وەرگرت كە هێشتا لە شوێنێكی تردا بەرچاوم نەكەوتووە و، بەیەكێك لەو هەڵبەستانەی (كوردی)ی دەزانم كە زۆر كەم تووشی دەسكاری و گۆڕان و ئاڵوگۆڕ و ئاوێتەكاری بووبێ، سەرەڕای نایابییەكەشی كە تاقانەی ئەو دەیان سەرچاوەیەیە كە ئەم پەراوییەم لەسەر پێك هێناون، جگە لە بالایی هەڵبەستەكەش بەر لە مامۆستا بیمار چاپیش نەكراوە. (مامۆستا بیمار) لە گوتاری (نووسەری كورد)ی ناوبراودا لە بارەی ئەم دەسنووسەوە نووسیویە:
(ئەم دەسنووسە ئێستا پەڕە پەڕەیە و گەلێ پەڕیشی لێ ون بووە. بەخەتێكی درشتی ئاشكرا نووسراوەتەوە ئەگەرچی مێژووی نووسینەوەی لەسەر نەماوە بەلام بەلای كەمەوە دەوری (٧٠) ساڵی بۆ دادەنێم).منیش ئەم كەشكۆڵە بە هی دوو دەیەی سەرەتای چەرخی بیستەم دادەنێم و هی تریشی تیایە چونكە لە پاشماوەی چوار كەشكۆڵ پترێكە و دیوانێكی بەنرخی (حوسەینی) كۆیەشی لەگەلا جز و بەند كراوە.
لە بارەی ناوەڕۆكی كەشكۆڵەكەوە (بیمار) پێرستی ژمارەی هەڵبەستی چەند هۆنەرێكی تیا دیاری كردووە، هەرچەند هەڵبەستی دووبارەی هەر ژماردووەتەوە وەك ئەوەی هەڵبەستەكانی (كوردی) لەو كەشكۆڵەدا (٣٠) پارچەیە، بەلام ئەو بە (٣٨)ی داناون.
وەك لە پێشەوە دیاریم كرد كە (مامۆستا بیمار) بۆ یەكەم جار بوونی ئەم پارچە هەڵبەستە نایابەی سەرەوەی لە گۆڤاری (نووسەری كورد)ی ناوبراودا ئاشكرا كردووە و بەم چەند دێڕەی دوایی هەڵبەستەكەی پێشكەش كراوە:
(لە ناو دەسنووسەكەدا غەزەلێكی تری (كوردی) هەبوو هەندێ كەموكووڕیی تیا بوو، لە لای كێشە و سوار نەبووو، مانای بەدەستەوە نەدەدا، كە دێڕی یەكەمی ئەمەیە:

«ئەمن كەوتومە ژێر باری غەمـــی دووری تۆ باریكە»

«بەخوا حەیفە ببم دەست و و نەوایی پشت و باریكە»

هومێدەوارم بتوانین لەگەڵ نوسخەی تردا بەراوردی بكەین و ڕاستی بكەینەوە...).
بەلام كاتێ (مامۆستای بەرێز مەسعوود محەمەد) كەشكۆڵەكەی پێ گەیاندم، بەئاسانی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەم بۆ ساغ كرایەوە كە ئەگەر (مامۆستا بیمار) كەمێكی تر خۆی لەگەڵدا ماندوو بكردایە ئەوەی دەرحەق نەدەگوت، بەلام لە ڕووی نووسینی نەخوێندنەوەوە دیارە هەر ئەوەندەی لە باردا بووە، كە شارەزاییی تایبەتی دەوێت.

جارێکی کەش تاسە و سوپاس بۆ هەردوو (مامۆستا مەسعوود محەمەد جەلی زادە) و (مامۆستا بیمار)ە کە بەهۆیانەوە ئەم پەڕاویە بەم پارچە هەڵبەستە ژمارەیەکی تری خرایە سەر و هەموو ڕێز و ئافەرینم بۆ هەستی پاکی (خوشکە نەجیبە خانی جەلی زادە)یە کە لەو چنگاڵە پیسانە بۆی ڕسگار کردووین. ئەوسای ئەمەی سەرووم نووسیوە، هێشتا مامۆستا (مەسعوود) لە ژیاندا بوو. بەداخەوە کە نەماوە. ئەمیش شێوەی نووسینی کەشکۆڵەکەیە.

ئەمن (جلی): من.

ژێر باری (جلی): ژیربار.

خەمی (جلی): غم.

بەخوای لە لای من وایە: (بەخوا) بووبێ و کرابێتە کۆییانە.

دەست و نەوایی (جلی): دستو نوای.

دوای ئەمانەش بەداخەوە بۆنەی هەڵبەستەکەم بۆ نەزانرا.

٢- خەنایی: خەناوی (خەنایی کە) لە خەنەی بگرە، سووری بکە بەخوێنی وەکو خەنەی من لە ڕەنگدا.

عەزیزم: ئەی خۆشەویستم، دۆستەکەم.

کاکۆڵت: وا دیارە ئەم هەڵبەستە نامەیەکە بۆ یەکێ لە دۆست و هەواڵ و هاودەمە خۆشەویستەکانی خۆی ناردووە، وەک نامەیەک و وادی لە دەست دووریی کردووە و ئارەزوومەندیی دیداری تیا دەربڕیوە. بەتایبەتی تاکی شەشەم دیاریی دەکا کە نامەیەکە.

موژگان: برژانگەکان، مژۆڵان، موژگ.

دیدە: چاو.

نەرگسینم: وەکو نەرگسم – ئەم ناوی (نەرگس) بردنە و بۆ چاوی خۆی وەک داونانەوەیەک وایە لەم هەڵبەستەدا، چونکە وا دێ بەبیرا دەبوو بیوتایە (نەرگسینت) بەڵام نەء. مەبەستی برژانگی چاوی وەکو نێرگسی خۆیەتی کە یارەکەی (برادەرەکەی) بیکاتە شانە و کاکۆڵی خۆی پێ خاو بکاتەوە و چاوی (کوردی) و برژانگەکانی هەڵکۆڵێ و دەست و پەنجە و کاکۆڵەکانی خۆی پێ خەنە ڕەنگ بکات.

تار تار: ڕەش ڕەش یا بەشانە لە خوێنی ئەم پەنجە و کاکۆڵی خۆروشی خەنەیی بکا و دیسان بەبرژانگی وەک شانەی ئەم قژی کاکۆڵی خۆی پێ شانە بکات.

بەخوێنی (جلی): بخون – ئەمیش دەبێ، بەڵام بەتێکڕایی لە هەڵبەستی تردا (بەخوێنی) وتووە.

حەنایی کە (جلی): خنائی کە.

دەست و (جلی): دست.

بەموژگانی (جلی): بمژکان.

دو دیدەی نەرگسینم (جلی): دو دیدەء نرکسینم.

٣- لە بەندی: لە داوی، لە بەندێتی وەک بەندیخانەی ناو قژی کاکۆڵی، لە گیرۆدەییدا.

عوقده: گرێ، مەبەستی پێچ و لوولی کاکۆڵەکەیە کە جاران بەشەو لە جێگەدا داوێنی کاکۆڵەکە لە دارپێچراوە و هەتا بەیانی گرێی تێ کەوتووە و لوول بووە.

گرفتار: گیرۆدە.

دڵی زارم: دڵی پەرێشانم.

مورغ: مەل، پەلەوەر، باڵندە، کە دڵی خۆی چواندووە بەمەلی ناو قەفەسی کاکۆڵی.

قەفەس: تووڵینە، ئەو تووڵینە و تەلینەیەی کە مەلی تیا بەخێو دەکەن وەک کەو.

بیبەخشـە: ئازادی کە، بەرەڵڵای بکە، مەبەستی لە دڵەکەیەتی لە ناو پێچ و لوولی کاکۆڵییا وەک مەل لە ناو تووڵینەدا بەری بدا و مەبەستی کەوەکە کە ئەو هاواڵەی سەری (کوردی) بدات و لە دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوە ڕسگاری کات.

بەم چەشنە: بەم جۆرە، ئەشێ بەم (جەژنەش)ی مەبەست بووبێ بەبۆنەی (جەژن)ەوە سەر لە (کوردی) بدات.

چونکە بەرێنووسی کۆن و ئەوسا دەنووسرا: (چەشن = جەژن).

قوتار: ڕەها، ڕسگار، بەرەڵڵا، ئازادکردن.

لە بەندی (جلی): لە بند.

عوقدی (جلی): عقد.

گرفتارە (جلی): کرفتارە.

دڵی زارم (جلی): دل زارم.

مورغی قەفەس (جلی): مرغ قفس.

بەم چەشنە (جلی): بم چشنە.

قوتارێکە (جلی): قتاریکە.

ئەم هەمـوو جۆرە نووسینەی سـەرەوە بەرێنووسی کـۆنن و من توانیم هەمـووانیـان بەڕاسـتی بخوێنمـەوە و بەرێنووسی ئێستـەمان جێگیریان بکەم، چونکە بناخەی خوێندنم لە حوجرە و مزگەوتدا بووە کە ئەو سایەی ساڵە (٢٠ و ٣٠)یەکانی چەرخی بیستەم بەم جۆرە ڕێنووسەی ناو ئەم کەشکۆڵە دەمانخوێند و دەماننووسی.

٤– مەنع: نەهێشتن، بەرگرتن.

ڕەقیب: دژ، ناحەز، نەیار.

ئەحمەق: نادان، کەم ژیری، بیر شێواو، دێوانە.

کەودەن: ئەحمەق، تێنەگەییو، دەبەنگ، گەمژە، حەپۆلە.

ئینسان: مرۆڤ، مرۆی، مێر،... مەبەستی ناکەسی ئەو ڕەقیبەیە.

بێ پیر: بێ شێخ، بێ چاو سوورکەر، هەتیوچە، بەرەڵڵا، سەرەڕۆ.

قەتار: ڕیزکردن (قوتاریکە) مەبەستی لەوەیە وەک سەگ (قەمتەر)ی بکات.

واتە (سُنْك = س نکی) کە (سەمەندۆک)ی کە (پەتی کە) بیبەستەوە.

وەیا: مەهێڵە بەرەڵڵا بێ و مەبەستی لەوەیە لەگەڵ سەگاندا ڕیزی بکات.
دەکا مەنعم (جلی): اکا منعم.
لە گریان (جلی): لکریان.
ئەم ڕەقیبەی (جلی): ام رقیبەء.
ئەحمەق و کەودەن (جلی): احمق کودن.
مەڵێ ئینسانە (جلی): ملی انسانە.
ئەو (جلی): او.
هەروەک سەگ (جلی): هروک سک.
قەتاریکە (جلی): قطاریکە.
ئەم نووسینانەی ناو کەشکۆڵەکە (جلی) هەموو ڕێنووسی کۆنن و ئێستە بەم ڕێنووسە دەنووسرێن کە من جێگرم کردوون.
٥- کێوی دەماوەند: مەبەستی ئەو ئەمەیە هەمیشە بەسەر کێوەکەوە، وەک غەمبارە.
ئومێدی وەصل: هیوای پێکگەیشتن.
موور: مێرووله - مەبەستی لە وردی و بچووکییە.
میان: قەد و باڵا، واتە ئەو هیوایە ئەوەندە زەبوون و باریکە، وەک قەدی سەروی باریک وایە، ئەمیش دەمی نیو باڵەیە لە کەشکۆڵەکەدا.
٦- بەیانی حەسرەت و شەرحی خەمی دووری لە هیجرانت: دەربڕینی خەفەت و لێکدانەوەی غەمی دووری و جیاییت.
کە ئەم تاکە لە (جلی)دا نووسراوە: (بیان حسرت شرح غم دوری لە هیجرانت)
(بکا غز قط تووان بێتو اشتر بێنە باریکە)
کاغەز: ئەمە بەنیشانەی ئەوەیە کە گوتم ئەم هەڵبەستە نامەیەکی دۆستانەیە بۆ هاوالێکی.
ئوشتر: حوشتر، وشتر (ئەوسا وای پێ گوتراوە).
٧- دامان: داوێن.
سەعاتەن: دەسبەجێ، هەر لەو سەعاتەدا، کوتوپڕ، خێرا، گورج، دەمودەست.
عەقڵ: ژیری، هۆش.
ڕۆح: گیان، ڕەوان، جان.
دین: ئایین.
نەثار: پەخش، پەخشان وەک گوڵ بەسەر، ئەوانە هەڵدەدەم و باڵا گەردانی دەکەم.
ئەم تاکەش لە (جلی)دا بەم جۆرەیە (اگر امجار بێ دستم بدامان بکا کردی)
(سعاتاً عقلُ روح دین دل بینة نثاریکة)

٧٤

## گەر دەبێ لوطفت ببێ

١- گـەر دەبێ لوطفت ببێ، وەرنە، جـەفـاکـاری مـەکـە
قـەدری خـەڵقی ڕاگـرە قـەت مـەردوم ئازاری مـەکـە
٢- شـیـرکـرۆژی دەوری سـینی، نابنە جـێگەی هیـوا
پشـتـیـوانت گـەر دەوێ، تۆ تەرکی (بازاری) مـەکـە
٣- بـەس بە (دڵ) یاری بکە (یارا)م نەمـاوە (یار)ەکـەم
مـەرحـەمـەت کە، بـارەقیـبـان توو خـودا (یاری) مـەکـە
٤- تۆ کـە خـزمـانت بڕەنجـێنی و سـەرا ژێریان بکەی
قـەت بەیاریکاریی بێگانە هیـوا باری مـەکـە
٥- حـاکـمی چا بە، طەریقی عـەدلداری پێش گـرە
چونکە حـوکـمت ڕادەبووری حـەیفـە زۆرداری مـەکـە
٦- ئێمە عەبدی جان فیداین فرصەت لە دەستت بەر مەدە
گـوێ لـەوە مـەگـرە دەڵێ هـەرگـیـز وەفـاداری مـەکـە
٧- هێندە نـەحسـە طالعم سـەرمت فیداکەم هێشـتە هەر
پێم دەڵێی: لاچۆ لە پێشم بەسـیـە لاسـاری مـەکـە
٨- چی دەکا پێم گیانەکەم جەور و جەفای دوو چاوەکەت
چاوەکـەم: ئەو ظالمە خـۆت بیکە، مـوخـتـاری مـەکـە
٩- با لـە باریدا بێ (کـوردی) باری سـەخـتت هەڵگرێ.
تۆش کـەمێ مـروەت بکە سـا زێدەتر باری مـەکـە.

---

١- لوطف: بەزەیی، چاودێری، دڵسۆزی، بەتەنگەوە بوون.
جەفاکاری: خراپی، بەدکاری، سزادان.
قەدر: ڕێز.
مەردوم: خەڵکی.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، مس، ن، گل١، کش، لاپەڕە/ ٣٥٦)دایە و هەموو دەستنووسی کۆن و باوەڕ پێ کراون و (کش)یان ئەم هەڵبەستەی لە کەشکۆڵی (مصطفی بەگی کوردی) دانراوە، لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی و هێشتا چاپ نەکراوە، بەڵام (کش) ناوی نووسەری لەسەر نییە هی دوا دوای چەرخی (٢٠) دەکات لە (عن، مس، ن، گل١)دا لە سەرە ناوی ئەم هەڵبەستەدا نووسراوە: (نامَەء کُردِی بَرای عَبْدالله پادشاە ببە).
واتە: (نامەی «کوردی» بۆ عەبدوڵڵا پاشای بابان) دیارە ئەمەش کە ئەو لەسەر حوکم بوو لە پێش و پاشی ڕووخانی باباندا دانراوە.
قەت: (کش): تو

٢- شیرکرۆژی دەوری سینی: نان خۆری فشەکەر، وشەی (شیر) بە (شێر)یش دەخوێندرێتەوە کە دەبێ بە (شێرکرۆژ).
تەرک: وازهێنان، دەستبەرداری.
بازاری: مەبەستی لە تێکڕای گەلە (ڕەشە گەل) نەک دەستوپێوەند و چێشتە و هەندێ گەورە پیاوان.
ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لەوانی تردا دووەمینە.

٣- یاری بکە: گەمە بکە و مەبەستی یاریی بە (دڵ) کردنە.
یارا: توانایی، وزە.
یار: خۆشەویست، دۆست.
مەرحەمەت: بەخشندەیی، دڵسۆزی، چاوێری.
با ڕەقیبان: لەگەڵ ناکەساندا و نەیاران دا.
یاری مەکە: هاوکاری مەکە، یاریکاری مەکە، هاوکارییان مەبە.
نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لەوانی تردا سێیەمینە و لە هەمووواندا چونیەکە.
و جوابکاری وشەبازی لەم تاکەدا هەیە کە پەسندی وێژەی کۆنە.

٤- سەراژێر: سەرەوژێر، واتە بیانشێلی و ڕەهەندیان بکەی بیانڕووخێنی (هەڵگێڕاندنەوە).
ئەم تاکەش دیسان هەمووی لە (ش)دا نییە و لەوانی تردا چوارەمینە.
بڕەنجێنی (گل١، ن): دەرنجینی:
بکەی (گل١، ن): دکەء
بکەی(مس)بکەء.
کێشی ئەم تاکە سووکە و دەبێ وشەی (بێگانە)کەی درێژتر دەربڕدرێت، ئەگەر نا وەک لەنگ بێ وەهایە.
لەم تاکە هەڵبەستە ڕەوشی بێگانە پەرستیی عەبدوڵڵا پاشای بابان ئاشکرا دەکا: کە هەمیشە دژ بە خزمان و نەتەوەکەی و دژ بە ڕژێمی بابان بووە و وازی نەهێناوە هەتا ئەو ڕژێمەی

ڕووخاندووە، خۆیشی مایە پووچ دەرچووە. سەرەڕای ئەوەی بەوکردەوانەی مۆری ناپاکیی ناوە بە ناوچەوانی خۆیەوە.

٥- حاکم: فەرمانڕەوا، گەورەی وڵات.

طەریق: ڕێگە، ڕێباز، بەرنامە.

عەدل: دادپەروەری.

حوکم: فەرمانڕەوایی.

حەیفە: مەخابن.

ئەم تاکە لە (کش)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمینە.

طەریقی (کش، مس): طریق - ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

٦- عەبد: بەندە، کۆیلە.

جان فیدا: ئەوەی گیان بەخت دەکا.

فرصەت: هەل، دەرفەت، دەرەتان.

وەفا: بەئەمەکی، چاکە لەبەرچاو بوو، پێزان.

ئەم تاکە لە (کش)دا بەم جۆرەیە:

«چاوکم کیفت اگر دنیی بە جنت شاد ببی».

کوی مکە تو بوکسەء دیژی وفاداری مکە

هەرگیز (ن) جانا.

بەرمەدە (مس): درمکە.

ئەم تاکە لە (کش)دا دووەمینە و لەوانی تردا شەشەمینە.

٧- نەحس: تووش، خراپ، بەد.

طالع: چارە، بەخت.

فیدا: بەختکردن، قوربانیدان.

ئەم تاکە لە (کش)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا حەوتەمینە.

نەحسە (کش، ن): خراپە:

سەرمت فیدا کەم (کش، مس): گر سر فدا کم.

هێشتە هەر (ن، کش) یار دلی.

پێم دەڵێ (ن، کش) بس بلی.

بەسیە لاساری مەکە (کش) هندە بیعاری مکە.

٨- جەور و جەفا: سزا و ئازاردان و خراپی کردن.

ظالم: ستەمگەر، زۆردار.

موختاری مەکە: سەرپشکی مەکە، خۆی سەربەخۆمەکە، ڕێگەی مەدە، دەسەڵاتی مەدەرێ.

ئەم تاکە لە (کش)دا شەشەمینە و دوا تاکە و لەوانی تردا هەشتەمینە.
نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (کش)دا بەم جۆرەیە:
«کر دکا پرست دو چاوت بو جفا و جورمن»
ئەو ظالم (کش) تو بی خدا.
ئەم هەڵبەستەم لە کەشکۆڵستاندا جزوبەند کردووە بە ناوی (کەشکۆڵی کۆن)ەوە و لە پێرستی کەشکۆڵستاندا لە لاپەڕە ٥٠ و ٥١دا جێگرم کردووە.
٩- ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لەوانی تردا نۆیەمینە و دوا تاکە.
لەباریدابێ: لە توانایابێ، بتوانێ.
مروەت: ئینصاف.
زێدەتر: زۆرتر.
زێدەتر باری مەکە (مس): زێدە سرباری مکە.
تێبینی: پایەی ئەم هەڵبەستە بەڕاستی نزمە هەر چەندە تام و چێژو درۆشم و مۆرکی (کوردی)ی تێدایە بەڵام لە زۆر جێیدا لاوازە، لەوانەشە دەماو دەم و دەسکاری لە ئاکامی نەخوێندنەوەی ڕاستیدا وای بەسەرهێنابێ.

٧٥

## ئەمن کەوتوومە ژێر بار

١- ئەمن کەوتوومە ژێر (بار)ی، خەمی دووریت و (بار)یکە
بەخوای حەیفە ببم؛ دەست و نەوایی پشت و (باریک)ە
٢- بەخوێنی من حەنایی کە، عەزیزم دەست و کاکۆڵت
بەموژگانی دوو دیدەی نەرگسینم، تارتاریکە
٣- لە بەندی عوقدی کاکۆڵت، گرفتارە دڵی زارم
وەکو مورغی قەفەس بیبەخشە، بەم چەشنە قوتاری کە
٤- دەکا مەنعم لە گریان ئەم ڕەقیبەی ئەحمەق و کەودەن
مەڵێ ئینسانە، ئەو بێ پیرە، هەروەک سەگ قەتاری کە
٥- خەمی دووری لە سەر شانم وەکو کێوی دەماوەندە
ئومیدی وەصل وەک موورە، میان و سەروی باریکە
٦- بەیانی حەسرەت و شەرحی خەمی دووری لە هیجرانت
بە کاغەز، قەت تەواو نابێتو و، ئوشتر بێنە باری کە
٧- ئەگەر ئەمجارە بێ دەستم بە دامانی بگا (کوردی)
سەعاتەن، عەقڵ و ڕۆح و دین و دڵ بێنە نەثاری کە

........................................................................

١- ژێرباری: بن باری، مەبەستی لەوەیە کە خەمی دوورییەکەی یار وەکو (کۆڵ = بار)ێک وایە کە خەڵکی بەشان = پشت هەڵی دەگرن یا لە ولاخی دەکەن و ئەوەتا (کوردی) کەوتووەتە ژێر ئەو بار (کۆڵ)ەوە. کە (بار)ی خەمی دوورییەکەیە واتا چۆنیەتی خەمەکەیە.
(بار)ی کە: باری بکە، لێی بارکە. واتا ئەی یارەکەم من بەم حاڵەشەوە کە لە بن باری خەمی دووریی تۆ دام ساتۆش فەرموو دیسان (باری تری کە)، یا مەبەستی ئەوەیە دەڵێ سەرەڕای ئەوە کە بوومەتە ژێر باری خەمی دوورییەوە کەچی یار (حاڵ)ی تریش ئاو قام بووە و کردوویەتە بن خۆیەوە. کە ئەم وشەی (بار)ە جیناس ئاراییە، جاری تریش بەکاری دێنێتەوە، وەستایی تیا دەنوێنێ.
حەیفە: موخابنە.

دەست و نەوا: ئاتاج (موحتاجی) پێویست بوون، چاوەنوار، کە لە (دەست)ی دەستە و خوار، دەستدرێژ کردن، دەست پانکردنەوە.
(نەوا)ی: موحتاجێتی و (هیوابارى) واتە بێ هیوایی (دەست و نەوا) یا ئەم (پشت)ە (پوشت) واتە نامەردە، کە (کوردی) موحتاجی بووە و پێی دەڵێن: وەک کەر (بار)ی بکە.
ئەمجا (دەشت و نەوایی پشت یا واتەدار و گۆچان بەدەستەوە گرتن بۆ یاریدە و پشوودانی پشت یا مەبەستی لە موحتاج بوونە بۆ (پشت)ی خۆی کە ئەو بار = (کۆڵ)ە هەڵبگرێ. بۆیەش وتوویە: (حەیفە) چونکە لە کوردەواریدا بە کەسی نامەرد دەڵێن (پشت دەر) و ئەمیش دەڵێ: من چونکە مەردم و (پشت دەر) نیم، حەیفە موحتاجی پشت بم.
(باریک)ە: واتە ئەستوور نییە و لەبەر ئەم باریکییەی پشتی خۆیەتی کە بێ هێزە و ناتوانێ، بۆیە دەڵێ حەیفە گوایە ناتوانێ و لە باریا نییە ئەو بارەی تر بەرێ. ئەمەش جارێکی تر جیناس ئاراییە و، وردەکارییە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە نایابە تەنیا کەشکۆڵێکی پەڕاویخانەی مەلا گەورەی کۆیەیە و ئێستا لای خانەوادەی جەلی زادەیە و بۆیە لێرەدا بە کورتکراوەی (جلی) ناوی دێت .
سەرەتا و ئەوی کە بوونی ئەم هەڵبەستەی ئاشکرا کردووە (مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار)ە کە بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە(٣ی ساڵی/١ی ئابی ١٩٧١ز)ی بەغدا دا لە ژێر ناوی (دەسنووسێکی غەزەلی کورد)دا وتارێک و سێ پارچە هەڵبەستی (کوردی)ی تێدا پێشکێش کردووە کە لە شوێنی خۆیاندا لەو هەڵبەستانەدا نیشانەم بۆ ئەمە کردووە.
لە بارەی ناوەڕۆکی کەشکۆڵەکەوە (بیمار) پێرستی ژمارە هەڵبەستی چەند هۆنەرێکی تێدا دیاری کردووە هەرچەند هەڵبەستی دووبارەشی هەر ژماردووەتەوە، وەک ئەوەی هەڵبەستەکانی (کوردی) لەو کەشکۆڵەدا (٣٠) پارچەیە، بەڵام ئەوی بە (٣٨)ی داناون.
(لە ناو دەستنووسەکەدا غەزەلێکی تری (کوردی) هەبوو هەندێ کەموکووڕیی تێدا بووە، لە ڕووی کێشەوە سوار نەبووە، مانای بەدەستەوە نەدەدا، کە دێڕی یەکەمی ئەمەیە:
«ئەمن کەوتوومەتە ژێر باری غەمی دووری تو باریکە»
«بەخوا حەیفەیم دەست و نەوایی پشت و باریکە»
ئومێدەوارم بتوانین لەگەڵ نوسخەی تردا بەراوردی بکەین و ڕاستی بکەینەوە.
بەڵام کاتێ (مامۆستای بەڕێز مەسعوود محەمەد) کەشکۆڵەکەی پێ گەیاندم. بەئاسانی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەم بۆ ساغ کرایەوە کە ئەگەر (مامۆستا بیمار) کەمێکی دیکە خۆی لەگەڵا ماندوو بکردایە، ئەوەی دەرحەق نەدەگوت.
ئەمن (جلی): من.
ژێر باری (جلی): ژێر بار.
خەمی (جلی): غم.

بەخوای: لەلای من وایە: (بەخوا) بووبێ و کرابێتە کۆییانە.

دەست و نەوایی (جلی): دستونوای.

دوای ئەمەش بە داخەوە بۆنەی هەڵبەستەکەم بۆ نەزانراوە.

٢- حەنایی: خەناوی (خەنایی کە) لە خەنەی بگرە، سووری بکە بەخوێن وەکو خەنەی من لە ڕەنگدا.

عەزیزم: ئەی خۆشەویستم، دۆستەکەم.

کاکۆڵت: وا دیارە ئەم هەڵبەستە نامەیەکە بۆ یەکێ لە دۆست و هاواڵ و هاودەمە خۆشەویستەکانی خۆی ناردووە وەک نامەیەک و دادی لە دەس دووری کردووە و ئارەزوومەندیی دیداری تێدا دەربڕیوە. بەتایبەتی تاکی شەشەم دیاریی دەکا کە نامەیەکە.

موژگان: برژانگەکان، مژۆڵان، موژگ.

دیدە: چاو.

نەرگسینم: وەکو نەرگسم- ئەم ناوی (نەرگس) بردنە و بۆ چاوی خۆی وەک داونانەوەیەک وایە لەم هەڵبەستەدا؛ چونکە وادێ بەبیردا دەبوو بیوتایە (نەرگسیت) بەڵام نە مەبەستی برژانگی چاوی وەکو نێرگسی خۆیەتی کە یارەکەی (برادەرەکەی) بیکاتە شانە و کاکۆڵی خۆی پێ خاو بکاتەوە و چاوی (کوردی) و برژانگەکانی هەڵکۆڵی و دەست و پەنجە و کاکۆڵەکانی خۆی پێ خەنە ڕەنگ بکات.

تارتار: ڕەش ڕەش یا بەشانە لە خوێنی ئەم پەنجە و کاکۆڵی خۆی ڕەشی خەنەیی بکا و دیسان بەبرژانگی وەک شانەی ئەم قژی کاکۆڵی پێ شانە بکات.

بەخوێنی (جلی): بخون: ئەمیش دەبێ بەڵام بەتێکڕایی لە هەڵبەستی تردا (بەخوێنی) وتووە.

حەنایی کە (جلی): خنائی کە.

دەست و (جلی): دست.

بەموژگانی (جلی): بمژکان.

دو دیدەی نەرگسینم (جلی): دو دیدەء نرکسیم.

٣- لە بەندی: لە داوی، لە بەندێتی وەک بەندیخانەی ناو قژی کاکۆڵت، لە گیرۆدەییدا.

عوقدە: گرێ، مەبەستی پێچ و لوولی کاکۆڵەکەیە کە جاران بەشەو لە جێگەدا داوێنی کاکۆڵەکە لە داپێچراوە و هەتا بەیانی گرێی تێ کەوتووە و لوول بووە.

دڵی زارم: دڵی پەرێشانم.

مورغ: مەل، پەلەوەر. باڵندە، کە دڵی خۆی چواندووە بەمەلی ناوقەفەسی کاکۆڵی.

قەفەس: تووڵینە، ئەو تووڵینە و تەلینەیەی کە مەلی تێدا بەخێو دەکەن وەک کەو.

بیبەخشە: ئازادی بکە، بەرەڵڵای بکە، مەبەستی لە دڵەکەیەتی لە ناو پێچ و لوولی کاکۆڵیا وەک

مەل لە ناو تووڵینەدا بەری بدات و مەبەستی لەوەیە کە ئەو هاواڵەی سەری (کوردی) بدات و لە دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوە ڕزگاری بکا.

بەم چەشنە: ئەم جۆرە، ئەشێ بەم (جەژنەش)ی مەبەست بووبێ، بەبۆنەی (جەژن)ە وە سەر لە (کوردی) بدات.

چونکە بەڕێنووسی کۆن و ئەوسا دەنووسرا (چەشن = جەژن).

قوتار: ڕەها، ڕسگار، بەرەڵڵا، ئازادکردن.

لە بەندی (جلی): لە بند.

عوقدی (جلی): عقد.

گرفتارە (جلی): کرفتارە.

دڵی زارم (جلی): دل زارم.

مورغی قەفەسی (جلی): مرغ قفس.

بەم چەشنە (جلی): بم چشنە.

قوتاری کە (جلی): قتاریکە.

ئەم هەموو جۆرە نووسینەی سەرەوە بەڕێنووسی کۆنن و من ناتوانم هەموویان بەڕاستی بخوێنمەوە و بەڕێنووسی ئێستەمان جێگریان بکەم.

٤-مەنع: نەهێشتن، بەرگرتن.

ڕەقیب: دژ، ناحەز، نەیار.

ئەحمەق: نادان، کەم ژیری، بیرشێواو، دێوانە.

کەودەن: ئەحمەق، تێنەگەیشتوو، دەبەنگ، گەمژە، حەپۆلە.

ئینسان: مرۆڤ، مرۆ، مێر، مەبەستی ئەو ڕەقیبەیە.

بێ پیر: بێ شێخ، بێ چاو سوورکەر، هەتیوچە، بەرەڵڵا، سەرەڕۆ.

قەتار: ڕیزکردن (قەتاری کە) مەبەستی لەوەیە وەک سەگ (قەمتەر)ی بکات.

واتە (سنگ: (س نکی) کە (سەمەندۆک)ی کە (پەتی کە) بیبەستەوە.

وەیا: مەهێڵە بەرەڵڵابێ و مەبەستی لەوەیە لەگەڵ سەگاندا ڕیزی بکات.

دەکا مەنعم (جلی): دکا منعم.

لەگریان (جلی): لکریان.

ئەم ڕەقیبەی (جلی): ام رقیبەء

ئەحمەق و کەودەن (جلی): احمق کودن.

مەڵێ ئینسانە (جلی): ملی انسانە.

ئەو (جلی) : او.

هەر وەک سەگ (جلی): هروەک سک

قەتاری کە (جلی): قطاریکە.

ئەم نووسینانەی ناو کەشکۆڵەکە (جلی) هەموو ڕێنووسی کۆنن و ئێستا بەم ڕێنووسە دەنووسرێن کە من جێگرم کردوون.

٥- کێوی دەماوەند: مەبەستی ئەو تەمەیە هەمیشە بەسەر کێوەکەوە، وەک غەم بارە لە شانی و لێڵە.

ئومێدی وەصل: هیوای پێکگەیشتن.

موور: مێرووله، مەبەستی لە وردی و بچووکییە.

میان: قەد و باڵا، واتە ئەو هیوایە ئەوەندە زەبوون و باریکە وەکو قەدی سەروی باریک وایە.

«امید وصل وک مووره میان و سر و باریکە»

ئەمیش دەقی ئەم نیو باڵەیە لە کەشکۆڵەکەدا:

٦- بەیانی حەسرەت و شەرحی خەمی دووری لە هیجرانت: دەربڕینی خەفەت و لێکدانەوەی خەمی دووریی جیاییت.

کە ئەم تاکە لە (جلی)دا وا نووسراوە:

«بیان حسرت شرح غم دوری لە هیجران،

بکاغز قط تووا نا بێتو اشتر بینه باریکە»

کاغەز: ئەمە بەنیشانەی ئەوەیە کە گوتم ئەم هەڵبەستە نامەیەکی دۆستانەیە بۆ هاواڵێکی.

ئوشتر: حوشتر، وشتر، (ئەوسا وای پێ گوتراوە).

٧- دامان: داوێن.

سەعاتەن: دەستبەجێ، هەر لەو سەعاتەدا، کوتوپڕ، خێرا، گورج، دەمودەست.

عەقل: ژیری، هۆش.

ڕۆح: گیان، ڕەوان، جان.

دین: ئاین.

نەثار: پەخش، پەخشان وەک گوڵ بەسەر ئەوانە هەڵدەدەم باڵا گەردانی دەکەم.

ئەم تاکەش لە (جلی)دا ئەم جۆرەیە:

«اگر امجار بی دستم بدامان بکا کردی

سـعاتا عقـل روح دین دل بینه نثاریکە»

## ئەوا دیسان

١- ئەوا دیسان، دڵم ئاهاجی تیری دڵڕوبایەکە
ئەگەرچی ظاهیرا ماوم بەڵا هەر کەم بەقایەکە

٢- تەنی ئەنگاوتم و، دین و دڵی بردم، دەڵێ؛ ئێشتا
وەرە ئیمان بهێنە، چونکە عاشق بێ بەهایەکە

٣- بنازم (ئایەت)ی حوسنی بوو (حَقُّ الْيَقِينُ)ی من
بلێ: بۆ (مُطْمَئِنُّ قَلْب)م؛ کە (خالیق) خۆی خودایەکە

٤- بە ڕوو ڕۆژەی بەزولفی شەو، مەمی لام جوتێ لیمۆیە
زەقەن وەک سێوی لا سوورە، بەخوو هەردەم هەوایەکە

٥- بەقەد سەروە، بەعاریفی گوڵ، لەبی چون شەککەری میصرە
دەهانی غونچەیی باخە، بەچاو ئاهووی خەتایەکە

٦- موقابیل بەو (پەڕی ڕوخسار)ە عاشق زار و بیمارە
وەکو پەروانە وو بولبوول، بەشی؛ سۆز و هەواکە

٧- گوتم: با ماچی چاوت کەم، بە صندووقی سەری کاکت
گوتی: لا، لێم گەڕێ توخودا، چ بێ شەرم و حەیایەکە

٨- لە کن من هەر خەڵاتە زەجر و لۆمەی، هێندە پێی شادم
شەفای دەردی دڵی زارە، لە هەر جوینەی دەوایەکە

٩- بە کەیفی خۆیە، موختارە، هەچی دەیڵێ و بڵێ، ئیدی
کە ئەو سوڵتانی خووبانە و دڵی (کوردی) گەدایەکە

---

١- ئاهاج: نیشان، نیشانگە، شوێن تیر تێ گرتن، پێویست.
دڵڕوبا: دڵفڕێن، دڵبەر، دولبەر.
ظاهیرا: بەئاشکرا، بەسەر زانی، ئەوی دیار بێ و، ئەم وشەیەش لە (ظاهیرەن)ەوەیە.
بەڵا: بەڵام و (بەڵای دەرد و ناخۆشیشە).
بەقا: مانەوە، ژیان.

سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە (مس، ص، ر)یە و لە چاپکراویشدا تەنیا ڕۆژنامەی (عیراق)ی پاشکۆی کوردی، ژمارە ١٩ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٧٨) بەغدایە، کە مامۆستا (محەمەد عەلی قەرەداغی) لە ژێر ناوی (چەپکێک لە شیعری بڵاو نەکراوەی مستەفا بەگی «کوردی»)دا دوو پارچە هەڵبەستی تیا بڵاو کردووەتەوە و نیشانەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەویش لە (ر)ی وەرگرتووە لە لاپەڕە (١٨١)ی ئەو کەشکۆڵەوە.

لەم سەرچاوانەدا (مس)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم پارچە هەڵبەستە، هەرچەندە بەداخەوە بۆنەکەیم دەست نەکەوتووە.

آماجی (ر): اماج – ڕێنووسی کۆنە.

دڵڕوبایێکە (ر): دلربایکی.

بەڵا (ر، عیراق): اما (ئەما).

بەڵا هەر کەم بەقایێکە (ص): بلا هردم بلایکە.

ئەم پارچە هەڵبەستە بەتێکڕایی شێواوی و پاش و پێش و ناوەڕۆک گۆڕدراوی و جیاوازیی زۆر تێدا ،پەیا بووە، بەتایبەتی سەرچاوەکەیش یاریدەی وێکەوتنە نزیک یا (خودی) دەقەکەی وتنی (کوردی) نادات.

٢– تەن: لەش، قاڵب، جەستە.

ئەنگاوتم: پێکای.

دین: ئاین.

ئێشتا: هێشتا، یەشتا، هێشتە.

ئیمان: باوەڕی.

بەها: نرخ، ڕێز.

ئەم تاکەی سەرەوە لە (ر)دا یەکی شێواوە و بەم جۆرەیە:

«دلی بردم رُحي سوتوم تن کشتم دلی ایشتا

اتو ایمانت کوانی عجب یاران بلا یکە»

لە (عیراق)دا (مامۆستا قەرەداغی) گۆڕیویەتە سەر ڕێنووسی ئێستەکە بەم جۆرەیە:

«دڵی بردم، روحی سووتووم، تەنی کوشتم، دەڵێ ئێشتا:

ئەتۆ ئیمانت کوانی؟؟ عەجەب – یاران! – بەڵایێکە»

هەروەها ئەم پەراوێزەشی لەسەر نووسیوە: («سووتووم» ئەگەر «سووتم» بێ باشترە و لە پێش «عەجەب»ەوە «ئەی» یان شتێکی وای ببێت (کێش)ەکەی ڕەوان دەبێت).

لەگەڵ ئەمانەشدا، دەربڕینەکەی بەو جۆرە هێشتا ڕەوانییەکی وتەی (کوردی)ی نییە.

ئەنگاوتم (ن): پیکا = پێکا.

دین و دڵی بردم (ص): دل و جانش بردوم = (دڵ و جانیشی بردووم).

وەرە (ن، ص): اتو (ئەتۆ).

٣- بنازم: شانازی بکەم، ناز بکەم، بایی ببم، بەشی ئەوە و بڵێم، وەی لە خۆم ئەی خۆشی، خۆشی لە خۆم.

ئایەت: ناوی هەر یەکێ لە ڕستەکانی (قورئان)ی پیرۆزە، بەواتە:

(بەڵگە، خودی، پەڕتەوی، نیشانە... هتدیش) دێت.

حوسن: جوانی، شۆخی، دڵگیری.

حق الیقین: ڕاستییەکی شوێن بڕوای جێگیری گومان لێنەکراوە - دیاردیی چەند ئایەتێکی قورئانە، لەمەڕ بڕواکردن بەڕاستی باسی جەهەننەم، قورئان کە وتەی خوایە و ڕاستگۆییی پێغەمبەر و... هتد و گومان لێ نەکردنیان، وەک لە ئایەتی: ٩٥ (الواقعة) و ٥١ (الحاقة)... هتددا هاتووە.

(کوردی)ش دەڵێ: چۆن بڕوام بەم ئایەتانە هەیە ئاواش بڕوام ڕاستی بەڕاستیی جوانی خۆشەویستەکەم هەیە.

مطمئن قلب: (موطمەئین = دڵنیا) و (قەلب = دڵ) بەواتە: بەدڵ و دەروون نەک بەدەم دڵنیا بوون. ئەمیش نیشانەیە بۆ چەند ئایەتێکی تری سوورەتەکانی قورئان لەمەڕ ڕاستیی بەڵێنەکانی خوا و بوونی فرمانی خوا لەسەر سەرکەوتنی ئیسلامەکان لە جەنگی (بەدر)دا و گفتوگۆیەکی حەزرەتی ئیبراهیمی ئازەر لە بارەی ڕاستیی زیندووکردنەوەی مردووەوە کە خوا پێی فەرمووی: ئایا بڕوا ناکەی؟؟ وتی: بەڵێ، بەڵام دەمەوێ دڵیشم دابمرکێ (دڵنیا ببم) وە یا داواکردنی حەواریونەکان لە عیسا لە بابەت سفرەیەکی خواردنەوە لە خواوە و وتیان تاکو (دڵنیا) ببین وەک لە ئایەتەکانی: ٢٨ (الرعد) و ٢٦٠ (البقرة) و ١٢٦ (ال عمران) و ١٠ (الانفال) و ١١٣ (المائدة) و... هتددا هاتووە.

لێرەدا (کوردی) دوای بڕوایی هێنان بەجوانیی خۆشەویستەکەی، دەشیەوێت بیبینێ و، بەم شێوە لابەلاییە تێی دەگەیەنێ کە (کردگار) هەر خۆی خوایەکی تەنیا و تاکە ئیتر، ئایا تۆ بۆچی خۆتم نیشان نادەی تاکو دڵنیا ببم خۆ تۆ خوانیت؟؟ و بالای منیش جوان بی، تاکە جوان نیت و دڵنیا کە.

خالیق: کردگار، دروستکار - مەبەستی خوایە.

خودایەکە: خوا یەکە و دووان و پتر نییە و تاک و تەنیایە و بێ هاوبەشە.

بوو (حق الیقین)ی من (ر، ص، عیراق): کە بۆ (حق الیقین)ی من.

هەرچەندە (کە بۆ) کەی (ر، ص) بە (کبو) نووسراوە بە (کە بوو) دەخوێندرێتەوە.

بلێ (ر، ص): بلی - ڕێنووسی کۆنە.

بلێ (عێراق): بەڵێ - ڕاستە شێوە کۆنەکە (بلی) بە (بلێ) و (بەڵێ)ش دەخوێندرێتەوە، بەڵام (مس) کە لە هەموو سەرچاوەکان کۆنترە و نووسەرەکەی هاواڵ و هاوچەرخی (کوردی) بووە نووسیویە (بلی) واتە (بلێ) و، وشەکەی جێگیر کردووە.

خۆی (ر، عیراق): هەر.

هەر سەرچاوەی (مس) لە پاڵ (بلّیّ: «بو مطمئن قلب»ی)دا بەپەراوێز نووسیویە: (نسخە: بلا یو مطمئن قلبی) کە بەڕاستی ئەمەیان جێگیرترە و پڕ بەپرتری ئایەتەکانە بەڵام نووسیویە (نسخە) و، ئەگەر ئەو بەبنکە (اصل) بینووسیایە، شایانتر بوو کە وەرم بگرتایە.

٤- زەقەن: چەناگە.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا نییە و لەوانی تردا چوارەمینە و هێشتا چاپ نەکراوە.

بە ڕووی ڕۆژە بەزولفی شەو (ص): بە زلفی شو بە رو روژە.

٥- قەد: باڵا.

عاریض: ڕوومەت، ڕوخسار.

شەککەری میصر: جاران و ئێستەش وڵاتی میصر بەچاندنی قامیشی شەکر و شەکر لێ دەرهێنانی بەناوبانگە.

دەهان: دەم، زار، دەو، دەڤ، بەڵام مەبەستی لە (لێو)ی بچووکی وەکو خونچەیە.

ئاهووی خەتا: ئاسکی خەتا، جۆرە ئاسکێکی نایابی چاو زۆر جوانی بەناوبانگە و تەنانەت ئاسکی (خەتا) بۆنی (میسک)یشی لێ وەردەگیرێ کە لە شوێنی تردا لەمە دواوم.

ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا پێنجەمینە.

بەقەد سەروە (ر، عیراق): بەقەد سەروی - ئەمەش هەڵەیە و نابێ کە بەپێی دەستووری زمان و تەنانەت لەگەڵ ئەم تاکەشدا ناگونجێ چونکی دوای ئەو وتوویە: بەعاریفی گوڵە، کە (سەروی بەعاریفی) ناشێت.

ئەمە چ جای صیغەی هەموو هەڵبەستەکە، کە لەگەڵیا ناگونجێ.

چون (ر، عیراق): وەک - ئەمیش لە تاکی پێشوودا دووبارەیە.

دەهانی غونچەیی باغە (ر، عیراق): دەهان وەک غونچەیی باغە - دیسان ئەم (وەک)ە هەر لەم تاکەدا جارێکی تریش هاتووە و لە تاکی پێشووشدایە و نابێ.

٦- موقابیل: بەرامبەر.

پەروانە: پەپوولەیەکی بچووکە بەشەو لە دەوری چرا و ڕووناکی گرد دەبێتەوە، گوایە خۆشی دەوێ و لە خۆشەویستییا دەسووتێ، ئەوەندە خۆی بەگڕ و گەرمی ڕووناکییەکەدا دەدا.

بولبول: مەلێکە و گوایە عاشقی گوڵە و شەو تا بەیان بەدیار خونچەوەیە کە بپشکوێت و دڵۆپە شەونمەکەی ناوی هەڵمژێ لە کەشەنگی و چارە ڕەشیدا بەرەبەیان خەوی لێ ئەکەوێ، کاتێ چاو ئەکاتەوە خونچەکە پشکوتووە و ئیتر تا ئێوارە بەسەر گوڵدا بەهەوای خۆش (نەغمەی خۆش) دەخوێنێ، واتە گۆرانی دەڵێ. (کوردی)یش عاشقی کردووەتە پەروانە و بولبول کە بەشیان سۆز (سووتان) و ئاواز (هەوا)کەیە.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا نییە و لەوانی تردا شەشەمینە هێشتا چاپ نەکراوە.

ڕوخسارە (ص): ئەندامە - ئەمیش جوانە و ئەگەر لە زۆربەی سەرچاوەکاندا بووبووایە دەمانکردە بنکە.

٧- صندوقی سەر: مەبەست لەو چاکەیەیە کە مرۆڤ لە ژیاندا دەیکات و کە مرد ئەو چاکەیە لە گۆڕەکەیدا وەک (صندوقی بن سەر)ی وایە بەرگری خۆی پێ دەکا لە لای خوا لە کاتی لێپرسینەوەدا و دیارە (کاک)ی ئەو جوانە مردووە کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی لەسەر داناوە.

شەرم و حەیا: ئابڕوو.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا چوارەمینە و لەوانی تردا حەوتەمینە.

گوتم (ص): وتم.

گوتی (ص): وتی.

ماچی (ر، ص): قاچ.

چاوت (ص): لێوت.

صندووقی (ر، ص): صندوق - کە بەواتە (مارەیی) بەڵام مارەیی بۆ (سەر) نییە، بۆیە نابێ.

لا (ر، ص): ای (ئای) و ڕێنووسە کۆنەکە، بە(ئەی)یش دەخوێندرێتەوە.

٨- خەڵات: بەخشیش و دیاری.

زەجر: سەرزەنش، هەڕەشە.

لۆمە: توانج.

شفا: چاکبوونەوە، ڕسگاربوون لە نەخۆشی.

دەوا: دەرمان.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا نییە و لەوانی تردا هەشتەمینە هێشتە چاپ نەکراوە.

شفای دەردی دڵی زارە (ص) لە بۆ دەردم شفایەکە - ئەمیش جوان و جیناس ئارایی ترە، بەڵام لە (مس) و سەرچاوەی تردا نەهاتووە، بۆیە نەمکرد بەبنکە.

٩- کەیف: ئارەزوو.

موختار: سەربەخۆیە هەڵبژێردە، کار بەدەست خۆیەتی. سەرپشک.

ئیدی: ئیتر، چونکە دوور نییە ئەم وشەیە ئەوسایە لە (سولەیمانی)دا بەکار هاتبێ وەک ئێستەی ناوچەی هەولێر.

سوڵتان گەورەی وڵات و ناوی سەرۆکەکانی عوسمانی و زۆر لە وڵاتان بووە و تا ئێستەش پەیڕەوی دەکرێ - سەرۆکی(هەولێر) (سوڵتان موزەفەر) بووە.

خووبان: جوانان.

گەدا: سواڵکەر، هەژار، مسکێن، چاو لە دەستی دەستداران.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا شەشەمینە و لەوانی تردا نۆیەمین و لە هەمووانیشدا دوا تاکە.

خۆیە موختارە (ر، عیراق): خۆتە موختاری - ئەمیش لەگەڵ صیغەی هەڵبەستەکە نابێ.

دەیلێ و بلێ ئیدی (عیراق): دەیلێی بلێ و مەیدە. ئەمەش هەڵەیە و واتا نادا.

دەیلێ و بلێ ئیدی (ر): دیلی بلی و دمیدآ. ئەمیش شێواوە.

بەکەیفی (ر، ص): بکیف.

## توخوا ڕاستی بڵێ

١- توخـــوا؛ ڕاســـتی بڵێ! دڵبـــەر درەنگە
ئەوە مـــوژگـــانە قـــوربان یا خـــەدەنگە؟؟
٢- مـــەگـەر خـــالیق بەکـــەیفی خـۆتی کـردی
کــە عـــالـەم بۆت بـووە، بەشــێت و بەنگە
٣- لە حـــەسرەت ڕووی مـوویی کـرژ و بڵاوت
دڵم دایم مـــیـــثـــالی غـــونچـــە تەنگە
٤- ئەوەندە تیـری عـەشـقت دا لە جـەرگم
کـە قـافـیـەی شـیـعـرەکـانم بۆیە لەنگە
٥- لە حـــەسـرەت چاوەکـــانت گـێـژ و وێژم
کـەچی خـەڵقی دەڵێن پێم مـەستی بەنگە
٦- وتم، قـــوربان لەگـــەڵ دۆســـتی قـــەدیمت
بکە صوڵحێ، ووتـی، خێر، وەختی جەنگە
٧- وتم، قـــوربان چیـــیـــە مـــایل بەجـــەنگی،
وتی مـــاددەی (سـیـاوەش) و (پەشـــەنگ)ە
٨- وتم، قـــوربـان بکە ڕەحـــمێ بەحـــاڵم،
وتی، چ بکەم دڵی من مـــیـــثلی ســـەنگە
٩- ڕەفـیق ئامـان، عـیـلاجێ دەردی (کوردی)
کە هیچ ڕەحمی نییە ئەو شۆخ و شـەنگە

---

١- موژگان: برژانگ.
خەدەنگ: تیر.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە تەنیا گۆڤاری (بەیان) ژمـارە/٧٢ حوزەیران و تەمموزی ساڵی ١٩٨١ - بەغدایە، کە (مـامـۆسـتـا عـوسـمـان هـەورامی) لە ژێر ناوی (دوو کـۆرپـەی هەناوی

«کـوردی»)دا وتارێک و دوو پارچە هەڵبـەسـتـی تیـا بڵاوکـردووەتەوە، ئەم هەڵبـەسـتـانـەی لە کـەشکۆڵێکی دێرینەی (عـەفـان نەقـشـبـەندی) وەرگـرتووە، دیاریی نەکـردووە کـەی و کـوێی نووسراوەتەوە.

لەبەر نـەبوونی سـەرچاوەی تری ئەم هەڵبـەسـتـە بەراوردم بۆ نـەکـرا، بۆیە وەک خـۆی لێـرەدا نووسـیـمـەوە لەگەڵ لێکدانەوە و بیروڕامـدا بەپێی پێویسـتی لەسـەر هەر تاکێکی و سـوپاس بۆ (مامۆستا هەورامی) کە ئەم پارچە هەڵبەستەی دەست خستم.

نیـو بـاڵی یەکەمی ئەم تـاکە قـورسـە لـە (کێش)دا و، ئەگـەر (توخـوا)کەی گـورج دەرنەبڕدرێت. هـەرچەنـد (کـوردی) و هۆنەرانی بـەر لەم چەرخـەمـان بـە(خـودا)یان وتوە و نووسـیـوە مـەگـەر بەدانسقە. (بەخوا)یان وتبێ یا نووسیبێ.

٢- خالیق: کردگار - مەبەستی لە خوایە.

کەیف: ئارەزوو.

ئەم تاکە نیشانەیە بۆ هەڵبەستێکی کۆنی (عارەبی) کە لەسەر پێغەمبەری ئیسلامدا هەڵدراوە:

«خُلِقْتَ مبرئاً من كلِّ عيب  كأنَّكَ خُلِقْتَ كَما تَشاءُ»

منیش بەم جۆرە گۆڕیومەتە سەر کوردی:

«بێ هـەر عەیبێک دروست کرای  هەروەک خۆت ویستبێتت وەهـای»

بۆت بـووە بەشـێـت و بەنگە: ئەشێ (بـۆت بووە شـێـت و دەبەنگە) بووبێ هـەرچەندە لاوازیـشـی تیـایە و چووە ئـەبینرێ وتنـەکـانی (عـەلی بەردەشـانی) و هـاوچەشـنـەکـانیـیـەوە، بەڵام مـۆرکی (کوردی) بەتێکڕای لەم پارچە هەڵبەستـەوە هەیە و دەماودەمی و نووسینەوەی و خـەتی ناخۆش و... هتد شێواویی بەسەرا هێناوە.

٣- حەسرەت: خەفەت، خەم، دڵتەنگی.

میثالی: هـەروەکو، بەوێنەی.

ڕوویی مـوویی گـرژ و بڵاوت: ئـەشێ (ڕوو و مـووی) بێ، کـە کـرژییـەکە بـۆ ڕوو، بڵاوییـەکـە بۆ مووەکە بێ و ڕووی موویی نابێ، ڕووی موو چی نییە و بێ واتایە.

٤- قافیە: پاشبەند، سەروا، دوا وشە تاکە هەڵبەست.

بۆیە: زۆر پڕ بەپڕ نییە و (ئێستە، واکە) و شتێکی لەم جۆرە هەڵدەگرێ.

٥- حەسرەت: وشەیەکی دووبارەی تاکی سێیەمە و ئەشێ وشەیەکی کە بووبێ.

مەستی: سەرخۆشی.

بەنگ: بەنج، حـەشـیـشـە - بەرە گیـایەکی سـەرخـۆشکارە و دیارە (بەنگ)ەکـەی تاکی پێـشـوو (دەبەنگ: کـەودەن، حۆلی، حـەپۆلە، بـێ مێـشک دێوانە...)یە چونکە دووبارە دەبێـتـەوە ئەمـیش ناگونجێ.

٦- قەدیم: کۆن، دێرین.

صولح: ئاشتی، ڕێک کەوتن.

خێر: نەء، نا.

بەم تێبینی و بەراوردانەمدا دەردەکەوێ کە ئەم هەڵبەستە زۆری گۆڕان بەسەردا هاتووە کە لە زۆر جێگەدا لاواز و بێ هێزی کردووە و هاکا لە وتەی (کوردی) دوور خستبێتەوە و گەلێ وشەی (نوێی)یە وەک (ووتی... هتد کە جاران (گوتی) بووە...).

٧- مایل: سەر بە، ئارەزوو.

ماددەی: خاڵانەی، هەروەک ئەوی، مەسەلەکەی.

سیاوەش و پەشەنگ: جارێ ئەم (سیاوەش)ە ئەگەر بەشێوەی (سیا وەحش) یا (سیا وەخش) نەبێ، تاکەکە لەنگ دەکا. (پەشەنگ) بەرەی تۆرانی (تورک) بووە و سیا وەخشی ئێرانیی کوشتووە لە جەنگێکی کۆندا و هەرایەکی درێژی لەسەر بەرپا بووە و ئێستەش لە کوردەواریدا باوە دەڵێن: (ئەڵێی خوێنی سیا وەحشە، هەر نابڕێتەوە).

٨- ڕەحم: بەزەیی، دڵسۆزی، چاودێری.

حاڵ: یار، چۆنێتی.

میثلی: وەک، هەروەکو، بەچەشنی.

سەنگ: بەرد.

٩- ڕەفیق: ئەی هاواڵ، ئەی هاودەم، ئەی دۆست.

ئامان: ئەی هاوار، هانا بۆ بردنە.

عیلاج: چارە.

دوا وتە:

ئاواتەخوازم کە لە سەرچاوەی تریشدا ڕوونووسی تری ئەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوە سەر هەڵبدات، تاکو دەقێکی نزیکترین لە وتنەکەی (کوردی)ی لێوە بێتە ئاراوە.

٧٨

## صەیدی دڵ بووم

١- صەیدی دڵ بووم و، ئەتۆ گرتمت، ئاریّ مەسەلە
حَلَّتِ الْصّدَ لمن یَقْبَضُهُ، لا مَنْ قَتَلَ

٢- یار وەک، مەردومەکی دیدەیە، ئاخ حەیفە ڕەقیب
لەسەر ئەم مەردومەکی دیدەیە، هەروەک سەبەلە

٣- صۆفی بیستوومە عەمامەت لە بەهای مەی دەگرن
قوڕ بەسەر، فرصەتە بیگۆڕەوە (نِعْمَ البَدَل)ە

٤- باخی عەشق ئەرچی لە دوور خۆشە لە بۆ عاشقی زار
بێخی عیجز و چڵی بەدبەختی و خونچەی ئەجەلە.

٥- سەد جەهەننەم لە حەشردا کەمە بۆ گیانی ڕەقیب
گەر بڵێن ئەجری گونەه کرد بەقەدری عەمەلە

٦- ناز و، بێ ڕەحمی و، حیلە و دەغەڵی و، ئاه و فیغان
بۆ من و، یار و ڕەقیب؛ قیسمەتی ڕۆژی ئەزەلە.

٧- (موشتەری) دیدەیە ئەو(ماه) دەسەی (زوهرە) جەبین
بەختی (مەریخ)ە ڕوخی (ڕۆژ)ە، صیفەت وەک (زوحەل)ە

٨- هێندە بەدبەختە لەگەڵ (دەردەکەوم) صەبر، دەڵێ:
ئۆف خودا، نامریّ، لە کۆڵم بکەوێ، ئەم چەپەڵە.

٩- ئەی ڕەقیب!! بەس بڵێ یار خۆشی دەوێی من (کوردی)م
کۆنە ڕەندم، بەخودا بەم قسە؛ ناکەومە مەلە.

---

١- صەید (الصید): نێچیر.
ئاریّ: بەڵێ، ئا ئا، ڕاستە، وایە.
مەسەلە: خاڵانەیە، گێڕدراوەتەوە، وتراوە، سەرکوڕەشتەیە، پەندی پێشینانە.
حلت: حەڵاڵ بوو، موفت بوو.

لمن: بۆ ئەوەی، بۆ ئەوی.
یقبضە: دەیگرێتەوە، نێچیرەکە بۆ خۆی دەگرێتەوە.
لا من: نەک ئەویی، نەوەک بۆ ئەو کەسەی.
قتل: کوشتی.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە زۆر کەمە و لە دەسنووسدا سێیانە، ئەوانیش (گل/٩، ف، نم/١)ن و لە چاپیشدا هەر چوار دیوانە چاپکراوەکەیەتی کە (گ/٢، س، گ/٣، کم)ن و لە نێوانیاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی
ئەم ڕواڵەتی سەرچاوەکەیی ئەم هەڵبەستە کە مۆرک و سۆز و ساز و چێژ و بۆن و ڕەنگی هەڵبەستی (کوردیی) پێوەیە، ئەوە دەردەکەوێ لەوانە بێ کە ئەم هەڵبەستەی دوا دوای ژیانی بی بۆیە کەمتر بڵاوبووەتەوە و هەر لەبەرئەوەشە کە (بۆنە)ی وتنەکەیم دەست نەکەوتووە.
گرتمت (گ/٢، س، گ/٣)دا: کوژتمت – ئەمەش واتای هەڵبەستەکە ئاوەژوو دەکاتەوە و دەبێتە ئەوەی (کە ئەی یاری من هی تۆ نیم) ئەمەش نابێ.
لە سەرچاوەکاندا (گ/٢، گ/٣) نیشانەی بزوێن = (سەر و بۆر) = (حرکات)یان بۆ ئەم نیو تاکە عارەبییە نەکردووە.
الصَّدَ (کم): الصَّد – ئەمیش هەڵەیە.
يَقْبَضَهُ (کم): يَقْبَضْ، هەڵەیە و لەنگیشە.
يَقْبَضْهُ (نم/١): یقبضُ – هەڵەیە و لەنگیشە و لە (س)دایە و بەبێ سەر و بۆرە.
لا مَنْ (س): لا مِنْ.
قتل (س): قتلْه.
٢– مەردومەک: مەردوم، بیلبیلەی یا گلێنەی چاو.
دیدە: چاو.
حەیفە: موخابینە.
ڕەقیب: ناکەس، دژ، ناحەز، بەدکار، نەیار، خراپکار، بەدی نێوان دوو کەس.
سەبەل: نەخۆشییەکە تووشی چاو و پێڵووەکانی دەبێ.
لەسەر (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): لەبەر – ئەمەش هەڵەیە، چونکە نەخۆشی سەبەلەکە لەسەر (چاو)ەکەیە نەک لەبەریدا.
ئاخ حەیفە (گ/٢، س، گ/٣): سەد حەیف. من بەگۆڕانی مامۆستا گیوی دەزانم.
٣– صۆفی: مەبەستی لە صۆفیە درۆزنەکانە کە خۆیان بەصۆفی دەنوێنن.
عەمامە: سەروپێچ، سەرپێچ، مێزەر.
بەها: نرخ.
مەی: بادە، خواردنەوەی سەرخۆشکار.

دەگرن: وەردەگرن و ئەشێ (دەكڕن)یش بێت.

قوڕ بەسەر: ئەی كۆست كەوتە لەبەر ئەم بێ ئاگاییەت.

فرصەت: هەل، دەرفەت.

بیگۆڕەوە: ئاڵوگۆڕی بكە لەگەڵ (مەی)دا.

نعم البدل: چاكترین بریتی، باشترین گۆڕینەوە.

دەگرن (نم/١): اگرن (ئەگرن).

دەگرن (گ/٢، گ/٣): دەكڕن – ئەمیش دەگونجێ دەگەرچی كارەكە گۆڕینەوەكارییە نەک كڕین و فرۆشتن.

بیگۆڕەوە (گ/٢، س): بیگۆورەوە – دیارە هەڵەی چاپییە.

اَلبَدَلَهْ (كم): البَدْلَه = هەڵەیە و ئەوانی تر سەروبۆریان بۆ نەكردووە.

٤– ئەر: ئەگەر.

عاشقی زار: عاشقی زەبوون، عاشقی بەدبەخت، بەزاری و پەرێشان.

بێخ: ڕەگوڕیشە، بێخ، هەرچەندە واتەی بناخە و بنچینەش دەدا لە شوێنی تردا.

عیجز: ناتوانایی، پێ هەڵنەسان، لەبارانەبوویی.

چڵ: لق، لق و پۆپ، پەلووپۆ.

بەدبەختی: چارەڕەشی، بەخت بەدی.

خونچە: گوڵی نەپشكوتوو، بەڵام مەبەستی ئەوەیە لە كاتی گەشانەوەی گوڵی هیوایدا مردن (ئەجەل) لێی تێک دەدا. چونكە خونچەی ئەو گوڵە خۆی ئەجەلەكەیە.

ئەجەل: هەڕەتی مردن.

عەشق (گ/٢، س، گ/٣): عیشق، ئەمەش جۆرە دەسكارییەكی نابابەتیانەیە و كورد دەڵێ: (عەشق).

چڵی (گ/٢، س): جلی – ئەمیش نابێ، چونكە باسی باخە نەک بەرگ و پۆشاک.

٥– جەهەننەم: دۆزەخ.

حەشر: ڕۆژی لێپرسینەوەی دوایی (قیامەت).

گەر: ئەگەر – ئەم (ئەگەر) لێ كردنەی (كوردی) لەم بیرەدا؛ لێكۆڵینەوەیەكی فەلسەفیی درێژ لە بارەی بیروڕای ئەم هۆنەرەمانەوە هەڵدەگرێ.

ئەجر: پاداش، مز، كرێ، بریتی، نرخی، تۆڵە.

گونەه كردە: گوناهكار.

بەقەدری: ئەوەندەی، باتەقای.

عەمەل: كردەوە، كار.

كەمە (گ/٢، س، گ/٣): بەسە – ئەمیش ئەوەندەی (كەمە)كە بەهێز نییە و گۆڕینی مامۆستا

گیوە.
گونەھ کردە (گ/٢، س): گوناھ گەردە – ئەمەش ھەڵەیە.
گونەھ کردە (گ/٣): گوناھ کەردە.
قەدری (نم/١، کم): قدّ. یا (قد).
٦– ناز: نازونووز، عیشوە، شانازی، لەیارەوە.
ڕەحم: بەزەیی، چاوێری، دڵسۆزی لە یاوە.
حیلە: فێڵ، ساختە، فرتوفێڵ، کەڵەک... لە (ڕەقیب)ەوە.
دەغەڵی: ناڕاستی و لادان بەلای خراپیدا، شێواوی لە ڕەوشتدا. لە (ڕەقیب)ەوە.
ئاھ: ھەناسەی ساردی کەساسی و پەرێشانی، لە (کوردی) خۆیەوە.
فیغان یا فوغان: ھاوار و گریان و زاری – لە (کوردی) خۆیەوە.
یار: خۆشەویستەکەی (کوردی)، (یار).
ڕەقیب: ئەوی بەدی لە نێوان ئەو و، خۆشەویستەکەیدا دەکا.
قیسمەت: بەش – ئەم ناوی (قیسمەت) بردنەش لە بڕوا کردنی (کوردی)یەوەیە – لێرەدا – کە خوا ھەموو شتێکی بڕیار داوە و ئەویی ڕوویداوە و ڕوو دەدا، لەوەوەیە: (قەدرییەکان).
ئەزەل: ھەرە سەرەتا ڕۆژی یەکەم، ئەمیش وشەیەکی فەلسەفییە.
ئەم تاکە جوانییەکی وێژەییی تیایە، بەوەی کە بەپێی وێژەی کۆن بە(لەف و نەشری مشەوەش) دادەنرێ کە (ناز و بێ ڕەحمیەکە)ی نیو باڵی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ (یار)ەکەی. نیو باڵی دووەم و، (حیلە و دەغەڵی)یەکەش بەندە بە(ڕەقیب)ەوە و (ئاھ و فیغان)ەکەش بۆ من = (کوردی)یە. ئەمەش بەوەستایی دانراوە.
ناز و (گ/٢، س، گ/٣): نازی – ئەمەش ھەڵەیە و چونکە (ناز) ھی (بێ ڕەحمی) نییە، بەشکو (ناز و بێ ڕەحمی) ھی یارەکەن.
حیلە و (گ/٢، س، گ/٣): حیلەی – ئەمیش دیسان ھەڵەیە، چونکە (حیلە)کە ھی (دەغەڵی) نییە، بەشکو ھەردووکیان ھی (ڕەقیب)ن.
ئاھ و (کم): آە.
٧– موشتەری: ناوی یەکێکە لە ئەستێرەکانی کۆمەڵەی ڕۆژی (المجموعة الشمسية) و بەئەستێرەیەکی سارد زانراوە و چەند ئەستێرەیەکی تریش بەدەوریەوەن و بەدەوریا دەسووڕێنەوە و مەبەستی لەوەیە چاوی وەک ئەستێرەی (موشتەری) بووە.
(کوردی) ئەم (ساردی)یەی کردووەتە نیشانە بۆ ڕەنگی شینی چاوی خۆشەویستەکەی، چونکی ڕەنگی شین ساردی و ھێیەک دەدات. ھەروەھا ئەستێرەکانی دەوری ئەم ئەستێرەیەشی وەک برژانگەکانی ئەو چاوانەی داناوە کە بەدەوریەوەن. وشەی (موشتەری) لە ڕووی زمانییەوە بەواتە (کڕیار) و (کوردی) ئەو دوو ناوی لێک جیایەی، وەک سەر لێ تێکدانێک

بەکارهێناوە کە لە وێژەی کۆندا جوانی و باو بووە.
دیدە: چاو.
ماه: مانگ – ئەمیش یەکێکە لە پارچە گەورەکانی ناو بۆشایی ئاسمان و ئەستێرەیەکە بەدەوری (خۆی) و (زەوی)دا دەسووڕێتەوە و(ڕووناکی)یەکەی لە تیشکدانەوەی ڕووناکیی ڕۆژەوەیە، بۆیە جوانییەکی ڕووناک و پاک و بێگەردی چاو ئازار نەدەری هەیە.
ئەم (مانگ) بە(دەست) دانانەی (کوردی) نیشانەیە، بۆ تێگیرانەکەی حەزرەتی مووسا و (فیرعەون) کە داوای (موعجیزە)ی لە (مووسا) کرد و ئەویش داردەستەکەی فڕێ دا و بووە هەژدیهایەک و، کە (دەستی) لە بەرکی دەرهێنا تەماشاکەران ڕوانییان ئەو دەستەی یەکجار سپی و پەڕتەوداره و جادووکارەکانی (فیرعەون) ئەوەیان پێ نەکرا، چونکی ئەوان کە گاڵۆک و پەتکەکانی خۆیان کرد بەمار، هەژدیهای داردەستەکەی (مووسا) هەموو ئەو مارانەی هەڵلووشی و... هتد. وەک لە ئایەتی: ١٠٨ (الاعراف) و: ٣٣ (الشعراء)ی قورئانی پیرۆزدا هاتووە.
(کوردی)یش دەستی خۆشەویستەکەی چواندووە بەدەستە سپی و جوانەکەی (حەزرەتی مووسا) بەنیشانەی سپییەتی و پیرۆزیی. ئەمە ئەگەر (ماه دەست) بێ بەڵام من بە (ماه وەش) واتە (ڕوو وەک مانگ)ی دەزانم و لام وایە، هەڵەی نووسین بێ و سەرچاوەم بۆ ئەمە نییە بۆیە نەمگۆڕی.
زوهرە: ئەستێرەیەکی بچووکە لە نێوان (کۆمەڵەی ڕۆژی)دا کە بەدەوری ڕۆژدا دەسووڕێتەوە و خۆی ئەستێرەی تری بەدەورا نین، بەڵام یەکجار پڕتەودار و ڕووناکە بەتایبەتی لە بەرەبەیاندا. لە لایەن زۆربەی گەلانەوە بە (خوای جوانی) دانراوە، واتە (ڤینۆس)، لای عەرەبەکانیش خوای (العُزّی) بووە.
(کوردی) کە ئەم ئەستێرەیەی داناوە بە(ناوچەوان)ی خۆشەویستەکەی لەبەر جوانی و پەڕتەودەری و بێگەردییەکەیەتی بەتایبەتی لە بەرەبەیاندا کەوا تاریکاییی جیهان وەک زولفەکەی بەدەوریا پەخشە و نەبوونی ئەستێرەش بەدەوری ئەم (زوهرە)یەدا نیشانەی بێ خاڵیی ناوچەوانی خۆشەویستەکەیەتی.
جەبین: ناوچەوان، ئەنی، تەوێڵ، پێشانییە.
بەخت: چارە، (طالیع).
مەریخ: ئەمیش ئەستێرەیەکی بچووکی (کۆمەڵەی ڕۆژی)یە و لە هەمووان نزیکترە بەڕۆژ، دوو ئەستێرەی تریشی بەدەوردا دەسووڕێنەوە.
(کوردی) ئەم نزیکییەی (مەریخ) لە ڕۆژە و کە سەرچاوەی ڕووناکییەو، بوونی دوو ئەستێرەی تر بەدەوریدا بەوەی داناوە کە ئاوا بەختی ڕووناکە لەگەڵ بوونی (جوانی) و (دارایی)دا کە لە جێگەی ئەو دوو ئەستێرەیەی دەورین یا نیشانەیە بۆ دەستوپێوەند و هەوادارانی هەروەک

یەکجار ڕووناکییەشی بەبەختەوەر و ڕەنگینی خۆشەویستەکەی داناوە.
ڕوخ: ڕوو، ڕوخســـار و لە یاری (شــەترەنج)دا ڕوخ (قــەڵایە) گـوایـە ڕەنگ و ڕووی وەک ڕۆژ و قەڵایەکی ئاوا ئاشکرا و ڕووناکە (ڕوخ = دەستەجڵەو).
ڕۆژ: ئەمـیش یەکێکە لە ئەسـتێـرە گەورەکانی ناو ئاسـمـان و کـرۆک (مـەرکـەز)ی (کـۆمـەڵەی ڕۆژی)یە بەپێی خـڕیی زەویی، ئێـمـە و ئەو تیـشکە زۆر و بەتینەی لە ڕۆژەوە بڵاو دەبێـتـەوە، یەکێکە لە هۆیەکانی ژیان و ڕواڵەتی زیندەوەری لەسەر زەوی و بەبێ ئەو ژیان نابێ.
(کـوردی) کە ڕووی خـۆشـەویسـتـەکـەی بەڕووی ڕۆژ و، تیـشکە جـوان و ڕووناکـەکـەی داناوە، بەنیشانەی ئەوەیە کە ژیانی بەبێ ئەو ناگونجێ و مایەی زیندەوەرییـەتییـە و ئەو دەستەجڵەوی ڕۆژە.
صیفەت: ڕەوشت، سروشت، خوو و ڕواڵەتی کەسێتی.
زوحەل: کەیوان، ئەمیش ئەستێرەیەکی تری (کۆمەڵەی ڕۆژی)یە و نۆ ئەستێرەی تری سەر بەو هەن کـە بەدەوریدا لە چەند جـغـزێکی زۆر گـەورەدا دەسـووڕێنەوە بەڵام سـووڕانـەوەی خـۆی سستـە و بەنزیکەی (٢٩ ساڵ و نیو) یەک جار بەدەوری ڕۆژدا دەسووڕێتەوە. لە ڕواڵەتەکانی ئەم ئەسـتـێرە پیرۆزە، ئەوەیـە کـە ناوچەیەکی یەکـجـار پەڕتەودەری ڕووناکی بـەرین و فـراوانی بەدەور دایە و بەزۆر بەرز و گەلێ دوور ناو دەبرێ.
(کوردی) ئەم ڕواڵەتانەی ئەم ئەستێرە گەورەیەی لە ڕەوشت و خووی خـۆشەویستەکەیدا دیوە کە وەک ئەو نۆ ئەسـتـێرەیەی بەدەوریدان، ئاوا (دڵداران)ی بەدوەوەن و خـاڵ بەدەورییـەوەی ئەو ڕووەی دابێ و دڵداران شـیـفـتـەی ئەون و ئەویش لـەوان زۆر لە بەرزیـتـر و لێـوەیـان دوورترە بەسـستـیـیـەوە لەگەڵیـاندا دەجوولێـتـەوە و گـەرمـوگـوڕییـەکی بەرامـبـەر بـەوان نییـە و خـاوە لەگەڵیاندا.
کە ئەمـانەمـان زانی وەک جـاری تریش لـەم پەڕاوییـەدا نیشـانەم بۆ کـردووە، کـە (کـوردی) زۆر بەوردی و قووڵی ئاگەداری زانستی (ئەستێرەشـوناسی) و ڕواڵەتی ئەستێرەکان و... هتد بووە کە ئـەم بارەیەی ژیانی لێکۆڵینەوەی تایبـەت هەڵدەگرێ هـەروەک زۆر لە هۆنەرە کۆنەکانیشـمان لەم لایەنەوە زانـا بوون. ئەمــە لـە ڕووی (گــەردوونناسـی)یەوە، بـەڵام لە بـارەی وێژەییـیـــەوە گردکردنەوەی ناوی ئەم هەموو ئەستێرانە جوانی و پەسەندیی تیایە:
دیدەیە (ف): دیدەی.
دیدەیە (گ/٢، س، گ/٣): دیدەیی.
ماه دەسەی (ف): ماه رخەی. ئەمەش ڕایەکەی من بەهێز دەکا کە (ماه وەش).
ماه دەسەی (نم/١): ماه رخە - پشتگیریی ڕایەکەمە کە (ماه وەش)ە.
ماه دەسەی (گ/٢، س، گ/٣): ماهرووەو.
ماه دەسەی (کم): ماه روخە.

ئەم (مـاھ) دەسـەم لە (گل/٩) وەرگـرتک چونکە هـەر لەم تاکـەدا (ڕوخی ڕۆژە) و (مـاھ روخـە) نابـی دووجـار دووبـارە بێـتـەوە و لە وێژەی کـۆندا، نەنگی بووە و لـە یەکـێکی وەک (کـوردی) نەوەشاوەتەوە بۆیە پەیڕەویم کرد واتە هـی (گل/٩).

کـە (ڕوو) دووجـار دووبارە بکاتەوە، بەداخـەوە سـەرچاوەم نیـیـە کـە (مـاھ وەش)ی تیـا بێ لە جێگەی (ماھ دەست) کە زۆر گونجاو نییە ئەگەرچی لێکیشم داوەتەوە.

زوهرە (نم/١): زهر.

بەختی مەریخە ڕوخی (ف): بخت مریخْ جفتُ.

ڕۆژە، صیفەت وەک زوحەلە (ف): رۆژ وکو روی زحلە. - ئەمیش شێواوییە لە (ف)دا.

٨- بەدبەخت: بەخت خـراپ، چارەڕەش - بەڵام لێـرەدا مـەبەست لـە زۆرداری و سـتـەمکاری و بێ بەزەیی نییە.

صەبر: لەسەرخۆ - ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سستی و خاوییەکەی وەک لە دوایی تاکی پێشوودا لێکم داوەتەوە.

لە کۆڵم بکەوێ: گوایە وەک بارێکی گرانە بەکۆڵییەوە و ئاواتەخوازی ئەوەیە ئەو بارەی لە کۆڵدا بکەوێ.

چەپەڵ: پیس.

دەردەکەوم (ف): دردکوم - ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

صەبر (ف، نم/١، کم، گ/٢، س): پیشم (پێشم).

دەڵێ (نم/١، کم، گ/٢، س): ئەڵێ.

ئۆف (گ/٢، س، گ/٣): ئەی - بەدەسکاریی مامۆستا گیوی دەزانم.

خودا (نم/١): خوا.

لە کۆڵم (گ/٢، س، گ/٣): لە کۆڵمان. هەر بەدەسکاریی دەزانم.

چەپەڵە (گ/٢، س، گ/٣): چەپەڵە - ئـەشێ ئەم (ل = لام)ی چەپەڵە، ئەوسـایە قـەڵەو نەبووبێ و ئەگەر نا (ئیقوا) لە پاشبەندەکەدایە.

٩- کۆنە ڕەند: کۆنە ئەرباب و جوامێر و قسە خۆش. واتە تێ دەگەم.

دەوێی (نم/١): اویی.

بەخودا (نم/١): بەخوا.

بەم قسە (نم/١، کم): ئەقسە - دیارە هەڵەی چاپییە.

بەم قسە (گ/٢، س، گ/٣): بەو قسە - ئەمیش دەسکارییەکی هەڵەیە.

## لـه نووری لامیعـی

١- له نووری لامــیــعی تشــتــێکی ڕاگــرت و، وتـی: ڕوومــه
بەدۆشــا ئـەژدەهای پڕ ئـێــشی ڕاکــێــشــا وتی: مــوومــه
٢- کــه بـازی چاوی بـەردایـه دڵم، پێم وت: ئـەمــان ڕەحــمێ
وتی: وا دیاره زۆر گـەوجی دڵت ئەمــڕۆکــه جــەلغــوومــه
٣- تکام کـرد قـەتڵی من ناحـەق نـەکا سـوننەت، وتی: فـەرضـه
وتم: بۆ ئاگــرت بـەردایه عــومــری من؟ وتی: خــوومــه
٤- وتم: تـەنهــا منم پابەندی عــەشــقی تۆم وتی: گــوم بـه
سەدی وەک تۆ له هەرسوو، بەستەیی زنجیری گێسوومه
٥- وتم: تـاکــەی لـەدەردابم؛ وتی: هـێــشــتــاکــو ئـەووەڵتــه
وتم: سـووچم ئەبێ چی بێ؟؟ ووتی: عـاشق کـه مـەظلوومـه
٦- وتم با بـەس له خــوانی وەصـلی تۆ نەومــیـد بێ بەش بم
وتی: مــردووت مـرێ؛ عـاشق بەدائیم زار و مــەحــرووومـه
٧- وتم زارم له خــەم ڕوانیی، وتی: (قــانوون) مــەشــێــوێنه
غـەمی زۆر حــاڵی زار، وەک لازم و، عـاشـق کـەمـەلزوومـه
٨- بەجـان و دڵ، وتم: نـازت ئەکــێـشـم، تووڕە بـوو: بەســیـه
قـسـەی نوێ بێـته ئەم قـەوله قـەدیم و شـەرحـی مەعلوومـه
٩- وتم: ڕەســــمــی وەفــــاداری بـەجـێ بێنـه، وتـی: نـابێ
وەفـا بۆ دولبـەران، هەی بێ خـەبەر یەکبـاره مـەعـدوومـه
١٠- وتم: ڕاوی دڵت کــــردم، وتـی: کــــۆڵی شکارت بووی
وتم: چاره؟ وتـی: عـاشق وەهایـه، صــەیدی مـەشـئـوومـه
١١- وتم: زەخـمی دڵم؛ بەس کـارییـه. تـوند بووه؛ وتـی: لاچۆ
بەمن چی؟ تیــره بارانی نیگاهـی چاوی جــادوومــه

١٢- وتم: گـەردن کـەچی عـەشـقت منم قـوربان. وتـی: شـێـتـی
هـەزارێکـی وەکـو تۆ کـوشـتـەیی شـمـشـێـری ئەبروومـە.
١٣- گـەردن کـەچ: نیـشـانەی بەندێتـی و بچـووکـیـیـە، ملکەچ
شمشیر: چەکێکی بڕندەی وەک شیرە و لەو پانتر و کورتترە.

---

١- نوور: بەرتەو، ڕووناکی، تیشک.
لامیع: تیشکدەر، بەرتەودار، بەشەوق.
تشـتـێکی: ئـەمـە بەڕێنووسـی کـۆنـە بەواتە: (شـتـێکی) وەلە هـەمـان کـاتدا بە (تەشـێگی)ش دەخوێندرێتەوە کە هەردوو بۆ ئێرە دەگونجێن، بەڵام ئەم وشەیە (تیشکێکی)ی دەزانم و لەبەر ئەوەی لە سەرچاوەکانیدا نەهاتووە، جێگیرم نەکرد.
دۆش: شان، پیل، کۆڵ.
نێش: چزوو، ئازارو مـەبەست لە کـەڵبـەکـانیی (ددانـی) ئەژدیهـای کـوشندەیە کـە وەک مـووی بەسەر شانیدا پەخشە.
بەپێی ئەو سەرچاوەی لەلام گردبوونەتەوە، ئەم پارچە هەڵبەستە، سێ دەنگ لەسەر خاوەنەکەی هەیە کە:
یەکـەم: (مس، عن، ن، گل/ ٣، ص، م) کـە ئەم شـەش سـەرچاوە کـۆن و دەسنووسـە بـەهی (کوردی) و (سالم)ی دەزانن کە پێکەوە ووتویانە و کە من لەسەر ڕای ئەم بەشەیانم کە هۆی ئەم ڕایەم لەدواوەوە دەردەخەم.
دووەم: (عن نسخە، گ٣)دا بەهی تەنیا (کوردی)یان داناوە.
سێیەم: (گل٢، حم، نم١، ر، س/ ٢) ئەم دەستەیەش هەبەستەکە بە هی (سالم) دەزانن.
بەڵام ئەم دوو بەشەی دواییبان کە بە هی (کوردی) یا (سالم) نووسیویانە بەتێکڕایی جگە لە (عن نسخە) کە هەمان سەرچاوەیە لە بەشی یەکەمدا من بۆم ساغ بووەتەوە کە هی (کوردی) بەتەنیا نییە، بەشکو (سالم)یش هاوبەشیی لەدانانیان لە گەڵا کردوە ولە (حم) و ( عن نسخە)ش (گل٢) هەرچەند سەرچاوەیەکی کۆنن و نووسەرەکەی (مەلا عەبدوڵڵای گەلاڵە)یە کە ئەدەب دۆست و کەشکۆڵ نووسێکی بەناوبانگەو لە ١٢٨٢ گۆچیدا نووسیویەتەوە کەلە (کۆڕی زانیاری عێراق- بەشی کوردی) دایەو کەشکۆڵە ژمارە ٤٦٧ی دراوەتێ بەڵام هەر ئەم نووسەرە لە کەشکۆڵی (گل٣)یدا کە لە ١٣٠٠ کۆچیدا نووسیویەتەوە پاشگەز بووەتەوەو بە هی (کوردی و سالم)ی پێکەوە ناونووس کردووە. ئیتر لەسەرچاوەی تۆزێ کۆندا تەنیا (ر) کە بەهی (سالم) ی داناوە. هەرچەندە، ئەویش هیی (مەلا ڕەسوولی تۆربەیییە) و شارەزاو شوێن بروایە، بەڵام ئەشێ لەو سەرچاوەیی وەری گرتووە وابووبێ و بەس. لەبەر ئەم هۆیانە هەڵبەستەکەم لەم پەڕاویەدا بەناوی هەردوو هۆنەرەکەوە نووسی کە (کوردی و سالم) و ئەگەر باشتر سەرچاوەی

بەهێزتر ئەم ڕایەی هەڵوەشاندەوە، با ئەم بناغەش هەبێ کە بەری (١٣) سەرچاوەی دەسنووس و چاپکراوە. ئەمەش گیروگرفت نییە کە هی ئەم یا هی ئەویان بێ، ئەوەندەی کە ناتەواوی و کووڕی لەم هەڵبەستەدا بەپێی ئەو (١٣) سەرچاوەیە لە دەقی زووی خۆی نزیک کراوەتەوە. ئەمیش جیاوازیی نێوان سەرچاوەکانە لەسەر ئەم تاکەی سەرەوە.

وتی (گ٣): کوتی.

تشتێکی (گل٢): طشتیکی.

تشتێکی (ر، حم، عن، نسخە): تشتێکی

تشتیکی (گ٣): چشتێکی.

تشتیکی (ص، ن، م): تیشکێکی- ئەمەیان زۆر جوان و بەجێترە و ئەگەر زۆربەی سەرچاوەی لەگەڵ بووایە لەسەرەوە جێگیرم دەکرد.

بەدۆشا (گل٢، گ٣): بە دوشی.

بەدۆشا (س٢): بە دوشەھ. دیارە هەڵەی چاپییە.

ڕاکێشا (ر، س٢، گ٣، نم١): ڕاگرت- ئەمیش ناگونجێ

لە نێوان ئەو ١٣ سەرچاوەیەدا (مس)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەکەم، ئەمیش ئەو سەرەناوانەیە کە شەش سەرچاوەکەی بەشی یەکەم لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسیویانەو بەهی (کوردی) و (سالم) پێکەوەیان داناوە:

یەکەم: (مس) نووسیویە (من استعار سالم و کردی) واتە: (هەڵبەستەکانی سالم و کوردی).

دووەم: (عن) ئەم پەراوێزە درێژە فارسییەی نووووسوە: (دیده میشود که باری دیگر إین قصیده را در این بیاض باسم کردی مندرج است چون بخلاف إستینساخ دفعهء آول أز مصادر مورقه مطلع شدم که کردی و سالم مشترکا دریک زیارت سادات زردیاوا رحیمهم الله إین رانظم فرموداند- علی). واتە (دەبینرێت کەوا جارێکی کەش ئەم چامەیە لەم کەشکۆڵەدا بەناوی (کوردی)یەوە نووسراوە چونکە بە پێچەوانەی نووسینەکەی جاری پێشوو لە سەرچاوەی باوەڕپێکراووەوە ئاگاداربووم کەوا (کوردی) و (سالم) پێکەوە. لە دیدەنییەکی شێخەکانی قەرەداغدا خوایان بەخشێت، ئەم چامەیەیان داناوە – عەلی).

سێیەم: (ن) لەسەرە ناوی ئەم هەڵبەستەدا نووسیویە: (کردی با سالم) واتە (کوردی لەگەڵ سالم)دا ئەم هەڵبەستەیان داناوە.

چوارەم: (گل٣) (لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسیویە (گفتهء کردی وسالم)، واتە ئەم هەڵبەستەی دوایی (ووتەی ((کوردی) ئەوا سالم).

پێنجەمین: (ص)، ئەم ڕستەیەی کردووەتە سەرەناو بۆ ئەوەی هەڵبەستە: سالم و کردی باهم) واتە: (سالم و کوردی پێکەوە) ئەم هەڵبەستەیان داناوە.

شەشەم: (م) کە ئەمیش دەسنووسی هونەرمەند مەلا عەبدوڵلای تووتنچی (موفتی

پێنجوێنی)یە کە بە کوردی  لەسەر ئەم هەڵبەستانەی نووسیوە (شعری مصطفی بەگ و سالم پیکوە)
ئەم بەڵگە؛ بەهێزانە بوونە، هۆی ئەوەی کە هەڵبەستەکەم بەناوی هەردوو هۆنەر (کوردی) و (سالم)ەوە جێگیر کرد.
٢–ئەمان: هانا ئەبەربردن و هاوار و دادکردنە:
ڕەحم: بەزەیی، دڵسۆزی، نەوازش، چاودێری.
جەلغوو: خواردنی (ژەمی) باز، بەپێی هەڵبەستی زۆر لە هۆنەران و بەتایبەتی هەڵبەستی (میرزام تەواری)ی حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە وادیارە ئەوسایە ڕاوەباز زۆرباوبووە، ئەمیش تایبەتی و لەسەر ڕۆیشتنی دەوێ، ئەم تاکە لە (گ٣، عیراق، گل٢، نم١، ر، س٢) دا نییەو لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م)دا دووەمینە و لە (عن نسخە، حم) دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیەو هێشتا چاپیش نەکراوە.
٣– قەتل: کوشتن.
ناحەق: بەخۆڕایی، لەسەر هیچ و پووچ، بەبێ پێویستی. نادادی.
سوننەت: ئەو کردەوە ئاینییانەیە کە پێغەمبەر (د.خ)ی ئیسلام کردوونی و وتوونی و ئیسلامەکان پەیڕەوییان دەکەن:
فەرض: ئەو پێویستییە ئاینیانەیە  کە خوا لە قورئاندا لەسەر ئیسلام دای ناوە کە دەبێ بکرێن وەک (شەهادەت، نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات).
عومر: تەمەن ، ئەم (ئاگربەردان) ناوبردنە لەو نەریتە خراپەوەیە کە کوردان و بەتایبەتی (دەرەبەگەکان) خەرمانی  دوشمنی خۆیان سووتاندە. کە بووە. بەئیدیۆم (کینایە) یەک لە کوردیدا و بۆ شتی تریش دەوترێ.
ئەم تاکە لە (گ٢، عراق، گل٢، حم، نم١، س٢) دا دووەمینە لە (س، عن، ن، گل٣، ص، م) دا سێیەمینە و لە (عن نسخە) دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
نەکا سوننەت (گ٣): مەکە سووننەت.
نەکا سوننەت(گل٢، حم، عن نسخە، ر): نکا واجب.
نەکا سوننەت (نم١) نیە واجب.
نەکا سوننەت (س٢) بەس بکە جانا– ئەمیش لەنگەو هەڵە
وتم (گ٣، س٢) گوتم.
وتی (٣،س٢): کوتی.
٤– پابەند: پێ بەند، پێ بەستراو، لاق بەستراو.
لە هەرسوو: لەهەر لا، لە هەر شوێن.
بەستە: بەستراو

گێسوو: ئەگریجەی ئافرەت.
ئەم تاکــە لە (س٢) دانیــیــەو لـە (عن نسـخــە)دا دووەمــینە و لە (گ٣، العـراق، گل٢، نم، ر) دا سـێیـەمـینەو لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م)دا چوارەمـینەو لە (حم) دا پێنجـەمـینە تـاکی ئەم هەڵبەستەیە.
عەشقی تۆم (عن نسخە، حم، ص) عشقی تو. ئەمیش ئەشێ ڕێنووشی کۆنیشە.
وتی گوم بە (نم١): وتی شێتی... ئەمەش لە تاکی دوازدەمە و ئاوێتە بووە.
سـەدی وەک تـۆ لە هەر سـوو (نم١، حـم، عن نسـخـە): هـەزارێکی وکـو توو- ئەمـیش هـی تاکی دوازدەیەمە.
سەدیی وەک تۆ (گ٣): دوسەد وەک تۆ.
بەستەیی زنجیری گێسوومە (نم١، حم، عن نسخە، گل٢، گ٣): کوشتەیی شمشیری ئەبروتە ئەمـەش هـەر هـی تاکی دوانزەیەمـینە و ئاوێتـەی ئێرە بووە وپابـەند لەگەڵ (گێـسـوو) دەگونجێ نەک پابەند لەگەڵ (کوشتەی شمشیر) دا.
٥- لەدەردام= لە نەخۆشیدابم، (لە دەوردابم: لەبەر دەرگانەدابم) کە ئەمەش جیناس ئاراییە بەواتە (لە دەرەوەی دەرگاکەتدا دەرکرد)یش دەگوجێ
مەظلووم: ستەم لێکراو، زۆر لێکراو، مافخوراو.
ئەم تاکە لە (عن، نسخە، گ٣، گل٢، حم، نم١، ر، س٢)دا نییە و لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م) دا پێنجەمینە و هێشتا چاپ نەکراوە.
لەدەردابم (ص): لە اوابم
ئەو وە لە(ص، م) هولتە.
٦- خوان: سفرە، تەیکە.
وەصل: پێکگەیشتن، چاو بەیەکترکەوتن.
نەومید: نائومێد، بێ هیوا، بەش بڕاو.
مردووت مرێ: ئەم وتنە ئیدیۆم (کینایە)یەکی کوردییە (مردووش هەر مردووە) و جنێو نییە لە جنێویش دەچێ یا مەبەستی (لە خزم و کەس لێ مردن)ە بەهەردوو سەرا دەگونجێ.
مەحرووم: بێ بەش (زار و مەحرووم) بەواتە نەخۆش و لە زار یا، زەبوون و بێ بەش.
ئەم تاکـە لـە (عن نسـخــە، گ٣، هیـران، ک٢)دا چوارەمـینـە وە لە (نم١، ر)دا پێنجـەمـینـە و لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م، گل٢)دا شــەشــەمین و لـە (حم)دا هـەشــتــەمین تـاکی ئەم پـارچە هەڵبەستەیە.
وتم، وتی (گ٣، س٢): کوتم، کوتی.
نەومید (گ٣، س٢): نەومێد.
وەصلی (نم١): لطفی

بەدائیم (نم١): همیشە

٧- قانوون: یاسا، دەستوور

حالی زار: حاڵی پەرێشان، زەبوونی باری نەخۆشی.

لازم: پێویست

مەلزووم: لەسەر پێویست کراوە، بەسەرا سەپێنراو.

ئەم تاکە لە (گ٣، العراق)دا نییە و لە (حم)دا چوارەمینە لە (گل٢)دا پێنجەمینە و لە (عن نسخە، ر، ک٢)دا شەشەمینە و لە (مس، عن، ن، گل٣، ر، ص، م، نم١)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

وتم، وتی (س٢، گ٣): کوتم، کوتی.

لە غەم (حم): لە خو

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (گل٢، ر، س، نم١)دا بەم جۆرەیە (وەفا بۆ دولبەران هەی بێخەبەر یەکبارە مەعدوومە) تەنیا لە (نم١)دا لەجێی (هەی) نووسراوە (ئەی) و ئەمیش نیو باڵی دووەمی تاکی نۆیەمینە و، بەهەڵە ئاوێتەی ئەم سەرچاوانە بووە، لێرەدا بەم پێیە، ئەم تاکە هێشتا چاپ نەکراوە.

٨- بەجان: بەگیان

قەول: وتە، قسە

قەدیم: کۆن، دێرین، پێم وایە، ئەم (قەولی قەدیم و نوێ)یە، مەبەستی (تەورات) و (ئینجیلە) و ئەشێ ئەو دولبەرە لە گاورەکان بووبێ.

سەرح: لێکدانەوە

مەعلووم: دیاری، ئاشکرا و لە (عن)دا نووسراوە (نوسخە: مەوهومە) کە ئەمەش دەگونجێ.

ئەم تاکە لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م)دا هەشتەمینە و لە وانی تردا نییە و هێشتە چاپ نەکراون و، لە هەموانیشدا چوونیەکە.

٩- ڕەسمی: شێوەی، دەستووری مەبەستە.

وەفا: ئەمەک

خەبەر: ئاگاداری

مەعدووم: نەبوو، لەناوچوو، لەناوبراو.

ئەم تاکە لە (گ٣، العراق)دا حەوتەمینە و لە (عن نسخە، گل٢، حم، نم١، ر، س٢)دا نییە و لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م)دا نۆیەمین، تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە (گ٣)دا دوا تاکە.

نابێ (گ٢): شێتی

هەی بێ خەبەر (گ٣): (کوردی و سالم)ی تیایە کە بەڵگەی ئەوەیە ئەم هەڵبەستە هی هەردووکیانە.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە چەند سەرچاوەیەکدا ئاوێتەی تاکی حەوتەم کراوە، هەڵەیە.

وتم، وتی (گ٢): گوتم، گوتی.

١٠- شکار: ڕاو، نێچیروانی.

صەید: ڕاو، شکار.

مەشئووم: شووم، بووم.

ئەم تاکە لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م)دا دەیەمین تاکە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لە هەمووشاندا چوونیەکە.

١١- زەخم: برین، زام، کولکی.

بەس: زۆر، گەلێ، فرە.

نیگاه: ڕوانین، تەماشاکردن، نوارین.

ئەم تاکە لە (حم)دا سێیەمینە و لە (عن نسخە، گ٣، س٢، العراق)دا پێنجەمینە و لە (نم١، ر)دا شەشەمینە و لە (گل٢)دا حەوتەمینە و لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م)دا یانزەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

وتم (گ٣، س٢): گوتم

زەخمی (س٢): رەحمی

بەس کارییە (عن نسخە): بس کالخوی: (بەس کا لە خۆی)

بەس کارییە (جم): بس کا لە خۆی.

بەس کارییە (نم١): کاریگەرە.

وتی لاچۆ (س٢) وتی.

وتی (گ٢): گوتی

ئەم تاکە لە (گل٢، نم١، ر)دا چوارینە و لە (گ٢، س٢، العراق، عن، حم) شەشەمینە و لە (مس، عن، ب، گل٣، ص، م)دا دوانزەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

وتم (گ٣، س٢): گوتم

قوربان (عن نسخە، حم): تنها

قوربان (نم١) فردا

وتی (گ٣، س٢): گوتی

شێتی (نم١): گوم بە، ئەمیش لە تاکی چوارەمە و ئاوێتەی ئێرە و تاکی نۆیەمیش بووە.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (گ٣)دا بەم جۆرەیە: (کوتم تەنیا منم بەستەی ئەتۆ توند بوو جوابی دا) ئەمیش لە تاکی چوارەمەوە بەشێواوی و لاوازی ئاوێتەی ئێرە بووە. نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (حم، عن نسخە، نم١)دا بەم جۆرەیە (صەدی وەک تۆ لە هەرسوو بەستەیی زنجیری گێسوومە) ئەمیش دیسان لە تاکی چوارەمەوە بەهەڵە ئاوێتەی ئێرە بووە.

له (گ‌٣)دا له جێی ئەو (صەدی وەک تۆ)یە نووسیویە (هەزارانی).

١٣- وتم: (سـالم) دزە، دەستی بڵند کرد ئایـینەی ڕاگرت،

وتی: کێشـکچی ئـەم باخـە؛ بە(کوردی) خالی هیندوومە.

(سالم): نازناوی عبدالرحمن بەگی ئامۆزای (کوردی)یە.

دزە: مەبەستی دزی باخی ڕوری ئەو جوانەیە لێی دواون.

دەستی بڵند کرد: جوانەکە دەستی بڵند کردوە کە نیشانەیە بۆ دەست بڵندکردنەکەی حەزرەتی مووسا لای جادووگەرەکانی فیرعەون و دەستەکەی ئەوەندە سپی و بریقەدار بوو، کەس دەستی وای نەبووە، جادووگەرەکان نیانتوانی دەستی خۆیان وا لێ بکەن و لێرەدا ئەو دەستەی وەک ئاوێنە داناوە کە ئەمەش نیشانەیە بۆ (جامی جەم): ئاوێنەکەی جەمشید، کە گوایە سەیری بکردایە هەموو جیهانی تیا ئەدی، واتە بەهۆی ئەم ئاوێنەیەوە کەس ناتوانێ دزی لەو باغی ڕووە بکات بەتایبەتی کە (کوردی) پاسەوانییەتی.

کێشکچی: پاسەوان.

بەکوردی: بەزوبانی کوردی وەیا (بەکوردی)، واتە لای مـصطـفـا بەگی (کوردی)یەوە کە ئەو پاسەوانی باخە جگە لەو ئاوێنەیەی کە لێی درام، خاڵە ڕەشەکەی سەر ڕوویەتی کە وەک هیندو (هیندی- خەڵقی هیندستان) ڕەشە، کە گوایە (کوردی) بەو خاڵە داناوە پاسەوانە.

ئەم تاکە لە (گ‌٣)دا نییە و لە (حم، س٢)دا حەوتەمین و لە (عن نسخە، گل٢، نم١، ر)دا هەشتەمین و لە (مس، عن، ن، گل٣، ص، م)دا سیانزەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەموو ئەوانەدا دوا تاکە.

وتم (س٢): کوتم

سالم (عن نسخە): کردی ئەوە بوو لە پراوێزی سەرەتای ئەم هەڵبەستەدا لە (عن)دا نووسیوەیە کە لە نوسخەیەکی تردا لە هەمان کەشکۆڵدا ئەم هەڵبەستەی بەهەڵە بەناوی (کوردی)یەوە وەرگرتووە کە ئەمەیە ئەوەتا (کوردی)ی نووسیوە، تەنیا هی ئەو نییە و هی هەردوانیانە.

دزە (ر): وەرە.

بڵند (نم١): درێژە.

ئایینە (نم١): ئاوێنە- دیارە گۆڕدراوە

کێشکچی (نم١) ایشک چی، ئەمیش بەگۆڕاو دەزانم

بەکوردی (گل٢، س، نم١، حم، عن نسخە، ر): بدایم، ئیتر لە سەرچاوە دەسنووسە باوەڕپێکراو و کۆنەکاندا (بەکوردی)یەکە نازناوی (کوردی)یە.

دوای ئەم کۆتاییهاتنە بەدوورکەوتنەوە لە باسەکەی نازانم، کە ئەم پەراوێزەی دوایی بۆ ئێرە وەربگرم کە (عەلی ئاغای نەوتچی) لە کەشکۆڵی (عن)یدا لە کۆتاییی ئەم هەڵبەستەی سەرەوە وا بەفارسی نووسیویە:

(شيندةآم كة أثر إكمال راين قصيدة ورعين إجتماع سالم قصيدةء زير فرمودة رحمهم الله وإيانا – علي).

واتە: ( بیستوومە دوا بەدوای تەواو کردنی ئەم چامەیەی سەرەوە و، لە هەمان کۆبوونەوەدا (سالم) ئەم چامەیەی تری خوارەوەی فەرمووە خوا بیانبەخشێ لەگەڵ ئێمەدا– عەلی).

لەم پەراوێزەدا ئەوەمان بۆ دەر دەکەوێ کە (سالم و کوردی) لە کاتی دانیشتنەکەیاندا لەگەڵ شێخە پیاو ماقووڵەکانی قەرەداغیدا بوون کە پێکەوە ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیان داناوە و ئەمجا سالم لە هەمان کۆڕدا (جۆشی شیعر دانانی) نیشتووەتەوە تا ئەم هەڵبەستەی دوایشی داناوە کە لەم پەراوێزەی سەرەوەدا ناوی هاتووە.

ئەمجا لەبەرئەوەی ئەو هەڵبەستە ناوبراوەی (سالم) کە بەتەنیا وتوویەتی (سێ) تاکی تیایە، هێشتا چاپ نەکراوە، جگە لەوەی چەند هەڵەیەکی زەقی لە دیوانە چاپکراوەکانی سالمدا هەن لەسەر ئەم هەڵبەستەی و، چونکە بەپێی سەرچاوەی دەستنووسی ڕاستی هەڵەکانیم لایە، بۆیە هەلی دەزانم ئەو هەڵبەستەی تری (سالم) پێشکێش بکەم بەتایبەتی کە بەو پەراوێزەی سەرەوە و بەم هەڵبەست و بۆنەیەوە بەستراوەتەوە.

## ئەمیش هەڵبەستەکەی تری «سالم»ە

١- سەوادی قیرگوون شەبها لە نوسخەی عەنبەری مووتە
سەراسەر ڕەونەقی دونیا لە عەکسی ئایینەی ڕووتە.
٢- مەثەل ئەستوونەیی دوودی هەناسەم بۆ ڕوشی و بەرزی
مەگەر پرچی و راز و قامەتی لاولاوی هەڵچووتە
٣- بەناحەق کوشتمی موژگانی خوێنرێژت، وەلێ زانیم
لەگەڵ من ئەم هەموو کەچ بازیە تەحریکی ئەبرووتە.
٤- بەدەوری لوئلوئا غەوواصی زەنگیی دانەیی خاڵت
بە(ظاهیر) پاسەوانی کوڵمی مەرجان، لێوی یاقووتە
٥- سیەه ڕوو بم، وەکو زولفت، سەری موو گەر خیلافی بێ
بەحەققی میصحەفی ڕوی تۆ، (دز)ی دڵ، خاڵی هیندووتە
٦- وەکو موژگانی تۆ، بەرگەشتەیە طالع بەڕووی مندا
پەرێشان زولفی موشکینت، لەگەڵ ئەحواڵی من؛ جووتە
٧- جەوازی دا حەکیم: بادامی چاو و شەککەری لێوت
لە قانوونی ویصالا؛ بۆ دڵی من، قووەتی قووتە
٨- بەهشتە وەصلی تۆ بۆ من، لە بن داری موغەیلاندا
لە وەختی دووریا؛ گوڵشەن وەکو صندوقی تابووتە.
٩- دڵی ساحیری لەبەر زولف و زەنەخ ناگاتە ڕوخ هەرگیز
لە لایێ حەلقەیی ئەفعا لە لایێ چاهی هاڕووتە
١٠- عەصای مووسا لە کوێ بێنم ڕەهابم دا لە دەس چاوت
لە (ماه) تا پشتی (ماهی)، گشتی؛ خۆ بەر حوکمی جادووتە
١١- (بەسێ) دون هیممەتە گەر ئارەزووی ئەو رەنگی شاهی کا
هەتا؛ سەرگەشتە (سالم)، ئووفتادەی سایەیی ڕووتە

---

١- قیر گون شەبها (س٢، س١): هەردوو دیوانە چاپەکەی سالم، گیو و مەریوان

قیر گوونی شەو – بەڵام من لەسەر کەشکۆلی (عن، گل۳) و، (عن: دیوانی سالم دەسنووسی مەلا عەبدوڵلای قزلجی) چاکم کردەوە لەم هەڵبەستەدا (عن)م کردە بنکە.
ئایینەی ڕووتە (س۲، س۱): خـاڵی هندووتە، ئەمـەش نابێ، چونکە ئەم وشـەیە لە تاکی پێنجەمدا دووبارەیە و لەسەر سێ کەشکۆڵەکە چاکم کردەوە ئەم (ئایینە)یەش نیشانەیە بۆ (ئایینە)کەی هەڵبەستی پێشوو (دوا تاک) کە ئەشێ (کوردی) وتبێتی و (سالم) پێی ناخۆش بووبێ، وەڵامی داوەتەوە وەک لە دوو تاکی دوایشدا دەگەڕێتەوە سەر ئەم وەڵامە.
دونیا (گل۳): زنیت
٢– ئەم تاکە تەنیا لە (عن، گل۳) دایە و لەوانی ترا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە و لەم دوو سەرچاوەیەشدا چونیەکە.
٣– کوشتمی (س۲): کوژتمی، دەستکاریی مامۆستا گیوە.
ئەم تاکە لە هەردوو دیوانە چاپەکەدا، لەگەڵ تاکی پێنجەمدا پاش و پێشە، بەڵام من بەڕیزی کەشکۆڵەکان جێگیرم کرد.
٤– ئەم تاکەش تەنیا لە (عن، گل۳)دایە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
٥– ئەم تاکە وەک گوتم لە (س۱، ی۲)دا، پاش و پێشە لەگەڵ تاکی سێیەمی سەرەوە و لە چاپەکاندا ئەم دووەمە و، ئەو سێیەم، هەرچەند من وەک ڕیزی کەشکۆڵەکان نووسیم. وەک لە تاکی دووەمدا نیشانەم کرد، ئەم وشەی (ظاهر) و (دز)ەی ئەم دوو تاکەی سەرەوە نیشانەن بۆ دوا تاکی هەڵبەستە (ناوکۆیی)یەکەی (کوردی و سالم) و، وەک وەڵامدانەوەیەکیشە کە لەوێدا سالم کرابوو بەدز و خاڵەکەش کرابووە کێشکچی کە لێرەدا (سالم) خاڵەکەی کردووەتە بە(ظاهیر پاسەوان) و سوێندیشی خواردووە کە (دز) خاڵەکەیە. بەمە وەڵامی دوا تاکی هەڵبەستەکەی تری داوەتەوە.
٦– پەرێشان (س۱: دیوانی سالم چاپی مەریوان): پەرێشانی.
لەگەڵ (عق): دەگەل
ئەم تاکە لە (س۱، س۲، عن)دا چوارەمینە.
٧– جەوازیدا حەکیم بادامی (س۱، س۲): جوازی حکمی بهرام.
چاوو (گل۳): چاوت.
ئەم تاکە لە (عق، س۱، س۲)دا پاش و پێشە لەگەڵ تاکی دوایی (٨ هەم) و لە واندا ئەم شەشەم و ئەو پێنجەمە بەڵام من بەپێی (عن، گل۳) ڕیزەکەم وەرگرت، هەروەها ئەم تاکە وەڵامی ناوەڕۆکی تاکی حەوتەمی ناوکۆییەکەیە.
٨– تۆ بۆ من (س۲) تۆ و من، ئەمیش لەنگە و ئەشێ هەڵەی چاپی بێ.
موغەیلاندا (س۱، س۲): موغیلانا، ئەمیش وەڵامی (وصل)ی هەڵبەستە ناوکۆییەکەیە.
٩– روخ هەرگیز (س۱، س۲، عق): ڕخسارت، بەڵام وشەی (روخ)ەکە جگە لەوەی لە دوو

کەشکۆڵەکەشدایە و بۆرە جیناسیەکیشی لەگەڵ (زەنەخ)دا هەیە، دیسان نیشانەیە بۆ (یاریی شەترەنج) کە سەربازی (دڵی ساحیر) ناگاتە قەڵا (ڕوخ)ی ڕووی.

ئەم تاکە لە (س١، س٢، عق)دا حەوتەمینە.

١٠- ئەم تاکە لە (عن، گل٣) دایە و دەیەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لە هەمووandا چونیەکە و لێکدانەوەکەی ئەفسانەییە.

١١- شاهی کا (عق): شاهی بی، ئەم شایە نیشانەیە بۆ فیرعەون، کە لە تاکی پێشووشدا لە مووسا و مار و جادوو... هتد دواوە.

بەم سێ تاکە چاپ نەکراوەی ئێرەوە ژمارەی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە بوو بەتاک کە لە چاپەکاندا (٨ جووتە) و لە وێژەی کۆندا لەبەر (تاکێتیی خوا) پەیڕەوی تاکێتیی ژمارەی تاکە هەڵبەست کراوە، ئەم تاکەش لە هەمووandا دوا تاکە و ئەم چامەیەی سالم بەتیکڕایی وەڵامی (ناوکۆییەکانە).

## چا

١- چا مــەرھـەمی زەخـــمـــانە
دەرمـــــــــــانـی بـریـنـانـە
ئـەجــــزایی طەبیـــــبـــانە
غــەمـــخــواری حـــەزینانە
٢- ئـەگــــەر مـــــەیلت لـە چایە
تـەعـــــــــریـفـی لـە لام وایـە
شــیـرین، پڕ ڕەنگ و مــایـە
نـەزھـەتـدەری ڕۆحــــــــانـە
٣- شـــــیــــــرین ئـەگـــــەر تاڵـە
................................
................................
ڕۆحی ھـەمــــوو ئینســـــانە.
٤- بۆم تێکە فـەقێ ســـوور چا
لـەعلی لـەبی یار ئـاســــــــا
زوو تێکە بـۆم دەی ســـــــــا
ڕۆح ھـاتـووە جـــــــــەولانـە
٥- مـەنظەر گەھەت سەحرا بێ
چـاوت کــــــــە لـە لـەیـلا بێ
مـەجلیس کە لەگـەڵ چا بێ
دیــــــوانــــــی وەزیـــــرانـــــە
٦- عـــەقڵ و ھـونەر و ھـۆشـــە
فـەھـم و بەصـەر و گـۆشـە
بێ ئەوی، دڵ پڕ جــۆشـــــە
بێ ئـەوی، ســـەر حـــەیرانە

٧- (هـجــری) کـــه برینداره
ڕەنگ زەرد و خــەفــەتبــاره
بێ چاییـــیـــه بێ چاره
ســـــــینـه و دڵـی بـریـانـه

...............................................................

١- مـەرهـەم: دەرمـانێکە بۆ نەرمکردن و چاککردنەوەی برین و ئاوسـاوی کە لە شـوێنی تردا لێی دواوم کە لە ڕۆنی خەست و دەرمانی تر دروست دەکرێ.
ئەجـزایی طەیبـانە: داوی پزیشکانە کـەرەسـتـەیانە: (داو و دەرمـان) کە (داو) لێرەدا بەواتای (تاو) یا تۆڕی ڕاوکردن نییە.
حەزین: خەمبار.
سـەرچاوەی ئەم پـارچە چوار باڵی (ڕوباعی)یە کـە حـەوت (چوار باڵین) تەنیـا گـۆڤاری (بەیان) ژمــاره ٧٢ی حـــوزیران و تـەمموزی ســاڵی ١٩٨١ی زاینیـــیــە کــە لە لاپـەڕە (٥٢ - ٥٤)یدا (عـوسـمــان هـەورامـی) لـە ژێر ناوی (دوو کـۆرپەی هـەناوی «کـوردی»)دا وتارێک و دوو پـارچە هـەڵبـەسـتی (کوردی)ی بڵاو کردووەتـەوە، یەکێکیان ئەم پارچە هەڵبەسـتـەی سـەرەوەیە و ئەوی کەیانم پیشتر پێشکەش کردووە و نیشانەم بۆ ئیرە تیا کردووە.
(مـامـۆسـتـا هـەورامی) ڕای گـەیاندووە کـە ئەم هـەڵبـەسـتـەی لە مـامـۆسـتـا عـەلی سـەنجـەری وەرگـرتووە ئەویش لەبەر دەسـتـنوسـێکی (مـەلا عـەبدولحـەمـەدی ڕەزا)وە لە سـاڵی (١٩٣٩ز)وە لەبەری کردووە. لە بارەی بۆنـەی ئەم هـەڵبـەسـتـەوە (مـامـۆسـتـا هـەورامی) لە دەمی (مـامـۆسـتـا سـەنجەری)یەوە دەگێڕدرێتەوە کە:
( لە سـەردانێکی «کوردی»دا بۆ (تاران) لەگـەڵ کاروانـدا لای داوەتە گوندی (باشـمـاخ)... بەو ئاواتەی چایەک بخـواتـەوە و لە دەردی سـەرئێشـەی چامی ڕێگە ڕزگـاری ببێ، دەبێتـە مێوانی فـەقێکان و داوای چا دەکات و لە چاوەڕوانیی (چا دەم کێشـانەکەدا) داوای پارچە کـاغـەزێک دەکا و ئەم هۆنراوەیەی بۆ دێت و تۆماری دەکات.
یەکێ لە فەقێیەکان دەڵێ: شێوەی ئەم هۆنراوەیە لە هی مستەفا بەگی (کوردی) دەچێ.
ئەویش دەڵێ: بەڵێ، من خۆم مستەفا بەگ باش دەناسم، کە نیشـتـەجێ بێ، نازناوی هۆنراوەی (کوردی)یە کە لە گەڕان و سەفەردا بێ، نازناوی هۆنراوەی «هیجری»یە.
فەقێیەکان دەڵێن: خۆزگە بەدیداری شاد دەبووین.
ئەویش دەڵێ: ئەگـەر زوو چایەکە زوو دەم بـکەن دەتانبەم دەسـتتـان دەنێمە ناو دەستی، چونکە ئێستە لەم گوندەدایە و من دەزانم میوانی کێیە.
کـە ئارەزووی چای دەشکێ بەفـەقـێـیـەکـان دەڵێ: فـەرمـوون دەسـتـتـان بخـەمـە دەسـتی «کوردی»یەوە. کە دەست دەخاتە دەستیان دەڵێ: ئێستاکە دەستتان لە دەستی مستەفا بەگی

«کوردی»دایە.

ئەمەی سەرەوە پوختەی گێڕانەوەکەی (مامۆستا هەورامی) بوو، لە بارەی بۆنەی هەڵبەستەکەوە، کە لە دواتر نووسیویە لە لایەن و دەستنووسی (ئەحمەد محەمەد – حەمکۆل)ەوە کەشکۆڵێکی دەستکەوتووە، ئەم هەڵبەستەی بەناوی (هجری سنەیی)یەوە تیا نووسراوە کە هەتەی جیاوازییی لە نێوان ئەو کەشکۆڵە و، وتنەکەی (مامۆستا سەنجەری)دایە، کە لە گۆڤارەکەدا دیاری کراوە کە لە شوێنی خۆیاندا دەیان نووسم.

ئەو کەشکۆڵەش بەناوونیشانی (حەمکۆڵ) ناو ئەبەم وەک سەرچاوە. لەبەرئەوەی لەو کەشکۆڵ و گۆڤارەش پتر سەرچاوەیەکی ترم دەست نەکەوت هەر گۆڤارەکەم کردە بنکە و هەرچەندە ناوی (هیجری سنەیی)یش لەسەر کەشکۆڵەکەدا جارێ هەر دەینووسمەوە و دەبێ ئەوەش بزانین کەوا (هیجری)، وەک لەسەرەوە نووسراوە، نازناوێکی (کوردی) بووە، خۆیشی بەبنەچە (سنەیی) بووە، بۆیە منیش هەر بەهەڵبەستی (کوردی)مانی دەزانم.

لە بارەی ئەم هەڵبەستەوە بە (دەمی) مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای تووتنچیی پێنجوێنی (موفتی)م بیستووە کە گوایە (کوردی) لە کۆڕی (فەقێ)یانێکدا باسی خۆشی و بەکەڵکیی (چایی) دەکەن و (کوردی) دەڵێ من هەڵبەستێکم لەسەر چایی داناوە، بۆ ئەوەی لە خۆشیی چایی دا و، لە کۆڕی چایی خواردندا بەگۆرانییەوە بگوترێ، بەڵام (موفتی) فەرمووی هەڵبەستەکەم دەست نەکەتووە، هەر ئەمەندەم لێرە بیستووە، منیش بەپێی کێشی سووکی هەڵبەستەکەدا ئەم ڕایەی (موفتی)یە پەسند دەکەم.

٢– مەیل: ئارەزوو، حەز.

تەعریف: لێدوانی یا باسکردنی چای مەبەستە.

مایە: نەکهە.

نەزهەت: پیرۆزی، خۆشی، دوورکەوتنەوە لە پیس و خراپی، پاکژی.

شیرین، پڕ ڕەنگ و مایە (حەمکۆل): شیرین و پڕ ڕەنگ مایە.

٣– شیرین و تاڵ: هەر دووکیان تامی چان لە شەکر زۆری و بێ شەکریدا، دیارە مەبەستی لەوە بووە کە بەهەردوو حاڵ پێی خۆش بووە.

لەم چوار باڵییەدا (باڵی دووەم و سێیەمی)یە جێ هێڵراوە (مامۆستا هەورامی) لە پەڕاوێزەوە نووسیوە کە (مامۆستا سەنجەری ئەڵێ: ئەم دوو تاکەم لە یاد نەماوە).

دیسان مامۆستا هەورامی نووسیویە: (سەیر ئەوەیە کۆپلەی دووەم و سێیەم لە هەردوو لادا «ئەوی مامۆستا سەنجەری و ئەوی حەمکۆل» ئەم ناتەواویە چوون یەکە، دیارە یکێکیان لەوی تری وەرگرتووە یا مامۆستا سەنجەری داویە بەمامۆستا نەجمەدین مەلا و کاک ئەحمەدی «حەمکۆڵ»یش لەبەر دەسنووسی مامۆستا نەجمەدین نووسیوەیەتەوە.

ڕۆحی: گیانی.

ئینسان: مرۆڤ.

٤– چای سوور: چای سوور مەبەستی (خەست)ە
لەعل: گەوهەرێکی ڕەنگ ئاڵە
لەب: لیوە – گوایە (چا) وەک وەک لەعلی لێو ئاڵ بێ.
جەولانە: جۆلانە، هاتوچۆ، ناز و تەک
بۆ تێکە فەقێ سوور چا (حەمکۆل): بۆم تێکە دەسا سوور چا – دیارە ئەمەش نابێ چونکە لە نیو باڵی سێیەمی ئەم چوارباڵییەدا (دەسا) دووبارە دەبێتەوە، کەواتە (بۆم تێکە فەقێ، سوور چا)یەکە ڕاستترە.
٥– مەنظەر گەهـ: ڕوانگە، دیمەن.
سەحرا: دەشت و دەر و لەوانەیە ئەو کاتە بەهار یا دیمەنی دەشت و دەر خۆش بووە و بەو بەڵگەیەش (مامۆستا هەورامی) وتوویە لە هەیوانی مزگەوت، فەقێیان خەریکی دەورکردنەوە و کۆشش بوون کە (کوردی) دیونی و جۆتە لایان.
لەیلا: ناوی خۆشەویستەکەی مەجنوونە، بەڵام مەبەست لە هەر خۆشەویستێکە.
مەجلیس: شوێن دانیشتن و تیا کۆبوونەوە، کۆڕ.
دیوانی وەزیران: بارەگا یا دیوەخانی وەزیران (شالیاران).
مەنظەرگەهت سەحرابێ (حەمکۆل): مەنزلگەهی سەحرابێ.
٦– عەقل: ژیر
فەهم: تێگەیشتن
بەصەر: بینایی
گۆش: گوێی و مەبەستی لە هێزی بیستنە
بێ ئەوی: بەبێ ئەو
حەیران: سەرسام، سەراسیمە، ڕاماو.
بێ ئەوی دڵ پڕ جۆشە (حەمکۆل): بێ وەی دڵی پڕ جۆشە.
بێ ئەوی سەر حەیرانە (حەمکۆل): بێ وەی سەری حەیرانە.
٧– سینە = سینگ
هۆنەران هەر بۆنەیەک هەستیانی تیا بزوابێت کە دەروونیان بجۆشێنێ و باری نووسینەوەی هەڵبەستیان لەبار بووبێ و لەم جۆرە هەڵبەستانەیان وتووە، بەڵام زۆریان لەبەر گەلێ هۆ لەناوچوون و ئەم هەڵبەستەی (کوردی) بەڵگەی ئەوەیە کە لەم جۆرە هەڵبەستە سووکەڵانەی زۆر لەناوچوون، و چونکە ئەم پەراویە کەمی لەمانە تیایە.
دەبێ ئەوەش بزانین کە (چا) لە سەردەمی (کوردی)دا هەبووە و لەوەبەر هەڵبەستی ترم لە بارەی (چا)وە نەدیوە بەڵام لە دوای ئەو هەڵبەستی هۆنەرانی دیکەمان هەن وەک:

تاڵ و شیرین پێکەوە نەمدیوە، چا بێ، (چا) نەبێ
هەر کەسێکی هەمنشینی چا نەبێ، پێت چانەبێ.

## ئەی موسوڵمانینە

١- ئەی مـــوســـوڵمـــانینە نابێ پێم بڵـــێن چیم کـــردووە؟؟
دولبـــەرم بۆچی وەها دەســـتی لە خـوێنم خـســتـووە ؟؟
٢- پەنجـەشی خـێناویـەو هێـشـتـا کـوو لێک حـاشـا دەکـا
سـوێند دەخـوا بەدرۆ، دەڵێ: بەخـوا ئەمن نەمکوشـتـووە
٣- چونکە ئەمـرۆ من شـەهیـدی کـەربەلای عـەشـقـی ئەوم
هەر وەکـوو (کـەو) پـەنجـەکـانی وا بەخـوێنم ڕشـتـووە
٤- چاوی مـەسـتی فـیـتنەجـۆی هەروەک سـوارەی تورکـمـان
خــــەرمـــــەنی عـــــەقڵ و دینی بـەغـــــارەت بـردووە
٥- پەرچەمی چەشنی پەڕی تاووس کـــە دەدرەوشــێــتـــەوە
هێندە نەرم و خــاوە وەک ئاوریشــمـــە یا (تووکی توو)وە
٦- کێ خـەلاصی یی دێ لە قوللەی قافی عیشـقی چاوەکەی
زەحـمـەتە بەخـوا کـە چونکە پڕ لە سـیـحـرە جـادووە.
٧- ئەو سـیـــا والا لەدەوری گـــەنجی ڕوخـــســاری نیگار
پڕ عـەجـەب مـاوم (کـە) داخـۆ (مـار)ە یانە (گـێـسـو)وە
٨- یا خـــودا دووربێ لەچاوی بەد تـەمــاشــاکـــەن، کـــەوا
هێندە باریکە قـــەدی، قـــورئان دەخـــۆی تارمی (مـــوو)وە
٩- (کــــوردی) تاکــــو تۆ خــــــەریک ئەو نازدارەبووی
پێی لە (داو) نایی و لە گـۆی خـسـتی بەچاو ئەو ئاهووە

.................................................................

١- سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە دوو کەشکۆڵی دەسنووسی (عن،ص) و، (گ٣)ی چاپکراوە.
من (عن) مکەیانم کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی، هەرچەندە بەداخەوە (بۆنە)ی وتنەکەیم نەزانیوە.
٢- حاشا دەکات: ناچێتە ژێری، دانی پیا نانێ.
پەنجەشی (گ٣) پەنجەکەی.

هێشتا (گ٣): ئێستا.
هێشتاکو لێم (ص): هشتاکو لم = (هێشتا گوڵم) ئەمیش دەگونجێ.
هێشتا کو لێم حاشا دەکا (گ٣) ئێستا دەکا حاشا گوڵم. ئەمە شێوازە
بەدرۆ دەڵێ. بەخوا (گ٣): بەخوا دەڵێ باللە. - ئەمیش شێواوە.
٣- شەهید: کوژراو لە ڕێگەیەکی ڕەوادا بەهەشتییە.
کەربەلا: شارێکە لەناوەندی عێراق- ئەمە نیشانەیە بۆ هەرای تیا کوشتنی حوسەینی کوڕی و یارا.
کەو- مەلێکی جوانی دەنگخۆشی چیاییە و گوایە کاتێ حەزرەتی حوسێن کوژراوە، کەو چینەی لەجێ
خوێنەکەیدا کراو،ە، بۆیە پەلی و دەنووکی سوورە ئەمەش ئەفسانەیەکی درۆیەو کەو لەو ناوچەیە نییە.
کەربەلای عەشقی ئەوم (گ٣) کەبەلایی عیشقی تۆم- ئەمەش ناگونجێ و دەسکارییە.
پەنجەکانی (گ٣) پەنجەکانت- دیسان ناگونجێ.
٢- فیتنە جۆ: ئاشووبە گێڕ.
سوارەی تورکمان: سوارەی جەندرمەی (عوسمانییەکان) کە سوارەی ( نیظام)یشی پێ گوتراوە کە کوردی جۆرە لەهجەیەکی تورکی زان بوون،
خەرمەنی: خەرمانی
عەقل: ژیری. هێژایی.
غارەت: تالان، هێرش.
فیتنەجۆی هەر (گ٣) فیتنە جۆکەت.
دینی (گ٣): هۆشی.
٥- تاووس: مەلیکە ئەوەندەی (قەلەموونێک) گەورەترە، سەرنووکی پەڕەکانی کلکی، گۆڵگۆڵیی ڕەنگاوڕەنگی درەوشەرەوەیە، بەتایبەتی لەکاتی خۆکێشکردندا (چەتر هەڵدان)یدا دیاری دەدا.
خاو (گ٣) صاف
قوو= مەلێکی پەڕەکەی فەرم و بێ مووچکە،
پەرچەمی چەشنی (گ٣): پەرچەمت هەروەک/ وەک ئاوریشمە (گ٣) قورئان دەخۆی.
قوللەی قاف: گوایە قەلا بوو، بەسەر کێوی قافەوە لەوپەڕی دووری لە بەرزیدا، بەلام لەڕاستیدا بەست (سەددە) ی نێوان چین و ژاپۆنە لەکۆنەوە دروست کراوە کە کێوی (هاجووج و ماجووج) یشیان پێ گوتووە ولە قورئاندا (ئەئجووج و مەئجووج)ە.
زەحمەت: سەختە، ناشێ
سیحر: جادوو

چاوەکەی (گ۳): چاوەکەم

بەخوا (گ۳): باللە.

٧- سیا والآ: (سیا: ڕەش) و (والآ: پەخش کراوە) و مەبەستی لە زولف و وکێسور ئەگریجەکانیەتی بەدەوری ڕوویدا.

نیگار: جوان و مەبەسیی خۆشەویست (یار)ەکەیەتی.

پڕ عەجەب: زۆر سەرسام.

ڕوخساری نیگار (گ۳) ڕوخسارتە

داخۆ (گ۳): وا خۆ- ئەشێ هەڵەی چاپ بێ

یانە (گ۳): یاخۆ

٨- قەدی: مەبەسی لە کەمەریەتی ئەوەندە باریک بووە.

تاری موو : تەڵی موو، داوی موو- ئەم جۆرە (موبالەغە)یە، باو بوو لەوێژەی کۆندا.

کەوا (گ۳): گوڵم. ئەم تاکە لە (گ۳)دا دوا تاکە.

٩- لە گۆی خستی: پەلوپۆی لێ بڕێت، جووڵەی پێ نەهێشتی، فزەی لێ بڕێت.

چاو ئاهوو: چاو ناسک مەبەسی لە جوانییەکەیەتی وەک چاوی ئەو وەها بووە.

ئەم تاکە کە (گ۳)دا نییەو لەوانی تردا دوا تاکەو هێشتە چاپ نەکراو.

تێبینی: ئەم پارچە هەڵبەستە ئاشکرایی مۆرکی (کوردی) شێوەیە، بەڵام لەوە دەچێ کە زۆر شێوابێ دەستاو دەست دەماودەمی ناشارەزایی کردبێ وەهای بەسەر هاتبێ.

## لەقەبی صالحە

١- لەقەبی صالحە، پاشا نییە، ناوی یەسووە
بە موسوڵمانی مەزانن، تەرەسە؛ ئەهلی جووە
٢- بەخەسیسی نییە مانەندی لە ڕۆم و عەجەما
وەکو ئەم کوونییە، ئەسپابی موهەییا نەبووە
٣- ئەم سەگە، هێشتو ناخەڵەفە. شەرمی بەقەومی خۆی دێ
دوژمنی ئەو کەسەیە پێی بڵێ: ئەمڕۆ (شەمووه)ە
٤- دامەنی ڕەش، وەکو (تاووس) بە فڕین و ئەسەرا،
خوێڕییە مامری حیزە، هەموو خۆراکی گووە.
٥- دوشمناتیی من و ئەم گاندەرە، ڕەسمێک قەدیم
غەرەضی (کونە)، کە تائێستە لە بیری نەچووە.
٦- هەروەکو بێوە ژنان پەرچەمی بەرداوەتەوە
کۆنە فاحیشە، دەڵێی کێرێکی پێدا نەچووە
٧- پارەیەکی خۆی بە ئیمام جەعفەری صادق نادا
شەرموعاری نییە وەک شیعەیی بێ ئابڕووە.
٨- زێدە ئیکرامی هەیە بۆ کەسێ گەر بێتە کنی
بۆی تەرک نابێ بەپیریش، مەثەلی کۆنە خووە
٩- دەفتەری بینێ، دەزانن، کە لەسەرخۆی چیی داوە
بۆ دراوی کونەکەی جوملە مەصاریف چ بووە.
١٠- ڕووی بە (ئەحمەد) دەڵێ ڕۆڵە چییە شیومان ئیوارێ
دەڵێ هۆ باب: شلە ساوەر یا ماست یا کودووە
١١- دێتە جواب: قوون فرە باب، جەژنە گەلێکی ماوە،
بن سەری خاڵی نییە داکەکەت دا خۆ چ بووە

١٢- عـيللەتـی (پشک) ی بگاتـێ لە (حـەکیـمـان) مـەگـەڕێن
بۆ دەواو صـــیـــحـــەتی ئـەو شـــەربەتی جـــەوت و بەڕووە
١٣- نێـــر ئـەگـــەر ئـاووس ئەبـوو، ئەم دەبـوو داکـی چل بـێ
(کـوردی) حـــەیفـــە بەســـە لەم نەوعـــە کـەســـانە مـــەدووە

.................................................................

١- لەقەب: نازناو، چەشنە پێناسەیەکە.

(صالح): وادیارە ئەو کەسەی ئەم هـەڵبەستەدا داشۆرین ناوو ناتۆرەیەی پیا گوتووە، پیاوێکی دەوڵەمەندی بنەچە خانەدانی خـوو چرووک و پەست بووە و بەهەندێ وشەیشدا دەبێ لە دەوری (کۆیە) بووبێ یا (پاشا)یە عوسمانی، (پاشا نییە) بەڕێنووسی کۆن- ئەو وشەیە بە (پاشا) نییەو (پاشانی)یە واتە: (حیز) دەخوێندرێتەوە.

یەسوو: ناوێکی جولەکانەیەو لە (یووسف)ەوەیە، یا کورتکراوەی (یووسف)ە.

تەرەس: سووک، بێ ئابڕوو، ڕەوشت پەست، دەویت.

جوو: جـوولەکە. (ئیسـرائیلی) یا ئەوانی پەیڕەوی (مووسـا) پێغەمبەر دەکەن. مـەبەستی لە (بێ ئاینی) بووە.

سـەرچاوەی ئەم هەڵبـەسـتـە کە هێشتـا چاپیش نەکراوە (مس، عن، ن، ص)ە و، لە هەمـوویان تەواوترو، بە واتا ترو ڕەوانتریان (ن) بوو، بۆیە کردمـە بنکەی لێکۆڵینەوەی و، هەمـوویان بەهی (کوردی) یان داناوە بەڵام لە (عن)دا ئەم پەراوێزە هەیە:-

(این قصیده بەعنوان (ذم) حرفیا و باتشـویش نقل کردم و شـاعرش مـعلوم نیست، شـاید یک نسخەء کامل وباسم شاعرش بدست آورم -علی)

واتە:-(ئەم چامـەیەم بەسـەر ناوی (زەم) و کوتـومت بە شێـواویشـەوە، وەرگرت کە هۆنەرەکەی نادیارییەو بەشکو ڕوونووسێکی تەواویی و ناوی هۆنەرەکەیشم دەست بکەوێ- عەلی).

٢- خەسیس: پیس، پەست، چرووک، لەجەر، پیسکە.

ڕۆم و عەجەمم: مەبەستی لە عوسمانی و ئێرانی بووە.

کوونی: نامەرد، کووندەر.

ئەسپابی موهەییا: هۆیەکانی ئامادە.

بەخەسیسی (مس): بەخستی.

لە ڕۆم و عەجەما (عن): لە ام أیامە.

وەکو ئەم کوونییە (عن): کس و کو ام کونیە.

٣- ناخەڵەف: ناوەجاخ، ناکەس، ناڕەسەن.

قـەومی خۆی: مـەبەسـتـی لە بنە جووێتی یە، وەئـەشێ لەبەر ڕەزیلییـەکـەی بێ، کەوا کـردوویە بە (جوو) چونکە پیسکەن.

شەموو: ڕۆژی دوای هەفتەیە و ڕۆژی حەسانەوەیە، لەلای جوو، لەخوا تیایا حەساوەتەوە لەدوی دروستکردنی جیهان.
ئەم سەگە هێند (عن): ام سگە – زۆر لەنگەو.
ئەم سەگە هێند (مس): ام سگەچون– نوسخە: أم سگە زور.
خۆی دێ (عن، ص): خویە: (خۆیە).
٤– دامەنی ڕەش: نیشانەیە بۆ ڕەشیی قاچەکانی تاووس و پەڕیشی بەو جوانییە.
فڕین: مەبەستی وەک مریشکە نافڕێ و فشەکەریشی مەبەسە
ئەسەر: ڕواڵەت و مەبەستی: (گوو خواردنی مریشکەکەیە) کە ئەویش گەندەخۆر بووە.
مامر: مریشک، مر.
جیناس ئارایی لە: (خوێڕی) و (خۆراک) دا هەیە.
ئەم تاکە لە (مس) دانییەو لەوانی تردا چوارەمینە
دامەنی(عن): دابونی.
ڕەش وەکو (عن، ص): هروکو.
خوێڕییە مامری حیزە (عن) چونکە ام حیزە مریشکە.
٥– دوشمنانی: دوشمنایەتی.
ڕەسمێکە: شێوەیەکە، باوێکە، لەیستێکە.
عەرەض: مەبەستی لە (ڕق).
(کونە) بە ڕێنووسی کۆنەو بە (کۆنە) و (کوونە) دەخوێندرێنەوە، هەردووکی دەگونجێ.
کە تائێستە (عن) کە ایستە.
ئەم تاکە (س)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمینە.
٦– پەرچەم: لەوانەیە کاکۆڵی بووبێ و ئەم وای پێ گوتووە، مەبەستی پێشەوەی کاکۆڵە.
فاحیشە: سۆزانی، داوێن پیس.
ئەم تاکە لە (عن) نییەو لە (مس)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا شەشەمینە.
٧– پارە: هەرچەند بەواتە (فلوس)ە، بەڵام (پارە)ش ئەوسایە جۆرە فلسێک بووە، لە نرخدا کەمترین و بەرامبەر بە (فلس) بووە.
جەعفەری صادق: یەکێکە لە نەوەی ئیمامی عەلی و مەزنێکی ناوداری ئیسلام و، ئیمامێکی شیعەکانەو لەسەرێنی عەباسییەکاندا ژیاوە.
عار: شوورەیی، ئابڕوو، شەرم.
ئەم تاکە لە (ص، مس) دانییەو لەوانی ترا حەوتەمینە.
پارەیێکی (عن): پارکی
وەک شیعەیی (عن): اومحپەیی.

٨- ئیکرام: بەخشش، بدەیی. زێد ئیکرام: زیادەبەخشش (کەرەم): نەوازش.

کنی: لە ڕێنووسی کۆندا بە (کنی) و (کونی)ش دەخوێندرێتەوە و هەردوو جۆرەکەش بۆ ئێرە دەگونجێن.

تەرک: وازلێهێنان، دەس لێ هەڵگرتن، نەچوونەوە سەر.

مەثەلی: بەوێنەی ئەمەش نیشانەیە بۆ پەندی پێشینانی: (خووی شیریی تەرک نابێ بە پیری).

ئەم تاکە لە (ص، مس) دا شەشەمینەو لەوانی تردا هەشتەمینە.

بۆ کەسێ گەر (عن): هرکس.

نیوباڵی دەقی ئەم تاکە لە (ص، عن) دا بەم جۆرەیە: (هر دزانی بلی احمد وره ام ایشە کوە).

دیارە احمد کوڕی بووە.

٩- لەسەر خۆی چیی داوە: گوایە بە پارە خەڵکی بەسەر خۆیدا کێشاوە.

بەدراو= (بەڕێنووسی کـــــۆن): (دراو= پارە)، (دەراو= ڕێگە) لە ڕێگەیداو (دڕاوی)یش دەخوێندرێتەوە، کە هەرسێکیان دەگونجێن و ئەمەش وەستایی دیاری بە وشەکردنەو جوانیی وێژەیی.

جوملە= گشت، هەموو، سەرپاک، تێکڕا.

مەصارییف= خەرج کراو لە پارە.

ئەم تاکە لە (ص، مس) دا نییە و لەوانی ترا نۆیەمینەو لە (عن) دا بەم جۆرەیە:

دفـتـری بینە بزانم چەکـراوە امـرو

بودری کلکت جملە مصاریف چەبوە

١٠- ئەحمەد= بێرەدا دەرئەکەوێ کە کوڕی بووە.

شیو: چێشت

شلە ساوەر: چێشتێکە لە ساوەر دەکرێ، بەڵام ئاوی زۆر تیایەو ڕوونە.

کودوو: کوولەکە، کودی، کوودی.

ئەم تاکەش لە (ص، مس)دا نییە و لە وانی تردا دەیەمینە و لە (عن) دا بەم جۆرەیە:-

لە ئەحمـەدە خواردنی امروت چیـە لو ایواری.

دڵی شـیـوت شلـە سادە یا مـاست یا کـودوە.

١١- فرە: فراوان، گەورە، فش- قوون فرەباب: جوێنێکە و مەبەستی لەوەیە کە پێی ناخۆش بووە، ئەوەندە خواردنەیان هەیە بۆ ئێوارە دیارە ژنەکەی بەنیـازێک ئەمـاتەی کـردوون، کە ئەمـیش بەدناوکردنی ژنەکەیەتی لەژێرەوە، لەلایەن (کوردی)یەوە.

ئەم تاکە لە (ص، مس) دا نییەو لە (عن)دا بەم جۆرەیە:

(پی و لی قـون فرەباب از شـلە سـاوەر ناخـوم

مـاشـی نۆ سـالـە نماینە ئەوە چی گندوگـوە).

١٢-عيللەت: نەخۆشی، خەستەیی. ناساغی.

پشک: کـون تێ بوونی مـەشـکە و لێـوە وەلاندنی ئـەوی تیـایەتی. بـەلام لێـرەدا مـەبەسـتـیی لە نەخۆشیی ڕەوانیی (ئیسهال)ی (صالح)ە.

حەکیم: پزیشک- بەداخەوە کە خـوالێخۆشـبوو دوکتۆر (رافیع عەقراوی) و وشـەی (نۆشدار)ی لەباتی (پزیشک) بەکارهێنا- کە هەڵەیەو (نۆشدار)، (دەرمانساز)یە.

دەوا: دەرمان.

صیحەت: تەندروستی.

جەوت و بەڕوو: هەردوو بەری یەک جۆرە دارن و بەڕووەکەیان دەکرێ بـە ئارد بۆ نان بە کاڵی و کۆلاوی برژاوی دەخۆرێ، هەروەک بۆ نەخۆشی سک چوون (ڕەوانی باشن و جەوتەکەیان گەلێ سوودی پزیشکی و کیمیایی و پیشەسازیی تری هەیە و مەشکەو گوندە و پێستەشی پێ خۆش دەکرێ و (بەڕوو) وەک (ئالف) دەدرێ بە ئاژەڵ.

عیللەتی پشکی بگاتێ (عن): عیلەتێکی کە بگاتێ.

صیحەتی ئەو (عن) دردی آوی.

ئەم تاکە لە (ص، مس) دا حـەوتەمینەو لەوانی تردا دوانزە یەمینە (کوردی)- بە دوور کەوتنەوە لە (بابەت) لەم تاکە هەڵبەستەدا وەستاکارانەو لەژێرەوە جنێو بەو (صالح)ە داوە:-

مەبەستی ئەوە بووە کە لەبەر (کوندان) پاش هەڵۆڵ بووە، پیسیی بۆ ڕاناگیرێ.

١٣- ئاوس: زگ پڕبوون بە منداڵ و بێچوو.

حەیف: موخابن.

نەوع: جۆر، چەشن، جۆن.

ئەم تاکـە لە (عن) دا نیـیـە و بـۆیە هۆنەرەکـەی بـە (نەزانراو) داناوە هەروەهـا لە (ص، مس)دا هەشتەمینەو (ن) دا سیانزە یەمینە و لە هەمووان‌دا دوا تاکە.

حەیفە(ص) ایتر.

(کوردی) بەم پارچە هەڵبـەسـتـەوە هـی تری، شـوێن دەسـتـی خـۆی لە (هەبو) دا، بەچاکی دیاری کردووە، ئەگەرچی شێواوی بەم هەڵبەستەیەوە دیارە.

## تاری کاکۆڵت

١- «تاری کاکۆڵت لەسەر صەفحەی ڕوخت تاتارییە»
خەططی دەوری لێوی ئاڵت جەدوەلی ژەنگارییە
٢- ڕۆین و، وەستانەوەو عیشوەو نیگاهێکت هەیە
نازە یاخۆ خەشمە، یاری هەمدڵی و خەمخوارییە
٣- دڵ بریندارم بە پەیکانی موژەی خونڕێژی تۆ
ناڵەیی زاری منی زاری لە ڕۆح بێزارییە.
٤- لێوی من موشتاقە قوربان بۆ ئەسەر لێونانی تۆ
ڕۆح لەسەر لێوم بە موژدەی وەصلت ئینتیظارییە
٥-حالەتی نالاندنی (نەی) پێت بڵێم وەجهی چییە؟؟
بۆ فیراقی ڕووی حەبیبان، ائیما هاوارییە
٦- من چم و حەددم چییە عاجز دەبی لێم چاوەکەم
عەقڵ و دینم حەفەیە جان و دڵم، سەربارییە
٧- تاکەی ئاخر، حەسرەتی کاکۆڵەکەت پەنهان بکەم
هجری (ئاشوفتە دڵی و) کاکۆڵ پەرستی کارییە

................................................................

١- تاری: داوی، تاڵی مووی، داوی موو، تەڵی موو.
کاکۆڵ: مەبەست لە قژی درێژی پرچ قرتاوی نێرینەیە.
لێرەدا هەرچەند (کوردی) ناوی کاکۆڵی خۆشەویستەکەی بردووە، بەلام مەرجیش نییە کە کاکۆڵی بووبێ، بەلام نێرینە بووە وەک لێکی دەدرێتەوە.
صەفحە: ڕوە پەڕە: تەختی ڕووی خۆشەویستەکەی مەبەستە.
ڕوخ ڕوو، ڕوخسار (صەفحەی ڕوخ) نیشانەیە بۆ چواندنی بە (ڕوو)بە ڕووپەڕەی قورئان: یا پەڕەی گوڵ.
تاتار: مەبەست لە (تەنەر= مەغۆل)کانە و کردنی تاری کاکۆڵەکە بەو (تەتەر)ی یا نیشانەی بەهێز و کاریگەرییە و جیناسی تیایە.

خەططی دەوری لێو: مەبەست لە سمێڵ و ڕیشە کە وەک نووسراو (خەت) دێری نووسینەکە بەسەر ئەو پەڕەی ڕوویەوە.
جەدوەلی ژەنگاری: (جەدوەل- لێرەدا بەواتە- ڕێچکە) و (ژەنگار، ناوی ڕەنگێکی شینی کاڵە) بەنیشانەی ڕێچکەی مووی (دێر)ی تارە سەر دەرکردووە کاڵەکەی بەسەر ڕوویەوە بووە و دیسان (جەدوەلی: ژەنگار)و (ژەنگال: سنجاد) کە شوێنی بەناوبانگترین دەزگای ئەستێرە شوناسی بووە (مرصد) لەسەرەتی عەباسییەکاندا لەشوێنی ئەم ساری (گرینویچ)ەی ئێستا بووە. کە سەرەتای ئەندازە و پێوانەی گۆی زەوی و میقاتی سەعاتی جیهانی و، هتد کە لەسەر ئەوە کراوە، شوێن ئەندازیاران و زانانی بەناوبانگ بووە لە زانستی بیرکاری و ئەندازیاریی زەوی شوناسیدا بەرکاریان هێناوەو (پەرگارەکە) سمێڵە قەیتانییەکەی بووە کە تازە مووی لێ هاتووە و جەدوەلی زانیارانەی زاناکانی (سنجار) بووە. سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە لە دەسنووسی کۆن (عن، ع، ص، ف، لاپەڕە ٣، نم/ ١)ە وە لە چاپکراویشدا ( لاپەڕە ٢٨، ٢٩، گ لاپەڕە ٥١، س لاپەڕە ٤٩، گ٣) یە و، دوا تاکیشی لە لاپەڕە ٢٩٨ی لە مێژووی ئەدەبی کورد)ی مامۆستا عەلائەدین سەجادی دا چاپ کراوە.
کەشکۆڵی (عن) بەر لە نووسینی ئەم هەڵبەستەی سەرەوە هەڵبەستکی تری نووسیوەو لەسەرەتای ئەو هەڵبەستەشدا نووسیویە: حسرتی در ردیف «نالی» برای کردی رحمم الله نوشتە- علی) واتە: (ئەم هەڵبەستە کە هاوچەشنی هەڵبەستێکی نالییەو (حەسرەتی) بۆ (کوردی)ی نووسیوە خوا لێیان خۆشبێ- عەلی) ئەمجا دوای ئەو هەڵبەستە ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی لەژێر سەرەناوی: (پاسخ کردی برای (حسرتی) در ردیف او و (نالی) رحمم الله - علی) نووسوە واتە: ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی) وەڵامی «کوردی» یە بۆ: (حەسرەتی) کە لە هاوچەشنی هەڵبەستەکەی (نالی)دا ئەو واتە (کوردی)یش دایان ناوە خوا بیانبەخشێ- عەلی).
ئەو هەڵبەستە نیشانە بۆکراوەی (نالی) کە (حەسرەتی) لە هاوچەشنیدا نامەکەی بۆ (کوردی) نووسیوە و (کوردی)یش بەهەمان هاوچەشن وەڵامی داوەتەوە ئەمە سەرەتاکەی هەڵبەستەکەی (ناڵی)یە (بەرگی دونیا هێندە کورت و کۆنەو و، بازاڕییە)، هەروەها گەڵی لە هۆنەرانیشمان هەڵبەستیان لەم هاوچەشنە گوتوە، وەک (وەفایی)و...هتد کەواتە ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی) وەڵامی نامەیەکی هۆنراوەی (حەسرەتی)ی برادەریەتی کە ئەوی (حەسرەتی) لەخوارەوە پێشکەش دەکەم هەڵبەستەی (حەسرەتی)یە هێشتا چاپ نەکراوە و ئەمە (یەکەم جار)ی چاپکردنیەتی وەک پێ بزانم. وەلە دوا تاکی هەڵبەستەکە (کوردی)دا ناوی (حەسرەتی) هاتووە. شایانی دەست نیشان کردنە کەوا (حەسرەتی) (نازناو)ی (مەلا عومەر) ناوێک و هەواڵ و هاوچەرخی (کوردی)بووە و من بە (مەلا عومەر)ی (ڕەنجووی)ی دەزانم کە ئەشێ ئەویش جگە لە نازناوی (ڕەنجووری) نازناوی (حەسرەتی)یشی بووبێ وەک (سالم) نازناوی (بیمار) و (کوردی) نازناوی هیجریشی هەبووە و ئەگەر ئەم (حەسرەتی)یە، ئەو ڕەنجوورییە

نەبێ کەوا (مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی) دیوانێکی نایابی لەسەر ئامادەی چاپ کردووە، ئەوا لەو مەندە پتری لێ نازانم کە (کوردی) هەڵبەستی (قەوسی ئەبرۆو موژەت تیروکەوانە بە عومەر)ی بۆ ئەوە گوتووە. وەک لەویدا نیشانەم بۆ کردووە، بەڵام وەڵامەکەی ئەو مەلا عومەر (حەسرەتی)یەم یا (رەنجوی)یەم، دەست نەکەوتووە کە بۆ (کوردی)ی نووسیوە، ئەوە بەرامبەر بەو هەڵبەستەی تری (کوردی) دای نابێ.

خەططی (ع، ص) خط ڕێنووسی کۆنە.

خەططی (گ): خەت

دەوری (گ): لە دەوری

دەوری لێوی (ع): لیوی.

حەد دەلی(ص،ع) جدول.

ژەنگارییە (ر) ژنگاری.

ئەم نیشانە بۆ (جەدوەل) و (ژەنگار) و خەط کە ئەمانە زار گوتی (گەردوون و ئەستێرە شوناسی)و (ڕەنجوور)ش ئەستێرە شوناسێکی کەم هاوتای سەردەمی خۆی بووە، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەو (حەسرەتی)یە ڕەنجووری بێ. ئەمیش نامەکەی مەلا عومەر (حەسرەتی)یە کە بۆ (کوردی)ی داناوە و ئەم هەڵبەستەی سەرەوە لە وەڵامی ئەمەدایە:

**(نامەی حەسرەتی بۆ کوردی)**

«تاری کاکۆڵت لەسەر صەفحەی ڕوخت تاتارییە؟»

یا لەسەر گەنجینەیی لێوت کە مەشقی (مار)یە

یادی ڕەنگ و، دەنگ و، کردارت؛ دەروونم جۆش ئەدا،

دڵ وڕێنەی وەصلەکەی پارو لیقای پێرارییە.

حەیفە وابێ باکی، جارێ یادی من ناکەیتەوە؟؟

هەر لەتۆم دیوە عەزیزم ئەم لە دۆست بێزارییە.

دڵ برینداره لە دووریت تۆش ئەوەندە بێ وەفای،

هانێ، فەرموو گوێ لەدەنگی بگرە چۆن هاوارییە.

قافڵەی کاڵای (عیتاب)و (لۆمە) دیاریی دەستمە

بۆ دەلیلی خۆشەویستی هاتنم سەر یاریی یە.

خۆزگە دەتزانی کە چەند موشتاقی دیدارم وەلێ،

تۆ نەهاتی، من ئەوا هاتم، بەڵێ: ناچارییە.

ڕەسمی خۆیانە کە عاشق تووشی (هیجری)کا دەسا

(حەسرەتی) پێی خۆشە، چونکە بێ وەفایی کارییە.

ئەمە پارچە هەڵبەستەکەی (حەسرەتی) بوو لە هاوچەشنی هەڵبەستەکەی نالیداو نامەی (حەسرەتی)یە بۆ (کوردی) جارێ تەنیا سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەی (حەسرەتی) کەشکۆڵی

(عن)ە و لە شوێنی تردا بەرچاوم نەکەوتووە، سەرەتای ئەم هەڵبەستە کە بە:
«تاری کاکۆڵت لەسەر صەفحەی ڕوخت تاتارییە» دەست پێ دەکا ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هی (حەسرەتی)یەو (کوردی) لەوی وەرگرتووەو کردوویە سەرەتای هەڵبەستەکەی خۆی وەک (تەخمین) (تەلمیع) یا (تەرجیع) کە ئەمەش لە وێژەی کۆندا باوە و هەڵبەستی ژی لەم جۆرە لەم پەراوییەدا بەرچاو دەکەوێ.
کە ناوی (کاکۆڵ) بە (کوردی)یەوە دەبا دوورنییە (کوردی)ش کاکۆڵی بووبێ و مەرجیش نییە وابێ، کاکۆڵ بەنیشانەی (پیاو)یش هاتووە.
ئەم (نامە) و (وەڵام)و ساغبوونەوەی کوردی لە تاوانباریی (نێردۆستی) ڕزگاردەکات.
لەباسی (گەنجینەومار)ی تاکی یەکەمدا، نیشانە بۆ ئەوەیە کە گەنجینە هەمیشە مارێکی پاسەوانی لەسەرو هەتا خاوەنی گەنجینەکە پەیا دەبێ مارەکە ئاڕوا و ئەوی دەستی بۆ بەرێ مارەکە دەیکوژێ.
ناوەڕۆکی تێکڕای تاکەکانی هەڵبەستەکەی (حەسرەتی) بەڵگەی دۆستایەتیی بەهێز و خۆشەویستییەکی پڕ بە دڵە لە نێوانیانداو ئەوەندەش (حەسرەتی) خۆی بە دۆستی زانیوە، ئەوەتا توانجی تێ دەگرێ سەرزەنشتی دەکا، بەپێی تاکی پێنجەم و شەشەم دیارە (حەسرەتی) سەری لە (کوردی) داوە، بەڵام لە کوێی و کەی؟؟
وشەی (هیجری) هەرچەندە بەواتە (دووری)یە لەتاکی دواییدا واتە، بەڵام نیشانەیە بۆ نازناوی (کوردی) و لە ئاکامیشدا لە (کوردی) خۆش بووە کە لەگەڵیا بێ وەفایەو هەڵبەستەکەی (کوردی)ش کە لە وەڵامی ئەمدا، هەمان پەیوەندیی دۆستانە دەگەیەنێ کە (کوردی)ش لەدوا تاکی وەڵامەکەیدا، نازناوی خۆیش و (حەسرەتی)یشی بردوو. جگە لەوەی لەم پەڕاوییەدا لە دواتر دوو (نامە)ی هەردووکیان بۆ یەکتر بە (هەورامییانە) (زاراوەی گۆران) هەیە.
٢- ئەم تاکە بەتێکڕایی نیشانەیە بۆ هەڵبەستێکی کۆنی (فارس) کە دەڵێت:

(آخـورتو آمـوخت بـه هنگام دویدن
رم کردن و ایستادن وایس نگیریدن

واتە(ئاسک لەتۆوە لەکاتی ڕاکردنیا، ڕەوکردت (سڵکردن)، هەڵوێستانەوە و بۆ دواوە توارین فێربووە).
عیشوە: ناز
خەشمە: ڕقە، تووڕەییە.
باری هەمدڵی و (ع، ص، ف) یا همدلە.
باری هەمدڵی و (کم، نم، س): یاری همدلەی و (باریی هەمدڵەی). هەمدڵی و(ک٣) یا ڕەحمی دلەی ئەمیش هەڵەیە و دەسکاری وەسنگەیە. باری هەمدڵی و (ئەنوەر): یاخو لەبەر.
خەمخوارییە (گ، س، گ٣) خەمخوارییە.
ئەم تاکە لە(-) دانیە و لەوانی تردا دووەمینە.

٣– پەپک: تیر
خونڕێژ: خوێنڕێژ.
ناڵەیی زار: هاواری دەمی. دەنگی.
منی زاری: منی پەرێشان ئەمیش جیناس ئارایییە.
ڕۆح: گیان.
ئەم تاکەش دیسان لە (ر)دا نییەو لەوانی تردا سێیەمینە.
بریندارم (کم): بریندارم– دیارە هەڵەی چاپییە.
بریندارمم (گ۳): بریندارە. ئەمە دەسکاری، دەسنگەیە
بە پەیکانی (نم۱): بەگیانی
بە پەیکانی(ع، ن): پەیکان
خوێنڕێژی (گ،۲س، گ، ئەنوەر) خونڕێژی.
زارە (ژا، ن، کم، گ۲، س، گ۳، ئەنوەر)زاری
لەڕۆح (گ۲، س،گ۳) بەگیان دیسان گۆڕینی گێژە بۆ کوردی.
٤– موشتاق: ئارەزوومەند، تامەزرۆ،
ئەسەر: لەسەر،
ڕۆح: گیان.
وەصل: پێکگەیشتنی، کوردی مەبەستی لە هاتنی (حەسرەتی) بووە و، بەم نامەیە بانگهێشتی کردووە. ئینتیظار: چاوەڕوان.
ئەم تاکە لە (ر)دا دووەمینە و لەوانی تردا چوارەمینە.
بۆ ئەسەر (ر): بو لسر: ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
بۆ ئەسەر لێوەنانی (ئەنوەر): بو سری لیوانی.
ڕوح (گ۲، س) گیان– گومانی تیا نییە کە گیو ئەمەی کردووە بە کوردی.
وەصلت (ئەنوەر): وەصلی.
نیو باڵی یەکەم مەبەستی لەوەوە کە بگەن بەیەک و، لەگەڵ یەکدا بدوێن، ئەمەش وەستاکارای وێژەی کۆنە.
٥– عیللەت: دەرد، بەڵام مەبەستی لە (هۆ)یە = هۆ جییە؟ بۆ چ؟؟
وەجهی: هۆی چییە؟؟ لە چ ڕوویەکەوەیە.
فراق: دووری، لێرەدا: (لەفیراقی) بەجێ ترە. بەڵام کێشی هەڵبەستەکە ڕێگەی نەداوە، چونکە (بۆ فیراقی)یەکە وەک ئارەزووکردنێکی (فیراق) دەگەیەنێ، کە ئەوەش پێچەوانەی بیری ئەم تاکەیە، هەرچەندە (کوردی)ش مەبەستی لە (لەفیراقی) بوە، نەک (بۆ فیراقی).
حەبیبان: خۆشەویستان.
لە کەشکۆڵی (عن)دا بەرامبەر ئەم تاکی پێنجەمینە، ئەم پەراوێزە فارسیە. نووسراوە: (با آنکە

اين غزل كردى جواب (حسرتى) است اما دراين موقع كرد إشاره به (نالى) از (نالاندن) و (حبيبه) معشوقه است از (حبيبان) كرده وگفته، همچنا (نالى) مثال (نەى) از فراق (حبيبه) مينالد و، من مشتاق انتظار از فراق شما مينالم .... الخ– على)

واتە (لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم هەڵبەستەی «کوردی» وەڵامە بۆ «حەسرەتی»، بەڵام لێرەدا (کوردی) دەستی بۆ «نالی» لە (نالاندن) دا بۆ (حەبیبە)ی خۆشەویستی (نالی) کێشاوە لە وشەی (حەبیبان)ی ناو ئەم تاکە هەڵبەستەیدا، بۆی: هەر وەک: (نالی) مافەنری (نەی) لە دووریی (حەبیبە) دەناڵێ، منی ئارەزوومەند و چاوەڕوانیش لە دووریی تۆ ئەی (حەسرەتی) ئاوا دەناڵم... هتد... عەلی)..

منیش لەم (تەعلیق) و ڕەخنە جوانە، ئەمەی دەخەمە سەر: کەواتە ئەو هەڵبەستەی کە (حەسرەتی) و (کوردی) کە هاوچەشنەی هەڵبەستەکەی (نالی)ن، مەبەستیان لەم دوو تاکەیەتی کە تیایا (نالی) فەرموویەتی:

من لە بێ بەرگی (مچە)م پرسی کە بۆ چ ڕووتی؟ وتی:

ڕەبی من (شێت) بم،ئەگەر شادبم، بە بەرگی عارەبییە.

«خەلعەتی تەشریفی هەرکەسێ، چییە؟ غەیری کەفەن؟

هەر ئەوە هەم فاخیرەو، بۆ ئاخیری یەکجارییە؟؟

بەڵێ: ئەشێ (نالی) لەواتای ئەم دوو تاکەیدا وەک توانجێک لە (کوردی)ی گرتبێ، چونکە (کوردی) لە فەلسەفەی ژیانیدا بایەخی بە جلوبەرگ نەداوە و تەنانەت هەر کوێیەکی جلەکانی دڕابێ، نەیدووریتەوە، لەدوا دوای ژیانیشیدا زۆرجار بە ڕووتی سووڕاوەتەوە، ئەوەتا خۆی (کوردی) لە هەڵبەستێکیدا وتویە:

«چونکە مەحبووبە، بەناز پێم دەڵێ گاهێ (مچە) ڕووت»

کە لە کوردەواریدا باوە ناوی (مصطفا) لە خۆشەویستیدا (مچە)ی پێ وتراوەو دەیڵێن.

هەڵبەستەکەی (نالی) کە ناوی (مچە)ی تیایە، بەداخەوە سەرچاوەکانی (نالی) بە هەڵە ئەو (مچە) یەیان کردووە بە (مخە)و لە نەشارەزاییەوە بەستوویانە بە (محەمەد) ناوێکەوە، لە ڕاستیدا (مچە) یە و (مخە) نییە، بەشکو (مچە) لە زمانی کوردیدا کورتکراوەی (مصطفا)یە کە ناوی هۆنەرمان (کوردی) بووە و، لە کەسانی شارەزای وەک (توفیق بەگی فەتاح بەگی ساحیبقران) بیستومە کە (نالی) مچەی بەو گوتووە هەر وەک (کوڕی) هەمان کورتکراوەی بێ لە نێو باڵەی سەرەوەیدا ناوی خۆی بە (مچە ڕووت) بردووە، لەگەڵ شێخ محەمەد (فخر العلماء) گفتوگۆیەکی لەبارەی ئەم ڕووتییەی (کوردی)یەوە هەیە بەڵگەی تریشم بۆ ئەوەی کە ئەو، وشەی (مچە)یە لە هەڵبەستەکەی (نالی)دا، کە، (مخە) نییە دیسان لە کەشکۆڵە نایابەکەی (عن)دا کە لەوەێدا بە پەراوێزێکی (فارسی) لەسەر ئەو هەڵبەستەی (نالی) ئەم ڕاستییەی ڕوونکردووەتەوە، بۆ واتای ئەو هەڵبەستەی (نالی)یش بڕوانە دیوانی نالی (مامۆستا مودەڕیس و کوڕانی) لاپەڕە: (٥٧٩)و بە لێ ووردبوونەوەش ئەم بۆچوونەم جێگیر

ئەبێ، چونکە وەکو بیستوومە (نالی) لەدوای ئەوەی کۆڵێ داوە لە ئامۆژگاری کردنی (کوری)دا بەبێ سوودی لەو ڕێگەی ئامۆژگار ڕووت و هەڵپچراوییەی لای داو ناچار لەو هەڵبەستەیدا بەو دوو تاکەی سەرەوەی لەژێرەوە لەبیرە فەلسەفەییەکەی ژیانی (کوردی) و لەهۆی ڕووتییەکەی و بیروڕای (کوردی) دواوە، بەڵام (کوری)ی تیابە: (مچە شێت) (مچە ڕووت) دەربڕیوەو، دوورنییە (حەسرەتی)یش هەر لەبەر ئەم هۆی ڕووتییەی (کوردی) بووبێ کە لەسەر هاوچەشنی ئەو هەڵبەستەی (نالی) نامەکەی بۆ (کوردی) نووسیبێ و، وەک بڵێی (حەسرەتی)یش لەژێرەوە هەمان توانجی (نالی)ی لە (کوردی) دابێت و (کوردی)یش ئەوەندە زیرەک و، وریا بووە لە مەبەستەکانیان گەیشتووە، لێرەدا بە هەلی زانیوە ئاوا لابەلاو لەنێوان وەڵامەکەی بۆ (حەسرەتی)ی دا.

شاعیرانە توانجی خۆی ئاوقای سەرو گوێلاکی (نالی) بکاتەوە، و ئەوەتا ئەمیش هەم ئالاندنەکە ی(نالی)ی بۆ (حەبیبە)ی خۆشەویستی بە فەلسەفەی ژیانی (نالی)ی داناوە و هەم لەپاڵ ئەوەشدا (نالی)ی تیا کردووەتەوە (نەی): لوولە قامیشێکی بەتاڵی ڕەق و تەق و، وشک و کونکون وەک (نای) کە (نەی)یە وەئەمەش لە تۆڵەی ئەوەدا کە (نالی) لەباسی فەلسەفەی ژیانی (کوردی)دا کە ڕووتییە بە (مچە شێت) و (مچە ڕووت)ی داناوە، وەکو لە پیرە شارەزاکانم بیستووە کە (نالی) لە گوفتوگۆیدا لەگەڵ (کوردی) لە میانەی دۆستایەتیدا بە (مچە شێت) ناوی بردووە.

هەر وەک بۆم ساغ بووەتەوە (کوردی) لە سەرێنی تەمەنی گەنجێتی و لاوێتییەوە گوێی بە ڕێکوپێکی دیمەنی خۆی و پۆشتەریی و پەرداخی و جلوبەرگ و پۆشاکی نایاب نەداوە، لەگەڵ ئەوەشدا کوڕە جەگێکی گەورە بووە کە باپیری (وەزیر جەنگ) و باوکیشی دیسان (وەزیری جەنگی) پاشایەتی بابان بوون و لە (خانەوادە) دەست ڕۆیشتووەکەی (صاحیبقران)بووە کە یەکێک بووە لە (خانەوادە) مەزنەکانی سنە و خاوەن گوندو زەوی و زاری زۆر بووە، لە ناوچەی ئەردەڵاندا ولە ناوچەی (سولەیمانیشدا) زەوی و زاری گوندێکی زۆری هەبووە و تەنانەت وەک ئاگادارم تا ئێستاش لە وەچەی ئەم خانەوادەیە خاوەنی گوندانن لەچەند شوێن وەک گوندی (گەدان) و (کەماڵان) لە (شارەزوور) کە هی میرانی (ئیسماعیل بەگی) کوری نووری بەگی فەتاح بەگی صاحیبقرانە کە ئەحمەد حەمدی بەگی شاعیر و توفیق بەگی شاعیر مامی ئەون.

هەروەها بیستوومە چەند جارێک خزمانی (کوردی) لە کاتێکدا کە (کوردی) (بەرگ و زەخیرەی ساڵی)ی ماڵە هەژارێکی داوە، ئەو خزمانەی (کوردی) بە کوردی یان وتووە: (کورە زۆر نابەجێیە کە خۆت وەها ڕووت ڕائەگری، ئەوەندەی دات بەو هەژارە ساڵی ئەوەندەش بدە بە بەرگ و پۆشاکی خۆتدا).

(کوردی)یش لە وڵامدا. گوتویە: (مرۆڤ بە بەرگ و پۆشاکەوە هەڵناسەنگێرێت، بەشکو خودی خۆی مرۆڤێتی و مەزنیی و دەچەسپێنێ).

خودی کوردی لە زۆر لە هەڵبەستەکانیدا خۆی بە (مچە ڕووت، چەپەڵ، ڕێسمان و... هتد) ناو

بردووه و، بەتەنک پۆشـاکییـەوه نەبووه. لەبارەی ئەم ڕووتیـەیشیـەوه، جگە لە نالی جـاری تریش لەگەڵ (شـێخ محـەمـەد) (فـەخرولعولەمـای کورد) لە (تاران) گفـتوگۆیەکی فـەلسـەفی لە بارەی ڕووتییەوه هـەیە کە لەشوێن تری ئەم پەڕاوییەدا پێشکەشم کردووه.

لەڕووی وێژەییشـەوه بەرامـبەر بەو تاکە هـەڵبـەسـتـەی (کوردی) کـە (نالی) ی تیدا بە (نای – یارانەی= قامیش) چواندووه، بیرم بەلای ئەوەدا دەڕوات کە لەهەمـان ناوەڕۆکی هـەڵبەسـتـەکەی کوردییەوه، دیسـان هـەڵبەسـتێکی کۆنی فارسـییش تاکە هـەڵبەسـتێکی (عەرەبی) هـەیە کە ٠(هـاو ناوەڕۆکی) تاکە هـەڵبـەسـتـەکەی (کـوردی)ن لە خـوارەوه دەیاننووسـم. کـە بڕوا نـاکـەم (کـوردی) ئەو تاکـە (فارسی) و (عـەرەبی)یەی نەبیسـتبێ و، ئەمـەش لاوازی و لاسـاییکردنەوەو دزیکردنی ئەدەبی نـیـیـە، بەشکو لـە وێژەی کـۆنـدا ئەم جـۆرە دووبـارەکـردنەوەی (بیـروڕا) یە (بـاو) ێکی (ڕەوا)بووه و لەسـەر ئەم ڕەوایەتییـە دەقێکی عـارەبی دەڵێ: (مَنْ أَخَذَ شعِراً فحسّنهُ فقَّدْ ملّكه) واتە: ئەو هۆنەرەی هـەڵبـەسـتێک یا دەقێکی وتراوی وەرگرت و بەڵام بـە جـوانتـرین شـێوه ڕای گەیاند ئەو هۆنەرە بەڕاستی خۆی خاوەنی بیروڕایەکە و موڵکی ئەوه).

تاکە هـەڵبەستە فارسییەکەش ئەمەیە:

«بشنـو از (نی)، چون حـیکایت مـیکند

و ز جـــودایـهـــا شکایت مـــیکند»

دیسان تاکە هەڵبەستە (عارەبی) یەکەم لەم جۆرە بۆنەیەوەیە کە:

«أســمع الناسَ حين غنّى َوبكى

ومن فــراق الاحـبــة إشــتكى»

فارسییەکە واتە: (لە «نەی» ببیە کە چۆن سەرگوزەشتە دەگێڕێتەوه، کە تیایا لە (لەیەک دووری) گازندە دەکات.

عەرەبیەکەش واتە: (لە (نەی) دەببەم کە (گۆرانی وت و گریا) وه گازندە لە لێک دووریی خۆشەویستان دەکات

ئەمیش جیاوازییەکانی تاکە هەڵبەستەکەی (کوردی)یە لە سەرچاوەکانیدا:

ئەم تاکە لە (ر) دا چوارەمینەو لەوانی تردا پێنجەمینە.

عیللەتی (ع، ر): علت– ئەمەش ڕێنووسی کۆنە..

ناڵاندنی (ع): نالاندن– دیسان جۆرە ڕێنووسێکی دێرینە.

نەی (ن، نم/ ١، کم، گ/ ٢،س): دل.

نەی (ر): من.

وەجهی (ر): وجە – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

بۆ فیراقی (ص) بو فراق.

حەبیبان (نم/ ١) رقیبان.

٦– حەددم چییە: چ ڕایەم دەکەوێ.

عاجز: زویر، زیز، دڵگران.
عەقڵ: ژیری، هێژایی.
دین: ئاین.
توحفـه مـەبەسـتی لە (شـتی نایاب)ە کـە بەدیاری (عـەقڵ و دینەکـەیەتی بۆ حـەسـرەتی بەدیاری هـەڵبـژاردووە و، یـا (عـەقڵ و دین)ە کـەیەتی کـە لە حـەسـرەتیـیـەوە وەک (توحـفـەیەک) دەست (کوردی) کەوتوون.
جان: گیان
ئەم تاکە لە (ر) سێیەمین و لە هەموو ئەوانی تردا شەشەمینە.
دەبێ (ئەنوەر) دەبی
دینم (ر) هۆشـم: ئەمیش نابێ، چونکە هۆشـەکەش هـەروەک (عەقل)ەکەیە.
توحفەیە (ئەنوەر) دیارییە – بەڕاستی ئەمەش جوانەو جیناسەو دەگونجێ.
جان و (گ، س، گ٣) گیان و ئەمە بەکوردی کردنی (گیو)ە.
دڵم (ر، گ٣): دڵیش
٧- ئاخر: دوایی، ئیدی
حــەسـرەتی: خــەفــەتی و نیــشــانەیە بۆ (حــەســرەتی)ی هاواڵی کــە ئەویش لە دوا تـاکی هـەڵبەستەکەیدا ناوی (هیجری)ی بردووە.
(هیـجـری): نازناوی (کـوردی) یە و ئەشێ ئەم بـە یەکگەیشـتنەی (کـوردی) و (حـەسـرەتی) لە سولەیمانیدا نەبووبێ.
ئاشوفتە: پەشێو. کە ئاشوفتەدڵی: دڵ پەشێوییە.
ئەم تاکە لە (ر) دا پێنجەمینە و لەوانی تردا حەوتەمین و لە هەمووواندا دوا تاکە.
تاکەی (ع، ر): تاکی – ئەمە ڕێنووسی کۆنە.
حەسرەتی (ع): حسرت. دیسان ڕێنووسی کۆنە.
کاکۆڵەکەت (ئەنوەر): اگریجـەکەت– لە ڕوانگەیەکی صۆفـییانەوە (کاکـۆک)ڕەمزی (دووری)یە و ئەشێ (حەسرەتی)ش کاکۆڵی بووبێ– هـەرچەند – مەرجیش نییە –
دڵیو (جانی) دڵ، دێو (مێژووی ئەدەبی کوردی): دڵ و.

## شۆری ئەمجارەم

١- شۆری ئەمجارەم لە جۆری بەزمەکەی (شیرین) نییە
نەوعی سەودای کاکە مەم یا شەوقی (خاتوو زین) نییە
٢- مەسخەرەی دەهرە کە (بەندی هیجرەتە) دێوانەتان
دەک فەلەک بارت کەوێ وەک ڕێت لەسەر ئاین نییە
٣- وا لە یار و مەملەکەت بووم، خاکی ڕووی دونیام بەسەر
بۆ یەکا ئێستاکە کارم: بێ لە گریە و شین نییە.
٤- من لەگەڵ بەختی ڕەش و چەرخا کە پەنجە لێ دەدەم
چی دەبێ؟ سا با ببێ، غەیرەز ئەمەم تەمکین نییە.
٥- صەبری ئەییووبم هەبێ؟ هەردەم؟ دەروونم بێتە جۆش
جوز، لە نەظمی پارچە شیعرێ زێدەتر تەسکین نییە
٦- شەرحی حاڵی من لە (تاران) سوویی یارانە، بەڵێ
بۆ میانی دۆستی؛ بستێکە، قوولەی چین نییە.
٧- نەفسی (هیجری) بەرزە، بۆیە ڕازی خۆی ناڵێ بەغەیر
سککەیی صاحیبقرانی چون بەهای پاین نییە.

---

١- شۆر: هاوار، دەنگ و ساز و ئاواز، بانگەواز.
جۆر: چەشن، نەوع، (شۆروجۆر) سەجع ئاراییی تیایە.
بەزمەکەی شیرین مەبەستی لە چیرۆکی شیرین و دڵدارەکەیەتی کە بووەتە مایەی (بەزم) لەنێوان (فەرهاد) و (خوسرەو) و (کوڕەکەی)دا کە هەموو حەزیان لە شیرین کردبوو. کە (کچە ئەرمەنی)یەک بووە.
لای ئەوان ناوی (سیرۆن) بووە و بەپیلانێکی نامرۆڤانە سەری (فەرهاد)ی تیاچووە.
سەودای: عەشقی، ئەڤینی.
کامە مەم: مەبەستی لە چیرۆکی ئەو و خاتوو زینی دڵدارییە کە ئەحمەدی خانی بە هەڵبەست نەمری کردووە و کردوویەتە هاوتای (لەیل و مەجنوون) و (ڕۆمیۆ و جوڵێت).

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە (عن): تاکی سێیەمیەتی بەتەنیا لە (ف)دا بەهەڵە ئاوێتەی هەڵبەستی (ڕەنگی گوڵ گیانە وەکو ڕوخسارەکەت ڕەنگین نییە)ی (کوردی)ی کردووە، کە پارچە هەڵبەستی ژمارە (٨٥)ی دوای ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیە.
لە (عن)یشدا لەسەر ناوی ئەم هەڵبەستەدا نووسراوە (نامَەء کُردِی دَرْ بَنْدخانَەء طَهْران سُوِی یارانَش دَرْ شَهْرِ سُلَیْمانیە- علي). واتە (نامەی کوردی لە بەندیخانەی (تاران)ەوە بۆ یارانی خۆی ناردووە لە شاری سلەیمانی- عەلی.

٢- مەسخەرە: گەمە جاڕ، گاڵتە پێ کردن.
دەهر: ڕۆژگار، سروشت (فەلەک)، گەردوون.
هیجرەت: دوورکەوتنەوە- نیشانە بۆ پەندی پێشینانە کە (بەرد لە شوێنی خۆیدا سەنگینە) و ئەوەتا لێتان دوور کەوتووەتەوە بەند کراوە.
دێوانەتان: مەبەستی لە خۆی بووە کە دێوانەی یارانی خۆی بووە.
ئاین: مەبەستی لە ڕێی ڕاست و دادپەروەرییە کە لە دەهردا نییە.
بەداخەوە کات و هۆی ئەو بەندییەم لێ ئاشکرا نەبووە.

٣- یار: دۆست، مەبەستی لەو یارانەیە کە ئەم نامەیەی بۆ ناردوون.
مەملەکەت: پاشانشینی، مەبەستی لە خاکی بابان بووە.
ئەم تاکە بەتەنیا لە (ف) دایە و بەهەڵە کراوەتە سێیەمین تاکی پارچە هەڵبەستێکی تری (کوردی) کە لەدوای تەواوبوونی ئەم هەڵبەستەوە پێشکێشی دەکەم.
وا لە یارو (ف): دور لیار و.
خاکی (ف): خاک. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
بێ لە (ف): غیر. بەڵام (بێ لە)کەی (عن) جوانتر و بەپێی شێوەی کۆن پەسندتر بوو کە ئاڵۆزییەکی سەرلێشێوێنی وێژەی تیایە کە وەستایی دەگەیەنێ.

٤- چەرخ: ڕۆژگار، سروشت.
غەیرەز: جگە، بەبێ، بلی، بێ لە.
تەمکین: توانایی، وزە، لەبارابوویی.

٥- صەبری ئەیووب: پشووی ئەیووب و مەبەستی لە صەبر و خۆڕاگریی حەزرەتی ئەیووبە کە پێی بەناوبانگە و بەرامبەر بەتاقیکردنەوەی خوایی بەنەخۆشی و لێقەومان و خۆڕاگرییەکی یەکجار پشوو درێژی بوو وەک لە چوار شوێنی ئایەتەکانی ١٦٣ (النساء) و ٨٤ (الأنعام) و ٨٣ (الأنبیاء) و ٤٩ (ص)ی قورئانی پیرۆزدا لە (سفر)ی ئەییوبی (عەهدی قەدیم) واتە (تەورات) تێیدا هاتووە.
جوز: جگە، بەبێ، بێجگە.
نەظم: هەڵبەست: ئەمەش بەڵگەی بەرهەم و زۆرییەتی کە ئەوی هەستی جووڵاندبێ،

هۆنراوەیەکی لەسەر داناوە. کەچی بەو حاڵە ئەم تۆزەی ناو ئەم پەڕاوییەم لێی دەسکەوتووە، کە گەلێ پتری بووە؛ چونکە ئەو هەر خەریکی نووسین و خوێندنەوە بووە وەک لە شوێنێکی تردا وتوویە:

منم و جەفا و فیراق و ئومێدی ویصالی یار
(کاغەز) ڕەفیقی ڕۆژ و (شەمع)یش ئەنیسی شەو.

زێدە: زیاتر، پتر.

تە سکین: دامرکان، ئارام.

٦- شەرحی حاڵی: باسی باری، لێ ڕوانینی چۆنیەتی خۆی.

تاران: پایتەختی ئەوسای (قاجاری)یەکان بووە.

یاران: ئەو دۆستانەی نامەکەی بۆ ناردوون و جوانیی وێژەیی لە نێوان (یاران ، تاران)دا هەیە. بەداخەوە وێ نەکەوتووم ئەم یارانە (کێ بوون).

میان: بەین.

بستێکە: بنگوستێکە هەرچەند ئەمەش (موبالەغە)یە کە نێوان ئەم دوو شاری (سلێمانی) و (تاران) بستێ بێ، بەڵام بۆ نێوان دۆستایەتی ڕاستە کەمە.

قوللەی چین: بەستی نێوان چین و ژاپۆن کە لە پێشترا لێی دواوم وە، جاران بەزۆر دوور و سەخت زانراوە، گوایە کەس نەیگەیوەتێ.

بەم تاکەی (کوردی) هانای بۆ دۆستەکانی بردەوە کە فریای بکەون و نەک بەرەپ و ڕاستی گوتوویە، بەشکو لە ژێرەوە تێی گەیاندوون.

٧- نەفسی: سروشتی، خودی، ڕەوشتی، دەروونی.

ڕاز: نهێنیی دڵ.

غەیر: بێگانە، بیان.

سککەیی صاحیبقران: مەبەستی فاملیاکەی خۆیەتی کە ئەو (لەو) بووەو بۆیە وەک خانەوادەکەی نەفسی بەرزە و خۆی بەنەفس بەرز داناوە؛ چونکە لەو فاملیا بەرزە بووە.

بەها: نرخ، ڕێز، شکۆ.

پایین: نزم، پەست، داکەوتوو، بێ نرخ.

لێرەدا خانەوادەکەی خۆی کردووە بەپارچە دراوێکی زێڕی بەنرخ. بۆیە بێزی نەهاتووە هانا بەرێتە بەر عەجەمەکان کە فریای بکەون و، دۆستانی (سولەیمانی)ی بەخۆ زانیوە بۆیە دەستی بۆ درێژ کردوون کە یارمەتیی بدەن و دوور نییە ئەم نامەیەی بۆ (سالم) و یا خزمانی نووسیبێ، ئەویش وەڵامی دابێتەوە، کە وەڵامێکی وەهام پێ نەزانیوە.

## ڕەنگی گوڵ

١- ڕەنگی گوڵ، جانا وەکو ڕوخسارەکەت ڕەنگین نییە
شەککەری میصری وەکو گوفتارەکەت شیرین نییە
٢- ئەهلی چین؛ نەققاشی چاکن. بەڵان تەصویری تۆ
نەقشی خامەی کردگارە، کاری وەستای چین نییە
٣- مەنعی من عەمدەن دەکا ئەغیاری گەوج یاخۆ (کەر)ە
طالیبی پووش و گیا، جۆیای گوڵ و نەسرین نییە
٤- (مەنطیق)م طەی کردبە ئەحوالاتی تەئریخیشەوە
هیچ وەکوو عەشق باعیثی جان یان مایەی ژین نییە
٥- من کە کوشتەی تیغی عەشقم، ڕۆژی دیوانی خودا
بۆچی شاهید بێنم؟ ئاخر بەرگەکەم خوێنین نییە؟؟
٦- مەشقی مەنصوورە لە وەختی کوشتنیشدا پێکەنین،
ئارێ بەشقی عەشقە عاشق، سەر بەبوغض و کین نییە
٧- من کە ڕیسوا بووم و تەپڵی عاشقیم لێ دا ئیتر
(کوردی) هیچ پەروای دڵ و سامان و جان و دین نییە

..............................................................................

١- جانا: ئەی گیانەکەم، ڕەوانەکەم.
ڕوخسار: ڕوو، دەموچاو.
ڕەنگین: هەرچەند بەپێی (زمانی) بەواتە ڕەنگاوی یا ڕەنگاوڕەنگەیە، بەڵام مەبەست لە جوانییە وەک جوانیی پەڕەی گوڵ و ناسکی و بۆن خۆشیی.
شەککەری میصری: قەندی وڵاتی میسر کە پێی بەناوبانگە و جۆرێکی زۆر شیرینە و هۆنەران زۆر بەکاریان هێناوە لە هەڵبەستیاندا.
گوفتار: گوفتوگۆ، مەبەست لە زمان شیرینی و قسەخۆشییە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە دەسنووسدا (مس، عن، ص، ف، نم١، با)یە و لە چاپکردنیشدا (گ٢، س، گ٣، کم) و من (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە، بەداخیشەوە کە (بۆنە)ی ئەم

هەڵبەستەم بۆ ڕوون نەبووەتەوە.

ڕەنگی گوڵ جانا (مس): رنگت کل جانا – ئەمەش بەڕێنووسی کۆنە.

ڕەنگی گوڵ جانا (ف): رنگی گل قربان.

ڕەنگی گوڵ جانا (نم١): رنگی گل.

ڕەنگی گوڵ جانا (با): رنگی کل قطعا.

رەنگی گوڵ جانا (کم): رەنگی گول.

ڕەنگی گـول جـانا (گ٢، س، گ٣): ڕەنگی گـوڵ گـیـانا– ئەمــەش بە ئاشکرا لە دەسکاریی (مامۆستا گیو)ە کە کورد هەرگیز نەیگوتووە و ناڵێ (گیانا) بەشکو (گیانە)یە.

رەنگی گول جانا (ب): رنک کل قربان.

روخسارەکەت (مس، عن، ص، ف): رخسارکت – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

شەککەری (نم١): شکری. ڕێنووسی کۆنە.

شەککەری (کم). شکری. ڕێنووسی کۆنە.

شەککەری (مس، ص): شکر

شەککەری میصری (با): شەکری مصری قط.

٢– ئەهلی: دانیشتوانی، کەسانی، نیشتمانییانی، خەڵقی، نیشتەجێیانی.

چین: وڵاتی چینە کـە دەکـەوێتـە ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی کـیـشـوەری ئـاسـیـاوە و، بەهـونەرمـەندانی وێنەکـار (نەقـقـاش) و پەیکەرتاش و کـاری دەسـتـیـی ورد و هونەری و ئەمـانە بەنـاوبانگن. وەک (کوردی)ش ئەمەی زانیوە.

نەققاش: نەخشەکێش، هونەرمەندانی وێنەکار، شێوەکار.

بەڵان: بەڵام.

تەصویر: وێنەی، نەخش، شێوەی.

نەقشی: نەخشی، وێنەکێشراوی، نەخشاوی.

خامە: پێنووس، قەڵەم. کە قەڵەم وشەیەکی کوردییە لە (کەلەم)ەوە هاتووە.

کردگار: دروستکار و مەبەستی خوایە کە نەخشەکەی گەلێ لە هی وەستـاکانی چین جوانتر و دڵگیرترە کە خۆشەویستەکەی (کوردی)یە.

وەستای چین: مەبەستی هونەرمەند (نەققاش)ەکانیانە.

ئەهلی (ب، مس): اهل. – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

نەققاشی (ب، مس): نقاش. دیسان ڕێنووسی کۆنە.

بەڵان (ف): بلا.

تەصویری (ب، مس، ص): تصویر. ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.

نەخشی (ب، مس، ص): نقش.
کاری (ب، مس، ص): کار. ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.
وەستای (مس): وستا.
٣- مەنع: بەرگریی، ڕێ نەدان، ڕێ لێ گرتن. (لە یارەکەی)
عەمدەن: بەقەستی، بەئارەزوو.
ئەغیار: بێگانان. مەبەستی دز و خراپ و ناکەس و ناحەزەکانە و دەبوو بەپێی ناوەڕۆکی هەڵبەستە (غەیر) بووایە بە (تاک) نەک بە(کۆ) بیگوتایە (غەیرە).
کەر : نەفام، ناژیر، بێ هۆش.
طالیب: خواستیار، خواستەر، خوازیار، ویستەر.
جۆیا: ویستەر، ئارەزوومەند، بەتەما.
نەسرین: جۆرە گوڵێکی نایابی سپی و بۆن خۆش و جوانە و مەبەست لە یارە و، مەبەستی لە پووش و گیایە کە بۆ ئەغیارە کەرەکەیە و ئەوی گوڵە نەسرینەکەشی دەوێت ئەوە مەبەستی لە (کوردی) خۆیەتی.
مەنعی (مس): منع: ڕێنووسی کۆنە.
ئەغیاری (مس): اغیار. ڕێنووسی کۆنە.
ئەغیاری گەوج (ف، نم١، با، کم، گ٢، س، گ٣): ئەغیارەکەت. ئەمیش هەڵەیە؛ چونکە نابێ ئەغیاری خۆشەویستەکەی (کوردی) بێ، بەشکو دەبێ ئەغیاری (خودی کوردی)بێ، بەوەدا کە (مەنع)ی (کوردی)ی کردووە.
طالبی (مس): طالب. ڕێنووسی کۆنە.
گیا (نم١، با، کم): گیایە.
گیا (گ٢، س، گ٣، ص): گیا و.
جۆیای (ب، مس): جوی و. ئەمەش واتا نادات.
جۆیای گوڵ و (نم١، کم): خواهشی.
گوڵ و نەسرین (ف): گول نسرین.
٤- مەنطیق: زانستی هۆشمەندی و ژیرییە بەزانستی (المیزان) واتە (ترازوو)ش ناوی دەبەن، چونکە وەک تەرازوویەکی ورد وایە بۆ پاراستنی هۆش و ژیری لە هەڵەی بیری و قسە نەکردن و کەم نەهێنان.
(کوردی)ش شارەزای ئەم زانستە نەبووبێ پرکێشی ئەوەی نەکردووە ئەم توانایەی خۆی تیا دەرببڕێت.
طەی: بڕین وەک بڕینی ڕێگە یا لە شتێ گەیشت و پەی پێ بزانێ.

ئەحوالات: بارەکانی.

تەئریخ: مێژوو – زانستێکە لە بارەی ڕووداوەکان و کات و هۆیەکانیان دەدوێ. (کوردی) لەم زانستەشیدا پەی پێ بردنی خۆی تیا دەربڕیوە لەم بارەوە واش بووە و بەڵگەش هەڵبەستەکانێتی؛ چونکە زۆر شارەزای مێژووی ئیسلام و گەلەکانی بەتایبەتی و مێژووی تر بەگشتی بووە.

هیچ: چ چشتێکی مەبەستە.

باعیث: هۆ. سەبارەت.

جان: گیان.

مایەی ژین: مەبەستی لە عەشقەکەیە دەشکوژی و زیندووشی دەکاتەوە.

ئەم تاکە بەتەنیا لە (س، عن، ص) دایە و چوارەمینە لەوانی تردا نییە و، هێشتا چاپیش نەکراوە.

ئەحوالاتی (مس، ص) حوالات – ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

باعیثی (مس، ص) باعث – دیسان ڕێنووسی کۆنە.

یان (ص): یاخو. ئەمەش لەنگی دەکات.

٥– کوشتە: کوژراو.

ڕۆژی دیوانی خودا: ڕۆژی دوا لێپرسینەوە کەسان لەلایەن خواوە (قیامەت).

شاهید: گەواهیدەر، ئەوی ئاگەداری کارێ بێ.

ئاخر: ئیدی.

خوێنین: مەبەست لە برینداری و شەهیدیی خۆیەتی کە ئەو خوێنە شاهیدە بە بەرگەکەیەوە و شەهید بەبەرگی خۆیەوە دەنێژرێت.

ئەم تاکە لە (مس، عن، ص)دا پێنجەمینە و لەوانی تر چوارەمینە.

کوشتەی (مس، ص) کشتەء. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

کوشتەی (گ٢، س، گ٣): کوژتەی – ئەمەش گۆڕینی مامۆستا گیوە.

تیغی (مس): تیغ – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

تیغی (ف): تیر.

ڕۆژی دیوانی خودا (ب، مس، ص، ف): روژ دیوان خدا. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

خودا (نم١): خوا.

خودا (گ٣): جەزا. هەڵەیە و (جەزا) دیوانی نییە و (دیوان)ەکە هی خوایە.

خوێنین نییە (گ٢، س، گ٣): خوێناویە– ئەمەش لەگەڵ پاشبەندەکانی هەڵبەستەکە ناگونجێ و هەڵەیە.

بەرگەکەم (لە هەموو سەرچاوەکان جگە لە/عن) نووسراوە (کفنەکەم) کە ئەمەش هەڵەیە چونکە (کوشتەی عەشقەکە) مەبەستی لە شەهیدیی خۆیەتی، شەهیدیش ناخرێتە ناو کفنەوە بەشکو هەر بەبەرگی خۆیەوە دەنێژرێ بۆیە ئەو وشەی (کفنەکەم)ەم بەپێی (عن) گۆڕی و کردمە (بەرگەکەم) کە لە هەموو سەرچاوەکان ڕاستتر و پەسندتر و بابەتییانەترە.

٦- مەشق: خەریک بوون بەفێربوونی کارێکەوە.

مەنصوور: مەبەست لە مەنصووری هەلاجە کە چەند جاری تر لێکم داوەتەوە.

لەوەختی: لە کاتی.

پێکەنین: نیشانەیە بۆ پێکەنینەکەی (مەنصوور) لە کاتێکدا سزای کوشتنیان دەدا و خوێنەکەی خۆی پرژایە دەموچاوییەوە و دەستی کردە پێکەنین، لە وەڵامی ئەو هۆی پێکەنینەدا گوتی:

من خەمی ئەوەم بوو لەم سزادانەدا لەبەر ئازار، ڕووم گرژ ببێ، بەڵام شوکور ئەو خوێنەم کە ڕژایە سەر ڕووم و ئەگەر ڕووم گرژیش ببێ پێوەی دیار نابێ بۆیە سادەم و پێ دەکەنم، چونکە من خۆم لەسەر حەق دەزانم، بۆیە نابێ ڕووم گرژ بێت.

(کوردی) مەبەستی لەوەیە کە هەرگیز ڕوو گرژ ناکاو دەم بەپێکەنینە.

ئارێ: بەڵێ.

بەشق: پیرۆزێتی، حەقێتی.

بوغض و کین: ڕق و پیشخواردنەوە و، دڵڕەشی.

ئەم تاکەش تەنیا لە (مس، عن، ص)دا هەیە و شەشەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپش نەکراوە.

مەشق (مس، ص): مشق -ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

وەختی (مس، ص): وخت . دیسان ڕێنووسی کۆنە.

بەشق (مس): بشق- ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

بوغض و (عن): بغض. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

کین (ص): قین. ئەمەش دەگونجێ.

٧- ڕیسوا: بەناو، ئابڕووچوو، بێ ئابڕوو.

تەپلی عاشقیم لێ دا: دەنگی دڵدارییەکەم بڵاو بووەوە، پێم زانرا، ئاشکرام کرد.

هیچ: چ نە.

پەروا: ئەندێشە، ترس، مەترسی، باک.

سامان: دارایی.

جان: گیان.

دین: ئاین.

ئەم تاکە لە (ب، نم١، با، گ٢، س، گ٣)دا پێنجەمینە و لە (مس، عن، ص)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەمووشیاندا دوا تاکە، بەڵام لە (ب)دا شەشەمینە، چونکە تاکی سێیەمی پارچە هەڵبەستی پێشوو (شۆری ئەمجارە)، لە جۆری بەزمەکەی شیرین نییە)، تێدا ئاوێتەی ئەم پارچە هەڵبەستەکراوە بەپێنجەمین تاکی ئەم جۆرەیە:

«دوور لە یار و مەملەکەت بوم، خاکی ڕوی دنیام بسر»

بۆیا استاکە کارم غیری گریەوشین نییە.

لە هەڵبەستی پێشوودا ئەمە (شی کراوەتەوە).

تەپڵی (عن، س، س، نم١): طبل. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

تەپڵی (نم١): طپلی. ڕێنووسی کۆنە.

پەروای (ف): باک.

دل و سامان (ب): سر و ایمان.

سامان (نم١، ف، کم) ایمان و.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (گ٢، س، گ٣)دا بەم جۆرەیە:

(کوردی) ئەز پەروام سەر و ئیمان و گیان و دڵ نییە) ئەمەش لەگەڵ پاشبەندەکاندا، ناگونجێ و هەڵەیە.

## دەڕۆی قوربان

١- دەڕۆی قـــوربان، ڕەفــیــقـی ڕات خـــودا بێ
ئەنیــست، ڕەهبــەرت، شـــای ئەنبــیـــا بێ
٢- لەمـــەولا، من لە (مـــەولا)، شـــێـــری یەزدان
طەلەبکارم لەگـــەڵتـــا ســـایە ســـا بێ
٣- حـەســەن هـیـمـەت بکا بۆ حـوسنی کـارت
ئیـــمـــام عـــەببـــاس لە ڕێتـــا ڕانومـــابێ.
٤- دەڕۆی؟ هاتووی، لە من ڕوخسەت دەخوازی؟
نـیگـادارت بـڕۆ غــــــەوثـی بـەغــــــابێ
٥- هـەمـــــــوو هـەر (قـــــادر)ن دڵ بەندەتانە
بـنـــازم!! دڵ، لـە داوی (قـــــــــادر)ابێ.
٦- ئەگـــەر چی قـــەلبـــەکـــەم لاتە هەمـــیـــشـــە
بــــڕۆ وەک لاتــــە دڵــــمـــــت بـــا لـــــەلا بــــێ
٧- عـــەزیزم قـــەلبـــە، گـــەر ڕۆحـــە فـــیـــداتە
فـــەرامـــۆشم مـــەکـــە ڕەحـــمت دەبا بێ
٨- گــــولاو پاشی ســـــەلام و پایبـــــۆســــیم
لە هەمـــووانە چ شــــا بێـــتـــو گـــەدا بێ
٩- بـلـێ دێـوانـەکـــــــەی دیوانـی خـــــــۆتـان
بـەبـێ ئـێـــــــوە ئـەبەد هـەڵـکـردی نـابـێ.
١٠- بەڵێ عـــاشق هـەمـــیـــشـــە دیل و بەندە
ئـەبێ هـەر پـێی لـەداوی پەرچەمــــــابێ.
١١- بەخـزمـەت هەر دەگـا (هیـجـری) بەقـوربان
ئەگـەر لـەم بەندە سـەخـتـەی خـۆی ڕەهابێ.

............................................................................

١- ڕەفیق: هاواڵ، هاودەم، (هاوڕێی مەبەستە).
ئەنیس: پێچەوانەی نامۆیی کردنە، ئەوەی کە دەبێتە هۆی ڕابواردن و نامۆیی نەکردن، هاودەم.
ڕەهبەر: ڕابەر، پشتیوان، ڕێ نوما، ئاراستەکار.
شای ئەنبیا: شای پێغەمبەران و مەبەستی لە پێغەمبەری ئیسلامە (د.خ).
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە چاپ نەکراوە تەنیا دوو کەشکۆڵی دەسنووسە کە (عن، کش)ن کە لە (کش)یاندا (محەمەد ئەمین) ناوێک ئەم هەڵبەستەی بەشێواوی و ناتەواوی و بەبێ دیاریکردنی بۆنەکەی نووسیویە، بۆیە (عن)م کردە، بنکەی لێکۆڵینەوەی.
لە (عن)دا ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوە وەک سەرەناو، لەپێش ئەم هەڵبەستە نووسراوە:
(وداعیەی کردی دربندخانەء طهران کەیسر برادرش (قادربیک) بغرض تسهیل ر هاکرونش بە سلیمانیە فرستاوە- علی) واتە: (هەڵبەستی بەڕێکردنی «کوردی) بەندیخانەی (تاران)ەوە کە (قادر بەگ)ی برازای ناردووەتە (سولەیمانی) بۆ ئاسانکاری بەرەڵلاکردنی ئەو - عەلی)، واتە لەدوای سەردانی (قادر بەگ)دا لە (کوردی) کە لە بەندیخانەی (تاران) بووە ئەم هەڵبەستەی وتووە.
ڕەفیقی (کش): رفیق، ڕێنووسی کۆنە.
ڕەهبەرت (کش) هەمەبرو
شای ئەنبیابێ (کس): شای انبیای بی. ڕێنووسی کۆنە.
٢- لەمەولا: لێرەوەدوا.
مەولا: مەزن، گەورە، خۆشەویست و جیناس لەم دوو (مەولا)یەدا هەیە و جوانییە.
شێری یەزدان: مەبەستی لە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبە کە بە (سیف الله المسلول) ناو براوە و ئەم وشەیە بەڕێنووسی کۆنە کە بە (شیر) و (شێر)یش دەخوێندرێتەوە و جیناس ئارایییە.
سایە سا: (سایە = سێبەر) = (سایە = وەک)یە کەواتە (سایە)یە کەواتە سایەسا (وەک سێبەر)ە کە لە ڕووناکیدا سێبەر هەمیشە بەهەر شتێکەوەیە و لێی جیا نابێتەوە.
ئەم تاکە لە (کش)دا نییە.
٣- حەسەن: ئیمام حەسەنی کوڕی حەزرەتی عەلییە.
هیمەت: یاریکاری و پشتیوانی و بەهرەوەری.
حوسن: چاکی، جوانی و مەبەستی لە (کار دروستی)یە.
ئیمام عەبباس: حەزرەتی عەبباسی کوڕی حەزرەتی عەلییە و ناوی مامی پێغەمبەریشە.
ڕانوما: ڕێ نیشاندەر.
ئەم تاکە لە (کش)دا دووەمینە و لە (عن)دا سێیەمینە.

لە ڕێتا ڕانومابێ (کش): ڕەفیق ڕێکارت بی.

٤- ڕوخسەت (رخصەت): ئیزن خواستن، دوعاخوازی.

نیگادار: چاودێریکار.

غەوثی بەغا: شێخ عەبدولقادری گەیلانی کە مەزاری لە بەغدایە، بۆیە بە (بەغدا)وە ناوی دەرکردووە.

ڕوخسەت (کش): همت.

نیگادارت (کش): نکاە دارت -ڕێنووسی کۆنە-

غەوثی بەغابێ (کش): غوص بغدابی.

ئەم تاکە لە (کش)دا سێیەمینە و لە (عن)دا چوارەمینە.

٥- (قادر) ناوی (قادر بەگ)ی برازای (کوردی) و ناوی (غەوث) و ڕواڵەتی خوا و پێغەمبەر و عەلی و حەسەن و عەبباس و هەموو (گەل)ە وەک لەم تاکەیدا دەری بڕیوە.

بەندەتانە: بەڕێنووسە کۆنەکەی (بندتانە) وایە (بەندیی) ئێوەیە کە ئەمەش دەگونجێ لەگەڵ (بەندە = کۆیلە)دا.

ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لە (عن)دا پێنجەمینە.

٦- قەلب: دڵ.

لاتە: لاوازە، بێ هێزە، زەبوونە.

لاتە: لە لای تۆیە و ئەم دوو (لاتە)یەش جیناس و سەجع ئارایی و جوانییە.

ئەم تاکە لە (کش)دا پێنجەمینە و لە (عن)دا شەشەمینە.

ئەم تاکە لە (کش)دا بەم جۆرەی دوایییە و شێواوە:

«اکـــر قلبـــەکم لـەلا دورە ایســـتـــە

برو دل وەک دل لـەلات بو هـر لەلات بـی»

٧- عەزیز: خۆشەویست.

ڕۆح: گیان.

فیدا: بەقوربان، قوربانی، باڵاگەردان، سەرگەرد.

فەرامۆش: لە بیرچوون.

ڕەحم: بەزەیی، دڵسۆزی.

ئەم تاکە لە (کش)دا چوارەمینە و لە (عن)دا حەوتەمینە.

قەلبە گەر ڕۆحە فیداتە (کش): قلب و روحی من فدات بی.

ڕەحمت دەبابێ (کش) خوف خدات بی.

٨- گوڵاوپاش: گوڵاو پڕژێن.

سەلام: سڵاو، چاک و چۆنی، ڕۆژباشی، ئیکلام.

پایبۆسی: پێ ماچکردنی

گەدا: هەژار، مسکین (شاوگەدا) مەبەستی لە هەموونە لە دارا و دەستکورتی میللەتانی.

ئەم تاکەش لە (کش)دا نییە و لە (عن)دا هەشتەمینە.

٩- بڵێ: ئەی قادر تۆ بەوان (شاهوگەدا) بڵێ.

دێوانەکەی: شەیدایەکەی.

دیوانی: دیوەخانی، وەیا (کوردی) دیوانی شیعری ئێوەیە، و بە(دێوانە) واتە شێت.

ئەبەد: هەرگیز.

ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لە (عن)دا نۆیەمینە.

١٠- ئەم تاکەش لە (کش)دا نییە و لە (عن)دا دەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

١١- بەخزمەت هەر دەگا: بەدیدارتان شاد دەبێ.

(بەندە سەختە) مەبەستی بەندێتییەکەی تارانێتی کە دەشێ وەک لە پارچە هەڵبەستی (جۆری ئەمجارەم لە جۆری بەزمەکەی شیرین نییە) دا ناوی بردووە بەو پارچە هۆنراوەیەی هانای بردووەتە بەر دۆستانی لە سلیمانی و لەوانەیە دوا بەدوای ئەو نامەیە (قادر بەگ)ی برازای چووبێ بە دەنگییەوە دوای سەردان و تێگەیشتنی کاروبار، ئەوەتا بەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوە (قادر بەگ) بەرێ دەکاتەوە بۆ سولەیمانی بۆ ڕسگار کردنی مامی کە (کوردی) بووە.

ڕەها: ڕسگاری.

ئەم تاکەش لە (کش)دا بەم جۆرەی دواییە و شەشەمینە و لەوێشدا دوا تاکە.

«بخـذمـت هردکـا کردی بقـربان

اکر کلەکم بند نجات بی... تمت شد» واتە تەواو بوو.

## ی

٨٧

### ئەوا فەرشی موحیبەت ڕادەخەم

١- ئەوا فـەرشی مـوحـیـبـەت ڕادەخـەم یاران (قـەضـا) با بێ
سـەرینی مـیـحنەتم داناوە بۆ خـۆم، کـوا (بەلا) با بێ.
٢- دەمـێک بوو قـاصـیـدی ئاهم لە پرسـشـدا بوو تا ئـەمـڕۆ
ئەوا مـژدەی غـەمی هێنا، بەخـێـر بێ، مـاڵی ئاوا بێ
٣- قـاصـیـد: تەتەر، نامـەهێن و نامـەبەر
ئای: هەناسـەی سـاردی خـەمـبـارییـە
٣- دەڵێن قـافـڵـەی قـەضـا، باری غـەمی پێیـە عـەجـەب ماوم
لەگـەڵ ئەم زۆرییـەشـدا، ئەم مـەتاعـە ناڕەوا نابێ
٤- گلەم کـرد من لە غـەم، بۆچی بەجـێم دێڵێ جگەر سـۆزم
وتی، ئاخـر لە دڵتـا، جـێگە هێند تەنگە گـوزەر نابێ
٥- کە شـەرحی حاڵی خۆم بۆ کرد، لە (تەپڵی شادمـانی)ی دا
کـەس مـوڵکی وەهای نەبووە چ ئەسکەندەر چ دارا بێ
٦- ڕەفـیـقـانی قـەضـا: بۆ شـوکری حـەق ناکەن ئەمنتـان هەم
ئەگـەر من شک نەبەن دەرد و بەلا، دونیـا وەها نابێ.
٧- لە دەشـتی (شـارەزوور)ی دڵ، سـیـامـاڵی غـەمم هەڵدا
بەهەسـتوونە و چەڵەی ئاهم، مـەگـەر ئەم ماڵە وەستـابێ.
٨- لە داغی کـەوکـەبی طالیع لە دوو سـەرچاوەکـەی چاوم
نەمـاوە قـەطرەیێ، یاڕەببی ئەم ئەسـتـێـرە ئاوابێ
٩- بە مـەرگی خۆت قـەسـەم، ئاخر هەمـوو دەردێ عیـلاجی دێ
بەغـەیرەز دەرد و سـەودای عـەشـقی شـۆخێ سـەرو بالا بێ

١٠- زەلیل و بێکەس و زار و پەرێشـــــان حـــاڵ و بێ مــــاڵم
وەکـو مـن کـەس نیـیـە بـەم ڕەنگە کـوشـتـەی خـاڵی ئـاڵا بێ
١١- ڕەفـیـقی وەحـشـیـان و، وێڵ و سـەرگـەردان و حـەیرانم
بـەڵێ، ئـەهلـی مـوحـەببـەت ئـاخـری کــاری، دەبێ وابێ
١٢- لە ملدا سـیلسـیلەی زولف و لە حـەلقـا تیـغی ئـەبرۆ بێ
گـرفـتـاری مـەحـەببـەت کـەی دەبێ ئـازار و ئازا بێ
١٣- مەڵێ (هیجری) لەبەر دەردی گرانی، عەشقی لێ تێک چوو
ئەسیـر و جـان فـیدای عـەشـقم هەتاکو ڕەگ لە مل مـابێ

............................................................................

١- فەرش: ڕایەخ.
موحیببەت: خۆشەویستی.
قەضا: تووشبوون، گرفتاری، گیرۆدەیی، ئەنگاوتەیی.
چارەنووس- جارێکی تر (کوردی) بڕوای خۆی بەرامبەر بە (قەضا و قەدەر) وەک فەلسەفەیەک دەردەبڕی کە هەر شت لە خواوەیە.
سەرین: بالیف - بەمە (ڕایەخێکی) ناخۆشی بۆ خۆی دروست کردووە.
میحنەت: دەرد، چورتم، ناخۆشی.
بەڵا: گێچەڵ، پەرێشانی، ئاوقای خراپی بوون.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (مس، عن، ن، ح، گل/٩)یە لەگەڵ ڕۆژنامەی (عیراق) پاشکۆی کوردی ژمارە/١١ی کانوونی دووەمی ١٩٧٨- بەغدایە کە (مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخی) لە ژێر ناوی (پارچە شیعرێکی مستەفا بەگی کوردی)دا ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی نووسیوە، هەرچەندە دەستنیشانی سەرچاوەکەشی نەکردووە، بەڵام وێ دەچێ لە (ح)ی وەرگرتبێ و من لێرەدا (عن)م کردە بنکە، هەرچەندە بەداخەوە (بۆنە)ی وتنەکەم لێ ڕوون نەبووەتەوە.
٢- پرسش: سۆراخ، پرسیار.
بەخێربێ: بەخۆشی بێت. چونکە مژدەی ماتەمی بۆ هێناوە.
٣- قافڵە: کاروان.
بار: بار و بارخانە، (کاڵا) و شتومەکی بازرگانیی کاروانەکەی مەبەستە.
عەجەب: سەرسام.
مەتاع: کاڵا.
نارەوا: مەبەست لە (نارەواج)ە. ئەمە نیشانەیە بۆ زۆریی خەم.

لەو سەردەمەدا، لەبەر (پاشبەند = قافية) وشەی (ڕەوا ج)ی نەگوتووە.

٤– گلە: گلەیی، گازاندە.

جگەرسۆز: دڵسۆز، جگەرسووتاو، بەتەنگەوە بوو.

گوزەر: هاتوچۆ، جستوجۆ. مەبەستی لەوەیە کە خەم لە دڵیا یەقی خواردووەتەوە، ئەوەندە زۆرە.

گلەم کرد من (ح): کلم کردن.

٥– شەرحی حاڵ: باسی بار و چۆنێتی.

تەپڵی شادمانی: جۆرە ئاوازێک بووە بەبۆنەی خۆشییەوە بەتەپڵ و ئامێرە مۆسیقییەکانی تر لێ دراوە.

موڵک: شوێن، وڵات، نیشتمان، خاک، سامان و زەویوزاری مەبەست بووە.

ئەسکەندەر: ئەسکەندەری (گەورە) یا (مەکدۆنی) یا (ذولقەرنەین)یشی پێ دەڵێن کە لە (٣٥٦– ٣٢٤)ی پێش زایندا ژیاوە، و لە (مەکدۆنیە) لە دایک بووە، لە (بابل) مردووە لەسەر دەستی (ئەرستۆ) فێربووە و جیهانگیریی کردووە. تیا سەرکەوتووە و ئازا و بەناوبانگترینە، بۆیە (کوردی) ناوی بردووە.

دارا: یا داریۆس، یا داریۆش – بەم ناوە زۆر (پاشا)ی کۆنی ئێران هەن و ئەوی (کوردی) مەبەستیەتی لە ناواریدا ئەوەیانە کە لە ٣٣١ پێش زایندا ئەسکەندەر لە دەوری هەولێر بەسەریا زاڵ بووە و کوژرا.

چ کەس (ن، مس): چکەس

شادمانیی دا (عیراق): شادمانی دا.

٦– شوکری حەق: مەبەستی لە سوپاس و ستایشی خوایە.

لێرەدا مەبەستی ئەوەیە لەم دەرد و ناخۆشییەیدا و، دەبێ هەر خۆی تەنیا بووبێ بەشکو (ڕەفیقانی قەضا)ی تریش هەبوون کەوا ڕووی دەمی تێ کردوون و لە پشێویی سەرێنییەکەی خۆی دەدوێنێ.

ئەمنتان هەم: من بۆ ئێوە هەم وە یا من لە ئێوەدا (هەم = غەموخەفەت)م. کە ئەمەش وەستاییە.

٧– شارەزوور: ناوچەیەکی فراوانە دەکەوێتە نێوان چیاکانی بازیان و قەرەداخ و هەورامانی ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجە و گوێژە و ئەزمڕ و پیرەمەگروونە. بەڵام ئێستا ناوی ئەم پانتاییەیە لە نێوان سولەیمانی و هەڵەبجەدا و سەرێنییەکی زۆر فەرمانڕەواییی تیابووە و، مێژووی ئاوەدانە و شوێن بڵاوبوونەوەی ڕەشماڵی خێڵانییەکان بووە لەبەر ئاو و، لەوەڕەکەی.

سیاماڵ: ڕەشماڵ، کوین.

هەستوونە: کۆڵەکەی ڕەشماڵ.

چەڵە: گوریسە، کە لە چوارلاوە ڕەشماڵەکەی پێ ڕادەگرن و دەیبەستنەوە. کە وەک لوولە دووکەڵی هەناسەی ساردی وابوون.

وەستابێ: ڕاوەستابێ، بەند بێ، خۆی ڕاگرێ بەپێوە.

هەستوونە چەڵە (عیراق) هەستوونە و چڵە.

٨- لە داغی: لە خەفەتی دیسان وشەی (لە داغی = لە گەرمی و سووربوونێتی)یە. کە چەند ئەستێرەیەک گەرم و ئاگرین و مەبەستی ئەمەشیانە.

کەوکەبی طالیع: ئەستێرەی بەخت.

قەترەیێ (قەطرەیێ): دڵۆپێک، تنۆکێک.

یاڕەببی: ئەی خوایە، ئەی پەروەردگار.

٩- بە مەرگی خۆت: سوێند بەمەرگی کەسێ خواردن، نیشانەی ئەوپەڕی خۆشەویستیی ئەو کەسەیە.

قەسەم: سوێند.

عیلاج: چارە، تیمار، چارکردن.

غەیرەز: جگە، بەبێ، بێجگە، بلی، جگە لە.

سەودا: خولیا.

شۆخ: جوان.

سەروباڵا: باڵای وەک داری سەرو بەرز و بڵندبێ. کە درێژیش جوانییەک دەدات.

بەغەیرەز (ح، عن، مس، ن، گل٩) بغیراز. ڕێنووسی کۆنە.

١٠- زەلیل: زەبوون، کەنەفت.

زار: نەخۆش، چرووساوە، بەزاری (گریان) خەفەتبار.

بێ ماڵ: بێ خانوو، وە بەپێی نازناوی (هیجری)شدا کە لە دوا تاکی ئەم هەڵبەستەدا هاتووە ئەم هەڵبەستەی لە شاری سولەیمانی دانەناوە.

ئاڵا: واڵا، ئاڵ و واڵا، کراوە، بەرز و بڵند، جوان، ڕەنگین و (ئاڵا) لە (ئەعلا)ی عارەبییەوە نییە وەک لە فەرهەنگۆکەکەی پەڕاویی خانای قوبادی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمدا هاتووە هەر چەندە ئەشێ لە چەند شوێنێکدا بەواتەی (ئەعلا) بێ و بەشکو لە هەڵکردن (بەرزکردنەوە)وەیە (بەیداخ) بێت.

١١- ڕەفیق: هاواڵ.

وەحشیان: دڕندان، مەبەستی لەوەیە لە کێو و کەژا بووە لەو کاتی دانانی هەڵبەستەکەدا.

حەیران: سەرسام، حەپەساو، سەراسیمەیی.

ئەهلی موحیبەت: دڵداران و مەبەستیشی لە خواناسانی و زاراوەیەکی صۆفیانەشە.

ئاخری کاری: بۆ دوایی کاری ئەو، وە یا (دوایی کارەکەی)

وابێ: ئاوەها بێ، وە یا (وابێ = کراوەبێ) و مەبەست لە ڕۆژی قیامەتە کە خوا ڕوو لە ئەهلی مەحەببەت دەکاتەوە و هەروەها نامێنێتەوە و دەرووی چاکەی لێ دەکاتەوە.

١٢- لە ملدا: لە گەردەندا، لە ئەستۆدا، لە سکورددا.

سیلسیلە: زنجیر.

حەلق: قوڕقوڕاگە، مل، گەردن، ئەستۆ، سکورد.

گرفتار: گیرۆدە.

(ئازاد) و (ئازا)یە کە ( لەف و نەشر)ی موڕەتتەبە کە لە (ئازاد) مەبەستی لە نەبوونی ئازادییە بەهۆی بوونی زنجیرەی زولفەوە لە ملی عاشقدا. هەروەها (ئازا)یەکەش نائازاییی عاشقەکە ملی لەبن تیغی برۆدایە و پەلەقڕێ و توانایی خۆ ڕسکارکردنێکی نییە و نایکات و خۆڕاگرە، ئەمەش جوانی و، وەستاییە لە وێژەی دێریندا.

لە حەلقا (مس، ن، ح) لە حلق.

تیغی (مس، ن): تیغ. ڕێنووسی کۆنە.

١٣- ئەسیر: دیل.

جان فیدا: گیان بەقوربانی بوو، سەرگەرد، گوری.

ڕەگ لە ملدانی: دیارە ڕەگیش هەر لە ملدایە هەتا ژیان پایەدار بێ و مەبەستی لێدانی ڕەگی مل و لە کاردا بوونی دڵە.

کەواتە هەرگیز دەردی گرانی عەشق سەری لە (کوردی) تێک نەداوە.

هەمیشە دیل و جان فیدایەتی تا ماوە.

ئەم هەڵبەستە یەکێکە لەو هەڵبەستە کەمانەی (کوردی) کە جیاوازی لە نێوان وشەکانی ناوەڕۆکەکەیدا و ئاڵوگۆڕ لە نێوان تاکەکانیدا و هەڵبژاردنی هەندێ تاکی لەم یا لەو سەرچاوەدا زۆر کەم و دانسقەیە و بەپێی درێژییەکەی لەوانەیە بۆ کارەساتێکی گوتبێ کە بەداخەوە هێشتا وێ نەکەوتووم کە ئەو کارەساتە چی بووە کە ئەوەندە گەورە و کاریگەر بووە لەسەر (کوردی) کە ئەوەندەی لەسەر گوتووە.

٨٨

## دڵ وه چاکه

١- دڵ وه چاکـــه زامـــهکـــهی ناســـۆری تیـــری تا نـهبێ
ســـینه بۆ نێــشی مـوژانی مـــهﻫرِوان نیـشـــانه بێ
٢- ئهصلی مـهقصـهد ﻫهر یهکێکه بۆ پهرستارانی عهشق
یهک سیاقه، حهق شوناسی (کهعبه) یا (بتخانه) بێ
٣- نهخــشی ظاﻫیـر باطنیــێکی پاک و بێگهردی دهوێ
سهبحه طهوقی زاﻫیده صهد جار ئهگهر صهد وانه بێ
٤- بۆ زهریفی تایی طورِرِهی زولف دهرینان لازمـــــه
یهک لهسـهر یهک زامی دڵ، وا چاکه زامی شانه بێ
٥- پێکهنینی دولبهران میقداری عیصـمهت کهم دهکا
بۆیه غــونچـــه ﻫهر ئهوهندهی نازکـــه تا (وا) نهبێ
٦- خـــاڵهکـــانت دانهدانهن، چاوهکـهم عـــهیبم مـــهکـــه
ئهشکی خــــوێنینم له چاومـــــدا بلا، با وا نهبێ
٧- بێــو رِهقـیب ئاوارهکـه، ســاتێ له پێش چاوی ئهمن
قـورِم سـاغـه، تابهکـهی بۆ چاوی (کـوردی) تانه بێ

---

١- وه چاکه: وهﻫا چاکه.
ناسۆر: جۆره برینێکه، کولاندنهوهی برین، زامی به ئازار،
تانه: توانج، تاکو نهبێ، یا وهک تانه (لهکه)ی سهرچاو وابێ، ئهوهنده به ناسۆربێ به دڵهوه.
سینه: سنگ.
نێش: چزوو.
موژان: برژانگ، مژولان، کوژک.
مهﻫرِوان: مانگرِوان، جوانان، ئهوانهی رِوویان وهک رِووی مانگ بێگهرده.
نیشانه: نیشانگهی تیر.
ســهرچاوهی ئهم ﻫهڵبهســته (عن، جـا)یه و ﻫێـشـتا چاپ نهکراوه و من (عن)م کرده بنکهی

لێکۆڵینەوەی و بە داخەوە (بۆنە)ی وتنەکەم بۆ ڕوون نەبووەتەوە.
ڕواڵەتێکی تایبەتی بەم هەڵبەستەوەیە، لەوانەیە بگوترێ شێوەی گوتنی (کوردی) نییە، هەرچەند مۆرکی ئەویشی پێوەیە ئەویش لەوەوەیە کە سەرچاوەکەی دوو کەسی ئەدەب دۆستی باوەڕپێکراون کە (مەحموود پاشای جاف): (جا) وە (عەلی ئاغای نەوتچی): (عن)ن، بۆیە هەڵبەستەکە پاک و بێگەردە و، وەک ئەوانی تری زۆر دەماودەمی نەدیتووە و دەستاودەستی نەکردووە.

٢- ئەصلی مەقصەد: بنەچەی مەبەست.
پەرستاران: ئەوانەی لە ڕێی عەشقا دەپەرستن، جوانپەرستان، دڵداران. ئەمەش لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئاینە ئاسمانییەکان و بت پەرستەکانیش هەموو ناسینی خودایەکن.
سیاق: ڕێرەو، جۆر، چێژ، چۆن.
حەق شوناسی: خوناسی، ڕاست پەروەری.
کەعبە: قیبلە: (حەجەر و لئەسوەد) کە لە شاری مەککەیە و ئیسلام لە نوێژ و حەجدا ڕووی تێ دەکەن.
بتخانە: شوێنی بت تیا پەرستن، جێگای بت پەرستان.

٣- نەخشی ظاهیر: نەخشی (شێوەی) سەرزاری، (ئەوی بەڕووەوەبێ)ی مەبەستە.
باطین: دەروون، ناوەوە، ناوەڕۆک، دڵیش دەگرێتەوە.
سەبحە: تەسبیح، جۆرە (ڕستیک)ێکە، بۆ (زیکر) و بۆ پێ ڕابواردن،
طەوقی: تەوق، ئەو زنجیرەیە لە بەندیخانەکاندا دەکرایە گەردنی (بەندی)یەوە.
زاهید: بە سەر زاری خواناس و صۆفیی درۆزنی مەبەستە.
صەد دانە: ئەو تەسبیحەی کە بۆ جوانی و ڕابواردن نەبێ صەد دانەیە، کەوا دەروێش و صۆفییەکان بۆ ژمارەی ناوی خوا بردن (زیکر) کردن و ژماردنی ناوی خوا بردنەکە هەڵی دەگرن، و بگرە (١٠١) دانەیشە.

٤- زەریفی: جوانی، (ظەریفان): جوانان. ڕێکوپێکەکان.
تای طوڕڕە: تای مووی سەر ڕوومەت.
لازمە: پێویستە.
بۆ: (جا) بر.
لازمە (جا) کاشکی.

٥- میقدار: چەندێتی. کەموزۆری، ئەندازە
عیصمەت: پا کی، داوێن پاکی، ڕەوشت جوانی، سروشت چاکی.
بۆیە: لەبەرئەوە – بە ڕێنووسی کۆن (بویی) نووسراوە کە (بۆی)یش. دەگرێتەوە بەواتە (بۆن) و ئەمەش دەگونجێ.

وا: کراوە، بەش، مەبەستی پشکووتنی خونچەکەیە، (والا)، گەشانەوە،
کەم (جا) کە.
٦- دانە دانە: دەنک دەنک، یەک یەک.
عەیبم مەکە: لێم مەگرە.
ئەشک: فرمێسک، ڕۆنتک، ئەسر، ئەسرین.
بڵا: دەبا، سادەی، سابا.
با وا نەبێ: با فرمێسکەکەی من دەنک دەنک (تک تک: دڵۆپ دڵۆپ) نەبێ، وەک خاڵەکانی تۆ و ئیتر بۆ ئەوەی لێم نەگری و بە عەیبی منی نەزانی با فرمێسکم بە خوڕبێت و وەک دەنک دەنکی خاڵەکانت هی منیش تکە تکە نەبێ.
٧- بێو: تۆ وەرە و، ئەگەر بێتو، ئەگەرکو، خۆ ئەگەر، گریم.
ڕەقیب: دژ، ناکەس، ناحەز، خرابکار و ئەوی بە مەرایی خۆی لەگەڵ خۆشەویستەکەی (کوردی) نزیک کردووەتەوە و دژی (کوردی)یە و نەیارە.
ئاوارە: دەربەدەر، ڕەهەندە، دەرکردن، وێڵ.
قوڕم ساغ: ساختەچی، پەست، نامەرد، دەویت.
تابەکەی: تاکو کەی، هەتا کەنگێ.
تانە: لەکەی سەرچاوە، پەڵەیەکی سپییە ئەکەوێتە سەر گلێنەی چاو. وە یا ئەو ڕەقیبە وەک (تانە بی: تاکو نەبێ) واتە وەک تانە (لەکەی سەر چاو) وە (نەبی).
ئەم وشەی (قورم ساغ)ە ئەگەر لە دەربڕیندا بە شێوەی (قوڕم) (ساغە)، بە برگە دەرنەبڕدرێت، کێشەکە بە لەنگ دەبێ کە بە (قو + ڕم + سا + غە)یە.

٨٩

## کەی ئەوە مەحبووبەیە

١- کەی ئەوە مەحبووبەیە؟ گەر بێ وەفا و خوێن خوار نەبێ؟
حەڵقە حەڵقەی زولفی، وەک زنجیری دەس زۆردار نەبێ؟
٢- کەی نیگارە؟ گوڵ ئەگەر، بۆ بێن و، جوانی و، نازکی؟
چەشنی ئەندامی نەبێ و، وەک خاری چەشتەی ژار نەبێ؟
٣- ئەبرۆی شمشێر و، موژەی تیر، گەر نەبێ؟ کەی دولبەرە؟
چاوی دڵ بیمار نەکات و؟ چاوی خۆی بیمار نەبێ؟؟
٤- قەت بە مەحبووبەی مەزانە، تا دڵت داگیر نەکات
یا لە سۆز و، قاڵبی سووتاوتا، دەسدار نەبێ
٥- گەر لە دووری (گورچوو)ی بەرۆکت بی؟ دزە، یارت نییە
یا لە دەرهێنانی دڵتا، چەشنی گورگی هار نەبێ؟؟
٦- شاهیدی مەقبووڵی عەشقی گەر نەبێ؟ شاهید نییە
تا لە سەر گۆنەی نیشانەی شوێنی گەستووی مار نەبێ
٧- قەت گرفتار و ئەسیری دولبەری (بێ دڵ) مەبە
تا ئەویش وەک تو، بە تیری غەمزە، دڵ ئەفگار نەبێ
٨- دڵ بە (مەجبووب)ی مەدە (مەشطاطەگەر) بێ و حیلە باز
ئەسمەر و قەد عەر عەرو، خونخوار و، چاو بەخومار نەبێ
٩- قەدری عاشق کەی دەزانێ، یاری (بەد خوو) و خوردە ساڵ
تا خەطی موشکین لە سەر صەفحە ڕوخی ئیظهار نەبێ.
١٠- کورتە عومری (یاری دڵ)، عەشقێکی کوێری و شێتییە
مایە پووچی و میحنەتە گەر، عەشقێ عەقڵی سوار نەبێ
١١- ئەو جەفا و جەورەی کە (کوردی) لەو نیگارەی چەشتووە
صەد، کەبێعار بێ، دەبێ بۆچی لە ڕۆح بێزار نەبێ

........................................................................

١- ئەم هەڵبەستەی (کوردی) یەکێکە لە پارچە هەڵبەستە (ئاوێتە) بەیەکتری بووەکانی، لەبەرئەوە لێم بووە مایەی سەرە خولێ، لە ڕێگەی ساخکردنەوە و جیاکردنەوەی ئەم پارچە هەڵبەستی، لەوی تری و ماوەی چەندین ساڵ عەوداڵی بە دەستهێنانی سەرچاوە بووم، تا لە ئەنجامدا وێکەوتم کە دوو پارچە هەڵبەستی (کوردی) تاکەکانیان تێکەڵ بە یەکتر بوون و، من بەهۆی سەرچاوەی زۆرەوەو، بەشارەزاییم لە شێوازی هەڵبەستەکانییەوە بۆم دەرکەوت کە دوو پارچە هەڵبەستی لە ناو سەرچاوەکاندا بە تێکەڵی و ئاوێتەیی شێواون.

بەڵام وەک لە تێکڕای هەڵبەستەکانی ناو ئەم پەڕاوییەوە ئاشکرا دەبێ کە (کوردی) بە زۆری چاودێریی ئەوەی کردووە کە (لە هەر پارچە هەڵبەستێکیدا «یەکێتیی بابەت» هەبێ)، ئەم ڕاستییە بە تەواوی ڕێینومایی ئەوەی کردم کە هەموو تاکەکانی ناو سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستە بریتین لە دوو بابەتی لە یەکتر چیاواز.

بابەتی یەکەمیان: ئەم هەڵبەستەیە کە هەر لە بارەی (دڵخواز: مەحبووبە)وەیە.

بابەتی دووەمیان هەڵبەستەکەی دوای ئەم هەڵبەستەیە لەم پەڕاوییەدا لە ژێر سەرە ناوی (ئەو سەرە سەر بۆچەیە)دا لە بە پشتیوانی هەڵبەستەکانیشیانەوە بۆم لە یەکتر جیاکرانەوە.

کە ئەویش لە بارەی (دڵدار: عاشق)ەوەیە.

بۆیە هەندێ لە سەرچاوەکانی ئەم پارچە هەڵبەستە هەمان سەرچاوەکانی هەڵبەستەکەی دوای ئەمن، هەروەک هەندێ سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەش سەرچاوەی ئەو هەڵبەستەی دیکەن و هاوبەشن.

لە هەندێکیاندا چەند تاکێکیان ئاوێتەی یەکتری کردووە، هەروەک لە هەندێکیاندا ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیان بەیەک پارچە هەڵبەستی سەربەخۆ نووسراوە. هەروەها لە هەندێکیاندا هەردوو پارچە هەڵبەستەکەیان بەیەک پارچە هەڵبەست داناوە.

ئەمە جگە لەوەی کە گۆڕان و شێواویی ئەوتۆیان بەسەردا هاتووە کە لە هەندێ شوێندا لە هەڵبەستی (کوردی) ناکەن و مۆرکەکەیان دژوارانەووە. لەگەڵ ئەم جیاکردنەوەیەشمدا، دیسان ئاواتە خوازم کە سەرچاوەی بەهێزتر دەربکەوێ، تاکو پترێک، ئەم ئاڵۆزییەی خاو بکاتەوە، یا پشتگیریی ئەم جێگیرکردنەم بکات و هەردوو پارچە هەڵبەستەکە لە دەقی گوتنەکەی کوردی نزیک بکاتەوە.

سەرچاوەکانیش بۆ ئەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوە ئەمانەن:

(مس، عن، ن، گل/١، گل/٢، گل/٣، گل/١٠، ص، ما/٢، جلی، مر، مع ر، ه)ن.

لەنێو ئەو حەمکە سەرچاوەیەدا من (مس)م کردە بنکەو دەسکەلای لێکۆڵینەوەی ئەم پارچە هەڵبەستە و کەڵکیشم لە سەرچاوەکانی تر وەرگرتووە، هەندێ تاکی ئەم هەڵبەستە، هێشتا چاپیش نەکراون (ئەوەندەی پێم زانیبێ).

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە کە یەکەمینە لە زۆر سەرچاوەدا بەڵام لە (جلی، ر)دا نییە، و لە هەمووانیشیاندا چونیەکە.

٢- چەشتەی ژار، ژەهر هەڵمژیو، دڕکی ژاراوی، ژاراوی.

ئەم تاکە لە (جلی، ر)دا نییە و لەوانی تردا دووەمینە و لە هەمووواندا چونیەکە.

٣- بیمار نەکات: بریندار نەکات، نەخۆش نەخات، نەیپێکێ.

بیمار نەبێ: بە خومار نەبێ، مەبەستی لەچاوی خەواڵووی (مەست)ی مەحبووبەیە، کە ئەمەش جیناس ئاراییە. (جوانکاری لە وێژەی کۆندا).

ئەم تاکە لە (جلی، ر، مس، عن)دا نییە و لەوانی تردا سێیەمینە و لە هەمووواندا چونیەکە.

٤- سۆز: سەودا، شەیدایی، جۆش و خورۆش.

دەسدار: دەست تیابوون (نەک دەوڵەمەندی).

ئەم تاکە لە (جلی)دا نییە و لە (مس، عن)دا سێیەمینە و لە (ن، گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، ص، ما/٢، مر، مع، ه)دا چوارەمینە و لە (ر)دا، چونکە ئەم هەڵبەستە و هەڵبەستی پێشووی تیایە، یەک پارچە هەڵبەستە بۆیە (لەوا) ئەم تاکە پێنجەمینە.

نیوەی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (ر، گل١، گل٢)دا بەم جۆرەیە:

(نەک لە دەوری شەمعی ڕوخسارت وەکو پەروانە بی) کە ئەمەش نیوباڵی یەکەمی تاکی دوایی (پێنجەمین)ە و بەشێواوی ئاوێتە بووە بڕوانە ئەوێ.

یا (ر): قط.

سووتاوتا دەسدار نەبێ (ر، گل١، گل٢): سووتاوت ئاگاهدار نەبێ - بەڵام لە (گل١، گل٢)دا (ئاگادار نەبێ)یە.

٥- گورچوو: گورچیلە، گورچک، مەبەستی لە پارەی بەر باخەڵ (بەرۆک) و دەسبڕی و سامان لێ کێشانەوەی دڵخوازەکەیە لە هی دڵدارەکە.

بەرۆک: یەخە، بەرباخەڵ، گیرفان.

لەم تاکە هەڵبەستەدا مەبەستی لەو چەشنە دڵخوازەیە کە هەر چاوی لە سامانی پیاوە و پارە لێ کێشانەوەی، بۆیە (کوردی) بە دزی داناوەو نەی خستووتە خانەی دڵخوازەوە.

چونکە وەک لە نیوباڵی دووەمیدا ڕای گەیاندووە کە ئەو دڵخوازە لە پێناوی دزی و لێ کێشانەوەکەیدا و بۆ ئەوەی هەرچی زۆرترە لەو دڵدارەی بە دەست بێنێ، بۆیە بەجۆرێ خۆی لەلای کابرا دەر دەخات کە گوایە زۆر کابرای خۆش دەوێت و لەڕاستیشدا درۆزنە، مەبەستی پێکەوە و ژیان نییە بە یەکدڵی لە سایەی ئەوینداری (عەشق)ێکی سەرتاسەری ژن و مێردایەتیدا کە یەکەم بنچینەی کۆمەڵایەتییە لە پێکهێنانی کۆمەڵان و هەر گەلێک و مرۆڤایەتی و لەبەرئەوەیە (کوردی) ئەو دڵ ڕاکێشانی دڵخوازە بەکردەوەی (گورگی هار) پێناسە کردووە.

٦- شاهیدی: گەواهیدەری، بەڵگەی. (شایەتی)

مەقبووڵ: پەسەند، دروست، وەرگیراو.
شاهید نییە: نازدار نییە، دڵخواز (خۆشەویستی جوان) نییە.
گۆنە: ڕوومەت، گۆنا.
گەستووی: گەستەی، گاز لێ گیراوی، پێکراوی، ئەنگاوتەی (مار).
ئەم تاکە نیوەی دووەمی لە گۆرانییەکی (سەید علی ئەصغەر (ش١)دا یەکەمە و هەرچەندە ئەو لە چەند گۆرانییەکیدا هی (کوردی) و طاهیر بەگی جاف و ناری و ...هتدی لەسەر ئەم کێشە یەکخستووە و لە چەند تۆمار کردنێکی گۆرانییەکانیدا دووبارەی کردوونەتەوە و ئاوێتەی یەکی کردوون و تەنیا کەڵک لە شێوەی دەربڕینی هەر نیو تاکێک دەگیرێ، نەک لە زنجیرەی تاکەکان و پارچە هەڵبەستەکان «چونکە تیکەڵی کردوون بەیەکتری لەو گۆرانییانەیدا».
هەروەها ئەم تاکە لە (کش٢، ش٢)دا نییە و لە (مس، عن، گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، کش١، ص، م/٢، مر، مع، ف، ش، نم١، هـ، کم، گ٢، س، گ٣، نی،(مد/٦)دا دووەمینە بەڵام یەکەمی لە مد/٦ دا نییە و لە (جلی، ر)دا سێیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیەوە لە هەندێ لەم سەرچاوانەشدا نیوباڵی یەکەمی، یا دووەمی ئاوێتەی تاکێکی تر بووە یا لە تاکێکی تردا بەجۆرێکی ترە وەک لە خوارەوە شیی دەکەمەوە. ئەم تاکە بەم جۆرە هێشتا چاپ نەکراوە.
جوانی لەم تاکەدا یەکخستنی وشەی (شاهید) و (شاهید)ە کە هەر یەکەیان بە واتایەکی جیا لەویتریان، دیسان گرد کردنەوەی پێنج وشەی (ش) و یەککەوتنی (نیشانە) و (شوین) و وردەکاریی جیناس ئارایی و وەستایی نواندنە بە پێی وێژەی کۆن.
نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (ف، ش، کش١، نم١، کم، گ٢، س، گ)دا نییە و لە جێگەی (ئەم) نیوباڵی یەکەمی تاکی دوایی (حەوتەم)ی بە هەڵە ئاوێتە کراوە. بڕوانە ئەوێ.
دیسان هەر ئەم نیو باڵی یەکەمی تاکی سەرەوەیە لە (جلی، ر، تی)دا نییە لە جێگەی ئەم نیوەی یەکەمی تاکی پێنجەمین ئەم پارچە هەڵبەستەی بە هەڵە ئاوێتە کراوە. بڕوانە ئەوێ.
ئەمیش جیاوازییەکانە لە سەر ئەم تاکە لە نێوان سەرچاوەکانیدا کە دەردەکەوێ، شێواوە.
شاهیدی مەقبووڵی عەشقی (ن، گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، ص) شاهد مقبول عشق/ ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
گەر نەبێ (ن، گل١، گل٢، گل٣، ص) کر نبی – ڕێنووسی کۆنە
گۆنەی (گل١، گل٢، گل٣) کونای. دیسان ڕێنووسی کۆنە.
گۆنەی (ف، ن، ص، تی، مد/٦) دا گونای دیسان ڕێنووسی کۆنە.
گۆنەی (گل١٠، جلی): گۆنەء. ڕێنووسی کۆنە.
گۆنەی (ما/١، مر، مع): گونەء.
گۆنەی (ش): صفحەء – و– نسخە: گۆنە کە ئەم نوسخەیە ڕاست و ڕێنووسی کۆنە.
گۆنەی (ش١): گوونای

نیشانەی (ن، ص): نیشانەء. ڕێنووسی کۆنە.
نیشانەی (گل١، گل٢، گل٣، گل١٠): نیشانەء ڕێنووسی کۆنە.
نیشانەی (ر): نبی نیشانەی – لەنگە.
شـوێنی (ن، ش، کش١، نم١، گـ٢، س، گـ٣، تی) جـیگە شـوێنی (گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، ن، جلی، ص): جیکە.
شوێنی (مد/٦) جیگەء.
گەستووی (ن، ص): گستوی. ڕێنووسی کۆنە.
گەستووی (گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، مد/ ٦)دا کستەء
گەستووی (ما/١، کش١): گستەی.
گەستووی (مر، مع، ن، نم١): گستەء
گەستووی (گم/ تی): گەستەی.
گەستووی (گـ٢، س، گـ٣): گەزتەی. ئەمەش دەستکارییە.
شوێنی گەستووی مار نەبێ (ش١) زخمی ماران گاز نەبی.
٧– بێ دڵ: مەبەستی لەو کچ و ژنانەیە کە بێ نەواو دڵ مردوو، وە سارد و سڕی هەستن.
غەمزە: چاو داگرتن، چاو هەڵتەکاندن، بەلاچاو (نیونیگا) ڕوانین.
ئەفگار: بریندار، ماندوو، بە ئازار.
ئەم تاکە لە (کش١، کش٢، جلی، ف، ش، ر، نم/١، کم، گـ/٢، گـ٣، س، تی، ش١، ش٢)دا نییە لە (مس، عن، گل١، گل٢، گل٣، ن، گل١٠، ص، ما، مر، مع، هـ)دا چوارەمینە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
بێ دڵ (گـ/١، گل٢، ما/٢): دل بر: (دڵبەر، دولبەر) کە ئەمەش هەڵەیە.
٨– مـەشـشـاطەگـەر: ئەو ئافـرەتانەی سـەری کـچـان و ژنان شـانە دەکـەن و ئەوانەش کـە (مـەشـشـاطەگـەر)ن لە (ئافـرەتە ناشـیـرینەکـاندا هەڵدەکـەون کـە لە کـۆنەوە لە ناو هەر کۆمەڵگایەکیدا ئەوانە کچ و ئافرەتانیان ئارایشت کردووە زۆر پسپۆڕن لە دڵی پیاو ڕاکێشان و پارە لێ کێشانەوەی پیاواندا، و بە واتای (مەرایی کار)یش دێ.
حیلە باز: فێڵباز، ساختەچی، دەستبڕ، کەڵەکچی، تەڵەباز.
عەرعەر: درەختێکە ڕاست هەڵدەچێ و هۆنەران چواندوویانە بە بالای یار.
خونخوار: خوێنخوار، ستەمگەر.
چاو بەخومار: چاو مەست، چاوی نەرم.
٩– قەدر: ڕێز، نرخ، بایەخ، گرنگی
خوردە سـاڵ: مەبەستی لە کچۆڵەیەکە مناڵ بێ لە تەمەنی پێگەیشتن (موراهەقە) تێ نەپەڕیبێ و، دیارە لە ئەزموون (تەجروبە) کەیە.

خەطی: مەبەست لە گەندەمووی دەموچاوی کچۆڵانە.
موشکین: مسکاوی، واتە بۆنی مشک (مسک)ی لێ بێ، وەک ڕێحانە ڕەشەی بۆن خۆش.
صەفحەی ڕوخی: تەختی ڕووی (ڕوخساری)
ئیظهار: دەرکەوتن. مەبەستی لە (لێهاتن)ی گەندەمووەکەیە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (کش/٢، جلی، تی، ش١، ش٢)دا نییە و، لە (مد/٦)دا پێنجەمینە و لە (کش/١، ف، ش، نم/١، کم، گ٢، س، گ٣)دا شەشەمین و لە (ر)دا حەوتەمینە و لە (مس، عن، ن، گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، ص، ما/٢، مر، مع، ﻫ)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
قەدری(ر): قدر – ڕێنووسی کۆنە.
کەی (ش): کە.
دەزانێ (نم/ ١) ئەزانێ.
یاری بەدخوو، و خوردە ساڵ (ش، ف): چونکە طفل و بەد خووە.

١٠- (یاری دڵ): مەبەستی لەو دڵخوازەیە کە هەر (بەدڵ) دڵدارەکەی شەیدای بووبێ و لەو دڵدارییەیدا ژیری و بیر لێکردنەوەی نەخستبێتە کار، چونکە بەلای (کوردی)یەوە دڵداریی ڕاستی بۆ پێکهێنانی جووت گرتنێکە کە بناخەی دامەزراندنی (خێزان) بێ.
لێرەدا (کوردی) وریایی و ژیری لە دڵداریدا، بە پێویست زانیوە بە پاڵ دڵگیریی یارەوە.
کوێری و شێتی: بیرو باوەڕێکی (باوە) لە نێوان شارەزایانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤ ناسیدا کە دڵدارییەک هەر تەنیا لەبەر (جوانی)ی دڵخوازەکە بێ و کوتوپڕ بێ و لەو دڵدارییەدا بیر لە گونجاندنی سروشتی هەر دوولای (دڵدار و دڵخواز) پێکەوە و لە یەکدڵی و پاکی و بە تەنگ دڵی یەکترەبوونەوە (بیر) نەکرابێتەوە ئەوا ئەو دڵدارییە تێڕۆچوونێکی کوێرانەیە و بۆیە یەکگەیشتنێکی دەمییە و ئامانجی پێکەوە ژیانی هەتاسەری نییە، بۆیە ئەو دڵدارییەی بە مایە پووچی و بەباری گران داناوە چونکە ئەو دڵدارییە لایەنی عەقڵ (ژیری) تیا ڕەچاو نەکراوە و هەر تەنیا (دل) عاتیفە لەو دڵدارییەدا سەرکەوتووە و لایەنی (ژیری) تیا سواری ئەو (عاتیفە)یە نەبووە.
ئەم تاکە هەڵبەستە هەر تەنیا لە (عن، مس)دایە و تاکی بەر لە تاکە هەڵبەستی کۆتاییە و هێشتا (وەک بزانم) چاپ نەکراوە، پێم وایە (کوردی) ئەوەندە بە قووڵی سەیری (دڵداری) و ژنهێنانی کردووە، کە بووەتە هۆیەکی ژن نەهێنانەکەی، بە تایبەتی سووکە نیشانەیەکی ئەم ڕایەی من، لە تاکە هەڵبەستی دواییدا هەیە.

١١- ئەم تاکە هەڵبەستە لە (کش٢، تی، ش١، ش٢) دا نییە، لە (کش١، ف، ش، نم١، کم، گ٢، س، گ٣)دا حەوتەمینە، لە (مد/٦)دا دوا تاکە و لە (ر)دا هەشتەمین و لە (مس، عن، ن، گل١، گل٢، گل١٠، ص، م/١، جلی، مر، نع، ﻫ)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستە و دواتاکیەتی.

جەفا: وشکیەتی، مەبەستی لە دڵ پێ نەدانی دڵخوازەکەیەتی بەرامبەر بە (کوردی).
جەور: ستەم، بەدکاری، خراپیکردن.
نیگار: ڕەنگین، نەخشین، ڕازاوە، مەبەستی لە دڵخوازەکەی خۆیەتی.
جەورەی (ر): جورە: ڕێنووسی کۆنە.
کوردی (ر): هیجری- ئەگەر لەم سەرچاوەیە پتر نازناوی (هیجری) بهاتایە منیش لێرەدا ئەم (نازناو)ی (کوردی)یەم دەگۆڕی بە (هیجری) و تەنانەت هەڵبەستی دوای ئەم پارچە هەڵبەستە کە: (٩٠- ئەو سەرە سەر بۆچە)یەو لەسەر کێش و پاشبەندی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیە و تەنیا ئەم لە بارەی (خۆشەویست) و ئەویان لە بارەی (دڵدار)ەوەیە، کە لەودا نازناوی (هیجری) هاتووە.
نیگارەی (جلی): نکارەء. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
چەشتووە (جلی): دیتوە.
چەشتووە (گ٢، س، گ٣): چەژتووە- ئاشکرایە ئەمەش لە دەسکارییەکانی (گیو)ە.
صەد کە بێعار بێ (کش/١): صەد کە بیعاری.
صەد کە بێعار بێ (ش): صد کە بیعار ابی. ئەمیش لەنگە.
دەبێ بۆچی (ر): بۆچی – ئەمیش لەنگییە.
صەد کە بێعار بێ (مد/٦): صد کە بیزار بی- ئەمیش ناگونجێ؛ چونکە هەر لەم نیوباڵەدا وشەی (بێزار) هەیە.
لەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) لە ڕواڵەت و چاکی و خراپییەکانی (دڵخواز) دواوە و، من وەهای بۆ دەچم (کوردی) ئەو دڵخوازەی خۆشەویست بێ، بەڵام تیا سەرکەوتووە و، ئەم پارچە هەڵبەستەش کە لەمەڕ (ئافرەت خۆش ویستنەوەیە) بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە (کوردی)یان (بەنێر) بازی تاوانبار کردووە و هەڵبەستی تری وەک ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی زۆرن لەم پەڕاوییەدا.

٩٠

## ئەو سەرە سەر بۆچە

١- ئەو سەرە سەر بۆچە دائیم پڕ لە عەشقی یار نەبێ
ئەو دڵە دڵ بۆچە! هەرگیز والەو و غەمبار نەبێ.

٢- بۆ دەڵێم عاشق؟ کەسێ لاف و گەزافێ لێ بدا؟
خاریجی عەشقە ئەوی مەستی مەیی سەر شار نەبێ

٣- هەر کێ وەک (پەروانە) بۆ سووتان بە (بێ پەروا) نەبێ
عاشقی نازانێ، تا سووختەی شەمی ڕوخسار نەبێ

٤- هەر کەسێ (هات) و، وتی من عاشقم باوەڕ مەکە!!
تا بە پەیکانی موژەی مەحبووبەکەی زامار نەبێ

٥- جان فیدای مەحبووبەیێ بە، دڵنەواز و حاڵزان
هەمدەممی ناکەس بەچەو هەم صوحبەتی ئەغیار نەبێ

٦- ڕۆژی صەد جاران دەرت کا و، یا جنێوت پێ بدا
خەلعەتە، خۆشە، بەشەرتێ، لا ڕەقیبی خوار نەبێ

٧- کوا ڕەفیقێکی شەفیق بێنێ عیلاجێکت بکات
هەمدڵ و هەمڕاز و هەمدەرد بێتو، بەد ئەطوار نەبێ

٨- (نا خودا)ی عاشق، سەفینەی عەشقەکەی (ئەممارە) بێ؟
(مار)ە، کەشتیی کون ئەکا، تا غەرقی کا و، ڕزگار نەبێ

٩- ناخرێتە ڕیزی عوششاقان و خانەی عەشقەوە
تاوەکو (هیجری) بە هیجران و خەفەت دووچار نەبێ

........................................

١- واله: شەیدا، سەرسام، حەیران، تیا ڕاماو.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە: ( مس، عن، ن، گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، ص، مد/ ١، کش١، محمد أمین، کش٢، محمد أحمد صدباری»، ما/٢، جلی، مر، مع، ش، ر، نم١، ه، کم، گ٢، گ٣، تی: (پەڕاوی تێگەیشتنی ڕاستی)ی (د. کەمال مەزهەر ئەحمەد) ل/ ١٧٧، ش١: شریتی

گۆرانییەکانی سەید عەلی ئەصغەر کوردستانی هی ئێستگەی ڕادیۆی عێراق، بەشی کوردی، ش٢: تۆماری ستودیۆی لوئلوئە – بەغدا)یە و وەک لە هەڵبەستی پێشوودا ڕوونم کردەوە کە زۆربەی تاکەکانی ئەم دوو هەڵبەستە، ئاوێتە و شێواون و من بە پێی سەرچاوەکان ساغم کردنەوە و جێگەم کردن و بۆ ئێرە (کم)م کردە بنکە و پشتم بەوانی تریش بەستووە.
بەداخەوە بۆنەی ئەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوەم، بۆ ئاشکرا نەبووە، بڕوانە سەرەتای هەڵبەستی پێشوو (٨٩ – دڵ بە مەحبوبێ مەدە).
ئەم تاکەی سەرەوە لە (کش٢) و (ش١) و (ش٢)دا نییە و لەوانی تردا یەکەمین تاکە.
ئەو سەرە (تی): ئەم سەرە.
سەر بۆچە (گ٢، س، گ٣) سەر بۆچی – هەڵەیە و ناگونجێ.
سەر بۆچە (مد/٦): سەر بوچە – ئەمەش جوانە.
عەشقی (ن، گل١، گل٢، گل١٠، ص، جلی، ر): عشق – ڕێنووسی کۆنە.
ئەو دڵە (تی): ئەم دڵە.
دڵ بۆچە (گ٢، س، گ٣، تی) دڵ بۆچی – دیسان ناگونجێ.
دل بۆچە (مد/٦) دل پوچە.
هەرگیز (نم١): دایم.
هەرگیز (گ٣): بە دائم – لەنگە.
هەرگیز( کش١، ص، جلی، ف، ر، کم، گ٢، س،): دائم.
واله ود (کش١، ص، جلی، ف، ر، کم، گ٢، س، گ٣): عاجز و.
واله وو (ش): عاشق و.
غەمبار (گ٢، س، گ٣) خەمبار.
غەمبار (مد/٦) غمخوار.
٢– لاف و گەزاف: فشە، خۆ هەڵکێشانی بە درۆ، فیشاڵ.
خاریج: دەرەوە (خاریجی عەشقە): لە عەشق بە دەرە،
مەیی سەر شار: ئەو بادە (مەی)یە کە یەکسەر لە کووپە (قەرابە) و یا سوراحییەکەوە بخورێتەوە، نەک
پیاڵە وەیا (چاکترین مەیی کۆنە و بێ دەغەڵی = خوللەر)ە
ئەم تاکە لە (کش١، کش٢، جلی، ف، ش، ر، نم١، گ٢، س، کم، گ٣، تی، ش١، ش٢)دا نییە و لە (مد/٦)دا دووەمینە و لە (مس، عن، ن، گل١، گ٢، گ٣، گل١٠، ص، ما/٢، مر، مع، ه)دا سێیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و بەم جۆرە هێشتا چاپ نەکراوە.
نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (ر، جلی، مد/٦)دا نییە و لە جێگەی ئەم (نیو باڵی تاکی پێنجەم)ە لەم پارچە هەڵبەستەدا – بڕوانە ئەوێ، بەڵام لە (مد/٦)دا بۆ نیوەی دووەمی

بڕوانە دووەمی تاکی (٢)ی سەرەوە و هەروەها ئەم نیو باڵی دووەمەی تاکی سەرەوە لە (ف، نم١، کم، گ٢، س، گ٣)دا نییە و لە جێگەی ئەم نیو باڵی دووەمی تاکی پێشووە کە لە سەرەوە شیم کردەوە – بڕوانە ئەوێ.

بۆ (ف، ص، ر): بوچ.

بۆ (س): بدۆ.

بۆ (ش): بوت

کەسێ (ش): کەسێکە ئەمیش لەنگە.

لاف و گەزافێ (ف): لاف گزاف و ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

گەزافێ (جلی): گزافی = دیسان ڕێنووسی کۆنە.

گەزافێ (ش، ر، کس١): گزاف – ڕێنووسی کۆنە.

لێ بدا (ش) لی ندا – هەڵەیە.

ئەبێ (گ٢، س): نەبی، هەڵەی چاپی یا دەستنووسە.

٣- هەر کێ: هەر کێیەک، هەر کەسێ، هەرچی کەسێک.

هەرکێ (گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، نم/١، کم، گ٢، س، گ٣): هەرچی – کە ئەمەش ئەوەندەی (هەر کێ) (پڕ بە پڕ) نییە، چونکە (هەرچی) هەموو شتێک دەگرێتەوە بەڵام (هەرکێ)یە کە، دەستنیشانی کەسێک دەکات لە کەسان. پەروانە: پەپولەیەکی گچکەی زەرد باوی باڵ کورتە، کە لە هەر لایەکەوە تیشکی چرا، یا مۆم و... هتد ببینێ، گورج ڕووی تێ دەکات و ئەوەندە شەیدای تیشکەکەیە، بێ ئەوەی پەروای ئەوەی هەبێ کە لە نزیکبوونیدا دەیسووتێنێ و، ئەم پەپوولەیە بە (شەوان) دەگەڕێ.

هۆنەران (دڵدار)یان چواندووە بەم پەروانەیە و لە هەڵبەستەکانیاندا وەک لەم تاکەدا هاتووە و کراوەتە هێما (ڕەمز)ی دڵخواز (عاشق).

بێ پەروا: بێ باک، نەترس، دەربەست نەبوو.

سووختە: سووتاو.

شەم مۆم کە مەبەست لە چرا و فیتیلە و فانووس و (فەننەر)یشە کە لێرەدا شەم (یار)ە.

ڕوخسار: ڕوو، کە (کوردی) مەبەستی لە ڕووی دڵخوازەکەیەتی کە لێرەدا چواندوویەتی بە (شەم).

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (جلی)دا نییە و لەوانی تردا پێنجەمینە و لە هەندێکیاندا سێیەمینە.

نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە لە (ر، گل١، گل٢)دا بەم جۆرەی دواییە:

نەک لە دەوری شەمعی ڕوخسارت وەکو پەروانەبی

ئەوە بوو لە (شیکردنەوە)ی تاکی پێشوودا نیشانەم بۆ کرد و لەو سێ سەرچاوەیەی لە سەرەوە ناونووسم کردن هەڵە و شێواوی و ئاوێتەی یەکتری بوون، زۆرن.

لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا جوانیی وێژەیی لە یەکخستنی دوو وشەی (پەروانە) و (پەروا نەبێ) دایە.

٤- پەیکان: تیر، گوللە.

مەحبووبە: خۆشەویست، بەڵام (بۆ ئافرەت): دڵخوازە.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە (کش)دا نییە و لە (جلی، ر، ش/١ ) (شریت = کاسێت ٢/١ و ش/٢، تی)دا دووەمینە، وەهەروەها لە (کش، ف، ش، نم کم، مد/٦، گ٢، س، گ٣) سێیەمینە و لە (مس، عن، گل١، گل٢، گل١٠، ن، ص، مر، مع، ه، /١)دا پێنجەمینە.

بەڵام نیوباڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (گل١، گل٢، ر، تی، جلی)دا نیوباڵی دووەمی تاکی پێشووە کە لەوێدا ڕوونم کردووتەوە.

بڕوانە ئەوێ.

کەسێ (ش١، ش/٢): کەسێک

هات و (ر، جلی، نم/١، کم، ف، تی، گ، س، گ٣): بێتو وتی (ر، جلی نم/١، کم، ف، تی، گ٢، س، گ٣): بێتو.

وتی (ر، جلی، نم١، کم، ف، کی، گ٢، س، گ٣) بلی.

وە (بڵێ) نووسراوە کە ناگونجێ.

باوەڕ (ش/١، ش/٢، مد/٦) بڕوا.

مەکە (ش١، ش٢): مەکە/ وە: (مەکەن).

زامار (جلی، نم/١، کم، ف، مد/٦): بیمار.

٥- جان فیدای: گیان بەختکاری.

دڵنەواز: دڵ ڕاگر، دڵ لاوێنەرەوە، بەتەنگەوە بوو.

هەم صوحبەت: هاو، وتووێژ.

ئەغیار: بێگانەکان، بیانییان مەبەستی لە (دژ و دوژمن)ە

ئەم تاکە لە (کش٢، تی، ش/١، ش/٢)دا نییە و لە (ر، مد/٦)دا شەشەمینە و لە (کش١، جلی، ف، نم/١، کم، گ٢، س، گ٣)دا پێنجەمین و لە (مس، عن، ن، گل١، گل٢، گل٣، گل١٠، ص، ما/٢، مر، مع، ه)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

جان فیدای مەحبووبەیێ بە (ش): جان بە مەحبووبی بدە - ئەمیش لەنگە.

جان فیدای (گ٢، س، گ٣) گیان فیدای - ئەمیش ئاشکرایە لە گۆڕانکاری و بە کوردی کردنەکانی گیوە.

جان فیدای (کش/١): جان بفدای - وە لە پەراوێزی ئەم نوسخەیەوە بە عەرەبی نووسراوە: (لعل زیادە الباء منە) واتە: ئەشێ پیتی (ب) لە (بفدای)دا زیادەبی...

مەحبووبەیێ بە (جلی): معشوقەء بی.

مەحبووبەیێ بە (ر): معشوقەیی بە.
بە (مد/٢): بی.
٦- خەلعەتە: خەڵاتە، بەخشیشە، ئەم وشەی (خەلعەت)ە عەربیی نییە و ئەگەر لە زمانی عارەبییەوە بێت، ئەوا دەبێ بنچینەکەی (خلع: خەلع) بێ کە ئەمەیش بە واتا:
(داکەندن، لەسەر کار لا بردن)ە و ئەم واتایەش پێچەوانەی واتای (خەڵات)ە کە خۆمانە.
بە شەرتێ: بە مەرجێ
ڕقیبی خوار: مەبەستی لەم وشەی (خوار) پێوەلکاندنەی هەم بۆ ڕاستکردنەوەی پاشبەندی ئەم تاکە یە لەگەڵ تاکە هەڵبەستەکانی تری ئەم پارچە هەڵبەستە دا، وە هەم مەبەستی لە (ڕەقیبی خوار)، واتە (چەوت، شەت، لار، ناڕاست)ە کە ڕەقیبەکە ئەگەر هەر (نەیار) و (دژ) بێ ئەوا (ڕەقیب) ڕووتەکەیە، بەڵام هاتنی (ڕەقیبی خوار) مەبەستی لەوەیە کە هەم ڕەقیبە و هەم لار و چەوتیشە بۆیە ( کوردی) ئەم ناوەی لە ڕەقیب ناوە.
ئەم تاکەی سەرەوە لە (ر)دا نییە؛ و لە (مس، عن)دا پێنجەمینە و لە (جلی)دا شەشەمینە و لەوانی تردا حەوتەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.
صەد جاران دەرت کا و (گ١، گل٢، گل٣): صەد جارت کە دەرکات.
دەرت کا و (جلی): دەرم کا – ئەمەش نابێ چونکە کوردی بە تێکڕایی ڕووبەڕووی کەسێک لەم هەڵبەستەیدا دواوەو باسی لە خۆی نەبووە.
یا (جنێوت پێ بدا) هەر لە (عن، مس)دا و لەوانی تردا (بەشەق تێت هەڵبدا) یە و من (جنێوت پێ بدا)یەکەم هەڵبژار، چونکە (کوردی) زۆر جاری تریش وا لەم واتایەی ڕاگەیاندووە.
خەلعەتە خۆشە (جلی): پێم خۆشە ڕۆحم.
بە شەرتێ لای (جلی): بلا بو شرط.
ڕەقیبی خوار (جگە لە: مس، عن) لە هەمووواندا نووسراوە: (لەلای ئەغیار).
٧- شەفیق: دڵسۆز، بە بەزەیی.
ئەطوار: ڕەوشت، نەریت، کردەوەی جۆرەهای خراپی مەبەستە.
ئەم تاکە لە (ر، ن، ص)دا نییە و لە (مس، عن، جلی)دا حەوتەمینە و لە (گل١، گل٢، گل٣، گ١٠، ه)دا هەشتەمینە.
بێنێ (گل١، گل٢): بیتو.
عیلاجێکت (جلی) علاجیکم. ئەمەش بەراوەژووە.
هەمدڵ و (جلی): هم قصە.
لە دوای ئەم تاکەی سەرەوە تەنیا لە (جلی)دا ئەم تاکە هەڵبەستەی خوارەوە نووسراوە کە ئەمیان لەوانی تری بێ پێزتر و مۆرکی (کوردی)ی پێوە نییە، بۆیە لە سەرەوە جێگرم نەکرد؛ چونکە هەر بە تەواوی بە هی (کوردی)ی نازانم کە ئەمەیە:

(هەر کــەسێ نایێ لە دەســـتی بێ بەفــریادم بکا
یەک برای جانی نەبێ یا مەردی صاحیب کار نەبێ).

٨- ئەم تاکە هەڵبەستە تەنیا لە (مس، عن)دایە و هەشتەمینە و لەوانی تردا نییە و ئەوەندەی پێ بزانم هێشتا چاپیش نەکراوە.

( نا خودا): کەشتییەوان- (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا عشقی کردووە بە (کەشتییەوان) و عەشقەکەیشی چواندووە بەو (کەشتییە).

ئەممارە: زانایانی کۆن هەستی ئارەزوو (نەفس) ی مرۆڤیان بە لاوە دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: هەستێکە هەر سەرگەرمی ئارەزووی جیهانی بێت، کە ئەمەیان (نەفسی ئەممارە)یە.

جۆری دووەم: هەستی خواناسی و خواپەرستی و باوەڕکردنە بە هێزی (مەعنەوی) و پێچەوانەی جۆری یەکەمە، ئەگەرچی ڕێگە دراوە کە بەپاڵ (هەستی مەعنەوی)یەوە، مرۆڤ خۆشی لە هەندێ ئارەزووی جیهانی وەریگرێت، بە مەرجێ ئەو خۆشی وەرگرتنە دژایەتیی لەگەڵ (هەستە مەعنەوی)یەکەدا نەبێ، لەبەرئەوەیە کوردی مەرجی عاشقی ڕاستەقینەی بەوە داناوە کە عەشقەکەی هەر بۆ ئارەزووی جیهانی واتە: نەفسی ئەممارە نەبێت.

٩- عوششاقان: دڵداران.

هیجران: دووری لە دۆست و دڵخواز.

ئەم تاکە لە (جلی، ر)دا نییە و لە (ن، ص)دا هەشتەمینە و لە (گل١، گل٢، گل٣، هـ، ما/٢، مر، مع، عن)دا نۆیەمینە و لە هەموو سەرچاوەکاندا کە ئەم تاکەیان تیا بێ، دوا تاکی پارچە هەڵبەستەکەیە ئەگەرچی بە تێکڕایی شێواوی لەم هەڵبەستە و ئەوی پێشوودا هەیە، بەڵام ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا چونیەکە.

## کەوا دارایی

١- کــەوا دارایــی، زەڕ کــورتــەک، کــەمــەرچــین، جــبــبــە گــوڵناری
کـلا و لار، چاوخـومـار، شـیـرین سـوار، خـاڵ مـوشکـی تاتاری
٢- کـە (مــانـی) هاتـە سـەر کـێـشـانـی ئەبرۆی تۆ لە پاش چاوت
لە مـەسـتـی دەستـیدا لە غـزی کە کەچ هات خـەططی پەرگاری
٣- (مونەجـجیم) گـۆشـەیی، چاوتی کـە دیی نووسیی لە تـەقویمدا
کـە ئەمـسـاڵ (ذوو ذەنەب) طالیع بووە، ئیـفـسـادە ئاثاری
٤- لە چاوی بەد بەدووری کـەی (خـودایا) دەردی لێ دەرکـەی
ئەگـەرچی چەشـمـەیی جـادوون دو چاوی بێـچـوە عـەییـاری.
٥- دوعام کرد چاوەکەت خۆش بێ، کە خۆش بوو ئەمنی بیمار کرد
ڕەفـیق، ئـامـان دوعـاکـەن، ڕەببی ظالم هەر بە بیـمـاری
٦- وەکـو فـەووارە خـوێن دەقـوڵـێ لە گـۆشـەی مـیـحـوەری گـەردن
لە چاوەی چاوەکـانـی مـن. لە دەردت هـێندە خـوێن باری
٧- سـوارەی پڕ چەکی دیـدەت، لە نـاکـاوا دڵی پـێکـام
کـەچی هێشـتـا دەڵێیت: من نیم و، سـووچی خـۆتە لاساری
٨- ئـەگـە تـۆ ڕاست دەڵێـیت و قـاتیلی دڵ نیت، ئەدی بۆچی؟
دەدۆزن تیـری مـوژگـانت، بە خـوڕ خـوێن دێ لە سـووفـاری
٩- گـوڵ ئەمڕۆ خـۆی موقـابیل کـرد بە ڕوخسـارت، لەلای خـەڵقی
بـەڵێ: هـەر دەم دڕاوو هـەرزە گـۆن، مـەحـبـووبی بازاڕی
١٠- ئەتـۆش تەقلیـدی زولفی یار دەکـەی وا دیارە ئەی عـەقـرەب
حـەیا هەروا لە چاودا، چی بڵـێی، ئەی کـوێرە مـوختـاری
١١- چوار چشت قـەت مـەکە خواهیش لە دونیا (کوردی) تا ماوی
لەخـۆت عـەقڵ و لە دڵ صـەبر و لە بەخت ئیـمداد، لەیار یاری

.................................................................

١– کەوا: پۆشاکێکی شۆڕی، وەک (جبە) وایە، بەڵام وەک ئەو فشوفۆڵ نییە، لە ژێر سەڵتە و عەبا و جبەوە لەبەر دەکرێ لە کۆنەوە لە کوردستاندا باوە.

دارایی: ڕەنگێکی نارنجیی تەڵخ و لێڵە و بەرەو قاوەیی و جگەرییە.

کورتەک: جۆرە تەکمەیەکی (ناودار) وەک لبادە، بەڵام لەو (کورت) تر و پشتێنی لەسەر دەبەسترێ و ئەمیش بەرگێکی کۆنی کوردانەیە (زەڕ کورتەک) ئەو (قوماش)ەی کە کورتەکەکەی لێ دروست کراوە تووڵی سورمەیی زێڕینی پێوە دووراوە.

کەمەرچین: جۆرە لبادەیەکی ناودار بووە کە (نێر) و (مێ) لە سەر بەرگەوە لەبەریان کردووە، بەڵام لامل و لێوارەکانی و ناو شان و سەر قۆڵ و گۆشەی داوێنەکانی بەسورمەی ئاڵتوونی چنراوە بە تایبەتی کەمەری نەخشی سورمەی سغی تیاکراوە و ناوقەدەکەی باریک کراوەتەوە هەرچەند (فەرهەنگی خاڵ) هەر بە هی ئافرەتی داناوە، بەڵام هی نێر و مێ بووە. پیاوە گەورەکان لە بەریان کردووە.

جببە: جۆرە کەوایەکی فشو فۆڵە لەسەر هەموو بەرگێکەوە پیاوە گەورەکان و ناوداران و شێخ و مەلا و مریدەکان و ئاغە و مەلا و زاناکان لە بەریان کردووە.

گوڵنار: ڕەنگی سوورێکی وەک گوڵە هەنارە.

کڵاو: پۆشاکێکی سەرە، وەک کاسەیەک وا بووە یا چنراوە، یا لە قوماشی جوان و چنراو ئەوەندەی پڕ بە سەر هەتا ناوچەوان بوو.

لار: ئەم لاریی کڵاوە گەنج و کەسانێ کە لەخۆیان باییبوون، کڵاوەکەیان بەلاری لە سەر کردووە بۆفیز. ئافرەت و کچی جوان و کارمەندانی بە دەسەڵاتیش کڵاوەکەیان لار داناوە.

چاوخومار: چاومەست و چاو خەواڵوو، چاو نەرم.

شیرین سوار: شۆڕەسوار، ئەی ئەوەی سواریت لێ دێ و لێت شیرینە، لەناو کوردا، ئافرەتیش سواری چاک و (شۆڕە سوار) و (شیرین سوار)ی تیا بووە، بەتێکڕایی بۆ مێینە و نێرینە بووە.

موشکی تاتار: بۆنی خۆشی (مسک، میسک، موشک، مشک)ی وڵاتی (تەتەر)ەکان کە لەوێش ئەو جۆرە ئاسکە هەیە کە ئەو بۆنە خۆشەی لێ وەردەگیرێ. لەلایەکی ترەوە (مسک) ڕەنگەکەی ڕەشە و (تەتەر) (تاتار)یش لەبەر خراپکاری بە ڕەش دانراون. واتا (مسکی ڕەش)، بۆیە (کوردی) بە خاڵە ڕەشەکەی چواندووە.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە ١٨ کەشکۆڵی دەستنووسە کە (مس، عن، گل١، گل٣، گل٥، گل٨، گل٩، ن، جلی، ف، ر، ش، ص، یح، ما، کو، نم١، با)وە گۆڤاری (گەلاوێژ) ژمارە :٣ ساڵی ٦/ مارتی ١٩٤٥ لاپەڕە ٣٧ و ٣٨(بەغدا)یە لەگەڵ ڕۆژنامەی (ژین) ژمارە: ٦٤١ لاپەڕە/١ ڕۆژی پێنجشەمەی ١٣ی شەعبانی ١٣٦٠ک بەرامبەر بە ٤ی ئەیلوولی ١٩٤١ ساڵی ١٥/ (سولەیمانی)یە، لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ پشت بەستن بە سەرچاوەکانی تریش. ئەم هەڵبەستە لە (عن)دا دوابە دوای هەڵبەستی (بۆ گەڕانی

ئاشی دڵ فرمێسکی چاو ئاق دەنیزە)ی (کوردی)یەوە نووسراوە، هەروەها لە سەرە ناوی ئەم هەڵبەستە سەرەوەشدا بە فارسی نووسراوە: (ایضا کردی در شیو کل بەمناسب خستگی چشم احمد بیگ، پسر محمود اغا شیو کل، رحمهم الله فرموده – علی). واتە (دیسانەوە ئەم هەڵبەستەش «کوردی» لە بۆنەی چاویەشەکەی ئەحمەد بەگی کوڕی مەحمود ئاغای شیوە کەڵەوە (خوا بیان بەخشێ) فەرموویەتی – عەلی).

کەواتە ئەوی (کوردی) ئەم هەڵبەستەی بەسەردا هەڵداوە، ئەو ئەحمەد بەگی کوڕی مەحموود ئاغای شیوە کەڵە، کە (سالم)یش لە هەڵبەستی شۆڕشەکەی عەزیز بەگی بابانیدا پێی گوتووە:

«نەعرەتەی "ئەحمەد بەگ"ی نێزە وەشێنی شێوە کەڵ

مـیـثلی جـاوی گـازری، ڕیزی (نیظام)ی دادڕان»

کە دووریش نییە (سالم)یش بەم بۆنەی چاویەشەی (ئەحمەد بەگ)ەوە هەڵبەستی دانابێ و لە شیعردانانەکەی (کوردی)دا لەگەڵی بووبێ. (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا، چۆنێتیی جلوبەرگی نایاب و شێوەی جوانی و لێهاتوویی (ئەحمەد بەگ)ی بە جارێ دەربڕیوە کە ئەم هەموو شتەی لە یەک تاکدا جێ کردووەتەوە، جگە لە (نەمر) کردنی ناوی چەند جۆرە پۆشاکێکی کۆنەمان وەک کەلەپوورێک.

زەڕ (مس، عن، ن): زَرّ: ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.

زەڕ (گل١، گل٣، گل٥، گل٨، گل٩، ص): زر. دیسان ڕێنووسی کۆنە.

زەڕ (ف، ش، یح، ما، کو، ژیی): زر. هەر ڕێنووسی کۆنە.

زەڕ (ر): ذر. ڕێنووسی کۆنە بەڵام پیتی (ذ)ی لە باتی (ز) داناوە.

گوڵناری (ن، ص، یح، جلی): کلناری. ڕێنووسی کۆنە.

موشکی (گ٢، س): مسکی. ئەمیش دەگونجێ و ڕەنگە دەسکارییش بێ.

موشکی (گ٣): میشکی. ڕێنووسی کۆنە.

موسکی (جلی) مشک.

موشکی (نم١، ف، کم، « گەلاوێژ»): شکلی. ئەمەش هەڵەیە.

٢– مانی: وێنەکێشێکی کۆنی بەناونگە و پێشتر لێی دواوم، هەروەها (کەمانی) بە واتە (کە، مانی) یا کە ئەو وێنە کێشەیەوە جگەلەوە. (کەمانی: کەوانی وەک کەوان چەوت)یشە و هەر دووکی دەگونجێن و جوانکارییە .

کێشان: نەخشکردن، (کێشان) بەواتە ئەندازەکردن وەک بە تەرازوو بۆ نەخشکردنی وە (سەر کێشان) سەر لێ بردنە پێشەوە بۆ دیتنی وێنەکێشان.

مەستی: سەرخۆشی، یا لە (مستی) لە ناو دەستیا.

دالەغزی: دالەرزی، لەرزی، داخرا، تەتەڵەی کرد.

خەططی: خەتی، خەت کێشان، واتە هێڵی نووسینی نووکی (پەرگار)ەکەی.

پەرگـار: ئامـێـرێکی ئەندازیارییـە: (جـەوەل) و خـەتـی کـەوانـی (جـغـزی) پێ دەکـێـشـرێ و بۆ وێنەکێشانیش بەکاری دەهێنن کە ئەو (مانی)یە لە جوانییەکە مەست بووە.

ئەم تاکە لە (گل٣)دا چوارەمینە و لەوانی تردا دووەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

سەر کێشانی (نم١، کم): تصویری – و ئەمیش لەنگە.

سەرکێشانی (گەلاوێژ): سەر تصویری.

کێشانی (مس، ص، ن، یح): کێشان . ڕێنووسی کۆنە.

کێشانی ئەبرۆی (با): تصویری بروئی.

لە پاش (گل٣): لپش.

لە پاش (ژین): لبر. (لەبەر).

لە مـەستی (سـەرچاوە کـۆنەکان) بەڕێنووسی کـۆن (لمستی)یان نووسـیـوە کە بـە: (لە مەسـتـی): لەبەر سـەرخۆشی و. (لەمستی): لە ناو دەستیا، پەرگارەکە لە مستیا بووە دەستی لەرزیوە.

داله غزی که (نم١، جلی، کم١، گەلاوێژ): دالەرزی.

داله غزی که (ژین): والەرزی کە.

داله غزی که (ر، گل٣) و الرزی که

داله غزی که (گل١): والرزی.

خەططی (نم١): خطو.

خەططی (ف، کم، گەلاوێژ):خط و.

خەططی (مس، ص، ن، ما) خط. ڕێنووسی کۆنە

خەططی (جلی) نقش.

٣- مونەججیم: ئەستێرە شوناس، زانای زانستیی ئەستێرە شوناسی. گەردوونناس.

گۆشەیی چاو: قەراغی چاو، مەبەستی لە بینینی (نیو نیگا)یەکە بووە.

تەقویم: ساڵژمێر، ڕۆژژمێر: پەڕاوییەکی ناوی ڕۆژ و مانگ و ساڵ و کاتە و بۆنەی قەوماوی ئەو ڕۆژە کامە دەبێ و کامە بووە و کامەیە و... هتدی تیا دەنووسرێ (ساڵنامە).

ذوو ذەنەب: (کلکدار) ناوی ئەسـتـێـرەیـەکـە لە پێـوەڕست (تابیع)ەکـانـی هـەر ئەسـتـێـرەیەکی (کۆمـەڵەی ڕۆژی) و بەدەوری ڕۆژدا دەسووڕێتەوە، ڕووناکاییەکەی لە ٢٠٠ ملیـۆن میلەوە هانا دەکرێ. ئەستێرە شوناسخانەی (ئەدمۆند هالی) لە ساڵی ١٦٨٢ لەسـەر ئەم ئەستێرەیە دواوە، بـۆیە بـە ناوی (هـالی)یـەوە ناوی دەرکـــردووە، لە ســـاڵانی ١٧٥٩ و ١٨٢٥ و ١٩١٠ و ١٩٥٨ی زاینیـدا لە زەوییـەوە دەرکـەوتووە، هـەر لەبەر ئـەم درەنگ دەرکـەوتـنەیەتی کـە هـەڵهـاتنەکـەی بە مـەترسـیـدار، زانراوە وەک (کـوردی) لەم تـاکـەیدا هەڵـهـاتنی (ذوو ذەنەب)ی بـە خـراپ داناوە (پیرەمێرد)یش لە (٢٠، ٣٠)یەکاندا بە (کلکدار)ی (هالای) ناوی بردووە و وتوویە:

«ئـەتانگوت (هـالای) کلک هـەڵسـووڕێنـێ

ئـەم سـەر زەمـینـە پاک ئـەسـووتێنـێ»

«"کلکدار"یش هەڵات، هیچ نەبوو
گـونی بارگـیـری کـەسی پێ نەچوو»

بە پێی ئەوەی کە (کوردی) وتوویە: (ئەمسـاڵ ذو ذەنەب طالیع بووە) بە سـەرنجدانێک لە ساڵەکانی ژیانی و ڕێکەوتی هەڵهاتنی ئەم ئەستێرەیە، بێگومان ئەو ساڵە ١٨٣٥ی زاینی بووە کە ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی تیا وتووە، هەروەک (پیرە مێرد)یش کە ئەم ناوی (کلکدار)ەی لێوە وەرگرتووە. نیشانەی بۆ هەڵهاتنەکەی ساڵی ١٩١٠ی ئەم ئەستێرەیە کردووە. طالیع: لێرەدا مەبەست لە هەڵهاتن (دەرکەوتنی) ئەم ئەستێرەیەیە لەزەوییەوە.

ئیفساد: خراپ، تووش، چەتاڵ، بەد.

ئاثار: پاشماوە، یا مەبەست لە کاریگەریی خراپ و ناهەمواری ئەم ئەستێرەیە بەپێی بڕوای کۆن.

ئەم تاکـەی سـەرەوە لە (مس، عن، گل١، گل٥، گل٨، گل٩، ن)دا سـێـیـەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیەو من بە پێی ئەم سەرچاوانە کە کۆنترین و باوەڕپێکراوترین شوێنەکەیم بە تاکی سێیەم جێگیر کرد هەرچەندە لە (گل٣)دا پێنجەمینە و لە (یح، ژین)دا شەشەمین و لە (ف، کو، نم١، با، کم، گەلاوێژ، گ٢، س، گ٣)دا حەوتەمینە و لە (ش، ص، ما)دا نییە و لە (جلی)دا دڕاوە و چاک ناخوێنرێتەوە.

گۆشەیی (مس، عن، گل١، گل٣، گل٥، گل٨، گل ن، ن، یح): گوشەء. ڕێنووسی کۆنە.

کـەدیی نووسـیی (کـو، یح): کـە دینووسی – ڕێنووسی کـۆنە و بە (کـە دەینووسی)ش دەخوێنرێنەوە.

کەدیی نووسیی لە تەقویمدا (ژین): وەها نووسی لە تقویما.

کە ئەمسـاڵ (ژین): کە امشـەو– ئەمـەش. ڕێی تێ ناچێ، چونکە ئەوسا هۆی دەنگ بڵاو کردنەوەی خێرای وەک ئێستا نەبووە وەک: سەتەلایت و ئەنتەرنێت و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و تەلەفۆن و...هتد تاکو شەوی هەڵهاتنی ئەستێرەکە زانرابێ لە سولەیمانی لە شەوی هەڵهاتنەکەیدا.

جگە لەوەی هەموو سەرچاوەکان (ئەمساڵ)یان نووسیوە.

طالیع بووە (ر): طالع. لەم سەرچاوەیە کەوا (بوە) کە نە نووسراوە.

ئاثاری (ژین): بازارە. ئەمیش ناگونجێ و سەرچاوەکانی تری لەگەڵدا نین.

٤– چاوی بەد: (چاو پیس)، مەبەستی لە چاوی خراپان (حەسوود) ئەوانەی هەناسەی پیا هەڵدێنن و لە بڕواکردن بە کاریگەریی چاوی پیسەوەیە.

چەشمە: سەرچاوە، کانگا، چاوە.

جادوو: سیحر.

بێچوە عەییار: منداڵی کەسێ کە زۆرزان و فێڵ بازبێ و لە پێشترا لێی دواوم.

ئەم تاکە لە (گل٣، ف، ر، ش، ما، یح، کو، نم١، با، کم، گەلاوێژ، ژین، گ٢، س، گ٣)دا نییە و

لە (ص)دا سـێـیـەمین و لە (مس، عن، گل١، گل٥، گل٨، گل٩، ن)دا چوارەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە هێشتا، چاپ نەکراوە
٥- دوعام کرد: نزام کرد، لە خوا پاڕامەوە، تکام کرد.
بیمار: دەردەدار، بیمارکرد. منی ئەنگاوت بە چاوی (بیمار) واتە مەستی.
ڕەفیق: ئەی هاواڵ، ئەی هاودەم.
ئامان: هانا بردنەبەر.
ڕەببی: ئەی خوایە.
ظاڵم: ستەمکار، زۆردار
بیمار: لێرەدا مەبەستی لە چاوی مەستە و جیناسیشە کە مەبەستی چاکە و خراپە دیارە.
ئەم تاکە لە (ش)دا نییە و لە (گل٣، ما)دا سێیەمینە و لە (ن، ر، ص، یح، کو، نم١، با، کم، گەلاوێژ، ژین، گ٢، س، گ٣)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمینە (جلی)دا شەشەمینە.
بە بیماری (ر): بە بیداری - ئەمیش هەڵەیە.
بیمار: بیماری (گ٣) بێمار، بێماری.
ئەمنی (ژین): دلی.
ڕەفیق ئامان (ژین): ڕەفیقان سا.
ئامان (جلی) ایوە
ڕەببی (یح): رَبِّ. ڕێنووسی کۆنە.
ڕەبیی (مس، عن، گل١، ٣، ٥، ٨، ٩، ن، ر، ص، ما) رَبّی.
٦- فەووارە: فوارە، شوێن هەڵقوڵاندنی ئاو و بەرز بوونەوەی.
دەقوڵێ: قوڵپ دەدا، هەڵدەقوڵێ، بە گوڕ دێتە دەرێ. بڵق دەدا.
گۆشەی: کەناری. دەوراندەوری، قەراغی، لێواری
میحوەر: چواردەور. بەڵام (میحوەر) ئەو خەتە، بە بیر (خەیاڵ) دروست کراوەیە کە بە نێوان هەردوو پۆپەی سەروو، خوارووی خڕەی (گۆی) زەویدا تێ دەپەڕێ و زەویی بە سەردا و بەدەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، لێرەدا (کوردی) سەری خۆی کردووەتە (چەرخ) (فەلەک) و بە میحوەری گەردنیدا دەسووڕێتەوە و بارانی فرمێسکی خوێنینی پیا دەچۆڕێ، بە هەر گۆشەو کەنار و دەوراندەوری گەردنیدا وەک فوارە لە چاوەی چاویەوە دێتە خوارێ.
گەردن: ئەستۆ، مل، سکورد.
چاوە: سەرچاوەکانی.
ئەم تاکە لە (ش، ژین)دا نییە و لە (یح) دا پێنجەمینە و لە وانی تردا شەشەمینە و لە (جلی)دا حەوتەمینە.
دەقوڵێ (ف، جلی، نم١، با، کم، گەلاوێژ، گ٢، س، گ٣): دەتکێ. ئەمەش هەڵەیە و کەم هێزی، چونکە لە فوارەوە (دەقوڵێ) نەک (دەتکێ)، جگە لەوەی هەموو سەرچاوەکانی ترو بە تایبەتی

کۆنەکانی (دەقولّێ)یە و ئەمانەش نوێن.
لە گۆشەی (یح، جلی، ف، مس، ص) لکوشە. ڕێنووسی کۆنە.
لە گۆشەی (جلی، ما، عن، گل١): لکوشەی.
گەردن (ر، ما، یح): کردون.
گەردن (ف، نم١، با، گەلاوێژ، کم، گ، س، گ٣): گەردوون – ئەمیش هەڵەیە.
لە چاوی (یح): لە چاوە – ڕێنووسی کۆنە.
چاوەکانی من (ر): چاوکانی – ڕێنووسی کۆنە.
لە چاوەی (جلی) بەچاوی.
لە دەردت (ر، یح، ف، با، کم، گەلاوێژ، گ٢، س، گ٣): لە دوریت هەڵەیە.
لە دەردت هێندە خوێن باری (ما): اوند خوین بە خور باری.
هێندە (ف، کم) هێند – ڕێنووسی کۆنە.
باری (کم): اباری، ئەمیش لەنگە.
٧- دیدە: چاو
سووچ: خەتا، خراپە.
لاسار: چەتوون، بزێو، خراپ.
ئەم تاکە لە (گل٣)دا دووەمینە و لە (ص)دا پێنجەمینە و لە (مس، عن، گل١، گل٥، گل٨، گل٩، ن)دا حەوتەمینە. هێشتا چاپیش نەکراوە و لەوانی تردا نییە.
٨- قاتیل: بکوژ، کوژەر.
ئەدی: ئیتر، کەواتە.
دەدۆزن: ئەپشکن، ئەپێکن، دەئەنگیون.
موژگان: برژانگ، مژولان، موژە .
بەخوڕ: بەگوڕ و هێرش. بۆ ئاو بەکار دەبرێت (بە لێشاو)
سووفار: سەرە ڕم، سەرە نێزە، سەر تیرە مەبەستە (کە نووکی برژانگەکانیەتی)
ئەم تاکە لە (س، ما، یح، ژین)دا نییە و لە (ف، ر، کو، نم١، با، کم، گەلاوێژ، گ٢، س، گ٣)دا پێنجەمینە لە (جلی)دا شەشەمینە و لە (گل٣، ص)دا حەوتەمینە و لە (مس، عن، گل١، گل٥، گل٨، گل٩، ف)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
دەڵێیت و (نم١، ف، با، کم): دەلی ی
دەڵێیت و (گ٢، س، گ٣): دەڵێ ی و.
نیت (س): ی – بەبێ (توفتە)یە.
نیت (ف، نم١، با، کم، گ٢) نی
نیت (گ٣): بێ.
نیت ئەدی بو چی (کو): بی.

ئەوی (ف): ایدی.
دەدۆزن (ف، نم١، با، کم، گەلاوێژ): بە یەک یەک.
دەدۆزن (ن، ص): بەیک یک. – دیارە لە مانەوە گۆڕاوە بە (بەیەک یەک)
دەدۆزن (گ٢، س، گ٣): درۆزن – ئەمەش بە هەڵە وەرگیراوە.
لە موژگانت بە دواوە لە (جلی)دا پینەی بە سەرا هاتووە ناخوێنرێتەوە.
سووفاری (گ٣): سۆفاری.
٩– موقابیل: بەرامبەر، هاوتا، خۆ وەک یەک ڕاگرتن.
ڕوخسار: ڕوو.
بەڵێ: ئەم وشەیە لە سەرچاوە کۆنەکاندا بە ڕێنووسی کۆن و بەشێوەی (بلی) نووسراوە کە بە (بلێ: ئەتۆ بلێ ئەی کوردی) و بە (بەڵێ: ئا)یش وەردەگیرێ و دەخوێنرێتەوە هەردووکیان دەگونجێن.
دەم دڕاو: ئەوەی قسەی لە دەما نەوەستێ و مەبەستی لەوەیە کە (گوڵە)و (خونچە) نییە چونکە (گوڵ) بریتییە لە (خونچەی کراوە) کە دەمی کردووەتەوە بۆیە؛ بە دەم دڕاوی داناوە؛ چونکە (بۆن)ە خۆشەکەی خونچێتییەکەی با بردوویەتی و نەیماوە کە وەک (ڕوو)ی ئەحمەد بەگ جوان بۆنخۆشی نییە.
هەرزەگۆ: هەرزە بێژ. قسەنەزان، نادان لە گوفتوگۆدا.
مەحبووبی بازاڕی: یاری هەرزە و ئافرەتی سووک، (سوقاقی).
ئەم تاکە لە (ف، ر، ش، یح، کو، نم١، با، کم، گەلاوێژ، ژین، گ٢، س، گ٣)دا سێیەمین و لە (ما)دا چوارەمین و لە (گل٣، ص)دا هەشتەمین و لە (س، عن، گل١، گل٥، گل٨، گل٩، ن)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە. ئەم تاکە لە (ش)دا دوا تاکە، چونکە تەنیا سێ تاکی ئەم هەڵبەستەی تیایە و لە (جلی)دا پینەیە. یەکی بەسەرا لکاوەو دڕاوە ناخوێنرێتەوە و چوارەمین تاکە.
(کوردی) هەتا ئەم تاکە ئەم هەڵبەستەی هەر لەسەر (چاوی) ئەحمەد بەگ داناوە
لێرەوە ئەچێتە سەر باسی جوانی و زولف و شتی تر...
گوڵ (مس، ن، ما، یح، ر): کل : (گوڵ) ڕێنووسی کۆنە.
موقابیل (ژین): بەرامبەر.
کرد (ن، ص، ژین): گرت.
بەڕوخسارت لەلای خەڵقی (گ٣): لەلای خەڵقی بە ڕوخسارت. شێواوی دەسکارییە.
بەڕوخسارت لە لای خەڵقی (ر): نسخە مقدم و مؤخر أی (لە لای خلقی بەرخسارت). دیارە (گ٣) لەم جۆرە سەرچاوەیەی وەرگرتووە.
هەرزەگۆن (ما): هرزەکون. ڕێنووسی کۆنە.
گۆن: (مس، ن، ص، کم، با): کون. دیسان هەر ڕێنووسی کۆنە.

مەحبووبی (ن، ص، یح): محبوب. ڕێنووسی کۆنە.
بەڕاستی ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستە لە جوانترین دەربڕین و (وێ چواندن)ەکانی هەڵبەستانە.
١٠- تەقلید: لاسایی.
عەقرەب: دووپشک و مارەکۆڵ.
حەیا: شەرم، ئابڕوو.
چی بڵێی: هەر چییەک کە تۆ بیڵێیت.
کوێرە: مەبەستی دووپشکەکەیە گوایە چاوی نابینێ و لێرەشدا سووکە توانجێکی ژێرەوەشی لە ئەحمەد بەگ ئەشێ گرتبێ، یا بۆ پێکەنین و بەنازەوە بەوی گوتبێ (کوێرە)و بەمەش ئیدیۆم (کینایە)یەکی کوردییە.
موختاری: سەربەستی، ئارەزووی خۆتە، ئازادی، مەبەستی ئەوەیە کە هەرچی دەتەوێ بیڵێیت، بیڵێ وەک زولف وەهای تاریک (ڕەنگ) و لوولی. پێچوپەنای وەک چەوتی کلکی دووپشک.
ئەم تاکە لە (ما، ژین)دا پێنجەمینە و لە (یح)دا حەوتەمینە و لە (ف، ر، کو، نم١، با، کم، گەلاوێژ، گ٢، س، گ٣)دا هەشتەمینە و لە (گل٣، ص)دا نۆیەمینە و لە (ش)دا نییە و لەوانی تر دەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە (جلی)دا پینەی بەسەردا لکاو، ناخوێنرێتەوە و پێنجەمین تاکە.
ئەتۆش (ن، ص، یح): اتویش.
تەقلیدی (مس، ن، ص، یح) تقلید. بەڕێنووسی کۆنە
زولفی (مس، ن، ص، ما): زلف. ڕێنووسی کۆنە.
بار (کو): خوت.
دەکەی (نم١، ژین): اکەی.
دەکەی (مس، ن، ص، ما) دکەء -ڕێنووسی کۆنە.
وا دیارە (نم١، ف، کم، با، گەلاوێژ) دووبارە.
وا دیارە (گ٢، س): وە دیارە.
حەیا هەروا (ر): حیا اوتە: (حەیا ئەوتە).
لە چاودا (ما، ژین) لەچاوا
چی بڵێی ئەی (گەلاوێژ) چی بلی ئەی. ڕێنووسی کۆنە.
چی بڵێی ئەی (یح، ما): هرچی تو بلی.
چی بڵێی ئەی (ژین): هەرچی تو بلی ی.
چی بڵێی ئەی (ما): هرچی بلی.
چی بڵێی ئەی (ف): هرچی بیکەی.

چی بڵێی ئەی (کو): هرچی بو بلیٔ.

١١- خواهیش: داوا، خواست، ویستن.

دونیا: جیهان، گێتی.

عەقل: ژیری.

صەبر: پشوو، ئارام، خۆڕاگرتن.

ئیمداد: بە دەنگەوە هاتن.

یاری: دۆستایەتی، (یاری: هاریکاری)، یاری : گەمە و پێکەنین و خۆشی دیاریدەدان و هەموو ئەم واتایانەش بۆ ئێرە دەگونجێن و نەفس بەرزیی خۆی گەیاندووە کە ئاشکرای کردووە لە ئەحمەد بەگ یاریدەدان و پاداشتی هەڵبەستەکەی ناوێ؛ چونکە کوردی بە پارەی شاعیرێتی نە ژیاوە.

ئەم تاکە لە (ش)دا نییە و لە (ما، ژین)دا حەوتەمینە و لە (یح)دا هەشتەمینە و لە (ف، ر، کو، جلی، نم١، با، کم، گەلاوێژ، گ٢، س، گ٣)دا نۆیەمینە و لە (گل٣، ص)دا دەیەمین و لە (مس، عن، گل١، گل٥، گل٨، گل٩، ن)دا یانزەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەموانیشدا دوا تاکە.

لە گەلاوێژدا بە پەراوێز نیشانەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەم هەڵبەستەی لە (چاپی بەغدا) واتە لە (دیوانی کوردی- کوردی و مەریوانی: کم) وەرگرتووە کەچی وەک لە سەرەوە بەراورد کراوە دەبینرێن جیاوازیی زۆریان لە نێواندایە. چشت ( ما، ن، با، گەلاوێژ): شت.

چشت ( گ٢، جلی، س، گ٣): چت.

قەت (عن، مس، ص، ر، یح، ما، ژین): قط. ڕێنووسی کوردییە.

لە دونیا (ف): لخوت – ئەمیش نابێ و لەنگە و دووبارەیە.

لە دونیا کوردی تا ماوی (ر، ما، یح، ژین): لە چوار کەس، کوردی تا دمری.

لە دنیا کوردی تا ماوی (کو): لە خۆت کوردی هتا ماوی.

لە دنیا (گ٣): لە چوار کەس.

لە دنیا (جلی) لە چارکس.

ئەم نیمچە دڵداری و شەیدایی ڕاگەیاندنە بۆ (نێرینە)ی دۆستان، بە پاکی نەریتێکی (باو)ی وێژەی نەتەوە ئیسلامەکانیشە.

## لە پاش چەند وەعدە؟

١- لە پاش چەند وەعدە قەت جارێ نەهاتی؟
ئەمـــیش بۆ من نـەهـاتی بـوو، نـە، هـاتـی
٢- کـە تۆ صـەییـادی من صــەیدی بریندار
حــــەقـی مـن بوو هـەڵێم، تـۆ بۆ هـەڵاتـی؟
٣- بە(ڕوخ) شـاهـی لەسـەر تەخـتـی جـوانی
هـەمـوو دڵ، ڕەعیـەتـە، هێشـتـاکو مـاتی؟
٤- لە دەست زنجیری (ضەیق)ی تۆ مەحاڵە
دڵـی دێـوانـەیـی مـن بـێ نـەجـــــــاتـی
٥- ئەوەند شـیـرین زمـان و خـۆش کـەلامی
بە عـــەینی هەروەکـــو قـــەند و نەباتی
٦- لـە شــــامـی زولفـی تۆ بـۆیە ئـەمـــینـم
بە ڕۆژ چـونکە وەکــو صـــوبحی بەراتـی
٧- لە (هیجری) گەر دەپرسی ئاخۆ ماوە؟
حــەیاتی باقـــیـــە تا تۆی حـــەیاتی.

---

١- وەعدە: بەڵێن
نەهاتی: تۆ نەهاتیت بۆ لام.
نەهاتی: وشکەساڵ (قحط)، بێ بەختی، بۆ نەهاتن؟
نە، هاتی: (نە= نەوەکو، نەکو)، (هاتی = بەخت، قازانج...) کەواتە: نە، هاتی= نەوەکو بەخت و قازانج، بۆ هاتن و... ئەمەش جوانی و جیناس و سەجع ئارایی و وەستایی تیایە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (مس، عن، گل٣، کا، نم٣، ک١، ص)ە و هەموویان دەستنووسن و هێشتا چاپیش نەکراوە و من (مس)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
ئەم هەڵبەستە لەلایەن شێخ عەبدولرەحمان کاکە (نەسیب)ەوە کراوەتە پێنج خشتەکی و وابزانم ئەویش چاپ نەکراوە. لە دوای هەر تاکێکی ئەم هەڵبەستەی سەرەوە پێنج خشتەکی

ئەو تاکە دەنووسمەوە هەر چەندە (ئەحمەد حەمدی صاحێبقران)یش هاوچەشن ڕەدیفی ئەمی وتووە کە لە لاپەڕە: ٣٦٢ی دیوانە چاپکراوەکەی و لاپەڕە: ٢٩٤ی دیوانە دەستنووسەکەی (حەمدی)ی لای مندا هەیە و چەند هۆنەرێکی دیکەش هاوچەشنی ئەم هەڵبەستەیان وتووە.

٢- صەییاد: ڕاوچی، نێچیرڤان

صەید: نێچیر

هەڵێم: هەڵبێم، ڕاکەم، لە دەستت خۆ ڕزگارکەم، دەرچم.

هەلاَتی: ڕات کرد، وەک ڕۆژ هەڵهاتی، ئەم دوو هەلاَتنەی ناو ئەم تاکە پێچەوانەی یەکترن و ئەمیش جوانییەکی وێژەیییە و جوانکاری.

ئەمەش پێنج خشتەکیی ئەم تاکی دووەمەیە:

چ فایدە بۆ منی مەحزوون و غەمبار

بە داوی زولفی خۆت ئەمکەی گرفتار

لە بۆ صەییادی وەک من حەیفە ئەی یار

کە تۆ صەییادی من صەیدی بریندار

حەقی من بوو هەڵێم، تۆ بۆ هەلاَتی!!

٣- ڕوخ: ڕوو، ڕوخسار، (ڕوخ = قەلاَ: لەیاری شەترنجا) مەبەست کە تۆ بەو گەورەیییە و خاوەن قەلاَیییەت کە پادشا و... هتد)

ڕەعیە: مسکێن

٤- ضەیق: تەنگ، گوشراو مەبەستی زنجیری لە مل توندکراویەتی.

مەحاڵ: ناشێ، شتێ کە لە کردن و بوون نەیەت، ناگونجێ.

نەجات: ڕسگار، ڕەها، بەربوون.

٥- بە عەینی (نم٣): بێ عەینی - ئەمەش هەڵەیە هەرچەند ئەمیش باوە.

بە عەینی (مس، عن، کل٣): بعینِی (بعَیْنِهِ).

کەلام: گفتوگۆ.

بە عەینی: هەر وەکو، بە خودی خۆی.

قەند: شەکر

نەبات: لیمۆی شیرینی بەپەروەردە و وشککراوەیە کە لێی دواوم.

٦- شام: ئێوارە، تاریکاییی داهاتنی ڕۆژ، (شام) شارێکە ئێستا «دیمەشق»ی پێ دەڵێن، ئەشێ لەوێش سەری لە خۆشەویستێکی دابێ و لەوکاتەدا ئەو کەسە لە شوێنی خۆی نەبووبێ (کوردی)یش ئەم هەڵبەستەی بۆ دانابێ کە هاتەوە بیدەنێ، لەگەڵ ئەویشدا (باو)ە شاعیرانی تریش زۆر ئەم دەربڕینەیان دووبارە کردووەتەوە بە دووریی نازانم ئەو کەسەی کوردی لە شام سەری داوە (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) بووبێ.

ئەمین: دڵنیا، بێ ترس

ئەم ئەمینم بەڕێنووسی کۆن بە شێوەی (أمینم) دەنووسرێ و لە هەمان کاتدا بە (ئەمینم)یش دەخوێندرێتەوە ئەمەش جوانکارییە.

صوبح: بەرەبەیان

بەرات: ڕێکەوتی شەوی ١٥ی مانگی (شەعبان)ی ساڵی کۆچی دەکات کە بە شەوێکی پیرۆزی دادەنێن، چونکە کاتی تەقدیراتی ڕزق و ژیان و... هتد لەلایەن خواوە بە پێی بڕوای ئیسلامەکان، و بەلایانەوە جەژنە، هەروەها جەژنی (یەحیا)و (زەکەریا) پێغەمبەریشە.

٦- هیجری: ئەم نازناوەی بەڵگەی ئەوە بووە کە لە دەرەوەی وڵات یا (سولەیمانی) ئەم هەڵبەستەی داناوە و ئەمەش لەگەڵ بۆچوونەکەی مندا یەک دەگرێتەوە کە لام وایە بۆ (مەولانا)ی دانابێ.

حەیات: ژیان

باقییە: ماوە، پایەدارە و مەبەستی لەوەیە کە (هەر دەژی...) هەتا تۆ لە ژیاندابی.

تێبینی: لە هەڵبەستە هاوچەشنەکەی (حەمدی)ی صاحێبقراندا لە دەستنووسەکەدا بەم تاکە دەست پێ دەکا کە:-

دڵم دەرهات و تۆ هەر دەرنەهاتی

نەهاتی، هەر نەهاتی، هەر نەهاتی، کە هی (مەحوی)یە.

کەچی لە چاپی دیوانەکەیدا بە تاکێکی تر دەستی پێ کردووە... کە هەر دووکیان ڕەدیفی (کوردی)یان وتووە بەداخەوە پەڕەی دوای ئێرە کە(تەخمیس)ە کەی (کاکە)ی تیایە لە لای من لەناوچووە و گەڕام نەمدۆزییەوە.

## ئەمان مردم

١- ئەمـــان مـــردم عـــیـــلاجێ، ســـا لەڕێی پێـغــەمــبــەرا چارێ
ویصـــال، یـا قــەتڵ، یا تـەسکین، لە هـەرسـێ بۆم بکەن کــارێ
٢- وەهـا ســـووتـاوم ئەصـــــلا تـابی فــــریادم نـەمـــا ســـادەی
ڕەفــیــقــان نیــوە ســووتن ئێـوە، نـامــەرد عــەرزە هاوارێ
٣- لە کـونجی سـینـە دەنگی ئـای و ئۆی دڵ دێ بەمـەحـزوونی،
وێران بێ نـەم دی ســــــاتـێ، لێی نـەیـێ نـاڵـەی برینـدارێ.
٤- ئەلای هـەرکەس دەچم مەنعم دەکا خـۆت بۆچی ڕیسوا کـرد؟؟
درێـغ کـــوا حـــاڵـزانـێ؟ڕەببی تـووشم بێنـی بیـــمـــارێ.
٥- لە ژێر باری غـەمـا وا شـانی صـەبرم ڕێشـە ئێـسـتـاکـە
فــیــراقی یار، لەبەر ئـاخـر شـەڕی لێم بووەتـە سـەرباری
٦- بەڵای (مـەنصـوور)، لە دڵمی دا و (مـەدەدکـار)ی نـەبوو طالیع
لە دەرگـای یار وەکـو شـێت (بـاز)ی بردو، کـەوتە سـەر داری
٧- لە نەزعـا، پێی دەڵێم: قـوربان: جـەفـا بەس بێ. دەڵـێ: کـافـر
هێمـا چەت دیگە، تۆ سـەگ مـەرگی، کـارم مـاگە پێت جارێ
٨- صــەبا! یارانـی مـەجلیس، گــەر هەواڵی من بپـرسن لێت؟
بڵـێ: کـێشـایە مـەیخـانە، دوو چاوی بێـچـووە عـەییـارێ
٩- دوڕ و یاقــووت دەبارێ لەم کــەلامــە شــیــرنەی (کــوردی)
خـــودا ســـاکـــوا؟ لە دونیـــادا قـــەدر زانـێ، خـــڕیدارێ

---

١- ئەمان: ئەی هاوار، هەی داد، وشەی هانابردنە، فریاد.
عیلاج: چارە.
ویصال: پێکگەیشتن.
قەتڵ: کوشتن.

تەسكین: ئارام، بارسووككردن، هێور.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە كەشكۆڵی (مس، عن، ن، گل٥، ع، ف، ر، ش، كو، ما٢، ب، با، نم١، نم٣، صح)ە. لەگەڵ چاپكراوانی (كم، گ٢، س، گ٣، حص، بێكەس، رضا/١، ئا، رضا/٢)ە لەمانەشدا (كم)م كردە بنكە بەپشتیوانیی ئەوەكانی تر.

بەداخەوە (بۆنە)ی ئەم هەڵبەستە نایابەم لێ ئاشكرا نەبووە لەم (٢٤) سەرچاوە دەستنووسی كۆن چاپكراوانەیدا.

ئەم تاكە لە (ع، ش)دا نییە و لەوانی تردا یەكەمین تاكی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

عیلاجێ سا (گل٥، ر): علاجم كن. = (عیلاجم كەن).

عیلاجێ سا (ما٢): علاج پیاو.

چارێ (ر): چاری. ئەمەشی لە تاكی حەوتەمیندا دووبارە كردووەتەوە.

ویصال (ما٢): وصل. ئەمەش ئەشێ لەسەر شێوەی دەربڕینی (قەتل)ەكە بێ، وەك سەجع، ئەگەر لە سەرچاوەی كۆنی تردا بووایە، ئەمكردە بنكە لە سەرەوە.

ویصال (رضا/١): وصالی: ڕێنووسی كۆنە.

قەتل (بێكەس): قەتڵە.

لە هەرسێ (ن، گل٥، كم، بێكەس): لە هەر سێ.

لە هەر سێ (نم٣، رضا١، رضا٢) لە هەر سیە – ئەمەش ڕێنووسی كۆنە–.

لە هەر سێ (مس، عن، ما٢، نم١) لە هرسی٣.

كارێ (نم١، كم، بیكەس): چاری – ئەمەش نابێ كە لە یەك تاكدا هەمان پاشبەند دووبارە بكرێتەوە.

ئەم هەڵبەستە، یەكێكە لە شارەكانی (كوردی) و ئەوەتا ئەوەندە پڕ بەدڵە كە گەلێ هۆنەرانمان وەك شێخ ڕەضای تاڵەبانی، ئەحمەد حەمدی بەگی صاحیبقران و بێكەس كردوویانە پێنج خشتەكی؛ چونكە ئەگەر هەڵبەستێ لەوپەڕی جوانیدا نەبێ (تەخمیس) ناكرێ.

٢– سووتاو: سووتانی گڕی ئاگری عەشقی مەبەستە و ئەمەش یەكێكە لەوەی كە بووەتە هۆی ئەو ئەفسانەی سووتانی ڕاستیان بە (كوردی)یەوە هەڵبەستووە كە گوایە وەها سووتاوە خۆڵەمێشەكەشی بابردوویەتی، بۆیە گۆڕ (قەبر)یشی نییە، كە ئەمەش درۆیە.

ئەصلا: هەر لەبن: لە نووكەوە، لە بنچینەوە، لە ناخەوە.

تاب: تاو، گوڕ، توانایی، وزە.

فریاد: هاوار، بەدەنگەوە هاتن، هانابردن، فریا.

ڕەفیقان: هاوالان، هاودەمان، دۆستان، برادەران!!

نیوە سووت: نیوە سووتاو، نیوە سووتە – مەبەستی ئەوەیە كە ئێوە چاكترێكن و ئەوەندەی من بەیەكجارەكی نەسووتاون، فریام كەون، بمگەنێ.

ئەرزە: ئەرضە، واتە هانای بردووەتە بەر خرەی زەوی کە هەموو جیهانی مەبەستە وەیا بۆیە بۆ (زەوی) هانای بردووە کە ئەوەندەی گۆڕێک جێگەی پێ ڕەوا ببینێ، چونکی وەها سووتاوە بەشی ئەوەی نەماوە کە بخرێتە گۆڕەوە و هاواری بۆ (ئەو)ە بووە کە گۆڕێکی ببی و هەر ئەم جۆرە گوتانەی بووە کە هەندێ سەرچاوە وتوویانە گوایە (کوردی) گۆڕی نەبووە.
ئەم تاکە لە (ش)دا نییە و لە (بێکەس)دا حەوتەمینە و ئەوەش جێگەی خۆی نییە و ئیتر لە هەموو سەرچاوەکاندا دووەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە، جگە لە (ع) کە یەکەمینە لەوێدا.
وەها (رەضا١، رەضا٢): ئەوەند.
ئەصلا (بێکەس) ئەسڵەن.
تابی (مس، ن، ع، ر، ما٢): تاب. ڕێنووسی کۆنە.
تابی (ف): تاب.
فریادم (ع): هجرانم.
نیوە سووتن (ف، ما٢، نم١، کم): نیوە سووتون.
نیوە سووتن (گ٢، س): نیوە سووتەن.
نیوە سووتن (گ٣): نێوە سووتن – واتا نادات.
ئەرزە (ر، ئا): عرضی. ئەمیش دەگونجێ و جوانە و مەبەستی لەوەیە کە (عەرضی) کردنی بۆ ئێوە: (هاوار)کردنە.
ئەرزە (ع، کو، با، نم٣، ف، مس، گل٥): عرض.
٣- کونج: گوشە، سووچ و، مەبەستی لە دڵیەتی لە ناو سنگیدا.
سینە: سنگ.
مەحزوونی: غەمباری، ماتی، کزی، غەمگینی، خەفەتباری.
بریندار: مەبەست لە دڵەکەیەتی کە بەتیری عەشق بریندارە.
ئەم تاکە لە (ش، ر)دا نییە و لە (ع، بێکەس)دا دووەمینە و لە (ما٢)دا پێنجەمینە تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و ئیتر لە هەموو ئەوانی تردا سێیەمین تاکە.
لە کونجی (مس، ن، گل٥، ع، ما٢): لە کنج – ڕێنووسی کۆنە.
دەنگی (مس، ن، گل، ع): دنک.– ڕێنووسی کۆنە.
ئایو ئۆی (ئا): هایو هوی.
ئایو ئۆی (ما٢، کم، گ٢، س) ئایو وای.
ئای و ئۆی دڵ دێ (رضا١، رضا٢) ئای وا و دل دی.
دل دێ (ن) لی دی.
نەمدی (گل٥): شـهری = (شەهریی، شەهرێ = شاریی، شارێک یا مانگێ) ئەمیش دەگونجێ، جوانە و ئەگەر سەرچاوەی تری لەگەڵ بووایە لە سەرەوە وەک بنکە وەرم دەگرت.

ساتێ (کم): ساتی- ڕێنووسی کۆنە.
لێ ی نەیێ (کم) لی ی نەیەی.
لێ ی نەیێ (کو، با) لی ی نەبی.
لێ ی نەیێ (ئا، گ٢، س، گ٣) لی نەیە- لە ڕووی دەستووری زمانەوانییەوە تەواو نییە.
لێ ی نەیێ (گل٥): لیم ندی = (لێم نەدی)
ناڵەی (کو): نالە. ڕێنووسی کۆنە.
ناڵەی (مس، ن، گل٥، ما٢): نالەء. ڕێنووسی کۆنە.
نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (ع)دا بەم جۆرەی دواییە:
«دریغ کوا حال زانی ربی توش بی برنداری» دیارە شێواوە.
ئەمەش لەگەڵ ئەوەدا شێواوە و لەنگە، نیو باڵی دووەمی تاکی دواییە و بەهەڵە لەم سەرچاوەیەدا ئاوێتەی ئەم تاکەی سەرەوە کراوە. بڕوانە تاکی دوایی.
٤- ئەلای: بۆ لای، بۆ کن.
مەنع: نەهێشتن، ڕێ لێ گرتن، ڕێنەدان، قەدەغە.
ڕیسوا: سووک، بەناو، ڕیسوا.
دریغ: موخابن، حەیف. دریغا.
حاڵزان: ئەوی لە بار و چۆنییەتی و هەستیی بزانێ و تێی بگا و هاوبیری بێ.
ڕەبیی: خوایە، ئەی جودایە. خوایا.
بیمارێ: نەخۆشێ یا دەردەدارێکی وەک خۆی مەبەستە.
ئەم تاکە لە (ش، ع) دا نییە لە (ر، بێکەس)دا سێیەمین و لە (ما٢)دا شەشەمین و لەوانی تردا چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
ئەلای (کم): بو لای.
ئەلای (حص): بەلای.
دەچم (نم١، نم٣، صح، حص، بێکەس): ئەچم.
دەکا (نم١، نم٣، صح، حص، بێکەس): ئەکا. ئەم (ئەچم و ئەکا)یە نوێیە.
دەکا (ئا): دەکەن.
ریسوا (مس، عن، ن، گل٥، ف، ر، کو، ما٢، ب، با، نم١، نم٣، صح، رضا٢، رضا١، ئا، حص، کم): رسوا.
حاڵزانێ (گ٢، س، حص): حاڵ زانی - ڕێنووسی کۆنە.
حاڵزانێ (رضا١، رضا٢): حالە زانی.
حاڵزانێ (گل٥، ر): هاوزبانی.
حالزانێ (ما٢): هامزبان. ئەم (هاوزبان) و (هامزبان)ە ئەگەر لە چەند سەرچاوەیەکی کۆنی

تریشدا بووایە ئەمکردە بنکە، چونکە بەجێیە و دەگونجێ و کوردی ترە هەرچەندە لەوانەشە ئەگەر (کوردی) وای گوتبێ نازناوی خۆی لە هەڵبەستەکەدا (هیجری) دادەنا گوایە لە دەرەوەی وڵات وتوویە بەڵام وای نەکردووە.

تووشم بێنی بیماریێ (ع) توش بی برنداری- جگە لەوەی (بریندار) دووبارەشە لە پاشبەندا و، لەنگ و شێواویشە، هۆی ئەم ئاوێتە بوونی ئەم نیو باڵی دووەمەی سەرەوە، بۆ تاکی پێشوو، بووەتە مایەی نەبوونی ئەم تاکە لە (ع)دا.

٥- صەبر: پشوو، ئارام. خۆڕاگریی.

ڕێش: برین، زام، کولک.

فیراق: دووری، لێ جیایی.

ئەم تاکە لە (ش، رضا١، رضا٢)دا نییە و لە (ر، بێکەس)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

لەژێر (ر) لشر.

غەما وا (ر، ما٢): غریبی.

غەما (گ٢، س، گ٣): خەما.

ڕێشە (کم): ریژە.

فیراقی (کو، مس، ن، گل٥، ع، ما٢، نم٣): فراق - ڕێنووسی کۆنە.

فیراقی (صح): فراق - ڕێنووسی کۆنە.

لێم بووەتە سەر باریێ (ر، ع، ما٢): لی بو بسر باری.

لێم بووەتە سەر باریێ (صح، ئا، گ٢، س، گ٣) لیم بوو بە سەرباریێ.

٦- مەنصووری: مەنصووری هەلاج و عەشقەکەی مەبەستی لە (بەڵای مەنصوور) فەلسەفەکەیەتی.

مەدەدکار: یاریکار. بەدەنگەوە هاتوو، هاوکار، هاریکار.

طالیع: بەخت. جگە لەوەی لێرەدا واتای (هەڵنەهاتن) و (دەرکەوتن)یش دەدا.

سەرداریێ: مەبەستی داری قەنارەی خنکاندنە وەک (مەنصوور). سەرداری: گەورەییشە.

لە ڕێگەی عەشقدا. واتە (سەرداریتیی دڵداران).

ئەم تاکە لە (مس، عن، ن، گل٥)دا شەشەمین و لە (ما٢) چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (ما٢)دا شێواوە و بەم جۆرەیە:

«بلای من هاتوە طالع مددکاری نبو منصور»

لە سەرچاوەکانی تردا هەموو چونیەکە و، وەک لە سەرەوە جێگیرکراوە، وەهان و جیاوازییان نییە، هەرچەند ئەم تاکەش لاوازی و وشکییەکی تیایە و لەوانەیە گۆڕینی بەسەردا هاتبێ.

(بازی برد) بازی دا، قەڵەمبازی و جگە لەوەی (مەلی باز)ی دڵی وەک شێت لە دەست چووە و

پەڕیوەتە سەر دارێ.

٧- نەزع: گیانەڵا، کاتی مردن، گیان لە لەش جیابوونەوە، داکەندنی بەرگی (لەش) لە کرۆکی (گیان).

جەفا: خراپی و ئازار و سزا و کرژیی مەبەستە، وشکی.

کافر: خوا و پێغەمبەر نەناس و پەیرەوی نەکەرییان، یاخی لە ڕێبازی ئاینی.

هێما: هێشتا، (هێما) لە هەمان کاتدا بەواتە (ڕەمز)یش دێ و لەوانەیە ئەم (هێما)یە (چی) بێ واتە بۆچی.

چەت دیگە: چیت دیوە- ئەمەش زاراوەیەکی سنەییانەیە کە شێوە زمانی خانەوادەی (کوردی) بووە.

سەگ مەرگ: (ئەوی بەرگەی سزا و ناخۆشی بگرێ و درەنگ گیان بدا بەدەستەوە)ی مەبەستە.

ماگە: ماوە: ئەمیش هەر زاراوەکی سنەییانەیە.

ئەم تاکە لە (ش، ما٢، نم، نم٣، صح، ئا، حص)دا نییە وە لە (ع)دا چوارەمینە لە (ف، ر، کو، ب، با، نم١، کم، گم٢، س، گ٣، بێکەس، رضا١، رضا٢)دا شەشەمینە، وە لە (مس، عن، ن، گلە)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

پێی دەڵێم (نم١): پیم دەلی، ئەمەش هەڵەیە بەپێچەوانەی واتایەکەیە.

پێی دەڵێم (ر): پیم الی. ئەمیش ناشێ.

پێی دەڵێم (رضا، رضا٢، بێکەس): پێ ی ئەڵێم- ئەمەش نوێیە.

بەس بێ (رضا١، بێکەس): بەسیە.

دەڵێ (ر): دکی. دیارە هەڵەی نووسینە و مەبەست لە دلی = دەڵێ بووە.

دەڵێ (بێکەس): ئەڵێ. ئەمیش نوێیە.

هێما (گلە): همان.

هێما (ع): هیمای.

هێما (ر): اهما - وەیا (هما) چونکە باش ناخوێنرێتەوە.

هێما (نم١، کم، گ٢، س، گ٣): ئەمە - ئەمەش دەگونجێ.

هێما (رضا١، رضا٢، بێکەس): ئەرێ. ئەمەش دەگونجێ.

چەت (ف، کم، نم١، گ٢، بێکەس، س، گ٣) چیت- وە لە سەرچاوە کۆنەکان (چَتْ) یا (چت)یان نووسوە.

دیگە تۆ سەگ مەرگی (ع، س، ن، گلە): دیکە توسک مرکی - ڕێنووسی کۆنە.

مەرگی (ر): مرکی - ڕێنوسی کۆنە.

مەرگی (رضا١): مەرگ. هەر ڕێنووسی کۆنە.

کارم ماگە پێت (ع، س، ن، گلە): کارم ماکە پیت. - ڕێنووسی کۆنە.

کارم ماگە پێت (ف، رضا١، رضا٢) کارم ماوە پێت. بەدەسکارییەکی نوێی دەزانم.

٨- صەبا، ئەی بای بەرەبەیان، ئەی بای شەماڵ. ئەمەش لای شاعیران (باو) بووە نامەیان بەشەماڵدا ناردووە.

یارانی مەجلیس، هاوالان و هاودەمەکانی مەبەستە کە هەمیشە لە دیوەخاندا پێکەوە بوون.

مەیخانە: شوێنی مەی تیا خواردنەوە و فرۆشتنی مەی (بادە)؛ چونکە چاوی ئەوەندە جوانن سەرخۆشیان کردووە یا لە ناو ئەو چاوانەی داخی دڵی بە بادە نۆشیی بەبا دەدات و مەیخانە مەبەستی لە عەشقەکەییەتی.

بێچووە عەییار: مناڵی کەسێک زۆرزان و فێڵباز و جادووکار بێ زۆر جار لەمە دواوم.

ئەم تاکە لە (ش)دا نییە و، لە (ر، بێکەس، رضا١، رضا٢)دا پێنجەمینە و لە (نم٣، صح، ئا، حص)دا شەشەمینە و لە (کو، ع، ما٢، ب، ف، با، نم١، کم، گ٢، س، گم٣)دا حەوتەمینە و لە (مس، عن، ن، گل٥)دا هەشتەمین، تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

یارانی (مس، ن، گل٥،ع، ر): یاران. ڕێنووسی کۆنە.

مەجلیس (ر، ما٢): مسجد. کە هەڵەیە و دەسکارییە.

گەر (مس، ن، گل٥، ع): کر. ڕێنووسی کۆنە.

گەر هەواڵی (ر) گر احوالی - لەنگە.

گەر هەواڵی (ما٢): گر لە حالی- هەر بەدەستکاریی دەزانم.

بپرسن (نم١، با، صح، حص، بێکەس، نم٣): ئەپرسن.

بپرسن (ع، ر، ما٢، کو، کم، گ٣، با): دەپرسن.

بپرسن (گ٢، س): دەپرسی- هەڵەیەکی دەسکارییە چونکە لە ڕووی زمانیشەوە هەڵەیە.

بڵێ (ع، کو): بلین.

کێشایە (ما٢، کم، ما، گ٢، س، گ٣، رضا١، رضا٢): کیشاویەتە. ئەمەش لەنگە.

دو چاوی (گ٢، س، گ٣، رضا١، رضا٢، ما٢): چاوی. ئەمیش لەنگە.

بێچووە (ع): بیچو.

٩- دوڕ و یاقووت: دوو جۆرە گەوهەری بەنرخن.

کەلام: وتە و مەبەستی ئەم پارچە هەڵبەستەیەتی.

دونیا: جیهان، گێتی.

قەدر: نرخ، ڕێز.

خرپدار: کڕیار.

ئەم تاکە لە (ش)دا یەکەمین وە لە (ع)دا شەشەمینە و لە (ر، نم٣، ئا، حص، صح، رضا١، رضا٢)دا حەوتەمینە و، لە (ف، کو، ما٢، ب، با، نم١، گ٢، س، گ٣، کم، بێکەس)دا هەشتەمینە و، لە (مس، عن، ن، گل٥)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

یاقووت (ر، ش): گوهر، ئەمەش دەستکارییە و ناتەواوە؛ چونکە ناوی (هەموو)ە.
یاقـووت (حص): گـەوهـەر. دیسـان دەسکارییـە (یاقـووت) جـوانـترە کـە جـۆرە گەوهـەرێکی لە (دور)ە.
دەبارێ (نم۱، نم۳): اباری.
دەبارێ (صح) أباری، ئەمیش نوێیە.
دەبارێ (حص، با، کم، بێکەس): ئەبارێ. دیسان دەستکارییەکی نوێیە.
کەلامە (ما۲): کلامی.
کەلامە (ر): کلام.
شیرنەی (ع): شیرینی – ئەمیش لەنگە.
شیرنەی (ر): شیرن.
شیرنەی (صح، نم۳): شیرینەت. دەسکاری کراوە.
شیرنەی (حص، ئا، گ۲، س، گ۳): شیرینەی. لەنگییە.
شیرنەی (کم): شیرینەی– لەنگییە.
شیرنەی (نم۱): شیرنە.
شیرنەی (ما۲): نازک.
خودا سا (ع، کو، ش): خدایا.
خوداسا (بێکەس): دە ساخوا.
خوداسا (نم۱، حص، کم، با، گ۲، س، گ۳): خواسا.
خوداسا (ئا): دریغا.
کوا (ر، ما۲، س): کو.
لە دنیادا (صح): لدنیا– ئەمەش لەنگە.
قەدر زانێ (ع): قدر زانو.
قەدر زانێ (حص، بێکەس): قەدر زان و.
قەدر زانێ (کم، نم۱، با): قدرزان و،
قەدرزانێ (گ۲، س): قەدر زانی. بەدەسکاریی دەزانم.
قەدرزانێ (صح، کو): قدر زانو.
خریدارێ (گ۳): خەڕیدارێ– دەسکاریی گیوە.

٩٤

## لاوی قەد لاولاوی من

١- لاوی قـــەد لاولاوی من گـــەر بێ بەناز چاو هەڵبـــڕێ
وا دەزانم: شـــێخ لە من زووتر لە ئیـــمـــان وەرگـــەڕێ
٢- ڕۆژێ بێجام کرد و ساتێ چوومە لای شێخ بۆ سەماع
وەک (کوزە کەمتیار)ی پێ بێ ساعەتەن، لای دام لە ڕێ
٣- واعیظ ئەمڕۆ هەمدیسان حەڵواخۆری کەوتووەتە یاد
نەک لە ڕێگەت لا بدا، گـــوێ مـــەگـــرە لێی باهەڵتـــڕێ
٤- باز ڕەقیب دەستی بەفیشاڵ کردوە، وەک بای غەضەب،
بۆیەکـا ئەمـــشـــەو، لە بەزمی یار، چرای من ناگـــڕێ.
٥- خوێنی من، بۆ شوێن ونێ دەسڕێ لە پەنجەی قاتیلی
وەختە خۆی ئەنگوشت نوما کا، لێی گەڕێن بابیسڕێ
٦- ئەو، دەڵێ: خوێنخواری خۆمی و، من دەڵێم: قوربانی تۆم
حـاکـــمی ظالم. چ هەرزانجـانە: دەک خـــوا نەیبـــڕێ
٧- تیغ بە ملمـــا دێنێ بەدرۆ پێم دەڵێ، نابڕێ قـــوبان
تیـــــغی ئەو دەبڕی، بەڵا هاوارە بەخـــــتم نابڕێ
٨- پێم دەڵێ: خۆ عەقڵی تۆ کەس نەیبو، بۆ وا شێت بووگی؟
سیحری چاوی خۆی نەدیوە، حەقیە لۆمەم کا، بڕێ.
٩- وای دەزانی ناسکە ســـەرچاوی (کـــوردی) (پا)ی نەنا
وا بە(پا) خـــۆشـــە بووە بیـــشـــیکوتن، دەرناپەڕێ.

---

١- لاو: گەنج، قۆز، بەڵام ئەو کەسە کێیە بەداخەوە هێشتا بۆم ساغ نەبووەتەوە.
لاولاو: ڕووەکێکی وەرزیی (مەوسیمی) باریک و درێژ و لە قەد درەخت و دار و دیوار و پەرژین هەڵدەچێ و دەئاڵێ و مەبەستی لە باریکی قەد (کەمەر)ی و باڵای ئەو لاوە جوانەیە.
شێخ: مەبەستی لەو کەسانەیە کە بەسەر زاری خۆیان دوور لە دڵداری پیشان دەدەن، یا

بیرێکی صۆفیانەیە هەروەها توانج لە شێخە درۆزنەکان دەدا بەپاڵ هەڵنانی جوانیی ئەو لاوەوە.

لە ئیمان وەرگەڕێ: واز لە ئاینی بهێنێ و، وەک حەز لەو جوانە بکات و بڕوای ئاینی لاواز ببێ لە چاو خۆشویستنی ئەو جوانەدا.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە دەسنووسدا ئەمانەن: (مس، عن، ص، گل١، گل٩، ق، ما، نم١، با، صح) و چاپکراویشدا (کم، گ٢، س، گ٣، حص)ە و لە نێوانیاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی، لەگەڵ پشت بەستن بەوەکانی تریش.

لاوی (ص): لاو. –ڕێنووسی کۆنە– مەرج نییە کە لاو هەر تەنیا بۆ کوڕ (نێرینە) بێت، بەشکو لاو بەواتا (جوان) ئەشێ بۆ کچ و ئافرەتیش بێ.

گەربێ (صح): بیتو.

گەربێ (حص): بیتۆ و.

گەر بێ (مس، ص، ما): کربی.

وا دەزانم (صح): وا ازانم – گۆڕینێکی نوێیە،

وا دەزانم (نم١): وا ئەزانم – دیسان گۆڕینی نوێیە.

٢– بێجا: هەڵە، نابەجێیی.

کوزە کەمتیار: گوایە ئەو کەسەی هەڵی بگرێ هەرچی بیەوێ بۆی دێتە دیی و خەڵقی خۆشیان دەوێت. ئەمەش بڕوایەکی ئەفسانەییی نەتەوەکەمان بوو.

ساعەتەن: دەسبەجێ، هەر لەو سەعاتەدا.

کرد و ساتێ (ما): کرد سعاتی.

ساعەتەن (حص): ساعەتا.

پێ بێ (گ٢): پێ بی. هەڵەی چاپییە.

ساعەتەن (گ٣): دەسبەجێ، دەسکاری و گۆڕینی گیوە.

٣– واعیظ: ئامۆژگاریکار، پلەیەکی ئایندارییە لە ئیسلامەتیدا، وەک شێخ.

حەڵواخۆری: مەبەستی لە مەراییکردنە و ئەمەش (ئیدیۆم = کینایە)یەکی کۆنمانە.

هەڵترێ: خشە بکات. چەند بدات. لەوچ لەوچ بکات و ئەمیش هەر (کینایە)یەکمانە.

ئەمڕۆ هەمدیسان حەڵواخۆری (گ، س، گ٣) ئەمڕۆکەش ئەوا هەڵواخوری– دەسکاری و گۆڕینی مامۆستا گیوی پێوەیە.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (ما)دا بەم جۆرەیە:

«واعظ دیرین دیسان وا دادی وعظی کەوتە یاد»

ڕێگەت (مس، ص، ما): ریکت. ڕێنووسی کوردی کۆنە.

گوێ مەگرە لێی (مس، ص، ما) کوی مکرەلی. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

٤- باز: دیسانەوە، هەمدیس، هەمیسان، جارێکی تر.

فیشاڵ: فشە، درۆ، خۆهەڵکێشان، وتەی ناڕاست، گەزاف.

بای غەضەب: بای ڕق و بوغز - ئەمەش نیشانەیە بۆ قەومەکەی (هوود) پێغەمبەر کە بە فرمایشی ئەویان نەدەکرد و خواش بە (بای غەزەبی خوایی) واتا بایەکی توندوتیژ و سارد لە ناوی بردن، وەک لە ئایەتەکانی:

٢٣ (الاحقاف) و ٤١ (الذاريات) و ١٩ (القمر) و ٦ (الحاقة)ی قورئانی پیرۆزدا باس کراوە.

چرای من ناگرێ: ئەمە کینایەیەکی کوردییە و مەبەست لەوەیە کە: من لە ناواندا نیم لەو بەزمەدا؛ چونکە ڕەقیب لە بێ بەشکردن (چرا کوژاندنەوە)ی من دایە.

باز (گ٢، س، گ٣): وا.

فیشاڵ (ما) فتنە.

بای غەضەب (ما): بای غظب - ڕێنووسە کۆنەکەیەتی-.

بۆیەکا (با، صح، نم١، حص): بویەوا.

بۆیەکا (کم): بویەکە.

چرای من (ما): چرای.

ناگرێ (حص): ناگەری - ئەمیش هەڵەیە چونکە چرا (دەگرێ) و ناگەرێ.

ناگرێ (ف): ناکری. ڕێنووسی کۆنە.

ناگرێ (ما): هلناكرّي: (هەڵناگرێ): ئەمیش لەنگییە.

٥- شوێن وونی: گومکردنی شوێنەواوی شتێک - وادیارە بابەتی شوێن هەڵگرتن و شوێنە ونێ و هۆی دۆزینەوەی تاوان وێکەوتنی کە لەو سەرێنییەدا باو بووە، بۆیە (کوردی) چەند جارێکی تریش لە ناو هەڵبەستەکانیدا ئەم بیرەی دەربڕیوە کە ئەم باسە بەتەنیا لێکۆڵینەوە و لێدوانی، ورد و قووڵی دەوێ لەسەر هەڵبەستی (کوردی) و هۆنەرانی تریش و بابەتێکی گرینگە و لە بەیتی (قەڵای دمدم و خانی لەپ زێڕین)دا ئەم شوێن پێ هەڵگرتنە بەدرێژی هاتووە.

قاتیل: کوژەر، بکوژ.

وەختە: هاکا.

ئەنگوشت نوما: بەپەنجە دیاری (نیشانە)کراو، مەبەستی لەوە پەنجەی خۆی لە خوێنەکە سڕیوە و دوای ئەوە پەنجەی خۆی پیشان دەدا کە خوێناوی نییە.

بابیسرێ: با ئەو خوێنە بسڕی و شوێنەکە گوم بی و نەناسرێ کێ بکوژە.

من (ف): دل.

شوێن ونێ (نم١، کم، حص، صح): شوینە ونی. ئەمیش لەنگە.

شوێن ونێ (گ٢، س، گ٣): شوێن ووتی. ئەمیش واتا نادات و ئەشێ هەڵەی چاپی بێت.

دەسرێ (صح، نم١): اسری.

دەسرِێ (حص): ئەسرێ.
دەسرِێ (س): دەسرِی. ئەمیش رێنووسی کۆن یا هەڵەی چاپییە.
دەسرِێ (گ٣): دەسرِی، دیسان هەڵەی چاپییە.
لە پەنجەی (ما، نم١، صح): بەپنجەی. ناگونجێ.
لە پەنجەی (حص، کم، گ٢، س، گ٣): بەپەنجەی- ناگونجێ.
قاتیلی (ما): قاتلم. هەڵەیە.
وەختە (ما): وقتە.
لێی گەرِێ (ما) لیی کرّي. رێنووسی کۆنە.
بابیسرِێ (گ٣): بابیبرِێ - هەڵەیە.
بابیسرِێ (ما): با بستری.
٦- خوێنخوار: خوێنەخوێی. گوایە (کوردی) خوێنی لەسەرە و بکوژ بووە.
حاکمی ظالم: فەرمانداری ستەمکار- لە هەڵبەستەکانی (کوردی)دا ئەمە زۆر دووبارە دەبێتەوە و هەڵدەگرێت بەجیاواز لەسەری بنووسرێت.
ئەم تاکە تەنیا لە (مس، عن، گل١، گل٩)دا هەیە و لەوانی تردا نییە، هێشتا چاپ نەکراوە و نیو باڵی یەکەمی لە (گل١)دا بەم جۆرەیە:
«من دەڵێم قوربانی تۆم و ئەو دەڵێ خوێنخواری خۆم»
٧- قوبان: سووک کراوەی (قوربان)ە و کوردی جاری تر بەکاری هێناوە.
بەڵا: بەلام، یا: (بەڵا هاوارە = هاوار لە دەست بەڵایە) و ئەمیش جوانییە.
بەختم نایبرِی: بەختم برِ ناکا. نایەڵێ بیبرِێ. ئەوە بەختی من نییە کە روو بدات بیبرِێ.
ئەم تاکە لە (مس، ف، نم١، با، صح، گم، گ٢، گ٣، س، حص)دا شەشەمینە و لە (مس، عن، گل١، گل٩)دا حەوتەمینە.
بە ملما دێنێ (نم١، صح، حص): بەملیا دینی. راست نییە.
دێنێ (کم): دینی و. ئەمەش لەنگییە.
دێنێ (گ٢، س، گ٣): دێنێ و دیسان لەنگە.
دێنێ بەدرۆ پێم دەڵێ (ف): دینیو بە درو دەلی. -لەنگە.
دێنێ بەدرۆ پێم دەڵێ نابرِێ (ما): دینێو خوت پیم دلی نابرّي. لەنگە.
بەدرۆ پێم دەڵێ (کم): بەدرو دەلی. لەنگە.
بەدرۆ پێم دەڵێ (گ٢، س، گ٣): بەدرۆ دەڵێ. - لەنگە.
ئەو (ف، کم، گ٢، گ٣، س، حص، صح): تو - هەڵەیە.
دەبرِێ بەڵا (حص، صح، نم١) برندەیە. ئەمیش کێشەکەی قورس دەکا.
دەبرِێ بەڵا (کم، ف): برّندەیە.

دەبڕێ (گ۲، س) بوڕندەیە، دەسکارییە.
دەبڕێ (گ۳): بوڕڕندەیە. دەسکارییە.
تیغی ئەو (ما) تیغ تو.
بەڵا (ما) اما.
٨- عەقل: ژیری، دانایی.
بووگی: بوویت و ئەمیش وشەیەکی سنەییانەیە.
سیحری: جادووی.
حەقیە: بۆی هەیە.
لۆمە: سەرزەنشت.
بڕی: هەندێ، کەمێ، تۆزێ، نەختێ، چکێ.
ئەم تاکە لە (ص، ف، نم۱، با، صح، کم، گ۲، س، گ۳، حص)دا حەوتەمینە و دوا تاکە و لە (مس، عن، گل۱، گل۹)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
پێم دەڵێ (ما): پیم دلیء = (پێم دەڵێی)
خۆ عەقلی تۆ کەس نەیبو (ف، نم۱، کم، گ۲، س، گ۳، صح، حص): کوردی خو تو عاقل بوی- ئەمیش لەنگە و بەهەڵە نازناوی (کوردی)ی تێ کەوتووە.
خۆ عەقڵی تۆ کەس نەیبو (با): کوردی خو تو عاقل بویی.
بۆ وا شێت بووگی (صح، حص): ئەوسا شیت بوویی.
بۆ وا (نم۱): بوچی.
بۆ وا (ف، با، ما، کم، گ۲، س، گ۳): بوچ.
بووگی (ما): بوی.
لۆ مەم کا (ما): لومم کەء.
بڕێ (ف، نم۱): لەری.
بڕێ (کم): لەرّی.
بڕی (گ۲، س): لە رێی- دەسکاریی گیوە.
بڕێ (گ۳): لە ڕێ. دیسان دەسکاریی ئەوە.
٩- وای دەزانی: مەبەستی لە یارە لاوە خۆشەویستەکەیە کە وای زانیوە.
سەرچاوی: بان چاوی (کوردی)
پا: پێ، قاچ.
نەنا: واتە نەنا، واتە پێی نەخستە بانی چاوم.
خۆشە: شتێک زۆر کوترابێ یا شێلرابێ یا زۆری شتێک دیبێ یا بیستبێ پێی دەڵێن خۆشە بووە. ئاوەسوو بووە. وەک: (چەقاوەسوو)، مەبەستی لە خۆشەبوونی چاوەکەیە، وەک پێستە

خۆشەکراوە.

بیشیکوتن: چاوەکەش بکوتنەوە، بی پەستنەوە.

دەرناپەڕێ: چاوی (کوردی) بەو کوتانەوەیەش هێشتا هەر دەرناپەڕێ لە (کالانەی چاو)ا.

ئەم تاکە تەنیا لە (مس، عن، گل١، گل)دا نۆیەمین و لە (ص)دا هەشتەمین و لەوانی ترا نییە و، هێشتا چاپیش نەکراوە، لە هەموو ئەم سەرچاوانەشدا کە تیایەتی دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

بەهۆی دەست نەکەوتنی ئەم تاکەشەوەیە (ف، نم١، با، صح، کم، گ٢، س، گ٣، حص) ئەوانی تر بەدەسکاری لە تاکی پێشوودا و، نازناوی (کوردی)یان تێ هاویشتووە، هەروەک دیترا لەنگیش بووە.

وای دەزانی (ص، ما): وا دەزانی.

ناسکە (ص، گل١، مس، گل٩): نازکە. ئەمیش دەگونجێ.

پای (ص، ما): پات.

بیشیکوتن دەرناپەڕێ (ما): اربپکی شیش نادڕی – دیارە هەڵەی نووسینە.

پیشیکوتن (ص): گر بیکوتن.

بیشیکوتن (مس): اربیکوتن = (ئەر بیکوتن).

## دڵ گرفتار بوو

١- دڵ گــرفـــتـــار بـوو، ئەمن، دەمگوت عــیـــلاجی نـاکـــرێ
زۆر زویر و عـــاجـــزە غـــەم دەســـتی لـێ هـەڵناگـــرێ
٢- غــەمــــرەوێنێکی نەبوو بێـــچـــارە، جـــارێ بێـــتـــە لای
باری دەردی ســـووک بکاو نـەیهــێــڵێ غــەم وای داگــرێ
٣- مــژدەیێکی وەصلی یارم بوو، دڵی خـــســـتـــمـــە فــڕین
بەخـتی بەد، وا کـەوتە داوی  توندی سیـصـەد تا (گـرێ)
٤- کـــۆچ و باری دڵ لە دێمی بیکەسی گـــۆمـــا گـــومـــە
تاکی، پێـشـەنگیش کـەشـەنگە، کـەفـتـە ڕێ داناگـرێ.
٥- چاو و گـــوێم، والآن، بـە چوار لادا، کـــە ڕێگە دەربکەم
بۆ حـــەپەی ســـەگ بیـــســـتنێ، یا بـۆ ترووسکە ئـاگـــرێ
٦- ڕێگە دەرنـاکـــەم لـە بۆ کـــۆنـە هـەوار، لەم وەحـــشـــەتـە
لوطفی (قـــادر) گـــەر نـەبێ، قـــەت ئەم تـەمـــە لا نابرێ
٧- هـەوری مـــیـــحنەت، بارشی مـــاتـەم دەبارێنـێ بەجـــۆش
بـای جـــەفـــا، دێ خـــێـــوەتی کـــەیفی دڵـم، هـەڵنادرێ
٨- دڵ لـە دەم دەردا دەناڵێ و پێی خـــۆشـــە ئـەم حـــاڵـەتـە
بەڵکە تـەئـثـــیـــرێ بکـا فـــەرشی وەفـــای بـۆ ڕاخـــرێ
٩- ڕۆژ و شــەو بـەدکـاری بێ فــەڕ، کـاری هـەر بەدگـۆییـیـە
ڕێی هـەڵە کـــردم، دەزانـێ هـەر دەمـــێنـێ و نـامـــرێ
١٠- ئەرکی عـەشقی تووشی وام تووش نەبووە، هەرگیز بۆیەکا
لازمـــە تـەئریخـــەکـــەی بەم مـــەصـــرەعـــە بۆ دانرێ
١١- (کوردی) دانیـشـە لە ناو کۆشی عـیـجـزدا و دەنگ مـەکە
تا (تـەتـەر) بێ، ڕێنومـــاییت کـــا، لەلایەن (قـــادر)ی

١– گرفتار: گیرۆده، تووش بوو
عیلاج: چاره ، تیمار، چار
زویر: زێر، سەغڵەت، مات، دڵتەنگ
عاجز: ناتوان، زیز
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، مس، م، أ، جلی، مد/١) دا تەنیا یەکەم تاکییەتی و ناوی خاوەنی تیا نییە، لەگەڵ (گ٣)، گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە/ ٢ی ئابی ١٩٧١ کە (مامۆستا عەبدولرەزاق بیمار) پێنج تاکی ئەم هەڵبەستەی تیا بڵاو کردووەتەوە.
منیش (عن)م کردە بنکە کە ئەم پەراوێزە فارسییەی لە سەر نووسیوە:
(قادر بیگ حمید بیگ صاحبقران برای عمویش «کردی» نوشته کە در قرارگاه محمد پادشاه کیخسرو بیگ جاف إلتقا کنند و «کردی» در آن سفر راهرا گم کرده و بعلت سالخوردگی مشقت دیده و هم حین وصولش قادر بیگ ناموجود، چون او بە سبب تأخیرش آشفته و سر راه تعقیب گرفته بوده کە «کردی» باین قصیده، حسبحال خود شرح فرموده. آبائنا أجمعین – علی)
واتە: (قادر بەگی حەمید بەگی صاحێبقران بۆ (کوردی)ی مامی نووسیوە کە لە هەوارگای محەمەد پاشای کەیخوسرەو بەگی جاف بە یەک بگەن و (کوردی)ش لەو چوونەیدا ڕێگەی گوم کردووە و لە بەر پیری شەکەت بووە کە گەیشتووە، قادر بەگ لەوێ نەبووە، چونکە ئەو بە هۆی دواکەوتنەکەیەوە پەژارە و ڕێگەی سۆراخی گرتبوو «کوردی» بەم چامەیە بەسەرهاتی خۆی گێڕاوەتەوە، خوا لەگەڵ باوو باپیرانماندا بیانبەخشێ – عەلی .
گرفتار بوو ئەمن دەمگوت:( جلی، نووسەر، مد/١): گرفتارە ئەمان چ بکەم.
گرفتار بوو ئەمن دەمگوت (گ٣): گرفتارە خوا چبکەم.
گرفتار بوو ئەمن دەمگوت (م): گرفتار بوو ئەمان وت
عیلاجی (س): علاج – ڕێنووسی کۆنە.
زویر و (مد/١) زویرە. لەو نسخەیەدا کە تاکی یەکەمی نووسیوە وە هەر لە نسخەیەکی (٥) تاکییەکەیدا (زویرو)ە.
٢– غەمرەوێن: ئەوی غەم بە با دەدا و دەبێتە هۆی لاچوونی غەم کە مەبەستی هاوڕێ و هاودەمە.
بێچارە: دەستە پاچە، پەککەوتە، مەبەستی لە دڵەکەیەتی کە ناچار بووە لە تەنیاییدا.
باری: کۆڵی، قورسایی، چۆنێتیی ناخۆشی.
غەمرەونێکی(جلی) (مد/١،نسخە ١: غم روینک نەبوو (گ٣، نووسەر): نییە، ئەمیش ناگونجێ.
جارێ (م، گ٣): ساتێ – جارێ (مد/١) (نسخە) جارێک.
وای داگرێ (گ٣ /جلی، نووسەر) وا دای گرێ – ئەمیش لەگەڵ پاشبەندا زۆر ناگونجێ.
(نەیهێڵێ) لە مد/١ نسخەدا سێیەو نەنووسراوە.

٣- وەصل: بە یەکگەیشتن

فڕین: مەبەستی چوونەکەیەتی کە دڵی وەک (مەلێک) بۆی فڕی بوو.

بەختی بەد: چارەڕەش - ئەمەش لە بڕوا بە (بەخت) کردنەوەیە.

داو: بەندێکە بە جۆرێکی تایبەتی دەچنرێ و (مەل)ی پێ دەگیرێ و جوانییەکە لەگەڵ فڕین و دڵەکەیدایە وەک مەل.

ئەم تاکە لە (گ٣/جلی، مد/١، نسخە، نووسەر)دا: نییە و لەوانی تردا سێیەمینە و هێشتا چاپ نەکراوە.

سێصەد تاگرێ (م) پڕ قڵف و گرێ. ئەمەش زۆر، لەگەڵ پاشبەندا ناگونجێ.

سێصەد تا گرێ = ٣٠٠ دانە گرێ و قوڵفەی وەک داو چنراو.

٤- دێم، بێ ئاوی

بێکەسی: بێ خزمی و ئەشێ گوم بوونەکە لە ناوچەی (بێکەسە)ی شارەزووریش بووبێ.

گوم: بزر و ئەشێ مەبەستی ئەو (گۆم)و زەلکاوەی ئەو ناوچەیەش بێت ئەمە جیناسە.

تاکی: تاکو، تەنانەت، هەتا، چونکە، ڕەنگە مەبەستی گۆمی (وان) بێ، هەواری کەیخسرەو بەگ بووە.

پێشەنگ: ئەو وڵاخە خورتەی لە بەرایی کاروانەوە دەڕوات.

کەشەنگ: شەکەت، ماندوو.

کەفتە: کەوتوو، وەیا کەفتە بە ڕێنووسی کۆن (کفتە)یە (کفت)یش ماندووێتییە، وەستایانە.

ڕێ داناگرێ: یەکی کەوتوەو ناتوانێ بڕوا ئەوەندە گەڕاوە ماندوو بووە لەو گومبوونەدا.

ئەم تاکەش لە (گ٣، جلی، مد١، نسخە، نووسەر) دا نییە و لەوانی تردا چوارەمینە و هێشتا چاپ نەکراوە.

کەشەنگە، کەفتە (م): کەشنگو کفتە.

٥- واڵا: کراوە، مەبەست لە ئامادەییە بۆ دیتن و بیستن لەو گومبوونەدا.

حەپەی سەگ،ترووسکە ئاگر: نیشانەی بوونی ئاوایی و ئاوەدانین.

ئەم تاکە لە (گ٣، جلی، نووسەر مد/١، نسخە) دا نییە و لەوانی تردا پێنجەمینە و هێشتا چاپ نەکراوە.

واڵان (مس، م): وازە. واتە کراوەیە.

ترووسکە (م): تروسکەی.

٦- وەحشەت: تەنیایی، چۆڵەوانی، شوێنی گیاندارە دڕندە کێوییەکان.

لوطف: چاودێری، دڵسۆزی، نەوازش.

قادر: قادر بەگی برازای کوردی، (قادر) خوای توانا.

تەم: تاریکی، غەم، مەبەستی ئەو گیرۆدەیی و چەتاڵییەی تێی کەوتووە.

ئەم تاکەش لە گ٣، جلی، نووسەر مد/١، نسخە) دا نییە و لەوانی تردا شەشەمینە و هێشتا چاپ نەکراوە.

لەم وەحشەتە (م): گیرودە خۆم.

٧- میحنەت: ئەرک و شەکەتی و کەشەنگی و ماندوێتی و ناخۆشی و..

بارش: باران – تاوە بارانی بەهاری.

ماتەم: تەم، دڵگیران.

بەجۆش: بەگوڕ، بەتاو (بۆ باران)ە کە.

جەفا: ناخۆشی و دڵتەنگی و ئەرک، لەو گومبوونەدا.

خێوەت: چادر

کەیف: خۆشی، شادی

ئەم تاکە لە (گ٣، جلی، نووسەر، مد/ا، نسخە)دا سێیەمینە و لەوانی تردا حەوتەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

بارشی ماتەم (گ٣، جلی، نووسەر، مد/١، نسخە): بەرق و بارانی

بەجۆش (گ٣): لە تاو هەڵەیە واتا نادات

بەجۆش (م، مد/١، نسخە): بەتاو

کەیفی (مد/١، نسخە) کیف: ڕێنووسی کۆنە.

٨-حاڵەت: بار، چۆنێتی.

بەڵکە: بەشکو

تأثیر: کاریگەریی

فەرش: ڕایەخ

وەفا: بەئەمەکی و مەبەستی لەوەیە کە هەر دەرددار بێ و دەرد لەگەڵیدا بەوەفا بێ و لێی جیا نەبێتەوە.

ئەم تاکە لە (مد/١، نسخە)دانییە، (گ٣، جلی، نووسەر)دا چوارەمینە و لەوانی تردا هەشتەمین. وە لە کێشدا قورسییەک هەیە، ئەگەر لەو وشەی (خۆشە)دا (واو)ە کەی بە گورجی دەرنەبڕدرێت و پێم وایە شێواوییەک لەم تاکەدایە.

لە دەم دەردا (گ٣): بەدەم دەردا. ئەمیش ناگونجێ

لەدەم دەردا(جلی ،نووسەر): بەدەم دەردە. دیسان ناگونجێ.

دەناڵێ و (گ٣، نووسەر) دەناڵێ.

ئەم حاڵەتە (گ٣/ جلی، نووسەر): ئەم حاڵە زۆر ئەمیش گۆڕانکاریی تێ کەوتووە.

بەڵکە (م): بەڵکو – نسخە: بەشکو

فەرشی وەفای بۆ ڕاخرێ (جلی) فرشی وفا بوی راخری.

٩- بێ فەڕ: بەد، ناپیرۆز، خراپ کە ڕێگەی لێ تێک داوە و گومی کردووە.
ئەم تاکە لە (جلی، نووسەر)دا نییە و لە مد/١، نسخە)دا چوارەمینە و لە (گ٣)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا نۆیەمینە.
بێ فەڕ (گ٣): بێ پڕ- ئەمەش واتا نادات و هەڵەیە.
نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (گ٣، مد/١، نسخە) دا بەم جۆرەیە:
«وا دەزانێ هەر دەمێنێ ئەم سەگە قەت نامرێ» بەڵام مد/١ نسخەدا لە جێی ئەمە(سکە= سەگە)یە لەم تاکەدا مەبەستی لەوەیە ئەوی ڕێگەی پێ هەڵە کردووە لەدوای مردن و لە قیامەتدا خوا تۆڵەی لێ دەسەنێ.
١٠- تووش: خراپ، چەتاڵی، (تووش نەبووە) نەهاتووەتە ڕێگەم و ئەمەش جیناس و جوانییە.
لازمە: پێویستە، دەبێ.
تەئریخەکەی: کاتی ڕوودانی ئەو کارەساتە کە کەی بووە.
مەصرەع: نیو باڵە هەڵبەست و مەبەستی ئەم نیو تاکەی دووەمی دواییە کە کاتی ڕووداوەکەیە.
ئەم تاکە لە (گ٣، جلی، نووسەر، مد/١، نسخە)دا نییە و لەوانی تردا دەیەمینە و هێشتا چاپ نەکراوە.
هەرگیز بۆ یەکا (م): تا اسیتە یقین.
وا دیارە (کوردی) لە زۆر گەڕان و ڕێ دەرنەکردن ماندوو بووە و بەتایبەتی شەویشی بەسەرا هاتووە و هیوای نەماوە بکەوێتە سەر ڕێگەی هەوارەکەی (محەمەد پاشای جاف)، وەک لە تاکی پێنجەمی پێشەوەدا ڕای گەیاندووە تەنانەت هیوای بەوە بووە کە دەنگی سەگوەڕ یا ترووسکە ڕووناکییەک ببینێ لەو شەوەدا، کە ئەوەش نیشانەی بوونی ئاواییە لەو شوێنەدا و ئەوەشی پێ نەزانیوە نەبیستووە و نەیدیوە.
بۆیە وەهای بەچاک زانیوە لە گوێ (شارێگە)یەکدا ئەو شەوە ڕێگەکە و یا لە ناو باوەشی ڕێگەکەوە دابنیشێ چونکە باوەڕی وابووە هەر بەوەی کە دواکەتووە لە گەیشتن، بەو هەوارگەیە، بێگومان پەیک (قاصید= تەتەر) بەدوایا دەنێرن و دەیدۆزنەوە و دەیگەیەننە هەوارگایەکە.
لە سەر ئەو بڕیارە (کوردی) وەک لە تاکە هەڵبەستی سەرەوەدا هاتووە کە چاکتر وایە لە قەراغ ڕێگەیەکدا لە (ڕۆژی دووەم)دا چاوەڕوانی ڕێبوارێک کە هەوارگایەکە پێ بزانێ و لەگەڵیدا بڕوات وە یا (تەتەر)ی (محەمەد پاشا)ی بەدوادا بێت و لەگەڵیا بگاتە هەوارگە. ئەمجا هەروەک لە تاکی سەرەوەدا هاتووە ئەو ڕێ گومبوون و ماندوێتییەی بەو پیرییە کە ئەوەندە کاری تێ کردووە کە کارەساتەکەی بە ڕووداوێکی دانسقە و دەگمەن زانیوە لە ژیانیدا، بۆیە ویستوویە لەم تاکە هەڵبەستەدا بەپێی (نەریتی ژمارە)ی پیتە (ئەبجەدی)یەکان، ساڵی ئەو ڕووداوە جێگیر بکات کە (کوردی) دوای ئەوە (١٨) ساڵی تریش ژیاوە.

نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە جگە لە (عن، مس) لە هەموو سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەی دواییە:

(تاکی پەیدابێ، ویا جوابێ لەلایەن قادرێ)

کە ئەمەش بە پێی هەموو تاکە هەڵبەستەکانی ئەم پارچە هەڵبەستە ناتەواو و هەڵە و نەگونجاوە چونکە:

لەلای (محەمەد پاشا)وە نەزانراوە کە (کوردی) ناچێتە لایان وەیا لە کوێیە و هەروەها چییە بابێ و (کوردی) گوایە (نامە)ی بۆ ئەوان نەنووسیوە کە لە فلانە شوێن ماوە ڕێگەی گوم کردووە.

تاکو چاوەڕوانی (جواب)ی ئەوان بێ، وەک لەم دوا تاکەی سەرەوەدا وشەی (پەیدابێ جوابێ) هاتووە.

بەڵام لە هەردوو سەرچاوەی (عن، مس)دا بەو جۆرەیە کە لە سەرەوە جێگیرم کردووە ڕووداوەکەم بە (ورد)ی نووسیوە، بۆیە ئەو (دەقی) ئەم دوو سەرچاوەیەم بەلاوە لە هەمووان ڕاستتر و گونجاوتر زانی و لەبەرئەوە لە سەرەوە جێگیرم کرد لە بەر پەسەندییەکەی.

ئەمیش لێکدانەوە و جیاوازییەکانی ئەم تاکەیە لەناو سەرچاوەکانیدا:

کۆش: باوەش– گوایە چووەتە باوەشی ڕێگەکەوە، لە جێگەی نوێنی پێ خەف و ئەو شەوە لە (سارا)دا نووستووە.

عیجز: ناتوانی، لە بارا نەبوویی، بێ دەرەتانی.

تەتەر: ئەو کەسەی نامەی بردووە، ڕێنوێنی کردووە.

(قادرێ): قادرێک، یەکێ لە قادرەکان کە ئەوانیش ئەمانەن

١– قادر: توانا لە ڕووی زمانییەوە.

٢– قادر: لە ڕواڵەت یا ناوە پیرۆزەکانی خوای مەزنە و، مەبەست لە خودی (خوا)یشە.

٣– قادر: وەک لە هەڵبەستی دیکەی کوردیدا ئاشکرایە کە (کوردی) پەیوەندییەکی گیانی و نهێنی و بەگەورە زانینی (غەوسی بەغدا) واتە (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)ی لە دەروونا بووە و لە کوردەواریش دا (عەبدولقادر) بە (قادر) پێناسە کراوە. کە ئەم (قادر)ی غەوسەش یەکێک بووە لەو (قادرێک)ی کە (کوردی) لەو باری ناتوانی (عیجز)ەیدا هیوای پێی بووە کە ڕێنومایەک لەو ڕێگەیەیدا فریای بکەوێت و بە هانایەوە بێ و ئەمەش بڕوایەکی ئیسلامەکانە بە توانایی پیاوچاکان.

٤– سەرەڕای ئەمانەش (کوردی) بۆ ئەو سەردانەی بۆ ناو (خێڵی جاف) بە پێی نامەی (قادر بەگی) برازای (کوردی) بووە کە گومانی تیا نییە ئەو دواکەوتنەی (کوردی) هیوای (کوردی) بەهێز کردووە و هاندەری ئەو (قادر بەگ)ەی برازایشی بووە کە بە خودی خۆی وەیا کەسێکی تر بنێرێ بە دوای (مامی)دا.

له کەشکۆڵی (عن)دا لەسەر ئەم دوا تاکە هەڵبەستەی سەرەوە.

ئەم پەراوێزەی دوایی نووسراوە: «کردی در مصرع اول این بیت سنهء سفر بحساب (أبجدی) أستخراج فرموده – علی»

واتە «کوردی لە نێو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا ساڵی ئەو سەفەرەی بە نەریتی ژمارەی پیتی (ئەبجەدی) دەرهێناوە – عەلی».

دەبێ ئەوە ڕابگەیەنم کە ئەوسایە نووسین بە ڕێنووسی کۆن و سەردەمەکە نووسراوە. لەبەر ئەوە ئەم (حیسابی ئەبجەدی)یەشی لەسەر ئەو ڕێنووسە کۆنە کراوەو ئەم نیو باڵییەی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە بەم جۆرە نووسراوە:

« کردی دانیشە لناو کوشی عجزداو دنگ مکە»

٢٣٤ + ٣٧٠ + ٨٧ + ٣٣٦ + ٩١ + ٧٤ + ٦٥ = ١٢٥٧.

کە ئەو ژمارەی (١٢٥٧)ە کە کۆی پیتەکانی وشەگەلی نیو باڵییەکەیە. مەبەست لەوەیە ئەو ژمارەیە ساڵی کۆچی (هیجری) بووە، کە ساڵی ١٢٥٧ک. بەرامبەرە بە ساڵی ١٨٤١ زایینی و ئەو کاتەش (بەهار) بووە و لە ١٨ ساڵ بەر لە مردنی کوردیدا بووە.

کە ساڵی ئەو ڕێگە گوم کردنەی (کوردی) بووە لە (وەرز)ی بەهاردا لە ڕەوەند لە ڕەشماڵدا بوون. ئەم جۆرە (وردەکارییەش لە وێژەی (کلاسیکی)دا شارەزایی و پسپۆڕی بووە لە نێوان هۆنەراندا لە نیشتمانە ئیسلامەکاندا.

لێرە و خواریشەوە جیاوازیی وشەکانی نیو باڵی دووەمی سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستەدا بەم جۆرەی دوابیە، جگە لە (عن، مس):

« تاکی پەیدا بێ وەیا جوابێ لەلایەن قادری».

تا: هەتا

تاکی: تاکو، هەتاکو، تاوەکو، هەتاوەکو.

لە ناو کۆشی عیجزدا (گ٣): لە کونجی بێکەسیدا کە لە (عن) و (مس)دا ئەم (کۆشە)ی بە (کوشی) نووسراوە وەک لە (ژمارە ئەبجەدی)یەکەیشدا هاتووە.

لە ناو کۆشی عیجزدا (جلی، نووسەر، مد/١ نسخە): کونجی عاجزیدا.

تاکی (گ٣): بەلکە.

تاکی (جلی، نووسەر) بەلکو.

وەیا جوابی (گ/٣): لە بوت جووابی – وە لە پاڵیدا نووسراوە (نوسخە: پەیکی). واتە لە جێگەی (جوانی) وشەی (پەیکی)یش هاتووە.

وەیا جوابی لە لایەن (جلی، نووسەر): رحمی لەلایی – کە ئەمەش لەنگ و کێشەکەی کورتە.

٩٦

## شۆخی دڵ ئازار

١- شـــۆخی دڵ ئـازاری یاری ســـەرســـەری
کـافـرەی (تورک)ەی لـە مـەزهەب بـێ بەری
٢- بۆچ لـەلای تو قــەتڵی عــاشـق واجــیــبــە
قـەصـدەسـەر، دائیم بەدەسـتـەو خـەنجـەری
٣- ڕۆح و تەن تەسلیم بە شـمـشـێـرت دەکـەم
ئەر بزانم تـۆ بـە قـــەتڵم مـــشــــتــــەریی
٤- نیم نـیگـای چـاوت دڵ و دینـی ڕفـــــاند
چاوەکـــەم؛ مـــەعلوومـــە تـۆ غـــارەتگـەری
٥- ئەم ســوپای کـاکـۆڵ و طابوورەی مــوژەت
فـــەوجـی ســـەربازە لـەپشـــتی لەشکەری.
٦- تۆی نـەوەی بەهرامـی شـێـرئەفگەن کـەوا
لائیــــقـی تـاج و نـگین و ئـەفـــــســـــەری
٧- من وەکـــو فـــەرهادی بێـــچـــارەم ئـەتۆش
(خوسرەو)ی عەصری بە شیرین مەنظەری
٨- شـــۆخ و مـــەحـــبـــووب و لەطیف و نـازکی
چـاو غــــەزال و نـەونـەمــــــامی نـەوبـەری
٩- گـەوهـەرت (کـوردی) وەکـوو خـەرمـوهـرەیە
چونکە خـۆت کـەم طالیع و بـەد ئەخـتـەری

---

١- دڵ ئازار: دڵ ئازاردەر، دڵشکێن.
یاری سـەرسـەری: (دۆسـتی سـەرسـەرییـان) و بەسـەرزاریش وا دەگـەیەنێ کـە شـۆخـەکـەی سـەرسـەرییـە، بەڵام مـەبەسـتی ئەوەیە یاری ئەوانە کـە ئـەمـەش (یاریی بەوشـە کـردنە) و وەستاییە لە هۆنەریدا.

کافر: خوا و پێغەمبەر نەناس و (دژ)یان.

تورک: واتە ستەمکار وەک عوسمانییەکان.

مەزهەب: ڕێڕەوێکە لە ئایندا.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (مس، م، ما، گ٣)، گۆڤاری (کاروان) ژمارە (٣)ی کانوونی یەکەم ١٩٨٢ سەرەتاکەی نووسراوە. کە لە کەشکۆڵی ژمارە ٦٤ی کتێبخانەی میریی (ماربورک- بەرلین) دایە. و (گ٣)کەمان کردە بنکە.

دل ئازاری (ما، کاروان): دڵ آزارو.

کافرەی تورکەی (ما) کافری تورکی.

پێم وایە ئەم هەڵبەستەی بۆ (کەیخسرەو بەگی جاف)ی داناوە وەک لە تاکی حەوتەمدا ناوی بردووە.

٢- قەتل: کوشتن.

واجیب: پێویست.

قەصدەسەر: بەنیازی سەر، واتە بۆ کوشتنی، سووربوون لەسەر بڕینی سەر.

دەستەوخەنجەر: هەمیشە لە کارابوون بەخەنجەری ڕووتە کە دەست لەسەر خەنجەرەکە بێت و مەبەستی لەوەیە کە هەرکەسێ ئەو (یار)ە ببینی بەخەنجەری جوانیی دەپێکرێ.

بۆ چ (مس): تو. کە ڕێنووسی کۆنە.

قەتلی (مس، ما): قتل. ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.

دائیم (گ٣): لێم دا.

بەدەستەو (گ٣): بەدەست و.

٣- ڕۆح: گیان.

تەن: لەش.

تەسلیم: دانەدەست.

شمشێر: جۆرە چەکێکی بڕندەیە و مەبەستی لە برۆیەتی کە وەک شمشێر لە چاوی دڵداردا بڕندەیە.

مشتەری: کڕیار.

تەسلیم (گ٣) تەسلیمی.

ئەر (گ٣): گەر، واتە: ئەگەر

٤- مەعلوومە: ئاشکرایە، دیارە، زانراوە.

غارەت: تالآن- (غارەتگەر= تالآنکار)، جەردە، چەتە.

مەعلوومە (م): عینی ئەتو = (عەینی ئەتۆ) ئەمیش دەگونجێ کە (عەین = چاو)ە.

٥- سوپا: لەشکر، لەشکەر.

کاکۆڵ: دیارە یەکێک لە ناودارانی ئەوسای بووە کە کەیخوسرەوی جاف بووە. کە جاران کوڕی قۆز و لێهاتوو کاکۆڵی هەبووە یا ڕەمزی نێرێتییە و دیارە کەیخوسرەوبەگی جاف کاکۆڵی هەبووە.
طابوور: بەشێکە لە سوپا.
موژە: برژانگ، موژ، مژولان، موژگ.
فەوج: دیسان بەشێکە لە سوپا.
لەشکر: هەر سوپایە، سەربازان.
ئەم (گ٣، ما): بەم.
فەوج (ما): اوج.
سەربازە (ما): سەربازی.
لەپشتی (گ٣): لەپشنی. دیارە هەڵەی چاپییە.
نەوە: نەتەوە، بەرە.
بەهرام: بەم ناوە شەش پاشای کۆنی ئێرانی هەبووە، یەکێکیان سەرفەرماندەیەکی سپایی ئازا بووە و دوایی لە فەرمانڕەوایەکەی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە و پاشتر کوژراوە و ئەمەیان بە (بارامی گۆڕ) بەناوبانگە کە ڕاوچی بووە و نێچیرەکەی کەرەکیوی (گوور) بوو.
لەوانەشە ناوی باوکی ئەو کەسەی (کوردی) ئەم هەڵبەستەی پیا هەڵدابێ (بارام) بووبێ.
شێرئەفگەن: شێرشکێن و مەبەستی لە ئازایەتی و توانایییە.
لائیق: شایان.
تاج: کڵاوی پادشاهان کە بەگەوهەر ڕازاوەتەوە.
نگین: ئەموستیلە و نیشانەیە بۆ ئەموستیلەکەی حەزرەتی سلێمان.
ئەفسەر: گەورەی سەربازان (ضابط).
تۆی نەوەی (گ٣): تۆ تۆیی.
لائیقی (ما، م) لایق.
٧- ئەم تاکە لە (گ٣)دا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لەوانی ترا حەوتەمینە.
فەرهاد: دڵداری شیرین و هونەرمەندی کێوتاش.
خوسرەو: پاشای ساسانییان و مێردی شیرین کە ناوی ئەو دۆستەی (کوردی) بووە، ئەویش خوسرەو بەگی جاف بووە.
شیرین مەنظەر: دیمەن جوان و، یا خوسرەوی خاوەنی شیرینی جوانی مەبەستە.
فەرهادی (ما، م): فرهاد. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
بەشیرین (ما): بشیر. -هەڵەیە.
لەم تاکەدا بەتەواوی ڕوونی کردووەتەوە کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی بۆ خوسرەو بەگی جاف

داناوه وەک نامەیەک بۆی ناردووە کە بیری ئەوی کردووە.

٨- مەحبووب: خۆشەویست.

لەطیف: دڵسۆز، جوان، نازک، ئێسک سووک، بە بەزەیی.

غەزال: ئاسک، مامز، حەیران، ئاهوو.

نەوبەر: تازەبەر: مەبەستی لە گەنجێتی تەمەنی خوسرەو بەگی جافە.

ئەم تاکە لە (مس، م، ما)دا هەشتەمینە و لە (گ٣)دا حەوتەمینە

غەزال و (ما): غزالی و.

نەمامی (گ٣): نەمام و.

٩- خەرموهرە: مووروو کەرانە (خەر = کەر) و (موهرە = مووروو) موورووییەکی شینە و هەرزان بەهایە. موورووەشینە.

طالیع: بەخت، بەدئەختەر، (ئەختەر)یش ڕۆژە و دیسان ڕۆژڕەشیش دەگرێتەوە. یا چارەڕەش.

خەرموهرە: یا (موورووەکەرانە) لە هەمان کاتدا ئەو گرێ و بەرزاییيەیە کە لە لاشەویلگەی (کەر)دا پەیدا دەبێ لە ئاکامی برینێکەوە کە بەباشی تیمار نەکرابێ کە (سلەوەج)یشی پێ دەڵێن و، لە پزیشکیدا پێی دەوترێ (سالیڤەر کالیکولی). لە کوردەواریدا (باو)ە کە ئەو (گرێ)یە دەردەهێنن و ژنان بۆ (بەخت چاکی) بەکونکراوی دەیکەنە (بەرموور)یانەوە کە ئەمیش واتە (بەرموور): ڕستە موورووییەکی جۆراوجۆر بووە کە هەریەکەی گوایە کەڵکی تایبەتی خۆی هەبووە وەک (موورووی دڵ) موورووی (سەر دەستار و بن دەستار) کە گوایە هەرکەسێ بکەوێتە چوغوڵی لە نێوان ژن و مێردێکدا. ئەو مووروووە وەک دەستار ئەو کەسە چوغوڵە دەهارێ، یا موورووی (شەوە) و... هتد.

ئەمجا (کوردی) گوتوویە: تەنانەت گەوهەری من ببێتە موورووە کەرانە ئەمجا (بە بەختم) ناکا، چونکە کەم (طالیع)م و ئەمەش گلەییيە لە خوسرەو بەگ کە لە (کوردی) نەپرسیوەتەوە.

## بۆ فریبی عاشقان

١- بۆ فـــریبی عـــاشـــقـــان و، جـــەزبی دڵ، وا مـــاهیـــری،
ڕەنگە شاگردیت بکەن، میهتەر: (نەسیم) و (سامیری).
٢- ســەد (کــەی) و (دارا) بە ســەگـوانی دەرت نابن کـە تۆ،
خاتەمی دەستی (سولەیمانی)یت و، (توحفە)ی (زاهیر)ی.
٣- بەختی ئەو ئوستادە سووتێ، دەرسی سیحری پێ وتی،
وا؛ کە تۆی بەردایە (گژ) عالەم، بەمەکر و ساحیری.
٤- کافریش، ڕەحمێ بە (یەخسیر) و زەلیلی خۆی دەکا،
ساوەرە، ڕەحمێ بەجەستەی من کە، گەرچی کافری.
٥- من کە (پەروانە) و (کەمەندکێش)ی (کەماڵ) و حوسنتم،
(کەعبە) کەچ نابێ، ئەگەر بۆ (شەمع)ی ڕووتم ڕاگری.
٦- گەر بەخەنجەر پارە پارەم کەن، لەسەر ڕێ دام بنێن،
دەست لە تۆ هەڵناگـــرم، هەر تۆم لە خـــەڵکی چاتری.
٧- چونکە هەم چەشنت لە ئیـقلیـمی مـەلاحـەتدا کـەمـە،
ساوەکو (خوسرەو) هەمیشە لێ دە تەپڵی (نادر)ی.
٨- هـەروەکـــو (ڕۆح) و (دڵ)ی، دووری، لە پێش چاوم وەلێ،
لەم دڵەی، پڕ دەرد و مـــیـــحنەتما، بەدائیم حـــاضـــری.
٩- (کوردی) ئامانەت، سەد ئامانەت کە ئەمشەو جومعەیە،
تا ســـبـــەینێ، قـــەت مـــەبە؛ غـــافڵ لە ذیکری (قـــادر)ی.

.................................................................

١- فریب: لاسدان، هەڵخەڵەتاندن، لە خشتەبردن، فریو.
جەزب: ڕاکێشان، کێش.
جەزبی دڵ: کێشەری دڵ، دڵکێش، (کوردی) لێرەدا خۆشەویستەکەی خۆی کردووەتە (موگناتیس) دڵڕاکێش چواندووە، لە جوانیدا و لە مەردی و لە ڕەوشت و لە پیاوەتیدا.

میهتەر: مەیتەر.
نەسیم: مەبەستی لە نەسیمی عەیاری بەناوبانگە، کە قسە خۆش و زیرەک و هاودەمی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی بووە، هەروەها مەیتەری ولاخی تایبەتی سوڵتانیش بووە. لە زیرەکی و قسە خۆشیدا دڵی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە وەک خۆشەویستەکەی (کوردی).
سامیری: ئەو کابرا جوولەکەیەی سەرێنی حەزرەتی مووسا پێغەمبەر بووە و جادووکار و شارەزای زانیاریی (فیزیا)یش بوو. ئەوەندە فێڵباز بوو، توانیی هەندێ لە جووە هاوئاینەکانی لە (مووسا) هەڵبگێڕێتەوە و خشڵ و زێڕێکی زۆری لێ وەرگرتن و کردی بەگوێرەکەیەک کە بەرەو لایەکی تایبەتی دابنرایە وەک گۆلک دەیبۆڕاند و تێی گەیاندن کە ئەوە خوای ڕاستییە کە (بەچاو) دەبینرێت و (بەگوێ) دەنگەکەی نەبیستن و ئەو دەنگەی گوایە زمانی تایبەتی خوابووە کە هەر (سامیری) خۆی تێی گەیشتووە و، داستانی ئەو کابرایەش لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە خوا فەرموویەتی:
(عجلاً جسداً لهُ خوار)
واتە: گوێرەکەیەکە لاشەی (بوونی) هەیە، بۆڕەشی لێوە دێت و... هتد.
لێرەدا (کوردی) ئەو خۆشەویستەی خۆی کە ئەم هەڵبەستە و هەڵبەستی پێشووشی بەسەردا هەڵداوە و، چواندوویەتی بەو دڵڕاکێشەرەی، کە کەسانی وەک (نەسیم) و (سامیری) لەوانەیە بۆ ئەو دڵکێشییە شاگردی ئەو هاواڵە خۆشەویستەی خۆی بووبن یا ئەوانی ڕەنگە بەشاگردی ئەم دانابێ.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە: (مس، عن، گل/١، گل/٥، گل/٦، گل٧، گل٨، گل١٠، ف، بم، ش، ما/١، م، مع، شح، مر، ق/٤، نم/١، ما)یە لەگەڵ سەرچاوە چاپییەکانی (گ٢، س، گ٣)دا و لە ناو ئەم هەموو سەرچاوانەشدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم پارچە هەڵبەستە ئەو بە پشتیوانی سەرچاوەکانی تری (بۆنەی) ئەم هەڵبەستە ئەوەیە کە وەک هەڵبەستی پێشوو (کوردی) ئەم پارچە هەڵبەستەشی هەر بۆ (کەیخوسرەو بەگی جاف) داناوە و، بەڵگەی ئەم ڕاستییەشم لە (مس) دایە کە تێدا نووسراوە: (بە عەرەبی و فارسی):
(و لهُ) در حضور کیخسرو بیگی جاف فرموده).
(دیسانەوە هی ئەو (کوردی)یە کە لە بارەگای (کەیخوسرەو بەگی خان)دا فەرموویەتی) لەبەرئەوەی کە ئەم هەڵبەستەی سەرەوە لەم سەرچاوەی (مس)ەدا، دوابەدوای هەڵبەستی پێشوودا نووسراوە، بۆیە بەعەرەبی تیا نووسراوە (و لهُ) واتە «ئەم هەڵبەستەش وەک ئەوەکەی پێشوو، هەروەها ئەو، واتە (کوردی)یە» بەڵام هەڵبەستی پێشوو (کوردی) وەک نامەیەک بۆ کەیخوسرەو بەگی جافی ناردووە کە زۆر بیری کردووە و ئارەزوومەندی دیتنی بووە.
وا دیارە لەسەر ئەو (نامە)یا هەڵبەستەکەی پێشوو (کەیخوسرەو بەگ) ناردوویەتی بەدوای (کوردی)دا و ئەوەتا ئەم هەڵبەستەی لە کاتێکدا داناوە کە لەلای خودی (کەیخوسرەو) بووە،

وەک لە سـەرەتاوە بە (عـەرەبی) و فـارسـییـەکەی پێشـوودا نووسـراوە. جگە لەو سـەرچاوەی (مس)ە، هـەروەهـا (سـەرچاوەکانی (م، شـح، مر)یشـدا وەک سەرەتا و لەسـەر ئەم هـەڵبـەستـە بە (فارسی) نووسراوە:
(برای کـیـخـسـروبیک جـاف) واتە: (بۆ کـەیخـوسـرەو بەگی جـاف)، سـەرەڕای ئـەمـانەش لە سـەرچاوەی (عن) بە پەراوێزێکی فـارسـی لە داوێنی ئەم هـەڵبـەسـتـەوە نووسـراوە: (کـردی در زیارت کـیـخـسـرو بیگ جـاف رحـمـهـمـا الله این قـصـیـددا فـرمـووە -علی) واتە: (کـوردی لە سـەردانی کەیخوسرەو بەگی جافدا خوا لە هـەردووکیـان خۆش بێ ئەم چامـەیەی فـەرمـووە- عەلی).
کـەواتە گـومـان لەوەدا نامـێنێ کـە ئـەم (پێنـج سـەرچاوە) دەسنـووس و باوەڕپێکراوەی ئەم هـەڵبـەسـتـە بۆ کەیخـوسـرەو بەگ و لەلای خـۆی (بەگ) داینـاوە کـە ئەمـەش بەڵگەیـەکی پەسندی بایەخداری زانستییانەیە لەمەڕ (بۆنە)ی ئەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوە.
منیش بەدڵنیـاییـیـەوە دەتوانم ڕای بگەیەنم کـە کـاتی دانانی هـەردوو هـەڵبـەسـتـەکەش لە وەرزی (بەهـار)دا بووە کـە مـاڵی کەیخـوسـرەو بەگی سـەرۆکی خێڵی جاف لە ڕەشمـاڵانی سـەردەسێر (هـاوینـەهـەوار)ەکـانی جـافـدا بووە، هـەروەک بـار و پلـەی بەرزی کـۆمـەڵایەتـیی (کـوردی)یش ڕادەگەیـەنێ وەک بە گەشـتەکەی (مسـتـەر ڕیچ)دا هـاتووە. ئەم (کەیـخوسرەو بـەگی سـەر خێڵی جاف)ە (ڕیچ) لە گەشـتەکەی ساڵی (١٨٢٠ز) یدا بۆ (کـوردسـتـان)، لە بیرەوەرییـەکانی مـانگی (مایس)ی ئەوسـای بابان دا (کەیخوسرەو بەگ)ی دیوە کەوا ئەم سەرخێڵە پایەی هـەرە بەرزی سـەرفـەرمـاندەیی سـوپـا و بەڕێوەبـەراتـیی هـەبووە لەو پـاشـایەتـیـیـەی (بابان)دا و پیـاوێکی بەناوبـانگی مـەزنی کۆمـەڵایەتیی ئەو سـایەش بووە نەک هـەر لە قەڵەمڕەوی (پاشـایەتییـەکە)دا بەشکو لە دیوی ئێرانیشدا هـەمان شان و شکۆ و مەزنایەتیی پەسند و بەنرخی هەبووە.
(کەیخوسـرەو بەگ) لەسـەرێنیی (پاشایانی بابانـدا، بەشداریی بەڕێوەبـەرایەتییـەکەی کردووە، بەتایبـەتی لە دەوروبەری سـاڵی ١٧٨٩ وە تاسـەرێنی وەدوای سـەرێنی گەشـتـەکەی (مسـتـەر ڕیچ)یشـەوە سـەرێنی (مـەحمـوود پاشـای بابان)، کـە ئەم پاشـایە، خوشکـی کەیخـوسـرەو بەگی جافی مارە کردووە، هەروەک لە سەرێنی (ئەوڕەحمان پاشای بابان)یشدا (کەیخوسرە و بەگ) لە هـەمـان پلـەوپـایەی بابانیـدا بووە، مـسـتـەر ڕیچ لە سـاڵی (١٨٢٠ ز)دا و لە مـانگی (ئاب)دا (مـەریوان) بۆ دیدەنی (کەیخـوسـرەو بـەگ) لە هـەوارگـەکەی خـۆیدا بەخـۆی و هـاوسـەرەکەی و دەست و پێوەند و نووسـەر و سـەربازە چەکدارەکانییـەوە میـوانی (کەیخوسـرەو بەگ) بووە، لە خـوار (گـۆلی زرێبـار)ەوە و بـەگـیش مـیـوانداریـیـەکی جـوان و شـایـان بە (نوێنەری پـاشـای بەریتانی)ی کردووە.
ئەمیش جیاوازییەکانی وشەگەلی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیە بەپێی سەرچاوەکانی:
فـریبی (مـس، گل١، گل٥، گل٦، گل٧، گل٨، شع، مـر، گل١٠، کـو، ش، ق/٤): فـریب - کـە

ئەمەش بەڕێنووسی کۆنە.
عاشقان و (ش) عاشقان بو.
دڵ (بم) من.
بکەن (گ٣): - بکا- کە ئەمەش دەستکاریی (گیو)ە
نەسیم (گ/٣): نەسیمی. - ئەمەش هەڵەیە، چونکە (نەسیم) هی (ساحری نەبووە و ئەم دوو کەسە لێک جیاوازن لە (کەسەتی) و (سەردەم)یشدا و، ئەمەش هەر لە دەستکارییەکانی (گیو)ە.

٢- کەی: واتە (پادشای مەزن و خاوەن شکۆ) ئەمە جگە لە واتا (زمانی)یەکەی کە، (چ کاتێ، چ دەمێ) دەگرێتەوە، هەروەها ئەم وشەیە، یەکێکە لە وشە کوردییە (پەهلەوی)یەکانی سەردەمێکی ساسانی باپیرانمان کە بەشێوەی (کەی) = (KEY) دەربڕدراوە، بە هەمان واتای (چ کاتی)ی پرسیار کردن و بەواتای (پێناسە = عنوان)ی پاشا (کەیانی)یەکانی وەک: (کەیخوسرەو، کەیقوباد، کەیکاوس) کە دیسان وشەی (کەی) بەواتای (خواوەند). مەبەست لە (خاوەنێتی و پاڵەوان و شاهەنشا)یش هاتووە و (فارسی)یش، هەر بەم واتایانە لە ئێمەوە ئەم وشەی وەرگرتووە و بەکاری هێناوە.
(دارا) ئەمەیش دیسانەوە وشەیەکی کوردی پەتیی کۆن و ڕەسەنە کە لە سەرێنی ساسانییەکانی باپیرانماندا کە (زارگوت = لکە زمانەکەمان) ئەوسایە (پەهلەوی) بووە، هەر بەشێوەی (DaRa) واتە (دارا) واتای: بووە، خاوەن زەویوزار، شتدار، ساماندار دەدات.
بەڵام لە ڕووی (کەسەتی = شەخسیەت)ەوە ناوی (داریۆش)ی پاشای فەرمانڕەوایی (هەخامەنشی)ی، پاشایەتیی (فارس)ە کە بەر لە ١٥٠٠ و ئەوەندە ساڵێک لەسەر دار و پەردووی فەرمانڕەوایی (مادی = مید)یە کوردەکانی خۆمان لە ئەنجامی خیانەتێکەوە (لە ئێمە) دامەزراوە. هەروەها (دارا)ی پاشای (فارس) لە شوێنی گوندی (دارەمان)ی سەر ڕێگەی (کەرکووک) بۆ (هەولێر) و نزیک بە (کەرکوک)دا. ئەسکەندەری (مەکدۆنی)ی گەورە شکاندی و پیرەمێرد لە هەڵبەستێکی (گەمە جاڕی)یدا فەرموویەتی:
«(دارا) لە دەشتی (هەولێر) لە برسا خەوی لێ کەوت»
سەگوان: سەگەوان، سەگڤان، وشەیەکی کوردیی کۆن و ڕەسەنە و، لە (سەگ) و (وان) یا (ڤان) پێک هاتووە. بەواتەی سەگدار، خاوەن سەگ، سەگ بەخێوکەر، بەڵام لە سەرێنی زۆر کۆندا فەرمانڕەواییە کۆنەکانمان و ماڵەگەورەکان پیشەی (سەگوان، سەگڤان)یان هەبووە، بۆ چاودێری کردنی سەگە بەقەڵافەت و ڕاوکەر و پاسکەرەکانیان و، ئەو سەگوانانە خواردن و حەواندنەوەی سەگەکانیان بەدەست بووە و (بوودجە)ی تایبەتیان بۆ تەرخان کراوە و، مەشقی پاسکردن و ڕاوکردنیان بەسەگەکان کردووە.
هەروەک لە سەرێنی (زەردەشتی)ی باپیرانیشماندا بەپێی ئەو ئاینە، (سەگ) ڕێزێکی تایبەتی

و مەزنی هەبووە. کە ئێستا لەو سەرێنی (کوردی) سەگ و سەگەوان سووکە و سووک بووە.
خاتەم: وشـەیەکی (عارەبی)یە واتە (ئەمووستیلە، کلکەوان) وە لێرەدا (کوردی) مـەبەستی لە (نگین) واتە: ئـەنگوستیلە جادووییـەکەی حـەزرەتی سلێمـان کـە هەرچی وەک (سلێمـان) و (زاهیر)ی ناو ئەم تاکە هەڵبەستەشە لە باو و باپیرانی ئەو کەیخوسرەو بەگی جافە بوون.
کە گـوایە (کـەیخـوسـرەو بەگ) وەک نگینـەکەی حـەزرەتی سلێمـان بووە لە خـانەوادەکـەیدا لە سلێمان بەگی باوکییەوە بۆ ماوەتەوە.
جگە لەمـە وشـەی (خاتەم) کـە عـەرەبییـە واتە (کۆتایی پێـهێنەر) کە ئەم ڕواڵەتەش مـەبەست لە کـۆتاییـهـێنەرێتـیی پێـغـەمـبـەری (ئیـسـلام)ە (دروودی خـوای لێ بێ) کـە ئیـتـر لەدوای ئەوەوە پێغەمبەرێ بۆ سەر مرۆڤ نەهاتووە و، مەبەست لەوەیە کە (کەیخوسرەو بەگ) کۆتایی پێهێنی یا دوامین شکۆمەندێکی ئەوسـای خانەوادەی بەرەی (سلێمانی) سەرۆکەکانی جاف بووە، وەک ئەموستیلەکەی (حـەزرەتی سلێمـانی) کاریگەریی بوو و کە هەمـوو توانایەکی لە وزەدا بووە و چۆن سلێمـان خـواسـتی هەرچیی لەو ئەمـوسـتـیلە (نگین)ی خـۆی کـردبێ دەسـتـبـەجێ بۆی هـاتووەتـە دی، ئاوەهـاش (کـەیخـوسـرەو بـەگ) چیی ئارەزوو بـووبێ، بۆی هـاتووەتـە دی ئەوەندە خاوەن دەسەڵات بووە.
سلێمـان: کـە لەم تاکـە هـەڵبـەسـتـەی سـەرەوەدا هـاتـووە ئەوە ناوی باوکی (کەیخـوسـرەو بەگی جاف) بووە کـە (کوردی) کەیخوسرەوی بەئەموستیلە (نگین)ەکـەی (سولەیمان) وەیا بەکۆتایی سەر خێڵی (سلێمان)ە و (کەیخوسرەو) جێی باوکی گرتووەتەوە.
هەروەها جوانی لەم هەڵبەستەدا یەکخستنی وشەی (خاتەم)ی ئەموستیلە و (خاتەم)ی کۆتایی پێ هێنن، لەگـەڵ (سلێمـان)ی پێغـەمبـەر و (سـلێمـان) بەگی باوکی (کـەیخـوسـرەو)دایە کـە لە وێژەی کۆندا وردەکاری و جوانکاری و وەستایانە بوو.
توحفە: وشەیەکی عارەبییە، بەواتەی شتی نایاب و دەگمەن و دانسقە.
لێرەدا (کـوردی) کەیخوسـرەو بەگی کردووە بە (توحفـە) لە جوانی و ڕەوشت بەرزی و ئازایی و پیـاوەتی و شکۆداریدا بەڵام فـەرمـوویە (توحــفــە زاهـیـری) واتە (توحــفــەی ظاهر) بـەواتە توحـفـەیەکە بەئاشکرا و ڕاست و ڕەوانی، توحـفـە بووە. کـە وشـەی (زاهـیـر: ظاهـیـر) واتا زمانییەکەی (ئاشکرا، بەڕووەوە، دیاری، ڕوون)یە.
زاهیر: کە لە وشەی (ظاهیری)ی (عارەبی)یەوەیە لە زمانی کوردیدا (ظاهیر) بووە بە (زاهیر)، وەنەبێ لەم تاکە هەڵبەستـە ئەم وشـەیە هـەر تەنیـا بەم واتا زمـانییـە هـاتبێ، بەشکو ئەم وشـەیە ناوی باپیری (کەیخـوسرەو بەگی جـاف) بووە کە بە (ظاهیر بەگ) ناسراوە و سـەرخێڵی هـەرە بەرزی جاف بوو.
لێــرەدا جــوانکاری و وەســتــایی (کــوردی) و شــاردنـەوەی واتا هـەیە کــە لە ژێر وشـــەی (زاهیر)ەکەدا واتای (ئاشکرا) و واتای (زاهیر)ی باپیری کەیخوسرەو هەیە.

ئەمەش لە وێژەی کۆندا هۆنەرێکی ورد و بەتوانا نەبووبێ ئەم جۆرە یاری بە وشە کردنانە و حەشاردانی چەند واتایەک لە ژێر تەنیا وشەیەکدا، لە وزەدا نەبووە.
سەرەڕای ئەمانە وشەی (زاهیر) بەپێی سواندن، لە وشەی (ظاهیر)ەوە لە فەرهەنگی عەرەبیدا بەواتای (گوڵی جوان) وە بەواتای (نیظام)یش هاتووە و ئەوەیە کە لە کوردەواریدا بە (ظاهیر) ناو دەڵێن: (زاهیر).
سەرچاوەی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە (مس، عن، ما/١، م، مع، مر)ەکە لەمانەیاندا دووەمین تاکی پارچە هەڵبەستەکەیە و تەنیا هەر لەمانەیاندا هەیە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
لە جیاوازییەکانی وشەگەلی ئەم تاکە، لە سەرچاوەکانیدا تەنیا وشەی (توحفە) هەیە کە.
توحفە (ما/١، مر): نوطفە- بەواتە لە (تۆو)، یا لە (بەرە) و (نەوە)ی.
(سلیمان) و (زاهیر)ن، کە ئەمەش دەگونجێ و جوانە- بەڵام چونکە لە زۆرترین سەرچاوەدا (توحفە) نووسراوە بۆیە وشەکەم نەگۆڕی بە (نوطفە) کە ئەمیش هەر (عارەبی)یە.
٣- بەختی سووتێ: ئیدیۆم (کینایە)یەکی کۆنی کوردی بەمەبەستی ئەوەی ئەو کەسەی وەهای دەربارە دەگوترێ، بێ بەخت بێ.
ئوستاد: مامۆستا، فێرکار.
دەرس: وانە، فێرکردنی شتێک بابەتێک لە هەر بارەیەکەوە بێ.
گژ: ڕوو بەڕووکردن، پێکادان، خۆ لەیەکدان، جەنگ، ئاوقا.
عالەم: جیهان، گێتی.
مەکر: فێڵ، ساختە، کەڵەک، تەڵەکە، جۆرە نازێکیشە، بەڵام مەبەست لە زیرەکیی کەیخوسرەوە.
ساحیری: جادووگەری و، کە: سحر: جادووە.
ئەمیش جیاوازییەکانی وشەگەلی ناو ئەم تاکە هەڵبەستەیە لە سەرچاوەکانیدا
بەختی (گل/١، گل/٥، گل/٦، گل٧، گل/٨): بخت: ڕێنووسی کۆنە.
ئوستادە سووتێ (ف)، نم١: استادە سوتی. ڕێنووسی کۆنە.
ئووستادە سووتێ (گ٣) ابستادە سووتی – لە تێنەگەیشتنەوە وەهای لێ هاتووە.
ئەو ئوستادە سووتێ (ق/٤): أستادت سوتی – شێواوە.
دەرسی (گل/١، گل/٥، گل/٦، گل/٧، گل/٨، ش): درس- ڕێنووسی کۆنە.
سیحری (گل/١، گل/٥، گل/٦، گل/٧، گل/٨): سحر: ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.
وتی (گ/٣): گوتی = بەدەسکاریی گیوی دەزانم.
وا کە (بم) وەکە.
بەردایە (ق/٤): بەردا لە.

گژ (نم/١): گشتی – ئەمیش کێشی نیو باڵییەکە لەنگ و گران دەکات.
گژ (کو، ق/٤، ش، کم، گ/٢، س، گ/٣): گشت.
گژ (ف): گشتمان – نسخە: گشت عالم.
بە مەکر و (ق/٤): بە سحر و، دەسکاری کراوە.
مەکر و (گل/١، گل/٥، گل/٦، گل/٧، گل/٨): مکر– ڕێنووسی کۆنە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (مس، عن، ما/١، مع، شع، ن، مر)دا سێیەمین و لەوانی تردا دووەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
٤– کافر: ئەوی بڕوای بەخوا و پێغەمبەر نەبێ و پەیڕەوی فرمانیان نەکات.
ڕەحم: بەزەیی، دڵ پێ سووتان.
یەخسیر: ئەو وشەیە دوور نییە کە وشەی (عەرەبی)ی (ئەسیر)ی لێوە پەیدا بووبێ، نەک بەپێچەوانە؛ چونکە هەمیشە وشەی کورتتر وەک (ئەسیر) لە وشەی درێژترێکەوە، وەک (یەخسیر) پەیدا دەبێ، لەبەرئەوە پێم ڕەوا نییە کە وشەی (یەخسیر) لە وشەی (ئەسیر)ی (عەرەبی) وەرگیراو دابنرێت.
زەلیل: زەبوون، کەنەفت، پەککەوتە، دەستەپاچە، پەرێشان.
جەستە: لەش، قاڵب:
ئەم تاکە هەڵبەستە هەر لە (ص، عن، ما/١، م، مع، شح، مر)دا چوارەمینە و لەوانی تردا، سێیەم تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
یەخسیر و (بم): بیچارە.
یەخسر: بەواتە دیل، دەستگیرکراوی جەنگ.
یەخسیر و (نم/١، ما/١، مر، کم، گ/٢، س، گ٣): یەخسیری – ئەمەش هەڵەیە؛ چونکە ئەوی یەخسیر بێ، هی (زەلیل) نییە بەشکو (یەخسیر) شتێکە و (زەلیل)یش شتێکی ترە.
یەخسیر و (گل/١، گل/٥، ما/١، مر): نخچیر و– واتە (نەخچیر) = (نێچیر) کە گیانداری وەک مەل و ئاژەڵی ڕاوکراوە کە ئەمەش بۆ ئەو شوێنە ناگونجێ.
زەلیل و (گل/١، گل/٥، گل/٦، گل/٧، گل٨، مس، ش، ق/٤، مر): زلیل – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
دەکا (ق/٤): ئەکا.
ئەم: (گەر چی کافری)یە لەم تاکەدا بەواتای ئەوەیە، ئەگەر وەهای دابنێم کە تۆ کافربی، نەک: (تۆ کافری) وەک لەسەر زاریدا دیارە، کە ئەمەش ڕێگە ونکردنێکە لە خەڵکی.
٥– (پەروانە): پەپوولەیەکی بچووکی زەردباوە، شەیدای ڕووناکیی مۆم و چرا و فانۆس و فەنەرە و ئەوەندە ئەو ڕووناکییەی پێ جوان و دڵگیرە کە بەگورجی خۆی بەگڕی ئاگرەکەیاندا دەدا و دەسووتێ.

شـاعـیـران لـه کـۆنەوە خـۆیان دەچوێنن بە (پەروانە)ی شـەیدا و سـەوداسـەری دڵـخـواز و خۆشەویستەکانیان، لە شیعرەکانیاندا وەک لەم تاکە هەڵبەستە و زۆری تری (کوردی)شدا هاتووە.

کەمەندکێش: وشەیەکی کوردیی لێکدراوە لە دوو کەرتی (کەمەند) و (کێش). کە (کەمەند) ئەو گوریسە توند و خۆ ڕاگرە درێژەیە لە ڕاودا بۆ گرتنی ئاسک و کەڵە کیوی و بزنە کیوی، ڕاوچی بەگوڕ هەڵی دەداتە نێچیرەکەی کە سەری گوریسەکە قوڵفەیە، تاکو ئەو قوڵفەیە لە (شاخ) و (گەردن)ی ئەو نێچیرانە ئاڵی و ڕاوچییەکە بەوە بەیدەستیان دەکات.

لە هەمان کاتیشدا هۆنەران لە هەڵبەستیاندا (سەودا)ی خۆشەویست و دڵخوازەکەیان دەچوێنن بەو کەمەندە و بەیدەستکراویی خۆشەویستەکەیانی.

لە لایەکی سێیەمەوە لە ناو (صۆفی)یەکاندا باوە کە سۆزی شێخەکەیان و بەندیواریی خۆیان بەشێخەکانیانەوە بەو کەمەندە دەچوێنن کە گیرۆدەی ئەو سۆز و بەندیوارییەن.

ئەمجا هەر هۆنەرێ بەیەکێ لەم سێ مەبەستە لە هەڵبەستەکانیاندا وشەی (کەمەند)یان بەکارهێناوە.

(کێش) هەرچی وەک ئەم کەرتی (کێش)ەیە لە (کەمەندکێش)دا بەواتە ڕاکێشەر، کە کەمەندەکە نەک هەر ئەو دڵدارە ئەو نێچیرە و ئەو (سۆفی = صوفی)یەی گرتووە، بەشکو بەکێشیشی دەکات واتە ڕای دەکێشی بەرەو لای (خۆشەویست) یا (شێخ) یا (دڵخواز).

ئەم کەمەندکێشییە لە وێژەیی کۆن (کلاسیکی)دا نەریتێکی هۆنەرانە کە لە هەڵبەستەکانیاندا هەر یەکەی بە ئامانجی خۆی بەکار هێناوە، وەک لێرەی ئەم تاکەی (کوردی)دا و لە زۆر هەڵبەستی تریدا.

کەماڵ: زیرەکی، دانایی، وریایی، تەواو، لە هەر شتێکدا. کە مەبەستی ئەم ڕواڵەتانەیە لە (کەیخوسرەو بەگدا) هەبوون، (مستەر ڕیچ) لە گەشتەکەیدا کە لە نزیکەوە کە کەیخوسرەو بەگی ناسیوە، لە زیرەکیی کەیخوسرەو بەگ دواوە و نووسیویە:

> من یەکەم ئەوروپاییەک بووم کە (کەیخوسرەو) چاوی پێ کەوتبێ، کەچی ئەو، بەحەپەساوی و کەودەنانە (غەباء) چاوی تێ نەبریم و لە ڕووی شەنگ و شۆخی و جوانییەوە. مستەر ڕیچ بەپیاوێکی جوان و شۆخ و شەنگ و قۆزی ناو بردووە.
>
> هەروەک (کوردی)یش لێرەدا لە جوانی (حوسن)ی کەیخوسرەو بەگ دواوە.

کعبە: بەیتوڵڵا، بەیتولحرام، خانووی مەککە کە زیارەتگەی موسوڵمانانە.

شەمع: مۆم و مەبەست لە هەر ڕووناکیدەرێکە و (جوانی)ی کەیخوسرەوی مەبەستە، وەک لە باسی پەروانەدا ڕوونم کردووەتەوە.

ئەم تاکە هەر لە (مس، عن، ما/١، م، مع، شح، مر)دا هەیە و لەوانی تردا نییە و، هێشتاش چاپ نەکراوە.

لە (بۆ شەمعی رووتم ڕاگری) مەبەستی لەوەیە ئەوەند شەیدای بووە، تا وەک پەروانە بسووتێ.

٦- لەم تاکە هەڵبەستەدا (وشـە)ی وەهای تیا نییە کە لێکدانەوەی بوێت- بەڵام لە سەرچاوەکاندا جیاوازییان هەیە لە وشەکانیدا کە:

پارە پارەم کەن (نم/١، کم): پارەمکەن- ئەمیش لەنگە و ناتەواوە. ڕەنگە هەڵەی چاپی بێ.

پارە پاەرم کەن (گ/٣) تیکە تیکەم کەی- ئاشکرایە کە دەستکاریی گیوە.

لەسەر ڕێم دابنێن (ف، نم/١، م، ش، مع، با، شح، مر، گ/٢، س): لەسەر ڕێم دابنیی.

لەسەر ڕێم دابنێن (بم): لسر ریم دابنی - وە لە (س)دا نووسراوە: نسخە لریگام.

لەسەر ڕێم دابنێن (کو، ما/١): لریگادا دابنین.

هەر تۆم (ف، نم/١، م/١، م، ش، مع، با، شح، مر، کو، ق/٤، با، کم): هرتو.

خەڵقی (گ٢، گ٣، س) خەڵکی- بێگومان ئەمەش گۆڕینی گیوە.

سەرچاوەکانی ئەم تاکە: (مس، عن، ما/١، م، مع، شح، مر)ەکە لەمانەدا شەشەمین و لەوانی تر و چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

٧- هەم چەشنی: هاوجۆری، هاوتای، بەوێنەی.

مەلاحەت: جوانی، شیرینی (لە لەش و ڕەوشت چاک)یدا.

ئیقلیم: پارچەیەک زەویی زۆر فراوانە لە نیشتمانێکدا.

خوسرەو: ناوی خودی (کەیخوسرەو بەگی جاف)ە کە ئەم هەڵبەستەی بەسەرا هەڵدراوە، لێرەدا کە (کوردی) گوتوویە: وەکو (خوسرەو) ئەمە ئەوپەڕی جوانییە لە (هەڵنان)دا، بەواتا هەر تەنیا وەک خۆت و (بەس)، لە بێ هاوتاییدا، چونکە نەیگوتووە (وەکو فلانکەکەس وەهایت) بەشکو گوتوویە: وەک خۆت وەهایت.

هەر لەسەر ئەم (بیرە قووڵە): مەولەوی فەرموویەتی:

«ئەساسەی نێچیر، ماوەردەم پەی وێت،
وێت طەیار مەکەرد، چون کی؟ هەر چون خۆت.»
واتە: «کەرەستەی ڕاوم نەهێنا بۆ خۆت.
خۆت لێ گورج دەکرد، وەک کێ؟ هەروەک خۆت»

چونکە کەسێکی تری لەو گورج و شایانتری نەدیوە، مەگەر هەر ئەو، کە ئەمە باسی ڕاوکردنەکەی (خاڵ)ی (مەولەوی)دایەو و (کوردی)یش فەرموویەتی هەروەک خوسرەو کە ئەویش (خۆتی).

کووسی نادری: ناوی جۆرە ئاوازێکی مۆسیقی و گۆرانییەکیشە.

کووسی نادری: کووسی واتە (ئاواز) و (ئامێر)ی مۆسیقیی وەک هی ئەوەکەی (نادرشا).

کووسی نادری: (ئاواز) و (ئامێر)ی مۆسیقایەکی (نادر) = نادیدە، دانسقە، دەگمەنە. هەڵکەوتەیەکی بێ هاوتا.

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا لەمانەدا مەبەستی لە چ کامێکیان نییە؛ چونکە (کوردی) مەبەستی لەوە بووە: کە ئەی خوسرەو کە هاوتایەک یا هاوجۆرێکت نییە و لەو ڕواڵەتانەدا کە لێیان دواوم هەر تایبەتن بەخودی خۆتەوە، دە کە واتە هەر خۆشت شایانی ئەوەیت کە ئەم چۆنێتییەت بەلێدانی کووس واتە ئاواز و ئامیری مۆسیقایەکی دەگمەنی خۆت لێ بدەی و دەنگ بڵاو بکەیتەوە کە هەر خۆی و خۆت و، پێویستە ئەو کووس لێدانەیشت دانسقە بێت، نەک وەک ئەوەکەی (نادرشا) بێت، بەشکو وەک هی خودی خۆت بێ.

ئەمیش جیاوازییەکانی نێوان سەرچاوەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەیە لە وشەکانی ناوەڕۆکەکەیدا:

هەم چەشنت (نم/١، ف، ما/١، مع، مر، کم): هام چەشمت.

هەم چەشنت (کو، ق/٤): هەم چەشمت.

ئیقلیمی (مس، گل/١، ما/١، شع): اقلیم – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

مەلاحەت (ف، کو، ش): محبت.

مەلاحەت دا نییە (گ/٣): مەلاحەت دا. دیارە هەڵەی چاپی یا نووسینە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (مس، عن، ما/١، مع، شع، مر)دا حەوتەمینە و لەوانی تردا پێنجەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.

٨- ڕۆح: گیان، مەبەستی لەوەیە ئەگەرچی وەکو گیان خۆشەویستی، بەلاّم گیان بەچاو نابینرێ، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ هەمیشە لە ناو دڵم دای.

میحنەت: ناخۆشی، خەم، ئازار، باری گران، ماندوویێتی.

دائیم: هەمیشە.

حاضر: وشەیەکی (عارەبی)یە بەواتە: ئامادە، هەبوون، مەبەستی لەوەیە ئەوەندەی (کەیخوسرەو بەگ)ی خۆش ویستووە، بۆیە ئەگەر لە یەکیش دوور بن و دیاری نەبن وەک دیار نەبوونی (ڕۆح) و (دڵ)ە کە بەلاّم هەمیشە لە ناو دڵیدا هەی و ئامادەی و لێی دوورنیت، وەک لە پێش چاو دابیت ئاوەهای.

ئەم تاکە لە (مس، عن، ما/١، م، مع، شع، مر)دا هەشتەمینە و لەوانی تردا، شەشەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

٩- ئامانەت سەد ئامانەت: ئەمە وتەیەکی: ئیدیۆم (کینایە)ی زمانی کوردییە کە بۆ ڕاسپاردنی پارێزگاری کردنی شتێک، بەکار دەهێنرێت. واتە قسەی نەستەق و لە هەر بۆنە و دەرفەتێکدا دووبارە دەکرێتەوە لە ئاخاوتن یا نووسیندا و (کوردی) زۆر لەمانەی بەکارهێناوە، کە ئەمەش هۆیەکی ڕێگری هەڵبەستەکانیەتی.

جومعە: هەینی، ئەینی، ناوی شەو و ڕۆژێکە بەلای ئیسلامەکانەوە.

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا پیرۆزیی شەوی (هەینی)ی ئەو شەوەی کە لە لای کەیخوسرەو

بەگ بووە بەهەلی زانیوە کە (زیکر)ی تیا بکات کە ئەو سایەیش و لە سەرێنی شێخ مارفی نۆدێییەوە ئەم نەریتە لە سولەیمانی هەبووە لەلایەن پەیڕەویکارانی (تەریقە)ی (قادری) و (نەخشی)یشەوە.

غافڵ: بێ ئاگا– کە (کوردی) خۆی بەخۆی دەڵێ کە ئەوە شەوی هەینییە هەتا بەیانی بێ ئاگا و دووربێ لە زیکرکردن.

ذیکر: بەدەم (زار) و بەدڵ یاد و ناوی خوای مەزن کردن و ئەمیش یادکردنەوەی پێغەمبەر و پیاوچاکان و شێخە تەریقەکانە.

(قادر): توانا، خوای توانا، قادری مەبەست لە غەوسی گەیلانی کە ناوی (عەبدولقادر) بووە کە (کورد) بە (قادر) ناوی دەبەن.

هەروەها وەکو بیستوومە کە (کەیخوسرەو بەگ) برایەکی و یا باوکی باپیری ناویان (قادر)بووە و ئەمە جگە لە (قادر بەگ)ی برازای (کوردی) کە وەک لە هەڵبەستی پێش ئەم هەڵبەستەدا بەدرێژتر لێی دواوم ئەویش لەو سەردانەی (کوردی)دا لە لای کەیخوسرەو بەگ بووە. کە (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا ئەم هەموو (قادر)انەی بەیاد کردووەتەوە و وەک سەر لە خەڵکی شێوانێکە کە لە نێوان ئەم (قادر)ە زۆرەدا مەبەستی چییە و لە ژێر ئەم ناوەدا مەبەستەکە شاردراوەیە، کە ئەمەش جۆرە نەریتێکی وێژەیی کۆنە و بەجوانکاری و، وردیی شاعیرەکە دانراوە، هەر ئەمانەیشە وە بیستووشمە کە کەیخوسرەو بەگی جاف کوڕێکیشی هەبووە. ناوی (قادر) بووە و، لە پێکادانێکی خێلاتی ئەم قادرە لە ساڵی ١٢٥٧گ = ١٨٤٨زدا کوژراوە و دوور نییە ئەو شەوە یادی ساڵانەی کوژرانی ئەم قادرەیان بووبێ کە کوردان لە ڕۆژ و شەوی وەهادا خێرێکی زۆر دەکەن و خواردنی چاک و زۆر دەرخواردی زۆر لە جۆر کەسانە دەدەن و دەبەخشنەوە.

جگە لەمانەش مامێکی کەیخوسرەو بەگ واتە برای (سلەیمان بەگی باوکی) کە هەر ناوی (قادر) بووە کە (کوردی) هەموویانی لەم تاکەیدا شاردوونەتەوە وەک لە هەڵبەستی ژمارە (٩٥ – دڵ گرفتار بوو)دا کە (سەردانی)ی ماڵی محەمەد پاشای جاف و کەیخوسرەو بەگی کردووە کە بەشتی ئەو سەردانە بەهۆی کوشتنی ئەو قادر بەگەوە بووە کە (کوردی) بانگهێشت کراوە و ڕێگەی گوم کردووە.

بەدووری نازانم ئەو هەڵبەستەیانی لەو ساڵی (١٢٥٧ک = ١٨٤١ز)دا دانابێ.

هەروەک لە سەرچاوە دەمییەکانمەوە زانیومە کە (کوردی) هەڵبەستێکی پرسەنامەی بەجۆشی بەو بۆنەیەوە داناوە کە بەداخەوە هێشتا ئەو هەڵبەستە پرسە نامەیەم دەست نەکەوتووە.

محەمەد پاشای جافیش کە لە سەردانەکەی (مستەر ڕیچ)دا پایەی (پاشایەتی)ی (ڕیچ) بە (محەمەد بەگ) ناوی بردووە. وەرنەگرتووەدا پێم وایە، نزیکتر ئەوەیە و لەوانەبێ (کوردی) ئەم سەردانەی ناو ئەم دوو هەڵبەستەی پێشوو و سەرەوەی بەبۆنەی بەهارەوە بووە، چونکە لە

هاوینەهەواردا بوون و ئەشێ هەر لەو کاتی سەردانەیان شەوی (جومعە = هەینی)یە بووبێ، جومعەی کوژرانەکەی ئەو قادربەگەی (قادر)ی کوڕی کەیخوسرەو بەگیش کوژرابێت و ئەوسایەش کە لە هەڵبەستی ژمارە ٩٥دا نیشانەم بۆ کردووە، محەمەد پاشا پایەی پاشایەتیی هەبووە. کە دوای سەردانەکەی (ڕیچ) بووە.

ئەو (محەمەد بەگ) یا (محەمەد پاشا)ی جافەش هەر کوژراوە باوکی وەسمان پاشای جافە کە (عادیلە خانم)ی کچی (قادربەگی برازای کوردی)ی مارە کردووە. کە (عیزەت بەگ) و (تایەربەگ) و (ئەحمەد موختار بەگ) و (ناهیدە خانم) منالّی ئەو (عادیلە خانم) و (وەسمان پاشایە) بوون و جگە لە (عیزەت بەگیان، هەر سیانەکەی تر لە شاعیرە ناودارەکانی کوردن و خزمایەتی (کوردی) لەگەڵ (جاف)دا هەبووە.

هەر ئەو وەسمان پاشایەش برای (مەحموود پاشا)ی بەناوبانگ و گەورەی خان بووە کە وەسمان پاشا لە ساڵی ١٢٦٦ک = ١٨٤٩ز.دا پایەی پاشایەی دراوەتێ.

ئەم تاکە لە (گل/١، گل/٥، گل/٦، گل٧، گل٨، گل١٠، کو، ف، بم، ش، کم، گ٢، گ٣، س، ق/٤، نم/١، با)دا حەوتەمین و لە (مس، عن، م، ما/١، مع، شح، مر)دا نۆیەمین و دواتاکی ئەم هەڵبەستەیە لە هەموویاندا.

ئامانەت سەد ئامانەت ( ما/١، مع، مر، کل٢، نم/١، با، س، گ٣): لیت بی صد امانت (لێت بی صەد ئەمانەت)

کە ئەمشەو (گ٢، گ٣، کم، نم/١، ف، گل/١،س): هەرکە.

جومعەیە (گ/٣) جومعە.

سبەینێ (ش، کو، ما/١، ق/٤): صبینی. ڕێنووسی کۆنە.

قەت (ش، کو، ما/١، ق/٤): قط – ڕێنووسی کۆنە.

٩٨

## مەگەر ناڵینی من

١- مـــەگـــەر نـاڵـینـی من هـاتـووەتە گـــۆشـی
کـــەوا کـــردوویـە تـەرکـی ســـورخ پـۆشـی
٢- بەهـاری گـوڵشـــەنی حـــوسن و جــەمـــاڵە
بەســـوخـــمـــەی ســـەبز و نـیم تانـی بنـۆشـی
٣- خـــەڵاتـی دولبـــەری و شـــۆخـی کـــە دەدرا
لە پـاش یووسف مـــوزەییـــەن بوو، بـە دۆشـی
٤- فـەلـەک تۆش عـاشـقـی وەک من کە ئەمـشـەو
خـــەریکـی نـاڵـەو و گـــریـە و خـــورۆشـی
٥- مـــەدە وەعظم لـە تۆبـەی عـــەشق واعـــیظ
ئەگـەر صـاحـیب کـەمـاڵ و عـەقـڵ و هـۆشـی
٦- لە مـن (بەدتـر) دەبی زاهـیـد! ئـەگـــەر تۆش
شـــەرابی دەســـتی مـــەحـــبـــووبـێ بنـۆشـی
٧- غـەرەض: بۆ فـەوتی (کـوردی) بوو کە فـەوتا
ئیـــتـــر بۆ کـــێـیـــە نـاز و خـــود فـــرۆشـی؟؟

................................................................

١- گۆش: گوێ
سورخ: سوور، ئاڵ، قرمزی
سەرچاوەی دەستنووسی ئەم هەڵبەستە (کەشکۆڵی): (مس، عن، گل٧، گل٨، ما، ف، کو، یح، نم١، با)یەو لە چاپکراویشدا (ئا، کم، گ٢، س، گ٣)یە، و (ئا)مان کردە، بنکەی لێکۆڵینەوەی بەڵام بۆنەی هەڵبەستەکەمان لە لا ئاڵۆزە.
٢- گولشەن: گوڵزار، لالە زار، باغ، شوێن گوڵ، گوڵستان.
حوسن: دڵگیریی، شۆخی، شیرینی، جوانی.
جەمال: جوانی
سوخمە: پۆشاکێکە یا قۆڵدار یا بێ قۆڵە و قۆڵداریشی ناوادارە، وەک (بلووز)ی ئێستە وایە،

بەرگێکی خۆجێیی کوردانەیە.
سەبز: سەوز. کەسک
نیم تان: کورتەک ئەویش وەک سوخمەی قۆڵداریی ناوداره، بەڵام کەمێ لەو درێژترە تا نزیکی ئەژنۆیە.
بنۆش: ناوی ڕەنگی (مۆر) یا بنەوشەییە، هەروەها ناوی جۆرە کرێکی (قوماشێکی) تایبەتییە کە (بنۆش)ی پێ وتراوە لە ئاوریشم کە مۆر بووایە.
درەنگی مۆر بوو. بە جۆرە (خامەک)ێکیش دەوترا (بنۆش) یا (بنەوش) کە لە ڕەنگی (گوڵە بنەوشە)وەیە.
ئەم تاکە لە (عن، گل٧، گل٨، ف، ئا)دا دووەمینە و لەوانی تردا سێیەمینە.
گولشەنی (گل٧، گل٨، ما، یح، نم١): گلشن.
سەبز و (ئا، گ٢، س، گ٣): سەوزو.
نیم تانی بنۆشی (نم١، کم، ئا، گ٢، س، گ٣): دوشی بادەنوشی – ناگونجێ.
نیم تانی بنۆشی(ف) مینای با دەنوشی – ئەمیش ناگونجێ
نیم تانی بنۆشی (گل٧): قبای بادەنوشی – ئەمیش ناگونجێ هەرچەند (قەبا)یەکە وایە.
نیم تانی بنۆشی (کو): مینتای باد پوشی– ئەمیش ناگونجێ.
نیم تانی بنوشی (یح) نیم تاڵی با لە پوشی = جوان و بەجێیە.
نیم تانی بنوشی (ئا) نیم تاڵی سادە پوشی – ناگونجێ. بە تێکڕایی ئەم تاکە شێواوە.
٣– خەڵات: بەخشیش.
شۆخی: جوانی، دڵگیری، شەنگی، شیرین، دولبەری.
یووسف: حەزرەتی یووسف – و مەبەس لە جوانییەکەیەتی کە لە ئایەتی: ٣١ (یووسف)دا لە قورئاندا خوا بە فریشتە (مەلائیکە)ی ناوبردووە لە جوانیدا. (کوردی)ش، بۆیە وتوویە: (لە پاش یووسف)ەوە بۆ خەڵاتی جوانی وەرگرتن، بەڵام بەمەش دڵی ئاوی نەخواردووەتە کە یەکێکی تری وەک (یووسف) هەبێ و لەو جوانتر بێ، بۆیە بە شێوەیەکی تر جوانترێتی یارەکەی وەها دەربڕیوە کە ئەو
(خەڵاتە) هەر بەوەندەی درا بەسەر شانی یارەکەیدا (خەڵاتەکە)ی پێ ڕازایەوە، جا ئایا دەبێ ئەو یارە خۆی چەند جوان بووبێ. ئەمەش ئەو پەڕی باسی جوانی کردنە.
ئەشێ ئەم هەڵبەستە نیشانە بێ بۆ یەکێ لەو خەڵات وەرگرتنانە (پاشاکانی بابان) کە لە سوڵتانی عوسمانی و... هتدەوە بۆیان دەهات، یا خۆیان بە کەسێکیان بەخشیبێ.
موزەییەن: ڕازاوە، ئارایشت.
دۆش: شان، وا دیارە ئەو خەڵاتە، لە کەوڵە سمۆرە نایابەکان بووە بۆیە دراوە بە شاندا.
ئەم تاکە لە (عن، گل٧، گل٨، ف، ئا)دا سێیەمینە و لەوانی تردا دووەمینە، واتە لەگەڵ تاکی

پێشوودا پاش و پێشە و لێرەو دوا زنجیرەی تاکەکان لە هەموو سەرچاوەکاندا چونیەکە.

که دەدرا (ف، یح): که دورا.

که دەدرا (ما): که دروا.

که دەدرا (کو): که ددرا- ئەشێ (ف، یح، ما) پیتی (د)یان لێ گۆڕدرابی بە (و) وە لە سەرچاوە کۆنەکاندا (دَدْرا) نووسراوە، بۆیە (دەدرا)مان جێگیر کرد.

دولبەری (گ، س، گ۳): دڵبەری، ئەمەش دەسکاریی گیوە، چونکە لە سەرچاوە کۆنەکاندا نیشانەی (لامی قەڵەو) نەبووە کە گیو لێی وەرگرتبێ.

٤- فەلەک: ڕۆژگار، ئاسمانی مەبەستە (گەردوون)، سروشت.

خورۆش: جۆش و ئاڵۆزی.

وا دیارە کاتی دانانی ئەم هەڵبەستە و خەڵات وەرگرتنەکە، ئاسمان و کەش تووشی ئاڵۆز بووە هەورە تریشقە و باران بووە کە زۆرترەکەی بەر دوادوای وەرزی (زستان) و سەرەتای بەهار دەکەوێ کە (کوردی) لە هەمان کاتدا بە دەردی دەروونی خۆیەوە لە ناڵە و گریان و خورۆشدا بووە کە بەداخەوە ئەو دەردەمان بە تەواوی بۆ ئاشکرا نەبووە.

تۆش (ما) توشی.

ناڵەو و گریە و (کو): کریە و نالەو.

گریەو (ما): کریو، ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

گریە و (یح): کریە و، هەر ڕێنووسی کۆنە.

٥- وعظ: پەند و ئامۆژگاری. (واعیظ): پەند و ئامۆژگاریکار.

تۆبە: واز لێهێنانی دڵداریی مەبەستە. و ئەڵێ ئەی (واعیظ) ئامۆژگاریم مەکە وازی لێ ناهێنم.

صاحیب: خاوەن.

کەماڵ: (تەواویی لە تاقیکردنەوە و بیروڕا و زانستی) مەبەستە.

عەقڵ: ژیری.

ئەم لێدواننی (واعیظ) و لە تاکی دواییدا (زاهید)ە، بەڵگەی بوونی دژ و بەدکارە لەنێواندا کە بە جۆرێکی لابە لا لێیان دواوە، بەڵام نادیارییە.

تۆبەی (یح): تۆبەء ڕێنووسی کۆنە.

لە تۆبەی (ما): لتوبە، ڕێنووسی کۆنە.

عەشق (گ۳): عیشق.

واعیظ (ف، با، نم١، کم،گ٢، س، گ٣): زاهید.

ئەگەر (گل٧، گل٨،یح): أکر - ڕێنووسی کۆنە.

عەقڵ و (ما): عقل. ڕێنووسی کۆنە.

٦- بەدتر: خراپتر بۆ گیرۆدەبوون بەو عەشقەوە و پەیوەندی بە جوانەوە و زیاتربوونی

خۆشەویستی.

زاهید: مەرایی کاران و (بەسەر زاری خۆ بە خواناس و گۆشەگیر دەرخەران)ی مەبەستە.

شەراب: بادە، مەی، خواردنەوەی سەرخۆشکار وەک عەشقەکە بێ.

مەحبووب: خۆشەویست، ئەو جوانەی لێی دواوە مەبەستێتی.

ئەگەر (یح): أکر – ڕێنووسی کۆنە

تۆش (ما): تویش.

شەرابی (گ٣): شەڕابی، یا هەڵەی چاپی یا دەسنگەی گیوە.

دەستی(ما): دست. ڕێنووسی کۆنە.

مەحبووبێ (گل٧، گل٨): محبوب. ڕێنووسی کۆنە.

مەحبووبێ (ما): محبوبم.

مەحبووبێ (نم١، کم، گ٢، س، گ٣): محبوبەی: (مەحبووبەی).

٧– غەرەض: ئامانج، مەبەس، مەبەست.

فەوت: نەمان، لەناوبردن. (فەوتا) لە ناوچوو.

بۆکێیە: بۆ چ کەسێکە وەیا بە توانجەوە پێی دەڵێ (بووکێیە)؛ چونکە وا دەر دەکەوێ لەم هەڵبەستەدا لە دوو (بەرە) دواوە، وە وەک هەڵبەستەکەی(نالی) وایە کە بۆ مردنی (سلێمان پاشای بابان) و دانانی (ئەحمەد پاشا)ی کوڕی لە جێگەی ئەو کە لە هەمان کاتا پیرۆزانەیشە کە گوتوویە:

«تا فەلەک دەوری نەدا کەوکەبەی ئاوا نەبوو»

بەڵام بەداخەوە ئەم هەڵبەستەی (کوردی) لێڵییەکی تیایە یا ناتەواوە کە نازانرێ بۆ کێی گوتووە.

خود فرۆشی: خۆ فرۆشتن کە ڕەنگە ئەمەی بە (بەرەیەک) وتبێ و هەندێ شوێنی تری هەڵبەستەکە بۆ بەرەیەکی تر؛ چونکە لە پەراوێزی ئەم تاکەوە لە (مس)دا کە کەشکۆڵی (صەیدی هەورامی)یەو خۆی هاواڵ و هاودەم و هاو چاخی (کوردی)بووە، بە بن ڕستەی: (بو فوتی کردی بو کە فوتا) واتە (بۆ فەوتی کوردی بوو کە فەوتا)دا خەتێکی کێشاوە و لە گۆشەی لای چەپی خەتەکەوە نووسیویە: (١٢٥٨ه) و ئیتر بە داخەوە داوێنی ئەو پەڕەیە لە پەڕپووتیدا لە ناوچووە و ئەوی لە دوای نووسینی ئەم ساڵی (١٢٥٨ه)یەوە، نووسیویە نەماوە و نازانرێ چی نووسراوە.

ئەمەش نیشانەیەکی بە هێزە بۆ ئەوەی کە لە و ساڵی کۆچییەدا کە بەرامبەرە بە ساڵی (١٨٤٢ی زاینی) شتێکی ئەوتۆ ڕووی داوە کە هەستی (کوردی)ی جوولاندبێ و ئەم هەڵبەستەی لەسەر دانابێ، بەڵام دڕاوێتی و لە ناوچوونی ئەو داوێنی پەڕەیەی لە کەشکۆڵەکەی (مس)دا، ئەو ڕووداو و بۆنەی هەڵبەست بۆ دانانەی، لەگەڵ خۆیدا لێ گوم کردووین.

منیش لە ڕێگەی تۆ ژینەوەدا، پیتەکانی ئەو ڕستەی (بو فوتی کردی بو کە فوتا)ی ناو ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەم بە ژمارەی پیتی ئەبجەدی بەراورد کرد، دەرکەوت دەکاتە (١٢٥٨) چونکە ئەوسا ڕێنووس بەو جۆرە بووە کە (صەیدی) لە (مس)دا نووسویە و خەتی بەبندا کێشاوە کە: ژمارەی ١٢٥٨ی لە دوای خەتەکەوە نووسیوە.

کەواتە بۆچوونەکەم لە سەر ناوەڕۆکی ئەو ژمارەی ١٢٥٨ی ئەو پەڕەیە ڕاستە و، بەڵام لەگەڵ ناتەواویشیدا هەر لێرەدا جێگیرم کرد بەشکو بەهۆی سەرچاوەی ترەوە ئەمە شتێکی لێ بکرێ بەشتێ، چونکە ئەوساڵە سەرێنی فەرمانڕەوایی ئەحمەد پاشای بابان و هەڕەتی چەند پشێوییەک بووە کە مێژوو بۆی دیاری کردووین و لەوانە بوون هەستی هۆنەرانی ئەوسایان جووڵاندبێ، ساڵ دوایی ئەحمەد پاشا ڕووخاوە لەگەڵ پاشایەتییەکەی.

فەوتی (یح): فوت. ڕێنووسی کۆنە.

کوردی (یح، ما، کو): هجری – ئەم هەڵبەستە لەوە ناچێ لە دەرەوەی (سلێمانی) وەیا (کوردستان)دای نابێ کە (کوردی) بۆ ئەوانە نازناوی (هیجری) داناوە.

بۆ کێیە (ما): بوکیتە.

بۆ کێیە: (نم١): بۆ کێ یە – هەڵەی دەستنووسە.

ناز و (گل ٧، ما): ناز.

خود فرۆشی (گ٢، س، گ٣): خۆ فرۆشی ئەمەش دەستکاریی مامۆستا گیوە.

## بەئەبرۆ و خاڵ و خەت

١- بە ئەبرۆ و، خاڵ و، خەت؛ خووبی، بەباڵا؛ چوست و چالاکی
بەظاهیر؛ (بێچوە دەرویش)ی، بە دڵ جەللادی سەففاکی.
٢- بە ئایینەی ڕوخ؛ (ئەسکەندەر)، بە جامی دیدە؛ (جەمشید)ی
بە بەتەختی سینە؛ (پەروێز)ی، بەماری زوڵف (ضوحاک)ی.
٣- لە (ڕەسم)ی قەوسی ئەبرۆت، سستەوا (پەرگار)ەکەی (مانی)
لە (نوسخە)ی (جەوهەری فەرد)ی دەمت، حەیرانە (سەککاکی).
٤- سپای (حەت)، غەیری (مووکێش) یانە (تیغ)؛ چاری نییە لای کەس.
بە (دەریا عیلم)ەوە، هیچم نەکرد، با بچمە (دەللاکی).
٥- دەڵێن: جەللاد!!، دەڵێ: نەء، سەرکزو، مەعشووقەیەکم، داد
بەڵێ ئەو ڕاست دەکا، ئەمما درۆزن؟ کلکە میسواکی.
٦- لە دەست (باوکی) هەڕاکەم؟ یا لە بۆڵەی (داکی) هاوارکەم؟
لە (ظولم)ی (خۆی) بناڵم؟ یا لەبەر جەورو جەفای کاکی ؟
٧- (گەلە)ی صۆفی، ئەوا هاتن، کە میراتی (فەقێ) بەش کەن،
بەڵێ: مەعلوومە خۆ؛ (وەحشی) کە مرد، سەگ دەچنە سەر لاکی.
٨- (حەیا)ی بردی (شەراب)، واعیظ. کەوا (مەنع) ت دەکا (زاهید)،
(هەوێ ساری) خراپە، بۆیە وا (بەدگۆ)ی و (بەدناک)ی.
٩- عەجەب، دەستەو گریانم بووە (کوردی): بەڵای دونیا
مەگەر قیسمەت بوو، بۆ من ڕۆژی ئەووەڵ، عیجز و غەمناکی.

---

١- خەت (خەط): ڕوومەت، کوڵم، ڕوخسار، لەهەمان کاتیشدا مەبەست لە (گەندەمووی) ڕوخسارە.
لە تێکڕای ئەم پارچە هەڵبەستەوە، دەردەکەوێت کەوا ئەم هەڵبەستە، ڕازی دڵدارییەکی قووڵ و کاریگەری بێ ئەنجامە، بەرامبەر بە کچێکی کوردی دڵخوازی دای ناوە.
لێرەدا پرسێک دێ، بەبیردا کە ئایا (کوردی) لەو سەرێنییە ئاینییەی خۆیدا کە تەنانەت لە ئێستەی (٢٠٠٥)دا بە ڕوو هەڵماڵراوی ئاشکراکردنی (نێربازی) نەنگی و سووکییە و

(کوردی) چەندین هەڵبەستی دڵداریی بەسەر (کچ)دا هەڵدابێ و ئەو هەڵبەستانەیش کە ناوی نێرینەیەکی هاواڵ و کەسیەتییە ناودارەکانی ئەوسایان تیایە لە ڕووی تێگەیشتن و کورتبینی و لێنەکۆڵینەوەوە هەندێ سەرچاوە وەک لە شوێنی خۆیاندا ڕوونم کردوونەتەوە لەم پەڕاوییەدا کە ئەو سەرچاوانە (کوردی)یان بەناڕەوایی بە(نێربازی)، تاوانبار کردووە، کە ئەم پەڕاوییەم لە زۆر شوێنیدا بەبەڵگەی بەهێزەوە ئەو تاوانبارکردنە ناڕەوایەی (کوردی)ی تێدا بەرپەرچم داونەتەوە و پووچ و تڕۆم کردوون.

خووب: بەواتە جوان، وشەیەکە، کورد و فارس بەکاری دێنن.

بەباڵا: ئەم وشەیە هەر بەسەرنجدانێکی سەرزای دووردەکەوێ لە ئەم شوێنەدا جێگەی نییە و گۆڕدراوییەکی بەسەردا هاتووە، لەوانەیە، وە نزیکتر لە ڕاستی و، دەقەکەوە ئەوە وشەیەکی وەک (بە هەیبەت) بێ.

یا(دوو)، وشەی (چوست) و (چالاکی)یەکە، لەوانەیە، وشەی تریان لە دەقەکەی (کوردی)دا لە جێگە بووبێ، بەمەرجێ پاشبەندەکەی تێک نەدرێ.

بۆیە وەک خۆی و بە گونجاوی (ئەم شوێنەم) هێشتەوە. بەشکو سەرچاوەی تر، دەرکەوێت کە ئەم ناڕێکییە پڕ کاتەوە.

چونکە باڵا دەچوێنرێ بە (چنار)، (لاولاو) و (عەرعەر) و... هتد نەک بە چوست و چالاک، هەروەک (چوست و چالاکی)یش لە (باڵا)وە نییە و لە (هیمەست و هەیبەت و دیمەن) و ئەمانەی لەگەڵدا دەگونجێ.

ظاهیر: سەرزاری، لە ڕواڵەتدا، دیار، ئاشکرا.

دەروێش: هەوادارانی یەکێ لە (تەریقەت)ەکان و کەسێکی چاک و بێ وەی و خواناسە و لە شوێنی تردا بە درێژی تر پێناسەم کردووە.

جەللاد: وشەیەکی (عارەبی)یە بە واتە: ئەو کەسەی کە پێست دەگروێت، بەڵام لێرەدا مەبەست لەو کەسەیە کە لەبەردەستی سەرۆکە خوێن ڕێژەکاندایەو ئەو خەڵکی لە سێدارە دەدا وە یا بە شیر ملیان دەپەڕێنێ و بەدەورو پشتی ئەو سەرۆکە ستەمکارەیە و (دژ)ەکانی پاک دەکاتەوە هەروەک ناوی ئەوانەیش کە بە داریاقامچی لەو کەسانە دەدەن کە گوایە لە (دژ)یانەو بە (یاسا)ی ئایینی و (شارستانی) بە خراپ دەرچوون تاوانبار کراون.

سەففاک: ئەو وشە (عەرەبی)یە لە ڕووی زمانییەوە بە واتای (ڕێژەر) و (ڕشتنی هەر شتێک) دێت، بەڵام بە مەبەستی (خوێنڕێژ) لێرەدا بەکارهاتووە، لەوەوە کە گوایە (دڵخواز) ئەوەندە دڵی ڕەقە دڵدارێکی شەیدای ئەو، بەو دەردی دڵدارییەوە دەمرێ (بەدەست جەللای دڵدارییەکەی) و، (دەکوژێ) و خوێنی دەڕێژرێت.

سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە لەکەشکۆڵی دەسنووسدا: (مس، عن، بم، گل١، ف، جلی، نم،/١، با، ب) لەگەڵ دەسنووسێکی خودی (مامۆستا عەبدولرەزاق بیمار)ی ١٩٧٥ز.دایە، کە

لەوە دەچێ لە (ب) وەرگیرابێ کە من وەک پەراوێزێکی دەسنووسی خۆم لە کەنارێکی پەڕاوی (شرح دیوان الحلاج – دوکتور مصطفی کامل الشیبی/١٩٧٥دا نووسیومە) هەروەها سەرچاوە چاپکراوەکانی ئەم هەڵبەستەش (کم، گ/ ٢، س، گ٣)ە.

کە لە نێوانیاندا چاپی (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە بەپشتیوانیی سەرچاوەکانی تری.

بۆ (بۆنەی ئەم هەڵبەستە) بەداخەوە هێشا بە تەواوی بۆم ساغ نەبووەتەوە کە چی و بۆچی و کێ و. هتدە...

جیاوازیی ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستی یەکەمەی سەرەوە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەی دواییە:–

خاڵ و خەت (نم/١، با، ف، کم، گ٢، س، گ٣): خط و خال.

خووبی (گ٢، س، گ٣): جوانی – ئەمەش بە ئاشکرا دیارە گۆڕینی مامۆستا گیوە.

لە وشەی (بێچوو)ی نیو باڵی دووەمییەوە لە (جلی)دا تەنیا (بچە)یکی ماوەو ئەوی تری دڕاوە.

جەللادی (نم/١، ف، با، کم): جلّادو.

٢– ئەم تاکە هەڵبەستە بە تێکڕایی ئەوە دەگەیەنێ کە (کوردی) ئاگەداری خۆی لەسەر کەسیەتییەکانی: (ئەسکەندەر) و (جەمشید) و (پەروێز) و (ضوحاک)ی ناو پەڕاویی (شانامەی فێردەوسی)ی تیا ڕاگەیاندووە کە ئەو گەورە پیاوانە هەریەکەی بە چەند ڕواڵەتێکی، یا چەند شتێکی وەک (ئاوێنە) و (جام) و (سینە) و (مار): ناویان دەرکردووە.

بەڵام لە خوێندنەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا لە ڕووی دەستووری زمانی و داڕشتنەوە هەست بە شێواوی و لێڵی و لێکپچڕان و چاک بەیەکەوە نەبەسترانی تیا هەست دەکرێ.

گومان لەوەدا نییە کە شاعیرمان (کوردی) ئەوەندە ناتوان نەبووە کە ئەو (شێواوی و لێڵی و لێکپچڕاوی)یەی لە دەست دەرچووبێ.

کەواتە ئەم تاکە هەڵبەستە لەوانەیە بە هۆی دەمادەم کردن و یەک لەبەریەک نووسینەوەوەکە بە هەڵە و نارێکی گوترابێ و، یان لە دەستنووسی ناخۆشەوە وەرگیرابێ کە بە چاکی و تەواوی نەخوێندرابێتەوە. کە ئەم تاکەی سەرەوە بەم مەرەیە برابێ وەک لە پاڵ لێکدانەوەی ناوی هەریەکێ لەو چوار کەسیەتی (شەخسییەت)ە مەزنەی سەرەوەدا ئەم شێواوییانە ڕوون دەکەمەوە:

ئەسکەندەر: هەرچەند جاری تریش ناوی ئەم پیاوەم لێکداوەتەوە بەڵام لێرەشدا چەردەیەکی لەسەر دەدوێم و بە چاکتری دەزانم.

ئەسکەندەر: جیهانگیری مەزنی مەکدۆنی (ئەسکەندەری گەورە)یە، کە لە ساڵانی (٣٥٦ – ٣٢٦)ی پێش زاینیدا ژیاوە، و بەو تەمەنە کەمەیەوە ئەوەندە جیهانگیر ولە جەنگدا سەرکەوتوو بووە، جارێکیان بەسواریی ئەسپەکەیەوە خۆی کردووە بە (دەریا)دا و گوتوویەتی هەموو زەویی ئەم سەرزەمینەم گرت و ئەبێ دەریایش بگرم، ئەوەندە لە خۆی بایبووە.

یەکێ لەو کارە گرنگانەی کە کردوویەتی لە شاری (ئەسکەندەرییە)ی گوێ کەناری دەریای سپیی ناوەڕاستدا کە دەکەوێتە لای ژووروی نیشتمانی (میسر)ەوە ئەم ئەسکەندەرە لە گوێ دەریای ئەو شارەدا بورجێکی یەجگار بەرزی دروست کردووە بۆ ئەوەی زۆر لە دوورەوە سەرنشینەکانی پاپۆڕ (کەشتی)یەکانی ناو ئەو دەریایە بە تیشکی ئەو (ئاوێنە) مەزنەوە کە لەسەر ئەو بورجەی ئەسکەندەر چەسپ کراوە، بتوانن هەر لە دوورەوە هانای شوێنی شارەکە بکەن و ڕووی تێ بکەن؛ چونکە ئەو شارە (ئەسکەلە)یەکی گوێ (مینا)ی کەم هاوتا و بەناوبانگی ئەوسای جیهان بووە کە لەهەر لایەکەوە (کەشتی) ڕووی تێ کردووەو بەو (ئاوێنە)ی سەر بورجەوە ئەو شارە چەندین ئەوەندەی تر بووەتە شارێکی بازرگانی و ئابووری و زانیاری و وێژەیی و هونەری و پیشەسازی و... هتد کە ئەو (ئاوێنە)یە بووە هۆی ئەوەی بە (ئاوێنەی ئەسکەندەر) ناو دەرکات و ئەسکەندەری زۆرتر پێ بناسرێت

کەواتە لەم تاکەی سەرەوەدا کە (ئاوێنەی ڕوخ) هاتووە کە ئەسکەندەرە، ئەوە دەربڕینێکی پڕ بەپڕی، ڕاستە لە چاوی دڵدارەوە وەک (کوردی) ڕوو = (ڕوح)ی دڵخواز و خۆشەویستەکەی وەک ئاوێنە ڕووناک و بێگەرد بووە، بەڵام ئاوێنەی (ڕوخ) نییە بەشکو (ئاوێنەی ئەسکەندەر)ە و جۆرە شێواوییەکی وەها لەم دەربڕینەدایە کە بەپێنەو پەڕۆیەکی چرووکیش بەیەکەوە نابەسترێتەوە و واتای پڕبەپڕی نادات و بەوە لە هەڵبەستە بەهێزەکانی (کوردی) دوور کەوتووەتەوە.

هەرچەندە (روخ) بەواتە (قەڵا)یە لە یاری (شەترنج)دا و ئەگەر گوتمان (قەڵا) بورجەکەی ئەسکەندەرە هێشتە هەر ترازووەکەی لارەسەنگە.

(جەمشید): دووەمین کەسە کە لەم تاکە هەڵبەستی دووەمەی سەرەوەدا هاتووە، کە تیایا: دیدە واتە (چاو)ی خۆشەویستەکەی (کوردی) چوێنراوە بە (جام) واتا: (ئامان)، کە ئەو (کاسە) یا (زەرفە) قووڵەیە وەک بەرداخ کە بادەی پێ خوراوەتەوە، ئەمجا لێرەدا ڕاستە چاوی خۆشەویست وەیا دڵخواز لای دڵداران مەست کارە، وەک چۆن بادەی ناو جامەکە، (جامەکە): مەست دەکات بەڵام، چاو چوێنراوە بە گەلاوێژ، بەنێرگس، بەمەست، ... تاد.. چواندنی بە (جام) کە (جام) بە چ جۆرێک لە چاو ناچێ، ئەم دەربڕینە جۆرە نەگونجاوییەکی تیایە و ئەو چاوە، بێ گلینەیە کە جوانیی چاوە.

لێرەدا ئەم باسی (جەمشید)ە بەجێ ناهێڵم و لە سەری دەڕۆم تاکو پتر لێکدانەوەکەم ڕووتتر بکەمەوە، نیشانە بۆ ئەوە دەکەم کە:

(جەمشید)(*) یەکێ بووە لە پادشایەکانی (ساسانی)یانی باپیرانمان، ئەو (بادە واتە مەی) یا (خواردنەوەی سەرخۆشکار)ی دروست کردووە بۆ یەکەم جار، وەیا لە سەرێنی فەرمانڕەواییی

---

(*) جەمشید، کوڕی تەهموورس، چوارەمین پاشای پیشدادی بەگوێرەی شانامەی فیردەوسی حەوسەد ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و جەژنی کەونارای نەورۆزی کردەباو و کۆمەڵێک داوونەریتی نوێی داهێنا.

ئەودا دروست کراوەتەوەو، بە (جام = کاسە)ی زێڕ و زیو، (گەوهەر بەند) خواردووپەتەوە و ئەو (جام)ەی ئەو بە (جامی جەم) یا (جامی جەمشید) ناوی دەرکردووە، وەیا ڕایەکی تر ئەوەیە کە: ئەو (جەمشید)ەش شووشە (جام)ێکی زۆر (پان) و (بەرینی) لە شوێنێکی زۆر بەرزی کۆشکەکەی خۆیدا چەسپاندووە و توانراوە ڕووی ئەو جامە بسووڕێنرێتەوە بە هەرلایەکدا کە ویستبێتیان و، گوایە (جەمشید) و (جام) یا ئەو (شووشە) یا (ئاوێنە)یەی کە لە شووشە واتە (جام) دروست کراوە، ناو شاری پایتەختەکەی ببینێ کە ئەوەش هەر (جامی جەم) واتە (جامی جەمشید)ی پێ وتراوە.

ڕای سێیەمیش هەیە کە دەگێڕێتەوە ئەو جەمشیدە لە بەرەبەیانێکی (جەژنی نەورۆز)دا بەسەر (کورسی)یەکی بەرزەوە دانیشتوەو گەورە پیاوان و ڕەشەگەلیش بە دەوریدا بوون کە ئاهەنگی ئەو جەژنە پیرۆز و ڕەسەنەی (کورد)ی تیا بەرپا بکەن و، کاتی خۆر هەڵهاتووە. و داویەتی لەسەر سنگی (جەمشید) پاشا، کە بەزێڕو زیو و ئەڵماس و گەوهەربەند ڕازاوەتەوە، تیشکی خۆر لەو (سینە بەندە گەوهەرینە)ی جەمشیدی داوە و تیشکەکەی شکاوەتەوە بەناو خەڵکەکەدا لەوەوە ئەو پاشایە کە لە هەمان کاتدا ناوی (جەم) بووە خەڵکە وتوویانە (جەم شید) واتە تیشکی جەم کە (شید) بەواتە (تیشک و پەڕتەو)ە و ئەو (سینە بەندەگەو هەرینە) تیشکدەرە بە (جامی جەم)یش ناسراوە.

(جەمشید) بەمانە هەموویەوە ناوی کردووە، بەڵام (چاو) واتە (دیدە) چواندن بە جامی جەم چاوێکی بێگلێنە و بیلبیلەیە کە زۆرترەکەی لە چاوی هەندێ کوێر دەچێ و ناشی (کوردی) کە لە جوانیی چاوی خۆشەویستەکەی دواوە کردبێتبە و بەو چاوی کوێرە کە ئەو (جام)ی ئەم سەردەمەی ئێمەیە (تەلەفیزیۆن) و (سەتەلایت) و (ئینتەرنێت)ە کە وەک جەمشید لە خانووی خۆمانەوە هەموو لایەکی (گەردوون بە دەنگ و ڕەنگی سروشتیی خۆیەوە دەبینین).

لێرەدا نیشانەیش بۆ ئەوە دەکەم ئەو (جامی جەم)ە ئاوێتەیە بناخەی سەرەتاییی بیر لە بوونی شتێکی وەک (تەلەفیزیۆن و سەتەلایت و ئینتەرنێت) کردنەوە بووە.

(پەروێز) کەسەتیی سێیەمی ناو ئەم دووەمین کە هەڵبەستی سەرەوەیە کە (کوردی) سنگ و بەرۆکی خۆشەویستەکەی چواندووە بە (پەروێز) ئەو پەروێزەی کە باوکی (کەیخوسرەو)ی دڵداری (شیرین) بووە و (پەروێز) بەسەرو سنگ بەرز، توانا، لێهاتوو و، خورت، بەکار و سەرو سنگ و بەرۆک جوانییەوە بەناوبانگ بووە.

ئەمجا هاتنی سنگی خۆشەویستەکەی لەم تاکە هەڵبەستەدا بە (پەروێز)وەیا وەک دەڵێن: بە جۆرە (حیلە شەرعی)یەک ئەگەر سنگی ئەو (پەروێز)ە و سنگی خۆشەویستەکەی (کوردی) بەیەکتری چواندن، دیسانەوە هەر دەربڕینێکە لەوە ناچێ (کوردی) بەو جۆرەی ڕاگەیاندبێ وەک لە سەرەتاوە نووسیم من ئەمەش بەلاوازی و شێواوی و ناپڕبەپڕی دەزانم.

(ضوححاک) ناوێکە کە عەرەبەکان ناوی (ئەزدیاک)، ئازدیاک، ئازدەهاک، ئەژدیاک)و.. هتدیان

گۆڕیوە بەشێوە (ضوحاک)، ئەو (ضوحاک)ەش ئەو پاشایەی ساسانییەکانی باپیرانمان بووە کە تا ئێستاش شوێنەوارە پاشماوەکانی بە بناری (خورماڵ) و (دێنە) و (بەردەبەڵ) و ئەو سەر شاخەی سەروو شارەزوور، هەر ماوە.

ئەو (ضوحاک – یا ئەزدیاک)ە پاشایەکی زۆر دادپەروەر و چاک و بە زەیی بووە، لە ناوچەکەدا، بەپێی ئەفسانە کۆنەکان گوایە (شەیتان) ئەو چاکییەی ئەوی پێ ناخۆش بووە، کە بۆی نەکراوە بە ئارەزووی خۆی هاونیشتمانیەکانی (خوحاک)ی باپیرانمان، لە خشتەبەرێ و، بیان خاتە سەر ڕێگەی خراپ، بۆیە (شەیتان) هاتووەتە سەر ئەوەی کە چاکتر وایە خودی (خوحاک) بخاتە سەر کار و ڕێگەی خراپ و نادادپەروەریانە و گوایە (ضوحاک) تووشی نەخۆشییەک دەکات کە هەرچی پزیشکی ناوچەکە هەبوون چاری نەخۆشییەکەیان پێ نەکراوەو هەر گوایە (ضوحاک) وای لێ هاتووە کە لەوەدوا هەر پزیشکێک ویستبێتی چاری نەخۆشییەکەی (ضوحاک) بکات، (ضوحاک) مەرجی لەگەڵ ئەو پزیشکەدا کردووە ئەگەر توانیی چاکی بکاتەوە ئەوا هەرچی بخوازێت و لە توانایی (ضوحاک) دابێ بۆ ئەو پزیشکەی بکات و خۆ ئەگەر چاکیشی نەکردەوە ئەوا سەری دەبڕی و لە ئەفسانەکاندا هاتووە کە چەند قەڵای لە کاسە سەری ئەو پزیشکە چارە نەکارانەی دروست کردووە.

ئەمجا ڕۆژێک شەیتان خۆی دەباتە شێوەی پیاوێکەوە و بە جانتایەکەی سەر شانییەوە، بە بەردەمی ماڵی پاشادا دەڕوات و هاوار دەکات من پزیشکێکم هەرچی نەخۆشی هەیە دەستبەجێ چاکی ئەکەمەوەو کابرا ئەبەنە لای (ضوحاک) پاشا و ئەڕوانێ ئەو کابرا ڕووتەیە، نابێ ئەوەی لە بارابی کە نەخۆشییە گرانەکەی چاک بکاتەوە کە ئەو هەموو پزیشکە لێیهاتووە چارەیان بۆ نەکراوە.

ضوحاک) بە کابرای پزیشک (کە شەیتان بووە) دەڵێ کوڕم ببینە ئەو هەموو قەڵایەم لە کاسە سەری ئەو پزیشکانە دروست کردووە کە چارەی نەخۆشیەکەمیان پێ نەکراوە، ئێستەش ئەگەر چاک دڵنیا نیت لە کارەکەی خۆت ئەوا دەست مەدەرە چارەی من، ئەویش وەڵامی دەداتەوە گەورەم ئەگەر دەستبەجێ چاکم نەکردیتەوە ئەوا چاوەڕوانی چەند ڕۆژێکم لێ مەکە و گورج لەسەرم بدەو ئاوێک لە جانتایەکەی دەردەهێنی و دەیداتە (ضوحاک) کە بیخواتەوە و لەگەڵ خواردنەوەیدا (پادشا) هەرچی (دەرد) هەیە لە لەشیدا نامێنێ. پادشا سپاسی پزیشکەکە دەکات و دەڵێ دەی بڵێ چیت ئەوێ بۆت بکەم (دوکتۆر شەیتان)یش دەڵێ گەورەم هەر تەنیا خۆشیی سەری تۆم دەوێت.

پادشا جارێکی تریش وتەکەی خۆی دووبارە دەکاتەوەو (دوکتۆر شەیتان) هەمان وڵاتی ئەداتەوە.

پادشا دەڵێ کوڕم نەریتی پادشایان وەهایە ئەم جۆرە وتەیەی من سێ جار بڵێنەوە، دەی ئەمە جاری سێیەمە چیت دەوێ ئەو سایە شەیتان دەڵێ گەورەم من خۆشیی تۆم دەوێت بۆ ئەوەی

سێ جار فەرموودەکەت بە پاشەوە نەدەم، ئەوا ئەگەر پێم دەبەخشێ لەسەر هەر شانێکت تەنیا یەک (ماچ) ئەوا خۆ بە بەندەی تۆ دەزانم. ئەو سایە (ضوحاک – یا – ئەژدەهاک)شا، هەردوو شانی خۆی بۆ ڕووت دەکات و کابرای پزیشک لە هەر سەرشانەی ماچێک دەکات و جانتایەکە هەڵئەگری و ئەڵێت گەورەم من ئێستە کاری دیکەم هەیە، بەڵام هەمیشە سەرت لێ دەدەم و لەگەڵ کورنووشی کردن بۆ بارەگای پاشادا لە (کۆشکی شا) دەچێتە دەرێ.
هەرکە کابرای (شەیتان پزیشک) دەڕوات پادشا هەردوو سەرشانی و جێگە ماچەکان ئازار پەیدا دەکەن و دواتر هەڵدەئاوسێن و ئاوسانەکە وەک دومەڵ دەتەقێ و لە هەر سەرشانەی مارێک دێتە دەرەوە لەو شوێن دەربوونی دوومەڵەکە شوێن ماچەکە بوو. دوکتۆران هەرچی دەکەن چاری ئەو دوو مارەیان بۆ ناکرێت کە هەردووانیان دەیانەوێ سەر بە کونە گەوێچکەی پادشا بکەن و پزیشکەکان تەنانەت مارەکان دەبڕن کەچی جارێکی تر سەر هەڵدەدەنەوە. ئەو سایە (بڕیار) دەدەن ئەم مارانە دەیانەوێت لە ناو کاسەی سەرتا (مێشک) بخۆن، دێنە سەر ئەوەی کە هەر مارەی ڕۆژێ زەلامێک سەربڕن مێشکەکانیان بدەن بەو دوو (مار)ە و ئەو مارانە ئەوەندە گەورە دەبن تاکو دەبن بە (هەژدیها) و لەوەوە ئەو پاشایە بە (هەژدیاک) واتە (هەژدیها) دەناسرێت و عەرەبەکانیش ئەو ناوەیان (تەعریب) کردووە بە: (ضوحاک) و ئیتر پاشماوەی داستانی ئەم (ضوحاک)ە درێژە و هەتا (کاوەی ئاسنگەر ) دەیکوژێت، هەر ئەوەندە لێ رادەگەیەنم، کە لەمەودواوە بە (تیروپشک) هەر (ڕۆژەی) دوو (کورد) سەر دەبڕن کە مێشکەکانیان بدەن بە مارەکانی سەر شانی پادشا و بەم جۆرە ئەو پادشا چاکەکارە (شەیتان) دەیگۆڕێ بەو خوێنرێژە.
کۆتاییی داستانەکە بە کەڵکی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە نایەت و هەر ئەوەندەی لێ بەبیرا دێنمەوە کە لەم تاکە هەڵبەستەدا (جووتە زولفەکانی) کچە جوان و خۆشەویستەکەی (کوردی) چوێنراون بە (جووتە مارەکەی) سەر شانی (ضوماک) کە زولف لەسەرەوە دێتە خوارێ بەسەر شاندا و بەڵام مارەکان هەریەکێ لەلایەکی سەر شانیدا لە خوارەوە هەڵقوڵاو بوون و، ئەگەر چی بۆ پینەکردن بیر بۆ ئەوە دەچێ کە مارەکان چۆن ویستوویانە (مێشکی ضوماک) بخۆن ئەو زولفانەش ئاوەها دڵی هۆنەریان بەند کردووە و لەوەی کە لە ناوی بەرن ئەمیش چواندنێکی لاوازە
کەواتە دیسانەوە (زولف) و (ضوحاک)ەکەی ناو ئەم تاکەش وەک هەرسێ کەسەتییەکەی تر شێواوی و لاوازیی تیا دەبینرێت.
خۆزگە سەرچاوەی تر سەریان هەڵدەدا کە ڕاستیی دەقی ئەم تاکە هەڵبەستەیان تیا بێ و ئەم تاکە لەم شێواوییە ڕزگار بکەن، ئەوەم ئاواتە.
لەگەڵ ئەمانەشدا شارەزاییی زۆری (کوردی) لە مێژووی ناوچەکەمان لەم تاکە هەڵبەستەدا بۆ دەردەکەوێ و هەر ئەم شارەزاییەی لەگەڵێ هەڵبەستی تردا دیارە.

٣- ڕەسم: وێنە، نەخش،

قەوسی: کەوانی چەماوەیی برۆی مەبەستە.

پەرگار: جەوەل = ئامێرێکی جغز و کەوان پێ کێشانە کە لە وێنەکێشی و لە (ئەندازیاریدا) کە قوتابییان، لە وانەی (هەندەسە)دا بەکاری دێنن.

مانی: ئەو هونەرمەندە وێنە و نەخشکێش، هۆنەر، بیرمەندو، فەیلەسووف و زانایە بەناوبانگەیە کە بەبیرە قـووڵ و بەهێـزەکـەی چووەتە پلەیەکی زۆر بەرز لە زانیـاری و کـابرایەکی کـوردی زەردەشتی بووە کە ناویم زۆر بردووە.

لە هەڵبەستەکانی (کوردی) و ئەم پەڕاوییەدا، هۆنەرانیش لە هەڵبەستیاندا نیشانەیان بۆ کردووە.

نوسخە: وێنە، هاوچەشن، لەبەرگیراوە..

جەوهەری فـەرد: (گەوهەری تاکانـە)، کە مەبەست لە خـودی (خوا)ی مەزنە کـە هاوچەشن و هاوبەشـی نییـە و هەر تـەنیا خـۆی بووە و هەر خـۆیشی دەبێ، یا مـەبەست لە هـەر شـتێکی بچووک و تاکانەی وردی وەک (دەم)ی بچووکی خۆشەویستەکەی (کوردی)یە.

حەیران: سەرسام، سەراسیمە، لە بەرامبەردا حەپەساو و سەر لێ دەرنەکردووە.

سەککاکی: لە ڕووی زمانییەوە بە واتە داڕێژەری پارەی کانزایی واتە سکەلێدەرێتی، لەم لایەنە زمـانییـەوە مـەبەست لەوەیە کـە ئەو سکە لێـدەرە ناتوانێ شـتێکی ئاوا بچـووکی (زەڕەنگەر سـازی) هێندە (ورد) دروست بکات کـە هاوتای دەمـە بچـووکەکـەی کچـە جوان و دڵگرەکـەی (کوردی) بێ.

بەڵام لە ڕووی ئەوەوە کە ئەم وشەیە (سەککاکی)یە ناوی کەسەتییەکی مەزنی بەناوبانگە ئەم تۆزە ئاگادارییەی دوایی لەسەر پێشکێش دەکەم:

سـەککاکی: (نازناو)ی (یووسف کوڕی ئەبوبەکر)ە، لە زانستی خۆشخوانی واتە (بەلاغەت)دا زانایەکی زۆر شارەزای پسپۆڕ و لە زانستیی (کەلام)یشدا بە ئیمام ناوبراوەو هۆنەرێکی باڵا دەست بووە؛ دانـەری گـەلێ پەڕاویی پڕوچڕی بایەخـداری زانیـارییـە، وەک پەڕاویی (مـفـتـاح العلـوم) کە تا ئێستـاش ڕێزی زانیـاریی وردی خـۆی هەیە و، لە سـاڵانی (١١٦٠ - ١٢٢٩)ی زاینیدا ژیاوە. گوایە بەو هەموو زانیارییەیەوە لە بچووکیی ئەو (دەمە) سەرسام بووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (مس، عن، گل/٦ و لە دەسنووسەکەی (بیمار)دا سێیەمینە و لەوانی ترا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوەو لە هەمووانیشیاندا چونیەکە.

٤- نیـو باڵی یەکـەمی ئـەم تاکی چوارەمـینە جگە لە سـەرچاوەکـانـی (مس، عن، گل/٦) بەم جـۆرەی دوایی نووسراوە:

«سوپای خەط هات غەیرەز تیغ کەسێ ناتوانێ چارەی کا»

جیاوازییەکانی ناو ئەم تاکەش بەپێی سەرچاوەکان بەم جۆرەن:

غەیرەز: (گ٢، س، گ٣): غەیری – کە گیو، ویستوویەتی لە شێوەی (فارسی ئامێزی) ئەم وشەیە بگۆڕی و سەیر ئەوەیە کە نەیکردووەتە (بێجگە)ی کوردی پەتی تر.
غەیرەز (جلی): غیراً – و بەدەسنووسێکی تری جیاواز چاک کراوە بە (عەبراز)
چارەی کا (گ/٢، س): چاری کا.
چارەی کا (گ٣): مەنعی کا.
بابچمە: (جلی): بچمە – ئەمیش لەنگە
لە سەرچاوەکاندا ئەم تاکی چوارەمینە لە (مس، عن، ن، گل٦)دا چوارەمینە و لەوانی تردا (سێیەمین، جگە لە لە دەسنووسەکەی (بیمار) و (جلی)دا شەشەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.
ئەمیش لێکدانەوەی وشەکانی ئەم تاکەیە کە لەسەرەوە بەپێی سێ سەرچاوەی (مس، گل٦، عن) کە جێگرم کردووە بە (شیاو)ترو لە واتادا (چڕ)تری دەزانم.
(سوپای خط): سوپای خەت، لەشکری خەت، کە وشەی (خەت)م لە تاکی یەکەمی ئەم هەڵبەستەدا لێک داوەتەوە کە مەبەست لە (گەندەموو)ە بە ڕووی ئەو کچەوە کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی بۆ داناوە. بەڵام هەندێ هۆنەری (سۆفی) ئەم خەتەیان بە گەندەمووی دەموچاوی (نێرینە)یەکیان چواندووە و هەر ئەمەش بووەتە هۆی خراپ لێکدانەوە، کە هەندێ سەرچاوە ئەم (خەت)ی ناو هەڵبەستی (کوردی)یەیان کردووەتە گەندەمووی ڕووی مێرمندالێ کوڕ و (کوردی)یان بە خۆشەویستیی ئەوەوە بەناڕەوایی پێ تاوانبار کردووە.
ڕاستە وەک ڕام گەیاند سۆفییەکان کە (خەت)یان بە گەندەمووی تازە دەرهاتووی دەموچاوی نێرینەیەک داناوە، چونکە بەلای ئەوانەوە کە ویستوویانە خودی خوا بە (نێرینە) ناوببەن، کە لە مێیینە لە پێشترە، ئەوەتا هەموو وشە و ناوەکانی خوای مەزن هەموو هی نێرینەن و بۆ نموونە لە جێگەی (ڕەحیم) و (صەبوور) و (شەکوور)دا نەوتراوە (ڕەحیمە)، (صەبوورە) و (شەکوورە) کە ئەمانەیان بۆ مێیینەن بۆیە بەلای ئەو سۆفییانەوە (خەت) بە (سمێڵ) و (ڕیش) دانراوە نەک (سمێڵ و ڕیشی نێربازی). (کوردی) مەبەستی لە گەندەمووی دەموچاوی کچە جوانەکەیە، هەر بۆیە لەم نیو باڵی دووەمەدا. چارەی ئەو گەندەمووەی (مووکێش) و بە (تیغ) داناوە کە موو (کێشەکە) بۆ مووی (ڕوخسار) و (تیغ)ەکەش بۆ مووی تری لەش و (کوردی) ئەوەندەش شەیدای ئەو کچە بووە کە فەرموویەتی «سەرەڕای ئەم دەریای زانستی »یەم کە شتێکی ئەوتۆم لێ بە دەست نەهێناوە کە لە دڵی دڵخوازمدا کەمێ شیرین ببم و بۆیە چاک وایە بچمە بەرپیشەی (دەلاکی) و وەها بکەم کەمێ گەندەموو تووکی لەشی هەڵکێشم و بتاشم و بەشکو لەو بوارەدا بگەمە ئەو دڵخوازەم».
مووکێش: ماشەیەکی یامقاشێکی وردیلەی بچووکە و مووی ڕووی پێ هەڵدەکێشرێ.
لە هەمان کاتیش لەو (مووکیش)یە مەبەست لە هەڵگرتنی دەمووچاوە بە کشتەک کە جاران ئەمانە هەر تایبەت بوو بە ئافرەت.

غەیری: جگەلە، بێجگە، بێجگەلە، بلی، بەبێ...

تیغ: مەبەست لە گوێزانە کە مووەکەی پێ چار دەکرێ، و جگە لە تیغ و مووکێشەکە ئەوسا چارەی لابردنی تووک و موو بووەو جا نازانم (دارِوو)ی (گەرماو)ەکان هەتا ساڵە پەنجاکانی چەرخی پێشوو لەگەڵ (دەمووکانە) کە مووی بەری ئەرِووتانەوە لەسەرێنی (کوردی)دا هەبووەیان نەء، کە ئێستا چەندین هۆی ئەوە پەیا بوون و چاکتر لە (دارِوو) و (دەمووکانە)ش و بێ، ئەرکتریش و بێ ئازارتریش و ئاسانتریش و بێ مەترسیتریش.

دەلاک: لە ڕووی زمانەوانی و فەرهەنگییەوە ئەم وشە عارەبییە بە واتا، شێلان و هەنوونی لەش کە جاران و تا ئێستاش کەسانێک هەن لە (گەرماوە گشتییەکاندا) سەرو لەشی کەسانی پیر و پەککەوتە و دارا و نەخۆش دەشۆن و شۆشتوویانە و هەروەها لە کۆڵنجکردندا پسپۆری ئەوەن کە چۆن شان و مل و دەمارەکانی لەش بشێلّن بۆ نەرمبوونی کۆڵنجەکە.

لە هەمان کاتیشدا وشەی (دەلاک) بووە، بە ناوی ئەوانەی پیشەی سەر و ریش تاشینیان هەبووەو ئەمەش لەوەوەیە کە شوێن ڕیشیان بەر لە تاشینەکە زۆر ئەسووەوە و دەهەنوو، بە نیازەی بنی تووکەکە سرِ ببێ و بێ ئازار بتاشرێ: لەوەوە بە (دەلاک) ناونراون.

(کوردیش) چارەی نەماوە کە چووبێتە بەر دەلاکی و دەموچاو هەڵگری وەک لە پێشەوە ڕوونم کردەوە.

٥- دەڵێن: دەڵێن، دەبێن ، دەبێژن – کە مەبەستی لە دڵخوازانە لە هۆنەران، کەوا لە هەڵبەستەکانیاندا، بە دڵخوازەیان دەڵێن: جەللاد، وەک لە یەکەم تاکی ئەم هەڵبەستەی؛ (کوردی) خۆیشی، کچە خۆشەویستەکەی بە (جەللاد) ناوبردووە.

جەللاد: وەک لە یەکەمین تاکدا لێکم داوەتەوە بە واتە: بکوژ، و خوێنخوارە.

دەڵێ: مەبەستی لە کچە خۆشەویستەکەیەتی کە وەڵامی دڵداری داوەتەوە.

نەء: بە واتە (نا، نا) من جەللاد نیم بەشکو سەر (کز گرتوو)یەکم.

سەرکز: ئەمە لە (ئیدیۆم: کینا)یەکی کوردەواری وەرگیراوە، کە ئەگەر پێناسەی کەسێکی بێ وەزنگ و بێ وەی بکەن، وتوویانە وە دەڵێن: فلانکەس سەری خۆی کز گرتووە، یا دەستی بەکڵاوەکەی خۆیەوە گرتووە، ئەوەندە بێ وەی و، بێ وەزنگە وەک (کوردی) لێرەدا بە زمانی خۆشەویستەکەوە بەسەر کزی داناوە.

مەعشووقە: وشەیەکی عارەبییە کە بەپێی دەستووری زمانی عارەبی، لەم جۆرە وشەگەلەدا جیاوازی لە نێوان وشەی (مەعشووق = ماشقە، یا ئەو کەسەی کە دڵداران خۆشیان دەوێت کە جۆری (مەعشووق) بۆ خۆشویستراوی (نێرینە)یە و (مەعشووقە)کە لەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە بۆ (مێیینە)یە، وەک لە تاکی دووەمی ئەم پارچە هەڵبەستەدا (کوردی) لە (زولف) واتە (ئەگریجە)ی کچانەی خۆشەویستەکەی دواوە کە (زولف) بۆ (مێیینە)یە. و ئەوەتا لەم تاکەیشدا خۆشەویستە دڵخوازەکەی (کوردی) خۆی بە (مەعشووقە) واتە مێینە پێناسە

کردووە، نەک (نێرینە) نیوەی دووەمی ئەم نیو باڵی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە هەر لە سەرچاوەکانی، (مس، عن، گل/ە)دا بەم جۆرەی سەرەوە. هاتووە کە لەبەر پڕی و چڕیی و پەسندیی دەربڕینەکەی جێگیرم کردووە.

ئەگەر چی لە سەرچاوەکانی تردا بەم جۆرەی دوایی هاتووە:

«دەڵێن جەللاد دەڵێ: من؛ مل کز و، (مەعشووق)م، هاوارە.»

ئەم دەقەیش جگە لە (لەنگی)یەکەی لە کێشی هەڵبەستەکەدا وشەی (مل کز) لە جێگەی (سەرکز)ەکەی پێشوو هاتووە، کە (مل کز) بە واتە (موطیع)ی (عەرەبی)یە، هەرگیزیش جوانان و دڵخوازان ئاوەها (موطیع = مل کز) نەبوون و نابن، چونکە ئەوانیش بیر و ڕاو خواستی تایبەتی و مافی ڕەوای خۆیانیان بووە و هەیە، بەڵام هەرچی وەک (سەرکز)ە، بەکارهێنراوەکەی ناو تاکە هەڵبەستەکەیە لە واتادا جیاوازە لە (مل کز).

وەک لێکم داوەتەوە بۆ ئەم شوێنە (سەرکز)ەکە، بەجێتر و گونجاوتر و بەهێزترە، جگە لەوەی بەکارهێنانی، وەیا بوونی وشەی (من) لە دەقە نیشانە بۆ کراوەکانی سەرچاوانی تردا وەک لەسەرەوە جێگیر کراوە (من) پێویست بەم شوێنە نییە و لاوازییە لە دەربڕینداء چونکە هەر بەوەدا کە لەو سەرچاوانەدا کە لە وشەی (مەعشووقم)دا هاتووە و پیتی کۆتاییی (مەعشووق)م، جێگەی (من)ە، کە دەگرێت کەواتە هەر لەبندا ئەم (من)ە، بۆ ئەم شوێنە پێویست نییە و ئەم جۆرە دەربڕینە لاوازەیش دوورە لە مۆرکی هەڵبەستەکانی شاعیرمان (کوردی)یەوە.

دوای ئەمانە هەموو، وەک دەبینرێت لەم دەقە بێ جێیەی سەرەوەدا وشەی (هاوارە) لە جێگەی (داد)ەکەی دەقە پەسندکراوەکە هاتووە، کە (داد) بە واتا (عادیل) و لە هەمان کاتیشدا هەمان واتای (هاوار)ەکە دەدات و لەمیش سووکترە لە دەربڕینداو وێژەییانە ترو ئاهەنگ و ساز خۆشترێکە لەسەر زار، (زمان) جگە لەوەی ساز و ئاهەنگی وشەی (داد) لە پاشبەند (سەروا = قافیە)دا هاوئاهەنگ و سازی وشەی (جەللاد)ەکەیە لە هەمان نیو باڵیدا کە ئەمەش پەسەندی و شیاوییەکی تر بە تاکە هەڵبەستەکە دەبەخشێ لەبەر ئەمانە من دەقی (مس، من، گل/ە)ەکەم هەڵبژارد و هەر بە (شیکردنەوە)ی هۆی هەڵبژاردنەکەم دەستم لەم نیو تاکی یەکەمی ئەم پارچە هەڵبەستە هەڵگرت.

لە نیو باڵی دووەمی ئەم، تاکی پێنجەمەدا (کوردی) بەو پەڕی (ئینصاف)ەوە دانی ناوە بە ڕاستی گوتنی کچە دڵخوازەکەیدا کە کەسێکی (جەللاد) نییە و ملی خۆکز گرتوویەکی (داد) خوایە و (مەعشووقە)یشە نەک (مەعشووق) و، ناو بردنی بە (جەللاد) لە تاکە هەڵبەستی یەکەمی ئەم پارچە هەڵبەستە نەریتێکی چاولێکەریی شاعیرانە و هەر بە بەم دان پیانانەیش مافی ڕەوای خودی کچە دڵخواز (مەعشووقە)کەی خۆی لە بیروڕا دەربڕیندا بەڕەوا جێگر کردووە کە (کوردی) لە سەرەتای نیوباڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەدا بە دووپاتەکردنەوەوە

فەرموویەتی: (بەڵێ) و ، ئەم (واتە کچە مەعشووقە)یە ڕاست  دەکات لەوەی دەری بڕیوە.
دوای ئەم دانپیانانە پاک و بێگەرد و مرۆڤانەیە (کوردی) (تەڵە)یەکی خۆی ئاسایی، یا (نالی ئاسایی)یانەی، ناوەتەوە کە لە ژێر سایەی وشەی سادەی سەرزاریدا واتایەکی قووڵ و دووفاقیی شاردووەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە فەرموویەتی:
(درۆزن؟ کلکە میسواکی).
واتە ئەوی درۆزنە هەر تەنیا کلکی میسواکی دەم دانی خۆ پاک کردنەوەکەی خۆی (تێ بێ)، کە ئەم دەقە ئەوەندە پڕو چڕو توند و تیژ و خەست و خۆڵ و پڕ بەپڕە مەگەر ئاوەها (جنێوێک) لە دەست (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) هاتبێ و ئەم جنێوەش دیسان لە (قسەی نەستەق) = (ئیدیۆم = کینایە)ی کوردیماندا بە جۆری (درۆزن بە کلکی بزن) واتە ئەو کەسەی کە درۆزنە هەر تەنیا کلکە بزنێکی تێ ڕۆبێ و بەڵام دەربڕینەکەی (کوردی) لەم قسەی نەستەقەی کوردەوارییەش گەلێ بە هێزتر و جێی خۆگرترە، چونکە لە قسەی نەستەقەکەماندا هەر (کلکە بزن)ێک ئاراستەی (درۆزن) کراوە، بەڵام (کوردی) لێرەدا ئەو (کلکەی میسواکەی خودی درۆزنەکەی) ئاراستەی کونی پاشەوەی درۆزنەکە کردووە کە بەپێسبوونی کلکە میسواکەیشەوە میسواکەکەی لە دەم و ددانی خۆی سووە.
ئەم جنێوەیش ئەگەر چی بەپێی هاتنی تاکە هەڵبەستەکە لەوە ئەچێ کە گوایە کوردی دوا بە دوای بە ڕاستگۆ ڕاگەیاندنی کچە دڵخوازەکەی ئەو کلکە میسواکەیشی تێ گرتبێ، بەڵام نەء تەڵە دانان و واتا شاردنەوەی لە بن وشەدا )یەکەی (کوردی) لەوەدایە کە ئەم نیو باڵی دووەمی تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی کردووە بە دووبەشی لە یەکتر جیاوازەوە کە:
لە بەشی یەکەمیاندا: پشتگیریی گوتەی کچە دڵخوازەکەی خۆی تیا ڕاگەیاندووە.
لە بەشی دووەمیاندا: سەرەڕای  ڕاستگۆیی دڵخوازەکەیشی لایەکی لە درۆزن کردووەتەوە و ئەو جنێوە کەسکوون و پیس و پۆخڵەی بە  درۆزن داوە نەک بە ڕاستگۆ کە سەرەتا و لە بەشی یەکەمی نیو باڵەکەدا کچەی بە ڕاستگۆ داناوە، کەواتە لەم جنێوەدا (کوردی) لەگەڵ کچەکەی نییە کە ڕاستگۆ بووە و مەبەستی لە هەر درۆزنێکە.
ئەم ئاوڕدانەوە لە درۆزنەیش لێرەدا، لام وایە لەو کاتەدا یا لە دەنگوباسی دڵدارییەکەی (کوردی) دا و شەیدایی بۆ کچەکەدا (شتێک) ڕووی دابێ و (کوردی) بۆیە ئەم مەبەستی (ڕاست گۆ) و (درۆزنەی) ڕاگەیاندووە کە بۆ سەرێنی (کوردی) و ئەو لەو دڵداری و لەو ڕوودانی ئەو (شتە درۆیە) ئاگەدار بوون ئەم تاکە هەڵبەستە لەلای ئەوان گەلێ بەهێز تر و جێگیرتر بووە. کە تێی گەیشتوون و بە داخەوە من پێم نەزانیوە چی بووە.
(میسواک) یا (سیواک): لقی جۆرە دارێکە ئەوەندەی پەنجەیەکی  ئەستووری زەلام ئەستوورەو بە درێژایی بستێک دەبێت. ئەو لقەدارە هەر دووسەری ڕێک قرتێنراوەو سەرێکیان لە نووکەکەیەوە بەرەوخوار ئەوەندەی ٢ – ٣ سانتی مەترێکی توێکڵەکەی بەڕێکی لێکراوەتەوە.

ئەو بەشـە بێ توێکڵـەی یا کـرۆکی لقـە دارەکـە ڕیشـاڵ ڕیشـاڵێکی (فڵـچـە) ئاسـاییـیـە کـە (مـیـسـواک) یا (سـیـواکی پێ دەڵێن) ئەو دارەی ئەڵقـەی لێ کـراوەتـەوە، نەمـزانیـوە لە (کوردستـان)دا هـەبێ و وا دیارە لە وڵاتی گەرمدا و بەتایبـەتی لە شاری (مەدینە)ی (حیجاز) و لە سـەرێنی پێـغـەمـبـەری ئیـسلام (د.خ)دا، بـوو ددا پاککردنەوە لـە بەڵغ و پاشـەڕۆکی نێـوان ددانەکان وەک (فڵچەی ددانی ئێستە) بەکارهاتووە و بۆنیشی خۆشە.

لەبەر ئەوەش کە پێـغـەمـبـەر (د.خ)یە بەکاری هێنـاوە و بە تایبـەتی بەر لە دابەسـتنی (نوێژ)دا، بۆیە لای ئیـسـلامـەکـان بـەکارهـێنانی (سـیـواک) بەر لـە نوێژ دابەستن بە سـوننەت دەزانێ و دەیکەن.

لە بەسـەرکردنەوەیەکی ئـەم تاکە هەڵبـەسـتـەدا دەگـەینە ئەو ئەنجـامـەی کە کـچـە دڵخـوازەکە گوتوویە من (جـەللاد) واتە بکوژ، نیم و من سەری خـۆم کز گرتووە، واتە کەسێکی بێ (وەزنگ) و بێ (وەی)م و ئەو هـاتوهـاوارەی دڵداران لە دەسـت هـەر جـوانێکی وەک مـن خـراپی لە خـودی ئێمە و لە منەوە نییە، بەشکو جوانیی ڕوخسار و شـەنگ و شۆخی لەش و لار و چاوی کاریگەر و دڵکێشی ئێـمەوەیە نەک لە خودا ئێـمەوە کە ئـەوانەش کارێکی سروشـتی و دەسکردی خوایین و دەسـەڵات و زۆرداری جـەللادی مـن لەوانەدا نیـیـە کـە دڵداران پێـوەی دەناڵن نـەک سـووچی دڵخواز بێ کە لەم تاکەدا پاکانەی بۆ کراوە.

٦- جارێ و پێشەکیی ئەم تاکە هەڵبەستە بریتییە لە سکاڵا و گازندە و جارِسی دەربڕینی دڵدارێک بەرامـبـەر بە (بـاوک) و (دایک) و (برا)ی خـودی دڵخـوازەکـەی وەک سـەربـاری زوڵم (سـتـەم)ی خودی دڵخوازەکەش بەرامبەر بە دڵدارەکەی.

ئەم سکاڵاو گـازندە دەربـڕین و جـارِسـیـیـە بێگومـان، دڵخـوازی دڵدارەکە (کچ یا ژن) بووە واتە (مێینە بووە) کە (کوردی) لێی دواوە.

کـە هـەرگـیـز ڕووی نەداوە، ئاوا بـە ئاشکرا دڵدارێک سکـاڵاو گـازندەی خـۆی بەرامـبـەر بە کەسـوکاری دڵخـوازێک ڕاگەیاندبێ کە (کوڕ)بێ کە ئەمەش (قوڕ) دەدا بە دەمـی نووسـەری ئەو سـەرچاوە تێنەگەیشـتووانەدا کە (کوردی)یان بە (نێر خوازی) و بـە نارِەوایی تاوانبار کردووە کە ئەمـەتا (کوردی) ئەو گـازندە و سکاڵاو جـارِسـیـیەی خـۆی لە هـەڵبـەسـتیدا بڵاوکردووەتەوە، ئەمە بۆ سـەدان دەچی کە ئـەم هـەڵبەسـتـەشی دەسـتاو دەست و دەمـاو دەم و ئەم کەشکۆڵ و ئەو کەشکۆڵ و ئەم یانەو چاپکراوی کردووە.

هـەڕاکـەم: بە واتە ڕابکەم، هـەڵبێم بەڵام (هەڕابکەم)ە لە کەشکۆڵەکـانـدا بە ڕێنووسـی کۆن و لە شـێـوەی (هـراکـەم)دا نـووسـراوە کـە لە هـەمـان کـاتدا ئەم شـیـوە کۆنە جگە لە (هـەڕاکـەم) بە (هـەراکـەم) واتە (هـەراو هوریا بکـەم) و بیکەمـە ناڵەو فـوغـان کـە هـەردوو جـۆری (هـەڕاکـەم) و (هـەڕاکـەم)یش بۆ ئـەم تاکـە هـەڵبـەسـتـە دەگـونجـێن و، واتای تەواوی خـۆیان دەدەن، ئەمـەش (جیناس ئارایی)یە ئەم تاکە لە (مس، عن، ن، گل/٦)دا شەشـەمینە و لەوانی تردا چوارەمینە.

له دەست (ن، نم/ ١، با، گ/٢، گ٣، س): له ڕق.

هەڕاکەم (ف، نم/١، ب١، گ/٢، گ٣، س): بگریم.

داکی (ف، نم/ ١، با، کم، گ، ٢، گ٣، س): دایکی. ئەمەش لەنگی ئەدا بە هەڵبەستەکە لەنگ و کێشەکەی قورس دەکات.

٧- (گەلە): بە واتە، کۆمەڵ و دەستە بەڵام هی سەگ.

صۆفی(سۆفی): بە واتە پەیڕەویکاری (تەریقەت = طریقەت)ە بەڵام مەبەستی لەوانەیانە بەسەر زاری و درۆ، خۆیان بە خواناس دەرخستووە و بۆیە لە وتەی (گەلەی صۆفی)دا کردوونی بە (سەگ). درۆزنەکەی تاکی پێشوو مەبەست لەمانەیش

میرات: ئەوەیە کە پاش مردوو بەجێ دەمێنێ و کەسوکارەکەی دوای ئەو بەپێی دەقی (ئاینی) وەیا (یاسایی) بەسەر خۆیاندا بەشی دەکەن.

ئەم میراتگیرییەی، مەبەست لەوەیە کە ئەو سایە بە هۆی (باو)ی هەردوو تەریقەتی (قادری) و لە دواترا (نەخشی)یەوەیە کە سۆفییە ساختەچییەکانیان بە خراپکاری و درۆ و دەلەسە (باو)یان لە (فەقێ) و (مەلا) سەندووە و کەوتوونەتە پێشێلکردنی ئەو دەقە ئاینییانەی کە مەلاو فەقێ ڕایان گەیاندوون، وەک بڵێی بوونەتە میراتگری فەقێ و مەلا.

لە لایەکی تریشەوە وەهای بۆ دەچم کە بووەتە هۆی ئەوەی کە (کوردی) لە تاکی پێنجەمی ئەم پارچە هەڵبەستەدا لە درۆزنیی ئەوانە دواوە کە کلکە سیواکەکەی ئاراستە کردوون، کە لێکم دایەوە لەوانەیە ئەم بابەتی (درۆزنی)یە لە (ئاکامی ڕوودانی شتێکەوە) بوو، کە وەک، کەمە (ڕوونکردنەوەیەک لێرەشدا لەو درۆزنییە و لە ڕوودانی ئەو شتە نزیک بووەتەوە، وەیا دەشێ درۆی ئەوانە بوویێتە هۆی بەرپەرچدانەوەی (خۆی – واتە: کوردی)لەلایەن ئەوانەوە کە کوردی خۆی بە (فەقێ)یەک چواندووەو (گەلەوڕەوە سەگی) ئەو سۆفییانە بوونەتە میرات گری (کوردی)، یا ویستوویانە ببنە ئەو میراتگرە کە یەکێکیان هاوبەشی بووە لە خۆش و بیستنی کچەکەدا.

وەهایشی بۆ دەچم ئەو چەلەحانێیەی سەرێنی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) لە نێوان (بەرەی مەلایان) و (بەرەی شێخان) و تەریقەتەکەیاندا ڕووی داوە کە دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، سووکە نیشانەیەکی لە بەرهەمی شێخ ڕەزایەکەیدا بۆ کردووە.

دەشێ ئەو چەلەحانێیەی سەرێنی شێخ ڕەزا درێژەکێشانی هەمان ڕێکنەکەوتن و هاتنی گەلەی سۆفی بۆ میرات خۆری (فەقێ)یان کە (کوردی) لەم تاکەیدا لێی دواوە. ئەو ڕێکنەکەوتن و چەلەحانێبەش لەوەوەیە کە هەرچی وشەی مەلایانە خوای مەزن بەخوای هەمووان دەزانن و لایان وایە هەرچی خواستـرا بە دەنگی هەر کەسێکەوە دەچێت، بەڵام هەرچی وەک بەری سۆفییان کە مەبەست لە (تەریقەتەکان) واتە پەیڕەویکارانی (تەریقەت) بەر لە خواو هەر کەسێ هاوار دەکەنە شێخەکەیانی و یاریدە لەو دەخوازن و ئەم بیرە فەلسەفییەش لە زۆر

کۆنەوە لە ناو ئیسلامەتی هەبووە و باوە، کە سەرێنی شێخ ڕەزاو دواتریشی زۆر و ستەمی بەرەی شێخان بەناو شێخێتی و تەریقەتەوە لە مێژووەکاندا لێی دواون و (مەحوی) و کەمێکیش شێخ ڕەزا و بە زۆری مەلا حەمدوونە کوێرە لە چامە درێژەکەیدا لەسەر شێخ (سەعید)ی باوکی شێخ مەحموودی حەفیدە ئەم ڕاستییەی ناو مێژووەکان بە وردی لەو چامەیەدا ڕاگەیەنراوە کە من نوسخەیەکی زۆر ڕاست و تەواوی ئەو چامەیەم لەلایەو، پەڕاوی (مەلا حەمدوونی زانا و بلیمەت)دا نووسیومە کە ئەو پەڕاوییە من و (مامۆستا محەمەد عەطای مەلا ڕەشیدی دورمان کوت) دامان ناوەو لە ڕێگەی لە چاپدانیدایە. کە ناوەڕۆکی ئەو چامەیە بە کردەوە بیروڕای تەریقەتی (قادری)ی شێخانی (سولەیمانی) ئاشکرا دەکات و پەردەی لەسەر هەڵدەماڵێ و هۆی (جنوکی)شی دەخاتە پاڵ.

ئەوەش هەر هۆی ئەو هەموو پەلامارەی (مەحوی)یە بە ناوی (مەلا)وە دژی (شێخ سەعید) بە ناوی (شێخەوە)ی لێ کەوتووەتەوە کە دیوانەکەی (مەحوی) سیخناخە لە پەلامار و هێرشە ڕەواو ئاینی و مرۆڤایەتی و کوردپەروەرییەی (مەحوی).

مەعلوومە: ئاشکریە، ڕوونە، زانراوە، شتێکی دیارییە.

وەحشی: کیوی، گیانداره دڕندە کێوییەکان (کوردی) مەبەستی لە (فەقێ و مەلایە) لە چاوی سۆفییەکانەوە کە لە سەرەتای ئەم تاکی حەوتەمینەدا دەستنیشانی کردوون و (کوردی) خۆی بە(فەقێ) یا بە (بەرەی مەلایان)ی ئەو سەردەمەی بە مردووداناوە.

لە چاو زۆر لەو بەرەی سۆفیانەدا کە لە هێرش بردندان بۆ سەر لاشەی ئەو فەقێ و مەلایانە وەک گەڵەی (سەگ بۆ سەرلاشەی وەحشییە مردووەکە) یادەشێ (سۆفییەک) وەک (کوردی) دڵی چووە بەو کچەدا و بە هۆی ئەوەوە ڕەشەگەڵی ئەوسایە لە سادەییانەوە ئەو سۆفییەیان بەلاوە لە (کوردی) لە پێشتر بووبێ و کچەکەیان دابێ بەو سۆفییەو (کوردی) لەو دڵدارییەدا وەک دڵداری جاری کەی لە هەڵبەستێکیدا ڕوونم کردووەتەوە سەرنەکەوتووە و ئەمەش بووەتە هۆیەکی ژن نەهێنانی (کوردی).

لاک: کەلاش، لاشەی بێگیان وەک فەقێ مردووە وەک وەحشییەکە کە سەگ ئەچنە سەر (لاک)ەکەی.

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (نم/١، با، گ٢، س، گ٣)دا: حەوتەمینەو لە (ف)دا شەشەمینە لەم پارچە هەڵبەستەدا.

گەلەی (مس، عن، ن، گل٦، ف): گلەء – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە کە لە هەمان کاتدا بە شێوەی (گلەی = گلەیی کردنی)یش دەخوێنرێتەوە کە بۆ ئەم تاکە هەڵبەستە دەگونجێ و بەجیناس ئارایی و یاری بە وشەکردن دادەنرێ کە لەساماناداری زۆر و زەبەنگەی زمانی کوردیمانەوەیە.

گەلەی (با، دەسنووسەکەی – بیمار ، نم/١، ب کم): گلی.

گەلەی (گ٢، س، گ٣): گەلی – کە ناگونجێ – چونکە سوفی (گەل) نییە.

گەلەی (جلی): کلی – کە ئەم (گاف) ی، خاڵ لەسەر و لە ڕێنووسی کۆندا (گ)ە.
میراتی (جلی): میرات.
خۆ (جلی): هەم
دەچنە (جلی): دینە
٨– ئەم تاکە هەڵبەستەش تەواوکاری تاکە هەڵبەستی پێشووە.
حەیا: ئابڕوو، شوورەیی.
حەیای بردی: مەبەستی لەوە بووە کە: (سووکی کردی، ترۆی کردی).
شەراب: بادە، مەی – ئەو (سرکە) ترشاو وگەڕاوەیەیە کە لە گوشینی ترێ یا خورما دروست دەکرێ و بەخواردنەوە سەرخۆشی دەدا .
واعیظ: پەندێر و ئامۆژگاریکار – مەبەستی لەبەدرۆ خۆی بەزانای ئیسلامی دەردەخەن و لە ڕاستیدا فریان بە ئیسلامەتییەوە نییەو، لەوانەیە هەر ئەو سۆفییەی تاکی پێشووی مەبەست بووبێ
مەنع: قەدەغە، بەرهەڵست، ڕێ لێگرتن، نەهێشتن.
زاهید: مەبەستی لە بەدرۆ بە ئیسلام خۆ دەرجەرانەیە کە زاهید لە کردنی خراپە و نافرمانیی ئاینی خۆی دەپارێزێ (گۆشەگیر) لەوە دەچێ کە بە (شەراب)ەکە مەبەست سەرخۆشیی دڵداری ئافرەتە کە وەک لە پێشدا نووسیم لە دڵداری کردنەکەی
(کوردی)دا بۆ ئەو کچە بەشدار بووبێ و ئەو (واعیظ)ە لە نەزانیی خۆی ئابڕووی تیا چووبێ و بۆ شاردنەوەی ئەو ئابڕووچوونە کچەکەی درابێنی بە ڕادەیەک ترۆ بووە، تەنانەت کابرای (زاهید)یش وریای کردووەتەوە لەو دڵدارییە (مەنع)ی کردبێ.
هەوێ: پیاوێک لە یەک (ژن) زۆرتری هەبێ، هەرژنێکیان هەوێی یەکترین و لە یەکیان خۆش نایەت.
هەوی ساری: باری بوونی هەوێیە، بەسەر هەست و ناخی دەروونی ئافرەتەوە و (کوردی)یش لەم تاکەدا بە خراپ ناوی بردووە.
بەدگۆ: خراپبێژ، ئەوەی کە زمانی هەر بە لای خراپە گوتندا بووڕێ
بەدناک: ئەم وشە لێکدراوە، دوو کەرتی (بەد) و (ناک)ە کە وەک لە پێشەوە نووسیم (بەد) بە واتە (خراپ) و، (ناک) واتە (خودیی) (زات)ی کەسەتی. کەواتە (بەدناک) بە واتە بەد خودی، بەدزات، بەد سروشت. کە دوورنیە ئەم ڕەوشتی (بەدگۆیی) و بەد سروشتی)یەی (واعیظ)ەکە لە هەوێ سارییەکەیەوە بێ کە ئەویش و (کوردی)یش هەردوو لە دڵدارییەکەیاندا شەیدای یەک کچن و گوایە (کوردی) هەوێی ئەو (واعیظ)ە بێ.
وەیا لەم تاکەدا مەبەست لەوەبێ کە هەردوو (واعیظ) و (زاهید) لەوەدا کە بە درۆ خۆیان لە ئیسلام خواناس و خواپەرست دەردەخەن و لە ژێرەوەش دووربن لەو خۆ دەرخستنەیانەوە و

ئەمجا هەردوو لەو ڕێبازەیاندا دوو (هەوی) و (هەوی ساری) خراپ و بەڵام (واعیظ)کەیان کە ئامـۆژگـاریی کـردنی کـردووەتە پیـشـە، (کـوردی) ئەوەی لـێ بە (چەنەبازی) دانابێ، لەبەر سروشتی خۆیەوە کە (واعیظ)ە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (گل/٦، ف)دا پێنجەمین و لە (مسن، عن، ن، جلی، وە نووسینەکەی – بیمار)دا حەوتەمینە و لە سەرچاوەکانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
دەکا (جلی): ئەکا.
واعیظ (گل/٦، ف، ب و، نووسینەکەی – بیمار): بالله – کە مەبەست لە (ئیلاهـ)ە.
کەوا مەنعت دەکا (ن، گل/٥): با منعت بکم.
کەوا مەنعت دەکا (ب و نووسینەکەی – بیمار): گر منعی نکا.
هەوێ ساری (ب و نووسینەکەی بیمار): هواساری.
هەوێ ساری (جلی): هوی.
خراپە (جلی): خرابە.
بەدگۆی (جلی): بدکوی – ڕێنووسی کۆنە.
حەقتە (ف): حق.
بەدناکی (ب، و، نووسینەکەی بیمار): وحش ناکی و، لە (ف)دا: بەدتاکی.
بەدناکی (جلی): وخش ناکی.
٩- بۆچوونەکانی من لە هاوبەشیکردنەکەی (واعیط) لە خۆشەویستیی ئەو کچەدا کە (کوردی) شـەیدای بووە بـە ڕوونتـر دەردەکـەون بۆیە (کـوردی) لەم تاکـەیدا ڕای گـەیاندووە کـەوا لەو سەرسامە، ئاوەها چورتمی جیهانی ئاوقای بووە و، کۆتاییی بەم تاکەو پارچە هەڵبەستەکەی هێناوە و پرسـیـویەتی تۆ بڵێی هـەر لە یەکـەم ڕۆژی ژیانمەوە بەشی من نـاتوانی و عـەمبـاری دانرابێ.
عەجەب: ئای بە سەرسامی کردنەو، مەبەستی لەوەیە کە شایانی ئەو ناخۆشییانە بووە.
دەستەوگرێبان: دەستەو یەخە، دەستەو بەرۆک، ئاوقا بوون.
(کوردی): لەم هەڵبەستەدا کە شاعیرمان (کوردی) بە نازناوی خۆی داناوە، بەڵگەی ئەوەیە کە هەڵبەستەکەی لە (کوردستان)دا بە گشتی و تایبەتی لە شاری سولەیمانیدا داناوە، کەواتە ئەو کـچـەی ئەم هەڵبـەسـتـەی بەسـەردا هەڵداوە، کـچـە کـوردێک بووە، کێ بووە ئەم داسـتـانی دڵدارییەیم بە وردی لەلاساغ نەبووەتەوە.
بە لای دونیا: چوتنم و تەگەرەو قۆرتی جیهانی.
قیسمەت: بەش، ئەو بەشەی کە خوا بۆ هەر کەسێکی بڕیارداوەی مەبەستە، ئەمەش بیروبڕوای فەلسەفەی (قەدەری) واتە بڕیار لەسەر دراوی لەلایەن خواوەیە.
ئەمـەش لە هەڵبەسـتی (کـوردی)دا ئەوەندە زۆر هـاتووە کە لێکۆڵینەوەیەکی درێژ و تێروتەسـەل

هەڵدەگرێ کە ڕاسپاردە و هیوام بۆ کردنیەتی و هەر ئەم فەلسەفەیەیش لە هۆنراوەی هۆنەرانماندا زۆرە.

عیجز: ناتوانی، لە تواناشا نەبوون، لە وزەدا نەبوون، کەم وزەیی، بێ وەرەیی.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوە چاپکراوەکانی وەک (نم/١، کم، گ٢،س ،گ٣)دا شەشەمینە و لە (ف)دا حەوتەمین و لە (مس، عن، ن، گل/٦،ب، جلی و نووسینەکەی – بیمار)دا، نۆیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە هەموو سەرچاوەکانیش دواتاکە.

ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکەیە لە سەرچاوەکانیدا:

گرێبانم بووە کوردی بەڵام دونیا (ب، نووسینەکەی بیمار): کریبانی او گرتوومە ئەی کوردی.

دەستە و (نووسینەکەی بیمار): دەست و

گرێبانم (جلی): گریبانی

مەگەر قیسمەت بوو بۆمن ڕۆژی (ب، دەسنووسەکەی بیمار): مەگەر هەر قیسمەتی خۆم بوو لە.

بەڵای دونیا (ف، نم/١، کم، گ٢، س، گ٣): لە دونیادا.

ئەگەر چی لەم پارچە هەڵبەستەدا بە هۆی گۆڕانەوە هەندێ شێواویی تێکەوتووە، بەڵام بە تێکڕایی، یەکێکە لەو هەڵبەستانەی کە زۆرترین مۆرکی (کوردی)ی پێوەیە.

هەروەها چەند جوانکاری و یاری بە وشەکردن و شاردنەوەی واتا لە ژێر وشەی ئەوتۆدا کە، ووشەکە و مەبەستەکە بە سەرزاری لەیەکەوە دوورن و بەڵام توانایی کوردی لە هونەری وێژەی کۆن (کلاسیکی)دا ڕەنگ بۆ چێژێکی وەستاکارانەی کردووە، بەبەر ئەم هەڵبەستەدا کە لایەنێکی ژیانی (کوردی)مان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

ئەگەر چی ئەو ڕوونکردنەوەیە بە تەواوی نییە و من بۆچوونی خۆمم کردووەتە پتر ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنەی ژیانی.

١٠٠

### ناوی عەشق

١- ناوی عەشق، هەرگیز لە دونیادا نەبووبا؛ کاشکی
(تۆ)ی لە بۆ دەرمانی چاو، نەبووایە پەیدا، کاشکی
٢- هەر لە ئەووەڵ، (قورقوشم) بکرایە چەشمەی مەنبەعی
ڕیشەیی (گیا)شی، کە نەڕوایە لە (صەحرا)، کاشکی
٣- کەس لە: (ڕەویە)ی عەشق و ڕێگەی عاشقی (موخبیر)نییە
شێت و شەیداتر ببووویایە؛ (زولەیخا) کاشکی
٤- (حاڵ)ی (مەجنوون)، خۆ؛ لە ڕێی عەشقا؛ ئەبوو غەیرەز ستەم
عومری، (صەرف)ی (بوت) دەکرد، لە جیاتی (لەیلا) کاشکی
٥- (عەشق)؛ ئەگەرچی؛ (ئەصل)ە. (دڵ)؛ مایەی فەساد و فیتنەیە
ڕیشەکەن، بایە، لە سینەم دا، بە (مەودا) کاشکی
٦- (دڵ) لە (سینە)م دا نەماوە، (چاو)؛ گرفتاری دەکا
کوێر و نابینا بوومایە، ئەی خودایا!!، کاشکی
٧- (کوردی)!!، ئەو وەختەی کە؛ زانیت: (چاو) و (دڵ) دوشمن بەتۆن؟
خۆت (کەنار) گرتایە، تا؛ نەبووایی ڕیسوا، کاشکی

---

١- عەشق: ئەڤین، ئەوین، دڵداری، خۆشەویستی و بەدڵاچوونی هەرشتێک و شەیدابوونی تاڕادەی گیان لە ڕێگەیدا بەخت کردنیش.
دونیا: جیهان، گێتی.
کاشکی: خۆزگە، خۆزیا، خۆزی، ئەوپەڕی ئاوات خواستنە.
تۆ: تۆو، ماک و بنەمای هەر شتێک کە هاوچەشنی خۆی لێ بەرهەم بێتەوە.
تۆ: مەبەستی لەوەیە کە ڕووی دەمی تێ کردووە، وەک دڵخوازەکە بێت، تاکو تەنانەت بۆ دەرمانی چاویش تاقە تۆزێک نەبینرایە نەوەک گیرۆدەی دەرد و جەخاری ئەڤین ببێت و ئاواتی نەبینینی ئەو شتەی خواستووە کە لە هەمان کاتدا بە (تۆ) واتە (ئەتۆ)، یا (خودی خۆت) ناوی بردووە.

دەرمـانـی چاو: ئەو مـادەیەیە کە دەکرێتـە چاوەوە، بۆ چارەی چـاوکولکی، نەخـۆشـی و دەردی (چاو): چاویەشـە، کولکی چاو.

دەرمـانـی چاو: ئەمە لە (قسـەی نـەسـتـەق)ێکی کوردەواری واتە (ئیـدیۆم = کینایە)یەکەوەیە، کە مەبەست و، واتا، لە (کەمێتی)یە، چونکە (دەرمانی چاو) یەکجار کەمی دەکرێتە چاوەوە.

سـەرچاوەی ئەم پارچە هـەڵبـەسـتـە (عن، ن، گ٣)یە کـە من (گ٣)یەکـەیـانم کـردە بنکەی لێکۆڵینەوەی بە پشتیوانیی دوو سەرچاوەکەی تر.

(بۆنە)ی ئەم هەڵبەستەم پێ نەزانیوە کە کەی و بۆچی و بۆ کێی هەڵبەستووە.

باری ئەم هەڵبەستە: ئەگەرچی (لێرە) و (لەوێ)ی ئەم هەڵبەستەدا چەشنە شێواوییەک، هەست پێ دەکـرێ و لە ڕووی زارگـوت (لەهجـە)ی داڕشـتنەکـەیەوە. بەلای (مـوکـریانی)دا چووە، کـە دەبوو بە لای (سـنەییـانە)دا بچـوایە، بەڵام هێـشـتـا مـۆرک و چێـژ و شـێـوەی هەڵبـەسـتی (کوردی)ی پێوەیە.

عەشق (گ٣) عیشق.

٢- هەر لە ئەووەڵ: هەر لە سەرەتای پەیابوونی (ئەڤین = عەشق)ەوە.

قورقوشم: جۆرە کانزایەکە لە ژێر و لە ناو خاشاکی (گۆی زەمین)دا پەیا دەبێ وەگەلێ سوودی پزیشکی و پیشەسازیی لێ وەردەگیرێ.

جاران (ستەمکارەکانی سـەر وڵات) قورقـوشمی تواوەیان داڕشـتووەتە ناو (چاو) یا (گـوێ) یا (ناو دەمەوە)، وە نەیارەکانی خۆیان بەوە لەناو بردووە.

یا هەر برینێکی کە بە (چ) دەرمانێک گۆشتـەوزوونی نـەهێنابێ، واتە بووبێتـە (تیـراوێ)، ئەوا دیسان لە چوار لای ئەو برینەوە قوڵکیکیان بە (هەویر بەستێک) دروست کردوە و، قورقوشمی تواوە کـراوەتـە ناو ئەو (کـۆڵ)ە هـەویرەو، دەمی برینـەکـەدا. ئیـتـر هەرچی ڕزیویی و (گـۆشت پارە)ی دەوری برینەکە بووە، سووتاوە و کەوتووەتە سەر ساغی و، ئەو سـایە لە نوێوە، برینەکە دەرمان کراوە و چاک بووەتەوە و، یا گومان لە (ترسان) لە هەر منداڵێک کرابێ، هەندێ ترش لە جـامێکدا توێنـراوەتەوە، ئەو جـامـە لەسـەر سـەری منداڵەکە ڕاگیـراوەو بـەدەم گوتنی (ئەوە چی ئەکەی، ترسی ئەم منداڵە دەردەکەم)ەوە. قورقوشـمی تواوە ڕۆکراوەتە ناو ترشاوی جامـەکەوە و قـورقـوشـمـەکە لـە ئاوەکـەدا (چ) شێـوەیەکـی گرتـبێ، گوتوویانە ئەم منداڵە لەو شـتـە ترسـاوەدا هـەندێ لەو ئاوەیان دەرخـوارد داوە و بەم چارە (بەکردەوەی) دەروونی (نەفسـی)یە، ئەو منداڵە لە نائارامی ڕزگار بووە وە ئەو تواندنەوەی قورقوشمە بەسەر ئاوەکەدا ترسەکەی بنبڕ کردووە.

هەروەک تـواندنـەوەی یـەکـجـار زۆری (قـورقـوشـم) و بـۆ مـاوەیـەکی ئەوتـۆ کـە هـەتا هەمـوو قورقـوشمـەکە ببێ بە (تۆز = خاکە)یەکی زۆر وردی سـپی ئەو (تۆز) لە کوردەواریدا (سپیاو)ی پێ وتراوە و بۆ گۆڕینی ڕەنگی ڕوخسـاری (کچ و ژن) وەک جـۆرە ئارایشتێک بەکارهاتووە کە چاکترین و بێ زیانترین (سپیاو) بوو.

ئیتر (کورد) و (قورقوشم) له گەلایەتیدا، میانە و بۆنەی زۆرتریشیان هەیە.
(کوردی)ی هۆنەریشمـان، ئەوەندەی سـزای بێ ئەنجـام بەدەست دڵداری (عـەشق)وە دیتـووە و، چەشتووە، ئەوەتا خۆزگەی خواستـووە کە هەر لە سـەرەتای پەیابوونی (عەشق)ەوە قـورقوشمـی تواوە کـرابایە ناو سـەرچاوەی ئـەو (لێ هـەڵقـوڵاندن)ی دڵدارییـەدا و، (کـانی)یەکـەیان کـوێر و وشک بکردایەتەوە کـە: ئیـتـر مـرۆڤ لە دەست ئـەو چەشنە (عـەشق)ە بـەسـزا و ئازار، دەرباز بووایە.
ڕیشـە: ڕەگ و ڕیشـاڵی (ڕوەک)- (کـوردی)مـان ئەوەندە داخ لە دڵی (ئەڤین) بووە، ئـەوەتا هەتا تەنانەت، ئـەوەی خـواسـتـووە کـە ڕەگ و ڕیشـاڵی نەک دار و درەخت، بـەشکو هـی گـژوگـیـایش وشک ببێـتـەوە و، نەمـێنێ واتە: ڕەگ و ڕیشـاڵی گـیـایەکی وەک (دڵداری و ئـارەزوومـەندی ئەوە بووە بیابان واتە (سەحرای) دەروون چۆڵ بێ لەو ڕەگ و ڕیشاڵی گیای (ئەوین = عەشق)ە.
لە خوێندنەوەی ئەم پەڕاویەدا دەردەکەوێ کە چەند پارچە هەڵبەستێکی باڵای تری بەتایبەتی لەسـەر (عـەشق) و پێـوەندیی خـراپی بەرامـبـەر، خـودی خـۆی: (کـوردی) دەخـوێندرێتـەوە، جگە لـەوە کـــە لـەم یـا لەو هـەڵبــەســـتـی تردا، بـەداخـــەوە لـە (دڵداری) عـــەشـق دواوە و باسـی ستـەملێکراویی و مـاف خـورای (دڵدار= عـاشق)ی ڕاگەیاندووە و سـەر و گـویلاکی (دڵخـواز = مـاشقـە)ی کوتـاوەتەوە کە بەرامـبەر بـەدڵدار و دڵخواز ئەوەندە دڵڕەق و سـتـەمگەر و بێ بـەزەیی بووە.
چەشمە: سەرچاوە ئەو شوێنەی کە ئاوی کانی و کارێزی لێوە دەردەکەوێ.
مـەنبـەع: ئەو شـوێنەی کـە خـودی (کـانی)ی لێ هـەڵدەقـوڵێ و بە (گونج) یا بە (جـۆگـە)ی سـەر داپۆشـراودا لە دوورە دەسـتـییـەوە، دەهێنرێتـە، بەردەست و، ئەوە (کـارێز)یشـی پـێ دەڵێن و، مەبەستی لە (چەشمە) و (مەنبەع)ی عەشقەکەیە.
چەشمەی مەنبەعی (ن، عن): چەشمە و مەبیەعی.
گیاشی، کە (گ٣): گیاشی- ئەمەش کورت و لەنگە لە کێشدا.
لە صەحرا (ن) لدلدا.
٣- ڕەویە: تێڕامـان، بیـر لێ کردنەوە، چوونە ئەندێشـەوە، کە لـە (گ٣)دا ئەم وشـەیە بە: (کـردار و ڕەفـتــار)ی لێک دراوەتەوە کــە ئەم لێکدانـەوەیەی (گ٣) لـە ڕووی (مـــاددی)یەوە نزیکاتـی بە وشـەکەوە هـەیە نەک لە ڕووی (مەعنەوی) و، مەبەستەوە.
(عـەشق) و (ڕێگەی عـاشـقی) وەک لە هـەڵبـەسـتی تری (کوردی)دا هـاتوون، دوو شـتی جـۆرە جـادوویەکی کـە هێـشـتـا نـهێنیی ئەو جـادووە پەی پـێ نـەبراوە و (کوردی) لـە داخـی دەروونـی خـۆیـەوە (زولەیخـا)ی ژنـی (عـەزیز)ی مـیسـری بەیاد کـردووەتەوە کـە دڵی چووە بە (حـەزرەتـی یووسـف)ی بەندە و زەرخـریدەیدا و پێی گـوتووە دەک خـۆزگـە ئـەو (زولەیخـا)یە کـە ڕێگەی (عـەشق)ی گرتووە و، گەلێ شێت و شـەیداتر بـووایە کـە ئەو هـەڵەیەی کردووە بـووەتە عـاشق،

ڕێگەی عەشقی گرتووە کە ئەم بابەتی داستانی (یووسف) و (زولەیخا)یە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بەوردی هاتووە و (سوورەت)ێکیشی بەناوەوە هەیە.

جگە لەمانە (کوردی) وەک لە زۆربەی سەرچاوە (دەمی)یەکانمم. بیستووە ئەم داستانەی هەڵبەستووە بەناوی (یوسف و زولەیخا)وە بەکوردی و بەداخەوە دەستم نەکەوتووە.

٤- حاڵ: بار، چۆنێتی و مەبەستی ژیانی (مەجنوون)ی عەرەبی دڵداری (لەیلا)یە کە بەبێ ئەنجام دڵداری لەیلا بووە و بەناکامی مردووە.

مەجنوون: ئەگەر چی لە ڕووی زمانییەوە واتە: (شێت) و (شەیدا)یە. بەڵام مەبەست لە (مەجنوون) (عاشقی لەیلایە). کە وەک لەم نیو باڵییەی یەکەمی سەرەوەدا ڕاگەیەنراوە هەر تەنیا ناکامی و زۆر و ستەم لێکراوی، بەشی بووە.

عومری صەرفی بوت دەکرد: مەبەستی لەوەبوو کە مەجنوون خۆزگە تەمەنی خۆی لە ڕێگەی بوت (بت) پەرستیدا خەرج دەکرد کە بەلای کەمەوە (بتپەرستی) ڕێبازێکی ئاینی بووە و پەرستنی ئەو (بت)ە کە ئاسوودەییەکی دەروونی و ئارامی بەخشیوە بە پەرستەرەکانی، بەڵام وەک لە پێشەوە نووسیم (مەجنوون) لە خۆشەویستییەکەی (لەیلا)یدا هەر بەخەم و خەفەتەوە ناڵاندوویەتی لە ژیانیدا.

لەجیاتی لەیلا کاشکی: ئەم خۆزگە خواردنەی کوردی بۆ ئەوە بووە کە لە شوێنی (ژیان سەرفکردنی مەجنوون)دا لە ڕێگەی خۆشەویستیی (لەیلا)دا، بتپەرستی کردنی گەلێ چاکتر بووە لەوەی کە بەناکامی و بەنەگەیشتنی بە (لەیلا) وەک گیاندارێکی کێوییەکان شێت و شەیدایانە، لە چۆڵ و بیاباندا و بەغەمبارییەوە، بێکەس و تەنیا و بێ ئەنجام سەری ناوەتەوە.

٥- کوردی (کەسایەتییەکی) زانا و تێگەیشتوویەکی ورد بووە کە ئەوەتا لێرەدا (باری عەشق) و (هەڵوێستی دڵ)ی لەم نیوەی یەکەمی تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا، لێک جیا کردوونەتەوە، کە (عەشق) بارێکی شەیداییە و لە ڕێگەی هەموو مرۆڤێک و بگرە گیاندارانی تریشدایە، کە هەموو (عەشقێک) هەر بەرامبەر بە (جوانێک) نییە لە ڕێگەی چێژ و خۆشیی بەیەکگەیشتنی جیهانیدا، بەڵکو بوونی عەشق لە هەموو گیاندارێکدا مایەی تاوان و گەیشتن بەکامی دەروونیدا وەک خۆشەویستیی خوای مەزن و، پەرستنی، کە بەدرێژاییی ژیان لە کڵپە و گڕسەندندایە و مرۆڤ بەرەو پاکی و چاکەی هەرچی سوودی مرۆڤایەتییە ئاراستە دەکات و، ئەو سایە هەرکەسەش ڕێز لە مافی بەرامبەرەکەی دەگرێت و دڵ ئازاری لە نێوانی نامێنێ و فەلسەفەی ڕاستی ژیانیش هەر ئەوەیە لەم جیهانەی کە تەمەنی کورتی تیا بەسەر دەبرێت و هەموو ئاینە خواناسییەکان و، ڕێبازە ڕەوشت بەرزییەکانیش، ئەوەیان مەبەستە و مژدەی بەهەشتیان بەرامبەر بەوە داناوە. هەر هیچ نەبێ ئەوانەی ئەم عەشقە (ئەسڵە) ڕێگەیان بێ، بەلای کەمەوە بەدەروونێکی شادمانیەوە، سەر دەنێنەوە بەڵام هەرچی وەک: ئەو (عەشقە)یە کە بە تێچوونی دڵ، لە (جوانێک) لەوانەیە کە هەر بەوەندەوە نەوەستێ و، ئەو دڵە بچێتە جوانێکی

تر و، تر و.. تاد.
که له ئەنجامدا ڕوشتەی چاک و، پاکی کۆمەڵایەتی و، خێزان پێکەوەنان، نەپچڕێت ژیانی مرۆڤیش لەو لایەنەوە ژیانێکی کورد وتەنی: (تکە و بەرانی لەیەکتری بەربوون) بەرپا دەبێت و ڕوشتەی خزمایەتی له نێواندا گوم دەبێ و لەناو دەچێ و، هەر بۆیە (کوردی) ڕایگەیاندووە کە (دڵ) واتە (دڵداری = عەشق)ی دڵ: (مایەی تێکچوون و شێواوی و گەندەڵ بوون و ئاشووبەیە = (فەساد و فیتنە).
ئەوەتا (کوردی) بەڕوون و ڕەوانی خواستیار و کاشکیخوازی، ئەوە بووە کە ئەو (دڵ) ئاوەهایە لە ناو سنگیدا هەر لە بن ڕیشەکێش کرابایە و ڕەگ و ڕیشەی (دڵ)ی وا لە (لە سیدا) نەماوە کە بە (موودا)ی لاتیژەکە تیغ هەڵبکەندرایە.
ئەم تاکەش لە سەرچاوەکانیدا چونیەکە.
٦ و ٧- وەک ڕام گەیاند (کوردی) هەڵبەستەکانی لە تێگەیشتنەوەن، بۆیە نەی دەگوت، من کە دڵم تووشی دەردی عەشق بووە و هەر لای دڵخوازەکەیەتی و لێرەدا زۆر بە وردی لە بابەتەکە دەدوێ و تاوانی ئەو (دڵ لە سینەیدا نەمان) و ( لەدەست چوونە)ی بەوەی کە هەر بەلای دڵخوازەکەیەوەیە، ئەو وتانە هەر بەتەنیا ناداتە پاڵ (دڵ) بەشکو لەوە گەیشتووە ئەگەر (هەستی بینین) نەبووایە کە لە ئەندامی (چاو)ە ئەوا (دڵ)ی بەو جۆرە گرفتار نەدەبوو، کەواتە تاوانەکەی داوەتە پاڵ (چاو)یش لە نیو باڵی یەکەمیدا.
لە نیو باڵی دووەمیدا (کوردی) لە تۆڵەی ئەو تاوانبارییەی (چاو)دا و لە نیو باڵی دووەمی تاکی پێشوویشدا لە ناخەوە، لە خوای خواستووە کە کوێر بووایە، بەڵام نەک کوێرێکی تroووسکە ڕووناکییەکی بووبێ، بەشکو هەر بە جارێ (نابینا) بووایە و هەرچی شت و ڕووناکییە نەیدیتایە و بەتایبەتی دڵخوازەکەی کە تووشی دەردی دڵدارییەکەی بووە و هەر بەوەندەوە، لە (دڵ) و (چاو)ی خۆی نەوەستاوەو، خۆی ئامۆژگاریی خۆی کردووە کە دەبوایە هەر زوو، ئەوسایە خۆت (کەنارەگیر) واتە دوورخستایەوە لە خواستی (دڵ) و (چاو) کە هەردووکیان دوشمنت بوون و هەن و لە ڕێگەی (عەشقی ڕاستەقینە) لایان داویت و گرفتار و ڕیسوایان کردوویت.
ئەی خودایا لە تاکی ٦مینداا لە (گ٣)دا نووسراوە: هەمیلا- کە ئەم (هەمیلا)یە (هومەیلا) ناوێکی هاودەمە خۆش گوفتار و زیرەکەکانی (شیرین) بووە لە داستانی (شیرین و خوسرەو یا (فەرهاد)دا و کوێر بووە.
چونکە هەر ئەم سەرچاوەیە ناوی بردووە لە سەرەوە جێگیرم نەکردووە.
(بوومایە) لە تاکی شەشەمدا (کێشەیەک) دەدا بەوەزنی هەڵبەستەکەو دەبێ (بوو)ەکە بەگورجی بگوترێ: (ئەو وەختە)ی تاکی حەوتەم لە (گ/٣)دا: (ئەم وەختە)یە.

١٠١

## نیم نیگای

١– نیـم نیـگـای دولبـــەری من، دڵ دەڕفـــێنێ، بـە عـــەلی
نـووکی پـەیکانی مـــوژەی، خـــوێن دەتکێنێ، بـە عـــەلی
٢– چاوی مـــەخـمـــووری، لە خـــاوی ســەحـــەری هەڵســاوە
بـادەیی ســـاغــیـــری عـــوشـــرەت دەڕژێنێ، بـە عـــەلی
٣– تیـــرەکـــەی ئـەمـــڕۆ کـــە هێناوەتـە ســـەر گـــۆشی برۆ
شـــیـــشـــەو و جـــامـی صــەبووحـی دەشکێنێ، بەعـــەلی
٤– تاری کـــاکـــۆڵی کـــە ئـەفـشـــانە لـەســـەر مـــەیتـــەنی ئاڵە
ڕوشـــتـــەیی جـــان و دڵ و دین دەپســـێنێ، بـە عـــەلی
٥– نەقدی فرمێسکی لەدەست مەردومی چاو، سەند بە (حوکم)
بـاج لەدەست مـــەردوەی ئـاوی دەســـتـــێنێ، بـە عـــەلی
٦– مـــایەیی عـەشـــقی وەهـا (پوخـتـــە دەکـا) مـــەردومی خـــاو
خـــوێن لـە جـــەرگ و دڵ و دیـدە دەمـــەیێنێ بـە عـــەلی
٧– (قـــادر)ە (کـــوردی) لەبۆ حـــەشـــری هەمـــوومـــان (قـــادر)
عـــەشـــقی ئـەو، زینـدە دەکـــات و، دەمـــرێنێ، بـە عـــەلی

........................................................................

١– نیم نیگا: ڕوانینی بە تیلایی چاو– کە جوانییەکیی تایبەتی هەیە.
دەوفێنێ: ئەیفرێنێ،
پەیکان: تیـر (نووکی پەیکان= نووکی گـوللەو تیـر) و ئەم (نووک) – بەهـەڵە لە تاکی دواییـدا بووەتە (تورک) لەجێی چاو.
عەلی: یا ناوی کەسێکە، کە ئەم هەڵبەستەی بۆ داناوە، یا مەبەست لە حەزرەتی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئامۆزاو، زاوای پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)، و. چوارەم خەلیفەی ڕاشیدین و یەکێکە لە مەزنەکانی ئیسلام و بەتایبەتی لەلای (شیعە) و لەساڵی ٤٠ی کۆچی= ٦٦٠ زاینیدا شەهید کراوە.
لەوانەیە، لەناو شیعەشدا ئەم هەڵبەستەی دانابێ کە ئەو بەیەکەم ئیمامی خۆیانی دەزانن و

هەتا ڕادەی پەرستن خۆشیان دەوێ، بەئامانجی ڕامیاری.

عەلێ: هەندێ لە سەرچاوە دەمییەکانم بە کوڕی قادر بەگی کوڕی کەیخوسرەو بەگی دەزانن. سـەرچاوەی ئەم هەڵبـەستـە (عن، ن، گل۱، ف، کـو، نم۱، گم، گ۲، س، گ۳)یە و (کم)م کـردە بنکەی لێکۆڵینەوەی وەک لە سـەرچاوە دەمییـەکانم بیسـتووە کـە لە مـیوانداریـیـەکی لای (قـادر بەگی کەیخـوسرەو بەگی جاف) ئەم هەڵبەسـتەی بەسـەر ئەودا هەڵداوە و لە هەڵبەسـتی تریشدا ناوی بردووە.

نیگای (ف، نم۱، کم): نیگاهـی= ئەمیش لەکێشیدا قورسە.

۲– مەخموور و مەست: مەبەستی مەستیی چاوی ئەو جوانەیە کە لێی دواوە.

خـاو: خـەو، نووسـتن. (خـاو) بـەواتا سـەرەتای گـۆرانی کـە بە هێـواشـی و لەسـەر خـۆ دەست پێ دەکا و، یا جۆری (وتنی) گۆرانییەکە (خاو) بێت (شێنەیی).

سەحەری: بەرەبەیانی (سەحەری) ناوی یەکێکە لە گۆرانییە کۆنە، ڕەسەنە کوردییەکان

بادە: مەی– مەبەستی لەوەیە (بادە)ی چاوەکەی لە هـی خواردنەوە پتر سەرخۆشی دەکات.

ساغیر: پیاڵە یا کاسەی مەی پێ خواردنەوە.

عوشرەت: خۆش ڕابواردن.

چاو (کو، گل۱، ف): ترکی: (تورکی) ئەمەش ناگونجێ.

لە خاوی سەحەری هەڵساوە (گ۳): وەکو تورک لەخەودا هەڵسێ– ئەمیش شێواوە.

بادەی سـاغیری عـوشـرەت دەڕژێنێ (گ۳) شـیـشـەی جـامـی صـەبوحـیم دەشکێنێ– ئـەمـەش شێواندنی تاکی دواییە. ساغیری (کم) ساغر. ئەم تاکە لە کێشەدا بڕگەیەکی ناتەواوە.

۳– گۆشی: گوێی، گوێچکەی– مەبەستی لە لاتەنیشتە و نووکی بڕۆکەی. گۆشەی بڕۆ.

شیشە: ئەو قاپ (بوتڵ)ەیە، کە بادەی بۆ خواردنەوە تیا دادەنێن: (سوراحی).

جام: پیاڵە یا کاسەی مەی (بادە) پێ خواردنەوە.

صـەبووحی: ناوی مـەی (بادە) خـواردنەوەی بەرە بەیانییـانـە کـە ئەوانەی زۆر لە خـواردنەوەدا ڕۆچوون (مـودمین) هـەر لە تاریکبوونەوە دەسـی پێ دەکـەن، مـەبەسـتی لەوەیە نەک هـەر تیـری چاو و مـوژگانی وەک لەدوو تـاکی پێشـوودا گـوتـی، بەشکو بەتیـر گۆشـەی بڕۆی شـووشـە و پیـاڵەی خـواردنەوەی بـەرەبەیان، تێک دەشـکێنێ و لەجـێـی ئەوانە خـۆی سـەرخـۆشی دەدات و بادەکە دەڕوژێنێ.

ئەم تاکە لە (ف، کو، نم۱، گ۲،س)دا نییە و لەوانی تردا سێیەمینە نێو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (گ۳) دا بەم جۆرەی دواییە:

(سـاغیری بـادەی عوشـرەت دەپژێنێ بە عـەلی) ئەمـیش شـێـواویی نیـوباڵی تاکی پێشـووەو هـی هەردوو تاکەکەی تیا ئاوێتەو شێواوە. بڕوانە تاکی پێشوو.

٤– تاری: تاوی ، تاڵی، تاکە مووی.

کاکۆڵی: وەکو زانیومە ئەم کاکۆڵە (قادر بەگی کەیخوسرەو بەگی جاف)ی مەبەستە کە کوڕە و کوڕی قۆز کاکۆڵیان هەبووە.

ئەفشانە: پەخشە= پەخشانە، بڵاوە خاو بۆ ئەوە بەسەر شانیا

مەیتەن: جۆرە پۆشاکێکی خۆجێیی کوردانەیە وەک بلوزی پێش دادڕاوی ئێستەیە.

ڕوشنە: پەیوەندی، بەندیواری.. پەیوەستە،

جان: گیان

دین: ئاین.

ئەم تاکە لە (ف، نم١، کم، گ٢، س، کو)دا سێیەمینەو لە (عن، ن، گل١، گ٣)دا چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

مەیتەنی(ف): نیمتەنی. (نیمتەن= بەواتە کورتەک)

جان (گ٢،س، گ٣): گیان لە گۆڕینەکانی گیوە.

دین (کو): (تەن= لەش) ئەمیش نابێ؛ چونکە (دڵ). کە لەم تاکەدا جێگەی لەش دەگرێ و ئیتر ناوی (لەش) بردن پێویست نامێنێ.

٥- نەقدی: (نرخی)ی مەبەستە.

مەردومی چاو: گلێنە، بیبیلە، (مەردوم= پیاو) کە (پیاوی چاو)یش نەگرێتەوە کە گلێنەیە.

حوکم: فرمانڕەوایی.

باج: سەرانە، جۆرە گوومرگ سەندنێکە.

مەردوەی ئاوی: زەلامی ئاوی ئەفسانەی زۆری لەسەرە کە لە دەریا و چەم و ڕووبارانددا جۆرە مرۆڤێک دەژی و تا ئێستەش بڕوا وایە کە هەیەو (عروس البحر)ی ناو دەبەن، (کوردی)ش مەبەستی لەو جۆرە زیندەوەرەیە کە وەک: گلێکەی لەناو ئاوی فرمێسکی خۆی دابێ.

ئەم تاکە لە (ف، نم١، کم، گ٢، س، کو)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمینە و دەست (لە هەردوو نیو باڵەکەدا لە): (نم١، ف، کم، گ٢،س) دەس.

٦- مایە: مەبەسیی لە (هەوێن)ە (ماک) و (بنەما) و (لێ دروستبوون)ی هەستێکە (هۆ)

مەردومی خاو: کەسانی کاڵ و (سادە)ی مەبەستە

ئەم تاکە لە (عن، ن، گل١، گ٣) دا شەشەمینەو لەوانی تردا پێنجەمینە..

عەشق (گ٣): عیشق- بێگومان (کوردی) بەشێوەی (عەشق) نووسویەو گوتومە یەک عیشق.

لە جەرگ (نم١، کم، گ٢، س، گ٣): لەنێو جەرگ- ئەمیش لەنگی دەکات دەمەێنێ (ف)= دەتکێنێ- ئەمیش نابێ چونکە دووبارەی تاکی یەکەم (تێکدانی واتایە).

دەمەێنێ (نم١): دەسێنێ- ئەمەش نابێ؛ چونکە دووبارەی تاکی پێنجەمەو شێواوییە.

دەمەێنێ (کم، گ٢، س) دەمێنێ- ئەمیش شێواو و لەنگیی و بێ واتایە.

٧- قادر: توانایە، دەتوانی= لەبارییایە، پێی دەکرێ کە مەبەستی لە (قادر بەگی جاف) بووە. چونکە

ئەم (قادر) ناتوانێ حەشر بکات.

حەشری: حەشرکردنی کە لێپرسینەوەی دوارِۆژ (قیامەت)ە کە هەر تەنیا خوا دەیکات

دووەمی (قادر): مەبەستی لە خوایە وەک لە  شوێنی ترا لێکم داوەتەوە و ئەو حەشر دەکات.

ئەم نیـو باڵی یەکـەمی ئەم تـاکە برِگـەیەکی نـاتەواوە، بەڵام دەروات و ئەمـەش لەکـۆندا زۆرە لە شیعردا. حەشری (ف، نم١، کم، گ٢، س، گ٣): قەتڵی ئەمیش، نابێ؛ چونکە (کوشتن) لە باڵی دووەمی ئەم تاکەدا بە (دەمرێت) هاتووە.

هەمـوومـان (ف): هەمـوو کـەس- ئەم تاکـە لە (عن، ن، گل١، گ٣) دا حـەوتـەمـە و لـەوانی تردا شەشەم و لە هەمووواندا دوا تاکە.

١٠٢

## دیسـان وا هـاتە گەردش

١- دیساان وا هاتە گەردش چەرخی چاوی مەست و فەتتانی
کوگـول ئیقلیمن ئوزرە بیـردە سوردی صـەففی موژگـانی
٢- بە طابووری مـوژەی زانیم لـەگـەڵ دڵ دێ بە شـەڕ، چونکە؛
یرش ئاسـایە در؛ غـەوغـایە، فـیـرقـەی سـونگی دەورانی
٣- بە حاشیەی تەڕلک و فیسی کەچ و طاقی دوو ئەبرۆی خۆی
یە لەوێردی بینایی کـەعـبـەوو دینی مـوسـوڵمـانی
٤- ئەگـەر غـەمـزەو نیگاهی چاوی ئەو (بێـتـو) بە ئیـمـا بێ
گوێزن؛ هەر یاقمەسی سەندەن: دەگەر (موڵکی سولەیمانی)
٥- گـرشـمـە و نیم نیگاهی چاوی مـەسـتی فیـتنە ئەنگێـزی
دەگـیل سـۆز، نازیلە، ئیلەر، مـوسـەخـخـەر جوملە ئێـرانی
٦- ئەگـە بێـتـو بچـێـتـە جـەننەت ئەو تورکی پەری چیـهـرە
قەوەر، گوێز غەمزەسیلە جەننەت ئیچرە حوورو غیلمانی
٧- بەدەوری گـەردنا پەخـشـان بووە؛ کـاکـۆڵی طەڕاری
صانرسەن، بەرگی گویل ئوزر ئۆلینمیش سونبول ئەفشانی
٨- وەها بێـبـاکـە بۆ قـەتڵی منی بێکەس دەڵێی ئەمـڕۆ
گـێـترمش باشـمن فـتـواسنی شـەوکـەتلی فـەرمـانی
٩- بڵـێن مـەیتـانی شین، بۆ تەعزیەی (هیـجری) نەکـاتە بەر
عەزا طوطمەگلە ئیحیا ئێتمەمیش مەقتوولی هیجرانی

---

١- گەردش: سووڕانەوە، گەردوخول.
چەرخی: سـووڕی، سـووڕانی خـولی. وەیا مـەبەسـتی ئەوەیە کـە چاوگـێـڕن بەتیـلایی چاوی خۆشەویستەکەی یا بە چەرخ (ڕۆژگار)ی ستەمگەردە ئەوەندە ئەو نیو نیگایە کاریگەرە، کە بە وەرچەرخاندن یا گێڕانی چاوی ڕۆژگار ئاسای، گەردش دەگێڕی.

مەست: بەخوماری و جوانیی چاوەکە چاوی نەرم یا پشتی چاوی کیسەڵدار بێت.
فەتتان: جوان، دڵکێش، ئاشووربگێڕو مەبەست لە تێڕوانینەکانی ئەحمەد پاشای بابانە (کە ئەم هەڵبەستەی بەسەر ئەودایە.
تا ئێرەی نیوباڵەی ئەم تاکەو هەموو نیوەی یەکەمی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە بەزوبانی کوردین و نیوە دووەمەکانی بەزوبانی (تورکی)ن.
هەروەک لە هەڵبەستەکانی تری ئەم پەڕاویەدا کە بە: (کوردی و فارسی) وەیا بە: (کوردی و عەرەبی)ن کە ئەمەش توانای هۆنەرمان (کوردی) دەگەیەنێ کە لەم چوار زمانەدا شارەزا بووە.
کوگول: دڵ – (وشەیەکی تورکییە).
ئیقلیمن: کیشوەری – ئەم وشەیە بە تورکیەکەی بەشێوەی (افلیمک) دەنووسرێ کە پیتی (کاف= ک)ەکەی بەپیتی (ن) دەردەبڕدرێت. ئەمە لە شێوەی ڕێنووسی تورکیدایەو من چۆن دەر دەبڕدرێت لێرەدا وەها بەڕاستی نووسیومن (ئیقلیم) بە بنەچە وشەیەکی کوردی لە قەڵەمڕوەیە
ئوزرە: لەسەر، بۆسەر، ئەسەر،
ببردە: جارێکی دی، دیسان، هەروەها، دیسانەوە.
سوردی: لێی خوڕی، هاتە سەری، تاوی دایە، هەڵمەتی بردێ– پیتی (پێ= ی)ی ئەم وشەیە زۆر سووک و گورج وەک (سکوون) دەردەبڕدەێت.
صەففی موژگانی: ریزی برژانگەکانی (صفی) عارەبی و موژگانی کوردییە ئەم نیو باڵە تورکییە واتە: ریزی موژگانی جارێکی تر هێرشیان هێنایە سەر کیشوەری دڵ بەو ڕوانینە جوانە لەلایەن ئەحمەد پاشای بابانەوە.
بۆنەی ئەم هەڵبەستە:
وەک لە سەرچاوە دەمی یەکانمەوە بیستوومە، ئەم هەڵبەستە لە شاری (ئەستەنبوڵ = ئاستانە)ی پایتەختی خەلافەتی عوسمانیدا (کوردی) بەسەر دوا پاشای، پاشایەتی بابان (ئەحمەد پاشا)دا هەڵی داوە کە (ئەحمەد پاشا) دوای ڕووخانی پاشایەتییەکەی بە دەستوپێوەند و خێزانەوە، بارو بنەی ڕێک خستووە و ڕووی کردووەتە ئەو شارە لە (سولەیمانی)یەوە ک لە شوێنی تری ئەم پەڕاوییە چەندین هۆنراوەی دیکەی کوردیدا لە چوونەکەی (پاشا) بۆ (ئەستەمبوول)و لە دۆستایەتیی نێوان خۆی (کوردی) و (پاشا) دواوە و، وەک لە شوێنی تریشدا چوونە ئەستەمبووڵەکەی (کوردی)م دیاری کردووە بۆ سەردانی (ئەحمەد پاشا) لەوێ.
لەو سەردانەدا وا بەڕێکەوت چەند هۆنەرێکی تر لەلای (ئەحمەد پاشا) دەبن و هەریەکە هەڵبەستێکی خۆی بەسەر (ئەحمەد پاشا) دەخوێنێتەوە و (کوردی)یش، لەوانەوە جۆش دەسێنێ و هەر لەو دانیشتنەدا ئەم هەڵبەستە لە هەڵنانی (ئەحمەد پاشا) دادەنێ و هەموان ئەم هەڵبەستە پەسەند دەکەن.

بەداخەوەو بە دڵنیاییەوە ناوی ئەو هۆنەرانەم دەست دەکەوت تاکو دەستنیشانیان بکەم و هەروەک هەڵبەستەکانیشیانم دەست نەکەوتن.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە نیوە کوردی و نیوە تورکییەی (کوردی) کە (تەضمین) یا (تەلمیع)ەو. (ملمع = مولەممەع)ە لە: (عن، گل/ ١٠، کو، ف، ح، ما/ ١، ما/ ٢، ق/ ٣، نم/ ١، با، کم، وە ڕۆژنامەی (پاشکۆی عیراق) بە کوردییە کە لە ژمارەی (١٩٧٩/١/٢١)دا مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی لەژێر ناوی (هەندێک کەموکوڕی چاپی دیوانی کوردی) دا (دوو) تاکی دوای ئەم هەڵبەستەی نووسیوە کە لەگەڵ مامۆستا شکور مستەفا دا ساغیان کردووەتەوە. منیش لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (کە)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکە. کە یەکەم چاپکراوێکی ئەم هەڵبەستەیە و لەگەڵ ئەم هەموو سەرچاوانەشدا هێشتە هەر ئاڵۆزی و لێڵیی تیایە، بەڵام زۆر سەرچاوە یاریدەری چاککردنیان دام وەک پێشکەشم کردووە.

چەرخی چاوی (کۆ، ما/ ١، ما/٢): چرخ و چاوی.

چەرخی چاوی مەستو (ف): چەرخ و چاو مست.

کوگول (کو، ما/ ١، ما/ ٢کم، با): گیۆل- ئەمیش هەر بەواتا (دڵ) ئارەزووە بەڵام بە زارگوت (لەهجە)ی کەرکووکیانەیەو ئەویکە بەشێوەی (تورکی ئەستەمبووڵییە) کە دەشێ (کوردی) هەڵبەستەکەی پێ دانابێ و لە سەرچاوەی ڕاستییەوە تورکی فێربووبێ.

ئیقلیمن: دیسان لە (گل/ ١٠، کو، ما/ ١، ما/ ٢، ق/ ٣) دا بە (اقلیمن) نووسراوە و لەوانی تردا بەشێوە تورکیەکە نووسراوە: (اقلیمک).

٢- طابوور: بەشێکە لە سوپا، مەبەست لە برژانگی چاوی ئەحمەد پاشای بابانە.

شەڕ: جەنگ. و لێرەوە لێکدانەوەی نیو باڵی دووەمە (تورکی)یەکەیەتی.

برش: هێرش، هەڵمەت. (یرش ئاسایە)یە = هێرشانە، هێرشیی، وەک هێرش، هێرش ئاسایی، و (در)ەکە بەواتا هەیە، هی، وایە.

غەوغا: هاتوهاوار، تێکچران و دەنگە دەنگ و دەنگ و پشێویی قەڵەباڵغی و (غەوغا) وشەیەکە بە بنەچە دەچێتەوە سەر (کووکە)ی کوردی.

فیرقە: بەشێکی مەزن لە سوپایەکە (عارەبی)یە.

فیرقەی سونگی: فیرقەی تیغی برندە: (قەمە) بەدەست کە لەو تیغی (سونگی)یە، مەبەست لە برژانگەکانی چاوەکەیە. و (فیرقە) وشەیەکی (عارەبی) و (سونگی)یەکەش کوردییە.

دەوران: ڕۆژگار- یا دەوراندەوری چاوەکەی وەک بڵێی: فیرقەی سونگی بەدەستی دەوران (ڕۆژگار) ئاوا (موژگانی) بەهێزو ستەمگەرو چارە نەکراوە کە کەس دەرەقەتی نایە.

وەیا بڵێ: فیرقەی سونگی بەدەستی برژانگەکانی ئەو چاوە، کە؛ بە دەوری چاوەکەدان. (دەوران) بەڕواڵەت (عارەبی)یە و دەبرێتەوە سەر (کوردی). ئەم تاکە بەواتا: تابووری موژگانی کە وەک قەمەی دەوری چاوی بەهەراوە لەگەڵ (دڵ)دا دێنە جەنگەوە.

یرش (نم/ ١، ما/ ١، کم، با، ق/ ٣). پورش.
فیرقەی (عن، گل/ ١٠، ح، ما/ ١، ما/ ٢): فرقە- ڕێنووسی کۆنە.
فیرقەی (کو، ف): فیرقە - دیسان ڕێنووسی کۆنە.
فیرقەی (نم/ ١): فرقی= ئەگەر ئەمە بەواتای (جیاوازی) بێ، ئەوا هەڵەیەو ئەگەنا ڕێنووسی کۆنە.
فیرقەی (کم، با): فرق- دیسان ڕێنووسی کۆنە.
سونگی (کو): سنلی. دیارە هەڵەی ڕێنووسی کۆنە.
سونگی (نم/ ١، ف، کم، با، ما/ ١، ما/ ٢، عن، گل/ ١٠، م، ق/ ٣): سنگی- هەر ڕێنووسی کۆنە- (جورجی زەیدان) لە (الفلسفة اللغوية)

٣- حاشیە: گۆشە، لێوار، قەراغ، گوێی (ی شتێک) پەراوێز، و پەراوێزی (پەڕاوی) ڕوخساری (ئەحمەد پاشا).

تەڕلک: ئەو دەسە سرە بووە کە جاران لەبن فێستەوە دراوە. بەسەرسەردا، کە نمی ئارەق کردنەوە قەراغی فێستەکە تەڕنەکا، نەک قەراغەکەی چڵکن ببی، ئەمجا چوار گۆشەی سپیی ئەو (دەسەسرِ)ە لەبن فێستی سوورو بە سەر ئەو ڕوو دەمو چاوە جوانەدا دیمەنێکی دڵگیری داوە کە (تەڕ) کوردییە (لک) ئامێرێکی دەستووری زمانی تورکییە، واتە (تەڕین) یا تەڕی هەڵمژ. (کوردی) جاری تریش لە هەڵبەستی:
(دل لە میحنەت کەیلە ئەی پیری موغانی بەزمساز)یدا ئەمەی ناوبردۆتەوە، دوورنییە هەردووکی مەبەسیی لە هی یەک کەس بێ و کوا ئەو (بەزم) هەڵبەستە لە بارەگای ئەحمەد پاشا دابووە لە ئاهەنگی مناڵبووندا.
فێس: ئەو کڵاوە سوورەیە کە لەسەرێنی تورکانی، عوسمانی، تا چەند ساڵێک دوای ئەویش پیاوان لەسەریان کردووە، لە شوێنی تردا بە درێژی لێکمان داوەتەوە و هەتا ساڵە چلەکانی چەرخی پێشوو بەکاردەهات لە (سولەیمانی)دا و تائێستەش لە (مووسل) و (میسر) بەکاردێ.
کە چ: لار، مەبەستی لەلار واتای نێستەکە پەریزەوە کە جوانیەکی داوە، (کوردی) ڕووی (ئەحمەد پاشا)ی بە پەراوی یەک داناوە کە (تەرلک) و (فێس) و (تاقی برۆ)ی کردەوە بە پەراوێز.
یەلەو یردی: بەبای دا، هەڵەی کرد، و بەدرۆی خستەوە (تورکی)یە.
بینایی کەعبەو دینی موسوڵمانی: بینای کەعبە کە شوێنی ڕووتێکردنی ئیسلامەکانە لە نوێژ و حەجدا، هەروەها دەڵێ: ئەوە ئاینی ئیسلامیشی بە با دا بەو دیمەنە جوانەی خۆی، خەڵکی وەرگێڕا، بۆلای خۆی کە تێستەکەی بە (کەعبە) داناوە بە جوانییەکەی دڵی باوەڕ بە ئیسلام کردو پڕ باوەڕی خەلقانی کێشی خۆی کردووە کە ئەم ڕستەی (بینایی کەعبە و دینی موسوڵمانی) یە تورکی نین و عەرەبی کوردی ئامێزن.

لەم تاکەدا( لەف و نەشری مورەتەب)ی تیایەو تاقی دوو برۆیەکە میحرابی نوێژە. بەڕاستی جوانی و دەربرینی بەهێز لەم تاکەدا هەیە.

کەعبەو (کم، با، گل/ ١٠) کعبەی.

٤- غەمزە: جۆرە جووڵەیەکی دڵگیری چاوە، تیلایی، نیونیگا، چاو داگرتن،

نیگاه: تەماشا، ڕوانین، نیگا.

ئیما: چاو برینە شتێک بە دڵسۆزی و ئارەزووەوە، دەئیما: (بەوردی) ئەمیش وشە تورکییەکانە بەتمانە:

گوێزن: چاوت، چاوی ، لە چاوی ئەوەوە، لەو چاوەوە کە ئەم گوێزنەش لە نووسینی تورکیدا بە (گوێزنک) ئەنووسرێ.

هەر باقمەسی: هەر ڕوانینێکی، هەر تەماشایەکی.

سەندەن: لەتۆوە. هی تۆ. کە هەموو تاکەکانی لە (غائب) ئەدوێ و لێرەدا ڕوو لە (موخاطەب)ە.

دەگەر: دەهێنێ، بایی (بەهای) بۆ نرخ -، هەڵدەگری، دەشێ، مەبەستی شاری (سولەیمانی)یە وە یا هەموو خاک و وڵاتی حەزرەتی سولەیمان کەوا ئەو (پاشا)یەکی یا (پێغەمبەر)ێکی فەرمانڕەوای دەسەڵات فراوان، ناسراوە، یا مەبەستی لە خاکی (وڵاتی) سولەیمانی بووە کە تەماشایەکی (ئەحمەد پاشا) ئەو موڵکەی هێناوە کە ئەمەش (جیناس ئارایی)ی تیایە- کە وێنەی ئەمە لە هەڵبەستی تردا زۆرە وەک لێرەدا.

نیگاهی (کو، ما/ ١، ما/ ٢، ف) نیگا. ڕێنووسی کۆنە.

چاوی (گل/ ١٠، ف، ما/ ١، ما/ ٢): چاو. ڕێنووسی کۆنە.

گوێزن (کو، ما/ ١، ما/ ٢، ف) بەشێوەی کۆن، ونووسینی تورکی کە (گویزک)ە، نووسراوە و ئەوانی تر بە شێوەی تورکی دەربڕینەکەی نووسیومانە.

یا قمەسی (نم/ ١): باقمە: هەڵەیەو لەنگە.

باقمەسی (کو، ما/ ١، ما/ ٢) باحمەسی- کە ئەمەیان شێوەی کەرکوکییانە و گۆڕدراوە.

دەگەر (کو، ما/ ١، ما/ ٢) دکر. ڕێنووسی کۆنە.

دەگەر (ق/ ٣) دیر- دکل دکل.

بە ئیمایی (نم/ ١، کم، با، کو، ما/ ١، ما/ ٢، ق/ ٣) بەقیمت بی. ئەمەش گۆڕانەو دەسکاری.

٥- گرشمە: عیشوە، لەنجەولار، غەمزە.

نیم نیگاه: نیوە بیگا، نیوە تەماشا، بەتیلای چاو،لا تەماشاکە جوانییەکی تیایە.

فیتنە ئەنگیز: ئاشووب هەڵگیرسێن. ئاشووبە نەرەوە- ئەمیش وشە تورکییەکانە:

دەگیل سوز: نەک هەر بە قسە، هەر بەقسە نا، بەشکووە.

نازیلە: نازی ئەو، نازی، نازت، عیشوەی، بەنازەوە،

ئیلەر: دەکا- دەبێ بە (ئیللەر) دەربڕدرێت ئەگەنا لەنگ دەبێ کە خۆی (ئێلەر)ە.

موسەخخە: تەسخیر، دەست بەسەراگرتوو، داگیر، واتە: داگیر دەکات کە وشەیەکی عارەبییە.
جوملە: گشت، سەرپاک، هەموو. دیسان عارەبییە
ئێرانی: ئێران- وڵاتی عەجەم (فارس)- واتە هەموو وڵاتی ئێران دەهێنێ وەیا بە غەمزە نیو نیگاکەی داگیری دەکا ئەو نازو گرشمە و نیو نیگا ئاشووباوییەت.
چاوی مەستی فیتنە دەنگێزی (کو، ف، کم، با) ئەو بەقیمەت بی- ئەمەش هەڵەیە.
دەگیل (ف): دکیش
دەگیل (کو، ق/ ٣): دگیش- هەڵەیە
دەگیل (گل/ ١٠) دوکش- هەڵەیە
دەگیل (ع): دکل- ڕێنووسی کۆنە.
دەگیل (نم/ ١) دگل- ڕێنووسی کۆنە.
دەگیل (ما/ ١، ما/ ٢): دیل- ئەمە (دەیل)ی کەرکووکییانەیە.
دەگیل سوز ناز ئیلەر (کم، با): دگل سوزنا زایلە ئەمەش ڕێنووسی کۆنە
سوز (کو): سر. هەڵەیە
ئیلەر (کو): اید. هەڵەیە .
ئەم تاکە بەواتە: لەنجەو تیلاییەکی چاوی ئەحمەد پاشا کە مەست و ئاشووبەگێڕە، نەک هەر بە (قاڵەی دەم) بەشکو بەجوانییە دڵگیرەکەی هەموو قەڵەمڕەوی ئێران دەهێنێ.
٦- جەننەت: بەهەشت.
تورک: جوان، جوانی چاوەکەی واتا: مەبەست لە تورکە ستەمکارەکانی عوسسمانیشە کە وەک جوانیی ئەو چاوە کاریگەرە. ڕووی لە دڵی دڵدار دا ئەوەندە ئازاردەرە
بۆیە، وتووشیەتی: ئەگەر بێتو بچێتە جەننەت. و بەوەدا کە (ئەگەر)ی تێ خستووە، واتە ئەوەندە ئەو ڕووە جوانەی ستەمکارە، ناچێتە بەهەشتەوە. بەڵام لەژێرەوە ئەمەی پێ وتووە کە ئەمەش جوانییەکی وێژەییە و شاردنەوەی واتایە لەژێر واتادا.
پەری: فریشتە = مەلائیکە.
چیهرە: ڕوو، ڕوخسار، چارە، ڕووی ئەحمەد پاشا.
ئەمیش وشە تورکیەکانە:
قەوەر: دەردەکا، ڕاودەنێ، قاودەدا، نایهێڵێ
گوێز: چاو.
غەمزە سیلە: بە غەمزەکەی واتە غەمزەی چاوی و تەنیا کەرتی (سیلە) لەم (غەمزە سیلە)یەدا تورکییە واتە هینەکەی مەبەستی لە غەمزەکەیە.
ئیچرە: لەناو، لە- واتە لە بەهەشت دەردەکا.
حوور و غیلمانی: حۆری غیلمانەکانی بەهەشت کە ئەم دوو وشەیەش (عارەبی)و تورکین. کە

(حوورو غیلمان)

دوو جۆره مرۆڤی نێر و مێی بەهەشتن.

چیهره (ک، نم/ ١، کم، با، ما/ ١، ما/ ٢). ڕوویە.

قەوەر (ف، نم/ ١، با، کم): قاور – هەڵەیەو لەنگە.

قــەوەر (مــا/ ١، مــا/ ٢): قــادر – ئەمــەش هەڵەیـەو لەوەوەیە کــە (کــوردی) بـەو (قــادر)ەوە بەناوبانگەو هەڵەشەو ناگونجێ بۆ ئێرە.

گوێز (ن، نم/ ١، با، کم) گوز. ئەمەش هەڵەیە.

ئیچره (ما/ ١، ما/ ٢): ئیچر. ئەمەش هەڵەو لەنگییە.

٧– پەخشان: ئەفشان، پەخش، بڵاوبوەوە.

طەڕار: طوڕە ئـاسـایی (طـورەمـان لـەشـوێنـی تردا لێک داوەتەوە) و لێـرەدا مـەبەسـتی لەوە کـە تووکـی پەخـشـانـی کـاکـۆڵەکـەی بەسـەر لا مل و گـەردنـیـدا هـاکـا (ملیـوان) و (کـراس) و (بەرگ)ەکەی لەتوکوت کا؛ چونکە ئەویش ئەیەوێ بگاتە ئەو لەش جوان و ناسکەی نەک بەسەر ئەو بەرگەوە بێ کە ئەحمەد پاشا لەبەریدا بووە،

ئەمیش وشە تورکییەکانە صانرسەن– یا صانورسەن: لات وایە، دەڵێی، باقل، گومان دەکەی.

بەرگی گویل: بەرگی (پەڕەی) گوڵ. مەبەسـتی لە لەشـیـەتی (شـان و مـل و گەردن) کە (پەڕە) کوردییە بەواتە (بەرگ) و (گویل) لە (گوڵ) ی کوردییەوە.

ئوزرە: لە سـەر بۆسـەر– وەک لە تاکە هەڵبەسـتی یەکەمدایە. ئۆلینمـیش: بووە، بووە بە، وەهای لێ هاتووە کە.

سـونبول: گوڵێکی جـوان و بۆنخۆش و نـایابە مـەبەست کاکۆڵە کە وشـەیەکی کوردییـە بەواتە: دەڵێ: بەسەر بەرگی گوڵدا سونبول پەخشان کراوە واتە: کاکۆڵەکەی بەسەر شان و ملیا.

بەدەوری گەردنا (کو): بسرگرد.... ١–فەوتاوە

بەدەوری گەردنا (ف): بسرگردنیدا –لەنگە

بەدەوری گەردنا (ما/ ١، ما/ ٢): بدورکردن– لەنگە

بەدەوری گەردنا (کم، با، نم/ ١): بەدەوری گەردنی

بەدەوری گەردنا (ح): بدورکردنا– ڕێنووسی کۆنە.

کاکۆڵی طەڕاری (کو): کا... (فەوتاوە)

طەڕاری (ح، ق/ ٣): تاتاری.

طەڕاری (ما/ ١، ما/ ٢): طاطائی– ناگونجێ

طەڕاری (گل/ ١٠): تاتایی– لەنگە و ناگونجێ

پەخــشــان: هەر لـە (عن، مــا/ ١ ، ک، گل/ ١٠) دا نووســـراوە و لەوانـی تردا (ئەفــشـــان) نووسراوەو من بەڕاستترم زانی چونکە لە کۆتاییی ئەم تاکەدا (ئەفشان) دووبارە دەبێتەوە.

صانرسەن (صانورسەن) (کم، نم/ ١): صورسن- هەڵەیە.

صانرسەن (ف): سوبرسن - هەڵەیە

صانرسەن (کو): سیورسن، ناگونجێ

بەرگی گویل (گل/ ١٠، ما/ ١، ما/ ٢، ح): برک کل.

بەرگی گویل (کم، ف، نم/ ١، با): برگ گل.

بەرگی گویل (کو): برگ گلی - کە هەموو ڕێنووسی کۆنن

ئوزرە (کو): زوزرە. - هەڵەیە

ئۆلینمیش (سونبول ئەفشانی (کو): اولنمش..... (فەوتاوە)

ئۆلینمیش (ف): اولن لنمش. هەڵەیە

ئۆلینمیش (کم، با) اولنمش. ئەمیش ڕێنووسی کۆنە

٨- قەتل: کوشتن.

گێترمش: هێناویە، هێناویەتە، هێناویە بە. وشەیەکی تورکییە .

باشمن: سەرمدا، سەر سەرما، سەرما بە تورکی (بەسەرمدا)ی مەبەستە.

فتواستی: فتوای= ئەو بڕیارەیە لەلایەن سەرەکێلی ئایینەوە دەدرێ. بۆ بابەتی گرنگ- شەوکەتلی فەرمانی: (شەوکەتلی= بەهێزو پیرۆزو مەترسی لێکراو- ئەمەش لە ڕواڵەتی فەرمانەکانی بارەگای هومایوونی عوسمانی بووە وەک پیایاندا هەڵدەدا) کە ئەمە هەر فەرمان= ئەو بڕیارانە بوو کە لەو بارەگایەوە دەردەکران) (لی)یەکەی کە ئامیری (نسبەت) تورکییە و (شەوکەت) عارەبی، (فرمانی) کوردییە. کە بە بێباکیی خۆی ئەم فەرمانەی بۆ بڕینی سەری من و بۆ کوشتنی من دەدات وەک فرمانی هویومابونیی عوسمانی.

منی (کو):می.

بێکەس دەڵێی ئەمڕۆ (کو) بیکس.... امرو- فەوتاوە.

گێترمش (کو، عیراق): کیترمیش- هەڵەیە

گێترمش (کم، با، گل/ ١٠، ما/ ١، ما/ ٢، ق/ ٣، ف، نم/ ١): کترمش- هەڵەیە.

باشمن (نم/ ١، ن، کم، با. عیراق): باشمە- هەڵەیە

باشمن (کو): باشنە- هەڵەیە

فتواسنی (گل/ ١٠): فتواسنە. ناگونجێ.

شوکەتلی فەرمانی (کو): شوک.... فانی فەوتاوە...

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە و ئەوی دوایی لە نووسینەکەی مامۆستا (محەمەد عەلی قەرەداغی)دایە کە لەسەرەتاوە نیشانەم بۆ کرد.

٩- مەینان- یا- مەینەن= بەرگێکی سەرەوەی نێر و مێ بووە، وەک کەوا یاتەکمە لە کوردەواریدا لەنیوەی یەکەمی چەرخی بیستەمەوە باوی نەماوە.

شین: شینێکی تۆخ کە نەریتێکی کۆمەڵایەتیی گەلان و کوردەوارییە، کە خۆشەویستێک بمرێ بەرگی ڕەش یا شین لەبەر دەکەن بەڵام لە کوردەواریدا زۆرجار بەرگەکانیان لەخوم (هەش) دەنێن و شینی ڕەش باویی دەکەن و کوردی نیشانەی بۆ ئەوە کردووە؛ چونکە شەهید عەشقی ئەحمەد پاشایە بەرگی ڕەشی بۆ لەبەر نەکەن؛ چونکە شەهید بەهەشتییە.

تەعزیە: پرسە.

عەزا: دیسان: پرسە. وشەیەکی عەرەبییە. لێرە دواوە لێکدانەوەی نیو باڵە تورکییەکەیە:-

طوطمەگلە -یا- توتمەگلە= گرتن، بۆ دانان وەک تەعزیە بۆ گرتن یا پرسە بۆ دانان (وشەکە تورکییە).

ئیحیا: زیندووکردنەوە، زیندووبوونەوە.

ئێتحەمیش: ناکرێتەوە واتا ئەو کوژراوە یا مردووەی وەک (کوردی) بە بەرگی شین و پرسە زیندوو نابێتەوە. وەیا چونکە شەهیدە ئەوانەی بۆ مەکەن نایەوێ.

مەقتوولی: کوژراوی (عارەبییە)- جگە لە (عن، مـا/ ١، کم، گل/ ١٠) لە هەمووان‌دا لە جێگەی (هیجری) نووسراوە (کوردی) و هەڵەیە

هیجراتیک: دووری

مەیتانی (عیراق): میتانی ڕێنووسی کۆنە

مەیتانی (کم) میتانی، ڕێنووسی کۆنە

مەیتانی (نم/ ١ ف): ملتانی. هەڵەیە

مەیتانی (کم، ب): مەلتانی- هەڵەیە.

شین بو تەعزیەی (کو): شین تونبە- ئەمەش هەڵەو لەنگییە.

عەزاطوطمەگلە (کو): عزا تتمگلە- هەڵەیە.

عەزاطوطمەگلە (گل/ ١٠): عزا دوتمکلە- هەڵەیە.

عەزاطوطمەگلە (کم،با): عەزا طوتەمگلە.

عەزاطوطمەگلە (ف) . عزا تمکلە هەڵەیە.

عەزاطوطمەگلە (عیراق) عزا ایتمگلە

ئیحیا (ف، نم/ ١، با، کو، کم عیراق): احیا ڕێنووسی کۆنە

ئێتمەمیش (کو): ایتممی... ئەمەش جوان و دەگونجێ.

ئێتمەمیش (عیراق): ایتمامش

ئێتمەمیش (گل/ ١٠): ایلمز - هەڵەیە

مەقتوولی هیجرانی (کو): مقتول. (فەوتاوە).

مەقتوولی هیجرانی (عیراق، کم، با): مقتول هجرانی، ڕێنووسی کۆنە

١٠٣

## ڕوخت وەک گوڵ

١- ڕوخت؛ وەک گـوڵ، تەنت؛ وەک سـیـم، لەبت؛ وەک لەعلـی ڕوممانی
دەهـانـت؛ فـنـدق و، غــــەبغـــــەب؛ وەکـــــو نـارنجی عــــــەممانی
٢- (فەقێ)ی؟، یاخـۆ (نیطامی)ی؟؟، یانەخۆ (پێش خزمـەتی شاهـ)ی؟
(دوڕ)ی مــوڵکی (ســـولەیمان)ی؟، ڕەئیـــسـی ئێلـی جـافـــانی؟؟
٣- بەحــوسنـی (یووسـف) ئاســـاتو، بەخــوڵق و لوطفـی شـیــرینت
چراغـی بەزمی (خــوســرەو)، نووری دیدەی (پیــری کــەنعــان)ی
٤- بە (ظاهر)، ســادە لەوحی، وەک ڕوخت وەحـشـیـی وەکـو دیدەت
لە دڵدا: تو (حــەکـیـمی)و، (عـاقـڵی)، ئوسـتــادی (لوقـمـان)ی
٥- (عـــەرەب) ئەندامی یو، (فـــارس) کـــەلام و،(تورک) ڕەفــتـــاری
نیگا (ئاهوو)، ڕەوت (کـەپکی)، زوبان (تـووتی)ی خـۆش ئەلحـانی
٦- ئەگـــــەرچی (قـــادر)ی، بۆ قـــەتڵی من، فکرێ بکە قــــوربـان
لەسـەر (صفـحـەی) ڕوخت، وەختـە؛ عەیان بـێ: خەططی ڕەیحـانی
٧- وەکـو (بولبـول)، فـیـغـان کـە دائیـمـا، (کـوردی) لە دەوری گـوڵ
وەکـــو (قـــومـــری) بنـاڵێنە، لـە (تاو) ســــەرووی خـــەرامـــانـانت

---

١- ڕوخ: ڕوو ، ڕوخسار..
تەن: لەش ، جەستە.
سیم: زیو ، زیڤ - مەبەستی لە سپێتییەکەی لەشی ئەو کەسەیە کە ئەم هەڵبەستەی بەسەردا هەڵداوە، کە ڕەنگی جەستەی ئەوی چواندووە بە (زیو).
لەب: لێو، لێڤ،
لەعلـی: ناوی جـۆرە گـەوهـەرێکی (شـووشــەیی)یە واتە: (یاقـووت)، کـە بەزۆری لەڕازاندنەوەی (خـشڵ)و لـەهـەندێ پێـویسـتـیی پیـشـەسـازیدا بەکـاردێ، وەک: لە(سـەر)و(بـن)ی ئەمـسـەرو ئەوسەری دەرزییەکانی چەرخی (سەعات) ی چاک و بەنرخدا بەکار دەبرێت کە لەسەر تەپڵەکی بن شـووشـە (جـامـی ئەو کـاتژمێر- سـەعـات)انـە دەنووسـرێ (٢٠ جـویڵس) بەپیـتـی لاتینی کـە

(جویلس) بەواتە (گەوهەر) و چونکە ئەو (کاتژمێر)ە ئەوندە پارچەی لەو گەوهەری (لەعل)ە ی تیایە، چونکە گەوهەرێکی سەختە و خۆی لەبن تیژاییی دەرزییەکاندا ڕادەگرێت و ناسوێت و لەئاسن ڕەقترە.

(لەعل) هەر لەسروشتی خۆیەوە چەند ڕەنگێکی وەک (زەرد) و (شڵ) و (سوور)ی هەن و لێرەدا (کوردی) کە فەرموویەتی (لەعلی ڕوممانی) واتە لەعلی ڕەنگی وەک ڕەنگی (هەنارە)، سوور و ئاڵ بووە وەک سوورو ئاڵی لێوە سوورەکەی. لەوانەشە مەبەستی لەڕەنگی سووری جۆرە (لەعلێک)بێت، کە لە ولاتی (ڕۆمان) بەدەست هاتبێ کە جوانیی ئەو ولاتە، چونکە وەک (کورد) لە ڕەگەزی (ئاری)ن هەموو پێست سپی و لێو (ئاڵ)ن، کە بەلای کەمەوە (کوردی) لە گەشتی (ئەستەمبۆڵ)یدا کە سەری (ئەحمەد پاشای بابان)ی داوە لەوێ ئەو خەڵکی (ڕۆمانی)یانەی دیتبێ، چونکە (کوردی) لە (نەدیتە) وتەی دەرنەبڕیوە واتە (دیویەتی) ئەگەر چی ئەم چواندنانەش لەم تاکە هەڵبەستەدا لەدوای سەدان هەزاران هۆنەرانی ترەوە (کوردی)یش بەکاری هێناوە، ئەمە نەریتێکی لاوازی و لاساییکردنەوەی (شاعیر) نەبوو بەشکو (باو)ێکی هەڵبەستی و دێرینەی (کلاسیکی)ی ئەوسای (کوردی) و لەوە پاشیش بووە و تائێستاش هەر پەیڕەوی کراوە و دەکرێت، لە شوێنی تری ئەم پەڕاوییەدا لێی دوام.

دەهان: دەم، زار، دەو. ئەم وشەیە (کورد) و (فارسی)یش بەکاریان هێناوە و بەکاری دەهێنن.

فندق: جۆرە بەرێکی درەختی یە و یەکێکە لە خواردنە (شەوچەرە)ییەکان. وەلە ڕەگەزی (بادەم = باوی) و (بستە)یە، لە بادام گچکەترە و لە (چەقالەش) مەزنترێکە و توێکڵەکەی ئەوەندەی توێکڵی بادام و چەقالە، (ڕەق)و(ئەستوور)نییە و، کە گەیشت لەسەرە باریکەکەیەوە کەمێک توێکڵەکەی دەترەکێ و دەم دەکاتەوە، یا بە سوورکردنەوە و برژاندن دەترەکێ.

هۆنەرانی وێژەی کۆن بچووکیی ئەم کەمە قلیشانەی فندقەکەیان چواندووە بە بچووکیی دەمی خۆشەویستەکانیان، وەک (کوردی) لێرەدا دوای ئەو نەریتە (باو)ە کەوتووە.

غەبغەب: ئەستوورایی و گۆشتنی ژێر چەناگەو بەر مل، کە جوانییەکی تایبەتی دەدات بەو دیمەنەی ڕوخساری مرۆڤ، وە هۆنەران لە هەڵبەستیاندا بەگەلێ شێوەی تر لێی دواون.

نارنج: بەری یەکێکە لە درەختە (ترشەمەنی = حمضیات)ەکان. شێوەی خڕێکی گۆیی و ناسک و بۆن و چێژ خۆشە، ئەوەتا لێرەدا (کوردی) ژێر چەناگەی جوانەکەی خۆی، واتە (غەبغەب)ەکەی بە (نارنج) چواندووە لە خڕی و تۆپیدا.

عەممان: ناوی شارێکی کۆن و ئاوەدان و پایتەختی نیشتمانی (پاشایەتی ئەردەنی هاشمی)یە، لەشوێن و (کەش و تووشی)ی سروشتی ناوچەکەیدا لە (کوردستان) ئەچێت و جۆرە (نارنج)ی ئەو شارەش ناوبانگی تایبەتی خۆی هەیە، لەوانەیە (کوردی) لە سەردانەکەی (ئەستەمبۆڵ)یدا بەو شارەدا تێپەڕیبێ و درەختە ترشەمەنییەکانی وەک پرتەقاڵ و لیمۆ ی ترش و شیرین و لالەنگی و جۆرەکانی تر بەچاکی تیا گەشە دەکەن و بەری زۆر و باش دەدەن.

بەدووری نازانم کە (کوردی) هەر لەبەر ئەوەی کە خۆی شاری (عەممان)ی دیوە، بۆیە بە (عوممان) لە هەڵبەستەکەیدا ناوی نەبردووە کە لەگەڵ پاشبەندی (روممان)ەکە گونجاوترە، کە ئەویش شارێکی تری نیشتمانی عەرەبە.

هەڵسەنگاندنی ئەم تاکە ئەگەرچی لەوێژەی کۆندا بەجوان و وەستاکارانەوە وەردەگیرێ، بەڵام بابەتییانە نییە ئەو خۆشەویستەی (کوردی) کە لە (گوڵ)و (زیو)و (لەعل)و (بستە)و (نارنج) پێک هاتبێ، لەمرۆڤ ناچێ. تەنانەت ئەگەر ئەو چوواندنە، لەرووی هێما (رەمز)یشەوە سەرنجی بدەیێ دیسانەوە ناتوانرێ شێوەی مرۆڤێکی جوان و ئاسایی و دڵگیری لێ رەچاو بکەین، بەڵام لەکاتی دانانی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)دا و لەوەبەرو دواتری بەشکۆ هەتا ئێستاش لەو وێژەی کۆن (کلاسیکی)یەدا ئەو کاری چوواندنە کارێکی دروست و رەوا و (باو) بووە و هەیە، بەهونەرمەندی دائەنرێ و سەرنجی ئەوە نادرێ کە (دەعبا)یەکە. کەواتە ئەو ناگونجاوی و، پێکچوواندنە بەپێی سەرنجی هەنووکەییمان جێگەی رەخنەیە و بەس. ئەمەش کارێکی پڕ بەپڕی وێژەیی و زانیارانە نییە چونکە ئەم هەڵبەستە هەزاران هاوچەشنیشی هی هەنووکە نین و لەروانگەی هەنووکەییەوە دانەنراون.

هەرچەندە لەم لایەنەوە، کە لێکم دایەوە، ئەم هەڵبەستە نابێ (مایە)ی رەخنە بێت، بەڵام دیسانەوە، هەر ئەم هەڵبەستە لەرووی (نێرینەیی)یا(مێیینەیی) ئەو کەسەوە کە ئەم هەڵبەستەی بەسەردا هەڵدراوە، ئەم هەڵبەستە گومانی زۆرمان لێ دەورووژێنێ، چونکە یەکسەر لەتێکرای هەڵبەستەکەوە دەردەکەوێ کە هەڵبەستەکە بەسەر کەسێکی (نێرینە)دا هەڵدراوە، جگە لەوەی هەر لە هەڵبەستەکەدا (ناو)یا (وشە)ی (قادر) هاتووە، کە ئەویش ئەوەندەی تر (دەنگی) ئەوانەی کە (کوردی)یان بەشەیدای نێرینە تاوانبار کردووەو وا (زوڵاڵ)تر دەکات و تەنانەت ناوی (قادر)یش لەم هەڵبەستەدا ئەوەندەی تر دەبێتە هێزو پشتیوانی روانگەری ئەوانەی لە تاوانبارکردنی (کوردی)یەوەن.

بەڵام خۆشبەختانە، وە لە هەستکردن بەوە کە (کوردی) گەلێ جار لە هەڵبەستەکانیدا یاریی بە وشە کردووە ئەمە ئەو ورووژانەی گوومانە دەرەوێنێتەوە کە خودی (کوردی) لە تاکە هەڵبەستی (دووەم) و (شەشەم) ی ئەم هەڵبەستەیدا بەو یاریی بەواتا و یاریی بە وشە کردنەی راستییەکی پاکانە بۆ خۆکردنی خستووەتە پێشی هەر لێکۆڵەرەوەیەکی ئەم هەڵەیەوە و، هەروەک گەمەکردن بەوانەی کە (کوردی) بە (شەیدایی نێرینە) تاوانبار دەکەن خۆی لەو تاوانباردکردنە رزگار کردووە، وەکو بڵێی کە (کوردی) بەو کارەی سەری لەزۆر کەس تێک داوە کەوا لە (کورتبینی)یا لە (ناوردی)وە یا لە (تێ نەگەیشتووان)ی هەڵبەستەکانی (کوردی)یەوە نەیانتوانیوە دەست بخەنە سەر راستیی مەبەستی (کوردی)و، تووشی ئەو هەڵەیەی کردوون کە ئەم رێبازو کارەی (کوردی) لە گەلێ شوێنی هەڵبەستەکانی کوردیدا هەن. ئەمەش لەوردی و توانایی خودی (کوردی)یەوە کە زانیویە، چۆن مەبەست دەردەبرێ و (تەڵە)بۆ هەندێ لە

خوێنەرانی هەڵبەستەکانی دابنێت و چەواشەیان بکات.

(کـوردی) ئەگـەرچی لە (پێنـج) تاکـە هەڵبـەسـتی ئەم پـارچە هەڵبـەسـتـەیدا وەک (دانە ڕۆکـە) داکردنێک بۆ ئەو کورتبین و ناورد و تێنەگەیشتووانە، خۆی وەها پیشان داوە کە ڕەچاوکاریی ئەوانە دروستە، بەڵام ئەوەتا، لە (دوو) تاکە هەڵبەستی ئەم پارچە هەڵبەستەیدا کە (دووەمین) و (شـەشـەمین)یاندا بە شـووڵێکی تەڕو تازە لووتـی ئەوانەی سـۆڵاندووەتەوەو، بۆ تێگەیشـتووانی هەڵبـەسـتـەکـەی خـۆی ڕوون کـردووەتـەوە کە (کـوردی) دوورو پاکە لەو تاوانبـارکـردنەی ئەم ڕاسـتـیـیـەی پێـشکەشم کـرد لـە توێی ئەم یا ئـەو سـەرچاوەی ئەم هەڵبـەسـتـەی (کـوردی) و هەڵبەستە (هاوچەشن)ەکانیدا ڕوون و ئاشکرایە و بەچاکی دەردەکەوێت کە (کوردی) دڵداری لەگـەڵ (قـادر) نـاوێکدا نەکـردووە کە لـەلای سـەرنجی قـووڵدەرانی هەڵبـەسـتـەکانی (کـوردی) دەردەکەوێ (قـادر) چی و کێ بووە وەک لەهـەر شـوێنێکی تری ئەم چەشنە هەڵبـەسـتـانەی ناو ئەم پەڕاوەییەدا ئەوانەم، بە بەڵگەی بەهێز و زانیارانەوە داناوە و یەکلاییم کردووەتەوە.

لەم پارچە هـەڵبـەسـتـەدا ئەو (قادر)ەی کـە لە (شـەشـەم)یدا هاتووە بەپێی تاکە هەڵبـەسـتی (دووەم)ی، ئەوە (قـادر بەگی کوڕی کەیخـەسرەو بەگ)ی جافە کـە زۆر دۆسـتـایەتی لەگەڵیـاندا هەبووە بەڕادەیەکی وەها کە وەسمـان پاشای جاف زاوای (کوردی) بووە، کە (عادیلە خـانم)ی کـچی (قـادر بەگی برازای کـوردی)ی مـارە کـردووە، کـە لە شـوێنی تری ئەم پەڕاوییـەدا لێی دواوم.

بەڵێ هەرگـیـز ڕاسـتی گـوم نابێت، وەک لـە ئەنجـامی بەدواداچوونی بێن درێژانەی قـووڵ و فـراوانمدا و لـە بە دەسـتـهـێنانی هەرچی زۆرتر لـەسـەرچاوەی هەر پـارچە هەڵبـەسـتـێکی (کوردی)دا و لەپەیوەندی یەکسەرەو لە نزیکەوەی ئەو کەسانەی زانیومە لە پەیکاری هەڵبەستی (کوردی)دان و سوودی زۆرم بۆ گەیشتنە ڕاستی، لێ وەرگرتوون ئەم پەڕاوییە بەڵگەی ڕادە و هێزی ئەو ڕۆچوونەمە.

سـەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە: (مس،عن، گل ٨، ن، ص، ف، ر، نم١، با) و، (کم، گ٢، س، گ٣)یەو، لـەنێـوانیـاندا (عن)و(کم)م کـردە بنکەو دەسکەلای لێکۆڵینەوەی ئەم هـەڵبـەسـتـە و بەپشـتـیوانیی سـەرچاوەکـانی تری توانیومـە، ئەم ئەنجامـە پێشکەش بکەم کە لێرەدا لەبەر دەست و چاواندایە و بڕیاردەری ڕاستیی ئەنجامی ئەم هەڵبەستە و هەموو هەڵبەستەکانی تری (کوردی)ی ناو ئەم پەڕاوەیە لێکۆڵەرەوە قووڵەکانیەتی منیش لێرەدا لە هەڵبەستەکانی تری ئەم پەڕاوییەدا هەر ئەوەندەم توانایی هەبوو کە بەپاکی بێ لایەنگری، ڕام گەیاندووە.

### ١- سەرەناوی ئەم هەڵبەستە:

سەرە ناوی ئـەم هەڵبەسـتە، کە بۆنەی هـەڵبەسـتـەکەش ئاشکرا دەکات لە سـەرچاوەکـانی (مس، عن، گل٨، ن، ص،)دا ئەم سـەرەنـاوەی خـوارەوە بەفـارسی لە پێش ئەم پـارچە هەڵبـەسـتـەی (کوردی)یەوە تیا نووسراوە کە:

(برای قادر بیک، کیخسرو بیک جاف)واتە ئەم هەڵبەستە: (بۆ قادر بەگی کەیخەسرەو بەگ جاف) دانراوە، بەڵام لە (عن)یاندا، ئەم نووسینەی دوایی لە سەرە ناوی ئەوانەی تر زۆرترێکە کە: (رحمهم الله علی). واتە (خوا بیان بەخشێ -عەلی) کە مەبەستی لە بەخشینی (قادر بەگ) وە (کەیخسرەو بەگ)ی جاف وە (خودی کوردی)یش کە لەکاتی نووسینی کەشکۆڵی (عن)دا و (کوردی) و (کەیخوسرەو بەگ) و (قادر بەگ) لەژیاندا نەبوون، چونکە لە کەشکۆڵ نووسیندا باوبووە، ئەگەر کەسانی مەبەستی ناو هەڵبەستەکە لەکاتی نووسینی کەشکۆڵەکەدا لەژیاندا بووبن، تیایاندا نووسراوە: (خوا تەمەن درێژیان کات...).

بەسەرنجدانی ئەم هەڵبەستە و هەڵبەستە هاوبەشەکانی تری (کوردی) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، جگە لە پەیوەندی تۆکمەی (کوردی) بەو کەڵەپیاوانەی جافەوە و پایەی بەرزی ئەوانەیشمان بۆ روون دەبێتەوە لە پاشایەتییە کوردییەکەی (دوا پاشایەتی)و(شا پاشایەتی)ی کورد وکوردستان بووە.

دوو هەڵبەستی کوردی کە:

(دڵ گرفتار بوو ئەمن دەمگوت عیلاجی ناکرێ) و (بۆ فریبی عاشقان و جەزبی دڵ وا ماهیری) ی (کوردی) و پایەی بەرزو ڕێزی (کوردی) لای خانەوادەی سەردارانی (جاف) دا، دەردەکەون و پەیوەندی بەهێزی (کوردی) لەگەڵیاندا ئاشکرایە.

ئەوەی پێویستە لێرەدا بەگوێرەی مێژوو دیاری بکەم، کاتی دانانی ئەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوەیەتی کەوا (کوردی) بەر لەساڵی ١٢٦٥ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٤٨ی زاینی ئەم هەڵبەستەی گوتووە، وەک لە دوو هەڵبەستە نیشانە بۆ کراوەکەی تریدا جێگیرم کردووە کە ئەم (قادر بەگی کوڕی کەیخوسرەو بەگی جاف)ە لەساڵی ١٨٤٨ی زاینی کوژراوە.

ئەمیش جیاوازییەکانی نێوان سەرچاوەکانە لەسەر ئەم تاکەی سەرەوە:

ڕوخت (ر): روحت.

ڕوخت (نم، با، گ٢، س، گ٣): روخی- ئەمیش نابێ چونکە هەڵبەستەکە بۆ کەسی نادیار (غائب) نییە و بەرامبەر بەکەسی ڕووبەڕوو گووتویەتی.

گوڵ (مس، گل٨، ف، ص):کل - ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.

گول (ر): درو.

وەک گوڵ (ن): وەک ... ناتەواوە

تەنت (ر): تن. ناگونجێ.

تەنت (نم١، با، گ٢، س، گ٣): تەنی - ئەمیش دیسان ناگونجێ.

لەبت (نم١): لب و.

لەبت (ر): لب.

لەبت (نم١، با، گ، س، گ٣): لەبی، ئەمیش نابێ.

لەعلی ڕوممانی (ر): لعل دهانی. ئەمیش دەستکارییە.

دەهانت (ر): دهن وک.

دەهانت وەک (نم، با، گ۲، س، گ۳): دەهان وەک – ئەمیش ڕێک ناکەوێ.

عوممانی (نم۱، با، گ۲، س، گ۳): ئێمانی ئەمیش هەڵەیە.

عوممانی (ن)ایمانی – دیسان هەڵەیە.

نارنجی عوممانی (ر): نارنج گیلانی. ئەمیش هەڵەترێکە.

٢– (فەقێ) ئەو کەسەیە کە خوێندنی (حوجرە) ی تەواو کردووە و دەستی کردووە بە خوێندنی زانیارییە ئاینی و زمانەوانی و زانیارییەکانی سەرێنی خۆی لای مەلایەکان لە مزگەوت چونکە هەتا چوار یەکێکی چەرخی بیستەمیش تێ پەڕی، لە کوردستاندا هەرە زانکۆ بالآیەکانی هەموو زانیاران، مزگەوتەکانمان بوون کە لەوە دوا بەرەبەرە قوتابخانەی میری کەوتنە کوردستانی عیراقەوە، ئەگەرچی لەوەبەر لە هەندێ شاری وەک (سولەیمانی)و (کەرکووک) و (مووسڵ) دا قوتابخانەی میری تاکە تاکە هەبوون بەناوی (ڕوشدیە)وە کە عوسمانی دای نابوون.

کە (کوردی) (قادر بەگی کەیخوسرەو بەگی جاف)ی چواندووە بە (فەقێ) و بەو (قادر بەگ)ەی گوتووە (ئایا تۆ فەقێیت؟؟) ئەوە لەوەوە بووە کە سەرێنی (کوردی) (فەقێ)یەکان ئەوەندە پۆشتە و پەرداخ و دەق و تەسەل و گیرفان پڕو بێ ناتەواوی بوون کە (قادر بەگ)ی چواندووە بە (فەقێ) لە ڕووی ئەو پۆشتەیی بەدەقیەی فەقێیانەوە.

هەر هۆی ئەو بایەخ پێدانە بووە کە بەسەدان (مەلاچاک) و زانای بەناوبانگ لەم هەرێمەدا هەڵکەوتوون وەک (بێتووشی) و (زەهاوی).

(نیظامی) = ناوی دوو جۆرە سوپای کوردی (بابان) بووە کە یەکەمیان لەلایەن برایم پاشای بابان و دروستکاری شاری سلێمانییەوە دامەزراوە، پسپۆڕی فەرەنگی هێناوە هونەرەکانی سەربازی و جەنگ فێری ئەفسەرە کوردەکان بکەن تا ئەوانیش مەشق بەو سوپایە بکەن کە بۆ یەکەمین جار ئەو پاشایە لەکوردستاندا دای مەزراندووە و (سوپاگەو) و (تۆپخانە) و (شوێنی چەکسازی)یان لە ڕۆژگاری ئەم (پارکی و ئازادی)یەی ئێستەی (٢٠٠٥ز)دا هەتا سەرو (چەق چەق) و (سەرچنار)دا بوو لە سولەیمانی، دوای ئەو بەماوەیەک ئەو سوپای (نیظام)ە بەرە بەرە پووکایەوە و ئەو پێشکەوتوویییەی نەما.

بەڵام دوا پاشای بابان (ئەحمەد پاشا) بۆ جاری دووەم ئەو سوپای (نیظام)ی دووەمەی دامەزراندەوە و (عوسمانی) لێی کەوتنە مەترسییەوە کە بەهەموو کارگەی تۆپ و چەکسازی و پسپۆڕی بێگانە و مەشق و چەکی نوێیەوە لە هەما شوێنەکەی سوپای (نیظام)ەکەی برایم پاشادا زیندووکردەوە و بەر لەوەی بگاتە ئاوات عوسمانی ئەحمەدپاشای ڕووخاند و کۆتایی بەپاشایەتیی بابان هێنا لە ڕۆژی ٤/ی تشرینی دووەمی ساڵی/١٨٥١ز.

(کوردی) دیسانەوە ئەوەندە (قادر بەگ)ی جافی بەڕێکوپێکی و پۆشتەو پەرداخی و پڕچەکی و نیشانچێتی و ئازایەتی و شارەزای هونەرەکانی سوپایی و جەنگ زانیوە، کە ئەوەتا لە (قادر بەگ)ی پرسیوە (ئایا تۆ یەکێکی لە ئەفسەرە نیظامی)یەکان کە ئەوەندی ئەوانیش ڕێکوپێک و وریا و پۆشتەو پڕچەکی نویَ و لێهاتووی؟ لە ڕاستیشدا ئەو قادر بەگە یەکێک بووە لە ئەفسەرە پایە بڵندەکانی (پاشای بابان) وەک زۆر لە کەسانی تری (خێڵی جاف). کە (ئەحمەد پاشای بابان) لەنێوان سالانی پاشایەتییەکەی خۆیدا: (١٨٣٩ز – ١٨٥١ز). گەشەی بەو سوپای (نیظام)ە کرد و بەلام بەرووخاندنی پاشایەتییەکە و ئەو پاشایە لەلایەن (عەبدوللا پاشای بابان)ەوە لەگەڵ ئەو سوپایەو دەزگا بەڕێوەبەرایەتییە کوردییەکانی بابانەوە هەموو گۆڕدران، بەدەزگای تورکیی عوسمانیی.

ئەو (سوپای نیظام)ە، وەنەبێ هەر (کوردی)مان بەم شێوە و لابەلاییە لە هەڵبەستیدا ناوی بردبێ، بەشکو ئەوەندە سوپایەکی ڕێکوپێک و پڕمەشق و چەکی تازەی ڕۆڵەی بەجەرگ و لێهاتووی کورد پێک هاتبوو کە چەندین هۆنەرانی ترمان بە تەسەلیتر و جوانتر لەو سوپای (نیظام)ە دواون کە لەشوێنی تری ئەم پەراوەیەدا نیشانەم بۆ کردوون.

(پێش خزمەتی شاه): کوردی کە لەم تاکە هەڵبەستەیدا (قادر بەگ)ی وەک یەکێ لە پارێزەرانی پاشای بابان (مورافیق) ناوبردووە کە ئەمەش دوو واتای تیا مەبەستە:

یەکەمیان:قادر بەگ بەپێی ئەوەی سەرخێڵێکی جاف بووە و لە فەرمانڕەواییی بابانەکانیشدا دەسەلاتدارێکی مەزنی سوپایی بووە و ئەوەندە پڕچەکی نوێی وەک ئەو (نیظام)یانە ڕێکوپێک بووە.

مەبەستی دووەم: لێهاتووییەکەی خودی (قادر بەگ) بووە کە هەر لە خۆڕا وەک یەکێ لەو(نیظامییانە)بووە، بۆیە (کوردی) بەوانی چواندووە و لەم تاکە هەڵبەستەیدا بە (قادر بەگ)ی گوتووە: (ئایا تۆ کە ئەوەندە بەبەر چاوەوەی بەو هەموو لێهاتووییە و جوانی و پۆشتەیی و پڕچەکی ئایا تۆ یەکێکی لە (مورافیق)ەکانی پادشا؟؟). چونکە ئەوەندە پشت پێ بەستراو بووە کە (پادشا) کردبێتی بە (پێشخزمەت– واتە مورافیق و ڕاوێژکارانی پادشا) خۆی.

لێرەدا و بەم ناوبردنی (پێشخزمەتی شاه)و (کوردی) دەرگایەکی ترمان لێ والا دەبێتەوە و دەخرێتە سەر پشت و کاتی دانانی ئەم پارچە هەڵبەستەی پێ دیاری دەکرێ کە بێگومان هەڵبەستەکە لەنێوان سالانی سەرەتای فەرمانڕەواییی. ئەحمەد پاشای دوا پاشای بابان (١٨٣٩ز)ە وە هەتا ساڵی (١٨٤٨ز)دا، دانراوە؛ چونکی وەک لە شوێنی تری هەڵبەستە نیشانە بۆ کراوەکەدا ساغم کردووەتەوە کەوا ئەو (قادر بەگی کوڕی کەیخوسرەو بەگ و کوڕە زای) (سلێمان بەگی) جافە لە ساڵی (١٨٤٨ز)یدا کوژراوە و، ئەم (نیظام)ەیشیان وەک ڕامگەیاند (ئەحمەد پاشای بابان) دای مەزراندووەتەوە. کە خودی ئەو (قادر بەگی جافە)ی تیا بالا پایە بووە.

هەروەک لەو سەردەمیشدا گەورە پیاوانی خێڵی جاف کە (کوردی) بەڕەئیسی خێڵی جافی ناوی بردووە، ئەو گەورە پیاوانەی ئەو خێڵە هەمتشە و بەتێکڕایی، پایەو دەسەڵاتی مەزنیان لە فەرمانڕەوایی باباندا هەبووە و دوای ڕووخاندنی (بابان) جافەکان پەیوەندییان لەگەڵ عوسمانیدا بەڕادەیەک هەبووە کە بێتە ناوبردن، هە رچەند وەک دەردەکەوێ خەلافەتی عوسمانی ویستوویەتی جافەکان بەهۆی سەرۆکەکانیانەوە هۆگری خۆی بکات، بەڵام چوست و چالاکی و جوولانەوەیەکی ئەوتۆ لەدەستدا نییە کە جافەکان لە دوای ئەوەی کە عوسمانی میرنشینی بابانی ڕووخاند، لایان دابێ بەلای عوسمانیدا ؛ بۆیە چەند پایەی پاشایەتی داونەتێ، بەڵام سەر بەعوسمانی نەبوون، بۆیە مەحموود پاشایان بەند و دەستبەسەر کرد و هەڵات.

دوڕ: ئەم وشەیە کە لە سەرەتای نێو باڵی تاکی دووەمی ئەم پارچە هەڵبەستەدا هاتووە، مەبەست لەناوی جۆرە گەوهەرێکی ڕوون و جوان و بریسکەدار و پڕشنگدەری جۆرەها ڕەنگە لە ڕووناکیدا و، لەگەلێ پارچەی هونەرمەندانەی جوان و لە خشڵدا بەکار هاتووە و دەهێنرێت. لەکۆندا و تا ئێستاش بەسەر نووکی سەرەوەی تاجی پاشایانەوە چەسپ کراوە، واتە (چقە)کەی تاجی پێ ڕازاندراوەتەوە. هەروەک لە سەرچاوەکانی (عن، ن، ص)ی ئەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە کە لە جێگەی (دوڕی موڵکی) تیایاندا نووسراوە (دوڕی تاجی).

هەروەها کوردی لەم تاکەدا مەبەستی لە (دوڕ) شتێکی نایابی (موڵکی سولەیمانی) یا (موڵکی سولەیمان)ی کە یەکەمیان مەبەست (موڵکی شاری سولەیمانی) واتە پایتەختی ئەوسای بابان و، لە دووەم جار مەبەستی لە موڵکی (سولەیمان بەگی) باپیری ئەو (قادر بەگ)ە بووە کە ئەم هەڵبەستەی بەسەردا هەڵداوە، کە ئەو (قادر بەگی جاف)ەی وەک ئەو (شتە نایابە)یان بە (دوڕ) پێناسە کردووە. کە موڵکی (سلەیمان بەگە) کەشی لە قەڵەمڕەوی (سلەیمانی)ی پایتەختدا دیاری کردووە، کە ئەوەش وردەکاری و کەڵک لەو (وێ چووە)شە وەرگرتن و، باڵا دەستی (کوردی) بووە، لەهۆنەرێتییەکەیدا بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

وەیا (قادر بەگی)کردووەتە دوڕی تاجی سەری (سەلەیمان بەگی باپیری)و دووریش نییە ئەو کاتەی دانانی هەڵبەستەکە (سولەیمان بەگ) لە زۆر پیریدا لە ژیاندا بووبێ و لەبەر پیری سەرۆکایەتیی خێڵی جافی سپاردبێ بە (خوسرەو بەگی کوڕی)کە ئەو (خوسرەو) بەگەش باوکی قادر بەگی جاف بووە.

ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکەیە لە سەر چاوەکانیدا:

فەقێی (ر): فقه.

یاخود (ف، ر، نم١، کم، گ٢، س، گ٣): یاخو.

یانە خۆ پێش خزمەتی شاهی (ر): یاغلام پیش شاهی– ئەمەش لەنگە.

ڕەئیسی ئێلی جافانی (ر): ستونی ملک جافانی.

ئێلی (با): اهلی، نسخه، عیل.

دوڕی موڵکی (عن، ن، ص) دوری تاجی- وەک لەپێشەوە نیشانەم بۆ کردووە. ئەم تاکە لە (ر)دا دواتاکە.

٣- حوسن: جوانی.

حوسنی یووسف: ناوی گوڵێکی جوان و پەسند و نایابە لە کوردستاندا.

یووسف: حەزرەتی یووسف پێغەمبەرە، سەرەڕای ڕواڵەت و ڕەوشتە پەسند و باڵاکانی، بە (جوانی)یش بەناو بانگ بووە، بۆیە، (کوردی) جوانێیتی (قادر بەگی جاف)ی بە جوانی یووسف (یووسف ئاسات) ناوبردووە، لە قورئانی پیرۆزیشدا جوانێتی (یووسف) بە جوانێیتی (فریشتە - مەلائیکە) چوێنراوە، (مستەر ریچ) لەگەشتەکەیدا لە جوانێتیی (خوسرەو بەگی باوکی ئەو قادر بەگە) دواوە کە دیارە (قادر) بەگیش لە جوانیدا چووەتەوە سەر باوکی کەوا (کوردی) بەو جوانەی ناوبردووە، وەک ڕەوشت جوانی (یووسف).

خولق: ڕەوشت و خوو کە (مستەر ریچ) لە ڕەوشتی جوان و بەرزی فاملیای (خوسرەو)بەگی باوکی (قادر بەگ) دواوە.

لوطف: میهرەبانی، دڵسۆزی، بە (بەزەیی)، قسەخۆشی،

شیرین: وەک واتای، (خۆش) ،(دڵگیر) ،(جوان). دەدات هەروەها: وردەکارییەکە (کوردی) ئەم (وشە) یا(ناو)ی (شیرینەی) لێرە داهێناوە کە لە (داستانی شیرین و خوسرەو)دا پاڵەوانێکی داستانەکەیە و (کوردی) جوانکاریی لەم ناوی (شیرین) و (خوسرەو) بردنەدا ڕاگەیاندووە.

چراغ: چرا، لالە، مەبەست ڕووناکی بەدڵان گەیاندنی (قادر)بەگە کە وەک چرای دیوانی (خوسرەو)بەگی باوکیشی وەهابووە و مایەی خۆش ڕابواردن و هیوا پێ بوون و دڵ پێ خۆشبوون و دیار بووە، لەناو ژینگە و کۆمەڵەی خۆیدا وەک لالە ڕووناک و تیشکدەر بووە.

خوسرەو: (خوسرەو بەگی سولەیمان بەگی جافە)کە باوکی قادر بەگی ناو ئەم هەڵبەستە بووە و لێرەدا بەتەواوی (کوردی) ساغی کردووەتەوە کە ئەو جوان و دۆست و خۆشەویستەی کە ئەم هەڵبەستەی بەسەرا هەڵداوە (قادر بەگ)بووە بەشێوەیەکی (نا)یە کەندەردوویی، بەڵام لەتاکی شەشەمدا بەیەکسەر و بەتەواوی ناوی ئەو کەسەی هێناوە کە ئەم هەڵبەستەی بۆ داناوە و بەڕاست و ڕەوانی ناوی خودی (قادر)ی تیا بردووە.

ئەم ڕوونکردنەوانەم لەسەر دیاریکردنی (کێیەتی)ی ئەوەی ئەم هەڵبەستەی بەسەردا هەڵدراوە و ئەو ناوی (قادر)ەی کە لەتاکی شەشەمی ئەم پارچە هەڵبەستەدا هاتووە، دەمکوتی ئەو سەرچاوانە دەکات کە (کوردی)یان بە (قادر)ەوە تاوانبار کردووە، سەری پەشیمانییان پێ دادەنوێنێ.

هەروەها ئەو (خوسرەو)ەی لەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە نیشانەیە بۆ (خوسرەوی پەروێزی پادشای ساسانی)ی باپیرانمان کە (کەسێتییەکی) دیاری داستانی (شیرین و خوسرەو) بووە

و کـە (خـوسـرەوی پەروێز) وا دەنگی لەسەر بلاوە، هەمیشە لە خـۆش ڕابواردندا کـۆڕ و (مەجلیس)ی پڕ و ئاوەدان بووە لە دەنگخۆش و، هۆنەر و وێژەوانـان. لێرەدا (قادر بـەگ) کراوە بەچرایەکی ڕووناکی ئەو (مـەجلیس)انەو، سـەرەڕای ئەوەی کـە (خـوسـرەو)یش باوکی (قـادر بەگ)بووە، کـە لەتاکی شـەشـەمی ئـەم پارچە هەڵبـەسـتـەدا ناوی براوەو لەتاکی دووەمـدا ناوی (سـولەیمان بەگی جـاف)ی باپیری (قـادر بەگ)و لێرەش ناوی (خـوسرەو بەگ)ی بـاپیری (قـادر بەگ) هـاتـووە کـە (کـوردی) لەم شـوێنـانەی ئەم هەڵبـەسـتـەیدا بەڕوون و ڕەوانـی کـەسـەنیی (قـادر)ی ڕاگـەیاندووە کـە (قـادر بەگی جـاف)ی کوڕی (کـەیخـوسـرەو بەگی جـاف)ی کـوڕی (سـولەیمـان بەگی جـاف) بـووە وە، بەڵام نەک هەر یەکـەو ڕاست و لەیـەک شـوێندا ئـەمـانەی دەربڕیبێ بەشکو وەک یاریکردنێکی وێژەیی لەم چەند شوێنانەدا مەبەستی داو بەدەستەوە کە ئەم (قادر)ە کێ بووە.

ئەم کـارەشی بـووەتە هۆی ئەوە کـە کـۆلکە وێژەوانان یەکـەو ڕاست (قـادر)ەکـەیان بۆ سـاغ نەکـراوەتـەوە جگە لەوەی کـە هـەر (کـوردی) لەچەند پـارچە هەڵبـەسـتی تریدا دیسـان ناوی (قـادر)ی بردووە و بەڵام هەر جـارەیان مـەبەست لە (قـادرێکی دیکە)بووە کـە ئەوە سـەری لەو کـۆلکە وێژەوانانە شـێـواندووە، وەک بەناڕەوایی ئەو (کـوردی)یە پاک سـۆفـیـیـە ڕاسـتـەیان بە (قـادر) ناوێکەوە تاوانبـار کـردووە کـە من لەهەر شـوێنێکدا نـاوی (قـادر)م بردبێ بە بـەڵگەی بەهێزی زانیاری پەسندەوە ڕوونم کردووەتەوە لەم پەڕاوییەدا کە هـەر جارەی مـەبەستی لەکام (قادر)بووە،

نووری دیدە: ڕۆشنایی چاو، ڕووناکایی چاو. مەبەست لە هێزو هەستی بینینی چاوی پیری کەنعانە، کە (یووسف) ئەو نووری دیدەی (یەعقووب)ی باوکی بووە. لێرەدا (کوردی) ئاگاداری خـۆی لە داسـتـانی ژیانی حـەزرەتی (یووسف)ڕاگـەیاندووە، کـە کـاتێ برایەکـانی (یووسف) بەناوی سەیرانەوە خستیانە بیرێکەوە و کراسەکەی (یووسف)یان خوێناوی کرد و بۆ باوکیان هێنایەوە کـە گوایە (گورگ) (یووسف)ی برایانی خـواردووە، باوکیـان لەخـەفـەتی (یووسف)دا هـەردوو چاوی کوێر بوون.

پیـری کـەنعـان: (کـوردی)شـمـان (قـادر بەگ)ی بەنووری چاوی (پیـری کـەنعـان) ناو بردووە مـەبەستی لەو پیرە (سولەیمـان بەگی جافی) باپیری (قادر بەگ) بووە و لێرەشدا (سـولەیمان بەگ)ی کردووەتە (یەعقووب)ی باوکی (یووسف)کە ـپیری کەنعان) بووە.

ئەم تاکـە هەڵبـەستی سـێیـەمـە لە هەمـوو سـەرچاوەکـانیـدا چونیـەکەو وەک چۆن لەسـەرەوە نووسیومە لە وانیشدا ئاوهایە.

لە سەرنجدانێکی ئەم تاکە هەڵبەستە لە ڕووی وێژەی کۆنەوە دەبینین کە (کوردی) لە داستانی (شـیـرین و خـوسـرەو) و، (یووسف) و (یـەعـقـووبی) باوکی و (خـوسـرەو بەگی جـاف) و (خوسرەوی پەروێز)ی لەمەڕ (شیرین)ی لەیەک تاکە هەڵبەستدا گرد کردووەتەوە کە ئەمەش

لەتوانای هۆنەرێکی کۆنی وەک (کوردی)دا بووە خۆ کە لە ڕووی جوانێتی و جوانکاری و وێژەییییەوە بڕوانییە ئەم تاکە بەپێی (نەریتی وێژەی کۆن) هونەری (لەف و نەشر)ی تیا نواندووە لە جۆری (لەف و نەشری مووشەوەش)ە کە سەرەتای تاکە هەڵبەستەکە (حوسنی یووسف)ە، دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی تاکە هەڵبەستەکە کە (پیری کەنعان)ی باوکیەتی.

هەروەها (شیرین)و خوڵق و لوتفەکەی لەکۆتاییی نیوەی یەکەمی هەڵبەستەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ (چرای بەزمی خوسرەو)، کە لە سەرەتای نیو باڵی دووەمی تاکە هەڵبەستەکەدایە و لەدەستووری وێژەی کۆندا بەجوانی و کارامەیی دانراوە، واتە بەپێی ئەو دەستووری وێژەیەی کە (کوردی) هەڵبەستەی لەسەر داناوە، جوانی و لێهاتوویی و پەسندی و دیاریی خۆی هەبووە، بەڵام ئێستا ئەو جۆرە کارانە بەرچاو ناگیرێ و بێ بایەخن.

٤- (ظاهیر) ئەم وشەیە لەڕووی زمانییەوە، واتای (سەرزاری) دەدات، کە (کوردی) لێرەدا ئەم واتایەشی مەبەست بووە.

هەر ئەم وشەیەش لەڕووی مەبەستێکی تری (کوردی)یەوە ناوی باپیری باوکی (قادر بەگی جاف)ە، ئەویش (ظاهیر بەگی جاف) بووە کە من بەدڵنیاییییەوە و، لە سەرچاوەی دەمیی باوەڕپێکراوی خودی گەورە پیاوانی جافەوە کە ئەم ڕاستییەم پێ زانیوە کە (قادر بەگ) کوڕی (خوسرەو بەگ -یا- کەیخوسرەو بەگ)ی کوڕی (سولەیمان بەگ) کوڕی (ظاهیر بەگ)ی جاف بووە.

کەواتە شاعیرمان (کوردی) لە بەکارهێنانی (وشە) و (ناو)ی (ظاهیر)دا مەبەستی هەم لە وشەی (بەڕواڵەت - بەسەرزاری)و هەم لەناوی باپیرەی خانەوادەی سەرخێڵی جافانە بووە، یا بەهێما (ڕەمز) نیشانەی بۆ ئەو (ظاهیر بەگ)ەیش کردووە لەم تاکە هەڵبەستەی چوارەمەی سەرەوەدا.

سادە: ئاسایی، بێ غەش، بێگەرد لە (ڕوخسار)دا کە بەبێ ئارایشت و خۆ ڕازاندنەوە ڕوو بێگەردێکی سروشتی بێت، وەیا کوڕێک کەوا هێشتا مووی لێ نەهاتبێ ویا لە دەمە دەمی سەرهەڵدانی گەندەمووی سمێڵ و ڕیشدا بێ.

جگە لەمانەش وشەی (سادە) بەواتا: (سەروەر کۆمەڵێک) لە خەڵقە، کە (قادر بەگ)یش هەر لەمێرمنداڵییەوە ئەوەندە لە هەموو ڕوویەکی ڕواڵەتی سەرخێڵی و بەڕێوەبەرایەتییەوە لێهاتوو بووە، جگە لەوەی براگەورە بووە، بۆیە باوکی کردوویەتە بەشێکی خێڵەکەیان (نەک حەمەد پاشا).

سادە لەوح: سادە دڵ، دڵپاک، دڵساف و بێ فێڵ و ساختە و تەڵەکە.

کە (کوردی) لەم تاکەدا (قادر بەگ)ی بەو هەموو واتای (سادە)و (سادە لەوح) پێناسە کردووە.

(کوردی) وشەی (ظاهر)ی بەمەبەستی ئاماژە بەناوی (ظاهر بەگ) باپیری لەیەکچوونی لەگەڵ (قادر بەگ) لەم تاکە هەڵەبەستەیدا ڕایگەیاندووە، و لەهەموو سەرچاوەکانی ئەم تاکە

هەڵبەستەدا (ظاهیر)ە نەک (تاهیر). دوای ئەوەی کە(کوردی) (قادر بەگ)ی لە ڕووی سەرزارییەوە بە (سادە)و بە (سادە لەوح) ڕاگەیاندووە لەسەرەتای ئەم تاکە هەڵبەستەدا کە ئەو ڕواڵەتە سەرزارییەی وەک ڕوو (ڕوخ)ی خودی (قادر بەگ) بێگەرد ناوبردووە، ئەوەیان دوا بەدوای ئەوە (هەر لەنیوە باڵی یەکەمدا) بەجۆرێکی تر ئەو قادر بەگە سادە و دڵپاکەی بە (وەحشی)واتە (دڕندە و کێوی) ناوبردووەتەوە. بەڵام ئەو (وەحشێتی)یەی نەک لە ڕەوشت و خوودا بەشکو لە چاوە جوانەکانی (دیدە)ی (قادر بەگ)دا ڕاگەیاندووە کە لە جوانیدا دڵی تەماشاکارانی چاوی قادر بەگی کردووە بەنێچیر بەدەست کاریگەرییەکەی چاویەوە کە دڵیانی پێکاوە و ئەنگاوتوونی، کە ئەمەش (مەدح) نەک (زەم)ە کە (کوردی) دیمەنی (قادر بەگ)ی لە سەرزاری (ظاهر)یەوە هەم بەسادە و بێگەرد و پاکی ڕوخسار و هەم بە(وەحشی)یەتی کاریگەری چاوی تاساندووە.

بەڵام لەنیوە باڵی دووەمدا لەبارەی (دەروونی) و (ناوەوەی) (قادر بەگ)وە دواوە کە فەرموویەتی:

لە دڵدا تۆ (حەکیمی) و (عاقڵی).

حەکیمی: بەواتە پزیشکی، یابە (حەکیم = هۆشمەند = کارزان) لێی دواوە کە (قسە ڕەوایی وە تێگەیشتن)یشە ئەبێ ئەوە بزانین کە کوڕە ئاغایان و بەگزادانی سەرەک خێڵەکانی کورد بەزۆری دەبێ چەند لێهاتوویییەکیشیان بووبێ وەک پسپۆڕی لە (گەردوونناسی)دا، واتە شارەزایی لە باری کەش و تووشی (وەرزەکانی ساڵ) و پسپۆڕی لە ئاژەڵداری و پاوەن و لەوەڕگاو (دەردودوو)ی ئاژەڵ و مرۆڤ و چارەیاندا ببێ.

عاقڵی: ژیری، هێژایی ئەم (قادر بەگ)ە بەژێر ناوبردنەی (کوردی) بەڵگەیەکی تری زیرەکی و ژیریی (قادر بەگ)ە، ئەم دوو ڕواڵەتی (حەکیم) و (عاقڵ)یەش لە کەسێکی دێرینەی وەک لوقماندا هەبوون بۆیە (کوردی) ئەو (قادر بەگ)ەی بە (ئوستادی لوقمان) ناوبردووە و، مامۆستای لوقمان.

لوقمان: لوقمانی حەکیم، کە لە هەمان کاتدا بەپێی هەندێ سەرچاوە گوایە پێغەمبەریش بووە، بەڵام هەرچی بووبێ ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا بەڕەوشت چاک کە خەڵکی ئاڕاستەی ڕێگەی ڕاست و حەق پەرستی و خواناسی کردووە، ناوی هاتووە، کە لە (سووڕەت)ی (لوقمان)دایە لەشوێنی تری ئەم پەڕاوییەشدا بەدرێژی لێی دواوم.

٥- کوردی لەم تاکە هەڵبەستەدا ڕواڵەت و دیمەنی کەسانی هەرسێ نەتەوەی دراوسێی هەرە نزیک و یەکسەرەی کوردستانی گەورەی لە خودی (قادر بەگ)دا ڕەچاوکردووە کە ئەو نەتەوانەش:

عەرەب: نەتەوەیەکی نیشتەجێی بەشی خواروو (باشوور)ی کوردستانی گەورەیە، لە زۆر کۆنەوە بەپێی دراوسێتی و دواتر بەهۆی ئیسلامبوونی کوردەوە کە پەڕاوی پیرۆزی ئەم ئاینە بەزمانی (عەرەبی)یە، کورد بەچەندین جۆر یاریدەی گەورە گەورەی عەرەبی داوە و پشتیوانیی

له (عەرەب) كردووە.

(كوردی) كـە لەم تاكـە هەڵبـەسـتـەدا جـوانێـتـیی (قـادر بەگ)ی بەجـوانیی ئەندامـی (عـەرەب) چواندووە، بـەزۆری لەمـەڕ پێزانینمـانەوەیە كـە عـەرەبمان بەبراگـەورەی خـۆمـان دانـاوە، بۆیە لەهەر شتێك و بابەت و بۆنەیەكدا ئەوانمان هەڵناوە و بەسەر دەستمان داناون.

له رووی جـوانێـتی و ئەندامی عـەرەبیشـەوە ئەگـەر لێكۆڵینەوەیەكی مـەیدانی فراوان بەناو تاكە تاكەی (عـەرەب)دا بكرێ دەرئەكـەوێ كـە رێژەی (جـوان)ی ئەوان سـەد یەكی رێژەی (جـوانی)ی كورد، نییـەو دیسـان كوردی لەسـەر ئەو پێوانەی رێز لە (عەرەب) گرتنەمان ئەوەتا (كوردی) ئەو ئەندامە جوانە كەم هـاوتایەی (قادر بەگ)ی چواندووە بەجوانیی ئەندامی عەرەب.

ئەم نەریتی (عەرەب) بەجوان دانانە وەك نەریتێكی (باو)ی ناو شاعیرانی نتەوە ئیسلامەكانی تریشدا لە هەڵبەستیاندا لە هەمان هەستی رێز لە (عەرەب) نا نەوەیە و بەس و، بووەتە كارێكی چاولێكەری وێژە و هەڵبەستی كلاسیكی.

(فارس) هەر لەم تاكە هەڵبـەستەدا (كوردی) دەم دووی شیرین و خۆش گوفتاریی (قادر بەگی) چواندووە بە زمـان شـیـرینیی (فـارس)، ئەمـەش لە دواكـەوتنی قـسـەیەكی نەسـتـەقی (فـارس)ەكانـەوەیە كە گـوتوویانە: (عربی هنر است، فـارسی شكر است، تركی گوز خر است) واتە زمـانی عـەرەبی هونەرە لەوەوە كـە ئەمـەندە زمـانێكی قـژقـژاوی و پیـتی ڕەق و سـەخت و ناقۆڵای وەك (ث، ن، ح، ذ، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ق) لە وشـەكانیاندایە كە لەسـەر زاری نەتەوە (ئاری)یەكـانی وەك (فـارس) و كـورد و... هتـد زۆر گـرانن بەهونەر دانراوە لە زمـانەكـانی ئەم ڕەگـەز (ئاری)یانەدا نیـیـە. بۆیە فـێـربوونـی هونەرمـەندییـەكی تایبـەتـی دەوێت بۆیە زمـانـی (عەرەبی) بە (هونەر) ناوبراوە.

لەو قسـەی نەستـەقـە فـارسییـەدا هـاتووە كە (زمـانی فـارسی شـەكـەرە) لە ڕاستـیشـدا وایە و زمـانێكی شـیـرین و وێژە بەرز و پێشكەوتووە لەجیـهـاندا، هـەرچەند قسـەی نەسـتەقـە (فـارس) خـۆی بەخـۆی گـوتووە لە نرخـی قـسـەكـە (دا دەشكێنێ) لەچاو ئەوەدا ئەگـەر نەتەوەیەكی تر وەهـای بەزمانی (فارس) بگوتایە كە ئەوسا بایەخدارتر دەبوو.

هەمـان قسـەی نەسـتەقـە فـارسـییـەكە لە بارەی زمـانی توركـییـەوە بە (تڕی كـەر) ناوبراوە كە لەڕاستـیدا توركی ئەگـەر بشێت بەزمان ناو ببرێ، ئەوا زمانێكە لە چین و لە مـەغۆلی و تاتاری و زمانەكانی ناوچەكە پێك هاتووە.

له رووی فەرمـوودەی (كوردی)یەوە كـە زمـانی شـیرینی (قـادر بەگی) بە (فارسی كـەلام) داناوە، هـەرچـۆنێك بێ یـەكێ لە ڕواڵـەتەكـانی (قـادر بەگ) بێگومـان زمـان شـیـرینـی بووە، چونكە (كوردی) هەموو هەڵبەستەكانی یا بەزۆرە (بابەتییانە) ترن و زانیویە چی فەرمووە.

سـێیـەمـین ڕواڵەتێكی كـە (كـوردی) لە بارەی (قـادر بەگ)ەوە لەم نیـوە تاكی یەكـەمی ئەم تاكی پێنجەمەیدا ڕای گەیاندووە ئەوەیە كە (قادر بەگ)ی بە (تورك ڕەفتار) ناوبردووە.

دەشـزانرێ کـە ڕەوشت و کـردەوەی (تورک) لەکـاتێکدا کـە بەهـۆی هێـرشـەکـانی (مـەغـۆل) و (تاتار)ەوە بـەناوچەی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتـدا بڵاوبوونـەتەوە، هەڵوێست و ڕەوشـتـیـانـی هـەر دڕندەیی و نامرۆڤایەتی و خوێنمژی و قەلاچۆکردنی گەلانی ناوچەکە و تالآنکاری و کوشتن و بڕینی و وڵاتان داگیرکردن بووە و ئەو وڵاتانەیان گۆڕیوە بە نیشـتـمانـی تورکی بەناڕەوایی لە گۆڕیندان، بۆیە بە(تورک ڕەفتار) واتە ڕەفتار خراپی داناون.

ئەمجا (کوردی) کە (قادر بەگ)ی بە(تورک ڕەفتار)داناوە ئەوە لەوەوەیە کە شـاعیران لە بابەتی خۆشەویستی ڕاگەیاندندا لە هەڵبەستیاندا جوانیی خۆشەویستەکانیان بەجۆرە کاریگەرییەک داناوە کە وەک (بەد ڕەفـتـاری تورک)وایە بەرامبـەریان و ئەوەش نەریـتـێکی ویژەیـیـیـەو دەنگ لە جوانیدانە نەک لە خراپ ناوبردنی خۆشەویستەکانیان.

(کورد)یشـمـان لەم وێچواندنەی (قادر بەگ)ی دا بە(تـورک ڕەفتار) هـەر تەنیا شـوێن ئەو نەریتە ویژەیییە کـلاسـیکییـە کـەوتووە، ئەگەنا سـەراپا ئەم هـەڵبـەسـتـەی و دووهـەڵبـەسـتـە ناوبراوەکـەی تریشـی و لە شـوێنی تری هـەڵبەسـتـەکـانیـدا بەبێ سێ و دوو خـۆشەویستی خـۆی بەرامـبـەر بە (قـادر بەگ) ڕاگـەیاندووە و هـەڵی ناوە و، ئەم بـە(تورک ڕەفـتـار) ناوبرانەشـی لایەنی هەڵنان دەگرێ نەک دژی (قادر بەگ)بوون.

تا ئێرە لێکدانەوەی نیـوە باڵی یەکەمـی شـەشـەم تاکی پێنجـەمـەی سـەرەوەم ڕاگەیاند و ئەمـەی دوایش لێکدانەوەی نیوە باڵی دووەمی ئەم شەشەم تاکەیە، لە پارچە هەڵبەستەکەدا.

نیگا: ڕوانین، تەماشا.

ئاهوو: ئاسک، جەیران، مامز.

نیگا ئاهوو: مـەبەسـتـی لە ڕوانینی ئاسکە، بەم لاو ئەم لای خـۆیدا بە چاوە ڕەش و جـوان و دڵگیرەکانی ئاسکەکە کە ئەوەندەی ئەو ڕوانینە، ڕوانینی چاوی (قادر بەگ) جوان بووە کە لەم تاکەدا و جاری تریش لەو چاوانەی دواوە.

کـەبک: کەو، کە مەلێکی شـاخ و چیـایی و خاڵ میلداری جوانە و خـوێندنێکی خـۆشی هەیە لە کوردستاندا زۆرە

ڕەوت کـەبک: کـەو لە کەلەپووری کورەواریدا زۆری ئاگەداری لەسـەرە، ئەوی بۆ ئێرە مەبـەسـتـە (ڕۆیشتنی کەو)ەکەیە کە بە(لارولەنجە)و (فیز)و لە خۆبایی بوونەوەو دەڕوات.

زمـان تووتـیی خـۆش ئەلحـانی: تووتی مـەلێکی جـوان و ڕەنگین و دەنـووک قـولابییـەو ئەوەندەی کۆترێک ئەبێ، بەڵام درێژترێکە و لە گەرمیاندا دەژی.

ئەم باڵندە تـیـژ ڕەوە زۆر زیرەکە و بۆیە توانای ئـەوەی هـەیە ئەو دەنگەی دەیبـیـسـتـی دووبارەی ئەو دەنگە یا و ێچـووی ئەو دەنگە بکاتـەوە جـاری تر ئەگـەر هـانی دووبـارەکـردنەوەی درا بەوەی کـە جـاری تـریش ئەو وتەیەی بەگـوێدا بدەن ئەوا بۆ مـاوەیەکی زۆر دەنـگەکـەی لەبیـر دەمـێنـێ و دووبارە و چەند بارەی دەکاتەوە.

تووتیی خۆش ئەلحان؛ هەرچەندە وشەی ئەلحان کە لە(لەحن)ی عەرەبییەوەیە واتە: (ئاهەنگ، ئاواز، ئاوازی خۆش دێت و، مەبەست لە گوتنی ئەو دەقە پەسندەیە لەلایەن تووتییە فێرکراوەکەوە دەبیسترێ). لەهەمان کاتدا (لەحن) بەواتای (وشە)یش دێت.
(کوردی) لە زمانی شیرین و وشە پەسندیدا (قادر بەگی) چواندووە بەو تووتییە دەقی جوانبێژانە هەروەک جوانیی ڕۆیشتنی قادر بەگ وەک هی کەوەکە بەلار و لەنجە بووە.
لە هەڵسەنگاندنی ئەم تاکە هەڵبەستەدا بەپێی وێژەی کۆن نەریتی جوانکاری (لەف و نەشری موشەوەش) هەیە کە لە هەمان کاتدا عەرەب ئەندامییەکە وەک جوانی چاوی ئاسک و ڕەوتی لە خۆباییەکەوە، کە وەک بەکردەوەیی تورک و خۆشخوێنییەکەی تووتی وەک زمان شیرینییەکەی (قادر بەگ).

٦- قادر: توانا، وە ناوی (قادر بەگ)یشە کە لێرەدا بە ئاشکرا ناوی بردووە.

قادری: دەتوانی کە کوردی ڕووی کردووەتە قادر بەگ و پێی گوتووە تۆ توانا هەیە بمکوژی.
قەتڵ: کوشتن کە مەبەستی لەوە بووە: ئەی (قادر بەگ) تۆ دەتوانی من بکوژیت و، (کوردی) و (قادر بەگ) کە دۆستی یەکتری بوون دیارە (کوشتنی ڕاستی)ی مەبەستی نەبووە، بەڵکو بەکاریگەریی جوانییەکەی دڵی (کوردی)، پێکاوە و، یا بە دۆستایەتییەکەیان دڵی (کوردی)ی ئەنگاوتووە ڕای کێشاوە بەلای خۆشەویستیی (قادر بەگ)دا.
فکرێ بکە قوربان: بیرێک بکەرەوە ئەی باڵا گەردانی سەرت و (گوریی) تۆ بم، ئیتر ڕەفتارت لەگەڵ مندا وەک ڕەفتاری مێرمناڵێک نەبێ، هەروەک لە تاکی چوارەمی ئەم پارچە هەڵبەستەدا (قادر بەگ)(*) (بەسادە لەوح)(*). ناو نووس کردووە کە دیسانەوە تەمەنی مێرمناڵی و هەرەتی گەندە مووی ڕیش و سمێڵ دەرکردنی (قادر بەگ) بووە. کە هاتی ڕیش و سمێڵ لە کەسێکدا لە تەمەنی سادە لەوحی و (مێر مناڵی) تێپەڕ دەکات و (کوردی)یش (قادر بەگ) وریا دەکاتەوە کە ئەبێ لەوەدوا هەڵوێستی پیاوانەتری لەگەڵ (کوردی)دا ببێ کە ئەو خواستی (فکرێ بکە قوربان) لە نیوە باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا مەبەستی ئەو خواستە ڕوون دەبێتەوە. کە فەرموویەتی: «لەسەر صفحەی ڕوخت، وەختە عەیان بێ: خەططی ڕەیحانی» واتە:

صفحەی ڕوخت: تەختی ڕوخسارت، پانتاییی ڕووت (ڕوومەتت).

عەیان بێ: دەربکەوێ، سەر هەڵبدات، ئاشکرابێ کە بەچاو ئەو ئاشکرا بوونە ببینرێت، مەبەست لەو ئاشکرا بوونەش دەرهاتنی گەندە مووی سمێڵ و ڕیشیەتی کە (کوردی) بەزمانێکی ناسکی وێژەییانە ئەوەی بە: (خەططی ڕەیحانی) دەربڕیوە، ئەمجا:
خەططی ڕەیحانی: کە (خەط) مەبەست لە نووسینە و (ڕەیحانی) بەواتا (ڕێحانەیی) واتە

---

(*) لە لێکدانەوەی مانای باڵ (بەیتە)کانەی پێشووی ئەم شیعرەدا، قادر بەگ ئەفسەرێکی لێهاتووی سوپای بابان دانراوە، ئەمەش لەگەڵ لێکدانەوەی ئەم بەیتە شیعرەدا یەک ناگرێتەوە.

نووسینەکە (ڕێحانەیی)بێت، واتە جۆرە (خۆشنووسی)ی (ڕەیحانی)،
هەروەها (ڕێحـــان) ڕوەکـــێکی تەڕیی بۆنخـــۆش و ڕەنگ ڕەش و ڕەش ســـەوزە، کـــە (بۆنخۆشی)یەکەی، بەبۆنی خۆشی ئەو (گەندە مـوو)ەی تازە دەرهاتوو لە ڕوخسـاری (قادر بەگ) چواندووە کە بە(وەختەی) داناوە، واتە: هاکا، یاسـەرەتی ئەوەیە کە ئەو گەندە مووت لێ بڕوێت و، وەک قسـەیەکی نەستەق لە کوردەواریدا بەو تازە گەندەمووە بەگاڵتەو، قەشمـەرییەوە دەڵێن: (سـمێڵ گوو گـر بووە) بەڵام (کوردی) بە(خەططی ڕێحـانی) ناو بردووە کـە ئەو خـەت (خـەط)ەش وەک (ڕەوشـتی) ڕێحـانەکە ڕەشـە واتـە گەندە مـووەکەی ڕەش و بۆن خـۆشـە وەک (ڕەشـە ڕێحانە) چونکە (ڕێحانە)یش هەیە کە (ڕەش داگەڕاو) نییە و هەر سەوزێکی ڕووتە.
دوامەبەستی (کوردی) لەم (وەصف)ە جوانەی وێژەیی دێرینانەیدا ئەوە کە ئیتر تووکی ڕیش و سمێڵت هاتووە و لەقۆناخی مێرمناڵییەوە چوویتە قۆناغی (پیاوانی)یەوە وە ئەمەشی نەک وەک ئەوەبێ کە گوایە (قادر بـەگ) ڕەفتاری ناڕەوای مناڵانەی بەرامبـەر بە(کوردی) بووبێ، چونکە ژیر و تێگەیشتوو بووە کە لە پێشترا (کوردی) دەنگی لەو ژیرییەی و تێگەیشتوویی (قادر بەگ) لە تاکە هەڵبەستی شەشەمی ئەم هەڵبەستەدا دواوە، کەواتە (کوردی) ئەم وریا کردنەوەیەی بۆ (قـادر بەگ) وەک ئامـۆژگاری کـردنێکی مـام بۆ برازای خـۆی وا بووە کـە خۆشـی لە خـۆمـان چوویتە ڕیزی پیاوانەوە سەرەڕای ئەو هەموو (وەصفەی) پێشوو بوویتە پیاوی تەواو بە(ڕیش و سمێڵ)دا.

٧- بولبول: جۆرە باڵندەیەکی (چۆلەکە)یییە لە قەبارەدا، بەڵام لە ڕەنگ و خاڵ و مێڵی ڕەش و سپی و کەوەییدا لە چۆلەکە جیاوازە و یەکجار دەنگی خۆشـە و خـوێندنەکە لەسـەر سـاز و ئاوازی موسیقییەکی ڕێکوپێک و (نۆتە)یییەکی دڵگیری سروشتییە.

وەکو (کوردی) لەم دوا تاکە هەڵبەستەیدا خۆی بەبولبول چواندووە و خۆی خـواستی هەمیشـە خوێندن واتـە (فیغـان) = هـاوار کردنی لە خـۆی کردووە کە لەکاتی دەمکردنەوەی خونچەدا بەو خەو لێکەوتنە دوورکەوتووەتەوە لە خونچەکە و (کوردی) دوورکەوتنەوەی خۆی لە (قادر بەگ) بە دوورکەوتنەوەکەی بولبولەکە داناوە کە غونچە و گوڵە.

ئەم چەشنە چواندنەش، نەریتێکی هۆنـەرانە کە لە هـەڵبەسـتیـاندا (بەم) یـا (بەو)شـێوە لەم داسـتـانی گـوڵ و بولبـولە دواون لە وێژەی کۆندا و سـەرکەوتووترینیـان ئەوەیان بوو کە شـێوە دەربڕینەکەی لە شـێوەی شاعیرانی تر کاریگەرتر بێ و هەرچەندە هەمووشیـان و هەر یەکەیان بە شـێوەی خـۆی لە هەمـان داسـتـان دواون کە خوێندنی بولبولەکەیان نەک بۆ جـووتگرتنی ناو خۆیان بەشکو بۆ شەیدایی بۆ گوڵ داناوە، کە ئەمـەش جوانییەکی وێژەیی کۆنە وەک جاری تر لەم پەڕاوییەدا دواوم.

پێم وایە بەم تاکە هەڵبەستەیدا (کوردی) هەڵبەستەکەی لەکاتی ماڵاوایی کردن و بەجێهێشتنی ناو (زۆم)ەکـەی (کـەیخـوسـرەو بەگ)و (قـادر بەگ)دا دانابێ کـە بە لـێ دوور کـەوتنە، ئیـتـر

دەکەوێتە (فیغان)ەوە وەک بولبول.
(قومری): لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەشدا دیسانەوە ئەم جارەیان (کوردی) لە جێگەی (بولبول) خۆی چواندووە بە (قومری).
قومری: مەلێکە لە نەژادی (کۆتر) و بەڵام لەو بچووکترە و دەنووکی زەرد سوورێکی پرتەقاڵی و سەرباڵی شین باوە و خۆی سپی و چاوگەش و گەورە و جوان و بەچوار دەوری گەردنیدا هێڵێکی ئەوەندەی پەنجەیەک پان وەک تەوقێک بەهەمان ڕەنگی شین باو بەملیا کێشراوە. هەمیشە کە هێلکە بکا (دووان) دەکات و کە هەڵی هێنا وەک هی کۆتر بێچووەیەکیان نێرە و یەکێکیان مێیە و ئەو باڵندە جوان و ئێسک سووکە بەدەنگێکی ناسک و دڵگیر دەخوێنێ و خوێندنی نێرەکە بەدەوری مێیەکەیدایە و لەگەڵ خوێندندا سەر نزم و بەرز دەکاتەوە و وەک گمەی کۆتر کە (هاقوو) دەکێشێ.
بەڵام خوێندنەکەی قومری ئەگەر کەسێ لێی ڕابمێنێ وەها تێ دەگات وەک بڵێ: (یاکەریم... یاکەریم) و لەسەر ئەم ئاوازە لە هەر کاتژمێرێکدا چەند جارێ ئەم خوێندنەی دەچڕێ و گوایە ئەم باڵندەیە جۆرە سۆفیەکە و هەمیشە بانگی خوای مەزن بەناوە (کەریم)ەکەی بەشێوەی (یاکەریم) دووبارە دەکاتەوە کە (خوا)یە.
(کوردی) لەم نیو باڵیەدا خۆی چواندووە بەو (قومری)یە کە لە (تاو) دوور کەوتنەوە لەو قەد و باڵا شەنگ و شۆخەی (قادر بەگ) کە بە درەختی بەرزی وەک (سەرو)ی چواندووە و بەڵام سەروێک کە لەکاتی شنەی بای شەماڵدا بەدەم ئەو بایەوە بەم لاو ئەولای خۆیدا دەلەرێتەوە و لەرانەوەیەکی دڵگیر کە لە ڕۆیشتنی (قادر بەگ)ی وەک لەنجە و لاری درەختی سەروە کە، ڕاگەیاندووە و بە(سەروی خەرامان) کە (کوردی) خۆی بەخۆی گوتووە: دەی سا لەتاو دووری ئەو قەد و باڵا بەرزە پڕ لەنجە و لارەی (قادر بەگ) وەک قومری بناڵێنە چۆن ئەو بەدەم ئاوازی موسیقییەوە (یاکەریم) دەچڕێ تۆش بە (یاقادر) دەربڕینەوە بناڵێنە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە هەموو سەرچاوەکانیدا دواتاکی پارچە هەڵبەستەکەیەو ئەمەش جیاوازییەکانی نێوان سەرچاوەکانیەتی:
دائیما (نم/١): دائیمی.
وشەی (لە دووری) بەرێنووسی کۆن بەشێوەی (لەدەوری)یش خوێندرێتەوە کە هەردوو شێوە نووسینەکەی ئەم وشەیە لەم تاکەدا ئەگونجێ و واتای تەواوی دەدەن و ئەمیش دەستکارییەکی جوانە لە بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە سەرچاوە کۆنەکانیدا بەشێوەی (لدوری) نووسراوە. جوانییەکی تر لەم هەڵبەستەدا کە بە (ڕوخت وەک گوڵ)ە دەستی پێکردووە و لە دواتاکیشیدا بە (لە دووری یا لە دەوری گوڵ) کۆتایی هاتووە.

١٠٤

## برا دەر بۆچی وا؟

١- برادەر، بۆچی وا بێ (شوین) و (شەرت و عەهد) و پەیمانی؟؟
لە من بێزاری داخۆ؟؟ یاری ئەغیار و، ڕەقیبانی.
٢- ئەمن (داد)م لەدەست (بێ شەرت و عەهدیت) بوو، ئەمێستاکە
لە (سەرڕای) بێوەفاییشت، دە(یار)ە؛ زۆر بەعەینوانی
٣- دەڵێن زۆر (توند)ی و، خوو (تورک)ی یەکجار مەست و بێباکی
بە (توندی) و (مەستی)یوە، بەد خووییا، دیارە لە یارانی
٤- بەتیغی ئەبروانت، بووی بە(جەللاد)ی دڵی عالەم
دەڵێن: دەروێش و، صۆفی و، تۆبەکارو، نۆ موسوڵمانی
٥- هەموو (ئێران)، (موسخەر)بوو، بەغەمزەی چاوەکەت گۆیا
لەلای خۆشت؛ (غەریب) و،(بێکەس)و، (مەحکووم) و (میهمان)ی
٦- لە ترسی (موددەعی)، یارای ڕوانینم نییە، هەرگیز
بە(فرسەت)، جارجارێ، مەر نیگاهێ کەم بەپەنهانی
٧- دەزانی گەرمە بازاڕی جەماڵت، تا دوو ساڵی تر
لەگەڵ کڕیارەکانت، بۆیە یەکجار وا: (گرانجانی)؟
٨- منی عاشق، دڵم گەر ڕاگری؟ ئەجری گەلێ زۆرە
کە بازاڕی جەماڵت چوو، موحەقەقەقمە؛ پەشیمانی
٩- لەلای هیچ کەس، ڕەوا نابێ؛ مەرام و مەقصەدت (هیجری)
(سەری حاجەت) بەرە بەر (بارەگا)ی: (غەوسی سولەیمانی)

---

١- شەرت (شەرط): مەرج، پەیمان، بەڵێن.
عەهد: پەیمان.
(شەرت و عەهد): ئەم دوو وشە عەرەبین کە لەسەرێنی (کوردی)یەوە و لەوە بەریش پێکەوە بەکار هاتوون هاکا بڵێم هەردووکیان یەک واتان.

ئەغیار: وشەیەکی غەرەبیە بەواتا بێگانان.

ڕەقیبان: وشەیەکی (باو)ە بەدەم هۆنەرانەوە لە هەڵبەستەکانیاندا و بەمەبەستی: نەیار، دژ، خراپکار... بەکاری دێنن،

ئەم ناوبردنی (برادەر)ەی کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی لەسەر داناوە کە وایە (بێ شەرت عەهد و پەیمان)ی ناوبردووە ئەگەرچی بەسەر زاری گلەیی و هێرش بردنە سەرە و، لە (زەم) دەچێ، بەڵام لە ڕاستی و لە هەڵبەستی کۆندا بەرامبەر بەخۆشەویستان وەک جۆرە (مەدح)ێکیشە، چونکە کەسێکی وەک ئەو (برادەر)ە ئەوەندە (چاک) بووبێ کە تەنانەت یاری (بێگانە و نەیاران)یشی بووبێ، کەبێگانە و نەیاریش دیارە چاک نین و ئەگەر بێگانە چاکیش بووبی یا چاک بێ، بێگومان هەر ئەوەندەی بۆ لواوە و جێ دەستی نە بووتەوە و، بەرژەوەندی وەهای هەبووبێ، یاببێ، کە لە پێناویا خراپەکەی خۆی دەرنەخات، کەواتە (کوردی) مەدحی کردووە و ئەوەتا سەرەتا بە(برادەر) ناوی بردووە.

سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە لە دەسنووسەکاندا: (عن، مس، ن، گل١، گل٣، گل٥، ص، ف، نم/١) و، لە چاپکراویشدا؛ (کم، گ٢، س، گ٣)ن.

لە نێوان ئەو سەرچاوانەدا من (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی، کە لە ویدا، ئەم هەڵبەستە لە هی ناو هەموو سەرچاوەکان ڕێکوپێکترێکە و لەگەڵ ئەوەشدا پشتم بەستووە بە سەرچاوەکانی تریش.

بۆنەی ئەم هەڵبەستە:

لە نێوان هەموو سەرچاوەکاندا بەڵگەیەک لە ڕووی بۆنەی ئەم هەڵبەستەوە، تەنیا لە (من) و (عن)دا ئەم لایەنەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

لە (من)دا ئەم هەڵبەستە لە ژێر ئەم سەرەناوە فارسییەدا نووسراوە: (کردی برای شێخ غوثە) واتە: (کوردی ئەم هەڵبەستەی بۆ شێخ غەوسە (غەوثە) داناوە.

لە (عن)یشدا ئەم سەرەناوە (فارسی)یەی خوارەوە دراوە بەم پارچە هەڵبەستە: (نامەء کردی در (طهران) برای شێخ محی الدین مشهور بغوسەء سلیمانی یە، کە همزمان در (طهران) بسر بردە نوشتە– رحمهماالله– علی)

واتە: (نامەی کوردی لە (تاران) بۆ شێخ محییەدینی بە(غەوسە) بەناوبانگی سولەیمانیی نووسیوە کە لە هەمان کاتدا، (غەوسە)ش لە (تاران) ڕای بواردووە – خوا هەردووانیان ببەخشێ – عەلی).

غەوسە: ئەم شێخ محییەدینیەی سولەیمانی کە بە(غەوسە) یا (غەوثە) ناسراوە، وەک من وێکەوتووم (غەوسە)ی یەکەم بوو، چونکە دوای ئەویش هەر لە خانەوادەی ئەو دوو کەسی تر بوون کە ناویان (محییەدین) و ناز ناوی (غەوسە – یا– غەوثە)یان پێ دراوە.

لەسەر (پۆپەی گردی شکاو) بی نێژن کە ئەمە ناوی کۆنی ئەم گردە بوو کە ئێستە بە(گردی

شێخ محییەدین) دەناسرێ کە ئەو سایە و هەتا ساڵی پەنجاکانی چەرخی بیستەمیش گردێکی جوان بوو، لە دووری شاری سلەیمانیەوە کە لە خۆرئاوای خوارووییەوە کە بەپێیان نیو سەعات ڕێگەیەک بوو.

بابێمەوە سەر نامەکەی کوردی... کوردی بۆ ئەو غەوسەیە: (غەوسە) لە بەهارێکدا بۆ سەردانی مرید و خەلیفەکانی دەڕواتە (ئێران) و دەگاتە (تاران) کە کوردی لەو کاتەدا لە تاران بووە و هەواڵی هاتنی (غەوسە) بۆ تاران دەزانێ و چەند ڕۆژێک بەدوایدا دەگەڕێت، ئەمجا (غەوسە) دەدۆزێتەوە. چونکە (غەوسە) هەر ڕۆژێ لای کەسێکی دۆستی بووە و کە (کوردی) ئەیدۆزێتەوە ئەم پارچە هەڵبەستەی وەک نامەیەک بەدەستی پێشکەشی ئەکات. (کوردی) لەم تاکی یەکەمەیدا نووسیوە (برادەر بۆچی وا بێ شوێنی) و هەر لەودانیشتنەیاندا (غەوسە)ش کە یەکێ لە مەلاچاکەکان و زاناو وێژەوان و هۆنەریش بووە، ئەویش بە هەڵبەستێکی (نۆ تاکی) وەڵامی (کوردی)ی داوەتەوە کە پێم وایە هێشتا بڵاونەکراوەتەوە و بەچاپکراوی نەمدیوە.

ئەم وەڵامە لە باڵایی و بابەتییانەییدا هاوشانی لەگەڵ ئەم پارچە هەڵبەستەی کوردیدا دەکات و لە دواییدا دەگەڕێمەوە سەر ئەم دیدەنییەی (کوردی).

گەلێک هەوڵم داوە بەداخەوە دیوانی هەڵبەستی (غەوسە)م دەست نەکەوت، جگە لەم هەڵبەستی وەڵامی و لەوەندەیی کە ڕام گەیاند بەولاوە سەرگوزەشتەی ژیانیشیم بەدەست نەهێناوە.

بەپێوستێیەکی گەورە و سەرشانی (نەوە)و خانەوادەی (غەوسە)و ڕۆشنبیرانمانی ئەزانم، بەدوای سەرگوزەشتەی پتری (غەوسە)ی مەزنمان و هەڵبەستیدا بگەڕێن و بڵاوی بکەنەوە و من بەم تەمەنی (٨٦) ساڵەییمەوە و بە(نەخۆشی) و پەککەوتەیی و چاوکزی و گوێ کپییەمەوە لەوەندە پترم پێ ناکرێت و، ئەگەر توانیم بەرهەمی کاڵ و کرچ وا پاکنووس نەکراوی خۆم زۆرە ئەوانە فریای چاپ بخەم، کە شایانی سپاسە بەڵێنی چاپکردنی هەر شکۆمەندی (ئاراس) و لە(هەولێر) پێدراوە و دوای نەمانیشم هەرچی شڕە و پڕەو نووسراوم هەن ئەو دەسگایە وەری دەگرێ و چی بۆ لێ بەرهەم هات بڵاوی دەکاتەوە.

ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکی یەکەمەیە بەپێی سەرچاوەکانی:

بۆچی (ما،ن) بوچە – ئەمەش دەربڕینێکی (زارگوت)ی سنەییانەیە کە (کوردی) هەندێ جار (وشەگەل)یانی بەکارهێناوە، شوێن (ف) سوین، (کە یا سێ نوقتە)ی پیتی (ش)ی لەسەر نییە یا مەبەس لە کورتکراوەی (سوێند)ە،

شوێن = (نم/١/ کم، گ٢، س، گ٣): سوێند.

داخۆ (کم، ف، نم/١، گ٢، س، گ٣): دایم.

یاری (مس، ن، ص): یار.

یاری ئەغیار و (ما): یار و ئەغیار – ئەمەش هەڵەیە.

٢– داد: هاوار و بێزاری دەربڕینیی مەبەست بووە.

بێـوەفـایی: بـۆ ئەمـەکی – ڕواڵەتێکە هـۆنەران لە هەڵبـەسـتـیـانـدا، دەیدەنە پاڵ (دڵخـواز) و (خۆشەویست)ەکانیان.

عینوان: مەبەستی لە: فیز، لووت بەرزی و، لە خۆبایی بوونە.

بۆ شـەرت و عەهدیت، جگە لە (مس، عن، ما) لـە هەمـوو سـەرچاوەکانی تردا نووسـراوە (بۆ عەهد و شەرتیت).

ئەمێستاکە: (ما): ایستاکە – ئەمیش لەنگی دەدات بە کێشی هەڵبەستەکە.

لە سەرڕای (گ۲، س، گ/۳): لەسەر ڕێی– بەدەسکاریی گیوی دەزانم.

بێوەفایشت (نم/۱، ف، گ/۲، گ/۳، س) بۆ وەفایی – ئەمیش لەنگە.

بێوەفاییشت (کم) بۆ وەفای– ئەمیش لەنگە.

دە(یار)ە = سـا ئەی یـارەکـەم، جگە لە (عن، مـس) لەوانی تـردا نووسـراوە (دیارە)و، ئەمـەش بەپێی وێژەی کۆن دووبارەیە لە تاکی دوایی (سێیەم)دا کە ناگونجێ.

دەیارە زۆر (نم/۱، ف): وا دیارە زۆر– ئەمیش ناگونجێ و لەنگە.

٣– خوو تورک: ڕەوشتی تورکانە وەک (تورک)ی عوسمـانی.

یاران: دڵخـوازەکە کەمـتـەرخـەمـەکان لە سـووتاویی دڵدارانیـان و یامـەبەسـتی (بەتەوسـەوەیە) بەواتا (خراپ و نەیارەکان).

توندی (کم): توندو.

توندی (ف): تندو.

خوو تورکی (ف، نم/۱، کم، گ۲، س، گ۳): بد خو ترکی. ئەمیش شێواوی یە.

یەکجار: (نم/۱) یەکبارە.

مەست و (ن) شیت و.

بێ باکی (ما) بێ باکن.

مەستی یو (ما): مست.

بەد خووییا (ن، نم/۱، کم، گ۲، س، گ۳) بد خویتا.

بەد خوویيا (ما): بد خویندا باقلی – شێواوە و لەنگە.

٤– لەم تیـغی ئەبرۆیە مـەبەسـتی زاراوەیەکی صـۆفیـانەیە کەوا ئەو (شـێخ محـیـیـەدینە) بە(نەظەری شێـخێتی) کە توانایییەکی نهێنیی مەعنەوییە، توانیویە دڵی خـەڵکی (عالەم) بپێکێ بۆ چوونە سەر ڕێباز (تەریقەت)ەکەی.

(جـەللاد) بەواتـا: بکوژەکـانی بـەردەسـتی فـەرمـانڕەوایانـە، بەڵام مـەبەسـتی لەوەیـە کـە شـێخ مـحییـەدین بۆ پێکاندنی خـەڵقی کەمەندکێشیـان بۆ تەریقـەتەکەی وەک (جـەللادی) بەردەسـتی شـێـخـی گـەورەی خـۆی وابووە کـە (شـێخ ئەحـمـەدی تاڵەبانـی)و بەرەو ژوورتر هـەتـا دەگـاتە

(غەوسی گەیلانی) کە داهێنەری تەریقەتی قادری بووە.
(کوردی) لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەدا بەوە بەڵگەی هێناوەتەوە کە: وەک دەڵێن ئەی (شێخ محییەدین) تۆ دەروێشی و کەچی ئاوا بکوژیشی.
صۆفی و (نۆ موسڵمان): مەبەستی لەتازە پایەی شێخێتی وەرگرتوویە.
دەروێش: ئەو کەسەی کە تۆبەی تەریقەتێکی وەرگرتبێ و ئیتر دڵی بەجیهانەوە نەمابێ.
صۆفی: هەواداری ڕێگەی (تەریقەت)ی ئاینی کە پایەی لە دەروێش مەزنترە و لە خوار خەلیفەوەیە.
تۆبەکار: ئەوەی لە سەردەستی شێخێک یا خەلیفەیەکیدا تۆبەی تەریقەتێکی وەرگرتبێ و چووبێتە سەر ئەو (تەریقەت)ە و پەیڕەویی ڕێنوماییەکانی بکات.
نۆ موسڵمان: ئەگەرچی واتای ئەوە دەدات کە کەسێ لە ئاینێکی تری خۆیەوە بووبێ بە(ئیسلام)- بەڵام لێرەدا مەبەست چوونە سەر تەریقەتە. یا بوون بە شێخە.
جوانییەکی وێژەیی لەم تاکە هەڵبەستەدا هەیە کە (کوردی) لەلایەک (غەوسە)ی کردووەتە بکوژو لایەکی تر، وەک چەشنە پلارێک کە (دڵدار) لە دڵخوازەکەی بسرەوێنێت پێی ڕاگەیاندووە تۆ بەو (بکوژییەتەوە) دەڵێن گوایە هەم دەروێش و هەم صۆفی و هەم نۆ موسوڵمانیشی کە نابێ بکوژ (جەللاد) بێت، کەچی ئەوەتا بکوژ و ئەنگێوەری دڵی خەڵکانی جیهانی و نابێ وەها بێت و پێویستە دڵی دڵدارانت ڕابگری و جۆرە گلەییەکە.
ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیە لە سەرچاوە جیاجیاکانیدا:
دڵی (نم/١، ف، کم، گ٢، س، گ٣) هەموو. بەڵام وشەی (دڵی) یەکە بەجێترە، چونکە جوانیی وێژەی لە نێوان ئەم وشەیە و، وشەی (دەڵێن)دا کە هەردوو وشەکە لەم تاکە هەڵبەستەدا و جیناس ئارایییە: (دڵی) و (دەڵێن).
(کوردی) لەم تاکە و لە تێکڕای تاکەکانی هەڵبەستەکەدا بەزمانی (صۆفیانە) بەرامبەر بە (شێخ محییەدینی غەوسە)ی برادەری دواوە، جگە لەوەی کە (شێخ) سۆفیەکی درووست بووە و (کوردی) خۆشی صۆفی ئامێزییەکی پاکی تیا بووە.
دەڵێن (ما): وەلێ.
دەڵێن (نم/١): ئەڵێن – شێوەی (دەڵێن)ەکەی جوانترە وەک وردم کردووەتەوە.
لە ڕووی وێژەیی کۆنەوە کە لەگەڵ (دڵی)یەکەدا جیناسی ئارایی تیایە.
نۆ موسڵمانی (گ٢، س، گ٣) نووی موسوڵمانی.
٥- ئێران – لە ڕووی زمانییەوە بە واتە ئاریان، شوێنی «نیشتمانی» ئاری نەژادەکان کە نەتەوەی (کورد) و (فارس) لەو نەژادی (ئاری)یەن.
بەڵام لە ڕووی مەبەستەوە (ئێران) بەواتا ئەو قەڵەمڕەوەی بەر فرمانی ڕژێمی (فارس)ە، کە

هەر بریتی نییە لە (فارس نشین)ە، ڕەسەنەکەی و بریتییە لە پارچەیەکی گۆشەی خوارووی ڕۆژئاوای (ئێران = ئاریان)، بەشکو جگە لەو گۆشەیە هەموو بەشی سەرەوە و ڕۆژئاواو خۆرئاوای ئێران بەشێکی (کوردستانی گەورە)یە کە بەهۆی دەس بەسەراگرتنی ڕژێمی (فارس)ەوە هەر بەئێران ناوی دەبەن، ئەمجا (شێخ محییەدینی غەوسە) لە هەموو ئێراندا دەروێش و مریدی هەبوون کە نیشتەجێی ڕەسەنی خاکی ئێران بوون وەک (کوردی) ڕای گەیاندووە کە بەهۆی تیغی برۆیەکانی (ئەبروانی) و دەسەڵاتی شێخییەوە ئەو ئێرانییانە بوونەتە پەیڕەویکارانی تەریقەتەکەی.

موسخخەر: ڕام بوو، دەست بەسەراگیراو، – کەمەر بەست، لە دەستی تەریقەتی (غەوسە) بەسەراگرتنی (ئێران)ی بەهۆی دەروێشە (شیر بەدەست)ەکانیەوە کە وەک برۆی شێخە و بە نیونیگا (غەمزە) و چاوداگرتنی تۆبە دادانەکەی ئەو نیشتمانەی هێناونەتە سەر تەریقەتەکەی.

لە ڕووی سەرزارییەوە (کوردی) لە نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا بە (غەوسە)ی برادەری گوتووە: تۆ هەر بەتیغی برۆ و غەمزەی چاوت هەموو ئێرانت ڕام کردووە و دەستت بەسەردا گرتووە (وەک لە نیو باڵی دووەمدا گوتوویە): گوایە ئەمە لە ئێراندا غەریب و بێکەس و میوانی، ئەی ئەگەر وەها نەبوویتایە ئاخۆ دەبوو چیی ترت (موسخخەر) بکردایە؟؟

غەریب: کەسێ کە لەشوێنێ یا وڵاتێکدا بێگانەبێ و ئەو شوێنە (زێد = نیشتمانی) خۆی نەبێ و لەناو هاونیشتمانییەکانی خۆیدا نەبێت.

بێکەس: کەسێ کە لەشوێنێکدا گومانی یەکێک لە خزمانی خۆی نەبات و کەسیانی لەگەڵدا نەبێ، یا هەر (لەبن) بێ خزم بێت.

میهمان: میوان. کەسێ لەناو ماڵ و خێزانی کەسێکی تردا بێت و ماڵەکە ماڵی خۆی نەبێت و بەسەردان و، یا بەدیدەنییەکی دەمی لەناویاندا بێ.

مەحکووم: واتە فرمانی میری بەسەرا دراو بۆ (بەند)ێتی یا بۆ دەست بەسەرێتی و ئازادی لێ سەنراوە.

ئەمەش جیاوازییەکانی ئەم تاکی پێنجەمە بەپێی سەرچاوەکانی:

گۆیا (ف): گوایە.

لەلای (ما)... ی – دڕاوە و لەناو چووە ناخوێندرێتەوە.

خۆشت (ما): خۆیچت – ئەمیش دووەمین وشەیە لەم پارچە هەڵبەستەدا کە ئەم وشانەی بەشێوەی سنەییانە (ئەردەڵانی) تیا بەکار هێنراوە و (کوردی) لە چەندین هەڵبەستی تریدا بەکاری هێناون کە خۆی بەبنەچە (سنەیی) بووە، و ئایا ئەمانەی ناو ئەم پارچە هەڵبەستە لە خودی (کوردی)یەوەن یا دەسکاری؟ ئەمەم بۆ ساغ نەبووەوە.

مەحکووم (ما): محکوم – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

٦– موددەعی – لە ڕووی زمانییەوە واتای (خواستەر)، ویستەر دەدات، بەڵام لە ڕووی وێژەییەوە

وەک لە هەڵبەستە دڵدارییەکانی (کورد) و (فارس)دا هاتووە مەبەست لەوەیە کە جگە لە (دڵدار) کەسێکی تریش – (دڵخواز)ەکەی ئەو (دڵدار)ەی خۆشی بوێت و خاوەن دەسەڵاتیش بێت، کە (کوردی) بەسەر زاری لێرەدا ئەمەیانی ڕاگەیاندووە.

بەڵام (کوردی) لە ڕاستیدا مەبەستی ئەمەیان نییەو، وەها پێ دەچێ کە ڕژێمی ئەوسای ئێران زۆر بەتوندی و بەگرنگییەوە (غەوسە)ی بەندکردبێ و (کوردی) لەم تاکەیدا بە(غەوسە)ی برادەری وتووە کە تەنانەت سەردانی ناو بەندیخانەی (غەوسە) مەترسیدارە و ڕەنگە بەتکا (واسیطە) یا بە(بەرتیل) دان (کوردی) توانیبێتی ئەو برادەرەی خۆی ببینێ و، وەک پاکانەیەک بۆ (غەوسە)ی کردووە کە گلەیی درەنگ سەردانی لێ دەکات و هەمیشە لە بۆسەی ئەوەدا دەرفەت (فرسەت) بهێنێ بۆ ئەوەی ڕێگەی بدرێ لەو بەندیخانەیەدا (غەوسە) ببینێ و بەو جۆرە چاوی پێی بکەوێت کە لێرەدا ئەوە دەگەیەنێ ڕەنگە دەستبەسەر نەبووبێ یا ئەگەر دەستبەسەریش بووبێ هەروا بەئاسانی ڕێگەی سەردان و دیدەنیی نەدرابێ.

یارا: توانایی، وزە، دەسەڵات،

فرسەت: دەرفەت، هەل،

بەپەنهانی: بەنهێنی و مەبەستی لەوە بووە کە پاسەوانەکانی ئێرانی سەر (غەوسە) ئەوانیش ترساون و بەدزییەوە لە دڵەڕاوکێدا ڕێگەی (کوردی)یان داوە کە دیدەنیی (غەوسە)ی برادەری کردبێ.

مەر: مەگەر

نیگاه: تەماشا، سەیرکردن، ڕوانین.

ئەم تاکە هەڵبەستی شەشەمینە لە (ما)دا حەوتەمینە، چونکە لەگەڵ تاکی دواییدا پاش و پێش نووسراون.

یارای (نم/١): یارایی – ئەمیش لەنگی دەدات،

٧- لەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) وەک دەمەتەقێیەکی گەمەجاڕی، و دڵخۆشکردن لەگەڵ (غەوسە)ی برادەریدا دواوە و غەوسەی بە(دڵخوازێک) ناوبردووە کە لە هەڕەتی خورتی و گەنجێتیدا بێ کە هێشتا کاریگەریی پیری و بەساڵاچوون زاڵ نەبووبێ بەسەر جوانێتی و دیمەن و ڕوخساری (غەوسە)دا، بۆ پێکەنین و دڵخۆشکردن پێی وتووە تۆ کە هێشتا دڵدارانی (جوانی = جەماڵ)ت بەبەریانەوە ماوە تاکو دوو ساڵی تریش و تۆش کە ئەوە دەزانیت بۆیە لەو (بازاڕگەرمی)یەدا لەگەڵ (دڵدار) کڕیارەکانت واتە عاشقانی جوانیت و ئەوانەدا کە تۆیان خۆش دەوێت تۆش خۆت بەناز دەفرۆشی و کەوتوویتە (گرانجانی) لەگەڵیاندا و ئەمەی وەک توانجێکی خۆشەویستانە و گەمە گرتووەتە (غەوسە). کە نابێ ئاوا گرانجان بێ،

تا دوو ساڵی تر: واتای ئەوە دەدات کە تا دوو ساڵی تر ڕیش و سمێڵی نایەت، بەڵام ئەم واتایە بۆ (غەوسە) ناگونجێ کە گەیوەتە پایەی شێخێتی، کەواتە لەوانەیە مەبەست لەوەبێ ئەوکاتە

هێشتا هەر (موو)ی ڕەش بووە و (موو)ی سپی پیریی لێ دەرنەچووە وە (کوردی) پێی وتووە،
ئالەم بارەشدا دڵی دڵدارانت ڕاگرە و دڵیان مەشکێنە و فرسەت لە دەست مەدە.
ئەم تاکە لە (ما)دا شەشەمینە لەبەر پاش و پێش نووسینەکەی کرپارەکانت (ما) کلّي خلايق.
یەک جاروا (نم/١): وا یەکجار.

٨- عاشق: دڵدار و مەبەستی عاشقی (غەوسە)ی برادەریەتی، (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا بە دوو جۆری لە یەکتری جیاواز لەگەڵ (غەوسە)دا دواوە.

جۆری یەکەم: پێی ڕاگەیاندووە ئەگەر دڵم ڕاگری ئەوە ئەجری (پاداشتی) لای خواوە زۆرە و وەک تکا لێکردنێک وایە ئەم تاکە درێژەپێدانی تاکی پێشووە وەک دووبارە.

جۆری دووەم: پێی گوتووە خۆ ئەگەر دڵت ڕانەگرتم و ئەو (ماوەی دوو ساڵە) بەسەرچوو، وە بازاڕی جوانییەکەشت چوو ئەوا دڵنیام ئەو سایە هەر پەشیمانیت بۆ دەمێنێتەوە و پەشیمانیش چ دادێک نادات.

ئەجر: پاداشت، چاکە.

بازاڕی جەماڵ: جوانییێتی، هەرەتی جوانی.

مو حەققەقمە: دڵنیام، لێم ڕوونە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ف، نم١، ما، کم، گ٢، س، گ/٣)دا نییە و لە (من، عن، ن، گل١، گل/٣، گل٥، ص)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و، بەپێی دەستووری وێژەی کۆنیش کە دەبوایە ژمارەی تاکەکانی هەر پارچە هەڵبەستێک (تاک)بێت نەک (جووت) و هۆنەرانی ئەو وێژەیەش پەیڕەوی ئەو دەستوورەیان کردووە، ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە هێشتا چاپ نەکراوە و ئەم پارچە هەڵبەستەی کردووە بە(نۆ تاک) بەتاکی دوواییەوە و بەمە ژمارەی تاکەکانی ئەم پارچە هەڵبەستە (جووت نین) وە تاکن و بوون بە نۆ.

وە، لە هەموو سەرچاوەکانیشدا ئەم تاکە چونیەکە جیاوازیی نییە، لەگەڵ یەکتردا.

٩- هیچ کەس: لە ڕووی فەرهەنگییەوە: واتای «ئەوەی کە(چ) کەس نییە» دەدات، بەڵام بووەتە باو کە مەبەست لە (چ کەسێکی دی) دەدات کە، (کوردی) ئەمەیانی مەبەست بووە.

ڕەوا: گیرا، پێکهاتن، گەیشتنە خواست.

(مەرام) وە (مەقصەد) کە هەردوو (عارەبی)ن واتای، ئارەزوو، خواست، ویستن، ئارمان دەدەن.

سەری حاجەت: ناچاری، ئاتاجی، خوازیاری، لەتاو پێویستی،

بارەگا - بارەگاه: وشەیەکی لێکدراوە (کورد) و (فارس) بەکاری دێنن،

ئەم وشەیە لە دوو (کەرت) پێک هاتووە کە: (بار) وە (گا - یا(گاه)ە.

(بار): مەبەست لە ڕێگە واتە (ئیجازە).

(گا– یا– گاھ) لێرەدا مەبەست لە پاشگری وشەگەلی (شوێن)ی وەک: (جاخ)؛(دەربار)وە خێوەت و شوێنی پاشایان و گەورە گەورەکانە.
کە بەلێکدانی ئەم دوو (کەرت) واتای شوێنی (ئیجازە دان)ی ئەو گەورە و پادشایانەیە، خواستی کەسان لە شوێنەکەی خۆیاندا پەسند بکەن، ڕێگەی بەجێگەیاندنی خواست و ئارەزووکردن بدەن. کە شکۆمەندیی پلەی گەورەکانە.
کەواتە بەکارهێنانی وشەی (بارەگا) لەم تاکە هەڵبەستەدا لەوەوەیە کە شوێن و پلە و پایەی (غەوسەی سولەیمانی) بەلای (کوردی)یەوە مەزن و باڵا بووە و، (کوردی) ئەو برادەرەی خۆی؛ هاوشانی پاشایان داناوە و لە ڕاستیشدا شێخێکی مەزن و مەلا چاکیش بووە.
ئەو ئارە زووی (کوردی)یش بەیەکگەیشتن و چاو بەیەکتر کەوتنەکەیان بووە، کە ئەوەندە (کوردی) ئارەزوومەندی دیداری ئەو برادەرە بەڕێزەی خۆی بووە، کە ئەو دیتنە بەجێگەیشتنی ئارەزووی بووە.
هیجری: لە ڕووی زمانییەوە بەواتا (دووری) و ناویشە بۆ ساڵنامەی (کۆچی ئیسلامی)، بەڵام لێرەدا بەواتای یەکێ لە دوو نازناوەکەی (هۆنەرمان) (مصطفا بەگی صاحبقران) هاتووە.
ئەم هەڵبەستەش وەک بەپێی سەرچاوەی باوەڕپێکراو کە لەلێکدانەوەی تاکی یەکەمیدا نووسیومە، لە (تاران) دای ناوە، کە دەرەوەی (کوردستان)ە و بەپێی ئەو نەریتەی ئەم هۆنەرنەرەمان دیارە نازناوە (هیجری)یەکەی داوە بەم هەڵبەستەی.
لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ سەرچاوە بەهەڵەو لە نەزانینەوە نازناوی ئەم شاعیرەیان لەم هەڵبەستەیدا بە(کوردی) نووسیوە و ڕاستە هەڵبەستی (کوردی)یە، بەڵام بەپێی نەریتەکەی (کوردی) لەم سەرچاوەیاندا: (ف، ما، نم/١، کم، گ٢، س، گ٣)دا هەر بە(کوردی) تیا نووسراوە کە دروست نییە.
بەرامبەر ئەو سەرچاوانەش لە سەرچاوە دەستنووسە کۆن و باوەڕپێکراوە دەستنیشانکراوەکانی تردا (نازناو)ەکەیان بە(هیجری)تیا نووسراوە و دروستە و پێ بەپێی نەریتەکەی (خودی شاعیر)ەکەیەتی.
بەڵگەیەکی تری بەهێز بۆ ئەوەی کە ئەم هەڵبەستە لەدەرەوەی کوردستاندا دانراوە، ئەوەیە کە خودی (کوردی) لەتاکی (پێنجەم)ی ئەم پارچە هەڵبەستەیدا (غەوسە)ی برادەری خۆی بە(غەریب) ناوبردووە، لەو شوێنەدا کە هەڵبەستەکەی بەسەر ئەر برادەرەیدا داناوە و هەروەها بە(میهمان) واتە (میوان)یشی داناوە، واتە ئەو شوێنەی هەڵبەست تیا دانان و (تێدابوونی غەوسە) هی(غەوسە) نەبووە کە تیا (غەریب و میوان) بووە، وەک لەم تاکەشدا بە (غەوسی سلەیمانی)ی ناوبردووە کەواتە لە (سولەیمانی) و (کوردستان)دا نەبووە و ئەگەر ناوەوەی کوردستاندا بووبێ بە(غەوسی سولەیمانیی غەریب و میوان) ناوی نەدەبرد
ئەمیش جیاوازییەکانی ناو دواتاکە هەڵبەستەیە بەپێی سەرچاوەکانی:

مەرام (ما): مراد.

مەقصەدت (ف، ما، نم/١، کم، گ٢، س، گ٣): مقصدی = مەقصەدی.

جوانی وێژەییی کۆن لەم تاکە هەڵبەستەدا لە یەک پێ گرتنی (بەر) و (بەرە)و (بارەگا)دایە کە جۆرە جێناس ئاراییەکیان تێدایە.

تائێرە بە تەسەلی کۆتاییم بەپێشکەشکردنی ئەم هەڵبەستەی سەرەوە و ساغکردنەوەی (کوردی) کە ئەم هەڵبەستەی پێشکەش بەو برادەرە شکۆمەندەی خۆی کردووە، ئەویش وەک ڕام گەیاند هۆنەرێکی بەتوانا و لێهاتوو بووە بەم هەڵبەستەی دوایی وەڵامی (کوردی)ی خۆشەویست و بەڕێزی خۆی داوەتەوە.

ئەم هەڵبەستەشم تەنیا لە چوار کەشکۆڵی دەستنووسەوە، وەرگرتووە، کە ئەوانیش (عن)، (مس، ن، ص)ن کە هەر چواریان باوەڕ پێکراو و کۆنن.

لە (عن)دا، بەم سەرەناوە فارسییە، هەڵبەستەکە نووسراوە: (جواب شێخ محی الدین مشهور بەغوسەء سلیمانیە برای کردی در طهران– رحمهماالله– علی) واتە: وەڵامی شێخ محێەدینی ناسراوە بەغەوسەی سولەیمانی بۆ کوردی لە تاران خوا بیانبەخشێ – عەلی.

لە (مس)دا هەڵبەستەکەی (غەوسە) بەم سەرەناوە (فارسی)یەی پێشکەش کراوە: (جواب شێخ غوثە برای کُردِی) واتە (وەڵامی شێخ غەوثە بۆ کوردی) وە لە هەر دووسەرچاوەی (ن، ص)یشدا هەڵبەستەکە لەژێر ئەم سەرەناوە (فارسی)یەدایە (محیّ برای کردی) واتە (موحی بۆ کوردی).

### (ئەمیش هەڵبەستە وەڵامەکەی غەوسەیە)

١– عەزیزم!! گەر بە(بێ شەرت)م بزانی؟؟ دیارە نایزانی،
لە (یاران)نیم و، یاری (زوو)تم و لام: جـانـی جـانـانـی.

٢– هەمان عەهدو، وەفام باقین و، ئەمما لێت کە حەیرانم،
لەبەر چی، هێندە کەم بڕواییو، وا (ژولیدە) ئیمانی؟؟

٣– لە (إن) ناترسی، دڵمت کردە مەحروومی جەمالی خۆت؟
گلەو، بوختانی ناحەق؛ ناگەنە ڕێگەی موسوڵمانی.

٤– ئەوەی فەرمووتە هەر دەست پێشکەرین، من بۆچی نات ناسم؟
کە چەند (پاراو زمان) و (خۆش گلە) و (ئوستادی پەیکان)ی.

٥– عەبەث؛ (خامە و زوبان)، بخرێنە (شەرحی حال)ەوە چونکە؛
(زوبانی دڵ)؛ کە هەر (دڵ)، لێی دەبێ (حاڵی) بەپەنهانی.

٦– دڵم شاهیدمە، ئیتر، چم لە شەرحی شیعری تۆ داوە؟؟
کە: «مەشهوورە، گەزافی عاشق و لافی هەزارانی»

٧-(غـەریب و بێکەسـی بێت)؟؟ هـەردوو (هـاودەردین)، لە (تاران)،
ئەوا من (موستـەقیرِ)، تۆش مەنعی گەشـتی دەشت و شارانی.
٨- بەســـە (دووری)، ئەگـــەر بـاوەڕ دەكـــەی؟؟ چـاوم ڕوا، چاوم!!
بدە (زاخـــاوی سككەی دڵ)، (شــفــای تەن)دە، بـەلوقـمـــانی.
٩- (موحی)، سـووتاوی عەشق و، (ئیلتیفات)ی: (هیـجری)یە، چاری؛
(بەتوندیش)؟؟، بێ منەت بە، (پا) بـنێ سـەر چـاو و مـوژگـانی.

..................................................................

١- [لە یاران نیم و یاری زووتم و (ن، ص): لە یارانم و یاری تۆم]،
٢- [ژولیدە: شێواو، پەشێو، پەرێشان].
٣- [(إن) مـەبەسـتی لە (إنَّ)ەی ئایەتی (١٢)هەمـە لە سـوورەتی (الحُجرات)ی قـورئانی پیرۆز: (إنَّ بعضَ الظن إثمٌ) و، لە وشـەی (بوخـتـان)یش مـەبـەست لە (بەخـراپ ناوبردن)ە، كـە لە ئایەتەكانی سوورەتی (النساء)دا هاتووە]
٦- [هەزارانـی- بەڕێنووسـی كـۆن، بەشـێـوەی (هزارانـی) دەنووسـرا، كـە بە(هوزارانـی)یش دەخـوێندرێتـەوە، كە (هوزار) (بولـبول)و ڕەمـزی عـاشـقـێـتـیـیـە، ئەمـەش جـوانكارییـەكی شاعیرانەی وێژەی كۆنی شێخ محێەدینی غەوسەیە].
٧- [ئەم تاكە هەڵبـەستە ئەوە دەگەیەنێ كە (غەوسە) یا (بەندی) یادەستبـەسەر و (كوردی)یش دەستبەسەر بووە لە شاری (تاراندا)،
٨- [(چاو)ی دووەم بەواتا (ئەی چاوەكەم هیـجری) و (غـەوسـە)ش ئەوپەڕی ئارەزوومـەندیی بۆ دیداری (كوردی)ی دەربڕیوە]. لە (ص)دا لە جێگەی وشەی (دووری) نووسراوە:(هیجران).
٩- [چاری (مس، ن): چاری- كە مەبەست لە (چارێیە).]

ئەوەی شـــایانی نیـشـــانە بۆكـردنە ئەوەیە كـە (شـــێخ عــەبدولقـــادری گـــەیلانی)یش لە هەڵبـەستەكانیدا (نازناو)ی (مـوحی)ی بۆخۆی هـەڵبژاردووە، بەدووری نازانم هەڵبـەستیان لەم یا لەو كەشكۆڵدا (تێكەڵبوونیـان بۆ یەكتـری) بەسـەردا هاتبێ، بەڵام چونكە لە كۆنەوە دیوانی (گـەیلانـی) بارەها لەچاپ دراوە و بـگرە هـەر لەسـەرێنیـی چاپی بەردی (بەمـبـا)وە، بۆیە بە تۆژینەوە جیـا دەكرێنەوە،كە لە كەشكۆڵەكانماندا هەڵبـەست بەنازناوی (محی)یەوە هەن و بەدواداچوونی گەرەكە.

١٠٥

## عەجەب ماوم

١- عەجەب ماوم، بە (گوڵ)، بۆ باخی لیمۆکەت دەڕازێنی؟
بە(مێخەک بەند) و (گۆ) و (سمڵ) و (خەناوکە)ی بۆ دەنەخشێنی؟
٢- بەناز و عیشوەو، جادوویی جوانی؛ چیم بوو، تۆ بردت
ئیتر (کافر)!! دڵێکی کەم لە کوێ بوو تا: دەری بێنی
٣- لە جۆلانەی (گرە)ی زوڵفا، بەسەر مەمکۆڵەدا، مەرخۆت
دڵەی شەیدام، بدەی ئارام و ڕام و بۆم بخەمڵێنی
٤- وەگەرنا؛ ئەم گلاراوە، پەتی پچڕاوە، شێواوە
دە بۆ؟ پێوەی بناڵێنم؟ هەتاکەی ئەمچرووسێنی؟
٥- بە(ماڵ) و (دڵ)، بە (تەن) تەنیا منت هەر (جانفیدام) قوربان
دەسا عەبدێکی هیند موخلیس؛ لە ڕێی چیدا دەڕەنجێنی؟؟
٦- دەڵێن: مودێکە، دەستت داوەتە ڕێگرتنی خەڵکی!!
بەوەی بردت ڕەزا نابیتو؟ (باجی جوانی) دەستێنی
٧- نیگاهێکت، بەسە بۆ: (قەتڵ) و بۆ (ئیحیا)یی عوششاقت
لە ئولکەی (حوسن)دا؛ پێغەمبەری و، ئیعجازی دەنوێنی
٨- بەڵێ؛ خۆت (قادر)ی ؛(ڕۆژ)ی هەموو عالەم بکەیتە (شەو)
هەزاران عاشقی وەک من، کە چاو هەڵبینی، دەنوێنی!!
٩- بە هەر دوو دەست، ئەگەر (بۆی) ،(ماه) و (پەروین) ڕاگری (کوردی).
بە(جان) و (مان)ەوە، تۆ تاقە ماچێکی کە ناهێنی.

---

١- عەجەب: سەرسام،

گوڵ = مەبەست لە (گوڵ)ی ڕووەک نییە، بەشکو ئەو (نقێم)ە گەوهەرینەی وەک (پیرۆز) و (یاقووت) و (شەوە) و... هتد... کە لە شێوەی نیوە (گۆ)یەکدا و بەخڕی یا خڕۆکەیی دەچەسپێنرێتە ناو چوارچێوەیەکی ئاڵتوونی پڵپڵەدارەوە و، لایەکی ئەو چوار چێوە زێڕینە قوڵفەی پێوەیە و لەلایەکی سوخمەی بێ قۆڵ لەبن مەمکدا چەسپ دەکرێ و لایەکەی تری

(قولاب)داره و بەولای تری سوخمەکەیەوە توند دەکرێ کە هەم سنگ و بەرۆک دەشارێتەوە و هەم ئەوەندەی تر (خڕی) و (قوتی) جووتە مەمک، نیشان دەدا.

هەروەها ئەو (گوڵ)ە بەداوێنی ملوانکەی تەلاو گەوهەرینی وەک، (شیلان) و (شەوە) و (زەردویی) و ...هتدە وە هۆنراوەتەوە کە لەمل بکرێ بەسەر مەمکۆڵانەوە یا کەمێ لەبنەوەیاندا جوانییەکی دڵکێش دەدات و سینگ و بەرۆک و مەمکی پێوە دەڕازێنرێتەوە.

باخی لیمۆ = لە هەڵبەستی هۆنەراندا مەبەست لە جووتە مەمکە کە بە(خڕی)دا وەک (لیمۆ) و (جوان) و (بۆن خۆشە)، (کوردی) سەرسامی خۆی لەوە پیشان دەدات کە ئەو جووتە مەمکە لیمۆییە قەشەنگ و دڵگرە چ پێویستی بەڕازاندنەوەیە و بەو جۆرە (گوڵ)ەی کە لێکم دایەوە و کچان و ژنان بەکاریان دەهێنن بەشکو خودی مەمکۆڵەکان لە سروشتیەوە جوانن و کوڕ هەر لە منداڵی و مەمکی دایکییەوە شەیدای مژینی مەمکە.

(مێخەک بەند) ملوانکەیەکی کەلەپووریی کوردانەیە کە یا لەشێوەی (گۆ گۆیی) یا هەر بەڕستی مێخەک دەهۆنرێتەوە ئەوەندەی سەری (کچەکە)، یا (ئافرەتەکە)ی پیا بچێت و تاکو خوار (مەمک) بەسەر سنگدا ملوانکەیی شۆڕبێتەوە و کەسانی دەسدار ناوەڕاستی خوارووی ئەو (مێخەک بەند)ە گوڵێکی زێڕین و نقێمی گەوهەرین چەسپ دەکەن.

کە ئەمیش هەم نەخشاندنێکی سینگ و مەمکە و هەم بۆنی خۆشی مێخەکەکەش لە دوورەوە هەستی نێرینە ڕادەکێشێ.

(گۆ) جۆرە ملوانکەیەکی زێرینی فۆلکلۆری کوردەواری بوو کە لە شێوەی (گۆ)دا ئەوەندەی دەنکە (گوێژ)ێکی گەورە دەکرێتە ملوانکەوە و داوێنەکەی هەمان (گوڵ)ە ناوبراوەکەی پێوە بەند دەکرێ و (کچ) و (ژن)ی کوردان بەکاری دەهێنن لە نەخشاندنی سینگ و مەمکدا و ئەو نقێمەی کە لە گوڵەکە چەسپ دەکرێ هەرجۆرەی بۆ مەبەستێکە وەک پیرۆزە بۆ چاوەزار، شەوە دژی گیاندارێکی نهێنییەو دژی (ژنان) و وکچانە و بەتایبەتی زەیستان کە خۆی و منداڵەکەی دەدەنگێوێ و... هتد.

(سمڵ) ڕوەکی (زەل)ە کە جاران ئەوەندەی ٧٥ سانتیمێک گیایەکەی درێژ بوایە دەیانکردە (گەسک).

هەر ناوە ناوەی لقوپۆپی ڕەگەکە لە شوێنێکیا تلۆقێک هەڵدەپشکوێ و ڕەق دەبێ و ئەم گرێیانە، یەکێ ئەوەندەی بستێک لەیەکەوە دوورن.

ئەو گرێ تلۆقانە یەکێ ئەوەندەی ناوکە خورمایەکی گەورە مەزنترن و توێکڵەکەیان ڕەش قاوەییەکە لێ کرێنرا ناوەکەی سپییەکی سپات و خاڵ خاڵی ڕەشی پێوەیە.

لە کوردەواریدا ئەو گرێیانە، کە بەرەی ڕوەکەکەن بە(سمڵ) ناو دەبرێن... ئەو سمڵە پاک کراوە لە شێوەی مووروی گەورە و گچکەتردا دادەتاشرێن و دەکرێن بەکشتەکەوە و بەهونەرمەندییانە (ڕستەک) واتە ملوانکەیان لێ دروست دەکەن، کە هەم جوانە و هەم بۆنێکی

خـۆشی پەسندی هەیە و، وەک مـێـخـەک بەند ئەکـرێتـە مـلەوە سنگی کچ و ژنی کـوردی پێ دەنەخشێنرێت و بۆنی خۆش دەکات (گۆسملّ)یش ناو دەبرێت.

هەر ئەو سـملّـە بۆ چارەی گـەلێ لە نەخـۆشـیـیەکـانی گـەدە و ڕیخـۆڵەکـان و دڵەکزێ و ئەمـانەی کـۆئەندامی هەرس (هـضـم) بەکـەڵکە و لە پـزیشکیـی کـوردەواریدا بـۆ چارەی بۆگـەنی (دەم و دان)یش چاکە.

خەناوکە = جۆرە ملوانکەیەکی (بەهاری)یە کە لە خـونچەی نەپشکووتوی گـوڵە باخی (پەمەیی) و (سـوور) هونەرمـەندانـە بە کشـتـەکـەوە دەهۆنرێتـەوە، جـوانی و بـۆن خـۆشی دەدات بەسنگ و مەمکی کچ و ژنی کوردان و دەینەخشێنێ و بۆنی خۆش دەکات وە (ملە گوڵ)یشـی پێ دەوترێ.

سـەرچاوەی ئەم پارچە هـەڵبـەسـتـە تەنیـا دوو کـەشکۆڵی (مع، مـا/٢)ە و لە شـوێنی تردا پێم نەزانیوە و هێشتا چاپ نەکراوە و (مع)ەکەیانم کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکە، چونکە لەم سەرچاوەیەدا ڕێکوپێکتر نووسراوە.

لە (ما/٢)دا جێگەی (سملّ و خەناوکەی بۆ) نووسراوە (سملّ لە بەزمی وا)

٢- ناز: خۆنازاندنەوە و فیز نواندن و لە خۆبایی بوونە.

عیشوە: گروشمە، گریشمە، ناز، خۆبادان، فیز.

جادوو: کار و ڕواڵەتی لە ڕادەبەدەر کە بەعارەبی (سیحر)ە.

جـادوویی جـوانی = دەربـڕینێکی یەکـجـار پـڕو چڕو ڕوون کـراوەیشــە کـە هۆنـەران بەزۆری خۆشەویستەکانیان بەجادووکار ناوبردووە لە هەڵبەستیاندا، بەڵام (کوردی) ڕوونی کردووەتەوە کـە ئەو (جـادووە) هـی جـوانیـیـە کـاریگەرەکـەی ئەو ئافرەتـەیە کە ئەم هـەڵبـەسـتـەی بەسـەردا هەڵداوە.

(کافر)= وشـەیەکی (ئیسلامی)یە بەناو نەتەوە ئیسلامەکاندا بڵاو بووەتەوە، بەواتا ئەوەی (کفر) بکات و کفریش مەبەست (لە خوا بەکردگار و توانا و یەکتاو هەر بووە و هەر دەبێ) نەناسرێت لە وتووێژیشـدا زۆرجـار یەکێ بەیـەکێ دەڵێ (کافر) لێـرەدا (کـوردی) ئەوەندە دڵی لە (کـافـر)ە پڕبـووە کـەوا هەرچی بوویەتی بردوویە لە تـاواندا بە(کـافــر) ناوی بردووە و هـەڵوێسـتـی ئەو خۆشەویستەی خۆی، بەرامبـەر بەخۆی، وەک (کافری) داناوە، چونکە هەر تەنیا دڵێکی هەبووە و ئەو (دڵە)ش ئەو کافرە بردوویەتی ئەوەندە بێ بەزەیی بووە.

ئەم هەڵبەستەی (کوردی) یەکێکە لەو هەڵبەستـانەی کە تیایا بەئاشکرا خۆشەویستیی خۆی بۆ ئافرەت ڕاگەیاندووە.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ما/٢)دا بەم جۆرەی دواییە.

«بەناز و عیشوەدوو جادوو، ئەوی هەمبوو هەمووبت برد».

هەروەها لە دوو تاکی یەکەم و سـێیـەمـدا بـاسی مـەمکی کردووە کە بە بـاسی مـەمکدا لەباسی (نێرینە) جیا دەکرێتەوە کە بۆ (مێ)یینەیە.

٣- جۆلانە: بریتییە لە پەت یا گوریسێکی دوولانەکراو کە دوولانەی هەر سەرێکی بەشتێکی وەک درەخت، سنگ، کۆڵەکە، دیوار، پەنجەرە و...هتد بەند دەکرێ و لە ناوەڕاستدا ئەوەندەی جێگەی تیا بوونەوەی (منالێک) (گەورە)یەکی بەئازار و بێ ئارام، بە(جاجم) یا بە(پەتوو) و ئەمانە شوێنی تیا پاڵکەوتنی ئەو (منالّ) یا (گەورەیە)ی وەک دەستە بەرەیەک خۆش دەکرێ و ئەوکەسەی تێ دەخرێ و، ڕادەژەنرێت بۆ ئارامگرتن و کەمکردنەوەی ئازارەکەی.

(کوردی) لێرەدا ئەو دڵەی کە ئەو دڵخوازی بردوویەتی بەیاد دەکاتەوە و پێی دەڵێ: ئەو دڵەم مەگەر لە جۆلانەیەکی ناو پێچووگرێی زولفتدا ڕام بکەیت و ئارامم بۆ پێ بگریت.

شوێنی ئەو جۆلانەیەیشی بەسەر (مەمکۆڵە)ی دڵخوازەکەیەوە دەستنیشان کردووە. وەک لەنیو باڵی یەکەمدا بەم دەربڕینە ناسک و جوان و شاعیرانەیەی وەک نەخشەکێشێکی ورد و لە (کەڤاڵ)= (لەوحە)یەکدا وێنەی بۆ گرتووین.

گرە: پێچ، لوولی، قەفی چەماوەی زوڵف و ئەگریجە.

مەمکۆڵە: مەمکی گچکە، کەواتە ئەو خۆشەویست و دڵخوازەی (کوردی) (کچ) یا (کچۆڵە)یەک بووە نەک نەک (قەیرە کچ) و (ژن). کە مەمکیان وەک هی کچۆڵە گچکە نییە.

مەر: مەگەر.

شەیدا: شێت، پەتیارە.

خەملاندن: ژیرکردن و، ڕامکردن، ئارام پێ گرتنی دڵە شەیدایەکەی،

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ما/٢)دا نییە.

٤- ئەم تاکە درێژەپێدان و سەرپڕکردنی تاکە هەڵبەستی پێشووە کە لەمەڕ دڵە شەیدا و (بێ ئارام) و (نا ئارام)ەکەیدا.

وەگەر: ئەگەنا.

گلاراو: نەخۆشێیەک کە دەردەکەی گل تێ بەربوونی لەشی بێ (گلاوی)، (گلگرتوو).

پەتی پچڕاوە: مەبەستی لەوەیە کە دڵەکەی وەک ئاژەڵێکی بێ ئارام ڕاگەیاندووە لە (نا ئارامی)دا ئەو پەتەی پێی بەستراوەتەوە پساندبێتی و (بەڕەڵلا) و بەلەسە بووبێ و لەدەست دەرچووبێ کە لە شێواویدا بەیدەست کردنی لە وزەدا نەمابێ.

دە بۆ: دەی سا بۆچی؟، دە ئایا لەبەر چی؟.

پێوەی بناڵێنم: بەدەست ئەو دڵە (یاخی) و (نامۆ)یەوە فیغان و زاری بکەم.

تاکەی (ئەم چرووسێنی) = (کوردی) ڕووی دەمی دەکاتە کچۆڵە دڵخوازەکەی و، لێی دەپرسێ ئایا ئیتر بەس نییە و هەتاکەی ئاوا من (ئەچرووسێنیتەوە). سزام دەدەی، لاوازم دەکەی، گەیشتن و ڕزگار بوون لەو سزایەی تیا بووە.

ئەم تاکە هەڵبەستەش دیسان لە (ما/٢)دا نییە.

٥- ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی) وەک بچووککراوەی هەموو هەڵبەستەکانی وەهایە، کە سۆزێکی

(نەشاردراوە)ی (کەساسی) سروشتیی (کوردی) دەردەبڕێ.
هەر ئەو سۆزە بێگەردەیەتی کاریگەریی داوە بەتێکڕای هەڵبەستەکانی (کوردی) و پێوەی تایبەتمەندە و ناسراوە. بۆیە لام وایە ئەم هەڵبەستەی کەمتر دەستاودەستکردن و دەسکاری و گۆڕان و شێواندنی بەسەر هاتووە و، ڕەسەنایەتیی زۆر تیایە.
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا ئەوپەڕی دەستبلاوی و دڵفراوانی و (لەخۆبردوویی) ڕاست و ڕەوانیی خۆی بۆ ئەو کچۆڵە دڵخوازەی دەربڕیوە، کە بە(ماڵ) واتە سامان و گوند و زەویزار و کۆشک و تەلار و ڕەز و باغ و کانی چەشمە سار و، بە(دڵ)، کە بەبێ (درۆ) و بەساغی و ڕاستی و لە هەموو ناخەوە ئامادەی یەکدڵی بوون و، بە (تەن = واتە لەش) کە هەرچی لە وزەی لەش و لاری خۆیدا بێ، بەکاربێنێ بۆ دڵڕاگرتن و خۆشی و کامەرانیی ئەو کچۆڵەیە و دڵنیاکردنی کچۆڵەکەش کە لە هەمووان پتر هەر خودی (کوردی) گیانی خۆ (بەخت کارە) لە ڕێگەی خواست و پێداویست و دڵکراوەی ئەو کچۆڵەیەدا و، لە تاکی دووەمدا بەو پرسیارەوە ڕای گەیاندووە کە ئایا بەندە و کۆیلەیەکی وەک منی (کوردی) دەست دەکەوێ، کەچی بەمانەیشمەوە هەر دەمرەنجێنێ و دەتەوێ لە خۆتم بکەیت؟؟
لە کۆتاییدا ئەوە ڕادەگەیەنم کە (کوردی) بەوەیدا کە هەر ژنی نەهێناوە، دیارە لەم دڵدارییەیدا لەگەڵ ئەو کچۆڵە بەس سەرنەکەوتووە و بۆ (کوردی) نەبووە، وەک چەند جاری تریش ئەمەی لێ ڕوویداوە.
مودێکە: ئەم وشەیە لە (مودەتێکەوە) پەیا بووە و مەبەستیش لەوەیە کە (ماوەیەکە)، و (بەینێکە).
دەستت داوەتە: کەوتوویتە، خەریکی ئەوەی، لە پەیکاری ئەوەدای، سەرگەرمی ئەوەی.
ڕێگرتنی خەڵکی: مەبەستی لەوەیە خۆت ئاشکرا دەکەیت و بەجوانییەکەت دڵی خەڵکان دەکێشی بەلای خۆتدا.
لەوەوە ئەوە بەبیرت دادێت، کچۆڵەکە کەوتووەتە قیتەقیت کردن و لە پەیکاری ڕاوکردنی دڵی کەسێکدایەکە خۆی هەڵی بژێرێت، کەواتە وازی لە (کوردی) هێناوە؛ بەڵگەی ئەم ڕاستییەش ئەوەیە کە (کوردی) وەک گلەیی لێی پرسیوە ئەی خۆشەویستەکەم بەوە کە دڵمت داگیر کردووە و بردووتە هێشتا واز ناهێنی؟؟
ڕەزا نابی؟ = دانامرکێیت؟ بەست نییە؟ قایل نابی؟ مرزوم نابێ؟
باج: جۆرە پارەیەکە وەک گومرگ بەناوێکەوە دەسەنرێت وەک ئەوەی کە کچۆڵەکە باجی جوانییەکەی خۆی بەڕاکێشانی دڵی خەڵکی و، وەرگرتنی دڵیان وەک باج، (باجی جوانی)یەکەی خۆی لە دڵداران، لە تەماشاکەرانی دەسێنێ.
لەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) دەری خستووە کە ئەو کچۆڵەیەی ئەم خۆشی ویستووە، بەڵام ئەو کچۆڵە بایەخی بە(کوردی) نەداوە و بەدوای ئارەزووی داگیرکردنی دڵاندا گەڕاوە و

ڕواڵەتێکی سروشتیی ئافرەتی بۆ دەرخستووین.

٧- نیگاه: تەماشا، نواڕین، ڕوانین، سەیرکردن.

قەتڵ: کوشتن- کە بەکاریگەریی جوانی چاوی کە تەماشای بکرێت ئەو تەماشاکارە دەکوژرێت، واتە گیرۆدەی داوی دڵداریی ئەو چاو جوانە دەبێت.

ئیحیا: زیندوو کردنەوە، گیان هێنانەوە بەر زیندەوەری مردوو.

عوششاق: دڵداران ئەوانەی سەوداسەر و گیرۆدەی داوی دڵداریی (عەشق) بوون.

ئولکە: هەرێم، ناوچە، کیشوەر. بەداخەوە ئەم وشانە بەوردی واتایان جێگیر نەکراوە.

حوسن: جوانی، شیرینی.

پێغەمبەر: کەسێکە، لە خواوەو بەناوی خواوە خەڵکی ئاڕاستەی ڕێڕەوێکی چاک و ئاینی کردووە.

وەک، زەردەشت، (ئیبراهیم خەلیل) و مووساو عیسا و محەمەد (د.خ).

ئیعجاز: موعجیزە نواندن کە (موعجیزە) کارێکی لە ڕادەبەدەری ئەوتۆیە هەر تەنیا لە دەست پێغەمبەران هاتووە، کارێکی نەکردەنییە بۆ مرۆڤانی تر و، لە وزەیاندا نییە و نەبووە.

٨- (قادر): وشەیەکی عەرەبییە و لێرەدا بەواتا (توانا) هاتووە. وەک لە شوێنی تری هەڵبەستەکانی ناو ئەم پەڕاوەیەدا هاتووە (کوردی) وشەی (قادر)ی بەچەندین واتاو مەبەست بەکارهێناوە لە هەڵبەستەکانیدا.

لەو زۆر بەکارهێنانەی ئەم وشەیدا (کوردی) دەرگای ئەوەی لە خۆی کردووەتەوە کە چەند سەرچاوەیەک لە (کورت بینی)و (قووڵ تێ ڕۆنەچوون) و (تێنەگەیشتنەوە)، (قادر) ناوێکیان بەستووە بە(کوردی)یەوە کە گوایە (کوردی) حەزی لێ کردووە، بەڵام من لە زۆر شوێندا بەتەواوی ئەو پیا هەڵبەستنەم پووچ کردووەتەوە بە بەڵگەی باوەڕپێکراوەوە.

لەم زۆر (قادر) بەکارهێنانەی (کوردی) لە هەڵبەستەکانیدا دەردەکەوێ کە چۆن (مەنصوری هەلاج) وتەی (ئەنالحەق)ی کردبووە (فەلسەفە)ی ژیانی خۆی (کوردی)یشمان وشەی (قادر)ی کردووەتە (فەلسەفە)ی ژیانی و هەرجارەی بەواتایەک یا بە مەبەستێکی جیا لەوانی تر، بەکاری هێناوە کە سەرچاوەکەشی دیسانەوە (خواپەرستی)یەکی وەک ئەوەی (مەنصوور)ە و ڕێبازێکی سۆفیگەرانەی (کوردی) بووە، لەم تاکە هەڵبەستەدا کە بۆ کچۆڵەیەکە، ئەوەتا دیسانەوە جێگە دەستی خۆی کردووەتەوە و (قادر)ێکی تیا ئاوێتە کردووە و کچۆڵەکەی کردووەتە ئەو (قادر)ە توانایەی کە توانایی (ڕۆژی ڕووناک) لە خەڵک کردنی بە(شەوی تاریک) ڕاگەیاندووە کە مەبەستەکە بۆ (مێ)یە نەک (نێر)ێکی وەک (قادر). وشەی (دەنوێنی) لە پاشبەندی تاکی پێشوودا هاتووە کە لەوێدا بەواتای (دەتوانی بیکەیت) و لێرەشدا بەواتای (خەوی لێ بخەیت) بەکاری هێناوە کە شەوی تاریک خەولێکەوتنی پێوەیە، هەرچەند مەبەستی لەم (خەواندن)ە (مراندن)یشە.

٩- هەر دوو دەست: نیشانەیە بۆ بە(پەنجەی دەست) نیشانەکردنی پێغەمبەری ئیسلامە (د.خ) بۆ (مانگ)و لەت (شەق)ی کردووە کە (موعجیزە)یەکی ئەو بووە.

بۆی: بۆ ئەو کە کچۆڵەکەی مەبەست بووە.

(ماه): مانگ، کە یەکێکە لە ئەستێرەکانی (کۆمەڵەی خۆری) کە ئەم گۆی زەوییەی ئێمەیەش یەکێکە لەو کۆمەڵە ئەستێرەیە.

(پەروین): بەئاسمانەوە کۆمەڵە ئەستێرەیەکی تر هەن کە بەهەزارانن و تەنیا شەش ئەستێرەیان بەچاو دەبینرێن کە بەپاڵ یەکەوە لەشێوەی هێشوویەکدا لە (ڕۆیشتن)دان بەئاسمانەوە دەدرەوشێنەوە (لە جریوەدان) کە لە (زمانی) سەرێنی پەهلەویدا واتە بەپەهلەوی ئاخاوتنی پێ وتراوە: (پەرڤی یێ PERVIe) وە (پرۆ)، (پروە)، وە (پرن)شی پێ دەگوترێ کە بە کوردیی ئێستە (لالا)و بەعەرەبی (ثورەییا) بە، هەروەک (پەروین)یش ناوێکی (کوردی) و (فارسی)یەتی.

(پەروین) ناوی یەکێکە لە قۆناخ واتە (مەنزل)ەکانی (مانگ) لە سووڕانەوەیدا بەدەوری ئەم گۆی زەوییەی ئێمەدا.

جان: گیان، ڕەوان و (لەش)یش دەگرێتەوە.

مان: بوونێتی، ژیان، ژین و، (بەقای) عەرەبیشە.

تاقە ماچێکی کە ناهێنێ واتە ئەی کوردی تۆ بەو توانایییەی مانگ و پەروین بەدەست ڕاگرتنتەوە ناتوانی ماچێکی لێ بسێنی و، یا ئەی (کوردی) تۆ بەو لێهاتوویییەتەوە ماچێکی ئەو کچۆڵەیە ناهێنی واتە بایی ماچێکی ئەو نابێت و لەمەشدا جوانیێتیی وێژەییی تیایە و وەستاکارانە و شاعیرانەیە.

ئەم پارچە هەڵبەستە وەک ڕام گەیاند لە دوو سەرچاوەدایە کە یەکێکیان (ما/٢)ە و لەم سەرچاوەدا دووجار نووسراوە جارێکیان بریتییە لە حەوت تاکی ئەم پارچە هەڵبەستە کە دوو تاکی (٣،٤)ی تیا نییە و، ئەو دوو تاکە هەر لە (مع)دا هەن.

جاری دووەمی نووسینی ئەم پارچە هەڵبەستە لە (ما/٢)دا بریتییە لە تەنیا یەک (چوار باڵی - چوارینە) ئەویش لە نیو باڵییەکانی دووەمی (٦ و ٢ و ٨ و ٧)ی ئەم هەڵبەستەی ئەم جێگیر کردنەی ئێرەیە وەرگیراون و بوونەتە چوار (نیو باڵی) کە ئەمەی خوارەوەیە:

(چوارینەکە)

«بەوەی بردت، ڕەضا نابیت باجی جوانی دەستێنی
ئیتر (کافر)، دڵێکی کەم لە کوێ بوو؟ تا دەری بێنی
هەزاران عاشقی وەک من کە چاو هەڵبێنی دەنوێنی
لە ئولکەی جوانیا پێغەمبەری و، (ئیعجازی) دەنوێنی»

من وەک ئاگەداریم لەگەڵێ کەشکۆڵەوە وەرگرتووە؛ تێ گەیشتووم هەندێ لە کەشکۆڵ نووسەکان لە پارچە هەڵبەستێکدا کامە (شابەیتی جوانی تیا بووبێ) هەر ئەوانی لە کەشکۆڵەکەیدا نووسیوەتەوە، ئەوەیشی بۆیە کردووە کەشکۆڵەکەی بەهەڵبەستی هەڵبژاردە پڕ بکاتەوە، هەرچەندە ئەو کارەش بووەتە هۆی پچڕ پچڕ بوونی پارچە هەڵبەستێک وەک لەم پەڕاوییەدا زۆر ئاڵۆزی و شێواوی لە هەڵبەستەکاندا دەبینرێ، هۆیەکیان ئەم کارە بووە.
ئەمجا منیش بەدووری نازانم ئەم (چوارینەیە لە کارێکی واوە دروست بووبێ).

٦٠١

## لە جێگەی شیرکرۆژانی بەبە

"شایی دایکی عەبلان"

١- لە جێگەی (شیرکرۆژان) و، دلێرانی (بەبە)ی دوێنێ
(شوغال) سەردارە، ئەمما (گورگ) بە دوو گوێیدا ئەلوورێنێ

٢- لە شایی (دایکی عەبلان)دایە، بێ (مارە)یە (بووک) ئەیبەن
لە بۆ (سوڵتان). (عەبلان): پێ خەسوو، بووکی ئەڕازێنێ

٣- مەلا (زوڕناژەن) و شێخیش (دەهۆڵ کوت): فەقێیە (هەڵپەڕکێ)
(ڕوبا)ی سەرچۆپی کێش، دەسرۆکی کلکی هەڵدەسووڕێنێ.

٤- چ پیاو ماقووڵی (ئەصناف) و، چ دەمڕاست و، چ ئەشرافن
لە کووچەی (غوربەتا) وێڵ و، (پەنابردە)، دەناڵێنێ.

٥- خەڵاتی (ڕۆم)؛ وڵاتی چۆڵ و، وێرانە، لە (بابان)دا
لە (کاول)دا نەبێ (ئاشیان)ی کوندە، لاڵە، ناخوێنێ.

٦- لە (شایی) بەس بڵێ، یاران ئەبێ دەرفەت بەدەس بێنن
هەتاکو، ئەم: (جەنازەی گوردی کوردە)، چاوی هەڵبێنێ.

٧- مەڵێن (هیجری)، لە (زید)ا، (کوردی)یە، بیللا لە حەشریشا
(بەکوردی)، (کوردی)، دەعواچی حەقی کوردە و هەر ئەیسێنێ.

---

١- شیرکرۆژ: ئەو وشە لێکدراوە ، بە ڕێنووسی کۆن و، بەشێوەی (شیرکرۆژ) نووسراوە لە سەرچاوەکەیدا بەڵام بە دوو جۆری: (شێرکرۆژ)یش دەخوێندرێتەوە کە (شیرکرۆژ) مەبەست لەو دەروێش و موریدانەیە کە لە کاتی (حاڵ لێ هاتن)دا، (شووشە) و (شیر) واتە (قەمەی درێژ) دا ئەکرۆژن، بەبێ ئەوەی زیانیان پێ بگات، و من بۆ ئەم شوێنە (شیرکرۆژە)ە کەیانم بە (بەجێ تر) هەڵبژارد چونکە هەرچی وەک (شێرکرۆژ)ە کەیانە بەمەبەست و، واتایی: (ئازا)، (دلاوەر) و (دلێر)یش دێت و لەبەرئەوەی کە وشەی خودی (دلێر) لەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە، من (شیرکرۆژ)ەکەیانم هەڵبژارد کە لە سەرێنی (کوردی)دا زۆر بوون و، (دلێر)یش زۆر بوون.
دوێنێ: ئەم وشەی (دوێنێ)یە لەم تاکە هەڵبەستەدا مەبەست لەوەیە کە (کوردی) دوا بەدوای

ڕووخاندنی فەرمانڕەوایی (بابان) ئەم هەڵبەستەی داناوە، بۆیە بە (دوێنێ)ی ناو بردووە.
چونکە هەڵبەستەکە دەنگ لە دوای ڕووخاندنەکەی (بابان) دەدات بەشێوەیەکی (چیرۆکئامێز)ی (تێز) پێ کردن.
شوغال: ناوێکە (کوردی و، فارسی) بەمەبەست لە (چەقەڵ) بەکاری دێنن کە گیاندارێکە ئەوەندە و لە شێوەی (ڕێوی)دایە، بەڵام بە (ترسنۆک) و (بوودەڵە) ناسراوە کە مەبەستی لەم (شوغال = چەقەڵ)ە خودی (عەبدوڵڵا پاشای بابان)ە کە دوای ئەوەی (بابان)ی بەڕووخاندن دا.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە:
ئەم هەڵبەستەم تەنیا لە یەک سەرچاوەوە، وەرگرتووە کە ئەویش کەشکۆڵە دەسنووسەکەی هاواڵی فەقێیەتیم (فەقێ محەمەد)ی ئەوەی شاعیری هەورامی (صەید)ی دووەم، وەرگرتووە.
ئەم هەڵبەستە تاکو ئێستا چاپ نەکراوە و ئەوی لەم پەڕاوە دایە، یەکەمین جاری چاپکرانیەتی، لەلای منەوە.
بەسەرنجدانێکی ئەم یەکەمین تاکی پارچە هەڵبەستە بەڕاستی دەنگی قرچە قرچی سووتانی جەرگ و هەناوی (کوردی)ی لێ دەبیسترێ و بۆ چڕووکی ئەم سووتاندن و قرچە قرچە هەناسەی خوێنەر و بیسەری ئەم هەڵبەستە تەنگ دەکات و دڵسۆزی بۆ (کورد) و (کوردستان) پەروەری (کوردی) و (بابان) دۆستیی ناوبراومان بۆ ڕوون دەبێتەوە.
بەڕاستی ئەم هەڵبەستە (بەڵگەنامە) و (سەرچاوە)یەکی گرینگ و بەنرخ و بایەخداری مێژووی گەلەکەمان لە سەرەتای نیوەی دووەمی چەرخی نۆزدەیەمی زاینیدا و سامانداری کردنی مێژووی فەرمانڕەوایی (بابان)مانە.
٢- (شایی دایکی عەبلان):
(عەبلان سووک کراوەی ناوی (عەبدوڵڵا)یە کە مەبەست لە خودی (عەبدوڵڵا پاشا)یە.
ئەم ڕاستییەم لە (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بەدەمی وەرگرت لە ساڵی ١٩٦٢ز.دا کە جارێکیان لەسەردانیدا باسی ئەم هەڵبەستەم بۆ کرد و ئەویش فەرمووی:
دەبا داستانی ئەم (دایکی عەبلان)ەت بۆ ڕوون بکەمەوە بەم جۆرە کە (عەبدوڵڵا پاشای بابان) فەرمانڕەواییەکەی (بابان)ی ڕووخاند چەندین ڕۆژ لە شاری (سولەیمانی)دا کردبوویە شایی و بەزم و هەڵپەڕکێ و ئاهەنگی خۆشی گێڕان لە لایەن سوپایەکەی خۆی و عوسمانییەوە.
لەسەر ئەوە خەڵکی (سولەیمانی) بەو بەزم ڕەزمەیان گوتووە ئەمە (شاییی دایکی عەبلان)ە و هەندێکی تریان وتوویە (دایکی عەبلان کوڕی بووە) کە مەبەست لە (عەبدوڵڵا پاشا) بووە.
هەروەها هەر لەوەوە ئەو دوو گوتنەی: (شایی دایکی عەبلانە) و (دایکی عەبلان کوڕی بووە).
بوون بە دوو (پەندی پێشینان) لە زەمانی کوردیدا و، بۆ هەر یەکێ کردەوەی (بێ جێ) و (ناشایستە) بکات، یەکێ لەم دوو پەندەی بۆ بەکار دەهێنرێ.
(بەبێ مارە بەبووک دەیبەن) ئەم دەربڕینەی کوردی لەم تاکە هەڵبەستەدا مەبەستی لەوە بووە کە کردەوە ناپەسندەکەی (عەبدوڵڵا پاشا) لە ڕووخاندنی (بابان)دا پێ چواندووە، بەوەی کە

ئەو پاشا نارەسەنە بەدکردەوەی خۆی وەک (بەبێ مارەکردن) دایکی خۆی بەبووک پێشکێشی کەسێک کردبێ وابووە. بگرە زۆرتریش بووە لەو بەبێ (مارە)کردنەشیدا و بە (بووک) بردنەیدا بۆ (سوڵتانی عوسمانی) بەرادەیەک تەنانەت خودی (عەبلان = عەبدوڵڵا پاشا) خۆی بووە بە (بەربووک) ئەوەندە نامەرد بووە.

واتە (پێ خەسوو)ی دایکی خۆی هەر خۆشی کەوتووەتە ئارایش و تاس و لووسدان و سووراو و سپیاوکردن و خەنە تێ گرتنی دایکی خۆی، بۆ ئەوەی چاکتر بە دڵی سوڵتان بێ ئەگەرچی بەبێ، مارەکردنیش بووبێت کە ئەمەش هەرە ئەو پەڕی جنێوی خەست و خۆڵە بە (عەبدوڵڵا پاشا)ی داوە، ئەویش بەرامبەر بەو ناپیاو بەگەورەییەی ئەو (عەبلان)ەیە لە دژی (نەتەوە) و (خانەوادە) مەزنەکەی خۆی کردوویەتی.

٣- من لە مەبەستی (مەلا) و (شێخ) و (فەقێ) و (ڕوبا) دەگەیشم و بۆم ساغ بوونەوە کە ئەوانە کێن و لە مامۆستا (مودەڕیس)یشم پرسی:

فەرمووی: ناتوانم ناوی ئەو (مەلا) و (شێخ) و (فەقێ) و (ڕوبا)یەت بۆ دیاری بکەم.

بەڵام دەتوانرێ ئەو کەسانە بەزەماوەندگێڕەکانی (شایی دایکی عەبلان) دابنرێن کە بەو جۆرە شاییەکەیان گەرم کردووە و، هەر جۆرێک بێ مەبەست لەو کەسانەن کە لە کارە پاکییەکەی (عەبدوڵڵا پاشا)دا پشتگیری و لایەنداریان کردووە، کە بێگومان ئەو جۆرە کەسە هەڵپەرستانە لەسەرێنی بوونی فەرمانڕەوایی باباندا لەگەڵ ئەو فەرمانڕەوایەدا بوون، کە دەوترێ: (مێژوو دووبارە دەبێتەوە) مەبەست لەم نەریتەیە.

٤- پیاو ماقووڵی ئەصناف: گەورەپیاوانی بازرگان و کاسبکاران و دووکانداران و پیشەسازان و هونەرمەندان و ئەو جۆرە کەسانەی ڕەشەگەل، کە شکۆداری توێژەکەی خۆیان بوون.

دەمڕاست: زمانپاراو و تێگەیشتووان و دڵسۆزانی گەل کە لە کوردەواریدا باو بووە لە لایەن فرمانداارانی هەر کات و هەر لایەکی کوردستان و ناو خێڵەکانیشماندا هەمیشە پرس و ڕایان پێ کراوە و، فەرمووودەیان بەپەسند وەرگیراوە، چونکە نەتەوەی کورد لە کۆنەوە کەوا لە کوردەواریدا (ڕیش سپی= ڕسپی)شیان پێ وتراوە.

ئەشراف: مەزنە ڕەسەنەکانی گەل، لە توێژی سەرەوە و ڕەوشت باشان کە لە فەرمانڕەواییەکانماندا دەنگیان وەرگیراوە شکۆدار و ڕێزمەند بوون.

کووچەی غەریبی: کۆلانی شارانی بیانی.

ڕەهەندە: دەربەدەر و لانەواز و ئاوارە لەدەست بەڕێوەبەرایەتییە خراپەکانی دژ بە کورد و کوردستان کە لە کۆنەوە لە کورستان باو بووە.

وێڵ و پەنابردە: وێڵ ئەو کەسەی ڕەهەند و دەربەدەر و شوێنی تیاگیرساندنەوەی دیاری نەکرابێ کە تێیدا بە (پەنابەر = هانابەر) جێگیر بووبێ.

دیارە ئەو کەسانەی کە لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا هاتوون، هەمیشە بەدەم ئەو دەردانەیانەوە ناڵاندوویانە و تلاونەتەوە.

٥- خەڵات: دیاری، بەخشیش.

ڕۆم: تورکی عوسمانی.

لەم نیـو باڵـی یەکـەمـە دا مـەبـەسـتـی ئەوەیە دوای ڕووخـانـدنـی (بـابـان) سـوپـای (ڕۆم = تورک) خاکی بابانی وێران کردووەو هاونیشتمانییەکانی ئاوارە کردووە و بەوە هەرێمی چۆڵ کردووە.

کـاول: وێرانکراو، مـەبەسـتـی لە کـەلاوەکـانـی وێرانکراوی خـاکـی (بـابـان) و بەتایبـەتـی شـاری (سـولەیمانـی)یە؛ چونکە (ڕۆم = عوسـمـانـی)ی چـواندووە بە (کوندەپەپوو) (کوندە) کە هەمـیشـە هێـلانە (ئاشـیـان) لە کـەلاوە وێرانـدا دەکـات و دەگـەنـە ئەو (کـوندەبـوو)ە زمـانـی خـوێندن = (پەپووکـردنی) لاڵ دەبێت و توانایـی خـوێندنی نـامـێنـێ لە (ئـاشـیـانـە = هێـلانە)ی نـاو کـەلاوەدا نەبێت، کـە (عـوسـمـانـی)یش ئەو وێرانکاریـیـەی وەک خـەڵات پێـشکەشی بەخـەڵکی قـەڵەمڕەوی (بابان) کردووە، هەتا ترسی ئاوەدانی نەبێ، کە لێی هەڵگەڕێنەوە.

٦- (شـایی): مـەبەست لە شـایی لۆغـان و بەزمـەکـەی (شـایی دایکی عـەبلان)ەکە لە پێشـەوە ڕوونم کردەوە و، (کـوردی) خـۆی بەخـۆی گوتووە ئیـتـر بەسـە لەو بەزمـی (شـایی)یە مـەدوێ و، نۆرەی ئەوەیە کـە کـوڕە کـوڕەی ئازا و دلاوەری نیـشـتـمـانپـەروەر هـەوڵ و کـۆشـشـی ئەوە بدەن کـە دەرفـــەت لـە دەست نـەدەن تـۆڵەی کـــوردانـەی خـــۆیـان لە ســـوپـای تـورکـی ســـتـــەمکـار و بەکـرێگیـراوەکـانی بکەنـەوە و بەڕێوەبەرایەتـیی (بابان) زیندوو بکەنـەوە هەروەک لە نیـو باڵی دووەمدا فەرموویەتی:

بۆ ئـەوەی تـەرمـی (جـــەنازەی) (پـاڵەوان = گـــورد)ێکی وەکـــو (بابـان) جـارێکی تر زیندوو ببێتـەوە و گیان و تینی بەبەردا بێتـەوە لە نوێوە چاوەکانی هەڵبهێنێ و سـوپای چەپەڵ و، وێرانکـاری تورکی ڕەگـەزپەرست لە خـاکـەکـەی بکاتـە دەرەوە، فـرمـان ببـێـتـەوە فـرمـانـی (کـورد)، لـە (بابان)دا کـە ئەو گـرێیـە گـەورەی سـەر دڵـی (کـوردی) بووە هەروەک گـرێی سـەردڵـی هـەمـوو کوردێکی پاکیش بووە و هەمـیـشـە لێرەدا تاکە هەڵبـەسـتێکی تورکیی هۆنەرێکی تورکیم بەبیردا دێتـەوە کە ئاخـۆ، تۆ بڵێی (کوردی)ی شـاعـیـریشمـان ئەو تاکە هەڵبـەسـتـەی بیستبێ ، بەدوای ئەو تاکە تورکیـیـەدا ئەم تاکـەی سـەرەوەی دانابێ، یا هـەر بەبیرا هاتنەوەیەکی ئەم و ئەو: (تَواردُ الخَواطِر)ە کە (کوردی) بەبێ (پێزانینی) ئەو تاکە تورکییە خۆی بەپێی بار و شوێن و کات ئەم (تاک)ە کوردییەی بۆ هاتبێ و ئەمەش زۆرجار ڕووی داوە و ڕوو دەدات.

ئەمیش تاکە هەڵبـەستە تـورکییـەکە بەداخـەوە ئێـستا دڵنیـا نیم لە ناوی خاوەنەکـەی و پێم وایە جاری تر لەم پەڕاوییەدا لەم تاکە تورکییە دواوم.

(تاکە تورکییەکە):

« ئۆڵەز بـوو (وطن)، فرض مـەحـاڵ، ئۆڵسـەدە مـوطلەق
چەکمەز، کورەنن، (سرتی)، بوو (تابووتی جـەسیمـی)».

واتە:

(ئەم نیشتمانە نامرێ، ئەگەر مردنەکەشی گریمانەک بێ کە نەیێتە دی، ئەوە دیسان هەر بەڕاستی).

(شانی ئەم گۆی زەوییە ئیتر توانای ئەوەی نییە کە ئەم تەرمە زەبەلاحەی نیشتمانی مرێنراو هەڵگرێ).

واتای وشە تورکییەکان:

ئۆلەز: نامرێت.

بوو (وطن): ئەم نیشتمانە.

فرض مەحال: ئەمە عارەبییە و بەواتە گریمانەیەکی ئەوتۆ کە هەرگیز نەیەتە دی.

ئۆلسەدە: ببێ (واتە ئەو فەرزی مەحاڵە ببێ) یا (بێتە دی)، بەلام:

موطلەق: ئەمیش عارەبییە و مەبەستی لەوەیە کە: (موحەققەق) واتە هەر بەڕاستی و بەیەکجارەکی ئەو کارە ناگونجێ و نایەتە دی.

چەکمەز: بۆی هەڵناگیرێ، ناتوانێ (تەرم)ەکە هەڵگرێ.

کوڕەنن: (کورە) مەبەست لە گۆی زەوی و ئەو پاشگری (نن)ەی خراوەتە سەر بەواتە هی گۆی زەمین کە مەبەست لە شانی (گۆی زمین)ەکەیە کە (تەرمەکەی بۆ هەڵناگیرێ بۆ هەتا هەتایی).

(سرت): شان (سرتی = شانی) واتە هی گۆی زەوی.

بوو تابووتی: ئەم تەرمە کە (تابووت)ەکەش عارەبییە.

(جەسیم): لەشی زۆر قەبارە مەزن (زەبەلاح) و پاشگرێکی (ی)ی تورکی خراوەتە سەر ئەم وشەی (جەسیم)ە عارەبییە و بووەتە (جەسیمی) واتە زەبەللاحی.

٧- شاعیر (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا گەیاندوویەتە چڵەپۆپەو ئەم تاکە وەک دەڵێن (شابەیت)ی پارچە هەڵبەستەکەیەتی.

(مەڵێن هیجری): شاعیر ڕووی دەمی کردووەتە هەمووان و فەرموویە: ئەوە مەڵێن کەوا (من) هەر کاتێ لە (زێد)دا واتە لە نیشتمان (کوردستان)دا بم نازناوم (کوردی)یە بەشکو تەنانەت لە ڕۆژی قیامەت (حەشر)یشدابم (هەر کوردم) و بە (کوردی دەدوێم) وەک لە نیو باڵی دووەمدا فەرموویەتی:

من لە ڕۆژی (حەشر)یش دا هەر تەنیا بەزمانی کوردی دەدوێم نەک بە زوبانی عارەبی.

هەر بە (زوبانی کوردی زکماکی خۆم ئەدوێم) و تەنانەت لە ڕۆژی قیامەتیشدا (دەعواچی)ی مافی نەتەوەی کوردم دەبم.

لەم نیو باڵی دووەمەدا وشەی (کوردی) کە دووەمین جارە هاتووە، هەم مەبەست لە خودی شاعیر (کوردی) و هەم مەبەست لە هەموو کوردێکی پاکە کە لە قیامەتیشدا بەزمانی کوردی (دەعواچی)ی مافی ڕەوای نەتەوەی کورد دەبێ لە بارەگای خوای بەرز و پیرۆزدا و (کوردی) بە (بڕوا) و (بیر) و (ورە)یەکی زۆر تۆکمەو بەتینەوە بەدڵنیاییەوە ڕای گەیاندووە کە ئەو مافە ڕەوا نەتەوایەتییەم دەسێنێ.

١٠٧

## شیختنی

١- شَــــیـــــخَـــــتِنیْ بهْـــــجــــرِکَ والله یاصُــــبَیْ
رەحـــمت براله بۆ کــەی و، جـــەورت هەتابەکــەی؟
٢- دائیـم لەدەوری خـــــاڵی روخت بێ قـــــەراره دڵ
هەر وەک له دەوری قـوطبی فـەلەک دائیرەی جـودەی
٣- هات جەیشی خەط ئەصەفحەیی ڕووت، ماڵی کاولم
هیندووش طەماعی کردووه له تەسخیری موڵکی ڕەی
٤- تافــەرشی جــوودی تۆ لـەســەر ئەم ئەرزه ڕاخــرێ
مەشـهووره فەرش بەذیللەتی حاتەم بەئیسمی طەی
٥- وەک گـــوڵ جگەر بە خـــوێنم و وەک لاله دڵ بەداغ
بۆ سیبی ڕووت، شەقائیقی ڕووم ڕەنگی بوو به بەی
٦- چاوم پڕ، له شــــەوقــــه بۆ دیدەنی تۆ، دەکـــەی؟
ڕەحمێ له پڕ، دەکەیتو سەرێ له کەپری دڵ دەدەی؟
٧- بەهەمەن صیفەت: بەتیری غەم، ئەسفەند یاری دڵ
ئوردیبەهشـتی عـەیشی به دەل بوو، بە عـەینی دەی
٨-تیـغنت له بۆ هیـلاکی من، ئەگـەر له مـشـتـه سـا
غەم عەزمی پێشدەستییە، خۆت زووکە، لێ دە دەی
٩-« کوردی» له هیجری (سالم)ه وا غەرقی میحنەته
ڕەحـــمت براله بۆ کــەیو جـــەورت هەتا بەکــەی.

.......................................................................

١- شیختنی: پیرت کردم.
بهجرک: بەدووری و جیاییت.
والله: بەخوا
یاصُبَی: ئەی ڕۆڵە، ئەی کوڕە بچکۆلەکە.
ڕەحم: بەزەیی، چاودێری، دڵسۆزی.

جەور: سزا، ئازار، ستەم، ناخۆشی.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە کەشکۆلی دەستنووسدا (مس، عن، جا، ر، ما، نن، نم١)ەو لە چاپکراویشدا: (گ، س، گ٣)یە. لەنێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
لە(عن)دا لە سەرەناوی ئەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوەدا نووسراوە:
(نامَەء أِشتیاقِ کُردی بَرای سالِم رحمهماالله– علي) واتە (ئەم هەڵبەستە نامەیەکی ئارەزوومەندیی کوردی)یە بۆ «سالم»ی نووسیوە خوا بیانبەخشی– عەلی) بەوەدا نووسراوە (رحمهماالله) کاتی نووسینی ئەم هەڵبەستە لە سەرچاوەی (عن)دا (کوردی) و (سالم) نەماون لە ژیاندا هەروەها (عن) لە کۆتایی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەشدا وەڵامەکەی (سالم)ی نووسیوەتەوە کە لە دوای لێبوونەوەی ئەم هەڵبەستە پێشکەشی ئەکەم ئەم (وەڵام)یش بەرپەرچی ئەوانەیە کە دانانی ئەم هەڵبەستەیان داوەتە پاڵ (مناڵبازی)ی کوردی.
ڕەحمت (نم١، نن): زحمت.
ڕەحمت (گ٢، س، گ٣): رەحمەت.
جەورت (گ، س): هیجرەت.
جەورت (گ٣): هجرت.
براله (ر): برا
(بۆکەی و) (هەتابەکەی) (ما): (بو کیو) (هتابکی) کە ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
٢– دائیم لەدەوری: بەڕێنووسی کۆن (دائیم لدوری: دائیم لە دووری)ش دەخوێندرێتەوە و بۆ ئێرەش دەگونجێ.
ڕوخ: ڕوو و لە یاریی شەترنجیا مەبەست لە قەڵایە و ئەمیش، ئەشێ.
کە (خاڵی ڕوو) و (خاڵی وەک قەڵا قایم) کە لێوی (کوردی) ی نەگەیوەتێ.
قەرار: ئارام.
قوطب: هەرە لووتکەی سەرو بنی گۆی زەوییە.
دائیرەی جودەی: ڕێڕەوی پیاسووڕانەوەی ئەستێرەی قوطب (جەدی)یە بە دەوری زەویدا بەهیزای سەر قوطب (قبلە)ی پێ دەزانرێ، بۆیە (ئەستێرەی قیبلە)شی پێ دەڵێن.
دڵی بێ ئارامی (کوردی)ش بەدەوری خاڵی ڕووی وەک قەڵای خۆشەویستەکەیدا وەک سووڕانەوەی ئەستێرەی (جەدی) بوو بەدەوری (قوطب)دا کە لە توانایی (کوردی)دا نەبوو، بیگاتێ و ئارام بگرێ.
ئەم تاکە لە (ر) دانییە و لەوانی تردا دووەمینە.
خاڵی (جا، نم١، نن): خانەء: (خانەی). ئەمەش هەڵەو لەنگە.
جودەی (ر): جدی
جودەی (گ٢، س، گ٣): جەدی

جودەی (جا، نم نن): جەی
ڕاستکردنەوە: فەرهەنگ: پەڕاوییە ئەستێرە شوناسییەکان (جەدی)یان تێدایە، دیارە (جودەی) بۆ ڕێککەوتنی پاشبەندی هەڵبەستەکەیە هەر چەند دەربڕینێکی ناڕاستە، هەر چەندە لەدەستووری وێژەی کۆندا ڕێگەی پێ دراوە.
٣- جەیش: لەشکر، سوپا.
خەط: مەبەستی لە ڕووی (سالم)ە.
ئەصەفحەیی: بۆ سەر ڕوو پەڕەی (هەروەک رووەکەی کردبێتە ڕووپەڕەی قورئان یا گوڵ) ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە (کوردی) لە (سالم)ی ئامۆزای بەتەمەنتر بووە.
کاول: وێران.
هیندوو: هیندی و مەبەستی لە تووکی ڕەشی ریش و سمیڵی (سالم) کە وەک خەلقی هیندی ڕەش باون.
طەماع: ئارەزوو، مرخ خۆشکردن. گێز.
تەسخیر: داگیرکردن.
موڵکی ڕەی: خاکی یا وڵاتی ڕەی و مەبەست لەناوچەی (تاران) کە ئەم ناوی (ڕەی)یەش ناوی کۆنە شارێکە کە (٨) کیلۆمەتر لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی تارانەوەیە.
ئەم تاکە هەرچەند لە (ر)دا سێیەمینە، بەڵام دوا تاکە و لەوانی تردا سێیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
جەیشی خەط (ر، ما): جیش خط.
ئەصەفحەیی (گ٢، س، گ٣): لە صەفحەیی ئەوەش دەسکارییە.
ئەصەفحەیی (ما): أصفحەء.
ئەصەفحەیی (ر): صفحەی.
طەماعی (ما): طماع.
طەماعی (ر): طمع.
کردووە لە (جا، ر، نم١، نن): کردوە
مولکی ڕەی (مس، عن، ر): ملک ری. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
مولکی ڕەی (ر): ملک اری. دیسان ڕێنووسی کۆنە
مولکی ڕەی (ما) ملک ری. دیسان ڕێنووسی کۆنە.
٤- فەرش: ڕایەخ.
جوود: بەخشندەیی.
ئەرز: زەویی: و مەبەستی لە وڵاتی بابانە.
مەشهوورە: بەناوبانگە.

زیللەت: زەبوونی، کەنەفتی، پەستی
حاتەم بەئیسمی طەی: حاتەم بەناوی (طەی)یەوە کە مەبەستی لە بەخشندەیی بەناوبانگی (حاتەم)ە، کە لە (عەشیرەتی طەی)بووە و ئەو بەخشندەییە لە چاو ئەوی سالم دا لە هەر پەست و زەبوونی و هیچیدا بوو. ئەم تاکە لە (ر)دا نییە و لە (مس، عن، ما، فا، نم١، نن)دا، چوارمینە و لە (گ٢، س، گ٣)دا پێجەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
فەرشی جوودی (مس، عن، ما): فرش جود.
ئەرزە (گ٢، س، گ٣): عرضە.
ڕاخرێ (ما، گ٢، س، گ٣): راخرا.
مەشهوورە (ما): مشهور.
بەئیسمی (مس، عن): باسم.
بەئیسمی (گ٢، س، گ٣): بەناوی. ئەمە لە دەستکارییەکانی گیوە.
حاتەم بەئیسمی طەی (ما): حاطم باسم طەی.
٥-جگەر بە خوێن: مەبەستی بۆ سووریی گوڵەکەیە.
وەک لالە بەداغ: دڵ بەداغی لالە (گوڵاڵە) لەوەوەیە کەوا خاڵێکی ڕەش لە ناوەڕاستی گوڵاڵە دایە کە هۆنەران بەدڵی داغداری خۆیانیان ناو بردووە.
سیب: سێو
ڕووت: ڕووی تۆ، پەتی، ڕووتووقووت. کە دەگونجێ
شەقائیق: چەند جۆرە گوڵێکی بەهاریی سوور و جوانە وەک، چارە چەقیلە، شەقڵە شوانانە، گوڵاڵە سویسنە و... هتد و گوایە ڕەنگی ڕووی (کوردی) وەک ئەو (شەقائیق)ە سوور بوو.
ڕووم: ڕووی من وەیا بە(ڕۆم)یش دەخوێنرێتەوە.
بەی: بەهێ و مەبەست لە ڕەنگە زەردەکەیەتی کەوا ئەو ڕەنگی سووری وەک شەقائقەی ڕووی خۆی بوو بەڕەنگی زەردی بەهێ لە داخی دووری و ... هتد
ئەم تاکە لە (ر)دا دووەمنیە لە(گ٢، س، گ٣) سێیەمینە و لەوانی دیکەدا پێنجەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
گوڵ (مس، ر، ما) کل – ڕێنووسی کۆنە.
جگەر (مس، ما): جکر – دیسان ڕێنووسی کۆنە.
بەخوێنم (جا، نم١، نن): بە خوینم – دیسان ڕێنووسی کۆنە.
دڵ بەداغ (ر): بداغ.
دڵ بەداغ (جا، نم، نن): دڵ لەداغ .
سیبی (ر): سیف.
بۆ سیبی (ما): بو بوی.

بۆ سیبی (گ، س، گ٣): بۆ سێوی، دەسکارییە.
شەقائیقی (ر، ما): شقایق.
شەقائیقی (گ، س، گ٣) شەقایقی... دەسکارییە.
بوو بە بەی(ر) بکی.
٦- کەپڕ: کە پریەتی، تەژیە
شەوق: ئارەزوومەندی، چاوەنواڕی
دیدەنی: چاو پێکەوتن، سەردان
دەکەی: چ وەختێ، کەی؟؟
ڕەحم: بەزەیی، دڵ پێ سووتان، دڵسۆزی
لەپڕ: لە ناکاو، لەپڕێکا، لە کوتوپڕیدا.
دەکەیتو: تۆ دەکەی
کەپر: چوار کۆڵەکەی چەقاوە لە سارایەکدا و سەرەکەی دارەڕایەو بە گەڵا و پووش گیراوە.
چواندوویەتی بەکەللەی سەری یا دڵی بۆشی خۆی.
دەدەی: (دەدیت) و (دەسادەی خێراکە).
سەرێ لە کەپری دڵ دەدەی: سەردانێکی کەپری دڵ کە مەبەست لە خودی (کوردی)یە و بریتییە لە چوار چڵە پەلە (ڕەقوتەق)ەکانی وەک داری کەپرەکە بەسەر دڵە زیندووەکەیەوە بەڕاستی ئەم تاکە وردەکاریی جیناس ئارایی و یاری بەوشەکردنی وەستایانەی تیایە و لەو پەری قووڵی و جوانیدایە و بەبێی وێژەی کۆن زۆر پەسەند و باڵایە. بەڵام کێشەکەی کورە.
ئەم تاکە لە (گ/٢، س، گ٣)دا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە هەردووکیان لە (ر، ما، جا، نم١، نن)یشدا نییە و تەنیا لە (مس، عن) دایە و شەشەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەردووکیشیاندا چونیەکە.
٧- ئەم تاکە هەڵبەستەش یەکێکە لە هۆنراوە بەرزەکانی (کوردی) بەپێی وێژەی کۆن و، واتای یەکجار ورد و فراوانی بەهێز دەدات، بەڵام وەک تاکی پێشوو تەنیا پشتی نەبەستووە بە(زمانبازی)یەوە، بەشکو هونەرمەندییەکەی خۆی تێدا تێکەڵ بە مێژوو، و زانستیی ساڵگەرگەری (تەقویمی) و وێژەیی و ئەفسانەیی و زمانی،... هتدیشی کردووە. لەبەرئەوە ئەوا بەنیمچە درێژیەک واتای هەریەکێ لە وشەکانی ناو ئەم تاکە هەڵبەستە لێک دەدەمەوە و پەیوەندیی ئەو واتایە بەمەبەستی هەڵبەستەکەوە دیاری دەکەم تاکو بتوانرێ هەڵبەستەکەیان لێوە نزیک بکرێنەوە:
بەهمەن: ناوی ڕۆژی دووەمی هەریەکێ لە مانگەکانی ساڵی ڕۆژی (شەمسی)یە، کە ئەمەش نیشانەیە بۆ سەرەتای ژیان و سەرەتای خۆشی و خۆشەویستی کە بەتیری غەم لێی تێک دراو.
بەهمەن: ناوی مانگی یانزەیەمی ساڵی (ڕۆژی)یە کە بەرامبەرە بە: ٢١ی مانگی (کانوونی

دووەم) تاکـو ١٩ی (شـوبات)ی هـەر سـاڵێکی زاینی (مـیـلادی) کـە ئەم سـاڵی (ڕۆژی)یەش ڕێکاوڕێکە لەگـەڵ سـاڵی (کـوردی)دا کـە لە ڕۆژی:٢١ی (مـارت: ئازار: نـەورۆز)ەوە دەست پێ دەکات و سـەری ساڵە. ئەم مانگەش (بەهمەن) ڕێکەوتی هەڕەتی سەرماوسۆڵە و چلەی زسـتان و ناخـۆشی و زریانە و ئەمـانـەی وەک تیری غـەم داناوە لە (بەهمـەن صیفـەتی)یەوە ئاراستـەی (ئەسفەندیاری دڵی کراون و... هتد.

کوڕی ئەسـفەندیاری ناو ئەم هەڵبەسـتـە و پاشایەکی کەیانی و لەپەیکاری تۆڵەی باوکیا بووە لە ڕۆستەم.

بەهمـەن: بە واتە: ڕنوو یا ئەو بەفرەی لەسـەر چیاوە دادەنرێ و هـەرەس دێنێتە خـوارێ و هـەتا بەرەو خـوارتر بێـتەوە، بەفری تر بەزۆری لە خـۆیەوە دەلکێ و کـاتێ ئەو کـۆمەڵە بـەفرە گـەورەیە دەگاتە دامێن، ناو تاقی چیا و دۆڵەکە پڕ دەکاتەوە و ئەوەش بەهۆی بەژێرەوەکردنی کـەسان لە ڕێبوار و کاروانی و ئاژەڵ و زیانییەکی گەورە دەدات و ڕێگە دەگرێ،... هتد هـەڵبەسـتـەکەش ئەم (ڕنوو)یەی وەک (صیفـەتی بەهمەن) یا وەک تیری غەم بەو صیفەتە بەهمـەنییـە (ئەسفەندیار)ی دڵی کردووە بەژێرەوە و نوغرۆی کردووە و لە ناوی دەبات.

بەهمـەن: ناوە بۆ یەکەم (ژیری عـەقل یا عاقل) لە جـیـهـان یـا گـێتـیـدا کـە مـەبەسـت لە خـوای ئەفسـانەیی یا ڕواڵەتی ئەو خـوایەمـانە و...هتد. هەڵبـەسـتـەکەش وا دەگـەیەنی ئەو ژیرییـەی ئەو خوایە بەتیری غەم لە (دڵی ئەسفەندیار) یا (ئەسفەندیاری دڵی) (کوردی) ی داوە و... هتد.

صیفـەت: سروشت، خوو، ڕواڵـەت، ڕەوشت و، مەبەستی لەوەیە کـە ڕواڵەتی وەک هـی (بەهمەن) وەهـان و، ئەو ڕواڵەتانەی بەهمـەن وەک تیری غەم وان و هتد...

بەتیری غـەم: بەگوللەی خەموخـەفەت- جا ئایا تیرەکە لە (بەهمەن)یا لە (ئەسـفەندیارەوە بێ یا هـەر خۆی (غەم) بێ وەیا بەپێچەوانەوە لەمیانەوە بۆ ئەویان ئاراستە کرابێ و هتد...

ئەسـفەندیار: ئەم نـاوە،یا ئەم وشـەیە ئەگـەر بە(ئەسـفەند) و (یـار) وەربگرین، ئەوا هـەریەکێ لەم دوو بەشـەی واتای جیـاوازی خـۆی هـەیە کـە (یار) بەواتە دۆست و خـۆشـەویست و هـاوەڵ بەڵام ئەسـفـەند: بەتەنیـا بەواتە: (تـۆویی گـوژاڵک)ە کـە ڕوەکێکی کێـویلەی لە جـۆری ترۆزی و کـاڵەک (گندۆرە)ی بچـووکـترێکە و بەرێکی وەک (شـەمامـە: شـەمامـۆکـە)ی یەکجـار تاڵ (حـەنضـەل) دەگرێ و مەبەستی لە (تاڵی)ی ئەسفەندی (هـاواڵ)ی دڵیەتی، بەهۆی ئەنگاوتییەوە و بەو تیری غەمی صیفەتی بەهمەنییە و ژیانی لێ (تاڵ) کردووە.

ئەسـفـەند: ناوی مـانگی دوانزەیەمین سـاڵی (ڕۆژی) یەکە بەرامـبـەر و بە٢٠ی (شـوبات) تاکو: ٢٠ی (مـــارت: ئازار) کـــە ئەمـــیش مـــانگی زســـتـــان و ڕێکەوتی دوا دوای چلـە و ئاڵۆزی کـــەشـــوتووشی و بـا و بارانـی سێ شـــەش و بورجـی پیـــرێژن و... هـتـــد دەکـــات و مـــەبەست هـەڵبەستەکە بۆ ئێرە وەک ئەوەیە کە لەسـەر (مانگی بەهمەن) لێکم دایەوە...

ئەسـفـەنـدیـار: خـۆ ئـەگـەر ئەم وشـەیە یا ئەم نـاوی (ئەسـفـەندیار)ە بەیەک وشـە لێک دایەوە و

(یار)ەکەی لێ جیانەکردەوە، ئەوا واتای جیاوازی تر دەدات وەک:
ئەسفەندیار: بەواتە توانایی(حەق) کە ڕواڵەتی خوایە- بەپێی هەڵبەستەکە هێزی صیفەتی بەهمەنی خراپکار وەک تیری غەم و لە توانایییە (حەق) و مافەی دڵی(کوردی) دراوە کە ئەمەش لە سەر فەلسەفەی دەسەلاتی زۆر(قوە)یە بەسەر (حەق)دا.
ئەسفەندیار: بەواتە دڵسۆزی و (لوطف) کە ئەمەش ڕواڵەتێکی خوایی و مرۆڤایەتییە کە ئەو ناسکی و دڵسۆزی و لوطفەی دڵەکەی بەتیری غەمی بەهمەن صیفەتی، پێشێل کراوە.
ئەسفەندیار: ناوی خوای (ئەسفەند)ی ناو براوە کە بەپێی ئەفسانەیی، ئەو صیفەتی بەهمەنییە بەتیری غەم خوای دڵی (کوردی)ی ئەنگاوتووە.
ئەسفەندیار: ناوی یەکێکە لە پاڵەوانە کۆنەکانی (کەیانی) کە ناوی لە پەڕاوی (شاهنامە)ی (فیردەوسی)دا هاتووە و نازناوی ئەو پاڵەوانە (پۆلاتەن) یا (جان پۆلا) بووە کە عارەبەکان کردوویانەتە (جانبلاط)، باوکی (بەهمەن)نی پاشای کەیانی بووە کە لە پێشەوە ناوم برد.
جارێکیان ئەسفەندیار بەفرمانی (گشتاسب)ی باوکی چووەتە جەنگی ڕۆستەمی (مازەندەرانی)یەوە، ڕۆستەم هەرچەندی کردووە دەرەقەتی نەهاتووە، چونکە تیر و شیر کە لە (مەعدەن) بوون کاریان لێ نە دەکرد، ناچار ڕۆستەم تیرێکی دووفلیچقانە(دوو نووک)ی لە داری (گەز) کە دارێکی زۆر ڕەق و پتەوە دروست کردن تێی گرت و لە چاوی (ئەسفەندیار)ی داو، برینی ئەو تیرە بووە هۆی لەناوبردنی ئەسفەندیار، چونکە تیرەکە لە (مەعدەن) نەبوو لە (دار) بوو. کە لە هەڵبەستەکەدا ئەم سەرگوزەشتەیەش مەبەستە و ئەسفەندیاری دڵی(کوردی) بەتیری غەمی ڕۆستەمە، وەک صیفاتی بەهمەنی پێکراوە.
ئوردی بەهیشت: ناوی سێیەمین ڕۆژە لە هەر مانگێکی (ڕۆژی)دا، مەبەستی هەڵبەستەکەش وەک لێکدانەوەی سەر (بەهمەنی دووەمین ڕۆژی مانگ) وایە کە لە پێشا لێکم دایەوە.
ئوردیبەهیشت: ناوی مانگی دووەمە لە ساڵی (ڕۆژی)دا کە بەرامبەرە بە٢١ی (نیسان) تاکو: ٢١ی(مایس: ئەیار)ی ساڵی زاینی، ڕێکەوتی وەرزی بەهار دەکات و مەبەستی هەڵبەستەکە بەم پێیە ئەوەیە ئەو وەرزە خۆشی بەهارەی ژیانی ئەسفەندیاری دڵی بەتیری غەمی بەهمەن صیفەت تێک دراو لێی بوو بەساردی ووشکی و ناخۆشی پایز و تاریکی...هتد.
ئوردیبەهیشت: بەواتە (ئاگر)ە کە ئەویش ڕواڵەتی پەرتەو (نوور)ەو (نوور)یش لە خواوەیە کە لە لای زەردەشتییەکان پیرۆز بووە. بۆ هەڵبەستەکەش ئەو (نوور)و ووناکی و، شەوق و گەرمییەی ئەسفەندیاری دڵی (کوردی) بەهۆی تیری غەمی صیفەتە خراپەکانی بەهمەن و ئاگر و وەجاخ و هیوا پیرۆزەیان خستووەتە کوژاندنەوە و بەرەو تاریکییان بردووە.
ئوردیبەهیشت: ناوی فریشتەیەکە، پارێزگاری شاخ و چیاکان و هەڵسووڕاندنی کاروبارییانی لە مانگی (ئوردیبەهیشت)دا پێ سپێردراوە، بۆیە مانگەکەش بەناوی ئەوەوەیە و لە هەڵبەستەکەدا ئەم فریشتەیە ئەنگیوراوە، بەتیری غەمی بەهمەن صیفەتی و ئەو توانایییەی لێ

تێک دراوە بە نائارامی.

ئوردیبەهیشت: ناوی جەژنێکی هەرە گەورە و پیرۆزی کۆن بووە و کە ڕێکەوتی ڕۆژی سێیەمی مانگە لە مانگی ئوردیبەهیشتەکاندا ئاهەنگی تێدا گێڕدراوە و بەجەژنی (ئوردیبەهشتەکان)یان ناو بردوە و لەم هەڵبەستەدا تێکچوونی ئەم چەژن پیرۆزەی (کوردی) دەگەیەنێ.

عەیش: ژیان، ڕابواردن، خۆش گوزەرانی.

بەدەل بوو: گۆڕدرایەوە، ئاڵوگۆڕ بوو، ئەویش بەهۆی ئەو تیری غەمەوە.

بەعەینی: بەخودی، هەر بەخۆی- وە یا (عەین: چاو) و، (بەعەینی) بەواتە (بەچاوی) ئەم چاوەش نیشانەیە بۆ چاو پێکانەکەی ئەسفەندیار بەتیری ڕۆستەم،... هتد.

دەی: لە ڕووی زمانییەوە بەواتە: (دەسا دەی) یا (هی کەی: ئیدی)، یا (تاریکی وەک دەیجوور) و ناوی فریشتەیەکیشە یا (پایز) و سەرما و قەبزی پایز و وشکی و ناخۆشییەکەی چونکی (دەی) ناوی مانگی دەیەمینی ساڵی (ڕۆژی)یە کە بەرامبەر بە٢٢ی (کانونی یەکەم) تاکو: ٢٠ی (کانونی دووەم کە ئەمیش پایزە و گەلێ واتای تریش دەدات کە هەموویان دەبەسترێن بە لێکدانەوەکانی پێشەوە و لەگەڵیاندا دەگونجێن.

بەبیر لێکردنەوەوە و بەدواداچوون چەندان واتای ورد و قووڵی تر لە هەڵبەستەکەوە دەردەکەون بەڕووی پەیوەندی و ڕواڵەییی ڕۆژ و مانگ و ساڵەکانەوە بەژیان و باری مێژوو و وێژەیی و... هتد. وەک هەموو توانایی (کوردی) و جیناس ئارایی (دڵ و بەدەل) (عەیش و عەین) و... هتدن. ئەمانە و گەلێ شتی لەم جۆرە کە لەم پەڕاوییە داهاتوون.

هەموو بەرپەرچی ئەوە ئەدەنەوە کە زۆر لە لێکۆڵەرەوەکانی (کوردی) و هەڵبەستەکانی لایان وایە کە هەڵبەستەکانی کوردی سادەن، ئەمەش ڕاستە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانرێ لەژێر زۆربەی ئەو سادەییانە تێدا زۆر جار داوی ئاڵۆزیی ئەوتۆی ناوەتەوە کە وا بەئاسانی بەسەر نەبرێن.

بە تایبەتی ئەگەر بەچاوی سەرێنی (کوردی) و بەپێی دەستووری وێژەی کۆن سەرنجیان بدەینێ.

ئەم تاکە لە(ر)دا نییە و لە(گ٢، ما) نسخەدا شەشەمین تاک و دوا تاکیشە هەرچەند لە (جا، نم١، نن، گ٢)دا شەشەمینە، بەڵام دوا تاک نییە و لە(حی، عن)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

بەتیری (ما): بەتیر

ئەسفەندیاری (ما، نن، نم١): أسفندیار.

ئوردیبەهیشتی (ما): أوردی بهشت.

بەدەل (نن، جا، نم١): بدل- ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

بەعەینی دەی (ما) جنین دێ.

٨- هیلاک: کوشتن، لەناوبردن، مراندن.

لە مشتە: لە دەستایە، بەدەستەوە.

سا: دەسا.

عەزمی: نیازی، ئارەزووی، لەسەر سووربوون،

پێشدەستی: دەس پێشکەری

خۆت: تۆ: مەبەستی لە(سالم)ە

لێ دە دەی: دە لێی بدە دەی سا تێی سرەوێنە.

ئەم تاکە لە(ر، ما، گ٢، س، گ،٣)دا نییە و لە (جا، نن، نم)دا حەوتەمین و لە (مس،عن)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و هێشتا چاپیش نەکراوە.

نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (جا، نم١، نن) دا بەم جۆرەیە:

«یار وا بەقتلی (کوردی) بیچارە تیغی گرتە مشت»

هەر ئەم هاتنی ناوی (کوردی)یە لەم نیوباڵەی ئەم سێ سەرچاوەیە و ئەوانی تری وەک ئەم سیانەدا بووەتە هۆی ئەوەی کە مەسەلەی بەستنی هەڵبەستەکە بە(سالم)ەوە فەرامۆش بکرێ. جگە لەوەی کە کێشی ئەم نیو تاکە ئاوێتەیە (کە ئەشێ هی هەڵبەستێکی تری بێ و دەستی من نەکەوتبێ.) درێژ تر و لە کێشی هەڵبەستەکەو بە تێخستنی (کوردی)یە کە کێشەکەی ئاڵۆزاوە.

عەزمی (مس، عن): عزم.

٩- لە هیجر: دووری

سالم: عەبدولڕەحمان بەگی ئامۆزای (کوردی)یە کە نازناوی هەڵبەستی (سالم) بووە

غەرقی: نوقمی.

میحنەت: ناخۆشی و چورتم و گێچەڵ.

نیوباڵی دوایی ئەم تاکە هەمان نیوباڵی دووەمی تاکی یەکەمی ئەم پارچە هەڵبەستەیە کە (سالم)یش لە وەڵامی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)دا خستوویەتە دوا تاکی هەڵبەستەکەیەوە وەک لەدواوە دێت. ئەم تاکە لە (جا، نم١، نن، ر، ما، گ٢، س)دا نییە و تەنیا لە (مس، عن، گ٣)دا هەیە و لەم سێ سەرچاوەیەشدا دوا تاکە و لە (مس و عن)دا نۆیەمین و لە (گ٢)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە:

نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (گ٢)دا بەم جۆرەیە:

«هیجری لەبەر فیراقی ئەتۆ غەرقی هیجرەتە»

کە دیارە ئەم نیوباڵەش شێواویی تیا پەیا بووە و لە وتنی (کوردی)ی دوور خستووەتەوە.

هەرچەندە هەموو سەرچاوەکان بە (نازناوی کوردی)یەوە نووسیویانە و تەنانەت وەڵامەکەی (سالم)یش هەر (کوردی)ی وتووە، بەڵام ئەوەتا لە (گ٣)دا بە(هیجری) نووسراوە کە هەڵەیە.

دوای ئەوەکە هەڵبەستەکەی (کوردی) یا ئەم نامەیەی سەرەوەی بۆ (سالم) برایەوە ئەوا وەڵامەکەی (سالم) دەنووسمەوە.

لە(عن)دا لەسەر ناوی ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی (سالم)دا کە وەڵامەکەی (کوردی) بەفارسی نووسیویە: (جواب سالم برای کردی ومتأسفانە إین جوابرا ناقصا حاصل کردم- علی) واتە (ئەم هەڵبەستەی دوایش وەڵامی سالمە بۆ «کوردی» کە بەداخەوە ئەم وەڵامەم بەناتەواوی دەستکەت- عەلی). لەم وشەی (ناتەواویی)یە دەتوانین ئەوە دەربێنین کە ئەم وەڵامەی (سالم) دەبووایە ژمارەی تاکەکانی بەقەدەر ئەوی (کوردی) واتە(٩) بووایە، بەڵام ئەوەتا کە تەنیا(پێنج تاک)ی دەستکەوتووە هەرچەندە لە هەردوو دیوانە چاپکراوەکەی (سالم)ی (کوردی و مەریوانی) و (گیو)یش دا هەر پێنج تاکی ئەم هەڵبەستە نووسراوە، بەڵام لە دیوانەکەدا ئەمە دیاری نەکراوە کە وەڵامی (کوردی)یە.

ئەمیش هەڵبەستەکەی «سالم»ە

١- جانانە حاڵی ئەم دڵە گەر جوستوجوو دەکەی
مەشغووڵی ناڵەیە لەجودایی بەمیثلی نەی
٢- (چهرەات کە پیش أزین بصفا رنگ لالە بود)
ئێستێ دەبا لە حینی خەزانا گرەو لە بەی
٣- چاوت لە بەزمی بادەکەشان بێتو عیشوەکا
ناکەین بەڕەسمی نەشئەیی مەستی هەوایی مەی
٤- غەم جەیشی سەلموطوورە دێیتە سەر ئێرەجی دڵم
بۆ شۆرشی لە وەغا چۆڵی سینە بوو بە ڕەی
٥- (سالم) دەلیلە مەصرەعی (کوردی) بڵێ بەیار
ڕەحمەت برالە بۆ کەیو جەورت هەتابەکەی

.................................................................

٢- ڕەنگ لالە بود (گ٣، مس١) ڕەنگی لالە بو، ئەمەش هەڵەیە چونکە فارسییە.
٣- بادە کەشان (گ٣): بادەگوشان- ئەمیش هەڵەیە (بەواتە مەیخواران)یشە
ناکەین (گ٣، س١) ناکەن- ئەمیش ناگونجێ.
٤- چۆڵی (س١): چدلی.
چۆڵی (گ٣) چ دەڵی.
کێشی ئەم تاکە (نیوباڵ نیوباڵی) ناتەواو و تەکووڵۆ و زیاد و کەمە، بەڵام بەیەکسەر هەموو تاکەکە بەپێی بڕگە کێشەکەی تەواوە.
٥- بۆ کەیو (س١): بوی.
بۆ کەیو (گ٢): بۆ وی و.

١٠٨

## تیری عەشقی

١- تیـری عـەشـقـی چاوەکـانت وا لە جـەرگم کـارییـە
ئاو لە چاوانم بـەخـــوڕ دێ ڕەنگەکــەی گــوڵنارییــە
لێم گەڕێن، با جێ نشینی کونجی غەم بم ئەی ڕەفیق
دەردەکەی مـن دەردی عەشـقـە زۆر گران و سـارییـە

........................................................................

١- گوڵناری: وەک ڕەنگی گوڵە هەنار.
کونج: گۆشە، کەنار،
ڕەفیق: برادەر، هاواڵ، هاودەم، دۆست.
ساری: تەشەنەکار، ئەو نەخۆشییەی لێوەی بکەوێتەوە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (مس، ما٢)ە کە لە کەشکۆڵەکەی (مس)دا بەدەسنووسی (نەجمەدین عومەری) ناوێک لە ساڵی ١٣٣٢ی کۆچیدا نووسیوە لە ژێر ناوی (کوردی)دا.
هەرچەندە ئەم چوار باڵییە مۆرکی (کوردی)ی پێوەیە بەڵام شێواویشی پێوە دیارە و، لەبەر ئەوەی کە سەرچاوەی زۆرم دەست نەکەوت وە واش دەردەکەوێ کە ئەم چوار باڵییە بەشێک بووبێ لە هەڵبەستێک بۆیە جارێ بە نیمچە گومانێکەوە بە هی کوردیم دانا.

١٠٩

## دەک ڕەقیب

١- دەک (ڕەقـیب)! تووشـی بەڵایەک بی، نەجـاتت قـەت نـەبێ
مـــانیـــعی وەصل و حـــەیاتم بووی، حـــەیاتت قـــەت نـەبێ
٢- وەک لە من تـێکچـوو حـوضـووری ڕۆحـەکـەم ڕەبی، خـودا
غـەیری (دەسـتی داری کـوێری)، ڕووی جـەمـاتت قـەت نـەبێ

............................................................

١- ئەو (دوو) تاکـە هـەڵبـەسـتـە بەم جـۆرەی لەسـەرەوە نووسـیـومـە لە کـەشـکۆڵەکـەی مـامـۆسـتـا (عـەبدولڕەزاق بیـمـار)م وەرگـرتووە لـە سـاڵی ١٩٦١ز.دا لە بەغـدا کـە بەناوی کـەشـکۆڵ = (سـەرچاوە)ی (ب)وە لەم پەڕاوییەمدا تۆمارم کردووە.
کەشکۆڵە کە لە ساڵی ١٣٠٢ی کۆچیدا نـووسراوەتەوە کە بەرامبـەرە لە ساڵی ١٨٨٤ز.یە بەڵام ناوی نووســەرەکـەی و شـوێنـی نووسـینەکەی تیـا دیاری نەکـراوە، هـەرچـەند ئەم (هـەڵبـەسـتـە بەناوی (کوردی)یەوە تیا نووسراوە.
وەک لە خـوێندنەوەی ئەم (چوارینە)یـەوە دەردەکـەوێ (کووڕی) لە دەقـی نووسـینەکـەدا هـەیە و، دیارە ئەوەش بەهـۆی (دەستاودەست)کردن و (دەماودەم)کردن و نووسراوی (ناخۆش خوێن)ەوە ڕووی دابێ وەک ئەم (دەردانەش) بەزۆربەی هـەڵبەستی هـۆنەرانمانەوە دەبینرێن.
بەمانەیشـەوە مـۆرک و چێژ و شێوەی هـەڵبەسـتی (کوردی) هـەر پێوە نومایانە و شـێـوازییەکانی هـەست پێ دەکرێن وەک لە شوێنی خۆیاندا دەستنیشـانم کردوون.
هـەرچـەندە لەبەر (سـەرچاوە کـەمی)نەمتـوانی بگەمـە وەڵامی ڕاستـی چەندین پرسیـار لە ڕێگەی ساغکردنەوەی ئەم پارچە هـەڵبەستەدا.
وەک: نووسـەری کەشـکۆڵەکە کێ بووە؟؟
- لە کوێ نووسراوەتەوە؟
- ئایا ئـەم هـەڵبـەسـتـە لـە خـودی خـۆیدا هـەر ئەم چوارینەیە بووە یـا ئەمـەی بەشـێکی پارچە هـەڵبەستێکە؟؟
- ئایا ئەم پارچە هـەڵبەستە چەند (تاک) بووە، ئەگەر چوار باڵی نەبووبێ؟،... هتد
جگـە لەوەی ئـەم چوار باڵـیـــە لەو کـــەشکۆڵەدا بـەناوی (کــوردی)یەوە نـووســـراوە و ســـاڵی نووسـینەوەکـەی لە کـەشکۆڵەکەدا دیاری کراوە، ئیـتر نە لەو کەشکۆڵەدا و نە لـە شـوێنی تردا چیم لە بارەی ئەم هـەڵبەستەوە پێ نەزانیوە.
لە کەشکۆڵەکەدا ئەم چەند وشـەیەی دوایی بەم جۆرەی دوایی نووسراون و من ڕاستم کردنەوە.

قەت (ی دەقی – سەرەوە) کە لە کەشکۆڵەکەدا بە (قط) نووسراوە.
مانیعی (ی دەقی سەرەوە) کە لە کەشکۆڵەکەدا بە (مانع) نووسراوە.
وەصل و (ی دەقی سەرەوە) کە لە کەشکۆڵەکەدا بە (وصل) نووسراوە.
ئەمیش لێکدانەوەی وشەکانی ئەم یەکەم (تاک)ە هەڵبەستەیە:
(ڕەقیب) مەبەست لە نەیارە و نەمزانی مەبەستی لە کێ بووە.
بەڵا: ئاوقا بوون بەخراپی و ناخۆشی و چورتم و گێچەڵ.
نەجات: ڕزگاری، قوتاری،
قەت لە (قط)ی عارەبییەوە هاتووە بەواتا هەرگیز، چ نە.
مانیع: بەرهەڵست، کۆسپ، تەگەرە.
وەصل: بەیەک گەیشتن، پێکگەیشتن.
حەیات: ژین، ژیان، زیندەگی.
بەلاپێک: ئەم وشەیە لە دەربڕیندا کێشی هەڵبەستەکە گران دەکات و بەشێوەی (بەلایێ) سووک و ڕەوان و بێ گرانی و بێ لەنگییە، ئەشێ ئەمیش شێواوی بێت.

٢- وەک لە پێشەوە نیشانەم بۆ ئەوە کرد شێواوی لەم چوارینەیەدا ڕووی داوە، ئەوەتا لە کۆتایی نیوەی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا وشەی (ڕەبی) بەواتەی ئەی خودا، وە وشەی (خودا) بەمەبەستی ئەی خوایە، هاتووە کە لە دەستووری وێژەی کۆندا ئەم جۆرە دووپاتە کردنەی یەک وشە پەسند نەکراوە و شاعیرمان (کوردی)یش ئەوەندە شارەزاو پسپۆڕی فەرهەنگی هەر چوار زمانەکانی (کوردی) و (فارسی) و (عەرەبی) و (تورکی) بووە کە ئاوا دووبارە کردنەوەی (ڕەبی) و (خودا) کە هەردووانیان یەک واتا دەدەن، بەلایەوە پەسند و جوان و بەجێ نەبووە و دڵنیام کە ئەم دووبارە کردنەوەیە لە خودی (کوردی)یەوە نەبووە و بەهۆی (گۆڕان)ەوە شێواوە بێگومان لە جێگەی (ڕەبی خودا) دەربڕینێکی تر لە دەقی گوتنەکەی (کوردی)دا هەبووە، و مەبەست لە پاڕانەوە لە خوا بووە، کە ئەو (ڕەقیب)ەش ئاوقای سزای خراپەی خۆی ببێت، ئەویش: (کوێربوون)ی (ڕەقیب) بووە، وەک بەڕاشکاوی لە نیوو باڵی دووەمی ئەم تاکەدا (کوردی) خواستی کوێربوونی ڕەقیبی کردووە، بەجۆرێک جگە لە (دەستی گرتنی گۆچانی کوێرێتی) ئیتر هۆیەکی تری دەبێت کە بتوانێ بچێتە ناو (جەمات)ەوە کە پێم وایە ئەم (جەمات)، لە وشەی (جەمات = کۆمەڵ)ی عەرەبییەوە نەبێ و لە (جەم = لا، تەنشت، لال) و...هتد زمانی کوردییەوەبێ.
حوضوور = ئامادە بوونی یارەکە.
ڕۆح = گیان.

١١٠

## ظوهووری تۆیە

١- ظوهووری تۆیە ئامالی هەموو عوششاق، بەسە تاکەی؟
بەجارێ دێنە سەر دینت ئەگەر دەرگانەکەت واکەی
خودا وەحیی کیتابی خەتمی جوانێتیی بە تۆ داوە
لە ئولکەی حوسندا بۆچ ئیددیعای پێغەمبەری ناکەی؟

.................................................................

١- ظوهوور: دەرکەوتن.
ئامال: هیوا.
عوششاق: دڵداران.
دین: ئاین.
وا: کردنەوە، کراوە.
وەحی: دەنگی خوایی، سرووش.
کیتاب: پەڕاوی.
خەتم: کۆتاییپێهێنان - نیشانەیە بۆ خاتەمینی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) لەناو ئایەتەکاندا کەوا پێغەمبەرە.
ئولکە: نیشتمان، هەرێم.
حوسن: جوانی، شیرینی.
ئیددیعا: داواکردن، خواستن، لەسەر سووربوون.
پێغەمبەری: لە جوانێتیدای مەبەستە.
ئەم چوار باڵییە لە گۆشەیەکی (مس)دا بەناوی (کوردی)یەوە نووسراوە، بەڵام ئایا ئەمە سەرەتای هەڵبەستێکە یا هەر ئەوەندەیە ئەم لەلا دیاری نییە و لەم سەرچاوە پتریش لە شوێنی تردا بەرچاو نەکەوتووە.

١١١

## چاوەکەم بۆچی

١- چاوەکـــەم بۆچی لەگـەڵ عـاشق ئەوەند دەعـوا دەکـەی
خـۆت لە جـوملەی دولبـەراندا ئـاخـری ڕیسـوا دەکـەی
٢- مـەجـمەعـی عوشـشـاق دەڕەنجێنیت و دەشـزانی ڕەقیب؟
بەچچە گـورگێکە، کەویی نابێت و شـەڕ ئینشا دەکەی!
٣- دائیمـا کـارت جـەفا و هیـجران و جـەور و غـوصـصـەیە
قـوڕ بەسـەر عـاشق، مەگـەر مـەعشـووقەیی هەر وادەکەی؟
٤- تاکـو تۆ صـاحـێـبی ئەو کـاکـۆڵی وەک زوتنـار بی؟
صەد وەکو صەنعان عەبەث بێ مەذهەب و شەیدا دەکەی.
٥- کـۆمـەڵی عـاشـق ئەمـێـسـتـا وێڵ و سـەرگـەردانی تۆن
جـارێ ناپرسی لە کـوێن؟ گـۆیا لەلای خـۆت چا دەکـەی؟
٦- ئـەهـلـی ئـەم دۆڵ و چـیـــــایـە چاوە چاوی چـاوی تـۆن
تۆش کە گۆشەی چاوەکەت قوربان بەرەو بەغدا دەکەی.
٧- حـــــاکـــــمـی نابێ بـەدادی بێکەســـــاندا ڕابگەی؟؟
داوی دڵ دەپسێنی، (والی) شـاد، لەگەل حـاشـا دەکەی.
٨- مەر لە ڕێی عـەشقا نەبوو فەرهـاد کە کێوی کون دەکرد؟
ئیکە بۆچی تۆ لەگـەڵ ئێـمـە غـەضـەب پەیدا دەکـەی؟
٩- تابـرینـمـــان گـەرمـــە فــریامـــان کـــەوە دادت دەدەین!
تۆ لە ڕێگەی ناخـودا دا حـەیفـە خـۆت لە خـودا دەکـەی.
١٠- ئێـــمـــە وا ڕۆیـین لە مـــەئـیـــووسـی لەلات، دەوڵەت زیاد
دا بزانـین عـــەبدی وەک ئێـــمـــە لە کـــوێ پەیدا دەکـــەی
١١- دڵ ئەوا لۆمـــەم دەکـــاتو، پێم دەڵێ: (کـــوردی) بڵـێ:
گـەر شکایاتم حـەقـە تۆ بۆ قـسـەی بێـجـا دەکـەی؟؟

...............................................................

١– دەعوا: مەبەستی تێگیران و هەرایە.

لە جوملەی: لە کۆمەڵی، لەنێوان.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، ع، ن، گل١، گل٦، ف، ما، ر، کش١، نم١) لەگەڵ (کم، گ٢، س، گ٣)دا (کم)م کردە بنکە بەپشتیوانیی ئەوانی تر.

لەم سەرچاوانەدا کە ڕێنومایییەکی کۆنەی ئەم پارچە هەڵبەستە بکەن، تەنیا دووانیانە کە ناوەڕۆکی هەڵبەستەکەش پشتگیریی ڕێنومایی ئەوان دەکات و ئەوانیش:

١– لە (ف)دا لەسەرەتای ئەم هەڵبەستەدا نووسیویە (کردی در مقابل عبدالله پادشاه بابان) واتە: (کوردی ئەم هەڵبەستەی لەبەرامبەر عەبدوڵڵای پاشای بابان گوتووە).

٢– بەڵام لە (عن)دا ئەم دەستنیشانکردنەی واڵاتر گەیاندووە کە ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوەی کردووەتە سەرەتا بۆ هەڵبەستەکە:

(بعد از سقوط حکمرانی ببه، عبدالله پادشاه ببه، اجتماعی باگروهی از علماء دین و شعراء و هواداران احمد پادشاه ببه کرده که (کردی) رحمهم الله یکی از آنها بوه و در آن اجتماع این قصیده نظم فرموده–علی) واتە: (لە دوای ڕووخانی فەرمانڕەوایی بابان عەبدوڵڵا پاشای بابان) کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کۆمەڵێ لە زانایانی ئاینی و هۆنەران و هەوادارانی (ئەحمەد پاشای بابان)دا کردووە، کە (کوردی) خوا بیان بەخشێ یەکێک بووە لەوانە و لەو کۆبوونەوەیەدا ئەم چامەیەی هەڵبەستووە – عەلی).

دەستنیشانکردنی ئەو دوو سەرچاوە بەنرخە سەرنجمان بۆ سێ خاڵی گرینگ ڕادەکێشێ کە:

١– ئەم هەڵبەستە لە ساڵی ١٨٥١ی زاینیدا وتراوە (دانراوە).

٢– (کوردی) یەکێ بووە لە ڕیزی ناوداران و پیاوماقووڵانی ئەوسام و بگرە لە پایەیەکی ئەوتۆ بەرزیشدا بووە کە ئەوەتا بێ پەروا هێرشی خەستوخۆڵی تێدا بردووەتە سەر دەسەڵاتدارترین کەسێک کە (عەبدوڵڵا پاشا)بووە و (کوردی) ئەوەندە بەخۆیدا ڕاپەڕمووە کە ئامۆژگاریی بکا و ڕێگە بۆ ئەو بەڕێوەبەرایەتییە نوێیەکەی دابنێ و ئەوی ڕاستییە بەبێ مەراییکردن بیخاتە مستی (پاشا)وە.

٣– ئەو دوو سەرچاوەیە ئەم پارچە هەڵبەستەیان لەچەند دێڕێکی دڵداری ساکاری زۆر کاوێژ کراوەوە بۆ هەڵگەڕاندووینەوە بە(ڕووبەڕوویییەکی) بایەخداری مێژووی ئەوسامان کە (بۆ چیڕۆکی) دڵسۆزی و نیشتیمانپەروەری و لە خۆبوردنی (کوردی) بەهۆی هەر ڕستەیەکییەوە لە دڵ و ناخی دەروونییەوە هەڵدەستێ.

ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکەی سەرەوەیە لە سەرچاوەکاندا:

بۆچی (ما): بی سوچ.

ئەوەند (کم، نم١، گ٢، س، گ٣): ئەمەند.

لە جوملەی (ر): لزمرەی.

دولبەراندا (ر): معشوقاندا.

دولبەراندا (ن، ع، کش١، محەمەد ئەمین): معشوقان بۆچ.

خۆت لە جوملەی دولبەراندا ئاخری (نم١، کم، گ٢، س، گ٣). چونکە مەعشووقی بەقوربان عاشقت.

ڕیسوا (نم١، م، ع، کم): رسوا.

تێبینی: شایانی باسە (کوردی) چەند گەشتێکی تریشی لەگەڵ (عەبدوڵڵا پاشای بابان)دا لەم بابەتەوە هەیە، کە وەک لە هەڵبەستی (گەردنم با طەوقی تۆی تێدا بێ ئازادی مەکە)یدا، ئاشکرا دەبێ جگە لە چەند جارێکی تریش کە لە هەڵبەستەکانی تریدا نیشانەی بۆ باری (عەبدوڵڵا پاشای بابان)کردووە و هەموویانم لە شوێنی خۆیاندا دیاری کردن لەم پەڕاویەدا.

٢- مەجمەعی: کۆڕی، دەستەی.

عوششاق: دڵداران مەبەستی ئەوانەیە کە لەو کۆبوونەوەیەدا بوون و تەنانەت خودی (کوردی).

دەڕەنجێنیت: لە خۆتیان دەکەی، دڵیان دەشکێنی.

ڕەقیب: ناکەس، خراپکار، دژ یا بێگانەکان مەبەستە، یا دەستەی (عەبدوڵڵا پاشا).

بەچچە گورگ یا بێچووە گورگ: ئەویش نیشانەیە بۆ هەڵبەستێکی (سەعدی شیرازی) کە لە پەڕاوی (گوڵستان)یدا گوتووە:

(عاقیبت گرگ زادە گرگ شود،

گرچە با ادمی بزرگ شود).

واتە: (سەرئەنجام ئەوەی لە گورگ بێ هەر دەبێتەوە بەگورگ، ئەگەرچی لەگەڵ مرۆڤیشدا گەورە ببێ)

کەوی:ماڵی، دەستەمۆ.

شەڕ: جەنگ، خراپە، بەدیی.

ئینشا: پێکهێنان، دروستکردن، بەرپا، هەڵگیرساندن. نانەوەی مەبەستە.

ئەم تاکە لە:(عن، ن، گل١، گل٦)دا دووەمینە و لە (ع، ن، ما، ر، کش١، کم، گ٢، س، گ٣)دا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.

مەجمەعی عوششاق (ن): زمرء عشّاق.

گورگێکە (ن): کرُگ آسا.

ئینشا (گل١، گل٦): برپا (واتە بەرپا).

٣- جەفا = ناخۆشی، خراپی، بەدکاری، وشکی.

هیجران: دووری، جیایی.

جەور: سزا، ستەم، زۆرداری،
غوصصە: ڕق، قین، پیشخواردنەوە.
مەعشووقە: دڵخواز.
ئەم تاکە لە (عن، ن، گل١، گل٦)دا سێیەمینە و لەوانی تردا دووەمینە
جەفاو (نم١، ف، کم، گ٢، س، گ٣): دەرد و.
جەفا و (ر): جَفا و.
مەگەر (کم، گ٢، س، گ٣): ئەتۆ.
مەگەر (نم١): کەتو.
مەگەر (ع، ر): مکر.
مەعشووقەیی (ر): معشوقە.
مەعشووقەیی (ع/ف): معشوقەء.
مەعشووقەیی (کم، نم١، گ٢، س، گ٣): معشوق.
هەر وادەکەی (نم١، کم): بوی و وادەکەی.
هەر وادەکەی (گ٢، س): بوویێ وادەکەی.
هەر وادەکەی (گ٣): بۆیێ وادەکەی.
٤- صاحێبی: خاوەنی.
کاکۆڵ: ڕەمزی پیاوەتی بووە کە دیارە (عەبدوڵڵا پاشا) کاکۆڵی هەبووە.
زوتنار: وشەیەکی کۆنی یۆنانییە و لە هەرە کۆنەوە بەهۆی سوریانییەکانەوە بەڕۆژهەڵاتیشدا بڵاوبووەتەوە بەواتە (پشتێن) کە (ڕەبەن) و (قەشە)کانی (فەلە = مەسیحی) دەیبەستن نیشانەیەکی فەلەیەتییە و مەبەستی (کوردی) لەوەیە ئەو کاکۆڵە نیشانەی پیاوەتییەتی کە بەسەری (عەبدوڵڵا پاشا)وە بووە گۆڕیویە (زوتنار)ێکی جیا لەوەی کە دەبوو وابواویە و بەو گۆڕانە لە گەلەکەی لای دابوو، و دەستی لەگەڵ بێگانەی وەک عەجەم و عوسمانی و مەمالیکەکانی بەغدا تێکەڵ کردبوو و، ئەوانی بێ مەزهەب و ئاین بوون دوایان کەوتبوو.
صەنعان: خواناسێکی بۆ خوا سولحاو بووە، گیرۆدەی داوی دڵداری ئافرەتە فەلەیەک بوو لەڕێ لای داوە...هتد.
عەبەث: بێهوودە، بێسوود.
مەذهەب: ڕێگەیەکی ئاینییە.
شەیدا: سەودایی، گیرۆدەی دڵداری، دڵدار.
ئەم تاکەش لە (عن، ف، کش١، نم١، کم، گ٢، س، گ٣)دا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لە (ن، گل١، گل٦)دا چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە: لە (ما)دا چوارەمینە و لە (ر)دا

شەشەمینە.

تاکوو تۆ صاحێبی ئەو کاکۆڵی (ر): تا اتو صاحب کاکل.

زوتنارە (ما): زنالی بی.

وەکوو صەنعان (ر): وک منیان.

وەکو صەنعان (ما): وکو صوفی.

عەبەث بێ مەذهەب و شەیدا دەکەی (ما): لە مذهب بی بری و گمرا دەکەی.

عەبەث بی مەذهەب و شەیدا دەکەی (ر): لە مذهب بی بری و رسوا دکی.

٥- کۆمەڵی عاشق: دیسان هەر مەبەستی لەوانەیە کە لەگەڵ عەبدوڵڵا پاشادا نەیارن و ئەو کۆبوونەوەیەیان کردووە کەوا نوێنەری گەل بوون.

وێڵ و سەرگەردان = ڕەهەندە و دەربەدەر و ترسناک و... هتد.

ئەم تاکە لە (ف، ر، نم١، کم، گ٢، س، گ٣)دا سێیەمینە و لە (عن، کش١)دا چوارەمینە و لە (عن، ن، گل١، گل٦، ما)دا پێنجەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

کۆمەڵی (ما): ناخوێندرێتەوە ئەوەندە چووەتەوە بەتەڕبوون و پەڕپووتی.

ئەمێستا (ما): همیسان.

ئەمێستا (ر): لمیرەء.

ئەمێستا (کش١، ن، ع): لمیرا.

ئەمێستا (گل١، گل٦): اویستا.

وێڵ و (ما): ویلی.

وێڵ و (ن، گل١، گل٦، عن، ر، ع): ویل.

سەرگەردانی تۆن (ن): سرکردانتن.

سەرگەردانی تۆن (عن، گل١، گل٦، ع، ر) سرکردانی تون.

جارێ ناپرسی (ر): دفعەء نالی.

گۆیا لەلای (ر): ایالکن.

گۆیا لەلای (ما): گویا لکن.

گۆیا (عن، گل١، گل٦، ع): کویا.

چادەکەی (گ٣): دەکەی. دیارە هەڵەی چاپییە.

(کوردی) لەم تاکەیدا بەتەواوی پشێویی ئەوسای وڵات و برسێتی و ئاوارە بوونی ڕاگەیاندووە لەگەڵ ملهوڕی و گوێنەدانی (عەبدوڵڵا پاشا)دا و ڕووبەڕوو بە خۆشی گوتووە و داویەتەوە بەچاویدا، کە بەهۆی ئەوەوەیە کە وەک هەڕەشەیەک وایە لە ژێرەوە.

٦- دۆڵ و چیا: مەبەستی لە (کوردستان)ە کە چاوەچاوە (چاوەنواڕ) چاوەڕوانی ئەو بوون.

بەرەو بەغدا: ئەویش (عەبدوڵڵا پاشا) گۆشەی جارێ (مەیلی) بەرەو مەمالیکەکانی بەغدای والی نشین بووە. ئەم تاکە لە (عن، ن، گل١، گل٦)دا شەشەمین و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپ نەکراوە.

دۆڵ و چیایە (ن، گل١): دشت و چیایە.

چاوە چاوی (ن): انتظاری.

چاوە چاوی (گل٦): چاوەنوارِی نسخە چاوەڕوانی.

قوربان (ن): چاوم.

لەم تاکەدا جیناس ئارایی و ناسکی لە بارەی زمانییەوە هەیە.

٧- حاکمی: تۆ حاکمیت، فەرمانڕەوایت، دەسەڵاتداری.

دادی بێکەسان: هاواری بێکەسان کە سەرۆکیان نەماوە و وەک (ئەحمەد پاشا)بێ تۆش فریایان ناکەوی

والی – والی تورکە لە مەمالیکەکانی بەغدا (والی شاد) = با والی بەکردەوانەت شادمان بێ.

ئەم تاکە لە (ع، ما، کش١)دا سێیەمینە و لە (ف، ر، نم١، کم، گ٢، س، گ٣)دا چوارەمینە و لە (عن، ن، گل٦)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

حاکمی (گ٣): حاکمێ – ئەمەش هەڵەیە.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (ر)دا بەم جۆرەیە: (داو دل بستینی ایستاکە والی شاد کەی).

بەڵام لە (کش١، نم١، ع، کم، گ٢، س، گ٣)دا بەم جۆرەیە: (تۆ دڵی خەڵقی دەبەی ئێستاکە وا حاشا دەکەی) هەرچەندە لە (ما، ن)دا لە جێگەی (واحاشا) نووسراوە (بۆ حاشا).

ئەم تاکە وەک دەردەکەوێ زۆر شێواوە وە چەند تاکێکی تری ئەم هەڵبەستەش کەم بڵاوبوونەتەوە بێگومان لە ترسانا بووە کە هەموو کەس نەیوێراوە بیاننووسێتەوە لەلایەکی تریشەوە هۆش و هەستێکی ڕامیاری (وعی سیاسی) کەمتر بووە، جگە لەوەی هەوادارانی بەرەیەکی وەک (عەبدوڵڵا پاشا)ش بوونەتە هۆی لەناودانی... هتد

ئەم چەشنە هەڵبەستانە.

٨- مەر: مەگەر.

فەرهاد: ئەو هونەرمەندە دڵدارە بەجۆشەی (شیرین)بوو کە لە خۆشەویستیی ئەودا، بەتەشوێ کێوی بێستوونی دەتاشی و دەکۆڵی و دەینەخشاند.

لێرەدا (کوردی) هەڕەشەیەکی نهێنیی جوانی لە (عەبدوڵڵاپاشا) کردووە. کە بەتووڕەیی خۆ تۆند کردنەوە لەگەڵ گەلی پێ ناکرێ، کە گەل لەبارییایە کێو کون بکا، نەک (عەبدوڵڵا پاشا).

ئیکە: ئیتر.

غەضەب: ڕقگرتن، قینگرتن، تووڕەیی.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، ن، گل١، گل٦)دا هەیە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپ نەکراوە.

ئیکه (ن): ئیدی.

پەیدا (ن): برپا.

٩- تا برینمان گەرمە (کینایە)یەکی کوردییە، مەبەست لەوەیە هەتا زووە و هەل لە دەست نەچووە، ئەم گەرماو گەرمیی برینداریيەمان چارە بکە.

دادت دەدەین: بەکەڵک دێین.

ناخودا: کەشتییەوان، مەبەستی بێگانەکانی وەک عەجەم و عوسمانی و مەمالیک و خراپکارانی ناوخۆیە و ئەم وشەیە جوانییەکی زمانی وێژەیی تێدایە لەگەڵ وشەی (خودا)دا کە خوای مەزنە.

حەیفە: موخابنە، ناشایستەیە.

ئەم تاکەش دیسان هەر لە (عن، ن، گل١، گل٦)دا هەیە و نۆیەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.

دادات دەدەین (ن): یاریت دەکەین، پشتیوانت دەبین.

ناخودا (ن، گل١): ناخودایی.

١٠- بەمەئیووسی: بەهیوابڕاوی، بەدڵشکاوی، بەنائومێدی، دیارە ئەو کۆبوونەوەیە بەپێکهاتن و رێککەوتن ئەنجامی نەگرتووە و کەڵکی نەبووە.

دەوڵەت زیاد = فەرمان ڕەوایییەکەت لە زیادی بێ - ئەمەش توانجێکە لە (عەبدوڵڵا پاشا)ی گرتووە کە گوایە دەوڵەتەکەی لە نازیادی دەبێ، هەروەها پێشبینییەکەشی هاتە دی، ئەوەبوو لەجێی پاشایەتییەکەی جارانی بابان عوسمانییەکان (عەبدوڵڵا پاشا)یان کردە قایمقام، پاشتر ئەویشیان پێ ڕەوا نەبینی و پیاوی تری خۆیان خستە جێ و بەجارێ چرای (بابان) کوژایەوە.

عەبد: بەندە (کوردی) خۆی ئەوی لەگەڵیدا بوو بەبەندەی (عەبدوڵڵا پاشا)ی داناوە و مەرجێ لە ڕێڕەویی ئەوان لانەدات، بەڵام بەم تاکەیدا دەردەکەوێ کە (پاشا) وای نەکردووە.

ئەم تاکە پێشبینییەکی وردی کارامەوانەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتییانە و لە (عەبدوڵڵا پاشا)ی گەیاندووە کە ئەوی بەدەورییەوەن وەک ئەم دەستەیەی لەگەڵی کۆبوونەوەیان کردووە کەڵکی ناگرن.

ئەم تاکە لە (ع، ف، ر، کش١، نم١، کم، گ٢، س، گ٣)دا پێنجەمینە و لە (ما)دا شەشەمینە و لە (عن، ن، گل١، گل٦)دا دەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

ئێمە وا ڕۆیین: (ر): من اوا رویم.

بەمەئیووسی (ر): بمأوایوسی.

دەوڵەت زیاد (ما)... زیاد - وشەی دەوڵەتەکەی ناخوێنرێنەوە...

دابزانین (ما): دابزانم.

عەبدی (ن، گل١ ،گل٦، ع، ر): عبد.

عەبدی (ما): عبدیکی.

ئێمە (ما) من.

١١- لۆمە = سەرزەنش.

شکایەت = گازاندە، شکوای حاڵ... سکاڵا.

حەق: ڕەوا.

بێجا: بێ جێ، قسەی خراپ و ناڕەوا و ناشرینی مەبەستە، دیارە (عەبدوڵڵا پاشا) قسەی بێ جێی کردووە لەو کۆبوونەوەیەدا.

ئەم تاکە لە (ع، ف، کش١، نم١، کم، گ٢، س، گ٣)دا شەشەمین و لە (ما، ر)دا حەوتەمین و لە (عن، ن، گل١، گل٦،)دا دەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەمووشیاندا دواتاکە.

دڵ ئەوا لۆمەم دەکاتو (ما): دل اوا دیت اکا لومم.

بڵێ (ع، ر، ف، نم١، کم، گ٢، س، گ٣) ئەمن.

ئەمن (ما): اوا.

گەر شکایەتم (ع): از شکایت کم.

گەر شکایاتم (ر، ن، کش١): گرشکایت کم.

گەر شکایاتم (ما): ارشکایت.

تۆ بۆ قسەی (ع، ف، نم١، کم، گ٢، س، گ٣): بوچ وا قصەء (= بۆچ واقسەی).

تۆ بۆ قسەی (ما): بوچی قصەء.

تۆبۆ قسەی (ر): تو بوچ حق.

هونەرمەندی:

ئەم هەڵبەستە لەسەر زاریدا دڵدارییەکی ڕووت و پڕوچڕە، بەڵام ئەگەر ڕوونکردنەوەی سەرچاوەکان نەبوونایە کە ئەم هەڵبەستە بۆ (عەبدوڵڵا پاشای بابان) گوتراوە، لە کۆبوونەوەکەدا هەر بەهەڵبەستێکی دڵداری و گازاندەکردن لە دڵخواز دەزانرا، کە ئەمەش هونەرمەندیانەی (کوردی)یە.

١١٢

## چ شایانم؟

١- چ شـــایـانم؟ کــە (شـــا)م هـاتووەتـە دیدار بۆ (نـچــەتا)یێ
کـە (شـام) ڕۆژی درەخـشـانـەو، چ شـوکـریم بۆ بـەدی نایێ
٢- وەکو، (بار)ی من سووک کرد، لە حیـفظی (باری)یا بێ ئەو
بە(مەحبووبی)و بە (مەحموودی)، لە هەر کات و لە هەر لایێ

................................................................

١- (تۆفیق بەگی فەتاح بەگی صاحێبقران) شاعیر، برای ئەحمەد (حەمدی) بەگی صاحێبقران لە هاوینی ١٩٤١ز. دا، لە سولەیمانی بۆی گێڕامەوە کە:
(کوردی) لە (سلەیمانی) نەخۆش دەبێ و یەکێ لەوانە بەبۆنەی نەخۆشییەکەیەوە (مەحموود پاشـای بابـان) سـەری لە(کـوردی) داوەو هەر لەو سـەردانەدا (کـوردی) بەم چوار باڵییـەی سەرەوە سپاسگوزاریی پاشای کردووە، ئەمەش تەنیا سەرچاوەمە کە سپاسی گیانی (تۆفیق بەگ) دەکەم، (خوا لێی خۆش بێ)
(شایانم) ئەم وشەیە بەدوو واتا بۆ ئەم شوێنە دەگونجێ:
واتای یەکەم = ئای چەند شایستەم و ڕێز لێگیراوم.
واتای دووەم =(کـوردی) لە شـادمـانیـدا بەو سـەردانە گـوتوویەتی: (ئایا من وەک (شـایان= پادشایان) وەهام کە ئەم دیدەنییە کراوم؟).
(شام)ی یەکەم لە نیو باڵی یەکەمدا بەواتا: کەوا من پادشاهم هاتووەتە لا، بەبۆنەی (نچەتا)= سووکە (تا) لێهاتنێکەوە.
(شام)ی دووەم لە نیـو باڵی دووەمدا بەواتا (ئێـوارە، شـەو) کە کاتی دیدەنییـەکە بووە کە ئەو کاتە شـەوەی بەلاوە وەک ڕۆژی (ڕووناک = درەخشان = تیـشکدەر) وەها بووە و جیـهانی لێ ڕووناک کردووەتەوە و باری لەشی سووک کردووە.
شـوکور = سـپاسگوزاری = و مـەبەسـتی لەوە بووە ئەو چوونـەی (مـەحمـوود پاشـا)ی ئەوەندە بەلاوە مەزن بووە کە جگە لەوەی (شەوی تاریکی= نەخۆشییەکەی) کە ئەو تاریکی، واتە ئازاری نەخۆشییـەی گۆڕیوە بەڕووناکاییی باری لەشی سـووک بوون. وە لەبەر ئەو گوتوویە: (بۆیە من هەرچی دەکەم ناتوانم سپاسگوزاریی پڕ بەپڕ پێشکەش بەپاشا بکەم و بۆم ناهێنرێتە دی= بۆم بەدی نایێ.
(بار) ئەم وشەی بارە دوو جار لەم سێیەمین نیو باڵییەدا هاتووە.
جاری یەکەم- مەبەست لە (بار)ی گرانی نەخۆشییەکەی بووە کە بەو دیدارە ئەو(بار)ی گرانە

سووک بووە.
جاری دووەم- بەشێوەی (باری= بارینی= خوای مەزن) هاتووە کە لەم جارەیاندا (مەحموود پاشا)ی سپاردووە بەخوای گەورە کە لە پارێزگار= مەحفووظ (حیفظ)ی خوا= (باری=بارئ)دا بێت.
(وەکو) لە نیو باڵی سێیەمدا مەبەست لەوەیە کە: وەک چۆن پاشا بەو دیدەنییە باری گرانی جەستەی ئەمی سووک کردووە ئاوەهایش هەم لەپەنای خواو هەم ئەو پارێزراوییەی بەوە بێت کە (مەحبووب)ی واتە خۆشویستراوی و هەم بە(مەحموود)ی بێت کە بەواتە سپاسکراوی و لەهەمان کاتدا (وشە)یا(ناو)ی (مەحموود) ناوی خودی (مەحموود پاشای بابان) بووە کە دۆستایەتییەکی زۆر لە نێوان (کوردی) و ئەم پادشایەدا هەبووە و ئەم خۆشەویستییە لە هەڵبەستی تری کوردیدا هاتووە.
(کوردی) ئەو خواستی و (مەحبووبی) و (مەحموود)یەی لە (خوا= باری) بۆ پاشا کردووە کە لە هەموو (کات)ێکدا و لە هەر شوێنێ: بێ، واتە بەدرێژاییی ژیان خۆشەویستی هەمووان و لە چاکە کارێتیدا سپاسکراوی هەمووان بێت.
هەڵسەنگاندن - (کوردی) ئەم چوار باڵییەی لە کاتێکی نەخۆشی و لەشی بەباریدا داناوە، هەرچەندە بە (نچەتا)یەکیشی ناو بردووە، بەڵام بەپێی نیو باڵی دووەم و سێیەم نەخۆشییەکە (باری لەشی) سووک بووە و دەری بڕیوە کە بەو سەرلێدانەی (پاشا) ئەو بارە گرانەی لەشی (کوردی)ی لابردووە.
جا بەو دەردەدارییەی لەشی توانایی دانانی ئەو چوار باڵییە پڕ وردەکارییەی هەبووە کە لێهاتوویی (کوردی) دەگەیەنێت لە شاعیرێتیدا.
هەروەها بەو بارە ناهەموارەیشییەوە چەندین وردەکاری و یاری بەوشەکردنی و جوانکاری و جیناس ئارایی لەیەک (چوارینە)دا دەربڕیوە وەک (شام)و(شام)و(تاریکیی شام)و ڕووناکی ڕۆژی (درەخشان) و (باری) و (باری= بارئ) و (مەحبووب) و (مەحموود)، جگە لەوەی (کات و شوێن)= (زەمان و مەکان)یشی خستووەتە پاڵ ئەو کارامەییانەی خۆی.
ئەوی لەلام ئاشکرا نەبوو لەم هەڵبەستەدا ئەوەیە کە ئایا ئەم نەخۆشییەی (کوردی)و(سەردانەی پاشا) لەکاتی کام فەرمانڕەواییەکانی ئەو پاشایەدا بووە. چونکە ئەو پاشایە چەندین جار فەرمانڕەوایی بابانی کردووە.

## ١١٣

## ساقی وەرە

١- ساقی وەرە، بۆ خاتری دینێ لەسەری هەی
هەر جورعە (لەبالەب) کە، لە بۆم بێنە پەیا پەی
٢- خاتر تەڕ و، ساغیر پڕو، مەعشووقە بەرابەر
ئەم دەردی سەری و میحنەت و غەمخوارییە، تاکەی؟
٣- ئەسپاب موهەییایە هەموو مەستن و مەشغوول
سا فرسەتە دەربارم، ئەگەر مەرحەمەتێ کەی
٤- لەم بەزمە، کە (ماتن) لە صەدای (ڕوود) و (سروود)ی
صەد (خوسرە) و صەد (هورمز)ە، شاهەنشەهەکەی (کەی)
٥- سەرگەشتە، لە دەنگی: (دەف) و (چەنگ) ناڵەیی (تەنبوور)؛
(ئەسکەندەر) و (دارا) و (جەم) و (حاتەمەکەی طەی):
٦- بنوارە کەوا: (موشتەری) و (زوهرە) و (بورج)یش
مەشغوولی (سەماع)ن لە صەدای (زیل) و (بەم)ی (نەی)
٧- (هیجری) کە هەتا (حەشر) دەناڵێنێ لە (حەسرەت)؛
ئاشووبی (زەمەن)، فیتنەیی (ئافاق)، خودا وەی.

---

١- ساقی: مەیدەر، بادەدەر، کە تێی دەکات و دەیگێڕێ بە مەی نۆشاندا.

دین: ئاین.

جورعە: وشەیەکی عەرەبییە، بەواتە (قوم) یا (مژ) یا قومێک لە خواردنەوەی هەر شلەیەک، مەبەست لە پیاڵە، یا پەرداخ یا کاسەیەکی جارانە لە (بادە = مەی) کە ئێستا (پێک)ی پێ دەڵێن.

لەبالەب: لێوانلێو، سەرلێوان، پڕ، سەرڕێژ، تەژی.

پەیاپەی: پەی دەرپەی، یەک بەدوای یەکدا، لێگا لێگا، خێرا خێرا.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە:

لە (مس، عن، ن، گل ٩، م، ر، ما، ما١، کش٢، بابان، فح، جم، نن نسخە، نم١، نم نسخە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٦١)ی ڕۆژی ١٩٧٩/٢/١٢)یە کە مامۆستا محەمەد عەلی

قــەرەداغی لەژێر نـاوی (دوو پارچە شـیـعـری بڵاو نەکـراوەی مـسـتـەفـا بەگی – کـوردی)دا پێشـەکـییـەکی نایاب و دوو پارچە هەڵبـەسـتی تا ئەو کـاتە بڵاو نەکراوەی (کـوردی)ی بەچاپ گەیاندووە، یەکێ لەو دوو پارچە هەڵبەسـتە بریتـییـە لە پێنج تاکی ئەم هـەڵبـەسـتـەی سـەرەوە، بەبێ ئەوەی نیـشـانـەی بۆ سـەرچاوەکەی کـردبێ، بەڵام من لام وایە کـە لە (ما)وە، وەری گرتبێ؛ چونکە بەتەواوی لە ناوەڕۆکی ئەم هەڵبەستە دەچێ لە (ما)دا.

من لـە نێـوان ئـەو سـەرچاوانـەدا کـە ناونووسم کـردن سـەرچاوەی (مس)یانم کـردە بنکەی لێکۆڵینـەوەی ئـەم پارچە هـەڵبـەسـتـە و کـەڵکی زۆریشم لـەوانی تریـان وەرگـرتووە. چونکە کـەشکۆڵی (مس) بەشـتـێکی زۆری خـودی شـاعـیـر (صـەیدی هـەورامی) بەدەسنووسی خـۆی نووسـیوینەوە و هـاوەڵێکی خۆشـەویستـی (کوردی) بووە و، لە پارچە هەڵبـەستێکی (کـوردی)دا کە نـامـەیەکی بۆ (صـەیدی)ی نووسـیـوە و لەگەڵ وەڵامـەکەی (صـەیدی) دا دوای چەند پارچە هەڵبـەسـتێک لەم پەڕاوییـەدا واتە لە کۆتاییی ئەم هەڵبـەسـتـانەی (کوردی)دا کە بەپیـتی (ی) کۆتاییـیـان دێت ئەو نامـە و وەڵامـەی (کـوردی) و (صـەیدی)یە بەپوختـە و لێکۆڵراوەیی وردەوە پێشکێش دەکەم.

بەڵام جـێگەی داخـە کـە ئەم هـەڵبـەسـتـە بـاڵایەی سـەرەوەی (کـوردی) وەک لە تاکـەکـانـیـدا دەردەکـەوێ دەنگ لە بۆنەیەکی تایبەتی کۆمـەڵایەتی دەدات و، کەچی نەهەڵبەستەکە خـۆی و نە ئەو (١٦) سەرچاوەیەی هەڵبەستەکە (بۆنە)کەیان بۆ ڕوون نەکردووینەتەوە.

ئەوی پێویستـە نەکرێ بەژێر لێوەوە بۆ مێژوو وێژەمـان دیاری بکرێ، ئەوەیە کە ئەم هەڵبەسـتە لە سـەرچاوەکـانی (نن، نم١، ر)دا ئەم بەنـاوی (صـابری)یەوە نووسـراوە و لە (نن نسـخـە، نم نسخە، فح)دا بە هی (فیکری) دانراوە وە لەوانی تریاندا بەناوی (کوردی)یەوەیە. لە ڕاستیشدا ئەم هەرسێ هونـەر (کوردی)، (صـابری) و (فـیکری)یـە لەسـەر هـەمـان کێش و پاشـبـەندی ئەم پارچە هەڵبـەسـتـەن کە بەهۆی چاکترین و باوەڕپێکراوترینی سـەرچاوەکان کە (مس، عن، ن، گل٩، م)ن. من ئەو ئاڵۆزییـەی کە گوایە ئەم هـەڵبـەسـتە هی ئەم، یـا هی ئەو هۆنەرانە، ئەوەم بۆ یەکـلایـی کـرایەوە کـە ئەمی لێـرەدا دەینووسم هـی خـودی (کـوردی)یە و بەتـایبـەتی ئەو پێنج سەرچاوەیەی دواییان سوورن لەسەر ئەوەی کە:

أ– ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیان بەناوی خودی (کوردی)یەوە نووسیوە.

ب– هـەڵبـەسـتـێکی تریان بەناوی (فـیکری)یەوە لـە ژێر ناوی: (فـیکری – ردیف کـردی) واتە هەڵبـەسـتـی (فیکری) لە هاوچەشنی هەڵبـەسـتی (مسـتەفا بەگی کـوردی)دا کە بەهەمـان کێش و پاشبەندەکەی هەڵبەستەکەی (کوردی) دای ناوە.

ج– بەشـە سـەرچاوەکانی تریشیان لەژێر سەرەناوی (صابری – در تضمین کردی)دا بەهەمان کێش و پاشبەندی هـەڵبەسـتـەکەی (کوردی) بەناوی (صابیری)وە هـەڵبەستێکیان نووسیوە کە سـەرەتای ئەو هـەڵبـەسـتـەی (صـابیـری) هـەمان تاکی یەکـەمی ئەم هەڵبـەسـتـەی (کوردی) کـە لە سـەرەوە جـێگیـرم کـرد و هێـشـتـا لـە پەیکاری سـاغکردنەوەی ئەم تاکی یەکـەمی

هەڵبەستەی (کوردی)یە دام، لەبەرئەوە هەڵبەستەکەی (صابیری) بە(تضمین) ناوبراوە کە تاکی یەکەمە هەڵبەستەکەی (کوردی)ی ئاوێتە کراوە لە یەکەم تاکیدا.

ئەو هەڵبەستەی (صابیری) بریتییە لە (٧) تاکە هەڵبەست کە شەشیان هی خودی صابیری و تاکی یەکەمی، یەکەم تاکەکەی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)یە. کە لە دەستووری وێژەی کۆندا ئەم چەشنە هەڵبەستە بە(تضمین) ناوبراوە و، (ترجیع)یشی پێ دەوترێ، واتە تێ هەڵکێشی پارچە هەڵبەستی یەکێک لە هی یەکێکی تردا، کە ئەمەش لە ناو هۆنەراندا باو بووە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

ئەم کارە لە کاتێکدا کراوە کە تاکە هەڵبەستی شاعیرێک زۆر پەسند و جوان و، وێژەییانە بووبێ ئەو تاکە هەڵبژێردراوە هەڵبەستی (تضمین) یا (ترجیع)ی لێ دروست کراوە. بەئاوێتەکردنی ئەو تاکە هەڵبەستە جوانە.

لە ڕێگەی یەکلایی کردنەوەی ئەو ئاڵۆزییەی ئاوێتە بوونی تاکەکان هەڵبەستی هەرسێ شاعیر و، چونکی دوو هەڵبەستەکەی (صابیری) و (فیکری) هێشتا چاپ نەکراون، بۆیە بەپێویستم زانی کە بۆ ئاسانکاری ئەوانەی خەریکی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستی ئەم جووتە شاعیرە دەبن لە دوای ئەم هەڵبەستەی (کوردی)یەوە هەردوو هەڵبەستەکەی ئەو جووتە شاعیرەش پیشکێش دەکەم. ئەمیش جیاوازییەکانی دەقی ناو سەرچاوەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی)یە:

دێنی لەسەری هەی (ر، ما، نن، نم١، حم، هاوکاری): ئەو دینە لەسەری هەی.

لەبالەب کە لەبۆم: (نن، نم١) لباولەب کەو بوم.

تێبینی: لە وێژەی کۆندا بەم جۆرە هەڵبەستەی کە لەم بابەتە بێت وەک: لە سەرەتایەکەیەوە شاعیر ڕووی دەم بکاتە ساقی، پێی دەوترێ (ساقی نامە). بۆیە لە زۆربەی سەرچاوەکان ئەم هەرسێ هەڵبەستەی (کوردی) و (فیکری) و (صابیری)، لەژێر سەرە ناوی (ساقی نامە)دا نووسراون.

٢- خاتر: بەواتە: سروشت، دڵ، دەروون، مەبەستی لە (زەوق)ە وەک: لەبەر خاتری یا خاترت خۆش بێ.

ساغیر: (پیاڵە، پەرداخ، کاسە)ی مەی پێ خواردنەوە.

مەعشووقە: ئافرەت یا کچی خۆشەویست (دڵخواز).

میحنەت: ناخۆشی، ئەرک، شەکەتبوون بەخەمەوە.

ئەم تاکە لە (مح، نن نسخە، نم١نسخە، کش١، بابان)دا نییە و لەوانی تردا دووەمین تاکە.

خاتر تەڕو ساغیر پڕ (عن، حم): ساغیر پرو خاطر تەر.

لەم دەردی سەری و: (ما) لم بختەبد و

لەم دەردی سەری و (نن نسخە، نم١) لم بختی بدو

ئەم نیو باڵی دووەمە ئاوێتەی هەڵبەستەکەی (فیکری) بووە.

میحنەت و غەمخوارییە تاکەی (نن نسخە، کش٢): طالع برگشتە خداوی.
لەم دوو سەرچاوەیەدا ئاوا شێواوە و ئاوێتەی دووەم تاکی (فیکری) بووە.
ئەم (نن، نم١): لەم.
لەوانەیە (فیکری) کە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی تێ هەڵکێشی هەڵبەستەکەی خۆی کردبێ، بەڵام لە دەستا و دەستی نووسینەوەیدا، هەڵە لە ئاوێتەییەکەدا ڕووی دابێ.
٣- ئەسپاب: هۆیەکان، پێویستی، هەلومەرجی ئەو بەزمەی مەبەستە، (ئەسپاب) بەبێ (ی)ی کۆتاییی ئەو (گۆران)یانەیە کە (ئەسپابی) نەنووسراوە.
موهەییا: ئامادە، بەرهەمهاتوو، پێکهاتوو.
مەستن: سەرخۆشن
مەشغوول: خەریک، ئەوانی لەو بەزمەدا خواردوویانەتەوە، هەر کەسێ مەست و کەیلی سەودایەکی خۆ بووە، بەئاواتی گەیشتنە کام.
فرسەت: هەل، دەرفەت.
دەربارم: من یەکێکم لە دەستوپێوەندە. کۆیلەم، ئەم وشەی (دەربارم) بەڕێنووسی کۆن نووسراوە (دربارم) بەواتە (بەرامبەرم)ە کە ئەم چەشنەش بۆ ئەم شوێنە دەگونجێ و واتایش دەدات، کە ئەمەش جوانێتییەکی وێژەییە و کارێکی کارامەییە.
مەرحەمەت: نەوازش، چاودێری، دڵسۆزی، بەزەیی پیا هاتنەوە، دڵ پێ سووتان.
موهەییایە (ر) موهەییان، کە ئەمیش ڕاستە.
موهەییایە (عن، ما، حم): مُهیّان و.
موهەییایە (نن، نم١): مُهیّا.
موهەییایە (هاوکاری): موهەییایە و
مەشغووڵ: (ر، ما، عن، نن، حم، نن، نم١، هاوکاری) سەرخۆش.
دەربارم (عم، حم، نن، هاوکاری) دەربارەم.
٤- بەزم: ئاهەنگ و خۆشیی ئەو کۆڕەی کە لەگەڵ (ساقی) و (مەعشووقە)دا بەبادەنۆشییەوە ڕایان بواردووە.
ماتن: ئەم وشەیە بە سێ جۆرە (واتا) لێرەدا هاتووە کە:
١- ماتن: (مات)ن، بەواتە لە بەزمەکەدا وڕو سەرسامن، کە ئەمەیان وشەیەکی کوردییە، بەواتە ئەوانی بەشداریی بەزمەکە، ماتن = وڕن.
٢- ماتن: (مات)ن = ئەمیان وشەیەکی لێکدراوی عەرەبی (مات)ە، بەواتە (مرد) گیانی دەرچوو، کە ئامێری پاشگری (ن)ی کوردی پێوە لکاوە، بەواتە ئەوان و کەواتە (ماتن = مردوون) لەو خۆشییەدا وەک چۆن لە کاتی خۆشیی زۆردا کەسێک فرمێسک دەڕێژێ کە فرمێسک لە کاتی ناخۆشیدا سەر دەکات و بەڵام (ئەوی تریان فرمێسکی خۆشییە).
٣- ماتن: واتە ئەوان مردن، ئەم جۆرەشیان کە مەبەستی ڕاستی ناو تاکە هەڵبەستەکەیە و لە

ژێر دوو جۆر (ماتن)ەکەی (یەکەم و دووەم)دا شاردراوەتەوە کە ئەمەش وردەکاری وێژەیی و وەستاکارانەی (کوردی)یە کە نیشانەیە بۆ وشەی (مات) بەکارهێنان لە کاتی کردنی یاریی (شەترنج)دا کە وەک لە شوێنی تری ئەم پەڕاوییەدا لە زانایی (کوردی) دواوم لە (یاری شەترنج)دا کە (کوردی) یەکێک بووە لە یاریزانە بەناوبانگەکانی (شەترنج) لە سەرێنیی خۆیدا.

ئەم دەربڕینی وشەی (مات)ە لەو یارییەدا لە کاتێکا نەبێ کە ئامێری (شا = پادشا = مەلیک)ی یەکێ لەو دوو یاریکەرە بخرێتە مەترسیی (خواردن)ەوە لە لایەن یاریکەرەکەی ترەوە کە وشەی (مات) یان (شا مات) بەکاردێنێ و دەڵێ (کش، شا مات) و یارییەکە دەدۆڕێنێ.

لێرەدا (کوردی) ئەو بەزمی کۆڕی مەی خواردنەوەیەی ئەوەندە بەخۆش ڕەچاوکردووە کە (شا) و (شاهەنشا)یان بەخێلی بەو بەزم و خۆشییەی دەبەن و لە داخا دەمرن وەک لە یاریی (شەترنج)ەکەدا (شا) دەمرێنرێت کە لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەدا نیشانەی بۆ هەندێ لەو (پاشا)یانە کردووە.

صەدا: (دەنگی ساز و ئاواز)ی خۆشی (ڕوود) و (سروود)ەکەی ئەو بەزمەی مەبەستە لە دەنگدانەوەی ساز و ئاوازی خۆشی گۆرانی وتنی ناو ئەو کۆڕە.

ڕوود: ناوی ساز (دەنگ)ێکی تایبەتیی مۆسیقییە، لەگەڵ ناوی ئاواز (نەغمە)یەکی (گۆرانی)دا. ئەمجا وشەی (ڕوود) لە هەمان کاتدا واتای (ڕووبار)یش دەدات بەواتای وشەی (ڕوود) وە ناوی ڕووباری ڕەوان و لە ڕەودایە وەک لە مۆسیقە و گۆرانیدا ڕەوان و بێ گرێیە.

جگە لەمانە وشەی ڕوود بەواتا (مەل)ە کە ئەمەش لە خۆشخوێنی و ساز و ئاوازی خوێندنی هەندێ مەلی وەک بولبولەوەیە کە (ڕوود)ەکە هەم ناوی (مەل)ەکە و هەم ناوی ساز و ئاواز و مۆسیقییەکەیەتی کە ئەمانە هەموو بەڵگەی گرنگ و زانیاری و فەرهەنگیی ئەوەن کە ئەم وشەیە (کوردی)یە.

سروود: ناوی هەموو جۆرەکانی گۆرانییە، بەواتە (گۆرانی)یشە یا (ستران).

سروود لە هەمان کاتیشدا ناوە بۆ گۆرانی و سۆزکردنی ئاینی لە زمانی کوردیدا لەوانەیە (کوردی) مەبەستی لەو بەزمی بادەنۆشییە بەزمی بادەنۆشی (مەعنەوی) بووبێ کە بادە (قورئانی پیرۆز) و (ساقی) پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)یە و (مەعشووق) ئەو پەڕتەوە (جەلا)ی خواییە کە مەستان و بادەنۆشانی (حەقیقەت) خوایی بەئاواتی گەیشتنی بەو (مەعشووق) یا (پەڕتەو)ەوەن.

صەد: ئەم ژمارەیە لە ژماردندا دەکەوێتە نێوان دوو ژمارەی (نەوەد و نۆ) و (صەد و یەک)ەوە کە لە زانستی بیرکاریدا بەشێوەی (١٠٠) دەنووسرێت و لە زمانی (کوردی)دا بەشێوەی (سەد)یش دەربڕدراوە و دەردەبڕدرێت و بەشێوەی (صەد)یش هاتووە.

جوانکارییەکی وێژەیی کۆن کە لێرەدا شاعیرمان (کوردی) بەکاری هێناو، ئەوەیە لە نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا وشەی (صەدا) و لێرەشدا وشەی (صەد)ی گرد کردووەتەوە کە

لە دەستووری وێژەی کۆندا پەسندە، بەوردەکاری و بەوەستایی شاعیر دادەنرێ.

لەم نیــو باڵی دووەمـــەدا ژمـــارەی (ســـەد = صـــەد) بۆ ژمـــارەی ئەو ســـەدان پادشـــا و شاهەنشاهانەیە کە هەر لەم نیو باڵییەدا (کوردی) ناوی بردوون.

بەبۆچوونی من ئەم بەکـارهێنانی (صــەد)ە بۆ هەریەکێ لە (خــوسـرەو) و، لە (هورمــز) و لە (شـاهەنشـایانی کەیانی) چ کامـێکیـان یەکی صـەد (خوسـرەو) یا صـەد (هورمز) یا صـەد (شـاهنشـاهەکـەی) نەبوون کـە ئەمـەش ئەوەیە کـە دەربڕینـەکە پڕ بەپڕ نیـیـە و تۆکـمـە نیـیـە هەرچەند (کوردی) مەبەستی لەوە بووە لە (سەدان) پادشـا و شاهنشـایانی وەک (خوسرەو) و (هورمـز) و.... کێ و کـێ...... واتە صـەدی وەک ئەوان کـە لە ڕووی مـەبەسـتـەوە دەربڕینەکـە ڕاستە.

ئەم تاکە هەڵبەسـتـە لە (فح، نن نسـخـە، نم نسـخـە)دا نییـە و لەوانی تردا چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

ئەمیش جیاوازیی دەقی نێوان سەرچاوەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەیە:

بەزمـــە: (ر، مـا، مـا١): نـزمـە کـە مـــەبەست لە نەزمـە ئـەمـیش هـەر واتای (بەزمــە) ئەدات بەڕێکوپێکی (نظم).

ماتن = (ر، ما، ما/١): ماتی.

ماتن: (نن، نم١): ماتم.

لە صەدای: (ر، ما، م١، هاوکاری) بەصەدای

ڕوود و: (عن، گل/٩، ما/١): ڕوودی

ڕوودو: (جم، ما، ر، عن) سازو.

سروودی: (ر) سرودنەی.

هورمزو: (عن، حم، ما/١) هرمز. ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

شاهنشاهەکەی کەی: (نن) شاهنشهی کی کی.

کەی کەی: لە (نم١)دا کەی کەی نووسراوە.

٥- سەرگەشـتە: سـەرسام، سەراسیمە، واق وڕماو، مەدهۆش، واتە ئەو پادشـا ناوبڕاوانە سـەرسام بوون.

دەف: ئامـێرێکی مـۆسـیـقـیـی کوردانەی کۆنە کە بەپێدامـاڵین و لەراندنـەوە دەنگ دەدات بەپێی پێداماڵین و لەراندنەوەکە ساز و ئاوازەکەی دەگۆڕدرێت.

ئەسکەندەر: ئەسکەندەری گەورەی مەکدۆنی.

حاتەمی طەی: ناوی کابرایەکی خێڵی (طەی)ی عەرەبە.

ئەم تاکە هەڵبەسـتـەی سـەرەوە لە (فح، نن نسـخـە، نم/١ نسـخـە، کش٢)دا نییـە وە لەوانی تردا پێنجەمین و لە (ما، هاوکاری)دا، دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

ئەمیش جیاوازییەکانی دەقی سەرچاوەکانە:

سەرگەشتە: (مس، عن، ن، کل/٩، ما/١، حم): سرکشتە، کە ئەمەش ڕێنووسی کۆنە و زۆر جار پیتی (گ) وەک (ک) دەنووسرا.

لە دەنگی: (عن، ر، ما، هاوکاری، حم): لبردەنگی، ئەمەش لەنگە.

دەف و چەنگ: (عن نسخە، ر، ما، حم، هاوکاری): دەف و

ناڵەیی: (عن، ر، ما، ما/١) نالەء. ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

تەنبوور: (ما، هاوکاری): تەمبوور.

تەنبوور: (عن، حم، ما/١): شمشاد (واتە قامیش)ە

تەنبوور: (نن، نم/١، ر): طەنبوور.

ئەسکەندەرو: (ر) اسکندر، ڕێنووسی کۆنە.

داراو: (ر) داراد. هەڵەی دەستییە.

داراو: (نن، نم/١، ما/١، ن، مس، گل٩، جم، عن) دارا کە.

جەم: (ر، عن، ما، ما١، ن، مس، گل٩، حم) لەکل (لەگل = لەگەڵ)

حاتەمەکەی: (عم، حم) حاطەمەکی، هەڵەی ڕێنووسی کۆنە.

طەی: (ر): کی ئەمەیش هەڵەیە.

٦- موشتەری: یەکێکە لە هەسارەگەلی کۆمەڵەی خۆری (المجموعة الشمسية) لە شوێنانی تری ئەم پەڕاوییەدا لێی دواوم.

زوهرە: دیسان وەک موشتەری، لێی دواوم.

بورج: ئەم وشەیە چەندین واتای جیا جیا دەدات لەوانە:

بورج: کۆنگرەی قەڵا

بورج: ناوی نێوان هەر نەغمەیەکی هەر حەوت نەغمە بنکەیییەکەی مۆسیقییە.

بورج: ناوی شوێنی گیرسانەوەی هەر یەکێ لە حەوت نەغمە بنکەیییەکەیە.

بورج: ناوی شوێنی ئەستێرەیە بەپێی هەر ڕۆژێک و ڕۆژێکی تر دەگۆڕدرێت و، ساڵێکی تر لە دوای ئەو یەکەم ڕۆژەوە ئەو ئەستێرەیە دەگەڕێتەوە شوێنی ئەمڕۆی کە ساڵێک لەمەوبەر شوێنی بووە، ئەمجا ئەم ڕێڕەوی ئەستێرەیە لە ڕۆژەکانی هەر ساڵێکدا کراوە بە(١٢) بەشەوە.

بورج: ناوی هەر یەکێ لەو (١٢) بەشە ناوبراوەیە واتە هەر بەشێکی دەوترێ (بورج).

بورج: کە ناوی هەریەکی لە (١٢) بەشەکەی شوێن گۆڕکێی ئەستێرەیەکە، کە هەر (سێ) دانە لەو بورجانە بەریەکێ لە وەرزەکانی ساڵەوەختەکە دەکەوێ کە ئەو ماوەی (سێ) بورجە لە بابەتی گەردوونناسی و ساڵنامەگەریدا (وەرز)ی پێ دەوترێ وەک (بەهار، هاوین، پایز، زستان).

بورج: سەرەتایەکەی لە ڕۆژی ٢١ی مانگی مارتەوە، واتە مانگی (نەورۆز)ەوە دەست پێ دەکات و لە ڕۆژی پێش نەورۆزی هەر ساڵێکدا کۆتاییی دێت کە ئەو ڕۆژەش دوارۆژی وەرزی (زستان)ە کە لە بورجی (بەرخ)ەوە دەست پێ دەکات (برج الحمل)، چونکە هەریەکێ لەو

بورجـــانە ناوێکی تایبـــەتی هەیە، بڕوا بەگـــرنگی و کـــاریگەریی بورج هەیە لەســـەر ژیانی زیندەوەران.
بورج: لە بابەتی (مـۆسـیـقـا)دا یا لە ڕووی زمـانەوانیـیـەوە بەواتا (پەردە)یە و پەردەشی پێ گوتراوە و (پەردەی مۆسیقیشی) پێ دەڵێت.
ئەم هەمـوو ناوانە و ناوانی تری (بورج)یش کـەم یا زۆر بۆ ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـەی کـوردی دەگـونجـێن و ئەمـەش وریایی و ڕۆشنبـیـری و شـارەزاییی (کـوردی) دەگـەیەنێت کـە (گەردوونناس)یش بووە.
سـەمـاع: گوێبـیست، جـاران کە مـامۆسـتـایان لە مـزگەوتاندا وانـەیان بەقوتابییـە (فـەقێ و موستـەعیدە)کان دەگوتەوە، هەندێ قوتابیی تر هەبوون کە یا جارێ نەگەیشتبوونە ئەو وانەیە، وەیا لەو وانەیە تێپـەڕیان کردبوو، بەڵام بۆ بەهـێزبوونی بیرەوەری و بۆ بیرنـەچوونەوە لەو دیو (وانە خـوێن)ەکـانەوە بەچۆکـدا دەهاتن و گـوێیـان دەگـرت لە مـامـۆسـتـای وانەبێـژەکـە ئەو گوێگرتنە، ئەو کارە (سەماع)ی پێ گوتراوە واتە گوێ لێگرتن بوو.
(کوردی)مـان ئەو ئەسـتێرە و بـورجانـەی کردوونەتـە گوێگر، لە دەنگی خۆشی (زیل) و (بەم)ی (نەی) واتە شمشاڵ = (بلوێر) کە شمشاڵ بۆرییەکە لە (کانزا = معدن) دروست دەکرێ، بەڵام بلوێر هەمان کاری هەیە لە دار دروست دەکرێ و (لوولک)یش لە قامیش دروست دەکرێ.
زیل و بەم: دوو جۆرە زاراوەی (زارگوت = مصطلح)ی مۆسیقین بۆ ئاوازەکە لە شوێنانی تری ئەم پەڕاوییەدا بەدرێژی لێکم داونەتەوە.
نەی: نەی جۆرە ئامێرێکی مۆسـیقییە لەوانەی کە بەفووپیاکردن دەنگ دەدەن و بەجووڵاندنی مۆسیقییانەی پەنجەکان لەسـەر کونەکانی لاپەراسووی (نەی) واتە شمشـاڵەکە، ساز و ئاوازی جیا جیای مۆسیقی دەدەن.
ئەم تاکە هەڵبـەسـتـە لە (عن، ما، فح، حم، ن نسـخـە، نم/١، نم/١ نسـخـە، کش٢)دا نییـە و لە (مس، ن، گل/٩، م، مـا/١)دا شـەشـەمـینە و لـە (ر)دا هەشتـەمـینە و نیـوەی دووەمی ئاوێتـەی تاکی سێیەمی هەڵبەستەکەی (صابیری) بووە.
ئەمیش جیاوازییەکانی دەقی ناو سەرچاوەکانی ئەم تاکەیە:
بنواڕە: (ن، ما/١) بڕوانە
مەشغووڵی: (ر): مشغول ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.
(زیل) و (بەم)ی: (ر): ذیل و بمە.
(زیل) و (بەم)ی: (ن، نم/١): زیر و بەمی.
٧- هیجری: یەکێ لە دوو (نازناو)ەکەی (کوردی) بووە.
حـەشـر: ڕۆژی قـیـامـەت، ڕۆژی دوا پرسـینەوەی خـوای مـەزن لە خـەڵقی لە بارەی گـوتن و کردەوەی خەڵقییەوە لە ژیانی جیهانیدا، بەپێی ئاینی ئیسلام.
حەسرەت: خەفەت، داخ، غەم، ماتەم.

بەپێی دەستووری وێژەی کۆن ئەم یەکخستنی دوو وشەی (حەشر) و (حەسرەت)ە لە یەک تاکە هەڵبەست یا لە نیو باڵی یەکدا جوانی و، وەستاکارانە و وردەکاری (تایبەتی)ی هەیە و جیناس ئارایی و پەسەندییە.
ئاشووب: کێشە، تەگەرە، گیروگرفت، کووکە، ناخۆشی، خراپی، ئاڵۆزی، دژواری.
(کوردی) ئەوەتا کۆتایی هەڵبەستەکەی بەدادکردن لە دەست دوو شت هێناوە.
یەکەمیان: (زەمەن)ە واتا کاتەکان کە مەبەستی لە (فەلەک) یا کاتی تیا هەڵبەستنی ئەم پارچە شیعرەیە.
زەمەن: کاتەکان، سروشت ڕۆژگار کە مەبەست لە بڕیار لەسەر دراوێتیی هەر کاروبارێکە کە ڕووی داوە و ڕوو دەدات کە هەموویان لەلایەن خواوەن کە (قەراری) لەسەر داون کە ئەمەش فەلسەفەیەکی ئاینییە لە ئیسلامەتیدا و (کوردی) زۆر بڕوای پێی هەبووە و لە زۆر لە هەڵبەستەکانیدا ئەم بیر و بڕوایەی خۆی ڕاگەیاندووە کە خواست و بڕیاری خوای مەزن لەسەر هەر خواست و بڕیار و ئارەزوویەکەوەیە.
دووەمیان: کە (کوردی) دادی لە دەست کردووە (فیتنە)ی (ئافاق)ە، کە (فیتنە)ش دیسان ئاشووب و پشێوییە لە (جیهان)دا کە (کوردی) بەشێوەی (ئافاق) دەری بڕیوە کە یەکەمەکەیان لە توانایی و دەسەڵاتی خواوە و ئەم دووەمەیان لە (ناوخۆیی) و پەیوەندی بە(سەر زەمین)ەوە هەیە واتە (جیهان) کە مەبەستی لە ژینگە (بیئە)یە. وە خوای مەزن ژیریی بەخشیوە بەمرۆڤ کە خۆی لە خراپە بپارێزێ و چاکە بکات کە باری کۆمەڵایەتی و ناوچەکە و کەسان و هتد... دا کۆ دەبێتەوە. کە ئەم فەلسەفەیە ڕووداوەکان دەبەستێ بە(ئافاق: جیهان، ژینگە)وە، کە بە(فیتنە) ناوی بردووە، چونکە بەهۆی زاڵبوونی (عاطیفە) بەسەر ژیریدا، خەڵک ئاوقای خراپی و چورتم دێت.
ئافاق: ئاسۆگەکان، ئاسۆگەل، مەبەست لە هەرە دوورترین جغزێکە بەدەوری هەر کەسێکدا لە (سارا)دا، یا دوورترین چاو ئەندازێکە کە بەچاو هانا دەکرێ و، لەوە بەولاوە زەمین بەدی ناکرێ لەو (جغز)ەدا ئیتر گۆ (قوبە)ی ئاسمان بەو (جغز)ی زەوییە دەگات و بەسەریدا قڵپ بووەوە و لێرەدا مەبەست لە ناوچەیەکە کە (کوردی) لە سەرێنی خۆیدا بەپڕ لە (فیتنە) و ئاشووبی ڕەچاو کردووە لە (هزر)ی خۆیدا. کە ئەوەتا (خودا وەی)یی لە دەست کردووە، وەک لە زۆر لە هەڵبەستی تریشدا ئەم بیر و بڕوایەی خۆی ڕاگەیاندووە کە لەم پەڕاوییەدا بەوردی شیم کردوونەتەوە، کە زۆربەی باری ناهەمواری بابانە.
خودا وەی: ئەی خوایە وەی تۆبە، داد لە دەست ئەم هەموو ئاشووب و فیتنەی (زەمان: کات) و (مەکان: شوێن) کە (کوردی) ئەم هەردوو کات و شوێنەی لەم دوا تاکە هەڵبەستەیدا یەک خستوون کە لە بابەتی خۆیدا (کات) و (شوێن) دوو بابەتی دووروودرێژی فەلسەفی بەربڵاون کە چەندین پەڕاوی و نامیلکەیان لەسەر نووسراون.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ر، ما، فح، نن نسخە، ش، نم/١، نم/١ نسخە، کش٢، هاوکاری)دا نییە

لە (نن، حم)دا شـــەشـــەمین و لـە (مس، ن، گل/٩، م، مـــا/١)دا حـــەوتەمـین تاکی ئەم پـارچە هەڵبـەسـتـە و دوا تاکیـەتی و هێـشـتـا چاپیش نـەکـراوە. هەروەها نیـوەی دووەمـی ئەم تاکـە بەشێـواوی ئاوێتەی (مـا، نم١) کراوە و بووە بەنیـوەی دووەمی تاکی چوارەمینی هەڵبـەستـەکەی (صابیری) کە دواتر لە بابەتی هەڵبەستەکەی (صابیر)دا نیشانەی بۆ دەکەم.

ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکەیە لە سەرچاوەکانیدا:

دەناڵێنێ: (عن، حم): دنالیت.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (عن) و (حم)دا بەم جۆرەی دوایییە:

(لم دنک دفو نالهء سمطور کمانجی) واتە (لەم دەنگی دەف و ناڵەیی سەمتوور و کەمانجەی).

ئاسووبی: (س، ن، گل٩، ما١): آشوب، ڕێنووسی کۆنە.

زەمەن: (نن، نم١، ر): زمان، ئەمەش لەنگی دەدات.

ئافاق: (نم١، نن): آفاقه.

خودا وەی: (نم١، نن): خوا وەی.

لەم تاکە هەڵبـەستـەی کۆتـاییـیەدا بەتایبـەتی و لە هەمـوو هەڵبەسـتـەکەدا بەگشـتی، شێـواوی و ئاوێتەبوون لە نێوان هـەڵبەستەکانی هـەرسێ شـاعیر (کوردی و فیکری و صـابیری)دا ئاشکرایە لە سـەرچاوەکانیـاندا و من بەمـەندە سەرچاوەیـەی ئەم هـەرسێ هەڵبەسـتـە و بەوەندەی تواناییم بەســەریدا شکـابێ هـەر ئـەوەندەم بۆ کـرا کـە لێـرەدا هـەڵبـەسـتـی هـەر یەکـەیانم لێـرەدا بەم شـێوەیەی کە پێشکێشم کردوون دەست هەڵدەگرم، بـەڵام پێم وایە سـەرچاوەی (گرنگ)یتـر و باوەڕپێکراوی تری وەک دەسنووسـی خـودی شـاعـیـرەکـان یا نوسـخـەی ئەوتۆ کـە لـەبەر دەستنووسانی خـودی شاعیرانەوە نووسرابنـەوە یا لە دەمی خودی شـاعیرەکانەوە وەرگیـرابن ئـەوا ئـەم ڕێکخـسـتنـەی من تێک دەدات و ئەوەش پڕ بـەدڵ ئاواتی مـنە و کــاری بەجـێـتـر و ڕاسـتـترە، جـارێ پێشـەکی ئەمی دوایی هەڵبـەسـتـەکەی (صـابیری)یە کە پتر لەوی (فیکری) پەیوەندی و ئاوێتەبوونی نێوان (صابیری و کوردی) تیایە بەپێی ساغکردنەوەکەی من.

**(هەڵبەستەکەی صابیری)**

١- ســــــاقـی وەرە بـۆ خـــــاتـری دینـێ لـەســـــــەری هـەی
یـەک جــــورعـــــە لـەبـالـەب کـــــە لە بۆم بێنە پـەیاپـەی.

٢- سـاقـی بەخــودا حــەیفـە، عــەبـەث ئێـــمــە لە لای خـۆت،
لەب تـوشنـە و و ســەرگــەشـتــە و مــەئیــووس لە دەرکــەی.

٣- حــــەیرانـن و دڵدادە، فـــرەیدوون شـــــەهـ و فـــەرهـاد،
لەم شـۆری جگەر سـۆزەیی سـەمـتـوور و کـەمـانـجـەی.

٤- بەهرامە لە تاو (حەسرەت) و (کیسرا) بە(کەسەر) چوون.
بـۆ بەزمـی وەهـا ســـاز و، بـەنـاز، ســـوور و چـەقـــانـەی.

٥- بۆ دولبـــەری و عـــیـــشـــوەگـــەری ســـەیر بکە ئەمـــڕۆ،
مـــەحـــبـــووبـەیی ئەحـــبـــابن و مـــەطبـــووعی طیـــبـــاعـــەی.
٦- خـــۆ خـــاصـــە، لە هەر جـــۆرە نیـــشـــانێکە لە جـــوانی،
مـــۆســـیـــقـــە و، گـــۆرانی و، ســـووڕدانی و، لەنجـــەی.
٧- لەو (بادە) ئەگـەر بێـتـو کـەرەم کـەی کـە بـە(صـابیـر)،
بێ هۆشی و خـەمۆش بەسیـە لـە غـەم، عوقبـە و دونیـەی.

................................................................

١- ئەمەش یەکەمین تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی)یە و جوانی و دڵگیری (صابیری) کردوویەتە تاجی سەری هەڵبەستەکەی خۆی واتە یەکەم تاکی هەڵبەستەکەی خۆی.
٢- ئەم تاکە لە (ما، عن، فح، حم، نن نسخە، نم نسخە، کش/٢، هاوکاری)دا نییە و لە (مس، ن، گل٩، م، ما١)دا دووەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە بەسەربەخۆیی بەناوی (صابر)ەوەیە.
لێرەدا بەهەلی دەزانم ئەوە ڕوون کەمەوە کە نازناوی ڕاستیی ئەم هۆنەرە (صـابیـر) و شاعیری بە(صابیر)ی واتە ئەی (صابیر) لە هەڵبەستیدا نازناوەکەی خۆی گەیاندووە. هەر ئەم تاکە هەڵبەستی دووەمەی (صابیر) یا (صابیری) لە (نن، نم/١)دا دەیەمین و، لە (ر)دا یانزەمین تاکی پارچە هەڵبەستێکە بەناوی (صابیر)ەوە بەمەرجێ تاکەکانی پێشەوەی (کوردی)یان بەشێواوی تێکەڵ کردوون کە لە شوێنی هەر تاکێکیاندا نیشانەی پێویستم بەپێی سەرچاوە بۆ کردوون.
بەخودا: (نن، نم/١): بەخوا، کراوەتە سولەیمانییانە .
لە دەرکەی: (نم/١)دا: لە دەرگەی، ئەمیش ڕاست نییە.
٣- ئەم تاکە لە (عن، ما، ما/١، فح، ن نسخە، نم نسخە، کش، هاوکاری)دا نییە، و، لە (مس، ن، گل/٩، م، ما)دا سێیەمینە و بەسەربەخۆیی واتە یەکسەر بەناوی (صابیر)ەوەیە. بەڵام لە (ر، نن، نم١)دا حەوتەمین تاکە و بەوەکانی (کوردی)شەوە بەهەڵە بەناوی (صابیر)ەوە نووســراوە کـە من ســاغم کـردووەتەوە لە هەڵبـەســتـەکـەی کـوردیدا هەرچەندە ئەوی شارەزاییـیەکی هەڵبەستی هەردوو شاعیر (کوردی و صابیر) بێت، جیایان دەکاتەوە بەمۆرکیاندا کە هەریەکەیان مۆرک و چێژی تایبەت بەخۆی هەیە و منیش وەنەبێ ئەم هەڵبەستەی (صابیر) یا (صابیری)یە، یەکەم هەڵبەستی ئەو بێ کە بەرچاوم کەوتبێ، بەشکو هەڵبەستی ئەمم زۆر لایە و شارەزای هەم، بۆیە بەئاسانی هەڵبەستی (کوردی) و (صابیر) دەناسمەوە، بەتایبەتی لە هێز و باڵاییدا ئەوانی (صابر) ناگەنە هەڵبەستەکانی (کوردی).
فرەیدوون شەه و (ر): فریدونیش و.
لە (نن، نم١)دا نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە بەم جۆرەیە:
(مشغولی سماعن لە صدای زیر و بەم و نەی)

که ئەمەش ئاوێتەی نیو باڵی تاکی شەشەی (کوردی)یە بەشێواوی.

٤- ئەم تاکە لە (عن، ما، فح، حم، نن نسخە، نم/١ نسخە، کش، هاوکاری)دا نییە و لە (ن، گل/٩، ما١)دا چوارەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە بەناوی (صابر)ەوە. بەسەربەخۆیی بەڵام (ر، نن، نم١)دا بەتێکەڵی لەگەڵ تاکەکانی (کوردیدا) بەناوی (صابر)ەوە بەشێواوی کە لە تاکە هەڵبەستەکانی (کوردی)دا لێیان دواوم و ساغم کردوونەتەوە. لە (نم/١، نن)دا ئەم تاکە هەڵبەستەی (صابر) بەم جۆرەیە:

بارامە هەتا حەشرە انالی لبر حسرت

لبرام بەزمەدا آوازی دەف چەنگ، چەقەنەی.

ئەمەش جگە کووڕی و شێواوییەکەی ئەوەتا لە نیو باڵی یەکەمی لە دووەم تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی) دایە و نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەی (صابیر)ە.

٥- ئەم تاکە لە (عن، ما، فح، حم، نن نسخە، نم/١ نسخە، کش/٢، هاوکاری)دا نییە و لە (مس، گل٩، ن، م، ما١)دا پێنجەمینە و لە (نن، نم١)دا نۆیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و تەنیا لە (ر)دا دەیەمینە.

سەیر بکە (نن، نم١): هر بکە.

مەحبووبەیی ئەحبابن و مەطبوعی (ر): محبوبەء احبابی مطوی.

مەطبووعی (نن) مطبوع و.

٦- ئەم تاکە لە (ما، فح، حم، نن نسخە، نم١ نسخە، کش نسخە، هاوکاری)دا نییە وە لە (مس، ن، گل٩، م، ما١)دا شەشەمینە و لە (نن، نم١)دا هەشتەمین و لە (ر)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

لە هەر جۆرە (نن، نم١): ئەم بزمە، ئەمیش شێواوە و لاوازە.

لە هەر جۆرە (ر): لهر بزمە.

نیشانێکە (نم١، نن): نیشانەکە لە، ئەمیش لاوازە و شێواویی تێدایە.

لە جوانی (ر): لکل هریک، لەنگ و لاوازە.

لە جوانی (نم١، نن): هریک، دیارە هەمان هەریەکی تاکی پێشوو کە لە سەرەوە لە جیاوازییەکاندا هاتووە لێرەشدا سەرچاوەکان دووبارەیان کردووەتەوە بەهەڵە.

ئەم نیو باڵی دووەمە لە (ر)دا بەم جۆرەی دواییە:

(آشوب زمان فتنەء آفاق خداوەی)، کە ئەمەش وا نیو باڵییەکی هەڵبەستەکەی (کوردی)یە بەهەڵە ئاوێتەی ئێرە کراوە.

٧- ئەم تاکە لە (عن، ما، فح، حم، نن نسخە، نم نسخە، کش٢، هاوکاری)دا نییە، وە لە (ر)دا دوازدەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە (مس، ن، گل٩، م، ما١)دا حەوتەمینە و لە (نن، ش، نم١)دا یانزەمینە و، لە هەمووشیاندا دوا تاکی هەڵبەستەکەیە.

لەو بادە: (ر): لوبادەء،

که بەصابیر: (ر): و کو صابر بضروری، ئەمەش لەنگە و هەڵەیە.
کە بەصابر (نن، نم١): وکو صابر.
بەسیە (ر): بستە.
بەسیە (نن، نم١): بسمە.
لە غەم (نم١، نن): لە غمی.
عـوقـبـەی و دونیـەی (ر) عـقـبی دینی، لەگـەڵ ئـەوەدا هەڵەیە، لـەگـەڵ پاشـبـەندەكـانی هەڵبەستەكەدا ناگونجێ و لەنگیشە.
عـوقـبـەی و دونیـەی (نن، نم١) عقـبـای و دینی، لـەمـیش لەنگە و لەگـەڵ پاشـبـەندەكـاندا ناگونجێ.
تا ئێرە، هەڵبەستەكەی (صابیر) یا (صابری) بوو لەگەڵ دیاریكردنی جیاوازییەكانیدا بەپێی سەرچاوەكانی و، لەگەڵ دروستكردنی هەڵە و لاوازییەكانی، بەڵام تاكەكانیم لێک نەدانەوە چونكە لە كاری بەرنامەكەمدا نییە.
ئەوا لێرەوپاش نۆرەی ڕۆچوونمە لە جیاكردنەوەی دەقەكانی هەڵبەستەكەی (فیكر)ی دا، كە ئەمیش هاوچەشن (ڕەدیف)ی هەڵبەستەكەی (كوردی) و ئاوێتە بوویەتی.

## (هەڵبەستەكەی فیكری)

سەرچاوەكانی ئەم هەڵبەستەی (فیكری) ئەمانەن:
(نم١ نسخـە، نن نسخـە، فح، كش٢)ە كە لە هەمـوویاندا زنجیـرەی تاكەكانی هەڵبەسـتـەكە چونیەک نییە لە سەرچاوەكانیدا هەر جیاوازییەكی نێوان سەرچاوەكانیش لە هەڵبەستەكەدا، لە دوای هەر تاكە هەڵبەستێكیەوە ڕادەگەیەنم.

١- (مـەجنوون) نیم، ئەم (بەحـر) و (بەڕ) و (بیـدە)، بكەم طەی
دەروێش نیم، كـەوتوومـەتە دوای عـێل بە حـەی حـەی.
٢- تاكـەی فـەلەک ئاوارەو و مـەحـروومی گـوڵم كـا؟
لەم بەخـتی بەد و طالعی بەرگـەشـتـە خـودا وەی.
٣- مـوطریب بەفـیـدات بم وەرە بۆ دەفـعی هەم و غـەم،
لێ دە لە دەف و بەربت و، چەنگ و، چەقـەنە و نەی
٤- بابێت، (نەوای تۆش)، مـوغـەننی لە مـەقـامـات،
قـەزراز و، حـیـجـاز، ئەوج و، هەوای (ناز)ی دەسـا دەی.
٥- هاتوونە ڕەقص مـوشـتـەری وە، زوهـرە لە خـۆشی
ئەم بەزمـە كـە خـاڵی لە ڕەقـیـبـە وەرە هەی هەی.
٦- سـەمـتـووره، بەمـەسـتـووری دەڵێتن بە فـەصـیـحی،
كەس بەزمی وەهای نەبووە، كە (جەم) كێ بووە، (كەی)، كەی؟

٧- ساقی وەرە ئەمجارە، بەکوێرایی ڕەقیبان،
هەڵبگرە (پیاڵە) و بە(قەڕابە)م بدەرێ مەی.
٨- ساقی، ئەگەر ئەم (لەنجە)یە، هێناتە فرۆتن
مولکی دڵ و، ڕۆحم کەمە بۆ قیمەتی (لەنجەی).
٩- ساقی چییە؟ ئەمجارەش، ئەگەر؛ عیشوە نوماکەی؟
شەرت بێ کە سەرای دڵ بکەمە پێشکەشی لەنجەی.
١٠- ساقی قەدی زۆر نازک و باریکەو چاکە،
دووبارە بکەم تاڵی هەناسەم، بۆ هەناسەی.
١١- ساقی سەرەکەم بێ بەفیدای گەردنی شووشەت
بەو جامە بلوورینە، لە بۆم بێنە پەیا پەی.
١٢- باخەڵقی نەکەن لۆمە لەسەر بادە نەدانی،
سەرخۆش بووە ساقی کە لەبەر عەکسی پیاڵەی.
١٣- (فیکری) کە تۆ ڕۆحت بکەیە پێشکەشی ساقی،
فەرقت چییە بەدبەخت، لەگەڵ حاتەمەکەی طەی.

.................................................................

١- هەردوو نیو باڵی ئەم تاکە لە (کش٢)دا پاشوپێشن.
نیم کەوتوومەتە دوای عێل بەحەی حەی (کش٢): نیم ام بّر و بحرانە اکم طی
نیم ئەم بەحر و بەڕە و بیدە ئەکەم طەی (کش٢): نیم و کەوتومەتە دوی عیل بەحەی حەی.
٢- گوڵم کا (کش٢): کولەکەی
بەختی (کش٢): بەختە
طالعی بەرگەشتە خودا وەی (نم١ نسخە، نن نسخە) محنت و غم خودایە تاکەی
هەروەها لە تاکی دووەمی هەڵبەستەکەی (کوردی)دا نیشانەم بۆ کردووە کە ئەم نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەی (فیکری) شێواوە و ئاوێتەی ئەوەکەی (کوردی) بووە.
٣- نووسینی وشەی (هەم و : خەفەت و) بەشێوەی (هەموو = گشت)یش دەخوێندرێتەوە و دەگونجێ.
٤- تۆش (نن نسخە، نم/١ نسخە، فح): توشی.
لە (کش٢)دا لە جێگەی (ئەوج) نووسراوە: (نوای اوچ).
٥- ئەم تاکە لە (کش/٢)دا شەشەمینە.
٦- بەمەستووری (نم/١ نسخە. نن نسخە، فح): بەسمتورە.
دەڵێتن (نم/١ نسخە، نن نسخە): الیتن.
نەبووە (فح): بوە، دیارە هەڵەی نووسینە.

ئەم تاکە لە (کش۲)دا حەوتەمینە

٧- هەڵبگرە پیاڵە و بە قەڕابەم (کش/٢): هەلبگرە قرابە و بەپیالم.

کە ئەمەش هەڵەی ناشێتییە لە دەستووری مەی نۆشیدا.

٨- ئەم تاکە لە (کش/٢)دا نییە و ئایا کۆمپانیای (لەنج) ئەو کاتە هەبووە تاکو لە وشەی (لەنجەی) دووەمدا مەبەستی لەو بووبێ؟ وەک شاعرێکی مەزن و لە نوێکەرەوانی یەکەمی بەر لە (گۆران) بوو هەڵبەستی کوردی کە لە کاتی دەرچوونی یەکەمین (ڕۆژنامەی کوردی) واتە کوردستاندا لەلایەن (میقداد بەدرخان)ەوە ئەو شاعیرەمان لە ژیاندا بووە و لە ڕۆژنامەی (ژین)ی (ئەستەمبوول)یشدا هەڵبەستی هەن و ناوی (عەبدولفەتاح وەهبی) بووە، ئەویش لەم بابەتی تاکە هەڵبەستەی (فیکری)یەوە فەرموویەتی:

(ئەگەر بمبێ بەماچێکی ئەبەخشم،

سەراپا سەروەتی کۆمپانیای لەنج).

کە بەو شەریکەیە (بێت لەنج)یش وتراوە.

٩- چییە ئەمجارەش ئەگەر عیشوە نوماکەی (نم/١ نسخە): ئەگەر ئەمجارەش عیشوە بنوێنی.

چییە ئەمجارەش ئەگەر عیشوە نوماکەی (نن نسخە): ئەگەر ئەمجارەشە عیشوە بنوێنی.

ئەم تاکە لە (کش۲)دا نییە و لەوانی تردا نۆیەمین تاکە.

ئەمجارەش ئەگەر عیشوە نوماکەی (کش/٢): ئەمجاریشە عیشوە بنوێنی.

١٠- ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا جگە لە (کش/٢) یانزەمین تاکە.

زۆر (کش۲): وا

باریکەو چاکە (کش۲): باریک وە چاکە.

باریکەو چاکە (نن نسخە): باریکوچاکە

بکەم تاڵی (کش۲) ببینی کە

بۆ هەناسەی (کش۲): بەهەناسەی.

١١- ئەم تاکە لە (کش۲)دا پێنجەمینە و لەم تاکەدا مەبەستی گەردنی وەک شووشە واتە (سوراحی)یە و خواستی ماچی کردووە.

شووشەت: بەڕێنووسی کۆن بەشێوەی (شوشت) نووسراوە

کەواتە (لووس و باریکت) دەدات و ئەمەش دەگونجێ و جیناسە.

١٢- ئەم تاکە لە (کش/٢)دا یانزدەمینە.

نەکەن (کش/٢): بکەن، ئەمەش نابێ، چونکە کە ساقی کە وێنەی جوانی خۆی لەناو پیاڵەکەدا، دیوەو لە جوانییەکەی خۆی مەست و سەرخۆش بووە و لەبەرئەوەی کە سەرخۆشە لۆمە هەڵناگرێ چونکە بەتەواوی هۆشی بەلاوە نەماوە و کەواتە ئەم (بکەن)ەی ناو (کش۲) ڕاست نییە.

١٣- ئەم تاکەش لە (کش/٢)دا دوازدەمینە و لە هەموو سەرچاوەکانی تردا دوا تاکی

هەڵبەستەکەیە.

فەرقت (کش٢): فرقی، ئەمەش ناگونجێ.

بەدبەخت (کش٢): بدبختە.

لێرەدا کۆتایی بەهەڵبەستەکەی (فیکری)یش هات و، وا بزانم چەردەیەکم لەمەڕ سەرگوزشتەی ژیانی (فیکری)یەوە لە شوێنی تری ئەم پەڕاویەدا ڕاگەیاندووە.

بۆ (صابر) یا (صابیری)یش ئەوە دیاری دەکەم لە ناو شاعیرانی کورددا سێ کەسیان بەم نازناوەوە هەڵبەستیانم لا هەن و خاوەنی ئەم هەڵبەستەی ناو ئەم ساغکردنەوەیەم هەرە کۆنەکەیانە کە لە سەرێنی شاعیر (کوردی) داڕێژراوە و هاواڵی (کوردی)یش بووە.

١١٤

## دڵ گرفتاری

١- (دڵ) گــرفــتــاری پەژارەی (هیــجــر)ە، جـانـانی دەوێ
لەعلی لێــوی شــەککەرین و گــەوهـەر ئەفــشـــانی دەوێ
٢- بـۆ بـڕینـی (ڕێ)، منـی کـــردووەتـە (خـــدری زینـده)؛ دڵ
قـــــەدبڕی ڕێگەو گــــەیینـی بەر لـە (کـــــاروان)ی دەوێ
٣- حــەپسی (چاه)ی مـیــحنەت و دووره (دیار) و (یار)ە دڵ
بۆ شیفای دەرد، (دیارە) چاری؛ مـاچی (پێشانی)ی دەوێ
٤- ڕوو لە قـیـبلەی (مـصطەفـا)یە، دڵ؛ بەرەو (ئەسـتـانە)یە
(ئاســتــانە)ی (ئەحــمــەد مــوخــتــار)ی بابانی دەوێ
٥- (هیـجـری) وێڵی چۆڵەوانی و، دەشت و کـێـوە، ناسـرەوێ
چون، لیـقـایی (خـاصـەکی)ی (مـیوانـی سـوڵتـان)ی دەوێ

.................................................................

١- سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە تەنیا دوو کەشکۆڵی دەستنووسی (مس)و(ن)ن، لەگەڵ یەک سەرچاوەی چاپکراوی (گ/٣)، کە لە سەرچاوەیەکی تری تەنانەت (بەدەمی)شدا لەبارەی ئەم هەڵبەستەوە چیترم پێ نەزانیوە جگە لە دەقی خودی هەڵبەستەکە، وەکو مۆرک و شێوە و چێژی هەڵبەستی (کوردی) زۆر پێوەیە ئەگەرچی دەقی ناو هەر سێ سەرچاوەکە جیاوازیی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەیە بەڵام من لە ساغکردنەوەی ئەم هەڵبەستەدا پشتم بەناوەڕۆکی جووتە سەرچاوە دەسنووسەکەی (مس) و (ن) بەست؛ چونکە وەک لە ساغکردنەوەکەمدا دەردەکەوێ لە ناوەڕۆکی (گ٣) زۆر شێواوی و گۆڕانکاری و لاوازی پێوە دیارە. و من ئەوەندەی لەبارما بووە و توانابیم بەسەریدا شکاوە، کۆشاوم ئەم دەقەی لە سەردێڕی یەکەمی لاپەڕەکانی ئەم هەڵبەستە و پەسەندترین دەقێکم لێ هێناوەتە دی، کە پێم وایە لە دەقی گوتنەکەی خودی (کوردی)یەوە نزیکتر بێت.

**هەڵسەنگاندن:**

ئەم شێوە هەڵبەستە ئەوەندە دڵگیرە کە لە نێوان هەڵبەستی چەندین نموونەی بەرچاو دەکەوێت وەک:

(نالی) لە دیوانی چاپی مامۆستا (مودەڕیس و کوڕەکانی)دا لە لاپەڕە (٧٠١) چاپی یەکەمدا نالی؛ (فەرموویەتی):

(یار دڵی خـوێنـین و چاوی پڕ لە گـریـانی دەویٚ
ئاریٚ، ئاریٚ؛ گـوڵ لە بـاخـا ئاوی بـارانی دەویٚ)

کە بەداخـەوە ئەوەم بۆ یەکلایـی نەبووەتەوە کە ئایا (نالی) لەپێش (کوردی)دا هـەڵبـەستـەکەی داناوە، یا بەپێچەوانەوە، هـەرچەنـد هـەرکامێکیان لەدوای ئەوی تریانەوە هـەڵبەستەکەی دانابیٚ، ئەوە لە جوانی و دڵگیری و خۆش ئاهـەنگی هـەڵبەستی یەکەمەکەیانەوەیە.

ناودارێکی دیکەی ئەو قوتابخانەیەی (کوردی) و، (وەفایی) بووە کە لە دیوانی چاپی (مامۆستا مـحـەمـەد عـەلی قـەرەداغی) چاپی یەکـەم لاپەڕە (٢٠٥)دا هـەڵبـەسـتـێکی لە هـەمـان کـێش و پاشبەندی ئەوەکەی (کوردی) لە بابەتی دڵداری داناوە کە ئەمی دوایی یەکەم تاکی ئەو پارچە هـەڵبەستەی (وەفایی)یە:-

(دڵی دێوانە ویـصـالی لەبی جـانـانی دەویٚ،
بولبولی شـێفتـە خەندەی گوڵی باخانی دەوی)

لێکدانەوەی ئەم تاکی یەکەمە:

گرفتار: گیرۆدە، دووچار، تووشبوو

پەژارە: بیر ئاڵۆزی، هـەزارە.

هیجر: لێکجیایی، دووری.

جانان: ئەگەر چی لە ڕووی (زمانی)یەوە وشەی (جانان) بەواتا (گیانان)ە، بەڵام لێرەدا جانان واتە (خۆشەویستەکان، یا خۆشەویست) یا ئەو کەسەی ئەم هـەڵبەستەی بەسەردا هـەڵداوە.

لەعل: جۆرە بـەردێکی بەنرخ واتە (گەوهـەر)ێکی شـووشـەیی سـەخـتـی ڕوون و ڕەنگ سـوور، یا زەرد... هتـد. لێـرەدا مـەبەست لە ڕەنگی سـوورەکـەیەتی کـە نیـشـانـەیە بۆ ڕەنگی ئاڵی لێـوی خۆشەویستەکەی.

شەککەرین: وەک شەکر و مەبەست لە (شیرین)ە، کە نیشانەی بۆ شیرینی واتە (جوانی) لێوی وەیا بۆ گوتاری شیرینی ئەو خۆشەویستەیە.

گەوهـەر ئەفشـان: واتە گەوهـەر پرژێن، یا گەوهـەر پەخـشکار کە درێژەدانە بەمـەبەستی گوتارە شیرینەکانی خۆشەویستەکەیەتی کە وەک گەوهـەر وەهـان لە دەمیەوە دەردەچن.

شـێـواویی دەقـەکـان: ناوەڕۆکی ئەم هـەڵبـەسـتـە لە سـەرچاوەکـانـدا شـێـواوی و گـۆڕانکاری بەسەراهـاتن دەگەیەنن کە ئەوەتا لە (مس)دا هـەر تەنیا تاکی (١، ٤، ٥) هـەیە و لە (ن، گ/٣)دا هـەر پێنج تاکـەکـە هـەن بـەڵام بەتایبـەتی نـاوەڕۆکی (گ/٣) هـەر بەجـاریٚ شـێـواوە، ئەویش لە ئاکامی دەماودەم و دەستاودەستکردنی نووسین لە دەستنووسی ناخۆشەوە ڕوویان داوە.

ئەو پەڕەیەی کـەشکۆڵی مـن کـە تەنیـا سیٚ تاکی ئـەم پارچە هـەڵبـەسـتـەم لیٚ وەرگـرتووە. تاکی یەکەمی لە بەری لای چەپی لاپەڕەکەدا نووسـراوە و لای سـەرووی ئەو لاپەڕەیە لەبەر پەڕپووتی، لەناو چووە واتە ئەو دیوەکەی لای ڕاستی لاپەڕەکە دوای ئەو تاکی یـەکەمە بەلای کـەمەوە (١٠) تاکە هـەڵبەستێکی لەناو چووە.

٢- ئەم تاکە لەبارەی بە گورجی ڕێگە برینەوەیە بۆ گەیشتنە یار بەر لە کاروان بەڕادەیەک لە خۆی چواندووە بەکەسێکی پیرۆزی ئاینی ئەوتۆ چەندین ئەفسانەی گورجی و چاکەکاری و بەدەم داماونەوە چوونی بەدواوەیە و لێرەدا مەبەستی لە گورجییەکەی ئەو کەسە نییە کە لە کوردیدا (خدری زیندە)ی پێ دەوترێ و گوایە لە ڕۆیشتنیدا نزیک و دووریی بۆ نییە، و بەچاوتروکانێک تەنگی زەوی کێشاوەتە و دەکێشێتەوە و یەکێکە لە دوو نەمرەکەی کەسان لە جیهاندا ئەویش حەزرەتی (نووح) و (خدری زیندە)ن کە هەردووک بە(جاویدان)یش ناسراون لە هەرە کۆنترین سەرەتای مرۆڤەوە و بۆ نموونە داستانی (گلگامش)ی پاشایەکی کورد لە نەمری و جاویدانیی (نووح) دەدوێ کە بەزمانی (سۆمەری) باپیرانمان نووسراوە و ئەو نووسینە تا ئێستاش لەسەر هەزاران خشتی سوورەوەکراو نووسراوە.

لێرەدا (کوردی) ڕایگەیاندووە کە لەلایەن دڵی خۆیەوە هاندراوە بۆ خێرا برینی ئەو ڕێگایەی لەبەری بووە کە هاوتایی لەگەڵ (خدری زیندە)دا کردووە لە خێراییدا. لە ڕاستیشدا وەک بۆم ساغ بووەتەوە کە (کوردی) یەکێک بوو لە کاتی خۆیدا هاوتای نەبووە لە خێرا ڕۆیشتندا. و بەتایبەتی لەو ڕێگەیەی ناو ئەم هەڵبەستەیدا و لە خۆشەویستیی یارەکەیدا ئەوەندەی تر تیژڕەوتر بووە بۆ هەرچی زۆر (زووتر) گەیشتنی.

قەدبڕ:

لە ڕێگەوباناندا گەلێ شوێنی ئەوتۆ هەن، کە پەلێکیان لێ دەبێتەوە، هەرچەندە ڕێگەی ئەو پەلە سەختترە لە خودی ڕێوبانەکە، بەڵام ڕێبوار لە ڕێگەی ئەو پەلەدا زۆر زووتر دەگاتە شوێنی مەبەست.

وەک لەم هەڵبەستەشدا دەردەکەوێ ئەو ڕێگەیەی (کوردی) لەو گەشتی ناو ئەم هەڵبەستەیدا، ئەوە ڕێگەی (ئەستەمبۆڵ) بووە. کە ئەوسایە دوای ڕووخاندنەکەی پاشایەتی (بابان) بووە و (ئەحمەد پاشا) ئەوکاتە لە (ئەستەمبۆڵ) بووە.

ئەو برینی ڕێگە کورتەی کە ڕام گەیاند لە کوردیدا بە(قەدبڕ) ناودەبرێت.

وادەردەکەوێ کە (کوردی) سەرەتا لەگەڵ (کاروان)ێکدا کەوتووەتە ڕێ بۆ (ئەستەمبۆڵ) بەڵام تیژڕەوی و بێ ئارامی لەتاو دووریی (ئەحمەد پاشا) وەهایان لە کوردی کردووە، بەڕۆیشتنی بە(قەدبڕ)ەکاندا لە (سولەیمانی)یەوە زۆر پێش کاروانەکە کەوتووە و بەپرسیار چووەتەوە سەر ڕێگەکە و بەر لە کاروانەکە گەیوەتە لای (ئەحمەد پاشا) لە (ئەستەمبۆڵ). بە هۆی لەناوچوونی چەند تاکە هەڵبەستێکی ئەم پارچە هەڵبەستە لە (مس)دا، بۆیە بەداخەوە نازانم ئەم (دووەمی) تاکە هەڵبەستەی کە لە سەرەوە جێگرم کرد، ئایا لە ڕاستیدا چەندەمین تاکە هەڵبەستە، یا چەند تاکی لێ لەناو چووە.

وەک دەرکەوت لەم پارچە هەڵبەستەدا کە لە پێشەوە نووسیومە، هەر تەنیا تاکی (یەکەم) لە (مس)دا بوو، واتە تاکی (دووەم و سێیەم)ی تیا نەبوو، بەڵام تاکی (چوارەم و پێنجەم)ی لە (مس)دا هەبوو کە هەر پێنج تاکەکە لە (ن ، گ/١)دا هەن.

٣- حەپس= بەندی، بەندکراوی ناو بەندیخانە (زیندان).
چاھ= چاڵ، مەبەست لە بەندیخانە (زیندان)ە.
حەپسی چاهی میحنەت= بەندکراوی ناو زیندانی ئەرک و ناخۆشی.
ئەم جۆرە دەربڕینە لە هەڵبەستە کۆنە (کلاسیکی)یەکاندا بابەتێکە بەمەبەستی خرانە ناو (بیری ئاو)ەوەی حەزرەتی (یووسف) لەلایەن برایەکانییەوە کە چاویان پیادا هەڵنەدەهات، هەروەها مەبەست لە زیندانی کردنەکەی حەزرەتی (یووسف)و کە دوای لە (بیر) دەرهێنانی و فرۆشرانی لە بازاڕی (میسر)دا کە (عەزیزی میسر) کڕی و لەسەر بوختان پیاکردنی (زولەیخا)ی ژنی (عەزیزی میسر) بە (یووسف)دا لە داخی ئەوەی کە (یووسف) دەستی لەگەڵ (زولەیخا)دا تێکەڵ نەکردبوو کە لە هەردوو زیندانەکەدا یووسف لە (میحنەت)دا بوو، کە شاعیران لە هەڵبەستەکانیاندا زۆرجار نیشانیان بۆ کردووە.
دیار: نیشتمان- کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی بەرێگەوە داناوە کە لە دەرەوەی نیشتمان بووە، بۆیە داخی لە دەست (دووری دیار): دوورە وڵاتی خواردووە و وەک بەندکراوی ناو زیندان بووبێ خۆی وەها داناوە.
یار: دۆست، خۆشەویست و مەبەستی لە(ئەحمەد پاشای بابان) بووە کە دوورییەکەی (کوردی) لەو (پاشا)یەی وەکو حەپسی ناو زیندان داناوە.
بۆ شیفای دەرد= بۆ ڕزگار بوونی لەو دەرد و (میحنەت)ی دوورییەیە تەنیا ماچکردنی (پێشانی)= (ناوچەوان)، (ئەنی) (تەوێڵی) (ئەحمەد پاشا)ی بەدەرمانی چارەکردنی ئەو بەندی و (میحنەت)ی ماندوویی ڕێگە و (دووری)ی لە (ئەحمەد پاشا) ڕەچاو کردووە.
دەرد: نەخۆشی، مەبەستی لە ماندوویەتی و ئازاری دوورە وڵاتی و دوور لە (ئەحمەد پاشا)بوو.
دیارە: ئاشکرایە، ڕوونە.
چاری ماچی پێشانی: (کوردی) بەلایەوە وابووە کە لە چاککردنەوەی خۆیدا لەتاو نەخۆشیی بەندکراوی و میحنەت و دووریی (یار)و دیار (کوردی) چاکترین چارەی بە ماچکردنی ناوچەوانی یارەکەی زانیوە.
جیاوازیی وشەکانی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا:
میحنەت (ن): خەستەگی
چاری (ن): دیاری: بەخشیش.
ماچی پێشانیی دەوێ (گ/٣) ماچی کوڵمانی دەوێ کە ئەمەش ناڕاستە، چونکە (کوردی) لە تێکرای هەڵبەستەکانیدا ئاوا بەڕەپ و ڕاستی و ڕاشکاوانەی پڕ لە (عاطیفە)وە (ماچی کوڵمان)ی دەرنەبڕیوە، وە لە کوردەواریدا نەریتێکی کۆنەمان باوە کە دوو نێرینەی دۆستی ئەوتۆ کە دەمێک بێ یەکیان نەدیبێ کە بە یەکگەیشتن ناوچەوانی یەکتر ماچ دەکەن، بەتایبەتی ئەگەر نێرینەیەک خزمێکی یا دۆست و ئاشنایەکی کچ یا ئافرەت (مێیینە)ی خۆی لە دوای ماوەیەکی دوور دیتەوە ئەوسا نێرینەکە ناوچەوانی ئەو ئافرەتە ماچ دەکات.

ماچی پێشانیی (مس): ماچی کوڵمانی، بەڵام نووسیویە: نسخە (پێشانی)واتە ئەم (ماچی کوڵمانی)یە لە نسخەی تردا (ماچی پێشانی نوسراوە) کەواتە لە (ن و مس)دا (ماچی پێشان)ی هاتووە و هەر لە (گ/٣)دا نەهاتووە، بۆیە لەسەرەوە من (پێشانی)یەکەم هەڵبژاردە کە بەجێترە بەپێی شکۆمەندیی (ئەحمەد پاشا)و دۆستایەتیی نێوان (کوردی)و ئەو (پاشا)یە.

دووریی دیار و یارە دڵ (گ/٣): دووری و خەمی تۆیە مودام.

**هەڵسەنگاندن:**

لەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) زۆر وردەکاری و جیناس ئارایی ڕاگەیاندووە کە توانای خۆی دەگەیەنێ لە هۆنەریدا کە:

(کوردی) وشەگەلی: (یار، دیار، دیار، چار)ی لەم تاکە هەڵبەستەدا گرد کردوونەتەوە و لەگەڵ جیاوازی واتاییشیاندا هەمووانی پەستاوتووەتەوە واتای گشتیی ئەم تاکە هەڵبەستەیە و کە هەموو ئەم وشانە نزیکایەتیی (جیناس)یشیان پێکەوە هەیە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن پەسەندی و بالایی و جوانی و جوانکاریی زۆری تێدایە لە ڕاستیشدا لە بیستن و لە بەر گوێ خۆشترێکە.

٤- (قیبلەی مصطفا) لەسەر زاریدا ئەم (قیبلەی مصطفا)یە (کەعبە) دەگەیەنی.

بەڵام (کوردی) هونەرمەندانە یارییەکی وێژەییی بەم دوو وشەیەی (قیبلە)و (مصطفا)یە کردووە کە هەرگیز مەبەستی لەو (کەعبە)یە نییە کە ئیسلامەکان لە هەر پێنج نوێژی ڕۆژانەیاندا لە چەندین نزاکاری و لە (حەج)کردنیاندا ڕووی تێ دەکەن، بەشکو (کوردی) مەبەستی لە قیبلەی خودی خۆیەتی نەک هی ئیسلامییەکەی، کەوا چۆن ئیسلامەکان ڕوودەکەنە (قیبلە) ئەوەتا ئەمیش ڕووی کردووەتە بارەگای (ئەحمەد پاشا)ی هاواڵ و خۆشەویستی و گەورەی نیشتیمانەکەی.

ئەمجا ئەم (قیبلە تایبەت)ەی خۆی کە بە (قیبلەی مصطفا) ناو بردووە و مەبەستی لەو (مصطفا)یە نییە کە یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەری ئیسلام-(د.خ) بەشکو (کوردی) خۆی ناوی (مصطفا) بووە، کەواتە مەبەستی (کوردی) لە بارەگایەکەی (ئەحمەد پاشا)یە کە قیبلەی تایبەتی خودی (مصطفافابەگی کوردی) بووە لە هەمان کاتیشدا لە ناوەکانی تری پێغەمبەر (ئەحمەد)و (ئەحمەدی موختار) بووە کە ئەوەتا ناوی ئەو پادشا بابانەی کە دۆستی (کوردی) بوو لە دیدەنی کردنیدا بووە ناوی (ئەحمەد) بووە کە (نالی) لە هەڵبەستە شاکارەکەیدا بەبۆنەی دانانی (ئەحمەد پاشا) بە(پاشایەتی بابان) و مردنی باوکی (ئەحمەد پاشا)وە ئەو (ئەحمەد)ەی بە (ئەحمەد موختار) ناوبردووە. هەروەها (کوردی)یش هەمان (پادشا)ی بە (ئەحمەد موختاری بابان) ناوبردووە لەم تاکە هەڵبەستەیدا.

ئەستانە: یەکێکە لە ناوەکانی شاری (ئەستەموول، ئەستەمبوول، ئەستام بوول، ئیسلامبوول.. هتد. کە وەک ڕام گەیاند (ئەحمەد پاشا)دوای ڕووخانی بابان لەوێ بووە کە (کوردی) چووەتە لای ئەو.

ئەستانە: شوێن، بارەگا- (کوردی) لێرەدا بەیەکخستنی دوو (ناو)ی (ئەستانە)و (ئاستانە) وردەکارییی؛ وێژەیی کردووە کە بەڵگەی توانایی و لێهاتوویی (کوردی)یە لە هۆنەریدا.

لە نێوان ئەم سێ تاکە هەڵبەستەی پاشماوەی هەڵبەستە سەرەتا لەناوچووەکەدا (کوردی) بەڕاشکاوی ڕاست و ڕەوانی مەبەستی ناوەڕۆکی سەرپاکی ئەم هەڵبەستەی ڕاگەیاندووە.

کەوا دڵی هانی داوە و لە بەرەو سەردان (دیدەنی)کردنەی (ئەحمەد پاشا)ی بابان بووە.

٥- (هیجری): نازناوی دووەمی (کوردی) بەواتە (دووریتی) کە مەبەست لە دوور کەوتنەوە لە شاری (سولەیمانی) یا لە (کوردستان) بووە، چونکە (کوردی) ئەم نازناوەی (هیجری)یەی لە دوا تاکی هەڵبەستەکانیدا دەربڕیوە کە کاتی ئەو هەڵبەست دانانە لە دەرەوەی ئەو شارە یا (کوردستان)دا بووە.

کەواتە بوونی ئەم (نازناو)ی (هیجری)یە، لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم تاکە هەڵبەستە دواتاکی ئەو پارچە هەڵبەستەیەتی کە بەداخەوە هەر تەنیا پێنج تاکە هەڵبەستیم دەست کەوتووە.

لە نیوە باڵی یەکەمی ئەم تاکەدا (کوردی) بەئاشکرا دەربڕیوە کە ئەم هەڵبەستەی بە ڕێگەی چوونە (ئەستەمووڵ)ەوە داناوە کە بەناوچەی (چۆڵەوانی) و (دەشت) و (کێو)دا لە بێ ئارامی و شپرزەییدا تێ پەڕیوە و هەڵپەی زوو گەیشتنە بارەگای (ئەحمەد پاشا)ی بووە لە نەسرەوتندا، بەڕادەیەک بەر لە (کاروان) گەیشتووە.

(لیقا): دیدەنی، سەردان و چاوپێکەوتن کە مەبەست بەیەکگەیشتنی بووە (بە ئەحمەد پاشای بابان).

(خاصەکی): لە ڕووی زمانەوانییەوە بەواتا تایبەتمەندێتییە. بەڵام لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (عوسمانی)دا زارگوت (مصطلح)ێکی تایبەتی بووە بەواتە ئەوانەی نزیکایەتی و پێوەندیی دۆستایەتییان لەگەڵ خودی (سوڵتان)ەکانی (عوسمانی)دا هەبووە، هەر لەبەر ئەمیشە کە (کوردی) (ئەحمەد پاشا)ی بە(میوانی سوڵتان) ناوبردووە، چونکە لە (خاصەکی) واتە تایبەتمەندەکانی خودی سوڵتان (خەلیفە)ی (عوسمانی)بووە.

ئەوەش ڕێزی بەرز و شکۆداری (ئەحمەد پاشای بابان) دەردەخات.

لەم تاکی دووەمی ئەم دواتاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا (کوردی) درێژەی بەباسی ڕۆیشتنە خێرا و شپرزەییەکەی خۆی داوە کە مەبەستمان لە پێگەیشتنی (لیقا)ی (ئەحمەد پاشا) بووە کە لە میوانە تایبەتمەند (خاصەکی)یەکانی خودی خەلیفە (سوڵتان)ی ئەوسای (عوسمانی) بووە.

١١٥

## چاوەکەم زانیوتە؟

١- چاوەکـــەم زانیـــوتە، بۆ شـــەو، خـــەو لە چاوم نـاکـــەوێ
چونکە من پێش خـزمـەتم پێشـخـزمـەتان نانوون شـەوێ
٢- ڕۆژ و شــــەو، دائیم لەبەر دیدەی خـــەیاڵم حـــاضـــری
ســـا چ فــەرقــێکی هەیە بۆ من ئیـــتـــر ئێـــرە و ئەوێ
٣- بەس نـیـــیـــە لێـــرە دەوێرم جـــار بەجـــار باست بکەم؟
نەمـــدەوێرا قـــەت لەبەر ئەغـــیـــار، کـــە ناوت بەم لەوێ
٤- دڵ لەبەر زامی فـــــیـــــراقت دائیـــــمـــــا زاری دەکـــا
ڕۆژ و شەو مەنعی دەکەم، باز دەردی سەختە و ناسرەوێ
٥- عـــــەقڵ و دینم داوە پێت لێـــشـی دەتۆرێی مـــاڵوێران
دەوڵەتێکی مـــوفت و بێ صـــاحـــێـــبـــە، بۆچی ناتەوێ.
٦- گـەر مـوخـــەییـــەر بم لە مـابەینی بەهەشت و وەصلی تۆ
وەصلی تۆ بۆ من جـــەهـەننەم پڕ لە جـــەننەت نامـــەوێ
٧- ئەی ڕەقـــیب وێڵم لە دەســـتت، لێـــرە بۆ لێم ناگـــەڕێی؟
باوە کوشتەت نیم ئەرێ هەی بەد مەزەب چیت لێم دەوێ؟
٨- هـەروەکـــو کـــۆهـی دەمـــاوەندە ســـەری پڕ شـــۆڕشـم
قـــەت تەمی هیـــجـــران و خـــەم، ســـاتێ لە دەوری ناڕوێ
٩- گـەردنی (کوردی) لە کـێـوی بێـسـتـوون مـەحکەمـتـرە
چونکە (ســـەد ســـاڵە) لە ژێر باری غـــەمـــایە و نانەوێ

---

١- پێشخزمەت: بەردەست، خزمەتکاری بەردەست.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (مس، عن، ن، گل، ف، ص، کش/١، کش/٢، ر، جلی، ما، نم/١) و، (کم، گ٢، سا، س، گ٣، لەگەڵ (مشـاهر الکرد وکردسـتـان) و لەمـانەدا (کم)م کـردە بنکەی لێکۆڵینەوەی و کەڵکم لەوانی تریش وەرگرتووە. بەداخەوە (بۆنە)ی ئەم هەڵبەستەم لێ ئاشکرا نەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا وەک دەبینرێ ئەم هەڵبەستە (١٨) سەرچاوەی هەیە. کە لە (کش/١)دا

کە دەستنووسی (محەمەد ئەمین) ناوێک وەرم گرتووە لە (کش/٢) تەنیا تاکی حەوتەمی نووسراوە کە ئەویش لە کاتی ژیانی (حریق)دا نووسراوەتەوە (سا) تاکی شەشەمی تیایە و لێکی داوەتەوە.

بۆ شەو (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، مشاهیر) بۆچی: (بۆچی).

بۆ شەو (ر): چ شو

بۆ شەو (جلی، ما): شو بوچ

پێشخزمەتم (ر): پێشخدمی

چونکە من پێشخزمەتم (ما) چونکی تو پیش خدمت.

چونکە من پێشخزمەتم (جلی) چونکە من پێش خدمتم.

لە (کش١، محەمەد ئەمین)دا ئەم تاکە هەر (چاوەکەم زانیوتە بۆچی) ماوە و ئەوی تری لەناوچووە.

٢- دیدە: چاو، بینین، چاڤ، چەم.

خەیاڵ: بیر.

حاضر: ئامادە.

فەرق: جیاوازی.

دائیم (نم/١، ف، کم): دایم.

دائیم (گ/٢، س، گ/٣): دائم.

لەبەر (ما): لپیش. ئەمیش لەنگە.

دیدەی (کش/١، محەمەد ئەمین): فکری.

حاضری (نم/١): حازری.

حاضری (ر): حاظری.

بۆ من ئیتر (ر): ایتر بو من.

ئێرە و ئەوێ (ر) ایر اوی.

بۆ من ئیتر (مشاهر) بو من.

٣- باست بکەم: لێت بدویم بەچاکە

ئەغیار: بێگانە، بیانی

لەوێ: بەداخەوە بۆم ساغ نەبووەوە کە (ئەوێ) کوێیە و ئێرەش کوێیە.

باست (ما، کش/١، محەمەد ئەمین، جلی) بحست

باست (نم/١): حست

باست (کم): بەحست

باست بکەم (ر) ناوت برم

ئەغیارەکە (نم/١، کم): اغیارەکە، ئەمیش لەنگە

ئەغیارەکە (مشاهیر): اغیار

قەت (ر، ف، ما، نم/١): قط

کە ناوت بەم لەویٚ (ر): لناوت بم لوی.

کە ناوت بەم لەویٚ (کش/١، محەمەد ئەمین): برم ناوت لوی

٤- فیراق: دووری، جیایی

دائیما: هەمیشە

زاری: گریان، هاوار

مەنع: بەرگری، نەهێشتن، قەدەغە.

باز: دیسان

سەختە: گرانە، قورسە

ناسرەوی: ئارام ناگریٚ

ئەم تاکە لە (جلی، ما)دا نییە، چونکە لەگەڵ تاکی دواییدا پاش و پێش بووە.

زامی (ر): زای = برینی

دائیما (نم/١، ما، کم، گ/٢، س، گ/٣): دائما.

زاری (گ٢، س، گ٣): یاری.

ڕۆژ و شەو (ف، ر، نم/١، گ/٢، س، گ٣) ڕۆژ بەڕۆژ

ڕۆژ و شەو (س) رۆژ نییە ڕۆژ

ڕۆژ و شەو (ما): روژ شو،

ڕۆژ و شەو (مشاهر) زو بە  زو

مەنعی دەکەم (ما) منع دکم

سەختە (ر): سختە

دەردی سەختە (ما) درد سختە

٥- عەقل: ژیری، هێژایی.

دین: ئاین

ماڵوێران: ماڵکاول، خانە وێران

دەوڵەتێکی: ماڵێکی، سەرمایەیەکی مەبەستی لە عەقڵ و دینەکەیەتی

موفت: بەلاش، خۆڕایی، بەبیٚ نرخ.

صاحێب: خاوەن

ئەم تاکە لە (ما)دا چوارەمینە وەک تاکی پێشوودا ڕام گەیاند، لەگەڵ ئەودا پاش و پێشە دینم (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، مشاهیر): هۆشم، ئەمیش نابیٚ، چونکە هۆش و عەقڵ هاکا یەک بن، بەلاٚم دین جیایە و لە سەرچاوە کۆنەکاندایە.

داوە پێت لێشی دەتۆرێی ماڵوێران (ما، جلی) داوە پێت لیٚ دتوری چاوکم.

ماڵوێران (ر): چاوەکەم
ئەم تاکە لە (جلی)دا چوارەمینە.
٦- موخەییەر: سەرپشک
وەصل: پێکگەیشتن
جەهەننەم: دۆزەخ
جەننەت: بەهەشت
گەر (مشاهیر): گر.
لە مابەینی (ر، ما): لمابین.
لە مابەینی (گ/٢، س، گ/٣): لە نێوانی
تۆ (سا، گ/٢، س، گ/٣): یار، ئەمەش ئاشکرایە کە هەڵەیەکی زمانییە؛ چونکە هەڵبەستەکە بەتێکڕایی و ئەم تاکە بەتایبەتی (موخاطەب) و (تۆ)ی تر لەم تاکەدا هەیە، ئیتر چۆن دەگونجێ یار بێ. وە ئەم تاکە لە (جلی) پێنجەمە.
ئەم تاکەی سەرەوە یەکێکە لەو تاکە هەڵبەستانەی (کوردی) کە بەسەر زاری واتایەک دەگەیەنێ کە پێچەوانەی واتا و مەبەستەکەیەتی وە لەبەر ئەوەی کە (مامۆستا عەلائەدین سەجادی) لە پەراوی (مێژووی ئەدەبی کوردی)یدا بەر لە ٣٠ ساڵ پتر زۆر بەجوانی ئەم تاکەی لێک داوەتەوە بۆیە بەچاکم زانی کە نیشانە بۆ ئەوە بکەم کەوا لێرەشدا پوختەیەکی ئەو لێکدانەوە پڕ بەپڕی مامۆستای ناوبراو لە خوارەوە وەرگرم کە:
(کوردی) لەم تاکەیدا بەیارەکەی گوتووە: ئەگەر لە نێوان بە تۆ گەیشتن و دۆزەخدا سەرپشک بم، ئەوا پێکگەیشتنەکەت هەڵدەبژێرم، تەنانەت ئەگەر دۆزەخیش پڕی بکرێ لە بەهەشت، یا بۆم ببێ بە بەهەشت، هەر نامەوێ و دەست لە پێکگەیشتنەکەی تۆ هەڵناگرم و ئەو بەهەشتەم ناوێ. ئەمەش نیشانەیە بۆ ئیدیۆم (کینایە)یەکی کوردانە کە یەکێ بە یەکێ دەڵێ (برۆ جەهەننەتت لێ پڕ) کە ئەمە بەجنێو و قسەی ناشرین وەردەگیرێ، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە مەبەست لەوەیە: (دەبرۆ دۆزەخت لێ پڕ کرابێ تاکو جێگەی تۆی تیا نەبێتەوە).
ئەم دەربڕینە بەهێزەی (کوردی) جارێکی تر ئەوەمان بۆ جێگیر دەکات کە بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندێ سەرچاوەوە هەڵبەستەکانی (کوردی) سادەبن و لە زۆر شوێندا ئەوپەڕی قووڵی و گێژ و بەو وشە یاری کردن و تەڵەی زمانی نانەوە و چەواشەکردن و وردەکاریی وێژەییی کۆنی تێدایە، وەک لەم پەراوییەدا دەردەکەوێ و ئەمەش پایەی بەرزیی (کوردی) و توانایی ئەومان بۆ ئاشکرا دەکات.
٧- ڕەقیب: ناحەز، ناکەس، دژ، نەیار.
باوە کوشتە: ئەوی باوکی کەسێکی کوشتبێ، باوک کوشتە.
بەد مەزەب: بەد مەزهەب، بێ ئاین، خوانەناس
ئەی ڕەقیب وێڵم لە دەستت لە سەرچاوەی (ر)دا هەر ئەوەندەی ئەم نیو باڵی یەکەمی ئەم

تاکەی نووسیوە و ئەوی دی بەجێ هێشتووە یا لەبیری چووە یا بۆی ساغ نەبووەتەوە.
وێڵم (کش/١، محەمەد ئەمین): ویل بوم.
بۆ (کش/١، کش/٢، احمد، ما): بوچ.
ناگەڕێی (کش/١، کش/٢): ناکری، ئەمە ڕێنووسی کۆنە
ناگەڕێی (ما): ناکرّی.
ناگەڕێی (مشاهیر): ناکەری، هەڵەی چاپییە
باوە (کش/١): بابە
باوە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): باوکە.
کوشتەت (ما) کشتت، ئەمە ڕێنووسی کۆنە.
کوشتەت (گ/٢، س، گ/٣) کوژتەت
ئەرێ (ما): ار
ئەرێ هەی (ر) اری هەی ار – مەزەب (مشاهیر) مذهب
چیت (کش/٢): چت
چیت (گ/٢، س): چێت
ئەم تاکە لە (جلی)دا نییە
٨- کۆها: کێوی، چیای، کەژی، شاخی.
دەماوەند یا دەباوەند یا دەنباوەند: ناوی ناوچەیەکی فراوانە لە نێوان (ڕەی) و (تەبەرستان)دا لەو ناوەندیدا چیایەک هەیە، چیاکەش هەر بەو ناوەوەیە.
ئەو چیایە زۆر قووچ و سەختە سەرە پۆپەکەی خڕێکی گومەزییە، بە گوند و باخات و میوەجات دەوری دراوە، لە هەموو چیاکانی دەوروبەری بەرزتر و هەمیشە بەفری ناچێتەوە، ئەشکەوتی زۆری پێوەیە و کانیاوی (گەڕاو)ی (گۆگرد = کبریت)ی زۆر لێیە لەگەڵ جۆرەها کانی تری وەک (کل) و (زاج) و ..... هتد. ڕووبار لە چیاکەوە دێتە خوارێ و بەلای (کونە با)دا تێ دەپەڕێ کە تەم و هالاوی ئەو گەڕاوانە (هەمیشە سەری چیاکەیان گرتووەتەوە) هاڕەی ئاو و هاژەی با دەنگی سەیر لەو کێوە پێک دێنن، زۆر جار بەگەرمای ڕۆژ هالاوی گۆگردەکە گڵپە دەکا. ئەفسانەی زۆر لەو دەنگە دەنگە و هاڕە و هاژە و گڕ و گڵپە و تەمومژ و سەختییەی دروست کراوە و هۆنەران لە هەڵبەستەکانیاندا ناویان بردووە.
لەوانە دەڵێن کاتێ فەرەیدون سەرکەوت و بیۆڕاسب یا ضوحاک یا (ئەژدیاک)ی زۆرداری گرت و زنجیری کردو لەو چیایە خستیە زیندانەوە، و گوایە تاکو ئێستاش لەگەڵ پاسەوانەکانی دەوریدا هەر ماون و ئەو تەمە هەناسەی ئەوە و ئەو کڵپەی ئاگرە ترووسکەی چاوەکانێتی ئەو هاژە و هاڕەیەش دەنگ و ناڵە و فیغانی ئەوە، دەشڵێن حەزرەتی سلیمانیش (دێو)ێکی لەوێ زنجیر و پالەهەنگ کردووە، ئەو ڕواڵەتە سروشتییانەی شاخەکە لەو (دێوە)و، لە (ئەژدیاک)ەیە... هتد.

ئەمجا (کوردی) کە گلەییی خۆی گرتووەتە ئەو چیا و ڕواڵەتە سروشتییە سەیرە.
شۆڕش: ئاشووب و هەڵا و هاتوهاوار و مەبەستی لەو دەنگە دەنگەیە کە لە چیای دەماوەندەوە دێت، ئاوەهاش لە سەریدایە.
تەم: مژ، هەڵا، هالاو. مەبەستی لەو تەمەیە کە بەچیاکەوەیە وەک تەمی کەللە و دڵی (کوردی) لە داخی دووریدا.
هیجران: دووری، لە یار جیایی.
ناڕەوێ: لاناچێ، ناڕوات وەک ئەو دەنگ و تەمی چیایە.
نیوەی یەکەمی ئەم تاکە لە (کش/١، محەمەد ئەمین)دا فەوتاوە.
کۆهی (ر، ما، گ، س، گ/٣): کێوی.
دەماوەند (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣) دەماوەندی.
سەری (ما): دلەی.
سەری (ر): دلی.
سەری پڕ شۆڕشم (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، مشاهیر): سەرم پڕ شۆڕشە
غەم (گ/٢، س، گ/٣): خەم.
لە دەوری (کش/١، ر، ما): لدورم.
قەت (ر، ما) قط. ئەم تاکە لە (جلی)دا نییە.
گەردنی: ملی، سکوردی، هەوکی، ئەستۆی.
بێستوون: چیایەکی بەرز و سەخت و ماهی زەردە لە نێوان (هەمەدان) و (حەلوان)دا و ئەوی بۆ ئێرە مەبەستە و نیشانەی بۆ کراوە ئەو بەشەیەتی، کە ئەو چیا و ماهی زەردە تەشوێ تاش کراوە، لەلایەن هونەرمەندی دڵداری شیرینەوە کە ناوی (فەرهاد) بووە.
سەد: لەسەر ئەم وشەیە لە (عن)دا ئەم پەڕاوێزە فارسییە بۆ نووسراوە:

> (شْنَیده ام که مَقْصود از سَدْ، حرف سین و دال اسْتْ به حسابِ اَبجَدی که، شَستْ و چهار است و نه مقصود از معنی سد است و گُویا کُردی) رَحمهُ اللّه بمُناسَبتِ دخول عُمرشْ به سنهء شست و چهار که زیاتر أزْ عُمرِ پیغَمَبَرِ آخر زَمان أسْت. علیه صلاة والسلام. علي)

واتە (بیستوومە کە مەبەست لە وشەی (سەد) هەردوو پیتی (س) و (د)ە کە بەژمارەی ئەبجەدی (س = ٦٠) و (د = ٤) و هەردوو پیتەکە (شەست و چوار)، نەک مەبەست لە واتەی وشەی (سەد)ە کە دەکاتە (١٠٠). گوایە، ئەمەش (کوردی) خوا بیبەخشێ بەبۆنەی گەیشتنە شەست و چواری تەمەنییەوە وتوویە کە پترێکە لە تەمەنی پێغەمبەری ئاخر زەمان سڵاوی خوای لێ بێ – عەلی) ئەوی زانراوە تەمەنی پێغەمبەری ئیسلام –د.خ– ٦٣ ساڵ بووە، ئەمەش بەڵگەیەکی جوان و سەیرە بۆ تەمەنی کوردی دیاری کردن کە سەرچاوەکان بە (٤٠) ساڵیان داناوە و بۆی ساغ بووەتەوە کە ئەو سەرچاوانە ڕاست نین، هەروەک لە شوێنی خۆیدا دیاری و

جێگیرم کردووە بەبەڵگەی بەهێزەوە

نانەوێ: ناچەمێ، خوار نابێتەوە، ئەم وشـەی (نانەوێ)یە بەڕێنووسی کۆن (نانوی) دەنووسرێ کە بـە (نانوێت) دەخـوێندرێتـەوە و بـۆ ئێرەش دەگـونجێ کە مـەبەسـتی مردنە، واتە نـامرێ و خـۆڕاگرە. بەڵێ (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا خۆڕاگری و دڵ بەهێزی (ورە) بەرز دادەنێ. خـۆی بەرامبەر بـەزۆرەی ڕۆژگار و ئەو هەمـوو سـتـەم و ناخـۆشییـەوە دەربڕیوە کە لە سـەرێنی ئەودا ڕوویدا لە پشێوی ناوخۆیی و دەسکاریی بێگانە و دراوسێکانمان.

ئەم تاکە لە (جلی)دا شەشەمینە و دواتاکە:

کێوی (کش/٢): کوهی

سەد ساڵە (ر، ما) سالیکە

سەد ساڵە (گ، جلی، س، گ/٢) چەند ساڵە.

غەمایە و (کش/٢، جلی): خەماندا

غەمایە و(ما، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): خەمایە.

غەمایە (ر): غم دایە.

گردنی (مشاهر): کردنی.

# هەڵبەستی "کوردی" بە شێوەزاری گۆران

١١٦

## صەیدی مەزانان

١- (صەیدی) مەزانان، (صەیدی) مەزانان

مە بۆ بزانان. کۆمەندەن جانان

٢-یەقین جە عەشقی یاران ڕەم کەردەی

وەرنە، چین عیللەت لێوەنی هەردەی؟

٣- ئازیزم حەیفەن یادت کەم بییەن.

مەگەر دەرد عشق جەیادت شییەن

٤- من جە دڵی زار، ئەی چەند فەردەوە.

یاد، دیرینەم نۆژەن کەردەوە.

٥- ئەبیات عیشقەت، گەر (گەزاف) نییەن؟

دەلیل لوطف وەرینەت چییەن؟

٦- پەی چێش گوم کەردی هەم فەرد جاران.

هورێزە وەپا چون کاروانداران.

٧- قەدەم ڕەنجەکە، گەر، زەدەی هیجری

خەیلێ موشتاقی (دیا) تەن (هیجری).

---

١- (صەیدی): مەبەست لە شاعیری مەزن (صەیدی)یە، کە ئەم (وشە)یە نازناوی ئەو شاعیر بووە و ناوی خۆی مامۆستا مەلا سەید (محەمەد) کوڕی مەلا (سلێمان)ی کوڕی مامۆستا (حاجی سەید ئەحمەد). لە نێوان ساڵانی (١٧٨٤-١٨٤٨ز)دا ژیاوە و لە خەڵکی (هەورامانی تەخت) بووە.

من ئەو هەڵبەستەی سەرەوەم لە سێ سەرچاوەوە، دەست کەوتووە.

سەرچاوەی یەکەمیان، کەشکۆڵەکەی (مس)ە کە سەرەتایەکەی دەستنووسی خودی (صەیدی

دووەم) و، پەڕی سـێـیی تری لەگـەڵدا (جـزوبەند)کـراوە و نەوەکـانـی ئەو (صــەیدی دووەم)ە بەدەسنووسی خۆیان کام هەڵبەستەیان ئارەزوو لێ بووبێ، ئاوێتەی ئەم کەشکۆڵەیان کردووە.
ئەم هەڵبـەسـتـەی سـەرەوە کـە بریتـیـە لە نامـەیەکـی برادەرانەی (کـوردی) کـە لە (هـەورامـانی تەخت) بووە بۆ (صەیدی دووەم) هـاواڵی خۆی ناردووە کە دیدەنیی (کوردی) بکات.
هـەر لەم کـەشکۆڵە سـەرچاوەیەمدا هـەڵبەسـتێکـی تری تێدایە کـە وەڵامـی ئەم نامـە هـەڵبـەسـتـەی سـەرەوەیە کە هـی (صەیدی دووەم) و بۆ (کوردی)ی برادەری خۆی داناوە.
ئەم سـەرچاوەی (مس)ە یەکێکە لە هـەرە سەرچاوە گرینگ و بایەخدارەکانی ئەم پەڕاوییەم کـە شوێنی بڕوا و بەڵگەنامەیەکی بەهێزە.
ئەم هـەڵبـەسـتـەی سـەرەوە (تاسـەنامـە)ی شـاعـیـر (کـوردی)و گـازنـدە کـردنێـتـی لە (صـەیدی دووەم)ی برادەری و خۆشەویستی. هـەر ئەم هـەڵبـەستە لە لاپەڕە (٢٠٥)ی دیوانە چاپکراوەکەی (صــەیدی)دا لەدوای تەواوکـردنـی ئەم هـەڵبـەسـتـەی (کـوردی)یەوە ئەو (وەڵام)ەیش پـێشـکـێش دەکەم.

ئەمیش لێکدانەوەی وشەکانی ئەم تاکی یەکەمەیە:
مەزانان: نازانی؟
مە بۆ: ئایا نابێت؟
بزانان: بزانی، بزانن؟
کوو: لە کوێ؟
مەندەن: ماوە؟ ماونەتەوە، مەبەستی (لە کوێران)ە.
جانان: گیانان- کە مەبەست لە دۆست و برادەرانە.
٢- یەقین: بەڕاستی، بێگومان.
جە: لە.
عشقی: خۆشەویستی، ئەڤینی.
یاران: دۆستان، برادەران، هاوەڵان.
ڕەم: ڕەو، سڵ، هەڵاتن، دوورکەوتنەوە.
کەردەی: کردووتە، واتە: ڕەوت کردووە.
وەرنە: ئەگەرنا، ئەرنە.
چێن: چییە، چی شتێکە، هۆی چییە، لەبەر چێن.
عیللەت: هۆ، سەبەب.
لێوەن: شێت، دێوانە، هەردەوێڵ.
هەردەی: بەهەردەوەی، داوتەتە کەژوکێو.
مەبەستی دوورییەتییە لە یاران و لە خۆی (کوردی).

هەردە: دەشت و دەر و شاخ.

سەرچاوەیەکی ئەم پارچە هەڵبەستە کەشکۆڵی (ن)ە، کە ئەمیش یەکێکە لە دەسنووسە چاک و باوەڕپێکراوەکان کە ئەم هەڵبەستەی (کوردی)م لێ وەرگرتووە و وەڵامەکەی (صەیدی)م تێدا نەدیوە.

لە جیاوازییەکانی تاکی یەکەم:

کۆمەندن (مس) کمندن.

مەزانەن (مس) بزان کورژاوەتەوە.

٣- ئازیزم: عەزیزەکەم، ئەو خۆشەویستەکەم.

حەیفەن: موخابنە، جێگەی داخە.

یادت کەم بییەن (یادت کەم بییەن): یادت کەم بووەتەوە.

مەگەر دەرد عشق: مەگەر دەرد و ئازار و ناخۆشیی دڵداری و خۆشەویستی.

جەیادت شییەن: لە یادت (بیرت) چووە.

حەیفەن (مس): حیفن.

بییەن (مس): بیَن.

شییەن (مس): شیَن.

٤- من جە دڵی زار: من لە قووڵاییی دڵی(دەروونی) پڕ تاسەو دەردی یادکردنەوەی تۆدا. وە لە دووریی تۆی خۆشەویستەوە.

ئەی چەند فەردەوە: ئەم چەند تاکە هەڵبەستەمەوە.

یاد دێرینەم: یادی تۆم کردووەتەوە بەم هەڵبەستەم کە یادی کۆنەی دۆستایەتیی نێوان من و تۆ وەک جاران لە نێوانماندا گەرم و گوڕ بوو.

نۆژەن کەردەوە: نوێم کردەوە، تازەم کردەوە. واتە نوێکردنەوەی دۆستایەتییە کۆنەکەمان.

فەردەوە (مس): فردَوة.

نۆژەن کردەوە (مس) نوژن کردَوة.

دێرینەم (مس) دَیرینم.

٥- ئەبیات عیشقەت: تاکە هەڵبەستەکانی خۆشەویستیت کە دات نابوون. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە (صەیدی) بەر لەم نووسینی نامەیەی (کوردی) هەڵبەستی خۆشەویستی بۆ (کوردی)ناردووە کە بەداخەوە ئەو هەڵبەستە و ئەو هەڵبەستەی تری (صەیدی)م بۆ (کوردی) دەست نەکەوتوون .

گەزاف نییەن: درۆ نین: واتە ئەو هەڵبەستە (تاسەنامە)یانەی تۆ بۆ من ئەگەر ئەوانە درۆ نین- درۆ نەبوون؟

گەزاف: درۆ، ناڕاست، خۆهەڵکێشان.

نییەن: نین، نەبوون.

دەلیل لوطف: بەڵگەی دڵسۆزی، چاودێری، لاواندنەوە، خۆشەویستی پێشاندان.
وەرینەت چییەن: لەمەوبەرت، دێرینەت، ڕابووردووت مەبەستی لە نامە هۆنراوەییەکانی پێشووی (صەیدی)یە بۆ (کوردی).
وەرین: پێشوو، جاران، ڕابووردوو، زۆر کۆن
گەرگەزاف (مس): کرکزاف = ئەمە ڕێنووسی کۆنە.
وەرینت: ورینت.
٦- پەی: لەبەر
} ——> بۆچی، لەبەرچی، بۆ.
چێش: چی
گوم کەردی: بزرت کرد، گومت کرد، لە بیرت کرد، بیرت چووەتەوە.
هەم فەرد جاران: هاو هۆنەرییەکەی جاران، ئەو کەسەی کە جاران هەڵبەستیان (تاسە نامە)یان بۆ یەکتر دەنارد کە من (کوردی) و تۆ (صەیدی) بووین.
هەم فەرد: هاواڵ، هاوهۆنەری، هاودەم.
هورێزە وەپا: ڕابە، هەڵسەرە سەرپێ، ڕاپەڕە، ڕاست بەرەوە، مەبەستی لەوەیە کە ئەی (صەیدی) زووکە و هەڵسە و، وەرە بۆ لام.
چون کاروانداران: ئەو (ڕابوون)ەت و هاتنە لای منەت وەک کاروانچییەکان ڕوو بکەرە لام، سەرم بدە، دیدەنیم بکە،
چون: وەک.
کاروانداران: کاروانچییان.
پەی چێش (مس): پی چیش
گوم کەردی (مس): کومکردی.
هەمفەرد (مس): همفرد
هورێزەوە پا (مس): هوریزە وَپا
٧- قەدەم ڕەنجەکە: قەدەم، پێ، قاچ، لاق
ڕەنجە: ئازار، ماندوو، یەشاندن،
قەدەم ڕەنجەکە: پێی خۆت ئازاربدە، ماندوو بکە- لە ڕێگەی هاتنتا ئەی (صەیدی) بۆ لای من (کوردی).
گەر زەدەی هیجری: گەر: ئەگەر
زەدە: ئەنگاوتە، پێکراو، لێدراو- هیجری: دووری، گەر زەدەی هیجری: واتە فەرموو بۆ لای من، ئەگەر تۆ ئەنگاوتەی ئازاری دووربوونەوەیت- یا- دووریت لە من.
خەیلێ: زۆر (حەیلی)ش دەبێت،
موشتاقی دیاتەن: ئارەزوومەندی دیدار (دیەت) چاوپێکەوتن و، بەیەکگەیشتن وەک من چۆن

ئارەزووومەندی دیدارتم.
دیاتەن: دیدەنی تۆ، دیدار و چاوپێکەوتنی تۆ.
هیجری: ئەم وشەیە لە نێوان باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا مەبەست لە (دووری) و (جیایی)یەو لەم نیو باڵی دووەمیشدا مەبەست لە یەکێ لە دوو (نازناو)ەکەی شاعیرمان (کوردی)یە.
قەدەم (مس): قدم
ڕەنجە (مس) رنجە.
زەدەی (مس): زدَي
موشتاقی دیاتەن (مس) مشتاق دیاتن.
لێرەدا پێشکێشکردنی (تاسەنامە)کەی کوردی بەلێکدانەوە و بەراوردکاری و لەسەر دواندنییەوە کۆتایی هات و نۆرەی پێشکێشکردنی وڵامەکەی (صەیدی دووەم)ە بۆ کوردی شێوەزاری گۆران.
سەرچاوەی ئەم وەڵامەش (مس)ە کە خودی (صەیدی) بەدەسنووسی خۆی لەم کەشکۆڵی (مس)ەدا وە بەدەسنووسی خۆی نووسیویەتەوە.
لەو دیوانە چاپکراوەدا هەڵبەستەکەی (کوردی) نەنووسراوە، کەوا دیارە (مامۆستا کاردۆخی) یا دەستی نەکەوتووە یا چاپکردنی بەپێویست نەزانیوە و، کەمێک شتێکی لە بارەیەوە ڕاگەیاندووە کە گوایە (صەیدی)(٢٠) ساڵ لە (کوردی) بەتەمەنتر بووە بەڵام وەک خۆی بۆی ساغ بووەتەوە کە (کوردی)(دوو ساڵ) لە (صەیدی) گەورەتر بووە.

**ئەمیش هەڵبەستە وەڵامەکەی (صەیدی)یە بۆ (کوردی):**

١- هیجری نەزانان، هیجری نەزانان
تۆ بەحاڵی دەردی ئێمەت نەزانان.
٢- من (صەیدی) سەردار سوپای دیوانان
کوشتەی دەردی عشق زەدەی هیجرانان
٣- تا وانام (کتاب) دەرسی عشقم وەند
مۆری دڵ بەسەجع، نابی عەشقم کەند
٤- جە مەکتەبخانان، تاقە مەشقم کەرد،
عالەم مەزانان مەشقی عەشقم کەرد.
٥- تاکە (جوان)بیم، نەسەودای یار بیم
هەدای عەشقم بی (پەوچی) سادار بیم
٦- بەسادار، عەشق یاوام بەپیری
ئەصلا ڕام نەکەوت من وەلای ژیری

٧- وەهـاری عـــومـــرم، جـــوانیـم ویـەرد.
گـاچـەنی هـیــجـران گـا بەداخ و دەرد
٨- هـەر شــێت و ســادار بیــابان گـێل بیم
چمــان من جـادار، مــەجنوونی وێڵ بیم
٩- (صـــەیدی) تـا زینـدەن، چەتـۆی دەردەوە
بوون مـەجنوون وێڵـەن بەڕووی هـەردەوە.

................................................................

٣- «واتە: تاتوانیم پەڕاوی دەرسی عەشقم خوێندەوە و عەشقم وەک مۆر لەسەر دڵم هەڵکەند»
٤- «واتە لە خوێندنگاکاندا مەشقی عەشقم کردووە و هەمووش ئەمە دەزانن»
٥- «واتە: هەتا گەنج بووم لە پەیکاری عەشق بووم بۆیە وێڵی (پەوچی) شوێنان بووم»
٦- «واتە: بەهۆی عەشقەوە مامەوە هەتا پیر بووم. لە ژیانما ڕێم نەکەوت بەلای ژیرییەوە»
٧- ویەرد: تێ پەڕی
چەنی: لەگەڵ
٨- چمان: چونکە.
جادار: جێنشین

## عشـق اگر

١- عــشق، صــد بار جگر پاره کند، هجــر چرا؟
هجـر اگـر قسـمت باشـد؛ برود (صـبـر) چرا؟
٢- خــانـهء صــبــر، چو برباد شــد از فــرقت تو
إلتــفـــات بەدر زید و عـــمـــر ســوی چرا؟؟
٣-ســوزش عــشق چـو شــمــعم نگذارید و هـنوز
خـام گـوئی تومـرا، جـان من، این زجـر چرا؟
٤- زلف تـو، بـاگـــــردن دل، ربط قــــديمـی دارد
قطـع این ربط بەمــحض ســحن غــیــر چرا؟؟
٥- سـرگـرانی بـەمن سـوخـتـەات، بی انصـافـيت
رحم اگر نیست، به این بسته زبان، کبر چرا؟؟
٦- تو بـه تیـر مـژه، یا ابروی شـمــشـیـر مـثـال
می کنی صـیـد دگـر چشم، بگو سـحـر چرا؟
٧- (هجـريا)، زاهـد عـيـار بگفت، انچـه کـه گـفت
باری ارمـا بـەمــسلمـــان به کند، گــبـر چرا؟؟

---

١- هەڵبەستە (فارسی)یەکانی (کوردی) کە لەم هەڵبەستەوە دەست پێدەکەن، (دەقی هەڵبەست)ە فارسییەکانم لەسەر شێوەی (نووسینی فارسی) نووسیونەتەوە. سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە فارسییە (عن، چ، ق/٣)یە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
ئەمیش لێکدانەوەی وشە فارسییەکانی ناو ئەم تاکەی سەرەوەیە.
عشق: دڵداری، ئەڤین، ئەوین.
صد: ژمارەی سەد (١٠٠)، سەدە.
بار: جار، بار.
جگر: جەگەر، جەرگ.
پارە: لەت، پارە پارە، لەت لەت،

کند: بکات- مەبەستی لەوەیە (جگەر پارە پارە بکات).

هجر: دوورکەوتنەوە، هەڵاتن.

چرا: بۆچی، لەبەرچی، بۆ، بۆچ.

گر: ئەگەر.

قسمت: بەش

باشد: ببێ.

برود: بڕوات مەبەستی لە ڕۆیشتنی ئارام (صەبر)ە.

صبر: ئارام (سەبر) پشوو.

خاوەنی ئەم هەڵبەستە:

لە سەرچاوەی (ح)دا ئەم هەڵبەستەی سەرەوە ئەم سەرە ناوە فارسییەی دوایی دراوەتێ: (من کلام سەید فەیضوڵلای موکری): واتە لە هۆنراوە (فەرمووده)ی سەید فەیضوڵڵا موکری)یە، بەڵام لە دوو سەرچاوەکەی تری ئەم هەڵبەستە (عن، ق/٣)دا بەناوی (کوردی)یەوە نووسراوە- کە بە باوەڕپێکراوی ئەم دوو سەرچاوەیە وە شارەزایی نووسەرەکانیان من جارێ لێرەدا بەناوی (کوردی)یەوە، نووسیومە و هەر کاتێ دەرکەوت کە هی (کوردی) نییە، بەپێی سەرچاوەی تر ئەوا جێگەی خۆی دەگرێ و مایەی کامەرانیمە؛ چونکە لەم پەڕاوییەدا تەنیا لایەنی ڕاستی گرتنم داوە و مۆرکی (کوردی) بەم هەڵبەستەوە هەیە.

**واتای تاکە هەڵبەستەکە:**

کە عەشق سەد جار جگەر پارە پارە بکات، ئیتر دوورکەوتنەوە بۆ چییە؟

ئەگەر بەش (نصیب) دوورکەوتنەوە بێ ئیتر ئارام لە ئەمان بۆ چییە؟؟

٢- خانەء: جێگەی، خانووی، خانەی، شوێنی.

صبری، پشوو، ئارام، خۆڕاگری، بیندرێژی.

چو: کە چون، کاتێ کە.

برباد (بەرباد): بەرباد، لەناو چوون.

شد: بوو، وەک: بەرباد بوو.

از: لە، بەهۆی.

فرقت: جیابوونەوەی، دووریتی.

تو (توو): تۆ، ئەتۆ، تە، ئەتوو.

إلتفاتی: لا لێکردنەوەیەک، ئاوڕلێدانەوەیەک.

بەدر: بۆ دەرگا، بەرەو دەرگای.

زید و عمر: دوو ناوی دوو کەسی نێرینەی عارەبن، کە یەکێکیان (زەید) و ئەوی تریان(عەمر)ە، لە وێنە (نموونە)ی دەستوور زمانی هێنانەوەدا وەک:

زەید هات و چاوی بە عەمر کەوت، عەمر کوڕی زەیدە. زەید و عەمر دوو بران، عەمر زەیدی بۆڕ دا.

سوی: بەرەولای، ئەلای، بۆ لای، بۆکن.

چرا: بۆچی- لە تاکی یەکەمدا لێکم داوەتەوە و ئیتر دووبارەی ناوێ.

**واتای ئەم تاکە:**

ئەگەر بەهۆی دووریی تۆوە ئارام لەبەر ببڕیت و خانەی ئارام بەرباد ببێ ئەوا:

ئیتر چاوبڕینە دەرگای کەسانی وەک زەید و عەمر لە پای چی و بۆ چییە.

ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکی دووەمەیە لە سەرچاوەکانیدا:

شداز لە (ح) دا نووسراوە: (کند). کەئەمەش ناگونجێ.

شداز لە (ق/٣) دا نووسراوە: (شودار= شەوەد ئەر) ئەمیش وەک ناگونجێ لەنگیشی ئەکات.

خانەی لە (ق/٣)دا نووسراوە خانە- کە ئەمیش لەنگە.

إلتفات لە (ق/٣) دا نووسراوە: استعانە (ئیستیعانە) ئەمە دەگونجێ و لەبەرئەوەی دوو سەرچاوەکەی تری ئەم تاکە (ئیلتیفاتی)یە، بۆیە چاکم نەکرد، ئەگەر چی (ئیستغاثە) بەجێترە.

عمر لە (ح، ق/٢)دا نووسراوە عمر و ئەمیش لەنگی دەکات و نادروستە.

٣- سوزش تین و تاوی، سووتێنەری سووتانی عشق- لە پێشەوەی ئەم تاکەدا لێکم داوەتەوە.

چو: دیسان.

شمعم: مۆمم وەک مۆمم. واتە وەک مۆم دام نەگرسێنی.

نگذارید: دام نەنێی و دام نەگیرسێنی و بمتوێنیتەوە.

هنوز: هێشتا، ئێستا، هێشتا کونێ.

خام (خاو)، پووچ، هیچوپووچ، بێهۆدە، خاو.

گوئی: دەڵێیت، پێم دەڵێیت وەک بێهودەم، پێ دەڵێت، بە ناپوختەم ناو دەبەیت.

تومرا: تۆ بەمن وەک تۆبە من بێ هوودە دەڵێیت. پێم دەڵێیت ناپوختەی

جان من: گیانی من، ئەی گیانەکەم.

این: ئەم، ئائەم.

زجر: سزا، ئەشکەنجە، جەخار.

چرا: لێ کدراوەتەوە.

**واتای ئەم تاکە:**

ئەگەر لە سۆزشی ئەوینی تۆدا (ئەی دڵخوازەکەم) بمکەیتە مۆم و بمتوێنیتەوە بەدەم سووتانەوە. ئیتر هێشتا:

بۆچی بە خاوو ناپوختە و چاک نەسووتاوم دادەنێت، ئەی گیانەکەم من ئاخر ئەم سزادانەمت بۆچ و لەبەر چییە.

گوئی له (ح) دا نووسراوه: (کویی)
جان من له (ح، ق/٣) دا نووسراوه: (جان خود)
٤- زلف (زولفی): زولفی، ئەگریجەی.
تو (توو) لێکدراوەتەوە.
با (با): لەگەڵ
گردن (گەردەنی): گەردنی، ئەستۆی، ملی، سکوردی.
دل (دل): دڵ.
ربط: ڕوشتە، پەیوەندی، بەندیواری.
قدیمی: دێرینەیی، کۆنی، زووەکەیی.
دارد: هەیەتی: وەک پەیوەندیی کۆنی هەیە.
قطع: پچراندنی ، بڕینی، پساندنی.
این: ئەم، ئائەم.
بەمحض: هەر لەبەر، تەنیا بەهۆی.
سخن وتنی، گوتنی، قسەی، وتەی، ئاخاوتنی.
غیر: بێگانە، بیانی
واتا:-
تای مووی زولفی تۆ و گەردنی دڵی من، پێوەندییەکی دێرینەیان لە نێواندایە، ئیتر پساندنی ئەم پەیوەندییە، هەر تەنیا لە بەرقسە (چوغوڵی)، (تێچاندنی) بێگانە لەبەرچی و بۆچ و بۆ لێکیان جیا دەکەیتەوەو دەبا ئەم دڵە بەتای مووی زوڵفەوە هەڵواسراو بێ، لێکیان مەکە، جیایان مەکەرەوە.
تو با (توو با) لە (ق/٣ دا نووسراوە)تن
دل لە (ح، ق/٣)دا نووسراوە (من: واتە مەن.
٥- سرگرانی: ڕق، قین، خەمساردی، گوێ پێ نەدان.
بەمن: بە منی، بەرامبەر بە منی
سوختەات: سووتاوت (لەناو ئەڤێن)
بی انصافیت: ناڕەوایە، بێ ئینسافییە.
رحم: نەوازش، چاودێری، بەزەیی، دڵسۆزی.
اگرنیست: ئەگەر نییە.
بەاین: ئابەم، بەم، بەئەم،
بستەزبان: بەسەزمان، زمان بەستراو، بێچارە،
کبر: خۆ بەگەورە زانین، خۆ بەزل دانان، فیز، لووت بەرزی، لە خۆبایی بوون، پۆز، خۆ بەمەزنکردن

**واتا ئەم تاکە هەڵبەستە:**

ئەم خەمساردی و ڕق هەڵگرتنەت، بەرامبەر بە منی سووتاوی دڵداریت، بێ ئینسافییە.
جاتۆ، ئەگەر هەر بەزەییشت بەم بەسەزمانە بێچارەیەدا نایەتەوە، ئیتر ئائەم خۆ بە زلزانین و پۆزەت بەرامبەر بەمن لە پای چی دایە و بۆچی؟

سوختەات لە (ح، ق/٣) دا نووسراوە سوختە، ئەمیش ناتەواوی و لەنگییە.

بستەزبان لە (ق/٣)دا نووسراوە نسبەزیان.

سرگرانی لە (ح) دا نووسراو: سرکرانی.

اگر لە (ح) دا نووسراوە: اکر

٦- تو بەتیری: تۆ بەتیری (گوللەی)

مژە: موژە، برژانگ، موژگ، مژولان.

یا ابروی یا ئەو ئەبرۆیەی.

شمشیر: شیر، شمشێر: ئەشێ ئەو برۆیەی کە لێی دواوە، پەیوەست (سێوەنگی) و پان بووبێ، چونکە ناوی (شمشێر)ی بردووە کە لە (شیر) پانترە.

مثال: وەک، چۆن، مانەند، هەروەک ، وەکی، وەکو

می کنی: دەکەی.

صید: ڕاوی، شکاری، نیچرڤانیی.

دگر: ئیتر، ئیکە، هی تر، هی کە

چشم: چاو، چەم، چاڤ وەک: چاوت ڕاو دەکا ئیتر.

بگو: بڵێ، بێژە،

سحر: جادوو.

**واتای ئەم تاکە:**

تۆ بەو تیری برژانگەت، یا بەو برۆی وەک شمشیرت کە ڕاوی دڵ دەکا، چاوت، ئیتر خۆت بڵێ جادووگەریت بۆ چییە؟

ئەمیش جیاوازییەکانی وشەگەلی ئەم تاکە هەڵبەستەیە لە سەرچاوەکانیدا:

می کنی (ح) دا نووسراوە: میکنی.

می کنی لە (ق/٣) دا نووسراوە: مکنی.

دگر لە (ق/٣) دا نووسراوە: دلم: ئەمەش جوان و بەجێیە و دەگونجێ.

دگر (ح) دا نووسراوە: (گر)

تو بە: تۆ بە. لە (ح، ق/٣) دا نووسراوە: یا، بە.

تو بە لە (ح، ق/٣) دا نووسراوە: مژەو (موژوو)

بگو لە (ح) دا نووسراوە: بکو- ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

٧- (هجريا): ئەی هیجری، واتە ئەی ئەو کەسەی کە ناوت (هیجری)یە.

زاهد: ئەوی بەسەرزاری گۆشەگیر و خۆ بەخواناس نیشاندەرە درۆزنە- ئەم بەکارهێنانی (زاهید) و توانج تێگرتنەی کارێکی لاساییکارانەی هۆنەرانە لە هەڵبەستەکانیاندا ئەگەرچی مەبەست لە (نەیار)ە بەڵام ئەشێ لە ڕاستیدا مەبەست لە کەسێکی دیاریکراو بێ لەو سەردەمەی (کوردی)دا کە نەمزانی کێیە.

عیار: فێڵباز، ساختەچی، کەڵەکەباز، تەڵەکەباز، ئەوی خۆی بەپێی کات و شوێن دەگۆڕی، واتە (هەلپەرست) کە مەبەست لە (زاهید)ەکەیە و لە وێژەی کۆن (کلاسیکی) دا هۆنەران زۆریان لەم جۆرە دەربڕینانە لە هەڵبەستیاندا ڕاگەیاندووە.

بگفت: گوتی، وتی.

انچە: ئەوی، ئەوەی، ئەوەکەی.

کە گفت: کە گوتی، کە وتی.

باری: دەبا، کەواتە، ئیتر، ئەمجا، سائیتر، باری ، ئینجا، قەمی، دەسا، سا ئەگەر.

ئەگەر، خۆ ئەگەر.

ارما: ئەرێ ئێمە، ئەگەر ئێمە.

بەمسلمان: بە ئیسلام

نکند: نەکات، دا نەنێت، نەزانێ.

گبر: ئەمە و وشەیەکی کۆن و ڕەسەنی چەند هەزار ساڵەی کوردییە و بەم (فارس)یش بەکاری دەهێنێ، بە واتە (فەلە- پێڕەویکارانی (عیسا) پێغەمبەر- (د.خ) ئەم وشەیە هەرگیز بە واتەی وشەی (کافر)ی (عەرەب) بەکار نەهاتووە و لەم وشەی (کافر)ەوە نییە کە لە (کوردی)دا وشەی (گەبر) بەشێوەی (گاور) واتە (فەلە)یش بەکاردێ کە بەداخەوە هەندێ کەس لە ناشارەزایی و دڵڕەشییەوە بە (کافر) لێکی دەدەنەوە.

**واتای ئەم تاکە هەڵبەستە:**

ئەی هیجری (کوردی) کە (زاهیدی عەییار) ئەوەی دژی من گوتی، بەڵێ گوتی. بەڵام ئایا ئەو کە منی بە (ئیسلام) دانەناوە. ئیتر بۆچی بەگەبر(گاور فەلە)ی داناوم.

**هەڵسەنگاندنی ئەم هەڵبەستە:**

داڕشتن و زمانی (فارسی) بێگەردی ئەم هەڵبەستە بەڵگەی هەرە شارەزایەتیی (کوردی)یەو بەتێکڕایش ئەم دەقەی دەس من کەوتووە و لە سەرەوە جێگرم کرد، شێوایی یەکجار کەم پێوە دیارە و جگە لەوەی بیری ناوەڕۆکی تاکەکانی زۆر بەهێز و هۆنەرانەو زانایانەیەو، وەستاکاری و مۆرک و چێژی هەڵبەستی کوردیی پێوە دیارە. کە لە هەڵبەستانی تریدا هاوچەشنی ئێرەن.

١١٨

## أیەء قران

١- اَیەء قـــــران، کــــه جـــــانا دلکش است
شش هزار و ششصد و شصت و شش است
٢- یک هزارش، (وعــد) و یکی دگــر (وعـــیــد)
یک هـزارش، (أمـــــر)، یک نـهی شـــــدید
٣- یک هزارش، قـــصــه هایی جــانفـزاست
یک هـزارش، نعت پاک مـــــصطفی است
٤- پانصـــــدش بحث حـــلال است و حــــرام
صــد دعــای (ذکــر) و (ورد)ی صــبح و شــام
٥- شصت وشش شد (ناسخ) و (منسوخ) کتاب
خـــــتم شـــــد والله اعلم بالصــــــواب

.................................................................

١- اَیەء: قورئانی پیرۆز.
ئایەت: ڕستـەیەک لە قـورئانی پیـرۆز، لە هەمـان کاتیـشدا واتای (مـوعـجـیزە)ش دەدات کـە مـەبەست لـە کـاری لە ڕادەبەدەرە، بەو بـڕوایەی کـە قـورئانی پیـرۆز فـەرمـوودەی خـوایە و، لە توانای مرۆڤ بەدەرە کە لەو جۆرە دەقەی بۆ دابنرێت.
قرآن: ناوەڕۆکی ئەو پەڕاوییـە پیـرۆزەیە کە بەهۆی (جـبـرەئیل)ی سـەرۆکی فریشـتـەکانەوە لە خوای مـەزنەوە بە پێغـەمـبـەری ئیسـلام، محـەمـەد کوڕی عـەبدوڵڵای قـوڕەیشـی ڕاگەیەنراوە و ئەویش بە (دەمی) بە ئیسلامەکانی گوتووە ئەم پەڕاوییە پیرۆزە. لەسەرێنی خەلیفەی عوسمانی کوڕی عەفاندا کۆکرایەوە.

**واتای ئەم تاکە:**

گیانەکەم ئایەتەکانی قورئان دڵگیرن بە ژمارە (٦٦٦٦) ئایەتن، ئەو جـۆرە خوێندنەوەیە درێژ دەخایەنێ. و ئاسانکاری نییە لە (نووسین) و (خوێندنەوە)یشدا.
کە جانا: کە ئەی گیانەکەم.
دلکش است: واتە دڵکێشە، دڵگیرە.
شش هزار و ششصد و شصت و شش: شەش هەزار و شەشسەد و شەست و شەش (٦٦٦٦)
٢- یک هزارش: یەک هەزاری، واتە لە ئایەتەکاندا.

وعد و: بەڵێن، کە مەبەست لە بەڵێنەکانی خوای مەزنن، بۆ پاراستنی چاکەدانەوەی خەڵکی کە لە ژیاندا چاکەکار و خواپەرست بوون بەپێی گەلێ لەو ئایەتانە لەوانە ئایەتی (٩)ی سوورەتی (ألمائیدة)و (٧٢)ی (النور) و (١١) ی (مریم) و (٥٥)ی (النور) و (٢٩)ی (الفتح)و (٢٦٨)ی (البقرە) و (٣٠)ی (فُعِّلت)و... هتد، کە خوای گەورە مژدەی لێ خۆش بوون و (بەهەشتی) بە چاکەکەران و خواپەرستان داوە.

یەکی دیگر: یەکێکی تر لە ئایەتەکان.

وعید (وەعید): واتە هەزارێکی تر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز (وەعید) جۆرە بەڵێنێکی هەڕەشەئامێزە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە کەسانی نافرمانکارانی خواوە سزادانیان بەرامبەر بە ڕەوشتی خراپیان لە ژیانیاندا، کە خراپ و یاخی لە فرمانی خواو ناپاک و دووبەرەکیکاران کە (بەڵێن)ی خۆیان لەسەر دراوە بۆ سووتاندنیان لەناو ئاگری دۆزەخداو بگرە لە خراپترین شوێنەکانی ناو (دۆزەخ) دا کە (وەیل) و (بیئسەلمەصر)ەم.

لە ئایەتە (وەعید)ییەکان: ژمارە (٦٨) ی(التوبە)، (٧٢)ی (الحج)، (٦٣)ی (یسن) و، (٦٠)ی (الذاریات) و (٦٣)ی (طە)، (١٤، ٢٠، ٢٨)ی (ق) وە (١٤)ی (ابراهیم)و... هتد. کە خوا هەڕەشەی لە گوناهبار و تاوانکارەکان کردووە لەو ئایەتانەدا.

یک هزارش امر: یەک هەزاریش (لەو ئایەتانە) فرمانی خوایە، بەڕێگەی ڕاست گرتن و چاکەکردن وەک لە ئایەتەکانی: ژمارە (١١٠)ی (ئال عمران) و (١١٤، ١١٩، ١٥٧)ی (الأعراف) و (٦٧، ٧١، ١١٤)ی (التوبە) و (١٧)ی (لقمان) لەبارەی (الامر بالمعروف والنهی عن المنکر)ەوە واتە فرماندان بەکردنی چاکە و نەهیکردن لە کردنی خراپە.

لێرەدا (ئەمر= فرمان) مەبەست لەوەیە کە ئاین بانگەوازی بۆ کردووە کە پڕ بە دڵ و بە زمان و بە کردەوە جێبەجێ بکرین.

یک نهیە، شدید، واتە یەک هەزاری تر لە ئایەتەکان بەتوندی نەی لێ کردنە لە خراپەکاری.

واتای ئەم تاکە: هەزار لە ئایەتەکان لەبارەی بەڵێنی خواوەند و هەزارێکی تری فرمان بەچاکە و نەی لە خراپەیە.

٣- یک هزارش قصە هایی: هەزارێکی تری ئایەتەکانی قورئان لەبارەی داستان و چیرۆکەها و سەرگوزەشتەوەن)

جانفزاست: دڵ و دەروون (گیان)کەرەوەی گیان ئاوەدانکار و خۆشن.

مەبەست لەو سەرگوزەشتە خۆشانەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون وەک سەرگوزەشتەکانی (باوکە ئادەم) و (دایکە حەوا) لە دروست کرانیان و ژیانی ناو بەهەشتیان و دەرکردنیان بۆ سەر ئەم گۆی زەمینە لەسەر بێ فرمانی کردنیان بەرامبەر بە فەرموودەکانی خوای مەزن.

ئەمجا سەرگوزەشتەی (نووح) و ملنەدانی گەلە نالەبارەکەی و ڕوودانی لافاوە گەورەکە و جێگیربوونی کەشتییەکەی (نووح) لەسەر شاخی (جوودی).

یک هزارش نعت پاک مصطفی است (یەک هەزاریش لە ئایەتەکانی قورئان) لەبارەی هەڵنان

و ڕەوشتی پاکی (موستەفا) واتە پێغەمبەری ئیسلامەوەیە- د.خ-
نعت: هەڵنان و بەجوانی دوانن لە خوو و، ڕەوشتی بەرزی ئەوەوەن، واتە باتەقای دوانن لەو هەموو پێغەمبەرانە هەر تەنیا لە پێغەمبەری ئیسلام دواوە.
نعت (عن): شەرع. ئەمیش پڕ بەپڕ نییە چونکە سەرپاکی قورئان خۆی (شەرع)ی ڕاستییە. واتە دەستووری ئاینی ئیسلامە، کەواتە بۆ ئێرە (نەعت) ڕاستە هەروەها ئەم هەردوو نیو باڵییەی سەرەوە لە (عن) دا پاشوپێشن.
٤- (پانصدش بحث حلال است و حرام): واتە پێنج سەدی بابەتی (حەڵاڵ و حەرام)ە.
حلال: ئەوەیە کە لە (دەستووری شەرعی ئیسلامدا ڕێگەی کەڵک لێ وەرگرتنیان دراوە کە کەڵکدار و بێ زیاین و لە کەڵک لێ وەرگرتنیاندا خوا و کەسان پێیان ناخۆش نییە و زیان بەکەس ناگەیەنن. حرایەتەکان برێتین لە نزا و لە خوا پاڕانەوە.
دعا: نزا، پاڕانەوە لەخوای مەبەستە کە سەد ئایەتە لەبارەی (دوعا = نزا) وەن کە لەڕووی زمانییەوە (دوعا) بە واتە (بانگ کردن)، (تاسە)و ئارەزوومەندی، (هانا بەبەربردن)، (نزا)، (پاڕانەوە)، (ویستن) وە (خواست) کە ئەمیش یا بە (دل) یا بە (زمان) ئەبێ هەروەها بە نووسینی چەند ئایەتێک و بە مەبەستی تایبەتی کە بە کوردی (دوعا = نوشتە)ی پێ ئەوترێ. یا بەدەم وەک بەسەر نەخۆشدا دەخوێندرێ بە ئاواتی چاک بوونەوە لەلایەن چاکانەوە.
٥- شصت وشش شد: بوو بە شەست و شەش (واتە لە ژمارەی ئایەتەکان).
ناسخ و منسوخ کتاب کە ناسیخ ناوی ئەو ئایەتانەیە کە کاریگەریی ئایەتی تری کە بەر لە خۆی هاتوون، پووچ دەکاتەوە و ئیتر کاریان پێ ناکرێ و پەیڕەوی ناکرێ.
منسوخ: ئەو ئایەتانەن کە بەهۆی هاتنی ئایەتەکانی (ناسخ)ەوە لە کار خراون.
کتاب: مەبەست لە قورئانی پیرۆزە کە کیتاب بەواتە پەڕاوی یا (نووسراوە)
ختم شد: واتە کۆتایی هات کە مەبەستی لە تەواوبوونی ئەم پارچە هەڵبەستەیە، کە لەبارەی (چەند و چۆنی) ی قورئانی پیرۆزەوەیە.
والله اعلم بالصواب واتە خوا ئاگادارترە و زاناترە بەڕاستی، کە ئەم ڕستەیەش ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سوورەتی (النباء)ە کە (کوردی) کردوویەتی بەنیوەی دەقی ئەم تاکە هەڵبەستەی؛ کە (کوردی) بۆ ئەوەی خۆی لە بەرپرسیاری ناڕاستی هەڵبەستەکەی ڕسگار بکات، نیشانەی بۆ ئەم ئایەتی نیو باڵی دووەم کردووە کە ئەگەر گوایە (کوردی) هەڵە بێت بەڵام خوا ڕاستیزانترە ئەوەبوو لە سەرەتای یەکەمین تاکی ئەم هەڵبەستەدا، نیشانەم بۆ جیاوازیی بیروڕای سەرچاوەکان کرد لە دیارکردنی ژمارەی ئایەتەکانی قورئاندا و (کوردی)یش لەبەرئەوەی خۆی ڕسگار کردووە لەوەی کە ئەگەر دیاریکردنی ژمارەکانی ئایەتی قورئانی بەڕاستی ڕانەگەیاندبی کە نووسیویە.
هەرچەندە من ئەمانەم ڕاگەیاندن بەڵام ڕاستییەکانی خوا چاکتریان دەزانێ.
شد ناسخ و منسوخ کتاب (عن) ناسخ و منسوخ.
ختم شد (خەتم شود): (عن) ختم کن (خەتم کردن وایە کۆتایی پێ بهێنە).

119

## خوبرویان سنندج

خـــوبرویـان سنـندج لایـقـنـد
برسر خورشید تابان فایقند
با همـه ناز و نزاکتهـایشـان
بندهء شاه (محمد صادق)ند

............................................................

ئەم چوار باڵییە (فارسی)یەم لەم دوو سەرچاوەوە وەرگرتووە، بە(بۆنە)ی دانانەکەیشیەوە.

**سەرچاوەی یەکەم:**

لە ساڵی ١٩٤٦ز دا لە (هەڵەبجە) کەمال باپیر ئاغا، ئەم چوار باڵییەی (کوردی) و بۆنەکەی پێ ڕاگەیاندم.

**سەرچاوەی دووەم:**- گۆڤاری (بەیان) ژمارە (١٨)ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ز، کە لە بەغدا دەردەچوو.

لەو گۆڤارەدا (محەمەد ئەمین کاردۆخی) لەژێر سەرەناوی (کوردی و جوانانی سنە)دا ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی بە ڕوونکردنەوەی بۆنەکەیەوە نووسیوە کە لەدوای لێکدانەوەی وشە (فارسی)یەکانی چوار باڵییەکەوە، (بۆنە)ی ئەم هەڵبەستە لە هەردوو سەرچاوەکەوە ڕادەگەیەنم، لەگەڵ بۆچوونی خۆمدا لەسەر ئەو ڕوونکردنەوانە.

ئەمیش واتای وشە (فارسی)یەکانە:

خوبرویان: ڕوخسار جوانان، جوانەکان.

سنندج: شاری (سنە) لە کوردستانی ئێران کە شاری زانست و هونەرە لە کۆنەوە بەشوێنی لێ پەیدابوونی سەدان زانا و هونەر و هونەرمەند و وێژەوان بەناوبانگە. هەروەک بنەچەی (کوردی) کە خانەوادەی (صاحێبقران)ە لە (ئەحمەد بەگی صاحێبقران- ئەحمەد بەگی گەورە)وە لەو شارەی کوردەوە گواستوویانەوە بۆ ناو فەرمانڕەوایی (بابان).

لایقند: شایانن، ئەو ڕوخسار جوانانەی(سنە) شایانی ئەوەن بەڕاستی و بەجوانی و لێهاتوویی ناوببرێن. ئەم (شایان)ێتییە بەمەبەست لە کچە جوانەکانی شاری (سنە)بووە کە وەک دواتر دەردەکەوێ کە (والیی سنە) لە هۆڵێکدا کچەکانی بەڕیزە لەلایەکەوە دای نابوون و بەرامبەریان کوڕە جوانەکانی (سنە)ی بەڕیزەی دانابوو تاکو (کوردی)بێت بەناویاندا تێ پەڕی بۆ ئەوەی (کوردی) بجووڵێن بزانرێ هەستی بەلای کام (کچ) یا (کوڕ)ەکاندا دەجووڵێ و هەڵبەستیان بەسەردا هەڵئەدات.

برسر: بەسەر.
خورشید تابان: ڕۆژی درەخشان، واتە تیشکدەر (ڕووناک) خۆری پەڕتەودار.
فـایقند: سـەرکـەوتوون. واتە لە جـوانی و پەڕتـەوداریدا ئەو کـچـە جـوانانە بـەسـەر ڕووی درەخشـاندا سـەرکەوتوون ئەوەندە جوان بوون.
واتای تاکە هەڵبەستی یەکەم:
کچە ڕوخسار جوانەکانی (شاری سنە) لە جوانیدا بەڕاستی لێهاتوون و شایانی بە(جوان) ناوبردنن.
هەر ئەو کچانە لە جوانیدا بەسەر جوانێتیی ڕۆژی درەخشاندا زاڵ و سەرکەوتوون.
وشەکانی تاکە هەڵبەستی دووەم کە لە سەرەتاوە نووسراوە:
باهمە ناز و نزاکتهایشان: لەگەڵ ئەو هەموو ناز و ناسکی و جوانییاندا.
بندەء شاە (محمد صادق)ند: بەندەی (کارەکەری) پاشایەکی وەک (محمد صادق)ن، واتە ئەو کچـە جـوان و هـەرە لێـهاتووانـە هێشـتا هـەر کـارەکەر (کـەنـیـزەکی) پاشـایەکی (لە جـوانـیـدا پاشا)ی وەک (محمد صادق)ن.
تا نیـو باڵی سـێـیـەمی ئەم چوار باڵەش، هـەر لە بارەی هـەڵنان و بـەجوان و شـۆخ و شـەنگ و ناسک و نازەنینێتیی ئەو کچانەوەیە و تەنیا لە نیو باڵی چوارەمدا ئەو کـچانەی بەجوانی و لێهاتووییانەوە کردوون بە(کەنیزەک)ی لە جوانیدا پادشایەکی وەک یەکێ لەو کوڕانەی کە (والیی سنە) گردی کردبوونەوە بەرامبەر بەکچەکان لەو هۆڵی کۆبوونەوەیەدا دای نابوون کە ئەویش (محمد صادق) ناوێک بووە.
(مـحـمـد صـادق) کـۆیلە و بەردەسـتـێکی جـوان و قـۆز و دلاوەر و چەلەنگی دیوەخـانی (ئاصـەف)بووە لە شـاری (سنـە)وە کـە ئەو (ئاسـەف)ە زۆر برادەری (کـوردی)بـووە جـاران لە کۆنەوە هەتا سـەرەتای سـاڵی چلەکـانی چەرخی بیسـتـەمیش زۆربەی پیاوانی کـوردسـتـان و بەتایبـەتی خـاوەن زەویوزار و سـامـاندار و بازرگانان و، خـاوەنی گوندان و کوێخـاکان لەمـاڵی خۆیاندا دیوەخانیان هەبووە، هەمیشە (خۆشـاو) و (قاوە) و (چا) و (چەرەس)ی تیادا دراوە و، و ئەوی ئەو شتانە و ئاوی گێڕاوە هەمیشە کوڕی قۆز و دلێر و جوان چاک و لاوی قشت بوون، وەک ئەو (محمد صادق)ی دیواخانی (ئاصەف)ە کە بەجوانی بەناوبانگ بووە.
لە چوار باڵەکەدا تەنیا ئەم چوارەمین نیو باڵەی دوایی لـەمەڕ هەڵنـانی کوڕێکی وەک محـەمـەد صادقەوەیە و سێ نیوباڵییەکەی پێشوو، وەک ڕامگەیاندن لەبارەی جوانێتیی کچەکانەوە بوون.
لێکدانەوەی تاکی دووەم:
لەگەڵ ئەو هەموو ناسکی و نازدار و نـازەنینێتییـەی ئەو کچە شـایان بە(جوان ناوبران)انە کە بەسـەر ڕۆژی درەخشـاندا زاڵ بـووە لە جوانیـدا هێشـتا ئەو تاقـمە کـچـە جوانانـە هـەربەندە (کارەکەر و کەنیزەیەکی) (محمد صادق)ەکە بوون لەجوانیدا.
ئاگـەدارییـەکـانی ئەو لێکدانـەوانەی سـەردەم، لە هـەردوو سـەرچاوەکـەی ئەم هـەڵبـەسـتـە

چواربالّییەوە وەرگرتوون، بەم جۆرەی دوایی پێشکەشیان دەکەم:
ناوەرۆکی هەردوو سەرچاوەکە:
(مامۆستا عەلی کەمال باپیر ئاغا) بەدەمی ئەو چوار بالّییە و بۆنەکەی پێ ڕاگەیاندووم و، (مامۆستا محەمەد ئەمین کاردۆخی) کە چواربالّییەکە و بۆنەی گوتنەکەی لە گۆڤارە ناوبراوەکەدا بلاوکردووەتەوە، وا دیارە هەردوو لایان بۆنەی هەلّبەستەکە و چواربالّییەکەیان (وەک یەک) وەرگرتووە، بەلاّم هەر کەسەیان بەشێوەی دەربڕینی خۆی ڕای گەیاندووە.
مامۆستای کاردۆخی نووسینەکەی بەمەی خوارەوە دەست پێ کردووە:
«مستەفا بەگی کوردی لە سنە حەز لە کوڕێک دەکات ناوی (محمد صادق) بووە».
من (حەمە بۆر) پێشتر لەم دیوانەدا ڕای خۆم لەم پێوەندییەدا دەربڕیوە.
بەلاّم (مامۆستا عەلی کەمال باپیر ئاغا) لە ڕاگەیاندنی بۆنەی ئەم هەلّبەستەدا فەرموویەتی:
«ئەو محەمەد صادقە جوانە لەوەوە هاوالّی (کوردی) بووە کە (محەمەد صادق) کۆیلەیەکی بەردەستی ناو دیواخانی (ئاصەف)ی (سنە)بووە کە (کوردی) دۆست و هاوالّی ئەو (ئاصەف)ە بووە و لەوێوە (کوردی) محەمەد صادقی ناسیوە و (محمد صادق)یش وێژەوانێکی فراوان و هۆنەریش بووە و لەوەوە برادەرێتی لەگەلّ (کوردی)دا پەیداکردووە و خۆشەویستیی (کوردی) بۆ (محمد صادق) و هی (محمد صادق) بۆ (کوردی) لەو هاوبیرێتییەیانەوە بووە نەک حەز لێکردن و داوێن پیسی» و، باوبووە ئەو پیاوانەی دیوەخانان دەبوو وێژەوان بن.»
منیش (حەمەبۆر) وەک لە پێش ئەم دەقەدا ئەم ڕاستییانەی قسەکانی (مامۆستا عەلی کەمال)م ڕاگەیاند.
مامۆستا کاردۆخی نووسیویە:
«کوردی بۆ بینین و سەیرکردنی ئەو کوڕە زۆر جار دەچێتە مالّی ئاسەف و ئەو شوێنانەی کە ئەو جوانەی لێیە»
من (حەمەبۆر) جۆری حەزلێکردن و – سەردانی مالّی (ئاصەف) و والێتیی (کوردی) و (محمد صادق)م لە پێشەوە ساغ کردەوە کە نیاز خراپی لە کارەکەدا نەبووە.
مامۆستا کاردۆخی لە درێژە پێدانی نووسینەکەیدا چووەتە جەرگەی باسەکەوە و نووسیویە:–
«ئەم هەوالّی حەزلێکردنە ئەگاتەوە لای (والی سنە) وە بیستراویشە کە زووتریش حەزی لە (قادر) ناوێک کردووە».
من بەرامبەر بەم دەقەی سەرەوە ڕا دەگەیەنم کە نیوەی دوایی ئەم دەقە کە نووسراوە: بیستوویشم کە زووتر... هتد بێگومان ئەم نیوەی دووەمی دەقەکە خودی مامۆستا (کاردۆخی) خستوویەتە سەر باسەکەی (والی سنە) وەک لە باسی دیوانی کوردی چاپی (کوردی و مەریوانی) کردنمدا لە پێشەوە ڕام گەیاند دیارە مامۆستا کاردۆخی) ئەم نیوەی دووەمەی دەقەکەی لەو دیوانە و (دیوانی کوردی) چاپی (مامۆستا گیو)ە وەرگرتووە کە (مامۆستا گیو)

بەهەڵە ناوەڕۆکی دیوانەکەی (کوردی و مەریوانی) بەخستنە سەری خۆیەوە بەناڕەوایی و بەتێنەگەیشتنی ئەو هەڵبەستەوە کە بەهەڵە لێکیان داوەتەوە ئەمە نووسراوە.

(کوردی) پیاوێکی قسەخۆش نوکتە باز بووە (والی) بۆ گێچەڵ بە(کوردی) کردن و خۆشکردنی کۆبوونەوەیەک بوو بۆ جوولاندنی کوردی ئەو دەستەی (کچانی سنە) لە جوانەکان و کوڕە جوانەکانی سنە لەدیوەخانی خۆیدا گرد دەکاتەوە، وەک لێی دوام لێرە و دوایش لە ڕاگەیاندنی دەقی نووسینەکەی مامۆستا کاردۆخی پێشکێشی دەکەم کە (مامۆستا عەلی کەمال) لەم شوێنەی بۆنەی ئەم چوار باڵییەدا پێی ڕاگەیاندووم کە:

«والی سنە لە دیوەخانەکەی خۆیدا لەگەڵ گەورە پیاوانی سنە و، وێژەوانانەدا جارێکیان باسی (کوردی) و (حازر جەوابی) و قسە خۆشی (کوردی) دێتە ئاراوە و دانیشتوانی ناو دیوەخانەکە بەتێکڕایی لەسەر ئەوە ئەبن کە (کوردی) حەزی لە کوڕ نەکردووە و ناکات و بەشکو ئەو (قاو) بەبوختانێکی ناڕەوای ناحەزان دەزانن و بە(درۆ)ی ناو ئەبەن».

بەرامبەر بەو گفتوگۆیەی دیوەخانەکەی (والیی سنە) مامۆستا (کاردۆخی) نووسیویە:

«گەوران و دانیشتوانی دیوەخانی والی سنە دەڵێن:

ئەمە درۆیە و مستەفا بەگی کوردی ئەگەرچی جوان ببینێ بەکچەکان شیعر ئەڵێت و بەمانایەکی تر ئەگەر کچی جوانی بۆ دەست بدات کوڕی ناوێ».

ئەم دەقەی (مامۆستا کاردۆخی) لەبارەی ئەوەوە کە ئەو پیاوانەی میوانەی دیوەخانی (والی) بەیەک دەنگ و یەک ڕا دەبن لەسەر ئەوەی کە (کوردی) حەز لە کوڕ ناکات و بەشکو مرۆڤێکی ئاساییە و کچی دەوێت و، لە ژنهێنانی (کوردی)یەوە ئەو گومانەی لێ کراوە.

دیارە ئەو کەسانەش گەورە پیاوانی (سنە)بوون کە بێگومان لە (والی) زۆرتر و ڕاستتر ئاگاداری هەموو هەست و نەستی (شاری سنە)بوون و خانەوادەی خودی (مستەفا بەگی کوردی)شیان بەقووڵی و لە نزیکەوە ناسیوە، بۆیە ئەو گەواهییەیان لە (کوردی)داوە و پاکانەیان بۆ کردووە، کە ڕاست بوون لە ڕایەکەیاندا.

ئەو سەردەمەش لە شارێکی ئاینی و زانیاری پاکی وەک (سنە)دا (کوڕ بازی) کارێکی نەکردنی بووە بەتایبەتی بۆ کەسێکی وەک (کوردی) کە یەکێ بووە لە بەرزترین و بەناوبانگترین و مەزنترین و پاکترین خانەوادەی (سنە) کە (صاحێبقران) بووە. (مامۆستا عەلی کەمال) لێرەدا فەرموویەتی: «ئەو گەورە پیاوانە باوەڕ بە(والی) دەهێنن کە (کوردی) (کوڕباز)نییە و لەسەر ئەوە ڕێک دەکەون کە کۆڕێک پێک بهێنن کە کوردیش تێیدا بەشدار بێ» بەرامبەر بەم دەقەی سەرەوە (مامۆستا کاردۆخی) لە وتارەکەیدا نووسیویە:

«والی لە وەڵامی گەورە پیاواندا – ئەڵێ: تاقیکردنەوەی ئەمە شتێکی ئاسانە، بەیانی ئەینێرن بەشوێن (کوڕ و کچی جوان)ی (سنە)دا لەم تەلارەدا– کوڕان و کچان بەرامبەر بەیەکتر دانیشن، لە دواییدا ئەنێرین بەشوێن (کوردی)دا، بێت، بەم بۆنە

شیعر بڵێت، ئەگەر شیعری بەکچەکاندا وت، وا دەردەکەوێ کەوایە (وەک) وتتان و ئەگەر شیعریش بەکوڕەکانا وت هەر بۆمان دەردەکەوێ».

بەرانبەر بەم دەقە (مامۆستا عەلی کەمال) لەسەر ئەوە بوو کە «ئەم ڕێککەوتنە لە نێوان گەورە پیاوانی (سنە) و (والی)دا ڕووی داوە».

(مامۆستا کاردۆخی) دوابەدوای دەقەکەی پێشەوەی نووسیویە:

«بەڵێ بەیانی ڕۆژی دوایی، ئەو تەلارە، بەگوڵ و کوڕ و کچی جوان ڕازایەوە، ئەدیب و هاودەمی (والی)ش لە ژوور تەلارەکەوە دانیشتوون، دەستوپێوەندی (والی)یش لەو خوارەوە وەستابوون.

والی ئەمەی کرد، ناردیان بەشوێن (مستەفابەگی کوردی)دا، و کە هات سەیرێکی دانیشتوان و دانیشتنەکەی کرد و چاوی بە (محمد صادق) کەوت و پێکەنی».

(مامۆستا عەلی کەمال) ئەم دەقەی سەرەوەی (مامۆستا کاردۆخی) بەم جۆرەی دوایی بۆ گێڕامەوە:

«ڕۆژی دوایی ئەو ڕۆژە کە (والی) دەنگی دابوو، وێژەوانان و هۆنەران و گەورە پیاوانی (سنە)ی بانگهێشتی کۆبوونەوەی ناو هۆڵی کۆشکەکەی کردبوو، لەهەمان کاتدا گەلێ لە کچە جوانەکانی (سنە)و کوڕە جوانەکانیشی ئامادە کردبوون کە کچان بەڕیزێک بەرانبەر بەڕیزی کوڕان دانابوو ئەوجا ناردنی بەشوێن (کوردی)دا کە کابرا چوو بەشوێن (کوردی)دا (کوردی) کابرای دانا هەتا خۆی گرد بکاتەوە و بەدەم خۆ گۆڕینەوە دەستی برد بەخشیشێکی چاکی دا بەکابرا و گوتی: ئەوە لە ڕێگەی ماندووبوونتدا و لە مژدەی ئەوەدا کە من دەگەیەنی بە بارەگای (والی) و لە کابرای پرسی، کە هاتی بەدوامدا کێ لە «دیواخانی والی» بوو؟ کابرا ناوی دانیشتوانەکان و ڕیزکردنی کوڕ و کچە جوانەکانی بە (کوردی) گەیاندووە و گوتوویە لەناو کوڕەکاندا زۆر ماندوو بووین، هەتا (محمد صادق)مان دۆزییەوە، چونکە لە ماڵی (ئاصەف) نەبوو ڕۆیشتبوو بۆ ماڵی خەزوور و خزمانی و باسی وتوێژی دیواخانیشی بۆ کرد. (کوردی) لەم قسانەی کابرا لە فیتی خۆی گەیشت و زانیی ئەم کۆبوونەوەیە، داوێکە بۆی نراوەتەوە گورج لەگەڵ کابرادا گەیشتە دیوەخان».

وەک سەرنج دەدرێ ڕاگەیاندنەکەی هەردوو سەرچاوەکەی ئەم هەڵبەستە هەر یەکەی تەواوکردنی یەکترین و هەردووکیان تەواوکەری کارەکە و تاقیکردنەوەکەی (کوردی) بەساغ کراوەیەتی دەردەخەن و، (مامۆستا کاردۆخی) دوابەدوای دەقەکەی سەروو نووسیویەتی:

(کوردی گەیشتە دیوەخان سڵاوی لە هەموان کرد- چووە بەردەم والی و پێی وت: بەڕێز گەورەم- ئەم بانگکردنە- م- بۆ چییە؟

(والی) وتی: ئاهەنگی خۆشییە، حەز دەکەی شیعر بەم جوانانی سنە -یە- دا بڵێی».

(کوردی» دەستبەجێ هات، لە ناوەڕاستی ڕیزی کوڕ و کچەکاندا ڕووی کردە (کچەکان) و،

وتی:

(خوبرویــان سننـدج لایقند

برسر خورشید تابان فایقند

با هـمه ناز و نزاکتهایشان

ئەمجا ڕووی کردەوە بەلای (کوڕە)کانا و شیعرەکەی بەم جۆرە تەواو کرد:

(بندەء شاه (محمد صادق)ند.

دانیـشـتـوانی (تەلارەکـەی والی)، کـە گـوێیـان لەم- دووبەشـە- هۆنراوە بـوو، دایانە (قـاقـای پێکەنین و بەگۆرانی و شیعر وتن، ئاهەنگەکە دوایی هات):

بەرانبەر ئەم دەقەی سەرەوەی بەبیرمە کە (مامۆستا عەلی کەمال) فەرمووی:

«کـوردی دوای تـەواوکـردنی چوار باڵیـیـەکـە کـە لە خـوێندنـەوەدا کـردوویەتـی بەدوو بەشــەوە، بەشی یەکـەمی کـە سێ نیـو باڵیـیـە لە بارەی هەڵنانی کـچـانەوەیـە و بەشـی دووەمی هەڵبـەسـتـەکـە کـە دوانیـو باڵی چوارەمـیـەتی لەوێدا، ئـەوەتا ئەو کـچـانە بەو جـوانیـیـە شــایانـی وەک پەرتەوی ڕۆژ درەوشــاوە و بەهـەمـوو نازەنینـی و ناسکیـانەوە کردوونی بە (بەندە)ی تەنیا یەکێ لەو کوڕانە کە ئەویش (محـمد صـادق) بووە؛ چونکە (کوردی) تێگەییـبـوو کە بوونی ئەو (مـحـمـد صـادق)ە لەناو ڕیزی کوڕەکـاندا و کـە بە خەریکبوون بەدوا گەڕانێکی زۆر ئەمجا (مـحمد صادق)یان ئامادەی ئەو کۆڕە کردووە، ئەوە وەک (تانوت)ێک وا بـووە بەرانبـەر بەبرادەر و دۆسـتـایەتیـیـەکـەی (کـوردی) لەگـەڵ ئەو (مــحــمـد صــادق)ەدا و بۆ دڵخـۆشکردنـی (والی و دانیـشـتـوانـی) ناوی (مـحـمـد صــادق)ی هێناوە و ئـەمـجـا (کـوردی) ڕووی کـردووەتـە (والی) و پێی گـوتـووە: ئەم بە (بەندە) ناوبردنی ئەم کچە جوانانە بۆ (محمد صادق)ڕای من نییە بەشکو فەرموودەی خـوای گـەورەیـە کـە لە ئایـەتی ژمـارە (٣٤)ی سـورەتی (النسـاء)دا هـاتـووە: (الرجـال قـومـون علی النسـاء)، واتە: (پیـاوان باڵادەسـتی ژنـانن) و ئەوەتا ئەم هـەمـوو کـچـانە بە کردەوە و بەتوانایی تاکە (مـحـمد صـادق)ێکیان تیـا نابێ، دەکـەواتە ئێوە بڕیار لەسـەر ئارەزووی من بدەن کـە ئایا سـەر بەکـامـە لای ئەو (کـچـانە)یا(ئەو کـوڕانە)م کـە منیش مـرۆڤێکی ئیـسلامـی ئاسایی و وەک ئێـوەم و لە بەند و باو و ڕەوشـتی کوردانەمـان لام نەداوە و لا نادەم»

لێرەدا دەقی وتارەکەی (مامـۆستا کاردۆخی) کۆتایی هات کە بەپێی فەرمـوودەی پیاوماقووڵانی (سنە) کە مـامۆسـتاکاردۆخی ڕای گەیاندووە بەپێی ناوەڕۆکی فەرمـوودەکانی (مامـۆسـتا عەلی کەمـال) کە من بیـری فەرمـوودەکانیم ڕاگەیـاندوون، چونکە کارێکی نەکردەنییـە کە من لە دوای ٥٩ سـاڵ تێپـەڕین بەسـەر گێڕانەوەکەی (مامۆسـتا عـەلی کەمال)دا بتوانم دەقـاو دەق گوتنەکەی بگوێزمـەوە ئێرەوە بەشکو پوختەی بیرەکەیم پێشکەش کردوون.

ئەوەش ڕادەگەیەنم کـە وەک (والی)و پیاوماقـووڵانی (سنە) لەو جارەدا ویسـتوویانە بە (کوردی)

ڕابوێرن، بەڵام وەک دەرکەوت (کوردی) بەوانی ڕابواردووە و قسەی کەسیشیانی نەشکاندووە و پاکانەی خۆشی بەوە کردووە کە خوای مەزن پیاوانی کردوونەتە باڵادەستی ژنان و ئەم لێکدانەوانەی من و هەردوو سەرچاوەکە، (بەس)ە بۆ دەمکوت کردنی ئەوانەی کە ئەم چوار باڵییەی (کوردی) جۆرێک بێ لە (کوڕبازی).

**ئەنجام لەم چوار باڵییە:**

(کوردی) کە لە قسەی پیاوەکەی (والی)یەوە هەموو شتێک لەو کۆبوونەوە و ناردن بەدوای (کوردی)دا تێ گەیشتووە لە چوارینەکەیدا قسەی کام لای (والی) و (گەورە پیاوانی) لە چوارینەکەیدا بەتەواوی دیاری نەکردووە و ڕای کام لایشیانی نەشکاندووە، بەوەی کە سێ نیوباڵی هەڵدانە بەسەر کچەکاندا بەڵام دڵ تێچوونی خۆی لەو کچانە ڕانەگەیاندووە، لە بارەی (محمد صادق)یشەوە ئایەتەکەی قورئانی گۆڕیوە بۆ کوردی کە ژنان خوار دەستی پیاوانن و لەوێشدا، ئارەزووی خۆی بەرامبەر بە(محمد صادق) ڕانەگەیاندووە بەبێ ئەوەی لە هەڵبەستەکەدا ڕای لایەکیانی پشتگیری کردبێ.

هەرچەندە بە سەرزاریش بەوەدا کە (سێ) نیوباڵی چوارینەکە لەمەڕ کچەکانەوە و، تەنیا یەک نیوباڵی لەمەڕ کوڕەکانەوەیە کەواتە گومان کردن لە (کوڕبازی)ی خۆی لاداوە و پاکانەی بۆ خۆی تیاکردووە، و بەقسەخۆشی (داو) بۆ نانەوەکەی خۆی پووچ کردووەتەوە و خۆی ڕسگار کردووە کە هەموو دانیشتوانی هێناونەتە پێکەنین و چەپڵە ڕێزان.

لە کۆتاییدا ئەمەش گۆڕینی ئەو چوارینەیەی (کوردی)یە لە (لەلایەن منەوە) لە (فارسی)یەوە گۆڕیومەتە سەر زمانی (کوردی):

«ڕوخسار جوانانی سنە شایان»ن،
کە (باڵادەستی خۆری تابان)ن
لەگەڵ نازکی و نازیاندا هێشتا
بەندەی (محەمەد صادق) (شا)یانن

وە (مامۆستا عەلی کەمال)یش کۆتاییی گێڕانەوەکەی خۆی بەوە بۆ هێنام کە فەرموویەتی:- «کوردی کە هەڵبەستەکەی خۆی خوێندەوە و گورج رووی کرد بەلای (والی) و (دانیشتوان) و، وتە کورتەکەی خۆی ڕاگەیاند لەسەر دەستووری کۆن و ئێرانیان کوڕنۆشی بەرامبەر بە(والی) و بە(دانیشتوان)کرد و (والی) لەبەری هەستا و لەلای خۆیەوە داینا، بەدەم چەپڵە ڕێزانی هەمووانەوە.

دوای ئەوە ئەو کۆڕەکە، بوو بە هەڵبەست خوێندنەوەی هەڵنانی (کوردی) کە (مامۆستا عەلی کەمال) داخ و درێخی خۆی ڕاگەیاند کە ئەو هەڵبەستانەی دەست نەکەوتوون و والیش خەڵاتێکی چاکی (کوردی)ی کردووە».

١٢٠

## خوشا پروانەای

١- خـــوشـــا پـروانـەای ســـوزد، کـــە وصـل یـار مـی بـیـنـد
خـــوشـــا بـلـبـل، کـــە بـی پـردە، گـل و گـلـزار مـی بـیـنـد
٢- چـە غـم، مـــجـنـون دیـوانـە، کـــە ســـرگـــردان لـیـــلا شـــد
کـــە در نـازک غـــزالان، شـــیـــوەی دلـدار مـی بـیـنـد
٣- نـگـاە نـرم دلســـخـت مـــراخـــون در جـگـر کـــردە
نـبـــیـنـد خـــود آیـنـە، مـگـر هـمـکـار مـی بـیـنـد
٤- قـــیـــامـت، مـنـتـظـر دانـم، کـــە قـــد او شـــود بـرپـا
نـمـانـد قـــــامـت (طـوبـا)، هـرانـگـین: یـار مـی بـیـنـد
٥- خـــداونـدا، مـــرادم دە، بـە وصـل دوسـت شـــادم کـن
کـــە دانـی ســـیـنـەی ریـشـم چـە ســـان آزار مـی بـیـنـد
٦- دلـم بـر بـیـکـسـی ســـوزد، کـــە بـا غـم دربـدر افـــتـــد
چـو مـن هـردم بـە غـــربـت زحـــمـت اغـــیـــار مـی بـیـنـد
٧- چـە خـــواهـی ای فـلـک از مـن؟ خـــدا را دسـت کـــوتـاە کـن
بـە یـکـدم راحـت (هـجـــری)، تـوگـــوئـی: عـــار مـی بـیـنـد

---

١- خوشا: ئەی خۆشی لە....، ئای شادمانی لە....
پروانەای: پەروانەیەک. وەک: ئەی خۆشی لە پەروانەیەک، ئەی شادمانی لەو پەروانەیەی.
سوزد: کە دەسووتێ، کە بسووتێ.
کە وصل یار کە گەیشتن بە یار.
می بیند: دەبینێ، کە (کوردی) خۆزگەی بەو پەروانەیە خواستووە.
خوشا بلبل: ئەی خۆشی لەو بولبولە.
کە بی پردە: کە بەبێ پەردە، واتە یەکسەر و بەئاشکرایی.
گل و گلزار می بیند: گوڵ و گوڵزار دەبینێ.
بلبل: بولبول، شالوول، شالوور، کە (کوردی) خۆزگەی بەمیش خواستووە.

سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە (فارسی)یەی (کوردی):
(مس، عن، ق٣)یە و هێشتە ئەوەندەی من پێم زانیبێ چاپ نەکراوە.
لە نێوان ئەو سەرچاوانەدا (مس)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکە و سوودم لەوانی تریش وەرگرتووە.
پروانەای (ق٣): پروانە.... ئەمیش لەنگی دەکات.
سوزد (ق٣): سوزان.
واتای ئەم تاکە:
(ئەی خۆشی لەو پەروانەیە کە لە خۆشەویستیی رووناکیدا خۆی دەداتە بەر ئاگر و دەسووتێ، بەڵام بە یارەکەی دەگات
هەروەها خۆشی لە بولبول کە بەئاشکرایی و بێ رێ لێگرتن گوڵ و گوڵزار دەبینێ.
٢- چە غم: چ خەفەتێک هەیە لە دودا کەوا:
مجنون دیوانە: مەجنونی دێوانە، کە بەزمانی (عەرەبی) بەدڵدارەکەی (لەیلای عامری) دەوترێ.
کە سرگردان: کە سەرگەشتە و دەربەدەری چۆلەوانی بووە لە تین و تاوی ئەڤینی (لەیلا)ی دڵخوازیدا.
لیلا شد: بووە شێتی لەیلا،
کە در کە لە نێوان، کە لە.
نازک غزالان: ئاسکە ناسک (جوانەکان)دا وەک (مەجنوون) لە بیاباندا ئەو ئاسکانە دەبینێ.
مەبەستی لەوەیە کە لە نێوان ئاسکە جوان و دڵگیر و ناسکەکاندا .
شیوەء دلدار واتە شێوەی دڵدار (لەیلا).- دیوانە (ق٣): ویرانە
واتای ئەم تاکە:
مەجنوونی سەرگەردانی بیابان لە ئەڤینی لەیلا چ خەفەتێکی هەیە کە ئەگەر لەیلایش دوورە بەڵام ئاسکە جوانەکان دەبینێ کە چاویان لە چاوی لەیلا دەکات.
٣- نگاە نرم: تەماشاکردنی نەرم- کە نوارینی نەرم بۆ چاوی بەخومار (خەواڵوو) چاو نەرم بەکار هاتووە هەروەک ڕوانینی نەرم مەبەست لە چاوی کاڵ (شین)ە کە تەماشای ئەم و ئەو بکات و مەبەستی کاریگەرییەکەیەتی.
دلسخت مرا: دڵ ڕەقی، دڵسەختی من کە یارەکەی مەبەست بووە.
مراخون در جگر کردە واتە خوێنی زاندووەتە جگەری منەوە، لە دڵ سەختیی ئەو خوێن زاوەتە جگەرمەوە و دەردەداری کردووم.
نبیند: نابینێ واتە چاوی لە عاستی مندا نابینایە و نامبینێ کە چۆن خوێنی زاندووەتە جگەرمەوە. ئەوەندە دڵڕەق و بێ بەزەییە، بۆیە خۆی نابینێ کە دڵڕەقێکی تری وەک خۆی نییە و هەر خۆیەتی و بەس.

در اینه مگر همکار می بیند: تەنیا هەر لە ئاوێنەدا مەگەر هاوکارێکی دڵڕەقی وەک خۆی ببینێ، ئەگەر نا ئیتر کەسێکی تری دڵسەختی وەک خۆی نییە.

خون در جگر (ق٣) خون جگر

خون در جگر (عن): خون چون خلر (خوللەر): خڵتەی شەراب «شەرابی کۆنە و پەسند»

خود (ق٣): جز

مگر (ق٣): اگر

می بیند (ق٣): خود بیند، لەگەڵ پاشبەنددا ناگونجێ.

واتای ئەم تاکە هەڵبەستە:

چاوە نەرمەکانی ئەو دڵ ڕەقە کە ئەڕوانن لەبەر خوماری و کاڵێتی ڕەنگیاندا ئەوەندە کاریگەرن لەسەر دڵی من کە ئەوەتە خوێن زاوە جگەر (جەرگ)ەوە، کەچی هەر ئەو چاوانە بەگوێرەی ئەو دڵخوازەم وەک هەر لەبن نەبین وەهان و بەڕادەیەک کە کەسێکی هاوتا و هاوچەشنی خۆیان نییە کە ببینن مەگەر تەنیا لە ناو ئاوێنەدا کە ئەو یارەم لەبەر ئاوێنەکە وەستابێ ئەوسایە لەو ئاوێنەیەدا هاوچەشنێکی تری وەک خۆی ببینێ ئەویش وێنەکەی خۆیەتی بەسەر ڕووی ئاوێنەکەوە. من لە هەڵبەستی دیکەی (کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی)دا ئەوەی کە دیومن واتا و ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستە بالآیەی (کوردی) شاعیرمانم نەدیوە.

٤- قیامت: ڕۆژی قیامەت (ڕۆژی حەشر)

منتظر دانم: چاوەڕوانکراو دەزانم، چاوەڕوان دەکەم.

که قد او: کە بالآی ئەو هەرکاتێ، کە (قەد)ی ئەو...

شود بر پا: بێتە سەر پێ، ڕاست بێتەوە، هەڵبستێ، هەستێتە سەر پێیان.

نماند قامت طوبا: بالآی بەرزی درەختی (طووبا) وەها بە بەرزی و بڵندییەکەی نامێنێ و دەچەمێتەوە ئەوەندە بالآی یار جوان و دڵگیر و بەرزە.

هرانگین: لە هەر کاتێکا، یا لەو کاتەدا

– کەواتە ئەو (درەختی طووبا) ڕاست بوونەوەکەی بالآی یارەکەی (کوردی) ببینێ، ئیتر بەژن و بڵندییەکەی ئەو درەختە وەک خۆی نامێنێ لە شەرمدا کە ئەوەندە بالآی یارەکەی (کوردی) جوان و لە خۆی بەرزترە و بەرز و دڵگیرترە لە هی خۆی (طووبا)یەک، دەچەمێتەوە و لقوپۆپەکەی سەر شۆڕ دەکا.

(طوبا): ناوی جۆرە درەختێکی ناو بەهەشتە کە بەبەژن و بالآی بەرز و دڵگیر بەناوبانگە.

دانم که قد (ق٣) زانم قد

نماند (ق٣): نخواهد

واتای ئەم تاکە:

ڕۆژی قیامەت ئاشکرا دەبێ و چاوەڕوانی دەکرێ، لە کاتێکدا کە ئەو (یار)ە هەڵبسێتە سەر پێ

و ئەوسایە بالای داری طووبا کە یار ببینێ ئیتر ئەو درەختە لە ناواندا نامێنێ.

٥- خداوندا: ئەی خوداوەند، ئەی خوایە

مرادم دە: ئەوە ئاواتم بهێنە دی، ئاواتم بدە کە.

بوصل دوست شادم کن: بەگەیشتنم بە دۆستەکەم شادمانم بفەرموو.

ئا لێرەدا کە (کوردی) بە مەبەستی (یارەکەی، دڵخوازەکەی، خۆشەویستەکەی) وشەی (دوست)ی بەکار هێناوە و لە تێکڕای تاکەکانی هەڵبەستەکەشدا وشەگەلی، وەک: (زولف و ئەگریجە و پرچ)ی بەکار نەهێناوە، کەواتە ئەم هەڵبەستەی لە ئەنجامی دووری لە برادەرێکییەوە و بەئاواتی گەیشتن بەو برادەرەی لە خوا پاڕاوەتەوە کە نیازەکەی (کوردی) وەربگرێ و بەگەیشتن بەو برادەرە خۆشنوودی بکات، کە دیارە (نێرینە) بووە.

ئەمیش لێکدانەوەی وشەکانی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەیە:

کە دانی سینەی ریشم: ئەی خوایە کە بۆ خۆت دەیزانی کەوا سنگی بریندارم کە مەبەستی (دڵ)یەتی لە ناو سنگدا.

چە سان آزار می بیند: کە، چەند و بە چ جۆرێک سنگە بریندارەکە ئازار دەبینێ.

واتای ئەم تاکە هەڵبەستە:

ئەی خوای گەورە ئەوەندە ئاواتم بهێنە دی هەتا بەدۆستەکەی خۆم (برادەرەکەم) دڵشادم بکەیت، چونکە خۆت چاک دەزانی ئەم سنگە بریندارەم لە تاو دووری لە چەند ئازار دەبینێ.

٦- دلم بر بیکسی سوزد: دڵم بەبێکەسیی خۆم دەسووتێ کە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ (کوردی) لە کاتی دانانی ئەم هەڵبەستەیدا لە سلەیمانیدا نەبووە چونکە کەس و کاری ئەو لە بیانییەدا نەبوون و لەبەرئەوە خۆی بەبێکەس ناوبردووە.

کە باغم دربدر افتد: لەو بێکەسییەشدا بەخەمباری بکەوێتە دەربەدەرییەوە کە (کوردی) لێرەدا خەمباری خۆی لەو دەربەدەرییەدا ڕاگەیاندووە.

لێکدانەوەی ئەم تاکە:

(کوردی) لەم تاکەدا ڕای گەیاندووە کە وا دڵی بەبێکەسیی خۆی سووتاوە، چونکە لەو بێکەسیی ناو بیانییەیدا بەخەمبارییەوە لە دەربەدەریدا بێ، هەروەها (کوردی) لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەدا گوتوویە کە:

وەک منی (کوردی) هەر دەمێک لە بیانیدا (بە غەریبی) ئەرک و ئازار دەکێشم بەدەست بێگانەوە.

٧- چە خواهی ای فلک از من؟: چیت دەوێ ئەی فەلەک لە من؟

لە نێوان هۆنەرە کلاسیکییەکاندا (باو) بووە و (باو)ە کە هەر چورتم و جەخارێکیان بەسەرا هاتبێ ئەو بەسەراهاتەیان داوەتە پاڵ کرداری فەلەک (گەردوون)ەوە، لەسەر ئەو بیر و بڕوایەی کە خوای گەورە کاری خراپ و بەدی بەرامبەر بەکەس ناکات و بۆیە خراپەیان داوەتە پاڵ

ڕۆژگار. کە ئەوەتا کوردی لێرەدا بارە ناهەموارەکەی خۆی خستووەتە ئەستۆی (فەلەک)ەوە و لێی پرسیوە کە: ئەی فەلەک چیت لە من دەوێ.
خدارا دست کوتا کن: پاش ئەو (پرسیارەی لە فەلەک) ڕووی کردووەتە بارەگای خوای گەورە و لێی پاڕاوەتەوە کە ئەی خوای مەزن ئەم دەستدرێژییەی فەلەک بگێڕی بەدەستکورتی و دەستی کورت بکەرەوە کە ئیتر فەلەک وازم لێ بهێنێ. وەیا بەخودی (فەلەک)ی گوتووە دە ئیتر بەسە دەستم لێ کۆتا کە (هەڵگرە).
بە یکدم راحت –هجری–: واتە ئەو فەلەکە، کە نازانم چیی لە من دەوێت.
بەیکدم راحت (هجری):
واتە تەنیا بە یەکدەم ئارام و ئاسوودەیی بوونی (هیجری واتە کوردی) ئەو (فەلەکە) بەدکارە وە ئەتۆ بڵێیت کە فەلەک ئەو ئارام و ئاسوودەییەی منی بەلاوە، وەک شەرم و شوورەیی بێ وەهایە، بۆ (فلک) ئاوەهایە بەرامبەر بە(هیجری) واتە لە (کوردی)، ئەمە لە واتای: (بەیکدم راحت هجری)دا وەیا ئەی فەلەک (ڕۆژگار) هەر لەبەر خوا یا بیکە لە ڕێی خوادا دەست لە من بکێشەرەوە، توبی خوا وازم لێ بێنە.
واتای ئەم تاکە:
ئەی فەلەک (گەردوون) (ڕۆژگار) چی لە من دەخوازی، بیکە لە ڕێی خوادا دەستم لێ هەڵگرە کەوا تەنیا بەیەک دەمە ئاسوودەیی و ئارامی من (هیجری)ت بەلاوە ئەوەندە ستەمە وەک بڵێیت ئەو ئاسوودە بوون و ئارامگرتنەم (هجری) بەلای تۆوە (فەلەک) شەرم و شوورەیی بێت وەهایە.

١٢١

## زكوه بيسـتون

١- زكوه بيـسـتـون سـينهى چون فـريـاد مـى كـردم
بهياد لـعل شـيـرين، شـورش فـرهـاد مـى كـردم
٢- بهدرياى مـحـبت غـصـه مـى خـوردم نـهنگ آسـا
زموج اشـک خـون افشـان، زطوفـان يادمـى كردم
٣- چو اهـوى، دل بيـچـاره، درزنجـيـر زلفت شـد
اگـر من بـودمـى اورا بهچشم؛ ئازاد مـيكردم.
٤- اگـر اين شـيـوهء، ليـلا صـفت، مـى ديدمـى اول
بهنجد، آنرا، چو مـجنون خـانه بنيـاد مـى كـردم

..............................................................

١- ئهم پارچه هـهڵبهسـتـهم له كهشكۆڵى (ح)وه وهرگـرتووه كه كـۆن نييـه و بهنـاوى (كوردى)يهوه نووسـراوه و له سـاڵى (١٣٢٨ك) ڕێككهوتى (١٩١٠ز)دا نـووسـراوهتهوه و نـاوى نووسـهرهكـهى نهنووسراوه، چونكه لهم ههڵبهسته تهنيا چوار تاكى لهوێدا نووسراوه، كه له ههمان كهشكۆڵدا، ناوى چهندين نووسهر لهگهڵ ئهو ههڵبهستانهدا نووسراون كه ئهو نووسهرانه نووسيويانهتهوه. لهو نووسهرانهش ئهمانهن:
شـائق( واته مـامـۆسـتـاى هۆنهر (شـاهۆ، مـهلا حهسـهنى قـازى)و (صـهدبارى) و (مـحـهمـهد نوورهدين) و(محهمهد ئهلحهسهنى)وه (خاكسار) واته مامۆستا (مهلا ڕهئووف صـائب)ى قازى واته براى (جـهمـيل صـائب) و (مـصطهفـا صـائب) واته (كـوردى) كـه لهگـهڵ مـهريوانى (بهھجـهت)دا يهكـهم جار و يهكهم ديوانى (كوردى)يان لـه ١٩٢١ز. دا له چاپ داوه و هـهروهها براى (ئهنوهر صائب)  و (جهلال صائب) و، (هادى صائب) كه ههمووان شاعير و كوڕه شاعير بوون.
زكوه بيـسـتون سـينه: له كێـوى بێـسـتوونـى سنگمـدا... كه سنگى خـۆى چواندووه بهچيـاى (بێستوون).
چون فرياد مـيكردم كهوا هاتوهاوار و دادو بێـداد (فرياد)م دهكرد و واته ئهو دادوفيـغـانهم له كێوى سنگمهوه بهرز دهبووهوه.
بهياد لـعل شـيـرين: بهيـادى گـهوهـهرى وهک گـهوهـهرى (لـهعل)ى (خـاتـوو شـيـرين)ى دڵخـوازى فـهرهـادهوه، كـه چواندنى گـهوهـهرى (لهعل) بهو (خـاتـوو شـيـرين)ه لهوهوهيه كـه (شـيـرين) پێى

زانی هونەرمەندی مەزن و پەیکەر و کێو تەراش لەو چیای بێستوونەدا بە پیلانێکی بە درۆ هەڵبەستراو کە گوایە (شیرین) مردووە، ئەو فەرهادە هونەرمەندەی دڵداری (شیرین) خۆی کوشتووە و ئەو خوێناوی بوونەی شیرین بە خۆکوشتنەکەی (کوردی) بە گەوهەری (لەعل)ی ڕەنگ (ئاڵ)ی چواندووە کە (کوردی) بەیادی (شیرینی دڵخوازی خۆیەوە، ئەمیش شیوەن و گریە و زاریی کردووە لە کێوی سنگی خۆیدا وەک چۆن (فەرهاد) بەگریان و زارییەوە. خۆی کوشت، هەروەهایش (شیرین) لە داخی خۆ کوشتنی (فەرهاد) ئەویش بەدەم گریە و زارییەوە ئاوەها خۆی کوشت و (کوردی)ش شۆرشی خۆی بەو یادەوە کردووە لەسەر داستانی شیرین و فەرهاد بە دەیان پەڕاوی (کوردی) و فارسیم بەهەڵبەست دیون و زۆریشیان چاپ کراون و لە (لەعل)یش لە شوێنی تردا زۆر دواوم.

شورش فرهاد میکردم: واتە منیش بەو یادی سووربوونی شیرین بەخوینی (لەعل) ڕەنگەوەم، شۆڕشی خەفەتی بیستنی مردنەکەی شیرینم لەلایەن فەرهادەوە لێ بووە بە (شۆڕش)ی (فەرهاد) کە ئەمیش خۆی کوشتووە.

**لێکدانەوەی ئەم تاکە:**

لە کێوی بێستوونی سنگمدا کە گریە و زاری و هاوارم دەکرد، هەروەها بەیادی خوێناویبوونی وەک (لەعل)ی لەشی کوژراوی (شیرین)ەوە ئاوهایش شۆڕشە گریە و زارییەکەی (فەرهاد) دەکرد کە بیستی شیرین مردووە. و لە ئەنجامدا فەرهاد خۆی کوشتووە.

**لێکدنەوەی ئەم تاکە:**

لەناو چیای بێستوونی سنگمەوە هاوارم لێ هەڵدەستا و گریە و زاریم دەکرد. ئا لەو کاتەدا لە ناو ئەڤینی یارەکەی خۆم، منیش وەک یادی ڕەنگی سووری گەوهەرینی خوێنی لاشەی کوژراوی شیرینم دەکردەوە و لەو یادەمدا، شورشێکی وەک ئەوەکەی فەرهادم دەکرد کە بەگریە و زارییەوە لەو شورشەیدا ئەمیش خۆی کوشت کە (کوردی) گوتوویە منیش شۆڕشێکی وەک ئەوەکەی فەرهادم بۆ شیرین دەکرد.

٢- بەدریای محبت: لە ناو دەریای خۆشەویستیدا. بێگومان ئەم ناوی دەریا بردنەی (کوردی) لەوەوە بووە کە بەچاوی خۆی دەریای دیوە و بەتایبەتی دەریای سپی ناوەڕاست لە سەردانەکەی لای (ئەحمەد پاشا)ی بابانیدا و ئەگەر لەو سەردانەدای (مەبەست بێ ئەوا لە دوای ڕووخاندیی (بابان- ١٨٥١ز. دا بووە و بەر لە ساڵی کۆچی دواییەکەیدا ١٨٥٩ز دابووە.

غصە می خوردم، نهنگ اسا: هەروەک (نەهەنگ خۆم لەو دەریایەدا بەقووتدا دەکرد.

زموج اشک خون افشان: لەناو شەپۆلی فرمێسکی خوێنینمدا کە ئەو دەریای خۆشەویستییەی کە وەک نەهەنگ خۆی تێدا بەقووتدا بردووە. کە:-

زطوفان یاد می کردم: ئا لەو دەریای خۆشەویستییە دا و بەدەم شەپۆلی فرمێسکی خوێنینمەوە یادی ئەوەم دەکردەو لەو فرمێسکە لافاو (طوفان)ێک بەرپا بکەم. کە (کوردی) لەم

تاکە هەڵبەستەیدا داستانی دڵدارییەکەی خۆی چواندووە بەداستانەکەی هونەرمەند (فەرهاد) و کێو تاشین لە خۆشەویستی شیرینی دلخوازیدا و... هتد

ئەم نیشانە بۆ کردنی ئەم یا ئەو شوێن، داستانی شیرین و فەرهاد بەزۆری لە ناوەڕۆکی هەڵبەستە کلاسیکییەکانی ناوچەکە بەزۆری دەبینرێ.

هەروەک (کوردی) بەوجۆرەی ناو ئەم هەڵبەستەی، ئاوەها لەو داستانەی شیرین و فەرهاد دواوە کە (کوردی)ش و شاعیرانیش دڵدارییەکەیان بەو هاوچەشنی دڵدارییەکەی فەرهاد داناوە.

**لێکدانەوەی ئەم تاکە:**

لە ئاوی دەریای خۆشەویستیدا بەقووتدا دەچووم وەک نەهەنگ

هەروەها لە(شەپۆڵ)ەکانی کە لە فرمێسکی خوێنینی منەوە سەریان هەڵدەدا بەدەم ئەو شەپۆلانەشەوە، لافاوێکی گەورەم بەیاددا دەهاتەوە لە ئەنجامی هەڵقولاندنی ئەو فرمێسکە زۆرەمەوە کە دەریایەکی خۆشەویستیی بۆ هێناومەتە دی و وەک نەهەنگ تێیدا بەقووتدا دەچم.

٣- چو اهوی دل بیچارە (چو ئاهویێ دڵی بێ چارە) واتە: دڵی بێچارەم هەروەک ئاسکێک.

درزنجیر زلفت شد (دەر زەنجیری زولفەت شود) واتە: ئەو دڵە بێچارەیەم کەوتە ناو داوی وەک زنجیری زوڵفتەوە

اگر من بودمی (ئەگەر من بوو دەمی) واتە: ئەگەر من بوومایە، لەجێی تۆ ئەی -خۆشەویستەکەم- ئەو سایە ئەو دڵە بەندکراوەم-

بەچشم ازاد می کردم: ئەوسایە دڵەبەندکراوی ناو زوڵفەکەم هەر تیلاییی نیگای چاو، لەو دوای ناو زلفە زنجیرەیەم ئازاد دەکرد و بەبەرەڵلاکردنی لەو (بەند)ە رزگارم دەکرد.

بەواتایەکی تر: ئەوسایە نەک هەر دڵەکەم لە بەندکراوی ئازاد دەکرد، بەشکو بەو تیلاییی چاوە دڵەکەم ئەکوشت و لە ئازار و ئەشکەنجەی ئەو بەندکراوییەی ناو زولفەکە قوتارم دەکرد و بە مردنەکە هەست بەئازار کردنەکەیم لەسەر لادەدا. لێرەدا وەک مەبەستی ئەوە بێ وایە کە یارە خۆشەویستەکەی ئەوەندە بەبەزەییە کە هەر تەنیا بەبەندکردنی دڵەکە لە داوی زولفەکەیدا، وازی لێ هێناوە.

**لێکدنەوەی ئەم تاکە:**

دڵی بێچارەی من وەک ئاسکێک کەوتووەتە بەند و زنجیری داوەکانی ناو زولفی تۆوە ئەی یارەکەم ئەگەر من لە جێی تۆ بوومایە، هەر بەتیلاییی چاوێک ئەو دڵ بەندکراوەم ئازاد ئەکرد، یا بەبەرەڵلا کردنی دڵەکە وەیا بە کوشتنی؛ چونکە کە دڵە کە (مرد) ئیتر هەست بە ئەشکەنجەی ئەو بەندێتییە ناکات.

٤- اگر این: من ئەگەر ئەم...

شیوەء لیلا صفت: ئەگەر من زوو ئەم شێوەی لەیلا صیفەتەم...

می دیدمی اول: بمدیایه له یەکەم جارم دیتنەکەمدا ئەوا...

بەنجد آنرا: له چۆل و بیابانی (نجد) واتە، چۆلەوانییەکەی (حیجاز)دا من ئەو سایە ئەو بیابانی (نەجد)ەم...

چو مجنون: هەروەک (مەجنوون)ی شەیداو دڵداری (لەیلای) دڵخواز، ئا ئەو سایە...

خانه بنیاد می کردم: ئەوسایە من وەک چۆن (مجنون) لە ئەڤینی لەیلای خۆشەویستیدا بوو بەچۆڵەوانینشین دەشت و بیابانی (نەجد) منیش وەک (مجنون) لە ئەڤینی تۆدا ئەی یار ئاوا لە چۆلەوانی وە بەدووریی ناو (نەجد) منیش خانوویەکم بنیات ئەناو لەو خانووەدا و لە چۆڵەوانییەدا بە ئاوارەیی دەژیام.

اول (ئەو وەڵ "ح"): ای دل.

**لێکدانەوەی ئەم تاکە:**

ئەگەر کاتی خۆی من ئەم ڕواڵەتە دڵخوازانانەی کەوەک ڕواڵەتەکانی (لەیلای) مەجنوون ئاوەها- ئەم ڕواڵەتانەم- بدیتنایە، هەر ئەوسایە و لە یەکەمین دیتنی تۆمدا بەزوویی لە چۆڵەوانی و بیابانی (نەجد- دەشتی حیجاز)دا وەک مەجنوونی بەنیازی چۆڵەوانی، ئەو سایە منیش خانوویەکم لەو (نەجد)ە بنیات دەنا و تێدا دەژیام.

١٢٢

**عـبـد مـعـبـود**

عبد مـعبود بەحق و، چاكر فـخر زمـان
شاه ملک نامداران، احمدی صاحبقران

.................................................................

١– ئەم تاكە هەڵبەستە (فارسی)یەی سەرەوە لە یەكەمین (دیوانی كوردی)دا بەتەنیا چاپ كراوە. ئەو دیوانە لە ١٩٣١دا لە لایەن (كوردی و مەریوانییەوە لە بەغدا چاپ كراوە. وەک بۆم ساغ بووەتەوە ئەم تاكە هەڵبەستە سەرەتای (چامە)یەكی (فارسی) درێژە كە (كوردی) لە بارەی خانەوادەی (صاحیبقران)ەوە، واتە لەمەڕ سەرگوزەشتەی ژیان و ناوی باو باپیرانی خۆیەوە دایناوە، كە لە ئازایەتی و هونەرمەندێتی و هۆنەرێتیی ناوبانگیانەوەیە، یەكێكیان لە بەشدارانی جەنگە بێ هاوتایەكەی (دوانزە سوارەی مەریوان) بووە.

لەگەڵ زۆر گەڕان و تێكۆشانمدا بۆ ئەوەی ئەو (چامە – قەصیدە)یەم دەست بكەوێت، بەڵام دەستم نەكەوت و بەلامەوە جێگەی داخە بەچۆڵی مانەوەی شوێنی ئەم چامەیە لەم پەڕاوەدا، هیوابارم كە لە لایەكەوە ئەم چامە گرنگە سەر هەڵبدا و ئەم كەلێنە گەورەیە پڕ ببێتەوە كە زۆر مێژوویی و بایەخدارە.

عبد (عەبدی) واتە (بەندەی) كە مەبەست لە مرۆڤە و خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا بە(عەبد) و عیبادا مرۆڤی ناو بردووە، بەو واتایەی كە هەموو خەڵک بەندەی خوای مەزنن و دەبێ خوا بپەرستن.

لەم تاكەدا (كوردی) مەبەستی لە (ئەحمەد بەگی) باپیری خۆیەتی كە (كوردی)ش، باپیری خۆی بە یەكێ لە (بەندە = كۆیلە)كانی خوا ناوبردووە.

معبود: واتە پەرستراو لە لایەن بەندەكانەوە، كە ئەویش خوای مەزنە.

بەحق: بەحەق، بەمافی ڕەوای خوای مەزن (حەق)ەوە، (حەق) یەكێ لە ڕواڵەتەكانی خوایە و كە دەوترێ (حەق) مەبەست لە خودی خوایە، هەروەها مەبەستیشی لەوەیە كە باپیری (كوردی) بە(حەق) واتە بەڕاستی بەندەی خوای مەزن بووە.

چاكر: بەندە، كۆیلە.

فخری زمان: ئەو كەسەی مایەی پێوە نازینی زەمان (ڕۆژگار) بووە كەوا بەدرێژاییی ڕۆژگار خەڵكی پێوەی نازیون، ئەویش مەبەست لە (پێغەمبەری ئیسلام –د.خ–) بووە. (كوردی) وەک زۆربەی دەسپێكردنی وتە و نووسین و هەڵبەست و نامیلكە و پەڕاویان ئەم چامەیەی بە پەرستراوێتیی خوای مەزن و ئەمجا ئەو پێغەمبەرە دەست پێ كردووە.

شاه ملک نامداران: پاشای هەرێمی ناوداران کە مەبەستی (کوردی) لە باپیری خۆی بووە، ئەوەندە بەناوبانگترین بووە.

احمدی صاحبقران: کە (ئەحمەد بەگی گەورە) یا (ئەحمەد بەگی صاحیبقران)ی باپیری (کوردی)یە و بە(حاجی حان)یش ناسراوە.

**لێکدانەوەی ئەم تاکە:**

بەندەی بەڕاستیی خوا و ئەو خوایەی کە بە(حەق) پەرستراوە و شایانی پەرستنە، هەر ئەو بەندەیە کۆیلەی کەسێ بووە کە مایەی پێوە نازین بووە و تا ئێستەش بەدرێژایی ڕۆژگار (زەمان) شایانی پێوە نازین بووە، واتە (پێغەمبەری ئیسلام -د.خ-) ئەو بەندەیەش خۆی پادشای ناوداران و بەناوبانگانی هەرێم بووە و ئەمجا بەندەی خوا و پێغەمبەر بووە، ئەویش (ئەحمەدی صاحیبقران)ی باپیری (کوردی) بووە.

## «حەوت بەند»ی مستەفا بەگی «کوردی»

### بەندی یەکەم

١- ای ز شـــیـــپــور تو جـــهـــان پر شـــور
وز نـوانـی تـو عـــــالمی مـــــســـــرور
٢- از وصــــــال تـو ملک جـــــان آباد
وز خــیــال تو شـــهــر دل مــعــمــور
٣- از صــــدای تـو خـــفــتـــهء غـــفلت
گـشــتــه بیـدار، رسـتــه، دل رنجـور
٤- به هـوای تو عـــاشـــقــان دلشـــاد
به ولای تو، دوســــتـــان منصـــور
٥- گــــمــــرهان طریق حـــیـــــرترا
ســــــایەات، نخل و، نـور، وادی تـور
٦- می کـشــان حــقــیـقت و عـــرفـان
از خم و خلّر تـواند مــــخـــمـــور
٧- نـغـــــمـــــەات رشک لحن داودی
پاســـخت حلّ مـــشـکلات زبـور
٨- هم دلت درّ غـــیب را حــــقّــــه
هم لبت گنج راز را گـنـجــــــور
٩- ارمــــغــــان تو اکـــمل و اتمم
ای یگانه به خـــاتمی مـــشـــهــور
١٠- مــقــدمت فـیض بخش عــالم شــد
دیر و بتـــخــانه بست و بت مکســور
١١- لمعـــهء طلعـــتت چو پیــدا شــــد
در دو عـــالم شکست خـــورد دیجـــور

١٢– ذەرّەء زهرهء تو مهر بود
زانچه در کائنات کرد ظهور
١٣– مظهر پرتو جمال تست
زآسمان جمله نجم و ماه و خور
١٤– مهر از مشعل رخت روشن
ماه از نور جبهەات پر نور
١٥– جز صفاتت نگوید الاّ گنگ
غیر ذاتت نجوید الاّ کور
١٦– شاهدم جلوەء حق است، دیگر
چیست غلمان و این و آن و حور
١٧– ای که بر تخت دل تو سلطانی
چون شوم از آستانەات دور
١٨– ای خوش آن دم سوی مقتل خویش
یابم از یار خاص خود دستور
١٩– همدل و همانند حلاجم
حق پرستی رهم، نه جورا جور
٢٠– پای کوبان ز شوق و دست فشان
فاش گویم بەنالەء سمتور
٢١– کای دمت نفخەء سرافیلی
مورد واردات جبریلی
٢٢– انتَ شَمسَ الهُدی ونورَ الحق
اظهر الحقَّ، یا ظُهورَ الحق

---

١– ای: ئەی، وەک: ئەی ئەو کەسە.

مەبەست لە پێغەمبەری ئیسلام (د. خ)یە کە ئەم (حەوت بەند)ە ئاینییەی بەسەر ئەودا هەڵداوە.

زو: لە – وەک: لەبەر تۆ...

شیپور: وشەیەکی کۆن و ڕەسەنی کوردییە کە (فارس)یش بەکاری دێنێ واتە (کەڕەنا).

(شـەیپوور) یا (کەڕەنا)، ناوی ئامێرێکی مۆسیقی زۆر کۆنە گەلی (کورد) لە جەنگدا بەکاری هێناوە) یا لە کاتی هەواڵ بەیەک گەیاندندا. بە(فوو) پیاکردن دەنگ دەدات، مرۆڤی سەرەتایی، لە شاخی (گا) و (گامێش) دروستی کردووە کە سەری نووکی (شاخ = قۆچ)ەکە، کونێکی بچووکی تێ کراوە و، لەو کونەوە فووی پیا کردووە بەپێی هەناسەی (فوو)ەکە، دەنگی جۆراوجۆری لێ پەیا بووە.

بۆ بانگەوازی گردکردنەوەی کەسان یا بۆ ورە بەرزکردنەوە لە جەنگدا بەکارهاتووە، یا ئاژەڵە دڕندەکانیان بەو دەنگە گڕەی ترساندووە.

لە (پەڕاوی پیرۆز = الکتاب المقدس) واتە (تەوڕات = العهد القدیم)دا ناوی (شەیپوور) بەشێوەی (شووفار) یا (شەیپوور) هاتووە.

لە زمانە ڕۆژئاواییەکاندا و، لە زاراوە (موصطەلەحات)ی (مۆسیقی)دا (هۆڕن) واتە (کەڵەشاخی ئاژەڵ)ی پێ گوتراوە. کە ئەم ناوی (هۆڕن)ە لە بنجی (زمانی)دا دەچێتەوە، سەر ناوی (کەڕەنا)کەی خۆمان، کە هی هەردوو لا (وشە)یەکی زمانی نەتەوە (ئاری)یەکانە.

لە زمانی (عارەبی)دا (بووق)ی پێ دەڵێن کە ئەمیش لە وشەی (بۆق) واتە (پاڵ پێوەنان)ی (کوردی)یەوە وەرگیراوە، کە (فوو پیاکردنەکەی) جۆرە پاڵ پێوەنانێکە. هەروەها لە (عارەبی)دا (نەفیر)یشی پێ دەوترێ، کە بەواتە بانگەواز بۆ گردبوونەوە بۆ جەنگ.

ئەمجا (کوردی) لێرەدا مەبەستی لە (شەیپوورەکەی پێغەمبەر «د. خ»): بانگەواز هەڵدانەکەیەتی بۆ پەیابوونی ئاینی ئیسلام کە بووە بەکارێکی مەزن و گرنگ لە جیهاندا.

تو (توو) تۆ – کە مەبەس لە خودی پێغەمبەری ئیسلامە (د. خ).

جهان: جیهان (دونیا) کە ئەو بانگەوازە، لە جیهاندا گۆڕانێکی ئاینیی مەزنی پەیا کرد لە ڕووی ئاینەوە.

پرشور: پڕ لە (زەڵە)، (زایەڵە)، (دەنگە دەنگ)، واتە بانگەوازی پێغەمبەر (د. خ). بۆ پەیابوونی ئاینی ئیسلام و بانگکردنی خەڵکی بۆ هاتنە سەر ئەم ئاینە نوێیە، کە بەدواترین ئاینی ناساند، کە ئەوە شۆڕشێکی پڕ بەجیهانی پەیا کرد.

هەروەها لە وشەی (شور)دا کە لەم (یەکەمین) تاکەدا هاتووە (مەبەست) لە (شور) یا (شۆڕ)ە ئەمە ناوی ئاوازێکی مۆسیقیی کۆنی کوردییە، کە لە (عارەبی) و (فارسی) و (تورکی)دا، بەیەکێ لە ئاوازی (مەقام) دائەنرێت وە (عەرەب) و (تورک) کردوویانەتە هی خۆیان وەک (شۆری بەیات) کە هەر (ناو)ی (وشە)ی (شۆر)ە، نە (عارەبی)یە و نە (تورکی). بەشکو (کوردی)یە و (فارسی)ش لە بەکارهێنانی ئەم وشەیەدا بەشدارە.

(شور) یا (شۆر) لە ڕووی زمانەوانییەوە دەنگ لە کارەساتێکی گرنگ و (ڕاپەڕین) دەدات. کە ئەم هەموو واتایانەی (شور) یا (شۆر)ە لەگەڵ (مەبەست) و (واتا)ی ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەگونجێن، کە ئەمەش توانای شاعیرمان (کوردی) پیشان ئەدا لە زمانەوانیدا بە(قووڵی) و (فراوانی).

نوای تو، نەم (نەوای)یە لەم شوێنەی ئەم تاکە هەڵبەستەدا گەلێ واتای جیا جیا دەدات، وەک: (ئاواز)، (ئاهەنگ)، (دەنگ)، (دەنگی ساز)، (لەشکر)، (شوێنەوار)، (یاقووت)، لە جۆرە گەوهەرێکە وە (بوونێتی) وە (هۆی ژیان) و... هتد، ئەدات.
هەموو ئەم واتا جیا جیایانە لەگەڵ مەبەست و واتای تاکە هەڵبەستەکەدا دەگونجێن. بەم پێیە وشەی (نەوا) لە (زانستی مۆسیقی)دا (دەنگ) یا چەند (پلە)یەکی هەن، لەوانە: (دەنگی پێنجەمین) یا (مەقامی پێنجەم)ە، کە بەزاراوە = (موصطەلەح)ی مۆسیقی بە(پێنج گا) یا (پەنج گاه)ی (کوردی) و (فارسی)ی، ناو دەبەن، واتە (نەوا) کە (وشە)یەکی (کوردی) و (فارسی)یشە، بەواتە هەمان ناوە (پێنج گا) یا (پەنچ گاه) و (کوردی) و (فارسی)یەکەیە.
جگە لەمانە (نەوا) ناوی یەکێ لە گۆرانییە کوردییەکانمانە، کە (بێگانەکان) بەهەڵە و بە(مەقامێکی عیراق)ی ناو ئەبەن، کە تەنیا ناوی (نەوا) ئەم دەسەڵات بەسەر کەلەپووری (کوردی) و (فارسی)دا ڕادەگەیەنێ لە لایەن (عەرەب) و (تورک)ەوە.
گردکردنەوەی ئەم هەموو واتایانە، لەم تاکە هەڵبەستەدا ئاسۆی فراوانی زمانەوانی و بەقووڵی لە واتا گەیشتنی (کوردی) شاعیرمان دەردەخات، کە هەموشیان پڕ بەپڕی واتاکانی ئەم تاکە هەڵبەستەن.
عالمی مسرور: جیهانێک پێی شادمان و دڵخۆش، کە مەبەست لە بانگەوازە مێژووییە ناوبراوەکەی پێغەمبەر (د. خ)ە بۆ هاتنە سەر ئاینی ئیسلام.
وەک ڕام گەیاند ئەم (حەوت بەند)ە فارسییەی (کوردی) بەرامبەر بەپێغەمبەری ئیسلام (د. خ)ی گوتووە، کە لەم (یەکەمین) تاکەیدا (کوردی) ڕووی دەمی کردووەتە ئەو (پێغەمبەر)ە کە ناوەڕۆکەکەی دەنگی بەهێز و زوڵاڵی ئەوە کە جیهانی هێناوەتە جۆش و خرۆش، لە کاتێکدا هەردوو ئاینی (مووسایی) و (عیسایی) بەسەدان و هەزاران ساڵ بەر لە ئاینی ئیسلامەوە هەبوون و، ئەمجا ئەم ئاینی ئیسلامە بەماوەیەکی کەم خۆی گەیاندە هاوتا و، پێشتری ئەوان و پێ بەپێی ئەوان لە جیهاندا بەرپایە و پەرەی سەندووە.
سەرچاوەکانی ئەم (حەوت بەند)ەی (کوردی) و (ئەوی دەست من کەوتوون) بریتین لە:
(مس، عن، گل/٣، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ن، ف، ص، لە کەشکۆڵستاندایە، (صا) و، (مک، ط، شح، نع، مع، جم، نم/١، با/١، سجا، حم، ق/٣، ج، ما/١، هـ)یە و، هێشتە چاپیش نەکراوە لە لایەن کوردەوە و کە نازانم بە(فارس)ەکان چاپیان کردووە یان نە.
لە نێوان ئەم سەرچاوە زۆرەدا (مس)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم حەوت بەندە و هەروەها لە زۆر جێگەدا پشتم بەستووە بەسەرچاوەکانی تریشەوە، کە لە شوێنی خۆیاندا ئەو پشت پێ بەستنانە دیاری دەکەم.

**جیاوازییەکانی ئەم تاکە هەڵبەستە:**

ئەم تاکە هەڵبەستی یەکەمی (بەندی یەکەم)ی ئەم (حەوت بەند)ە لە نێوان سەرچاوەکانیدا ئەم جیاوازییانە لە نێوان وشەکانیدا ئەبینرێت:

ئەم (بەندی یەکەم)ی (حەوت بەند)ە لە (ص)دا نییە و دیارە لەناوچووە.
شیپورتو (شەیپوورتوو) لە (گل/٥، گل/٦) و (شیپورت) نووسراوە کە لەنگیشە.
پرشور (پوڕشوور) لە (سجا)دا (پر نور) نووسراوە بەڵام لە (ج)دا نووسراوە کە: (لە یەکێ لە سەرچاوەکاندا بە(پر نور)ە و بیری چووە کە نیشانە بۆ (سجا) بکات کە سەرچاوەکانی ئەوە و من داومە بەنووسەرەکەی.
وز لە (عن)دا: (ز) نووسراوە.
نوای تو لە (گل/٥، گل/٦)دا نووسراوە: نوایت.
عالمی لە (ف، نم/١، ق/٣)دا نووسراوە (عالمین).

**جۆری ئەم (حەوت بەند)ە:**

حەوت بەند بەواتا پارچە هەڵبەستێکی درێژ کە بکرێ بەحەوت (بەش)ەوە کە هەر بەشەی بە(یەک بەند = بەندێک) دانراوە. هەر یەکێ لەو بەش (بەند)انەش بریتییە لە چەند تاکە هەڵبەستێک، کە کۆتاییی هەر (بەش) یا (بەند)ێک لەو حەوت (بەش) یا (بەند)ە بەتەنیا یەک (تاکە هەڵبەست)ی هەمان شاعیری خاوەن (حەوت بەند)ەکە دێت.
ئەو تەنیا (تاکە هەڵبەستەی کۆتایی)یە لە پاش بەندەکانیا جیاواز دەبێ، لە پاش بەندی ئەو (تاکە هەڵبەستانە)ی کە بەو (تەنیا تاکە) کۆتایی هاتووە، جیاواز لەوان.
هەروەها دەشێت پاشبەندی ئەو تاکە هەڵبەستەی کە لە کۆتاییی هەر بەشێکدا دووبارە دەکرێتەوە پاشبەندەکەی وەک پاشبەندەکانی یەکەمین بەشیان بێ. لە هەمان کاتیشدا هەندێ جار لە حەوت بەنددا تاکە هەڵبەستەکەی کە لە دوای هەر بەش (بەند)ێکیانەوە دووبارە دەبێتەوە، ئەو تاکە دووبارە کراوەیە پاشبەندەکەی یەک جۆر نەبێ، بەشکو لە هەر یەکێ لە بەش (بەند)ەکاندا ئەو (تاک)ە دووبارە کراوە پاشبەندەکەی جیا بێ، لەگەڵ پاشبەندەکانی هەر یەکێ لە (بەند)ەکاندا، کە (تەرجیع بەند) یا (تەرکیب بەند)یشی پێ دەوترێ، چونکە ئەو دوا تاکەی هەر بەشێک دووپاتەیە.

**بۆچی حەوت (بەند)ە:**

هۆی ئەوەی کە لە وێژەی کۆندا و بەپێی (دەستووری وێژە)ی کۆن کە پارچە هەڵبەستە (تەرجیع بەند) یا (تەرکیب بەند)ەکە بە(حەوت) بەش دانراوە ئەو لە (حەوت) دانرانە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی هەرە سەرەتاییی (مرۆڤ) و کاریگەریی ڕواڵەتیی سروشتییەکانی وەک (حەوت) دانە ئەستێرەکانی (حەوتەوانە) بەو ژیانە سەرەتاییەی مرۆڤەوە لە بارەی ساڵنامەگەری و (گەردووناسی)دا.
هەروەها حەوت ڕەنگە بناغەییەکەی (کۆلکەزێڕینە = پەلکەزێڕینە) کە لە سەرێنیی ئیسلامێتیی کوردەوە و لە خۆشەویستیی کوردەوە بۆ (کەسە مەزنەکانی عەرەب) وەک (عائیشە)ی ژن و(فاتمە)ی کچی پێغەمبەر (د. خ) کە گوایە هەریەکەیان (حەوت) پرچی هەبووە یا بەهەردووکیان (حەوت) پرچیان هەبووە کە ئەفسانەیەکی ناو کوردەوارییە و گوایە

پرچەکانیان وەک ئەو (پەلکەزێڕینە)یە جوان و ڕەنگین بوون، ئەمەش لە خۆشەویستیی ئەوانەوە بووە.
هەروەها ڕۆژەکـانی (هەفتـە) کـە بە(حـەوت) ڕۆژ دانراون. لە ڕووی داسـتـانـە ئاینیـیـەکـەی (ئەصحـابی کەهف)، کە (٧) کەسـەکانی ناو ئەشکەوتەکە (سێ سەد) و ئەوەندە سـاڵە خەویان لێ کەوتووە.
لە کاتی (حەج) کردندا (حەوت) پێویستیی وەک:
(سەعی) و (صـەفا) و (مەروە) و ئافەرۆزکردنی شەیتان بە(حـەوت بەرد) واتە (ڕەجم) و... هتد.
ئەوەتا دیسـان ژمارەی (حـەوت) لە ژمارەی ئەو بەردانـەشدا هاتووە کە شـەیتـانی پێ (ڕەجم) ئەکرێن.
لە داستانی حەزرەتی (یوسف)دا کە خەوەکەی (عـەزیزی میسر)ی لێکداوەتەوە کە (خەوەکە)ش ژمـارەی (حـەوت) گـا و، (حـەوت) گـوڵەگـەنم و (حـەوت سـاڵ)ی تیـا هاتووە کـە لە قـورئانی پیرۆزیشدا هاتووە. (چین) و (نهۆم)ەکانی (زەوی) و (ئاسمـان) بە(حەوت) طەبەقە دانراون کە لە قورئانی پیرۆزیشدا هەیە.
سـوورەتەکەی سـەرەتای (پێشـەوە)ی قـورئان واتە سـوورەتی (ئەلحـەمد) بە(سبع المثانی) واتە (حەوت دووبارەکراو) ناو نراوە کـە سوورەتی (فاتیحە)یشـی پێ دەوترێ، لە سەرەتای قورئان و خوێندنی نوێژە.
لە کـەلـەپوور (فـۆلکلۆر)ی گـەلاندا کـە نـەتەوەی (کـورد)یش یـەکـێکە لـەوان، ژمـارەی (حـەوت) شـوێنـەوارێکی (فـراوان) و (دیاریکراو)ی گەلی خۆی هەیە وە (حـەوت) بەژمـارەیەکی پیرۆز و پەسـەند دانراوە و بەبەڵگەی جـوان و دڵگیـر و بەنیـشـانەی (ئـازا) و (ئازایی) و هتـد... بەناو گەلاندا بڵاو بووەتەوە.
لە چیرۆکە ئەفسانەییە (گوێ ئاگردانی)یەکانماندا ناوی داستانی (حەوت کوڕ)، (حەوت برا)، (حـەوت دەریا) (ڕاوی حـەوت شـەو و حـەوت ڕۆژ) و (حـەوت ڕێگا)، (حـەوت سـاڵ)، (حـەوت چورتم)، (حـەوت دێو) و... هتـد زۆرن. لە قـوربـانی کـردنـدا (حـەوتم) کـراوەتە نـاوەکـەی.
بەدەستووری وێژەی کۆندا هەڵبەست چەند جۆرێکە لەوانە: تاک، چوارینە، هەڵبەستی پارچەکە لە حەوت تاک کەمتر بێ و، هەر کاتێ بووە (حەوت) تاک بە(غەزەل) ناو دەبرێ (٧ تاکە) و لەوە زۆرتر (چامـە = قـصـیـدە)یە ئەمـجا (حـەوت بەند)ی وەک ئەم هەڵبـەسـتـە فـارسـییـە بالآیەی (کوردی)ی (حەوت) بەشە.
ژمارەی (حەوت)یش کە (تاک)ە و، جووت نییە و خوای گەورەش کە (تاک) و تەنیا و بێ هاوتایە بۆیە هـەر (تاک)ە و لە پیـرۆزیی (تاکـێـتی) خـواوە ژمـارەکـانی وەک (١، ٣، ٥، ٧، ٩ و... هتـد) ئەمانە پیرۆزییەکی تایبەتیان پێ دراوە کە ژمارە (حەوت)یش یەکێکە لەم (ژمارە تاک)انە.
لە نموونەی (حـەوت بەند)ە کـوردییـەکـانماندا (حـەوت بەندی خـانـای قوبادی)، (حـەوت بەندی سـالم)، (حـەوت بەندی ئەحمەد حـەمدی بەگی ساحێبقڕان) و ئەم حـەوت بەندی (کوردی) و...

هتد. ئەم حەوت بەندەی (کوردی)یە لەبەر درێژییەکەی وەک هەر (حەوت) بەندێکی تر کراون بە(حەوت) بەشەوە کە زۆر لە شاعیرانمان هەڵبەستی (حەوت بەند)یان داناوە. کە بەناوبردنیان نامەوێ باسەکە درێژتر بکەمەوە.

**هەڵسەنگاندنی ئەم حەوت بەندە:**

(فەخرولعولەما)ی (سنەیی) (لە وتووێژێکیدا لەگەڵ (مستەفا بەگی «کوردی») کە (کوردیی) بەخاوەنی ئەم (حەوت بەندە) ناو بردووە کە ئەم حەوت بەندەی بەهەرە پۆپەی هەڵبەستەکانی (کوردی) زانیوە کە لەم پەڕاوییەدا و لەو گوفتوگۆیەی ئەو (فەخرولعولەما)یە و (کوردی)دا بەتەواوی دەدوێم.

(ئاغا فاضیل) کە کابرایەکی زانا و خاوەنی گەواهی نامەی بەرز و وێژەوان و هۆنەریش بوو جگە لەوەی کەسێکی پلە بەرزی (دیپلۆماسی) بوو، نوسخەیەکی لەم (حەوت بەند)ەی (کوردی) دامێ و ئەیگوت: (ئەم حەوت بەندە لە هەموو ناوچە وێژەیی (الاوساط الادبیة)کانی (فارس)دا یەکێکە لە هەرە شاکار و بێ هاوتاکانی وێژەی (فارس)، لە بارەی چێژ و کاکڵە و بابەتەکەوە، هەروەها دەیگوت: بەلای هەندێکەوە ئەم (حەوت بەندە) لەمەڕ ستایشی پێغەمبەری ئیسلام (د. خ)وەیە گەلێ گەلێ و زۆرتر لە بەناوبانگترینەکانی پێغەمبەرەوە وەک ستایشە بالایەکەی (شەمسی تەوریزی) و (سەعدی و حافظ)ی شیرازی (فضولی)ی دەژمێررێ، یا (لامییەی عەجەم)ی (طوغرایی ئیسپەهانی) و چامە (قەصیدەی بوردیە)ی (بوصیری) و (بانت سعاد)ی (کەعب کوڕی زوهەیر)ی عارەب و... هتد). ئەمە دەقی ڕای ئەو پیاوە بوو لەسەر ئەم حەوت بەندە.

لە زمانی عەرەبیدا پەندێکی پێشینیان هەیە کە: (شهد شاهد من اهلها)یە واتە: کە گەواهیدەرێکی لە خۆیان گەواهیی لەسەر دەدات) لێرەدا ئەو (ئاغا فاضیل)ە فارسە کە شارەزای وێژەی (فارس و عەرەب و تورک)یش بوو، بەرامبەر بەم (حەوت بەند)ی (کوردی)یەمان ئەمە ڕاوبۆچوونی بوو، کە ئەو نوسخەی ئەم (ئاغا فاضیل)ە، یەکێکە لە سەرچاوەکانی ئەم (حەوت بەند)ەم بەناوی (حم)ەوە لەم پەڕاوییەدا سەرچاوەیەکە.

هەروەها (ئاغا فاضیل) وەک لە پێشەوە ڕای گەیاند کە گوتی: (هەندێک ئەم «حەوت بەند»ە بەستایشی پێغەمبەر «د. خ» دەزانن، هەروەها گوتی: بەلای هەندێکیشەوە ئەم (حەوت بەند)ە بۆ (ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی طالب – خ.)ی داناوە. چونکە (ئاغا)ی ناوبراو (شیعە) بوو، ئەو (حەوت بەند)ە بێ هاوتایەی شایانتر بە(ئیمام) دەدی نەک بە(پێغەمبەر) و ئەمیش ڕاوبۆچوونێکە کە مامۆستا محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی لەسەر ئەم ڕایەیان بوو. کە ئەم ڕایەی لە دەربارییەکەی ئێرانیدا وەرگرتووە.

بەڵام کە بەسەرچاوە زۆرەکانی لای منی زانی کەوا لەسەر ئەوەن کە ئەم حەوت بەندە بۆ (پێغەمبەر – د. خ) دانراوە، بیرەکەی خۆی گۆڕی و هاتە سەر ڕاوبۆچوونی من لە بارەی بابەتی ئەم (حەوت بەند)ەوە. هەڵسەنگاندنێکی تری ئەم حەوت بەندە ئەوەیە کە لە ساڵە

چلەکانی چەرخی بیستەمدا لە سولەیمانی سەرۆکی (بەهایی)یەکانی ئەم شارە (مامۆستا نوورەدین عەباس) بوو کە مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو لە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەییدا، ئەم مامۆستایە بەهۆی ئەوەوە کە لەسەر ئاینی (بەهایی) بوو لەگەڵ چەند خێزانی (بەهایی) تردا دەربەدەر (نەفی) کرابوونە سولەیمانی.

(مامۆستا نوورەدین) پیاوێکی زۆر ڕەوشت جوان و پاک و ڕووگەش و زانا بوو. من (حەمەبۆر) ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەو مامۆستایەدا پەیا کردبوو. ئەو مامۆستایە نوسخەیەکی لەم (حەوت بەند)ی (کوردی)یە دامێ لە ژێر سەرەناوی: (ستایشی حضرت بەهائولڵا)دا کە نوسخەیەکی کەم هەڵە و زۆر تەواوە، مامۆستا دەیگوت ئەم (حەوت بەند)ە بەلای ئێمەی بەهاییەکانەوە بۆ (بەهائولڵا) خەلیفەی (باب) دانراوە. کە مەستەفا بەگی کوردی (بابی = بەهایی) بووە. بەهائولڵا ناوی میرزا عەباس بووە لە ساڵانی (١٨١٧ – ١٨٩٢ز)دا ژیاوە.

سەیر ئەوەیە کە نوسخەکەی (حم)ی ئاغا فاضیل و (مک) لەگەڵ ئەو نوسخەیەی (مامۆستا نوورەدین)ەدا چونیەک بوون و ئەوەکەی (ج) کە لە دوای ئەو نوسخانەوە پێم زانی ناتەواو، بەڵام وەک ئەوان بوو، بۆیە ئەوەکەی (مک)م لە هەرسێ نوسخەی (حم)، (نع) و (ج)دا بەسەرچاوەی ئەوان دەزانم و لە جێی ئەو سێ نوسخەیەی دادەنێم لەم پەڕاوییەدا کە من لە ساڵی ١٩٤٧ز.دا لە لایەن (سەیدیان)ی مەهابادی (خاوەنی چاپ و پەڕاویخانەی مەهاباد)ە نوسخەکەی (مک)م بۆ هاتبوو کە ئەویش لە کەشکۆڵێکی (موعتەمەدی کانی مشکانی)یەوە دەستی کەوتبوو.

(مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم) نوسخەیەکی لەم (حەوت بەند)ە دا بەمن کە لە لایەن (مامۆستا سەید تاهیری هاشمی)یەوە لە ئێرانەوە بۆی هاتووە کە لەم پەڕاوییەدا بە(ط) نیشانەم داوەتێ. کە ئەم (هاشمی)یە بەمامۆستا محەمەدی مەلا کەریمی ڕاگەیاندووە کە: (ئەم حەوت بەندە یەکێکە لە شاکارەکانی ئەدەبی فارسی) و مامۆستا (هاشمی) دیارە لە شیعەوە دەسی کەوتووە، بە(امام عەلی داناوە)، من کەڵکی زۆرم لەم نوسخەیەش وەرگرتووە و سپاسی محەمەدی مەلا کەریم دەکەم.

لەوەدا کە تێکڕای سەرەناوەکانی ئەم حەوت بەندە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەی دواین: (حەفت بەند)، (ترجیع بەند)، (تەرکیب بەند) و (نعت حضرت رسول اکرم) – واتە: پیاهەڵدان و هەڵنانی خاوەن شکۆ نێردراوەی خوا (پێغەمبەری بەخشاترین)، (کوردی) یا (مصطفی بێک) و... هتد... کە ئەم سەرەناوانە لە لایەکەوە بە هی کەسیان دانەناوە و لە لایەکی ترەوە بە هی (پێغەمبەری ئیسلام – د. خ)یان داناوە.

هەرچەندە لە چەند سەرچاوەیەکی کەمدا کە ئەم هەڵبەستە بۆ (ئیمامی عەلی) دانراوە، وەک (ڕایەکەی ئاغا فاضیل) و ڕای سەرەتایی (ڕۆژبەیانی) و ڕایەکی (هاشمی) کە بێگومان ئەمان لە سەرچاوەی دەسنگە و دەسکاریی (شیعە)کانەوە کراوە بە هی ئیمامی عەلی هەڵنان؛ بەڵگەی ئەم سەرچاوەیانەی کە (حەوت بەند)ەکەدا بۆ (ئیمامی عەلی)ی داناوە ئەوەیە کە لە

(بەندی شەشەم)ی ئەم (حەوت بەند)ەدا نیو باڵیی:
«نائب فخر خاندان لؤی» = (نائیبی فەخری خانەدانی لوئەی) هاتووە کە بەم وشەی (نائب)ەدا کردوویانە بە(عەلی) کە گوایە ئەو (نائیب = جێگر)ی ڕاستیی پێغەمبەر بووە کە ئەمەش هەرگیز بە(قاڵەی دەمی شیعە) ناکرێ بەوەی کە بۆ (ئیمام)ە چونکە پێغەمبەر (د. خ) لە نەخۆشیی سەرەمەرگەکەیدا (ئەبوبەکر)ی کردە شوێنگری خۆی کە لەو نەخۆشییەدا پێش نوێژیی ئیسلام بکات لە جێگەی پێغەمبەر کە ئەم کارە بەکردەوە ڕووی داوە نەک بەپیا هەڵبەستنی دەمی، کەواتە ئەم ڕایەی شیعە لە ڕاستییەوە دوورە و ئەم هەڵبەستە بۆ (ئیمامی عەلی) نەوتراوە کە لە (حەوت بەند)ەکەدا تەنیا ئەم (نیو باڵی) بەبەڵگەی هەرە لاواز دائەنرێ. لە خاوەنەکانی ئەم جۆرە نوسخەیانەشدا (ئاغا فاضیل) خۆی (شیعە) و سەرچاوەکەی (شیعە) و هەروەها مامۆستا (هاشمی)ش هەر لە سەرچاوەی شیعەوە وەک مامۆستا (ڕۆژبەیانی)یش هەر لە کاریگەری سەرچاوەی شیعەوە ئەو بۆچوونی دانانی (حەوت بەند)ەکەیان بۆ (ئیمامی عەلی) داناوە.
ئەوانەش کە ئەم (حەوت بەند)یان بەهەڵنانی (بەهائوڵڵا) داناوە:
یەکەم – بەڵگەیان ئەوەیە کە لە (حەوت بەند)ەکەدا ڕستەی (ظهور الحق) ڕواڵەتی ڕاستی (حەق) هاتووە کە یەکێ لە دروشمەکانی (بابی = بەهایی)یەکان لە دوا ڕستەی (ظهور الحق) وە (به هيّ الابهی)یە و بابییەکان لەبەر هەر جوان و باڵاترینێتیی ئەم (حەوت بەند)ەوە (حەوت بەند)ەکەیان بەلای خۆیاندا شایانتر دیوە وەک شیعەکان.
جگە لەو دوو بەڵگە (بەزۆر تێ ئاخنراو)ە ئیتر هەموو تاکەکانی هەر (حەوت بەند)ەکە بەبێ گومان پێغەمبەر دەگرنەوە کەواتە (کوردی) بۆ ئەمی داناوە.
هەرچەندە لە/١٩٩٩ز.دا لە (گرنگ بەگ)ی کوڕی میرانی ئیسماعیل بەگی نووری بەگی ساحێبقرانم، بیستووە کە گوایە(نەوشێروان مستەفا)ی بەلایەوە وەها بووە کە (کوردی) بەهایی بووە و ئەو (حەوت بەند)ەی بۆ بەهائییەکان داناوە.
بەڵام من تا ئێستە نووسینێکی وەهام پێ نەزانیوە کە لە (نەوشێروان مستەفا)ەوە دەرچووبێ و ئەوەش دان پیا دەنێم کە نووسین و بەرهەمەکانی ئەم بەسەرچاوەی باوەڕپێکراو و لێ هەڵهێنجاندنی زانیارانەوە زۆر تۆکمە و پتەون.
دوا ڕاوبۆچوونی بەهێزم بەسەرچاوەی زۆرەوە ئەوەیە کە لە دوای ئەم هەموو ڕاگەیاندنەی ناو ئەم باسۆکەی (هەڵسەنگاندن)ەکە ئەم (حەوت بەند)ە تەنیا بۆ پێغەمبەر (د. خ) دانراوە و بەس.
سەرەڕای ئەوەی کە بەرپرسیار و گەورەکانی (پاشایەتیی بابان) بەتایبەتی و هێز و دەسەڵاتدارە کوردەکانمان بەپێی باری ڕۆژگار بوونەتە دۆست و لایەنگری یەکێ لەو دوو دوژمنە و بە هاریکاریی و هێزی چەکداری ئەو دوشمنە لایەنگیراوەوە کە هەڵیان کوتاوەتە سەر بەشێکی هاوخوێن و هاوئاین و هاونیشتمانانی خۆی و هەرچۆن بووبێ، ئەنجامی ئەمانەش هەمیشە هەر تەنیا (زیان) و (بێ هێز بوون)ی نەتەوەی کورد و دەسەڵاتدارتر و بەهێزتری

دوژمنەکانمان بووە.

٢- از: لە، ژ.

وصال تو: گەیشتن بەتۆ، بەتۆ گەیشتن.

ملک: ولات، نیشتمان.

جان: گیان، جان – ئەم وشەیە لە (ج)دا بە(دڵ) لێک دراوەتەوە کە هەڵەیە چونکە (جان) و (دڵ) لە یەکتری جیاوازن. سەرەڕای ئەوەی وشەی (دل = دڵ) لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە کەواتە ئەوی (ج) زیادەیە.

آباد: ئاوەدان، ئاوا، ئاڤا.

وز خیال تو: لە بیرکردنەوەوە لە تۆ، لە (ج)دا ئەم وشەی (خەیاڵ)ە بە(گومان) لێک دراوەتەوە کە ئەمەش زۆر ئاشکرایە (خەیاڵ) بەواتە (گومان) نییە و لێکدانەوەیەکی یەکجار هەڵەیە و هەرگیز ئەم لێکدانەوەیە لەگەڵ ئەم نیو باڵییەدا ناگونجێ، چونکە نەک هەر ئەم تاکە هەڵبەستە بەشکو هەموو ئەم (تەرجیع بەندە فارسییە) سەراپا بریتییە لە (باوەڕ) کە (باوەڕ)یش پێچەوانەی (گومان)ە و ئیتر (مامۆستا ڕۆژبەیانی) ئەوەندە خێرایی کردووە لە دەستپێشکەری کردنی بەرهەمهێنانی (ج)دا وە دوا بەدوای نووسینەکەیشی چاوێکی پیا نەخشاندووەتەوە بۆیە هەڵەی وەها زەقی لە دەست دەرچووە، ئەگەنا ئەو شارەزاییەکی چاکی لە (فارسی) هەبوو، نەخوازەڵا وشەی (جان) (کوردی)یشە و، وشەی (خەیاڵ)یش تەنانەت نەخوێندەواری کورد بەکاری دێنێ.

(شهر)ە: وشەیەکی کوردی و فارسییە و عەرەب لە ئێمەوە وەریان گرتووە. کە ئێمە بەواتای (شار) بەکاری دێنین، وشەی (شار) سووککراوەی (شەهر)ەکەیە کە عارەب بەواتای (مانگ = ٣٠ ڕۆژ) بەکاری دەهێنن، هەروەک لە کوردیدا، واتای (باژێر) و (شارستان)یش دەدات.

دل: دڵ کە وشەی (دڵ)یش لە فەرهەنگ و، وێژەدا مەبەست لە (سۆز = عاطیفە)یە، وە یا هێما (ڕەمز)ی سۆز و کانگا و شوێنی خۆشەویستییە.

معمور: ئاوەدان، ئاوا، ئاڤا.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە هەموو سەرچاوەکانیدا دووەمین تاکی ئەم (بەندی یەکەم)ەیە.

واتای ئەم تاکە:

(لە گەیشتندا بەتۆ، ولاتی دڵ ئاوەدانە)، (لە تۆ بیرهاتنەوەدا شاری دڵ «وە یا دەروون» ئاوەدانە).

جیاوازییەکانی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا:

از: (عن): با.

از: (سجا): ای.

از: (ج): لە ڕوونووسێکا (ای) نووسراوە، بەڵام دیاری نەکردووە کە لە کام (ڕوونووس = سەرچاوە)دا وەها نووسراوە هەرچەندە لە کام لە سەرچاوەکاندا وەها نەنووسراوە و ئەم

لەسەر نووسینەی بێ بایەخ و زۆرکردنی ناوەڕۆکی بەرهەمەکەیەتی.

وصال تو: (گل/٥، گل/٦): وصالت.

وز: لە (عن): ز: (زو)ە.

وز: لە (سجا): از.

وز: (وەز): لە (ط): در.

وز: لە (ج) نووسـیویە: (لە ڕوونووسـێکا (در) نـووسـراوە. بەڵام دەسـتنیشـانی سـەرچاوەکەی نەکردووە کە ئەمـەش کـارێکی (نابەرنامـەییانە)یە هـەروەک دەرئەکەوێ ئەو (ڕوونووس)ە دیارە (ط) بووە. بەڵام ئەو شێواندوویەتی.

از وصال تو: لە (ف)دا-از نوای وصال تو  نووسراوە- ئەمیش لەنگە و هەڵەی نووسینەوەکەیەتی.

خیال تو: (گل/٥، گل/٦): خیالت – ئەمیش دیسان لەنگە و بڕگەیەکی ناتەواوە.

٣- از صدای تو: لە دەنگی بانگەوازی تۆوە، لە بانگ کردنتەوە (مـەبەسـتی بۆ بوون بەئیسـلام)ە. مەبەست لەو بانگەوازە؛ ئاشکراکردنی ئاینی ئیسلامە بەناو خەڵکدا، بۆ پەیڕەویکردنی ڕێگەی خـواناسی، خـوای یەکـتا و کـردگار و توانا و پەروەردگار و بێ هاوتـا و گرتنی ڕێگەی ئاینی ئیسلام بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە. کە فەرموودەی ئەو خوا مەزنەیە بۆ لادانی کۆمەڵگایەکەی لە پەرسـتنی (بت) و بوونە ئیسـلام و، یا مەبەست لە بانگی پێنج جـار (فرض)ی نـوێژە، لە هەر ڕۆژێکدا؛ کە ئەمانە لە لایەن پێغەمبەری ئیسلامەوە (د. خ)، بەخەڵکی ڕاگەیەنراون.

خفتە: خـەوتوو، خەو لێ کەوتوو، نوستوو، کە مەبەست لە بێ ئاگایانە لە ئاینی ئیسلام کە وەک خـەوتوو لە دەریای نەزانی و گومـڕاییی قۆناغی (جاهیلیـەت)ی عەرەبدا کە پێغـەمبـەر (د. خ) بەبانگەوازەکەی بۆ ئەو (جاهلی)یانە و ئەمجا بۆ هێنانی نەتەوەکانی تر بۆ سـەر ڕێبازی ئاینی ئیسلام.

غفلت: بێ ئاگایی، ئاگا لێ نەبوون، پێ نەزانین کە (کوردی) ئەو خەوتووییـەی بەم (غـەفلەت)ە چواندووە. کـە (عــەرەب) ســەرەتای پەیابوونی ئیـســلامــەتی بێ هـۆش بوون لـە قــۆناغــە (جاهیلیـەت)ەکەیاندا، خوایەکیان دەپەرست کە خۆیان دروستیان دەکرد و بەڵام پێغەمبەر (د. خ) ئەوانی لەو بێ ئاگــاییــیــە وریـا کـردەوە کــە دەبێ خــوایەک بپــەرستن کــە ئەو خــوایە بە(جاهـیل)انەی دروست کردووە و ئەوانەی بەهۆی ئاینی ئیسلامـەوە لەو بارە نەزانییـە ڕسگار کردوون.

گشتـە: (گەشتە): بووە، گەیشـتووە، گەیوەتە، مەبەست لەوەیە کە بەو ئاشـناکردنەیان بەڕێبازی ئاینی ئیسلام لەو خەوی بێ هۆشی و بێ ئاگاییەیان بەهۆش هێناونەتەوە.

بیدار: خەبەربوونەوە لەو خەوە (غەفلەت)ەی (جاهیلی)یەکەیان و لەو خەوەیان ڕابوون.

رستـە: ڕسگار بووە مـەبەست لە ڕسگاربوون و بێـدارەوە بوونە لەو خـەوەیان. ڕەسـتـە بەواتا (ڕەها بوو)، (قوتار بوو)ە.

دل رنجور: – یا – (دڵی ڕەنجوور): دڵ ڕەنجاو، دڵی ڕەنجاو، دڵ ئازار دراو بەخەم و پەشێوی و

ناخۆشی، زەبوون، کەوا (پێغەمبەر د. خ) هەمووانی لەو دژوارییانە ڕسگار کرد. بەڕاگەیاندنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

**واتای ئەم تاکە:**

(لە دەنگی بانگەوازی ئاشکراکردنی ئاینی ئیسلامەوە لە لایەن تۆوە (ئەی پێغەمبەر – د. خ) ئەوانەی کەوا لە خەونی بێ ئاگاییدا بوون)، (ئەوانە بێدارەوە بوون و لە ڕاستی و بوونی خوای کردگار و پەروەردگاری یەکتا و بێ هاوتا گەیشتن و بڕوایان هێنا بەدەقەکانی ئاینی ئیسلام و پێویستیی پەیڕەوی کردنیان، هەروەک دڵ شکاوان لەو تەمی بێ ئاگاییەیان ڕسگار بوون).

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە سەرچاوەکانی: (ف، جا، مک، ط، حم، نم/١، با/١، سجا، ق/٣) وە بەتایبەتی لەوەکەی (ج)یشدا نییە کە بەناڕەوایی و لە خۆهەڵنانەوە بە(شا سەرچاوە)ی داناوە کە سەرچاوەیەکی ناتەواویشە وەک لەم شیکردنەوانەدا بەبەڵگەوە دەردەکەوێ.

هەر ئەم تاکە هەڵبەستە لە هەر (سیانزە) سەرچاوەکەی تردا سێیەمین تاکی ئەم (بەندی یەکەم)ەیە.

**جیاوازی لە نێوان سەرچاوەکاندا:**

گشتە: لە (گل/٥، گل/٦، ص، ما/١)دا: گشت (گەشت) نووسراوە کە کوورییەک دەدات بەکێشی هەڵبەستەکە و واتایەکەیشی ناتەواوە.

رستە: لە (گل/٥، گل/٦، ص، ما/١)دا: (رست) = (ڕەست) نووسراوە و ئەویش لەنگ و ناتەواوە.

٤- بە هوای تو: بەخولیای بەدواداچوونی دەقەکانی (قورئان) و (حەدیث) و پەیڕەوی (سوننە)ی ئاینی ئیسلامەوە کە تۆ (ئەی پێغەمبەر – د. خ) بە(مرۆڤ)ت ڕاگەیاندوون، ئا بەو هەم ئاهەنگی و ئەڤین و بەو تاسە و ئارەزووەوە، بەو گێژ لێ بوون و حەز لێ کارییەوە کە هەموو:

عاشقان: دڵداران کە مەبەست لەوانەیە کە بەڕاستی و لە ناخەوە دڵیان بەئاینی ئیسلامەوەیە، کەواتە هەموو خۆشنوود شادانن کە بەهۆی تۆوە خوا هیدایەتی داون (ڕێنومایی و ئاڕاستەی کردوون کەوا هەموو:

دلشاد: شادمان بن. پێیان خۆش بێت کە خوا بەهرەی بەئیسلامبوونی پێ بەخشیون. کە (عاشق = شەیدا، دڵبەند، و حەز لێ کار)ی ئەو ئاینەتن.

بە ولای تو: (ویلا) = (سەروەرییەتی، دەسەڵاتداری، خۆشویستن، پەیڕەوی کردن، دوورکەوتن)ی مەبەستە.

دوستان: دۆستان، یاران، هاوئاهەنگان، کە مەبەست لە ئیسلامەکانە، لە پەیڕەوکردنیاندا بە(سەروەری) و دەسەڵاتداری و لە ناخەوە بەندیواربوونە بەو (تۆ)یەوە کە خودی پێغەمبەر (د. خ)یە.

منصور: (مەنصوور): سەرخراو، سەرکەوتوو، زاڵبوو، کە مەبەست لە سەرکەوتنە لە بەهرەی بەئیسلامبووندا.

**واتای ئەم تاکە:**

(بە – هەوای – واتە یاد و شەیدایی گرتنی ڕێبازی تۆوەیە، کە دڵداران شادمانن). (هەروەک بەدواکەوتنی شکۆداری و سەروەرێتییەکەی تۆوە ئەی (پێغەمبەر د. خ) کەوا دۆستان (هاوئاینە ئیسلامەکان) بەجارێ لە بوونە ئیسلامەتییەکەیاندا سەرکەوتوون چونکە لە ڕێگەی (بت پەرستی) لایان داوە کە بەرەو دۆزەخی نەبردوون و ئەوانە بەو بەئیسلامبوونەیان بەچوونە بەهەشتەوە، بەهرەمەندی سەرکەوتن دەبن.

ئەم تاکە هەڵبەستی چوارەمەی سەرەوە لە (ص)دا نییە و لە (ف، مک، ط، جم، نم/١، با/١، سجا، ق/٣، ج)دا سێیەمینە و، لە سەرچاوەکانی تردا چوارەمینە.

بەهوای: لە (ف، جم، سجا، نم/١)دا نووسراوە: (در هوای).

بە ولای تو: لە (گل/٥، گل/٦)دا نووسراوە: (ولایت کە). کە ئەمەش هەڵە و لەنگییە.

منصور: لە (ف)دا نووسراوە (مخمور) کە ئەمەش ناگونجێ و پاش و پێشە.

منصور: لە (گل/٥، سجا، ما/١، نم/١، جم)دا نووسراوە: مسرور (مسروور) – بەرامبەر بەم هاتنی وشەی (مەسرور)ە لەم پێنج سەرچاوەیەدا مامۆستا ڕۆژبەیانی نووسیویە: (لە ڕوونووسێکدا لەباتی (منصور)، (مسروور) نووسراوە، بێ گومان (منصوور) لەگەڵ (ولا) ڕێکترە، ئەگەر مەبەست لە دەسەڵات و ئاغایەتی بێ، ئەگەر مەبەست خۆشویستن بێ ئەوا (مەسرور) باشترە.

٥– گمرهان: ڕێ گوم کردووەکانی، گومڕایان، ڕێ لێ تێکچووان، ڕێگە بزرکردووانی.

مەبەست لەم ڕێ گوم کردووانە سێیانە:

یەکەم – مەبەست لە ڕێ گومبوونەکەی حەزرەتی مووسایە (د. خ) کە لە دەرە (وادی المقدس)دا لە شەوێکدا، لە (مەدیەن)ەوە بەرەو (طووری سینا) و (میصر) دەگەڕایەوە، ژنەکەی و مەڕەکانیشی لەگەڵ بوو، لە سەرماندا تەزی بوو. هتد. کە لە تاواندا لەو ڕێگەیەیدا سەرسام (حیرەت) بووبوو، کە خوای مەزن فریای کەوت لەو دۆڵی (طووری سینایە)دا. ئەو فریاکەوتنەی خوایە و، (نەخل) واتە دارخورمای بەردار دابوو بۆ مریەم لەو (نوور)ی ڕسگاربوونەیان لە خواوە، گەرم بوونەوە و تەزینی سەرمایەکەیان نەما، بۆ گومبوونەکەیان ڕێگەیان دۆزییەوە.

ئەمەش وەک نموونەیەکە کە سایەی پێغەمبەری ئیسلام (د. خ) وەک ئەو فریاکەوتنە وایە بەسەر بڕواکردووانەوە.

دووەم – مەبەستی دووەم لەو ڕێگە گومکردنە، سەرگەردانییەکەی (مریەم)ی دایکی حەزرەتی عیسا (د. خ)یە کە لە شەرمی منداڵبوونە بێ مێردییەکەیدا لە ناو باخێکی شاری (بیت الحم)ی چەند کیلۆمەترێک دوور لە شاری (قودس)ەوە کە وەک جۆرە گومبوونێک بوو، بەڵام ئەمیش خوا فریای کەوت لە بن (دارخورما)یەکەدا وەک لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

ئەمەش نموونەیەکی تری مەبەستی (کوردی)یە کە ئەو فریاکەوتنی خوایە بۆ (مەریەم) وەک سایەی دارخورمایی و پەرتەوی خوای مەزن، واتە بڕوا بەخوا و پێغەمبەری ئیسلام (د. خ)

وەک سایەی ئەو پێغەمبەرە وەهایە لەسەر برواکردووان.
سـێـیـەم – مـەبەست لەو ناوبردنـی ڕێگە گـومکردنە، ئەوانـەن کـە لە نێـوان بوونە ئیـسـلام و (بتپەرستی)دا سەرسام بوون کە کام ڕێگەیان ڕاستە (سایە) واتە دەرکەوتنی پێغەمبەرێتی لە (محەمەد) «د. خ»دا و ڕێنومایی کردنی ئەو بۆ ئەو سەرسامانەی بەو سایەی بوونەتە ئیسلام، هەم (خۆرشتی) وەک خورمان کەم مریەم و، پەرتەوی خوایی بۆ برواکردنی ئەو گومڕایانە و خستنیان بۆ سەر ڕێگەی وەک ئەوی لە (دۆڵی طوور) وە یا ناو باخەکەی (بیت الحم) و لەو (سایە)یە بەهرەوەربوون بەگرتنی ڕێگەی بوون بەئیسلام، یا ئەوانەی دوای ئیسلامبوونیان لەو ڕێگەیە لایان دابوو بەڵام هێزی سایەی ئاینەکەی کە ئەو پێغەمبەرە گەڕانەوە کە (کوردی) سایەی هەمیشەیی و بۆ هەتا هەتایی پێغەمبەری بەڕێگەی ڕاست دۆزینەوە چواندووە.
طریق: وشـەیەکی عـارەبییـە بەواتـە (ڕێ)، (ڕێگە) و مـەبەسـتی لە ڕێگە گـومکردنەکـەی ئەو سەرسام بووانەیە کە لە نێوان (گومان) و (باوەڕ)دا سەرگەردانن و سایەی پێغەمبەر (د. خ) فریایان دەکەوێ کە گرتنی ڕێگەی (باوەڕکردن) بەئیسلامەتییە وەک (سەرسامی) و تەزینەکەی (مووسا پێغەمبەر) و تەنگاوی مریەمی دایکی عیسا پێغەمبەر کە سایەکەی پێغەمبەری (ئاینی ئیسلام)ەوە خوا فریایان کەوتووە.
حیرترا: هی سەرسامی واتە سەرسامییەکەی ڕێگە گومکردن و لێقەوماوییەکەیان وەک لە سێ نموونە و مەبەستەکەی سەرەوەدا ڕوونم کردەوە.
سایەات واتە (سایەت) سێبەرت، کە مەبەست لە باڵ کێشانی پێغەمبەر (د. خ)یە بەسەر ئیسلاماندا بەرێزەوە چاک و پیرۆزە ئیسلامییەکاندا.
نخل و: دارخورما، هی دار قەسپ، (کوردی) سایە (سێبەر)ی بەواتە ئاینی ئیسلام، بەسایەی ئەو دارخورمایە چواندووە کە خوای مەزن لە باخەکەی شاری (بیت اللحم)دا بۆ (مەریەم) دایکی (حەزرەتی عیسا) پێغەمبەری ڕەخساند (د. خ) کە لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە: خوا بە(مریەم)ی فەرمووە، بنکی دارخورمایەکە بهەژێنە و لە بەری خورما گەیوەکەی بخۆ (وَهُزِی جزع النخلة...) کە خوای گەورە لەو تەنگاوییەی (مەریەم)دا و لە مەترسیی توانج و تانووت و ناو و، ناتۆرەی تاوانبارکردنیدا بە(داوێن پیسی) پیا هەڵبەستنی کۆمەڵگایەکەی کە لەگەڵیاندا ئەژیا و، جگە لە هەستی ئەو شەرمەزارییەی، ژان و ژووری مناڵ بوونەکەیشی ئەوەندەی تر بێ ئارامیان کردبوو، کە هێشتە مێردیشی نەکردبوو، لەو کاتە ناخۆشەیدا لە خواییەوە بانگی: هاتنەوە سەرخۆی لێ کرا و بەو (زستانە) بنکی ئەو دارخورمایە ڕابوەشێنێ و خورمای تازە گەیشتووی بۆ ئەوەرێتە خوارێ و لێی بخوات و خوا هەموو کارێکی بۆ ئاسان دەکات و ژانی نامێنێ و چاری مەترسییەکەی دەکرێ و شەرمەزاریی لەسەر هەڵدەگیرێت و هەر لەوێ حەزرەتی عیسا پێغەمبەری بوو (د. خ) کە پاکانەی بۆ دایکی کرد.
(کوردی) لە نیشانە بۆ کردنی (دارخورما)دا مەبەستی چواندنەکەیەتی بە(سایە)ی محەمەد پێغەمبەر (د. خ) بۆ سەر لێشێواوان و، ڕێگە گومکردووان وەک سایەی (دارخورما)یەکەی لە

(مـەڕ مـەریەم) لەو کـاتە تەنگوچـەڵەمـەیدا و ئارامکردنەوەی وەک لـە ئایەتەکـانی (٢٢ – ٢٦)ی سوورەتی (مەریەم) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.
لەم نیو باڵی دووەمـەدا لە سەرەتایەوە هەتا ئەم (نخل): واتای سەربەخۆی تایبـەت بەخۆی هەیە کە (سـایـەی) واتا (سێبـەری) و مـەبەست لە گەورەیی پێغـەمبـەر (د. خ)یە ئەو سـایەیە وەک (سێبـەر) و (بەر) ئەو دارخورمایەی دایە کە حەزرەتی (مـەریەم)ی دایکی (عیسا پێغەمبەر) (د. خ) لە سێبەریدا مناڵەکەی بوو کە (عیسا = یەسووع) بوو و لە بن دارخورمایەکەدا حەسایەوە.
نور: پرتەو، رووناکی، رۆشنایی.
وادی طور: دۆڵی طوور.
ئەمجا (نوور = پەرتەو) کە مەبەست لە دوو کارەساتەکە لە (دۆڵ و دەرەی طوور) واتە (طووری سینا)دا روویان داوە.
**یەکـەم کـارەسـات** – مـەبەست یا نیـشـانـە بۆ ئەو ترووسکە ئاگـرەیە کـە خـوای مـەزن رەخساندوویەتی بۆ حەزرەتی مووسا پێغەمبەر (د. خ) کە لەو شەوەدا لە سەرماندا تەزیبوو، لە سـایەی خواوە (مـووسـا) لەو (وادی المقدس)ە واتە (دۆڵە پیرۆزەدا و لەو لێقەومـانەیدا لە کـاتی گەڕانەوەی بۆ (میصر)دا و لەو کاتەدا دەنگێکی خوایی لە نـاو ئاگرەکەوە بانگی لە (مـووسـا) کرد، کە لەو شـەوەوە مژدەی پێغـەمبـەرێتیی پێ بەخشـراوە لەگەڵ توانای کاری لە ڕادەبەدەر (موعجیزە) نواندندا و، پووچکردنەوەی کاری جادووگەران.
(کوردی) مەبەستی لەو (نور)ە، تیشک و گەرمایی ئاگرەکە بووە کە مژدەی بوونە پێغـەمبەرێتی و بەتوانای دراوە بە(مـووسـا) کە سـایەی محـەمـەد (د. خ) بۆ بڕواهێنەکـان بەئیسـلام وەک ئەو (نور)ە وەها بووە.
**دووەم کارەسات** – کە (کوردی) مەبەستی بووە لەم کۆتاییی نیـو باڵی دووەمـەدا نیشـانەیە بۆ ئەو کاتەی (حـەزرەتی مووسا) لەگەڵ خوای مەزندا لە وتووێژدا بووە و لە خـوای خواستووە کە (خـوا) خـۆی پیـشـانی (مـووسـا) بدات، خـوا بەئایـەتی (لن ترانی) واتە نامـبـینـی وەڵامی (مووسا)ی داوەتەوە و کە (مـووسا) لەسەر خواستەکەی خۆی سـوور بووە، خوا فەرموویەتی دە بڕوانە ئەو (کێو) و (دۆڵ)ی (طوور)ە و بە(پەرتەو)ێکی خوایی کە بەر کێوەکە کەوتووە ئەو دۆڵ و کێوە بەیەک پارچە بووەتە کۆی زووخاڵی ڕەش و بـووەتە (کل) لە بۆ چاوڕشتن کە لەو ڕەشییە وەردەگیرێ بۆیە لە ئیسلامەتیدا (کل) بۆ (چاوڕشتن) بەپیرۆز دەزانن، چونکە پێغەمبەر (د. خ) چاوی پێ ڕشتووە، واتە بووەتە (سوننەت)ی پێغەمبەر و ئیسلامەکانیش چاوی پێ دەرێژن.
هـەروەها (مـووسـا پێغـەمبـەر) لـە بینینی ئەو کـارەسـاتی سـووتانـی (دۆڵی طوور) کەوتووە و لە هۆش خۆی چووە و لە قورئانی پیرۆزدا بە(خَرَّ مووسی مریعا) ئەو کەوتنەی مووسا ناوبراوە...)
هـەر لەبەرئەوەیشە کە ئەو (دۆڵی طوور)ە بە(وادی المقدس) ناونراوە.
(کوردی) لەم مەبەستی کارەساتەی دووەمەدا نیشانەکردنە بۆ ئەوەی کە سایەی پێغەمبەر وەک ئەو پەرتـەوی خـواییـیـە وا بـووە کـە توانایی خـوایی دەرخـسـتـووە، ئەو سـایەیەی لـەسـەر

ئیسلامەکان و ڕێنومایی کردنەکەیەتی بۆ پتر نزیکبوونەوە لە خوا، هەروەک بەرکەوتنی ئەو پەرتەوە (لە دۆڵی طوور) ئەوەندەی تر بڕوای مووسای بەخوا بەهێزتر کردووە. هەر بەو چەشنەش (سایە)کەی پێغەمبەر گومڕایان و سەرگەردانانی نەزانی و خوا نەناسانی ڕێنومایی کردووە و دەکات.

لە کوردەواریدا سایە بەواتە (گەورەیی)، (پیاوەتی)، (چاودێری) و... هتد...یش دێت وەک دەوترێ: لە سایەی تۆوە واتە لە گەورەیی و چاودێریی تۆوە.

لە سەرچاوەی (ج) واتە تەنیا لە نوسخە ناتەواوەکەی (مامۆستا ڕۆژبەیانی)دا وشەی نوور = پرتەو، تیشک، ڕووناکی، ڕۆشنایی بەشێوەی وشەی «نەور»ی فارسی لێک دراوەتەوە کە گوایە «نوور» نییە «نەور»ە کە «نەور»یش بەواتا (گۆپکەی گوڵ و گەڵای دار)ە کە ئەوەش دەبرێتەوە بۆ چیرۆکی ئەو دارخورما بەرداره لەو زستانەدا بۆ مریەم. بەڵام ئەمە لێکدانەوەیەکی دروست نییە، چونکە وشەی (نەور)ەکەی (مامۆستا)ی ناوبراو بەپێی (فەرهەنگی عەمید) کە لە بڕواپێکراو و زانیارانەترین فەرهەنگی فارسییە لەوێدا (نەور): (گۆپکەی دار و خونچەیە)، ئەمجا دارخورما نە گۆپکەی هەیە و نە خونچە و لێکدانەوەکەی (ڕۆژبەیانیش کە پڕ بەپڕ نییە گوڵ و گەڵا گۆپکەیان نییە کە ئەو (گوڵ و گەڵای دار)ی بە(گۆپکەدار) داناوە.

وادی: دۆڵی، شیو، زوورگ دەرە و هەڵەتەکانی، دەگرێتەوە کە مەبەست لە (دۆڵی طوور = وادی المقدس)ە کە جگە لەم واتایانەش واتای (گۆشەی خانوو، سنووری شتێک وە یا تەنشتی هەر شتێک دەدات.

طوور: جگە لەم واتایانەش واتایە بۆ:

یەکەم: ڕێز، هەڵەت و زوورگ، هەروەها کێوێکە دەکەوێتە بیابانی (سینا) و، لە نێوان وڵاتەکانی (فەلەستین) و (میسر) و (سعوودیە)دا و لە ژووروویی (سینا)وە نزیک بە(قەناتی سوێس)ی نێوان دەریای (سوور – قلزم) وە دەریای (سپی ناوەند = میدی ترانە)دا.

لە هەمان کاتدا (طوور سینا)یشی پێ دەوترێ و لە قورئانی پیرۆزدا بە(طوور سنین) ناوی هاتووە لە ئایەتی یەکەمی سوورەتی (التین)دا کە حەزرەتی مووسا لەوێ لەگەڵ خوای مەزندا دواوە، لەبەرئەوە (شاخی مووسا)یشی پێ دەڵێن.

شاعیرمان (کوردی) مەبەستی لەوە بووە وەک چۆن خوا ڕێنومایی حەزرەتی (مووسا)ی کردووە ئە ئاوەهایش پێغەمبەری ئیسلام (د. خ) ڕێنومایی کردووە بۆ گومڕایان.

دووەم: لە ناوەکانی تری ئەو (طوور)ەی لە پێشەوە لێکم داونەتەوە ناوی (طابور) وە (تابوور)یش هەن، جگە لەوەی کە (طوور) جگە لەو (طوورەی سینایەی لێکم داوەتەوە ناوی شاخ و دۆڵێکی ترەوە لە وڵاتی (فەلەستین)دا کە لەوێدا حەزرەتی عیسا پێغەمبەر (حەواریون)ەکانی ئاشکرا و دەستنیشان کردوون و بۆ بەئەمیان بەپیرۆز دانراوە لە لایەن برا و خوشکە (فەلە)کانمانەوە هەروەها (محەمەد) (د. خ) دۆستانی خۆی دیاری کردوون.

کە (کوردی)مان لەوانەیە نیشانەی بۆ ئەم (طوور)ەش کردبێ، بەوەدا کە سەرچاوەی ڕێنومایی

کردنە وەک (سایە) و (نوور)ی (محەمەد) دروودی خوایان لێ بێ، بۆ گومڕا و داماوەکان. هەروەها گەلێ شوێنی تر هەن بەم ناوەوە کە بەلای منەوە دوورن لە مەبەست و ناویان نابەم.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (صا)دا نییە لە (ف، مک، ط، جم، نم/١، با/١، سجا، ق/٣، ج)دا چوارەمینە، چونکە ئەمانەیان یەکی یەک تاکە هەڵبەستیان لەم پێنج تاکەی پێشەوەدا ناتەواوە، لەوانەدا وەک دەبینرێ سەرچاوەی (ج)یشیان تیایە.

گمرهان: لە (مک/ج)دا نووسراوە (مگرهان) کە دیارە ئەمەش یا هەڵەی نووسینەوە یا ئەوی لە سەرچاوەیەکی ترەوە (گم/رهان)ەکەی وەرگرتووە کە بەرێنووسی کۆن نووسراوە (گمرهان) ئەو بە(مگرهان)ی وەرگرتووە، کەچی مامۆستا (ج) لە نووسینەکەی (ج)یدا (مەگەرهان)ەکەی دەستبەسەرا گرتووە و بۆ جیاکردنەوە و دیاریکردنی ئەم تاقە سەرچاوەیەی خۆی ئەم وشە هەڵەیەی (مەگەرهان)ی بە: واتای «ئەشێ ئەو، تۆ بڵێی ئەو، دەبێ ئەو» لێک داوەتەوە کە ئەمەش پینە و پەڕۆیەکی ڕزیو ئاساییە کە بەسەرنجدانی ئەم لێکدانەوەیەی دەردەکەوێ لێکدانەوەیەکی لاواز و نەگونجاوە و هەر خودی (مامۆستا ڕۆژبەیانی) دوا بەدوای ئەم لێکدانەوە چەوتەی نووسیویەتی: «لە ڕوونووسەکەی کاکە حەمەی مەلاکەریمدا ئەم (مەگەرهان) بە(گومڕەهان) نووسراوە کە ئەم (گومڕەهان)ەش زۆر ڕاستترە، ئەگەر (سەید طاهیر هاشمی) بەسەلیقەی هەستیاری خۆی دەسکاری نەکردبێ.

سایەات: لە (ف)دا نووسراوە: سایەاست.

سایەات: لە (مک، ط، ج)دا نووسراوە: (سایەی).

نخل (نخل): لە ڕوونووسەکەی لای (مامۆستا عەلائەدین سەجادی)دا لەباتی (نەخل) نووسراوە (کۆە) = کێو، کە هەڵبەستەکە لارە سەنگ دەکات.

نخل و نور: لە سەرچاوەکانی: (ف، جم، نم/١، حم، با/١، ق/٣، سجا، مک، ط، ج)دا نووسراوە: (نور نەخل) واتە لەم سەرچاوەیانەدا بەپێچەوانەی ڕاستییەوە وشەی (نوور) پێش وشەی (نخل) خراوە، ئەمەیش جگە لەوەی لە سەرچاوە کۆنە باوەڕپێکراوەکاندا وەها نییە بەشکو: (نخل و نور)ەکە ئەوەش هەڵە و نەگونجاوییە و دیارە لە هەڵەی نووسینەوەوە یا لە تێنەگەیشتنی نووسەرەکانیەوەیە بەپێی ئەم لێکدانەوانەم:

یەکەم – وشەی (نور) لە ڕووی زمانەوانی (فەرهەنگی)یەوە (دژ)ی واتای (سایە) واتە (سێبەر)، هەروەک (نور)یش خۆی سایەی نییە و خودی پێغەمبەری ئیسلام (د. خ)یش لە (نوری خوا) ئاوێتە بووە و، وەک دەڵێن: ئەمیش سێبەری نەبووە چونکە (نوور سێبەری نابێ) کەواتە ناشێ وەک لەو سەرچاوانەدا هاتووە کە (نوور) بکرێ بە(سایە) بەڵام ئەگونجێ بوترێ (سایەئەت) واتە گەورەییت، وەک (نور)ە، کە بێ گومان (کوردی)مان ئەمەی مەبەست بووە چونکە بەپێی دەستووری وێژەی کۆن (یەکخستنی دوو وشەی وەک «نور» و «سایە»دا لە یەک شوێن «تاکە هەڵبەست»دا بەجوانکاری و بەوردی شاعیرەکەی و توانایییەکەی دانراوە»، چونکە بەو دژایەتییە فەرهەنگییەی: (سایە = ڕەشی و تاریکی) واتە (بێ نووری)یە و (نور)یش

ڕۆشنایی و پەرتەو دەگەیەنێت.
دووەم – نەخل بەواتە (دارقەسپ) و ئاشکرایشە کە ئەم دارە (نور)ی نییە بەشکو سێبەری هەیە بەوەی کە بەری ڕووناکی (نور)ەکە دەگرێت و، بەری (خورما = قەسپ)یش دەدات، کەواتە ناگونجێ بوترێ: (نووری نەخل) واتە (نووری دارخورما)، وەک لە سەرچاوە کۆنە ڕاست و باوەڕپێکراوەکاندا هاتووە کە لە دەقی گوتنەکەی (کوردی)دا دەشێ (بەر) و (سایە)ی دارخورما (نەخل)ە بچوێنرێت بە(خۆشی)یەکی وەک (ڕووناکی)، خاڵانەی ئەوەی کە خوای مەزن (دارخورما)یەکەی بۆ (مەریەم) ڕەخساندووە کە بەبەر و سێبەرەکەی خۆشییەکی دڵ ڕووناککەرەوە بووە لەو برسێتی و ماندوویێتییەی (مریەم)دا لە باخەکەدا کە خۆی شاردۆتەوە لەوێدا مناڵەکەی زکی دابنێ و... هتد.
سێیەم – لەم شیکردنەوانەوە دەردەکەوێ کە (مامۆستا ڕۆژبەیانی) نەگونجاوییەکەی تەنیا نوسخە ناتەواوەکەی خۆی خستۆتە پشتگوێ و ناوی نەبردووە و بە(چڕنووک گرتن و سیخورمە وەشاندن) لەم یا لەو نوسخەی تر (گێرەشێوێنی)یەکی کردووە کە نەگونجاویی ئەو نوسخەیەی خۆی بکات بەژێرەوە و، خوێندەواران بەلاقرتێ کاتی خۆی خەریک بکات.
چوارەم –وادی طوور بەتێکڕایی دارخورمای تیا نییە و تیا نەبووە؛ چونکی سروشتی ساردی نزیک ئاوەکانی دەریای سوور و دەریای سپی ناشێ توخمی دارخورمای تیا بڕوێت کە ئەویش ئەو شوێنەیە کە حەزرەتی مووسا ئاگرەکەی تیا هانا کردووە، وە ئەو شوێنەیشە کە بەدەرکەوتنی پرتەوی خواییەکە شاخی توور ڕەش هەڵگەڕاوە وەک لە پێشەوە لێی دوام، بەڵام ئەو شوێنەش نییە کەوا مەریەم (عیسا پێغەمبەر)ی لێ بووە (د. خ).
کەواتە دەقی ئەم نیو باڵییەی دووەمی تاکە هەڵبەستەکە بەم جۆرە بووە و ڕاستە:
(سایەات نخل و نووری وادی طور)
کە سایەی پێغەمبەری ئیسلام بەپێی مەبەستی (کوردی) سێبەر و بەری دارخورمایەکەی لەمەڕ (مەریەم) بووە کە لە دڵی (مەریەم) وەک (نور)ەکەی (دۆڵی طوور)، کە ئەمەشیان دروست و گونجاوە نەک (نخل و نور) کە تەنانەت ئەم هەڵەیە لە نوسخە تاکانەکەی (ج)دا هاتووە کە (نخل و نور) ناگونجێ و هەڵەی نووسینەوەی تێنەگەیشتوانەی دەستاودەست کردنەوە پەیا بووە.
مامۆستای ناوبراو لە سەرچاوەی (ج)یدا ئەم دوا لێکدانەوەیەی لەم سەرچاوەیەیدا نووسیوە: (مەگەر هەر بۆ ئەو ڕێی سەرگەردانییە تاپۆیەکی ڕووناکی دارخورمای شیوی طوور و بەپێی ڕوونووسەکەی کاکە حەمەش: «تۆی بۆ گومڕایان و سەرگەردانانی ڕێی وێڵ، سێبەری ڕووناکی دارخورمایی ناو هەردەی طوور» نووسراوە) کە توور دارخورمای نەبووە و دارخورما نووری نییە و لە (طوور) نەبووە لە بیت اللحم بووە. بۆ ئەم دوا دەقەی نووسەری (ج) دەخەمە بەردەست و سەرنجی خوێندەوارە بەڕێزەکان و من لێ بێ دەنگ دەبم تاکو ئەوان دادوەریی تێدا بفەرموون.

**لێکدانەوەی گشتیی ئەم تاکە هەڵبەستە:**

سـایـەی تۆ (ئەی پێـغـەمـبـەر) بۆ ڕێ گـومکردووان وەک پەیـابوونی ئەو بـەر و سـێـبـەری ئەو دارخورمـایە وایە کە خوای مـەزن بۆ (مەریەم)ی ڕەخسـاند کە (عیسـا)ی لە بنـدا بوو و لە بنیدا حـەسـایەوە و لە بەرەکـەی خـوارد، هـەروەهـا ئەو سـایـە گەورەیـیـەک وەک ئەو تـرووسکـەی ئـاگـر و پەڕتەوە خـواییـە وایە کە خـوای مـەزن پیشـانـی حەزرەتی مـووسـای دان و بوونە ڕەهـبـەری ئەو پێغەمبەرە وەک تۆ بوویتە ڕەهبەری بڕوا پێکردووانت.

٦- می کشـان: بادەخۆرانی، مەیخۆران، بادەنۆشان، مەیگ وساران.

حقیقت: ئەم وشەیە لە (حەق) و (حەقێتی) پێک هـاتووە.

(حەق)ەکەیان ناوەکانی خوای مەزن و ڕواڵەتەکانێتی.

حـەقـیـقـەت: بریـتـیـیـە لـە بوونێـتـیـی هـەمـیـشـەیی و هـەتا هـەتـایی و چۆنێـتـیی هـەر شـتـێکە بەشێوەیەکی جێگر و ڕاست و پێویست، بەوپەڕی تەواوەتییەوە بەڕادەیەک لە (ژیری) هەسـتی پێ دەکات و بڕوای پێ دەهێنێت.

لەم دەراوی بڕوا پێکردنەیشـەوە، بەلای (صـۆفی)یەکانەوە ڕێڕەو و شـتێک دێتە ئاراوە کە بۆ: لە خـوا نزیکبوونەوەیە، ئـەمیش ڕێڕەوە جیاجیـاکانی (صـۆفی)یانەیە، کـە هـەریەکەیان بەبیـروڕا و بڕوای تـایبـەتی بۆچوونی خـۆی بۆی دەچێت. بەڵام بـنچـینەی هـەمـوویان هـەر یـەکـەنـاسـی (وەحدانیـەت)ی بوونی خـوای مـەزنە کە لـە (طەریقـەت)ەکانی وەک (قـادری) و (نەقشـبـەندی) و (شـازلی) و (ڕەفـاعی) و (مـەولەویی ڕۆمی) و... هـتددا کـە بەلایانەوە ئەو (حـەقیـقـەتگەری)یە و مـەرجـەکانی هـەریـەک لە (طەریقـەت)ەکـان وەک جۆرە بادەیەکی خـواییـە و پێی سـەرخـۆشـی ناسـینی خـوایی دەبن بەوە لە پەیوەندی و بەند و باوەکـانی جـیـهـانـی دوور دەکـەونەوە و، ئەوەندەی ئەو دوورکەوتنەوەیەیان لە خوای مەزن نزیکتر دەبنەوە.

عرفان: زانینی نهێنییـەکانی خواییـە لە دەقە ئاینییەکانەوە و، ئەوی لە پەیکاری ئەم زانینەدا بێ، لە صـۆفیـە پێشکەوتووەکاندا ئەو کەسـە گەلێ قـووڵتر لە ڕواڵەتـە نادیارییەکاندا ڕۆ دەچێ وەک سەرەتایەکی ئەم قۆناغی (عیرفان)ە.

سـەرەتای ئەم ڕێڕەوەیش لە دەربڕینی فـەیلەسـووفە (یـۆنانی) و (ڕۆمـانی)یەکانەوەدا کـەوتووە و بڵاوبووەتەوە. لە پێشـترا ئەم فەلسـەفەیە (مەسـیحییە ئاینییـەکان) قۆزتوویانـەتەوە و توانیویانە لەگەڵ ئاینی عیسـاییدا بیگونجێنن.

دوای ئەوان بەهەمـان شـێوە ئـاینییـە ئیسـلامـەکان وەریان گـرتووە و کـاریان تێـدا کـردووە و ئەمانیش لەگەڵ ئیسلامەتیدا گونجاندوویانە، بەو ڕێباز و بڕوایەی کە (ژیری)ی مرۆڤ، توانایی گەیشتنە (کەم یا زۆر)ی تێگەیشتنی حەقیقەتە خواییەکان و ئەو نیاز و بڕوایەش بۆ ئەوەیە کە مـرۆڤ هـەرچی زۆرتر بتوانـێ خۆی لە بەند و باو، وە پێوەندیدار بەجیـهانییەکان و (دەروون = نەفسی خـۆی لە ئارەزووە جیـهـانـیـیـەکان ڕسگار بکات). ئەویش نایەتە دی مـەگـەر بەهەرچی زۆرتر لە زانـینی ئەو حـەقـیـقـەتە بۆ ئـەم کـارەش لە (پوخـتـەکـردنی دەروون = تزکـیـة النفس)

پێویستە و هەر ئەم کارەش بەپلە پلە دێتە دی.

ئەمجا ڕێڕەوە صۆفیگەرییەکان هەریەکەیان بەپێی بیروڕا و بروا و بۆچوونی تایبەتی خۆی پەلوپۆی لە (صۆفیگەری)یەکەی خۆی لە ڕێبازەکەی خۆی کردووەتەوە.

(کوردی) بیروڕا و بۆچوون و بڕوای تایبەتی خۆی بۆ لە حەقیقەت گەیشتن و بۆ گەیشتنە سەر (ڕێڕەوی عیرفان)، فەلسەفەیەکی تایبەتی خۆی هەبووە کە لە سەرچاوەی ڕێبازە صۆفیگەرییەکانەوە هەڵی هێنجاوە و لە زۆربەی نەک ئەم (حەوت بەند)ەدا بەشکو لە زۆربەی هەڵبەستەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، کە ئەم حەوت بەندە یەکێکە لەوانە کە لەم تاکە هەڵبەستەیدا نیشانەی بۆ ڕاستی و دروستیی ئەو (عیرفان)ە کردووە.

هەروەک لە سەرەتای لێکدانەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەوە لە (بادەنۆشان)ی ڕێبازی حەقیقەت دوام (کوردی) لەو (بادەنۆشان)ە مەبەستی لە (بادەنۆشان)ی ڕێبازی (عیرفان)یش بووە و ئەمجا چووەتە سەر نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستە و فەرموویەتی:

از خم: لێرەدا (از) (خم) = کووپە، یا هەر کاتەی بادە (مەی) تیا دانان کە ئێستە بە(قەڕابە) ناو دەبرێ.

خلّر (خوللەری): ئەم وشە (کوردی) و (فارسی)یە ناوی هەرە چاکترین (بادە) یا (شەراب)ێکی بەهێزە لە مەستکردندا لەبەر کۆنێتییەکەی و بەشێوەیەکی شارەزایانەترین گیرابێتەوە هەروەها وشەی (خوللەر) بەواتە خڵتە و پاشماوەی بادە – یا – شەرابی بادەنۆشانە کە بەپێی بیروڕای صۆفیەکان؛ بادە – یا – (شەراب)ی (حەقیقەت) و (عیرفان)ە بەشکو مەبەستیان لە خودی (قورئان)ی پیرۆز و (حەدیث) و بگرە (سوننەت)ەکانی پێغەمبەر یا هەر خودی پێغەمبەرە (د. خ). کە ئەو سەرچاوە و هێنەری (قورئان)ە بۆ مرۆڤ و خاوەنی فەرمودە (حەدیث) و (سوننەت)ەکانێتی کە پەیڕەوانی ڕێگەی (حەقیقەت) و (عیرفان) پێ مەستن.

تواند: هی خودی تۆن، (کوردی) بەم وشەی (تواند)ە فەرموودەکەی خۆی و مەبەستی خۆی لەم وشەیەدا یەک لایەنە جێگیر کردووە کەوا ئەو سەرمەستانەی (حەقیقەت) و (عیرفان)ە لە (بادە)کەی تۆوە، ئەی پێغەمبەر کە ئەو بادەیەش ئەوەیە کە لە لێکدانەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەدا ڕام گەیاند.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (گل/٥، گل/٦، ف، مک، ط، ج، جم، حم، نم/١، با/١، سجا، ق/٣، صا)دا نییە و لەوانی تردا شەشەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە، کە لە ناو ئەو سەرچاوانەدا ئەم تاکە هەڵبەستەیان تیایە (لە گشتیاندا) چونیەکن وەک چۆن لە سەرەوە نووسیومە. ئەبینرێ ئەم تاکەیش لە (ج)دا نییە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

بادەنۆشانی ڕێگەی (حەقیقەت) و (عیرفان) واتە خواناسانی ڕاستی و پەرستن، هەموویان لە سەرچاوەی چاکترین بادەی تۆوە ئەی پێغەمبەر بەجارێ مەستن و لە نەشئەی (بەڕاستی گەیشتن) و دۆزینەوەی ڕێگەی ڕسگاری و نزیکبوونەوە لە خوای مەزندا هەموو کامەرانن.

٧- نغمەات: نەغمەی تۆ. نەغمە: ساز، ئاواز، ئاهەنگ، دەنگێکی ئاهەنگدار، گۆرانی و سروودی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە(تەجوید) و هەر ئاهەنگێکەوە کە لەگەڵ خوێندنەوەی (قورئان)ەکەدا بگونجێ، یا مەبەست لە بانگەوازی پێغەمبەر (د. خ)ە لە بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا، بەفەرمووده (حەدیث)ەکان و کردەوەکانییەوە کە بە(سوننە) ناسراون.

نغمە: ساز و ئاوازێکە لە نێوان وشەکانی ئاخاوتندا کە لە بواری زانستیی گۆرانی و مۆسیقەدا بە(زەنگ) واتە بە(جەرەس)ی وتار ناو دەبرێت کە لە خوێندنەوەی قورئاندا ئەو (نەغمە)یە هەست پێ دەکرێت و لە هەڵبەستیشدا (کێش)ەکەیەتی.

نغمە: دەنگی ئاهەنگداری بەساز و ئاواز (لەحن)ە کە لە ئاخاوتن بەدەنگی بەرزدا هەست پێ ئەکرێت.

نغمە: دەنگی (خۆش)ی گۆرانی و مۆسیقا، یا هەر دەنگێکی خۆشە وەک خوێندنی جۆرەها (مەل = پەلەوەر)ی وەک بولبول، شالوول، کەو، سوێسکە، ریشۆڵە، کوێشکە (چۆلەکە) و... هتد کە هەریەکەیان کاریگەری خۆش و دڵگیری خۆی لەسەر هەستی مرۆڤ هەیە.

نەغمە، مەبەست لەو بانگی ئیسلامەتی گەیاندنەیە کە وەک ساز و ئاوازێکی ئاهەنگاوی پڕ بەدڵ و (ژیری) و (گیان) و بزوێنی هەستی پیرۆزی و توانایی خوای گەورە دەگەیەنێ بەرەو گەیشتن بەکامەرانی لە ژیانی جیهانیدا کە دوور بێ لە بەند و باو و، پەیوەندیی (شەهوانی)ی جیهانییەوە و کامەرانیی هەتا هەتایی بێت لە ژیانی خۆشی دوای مردن: (بەهەشت) ئاساییدا بەکامیابییەکی خۆش هەستکردن بەنزیکبوونەوە لە پەڕتەو (جەلا)ی خوا و خوا لێ ڕازی بوون و دەرنەچوون لە فرمانی خوا.

ڕشک: ئەم وشە کوردی و فارسییە گەلێ واتای جیا جیا دەدات، وەک: (بەدەماری)، (خۆشی)، (چاکی)، (ئارەزوومەندی)، (مایەی چاو پیا هەڵنەهاتن) واتە: بەخیلی پێ بردن، هەست بەمەردایەتی کردن (حەمییەت).

ڕەشک: وشەیەکی کوردیی ڕەسەن و کۆنمانە، تەنانەت لە سەرێنیی (پەهلەوێتی)ی زمانەکەماندا لە شێوەی (ئەرەشک)دا بەکارهاتووە.

مەبەست لەم بەکارهێنانی وشەی (ڕەشک)ە لەوەیە کە نەغمەکەی تۆ ئەی پێغەمبەر وەک (خۆشی وەرگرتن) و (چاکەکاری) ئارەزوومەندیی خۆشەویستی و یەکسانیی مرۆڤ و مافە مرۆڤایەتییەکانی مرۆڤ و لە خۆشەویستیی داود پێغەمبەرەوە کە ئەو خۆشەویستییەت لە خۆشەویستیی هەر کەسێک بە لە پێشتر و زۆرتر دەزانن و بەوە هەست بەمەردایەتی دەکەن، چونکە بەڕاستی لە خودی داود پێغەمبەر و پەڕاوییە پیرۆزەکەی ئەو (داود)ە، گەیشتوون کە (نەغمەی) بانگەوازی ئیسلامەتی هەڵدانەکەت لەوەوە بووە کە ئەو بانگ هەڵدانەت لە هی (داود) تەواوتر و پڕ بەپڕتر بووە بۆ مرۆڤ ئەو بانگەوازەت (نەغمەیەت) لە (لەحن)ی (داودی) با بەتەنیاتر بووە، چونکە تۆ کۆتاییهێنەر بوو بە(پێغەمبەرایەتی) واتە پوختەی هەرە بەرزی ڕێرەوی هەموو پێغەمبەران لە ئاینە ئیسلامییەکەتدایە، بۆیە ئیتر پێویست بەهاتنی

پێغەمبەرێک نەماوە لە ڕۆژانێکەوە (نغمە)ی بانگەوازەکەت لە ناو مرۆڤدا و بۆ چاکە و سوود و بەختەوەری و کامەرانیی ژیانی هەردوو جیهانی مرۆڤ، بڵاوکردووەتەوە.

لحن (لەحنی): ئاهەنگ، ساز.

لحن: لە ڕووی دەنگەوە بەواتە: ئەوی لەسەر ساز و ئاهەنگ و دەنگێکی تایبەتی بەسۆز دەربېرِدرێ و ئەم وشەی (لحن)ە بووەتە (زاراوە = مصطلح)ێکی زانیاریی گۆرانی و مۆسیقا.

لحن: لە زانیاریی گۆرانی و مۆسیقادا بەپیشەیەکی تایبەتی واتە (پیشەی لەحن) دەزانرێ کە مەبەست لە ساز و ئاواز و ئاهەنگ و سۆز پێدانی (دەنگ)ە، سا ئەو دەنگە هی (گۆرانی) یا هی (مۆسیقا) وە یا هەر دەنگێکی خۆشی وەک دەنگی زۆربەی (پەلەوەر = باڵندە)کان یا ئەو دەنگە خۆشانەی لە جموجۆڵی سروشتییەوە پەیا دەبن وەک دەنگە نەرمەکەی شنەی با و هاژەی لەرەی پەل و گەڵای داران و خوڕەی تاڤگە و ڕووبار و چەم و... هتد، لەحن: دەربڕینی وشەیە بەتەواوی.

لێرەدا مەبەست لەوەیە کە ئەی پێغەمبەری ئیسلام، نەغمە یا دەنگی بانگی ئیسلام هەڵدانت بەرامبەری کارە لەگەڵ (لەحن)ی دەنگ و ئاواز و سۆزە بەناوبانگەکەی (داود پێغەمبەر «د. خ») و بگرە نەغمەکەی تۆ (لەحن)ەکەی ئەو بۆڕ دەدات کە لەحنەکەی داود (بەخیلیت پێ دەبات).

داودی: وەک هی داود پێغەمبەر کە مەبەست لە دەنگە خۆش و سۆز و (لەحن)ە بەناوبانگەکەی (داود) پێغەمبەرە.

داود کوڕی (یەسس) و لە ساڵانی (١٠١٠ تا ٩٧٠)ی پێش زاینیدا ژیاوە لە (فەلەستین)دا، داود باوکی (سولەیمان)ی حەکیم یا (سولەیمان) پێغەمبەر یا سولەیمانی پادشای (جوولەکەکان بووە).

لە (ئینجیلەکان)دا هاتووە کە (داود) لە باپیرانی حەزرەتی (عیسا) پێغەمبەرە «د. خ» کە بەبنەچە دەگاتەوە سەر حەزرەتی (ئیسحاق) پێغەمبەری کوڕی حەزرەتی (ئیبراهیمی ئازەر) کە ئەمیان خۆی (خودی زەردەشت پێغەمبەر)مانە. «د. خ».

داود: لە هەمان کاتدا کە (پێغەمبەر) بووە، هەم (پادشا)یەکی (دادپەروەر) و بە(توانا) و (پاڵەوان)ێکی بێ هاوتا و (هونەرێکی ورد و زانا و ڕۆشنبیری فراوان و دەنگ خۆشێکی دەگمەن و دانسقە و (مۆسیقاژەن)ێکی شارەزا و لێهاتوو بووە، سەرەڕای ئەمانە هەمووی دەنگخۆشییەکەی لە بەناوبانگیدا بێ وێنە بووە. دەنگخۆشییەکەی (داود) لە (تەورات)دا باس کراوە، کە چەند کاریگەر و دڵگیر بووە.

(داود) هەر کاتێ سۆزەی بۆ خۆی کردووە، یا (زەبوور) واتە (پەڕاوییە پیرۆزەکەی خۆی) بەئاواز و دەنگە خۆشەکەیەوە چڕیوە، هەرچی گیاندار و دڕندە کێوییەکانی ئەو ناوە هەبوون لە (لان) و بێشە و لەوەڕگایەکانیانەوە، بەدەنگە خۆشەکەی (داود)ەوە هاتوون و لە دەوری گردبوونەتەوە بۆ گوێ لێگرتنی و (مەل و پەلەوەران)ی لە ئاسمان و لە ناو باخ و درەختانەوە کێش کردوونەتە لای خۆی و هەموو ئەو گیاندارانەی هێناوەتە جۆش و خورۆشەوە.

گوایە داود لە زمانی هەموو ئەو گیاندارانەی زانیوە و تێیان گەیشتووە و لەگەڵیاندا دواوە، وەک لە (شەش سوورەت)ی (قورئان)ی پیرۆزدا وەک (انبیاء) و (سبأ) و (ص) و... هتددا (١٦) جار ناوی هاتووە. (داود) پێغەمبەر بەلای (کاکەیی)یەکانی ئێمەیشەوە، یەکێکە لە پێغەمبەرە مەزن و خۆشەویستەکانیان.

(کوردی) کە لەم تاکە هەڵبەستەیدا ناوی ئەم (داود پێغەمبەر)ەی بردووە، جگە لەوەی کە ویستوویەتی فەضلی (محەمەد پێغەمبەر)مان و بانگەوازی مژدەی پەیابوونی ئاینی ئیسلام بدات بەسەر (داود پێغەمبەر) و ئاوازە خۆشەکەیدا، دیسانەوە ئەم ناوبردنەی لە بەندیوارییەتیی خودی (کوردی) و صۆفیگەرییەکەوە بە(داود پێغەمبەر)ەوە بووە.

ئەوی لێرەدا هەست ڕائەکێشی ئەوەیە کە شاعیرێتییەکەی کوردی و هەڵبەستەکانی بەخشکەیی قوتابخانەیەکی شیعریی تایبەت بەکوردیی لێوە پەیا بووە کە بەدەیان پتر لەو ساوە و تا ئێستەش (٢٠٠٥ز) شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە لە زۆری بوون و، لە زۆریشدان و دەتوانم ئەوە ڕابگەیەنم کە (کوردی)مان یەکەمین شاعیرێکمانە کەوا بەزۆری لە قوتابخانەکەیدا بن و شاعیرێکی تری کوردمان نابینم ئاوا قوتابخانەیەکی لە پاش بەجێ مابێ و ئەگەر شاعیری خاوەن قوتابخانەمان هەبێ هەر تاک و تەرا شاعیر هەن دوایان کەوتبن و ئەوەش ناچێتە جغزی خاوەن قوتابخانەییەوە. ئەم ڕایەشم تەنانەت وێژە و هەڵبەستی نوێمان ئەگرێتەوە کە شاعیری خاوەن قوتابخانەیان تیا نییە.

پاسخت: وەڵام یا وەرامی تۆ (ئەی پێغەمبەر لە «وەڵامدا ئەوەت»)دا.

(حلّ): لێرەدا بە (مەبەست) و (واتا)ی: (کردنەوەی گرێ کوێرەکە) (هەڵوەشاندن)، (کردنەوە)، (ڕوونکردنەوە)، (یەکالاکردنەوە)، (یەکلاییکردنەوە)، (ساغکردنەوە)، (ڕێکوپێکخستنی شتێک یا کارێک کە ئیتر گیروگرفتی نەمێنێ) و... هتد

مشکلات: موشکیلەکانی، گیروگرفتەکان.

ئەم وشەی (مووشکلات) و کە بە دوای وشەی (حلّ)ەکەدا هاتووە کاری لێکدانەوەکەی ئاسان دەکات کە بە واتا ڕوونکردنەوەو گیروگرفت لەسەر نەهێشتنی دێن.

زبور: ناوی پەڕاوییە پیرۆزەکەی داود پێغەمبەرە.

پەڕاوی (زەبوور) بە (مەزامیر) و، (سیفر)یش ناوبراوە. جگە لە سەربەخۆیەتیی (زەبوور) هەروەها بەشێکە لە چوار بەش: (سیفر)ەکەی (تەورات)یش.

(زەبوور)، چونکە پەڕاوییەکی خوداییە، نابێ لەسەرەتایدا گیروگرفت (موشکیلات)ی تیابووبێ، بەڵام (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا موشکیلاتی زەبووری ناوبردووە، کە ئەوەش لەوەوە نییە کە مەبەستی لە بوونی (موشکیلات) بووبێ لە ناو (زەبوور)دا لە سەرەتای ڕاگەیاندنیدا لەلایەن داود پێغەمبەرەوە، بەشکو بەتێپەڕبوونی (٢٥٠٠) ساڵێک بەسەر (زەبوور)دا کە لە کاتی ڕاگەیاندنی یەکەم جاریەوە هەتا سەردەمی (کوردی) کە بێگومان لەو ماوە دوورو درێژەدا، بەهۆی گۆڕانی باری ژیانی پەیڕەویکارانی (زەبوور) و بەپێی ئەوەی کە بە

ساڵەهای ساڵ لەدوای (زەبوور)ەوە ئەو پەیڕەویکارانەی پێویستییان بە (شت) و (کاروبار)ی وەها بووە کە لەسەردەمی هاتنی (زەبوور)دا ئەو (شت) و (کاروبار)انە پێویست نەبوون جگە لەوەی کە مێژوو بۆمان دەردەخات کە هاتنی یەک لەدوای یەکی پادشایان و سەرۆک و بەرپرسیار و فەرمانڕەوایان و بەرژەوەندییەکانیان دەسکاری و گۆڕان لەو جۆرە پەڕاویانەدا ڕوویان داوە کە ئەوانە لە پاشتر بەو هۆیانەوە (موشکیلات)یان لە (زەبوور)دا دروست کردووە، هەروەک چۆن (تەورات) موشکیلاتی زەبووری (حل) واتە چاک کردەوەو هەروەها (ئینجیل)یش (موشکیل)ی تەوراتی بەگوێرەی ئاینی (عیسەوی) چاک کردووە، هەر بەوپێودانەش شاعیرمان (کوردی) لە چاککردنەوەی گیروگرفت (موشکیل)انەی (زەبوور)ی دوای (٢٠٠٠) ساڵی ڕای گەیاندووە کە پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) بەوەڵامدانەوەکانی کە پڕ بەپڕی چەرخی هاتنەخوارەوەی (قورئان) بووە ئەو (موشکیل)انەی حەل کردووە. بەپێی ئایەتەکانی (قورئان) و دەقەکانی (حەدیث)، نەخوازەلا کە خوای مەزن بە ناردنی (حەزرەتی مووسا) تەورات جێگەی (زەبوور)ی گرت و (ئینجیل)یش جێگەی تەورات و (قورئان)یش بەپێی، ئاینی ئیسلام و ئیسلامەکان جێگەی (ئینجیل)ی گرتووەتەوەو هەر بەو پێودانەش وەک (کوردی) ڕایگەیاندووە کە پێغەمبەری ئیسلام (موشکیل)ەکانی زەبوور (حەل) کردوون. کە ئەم ڕاگەیاندنەی (کوردی) و ئەم شیکردنەوەیەی من بەپێی ئایەتی ژمارە (٣)یە لە سوورەتی (مائدە)ی قورئانی پیرۆز کە خوا فەرموویەتی:

(اليومَ أكملتُ لَكُم دِينكُم و اتممتُ عَليكم الإسلامَ دينا)

واتە ئا ئەمڕۆ هەموو ڕێبازەکانی ئاینەکەتانم بۆ تەواو کردن و ئاینی (ئیسلام)ەکەتانم وەک ئاینێک بۆ تەواو کردن).

کە بەم فەرموودەیەو تەواوێتی ئاینی ئیسلام بو پێغەمبەرەکەی کە (موشکیلات)ی زەبوور بە وەڵامدانەوە حەل بفەرمووێت.

### واتای ئەم تاکە هەڵبەستە بەگشتی:

دەنگی بانگەوازی بە ساز و سۆزی مژدەی سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلامت مایەی بەخیلی پێبردنی ئاهەنگ و ئاوازی خۆشی (داوود پێغەمبەر)یە (د.خ) هەروەک وەڵامەکانت ئەو ئاوازی (داوودی)یە بۆڕ دەدات لە چارەکردنی گیروگرفتەکانیدا کە هاتبووە ڕێگەی پەیڕەوی کارانی ڕێبازەکەی داود پێغەمبەر کە تۆ لە وەڵامتدا بۆ ئیسلامەکان ئەو گیروگرفتانەت چارەسەر کردن. ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ص) دا نییە کە کەشکۆڵێکە کەشکۆڵەکانی بەرگی یەکەمی (کەشکۆڵستان)دا کە ئێستە هی (مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخی)یە و من لە چەندین کەشکۆڵ بۆم پێک هێناوە.

هەروەها ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی (گل/ ٨، گل/ ٦، ف، مک، ط، جم، نم/ ١، با/ ١، سجا، ق/ ٣)دا پێنجەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە، هەروەک لە (حم)دا شەشەمین و لە س، عن، نع، ه، گل/ ٣، گل٥/، ن، ص، شح، مح، ما/ ١)دا حەوتەمین تاکە هەڵبەستی ئەم

یەکەمین (بەند)ەیە.
نغمەات لە (ف)دا نغمە است. کە ئەمەش لە واتا و دەستووری زمانیدا کوورە
نیوەی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە، لە (گل/ ٥، گل/ ٦، جم، نم/ ١، سجا)دا بەم جۆرەی دوایی نووسراوە:
(هم لبت گنج راز را گنجور).
وە لە (عن)دا بەم چەشنەیە:
(هم لبت گنج راز را رنجور) و، لە (ف)دا بەم شێوەیە نووسراوە:
(هم لبت گنج راز رنجوری). کە ئەمەیان لەگەڵ پاشبەندی تاکە هەڵبەستەکاندا هاوئاهەنگ نییە.
ئەم سێ جۆرەی ئەم نیو باڵی دووەمینە کە جیاوازن لەیەکتری و لەوی لەسەرەوەش، بەپێی زۆرترین و باوەڕپێکراوترین سەرچاوە جێگیرم کردوون ئەمە بەڵگەی شێواویی ئەم نیو باڵییەیە کە ئەم سێ جۆرەش نیو باڵی دووەمی هەشتەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە کە لە دوای ئەم تاکەوە پێشکەشی دەکەم. کە بەهەڵە گواستراوەتەوە ئێرەوە.
تێبینی:- گرانییەک لە کێشی ئەم نیوباڵی دووەمەدا هەیە کە دەبێ هەردوو وشەی (حل)و (مشکلات) کۆتاییەکەیان بە (سکوون) = (زەنە) دەربېڕدرێن، ئەگەر نا (کێش)ەکەی کەمێ لەنگ دەبێ.
٨- هم: هەمیسان، هەم، هەمدیس، دیسان، هەروەها، هەروا، دیسانەوە.
دلت: (دەلەت): دڵت، دڵی تۆ
درّ: (دوڕ): دوڕ، کە جۆرو گەوهەرێکی ڕەنگ سپیی درەوشەدارە، واتە (کریستاڵ)، کە یەکێکە لە بەردە بەنرخەکان و جۆرەها (مووروو) وە (خشڵەمەنی) لێ دروست دەکرێت و لە (لا) واتە (سورەییا)ی دەوری (گڵۆپ) هەڵواسین بە(بنمیچی خانووەوە) و ئارایشت و جوانکاری و، وردەکاری ئەنتیکەی لێ دروست دەکرێت، لێرەدا (کوردی) مەبەستی بێگەردی و ڕوونی و پاکی دڵی پێغەمبەرە (د.خ) وەک دوڕ و مرواری.
وشەی (دوڕ) دیسانەوە ناوی جۆرە (تووتی)یەکی گچکەیە کە مەلێکی زیرەک و زەین ڕوونە ئەو (ناو)ەیش بۆ ئەم شوێنە ئەگونجێ و واتای خۆی دەدات.
غیب: (نهێنی، پەنهان، گوم، نادیار، نا ئاشکرا، شاردراوە، نیهان، لەبەرچاو نەبوو) وە کەرتی (را)یەکەی ئەم وشە لێکدراوەی (غەیب را)یە واتا (هی، نهێنی).
مەبەست لەمەش سرووش = (وەحی)یە کە خوای مەزن و فەرمایشتی پیرۆزی دەخاتە دڵی پێغەمبەر (د.خ) و، ئەمیش بە زمان دەری ئەبڕێت.
بەپێی فەرمایشتی خوا لە قورئاندا ئەو (سرووش)ە واتە (وەحی) لەلایەن خواوە بەهۆی حەزرەتی (جبرائیل)ەوە، بۆ ئەو پێغەمبەری ئیسلامە هاتووە و لە دڵی چەسپ کراوە، کە دەقی ئایەتەکانی قورئانی بە مرۆڤ ڕاگەیاندووەو بوونەتە (ئیسلام) پەیڕەویکردنی ئەو ڕێگە

دروستەی (قورئان) و فەرمـوودەکانی پێغەمبەر (حەدیث) و کردنی ئەو کردەوانەی کە پێغەمبەر کردوونی و لـە قـورئاندا نەهاتوون لـە ئیسـلامـەتـیدا بە (سـوننە) پێناسـە کراوە. کـە مـرۆڤ لە جیهاندا چاک و پاک و سەرفراز و لەو جیهانیشدا جێگەی بەهەشت بێ.

غەیب: وشەیەکە لە نەریتی صۆفیگەریدا مەبەست لە خودی (خوای مەزن)ە.

حـقـە: (مـرواری دان) واتە قـوتووی مـرواری و قـوتووی گـەوهـەر تیـادانان. (گـەوهـەردان)، (دوڕدان).

ئەم (مـرواری دان)ەش (قـاپوور)ێکە لە مـادەی گـەچی (کلسی پـەیابووە و پـەیا دەبێت لـە ناو (دەریا)کاندا کە بە کوردی (گوێچکە ماسی پێ دەگوترێ، قـەبارەکەی ئـەوەندەی نینۆکێکە و، هـەتا ئـەوەندەی دوو لەپە دەست و مـەزنتـریش دەبێت و، لە ناو ئاوی (دەریـا)دا دەژی، و لە ناو هـەندێ لە ڕووبـاراندا.

ئەو (قـاپوور): گـوێچکە مـاسی بـە دوو (دانە)ی ئەوەندی یەک بن بـەسـەریـەکدا دەمـەونخـون و چەسپن، ئەگەر هـاتوو هـەر (وردودرشت)ێکی هـەرە گچکەی وەک دەنکۆکە (لم)ێک چووە ناو ئەو (قاپوورە)وە کە (مێروو)یەکی زۆر ورد لە ناو ئەو جووتە گوێچکەماسییەدا دەژی و بەوتێکەوتنی دەنکە (لم)ە بۆ ناو گوێچکە ماسییەکە، ئەو (مێروو)ە دەستبەجێ دەکەوێتە پیاڕژاندنی لیکێکی گـەچی (گەچەکی = کلسـی) بەسـەر ئەو دەنکە (شت) یـا (لم)ەداو دەست بەدەست ئەو (لیکاوە)ە دەمەیێت و (لیکاو)ی تری تێوە دەدات، لە ئاکامدا ئەو دەنکە (شت) یا (لم)ە زۆر وردە بەرەبەرە (زلتـر) ئەبێ و خـڕ ئەدرێ و ئەبێـتـە جـۆرە مـوورووویەکی گـەورە یا گـجکە واتە مـرواری و، یا (لۆلۆ) ئەو پێکهاتووە، ئەگەر بریتی بـوو لە (دانە دانەی) بچووک بچـووک ئەوە پێی دەوترێ وەیا (دەبێت) بە (مرواری).

دڕ: خـۆ ئـەگـەر ئەو (شـت) یا (لم)ە زۆری لـە (لیکاو) تێـوە چووبوو، ئـەوسـا بە (دانـەدانە)ی گەورەتر لە (مروار)ی لێ پێک دێت، کە بەو دەنکە یا (دانە) گەورانە دەگوترێت (دوڕ).

لێرەدا (جـوانی)ی وێژەیی لەم تاکـە هەڵبـەسـتـەدا و لە (قـووڵی)ی بیـرەکـەی و، وردەکـارییـە وێژەییـیـەکانی (کوردی) لە دانانی ئەم (تاک)ە دەرئەکەون کەوا (دڵی پێغەمبـەر)ی چواندووە بەو شـوێنی (دوڕ)و (مرواری)یانە، کە مەبەستی لە نهێنییەکانی خوایەتییە لەلای (صـۆفی)یەکان و بۆیە بە (غەیب)ی ناو ئەبەن، کە لە ڕاستیشدا، وەهایە فەرموودەکانی (دوڕ و مروارین)

لەم هەڵبەستەدا وەک (کوردی) بە پێغەمبەری گوتبێ:-

(هـەر تۆی ئەی پـێـغـەمـبـەر، ئەو دڵە پاک و پیـرۆز و مـەزنـەت بۆ (دوڕ)ی (حـەقـیـقـەت)ی نهـێـنی (غـەیبی) هـەروەکو (گەوهـەردان) وەهایە و تەنانەت ئەوی کـەوا هـاودڵیـشـتـە، دیسـان دڵی وەکو (گـەوهـەردان)ی (دوڕومـرواری)ی (غـەیبی)ی حـەقـائیـقـیـیـە، ئەمـەش خـۆشی بە دڵی خـۆدانەوەی شـاعیـرمان (کـوردی)یە و خۆشیدانەوە بە دڵی هەمـوو باوەڕهێنەکان بە پێغـەمبـەرو بە (ئاینی) ئیـسـلامـیـە و لە هـەمـان کـاتدا قـووڵیی واتا و فـەلسـەفـەی (کـوردی) لەو تاکـە هـەڵبـەسـتـەیدا پێشکەش کردووە.

هم لبت: هەم لێوت کە (لەب = لێو)، جوانکاری لە (هم لبت)دا هەیە.کە (هاولێوت) و (هەروەها لێوت) ئەگرێتەوە.

گنج: گەنج، گەنجینەی تیاپاراستنی شتی بە نرخ، نهێنیەی شتی بە نرخ و بایەخدار.

رازرا: هی گوتن، نهێنی وتووێژ، وتن، کە مەبەست لە (ئایەت)ەکانی (قورئانی پیرۆز)و فەرموودەکانی پێغەمبەر – واتە حەدیثەکانە کە ئەمەش هێما (ڕەمز)ە بۆ ئەو دەقانە وەیا بۆ ئەو گوتنەی کە خواستی دڵ بێ و پێچەوانەی دەقە ئاینییەکان نەبێت.

گنجور: (گەنجەوان)، ئەوی خاوەنی یا پاسەوانی (گەنج)ە، گەنجینەدار، دەستدار، ئەوی سامانێکی ئەوتۆ زۆری هەبێ کە وەک گەنجی هەبێ وەها بێ.

ئەم وشەیە کە لە وشەی (گەنج)ەوە هەردووکیان کوردییەکی پەتی و ڕەسەنی کۆنە کە لە پەهلەویدا بەشێوەی (گەنج)و (گەنجوەر) یا (گەنجوور) بەکارهاتوون کە (گەنج) شوێنی تیا پەنهاندانی زیو و ئاڵتوون ، پارە و گەوهەرە.

مەبەستی (کوردی) لەوەیە کە لێوی واتە دەمی پێغەمبەر شوێنی راز (گفتوگۆ)ی پەسندە وەک گەنجینەی ئاڵتوون و زیو و گەوهەر وەهایەو گفتوگۆ پەسندەکانیشی وەک ئەو شتە بەنرخانە وەهان خۆیشی (پێغەمبەر) خاوەنی ئەو (گەنج) یا (گەنجینە)یەو واتا (گەنجوور) یا (گەنجوەر)ە، بەڵام بەپێی پاشبەندی ئەم (بەندی یەکەم) شێوەی (گەنجوور)ەکەیان دەگونجێ نەک (گەنجوەر)ەکەیان و، (گفتوگۆ)یەکەی پەنهانی واتە (ئەسرار)ەکانی خوایی و خواناسییە ئای: ئەو (ئەسرار)انەش لە ناو دڵی پێغەمبەر دابووبن وە یا بەدەمی فەرموویبوونی.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (گل/ ٥، گل/ ٦، ف، صا، جم، نم/ ١، با/ ١، سجا، چم، ق/ ٣)دا بەم جۆرەی سەرەوە نییە، بەشکو نیوەی دووەمی وەک لە تاکی پێشوودا بۆم ساغ بووەوە، کە ئەم نیوەی دووەمەی ئێرەیە، لە هەندێ (سەرچاوە)دا کراوە بە نیوەی دووەمی تاکی پێشووی ژمارە (٧).

هەروەها ئەم تاکەی ئێرە (ژمارە – ٨) لە سەرچاوەکانی (ط، مک، ج)دا شەشەمینە و لە سارچاوەکانی تری:

(مس، عن، گل/ ٣، گل/ ٨، ن، ص، شح، مع، ما/ ١، هد، نع)دا شەشەمین تاکە هەڵبەستی ئەم بەندەیە ئەم نەبوونی هەندێ تاکی ئەم بەندی یەکەمە لە هەندێ سەرچاوەداو ئاوێتەبوونی ئەم (تاکە هەڵبەستە) یا ئەو (نیو باڵی) بۆ نێوان تاکەکانی تر بەڵگەیەکی ئاشکرایە، بۆ دروستبوونی شێواوی و، بگرە لەناوچوونی هەندێ لە تاکەکانی سەرپاکی ئەم (حەوبەند)ە، کە بڕوام وایە زۆرترین تاکە هەڵبەستەکانی هەموو (حەوت بەند)ەکەم بۆ ئێرە دەست نەکەوتوون بەم (٢٤) سەرچاوەیەشەوە و، کە هەر تەنیا بۆ ئەم حەوت بەندە گردم کردوونەتەوە، بۆیە بە دووری نازانم و هیوام بەهێزە کە دوای چاپکردنی ئەم پەڕاوییە لەلایەن وێژە دۆستان و خاوەن کەشکۆڵانەوە تاکە هەڵبەستی زۆری تر لە نێوان هەریەکێ لە (بەند)ەکانی ئەم (حەوت بەند)ەدا ئاشکرا بکرێن و لە چاپی دووەمی ئەم پەڕاوییەیدا جێگەی خۆیان بگرنەوە. لە سەرچاوەی

(ن)دا هەردوو وشـەی: (دلت)ی نیـوبـاڵی یەکـەم و وشـەی (لبت)ی نیـوبالی دووەمی ئەم تـاکـە هەڵبەستە ئاڵوگۆڕ کراون و یەک لە جێگەیەک بەهەڵە نووسراون، هەروەک نیوباڵی دووەمی ئێرە کە کەوتبووە شـوێن نیوباڵی دووەمی تاکی پێشـووەوە لە هەندێ سـەرچاوەدا کە لەم تاکە و لە تاکی پێشوویشدا ئەم ئاوێتەبوونەم بۆ ساغ کرایەوە بە پشتیوانی سەرچاوانەوە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە هەڵبەستە:**

ئەی پێـغـەمـبـەر – د. خ – ئەوەی هـاودڵ (هـاوبیـر)ی تۆیە وەیـا خـودی دڵت، مـانـەندی دوڕو مرواریـیـە بە بیـرو ڕایەکانت وە نهێنی (غـەیبی) وەک (دوڕدان) وەهـایە کـە ئەو (دوڕ)ە ڕێبـازی ئاینەکەتە کە بە مرۆڤت ڕاگەیاند. هەروەها و لە هەمان کاتیشـدا (لێوت) کە فەرمایشتە ئاینییە دوڕ ئاساییـیەکانی ئاینەکەت پێ ڕاگەیاندووە وەکو ئەو لێوەت واتە ئەو (دەم)ەتن کە گەنجینەی ڕازو نیازەکانت و گەنجینەی ئەو گفتوگۆ (فەرمووده) گەوهەرینانەو بەوە ئەو لێوەت یا دەمت یا خـودی خـۆت وەک خـاوەن گـەنجـینـەی (ئاڵتـوون و زیو و دوڕ و گـەوهـەر) وەهـای کـە گفتوگۆیەکانیش مەبەست لە ڕاگەیاندنی قورئانی پیرۆز و فەرمووده (حەدیث)ەکانی خۆیەتی.

٩- ارمغان: دیاری و (بەخشیش).

أكمل: تەواوترین، بێ کەموکووڕیترین – کە مەبەست لەم تەواوترینە نیشانەیە بۆ ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (مائده) لە قورئانی پیرۆزدا کە خوا فەرموویەتی:-

(اليومَ اكملت لكم دينكم......) واتە: (ئەمڕۆ ئاینەکەتانم بۆتـان تەواو کردووە...) کە لە لێکدانەوەی ناوی (زەبوور)ی تاکە هەڵبەستی (حەوت)هەمی ئەم بەندی یەکەمەدا پێشکەشم کردووە. لێرەدا کـوردی هاتنـی ئەو ئایەیەو پێشـکەشکردنەکـەی لەلایـەن پێـغـەمـبـەر – د.خ – وە بە (دیاری – بەخشین)ێک چواندووە بۆ نەتەوە ئیسلامییەکان بەتایبەتی و بۆ مرۆڤ بە گشتی.

(أتمم: دیسـان مـەبەست لە تەواوبوونی پێ ڕاگەیاندنی دەقـە پیـرۆزەکانی ئاینی ئیسـلام وەک یەکێک لە ئاینەکان، کە لە هەمـان نیوەی دووەمی ئایەتی نیشـانە بۆ کراوی سـەرەوەدا هـاتووە: (... واتممت عليكم الاسلام دينا)، واتە (هەر ئەمڕۆیش دوا دەقە ئاینییـەکانی دینەکەتانم وەک ئاینێک بۆ تەواو کـردن و کـۆتاییم پێ هێنا) کـە دیسـانەوە (کـوردی) ئەم کـۆتایی پێـهـێـنانی ئاینییەی وەک (بەخشیش = دیاری)یەکی پێغەمبەر داناوە کە پێشکەشی بـە ئیسـلام و مرۆڤ کردووە بەپێی هەمان ئایەت.

ای یگانە: ئەی تاقـانە، ئەی ئەو کـەسـەی کـە یەکـەمین کـەسی تاقـانەی لەوەدا کـە (خـاتەم)ی پێغـەمبـەرانی بە (خـاتمی) = خـاتم: کۆتـاییـهێن بە پێغـەمبەرایەتی لە جیـهـاندا، واتە ئەی ئەو کەسـەی کە تۆ دواترین پێغـەمبەرێتی لە جیـهانداو ئیتر پێغەمـبەرێکی تر لە دوای تۆوە نایەت و لە خواوە دەرگای پێغەمبەرایەتی تری پاش ئاینی ئیسلام داخراو تۆ (خاتەم) = کۆتاییهێن بەو پێغەمبەرایەتییەت ناسراوی و لە پێغەمبەرێتیدا ئەم (نازناو)ی (خاتەم)ییەشت پێ بەخشراوە.

مـشـهـور: بەناوبـانگ کـە مـەبـەست لەوەیە: تۆ ئـەی (مـحـەمـەد – د.خ ) بـەدوا پێـغـەمـبـەرێتی بەناوبـانگی.

ئەم تاکە هەڵبەستە تەنیا لە دوو سەرچاوەی (مس، عن)دا نووسراوە و نۆیەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمی (حەوت بەندە)یەو لە هەردووکیشیاندا چونیەکە، وەک لەسەرەوە نووسیومە کاتێ کە نووسەری (ج) خواستی سەرچاوەی و نوسخەکانی ئەم (حەوت بەند)ەی لێ کردم من ئەم تاکەم لەم دوو سەرچاوەیەوە دایە، بەڵام دیارە بیری چووە و لە سەرچاوە (ج)ە ناتەواوەکەی خۆیدا نەینووسیوە و، یا بۆیە نەینووسیوە نەوەک ناتەواویی نوسخەکەی دەربکەوێ. لەبەر ئەوە ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ط، مک، ج، گل/ ٥، گل/ ٦، ف، صا، جم، نم/ ١، با/ ١، سجا، حم، ق/ ٣، گل/ ٣، کل/ ٨، ن،ص، شح، مع، نع، ما/ ١، هـ) یشدا نییە.

ئەم وشەی (خاتەم) واتە کۆتایی هاتنە بە ئاین لە دوای ئیسلام کە تەنیا هەر پێغەمبەری ئیسلام – د.خ– دواترین پێغەمبەرە کە ئاینەکەی ئەم ئەوەندە پڕ و چڕ و تەواو و فراوانە کە لە دوای ئەمەوە مرۆڤ پێویستی بە پێغەمبەر و بە ئاینێکی تر نەماوە و نابێ، دوا ئاینە و قورئان بە ئاشکرا تایبەتمەندێتیی (خاتەمی) لە پێغەمبەرێتی دا دەگەیەنێت. ئەگەر ئاورێک لە (شیعەیەتی) بدەینەوە کە لە شیعەیەتیدا پێغەمبەرێک لە دوای پێغەمبەری ئیسلامەوە پەیا نەبووە، هەروەها (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)یش پێغەمبەر نەبووە، کەواتە هەرگیز ناگونجێ کە ئەم (حەوت بەند)ە بۆ ئەو (عەلی)یە گوترابێ و بەودا هەڵدرابێ.

هەروەها پێشەوای ڕێبازی (بەهایی)یش لە نێوان ئاینەکاندا و، بەپێی بۆچوونی ئاینی ناسان پێغەمبەر نەبووە بەشکو سەردەمی تیاپەیدابوونی (بەهاییەتی) دەسکارییەکی ڕامیاریی (ڕژێمی بەریتانی) لە ناوچەکەدا لە ئارادا بووەو (خاوەن بیر) و هۆش (موفەکیر)ەکانیش ئەم بۆچوونی بابەتی دەسکارییەی (بەریتانی) شوێنی پەسەندکردنیان بووە، پێویستییەکی شێواندنی ئاینی ئیسلام بووە لەو کاتەدا، ،کارێکی ڕامیاریی تر بووە لە ئاینی.

(کوردی)شمان لە دەیان شوێنی هەڵبەستەکانیدا لەم پەڕاوەدا پیاوێکی بەندیوار بە ئاینی ئیسلامەوە بووە، کەواتە بردنەوەی ئەم (حەوت بەند)ە بۆ (بەهایی)چێتی شوێن بڕواو پەسەندکردن نییە وە ئەم (حەوت بەند)ە هەر بەسەر پێغەمبەری ئیسلامدا هەڵدراوەو من بە دووری نازانم کە (دەسکارییەکی بەریتانی) لەم بردنەوەی ئەم (حەوت بەند)ە لەکاردا بووبێت بۆ بردنی بەلای (بەهایی)یەتیدا.

١٠– مقدمت: هاتنت، دەرکەوتنت، نێردرانت لەلایەن خواوە بە پێغەمبەری بانگەواز هەڵدانت بۆ مژدەی بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامیت.

فیض بخش: بەهرەوەری بەخش، بەهرەوەری بڵاوکەرەوە (کە مەبەست لە بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامە) کە (فیض) بەهرەوەری چاکەو خێروخۆشی زۆر بەخش، وە: بەخش = پەخش بڵاوکەرەوە، پەخشانکار، بەخشایشکار، بەخشایش.

عالم: جیهان، گێتی، (دنیا)، ڕۆژگاریش دەگرێتەوە،

شد: (شود): بوو، بووە هۆی، بوو بە، کە مەبەست لەوەیە هاتنەکەی یا ئاینی ئیسلام بڵاوکردنەوەی (بوو بەهۆی): بەهرەوەری بە گەلانی جیهان.

دیر: (دەیر): ئەگــەرچـی ئەم وشـــەیە بە (عـــارەبی) دانراوە، بـەڵام وشـــەیەکی (کــوردی) پـەتی ڕەسـەنە کە هەم بەواتای (کۆن) و، بـە واتای (پەرسـتنگا) دێت، هەروەها نـاوە بۆ شـوێنی تێدا نیشتـەجێ بوونی (ڕەبەنان) بە گۆشەگیری و تیاخـەریکبوون بە خواپەرستییـەوە. کە ئەم شوێنە تایبـەتە بـەو پەیڕەویکارانەی لەسـەر هەریـەکێ لە سێ ئاینەکەی (زەردەشـتی) و (مـووسـایی) و (عیسـایی) بوون و هەن، هەروەها لە ناو (زەردەشـتی)یەکاندا جگە لە (دەیر) دیسـان (ئاتەش کەدە) و، (دەیری موغان) یشی پێ وتراوە و دەگوترێ.

لە هەمـان کاتدا جگە لەم شـوێنی خـواپەرسـتـییـەش بەو شـوێنەی کە بتـپـەرسـتـان پەرسـتنی بتەکانیان تیـا بەجێ هێناوە و پێی گوتراوە (بتخانە) کە (کوردی) لەم تاکە هەڵبەسـتەیدا وەک ناوی (دیر)ی بـردووە، ناوی (بتــخـانە)یشی بردووە بۆ تـەواوێتی دەربڕینەکـەی بتـخــانە: (بت خـانە) = شـوێنی تیـاپەرسـتنی بتـەکان. (کوردی) لەم تاکە هەڵبـەسـتـەیدا ناوی هەردوو جـۆرە پەرسـتنی گـایەکـەی فـەرامـۆش نەکردووە بەهۆی هـاتنە گرنگەکەی پێغـەمبـەری ئیسـلامـەوە بە ئاینە پیرۆزەکەیەوە کە بووەتە هۆی داخسـتنی ئەو پەرستگایانەو لە جێگەیان (مزگەوت) بووەتە (پەرستگا)و شاعیرمان (کوردی) فەرموویەتی.

بست: داخـراو مەبەسـتی لەوەیە کـە ئەو پەرستنگـایانە دەرگایەکـانیـان بـەپەیابوونی (مزگـەوت) داخراون و ئەو باوەی پێشوویان نەماوە.

بت و، لـە کــوردەواریدا (بوت)یشی پێ گـوتـراوە کــە بریـتی بوو لـەو پەیکـەرانـەی کــە مــرۆڤ لەشـێوەی جـۆراوجـۆردا لە بەرد و دار و کـانزاییـەکـان و تەنانەت لە قـوڕی سـوورەوەکـراویش دروستی کردوون و پەرستوونی.

مکسور: شکاو، لەناوبراو، واتە بتەکان شکێنراون و لەناوبراون.

ئەم تـاکـە هـەڵبــەسـتــە تەنیـا لـە سـەرچـاوەکـانی: (مس، عن، گل/ ٣، گل/ ٨، ف، شح، ه)دا نووسراوەو بە (دەیەمین) تاکی ئەم بەندی یەکەمە جێگر کراوەو لە سەرچاوەکانی تردا نییە.

دیر: لە سەرچاوەکانی: (گل/ ٣، گل/ ٨، شح)دا نووسراوە (بت همه) واتە هەموو بتەکان.

**واتای گشتی ئەم تاکە هەڵبەستە:**

هـاتنت ئەی پێــغـەمـبــەر بە مـژدەی پەیابوونی ئاینی ئیـسـلامــەوە، بوو بە مــایەی لێـشــاوی بەهرەوەری پەخـشکردن لە جـیـهـاندا چونکە بەپێی (قـورئان)ی پیـرۆز تۆ (رحـمـةً للعـالمین)ی و هاتنەکەت مایەی داخستنی (دەیر) و (بتخانە)کان و لەناوبردنی بتەکان بوو.

١١- لمعـە: تیـشکی، ڕووناکیی، چەخـمـاخـەی، هـەڵگیـرسـانی وەک ئاگر، پەرتـەوی وەک برووسکە. مەبەست لە تیشکی ئاینی ئیسلام بووە یا ئاشکرابوونی محەمەد بەپێغەمبەری (د.خ).

طلعتت: هەڵهاتنی وەک مانگ و خۆر دەرکەوتنت، ڕوخسارت، ڕووت، کە مەبەست لە دەرکەوتنی ئاینی ئیسلام بووە و خودی پێغەمبەر.

چو پیدا شد: هەر کە پەیابوو، هەر کە دەرکەوت، کاتێ کە دەرکەوت، کە ئاشکرا بوو، نومایان بوو، کە هاتە دی، مەبەستی لە دەرکەوتنی تیشکی ڕوخسارەکەیە.

در دو عالم: لە دوو عالەمدا، لە هەر دوو جیهاندا، مەبەستی لە هەردوو جیهانی؛ ئەم جیهانەی کە تیادا ئەژیین و، ئەو جیهانی دوای ڕۆژی قیامەتە.

شکست خورد: شکستی خوارد، شکا، مەبەستی لەوە بوو، کە بەئاشکرا بوونی ڕووی پێغمبەرێتییەکەی محەمەد (د.خ) و مژدەی بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی ئیتر جاهیلیەت شکاوە، (شکاندنی چی؟) شکاندنی (دەیجوور) کە:

دیجور: هەرە تاریکایی شەوی ئەنگوستە چاو، کە لەبەر تاریکایی هەموو شت ڕەشی دەنواند و مەبەست لە شکاندنی ئەو لەشکرە ڕەش و تاریکایی (جاهیلی) و گومڕایی بووە بەهۆی ئاشکرابوونی لەشکری تیشک و ڕووناکاییە بەبوونی ئاینی ئیسلامەوە، کە بەبڕوای دروست بەخوای کردگار و تواناوە کە وەک ڕووناکایی زاڵبوو بەسەر تاریکایی بت پەرستیدا.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە: (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، ن، ف، ص، صا، مک، ط، سجا، جم، تم/ ١، با/ ١، حم، ق/ ٣، ج)دا نییە.

هەر ئەم تاکە هەڵبەستە لە (مع)دا دەیەمین و، لە (مس، عن، شح، ما/ ١، ه، نع)دا (پانزەیەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە.

ئەمیش جیاوازییەکانە:

لمعەء طلعتت (لەمعەی طەلعەتەت) لە (عن، شح)دا نووسراوە: (طلعتت مشعلی= (طەلعەتەت مەشعەلی)، ئەمیش ئەگونجێ.

چو پیدا شد: لە (عن، شح)دا نووسراوە: (هویدا کرد): دەربڕینێکی/ کووڕ) گۆڕدراوە.

چو: لە (عن نسخە)دا نووسراوە (کە= کی).

شد لە (عن نسخە)دا نووسراوە (گشت) ئەمەش دەگونجێ.

شکست لە (شح)دا نووسراوە (شکستە).. ئەم جۆرە لەنگە.

در دو عالم لە (شح)دا نووسراوە: (در زمین را). هەڵبەستەکەی لاواز کردووە.

وەک دەرکەوت ئەم تاکە لە (ج)دا نییە و کەچی نووسەرەکەی خۆی بەو تەنیا نوسخەیەی خۆیەوە (بایی) کردووە و، لە زۆر جێگەی نووسینەکەیدا بە(هەڵە) هەڵی کوتاوەتە سەر هەر (٢٤) نوسخەکەی من لەم (تەرجیع بەند)ەدا کە بەر لە هاتنەوەی ئەو بۆ (کوردستانی خوارو) من هەمان نوسخەکەی ئەویشم هەبوو، لە سێ سەرچاوەی جیا جیاوە بەپێی سەرچاوە کەمەکەی ئەم تاکە، دەبوو جیاوازیی (کەم) لە نێوان دەقی سەرچاوەکاندا بووبووایە.

کەچی بەپێچەوانەوە وەک لەسەرەوە دیاری کراوە، جیاوازییەکانی زۆرن، ئەمەش بەڵگەیی شێواوی بەسەرهاتنی ئەم تاکەیە کە وەک هەڵبزرکاوییەک بەم تاکەوە دیارە. جگە لەوەی کە:

نیو باڵی دووەمی ئەم هەڵبەستە لە (عن، ما/١)دا بەهەڵە ئاوێتەی تاکە هەڵبەستی دوایی، واتا دوازدەیەم کراوە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

کاتێ کە تیشک و پەرتەوی ڕووناکی (خۆ) دەرخستنت، وەک (مانگ و خۆر) هەڵهات، بۆ بانگ

هەڵدانی مـژدەی پەیابوونی ئاینـی پیرۆزی ئیسـلام و بڵاوکردنەوەی، بەناو مـرۆڤی سـەر ڕووی زەمیندا، ئەو هـەڵهاتنی ڕوخسـارەت و مژدە گەیاندنـی پەیابوونی ئاینی ئیسلام نەک هەر لەسەر گۆی زەوی (جیـهـان) بەشکو لەو جـیـهـانیش کە دەکـەوێتـە پاش ڕۆژی (قـیـامـەت)ەوە، مـرۆڤی بەجـۆرێ پێ بەهرەوەر دەبن و بـەگـەیشتن بـە بەهەشت شـاد دەبن و لە ئاگـر و سـزای دۆزەخ ڕسـتگار دەبن بەهـۆی ئەوەوە کـە گـومـڕایان و جـاهیلەکـانی عـەرەب لە بت پەرسـتی و خـوای ڕاستـی نەنـاسـی قـوتـار ئەبن کـە ئەو ڕووداوە گرنگە بێ هـاوتـایە وەک شکسـتـخـواردنی بەرەی تاریک و نـووتەکی شـەوە زەنگەکـەی نـاو گـومـڕایان بەدەست ڕوونـاکـیی تیـشکی پـەیابوون و بڵاوبوونەوەی بەناو مرۆڤدا و ڕێگەی ڕاست گرتنیان کە خواناسی و خواپەرستی بێ فـەرمانی نەکردنی خوای کردگار و پەروەردەگار و بێ هاوتا هەتا هەتایییە.

١٢- ذرە (زەڕەی)= گـەرد، گـەردیلـە، گـەردیلکە، وردیلە، وردیلکەی، ئەمـانـە لە ڕووی زمـانی (فـەرهـەنگی)یەوەن، بەڵام لە ڕووی واتای زانیـارییـەوە، مـەبەست لە هـەر گـچکەترین وردیلکەی هەر جـەسـتـە (جـیسـم)ێکە کـە ئیـتـر لەوە پارچەی وردتری نییـە، وەک (گـەردیلکە سپـییـە جـووڵەکارەکان)ی کە لەناو قەفی ئـەو ڕووناکیی خـۆرەی کە لە کونی (دەرگا) یا (پەنجـەرە) یا (کـلاوڕۆژنە)وە دێتـە ناو ژوورەوە کـە گەردیلکە سـپی ڕەنگە بزۆکـەکـانی لە سـووڕانەوەدان و لە (زانستی کیمیا و فیزیا)دا بە(ئەتۆم = Atom) ناو ئەبرێن.

لێرەشدا مەبەستی (کوردی) لە هەرە یەکجار بچـووکترین بزیسکەیی گـەردیلکەی درەوشاوەن، کە درەوشـاوەییـیەکەی لە هـی ئەسـتێرەی (زوهـرە) دەچێ کە بەکوردی (مێـهـر) و بەئینگلیـزی (ڤینۆس = Venus)ە. زهرەء (زوهرەی) ئەسـتێرەی (مێـهر) یا (ڤـینۆس). وە مـەبەست لە ئاینـی (پەرتەوین)ی ئیسلامە. لە ڕووی ڕووناک کردنەوەوە.

زهرە: لە ڕووی (زمـانی)یـەوە واتا: جـوان، لاڤ، گـەش، سـپی، قـەشـەنگ، ڕووپرشـەدار، چرا، تیشک، پەرتەو،...

زهرە: ناوی گەشـترین ئەو ئەستێرەیەیە کە لە ئێـمەی نیشتەجێی سەر (گۆی زەوی)یەوە دیارە، جگە (خۆر) و (مانگ).

زهرە: لە نێوان ئەسـتێرەکانی (کۆمەڵەی خۆری – المجموعة الشمسية)دا نزیکترین ئەسـتێرەیە لە (گۆی زەوی)یەوە.

زهرە: لـە ڕووی ناوە کـوردییـەکـەوە (ناهـیـد) و (ئەناهـیـد)یشـی پـێ دەگـوترێ جگە لەوەی (مێهر)یشـی پێ دەڵێن.

لە لێکدانەوەکانی ئەم واتانەی (زوهـرە)دا، هـەموویان لـەگەڵ لێکدانەوەی ئەم تاکە هەڵبەسـتـەی سەرەوەدا دەگونجێن و، مەبەست لە تۆزە پزیسکەیەکی ئەم (ئەستێرەی زوهرە)یە.

(زهـرە) کە وەک بە(تو = تۆ) لـە هـەڵبەسـتـەکەدا، دانراوە کە ئەو (تو = تـۆ)یە خـودی (مـحـەمـەد – پێغەمبەری ئیسلام – د.خ)یە.

کـە ئەو پزیسکە: (زەڕە)یەش دەقـە پیـرۆزە ئاینیـیـەکانی ئیسلام و (سـوننەت)ەکانی خـودی ئەو

پێغەمبەرەی مەبەست بووە.

کە (کوردی) ئەو (دەق) و (سوننەت)انەشی بە (مێهر) چواندووە.

زهرەء تو (زوهرەیی تۆ) کە مەبەست لە سەرچاوەی (زەرە)کەیە لەو (زوهرە) یا لە (مێهر)ەکەوە پەیا بوون. وەپەیابوونی ئیسلام لە (محەمەد – د.خ)ە.

مهر بود واتە (زوهرە) کە وەک میهر بوو. ئەمجا مێهر ئەمانەن:

مهر: خۆر، هەتاو، تیشکی ڕۆژ، پرتەو، تیشک، پەیمان، مەرج، دۆستی، خۆشەویستی، ئەڤین.

مهر: لە ناوی (میترا)وە پەیابووە یا ئەمیان لەویانەوەیە، کە (میترا) یا (میثرا) هەمان ناوی ئەفسانەیی (یۆنان) و (ڕۆمان)ە بەتایبەتی و هەموو (ئەوروپا)دا بەگشتی، کە بە(ڤینۆس) ناوی دەبەن، ئەویش (فریشتە) یا (خوا)ی خۆشەویستیی ئەفسانەکەیە.

مهر: (میترا) جۆرە (ئاین) یا (پەرستنێکی تایبەتی)ی بووە کە بە(میتراپەرستی) ناسراوە و (میترا) خوای (ئاری)یەکان بووە، لە چەرخی دووەمی زاینیدا و، لە پەیڕەویکردنی ئاینی (مەسیحی)دا ئەو (میتراپەرستی)یە، فراوانتر کراوە بەدەسکارییەوە و لە جیهاندا پەیڕەوی کراوە بەتایبەتی لە ناو (ڕۆمان) و (یۆنان)ەکانیشدا.

مهر: لە (ئاوێستا = ئاڤێستا = ئابستاڤ)ی پەڕاویی پیرۆزی زەردەشتییەکان بەفریشتەیەکی دروستکەری (ئاهۆ رامزدا = خوای چاکە) ناوبراوە بەناوی: (مهریشت) یا (مهریشتا)وە کە لە (بەرامبەر) یا (دژ)ی خوای خراپە = ئەهریمەن بووە ئەم داستانەیش لە یەکێ لە بڕگەکانی ئەو (ئاوێستا)یە دایە.

مهر: ناوی ئاتەشکایەتی دێرینەی ئەو زەردەشتییەکان بووە.

مهر: ئەم وشەیە هۆنەران بەزۆری لە هەڵبەستیاندا بەکاریان هێناوە، وەکو (کوردی)مان لێرەدا بەکاری هێناوە، تەنانەت هۆنەرە نوێیەکانیشمان لە شێوە (ئەناهید) و (ڤینۆس) و (خوای جوانی)دا ئاوێتەی هەڵبەستەکانی خۆیانیان کردووە.

ئەم واتایانەی وشەی (مهر)ە بەتێکڕایی لەگەڵ واتا و مەبەستی ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەگونجێن.

زانچە: لەوەی، لە ئەوەی کە، لە وی، لەو شتەی.

در کائنات: لە بوونەوەریدا، لە هەستیدا، لە پەیدایشدا، کە مەبەستی لەوەیە هێشتا لە بوونەوەریدا ئەوی ڕووی دابێ ناگاتە ئەو تیشکەی یا (جریوە)یەی وەک لە ئەستێرەی خۆشەویستی و ڕێبازی ئاینەکە.

کرد ظهور: ئەوی ڕووی داوە، ئەوی دەرکەوتووە، لە نێوان ڕواڵەتەکانی بوونەوەرێتیدا هاتووەتە دی، پەیدا بووە کە مەبەست لەوەیە ئەوانە چ کائیناتێ هاوتایی و هاوکێش نین و کەمترن لە ڕووناکییەکەی بوونی تۆ بەپێغەمبەر و، ڕاگەیاندنت بە لە دەقەکانی ئاینەکەتدا بەمرۆڤ.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (ف، ص، نم/١، با/١، سجا، حم، ق/٣)دا نییە و لە (مک، ط، ج)دا هەشتەمینە و لە (ص، ما/١)دا دەیەمین و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٦ و گل/٨،

ن، مع)دا یانزەمین تاک و لە (مس، عن، شح، هـ، جم، نع)دا دوانزەهەمین تاکی ئەم بەندی (یەکەم)ەیە.

وەکو لە پێشەوە دەستنیشانم کرد کە ئەم تاکە هەڵبەستە شێواویی زۆری پێوە دیارە، لەوانەیە بڵێم: مۆرکە ڕەسەنەکەی خۆی تەڵخ بووە و من بەهۆی زۆریی سەرچاوەکانیشەوە توانیم لە دەقی خۆی نزیک بکەمەوە.

**جیاوازییەکانی نێوان سەرچاوەکان:**

زەهرەء لە: (مس، ما/١، ج)دا نووسراوە: (مشعل) ناگونجێ.

زەهرەء تو مهر لە (ط)دا نووسراوە: (مهر مشعل). ناگونجێ.

زانچە لە (ف، ط، سک، ج)دا نووسراوە: (آنچە).

زانچە لە (گل/٥، گل/٦، ف، شح، مع)دا نووسراوە: (هرچە).

دەرکائنات لە (گل/٥)دا نووسراوە: (دەرکانت) دیارە هەڵەی نووسینە.

کردە لە (ص، گل/٣، گل/٦، ن، عن)دا نووسراوە: (گشتە)، کە تەواو نییە، چونکە (کردگارەکەی) دیاری کراوە، بەڵام (گشتە) بەواتە بووە (کردگار) دیاری نەکراوە.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە (ف، ص، ما/١، گل/٥، گل/٨، مع، عن، شح)دا، بەهەڵە ئاوێتەی تاکە هەڵبەستی دوایی (واتە سیانزەیەمین) کراوە، کە بەسەرنجدان دەردەکەوێ ئەوێ جێگەی خۆی نییە.

هەروەها لە جێگەی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە، لە سەرچاوەی (عن، ما/١)دا بەهەڵە نیو باڵی دووەمی تاکی پێشوو ئاوێتەی ئێرە کراوە.

**هەڵسەنگاندنی ئەم تاکە:**

(کوردی) بە بەکارهێنانی (دوو) وشەی (ذەڕە) و (زهرە) لەم تاکەدا جوانکاریی هۆنەرانەی کلاسیکیی نواندووە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

وەک ئەستێرەی (زهرە)ی جریوە جریوکار، تیشک دەرێتیی تو بە هۆی هێنانە دیی، دۆستایەتی و، پەیمانی پاک و، خۆشەویستیی برگەکانی ئاینی ئیسلامەوە کە بەناو مرۆڤدا بڵاوت کردەوە، جێگەی خۆشەویستیی (ڤینۆس) ئاسایی و، بڕوای پتەوی (مێترایانە)ی خوای ڕاستی ناسیت بەچاکی و هەتا هەتایە لە گێتی و پەیدایشدا، جێگە پەنجەت دیارە.

١٣- مظهر: دیمەن، ڕواڵەت، دیار بوو، لێ دەرکەوتوویی، نومایان – کە مەبەست لە دەرکەوتنی پێغەمبەری ئیسلام «د. خ»یە، بەمژدەدانی ئاینەکەیەوە.

پرتو: تیشک، تیشکدانەوە، مەبەستی لە ڕووناکییە پیرۆزەکەیەتی کە ئیسلامەتییە.

جمال: جوانێتی، دڵگیری، جوانی، شەنگی، شیرینی.

تست: هی تۆیە، ئی تۆیە.

زآسمان (زاسمان – کە لە (آز آسمان یا زو آسمان)ەوە ئەم وشەی (زاسمان)ە هاتووەتە دی.

بەواتە: لە ناو ئاسماندا، لە ئاسمانا، لە ئاسماندا، لە ئاسمانەوە.
جملە: گشت، هەموو، بەجارێ، سەرپاک، سەرانسەر. مەبەستی لەوەیە کە: لە ئاسماندا ئەمانەی دوایی هەموو لە سایەی دەرکەوتن و ڕواڵەتی پەرتەوینی جوانیی تۆوە (ئەی پێغەمبەر) هاتوونەتە دی وە یا وێنەیەکی جوانییەکەی تۆن ئەوانیش بریتین لە:
نجم: ئەستێرە، هەسارەی جریوە جریوکار.
ماە: مانگ و ئەستێرەی مانگی تریفەدار.
خور: خۆر، ڕۆژ، ئافتاوی ڕووناکی بەخش و تیشکدەر. مەبەست لەوەیە کە ئەو جریوە جریوی ئەستێرە و تریفەی مانگەشەو و، تیشک و خۆرەتاوی (هەتاو)ی ڕووناکی (خۆر) هەموو تیشکدانەوەی دەرکەوتنی پرتەوی خوانیی ڕەوشت و گوفتار (فەرمووده) و کرداری پەسندی تۆن ئەی پێغەمبەر.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (صا، مک، ط، نم/١، جم، با/١، سجا، حم، ق/٣، ج)دا نییە و لە (گل/٥، گل/٦)دا حەوتەمین تاکە و لە سەرچاوەی (ف)دا هەشتەمینە و لە (ص، ما/١)دا یانزەهەمینە و لە (گل/٣، گل/٨، ن، مع)دا دوانزەهەمینە و لە (مس، عن، شح، ھ، نع)دا سیانزەهەمین تاکی بەندی یەکەمی ئەم (تەرجیع بەند)ەیە.

**جیاوازیی نوسخەکان:**

پەر تەوی جەمالی لە سەرچاوەکانی: (گل/٥، گل/٦، ص، ن، مع)دا نووسراوە: آن جمال و نور – ئەمیش لە (کێش)دا کورتە.
تست لە سەرچاوەکانی، (ف، گل/٥، گل/٦، ص)دا نووسراوە: (تواند) ئەمیش لەنگە.
لە نووسینەکەی (ج)دا بۆ شاردنەوەی ئەوەی کە ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە نوسخە تاکانە و ناتەواوەکەی خۆیدا نییە، بۆ ئەوە نیشانەی بۆ نیو باڵی یەکەمی سەرەوە کردووە کە ئاوێتەیە و، بیری چووە لەو نووسینەیدا ئەم تاکە وەربگرێت.
نجم و ماە: لە سەرچاوەکانی (ن، ص، ما/١)دا نووسراوە: ماه و نجم واتە پاش و پێش کراوە.
نیو باڵی دووەمی تاکە هەڵبەستی پێشوو، (واتە تاکی دوانزەیەمین) کە لە سەرچاوەکانی (ف، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ما/١، مع، عن)دا بەهەڵە ئاوێتەی ئێرە کراوە – بڕوانە ئەوێ.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

دیمەن و ڕواڵەتی پڕ ئەوینی جوانیی تۆ (ئەی پێغەمبەر) بەجارێ هەرچی کە لە ئاسماندایە لە ئەستێرە و مانگ و خۆری تیشکدەر و تریفەدار و جریوە جریوکار هەموویان لە تۆوە جوانیی تیشک وەردەگرن.

١٤– مهر: بڕوانە لێکدانەوەکانم لەسەر، وشەی (مهر) لە تاکی دوانزەیەمی پێشەوەی ئەم بەندی یەکەمەدا واتا لە دوو تاک بەر لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا.
از مشعل: لە ڕووناکیی شاپڵیتەی، لە تیشکی چرای ڕووناکیبەخشت، مەبەستی لەو شاپڵیتە یا چرا پەرتەوینە، (ئاینی ئیسلام) و ڕوخساری جوانی پێغەمبەرە.

رخت: ڕوخسارت، ڕووی تۆ، چارەی تۆ، دەموچاوت.

روشن: ڕەوشەن، ڕووناک، گەش، ڕوون.

ماه: مانگ (ئەستێرەی مانگی مەبەستە نەک ٣٠ ڕۆژ).

از نور: لە نووری، لە پڕتەوی، لە ڕووناکیی، لە شەوقی، لە تیشکی (نوور = شیر) وەک: خورشید واتە تیشکی (نووری) خۆر.

جبهات: ناوچەوانت، تەوێڵت، ئەنیت، پێشانیت، نێوچەوانت.

پڕ نور: تیشکین، پڕتەوین، پڕ نوور.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە سەرچاوەکانی: (صا، شح)دا نییە و لە: (ف، نم/١، با/١، سجا، حم، ق/٣)دا حەوتەمینە و لە: (مک، ط، ج)دا نۆیەمینە و، لە: (ص، ما/١)دا دوانزەهەمینە و لە: (گل/٣، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ن، مع)دا سیانزەهەمینە و لەوانی دیکەدا چواردەمین تاکە.

**جیاوازیی نوسخەکان:**

از لە (عن)دا نووسراوە: چون – وشەی (از)ی هەردوو نیو باڵییەکە (چون) نووسراوە.

پر نور: لە (سجا)دا نووسراوە پرتو– ئەمەش ئەبێ هەڵەی لە لەبیرچوونی (هەڵەی) نووسینەوەیە بێت چونکە وشەی (نور) کە (پاشبەند)ی تاکە هەڵبەستەکانی ئەم بەندی یەکەمەیە و ناشێ (پاشبەند)ی ئەم تاکە لەوانی دیکەی جیاواز بێت و ببی بە(پرتو)، لە جێگە (پر نور).

لە نامیلکەی (ج)دا نووسراوە: «لە ڕوونووسێکی لای حەمەبۆردا نیوەی یەکەمی هەڵبەستەکە، بەم جۆرەیە:

(مظهر پرتو جمال تو اند) = (دیاردەی شەوقی جوانیی تۆن)

بەڵام لەگەڵ ئێرە ناڕێکە و دەبێ نیوەی هەڵبەستێکی تر بێ»

**واتای هەڵبەستەکە:**

هەتاو لە تیشکی چرای ڕوخساری تۆوە ڕۆشنە و مانگیش لە تریفەی تەوێڵی تۆوە گەش و بەشەوقە.

لە (ج)دا ئەم واتایە نووسراوە: ئەم هەڵبەستە جوغرافییە وەک وتراوە: (نور القمر مستعار من الشمس) و من چیی لەسەر نانووسم.

١٥– جز: جگە، بێجگە، بلی، بەبێ، بێ لە.

صفاتت: سروشتییەکانت، ڕواڵەتەکانت، ڕەوشتت، چۆنێتیت، نومایندەییەکانت، لێ دەرکەوتووییەکانت – کە مەبەست لە چاکییەکانی ئەم وشانەیە لە پێغەمبەر «د. خ»دا.

نگوید: ناڵێ، ناڵێت، نابێژی.

الاّ: مەگەر، مەگەر هەر، جگە لە، بلی.

گنگ: لاڵەپەتە، پتەلاڵ، لاڵ، جۆرە (پس)ییەکە لە ئاخاوتندا کە ئاساییانە زمان گۆی ئاخاوتن ناکات.

غیر: جگە لە، بێجگە، بەبێ.

ذاتت (زاتەت): خودی تۆ، هەر بەخۆت.

نجوید: لە پەیکاریدا نابێت، بەدوادا ناگەڕێت، پەیجۆیی ناکا، لێی ناتۆژێتەوە، لێی ناکۆڵێتەوە...

الاّ کور: مەگەر هەر تەنیا کوێر (کۆرە)، بێجگە لە نابینا، جگە لە بێ چاو.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (مس، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ف، ص، صا، ما/١، ق/٣)دا نییە، وە لە (جم، نم/١، با/١، سجا، حم)دا هەشتەمین و لە (مک، ط، ج)دا دەیەمین و لە (گل/٣، ن، شح، مع)دا چواردەمین و لەوانی تردا پانزەیەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمی (تەرجیع بەند)ەیە.

**جیاوازی نوسخەکان:**

گونگ لە (نم/١)دا نووسراوە (کَنکُ): کەنکو. کە هەڵەیە و لەنگیشە.

گنگ لە (سجا)دا نووسراوە: کونک، ئەمەش ڕاستە، چونکە زۆر جار لە ڕێنووسی فارسیدا پیتی (گ) بەشێوەی (ک) ئەنووسرێ.

نەجوویەد، لە (جم)دا نووسراوە: نبیند (نەبینەد) ئەمیش لە واتا و مەبەستدا ڕاستە، بەڵام چونکە زۆرینەی سەرچاوەکان (نەجوویەد)یان تیا نووسراوە بۆیە دەقی سەرەوەم نەکردە (نەبینەد) کە ئەمیش ئەگونجێ.

**واتای گشتیی ئەم تاکە هەڵبەستە:**

لە بارەی ڕەوشت و ڕواڵەتی تۆوە، تەنانەت کەس نەماوە نەدوێت، مەگەر (لاڵ) لە فرمانی نییە و تەنانەت هەمووان لە پەیکاری ئەوە دان کە بەخودی پیرۆزت بگەن بەکوێریشەوە بەو بێ چاوییە، واتە لاڵ و کوێریش لە تۆی چاک بەچاکە دەدوێن و ئارەزوومەندی گەیشتن بەتۆن یا هەموو تۆیان دەوێت جگە لە (کوێر) و (لاڵ) ئەویش لەبەر ئەو نەخۆشییەیان.

بێ گومان (کوردی) لەم دەستنیشانکردنی کەسانی (لاڵ) و (کوێر)ەدا مەبەستی لە ئایەتی (١٧١)ی سوورەتی (البقرە) لە قورئانی پیرۆزدا کە خوای مەزن فەرموویەتی: (صُمّ، بکمُ، عُميُ فَهُم لا يَعقلون) واتە: کەڕ و لاڵ و کوێرن و عەقڵیان بەسەریا ناشکێ هێژایی ناکەن.

١٦- شاهدم: ئەم وشەیە بەدوو جۆرە واتا دێت کە:

شاهدم: شایەتم، گەواهیدەرم، بەڵگەم، ئەوەی پشتی پێ دەبەستم، بۆ بیروڕایەکە دەگونجێ، کە ئەویش وەک لەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە بۆ (جیلوەی حەق)ە کە (شاهیدە).

شاهدم: ئەم جۆرە واتایانە: (خۆشەویستەکەم، یارەکەم، دڵگیرەکەم، دولبەرەکەم، دڵخوازەکەم)ە.

ئەم هەردوو واتایەش دەگونجێن لەگەڵ مەبەستی ئەم تاکە هەڵبەستەدا کە لە جۆری واتای یەکەمدا مەبەستی (کوردی) لەوەیە کە فەرموویەتی: شایەتم (گەواهیدەرم) بۆ ڕاستیی ناوەڕۆکەکانی ئەم (تەرجیع بەند)ەم.

جیلوەی حەقە و (ئیتر چیی تر نا): دیگەر...

له واتای جۆری دووەمیشیاندا (کوردی) مەبەستی لەوە بووە کە تۆی خۆشەویست و دڵخوازە جوانەکەم کە بریتی بێت لە (جیلوەی حەق) و (بەس) و لێکدانەوەی ئەم دوو بیرورِا، یا دوو جۆرە واتایەی لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا ڕاگەیاندووە کە ئەویش ئاوا لێک ئەدەمەوە:

جلوەء: شەوق، جوانی، پەرتەوە، شکۆ، صافی، بێگەردی، مشتومالّ، پرشنگداری، (بەیان)ی. مەبەست لەم واتایانە کە هەموانیان هی (حەق)ە کەن و گشتیان لەگەڵ واتا و مەبەستی هەڵبەستەکەشدا ئەگونجێن.

حق است: حق = ڕاست و دروستی، حەق خوایە، ناوێکی ڕواڵەتیی خوایە، هەروەها (جیلوە) زاراوەیەکی صۆفیانەیە کە دڵپاکی و پاکبوونەوە لە گەردی ئارەزووە جیهانییەکانە کە ئەمیش (ڕادە)، یا (پلە)یەکی ڕێرەوی صۆفیانەیە ئەمجا جیلوەی حەق چاوەنداز یا دوا شوێنی بەئەنجام گەیشتنی ئەو ڕێبازەیە.

دیگر: ئیتر، ئیکە، جگە لەمەیش.

چیست: چییە؟

غلمان: غیلمان، بەردەستە نێرینەکانی ناو بەهەشتن کە خوای مەزن تەرخانی کردوون بۆ ئەوانەی بەهەشتین، وەک کۆیلە وەهان بۆ بەر فرمانیی بەهەشتییەکانن. واتە (فریشتەکان). بێ گومان (غیلمان)یش لە هەرە جوانترین نێرینەن.

این: ئەم، ئەڤ، ئەیە.

آن: ئەو.

حور: بەردەستە مێیینەکانی ناو بەهەشتن کە خوای گەورە وەکو کەنیزەک تەرخانی کردوون بۆ مرۆڤە بەهەشتییەکان واتە (پەری). لێرەدا (کوردی) کە فەرموویەتی گەواهیدەرم بۆ بیرورِام بەرامبەر بەتۆ ئەی پێغەمبەر کە (جیلوەی حەق) بێ، ئیتر بەلای منەوە (کوردی) فریشتە (غیلمان) و (ئەم) و (ئەو) و (حۆری) واتە (پەری)چین لە چاو تۆدا ئەی ڕاگەیەنەرەکەی ئاینی ئیسلامەکەم.

بەلادانی نازانم کە ئەم (غیلمان)ە بەلاوە بەچی نەبوونی ڕاگەیاندنەی (کوردی)یشدا بەهەڵبەستنە نارەواکان بە(کوردی)یەوە کە گوایە نێرباز بووە، هەموویان بەدرۆ ئەخاتەوە چونکە ئەگەر (کوردی) ئەو ڕەوشتە کە دراوەتە پاڵی بووبووایە هەرگیز ئەمەی بەدەمدا نەدەهات، کە (غیلمان) چییە. چی بوونێتییەکی هەیە، کە (غیلمان) لە بەهەشتدا نابی لە فرمانی مرۆڤە بەهەشتییەکان دەربچێت و کەواتە هەموو هیوا و ئاواتی (کوردی) گەیشتنە بەهەشت دەبوو بۆ گەیشتنە (غیلمان)ی بەهەشت و نەی دەگوت ئیتر (غیلمان چییە)؟.

**لێکدانەوەیەکی دروست:**

لە سەرچاوەی (ن)دا (آین وآن)ەکەی ئەم هەڵبەستەی بەپەراوێزێکی (فارسی) دروست لێکداوەتەوە کە گوایە (آین) مەبەست لە جوانەکانی (مرۆڤ)ی سەر گۆی زەوییە و، (آن) واتە

ئەوان کە مەبەست لە (فریشتە و پەری = غیلمان و حۆری)یەکانی ئەوێن واتە (بەهەشت)ن. ئەم لێکدانەوەیە وردبینییەکی وێژەییانەی پەسند و دروستە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (عن، گل/٣، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ص، صا، مک، ط، شح، مع، جم، نم/١، ف، با/١، سجا، حم، ق/٣، ج)دا نییە و، لە (ما/١)دا پانزەیەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمە و، لە (مس، ن، ه، نع)دا شانزەیەمین تاکە، وە لەمانەشیاندا دەقی هەموو نوسخەکان چوونیەکن.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

من کە خۆشەویست و دڵخوازم، شکۆمەند و جوانێکی بێ خەوشی وەک تۆ بێ، ئیتر جوانیی مرۆڤ و غیلمان (فریشتە) و حۆری (پەری) دەبێ چی بن لە چاو جوانییەکەی تۆدا ئەی پێغەمبەری لە هەموو جوانانی جوانتر لە هەر بارەیەکی جوانییەوە، کە تۆ چاوێریکراوی حەق و، بەهرەداری جیلوەی حەقی و تۆ لە کوێ و ئەم و ئەو لە کوێ و هەر بۆیە دڵبەندی تۆم بەتەنیا و بەس.

١٧- ای کە: ئەی ئەوەی کە، ئەی ئەو کەسەی کە تۆ.
بر: لەسەر، بەسەر.
تخت: تەخت، پایتەخت.
دل: دڵ.
تو سلطانی: تۆ سوڵتانی (بەسەر تەختی دڵمەوە)، تۆ دەسەڵاتدارترینی وڵاتی دڵی منی.
چون: چۆن، چەوە؟، چ تۆ؟.
شوم: ببم، دەبم، دەشێم، چۆن دەتوانم، چۆن دەشێم.
از آستانەات: لە بارەگا (ئاستانەکەی تۆوە).
دور (دوور): دوور: (چۆن دەربارییم، لە بارەگای تۆ دوور بکەومەوە).
ئەم تاکە هەڵبەستە لە: (س، گل/٦، ف، ص، ما، مک، ط، جم، نم/١، با/١، سجا، ق/٣، ج)دا نییە و، لە (گل/٥)دا دەیەمین و، لە (مع)دا چواردەمین و لە (گل/٣، گل/٨، ما/١)دا پانزەمین و لە (عن، شح، نع)دا شانزەمین و لەوانی تردا حەڤدەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

ئانکی لە (گل/٣)دا نووسراوە (ای تو)
تو سلطانی لە (گل/٣، عن)دا نووسراوە: چو سلطانی (چو سوڵتانی).
چون شەوەم لە (شح، مع)دا نووسراوە: (کی شوم = کەی شەوەم).
آز آستانە ات لە (عن)دا نووسراوە: زاستانەء تو. کە هەموو ئەمانە دەگونجێن.

**تێبینی:**

لەم تاکە هەڵبەستەدا، وا پێ دەچێ کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی لە شاری (مەدینە)دا دانابێ و لە (میرانی تۆفیق بەگی فەتاح بەگی ساحێبقڕان)م بیستووە کە (کوردی) حەجی کردووە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

ئەی ئەوەی کە لەسەر (تەختی دڵم) وەک سوڵتانی و پایتەختی تۆیە، سا ئیتر چۆن بشێم لە بارەگای تۆ دوور کەومەوە.

١٨- ای : ئەی، ئای کە، هەی بۆ، ئای لە.

خوش: خۆشی، شادی (ئەی خۆشی) لە خۆم.

آن دم : ئەودەمەی (ئەی خۆشی لە خۆم بۆ ئەو کاتەی).

سوی: بۆ لای، ئەلای، بەرەو (مەبەستی لەوەیە کە دەبرێ بۆ...).

مقتل (مەقتەل): شوێنی لێ کوشتن (ئەو جێیەی لێی دەکوژرێت).

خویش (خویش): هی خۆم - مەبەستی لەو شوێنەیە کە خۆی لێی دەکوژرێت لە ڕێگەی خۆشەویستەکەیدا کە پێغەمبەر «د. خ»یە وە یا نەک هەر لە ڕێگەی ئەو خۆشەویستەدا بەشکو وەک لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە کە:

یابم: وەرگرم، پێم بدرێت، بەدەست بهێنم، دەستم کەوێت.

از یار: لە یارەوە، لە دۆستەوە کە مەبەستی (پێغەمبەر)ە.

خاص خود: تایبەت بەخودی خۆم، کە مەبەستی لە یارەکەیەتی.

دستور: فرمان و مەبەست لە فرمانی کوشتنی خۆیەتی، کە تەنانەت ئەگەر بشیکوژێت هەر پێی خۆشە.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە (صا، مک، ط)دا نییە و، لە (ج)دا یانزەیەمین تاک و لە (ق/٣، گل/٦، گل/٨، ف، جم، نم/١، با/١، سجا، ص، ما/١، گل/٣)دا شانزەیەمین تاک و لە (حم، شح، مس، عن)دا حەڤدەیەمین تاک و لە (ص)دا پانزەیەمین تاک و لە (ن، هـ، گل/٥، مع، نع)دا هەژدەیەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە.

لە (گل/٣)دا ئەم تاکە بەباشی ناخوێنرێتەوە، و لە پیتی (ش)ی (خوش) بەدواوەی دڕاوە، بەڵام دیوەکەی تری ئەم لاپەڕەیە کاری پێ نەکراوە.

آن دم لە (عن)دا نووسراوە: (آنکە) کە دەگونجێ.

سوی: لە (ف، نم/١، ق/٣، ج، ما/١)دا نووسراوە (کە سوی) ئەمەش لەنگی دەدات و لە (کێش)دا بڕگەیەکی زیادە.

یابم لە (گل/٣، گل/٥، گل/٦، عن)دا نووسراوە: (گیرم) کە بڕگەیەکی کەم و لەنگە و، بەواتا (گیرام)ە کە ناگونجێ.

یار خاص خود: لە (عن)دا نووسراوە: (شاهد خود را).

**واتای گشتی ئەم هەڵبەستە:**

ئای خۆشی بۆ ئەودەمەی بەرەو کوشتنگەیەکەی خۆمم دەبەن تا لە ڕێگەی بەندیواریمدا بەڕێبازی یارە تایبەتییەکەی خۆمدا. جا ئەگەر فرمانی کوشتنەکەم لەو یارە تایبەتییەوە پێ بوو، وەک پێم بڵێ تۆ کە سووری لەسەر ڕێبازی من با بتکوژن و لەو ڕێبازە پەشیمان

مەبەرەوە؛ چونکە کوشتنەکەت ئاراستەی بەهەشتت دەکات وەک (مەنسووری هەلاج) و پێم وایە بەر لەم تاکەیش تاکی تر هەبووبێ وەک پێشەکی بۆ ڕازیبوونی کوشتنەکەی و ئەمەش لە هەڵبەستی هۆنەراندا هەیە.

١٩- همدل: هاودڵ، مەبەست لە یەک بیروڕایی و هاوڕێگاییە.

همانند: هاوجۆر، چونیەک، هاوچەشن، هاومانەند.

حلاجم : حەللاجم – حەللاج مەبەست لە (مەنسووری هەلاجە) کە خواناس و خواپەرستێکی یەکجار پڕ و پاکی لە ناخەوە بووە لە صۆفیگەریدا، کە بەر لەم شوێنەی ئەم پەڕاوییە جاری تر سەرگوزەشتەی ژیان و بەسەرهاتیم تیا نووسیوە، کە لە ڕێگەی ئایندارییە دروستەکەیدا بەسزا و ئەشکەنجەکەی و، وێنە کوژرانە ناڕەواییەکەیم ڕاگەیاندووە.

حق پەرستی رهم: حەق پەرستی ڕێبازمە لە ژیاندا – مەبەستی لەوە بووە کە ئەم (کوردی)یش هەمان ڕێڕەوی دروستی (هەللاجی گرتووە).

نه جورا جور: نەک جۆراوجۆر – کە مەبەستی لەوە بووە ڕێبازە ئاینییەکەی یەک ڕەنگ و یەک جۆر بووە نەک ڕێبازێکی سەرزاری کە لە ژێرەوە جۆرەها بووبێ.

ئەم تاکە هەڵبەستە؛ لە سەرچاوەکانی: (مک، ط، ج، ق/٣، جم، نم/١، ف، سجا)دا نییە و لە (صا)دا دوانزەیەمین تاک و لە (گل/٣، گل/٦، گل/٨، با/١، ص، ما/١)دا حەڤدەمین تاک و، لە (حم، شح، مس، عن)دا هەژدەیەمین و لە (مع)دا شانزەیەمین و لەوانی تردا نۆزدەیەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە لە حەوت بەندەکەی (کوردی)دا.

ئەم تاکە هەڵبەستە و هەر چوار سەرچاوەیەی کە لێیان وەرگیراوە، لە هەموانیاندا، چونیەکە و پێم وایە ئەم جیاوازی تیا نەبوونەش لە کەمێتی ژمارەی سەرچاوەکانەوە بێت.

وە نەبێ کە (کوردی) لێرەدا ناوی (هەللاج)ی بردووە، ئەمە یەکەم جاری بێ، بەشکو لە هەڵبەستەکانی ناو ئەم پەڕاوییەیدا چەندین جاری تریش و هەر جارەی بەجۆرێک (هەللاج)ی بەیاد کردووەتەوە و پەیوەندییە توندوتۆڵەکەی خۆی بەبیروڕایەکەی بەرامبەر بەو پیاوە ئاینییە ناودارە دەربڕیوە و لە هەڵبەستەکانی (کوردی)دا شەیدایی خۆی بەرامبەر بەو پیشان داوە و لەمەوە سروشتە صۆفیگەرییە بێگەردەکەی (کوردی)مان بۆ نومایان دەبێت، کە صۆفییەکی خۆ بەو صۆفیگەرییە و (بایی)بوون نەنواندووە و کەسەتییەکی کراوەی ئەوتۆ بووە کە ژیان و پەیوەندیی بەجیهانییەکانیدا خۆی لەگەڵ ژینگە و ئەو کۆمەڵگایەدا گونجاندووە تاکو ڕادەیەک، دژی بیروبڕوا ئاینییە پاکەکەی نەبێت و لە هەمان کاتیشدا لەو ئایندارییەیدا خۆی بەپیاوێکی عەسەبی بەرامبەر بەخواپەرستییەکەی دەرنەخستووە، بەڕادەیەک کە لەگەڵ ئەم و ئەودا بێ خۆ جیاکردنەوە و دڵی خەڵق ئازاردان لەگەڵ هەمووواندا ڕای بواردووە و بە(لەیەک گەیشتن) بەسەری بردووە.

٢٠- پای کوبان: پا (پێ) کوتاندن، پێ بەزەوی دادان لە خۆشییاندا، هەڵبەز و دابەزکردن بە پێ (پا) وەک هەڵپەڕینی شادی.

ز شوق: له خۆشیدا، له شەوقدا و، له تاسه و ئارەزوومەندیدا و، له حەیبەتدا.
دست فشان: دەست هەڵتەکاندن له خۆشیدا، له شادمانیدا دەست ڕاوەشاندن بەهەر لادا، چەپڵەڕێزان.
ئەم پێ بەزەوی داماڵین و دەست ڕاتەکاندن و پل تەقاندنەی هەموو له خۆیدا ڕاگەیاندووە وەک سەرچۆپیکێشێک.
فاش گویم: له ڕووی فەرهەنگییەوە بەواتا: بەئاشکرایی دەڵێم، بەڵام مەبەستی له دەنگ بەرزکردنەوە و چڕینی سروودی ئاینییه له سۆز و هەستی پاکی خواناسییەوە.
بەنالەء سەمتور: واته: ئەو زایەڵه سۆزاوییەم بەدەم ناڵەی ئامێری مۆسیقایەکەوە که ناوی (سەمتوورە).
سەمتوور: که ئامێرێکی کۆنی تەلی (یا) (ژێ)ییيه بەلەراندنەوەی کار دەکات. ئەو ژێ یا تەله باریکه، دەنگێکی ئەوتۆ دەدات کە کار له قوولایی دەروون دەکات و بەپێی ئاوازی دەنگ لێ هێنانەکەی هەست دەجووڵێنێ.
ئەم تاکە هەڵبەستە له سەرچاوەی (مک، ط)دا یانزەیەمین تاکە و له (ق/٣، ف، جم، ج)دا دوانزەیەمین تاکە و له (ص)دا سیانزەیەمین تاکە و له (مع)دا حەڤدەیەمین تاکە و له (ص، ما/١، گل/٦، گل/٨، با/١)دا هەژدەیەمین تاکە و له (حم، مس، عن، شح)دا نۆزدەیەمین تاکه و له (گل/٥، ن، ه، نع)دا بیستەیەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە.
بەسەرنجدانی سەرچاوەی (گل/٥) دەردەکەوێت کە ئەوەندەی شوێنی تیا نووسینی چوار تاک لەم سەرچاوەیەدا لەبەر پەڕپووتی و زەردبوونی دووکەڵ و تەڕبوونەوە (لە پێش ئەم تاکەی سەرچاوەکەدا) ناخوێندرێنەوە کە بەم پێیە دەبێ ئەم تاکەی سەرەوە بیست و چوارەمین تاکی ئەم بەندی یەکەمە بێت، بەڵام تاکەکانی ئەودیوی لاپەڕەکە بەباشی دەخوێندرێنەوە.
هیوابارم کە لە سەرچاوەی ترەوە ئەو چوار تاکە هەڵبەستە کە نەمتوانی بیانخوێنمەوە سەر هەڵبدەن، ئەگەرچی دەسنووسی ئەم سەرچاوەی (گل/٥)ە زۆر خۆشخوێنە و هەموو نووسینەکانی نووسەری ئەم سەرچاوەیە کە (مەلا عەبدوڵڵای گەلاڵەیی) بەڕێنووسێکی یەکجار خۆش جوان نووسراون هەر کەسێ بەئاسانی ئەتوانێ بیانخوێنێتەوە.
هەروەها جگە لەو سەرچاوەی (گل/٥)ە دیسانەوە لە سەرچاوەی (با/١)یشدا، وەک ڕێکەوتنێکی سەیر، بەر لەم تاکەی سەرەوە لەم سەرچاوەی (با/١)ەدا (چوار تاک بەهۆی تەڕبوونی ئەو لاپەڕەیە کە ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی تیا نووسراوە و بەر لەم تاکە دیسان وەها کوژاونەتەوە بۆم نەخوێندرانەوە، خۆشبەختانە تاکەکانی ئەودیوی لاپەڕەکە نەژاکاون.
ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە بەجۆش و خورۆشهێنییەکەیەوە کە ئارامی لەبەر (کوردی) بڕیوە، وەک پێشەکییەک وەهایە بۆ ئەم دوو تاکەی دوایی، کە ئەم دوو تاکەیش لە کۆتاییی هەر یەکێ لە (حەوت بەند)ەکەدا دووبارە دەکرێنەوە و بەهاتنی ئەم دوو تاکە دوای هەر بەندێکیانەوە پاشبەندی تاکەکان دەگۆڕدرێن بەجۆرە پاشبەندێکی جیاواز لەوانی (بەند)ەکەی پێش خۆی و

بەدوایاندا هەمان دوو تاکی دوایی دێن و ئەم تاکەی سەرەوە دووبارە ناکرێتەوە بەڵام تاکێکی پێشەکی ئاسایی وەک ئەم تاکەی سەرەوە، بەر لە دوا تاکەکەی دوایی دادەنرێن و هەر بۆیە ئەم هەڵبەستە فارسییە، درێژە بە(حەوت بەند) یا (تەرجیع بەند) ناونراوە، چونکە پاشبەندەکانی هەر بەندێک یەک جۆرن و جیاوازن لە پاشبەندی شەش بەندەکەی تر و بەدوای هەر بەندێکیاندا ئەم دوو تاکەی دوایی دووبارە دەکرێتەوە.

**ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکەیە:**

شوق، لە (عن، ن، ص)دا نووسراوە (شوق) بەبێ پیتی (و = واو)ەکە.

سەمتوور لە (گل/٣، گل/٥، ف، سجا)دا نووسراوە: (شیپور = شەیپوور).

سمتورە، لە (نم/١، مک، جم، با/١، حم)دا نووسراوە: (طنبور = طەنبوور یا تەنبوور).

سەمتوور لە (ط، گل/٨، مع، ج)دا نووسراوە: (پرشور).

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

بەدەم پێ بەزەویدا کوتانی هەڵپەرکێی خۆشی و دەست هەڵتەکاندنی سەرچۆپی کێشانەی هەڵپەرکێیەکەدا بەئاشکرا بەدەنگی بەرز و چرینی سروودی پڕ بەپڕی ئەم خۆشییەم لەگەڵ ساز و ئاوازی دڵگیر و کاریگەری دەنگی مۆسیقایی سەمتووردا ئەگونجێنم.

٢١- کای: کە ئەی، هۆ ئەی، سا ئەی، دە ئەی، ئۆ هۆ ئەی - ئەمیش شێوەیەکی بانگکردنە لە کەسێک کە ئەویش (محەمەد - پێغەمبەر - د. خ)ەیەی ئیسلامی مەبەست بووە.

دمت: دەمت، هەناسەت، ئەوی لە دەمتەوە دەرچووە لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە حەدیسەکانی خۆی، یا ڕوونکردنەوەکانی لە ڕێگەی ئاینەکەیدا کە ئەو ڕاگەیاندنانە هەروەک:

نفخە (نەفخەیی): فووی، فووپیاکردنی، پف کردنی، فوودانی، پفی، مەبەستی لە فوو پیاکردنی (ئیسرافیل)ی فریشتە واتا (مەلائیکە) کە بەکەڕەنا (صوور)ەکەیدا فوو دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ زیندووبوونەوەی مردووەکان و ئاگەدارکردنیان کە ئەوا ڕۆژی قیامەت واتا هەڵسانە کە مەبەست لە زیندووبوونەوەکەیە و هەروەها ئاگەدارکردنیانە کە ئەوا ڕۆژی لێپرسینەوەی چاکە و خراپەی (مرۆڤە) لەو ڕۆژەدا تاکو هەرکەس بەپێی چاکەکانی کاتی ژیانی جیهانیی بەشی لە بەهەشتدا بدرێت و هەروەها بەپێی خراپییەکانی ژیانی جیهانیی سزا و ئەشکەنجە بدرێت و ئەوانەی کە خراپەیان لەگەڵدا کرابێ خوا پاداشیان بەچاکە بداتەوە و ئەوەندەی ئەو خراپییانەی لەگەڵیان کراوە سزای خراپکاران بدات و ئەوەندەی ئەو خراپییانەی لەگەڵیاندا کراوە، بکرێتە چاکە و بخرێتە سەر چاکەکانیان و بەو پێیە هەر کەسەی مافی ڕەوای خۆی وەرگرێت.

سرافیلی (سرافیلی) وەک (سرافیل) کە (سرافیل) پێناسەی (ئیسرفیل)یشی هەیە.

سرافیل یا ئیسرافیل وشەیەکی (عیبری) واتە (زمانی جوولەکانە)یە و ناوی ئەو فریشتە (مەلائیکە)یەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە، کە یەکێکە لە سەرۆکەکانی فریشتەگەل و یەکێکە لەو فریشتانەی کە زۆر لە خواوە نزیکن.

له سەرچاوەکاندا لەمەڕ دیمەنییەوە دەردەکەوێت کە قەڵافەتی ئەوەندە گەورە (کولۆفت)ە، گوایە ئەگەر پێی لە بنی زەویدا بێت ئەوا سەری دەگاتە پێچکەی کورسی لە بارەگا (عەرشی)ی خوای مەزن، لە هەرە بەرزترین ئاسمانەکان. کە (سەدرەتولمونتەها)ی پێ دەڵێن.
ئەم فریشتەیە (چوار باڵ)ی وەک هی باڵندە (مەل)ی هەن کە تیژڕەوترینە و لەسەر فرمانی خوای مەزن یەکەمین (کوڕنووشبەر) بووە بۆ (باوکە ئادەم) کە گیانی کراوە بەبەردا.
یەکێ لە پیشەکانی ئەم فریشتە پیرۆز و مەزنە ئەوەیە کە هەر فرمانێکی خوایی لە (لوح المحفوظ = لەوحەلمەحفوظ)دا بنووسرێ، ئەم فریشتەیە ئەو فرمانە ئەگەیەنێتە شوێنی خۆی لە هەرە نزیکترین کاتدا.
ئەو فوو بە(کەڕەنا) یا (بۆڕی) یا (صوور) کردنەکەی بەپێی ڕاسپاردە و فرمانێکی خوای مەزنە کە لە ڕۆژی دوایی (ئاخیرەت)دا بۆ زیندووبوونەوەی کەسانی مردوو و، ئاگەدارکردنیان لە کاتی ڕۆژی حەشر واتا: دەمی لێپرسینەوە واتا (ساعە الحساب)ە.
(کوردی) هەناسەی یا ئاخاوتنەکانی پێغەمبەری خۆشەویستی چواندووە بەو فوو پیاکردنەی (ئیسرافیل) کە فرمانی پیرۆزی خوایە بەواتا ئاخاوتنەکەی پێغەمبەریش بەفرمانی خوایە کە هەردووکیان: (فوو پیاکردنەکە) و (ئاخاوتنەکە) جیهانیان بەئاگا هێناونەتەوە و دەهێننەوە.
(کوردی) لێرەدا وەک نیشانە بۆ کردنی ئەو (دە) جار فوو بەکەڕەنا کردنەکانی (ئیسرافیل)ە وایە کە لە قورئانی پیرۆزدا و، لە ئایەتەکانی ژمارەی (٧٣)ی سووڕەتی (الانعام) وە (٩١)ی سووڕەتی (الکهف) وە (١٠٢)ی سوورەتی (طه) وە (١٠١)ی سوورەتی (المؤمنون) و (٨٧)ی سوورەتی (النحل) و (٥١)ی سوورەتی (یس) و (٦٨)ی سووڕەتی (المزمر) و (٢٠)ی سوورەتی (ق) و (١٨)ی سوورەتی (النبأ) وە (١٣)ی سوورەتی (الحاقە)دا هاتوون.
مورد: جێگە بەزی کاروان،( لێدابەزینی، بەزگە، کاروانسەرا، جێی تێ هاتن «تێچوون»، هەوارگە، هەوارگا، شوێن بەز، مەنزڵگا) – لەم شوێنانە مەبەستی (کوردی) لە لای (پێغەمبەری ئیسلام)ە کە هەمیشە (جیبرائیل)ی فریشتە، ڕووی کردووەتە ئەو لای پێغەمبەرە، ئەمە لە ڕووی مەبەستەوە بەڵام وشەی (مورد) لە ڕووی فەرهەنگییەوە بەواتا: (گوێی گۆلی ئاو) یا (سەر کانی) یا (قەراغی چەم و جۆگە و ڕووبار)ە کە ئاویان لێ دەخورێتەوە. کە مەبەست بۆ ئێرە ئەوەیە، چوونە لای (پێغەمبەر) و تەنانەت (گۆڕی پیرۆزیشی) وەک چوونە گوێی ئەو ئاوانەیە کە زیندەوەر بەبێ ئاو ناژی و، چوونە لایەکەی وەک ئاوی ئاگەدارییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەها بووە و وەهایە کە چۆن ئاو هۆیەکی ژیانە، هەروەها ئەو ئاگەدارییانەش هۆی کامەرانیی هەردوو جیهانە.
جبریلی: وەک (جبریل)، ئەمجا (جیبریل) بەشێوەی جیبرائیل و (جوبرائیل)یش هاتووە، کە ئەمیش وشەیەکی (عیبرانی) = جوولەکانەییە، کە فریشتە (مەلائیکەیەکی مەزنی زۆر نزیک بەخوای گەورەیە و سەرۆکی هەموو فریشتەکانە).
ئەم فریشتە مەزن و پیرۆزە کە دەچووە بارەگای پێغەمبەری ئیسلام، هەر جارەی چەند

ئایەتێکی قورئانی لە خوای گەورە بەو پێغەمبەرە گەیاندووە، لەوەوە کە بەیەکێ لە فریشتە زۆر نزیک لەو پێغەمبەرە دانراوە.
لە قورئانی پیرۆزدا سێ جار ناوی هاتووە، لە ئایەتەکانیدا کە لە ژمارە (٩٧ و ٩٨)ی سوورەتی (البقرة) و لە ژمارە (٤) سوورەتی (التحریم)دا.
لەم تاکە هەڵبەستەدا کە (کوردی) (دەم) یا فەرموودەکانی کە لە دەمیەوە ڕایگەیاندووە وەک قورئان و حەدیث و ڕوونکردنەوەی ئاینەکەی چواندووە بە(هەناسە) وە یا (فوو)ی ئیسرافیل لەوەوەیە کە ڕاگەیاندنە دەمییەکانی پێغەمبەر لە ڕووی (ئاین)ەوە دوا ڕاگەیاندن بوون و چونکە (محەمەد پێغەمبەر – د. خ) دواترین پێغەمبەر واتە (خاتەمولئەنبیا) بووە لە هەمان کاتدا ئەو فووکردنەی (ئیسرافیل)یش بە(کەڕەنا)یەکەیدا دواترین دەنگ دەبێ لە (ئیسرافیل) و (کەڕەنا)یەکەیەوە کەواتە هەردووانیان (دواترین) و بۆیە (کوردی) چواندوونی بەیەکدی.
هەر بۆیەش (کوردی) هەم ڕاگەیاندنەکانی پێغەمبەر و هەم دەنگی کەڕەنایەکەی بە(مەورید) ناو بردوون کە (مەورید) لە هەمان کاتدا بەو شوێنەش دەگوترێ کە بەهرەمەندیی وەک ئاو لێ خواردنەوەکەی لێ دەخورێتەوە، واتە هەم ئاینەکە شوێن بەهرەمەندیی (بەئیسلام بوون) و هەم دەنگی (کەڕەنا)یەکەش لەو ڕۆژ و دەشتی لێپرسینەوەیەدا (حەشر) و (مەحشەر) ئەمیش شوێن بەهرەوەریی پیاوچاکانە کە لە پاداشتی چاکەیاندا بە بەهەشت شاد دەبن، وەک لە تۆڵەی خراپکاریی پیاو خراپکاراندا (مەورید)ەکەیان چوونە (دۆزەخ) و (سزا) و (ئەشکەنجە)کانیانە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (گل/٥)دا نییە و لە (مک، ط)دا دوانزەیەمینە و لە (ق/٣، ف، جم، ج)دا سیانزەیەمین و لە (صا)دا چواردەیەمین تاک و لە (گل/٣، مع)دا هەژدەیەمین و لە (با/١، گل/٨، ما/١، ص)دا نۆزدەیەمین و لە (حم)دا نۆزدەیەمین و لە (مس، شح، عن)دا بیستەیەمین تاک و لە (نم/١، سجا، ن، ه، گل/٦، نع)دا بیست و یەکەمین تاکە لەم بەندی یەکەمی (حەوت بەندە)دا.

**جیاوازییەکان:**

نفخەء، لە (مک، ج)دا نووسراوە (نفخەء = نەفحەیی) واتە لە وشەکەدا لە جێگەی پیتی (خ)ی جێگیرکراوەی سەرەوەدا لە (مک، ج)دا پیتی (ح) نووسراوە کە بەواتا (بۆنی و...) دەگرێتەوە کە هەڵەیە. جا نووسەری سەرچاوەی (ج) بۆ داپۆشینی ئەم هەڵەیە و گوایە هەڵەکەی ڕاست کردووەتەوە نووسیویە:
«ڕەنگە نەفخە» بێ کە لە قورئاندا هاتووە: (ونفخنا فیها من روحنا) سوورەتی (انبیاء) – ٢١ – ئایەتی (٩٠).
منیش لە بەرپەرچدانەوەمدا، نیشانە بۆ خودی تاکە هەڵبەستەکە دەکەم کە باسی لە ئیسرافیل و فوو بەکەڕەنا کردنەکەیەتی وە ئەم ئایەتەی کە مامۆستای (ج) نیشانەی بۆ کردووە، فوو پیاکردنی خوای مەزنە بەگیانی (مریەم)ی دایکی (عیسا) پێغەمبەر (د. خ)دا و واتای ناو تاکە هەڵبەستەکە و لێکدانەوەکەی مامۆستای (ج) بە(ڕەنگە) زۆر لە یەکترەوە دوورن و (لێکدانەوە)

و (ڕەنگە)کەی مامۆستا دروست و پڕبەپڕ نییە لە ناوەڕۆکی هەڵبەستەکە جیاوازە.
سەرەڕای ئەوەی ئەو ئایەتەی نووسەری (ج) نیشانەی بۆ کردووە، ژمارە ڕاستییەکەی (٩١)ە کە نەک (٩٠) وەک مامۆستا نووسیویە. هەروەها مامۆستای (ج) درێژەی بەتێهەڵچوونە (سەرنجی ورد) پێنەدانەکەی داوە و، نووسیویە:
«ونفخ فی الصور – سوورەتی (کهف) – ١٨ – ئایەتی (٩٨) کە (نەفخی ڕوح) هی جبرەئیلە و (نەفخی صوور) هی
واردات: ئەم وشەیە بەواتە: (دەستکەوتەکانی) دێت بەڵام مەبەست لە هاتنە زۆرە یەک لە دوای یەکەکانی (جیبرەئیل)ە بۆ لای (پێغەمبەر – د. خ) لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بۆ (پێغەمبەر) دەهێنان کە وەک (دەسکەوت)ێکی لە نرخ نەهاتوو وەها بوون بۆ ئیسلامەکان و تەواوکردنی هەموو قورئان، لەو سەردانانەیدا کە لە خوای مەزنەوە دەیهێنان.
جبریلی واتە (هی جیبریل) کە مەبەست لەوەیە کە ئەو ئایەتانە یەکسەر لە (جیبریل)ەوە بەپێغەمبەر وەک (واریدات) = دەسکەوت گەیشتوون. وەک دەسکەوتی لە نرخ نەهاتووی ئیسلامەتی.
جبریل: گەورەترین فریشتە (مەلائیکە) و سەرۆکی فریشتەکانی ترە و هەرە نزیکترین بووە بەخوای مەزن و (ڕابەر) بووە لە نێوان خوا و پێغەمبەری ئیسلامدا و (پەیام)ی خوای بەپێغەمبەر گەیاندووە. کە وەک ڕام گەیاند لە (قورئان)یشدا ناوی (جبرەئیل) لە سێ ئایەتدا هاتووە.
لێرەداو بۆ دەستبەسەراگرتنی بابەتی (نەفخە)کەدا بگرم کە جارێکی تریش لە قورئاندا ئەم وشەی (نەفخە)یە هاتووە جگە لە (کەڕەنا فوو پیاکردنەکەی ئیسرافیل) وە (فوو بەگیان کردنەکەی مریەم)دا هاتووە کە نیشانەیشە بۆ یەکێ لە کارە لە ڕادەبەدەر (موعجیزات)ەکانی (عیسا پێغەمبەر د. خ) ئەوە بوو کە بە(مەل – باڵندە)یەکی لە قوڕ دروستکراودا فووی کردووە و بەفەرمانی خوای گەورە ئەو مەلە قوڕینەیە دەستبەجێ گیانی هاتووە بەبەردا و، داویەتە شەقەی باڵ و فڕیوە بەئاسماندا کە ئەم کارە گرنگەش لە ئایەتی ژمارە (٤٩)ی سووڕەتی (آل عمران) و ئایەتی ژمارە (١١٠)ی سووڕەتی (المائدة)ی قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە (کوردی) لە هەڵبەستەکەیدا (نەفخە = فوو پیاکردن)ەکەی نەداوەتە (عیسا پێغەمبەر – د. خ) داوەتە پاڵ (جیبرەئیل) و بەئاشکرایی داویەتە پاڵ (سرافیل = ئیسرافیل)
**واتای گشتیی ئەم تاکە:**
ئەی ئەوەی کە دەم (زارت) بەڕاگەیاندنی مژدەی پەیابوون و دەرکەوتنی ئاینی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی قورئانی پیرۆز و فەرمووده (حەدیث)ە دڵگیر و پەسندەکانت و بەڕوونکردنەوە گرنگەکانت کە وەک (نەفخە) = فوو پیاکردنی ئیسرافیلدا بوو بە(کەڕەنا)کەیدا کە هەردووکیان واتە ئەوی لە دەمتەوە دەرچوون و دەنگی کەڕەناکەش کۆتاییهێنەرن، ئەوی تۆ لە پێغەمبەرێتی و ئایندا و ئەوی ئیسرافیلیش لە کۆتاییهێنەرە بەژیانی سەر زەویدا) کە هەردووکیان ئەو

دەسکەوتەن وەک (واریدات) دەسکەوتەکانی لە جیبرەئیلەوە گەیەنران بەپێغەمبەر لە سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز کە قورئانیش هەرە مەزنترین (مەورید) شوێن بەهرەوەرییە بۆ مرۆڤایەتی لەسەر گۆی زەوی لە ناو گەلاندا و بگرە ڕووناککەرەوەی ڕێگەی ئەو جیهانیشە.

٢٢- ئەم تاکە هەڵبەستە دووەمین تاکە، کە لە دوای هەر یەکێ لە (حەوت بەند)ەکەی ئەم (تەرجیع بەند)ە فارسییەی (کوردی)یەوە دووبارە ئەکرێنەوە. بەوەدا کە (کوردی) ئەم هەڵبەستە درێژە فارسییەی کردووە بەحەوت بەشەوە، بۆیە ئەم هەڵبەستە بە(حەوت بەند) ناو دەبرێ.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە یەکەمین تاکە هەڵبەستێکە کە (کوردی) بەزمانی عەرەبی تیایدا دای ناوە و ئەم تاکە عەرەبییە دوا تاک یا کۆتاییی هەر یەکێ لە بەندەکانی ئەم (تەرجیع بەند)ەیە کە هەموویان بە(فارسین) جگە لە تەنیا ئەم تاکە.

**واتای وشەکان:**

انت: ئەتۆ، تۆ، خۆت، خودی خۆت.

شمس: ئەستێرەی خۆر، خۆر، کە وشەی خۆر لەوەوەیە کە ئەم (ئەستێرەی خۆر)ە لە لای (خۆرەڵات = ڕۆژهەڵات)ی گۆی زەوییەوە هەڵدێ و تیشکەکەی لە زەوی ئەدات وە ناوی خۆرەڵات لە زمانی هەرە کۆنی (کوردی)دا بەشێوەی (خاوەر)یش دەگوترێ و، بەواتا ڕۆژهەڵات.

ئەم ئەستێرەیە یەکێکە لە کۆمەڵەی خۆری (المجموعة الشمسية) و گەورەترینی ئەو کۆمەڵە ئەستێرەیە کە بەگوێرەی هاناکردن لە زەوییە و ئەم ئەستێرەی خۆرە ئەبینرێ ئەگەر نا بەپێی زانیاریی گەردووناسی گەلێ ئەستێرەی تری لە ئەستێرەی خۆرەکەی ئێمە تیشکدارتر و گەورەتر لە بۆشاییی ئاسماندا هەیە.

(کوردی) کە لە سەرەتای ئەم تاکەیدا گوتوویەتی (انت = تۆ)، (شمس = خۆر) مەبەستی لە پێغەمبەری ئیسلامە کە بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی وەک بڵاوبوونەوەی تیشک و ڕووناکی (ئەستێرەی خۆر) وەهایە، کە هەردووکیان ڕووناککەرەوەی دەروونی خەڵکی و هەموو ڕووی زەوی و ئاسمان و سەر گۆی زەوین.

الهدى: ڕێنومایی، ڕێ ڕووناککار، ڕەهبەر، ڕێ پیشاندەر، ئاڕاستەکار بۆ ڕێگەی چاک. کە لەمانە هەمووی هەر مەبەستی خودی پێغەمبەرە وەک کە (کوردی) گوتوویەتی ئەی پێغەمبەر تۆی وەک ئەستێرەی خۆر کە ڕێگەی گومڕایان و خوانەناسان ڕووناک دەکەیتەوە و ڕابەرییان دەکەیت بۆ کەوتنە سەر ڕێگەی چاک.

ونور الحق (وەنوورەلحەق): (کوردی) سەرەڕای ئەوەی کە گوتوویە: (تۆی ئەو ئەستێرەی خۆرە ڕێی ڕووناککەرەوەی ڕێنومایی کاری بەرەو چاکەیت)، لێرەشدا درێژەی بەو پێناسەیەی داوە کە بەو پێغەمبەرەی گوتووە (هەروەها) تۆ نووری حەقیت.

نور (نوور): پەرتەو، ڕۆشنایی، ڕووناکی... بەڵام:

الحق: نەک هەر پەرتەو و ڕۆشنایی بەتەنیا بەشکو تۆ ڕۆشنایی و پەرتەوی حەقیت.

حق: خوا، ڕواڵەتی خوا، ناوێک لە ناوەکانی خوا، ڕاستی، ڕاستەقینە، کە خودی پێغەمبەر

دەرخەرێکی ڕاستیی خوایە.
ئەم نیو باڵی یەکەمی تاکە هەڵبەستەی سەرەوە بەم شێوەیەش دەخوێندرێتەوە:
(ئەنتە شەمسەل هودا و نوورولحەق)
اظهر: دەرخە، بنوێنە، ئاشکرایکە، نیشان بدە، کە وشەکە ڕووی دەم لە پێغەمبەر کردنە.
الحق: ڕاستی.
یا ظهور الحق: ئەی نوێنەری، دەرخەری، پیشاندەری، ڕاستەقینە (حەق).
ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (گل/٨)دا نییە و لە (صا)دا پانزەیەمین تاک و لە (مک، ط)دا سیانزەیەمین و لە (ف، جم، ج)دا چواردەیەمین و، لە (ق/٣، ص)دا بیستەمین و لە (حم)دا نۆزدەمین و لە (مع)دا هەژدەمین و لە (با/١، ما/١، گل/٣)دا بیستەمین تاک و لە (مس، شح، گل/٥، عن)دا بیست و یەکەمین تاک و لە (نم/١، سجا، گل/٦، ن، ه، نع)دا بیست و دووەمین تاکە لەم بەندی یەکەمەدا. لە هەموو نوسخەکاندا دوا تاکی ئەم بەندی یەکەمەیە.
بڕوام وایە ئەم بەندە چوار تاکی تری لێ لەناوچووبێ بەهۆی دەستاودەست کردن و پەڕپووتبوونی کاغەزی نوسخەکان و بەهۆی مۆرانە و دووکەڵ و تەڕبوون و چاودێری نەکردنی نوسخەکانییەوە وە یا دەست نەکەوتنی نوسخەی تر کە لەم سەرچاوانە زۆرتریان تیا بێ، نەک بەپێی ئەم بەندی یەکەمە بەشکو بەپێی هەر حەوت بەندەکە.
لە لایەکی ترەوە بەپێی ئاگاداریم لە چەندین (حەوت بەند)ی تر کە لەوانەیە هەموو (بەند)ەکانی (تەرجیع بەند)ە ژمارەی تاکە هەڵبەستی هەر یەکێکیان ئەوەندەی ژمارەی تاکەکانی بەندەکانی تری بێت کە دەبینرێت ژمارەی هەر (حەوت بەند)ەکەی ئێرە چوونیەک نین لە زۆر و ژمارەیاندا.
ئەم تاکە هەڵبەستانەی ئەم بەندی یەکەمە بەهۆی زۆری سەرچاوەکانییەوە لەوانەیە کە زۆر نزیک بن لە دەقی گوتنەکەی (کوردی)یەوە. وەک لە تاکی یەکەمی ئەم بەندی یەکەمەدا دیاریم کرد کە زۆر لە نوسخەکان بەهۆی ئەوەوە نیشانەی بزوێن (علامە الحرکە)ی وەک سەر و ژێر و بۆر و ئەمانەیان لەسەر دەقی ئەم تاکەی سەرەوەیان نەنووسیوە، ئەوە بووەتە مایەی خوێندنەوە و نووسینی ئەم تاکە بەهەڵە، کە بەپێی دەستووری زمانی عەرەبی نەنووسراون.
ئەوە بوو هەر لە یەکەم تاکی ئەم بەندی یەکەمەشدا گفتوگۆیەکەی نێوان (کوردی) و (فەخرولعولەما) (شێخ محەمەد)م لەسەر شێوەی دەربڕینی ئەم تاکەی سەرەوەم ڕاگەیاند کە (فەخرولعولەما) گوتبووی (انت شمس الهدی = ئەنتە شەمسولهودا) و (کوردی) بۆی ڕاست کردبووەوە و، (شەمسول)ەکەی بۆ کردبووە بە(شەمسەل) کە فەخرولعولەما دانی بەو ڕاستکردنەوەیەی (کوردی) داناوە.

## بەندی دووەم

۲۳- آن گـــــدایان کــــه خـلق را نـنگـند
پـادشـــــاهـان عـــــرش اورنـگـند
۲٤- گنـج در آســـــتین و کـــــیس تـهی
پای بـر عـــرش و زیر ســـر سنگین
۲٥- چـون، خـــــزانـه نـهـــــان، بـه ویـرانـه
چون گـــــهـــــر در نـهنگ بـاهـنگـند
۲٦- خـلـوت پـشـت کـــــاخ را شـــــاهـد
کـــان دران مـــجـــمـعی همــاهـنگند
۲۷- گـــرچـه ظـاهـر بەکلبـــەاند ســـاکن
باطـنی را بـه جـــان شـــبـــاهـنگند
۲۸- هـمـــــــه پـیـل افـگـنـان و، آهـو وش
مـلـک اخــــــــلاق و آدمـی رنـگـنـد
۲۹- گـــاه در گـنـج دلبـــری مـــبـــســـوط
گــــه زرنج زمـــــان ســــبک سنگند
۳۰- طـائـر وهـم و مـــــــســـــــرع الافـکـار
در بـیـــــابـان وصـلـشــــــان لنگند
۳۱- هـم در اقــلـیـم دل چـو سـلـطـانـنـد
هـم بـر افـــواج جـــان چو ســـرهـگند
۳۲- از لـب لـعل و، گـــیـــســـوی مـــشـکین
خــــرم و، کـــامـــیـــاب، باهـنگند
۳۳-دل پـر اســـــرار غـــیـب را بـه مـــــثل
طـبـلـه در طـبـلـه، تـنـگ در تـنـگـنـد
۳٤- دل زکـف دادگــــــان شـــــــوریـده
شـــوخ و شـــیـــرین و شـــاهـد و شنگند

٣٥- عارفانند، زتارم اعلا
بردرت را گدای لالنگند

٢٦- انبیاء در مدارس غیبیّ
کشف کشّاف و فرّ فرهنگند

٣٧- در سمای حقیقت جانی
مهر پرواز طی راه لنگند

٣٨- شاهدم، شاهدم که در معراج
همه شان دید، در رهش (چنگند)

٣٩- با دد و انس و جنّ به صدق و صفا
لیک با دیو نفس در جنگند

٤٠- جان و دل (باز) پرتو نظری
کحل ابصار و صیقل زنگند

٤١- وا نگهی میکده چکار آید؟
که همه خودخم و مل و بنگند

٤٢- چونکه مست (ألستُ)اند آنان
پی کامی چنین قوی ینگند

٤٣- (غافل) از خویش و، (بیخود)، از (مستی)
(واقف) از روم و (آگه) از زنگند

٤٤- بی صفای هوای دلجویت
خفهؤ، بندگان بنگ رنگند

٤٥- از گدایان به شور های هو
هرکه با چنگ و دنگ، نی دنگند

٤٦- گوش سوی سروش و دف در کف
(نای) با (نای) و چنگ در چنگند

٤٧- از سرافیل؛ عشق: در یکدم
تا دم صور، واپسین دنگند

٤٨- مطربان خـوش، نغـمـه سـراى
بـا خـروشى چنين در آهنگند

................................................................

٢٣- آن: ئەو.
گدايان: سوالْكەران، هەژاران، بێ نەوايان.
كه خلق را: كه بەلای خەڵكەوە، كه بۆ خەڵكی، كه بەلای خەڵكییەوە، كه بۆ خەڵكی (كەسان).
ننگند: شوورەيين، سووكين، پەڵەی ڕەش و ناشيرينين، شەرمەزارين، شەرمهێنن، بەدناوێتين، كەموكوورِن.
واتای وشەكانی تا ئێرە مەبەست لەوەن كە: (ئەو سوالْكەرانەی كە بەلای خەڵكییەوە سووكايەتی و سەرشۆڕين، ئەوانە خۆيان):
پادشاهان: پاشاكان، پاشايەكان، پادشايان، پادشاكان.
واتە: ئەو سوالْكەرانەی سووک و شەرمەزارن بەلای خەڵكەوە هەر ئەوان خۆيان پاشايانن كە لەسەر:
عرش: ئەم وشەيە عەرەبييە و بووەتە وشەيەكی ئاينی، نەتەوە ئيسلامەكان بەواتە: (بارەگای خوا) يا ئەو كورسييەی لە خودی ئەو عەرش بارەگای خوايە دايە، وە يا بەواتە تەختی نشينگەی پادشايانە، كە لێرەدا مەبەست لەمەيانە، هەرچەندە (عەرش) واتای گۆشە و كەناری شتێک دەدات لە ڕووی فەرهەنگييەوە.
واتای تا ئێرەی وشەكانی ئەم تاكە هەڵبەستە ئەوەيە ئەو سوالْكەرە شەرمەزارانە كە بەلای خەڵكەوە سووكن، هەر ئەو سوالْكەرانە بەخۆيان پادشايانی سەر (تەخت = عەرش)ن ئەو عەرشەی كە شكۆدارە و:
اورنگند: بەشان و شكۆن، ڕێزمەند و شكۆدارن، ئەورِەنگ = شكۆ، ڕێز، جوانی، ڕەنگين، (جەمال و جەلال) لێ هاتووە، تێگەيشتن (مەعريفە) و...
هۆنەرە صۆفييەكان، زۆر جار ئەم وشەی (ئەورەنگ)ەيان لە هەڵبەستەكانياندا بەواتای (مەعريفە) بەكارهێناوە. ئەم تاكە هەڵبەستەی سەرەوە لە هەموو سەرچاوەكانی ئەم هەڵبەستەدا كە دەست من كەوتوون و لە پێشەوە ناويانم نووسيون لە هەمووياندا يەكەمين تاكە هەڵبەستی ئەم بەندی دووەمی (حەوت بەند)ە فارسييەی هۆنەرمان (كوردی)دا.
ئەم تاكە هەڵبەستە لە دوو ڕووی (كۆمەلايەتی) و (ئاينی)يەوە سەرنج ڕادەكێشێ بۆ لێكدانەوەی مەبەستەكەی (كوردی).

**لە ڕووی ئاينييەوە:**

(كوردی)؛ لاوەكييانە، يەكسەرييانە پەيڕەويكارانی پێغەمبەری ئيسلام و ئاينە پيرۆزەكەی دەستنيشان كردوون كە وەک لە دوو (چين)دا بن لێيان دواوە. چينێكی ئەو پەيڕەويكارانەن

بەتێکرایی بە(ڕەشـەگـەل) ڕەچاوی کـردوون کە لـە چاو (چین)ەکـەی ژیاندا سـرِ و سـواڵکەر و هەژار و دەستنەڕۆیشتووە ئیسلامـەکان بوون کە ئەم چینەیان بەڕاستی و پاکی و لە هەموو دڵ و دەروونی بێگەرد و ئاینـەکەیان وەرگرتووە و بەبـێ خۆ پێوە هەڵکێشـان خوایان ناسـیوە و لە خـوای یەکتـا و کردگـارپەرسـتیدا ڕێگەی ئاینەکەیان گرتووە و بـەو (نەدارایی) و (هەژاری)یە شـیاوە، هەر سـەریان کز گرتووە و لە سـوپاسگوزاری خوا دان و چاویـان لە سامـانی کەسـانی ترەوە نیـیـە و لەو بێ دەسـتـیـیـەیاندا بەلای دزی و تالان و مـاڵی خـەڵک بەحـەرامـی خـواردندا نەڕۆیشـتوون و نارِۆن و، ڕازین بەو بەشـەی کە خـوا پێی داون کە ئەوەتا لەم تاکە هەڵبەسـتـەدا (کوردی) ڕای گەیاندووە ئەو هەژار و سواڵکەرانەی کە بەلای خەڵکی چینی دەسدار و لە ژوور خـۆیانەوە لـە سـامـانداریدا وەک سـووکـی و شـەرمـهێنەر سـەیر دەکرێن و بەچینێکی ڕیسـوا و شەرمەزار ئەزانرێن.

واتە ئەو خــەڵکە چین و تـوێژی کـۆمــەڵایەتی دەسـدارە، ئەگـەرچی لەوارانە بـەپەست تەمــاشــا دەکـرێن، بەڵام لـە ڕاسـتـیـدا ئەو چینە هـەژار و کـەمــدەسـتــە (سـواڵکەرە) خــۆی پادشــای ڕاســتـەقـینەیە نـەک چینەکـەی کـە بـەسـامــان لە ژوورووی ئەو هـەژارانـەوەن. لە دیوێکـی تری بابەتەکەوە وەها دەگرێتەوە کـە هەندێ لەو (چین)ە سامـانداره کە پێشەوا ئاینییەکـان بوون کە بەســەر زاری پادشــای پۆست نـوشـین بوون، بـەڵام لە ڕاســتــیـدا دەروون ڕەش و بـێ باوەڕ و هـەلپەرست و جیهانخوازن نەک وەک چینە هـەژارەکە یا دەروێش و مریدەکانیان. ئەو دەروێش و مـریدانە لە پێشـەوا یا شـێخـەکانیـان گـەلێ بڕوا بەهێزترن لە ڕێگەی ئاینداریـیـەکـەیاندا و بۆیە (کوردی) بەئاشکرا ئەو هـەژار و سواڵکەرانەی بەپادشایـان و تەختی پاشایەتی نوشـین پێناسـە کردوون.

لە ڕوویەکی ترەوە (کـوردی) کـە کـەسـانی وەک خـۆی بە(هـەژاری چاو لە دڵسـۆزی و لوتف و نیعمەتی خوا)ی داناون و بەڵام هەر ئەوان بەبەشـی خۆ ڕازی و چاو لە بەشی خەڵکییەوە نەبوو و، هیـوا و ئاواتیـان بەهـێز بووە بەرامـبـەر بەچاودێری و دڵسـۆزی و بەخـشـندەیی خـوا کـە ئەو ڕێبــاز و بیــر و بڕوایەیان خــۆی پاشــایـەتیــیــە، نەک پاشــایەتیی بەدیمـەن و ڕواڵەت کــە ئەو دەســـدارانە لە دەروونـدا ئەوەندەی ئەو هـەژارانـە خـوانـاسـی ڕاست و پـاک نەبـوون و هـەڵپـــەی گردکردنەوەی سامـاندار بوون بەهـەر شێوەیەک بووبێ.

**لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:**

بەپێی گەلێ لە هـەڵبەسـتـەکانی کوردی کە بەم پەڕاوییەدا بڵاوکراونـەتەوە، کە (کوردی) پیاوێکی (نیشتمانپەروەر و نەتەوەپـەروەر) بووە یا دۆست و لایەنگری کۆمەڵایەتیخواز بێ لایەنن بووە کە وەک ئاوێنـە هـەمـوو بار و ڕواڵەت و هـەڵوێسـتـی (چین)ەکـانی کـۆمـەڵگایەکـەی خـۆی ڕەنگ پێ داوەتەوە و نومـایانی کردووە و، لایەنە چاک و خـراپەکانی وەک وێنەکێشـێکی هونەرمـەند وێنە کێشاوە و ڕاسـتییەکەی ڕاگەیاندووە ئەمـجا لەم ڕوانگەیەوە (کوردی) کۆمـەڵگایەکەی خۆی لە دوو چیندا ڕەچاو کـردووە کـە ئـەوانیش (چینی ڕەشــەگـەل) و (چینی سـامـانداران) و بـەبێ

گیروگرفت و بێ سێ و دوو لێکردن بەتەواوی (ڕەشەگەل)ەکەیانی پشتگیری کردووە.
لێرەدا ئەوی جێگەی سەرسوڕمانە کە (کوردی) خۆی و خانەوادەکەی لە چینی سامانداری و خاوەن زەویوزار و گوند و جۆگە و کانی و کارێز بوون و کەچی هەمیشە خۆی بەیەکێ لە ڕەشەگەل زانیوە و زۆر بەخشندانە و یەکجار دەستبڵاوانە لە سامان و بەرهەمی زەویوزارەکانی یاریدەی داماوان و لێقەوماوانی (ڕەشەگەل)ی داوە و هەر ئەو ڕەوشتەش لە فەتاح بەگی ساحێبقران و لە ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقرانی کوڕی ئەو (فەتاح بەگ)شدا خۆی نواندووە کە لە گرانییەکەی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کە تورکانی عوسمانی هەرچی دارایی خەڵکەکە و بەتایبەتی لە کوردستان هەموویان بەتاڵان بردوویانە و داگیریان کردووە و تەنانەت (قووتی) خێزانەکان و زەخیرەی خواردەمەنیشیان بەزۆر بردووە و مەڕوماڵات و ئاژەڵ و پەلەوەرەکانیان لێ سەندوون، بەڕادەیەک هەژاری بڵاوبووەتەوە کە بەڵگەم لا هەیە (خەڵکی) گۆشتی مرۆڤ و تەنانەت منداڵی خۆی و بگرە گۆشتی پشیلە و سەگیشی خواردووە و لەو گرانییەدا ئەحمەد بەگ و باوکی (هەر ڕۆژی سێ ژەم) یەکێ حەوت (مەنجەڵی گەورەی ساوەر کوڵان چێشتیان بەهەژاران داوە) (کوردی) هەرچی دەسکەوتی بوو داویەتی بەوانەی کە پێویستییان بووە و تەنانەت بەرگ و پۆشاکێکی وەک (بەگ) و (بەگزادە) بۆ خودی خۆی نەبووە و لەبەری نەکردووە و هەر لەبەرئەوەش بووە کە بە(مچە ڕووت) ناسراوە. وەک ئەو پێناسەکردنەی بە(مچە ڕووت) لە هەڵبەستی خۆیدا و لە پاشبەندی پیتی (ت)دا لەم پەڕاوییەدایە کە هەڵبەستەکەی بە(مچە ڕووت) کۆتایی هاتووە.
ئەم نموونەیەی و، زۆر ڕەوشتی تری سەرنجی لێکۆڵەرەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی) دەبات بەلای ئەوەدا کە لەم تاکە هەڵبەستە ئاینییەی سەرەوە کە بڕوا و مەبەستی لەگەدایان (ڕەشەگەل) و لە پادشایان دەرەبەگ و برا گەورەکانی وڵات نەبووە، کە بەلای (کوردی)یەوە ئەو گەدایانە (پادشای تەخت نوشینی ڕاستی بوون نەک دەرەبەگەکانی وڵات و، بەئاشکرا پشتی چینە (گەدا) و (چەوساوە)کەی خۆی گرتووە و پلاری لە چینی دەرەبەگ گرتووە و گەداکانی بەڕێزمەند و خاوەن شان و شکۆ داناوە.
ئەگەر سەرنجی (قووڵی)ی (کوردی) بدرێ لە زۆر هەڵبەستی تردا و ئەوی شارەزای زۆر لە کۆنەوەی (کوردی) بێ، وەک من تێ دەگات کە من لە لێکدانەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی)دا، لام نەداوە و پێ بەپێی بیری (قووڵی) (کوردی) لێکم داوەتەوە.
لە سەردەمی ژیانی (کوردی)دا کە (بیری نەتەوە و نیشتمانپەروەری) سەری هەڵدابوو، بەتەواوەتی دژی (دەرەبەگ) و ئەو بارودۆخە هۆیەکی سەرەکی بووە، بۆ ئەوەی (ڕۆم) و (عەجەم)ی دوو دراوسێی چنۆک و نەژادپەرست لەو سەردەمەدا سەرگەرمی ئەو ڕووخاندنی سەرۆکانی و فرمانداری و پاشایەتی و بەڕێوەبەرایەتییە کوردییەکانماندا بوون و مێژوو گەواهیدەری ئەم ڕاستییەیە کە ئەو دوو حکوومەتە یەک لە دوای یەک ئەو دەسەڵاتداری و بەڕێوەبەرایەتی و فرمانداری و پاشایەتییە کوردییانەیان ڕووخاندوون و لە ناویان داون کە

لێدوانی ئەو کارەش بۆ ئێرە درێژە دەکێشێ.

**جیاوازیی سەرچاوەکان:**

آن لە (ف)دا نووسراوە: (ین: ئەم)

آنان لە (عن)دا نووسراوە: وان = ئەوان.

خلق را، لە (ف، جم، نم/١، ما/١، سجا، حم، ق/٣)دا نووسراوە: نام را. واتە (ناوان) کە ئەمیش دەگونجێ.

پادشاهان عرش، لە (گل/٥، گل/٦)دا نووسراوە: پادشاهان کی عەرش.

پادشاهان عرش، لە (مک، ط، ج)دا نووسراوە: شەهریارانی تەخت هەرچەندە لە ڕووی پاکێتیی زمانەوە (شەهریارانی تەخت) دڵگیر و بەجێیە، بەڵام لە ڕووی هێزی واتاوە (پادشاهانی عەرش)ە کە گونجاوتر و پەسندترە.

من ئەم جیاوازییانەی نێوان دەقی نوسخەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەم، بەم جۆرەی سەرەوە لەگەڵ هەر (٢٤) سەرچاوەکانی ئەم (حەوت بەند)ەدا بەر لەوەی لە نامیلکەکەی (ج) بنووسێت، پێشکەشم کردبوون بە(مامۆستا ڕۆژبەیانی).

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

ئەو گەدا و هەژار و سواڵکەرانەی کە بەلای خەڵکەوە پەڵەیەکی ڕەش و شوورەیین لە کۆمەڵگادا، هەر ئەوانەشن لە ڕاستیدا پادشایانی تەخت نشین و شکۆدار و ڕێزمەندن لە ڕووی (پەی) بەجوانی و ڕاستی (مەعریفەت) بردندا.

زۆرتریشم لەسەر ئەم تاکە لێک داوەتەوە بۆیە بەمەندە کۆتایی پێ دەهێنم.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە سەرچاوەکانی (ط، مک)دا چواردەمین تاک و لە (ج، جم، ف، ق/٣)دا پانزەمین و لە (صا)دا شانزەمین و لە (حم، گل/٨، مع)دا بیستەمین و لە (با/١، ص، گل/٣، ما/١)دا بیست و یەکەمین و لە (شح، عن، گل/٥، مس)دا بیست و دووەمین تاک و لە (سجا، گل/٣، ن، نع، نم/١، ﻫ)دا بیست و سێیەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە لەم بەندی دووەمەیدا.

٢٤- گنج (گەنج): گەنج، گەنجینە، شوێنی شتی بەنرخ تێدا پاراستنی وەک زێڕ، زیو، گەوهەر، خشڵ، پارە، نەختینە (خەزێنە).

آستین: باخەڵ، بەرک، چاکی کەوا و جبە و عەبا و کراس، بەرکۆش و، داوێنی پۆشاک کە بگونجێ شتی زۆری تێ بکرێت و هەڵبگیرێت، یا فەقێیانە، لەوەندی، هەچک، داوێن، مەبەستی لەوەیە کە تیا بووی ئەو گەنجە لەم شتانەدا بێ و، تیا بووی گەنجە لەبەر زۆری لە بەردەستدا بێت بەڕادەیەک لە گەنجینەی تێدا پاراستنەکە سەری کردبێ لەبەر زۆری و نیشانەیە بۆ (هەرە ئەوپەڕ)ی دارایی و سامانداریی‌یەوە.

کیس: کیسە، جزدان، توورەکەی پارە و نەختینە، زێڕ، گەوهەر و زیو تیا پاراستن، پارەدان، جۆرکەی پارە تیا هەڵگرتن.

تهی: وشەیەکی کوردی پەتیی ڕەسەن و زۆر کۆنە کە هەتا ئێستەیش نزیکە لە شێوە کۆنەکەی خۆی ماوە تەنانەت بەر لە دوو هەزار ساڵێک پتر، واتە لە سەرێنی (باو)ی بەکارهێنانی زمانی (پەهلەویتی)ماندا بەشێوەی: (تەهی = Tehi) یا (تەهیک = Tehik) و (توهی = Tuhi) یا (توهیک = Tuhik) بەکارهاتووە واتا = بۆش (خاڵی) کە بەرامبەر یا (دژ)ی (پڕ)ە. یا کیسە، ئامان، کووپەڵەیەک چی شتێکی تیا نەبێت (بەتاڵ) بێت، هەتا ئێرەی ئەم نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە مەبەست لەوەیە کەسێک خەزێنەی پارە و نەختینە و زێڕ و گەوهەر و خشڵ و زیوی ئەوەندە پڕ بێت بەڕادەیەک سەر بکات لە (خەزێنە)کەوە و لەبەر زۆری نەیگرێت، کە ئەو تیا بووە و سەرڕێژ کردووە زۆرەی ناو خەزێنەکە بکرێتە کیسە و چاکی کەوا و داوێنی کراس و جبە و عەبا و ناو فەقێیانەوە و لە هەمان کاتدا ئەو کەسە ساماندارە (کیسە)ی بۆش و بەتاڵ بێ لەبەر بەخشندەیی وەک کەسێکی مانەندی پێغەمبەر کە ئەوی هەیبووە لە ڕێگەی خەڵکدا خەرجی کردووە، کە هەمیشە خوای مەزن بەوی داوە و، ئەویش درێغیی نەکردووە لە خەڵکی و، هەموو خەڵکی نەک هەر عەرەب کە لە ناویاندا ژیاوە، لە ئێمەوە نزیکتر بووە.

هەروەها ئەم واتایەی کە بۆ نیو باڵی یەکەمی سەرەوە لێکم داوەتەوە نیشانەیشە بۆ ئەوانەی کە بەدڵ و بەپاکی و لە ناخی دەروونەوە بەڕاستی بڕوایان بەئاینی ئیسلام هێناوە و پەیڕەویی دەقە پیرۆزەکانی ئەو ئاینەیان کردووە ئەوانەش چاویان لە پێغەمبەرەکەیان کردووە کە هەرچەندێ ساماندارتر بووبن، ئەمجا هەموویان لە ڕێگەی خوادا بەخشیوەتەوە بەسەر (دەستکورتەکاندا) ئەمە لە ڕووی سامانی (دراوی)یەوە هەروەها ئەوانە هەتا زۆرتر شارەزای دەقە پیرۆزە ئیسلامییەکان بووبن ئەمجا ئەو ئاگەدارییانەیان لە مێشک و دەروونی خۆیاندا نەهێشتووەتەوە و بڕوادارانی ئاینی و، کەسانیان لێ ئاگەدار کردووە.

دەبێ ئەوەش ڕابگەیەنم کە لێرەدا (کوردی) دەنگی لە ڕەوشتی بەخشندەیی خۆیشی داوە کە هەرچیی لە دەسکەوتی زەویوزارەکانی دەست کەوتبێ لە ڕێگەی خوادا داماوان و دەستکورتەکان و لێقەوماوانی لێ بەشدار کردووە. دەتوانرێ ئەم لێکدانەوەیە بەڕوویەکی تریشدا ڕابگەیەنرێت و بۆ ئەو دەستدار و سامانداری ولات ئەوانیش داراییەکەیان ئەوەندە بەهەژاراندا بەخشیوە کە وەک هەمیشە خاوەن گەنجینەی تر بوون لەبەر بەخشندەیی هەمیشەش (کیسە پارە) خاڵی بوون، ئەمەش وەک توانجێک وایە لە (دەستدار) و (دەرەبەگ) و (ئاغا) و (بەگ)ە پیسکە و چرووکەکانی گرتبێ وەهایە، کە هەر چاویان لە خۆیان بووە و ڕەشەگەل «رەعیەت»ەکانی خۆیانیان بەسەر نەکردووەتەوە و، بگرە مافیان پێشێل کردوون و چەوساندوویاننەتەوە.

(کوردی) بەڕاگەیاندنی ئەم واتایانە لە لێکدانەوەی ئەم نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا ئاکامی ئەو چاکەکارانەی بەجۆرێکی تر لەم نیو باڵی دووەمەی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا ڕاگەیاندووە، کە فەرموویەتی:

پای: پێی، واتە پێی ئەو چاکەکارانەی کە لە نیو باڵی یەکەمی سەرەوەدا لێکم دایەوە.

بر عرش: بەسەر (عەرش)ەوە و، لەسەر (عەرش) و، واتە ئەو چاکەکارانە ئەوەندە خوا لێیان ڕازییە و، خۆشیانی دەوێ بەڕادەیەک لە خواوە نزیکن، کە هەروەک پێیان (قاچیان) بەسەر (عـــەرش)ەوە بێت وەهـان، کـــە ئەوەندە لـە پێـــشـن بەلای خـــودای مــــەزنـەوە، هەروەک ئەو ساماندارانەی کە خوا هەمیشە خەزێنەی سەرڕێژ کردوون، پێ بەخشیون کە تەنانەت داوێن و چمکی بەرکیشیان هەمیشە پڕە لە تیابووی خەزێنەکەیان، ئەمجا هەر ئەو پایە بەرزانەی کە پێیان گەیوەتە (عەرش) هەر ئەوان لەبەر چاکیی خۆیان و (بەتەنگەوە نەبوونی) خودی خۆیان لە ڕێگەی ئەوەدا کە چاویان لە خەڵکییەوەیە و چاودێرییان ئەکەن هەر ئەوانە:

زیر سر سنگند: (زیر = ژێر) (سەر = سەر) (سنگ = بەرد) واتە سەرینەکەیان بەردە (کوچک، سەنگ، ئاسیاو، تاوێر، تل)ە.

واتە ئەو پێ بەسەر عەرشەوەبووانە کە ئەبێ لەوپەڕی خۆشی لە ناو (نوێنی گەرم و نەرم)دا بن، کەچی سەرین (بالیفک)ی ژێر سەریان بەردی ڕەق و تەقە، چونکە بەتەنگ خۆیانەوە نین و بۆ خەڵک دەژین.

لەم تاکەدا تەنیا ئەم جیاوازییە هەیە کە:

کیس، لە (مک، ما/١، شح، ط، ج)دا نووسراوە: (کیسە) کە ئەمیش دەگونجێ.

**واتای گشتی:**

پێم وایە کە دەست بەدەست و لەگەڵ هەر وشەیەکی ئەم تاکەدا واتایەکانیم بەوردی ڕاگەیاند، بۆیە پێویست بەڕاگەیاندنی جارێکی تری واتایەکەی نابینم.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە سەرچاوەکانی: (ط، مک)دا پانزەمین و لە (ج، جم، ف، ق/٣)دا شانزەمین و لە (صا)دا حەڤدەمین و لە (حم، گل/٨، مع)دا بیست و یەکەمین و لە (با/١، ص، گل/٣، ما/١)دا بیست و دووەمین تاک و لە (شح، عن، مس)دا بیست و سێیەمین تاک و لە (گل/٥، سجا، گل/٦، ن، نع، نم/١، هـ)دا بیست و چوارەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە لەم بەندی دووەمەیدا.

٢٥- چون: وەک، هەروەک، چون، مانەندی، وەکو، بەوێنەی.

خزانە: خەزێنە، شوێنی تیادانان و پاراستنی پارە و گەوهەر و... کە لە پێشترا لێکم داوەتەوە.

نهان: شاردراوە، نخیوراو، نهێنی، پەنهان.

بە ویرانە: لەوێرانەدا، لە کەلاوە کۆندا، لە بن تەلار و کۆشک خانووی کاول بوودا.

کە مەبەستی (کوردی) لەو گەنجینە شاردراوەیە کە لە بن کەلاوە کۆن و خانووی کاول و کۆشک و تەلاری وێرانبوودا بەشاردراوە مابێتەوە، (مەبەست) لەو پیاوچاکانەیە کە بەڕاستی پاک و خواناس و ئایندارن و مەبەستیان خۆ دەرخستن نییە، بۆیە ئەوانە هەمیشە وەک ئەو گەنجە پڕ پارە و زێڕ و گەوهەر و زیوە وەهان، کە لە ژێر کەلاوە کۆن و خانووە کاول و تەلارە وێرانبووەدا شاردراوەن، واتە ئەگەر ئەو باوەڕ ڕاستانە بەسەرزاری وەک کەلاوە و، چی کۆشکی رووخاو دەبینرێن، بەڵام لە دەروونیاندا پڕن لە ئاگاداری لە دەقە پیرۆزەکانی قورئان و

(حەدیث) و ڕوونکراوەکانی پێغەمبەر و بەدروستی لێکدراوە نابینییەکان وەهان کە دەروونیان سیخناخە لە ئاگەدارییە گەوهەرین و گەنجینە پڕ بەهاکان. ئەو گەورە پیاوانە مەبەستیان پەیڕەویکردنی دەقە ئاینییەکانە نەک بە سەرزاری خۆپیشاندەر و هەڵپەرست بن.
ئەمە تا ئێرە واتای نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە بوو، وە واتای نیو باڵی دووەمەکەیشی بەم جۆرەیە کە ئەو کەسانە:
چون گـهر (چون گـوهەر) وەک ئەو گـەوهەرە وەهان کـەوا بەردی گـران بـەهایە و نەهـەنگ لە دەریادا قووتی دابێ.
درنهنگ: لە ناو نەهەنگەکەدا، یـا لە سکی نەهەنگدا، ئەو نەهەنگەی کە گەوهەرە بەنرخەکەی لە زگیدایە و بەوەوە
باهنگند: قورسن، بەهێزن. (هەنگ: توانا، بـەهێز، قـورس، بەهاوار، مـەبەست لە گەوهـەرەکـەیە لە زگی نەهەنگدا وەک (یوونس) پێغەمبەر (کوردی) مەبەستی لەو گەوهەرە گرانبەها و، بەهێز و توانایە نیشانەیە بۆ داستانەکەی (یوونس پێغەمبەر «د. خ»)یە کە لە ناو کەشتییەکەدا ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون، چونکە هاوبیری ئەو پێغەمبەرە نەبوون و پەیڕەوی فەرمایشتەکانی ئەویان نەدەکرد و خۆشیان نەدەویست و فڕێیان دایە ناو دەریاکەوە، بەڵام بەفرمانی خوای مەزن نەهەنگێک ئاراستەی بوو، ئەو پێغەمبەرەی لە خنکاندن بەئاوی دەریایەکە ڕزگار کرد و ئەو پێغەمبەرەی گورج (قووت دا) و زوو گەیاندییە قەراخ ئاوی دەریایەکە و فڕێی دایەوە سەر زەوی و لە مردن قوتاری کرد.
لێرەدا (کوردی) ئەو پێغەمبەرەی بەو گەوهەرە گرانبەهایەکەی ناو زگی نەهەنگەکە چواندووە کە چۆن خـەزێنە (گـەنج)ەکـە لە بن دار بەڕووی ڕووخـاوی خـانووە کـاولەکـاندا شـاردراوەیە، ئاوەهـایش ئەو پێـغـەمـبـەرە بەو گـرانبـەهـایی و شکۆدارییـەوە لـە سکی (نـەهـەنگ)ەکـەدا شاردراوەتەوە.
ئەمەش نیشانەیە بۆ ئەوەی کە خواپەرست و بەفەرمایشی خوا پەیڕەویکاران، لە ئەنجامدا هەر ڕسگار بوون لە هەر مەترسییەک بەشیانە و پاداشی ئەوان لە لای خوای مەزنەوەیە.
ئەم تاکە هـەڵبـەسـتـە لە (نع)دا نـیـیـە و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ف، ص، صـا، جم، نم/١، با/١، سـجـا)دا دووەمین تاکـە و لە سـەرچاوەکـانی (با/١، حم، مس، عن، ن، مک، ط، شح، مع، ما/١، ج، ھ)دا سێیەمین تاکی ئەم بەندی دووەمینەیە.
نیـو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سـەرەوە لە (ن، صـا، مک، ط، جم، نم/١، با/١، سجا، حم، ق/٣، ج)دا بەم جۆرەی دوایی نووسراوە:
(همـچـو گـوهر نهـفـتـە در سنگند) واتە هـەروەک گـەوهـەر شـاردراوە (ئاخنراوی ناو بەردن) بەچاوگێڕان یـا بیر لە پەیابوون شـوێن لێ دەرکـەوتنی گـەوهـەر، دەزانرێ کـە (گەوهەر) لە ناو کـرۆکی بـەرددا پەیا نابێ، کـەواتـە ئەم دەقـە لـە لایەن فـارسـی نەزانێکەوە بـەو جـۆرەی بۆ خوێندراوەتەوە و نووسیویە و شارەزای ئەوە نەبووە کـەوا (گەوهـەر لە ناو بەردا شاردراوە نییە

و نەئاخنراوەتە ناو كرۆكی بەرد (سەنگ)ەوە و هـەڵەیە. كە ئەم هەڵەیە لە (١٠) سـەرچاوەی لای خۆم و لە سەرچاوەكەی (ج)یش دایە.
لەم نیو باڵییە هەڵەیەدا لە جێگە (نهفتە) نووسـراوە (نوهونت) كە ئەمیش هەڵەترە جگە لەوەی لە پاشـبەندی (سنگند)دا لە تاكی پێشـوودا هاتووە بۆیە ناگـونجێ جـارێكی تر لەم نیـو باڵییەشدا دووبارە ببێتەوە، كەواتە پاشبەندی ئەم تاكە جێگیركراوەی سەرەوە كە بە(باهنگند) ڕاست و بەجێترە بۆ ئەم تاكە هەڵبەستە و بەپێی دەستووری وێژەی كۆن دەگونجێ.
**واتای ئەم تاكە:**
لەگەڵ ڕاگەیاندن و لێک دانەوەی یەک بەیەكی وشـەكانی ئەم تاكە هەڵبەستەی سەرەوەم واتای گشتی و مەبەستی تاكە هەڵبەستە لێک داوەتەوە. بۆیە جارێكی تر واتا و مەبەستەكە دووبارە ناكەمەوە.
لەم سێ تاكەی پێشـوودا واتە تاكی (٢٣ و ٢٤ و ٢٥) لەو (گەدا) واتە (سـواڵكەر)انەی كـە لە پەیكاری سواڵكردنی هەرچی زۆرتر لە ڕاگەیاندنەكانی پێغەمبەرن و، ئەوەندە شكۆمەند و پایە بەرز و ڕێزدارن، ئاخـۆ ئەوێ كە سـواڵەكەی لێ دەكرێ ئەبێ لە كام پایەی باڵادا بێ و ئەمەش مەبەستی (كوردی)یە لەم سێ تاكەدا كە (پێغەمبەر)ە.
ئەم تاكە هەڵبەستە بەپێی زنجیرەی تاكەكانی ئەم حەوت بەندە، لە سەرچاوەكانی: (نع)دا نییە و لە (ط، مک)دا شـانزەمین و لە (ج، جم، ف، ق/٣)دا حـەڤدەمین تاک و لە (صـا)دا هەژدەمین تاک و لە (جم، گل/٥، گل/٨، مع)دا بیست و دووەمین و لە (با/١، ص، گل/٣، ما/١)دا بیست و سێیـەمین و لە (شح، عن، گل/٥، مس)دا بیست و چوارەمین و لە (سـجا، گل/٦، ن، نم/١، ه)دا بیست و پێنجەمین تاكە لەم بەندی دووەمەدا.
٢٦- خلوت: بەتەنیـایی، بەجیـاوازی، گـۆشـەیی، گۆشـەنوشـینی، گۆشـەگیـری، دەركـەناری، لە قەراغەوە، مەبەستی لـە چوونەكەی (محـەمەد – پێغەمبەری ئیسلامـە – د. خ) بۆ (میعراج) كە بەتەنهایی و گۆشـە و كەنارەگیری لـەودیوی (عەرش) واتە بارەگای پیرۆزی خـوای مەزنەوە كـە (شـەكسپیر)ی كورد (مـەولەویی تاوەگۆزی) لە بارەیەوە بەجوانترین و چڕ و پڕترین شێوە دەری بڕیوە و، فەرموویەتی:

(چوو و، دیتی و، گوتی و، بیستی و گەڕیاوە،
هێشتا (حەلقەی دەر) هەر مەلەریاوە)

(كـوردی)یشـمـان خـۆی ئەو گۆشـەگیـرییـەی پێـغـەمبـەری خـۆشـەویسـتی دیاری كـردووە كـە لە (كوێ)دا بووە؟
پشت كاخ را: ئەو شوێنەی دەسـتنیشـان كردووە كـە پێغەمبـەر (خەڵوەت)ەكەی تیا كـردووە كە ئەویش (پشت)، (لە پشـتی)، (كاخ را) كاخـەكەوەی دەسـتنیشـان كـردووە، (پشـتی كاخ)ەكەش مەبەسـت لەودیوی كۆشک (كاخ) واتـە (عەرش)ی خوای مـەزنەوە پێغەمبـەر گیرسـاوەتەوە و لەو كەنارەگیرییـەیدا ئامـانج لـە (چوونە مـیـعراجـەكـەی) یا (بران بۆ مـیـعراجـەكەی) تیـا بەجێ

گەیاندووە کە ئەودیو بارەگا (عەرشی خوای گەورەوە بووە) کە شاعیرمان (کوردی) بەڵگەی ئەو گۆشەگیری کردنەی پێغەمبەری لە پشت (کاخ = کۆشک) واتە (عەرش)ەوە بەگەواهیدەر، واتە بەڵگە ناوبراوەکە و (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا بەوشەی (شاهید) ڕای گەیاندووە.

شاهد: گەواهیدەری (خەڵوە)یەکەی لەودیوی واتە پشتی (کاخ = عەرش) دەستنیشان کردووە و، لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەیشیدا، فەرموویەتی:

کان دران: (کە ئەو) یا (ئەو لەو) یا (کە ئەو لە ناو ئەو):

مجمع: شوێن تیا گردبوونەوەیەدا کە (سەدرەتولمونتەها) بووە کە بارەگا (کورسی و عەرشی) خوای تێدا بووە و تیایە، ئا لەوێدا لەو کۆڕی پێکگەیشتنەدا

هماهنگند: هاومەبەست و (خوا) هەرچی ویستووە و فرمانی کردنی بەسەر پێغەمبەردا داوە. لە خەڵوەتەکەدا پێغەمبەریش ڕێکاورێک لەسەر هەمان بیروڕا و خواست و بەجێگەیاندنی فرمانەکە بووە، واتا هەردوو لایان (خوا) و (پێغەمبەر) یەکدەنگ و یەک بیروڕا و هزر بوون و هەن، بەبەڵگەی ئەوەدا کە پێغەمبەر لە فرمانی خوا (کە ناوەڕۆکی قورئانە) دەرنەچووە و ئەوەی بەخەڵک ڕاگەیاندووە و هەرچی وەک فەرمایشت (حەدیث)ەکانی خۆی و ڕاگەیاندنەکانی بەدەمی و ڕوونکردنەوە، یا بەکردەوە ڕای گەیاندوون، هەموو لە سنوور و چوارچێوەی واتا و مەبەستی ئایەتەکانی قورئاندا بوون کە ئەوەش بەتەواوەتی (هەم ئاهەنگی) بووە وەک (کوردی)یش لەو (خەڵوەتە) واتە لەو (میعراجە)دا و لە کۆڕ و کۆبوونەوە و بەیەکگەیشتنەی (مەجمەع)ەدا، بەهەم ئاهەنگیی، ناونووس کردووە.

بەم لێکدانەوەیانەی تا ئێرەیە، واتای گشتی و مەبەستی تاکە هەڵبەستەکەیشم بەوردی ڕوون کردەوە، کە دڵنیام تا ئێستە لە چاپەمەنیی کوردیماندا ئەمە یەکەمین جارە ئاوا ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە و واتا و مەبەستەکەی ڕابگەیەنرێت. هەر ئەو (هەم ئاهەنگی)یەش لە کۆڕی زیکر و لە چلەی خەڵوەکێشی و خۆ لە کەمەنددان و لە بەند و باوی ڕیازەت و تەهلیلەی صۆفی و مرید و دەروێشاندا بەتەواوی ڕەنگ دەداتەوە کە بەرامبەر بەخوای مەزن دەیکەن، هەروەک چۆن هەم ئاهەنگییەکەی کاتی میعراجیش کە بەرپا بووە، ئەمانیش ئاوەها. کە لەم بەند و باوی چاکەکانی صۆفێتی و دەروێشی و مریدایەتی و خواپەرستیدا هاومەبەستی و وەک پێغەمبەر (لە یەک تەل دەدەرێن) و یەک ڕێگەن و (کوردی)یش لە ڕووی ئایندارییەوە لە پایەی (مەنصوور) و (غەزالی) کەمتر نەبووە.

**ئەمیش جیاوازییەکانە:**

کاخ را لە (نم/١، ن، با/١، گل/٥، گل/٨، ج)دا نووسراوە: (کاخ شاهیدی ماست) واتە (کۆشکەکە گەواهیدەرە بۆ ئێمە) – ئەمیش وەک دیارە – هەڵبەستەکە لەنگ دەکات لە (کێش)دا.

کاندەران، لە (عن، گل/٣، ما/١)دا نووسراوە (کە آندران) واتەکی ئان دەران. ئەمیش دیسانەوە جۆرە قورسییەکی لە (کێش)دا پێوە دیارە.

کاندەران، لە (گل/٥، گل/٦، ص، صا، شح)دا نووسراوە: (ئاندەران) کە ئەمیش ناگونجێ.
کاندەران، لە (مع، ن، گل/٨، حم، نم/١)دا نووسراوە: واندەران – هەروەها ئەمیش دەگونجێ.
هماهنگند، لە (عن نوسخە)دا نووسراوە (یەک ئاهەنگەند) کە ئەمیش دەگونجێ.
**هەڵسەنگاندن:**
ئەم تاکە هەڵبەستە بەڵگەی بەهێزی ئاینداری و خواناسیی ڕاست و پاک و قووڵی ئاگەداربوونی (کوردی) دەگەیەنێ لە ئاینی ئیسلام. ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی زنجیرەی تاکەکانی ئەم حەوت بەندە لە سەرچاوەکانی (ط، ف، مک)دا نییە و لە (ج، جم، ق/٣)دا هەژدەهەمین تاک و لە (صا)دا نۆزدەمین و لە (حم، گل/٨، مع، نع)دا بیست و سێیەمین تاک و لە (با/١، ص، گل/٣، ما/١)دا بیست و چوارەمین تاک و لە (شح، عن، گل/٥، مس)دا بیست و پێنجەمین و لە (سجا، گل/٦، ن، نم/١، ھ)دا بیست و شەشەمین تاکی ئەم (حەوت بەند)ەیە لەم (بەندی دووەم)ەدا.
وەک دەردەکەوێ ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە کە ژمارەکەی گەیوەتە (٢٦) و کەچی تازە نوسخە ناتەواوەکەی (ج) هەژدەهەمین تاکە، بەواتە: تاکو ئێرە (٨) تاکە هەڵبەستی ناتەواوە کەچی ئەم هەموو داکۆکییە لەو نوسخە ناتەواوەی خۆی دەکات و هێشتە لە بەندی دووەمداین و دەبێ لە کۆتاییی تاکەکانی ئەم (حەوت بەند)ە نوسخەکەی (ج) چەندی ناتەواو بێت...
٢٧– گرچە: ئەگەرچی، هەرچەند، لەگەڵ ئەوەشدا، بەوەیشەوە.
ظاهر: ئاشکرا،(بەڕواڵەتی مەبەستە)، دیاری، نومایان.
بەکلبەاند: لە کولبەدان. کولبە: کۆختە، کۆڵیت، خانووی زۆر بچووک وەک خانووی (گوندانی)ی هەژار، مەبەستی لە شوێنی تیا ژیانی ئەو هەژار و گەدایانەیە، کە لە تاکی یەکەمی ئەم (بەندی دووەم)ەدا ناویان براوە، کە ئەوانە شوێنی تیا نیشتەجێبوونی (کۆشک و تەلار) ئاساییان مەبەست نییە و، هەژارانە دەژین و بەدڵ و دەروون لە ناخەوە هەمیشە لە پشت ئەو کۆشک (عەرش)ەوە ئەژین کە لە تاکی پێشوودا هاتووە و هەمیشە هۆش و هزریان لەوێیە، واتە هەروەک لە (گەورە)ترین و (چاکتر)ین و بەناوترین کۆشک و تەلاردا بژین، خۆیان وەها دەبینن، ئەگەرچی لە ڕواڵەت (ظاهر)یدا لە بێ نەوایی و دڵ بەجیهانییەوە نەبوونیان، شوێنی ڕاستی تیا ژیانیان (کولبە)یە.
ساکن: نیشتەجێ، تیا بوو، تیادا دانیشتوو. کە مەبەستی لەوەیە ئەو خواناس و خواپەرست و پەیڕەویکارانە دۆستی پێغەمبەری ئیسلام وە بەڕواڵەت لە کۆختە (کولبە)دا ژیاون (ساکن بوون) بەڵام:
باطنی را: لە دەروونەوە، لە ناوەوە، لە نادیاریدا، بەنادیاری، بەنهێنی.
مەبەستی (کوردی) لەم (باطینی) ناو بردنەی ئەو (گەدایان) و هەژارانە بووە کە ئەگەرچی بەسەرزاری ئەوەندە بێ نەوا بوون بەتەنگ خۆشیی ژیان و نیشتەجێبوون لە کۆشک و تەلارەوە نەبوون و زۆر سادە و صۆفیانە ژیاون، کە بەپێی ئەم ڕاگەیاندنەی (کوردی) هەر ئەوانە لە

ڕووی (باطنی)یەوە واتا لە دڵ و دەروون و ناخــیــاندا ئەوە بـەپاکی خــواناس و ئاینـدا بوون هەمیشـە لـە ناخـەوە شـایان بوون بەوەی کـە بـەهۆی ئەو ڕێگە ڕاسـتـەوە کـە گرتـوویانە خۆیان وەها ڕەچاو کردووە کە لەوپـەڕی کامـەرانی و لە ناو نایابترین کۆشک و تەلاردا دەژین، چونکە بڕوا و هیـوایان بـەهێز بووە کـە پاداش و ئاکـامی ئەو ڕێبـازەیان ڕازیبـوونی خـوایە لێـیـان و گـەیشـتنـە بە(بەهـەشـتی بەرین) وەک لەم نیـو باڵی دووەمی ئـەم تاکـە هـەڵبـەسـتـەی سـەرەوەدا (کوردی) پێی ڕاگەیاندووین.

بەجان: بەگیان، لە قووڵایی دەروونەوە، لە ناخەوە، واتە لە ناخەوە وەک:

شباهنگند وەک (شەباهەنگ) وەهان.

شـبـاهـنگ: کـەڵەشـێـری بەربـەیان خـوێن، ئەو مـەل و باڵندانەی لە بـەرەبەیاندا دەخـوێنن، وەک بولبول کە لە بەرەبەیاندا ئەخوێنێ.

شباهنگ: ئەسـتـێرەی بەرەبەیان (نجـمـه الصـبـاح) کە بەکوردی ئـەسـتـێرەی (کاروانکوژە) و بەعـەرەبی (شـەعـرا) (شـەعـرای بەیانی)یشـی پێ دەگوترێ، ئەم ئـەسـتـێرەیە سـەر بەکۆمـەڵە ئەسـتـێرەیەکە، یا یەکێکە لەو کۆمەڵە ئـەسـتـێرەیەی بە(گەورەترین سـەگ = الکلب الاکبر) ناو براوە.

ئەمجـا با بگەڕێمـەوە سـەر هـەر یەکێ لەو واتایانەی (شـبـاهـنگ) وە پەیوەندیی ئەو واتایانە بە ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستەوە:

١- شـبـاهـنگ: کـەڵەشـێـری بەرەبەیان خـوێن، نیـشـانەیە بۆ (شـەو بێـداری) واتە بەشـەو نەنووسـتنی ئەو هەژار و گەدا و خواپـەرستـانەی کە بەپێی نەریتی ئاینی ئیسـلام کە شـەو نەنـووسـتن و (زیکر و ناوی خـوا بـردن) و لە خـوا پاڕانەوە و؛ خـەریکبـوون بـەسـوننـەتی (پێغەمبەرە «د. خ»)وە.

هـەروەها لە ڕێبـازە صـۆفیـگەرییـەکانی وەک (شـازلی) و (ڕەفـاعـی) و (مـەولەوی) و (قـادری) و (نەقشبـەندی) و... دا کە هـەر یەکێ لەم (طەریقەتانە) بەرنامەگەلی تایبەتی هەیە، بۆ هـەر بۆنەی ئەو زیکر و تەهلیلە و چلەکێشی و خەڵوەیانە لەو بۆنە تایبەتانەدا.

کە مـەبەسـتـێکی (کوردی) لـەو جـۆرە (زیکر)انە بووە لەو شـەونوێژ و شـەو بێدارییـانەدا وەک خـوێندنـی کـەڵەشـێر لە بەرەبـەیاندا یا خـوێندنـی هـەر پەلەوەرێکی تری بەرەبـەیانی کـە وەک ئەو گەدایانە بە(ظاهر) و (باطن) پێوە دیارن. لە ڕێبازە صـۆفیـگەرییـەکاندا بە(ناڵەی صـوبحـدەم) ناو ئەبرێن و مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە هەڵبەستیدا لەم ناڵەیە دواوە.

٢-شباهنگ: ئەستێرەی بەرەبەیان (کاروانکوژە)ی کە لێی دواوم کە هەرە ڕووناکترین و ڕەنگ زیویترینی دایە بەجریوە جریوی ڕووناک و سپییەکەی پتر لە ئەستێرەکانی دیکە دەنوێنێ.

ئەم ئەسـتـێرەیە لە زانیـاریی گەردووننـاسـی (ئەسـتـێرەشـونـاسـیی ئاینی ئیسـلامـدا، شـوێنێکی دیاری پیرۆزی هەیە و بەند و باوی سەیر سەیر و بیروبڕوای جۆراوجۆری بەرامبەر هەیە وەک ئەوەی کـە ئەگەر لەگەڵ کاتی بانگدانی ئێوارەدا ئەو ئەستێرەیە هەڵبێت ئەوە نیشانەی خێر و

خۆشی و تەندروستی و کامەرانی و بەپیتیی کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییە.
(کوردی) و، جاری تریش لەم پەڕاوییەدا و بەبۆنەی ترەوە نیشانم بۆ ئەوە کردووە کە زانایەکی گەورە و شارەزای زانستی گەردووناسی (ئەستێرەشوناسی) بووە و هەر ئەو زانایەتییەی بووە کە لە زانایەکی مەزنی گەردووناسمان (ڕەنجووری) نزیک کردووەتەوە و نامەی بەهەڵبەستیان لە نێواندا هەبووە و لەم پەڕاوییەدایە.
ئەم نیشانە کردن بۆ ئەو ئەستێرە زۆر ڕووناک و جریوە جریوکارەی (کوردی) چواندنی ئەو (گەدا و هەژار)ە ناوبراوانەیە بەڕووناکی بەخشییەی ئەستێرەکە، پڕشنگدەری ئاینی ئیسلام، ڕێزمەندی پەیڕەویکارانی ئاینەکەن و بەو بەندیوارییە توند و تۆڵەیانەوە بەخوا و بەپێغەمبەر و بەئاینەکەوە شکۆمەندن و شوێنی دیاری خۆیانیان لە دڵی ئیسلامە ڕاستەکاندا کردووەتەوە.
**جیاوازییەکانی ئەم تاکە هەڵبەستە:**
گرچە ظاهر، لە (مع)دا نووسراوە: ظاهیرا گر = ظاهرەن گەر، یا (ظاهیرا گەر).
باطنی را، لە (ن، مع)دا نووسراوە: رهنماو = ڕەهنوماوو، کە ئەم ڕاگەیانەیش واتا نادات و ئەشێ هەڵەی نووسینەوە بێت.
وەک لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا ڕامگەیاند، ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە، وەک تەواوکەری واتای تاکە هەڵبەستەکەی پێشوو، وەهایە.
کە لەوێدا لە کۆشک (عەرش) و پشت کۆشک = ئەودیوی دەرەوەی کۆشکەکەوە دەست پێکراوە و لێرەی ئەم تاکەی سەرەوەشدا، شوێنی ئەو گەدا و هەژارانە بەکولبە ناو براوە کە بە گیان (جان) و دڵ و لە ناخەوە پەیوەندن لەگەڵ هاوئاهەنگییەکەی تاکی پێشوودا بەڕادەیەک بانگی زیکر و شەونوێژ و شەو بێدارییان وەک خوێندنی بەرەبەیانی باڵندەکان ئەبیسترێت لەو شوێن کۆبوونەوەیاندا کە (سەدرەتولموونتەها) واتە هەرە ئەوپەڕ و لووتکەی هەرە بەرزی ئاسمان و بارەگای خوایە ئەو گەدایانە وەک ئەستێرەی گەش و ڕووناک بەجریوەکەی (کاروانکوژە) لە (پڕشنگدان) دان.
**واتای گشتی:**
ئەو گەدایانە لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕواڵەتدا وەک کولبەنوشین دەبینرێن ئەوەندە خۆ دەرنەخەرن لە خواپەرستیدا و پێوەی نانازن هەر ئەو گەدا و خواپەرستانە لە قووڵاییی دەروونیاندا ئەستێرە پەرتەوینەکەی کاروانکوژە و دەنگی زیکرکردنیان .
ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە، بەپێی زنجیرەی تاکەکانی ئەم حەوت بەندە لە سەرچاوەکانی (با/١، ج، جم، حم، سجا، شح، ص، صا، ط، ف، ق/٣، گل/٣، گل/٥، گل/٦، ما/١، مع، مک، نع، نم/١)دا نییە و لە سەرچاوەکانی: (گل/٨)دا بیست و سێیەمین تاک و لە (عن، مس)دا بیست و شەشەمین و لە (ن، ه)دا بیست و حەوتەمین تاکە.
٢٨- همە: هەموو، گشت، سەرپاک، بەجارێ، حەمک، کە مەبەست لەو (هەموو)انە، ئەو گەدا و سواڵکەرانەی سەر بەبیروڕا و ڕاگەیاندنی پێغەمبەرەکەیانن.

پیل: فیل، زەبەللاحترین گیانداری سەر زەوی ئەم سەردەمەمانە و بەگیانداریکی زۆر بەهێز ناسراوە کە ماڵی (کەوی) کرا، گەلێ کاری گران و سەختی پێ دەکرێ کە لە دەست چەندین زەلامی بەهێز نەیەت.

افگنان (ئەفگەنان): ڕمێنەران، بۆڕدەران، بەزەویدادەران، مەبەست لە فیل شکێنەکانە کە ئەوەندە بەهێزن فیل دەبەزێنن.

لێرەدا مەبەست لە زۆرانباز و پاڵەوانێتی نییە، بەشکو مەبەست لەوەیە کە ئەو گەدا و هەژارانە لە پەیڕەویکردنی پێغەمبەرەکەیاندا ئەوەندە بەهێز و توانا و سەرکەوتوون کە (کوردی) چواندوونی بەفیل ڕمێن، مەبەستی ژێرەوەتری (کوردی) ئەوەیە کە پەیڕەویکارەکانی پێغەمبەر لەو پلەی هێز و توانایەدان کە ئاخۆ خودی پێغەمبەرەکەیان دەبێ لە چ تین و کوڕی (مەعنەوی) و لێهاتوویی دابێت – ئەمەش جۆرە هونەرمەندییەکی وێژەیی کە لەسەر زاریدا لەو گەدا و هەژارانە دواوە و لە ڕاستیشدا مەبەستی لە توانای پێغەمبەرە.

(کوردی) هەر لە هەڵنانی (گەدا)یەکاندایە کە مەبەستی لە هەڵنانی پێغەمبەر «د. خ» و فەرموویەتی:

آهووش = آهو = ئاسک، مامز، ئاهوو، جەیران) وە (وش = شێوە، وێنە، دیمەن، چەشن، جۆر، ڕەنگ) لە جوانی و دڵگیریدا، کە ئاسک یەکێکە لە گیاندارە کاوێژکارەکانی لە نەژادی مەڕ و بزن و گا و مانگا و گامێش و مەڕە کێوی و بزنە کێوی و ئەمانە کە بەجوانی و قەشەنگی بەناوبانگە و لە جۆری (دوو سم)ەکانە.

(کوردی) کە ئەم ڕواڵەتە جوانییانەی داونەتە پاڵ ئەو گەدا و هەژارانە کە مەبەستی لەوەیە کە ئەوەندە دڵگیر و پەسندن بەلای خوا و پێغەمبەر و خەڵکییەوە بەتایبەتی بەلای بڕوا بەهێزەکانی ڕێبازی ئیسلامییەوە ئەویش بەهۆی پەیڕەویکردنی ئەو ڕێبازەیانەوە، ئەوەندە جوان و بەگەنکراوی کردوون، کە هەرچی ناشیرینی و خراپی و نام و نەنگی بێ تیایاندا نییە لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە و زۆر دڵسۆزن بەرامبەر بەمرۆڤ (هەموو مرۆڤ) کە ئەو هەڵوێستەیان وەک جوانیی ئاسک (ئاهوو)ە. لە کاتێکا ئەمانە لە پەیڕەوانی ڕێبازەکەی پێغەمبەرن و لێرەدا (کوردی) بەخشکەیی ئەو (پێغەمبەرە «د. خ»)یەی هەڵناوە. (کوردی) هەر بەمەندەوە لەم بوارەدا نەوەستاوە بەشکو فەرموویەتی:

ملک اخلاق: فریشتە ڕەوشت لە فریشتە (مەلائیکە = مەلەک) بەڕەوشت و خوو (ئەخلاق)ی پەسند و بەرز ناسراون و (کوردی) ئەو گەدایانەی لە بارەی ڕەوشت و خووی پەسندەوە چواندووە بە(مەلەک = مەلائیکە = فریشتە).

(کوردی) فەرموویەتی ئەو گەدا و پەیڕەویکارانەی تۆ ئەی پێغەمبەر بەهەموو هێز و تین و دڵگیری و ڕەوشتە بەرزەیانەوە هەر لە ڕەنگ و دیمەن و ڕواڵەتدا مرۆڤن، نەک فریشتە. ئەمیش جۆرە هەڵنانێکی زۆر گەورەی ئەو گەدایانە و بیرکردنەوە لە هێز و تین و دڵگیریی ڕەوشت و خودی پێغەمبەری، داوەتە دەست بیستەر و بێژەر و خوێنەرەوەی ئەم تاکە هەڵبەستە.

**جیاوازییەکان:**

افگنـان و، لە سـەرچاوەکـانی: (نم/١، با/١، عن، مک، ط، ج، جم)دا نووسـراوە،(افگنـان) کـە پیتی (و = واو)ەکەیان تیا نووسراوە کە هەڵەی نووسینەوەیە.

پیل، لە (گل/٥، مـا/١)دا نووسـراوە (پل) کـە ئەمـەش ڕاست نیـیە، چونکـە (پل) واتای دەست دەدا و (پیل)یش لە کوردیدا (شان و قۆڵ)ە بەڵام (کوردی) لە هەڵبەستەکەدا مەبەستی لە (پیل) = (فیل)ە وەک لە پێشەوە لێکم داوەتەوە. کە مەبەست لە (فیل)ە، نەک (پل = دەست) و من پێم وایە هەڵەی نووسینەوە بێت و دەشێ (کوردی) لەو جەنگەی عەرەبەکان دوابێ کە لە هێرشی ئیسلامییاندا بۆ سەر خاکی (ئارییەکان) (فیل)ی (ئاریانییەکان)یان بە(شیر) شپرزە کردووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی زنجیرەی یەک لە دوای یەکی تاکە هەڵبەستەکانی ئەم (حەوت بەند)ە فـارسییـەی (کـوردی)، لە سـەرچاوەکانی (ف)دا نییـە و لە (ط، مک)دا حـەڤدەمین تاک و لە (ج، جم، ق/٣)دا نۆزدەمین تـاک و لە (ط)دا بیـستـەمین و لە (حم، گل/٨، جم، مع، نع)دا بیـست و چوارەمـین و لە (با/١، ص، گل/٣، مـا/١)دا بیـست و پێنجـەمـین و لە (شح، گل/٥، مس)دا بیست و شـەشـەمین تاک و لە (سجـا، عن، گل/٦، نم/١)دا بیست و حـەوتەمین و لە (ن، ﻫ)دا بیست و هەشتەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە.

٢٩- گاە: جارێ، جارێک، دەمێ، کاتێ، گاڤێ، گاڤەک.

در گنج: لە گەنجینەی، مەبەست لەوەیە لە ناو خێر و بێری.

دلبری: خۆش ویستراوی، کە مەبەست لە (شادمانی، شکۆمەندی)یە.

مبسوط: دڵکراوە، دڵواز.

گە: کاتێکی تریش، دەمێکی تر.

زرنج: لە ئەرکی، چەوساوەیی.

زمان: ڕۆژگار.

سبک سنگند: بێ نرخن، کەم ڕێزن، بێ نازن.

**جیاوازییەکان:**

گـەنج، لە سـەرچاوەکـانی (نم/١، عن، گل/٣، گل/٥، گل/٦، گل/٨، سـجـا، ط)دا نووسـراوە (کنج) واتە (کونج).

لە نامیلکەکەی (ج)دا نووسراوە:

«لای (کاکە حـەمـەی مـەلا کـەریم): (ط)دا (گـەنج)، (کونج)ە، واتا (گـۆشـە) کـە لەگـەڵ دڵبـەری و کەیفخۆشیدا ڕێک ناکەوێ».

بەڵام ئەم نووسـینی (کـونج)ە لەباتی (کەنج) وەنەبـێ هـەر لە نوسخـەکـەی (مامـۆستـا مـحەمـەدی مـەلا کـەریم) واتە (ط)دا نـیـیـە بەشکو وەک دیـاریم کـردووە لە (٩) نوسـخـە واتـە سـەرچاوەی تریشـدا هـەر بە(کـونج) نـووسـراوە، وەک لە سـەرەوە هـەر (١٠) نوسـخـەکـەم دیاری کـردوون بەجیاوازییەکانیانەوە.

گە، لە (نم/١)دا نووسراوە (کە) پێم وایە هەڵەی نووسینەکە (سەرەگاف)ەکەی نەنووسراوە و لە ڕێنووسی فارسیدا ئەوە باوە.
رنج زمــان ســبک سنگند، لە (ن، نم/١، با/١، مس، حم، ق/٣)دا نووســراوە: (طول زمــانە درننگەند = طوولی زەمــانە دەرنەنگەند)، پێم وایە لە ئاکــامی چاک نەخــوێندنەکــەی دەقی تاکەکەی سەرەوەدا بەناچاکی نووسرابێ و ئاوەها شێوا بێ.
رنج زمــان ســبک سنگند، لە (گل/٣، گل/٥، مک، ط، ج، جم)دا نووســراوە(طول زمــانە دل تنگند)- پێم وایە ئەمیش وەک ئەوی سەرووی بەسەر هاتبێ.
**واتای گشتیی ئەم تاکە هەڵبەستە:**
ئەم تاکەش هەر درێژە پێدانی باسی ئەو (گەدایان)ەیە کە لێرەدا (کوردی) بەم جۆرەی ناو بردوون:
ئەو گەدایانە جار جار وەک لە گەنجینەی پڕ خێر و بێری خۆش ویستراوی خۆیاندا خۆیان بەخەملاوی و دڵخۆش دەبینن کە بەکردەوە و گوتار و تەنانەت بەبیرکردنەوەش خوای مەزن و پێغەمبەری خۆشەویستیان لە خۆیان ڕازی کردووە، چونکە پەیڕەویی فەرمایشەکانی ئەوانیان کردووە.
بەڵام وەک لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەدا هاتووە هەر ئەو گەدایانە جار جاری تریش خۆیان لە ئازار و ئەرک و ڕەنجی ناخۆشی تێکڕای ژیانیاندا و لە ناهەمواریی ڕۆژگار (زەمان)دا، خۆیان لە جیهاندا بەبێ ناز و کەم ڕێز و ڕیسوا دەبینن، بەدەست بێ بڕوایان و گومڕایانەوە.
ئەم تاکــە هەڵبــەســتــە لە (صــا، ف)دا نیــیــە و لە (مک)دا هەژدەمین و لە (ج، جم، ق/٣)دا بیستەمین و لە (ط)دا هەژدەمین و لە (گل/٨، مع، نع)دا بیست و پێنجەمین و لە (با/١، ص، گل/٣، ما/١)دا بیست و شەشەمین تاک و لە (حم، شح، گل/٥، مس)دا بیست و حەوتەمین و لە (سجا، عن، گل/٦، نم/١)دا بیست و هەشتەمین و لە (ن، ه)دا بیست و نۆیەمین تاکە.
٣٠- طائر وهم: مەل، باڵندە، پەلەوەر.
وهم ئەوی هەر لە هزر و بیر و هۆشدا هەیە و لە بوونێتیدا نییە.
طائر وهم: مــەبەست لەو باڵندە ئەفسانەیەیە کـە هەر تەنیا ناوی هەیە و خۆی لە بوونێتیدا نەبووە و نییە، کە بەزمانی (کوردی) بە(سیمرغ) ناوبراوە و ناو دەبرێت و بەعەرەبی (عەنقا) و بەفارسی (هوما)یە و لە زمانە ئەورووپاییەکاندا (مەلی ئەفسانەیی)یە.
(سیمرغ) باڵندەیەکی ئەفسانەییە لە فۆلکلۆری گەلاندا، جێگەی گەورە و فراوان و بەڕێز و شکۆمەندی و بگرە پیرۆزیشە و، سەدان جۆرە چیرۆکی ئەفسانەیی لەسەرە.
هەر بۆیە (کوردی)ی شاعیرمان بە(طائری وهم) واتە فڕندەی گومانیی ناو بردووە. ئەم (مەلە ئەفسانەیی)یە لە کەلەپووری کوردەواریدا بەباڵندە (مورغ)ێکی زۆر گەورە، ڕەچاو کراوە کە زەلامێکی زەبەللاح دەتوانێ لەسەر پشتی دانیشێ و هەردوو لنگی بەملا و ئەولای شان و ملیدا شۆڕ بکاتەوە. لە تین و هێزدا توانای هەڵگرتنی ئەو زەلامە زەبەللاحەی هەیە کە بتوانێ پێوەی

بفرێت، بەئاسماندا. هەروەها یا بەنینۆکی چنگەکانی هەمان زەلام وە یا بەدەنووک هەڵبگرێ و پێوەی پەرواز بکات بفرێ بەئاسماندا. بەدووری نازانم لەبەر ئەو زەبەللاحییەی ئەو باڵندەیە بێ کە لە زمانی (کوردی)دا بە(سیمورغ) یا (سیمرغ) ناونرابێ. واتە ئەوەندەی (سی) پەلەوەر (مورغ)ە.

لەو هێز و تینەیەوەیە کە بەپەلەوەرێکی زۆر تیژڕەو و چوست و زیرەک ناسراوە لە ڕووی هەست و هۆشەوە بەباڵندەیەکی زۆر چاکەکار و خێرەومەند ناو براوە کە چەندین جار فریای لێقەوماوێک کەوتووە لە ناو دەریادا کە (کەشتی یا بەلەم)ەکەی کون بووە و کەوتووەتە ژێر ئاوەوە، یا لە بیابانێکی چۆڵ و کاکی بەکاکیی بێ ئاو و بێ زیندەوەر و بێ ئاوەدانی، یا لە دۆڵێکی کپ و قووڵ و فراواندا کە ڕێگە پیا هەڵزنان و پیا سەرکەوتنەوەی نەبێت و، پڕیش بێ لە هەژدیهای کوشندەی حەوت سەر یا لە بن حەوت چینەی زەویدا کە دەرەتانی سەرکەوتنەوە بۆ سەر ڕووی زەوی بێت، یا لە هەرە قووڵایی ئەشکەوتێکی تاریک و نووتەکی سامناکدا، یا بەسەر چیایەکی سەختی هەزار بەهەزارەوە کە ڕێگەی پیادا کشانە خوارەوەی نەبێت و...

هتددا. ئەو باڵندەیە فریای کوڕە کەچەڵەی داستانێک یا قارەمانی چیرۆکێک یا داماوێکی بێ دەرەتان کەوتووە و بەچنگ یا دەنووک ئەو زەلامانەی هەڵگرتوون، یا بۆیان نیشتووەتەوە و، سواری کۆڵی خۆی کردوون و گەیاندوونیەتە جێگەی ئەوتۆ کە بەئاسانی ڕسگار بن و بگەنەوە شوێنی خوازراوی خۆیان و (لە مردنی بە سزاوە) ڕسگاری کردوون، خستوونیەتە جێگای ئاسوودەیی و ئاسایش و ئارام و دەسەڵاتداری و ژینگەی ژیانی خۆشی و بەرفرەهی.

هەروەها بەو فریاکەوتنە ڕێگەی سەدان فرسەخ و ساڵەهای ساڵی بڕیوە لە پێناوی قوتارکردنیاندا. لە ڕووی ئەوەوە کە بەفڕندەیەکی (پیرۆز) ناسراوە لە چیرۆکە گوێ ئاگردانییەکانماندا هاتووە کە سێبەری ئەو (سیمرغ)ە لە مرینیدا بەر سەری هەر کەسێک کەوتبێ، ئەو کەسە بەبێ گومان بووە بە(پادشا) و ژیانی بەکامەرانی و تەندروستی و خۆشی و دەسەڵات و سامانداری و تەمەنی درێژیی بەسەر بردووە.

سەدان داستان و چیرۆکی لەم جۆرانە لە کەلەپووری گەلاندا و لەوانە لە هی کوردیشدا هاتووە. هۆنەران زۆر جار لە هەڵبەستەکانیاندا ناوی ئەم باڵدارە ئەفسانەییییە سەرسوڕهێنەیان بردووە، لەوانە شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە فەرموویەتی:

سێ (ئیسم) هەن بێ (موسەمما)، هەروەکو (ئاوی بەقا)

تەیری (عەنقا)، شاری (جابوڵقا)، پڵاوی (خانەقا)

(کوردی)ی شاعیرمان ئەو گەدا پڕ بڕوایانەی چواندووە بەم (مەل)ی (سیمرغ)ە، لە چوست و چالاکی و زیرەکی و، چاکەکاریدا و، لە بەڕاستی پاکی خواناسی کردندا، هەروەها بە:

مسرع الافکار واتا لە هزر و هۆش و بیر و هەستیاریی ئەو (گەدا)یانەشدا، کە ئەوەندە شارەزان، هەروا بەئاسانی لە خشتە نابرێن و زۆر بەخێرایی بیر دەکەنەوە و دەگەنە ئەنجامی ڕاستی لە پەیڕەویکردنی فرمانەکانی خوا و پێغەمبەردا.

ئەم شاعیرە لەگەڵ ئەمانەشدا بەجۆرێکی تر لەو گەدایانە دواوە و لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا فەرموویەتی:

در بیــابان وصلشـــان: لە چۆڵەوانیی گــەیشتن بەئاواتیـــان، ئەوانە بەو هـەمـــوو ڕواڵەتـە چاکانەیانەوە دیسان:

لنگند: شەلن، دەشەلن.

بیری ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستە دەمبات بەلای تاکە هەڵبەستێکی فارسیی شێخی سەعدی شیرازی وە کە لە بارەی ئەو جۆرە پیاوچاک و پێغەمبەرانەوە فەرموویەتی.

«گــهی برطارم اعــلا نشــینیم

گـهی تا پشت پای خـود نبـینیم»

کە (سـعدی) ئەمـەی بەحەزرەتی (یەعقووب)ی باوکی حـەزرەتی (یووسف)دا هەڵداوە بەواتا ئەو جۆرە کەسانە (جاری وا هەیە کە لەسەر هـەیوانی هەرەبەرز واتە بەپاڵ بارەگای خـوا (عەرش) دادەنیشن) وەک لە لێکدانەوەی تاکی یەکەمی ئەم بەندی دووەمـە لەمەڕ (گەدا)وە نووسـیومـە و ئەمجا سەعدی لە نیو باڵی دووەمی هەڵبەستەکەدا فەرموویەتی:

«هەر ئەوانیش چاویان هانای پشتی پێی خۆیان ناکات» کە مەبەستی لەوە بووە کە (یەعقووب) کە کوڕەکانی لە سەیران هاتنەوە و (یووسف)ی برایان هاویشتبووە، ناو بیرێکەوە و بەباوکیان گوت کە (یووسف) گورگ خواردوویەتی و (یەعقووب) بەو پێغەمبەرێتی و چاوی نهێنی بینییەوە بڕوای بەو هەواڵەی کوڕەکانی کرد، لە هەمان کاتدا کاتێ براکانی چوونە (میسر) بۆ هێنانی (گـەنم)ی خـواردەمـەنیی سـاڵی خـۆیان و لەوێ تومـەز پاشـای مـیـسـر (یووسـف)ی برایان و براکانی خۆی ناسییـەوە کە زانی باوکیان لە تاو خـەفـەتی (یووسف) کوێر بووە، کراسێکی خـۆی دانێ بەنیـشـانەی مـژدەی نەمـردنی خـۆی هەر ئەو (یەعـقـووب)ی کـە هـەسـتی دەکـرد بەدرۆیەکەی کوڕەکانی هـەر ئەو لە دووریی چەند فرسـەخـەوە گوتی (بۆنی یووسف ئەکەم لێم نزیک دەبێتەوە) و هـەستی کرد لەو دوورەوە بۆنی کراسەکەی یووسـفی کرد و کە کراسەکەی گەیشتێ چاوی چاک بوونەوە. ئەمجا لەوانەیە و بەدووری نازانم کە شاعیرمان (کوردی) بیری ئەم تاکە هەڵبەستەی خۆی لە تاکە هەڵبەستەکەی شێخی سـەعدییـەوە بێ کە لە شـوێنی تری ئەم پەڕاوییەدا ئەم بۆچوونەمم جاری تر ڕاگەیاندووە.

**جیاوازییەکانی ئەم تاکە:**

طائر، لە (نم/١)دا نووسراوە (طایر)، نادروستە.

وهم، لە (صا) نووسراوە: همّ = هەمم – ئەمیش نادروستە.

مسرع، لە (ف)دا نووسراوە: مسرّع – دیسان نادروستە لە نووسیندا.

الافکار: تەنیا لە (عن) دایە و لەبەرئەوە کێشەکەی لەنگ نابێ، بۆیە لە سـەرەوە جێگیرم کرد و سەرچاوەکەش شوێنی بڕوایە.

الافکار، لە (ق/٣، گل/٣)دا نووسراوە بافکار – ئەمیش لەنگ و هەڵەی نووسینە.

وەصلشـان، لە (عن، گل/٣، گل/٦، نم/١، مـا/١، سـجـا، جم، صـا)دا نووسـراوە وصـفشـان (وەصفشـان) – ئەمیش لە ڕووی دەسـتووری زمانی و فەرهەنگیشـەوە ناگونجێ، چونکە (ئەوان لە بیابانی وصفیان) واتا نادات کە چۆن خۆیان تیایدا لەنگن (شەلن).

لە (ج)دا مامۆستا بەرامبەر بەم (وەصلشان) و (وەصفشان)ە نووسیویە:

«لای مامـۆستـا سـەجـادی – (وەصف) باشـترە» منیش بەرامبـەر بە تێچـێنە بیروڕام وەهایـە کە هەرگـیز (وەصـفـشـان) ئەوەندی (وەصلشـان) پڕ بەپـڕ و جـێگیـر و گـونجـاو نییـە، هەر بۆیە لە سـەرەوە (وصلـشـان)م جـێگیـر کـرد و بەر لەم تێـچـێنەی مـامـۆسـتـا (ج) هـۆی ئـەم ڕایەی خـۆم دەربڕیوە و ئەوەتا مـامـۆسـتـا (ج) بەم جـۆرە لەسـەری هەڵی داوەتێ و با خـوێندەواری شـارەزا بڕیار لـەسـەر ڕاسـتـتـرینی (من و ئەو) بدەن، تـاکو لـە چاپی دووەمی ئەم پـەڕاوییـەدا ئەو ڕای خوێندەوارە بەر چاپ بکەوێت.

**واتای گشتی:**

ئەو گەدایانە وەک سیمرغ لە ڕێبازەکەیاندا گورج و چاکەکار و پیرۆزن و هەست و بیر و هێزیان زۆر بەخێرایی دێتە کار لەو ڕێگەی خواناسییەیاندا بەڵام هێشتا هەر خۆیان بەگوناهبار دەزانن وەک لە بیابانێکی چۆڵەوانی و بێ ئاو و ئاوەدانیدا بن و لەنگ (شەل) بن ئاوەهان.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە بەپێی زنجیرەی یەک لە دوای یەکی تاکەکانی ئەم (حەوت بەند)ە، لـە ســـەرچاوەی (ف)دا هـەژدەمـین تـاک و لـە (ط، مک)دا نـۆزدەمـین و لە (ج، جـم، ق/٣، ص)دا بیـست و یەکـەمـین و لـە (مع، نع، گل/٨، حم)دا بیـسـت و شـەشـەمین و لـە (با/١، ص، گل/٣، مـا/١)دا بیسـت و حـەوتەمین و لە (شح، گل/٥)دا بیـست و هەشتـەمین تاک و لـە (سـجا، عن، گل/٦، نم/١)دا بیست و نۆیەمین و لە (ن، ھ)دا تاکی سییەمینە.

٣١- هم: دیسان، وە، هەم، هەروەها، ڤە، هەمیسان، هەمدیسان، هەمدیس.

در: لە

اقلیم: وشەیەکە لە بنەڕەتی زمانی (یۆنانی)یەوە کەوتووەتە ناو زمانەکانی تری جیهان و زمانی (کوردی) و(فارسی)یشەوە.

اقلیم: لە ڕووی واتا و مـەبەسـتـەوە لە کۆندا هەموو وشـکاییی سـەر (گۆی زەوی) دابـەش کرابوو بە سەر(حەوت) ئیـقلیمدا کە بەکوردی (کیـشوەر) دەگرێتەوە، ئەویش ئەو بەشەی جیـهانە کە لە ڕووی کەش و تووشـی و ئـاو و باوە جیاوازیی لەگەڵ بەشێکی تری دراوسێیدا هـەبێ.

دل: دڵ.

چو: وەک، هەروەک، مانەندی، بەوێنەی، وەکی، وەکو،

سلطان لە ڕووی بەڕێوبەرایەتییەوە، گەورەترین دەسەڵاتدار بەسـەر ناوچەیەکدا کەوا لە پلەی (پاشا) یا (سـەرۆک) یا (خەلیفە) یا (فەرمانڕەوا)دا یە لە ڕووی سوپایشـەوە چوار پێنج پلە لە خـوار هەرە پایـەی باڵای ئەفسـەرییـەوە بە(سلطانند- سـوڵتـانن)، کـە مـەبـەسـتی (کـوردی) لەمەیانە.

فـوج: بـەشـێکە لە سـپـاو (افـواج) کـۆی (فـوج)ە بەواتە: فـەوجـەکـان. بەکـوردی (هـەنگ) یا (هـەند)یش دەگرێتەوە.کە مەبەست لە ژمـارەیەکی زۆرە وەک دەڵێن: هـەزار و هـەنگ، یا هـەزار و هـەند، بەواتە (ئەوەندە) یا (ئەوەنگە) کە بەساڵەهـای ساڵ و سواندن بووەتە (هـەند) و (هـەنگ).
جان: گیان، ڕەوان.
سـرهنگ: پـایەکی ئەفـسـەری بـاڵای سـوپاییـیـە کـە یەک پلە لە خـوار هەرە بـاڵای ئەفـسـەری (سوپاییەوە)یە. (سرهنگند: سـەرهـەنگن) واتە (سـەر) و (لە سـەروو) (هـەنگ)ەوەن.
لێرەدا سـەرنج دەدرێ کە (کوردی) دەسـەڵاتداریی ئەو خواناسـی و پێغەمبەرە خۆشەویستانە کە بە(گـەدا)ی نـاو بردوون، بەهـۆی ڕێڕەوەکـەیانـەوە (دەسـەڵاتیـانـی) بەسـەر (دڵ و دەروون)ەوە بە(سـوڵتـان)ی پایەی سـوپایی (نـەک پایەی ڕامیـاری) داناوە کـە لە پایەی سـەرهـەنگ کـەمـترە، بەڵام ئەو دەسـەڵاتەیانی بەسـەر (گـیـان)ەوە پایەی سـوپاییـدا کـە سـێ چوار پلە لە سـەروو پاییـە (سـوڵتـان)ەوەیە؛ چونکە (گـیـان) هـەر ئەوپـەڕی بەرزی و مـەزنیی زینـدوویـیـەو لە گـەورە و بچووکیدا لە ڕوانگەی سـوپاییەوە دەسـەڵاتەکەیانی هەڵسەنگاندووە.
ئەمـەش ڕۆشنبیریی فـراوانی (کوردی) ئەگـەیەنێ کـە کابرایەکی هـۆنەری سۆفی ئـامـێز بووە و پلە و پایەکانی سـەربازیی بەوردی زانیوە، وەک (سـەر لەشکرێک) شـارەزا بووە.
ئەم تاکە بەپێی (هـەر حـەوت بەندەکە) (٣١)ەمین تاکە و بەپێی بەندی دووەمیـان نۆیەمین تاکـە و لە سـەرچاوەکـانـی: (ف)دا پێنجـەمین و لە (گل/ ٣، گل/ ٦، گل/ ٨، ص، مک، ط، شـح، جم، نم/ ١، سـجـا، صم، مـا/ ١، ق/ ٢)دا حـەوتەمین تاک و لە (صـا، مع، ج)دا هـەشـتـەمـینە و لە (مس، ن، ھ)دا نۆیەمین تاکە و لە (نع)دا نییە.

**جیاوازییەکانی ئەم تاکە هەڵبەستە سەرچاوەکاندا:**

افواج لە (عن)دا نووسراوە: انواعی: ئەنواعی.
هم برافواج لە (مع)دا نووسراوە: برسر فوج.

**واتای گشتی**

تۆی خـۆشـەویست بەسـەر کـیشـوەری (دڵ)و دەروونەوە (سـوڵتـان)ی دەسـەڵاتداری لە ئاسـتی شـەیدایانتدا.
هـەم دیسـان هـەر تۆ سـەرفـەرمـاندەی هـەرە بەرزی سـوپای کـە هـەمـوو باڵادەسـتـییـەکت بەسـەر (گیان)دا هـەبێ، واتا گیانی (گەدا): تۆ ویستەکاندا.

٣٢- از لب: لە لێوی- کـە بەواتا لێوی پێغەمبـەر (د.خ) و مـەبەست لەو ڕاگـەیاندنانەی ئایەتەکـانی قـورئانی پیـرۆز و فـەرمـایشت (حـەدیث) و ڕاگـەیاندنە ئاینییـەکـانە کـە لە دەمی پیـرۆزی پێغەمبەر(د.خ)وە ڕاگەیەنراون.
لعل: ئەو بەردە بەنرخ (گـەوهـەرە)ی یەکێ لە ڕەنگەکـانی ڕەنگێکی کـاڵی زۆر دڵگیـرە- کـە مەبەست لەو لێوانەی پێغەمبەرە لە ڕووی بەنرخی و هەم لە ڕووی ڕەنگەوە وەک لێوی پێغەمبەر ئاڵە و بایەخدارە.

وشـەی (لعل) لە هەمـان کاتدا واتای گـوڵە (لالە)ی سـوور و(گوڵی سـوور)یش دێت کـە بۆ ئەم شوێنە دەگونجێ و (یاقوت)یشی پێ دەوترێ.

گەوهەر (لعل)یش لە سروشتیدا لە وڵاتانی وەک: (هندستان) و (بورما) و (سیام) و (سەیلان) و (ئوستراليا) و لە شوێنانی تریشدا بەرهەم دێت.

گیسو: پرچ، کەزی، قژ، بسک، ئەگریجە، پەرچەم، زوڵفی- مەبەست لەو بەشە پەخشانەی قژی سـەری کـوڕ و پیـاو و کچ و ئافرەتە کـە بەدەوری سـەریدا ئاوێزانـە. زۆر جـار (تاڵ تاڵ)ی ئەو گیسووە چوێنراوە بەدێڕی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە بەهۆی (جبرەئیل)ی فریشتەوە خوای مەزن (بەش بەش) ناردوویە بۆ پێغەمبەری خۆشەویست -د.خ- چواندنی (گیسو) و (زوڵف) و (پەرچەم) و (کاکۆڵ) بەدێڕەکانی قورئان یا بەدێڕەکانی (فەرموودە: حەدیث)ی پێغەمبەر - د.خ- نەریتێکی سـۆفیـانەیەو لەوێژەی کۆندا (باو)ە دەقـە ئاینیـیـەکانی (قورئان و حـەدیث) خـوێندنەوەیان چواندووە بە (بادە -مـەی) و پێی مـەسـتی برواداری بوون و، (دیتن) و (چاو پێکەوتن)یان چواندووە، بەوشـەی (وەصل) کە (وەصل) (دروست بوونی پیاو و ژن لەگەڵ یەکدا دەگرێتەوە) کە لە هەڵبەستی سۆفییانەدا ئەمەیان مەبەست نییە.

مشکین: وەک موشک، (مسک) یا (مسکاوی)، مسکە ئامێز، یا بۆن و ڕەنگی وەک (مشک) و ڕەش بێت. کە مەبەست لە ڕەنگ و بۆنی (گێسو)ەکەیە.

(مشک)، یا (مسک) ماددەیەکی زۆر بۆن، خۆشە و لە هەرە گرنگترین هەوێنی جۆرەها بۆنی خۆشە لە جیهاندا.

سۆفییەکان ئەو هەوێنە بۆن خۆشەیان لە هەڵبەستیانەدا چوواندووە بەکاریگەری خوێندنەوە و بیستنی قورئان و حەدیث و (نەشئە)ی سەرخۆشی(مەعنەوی)یان لێ وەرگرتووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە تا ئەوەندەی دەستم کەوتووە، بەپێی تێکڕای حەوت بەندەکە (٣٢)مین تاکە و، دەیەمین تاکی بەندی دووەمیەتی.

خرم: شادمان، بەکەیف و دەم بەپێکەنین، گەش، شاد، ئەم پیتی (و : واو)ەی دوای وشـەکە بەو واتا(وە)یەو، لێی جیایە. کامیاب (کامیابی): بەکام گەیشـتوویی، بەئاوات گـەیویی، ئەوەی هیوای هاتووەتە دی، لێ تێر و تەسەل و مەست بوون، بەهێزن، بەتینی،

باهنگند: بەرێزن، شکۆمـەندن، پایەبەرزن. قـورس و گرانبەهـان، سـەنگینن، توانان، زیرەکن، بەهەتەر (عەزمن) ئەویش بەهۆی بەهرەمەندییەوە لەو (لعل)ی لێوەو، (گیسو)یە بۆن خۆشـەوە کە لێکم دایەوە.

ئەم تاکە بەپێی بەندی دووەمی (ئەم حەوت بەندە) تاکی (١٠)مینەو بەپێی تێکڕای هەر حەوت بەندەکە تاکی (٣٢)مینەو لە سەرچاوەکانی بەندی دووەمدا ئەم تاکە لە (مع، ف، نع)دا نییەو لە (حم، ص، صا)دا حەوتەمین تاکە و لە (با/ ١، ج، جم، سجا، شح، ط، ق/ ٣، گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، ما/ ١)دا هەشـتـەمین تاک و لە (مع)دا نۆیەمین تاک و لە (عن، مس، ن، ه)دا دەیەمین تاکی بەندی دووەمە.

نیـو بـاڵی دووەمی ئەم تاکـەی سـەرەوە لە (گل/ ٣، گل/ ٥، صـا، مک، ط، جم، نم/ ١، با/ ١، سجا، صم، ق/ ٣)دا بەم جۆرەی دواییە:

(طبله در طبله، تنگ در تنگند).

ئەگەر بەدوای ئەم نیو باڵە ئاوێتەیە دا بگەڕێین، لە تاکی ئاینده دا، واته لە (١١)مین تاکی ئەم بەندی دووەمـە دایە، کـە لەو سـەرچاوانەدا نیـو باڵی یەکـەمی ئەم تاکـە نیـیـە بۆیە هـەر لەو سەرچاوانەیاندا تاکی ئاینده نییه و دیاره ئەویش لە بیرچوونەوەی کاتی نووسیندا ئەم هەڵەیە ڕووی داوه. (بڕوانه ئەوێ...).

هـەروەها نیوەی دووەمی ئەم تاکەی سـەرەوە: (١٠)مینە، بەهـۆی کۆنی و زۆر بەدەسـتەوە دان و بێ چاودێری لە سەرچاوەی (گل/ ٦)دا نووسینەکەی ئەوەنده سواوەو چووەتەوە، ناخوێنرێتەوە بەڵام نیوەی یەکەمی ئەم تاکە لـەم سەرچاوەیەدا و لە هـەموو سـەرچاوەکانی تردا چۆن یەکن و هانای خوێندنەوەی دەکرێت.

ئەم شێـواوییانەیش بەڵگەی زۆر دەسـتـاودەست کردن و بەهەڵە نووسینەوەی لەبەر نوسـخـەیەکی تر و، یا بەهەڵە لە دەمی کەسی تر وەرگیراوەوە پەیابووە.

**واتای ئەم تاکە هەڵبەستە بەگشتی:**

بەهـۆی لێوی پیـرۆزی گوڵاڵەیی گەوهـەرین (لعل) ئاسـای پێغەمـبـەر -د.خ- خۆشـەویسـتـەوە کە دەقەکانی (قورئان) و (حدیث)ی پێ بڵاوکردووەتەوە کە دێڕەکانی ئەو دەقانە وەک (تاتا)یەکانی گێسووی موشک ئامێزی خۆش ڕەنگ و خۆش بۆن وهان، مایەی باوەڕ پێکردنی ئەو گەدایانەن کە بە بەهرەوەربوونی ئەو بڕوایانەن لە شادمان گەشن بەکام گەیشتوون لە سایەی ئەو ئاینەوە کە لە هەمووان زۆرتر خۆیان بەشکۆدار دەزانن.

(کـوردی) سـۆفـیـیـانـە مـەبەسـتی لـەوەیە کـە خـۆیشی یەکێکە لەو گەدایـانەی چاو لە دەسـتی پێغەمبەرەکەیان.

٣٣- دل: دڵ.

پر اسرار: پڕ لە نهێنییەکانی، مەبەست لە نهێنی (حەقیقەتی عیرفان)ە.

غیب را: هی شاردراوە، ئی نادیاری. کە نهێنیی (خوایەتی)یە.

بەمثل: هەروەک، چۆن بەوێنەی، مانەندی، هەروەکوو، وەک.

طبله ئەو (سنووق)ەیە کە خـشڵ و پارە و زێڕ و بەردە بەنرخـەکـانی وەک گەوهەر و ئەڵماس و پیرۆزە و مـەرجان و شـیلاوی شـەوەی، تیا دەشـاردرێنەوە. کە لە بەکارهێنانی ئەم یەکەم وشـەی (طبله)یەیاندا مەبەستی (کوردی) لە لەشی ئەو (گەدایانە) بووە، چونکە خاوەن بڕوابوون و لەش (جـەسـتـە)یشـان لە لەشی بێ بڕوایان پاک و پیرۆزترە، کەواتـە فووی بـڕوایەکەیانی تیـایە وە یا مـەبەسـتی لە (طبلە) دڵی (ئەو گەدایانە)یەو ئەویش وەک (طبلە)یەکی تر لە ناو لـەشـیـاندایە، لە جێگەی ئەوەی کە (طبلە) ئەو گەوهـەر و شـتـە بـەنرخانەی تیـایە (دڵی) دڵیـان (ئەسراری غـەیب) واتە حەقیقەتی عیرفان و نهێنی خوایەتییان تیایە و دوورن لە بەدی و بەدکاریی جیهانی.

در طبله: (در: له) و ئەم (طبلە)ی دووەمــە مــەبەست لە گــیــانــی ئەو گــەدایانەیە کــە قــوتو (سنوق)کەی دڵیـانی تیـایە وەیا بەپێچـەوانەوە یا ئەم (طبلە)یەیان وەک گیـان و دڵی پاک و بێ خەوشی خـواناسی و لە حەقیقەتی عیرفـان و نهێنیی خوایەتی گەیشتنی تیـایە و لە ناو لەشی ئەو گەدایانەدا جێگرە.

(کوردی) ئەگەرچی سـەرەتای ڕازدا دانەکەی بە(گەدایان)ی پێـغـەمـبـەردا -د.خ- داوە، بەڵام مەبەستیشی لە (گەدایەکی) وەک خۆیەتی کە چاو لە دەستی پێغەمبەر بووە بۆ شەفاعەت.

لە لایەکی تریشـەوە دەتوانرێ ئەم (طەبلە در طبلـە)یە، بەوە لێک بدرێتـەوە کە دڵە پڕ لە (اسـرار غیب)ەکەیان، واتە پڕ لە زانین و تیگەیشتنی عیـرفـانی حەقیـقـەت و پەیبـردن بەنهێنیی بوونی خـواو خـوایەتی و ئـەو دڵە پڕەشـیـان کـە وەک (قـوتووی) گـیـان لە نـاو (قـوتووی) لـەشی ئەو (گـــەدایانـەدایە) و، یـا ئـەو دڵە لـەناخـــەوە بـڕوا هێنـەرەیـان وەک (طبلـە)یەک لـە ناو (طـبلـە)ی گیاندایە و خۆشەویستی پێغەمبەریش هەر لە گەشەو پەرەسەندندایە لە دڵ و گیانیاندا.

ئەم چەشنە (هزر)و بـڕوا ڕاگەیـاندنە لە هۆش و هەسـتی سـۆفـیـیـانـەدا و ڕاگەیاندنەیان (باو)ی ناو بەرەی سـۆفـیـیـەکـانی (گەدایان)ە و بـەڕادەیەک لەش و دڵ و دەروون و گـیـان سـیـخناخی عـیـرفـانی (حـەقیـقـەت شـوناسـی)و پەیبـردن بەنهـێنیـیـەکـانی بوون و هـەتـا هـەتاییی خـوایە، بەڕادەیەک ئەوەتا یەکێکی وەک (مەنصووری هەلاج) خودی خۆی بەو عرفان حەق و حەقیقەت و (اسـرار غـیـب)ە ڕەچاوکردووە، کە بـەفـەرمـوودەی (أنا الحق) واتە: (مـن حـەق و حـەقـیـقـەتم)ی دەربڕیوە کـە لە ڕاسـتـیشدا ئـەو حەق بوو، چونکە هەمـوو گەردیلەکەی لـەشی تەژی ئەو بڕوایە بووە.

(کوردی) بەپێی زۆر لە هەڵبەستەکانی، خـۆی بەیەکێ لە ڕێبوارانی ڕێبازی ئەو (مەنصوور)ە لە قەڵەم داوە.

هەر ئەم بۆ چوونەی ئەم تاکە هەڵبەستە، ئەشێ وەها لێک بدرێتەوە کە ئەو ئەسرارە غەیبییانە وەک فوویەکن کە لە نـاو قوتووی لەش، دڵ، دەروون و گیـانی گەدایاندا پـارێزراون کـە هەر ئەو (ئەسـراری غـەیبی)یانە وەک تەپڵ (ئامـێرێکی مۆسـیـقی) دەنگ دەدەنەوەو جیـهـان پڕ دەکەن، بەڕادەیەک تەنانـەت (لەش و دڵ و دەروون و گیـانی) گەدایەکانیش دەنگ دەداتەوە و کـوشـتنی ئەوان بۆ بـڕوا بەخـەلک هـێنان وەک دەنگدانەوەی (تەپڵـەکـەیە) کـە دەنگی بڕواو خـواناسی و پێغـەمبـەر دۆستی وەک دەنگی ئامێری مۆسیقی پڕ لە ئاهەنگی خۆشی بەسـۆزی ئاینی لێوە بەرزبێتەوە.

تنگ: تـەنگ، تەنگەبەر، بـێ مـەفـەر، شـوێنی تەسک و تروسک، پێچـراوە، شـاردراوە، نهـێنی، پەستێوراو، ئاخنراو، سیخناخ، پڕ، تەژی. هەروەها (تەنگ) بەواتای باری شـەکرە (شـەکربار) هاتووە کە نیشانەیە بۆ بچووکی (دەم و لێو) و، شیرین (وتە بێژی)ی دەم و لێو و، بۆ شیرینیی (چێــژی) دەم و لێــوی خــۆشــەویست (دڵخــواز) جگە لەوەی کــە وشــەی (تەنگ) نـاوە بۆ (سوراحی)یا (گۆزەڵە)یا (کوویە)یا (قەڕابەی) شـەراب، کە هەمیشە مـەست سـەرخـۆشی ئەو

شەرابەیە کە لەناویدایە و نیشانەیە بۆ (مەستی)ی سۆفییەکان لە (فەرموودە) و لە دیمەنی دەم و لێوەکە. بەبێ ئەمانە ئەم وشەیە چەندین واتای جیاجیای تریش دەدات، بەڵام ئەوەی بۆ ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە دەگونجێ، ئەمانەیانە کە لێکم دانەوە.

هەر ئەم وشەی (تنگ)ەیش لە سەرچاوەکانی: (صا، با/ ١، ما/ ١، مس)دا بەشێوەی (تنگ)ە هاتووە کە ئەمیش بەواتا: دەرگا، یا، کەنداو واتە: دەروویەکی دەریا کە بەشێکی لە وشکایی زەمین دا دڕیبێ و کردبێتیە (کەنداو)یا بەواتە: (پارچەیەک، هەندێک) لە زێڕ و زیو. کە ئەم شێوەی وشەی (تنگ)ە واتاکانی لەگەڵ مەبەست، واتای ئەم تاکە هەڵبەستەدا ڕێک دەکەون، لە (دەم و لێو) تەنگ و (بچکۆلەکەی) کە دەربڕینی دەقە ئاینییەکانە وەک کەنداوێکی دەریاوان لە واتا فراوانی دا، کە (پڕ): (سیخناخ)ە لەو (دەقانەی)ئایەت و حەدیث و سوننەتە، کە شیرینی وەک (شەکربار) کە گەدایانیان مەست کردووە و ئەکەن.

در تنگند: تەنگەبەری و (بێ مەفەری)دان کە مەبەست لەوەیە: خودی لەشی ئەو گەدایانە (پڕن) لە تێگەیشتنی حەقیقەت (عیرفان) و ئەو (دڵ) و گیانەیش کە لە ناو لەش بە(جەستە)ی گەدایەکانیشدایە، دیسانەوە (پڕن) هەمان تێگەیشتن و نهێنییەکانی خوایەتی و، ئەسرارە (غەیبییەکان) و شوێنی داخوازی و ئارەزووە جیهانی (شەهوەتی مرۆڤێنی)یان تیا نابێتەوە.

وشەی (تەنگ)ی یەکەمی سەرەوە لە سەرچاوەکان: (ما/ ١، شح/ ٥، ن)دا بەشیوەی (تەنگە) نووسراوە کە وەک لەپێشی ئەم دێڕەدا لێی دواوم.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەم شێوەیەی سەرەوە جێگرم کردووە، لە سەرچاوەکانی: (ف، صا، مک، ط، نم/ ١، جم، با/ ١، سجا، حم، مع، ق/ ٣، ج)دا نییەو لە سەرچاوەکانی (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، ص، شح، ما/ ١)دا نۆیەمین و لە سەرچاوەکانی: (مس، عن، ن، ه)دا یانزەیەمین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە.

من لەم تاکە دا هاتنی: (طبله در طبله) بەرامبەر بە(تنگ در تنگ)یا (تنگە در تنگە) بەجۆرە، (لەف و نەشرێکی) دەستووریی وێژەی کۆن ڕەچاودەکەم کە هەر وشەیەکی (طبله) بەرامبەر بەیەکێ لە (تنگ)یا (تنگە)کانە کە(شی)م کردوونەتەوە.

وەک لە تاکی پێشوودا ڕام گەیاند لە هەندێ سەرچاوەدا نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە بەهەڵە کەوتووەتە ناو تاکی پێشوو و بەوە لەم بەندی دووەمدا ئەم تاکی (١١)مینە ناتەواو دەرچووە، کە بەتۆژینەوەی ساغم کردووەتەوە. ئەمیش جیاوازییەکانی ئەم تاکەی سەرەوەیە، بەپێی سەرچاوەکان:

(دل پڕ اسدار) لە: (عن، ن، ما/ ١)دا نووسراوە: (دل زا سرار).

(بەمثل) لە: (مع)دا نووسراوە: (سەریز: سەر ڕێژ) بەواتە: (سەرپڕ). ئەمیش دەگونجێ

(بەمثل) لە (مس، ص، شح)دا نووسراوە: (سرشار) بەواتە (پڕ) و دەگونجێ.

(طبله در طبله) لە (صا)دا نووسراوە: (طپله در طپله) هەڵەی نووسینەوەی (ڕێنووسە)

(درتنگند) لە:( ما/ ١)دا نووسراوە: (دردنگند) ئەمەش ناگونجێ.

نیـو بـاڵی یەکــەمی ئەم تـاکـەی ســەرەوە لە: (ط، شح، گل/ ٣، گل/ ٥)دا نیــیــە و من بەپێی سـەرچاوەکانی تر لێرەدا جێگرم کرد، چونکە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە سەرەوە وەک لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا نیشانـەم بۆ کرد (بەهەڵە) کەوتبووە ئەوێوە و من هێنامـەوە ناو ئەم تاکەی ســەرەوە و بەوە ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـە کـە بـەهەڵە لەنـاو چووبوو (دۆزیمـەوە) و بوو بەم تاکـە هەڵبەستە و توانیم شێواوییەکە چارە بکەم.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

ئەو گـەدایانە (ئەو بڕواهـێنە پاک و دروسـتـانـە) دڵیـان پڕ لە زانین و تێگەیشـتنـی (عرفـان) و، بڕواکردن بەنهێنییەکانی بوونێتیی خـواو ڕاستیی ئەو حەقیقەتانەی کە پێغەمبەری ئیسلام - د.خ- بڵاوی کردنەوە کە ئەو بڵاوکردنەوەیە وەک ئاشکرا کردنی ئەو (سندووقە)یەک لە ناویەکدا پەسـتێوراوەن کـە پڕیان لە گەوهەری نرخدارە ئەو پێغەمبـەرە خـۆشەویستـە بۆ ئێمـەی واڵا کـردنەوە و، دڵ و دەروون و گـیـانـی (گـەدا)یەکـانی پڕ کـرد لـە دڵنیـابوون لە حـەقـیـقـەتی ئەو نهێنییانە و بەندیواری کردن بەخوا پەرستی و (پێغەمبـەر دۆستی)یەوە. بەهـۆی دەقە پیرۆزە ئاینەکانەوە کە چەسپاندییە ناخیانەوە.

٣٤- زکف : لەپی دەست، بەری دەست.

(زکف): لە دەست.

دادگـان: داوان، داوەکـان و بە(زکف)ەکـەی پێـشــەوە، دەبێـتــە : (زکف دادگـان): لـە دەست داوەکان، لە دەست چووەکان، ئەوانی لە دەست دراون.

کە مـەبەست لەوانەیە (دڵی جیهانی، ئەوانەی دڵیان بەئارەزووەکانی جیهانییەوە بووە یا هەیە) واتە: ئەو کـەسە (گەدایـان)ە کە دڵی جیـهانی (دڵ بەئـارەزووی جیـهانییـەوە)یان لە دەست داوە، لە دەست چووە.

بۆ گەیشتنە پایەی (گدایی): (شوریدە)ین.

شوریدە: شـەیدا، ئاشوفتـە، دێوانە (نەک شێت) بەشکو شـەیدای جوانیی فەرمـوودە و ڕەوشتی پەسەنـدی پێغەمـبەری مـەبەستـە، شـەیدا و دێوانە و دڵبـەندی ئەو خۆشـەویستییـە گیـانییـەی کە سەوداسـەری گـەیشتنە هـەستێکی پێ زانیینـی (حەق و حەقیقەت)و تێگـەیشتنی ڕێگەی ڕاستی (جیـهانی) و (ئەوە جیـهانیش) و پاک بوونەوە لە ئارەزووە (شـەهوانییـەکانی) (ئەم جیـهان) و کەوتنە سەر ئەو ڕێبازەی کە (پێغەمبەر -د.خ) بۆ مرۆڤی دیاری کردووە.

شوریدە : شۆرلێ هەستاوی خۆشەویستی ئەو ڕێبازە سۆفیانەیە.

(کـوردی) ئەو دڵی (جیـهـانی) لە دەست داوان و شـۆریدەیانی (نیـو باڵی یەکـەمی) ئەم تاکـە هەڵبەستەی بەم چوار چەشنەی دوایی پێناسە کردووە کە ئەو کەسانە (گەدایانە):

١- شوخ: سایە سووک، جوان، قسە خۆش و دەم بەپێکەنین، کە زوو دەچنە دڵەوەو نابێزێن.

٢- شیرین: شیرین، دڵگیر، قنج، خۆشویستراو.

٣- شاهد: دلخواز، یار، خۆشەویست، دڵڕفێن.

٤- شنگند، شەنگن (شنگ): گەش، ڕووخۆش، ئەو پەڕی جوانی و دڵگیر، نازدار، نازەنین، قشت، خۆش، مەبەستی شاعیر لەوەیە ئەم چوار چەشنە ڕواڵەتانە لەو کەسانەدایە کە بە(گەدایان): شەیدایانی ڕێگەی ئیسلامەتی و سواڵکەرانی بەر دەرگاو دیوان و بارەگای پێغەمبەری -د.خ- داناون.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە (صا، نع)دا نییەو لە (حم)دا هەشتەمین و لە (با/ ١، ج، جم، سجا، ط، عن، ف، مک، نم/ ١)دا نۆیەمین تاک و لە: (شح، ص، گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، ما، مع)دا دەیەمین و لە: (عن، مس، ن، ه)دا دوانزە یەمین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە.

هەروەها ئەم تاکە بەپێی سەرپاکی حەوت بەندەکە (٣٤)مین تاکە هەڵبەستە.

نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە (مک)دا بەهەڵە بەم جۆرەیە:

(کشف کّشاف فّر فرهنگند)

بەڵام هەر ئەو نیو باڵی دووەمە لە جێگای وشەی (فرهنگند)ەکە لە (ط)دا نووسراوە (فرسنگند) کە بەسەرنجدان دەردەکەوی ئەو هەڵەیەیان لە تاکە هەڵبەستی دوایی واتە: (١٤)مین بەندی دووەم وەیا (٣٥)مین حەوت بەندەکەدا بووەتە نیو باڵی دووەمی ئەوێ (بڕوانە ئەوێ). ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە هەموو سەرچاوەکانیدا چونیەکە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

ئەو گەدایانە دڵی جیهانی خۆیانیان لە دەست داوە و بەهۆی ڕاگەیاندنەکانی (پێغەمبەر- د.خ)وە، کەوتوونەتە سەر ڕێبازی ڕاستی و تێگەیشتن و خوایەتی ناسین و پەیڕەویکردنی ئەو ڕاگەیاندنانە و بەو هۆیەوە. هەموو سایە سووک و جوان و دڵگیر و گەش و دەم بەپێکەنین و... هتد لە شەیدایی و، دەرباری بارەگای پێغەمبەر دا.

٣٥- عارفان: عارفەکان، کە کۆی (عارفە).

(عارف) لە ڕووی زمانییەوە بەواتا: دانا، ناسەر (شوناسندە)، دان بەخۆداگر، بەپشوو، بین درێژ، هۆشمەند، وشیار.

(عارف) لە ڕووی سۆفیگەرییەوە زاراوەیەکە بەواتای خواناس بەحەق، تێگەیشتوو لە نهێنی (أسرارە) شاردراوە غەیبییەکانی بوون و حەقیقەتی خوای مەزن و ناسەری خوایەتی و پەیرەویکاری فەرمایشتەکانی خوا لەسەر ڕێبازی ئاین. بەگوێرەی (ئیسلامەتی)یش بڕواهێنەرانی پێغەمبەری ئیسلام -د.خ- لە دەقەکانی (قورئانی پیرۆز) و فەرموودە و حەدیثەکان و سوننەکان، کە مەبەست لە (گەدایەکانە) بەهۆشمەندییەوە (کوردی) یەکێ بووە لەو سۆفییە پاکانە.

ئەمجا لەم سەرەتای تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا کە (کوردی) فەرموویەتی (عارفانند): (عاریفانەند) واتە ئەوانە، یا ئەو گەدایانەی کە پێناسە کراون، خۆیان (عارف)ن بەهەرسێ واتای زمانی و ئیسلامی و سۆفیگەرییەوە واتە شارەزان لە:

تارم أعلا: (تارم) بەواتە ئاسمان و (ئەعلا) بەواتا (باڵا) کە لە دەستنیشانکردنی ئاسمانەکە

بە(ئاسمانی بالا)مەبەستی لەهەرە بەرزترین ئاسمانێکە کە (سدرەتو لمونتەها) و بارەگای (کورسی)ی خوای مەزنی لێیە کە واتە (کوردی) ئەو گەدایانەی بەناسەری پیرۆزی ئەو بارەگای خوایەی داناون کە پەیڕەویکاری لە ناخەوەی فەرمایشتی خوای گەورە ڕاگەیاندنەکانی پێغەمبەر -د.خ- دەکەن.

لە نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا (کوردی) ئەو (گەدا): سواڵکەرانی دەربار و بارەگای پێغەمبەرن بە جۆرێکی تر دیاری کردوون کە ڕێزە خۆری پاشماوەی سەر سفرە و خوانی پێغەمبەرن کە ئاینە ئیسلامییەکەیەتی و بەجۆرێ لە کرپنەرەوەی ئێسکی ئەو سەر (سفرە)یەی ناوبردوون کە فەرموویەتی:

بر درت را: لەبەر دەرگانەکەتدا: لەبەر دەرگانەکەتدا ئەو گەدایانەی بە(لالنگند): واتە کرێنەرەوەی پرزۆڵەو، وردە گۆشتی ئەملا و ئەولای ئەو ئێسکە گۆشت لێکراوەیەن کە بەسەر سفرەکەوە ماون و گەدایەکان وەک پاش خوان دەیانخۆنەوەکە مەبەست لە پەیڕەویکاری ئەوانەیە بۆ (دەقە ئاینی)یە ڕاگەیەنراوەکان

لالنگ: کرێنەرەوەی پرۆزڵەی دەوری ئێسکی گۆشت لێخوراو. ئەو گەدایانە (لالەنگ)ن.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە سەرچاوەی : (نع)دا نییە و لە: (صا)دا هەشتەمین و لە (حم)دا نۆیەمین و لە (با/١، ج، جم، ص، ط، ف، ق/٣، نک، نم/١)دا دەیەمین تاک و لە (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، ما/ ١، مع)دا (١١)مین تاک و لە (عن، س، ن، ه)دا سیانزە یەمین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە.

بەڵام بەپێی تێکرای تاکەکانی ئەم حەوت بەندە(سێ و پێنچ)مین تاکە.

**جیاوازیی نێوان سەرچاوەکان:**

عارفانند لە (عن، گل/ ٨)دا نووسراوە (عارفانی)، ئەمیش دەگونجێ. (ئەعلا) لە (شح)دا نووسراوە بالا، ئەمیش دەگونجێ و فارسییانە ترە.

(بردرت) لە (شح)دا نووسراوە: گەز چوپان- ئەمەش شێواوییە (بردرت) لە (گل/ ٨، ص)دا نووسراوە: بردرتو کە ئەمیش لەنگی دەدات.

**واتای گشتی:**

ئەو عارفانەی گەیونەتە ئاسمانی بالا، ئەمجارە هەر سواڵکەری بەر دەرگانەکەتن و ڕێزە خۆری پاشماوەی سەر سفرەتن ئەی پێغەمبەر -د.خ-

دوو تاکە هەڵبەستی دوایی تەواوکەری ئێرەن.

٢٦- انبیاء: پێغەمبەران، نێردراوانی خوا بۆ ڕێنومایی مرۆڤ.

در مدارس: لە خوێندنگایەکان.

غیبی: شاردراوە، نادیاری، نهێنی، پەنهانی. پشت پەردەیی.

ئەم نیو باڵی (یەکەمی) تاکە هەڵبەستەی سەرەوە تەواوکەر، یا درێژەپێدانی تاکی پێشووە کە نیشانەی بۆ ئەو (عارف)انە تیا کراوە کەوا (خواناسن) واتە: نزیکن لە ئاسمانی بالا، واتە

بارەگای خواوە و لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەبەر دەرگا و بارەگای پێغەمبەری ئیسلامدا ڕێزە خۆر و پاشماوە خۆری خوانی ئەو پێغەمبەرەن، کە لەم تاکەی ئێرەشدا ئەو (عارفانە)ی بە(انبیا) لێک داوەتەوە کە ئەو پێغەمبەرانە (بەپێی بڕوای ئیسلامی) وەک ئەو عارفانە دەستەو خواری (محەمەد – د.خ)ن لە قوتابخانە (خوێندنگای) غەیبیدا لە خواناسی و خوا بەخەڵک ناساندنیاندا، بەنوێکەرەوەی ئاینی ئەو پێغەمبەرانە و یەکخستنی دەقەکانی پەڕاوییە پیرۆزەکانیانە لە (قورئان)دا و کۆتاییهێنەرە بەپێغەمبەرایەتی بەپێی ڕۆژگار.

بۆیە ئەو پێغەمبەرانە لەو خوێندنگای خواییەدا کە هەر ئاینەی چەشنە مەدرەسەیەکی تایبەتی بەخۆی هەبووە و هەریەکەیان لە قوتابخانەی خۆیدا (پەیی) بەحەقیقەتی بوونێتی خوا بردووەو، لە پەیکاری پەیڕەویکردنی فەرمایشی خوادا بوون بەپێی ئاینەکانیان و بەخەڵکیان ناساندوون ئەوانە:

کشف: (پەی) پێ بردن، دۆزینەوەی، دەستنیشانکردن، پێزانین مەبەست لەوە کە ئەو پەی پێبردنەیان و خۆیشیان دیسانەوە پەی پێبراوەی (کشاف): دۆزەرەوەی، پەڕاوی وەک (کشاف)ن

(کوردی) ئەو پێغەمبەرانە و ڕێبازەکانیانی وەک پەیڕەویکاری ئەو نهێنییانە داناوە کە لە قورئانیشدان و، یا بەجۆرە (الکشاف)ێکی چواندوون و هەمووانی بەدەربارانی پێغەمبەری ئیسلام داناون و بەستوونی بەو(گەدایانەی) کە لە تاکی هەڵبەستەکانی پیشوودا لێیان دواوە، لە دوو تاکە هەڵبەستی دوای ئەم تاکە ئێرەش هەر درێژەی بەم بیرەی خۆی داوە و، ئەو پێغەمبەرانەی بەپیت، بەرەکەت و برشتی: (فەڕی) ناو فەرهەنگی ئاینی ئیسلام داناوە.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی ژمارەی تاکەکانی هەموو حەوت بەندەکە (٣٦)مین تاکە بەڵام بەپێی تاکەکانی ئەم بەندی دووەمە لە سەرچاوەکانی (ف، ط، مک، نم/ ١)دا نییە و لە (نع)دا هەشتەمین و لە (صا)دا نۆیەمین و لە (حم)دا دەیەمین و لە (با/ ١، ج، جم، سجا، ق/ ٣، گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦)دا پانزەیەمین تاک و لە (ما/ ١، مع، گل/ ٨)دا دوانزەیەمین تاک و لە (شح، ص، عن، س، ن، ه)دا چواردەیەمین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە.

فەڕ: (فەڕ، شان و شکۆ، شکۆمەندی، جوانی، پەرداخی، پەڕتەو، پیت، برشت، بەبرشت، بەهرەمەند)یش بەکاردێت.

مەبەستی (کوردی) لە شکۆمەندی و پەڕتەوی ئەو پێغەمبەرانەیە وەک پیت (حەرف)ی ناو فەرهەنگی ئاینی ئیسلامیداو، ئەوەتا لە قورئانیشدا بەڕێز و شکۆدار ناوبراون: بەڕادەیەک لای ئیسلامەکان پیرۆز و بەفەڕ و شکۆدار و ڕێزمەندن –د.خ–

فرهنگند: فەرهەنگن.

وشەی (فرهنگ) لە ڕووی زمانەوانییەوە واتا: (زانیاری)، دانش، ڕۆشنبیری، وێژە(ئەدەب) فێربوون و پەروەردە، هەروەها بەواتای بەرهەمی زانیاری یا وێژەیی هەر نەتەوەیەکیش بەکار دێ و بەتایبەتی مەبەست لە (پەڕاوی)یەکە وشە گەلی زمانی نەتەوەیەکی بەلێکدانەوەیانەوە

تیابێ (قامووس).
ئەمجا (کوردی) ئەو پێغەمبەرانەی بە فەڕ و شکۆی فەرهەنگ ناوبردوون.

**جیاوازی سەرچاوەکان**

انبیادر لە (ق/ ٣، ف، نم/ ١، با/ ١، سجا، ج)دا نووسراوە: أنبیایی کە ئەمەش لەنگە.
انبیادەر، لە (نع، گل/ ٣)دا نووسراوە: (انبیار) کە ئەمیش لەنگە.
فڕ لە (نع، عن، ق/ ٣)دا نووسراوە (فّری) ئەمە دەگونجی (فرهنگەند) لە (ط)دا نووسراوە (فرسنگند) واتە ماوەی یەک فرسەخ ڕێگە، کە (٦) کیلۆمەتر ڕێگایە کە ئەمیش ئەگەر بگونجێ بەڵام گونجاندنێکی لاوازە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

پێغەمبەرانێ کە لە خوێندنگای نهێنی (پشت) پەردەدا پێ گەیشتبوون، ئەوان ڕوونکەرەوەی شتی نەزانراو بوون و پیت (بەرەکەت) و برشتی خوو و ڕەوشتی ڕاست و دروست و پاک بوون و ڕووناککەرەوەی ڕێگەی ڕاست و ڕەوانی کامەرانیی هەردوو جیهانی بوون و ڕێگەی پێغەمبەری ئیسلامیان دیاری کردووە کە کۆتاییهێنەری پێغەمبەرێتییەکانیان بوون.

٣٧- در سمای: واتە لە ناو ئاسمانێ، لە ئاسمانێ، بۆ ئێرە مەبەست کە شوێنێکی یەکجار پان و بەرین و، فراوان: لە شوێنی هەرە فراواندا.
حقیقت: ڕاستی، دروستی، حەققایەتی، بەحەق زانینی نهێنییە شاردراوەکان کە بڕوا کردن بەبوونێتیی خوا (الحقیقة الصمدیة)ی زاتی خودی خوایەو بەدڵ پەرستنی ئەو خوایە و پەیڕەویی فەرمایشتەکانی، ئەمجا ئەو: (ئاسمان)یا (شوێنە فراوان)ە مەبەست لە شوێنی ئەم (حەقیقەت)ەیە.
جانی: گیانی، مەبەست لەو ئاسمانی حەقیقەتە، ئاسمانێکی مەعنەوییە و (حەقیقەت) وشەیەکی سۆفییانەیە لە دوای پلەی (مەعریفەت)ەوە دەیگەنێ کە دەبنە (ئەهل الحقیقە)ی بەرامبەر بە(اهل السنة والجماعة لأهل الشريعة).
مهر پرواز: ئەوەی فڕینی خۆش بوێت، بۆ چوونە ناو ئاسمانی مەعنەوییەوە.
وەک لە دوو تاکە هەڵبەستی پێش ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا ڕامگەیاندووە کە ئەم تاکەی ئێرە و تاکی تری پێش ئەمیش و تاکی دواییش درێژە پێدانی واتا و مەبەستی تاکی پێشووترە، واتە (تاکی (٣٥)ەمین حەوت بەندەکە (وەیا تاکی (١٣)ەمین ئەم بەندی دووەمەیە).
چونکە لەوەبەر لە پەیکاری ڕاگەیاندنی (گەدایان)دا بوو، بەڵام لە تاکی پێشوودا ئەو (گەدایان)ەی کردن بە(انبیا): پێغەمبەران، یا وەک بەشێک لە گەدایان. ئەوا لێرەدا ئەو (پێغەمبەران)ەی کە لە تاکی پێشوو، واتە تاکی (١٤)ەمین ئەم بەندی دووەمەدا (چەردە)یەکیان لێ دوام و ئا لەم تاکە هەڵبەستەی ئێرەدا ئەو پێغەمبەرانەی وەها ڕاگەیاندووە کە لە ناو (ئاسمانی)یا (شوێنێکی)یەکجار فراوانی (حەقیقەت) شوناسی (گیانی)دا ئەوان (ئەو پێغەمبەرانە) ئەگەر چی، گێز (ئارەزوو)یان لە پەروازکردنی (فڕینی) بێ سنوورە، لەو ئاسمانی

حەقیقەتی گیانییەدا بەڵام ئەوە تا کۆتایی ئەم تاکە هەڵبەستەی ئێرە (سەرەوە)ی بەوە هێناوە کە ئەو پێغەمبەرانە لە برینی (طی) ڕێگەدا. هێشتا هەر (باڵکورت، باڵشکاو، شەل)ن لەو برینی ڕێگەیەدا. کە لێرەدا وەک نیشانە بۆکردنێکی نهێنی مەبەستی (کوردی) لە توانایی لە ڕادەبەدەری (پێغەمبەری ئیسلام -د.خ)یە کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا لە خاکی (حیجاز)ەوە بەخاکی (قودس)دا گەیشتە حەوت نهۆمەی ئاسمان و پاڵ (سەدرەتو لمونتەها) و (لەوح) و (قەڵەم) و (کورسی)ی بارەگای (عەرشی) خوای مەزن و پەروەردگار لەوێ ئەوی پێویست بوو، فەرمووی و وەڵامی بیستەوە گەڕایشەوە کە لە ئاینی ئیسلامدا بە(میعراج) واتە ئەو شەوەی کە تیایا پێغەمبەر گەیشتە بارەگای خوای یەکتاو بێ هاوتوانا ئەوشەوە ناسراوە بە(میعراج).

طّی: برینی، پێچانەوەی کە مەبەستی لە پێچانەوەو برینی ڕێگەیە بەئاسمانا و نیشانە بۆ کردنی لەنگی پێغەمبەرەکان و بەراوردی لەگەڵ برینە تیژڕەوییەکەی میعراج بەئاسماندا. هەروەک لە وشەی دوای ئەم وشەی (طی)یەدا (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا وشەی (ڕێگە)ی دەربڕیبوو.

لنگند: لەنگن، دەلەنگن، شەلن، هەروەها ئەم وشەی (لەنگ)ە واتای:- خەستە (نەخۆش)، ناتوان، داماو و، هەڵوێستە کردنی کاروانیش دەگەیەنێت کە ئەمانیش لەگەڵ واتا و مەبەستی ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەگونجێن. بەوەی کە لە چاو توندوتیژیی برینی ڕێگەی میعراجەکەدا ئەوان وەک ئەو بەتوانا نین و لەش بەبار و هەڵوێستە کارن.

**جیاوازییەکان**

مهر لە (حم، ص، گل/ ٥)دا نووسراوە: بهر، لەبەر، بۆ، لە بۆ، لە کە ئەمانەش هەموو دەگونجێن و (مهر) پڕبەپڕترینە لە واتادا، بەڵام لەبەر ئەوەی لە زۆرینەی سەرچاوەکاندا (مهر) نەنووسرابوو بۆیە ئەم (بهر)ەم جێگیر نەکرد.

(طی راه) لە (عن، گل/ ٨، شح)دا نووسراوە: خود بەخود، خۆبەخۆ، لە خۆوە کە ئەم نووسینی سێ سەرچاوەیەش زۆر پڕبەپڕترو بەجێترو گونجاوترە لە ناوەڕۆکی سەرچاوەکانی تر، بەڵام لەبەر ئەوەی لە (٢١) سەرچاوەدا (طی راه) هاتووە، بۆیە (خود بەخود)ەکەم جێگر نەکرد کە شایانترە.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی زنجیرەی یەک لەدوایەکی تێکڕای (حەوت بەند)ەکە (٢٧)مین تاکە و بەپێی زنجیرەی تاکەکانی ئەم بەندی دووەمە (١٥)مین تاکە. لە سەرچاوەکانی ئەم تاکەدا زنجیرەی ژمارەی ئەم تاکە لە (با/ ١، ج، جم، سجا، صا، ط، ف، ق/ ٣، گل/ ٣، گل/ ٦، ما/ ١، مع، مک، ن، نم/ ١)دا نییەو لە (نع)دا یەمین و لە (جم)دا یانزە یەمین و لە (گل/ ٥)دا دوانزەیەمین و لە (شح، گل/ ٨)دا سیانزەیەمین و لە (ص، عن، من، ھ)دا پانزەیەمین تاکی ئەم بەندی دووەمینەیە.

**واتای گشتی ئەم تاکە:**

ئەم تاکە کۆتایی پێهێنەر و درێژە پێدانی دووتاکی پێش خۆیەتی و من نیوەی دووەمی بەم

چەشنەی دوایی بەجێتر دەبینم لەوەی لەسەرەوە جێگرم کردووە:

«بهر پرواز خود بەخود لنگند»

کە واتایەکەی پڕو چڕو پڕبەپڕترێکە کە مەبەستی لە پێغەمبەرەکانی ترە، ئەگەر چی هەموو لە قوتابخانەی گیانیدا یەکسان فێربوون، بەڵام بەرامبەر پێغەمبەری ئیسلام -د.خ- کە ئەم حەوت بەندە لە بارەی ئەوەوە ئەو پێغەمبەرانە لە کاتی پەروازکردن بەئاسمانی خوا ناسییدا کە لە قوتابخانە گیانییەکەیدا فێربوون و کەچی هێشتا لە پەرواز (فڕین)ەکەیان (لەنگ)ن لە چاو تیژڕەویی چوونە میعراجی پێغەمبەری ئیسلامدا. بەڵگەی تاکی ئایندە.

٣٨- شاهدم: خۆشەویستەکەم کە مەبەست لە پێغەمبەری ئیسلامە -د.خ- لە کاتی میعراج.

شاهدم: ئەمەیان لە واتایدا، جیایە لە واتای (شاهدم)ی یەکەم، کە لێرەدا مەبەست لە گەواهیدەرم : شایەتمە.

واتا: خۆشەویستەکەم کە (محمد) -د.خ- یە گەواهیم بۆ دەدات کە لە میعراجدا (بڕوانە نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە).

در میعراج: لە (میعراج)دا کە لە شەوێکدا لەگەڵ فریشتە (جبرەئیل)دا لە حیجازەوە بەسواری (بوراق) بەڕێکەوتن بۆ قودوس و ئەمجا بەرەو ئاسمانەکان تاگەیشتنە بارەگای خوای مەزن و...... هتد و گەڕایشنەوە.

ئەمجا لەم نیو باڵی دووەمەدا (کوردی) فەرمووویەتی: (همەشان دیدە): هەموویانی چاو پێ کەوت – واتە هەموو پێغەمبەرەکانی بینی کەوا در رهش (دەر ڕەهەش) لە ڕێگەی میعراج کردنەکەیدا چاوی پێیان کەوت وەک لە داستانی (میعراج نامەکاندا) هاتووە پێشوازییان لێ کردووە.

چنگند: ئەم وشەیە زۆر واتای. جیاجیا دەدات وەک (چنگ : چنگو پەل)یا (چەنگ)ی ئامێرێکی مۆسیقاو...... هتد بەڵام لێرە بەواتایەکی تری ئەو وشەیە هاتووە کە ئەویش (چەنگ) بەواتە (سەرکەچ): لە ڕێگەی شکۆمەندی پێغەمبەردا. وەک پێشوازی بکا و ڕێزگر لەو ڕێبواری چوونە میعراجەدا وەستا بوون.

**هەڵسەنگاندن:**

لە نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکەدا دەبینرێت دووجار وشەی (شاهدم)ی بەکارهێناوە بەپاڵ یەکەوە کە هەریەکەیان بەواتایەکی جیاواز لەوی تریانە.

**جیاوازییەکان:**

(رهش) لە (گل/ ٣، گل/ ٥، ما/ ١)دا نووسراوە: صەفی : ڕیزی.

جگە لەم جیاوازییە ئیتر لە هەموو سەرچاوەکانیدا ئەم تاکە چونیەکە.

ئەم تاکە بەپێی ژمارەی لەم (حەوت بەندەدا) (٣٨)مین تاکە و بەگوێرەی زنجیرەی تاکەکانی ئەم بەندەی دووەمیش (١٦)مین تاکە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی (ج، جم، سجا، شح، ط، ف، ق/ ٣، مک، نم/ ١، نع)دا

نییەو لە (صا)دا دەیەمین تاک و لە (با/ ١، حم، گل/ ٣، گل/ ٦)دا دوانزەیەمین و لە (گل/ ٥، ما/ ١، مع)دا سیانزەیەمین و لە (گل/ ٨)دا چواردەیەمین تاک و لە (ن)دا پانزەیەمین و لە (ص، عن، مس، ھ)دا شانزەیەمین تاکە ھەڵبەستی ئەم بەندی دووەمەیە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

ئەم تاکە درێژە پێدانی سێ تاکی پێشەوەیەتی کە لە پێغەمبەرانی (گەدایان) بەبارەگای پێغەمبەری ئیسلام -د.خ- دواوەو کۆتاییی بەتیژڕەویی دواییان لە (میعراج)دا ھێناوە کە لە ڕێگەی ئاسمانەکاندا ئەوانی لە پێشوازیکردنیدا دیون بە(ملکەچی)ی ڕێز لێگرتنەوە کە خودی پێغەمبەرە خۆشەویستە گەواھی ئەوەی داوە.

٣٩- با: لەگەڵ، بەرامبەر، لە ڕووی.

دد: جانەوەر، گیاندارە خراپکارو دڕندەکانی وەک مێردەزمە و، خێو، و شەوە و دایکی ئاڵ کە گیانداری ئەفسانەیی و نادیارن و خراپکاری بەرامبەر بەمرۆڤ (پیاو و ژن) دەکەن، ھەروەھا لەگەڵ گیاندارانی خراپکاری دڕندەی تری وەک گورگ و شێر و پڵنگ و، ورچ، وێز و، بەرازی کێوی و...... ھتد.

ئەو (گەدا)یانە ئەوەندە شکۆمەند و پیرۆزو ڕێزمەندن ئەو گیاندارە خراپکاریان ناویانم بردن لە ئاستی ئەو(گەدا)پاک و چاکانەدا بەبێ وەزنگ بەیەکتر گەیاندن و دۆستانە وێکرا دەژین

(انس): ئینسان. توخمی مرۆڤ، کە دیسان ئەو گەدایانە لەگەڵ مرۆڤ ھەموو مرۆڤ و تەنانەت خراپەکانیشیدا دیسان ئەوەندە چاکن کە ئەو مرۆڤانە بەلای خراپکارییە سروشتییەکەی خۆیاندا ناچن و دیسان چۆن جانەوەر و گیاندارە دڕندەکان دۆستانە دەژین لەگەڵ ئەو گەدایانەدا ئەو مرۆڤە خراپکارانەش ئاوەھا دەژین. جنّ: ناوی بوونەوەرییەکی خەیاڵیی ھزرییەکە نابینرێ و شێوەی لە نێوان شێوەی مرۆڤ و گیانی خەیاڵیدایە، کە چاک و خراپیشیان تیایە (کافر) و ئیسلام و بەکوردی (جنۆکە) و لەمە چێتری پێ دەگوترێ.

ھاتنی ناوی (جن): جنۆکە لێرەدا دیسان مەبەست لەوەیە کە ئەو گەدایانە لەگەڵ ئەم چەشنە گیاندارەشدا تەنانەت لەگەڵ خراپەکانیشیاندا دۆستانە و بێ وەزنگ بۆ یەکتر ئەژین ئەویش لە پاکیی سروشت چاکیی ئەو گەدایانەوەیە کە ھەڵکردنیان لەگەڵ ھەر بوونەوەریەکی تەنانەت خراپکاریشدا دەبێ و دۆستانە لەگەڵیاندا دەژین.

بە صدق: بە ڕاستی، بەڕاست گۆیی.

صفا: پاک و بێ خەوشی، خۆشی، گەشی، بێگەردی.

لەم جووتە وشەی (صدق) و (صفا)یە، مەبەست لەوەیە کە ئەو گەدایانە ئەوەندە چاکن و پاکن بەھۆی ڕێنومایی کردنیانەوە بەدەقە ئاینییەکانی ئیسلامی کە تەنانەت لە ژیانیاندا لەگەڵ جانەوەران و گیاندارە دڕندەکان و جنۆکەو مرۆڤی سروشت خراپیشدا بەجۆرێ مرۆڤایەتیانەی دروست لەگەڵ ئەو ھەموو بوونەوەرانەدا بەڕاستی و ڕاستگۆیی (صدق)و بەپاکی و بێ خەوشی لەگەڵیاندا دەژین و دۆستانە و بەخۆشی و چاکی ژیان پێکەوە دەبەنە سەر، ئەمەش

بەشێوەیەکی (نایەکەندەر دوویی): پەروەردەی چاکی ئیسلام دەردەخات کە ئاینی دۆستایەتی و خۆشەویستییە کە ئەوەتا گەدایەکان ئاوەها چاک و پاک و بێ خەوش و بێ کینەو بێ وەزنگن، بەڕادەیەک تەنانەت جانەوەران و دڕندان و خراپکاران ناچاری چاک ژیان دەکەن لەگەڵ خودی خۆیان (گەدا)کاندا.

تا ئێرە هەر تەنیا لێکدانەوەی نیوەی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە کە ئەمی دواییش لێکدانەوەی نیوباڵی دووەمی ئەم تاکەیە:

لێک: بەلام، لێکین، وەلێ، بەشکوو، قەمی. بەلان

با دیو: لەگەڵ دێوی.

دیو: ناوی گیانداریکی ئەفسانەیی و خەیاڵییە، ئەو گیاندارە لە زەلامێکی یەکجار زەبەللاح و قەبارە گەورەی (مرۆڤ)دا ڕەچاوکراوە کە زۆر بەهێزو تین و دیمەن ترسناک و شاخ و کلکدار، لە چیرۆکە ئەفسانەییەکانیاندا ڕاگەیەنراوەو، بەگیاندار یا بوونەوەرێکی گومڕاکار و بەدکاری وەک هی (شەیتان) ناوبراوە.

تاکە هەڵبەستەیدا کە دیسان گەدایەکانی هێناونەتەوە گۆڕێ و پیشانی داوە کە ئەو گەدایانە هۆیەکی پێگەیشتنیان ئەوە بووە کە لەگەڵ دێوی (نەفس)ی خۆیاندا لەجەنگدان و پێکیانەوە ناکرێ.

ئەمەش نیشانەیە بۆ نەریتێکی سۆفیگەری و تیا پێگەیشتنی پەیڕەویکردنی (تزکیە النفس)ە ئەویش بەربەرەکانی کردنی مرۆڤە لەگەڵ ئارەزووە جیهانییە (شەهوانی)یە نا(حەلاڵ)ەکاندا.

در جنگند: لە جەنگدان، واتە ئەو گەدایانە لەگەڵ دێوی زۆرداری ئارەزووە جیهانییە خراپەکاندا لە جەنگدان کە ئەوەش (تزکیة النفس)ەکەیان دژی (نەفسی ئەممارە). بەواتای پاک و بێ خەوش کردنی دەروون.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەگوێرەی ژمارەی تاکەکانی ئەم (حەوت بەندە) (٣٩)مین تاک و بەپێی ژمارەی تاکەکانی ئەم بەندی دووەمە (١٧)مین تاکە هەر ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا لە (شح، گل/ ٣، گل/ ٨، مع)دا نییە و لە (نع)دا دەیەمین تاک و لە (صا، ط، ف، مک، نم/ ١)دا پانزەیەمین تاکە لە (ج، جم، سجا، ق/ ٣)دا (١٢)مین و لە (با/ ١، حم)دا سیانزەیەمین و لە (گل/ ٥، ما/ ١)دا چواردەیەمین تاک و لە (گل/ ٨)دا پانزەیەمین تاک و لە (ن)دا شانزەیەمین تاک و لە (ص، عن، مس، ھ)دا حەڤدەیەمین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

بادد، لە (گل/ ٥، نع، گل/ ٨)دا نووسراوە: یاورو : یاوەرو – کە ئەمەش ناگونجێ، چونکە واتا نادات.

بادو، لە (نم/ ١، جم)دا نووسراوە: بادَدْ – کە ئەمیش ڕاستە و بەلام بەڕێنووسی کۆنی عارەبی بەنیشانە (بزوێنێک : حرکات) بۆ کردن نووسراوە.

(انس و جن): لە (ن)دا نووسراوە:

(جن و إنس) – كە پاش و پێش و ڕێنووسی کۆنە.
(لیک) لە (ن)دا نووسراوە هەم کە ئەمیش دەگونجێ.
(دیو) لە (گل/ ٥)دا نووسراوە: (دیو) – ئەمیش هەڵە نییە، چونکە ڕێنووسی کۆنە و دەگونجێ
(درجنگند) لە (ص، ما/ ١)دا نووسراوە (با جنگند) ئەمیش دەگونجێ.

**واتای گشتی**

(کوردی) لەم تاکەدا هەڵبەستەیدا لە پاکیی دەروونی ئەو پێغەمبەرانەو ئەو گەدایانە دواوە بەهۆی (تزکیە النفس)ەکەیانەوە کە لە پەیکاری گەیشتنە (حەقیقەت)دا بوون نەک خوازەڵۆکیی جیهانی (شەهوانی) ئەوەندە، دەروونی پاک و گیانی پوختەیان هەبووە کە توانیویانە هەڵکرد لەگەڵ جانەوەر و هەموو جۆرە کەسانێکی خراپیش و تەنانەت لەگەڵ درنج و جنۆکەیشدا بکەن بەڕاست و ڕەوانی و ڕوونی لە ژیانی دۆستانەدا بن و لە چاکی خۆیانەوە ئەو جانەوەرە و درنج و جنۆکانەیشیان ناچاری بێ وەزنگی کردوون.

لە هەمان کاتیشدا ئەو پێغەمبەران و گەدایانە بەو ئاسوودەیی و ئارامی خوازەیانەوە لەگەڵ (دێوی) دەروون (نەفس)ی جیهانیخوازی خۆیاندا لە جەنگدا بوون کە بە(نەفسی ئەممارە) ناودەبرێ کە (جیهانی ماددی)یە چونکە ئەوان بەندیواری (جیهانی مەعنەوی) بوون و هەن بەسەر نەفسی خۆیاندا زاڵ بوون لە سنووری فەرمایشتی خواوە کە پێغەمبەری ئیسلام ڕای گەیاندووە.

٤٠- جان و دل: گیان و دڵ.

بازی (باز)ی: ئەم وشەیە گەلێ واتای جیاجیا دەبەخشێ، ئەوی بۆ ئێرە پێویستە یا دەگونجێ وشە گەلی: (کراوە، گەش، والا، واز)ە.

پرتو: تیشک، ڕووناکی و، ئەو ڕۆشناییە کە لە جەستەیەکی نورانییەوە بەدیار دەکەوێت و، یا ئاکامی هزر لێکردن و تێڕامانەوە هەست بەڕۆشناییەک دەکرێ کە بۆ ئەم شوێنە ئەمەیانی مەبەستەو کراوەیی و گەشییەکەش بەهۆی تیشکی ئەو پەرتەوەوەیە.

نظری: ئەگەر چی لە بنجی وشەی (نظر)ە و، واتای (تەماشا کردن) دەدات، بەلام بۆ ئێرە: واتای بیر و هۆش و هزر و ئەندێشە دەدات کە پەرتەوەکە بۆ سەر (گیان و دڵ)ەکە دەڕەخسێنێ.

بەم چەشنە ئەم نیو تاکە هەڵبەستی یەکەمە، واتای: (گیان) و (دڵ) بەپەرتەوی هزر و ئەندێشەی (فکر)ییەوە کراوەیی و گەشی و بێ خەوشی دەدات بەدڵ و گیان کە (دڵ)ەکەش هەر مەبەست لە (دەروون) و (گیانە) بەلام دڵ و گیانی (گەدا)یە ڕاست و پاک و بڕوا هێنان بەدەقە پیرۆزەکانی ئاینی ئیسلام.

ئەبصار: کۆی (بصر)ە، بینایی، بینین بە چاوە.

لە نیوباڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەدا کاریگەریی ئەو ئەندێشەیی (فیکری)یە ڕادەگەیەنێت لەسەر ئەو شەیدایانی پێغەمبەر -د.خ- یە بەواتە گەدایەکەیان و دەفەرموێت ئەو پەرتەوی

ئەندێشەیە کە دڵ و گیانی گەدایەکانی (گەش و، والا) کردووە ئەوە هەروەک:
کحلی: کل، سوورمە.
(کوردی)یش ئەو پەرتەوی ئەندێشەیەی کە دڵی و دەروونی (گەدایەکانی) (گەش و، والا کردووەتەوە) بەو (کلی چاو ڕشتنەی) چواندووە.
لە هەمان کاتیشدا نەک هەر بەکلی چاوڕشتن بەشکو بە:
صیقل: (مشت و ماڵ) و (ڕەونەق پێدەر)و (ژەنگ لابەری) لەسەر ئەو چاوە ڕێژراوە و، یا لەسەر ئەو (دڵ) و (گیانە)شی داناوەو بە(صیقل)ی چاو لەخشت و خالی وەک:
زنگند: ژەنگن، کە (زەنگ : ژەنگ).
ئەم ڕاگەیاندنەش لەوەوەیە کە بەلای سۆفییەکانەوە وەهایە کە دڵ و گیان توانایی بینینی هەموو شتێکیان هەیە و چونکە لە ناو لەشدان و بەلای سۆفییەکانەوە لەشیش وەک (شووشە) وەهایە وەک لە ناو شووشەدابن دەبینن. بەڵام ئەگەر ئەو کەسی خاوەن لەش و گیانە بەندیوار و سەر بەجێگەیاندنی خواستە شەهوەتییە جیهانییەکان بوو، ئەوا شووشەی لەشەکەی لێڵ و تەڵخ دەبێت دڵ و گیان هانای بینینی ئەوەی لە دەرەوەی لەشە لێڵەکەوەیە نایانبینێ.
لەم تاکە هەڵبەستەدا بەهۆی (تزکیة النفس: پاکتاوکردن یا مشتوماڵی دەروونی) دوورکەوتنە لە شەهواتی جیهانی و بەندیواربوونە بە(بیر) و (هزر) و (ئەندیشە)ی بە جێگەیاندنی فەرمایشتەکانی خوا، ئەوسایە وەک لەم تاکە هەڵبەستە هاتووە لەشەکە پاک و ڕوون بێگەرد و بێ خەوشە و گیان هانای دیتنی دیوی دەرەوەی لەشەکەی دەبێ.
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی هەر (حەوت بەندەکە) (٤٠)مین تاکە و، بەپێی ئەم بەندەی دووەمە (١٨)مین تاکە.
ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا لە (ف، ق/ ٣)دا نییە و لە (نع)دا یانزەیەمینە تاک و لە (صا، ط، مک، نم/ ١)دا (١٢)مین تاک و لە (ج، جم، گل/ ٣، گل/ ٦)دا (١٣)مین تاک و لە (با/ ١، حم، شح، مع)دا چواردەیەمین تاک و لە (گل/ ٥)دا پانزەیەمین تاک و لە (گل/ ٨)دا شانزەیەمین تاک و، لە (ن)دا حەڤدەیەمین و لە (ص، عن، مس، ه)دا هەژدەیەمین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە.

**جیاوازی سەرچاوەکان:**

(جان) لە (صا)دا نووسراوە: (جسم) ئەمەش ناگونجێ.
(باز) لە (گل/ ٣)دا نووسراوە (زپرتو) دیارە هەڵەی نووسینەوەیە.
(کحل أبصار) لە (مع، با/ ١، شح)دا نووسراوە: (سرمەء چشم): (سورمەیی چەشم : سورمەی چاو) کە ئەمیش دەگونجێ و فارسییانەترو جوانە. لەبەر کەمبوونی ژمارەی سەرچاوە، لەسەرەوە جێگیرم نەکرد.
(زنگند) لە (صا، جم، نم/ ١، با/ ١، سجا، حم، ق/ ٣)دا نووسراوە (ڕنگند): ڕەنگەند، واتە (ڕەنگن) ئەمەیش لە واتادا کووڕە و لەم تاکە هەڵبەستە (٢١)مین ئەم بەندی دووەمدا ئەگەرچی وشەی (زنگند) هاتووە بەلام واتای (زنگ)ی ئێرە: (زنگ) و واتای ئەوێ (مرۆڤی ڕەگەزی

زەنگی)یە (قولەڕەش)ە لەیەکتر جیاوازن و بە(دووبارەکردنەوەی) دانانرێن.

**واتای گشتی:**

گیان و دڵ بەهۆی پەڕتەوی هۆشیاریی (فیکری) ئایندارییەوە گەش و کراوەن، وەک چۆن چاوی ڕێژراو ڕووناک و جــوان بیناترەو بەر چاو ڕووناکــتــرە وەهـایە و هـەر وەک گــیــان و دڵـە بەمشـتـومـاڵی (صـیقل) کـرابێ و ژەنگی (بەندیواری بەخـراپکاریی جیـهانـی)یەوەیان لێ پاک کراوەتەوە.

٤١- وانگهی: ئا ئەو کاتە، ئەو گاوە، لەو ساتەدا، ڤێ دەمی، ئەودەمە، ئەوسایە.

میکدە (مەیکەدە): مەیخانە، شوێنی بادە تیا خواردنەوەو لێ فرۆشتنی مەی.

چکار آید (چ کارئایەد): بە چ کارێک دێت، سوودی چییە، بۆچی باشە.

لەم نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا، ئەو گەدایانەی کە وەک لە تاکە هەڵبـەستی پێشوودا دیاری کـرا هەمـوو بەپەڕتەوی خـواناسی و بەجـێگەیاندنی فـەرمـایشـتـەکـانی گـەش و ڕوونی مـشـتـومـاڵ کراو لە ژەنگ و بـەڵخی جیـهـانی و گۆناهکارییـەکان، دوورن. ئەوەتا (کوردی) لەم تاکەی سـەرەوەیدا ڕای گەیاندووە کە کەوتوونەتـە سـەرخـۆشـییەکی گیـانیی ئەوتۆوە، ئیـتـر چ پێویستییەکیان بەمەیخانە هەیە و مـەیخانە بە چ کارێکیـان دێت؛ چونکە: (بڕوانە ئەم نیو باڵی دووەمی ئێرەیە):

کە همە: کە ئەوان (گەدایەکان) هەموویان:

خود: بەخودی خۆیان، (بوونەتە):

خم: کووپە، قەڕابە و مەرکانەی شەراب (بادە).

مل: شەراب، بادە.

بنگند: هەربەخۆیان (بەنگ : حەشیشە، خاشـخاش.) و مادده سـەرخۆش و سڕکـەرەکان، بەڵام بادە و بەنگی گیانی و مەستی ڕێگەی ڕاستی گرتن،

ئەم تاکە هـەڵبەستـە لە زنجیرەی تاکەکانی (هـەر حەوت بەندەکە)دا (٤١)ەمین و بـەپێی ژمارەی تاکەکانی ئەم بەندی دووەمە (١٩)مین تاکە.

هـەر ئەم تاکە لە (با/ ١، ج، جم، حم، سـجـا، صـا، ط، ف، ق/ ٣، گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، کم، نم/ ١)دا نییـە و لە (نع)دا (١٢)مین تاک و لە (شح، مـع، ما/ ١)دا پانزەیەمین و لە (گل/ ٨)دا (١٧)ەمـین و لـە (ن)دا هــەژدەیــەمـین و لـە (ص، عـن، س، ھ)دا (١٩)مـین تـاکـی ئـەم بـەنـدی دووەمینەیە.

**جیاوازییەکان:**

(وانگهی) لە (ص، ما/ ١)دا نووسراوە: (ساقی و) واتە (بادەدەر) کە ئەمیش دەگونجێ و لەبەر کەمبوونی ژمارەی سەرچاوە، لەسەرەوە جێگیرم نەکرد.

(چکار اید) لە (ص)دا نووسـراوە: (چ کـارو ببین): بـەچ کـارێک دێ و ببـینە، ئەمـیش دیسـان دەگونجێ و لەبەر کەمێتی سەرچاوە جێگری سەرەوەم نەکرد.

(کە همە)، لە (ما/ ١)دا نووسراوە (هەمەگی : هەمووان) و ئەمیش دەگونجێ و چونکە هەریەک سەرچاوەیە و کەمە بۆیە جێگری تاکی سەرەوەم نەکرد.
(کە همە خود) لە(شح، ما/ ١)دا نووسراوە: (همگی عین) و ئەمیش هەر دەگونجێ و چونکە سەرچاوەی کەم لەسەر هەیە، بۆیە جێگری سەرەوەم نەکرد.
خود لە (ص)دا نووسراوە: (چون) و دەگونجێ و لەبەر سەرچاوە کەمی، لەسەرەوە جێگیرم نەکرد.

**واتای گشتی:**

لەودەمە بەهرەوەرییە کامەرانییەی، گەدایاندا ئیتر مەیخانەیان بۆ چییە کە هەموو لە خۆشییاندا مەستی بادەی (گیانی)ی ئەوتۆن کە هەروەک خودی خۆیان بووبنە کووپەی شەرابی پڕ لە (بادە)و دنگی سەرخۆش (بەنگ) بووین وەهان هەروەک لە تاکە هەڵبەستەکانی دواییدا ئەم هاتنە جۆشە روونتر دەبێتەوە.

٤٢- چونکە: چونکە، ژبەر هەندێ، لەبەر ئەوەی، ژ بۆ.
مست: سەرخۆشی، درنگی، مەستی.
(ألستُ) اند: هی (ئەلەستو)ن. کە وشەی (ألست)ی عەرەبی بەواتە: (ئایا من ئەوەنیم کە) ئەمیش یەکێکە لە وشە گەلی بابەتی ژمارە (١٧٢)ی سوورەتی (الأعراف) لە قورئانی پیرۆزدا، ئەویش نیشانەیە بۆ ئەو رووداوە گرنگەی کەوا خوای مەزن کاتێ کە(مرۆڤی) دروست کرد و گیانی کردن بەبەراو بۆ ئەوە پەیمانیان لێ وەربگرێت کە هەر تەنیا ئەو خوای ئەوانە و ئەگەر لەو پەیمانەیان پاشگەز بوونەوە، ئەوا سزایان دەدات.
(کوردی) لە نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا وەک وەڵامدانەوە و روونکردنەوەی ئاکامی ئەو (فەرموودە پرسیارییەی) خوای مەزن کە (کوردی) فەرموویەتی:
پی (پەیی): لەبۆ، بۆ، ژبۆ، لەبەر، لە.
کامی چنین: ئەم وشەی (کام)ە کە لە هەموو سەرچاوەکاندا هەر بەشێوەی (کام) واتە سەرەتایەکەی بەپیتی (کاف) نووسراوە، بەزۆری لە رێنووسی کۆنی فارسیدا تەنانەت پیتی (گ)یش هەر بەشێوەی (ک) نووسراوە کە ئەم (کام)ەی ناو سەرچاوەکان مەبەست لە (گام)ە (چنین : ئاوەهایی)یە.
گام: کاو، کات، سات، گاف، دەم، هەرەت، قەدەم، هەنگاو.
ئەمجا مەبەست لە (پی گامی چنین) ئەوەیە کە(کوردی) فەرموویەتی (ئا لە کاتێکی ئاوەهایی دا).
قوی ینگند (قەوی یەنگەند) کە: (قەوی): تۆکمە، توند و تۆڵ، بەهێز.
ینگ: قاعیدە، بنچینە، بناغە، دەستوور، جۆر، چەشن (طراز) دەگرێتەوە و لێرەدا (کوردی) وەڵامەکەی بەوە کۆتایی هێناوە کە فەرموویەتی:
ئەو گەدایانەی کە دەربەستی بەڵێندان بەخوای مەزنن کە هەر ئەو تەنیا (خوا)یانە و لێ

پەشـیـمـان نابێتـەوە و ئەم هەڵوێسـتـەیشـیـان وەک بناغـەیەکی بەهێـزە بۆ پشـتگیـری بەڵێندانەکەیان.

ئەم تاکە بەپێی ژمارەی تاکەکانی ئەم (حەوت بەند)ە (٤٢)مین و بەپێی ژمارەی تاکەکانی ئەم بەندی دووەمە (٢١)مین تاکە و لە سەرچاوەکانی (با/ ١، ج، جم، حم، سجا، شح، صا، ط، ف، ق/ ٣، گل/ ٥، نم/ ١)دا نیـیـەو لە (نع)دا سـیـانزەیەمین تاکـە و لە (گل/ ٣، گل/ ٥)دا چواردەیەمین تاک و لە (ما/ ١، مع)دا شانزەیەمین و لە (ن)دا نۆزدەیەمین و لە (ص، عن، مس، هـ)دا بیستەمین تاکی ئەم بەندی دووەمینەیە.

**جیاوازییەکان:**

(چونکە) لە (ما/ ١) نووسراوە (چون کی) ئەمەش دەگونجێ، بەڵام بەپێی ڕێنووسی فارسی هەڵەیە.

(الستُ) لە (ما/ ١)دا نووسراوە کە مەبەست (الستی) ئەمەش هەڵەیە.

(الست) لە (ما/ ١)دا نووسراوە (مست) ئەمەش هەڵەیە چونکە دووجار (مەست) نووسراوە.

(پەی کامی) لە (عن، ن)دا نووسراوە: (ازپی کام): ئەمـەش بەتەواوی ناگونجێ، ئەگەنا واتا دەدات.

(چنین قوی) لە (عن، ن)دا نووسراوە (همچنان) ئەمیش واتاکە شێواوتر دەکات.

(چنین قوی) لە (ما/ ١)دا نووسراوە: (راکە خود) ئەمیش لەنگی دەدات و شێواوە.

**واتای گشتی:**

لەبەر ئەوەی بەهرەوەری مـەست بوون بەبەڵێندان بەپێی ئایەتە (الستُ)ەکـەی کـە ڕۆژی (قالوبلی) ئیتر بۆیە ئەوانە بەکارەکەیان کامەران بوون و ئاوا بنچینە بەهێز و تۆکمەبوون وەک بنکەیەکی بەهێز. کە ئەوانیش پەیڕەوانی ئاینی ئیسلامن بەڕاستی و پاکی واتە (گەدا)یەکانی مەبەستە.

دیسان تاکی دوایی پەیوەستە بەبابەتی ڕاگەیاندنی مەستییەکەی ئێرە و لەویشدا درێژە بەبابەتەکە دەدات.

٤٣- لەم تاکـە هەڵبەسـتـەی سـەرەوەدا (کوردی) ئەو (گەدا)یانەی لە چوار جـۆرە (بارودۆخ)دا ڕاگەیاندوون وەک:

١- غافل: بێ ئاگا. ئەمەیان باری یەکەمیانە کە بێ ئاگایی (گەدا)یەکانە لە از خویش: (لە خـۆ)، کـە فـەرمووییەتی ئەوان لەم (باری) یەکەمـەیاندا ئاگاو هۆشیـان بەلای خـۆیانەوە نەماوە، بەهۆی ئەوەوە ئەمـەندە خـۆیان (بناغـە) توند و تۆڵ بینیوە ئیـتر لە خـۆشییاندا هۆشیان لە خۆیان بڕاوە.

٢- بیخود: ئەمیش بارێکە کـە مرۆڤ تێی دەکـەوێ و لە باری سروشـتیی خـۆی دەردەچێ و بەهۆی ئەو (مـەست بوون) بەپەیڕەویکردنـەی بەئایەتی (الستُ)ەوە و لە سـەرخـۆشـیدا ئاوا هۆشی بەسـەر خـۆیەوە نامێنێ کە ئەم (بارە)یش و، هەرچوار جـۆرە بارەکە دەروێشـیـان

وەک (حاڵەتێکی کێشراوی) یا (کەمەندکێشکراوی) وەک خۆیان ناوی دەبەن بە(جەزبە) کە بەسـەریاندا دێت و دەچێتـە باری چەشنە لە هۆش خـۆ چوونێکەوە بەو سـەرخـۆشـیـیـە گیانییەیان.

٣- واقیف: ئاگا، وریا، هەستیار لە (روم) کە هەرچەندە (روم) مەبەست لە عوسمانییەکانە، چونکە ئەوان جێنشینی (ڕۆمانییەکان) بوون. مەبەست لە (پێست سپێتی)ی (ڕۆم)ە کە بەڕەگەز (ئاری)ن و وەک هێما (رەمز)ێک ئەو ڕەنگی (سپی)یە نیشانەیە بۆ ڕووناکی و ئەویش ئەو (پەڕتەوم) و گیانییە کە لە تاکە هەڵبەستی پێشتری ئێرە (٤٠)مین دا لێی دوام و کاری کردبووە. گەدایەکان.

ئەوەتا لێرەدا (کوردی) کارەکەی بۆ والا کردووینەتەوە کە لە دووباری (یەکەم - غافڵ) و (دووەم - بێـخـود)دا: (گـەدایەکـان) لە هۆش خـۆ چوو و، بـێ ئاگـابوون بەڵام لە باری (سـێـیـەم)دا کـە گـەدایەکـان بەئاگـا لە(پەڕتەو کـە مـەبەست لە ڕووناکی)یا ڕێبـازە ڕۆشنکراوەکەی ئیسلامە و لەمەیان ئاگەدارن و بەدڵ و گیان لێی جیانابنەوە چونکە مایەی کامەرانی و مەستییە گیانییەکەیانە.

٤- آگە: ئاگەدار، زانەری (زەنگ)ن ئەم ئاگەدارییەی (گەدایەکان) دیسانەوە وەک ئەوی پێشوو (باری سێیەم) هەر رمزییە، چونکە وشەی (زەنگ)کە بەواتە (زنگ : زەنگوڵە)یا مەبەست لە (کەڕەناکەی) فریشتە (ئیسرافیل) واتا (نەفخی صوور) بێ کە لە ڕۆژی قیامەتدا، لێی دەدات و هەمـوو مـردوو، زیندوو دەبنەوە، بۆ چوونە دەشتـی (مـەحـشـەر)و بارەگـای داد پرسـیی خـوای مـەزن لـە ڕۆژی قیـامـەتدا ئەمـەیان بەلێکدانەوەیەکی ڕاست دەزانم کـەوا (کـوردی) ئەو گـەدایانەی لەم (باری چوارەمـدا) بەئاگـاو دڵ وریا. لە لای ئەو زەنگ لێدانەوەن. خـۆ ئەگـەر لە واتایەکی تری وشـەی (زەنگ) بگەڕێین ئەوا نە ئەوی (زەنگی) زەنجی لە قولە ڕەشەکانی (زەنجبار)ی کیشوەری (ئەفەریقیان) و جاری تر لەم پەڕاوەدا بەوردی تر و بەدرێژ تر لێیان دواوم ئەوا لێرەدا مـەبەست لە تاریکییـە کە ڕەمزی ڕەشی لەش زەنگییـەکانـە ئەویش بەپێی بڕوای (بەرەی خـێـر) کـە خـوایی و (بـەرەی شـەڕ) کـە (شەیتانی)یە ئەمەیان (ڕەشێتی)ی ڕەمزەکەیە کە ئەو گەدایانە هەمیشە ئاگەدار و وریای ئەوەن کـە شـەیتـان بەسـەریاندا زاڵ نەبێ یا (نـەفـسی شـەیتـانی - نەفـسی ئەممارە) دەسەڵاتی بەسەریاندا نەبێ و هەربەرەی ڕووناکییەکە (بەرەی خواییە)کە بگرن.

ئەم تاکە هـەڵبـەستـە لە زنجـیرەی تاکەکانی (حـەوت بەندەکە)دا (٤٣)مین و بەپێی ئەم بەندی دووەمیش (٢١)مین تاکە و لە سـەرچاوەکانی (ص، ف، ق/ ٣، گل/ ٥)دا نییـە و لـە (صـا، ط، مک، نم/ ١)دا (١٣)مین تاکـە ولە (ج، جم، سـجـا، نع)دا (١٤)مین و لە (بـا/ ١، حم، گل/ ٣، گل/ ٦)دا (١٥)مین و لـە (شح)دا (١٦)مین و لـە (مـــا/ ١، مع)دا (١٧)مین تاک و لـە (ن)دا (٢٠)مین تاک ولە (عن، س، ه)دا (٢١)مین تاکی ئەم بەندی دووەمـەیە و لە (گل/ ٨)دا (١٩)مین تاکە.

زنگ کـە لە (ط)دا نووسـراوە: (رنـگ) دیارە هەڵەی نووسـینـەکە (نـوخـتـەی) بـۆ پیـتـی (ر)یەکـە نەکردووە.

**واتای گشتی:**

ئەو گەدایانە ئەگەرچی مەستی بەهرەدەرییەکانن و (غافڵ)ی و (بیخود)ییان لەو مەستییەدا وەک حاڵی دەروێشی بەسەردا هاتبێ، بەڵام هەمیشە لەسەر ڕێڕەوی خۆیان بوون بەوریایی و هۆشدارییەوە.

٤٤- بی صفای: بەبێ کراوەیی، بەبێ گەشی، بەبێ خۆشی، بێگەردی، بەبێ شادمانی.

هوای: ئارەزووی، خواستی، سازی، ئاوازی.

دلجویت: پەسندت، (دلجو) : پەسند، دڵویست، دڵخواست، خۆشەویست، هەڵبژاردە، دڵخواز، دڵسۆز، چاودێری).

مەبەست لەم نیو باڵی یەکەمی تاکە هەڵبەستەی سەرەوە ئەوەیە؛ کە ئەگەر گەشی و بێگەردییە دڵکێشـەکەی تـۆ (ئەی پێغەمبەر -د.خ) لە ئارادا نەبێ ئـەوا (تەواوکەری ئـەم گریانـەیە) لەم نیوباڵی دووەمەدایە کە:

خفە: تاساو، نیمچە خنکاو هەناسە و بێن تەنگ، (واتە خەڵکی هەموو ئاوەهان تاساوەن...)

بندگان: کۆیلەکان و مەبەستی لە هەموو خەڵکییە و ئەم خەڵک بە(بەندە : عەبد) دانانە لە بیرو باوەڕی ئیسلامەوەیە کە خەڵکی هەموو بەجارێ ئازاد و سەربەست و سەربەخۆن و تەنانەت لەسـەر زەمینیش شـوێنگر خـەڵیفـەی خـوای مەزنن و تـەنیا بەندە، عـەبدی خـوای مـەزنن بەو واتایەی کە (عبد) دەبێ هەر خوا بپەرستن و عەبدی ئەوبن و بەس.

ئەمجا (کوردی) ئەو خەڵکە تاساوانەیشی بە(بەنگ ڕەنگ) ناوبردوون واتە ڕەنگ و ڕواڵەت و، شێوەیان (بەنگ ئاسایی)یە و (بنگ)یش وەک لە تاکە هەڵبەستی (٤١)مینی ئەم تاکە (حەوت بەندە) واتە لە (١٩)مین تاکی ئەم بەندی دووەمەدا لێکم داوەتەوە کە بەواتە (حەشیشە) و سڕ و بێهۆشکارە، ئەو خەڵکانەش (بەندگان) بۆیە سڕ و بێهۆش و تاساو و تەنگەتاون، چونکە ڕووی چاودێری و دڵسۆزی پیغەمبەریان لێرە نییە؛ چونکە بەفەرمایشتی خواو دەقە ئاینییەکان (ئیسلامەوە) بەندیوار نین و پەیڕەوی ناکەن.

بنگ رنگ : بەنگ ئاسایی.

لە هەموو سەرچاوەکاندا ئەم تاکەی سەرەوە چونیەکەو جیاوازی لە وشەکانیدا نییە.

**واتای گشتی:**

کوردی وەک لە هەموو تاکە هەڵبەستەکانی پێشوودا لە بەندیواریی (گەدایان)دواوە و، کە دوای کـردەوە و فـەرمـایش و ڕاگـەیاندنەکـانی (پێـغـەمبـەری ئیـسـلام - د.خ) کـەوتوون و بەشـاد و کـامـەرانی و شکۆدار ناوی بردوون بەڵام لەم تاکـەی سـەرەوە لەوانە دواوە کـە هەڵسوکـەوت و بیروبڕوای بەندیوارییـان وەک (گەدایان) نییە و ئەوەتا ئـەوانی بە (تاساو) و (بەنج) کراو و بێ ورە ناو بردوون.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی زنجیرەی تاکەکانی ئەم (حەوت بەندە) (٤٤)مین تاک و بەپێی ئەم بەندی دووەمیش (٢٢)مین تاکەو لە سەرچاوەکانیشدا بەم جۆرەیە:
لە سەرچاوەکانی (با/ ١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، ق/ ٣، ف، گل/ ٨، مک، نم/ ١)دا نییە و لە (مع)دا (١٤)مین تاک و لە (نع)دا (١٥)مین و لە (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦)دا (١٦)مینە تاک و لە (شح)دا (١٧)یەمین و لە (ما/ ١)دا (١٨)مین تاک و لە (ص، ن)دا (٢١)مین تاک و لە (عن، مس، ه)دا (٢٢)مین تاکە.

٤٥- از گدایان: لە گەدایەکانیشەوە، واتە بەرامبەر بەو تاساوانەی لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا، دەستەی پەیرەویکارانی دەقە ئیسلامییەکان و پێغەمبەرویستەکان:
بەشور (بە شووری): بەشووری : بەدەم ساز و ئاوازی یەکێ لە مەقامەکانەوە کە ناوی (شوور)یا (شور)ە دژی ئەو تاساوانە لە بەرزکردنەوەی دەنگی زیکر و بانگ لە خواکردنەوە کە:
های و هو کە سووککراوەی دەنگی زیکری (حەی) (هەر زیندوو)وە.
هو : ئەو کە مەبەست لە خوایە لەسەر سازی (نەغمەی) مەقامی (شوور)کە دا دەچڕن، چونکە شکۆمەند و کامەران و شادن نەک (تاساو)ی خوانەناسی.
هرکە: هەریەکی لە وان (لەگەدایەکان)
با چنگ و (با چەنگ و) لەگەڵ چەنگداو ئەگەر بەواتای ئامێری مۆسیقای (جەنگ) بێت و، یا (با چنگ) بەچنگ، ئەگەر دەست و پەنجەی مەبەست بێ، کە چەپڵە ڕێزانە لە خۆشی و ئاهەنگگێرانی شکۆداری و کامەرانییەکەیانەوە.
(دنگ): ئەم وشەی دەنگی (یەکەم)ەکەیان بەواتە، (دەنگ) و (ئاواز) لێوە هاتنەوەیە کە مەبەستی ئەوەیە لەگەڵ لێدانی ئامێری مۆسیقا (چەنگەکە)دا با بەدەم چنگ لەپ بەیەکامالێن (چەپڵە لێدان) و (چنگ): پەنجە تەقاندنەوە بە(دنگ)یش گۆرانی بلێن... لێرەدا هەم دەنگی مەقام (گۆرانی)ی جۆری (شور)ەکەو هەم بەکارهێنانی مۆسیقای (چنگ)یا تەقەی چەپڵە ڕێزان و پەنجە تەقاندنی هەردوو یەک خستوون.
نی : نە، نەء، نا، نانا. واتە هەر (دەنگی) گۆرانی و (مەقام) نەک:
(دنگ): ئەو وشەی دووەمین جاری (دەنگەیان) واتاکەی زۆر جیایە لە وشەی (دەنگەکەی)یەکەم کە لێرەدا:
(دنگ): کەودەن، بلّح، دەبەنگ، حەپۆڵە. واتە دژی (هۆشیاری) و تێگەیشتوویییەو، مەبەست لەوەیە گەدایەکان تێ گەیشتوون، نەک حەپۆڵەو دەبەنگ و کەودەن کە دەبەنگن کەودەنی و حەپۆڵەییەکە مەبەستی لە (تاساوەکانی) تاکە هەڵبەستی پێشووە کەواتە ئەم تاکە هەڵبەستە، وەڵام یابەراوەژووی ئەو تاکە هەڵبەستەی پێشووە.
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی (حەوت بەندەکە) (٤٥)مین و بەپێی ئەم بەندی دووەمە (٢٣)مین تاکە و لە سەرچاوەکانیاندا کە لە (با، ج، جم، سجا، شح، ط، ف، ق/ ٣، ما/ ١، مک، نع، نم/ ١)دا

نییە ولە (صا)دا (١٤)مین تاک و لە (مع)دا (١٥)مین تاک و لە (حم)دا (١٦)مین و لە (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦)دا (١٧)مین تاک و لە (ص، ت)دا (٢٢)مین و لە (عن، س، ھ)دا (٢٣)مین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە:

**جیاوازییەکان:**

از گدایان بەشور لە (صا، مع، حم)دا نووسراوە:

(در چنین حالتی): لە بارێکی ئاوەھاییدا – ئەمەش دەگونجێ.

(بە های و هو) لە (مع، گل/ ٣)دا نووسراوە (بەھای و ھوی) کە سووککراوەی (حەی) و (ھو)ە کە مەبەست لە خوایە.

(هرکە با) لە (ص، حم، مع، شح)دا نووسراوە: هرکرا : ئەمەش دەگونجێ بەڵام (هرکە با)یەکە دروستترە.

(چنگ) لە (گل/ ٣، حم)دا نووسراوە (زنگ) بەڵام ئەمیش ئەوەندەی (چنگ)ەکە بەھێز نییە چونکە (زەنگ) ئەو ئامێرە مۆسیقییە نییە کە بووبێ بە(باو) تاکو لێ بدرێ لەئاھەنگدا.

ئەو وشەی (نی : نێ)یە بە(نەی : شمشاڵ) ناخوێندرێتەوە لەم تاکەدا.

**جوانکاری:**

بەجیناس ئارایی ھاتنی دووجار وشەی (دەنگ) و ھەریەکەی بەواتایەکی جیا لە یەکترییەوە، ھێنانی وشەی (چنگ) و (دەنگ) جوانیی وێژەیی لەم تاکەدا ھەیە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

**واتای گشتیی ئەم تاکە:**

ئەم تاکە ھەڵبەستە بەرامبەر بەتاکە ھەڵبەستی پێشووە کە لەویدا لە گومڕایان و خوا نەناسان دواوە، کە لە باری ژیانی تاساویدان.

بەڵام لێرەدا بەپێچەوانەی ڕێوە باس لەگەدایان دەکاتەوە کە بەھۆی پەیڕەویکردنی دەقە پیرۆزەکانەوە لە باری ژیانی کامەرانی و شادمانیدان و لە گۆرانی گوتن و بەکارھێنانی ئامێرە مۆسیقییەکاندان، ئەوەش لە وریایی و تێگەیشتنیانەوەیە نەک وەک ئەوانی تاکی پێشوو ئەوەتا لەم تاکەی ئێرەدا بە(دنگ) واتە (کەودەن) و (بلّح) ناوی بردوون.

لەم واتای ئەم تاکەی سەرەوە درێژی داوە ھەتا کۆتاییی ئەم بەندە لەم چەند تاکە ھەڵبەستەی دواییدا.

٤٦- گوش: گوێ، گوێچکە، گوھ، مەبەست لە (بیستن)ە.

سوی: بەرەو لای. بۆ لای، ئەلای، مەبەستی لەو شوێنەیە کە دەنگەکەی لێوە دێت جگە لە دەنگی گۆرانییە ئاینی (سرورد) زیکرکردنی (گەدا)یەکان، بەدەم ئامێری مۆسیقە لێدانی خۆیانەوە.

سروش: (فریشتە)و ھەروەھا (سرووش) مەبەست لە (جبرەئیل)ە کە تەنیا ئەوە بوو ئایەتەکانی (قورئانی پیرۆز)ی لە خوای مەزنەوە بەپێغەمبەری خۆشەویست ڕادەگەیاند لەگەڵ فەرمایشی تری خوادا. (کوردی) لێرەدا لەو گەدایانە دواوە لەو بارەیاندا کە لە ھەڵبەستی پێشوودا

ئاشکرای کــردوون ئەوا لێــرەدا ئەو گــەدایانە (گــوێ)ی دەروونیـــان بەلای ئەو ئایەت و فــەرمـایشــتـانەوەیە کـە جـبـرەئیل هـێنابوونی و خـۆشـیـیـان لێ وەردەگـرن و لەو ئاهەنگە کامەرانییەی خۆیاندا کە:

دف درکف: ئامێری مۆسیقای (دەف)یان لە ناو لەپی دەستدایە.

دەف: یەکێکە لەو ئامێرە مۆسیقییانەی کە بەلەراندنەوە و پێدا ماڵین دەنگ دەدات.

در کف: (لەپی دەست).

نای بەکوردی و فارسییش هەر (نای)ی پێ دەگوترێ و یەکێکە لەو ئامێرە موسیقییەکان.

بانای: (با : لەگەڵ) و (نای) لێرەدا ئەم وشـەی (نای)یە هەمان واتایەکەی (نای)یەکەی پێشوو نادات کە لێکم داوەتەوە.

بەشکو لێرەدا (نای) بەواتای (گەروو)، (گەلوو)، (قـورگ) دێت و مەبەست لەوەیە کە فوو کـردن بەنایەکەدا لە (قـورگ)ەوەیە کە فووی قورگ (نای) لەسـەر (نای)ی ئامێرە مۆسـیقاییـەکەیە، کە بەسازو ئاوازی ویستراوی تایبەتەوە دەبیسترێت بەدەم لێدانی (دەف)و:

چنگ: ئەم جـارەی ئەم وشـــەیە مــەبەست لـە چنگ و لەپ و پـەنجـەکـانـە بۆ لێـدانی ئامـێـری مۆسیقای (چەنگ).

بر چنگند: واتە پەنجەکان لەسەر ئامێری مۆسیقی (جەنگ)ەکەن.

چنگ: ئەمجارەیان ئـەم وشـەیە مەبەست لە ناوی ئامێری مـۆسیقای (چنگ)ەکـەیە کە بەعارەبی (قیثارە) و بەئینگلیزی (هارپ: Harp)ی پێ دەوترێ.

**هەڵسەنگاندن:**

(کوردی) لە بەکارهێنانی دووجاری هەریەکێ لە وشە (نای) و (چنگ)دا کە هەر جارەیان واتای جـیاواز لەوی تری دەدات جـیناس ئارایی بەکارهێناوە، کـە جـوانییـەکی وێژەیی هـەڵبـەسـتی کلاسیکییە.

ئەم تاکە هـەڵبەسـتـە بەپێی (حـەوت بەندەکە) (٤٦)مین و بەگوێرەی ئەم بەندی دووەمـە (٢٤)مین تاکە.

ئەم تاکە هـەڵبەستە بەپێی زنجیرەی ژمارەی لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

لە (ص، ف)دا نیـیـە و لـە (ق/ ٣)دا (١٣)مین و لە (ط، مک، نم/ ١)دا (١٤)مین و لـە (ج، جم، سجا، صـا، حم)دا (١٥)مین و لە (با/ ١، مع، نـع)دا (١٧)مین تاک و لە (شح، گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦)دا (١٨)مـین و لە (مـا/ ١)دا (١٩)مـین و لە (گل/ ٨)دا (٢١)مین و لـە (ن)دا (٢٣) و لە (عن، س، ه)دا (٢٤)مین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە.

جیاوازییەکان:

سروش، لە(مک، ط، ج)دا نووسراوە: (خروش).

(دف برکف) لە (گل/ ٨، گل/ ٦، مع)دا نووسراوە: (کف بادف).

(نای بانای) لە (گل/ ٣، گل/ ٥، جم، نم/ ١، با/ ١، مک، ط، ج)دا نووسراوە (نای برنای).

(نای بانای) و له (عن، گل/ ٦، گل/ ٨)دا نووسراوه (نای برلب) واتا (نای لەسەر لێو) (بر چنگند) لە (سجا)دا نووسراوە: (در چنگند)و ئەمیش لاوازی دەدات بەواتایەکەی لە(بر چنگند)دا ڕاستترە.

**واتای گشتی**

ئەو گەدایانە گوێیان هەڵخستووە بەرەو ئەو دەنگەی کە (فریشتە جبرەئیل) گەیاندی بەپێغەمبەر -د.خ-و هەر لەگوێیاندا دەزرنگێتەوە پێ بەپێی ناوەڕۆکی ئەو بیستنە هەندێ دەف بەدەستەوە و هەندێ (نای)ی بەسەر لێوەوە لە کۆڕی زیکر و سروود چڕیندا پێ بەپێی دەنگی دەف و نای و (چنگ)ەکەی کە بەدەست هەندێکی تریانەوەیە لە ئاهەنگی کامەرانی بەهرەوەرییەکەی خۆیاندا بەوەی ڕێگەی ڕاستیان گرتووە.

٤٧- از سرافیل: سرافیل ناوی یەکێ لە هەر چوار فریشتە مەزن زۆر لە خواوە، نزیکەکانە بەپێی دەقە ئاینە ئاسمانییەکان. ناوبردنی ئەم فریشتە (مەلائیکە)یە لێرەدا، لەوەوەیە کە خوای گەورە (ئادەمی) باوکی مرۆڤ دروست کرد و گیانی کرد بەبەراو، فرمانی دا کە فریشتەکان کوڕنووش (سەجدە)ی بۆ ببەن ئەم (ئیسرافیل)ەیان یەکەمینیان، بوو کە گورج کوڕنووشی (سەجدەی) بۆ (ئادەم) برد.

بەپێی بڕوای ئاینی ئیسلام هۆی ئەو دەستبەجێ کوڕنووش بردنە ئەوەبووە کە: (دیتوویە)، نووری پێغەمبەری ئیسلام بەباوکە ئادەمەوە دیار بووە، کە ئەو جۆرە خۆشەویستییەک بووە بەرامبەر بەو پێغەمبەرە -د.خ- (کوردی) کە لەم تاکە هەڵبەستەیدا ناوی ئەم فریشتەیەی بردووە، نیشانەیە بۆ ئەوە هەر لەو سەرەتای دروستبوونی یەکەم باوکی مرۆڤەوە، خۆشەویستی بەرامبەر بەو پێغەمبەرە دەستی پێ کردووە، کە ئەو سەرمەشقی سەر هەڵدانی (گەدایان) و پێغەمبەر دۆستان بووە. کە (کوردی) فەرموویەتی هەر لە خۆشەویستیەی (سرافیل)ەوە گەدایان خۆشیان ویستووە، هەتا (نەفخی صوور).

عشق: ئەڤین، خۆشەویستی. کە مەبەست لەوە (یەکەم) پەیابوونی (ئەڤین)ە بەئیسرافیلەوە بۆ گەدایان هەتا ڕۆژی قیامەت.

در یکدم: لە یەکدەمدا، کەوا دەستبەجێ، دوا بەدوای فرماندانی خوای گەورە بۆ کوڕنووش بردن بۆ ئادەم و گورج و لەیەک کاتدا بەدەم کوڕنووش بردنەکەوە ئەو خۆشەویستییە دیاری داوە، تا ئێرە هەر (ڕاڤەکردنی) نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستە بوو، کە لە نیوباڵی دووەمیشدا درێژە بەم باسی خۆشەویستییە و فەرموویەتی:

تا دم صور: هەتا دەمی (کاتی) فووکردنی (ئیسرافیل) بەکەڕەنا (صور)ەکەیدا کە ڕۆژی (قیامەت)ە، هەر ئەو دەنگ و باسانەی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر و، پەیڕەوکردنی ڕاگەیاندنەکانی و فەرمایشتەکانی خۆی و کردەوەکانی هەر لە درێژەدا دەبن و تا ئەو ڕۆژی حەشرە ئەم بابەتی بەندیوارییە بەو پێغەمبەرەوە وەک دواترین دەنگێک دەبێت کە (کوردی) خۆی فەرموویەتی.

واپسین دنگند: ئەو دەنگ و باسانە تا ئەو دەمی فوو کردنی بە(صور)ەکەدا هەرە دواترین دەنگن و هەر لە درێژەدا دەبن تا ئەوکاتە هەر دواییە کەلە نێوان ژیانی (جیهانی) و ژیانی (لەوەدوا) دەبێت.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە(حەوت بەندەکە)دا (٤٧)مین و بۆ ئەم بەندەی دووەمە (٢٥)مین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

(عەشق دەر یکدم) لە (عن)دا نووسراوە: (عشقرا هرگز) کە ئەمیش دەگونجێ.

(دەر یەکدەم) لە (گل/ ٥، گل/ ٦)دا نووسراوە: (درهردم : دەر هەردەم) وە ئەمیش دەگونجێ.

(دەنگەند) لە (ط)دا نووسراوە (رنگند): ڕەنگن. کە ئەمەش بەهەڵەی نووسینەوە ئەزانم بەڵام نووسەری (ج) لەسەر ئەم (ڕەنگەندە) نووسیویە: «لە ڕوونووسەکەی کاکە حەمە (مەبەست لە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم)دا –ط– رنگند–ەو هەڵەیە». منیش بەهەڵەی نازانم چونکە (ڕەنگدانەوە) ئەگرێتەوە.

**واتای گشتی:**

هەر لە کوڕنووش بردنەکەی (ئیسرافیل)ەوە بۆ باوکە (ئادەم) هەتا کاتێ کە فوو بەکەڕەناکەیدا دەکات (نەفخی صوور)، هەر سۆزوسازی کڵپە سەندنی ئەو عەشقە و تاکو ئەو دەقی دواترین دەنگە کە (ڕۆژی – حەشرە) هەرە دواترین دەنگ و ڕەنگدانەوەیە بووە دەبێت لە خۆشەویستی (پێغەمبەری ئیسلام –د.خ) کە وەک لە ئایەتی (٦٧) لە سوورەتی (زُمَرْ)دا هاتووە: (ثم ينفخُ فيه اخرى فإذا هُم قيام ينظرون) واتە (دیسان فوو بەکەڕەتایەکەدا دەکاتەوە و کە ئەوسایە ئەو کەسانە ڕاست بوونەتەوە لە نواڕیندان.

٤٨– مطربان: گۆرانی و سروود و بەستە بێژان و بەزم گێران و، (شادی) و (خۆشی) هێنەران.

ئەم وشە عەرەبییەی (موطربیان)ە کۆی (موطریب)ە.

خموش: خەمۆش، خامۆش، بێدەنگ، کپ، کڕ.

لە بەزم و ئاهەنگی گۆرانیبێژیدا باوە کە هەندێ لەو گۆرانیبێژانە تا دەتوانن گۆرانیی خۆیان دەڵێن و بەهۆی ماندوو بوونیانەوە، یا بۆ پشوودانێک لە گۆرانی بێژییەکەیان بۆ ساتێک، خامۆش دەبن و دوا بەدوای ئەوان هەندێکی تریان تێ هەڵدەچن و لەو ماوەی پیشوودانەی گۆرانیبێژەکانی بەر لە خۆیاندا دەکەونە گۆرانی گوتن و، یا دیسان هەر لە گۆرانی گوتندا (باوە) کە گۆرانیبێژان دەبنە دوو دەستەوە، سەرەتا دەستەیەکیان ئەچڕێ و دوای خامۆش (بێدەنگ) بوونی ئەوا، دەستەی دووەمیان هەڵدەداتێ و تێ دەچڕێ و پاش ئەوان دەستەی یەکەم بۆی هەڵدەسێ و دەچریکێنێ.

(کوردی) لەم نیو باڵی یەکەمی دوا تاکە هەڵبەستی ئەم بەندی دووەمەیدا هەمان نەریت و بەندو باوی بەم شێوەی دەربڕینی تایبەتەی خۆی ڕاگەیاندووە.

ئەوەتا کۆتاییی ئەم نیو باڵی یەکەمە بەم چەشنە دێنی و فەرموویەتی:

(نغمە سرای) ئەم وشە لێکدراوە کە بریتییە لە (نغمە) و (سرای).

نغمه: ئاوازی خۆش، دەنگی خۆش، ساز، سروود و ئاهەنگ، تەرانە، نەوایە.
(سرای): نەغمە خوان، ئاواز خوان، سروود بێژ، ئاهەنگ ساز، تەرانە خوان، بێژەری نەوا، چڕینی گۆرانی.
کەواتە:
(نغمه سرای) گۆرانی بێژ (موطریب)ەکەی مەبەست بووە.
(کوردی) لەم نیوباڵی دووەمەیدا فەرموویەتی:
باخروشی چنین: (با: لەگەڵ)، (خروشی : جۆش سەندنێکی)، بەزمێکی، زەڵەیەکی. (چنین : ئاوەهایی) کە مەبەستی لە بەهاتنە جۆش و گەرمبوونێکی ئاوەهای وەک لە نیوباڵی یەکەم هاتووە، لە ئاوا بەزمێکدا.
در آهنگند: لە کۆڕی خۆشی و شادمانیدان لە ئاهەنگدان، لە بەزمدان، بەکوڵ و دڵەوە.
هەروەها (آهنگ) عەزم و ئیرادە، ئاواز، ڕەوش، نەوا، لەحن و، کێشی ساز و ئاوازە خوانییەکەیش دەگرێتەوە.
(کوردی) ئەم دوا تاکە هەڵبەستە دەبەستێتەوە بەو دووتاکەوە کە لە دوای هەر یەکێ لە حەوت بەندەکەوە دووبارە دەبنەوە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە حەوت بەندەکەدا (٤٨)مین و لەم بەندی دووەمەدا (٢٦)مین تاکە و لە هەمووانیشدا دوا تاکی ئەم بەندی دووەمەیە، جگە لەو دوو تاکەی لە کۆتایی هەر بەندێکیاندا دووبارە دەکرێتەوە بەزمانی فارسی و عارەبی.
شوێنی تاکەکانی ئەم بەندی دووەمە لە سەرچاوەکاندا بەم جۆرەیە: لە (نع)دا نییە ولە (ف)دا (١٢)مین و لە (ق/ ٣)دا (١٥)مین و لە (ط، مک، نم/ ١)دا یەمین تاک و لە (ج، جم، سجا، صا)دا (١٧)مین ولە (با/ ١، مع)دا (١٨)مین و لە (حم)دا (١٩)مین و لە (شح، گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦)دا (٢٠)مین تاک و لە (ما/ ١)دا (٢١)مین و لە (گل/ ٨)دا (٢٣)مین تاک و لە (ص)دا (٢٤)مین و لە (ن)دا (٢٥)مین تاک و لە (عن، س، ه)دا (٢٦)مین تاکی ئەم بەندی دووەمەیە:
**جیاوازییەکان:**
(مطربان) لە (عن)دا نووسراوە: (مطربانرا).
(نغمه سرای) لە: (نم/ ١، سجا)دا نووسراوە: نغمه سرای.
(نەغمە سورای) لە (ف)دا نووسراوە (نەغمە سرای)
(با خروشی) لە: (صا)دا نووسراوە: (با خموشی)، کە ئەمەش هەڵەو دووبارەیە.
لە: (ج)یشدا نووسراوە: (لە ڕوو نووسێکا – باخموشی –یە).
(دەر اهنگند) لە (ط، مک، ج)دا نووسراوە: هەم آهنگند – ئەمیش دەگونجێ و بەڵام چونکە ئەم (هم اهنگند)ە لە پاشبەندی تاکی چوارەمینی ئەم بەندی دووەمەدا هاتووە، بۆیە لەبەر دووبارە نەبوونەوە جێگیرم نەکرد.

**واتای گشتی:**

گۆرانیبێژان و ئاهەنگ سازان و خۆشی هێنەرەکان ئەمیان دەچڕێ و لە بێدەنگ بوونیدا ئەوی تریان تێ دەچڕێ و بۆی دەسێنێتەوە، لە ئاوا جۆش و خرۆشێکی گەدایاندا لە کامەرانی و لە خۆشی شکۆداریی خۆیان هەموو لە ئاهەنگدان.

بەکۆتاییهاتنی ئەم دوا تاکی بەندی دووەمە ئەو دووتاکە هەڵبەستە فارسی و عەرەبییە وەک لە کۆتایی هەریەکێ لە (حەوت بەندەکە)دا دووبارە دەبنەوە کە ئەوا لە دواوە دەیان نووسمەوە، بەڵام چونکە لە کۆتاییی بەندی یەکەمدا بەدرێژی لێکم داونەتەوە، بۆیە پێویست بەلێکدانەوەی جاری تر نابینم. دوو تاکە فارسی و عەرەبییەکە.

**کای دمت نغمةء سرافیلي،**
**موردِ واردات جبریلي.**
**أنتَ شمسَ الُهدى ونورَ الحَق،**
**أظهِر الحقَّ یا ظُهورَ الحقْ.**

## بەندی سێیەم

٤٩- باز از آیینه عکس پیدا شد
شاهد معنوی هویدا شد
٥٠- باز آن جذبه، از دل خاشاک
همچنان کهربا، کاه ربا شد
٥١- باز چون گرد پرتو اختر
جان سرگشته، راه پیما شد
٥٢- رهگذاری بەسوی کوه نور
در رهش گویی خود ثریا شد
٥٣- باز آن شمع بزم خلوت غیب
مجلس افروز محفل آراشد
٥٤- باز آن پرده دار پرده نشین
چهره بنمود و، عقل شیدا شد
٥٥- باز از عشق و شوق آن چهره
جان و دل مست و کام صهبا شد
٥٦- باز زآن نوشخند و شیرین وش
عالمی پر ز شور و غوغا شد
٥٧- باز از مهر و بهر آن شاهد
آنکه (کن) گفت و (کون) برپا شد
٥٨- شش جهت، چار مام و، یک جوهر
سه موالیدو، هفت آبا شد
٥٩- در میان (جمیع) مخلوقات
جلوهء پاک ذات (الله) شد
٦٠- با (سرود) و (درود) هر موجود
آشکار و نهان گویا شد

۶۱- به ظهورش، رسالهء آدم
تا مسیحا که مسح و الغا شد
۶۲- از ازل ثبت لوح شد هرگاه
به ظهوری که روح افزا شد
۶۳- گاه بر صورت خلیل آمد
گاه در جسم لات و عزا شد
۶۴- گاه چون شمع و گاه پروانه
گاه خورشید و، گاه حرباء شد
۶۵- (أرنی) گو به (طور) شوق آمد
پرتوانداز کوه سینا شد
۶۶- هدهدی خبر به ملک سباء
بردو چون جم به تخت صنعا شد
۶۷- همچو (روح القدس) پیام از خویش
داد وانگه به شکل عیسی شد
۶۸- همه آماده باش هنگامی
کاندران (خاتم) امر فرما شد
۶۹- نسخ ادیان و ختم آنها کرد
نور یزدان که شاهد ما شد
۷۰- آن گدائی که ریزه خورش بود
گشت و مستغنی ملک دنیا شد
۷۱- مدتی در رکاب بندهء خویش
مهتری کرد و باز، مولا شد
۷۲- گه ز دنبال ناقه چون (مجنون)
گه به محمل نشست و (لیلا) شد
۷۳- جلوه گر شد به صورت وامق
برقع افگند و عین عذرا شد

٧٤- ساقی بزم میر مجلس بود
باز چون باده سوی مینا شد
٧٥- پس از آن جان بەرقص وگردش سار
برج گردان و، کوکب آسا شد
٧٦- طوطی طبعم از خموشی رست
باز شکر شکست و گویا شد
٧٧- بر سر شاخ (سدر) از دم روح
این سخن بر زبانم القا شد

............................................................

٤٩- (کوردی) لە سەرەتای ئەم بەندی سێیەمەیدا، وەها (هزر)ی کردووە کە لە گیانی خۆیدا خۆشەویستیی پێغەمبەری وەک پەرتەوێکی گیانی ڕەچاو کردووە و کە ئەو پەرتەوەیەش ئەوەندە ڕووناک بووە وەک ئاوێنە وەهابووە و لەو ئاوێنە پەرتەوییەدا وێنەیەک، دیمەنێکی لێ دەرکەوتووە کە ئەو دیمەنە (لە ئاکامی زۆر بیرکردنەوە لەو (پێغەمبەرە) و دیمەنەکەی - دیمەنی (عەکسی = وێنە) ی خودی پێغەمبەر - د.خ - بوو.
(کوردی) ڕازی ئەم بەندی سێیەمەی بەم (هزری خۆ) دەربڕینەی داداوە و، کە فەرموویەتی:
باز (باز): دیسانەوە، هەمدیسان، ئا ئەوا، هەمدیس.
از آیینە: لەناو، ئاوێنە، باڵەبان، قـۆدیک - کە مەبەست لەم (ئاوێنە)یە پەرتەوی گیانی (مەعنەوی)یەکەیە کە (کوردی) بە ئەندێشە و هزری خۆی هاناو ڕەچاوی کردووە کە ئەویش پرتەوی خوایی، یا خواست (ئیرادە)ی خوایی بووە کە (کوردی) مان بڕوای پێی بوو. بەدڵ پەرستوویەتی.
(عکس) ئەم وشەیە گەلێ واتای جیا جیا دەدات، ئەوی بۆ ئەم شوێنەی هەڵبەستەکە بشێت ئەمانەن:
(عکس): وێنە، دیمەن، شێوە، تیشکدانەوە کە (تیشکی خۆر) بەر (ئاوێنە) یا بەر (ڕووی شتێکی بریسکەدار بکەوێت ئەو تیشکە دەشکێتەوە ڕووناکییەک دەداتەوە (إنعکاس) دەکات وەکو پەرتەوێک لەو ڕووی ئاوێنەیە، یا لە ڕووی ئەو شتەوە ڕەنگ دەداتەوە.
لێرەدا (کوردی) مەبەستی لەوە بووە. کە لەو ئاوێنەیەوە کە بە هزری خۆی ڕەچاوی کردووە، دیمەنێ یا شێوەیەک لە ئاوێنەکەوە (کوردی) ڕەچاوی کردووە.
پیدا: پەیا، دەرکەوتن، دیاری بوون.
شد: بوو، واتە ئەو شێوە یا دیمەن (عکس = صورەت)ە لە ئاوێنەکەوە لەبەر ئەندێشە و بیری (کوردی) دا پەیدابووە، هەستی پێ کردووە. ئەمەی تا ئێرە لێکدانەوەی نیو باڵی یەکەمی ئەم

تاكە هەڵبەستەی سەرەوە بوو، ئەمجا:
شاهد معنوی: كە (شاهد) بە عەرەبییەكەی واتای: (گەواهیدەر) دەدات و لە وشەی (شاهد)ە فارسییەكەوە واتای: (خۆشەویست، دڵخواز، دولبەر، وە دۆست) دەدات كە واتای هەردوو زمانەكەیش بۆ ئێرە دەگونجێن.
مەعنوی: ئەوی بدرێتە پاڵ (واتا)وە: واتایی، بەواتایی، ناوەوەیی (باطنی) ڕاستەقینەیی، گیانی، پشت پەردەیی.
معنوی: وشەیەكی سۆفییانەیە كە بەلایانەوە مەبەست لە (هێزی نهێنی، خوایی)یەو لە بەندیواری بە زۆربەی شتومەكی (مادی) ی (جیهانی و ئارەزووە شەهوانییەكانی جیا دەبێتەوە)- بە پێچەوانەی ڕێبازی (ماددی)یەوەیە.
هویدا شد: ئاشكرابوو، ئاشكرابوو، ئاشكار بوو، پەیدابوو، نومایان بوو، دیاریی دا، دەركەوت، كەوتەڕوو...
ئەمجا پەیدابوونی ئەو (شاهد)ە بەلای (كوردی)یەوە، چۆن لە ئاوێنەكەدا، وێنە (عكس) یا تیشكدانەوەیەك دەركەوت، هەروەها لەم نیو باڵی دووەمی تاكە هەڵبەستەی سەرەوە، دیسان (گەواهیدەرێكی) (حەقیقەتی عیرفان) وەیا (دڵخواز، خۆشەویستێكی) (پێغەمبەر ئاسایی) ئاشكرابوو كە بانگەوازی ئاینەكەی هەڵداو دەقە پیرۆزە ئاینییە ئیسلامییەكەی خستە ڕوو كە خودی ئاینەكەش دیسان (گەواهیدەر) ی (مەعنەوی)یەو، لەهەمان كاتدا (خۆشەویست): (شاهد) یشە بو باوڕهێنەران بە ئاینەكە. (كوردی) لەبەندی (یەكەم و دووەمی) ئەم حەوت بەندەدا ئەوە بوو (گەدایان) ی (نامزەد) كردبوو، ئەوەتا لێرەدا ئەو (عەكس)ە لە ئاوێنەكەداو ئەو شاهیدی مەعنەوییە هەر لەوان ئاشكرا بووەتەوە كە (كوردی) خۆی بە یەكێك لەو (گەدایان)ە داناوە.
ئەم تاكە هەڵبەستە بەپێی هەر حەوت بەندەكە (٤٩)یەمین تاك و بەپێی ئەم بەندی سێیەمە یەكەمین تاكە لەم سەرچاوەیانەی دواییدا:
ئەم تاكە هەڵبەستە لە سەرچاوەكانی:- (جم، حم، ص، صا، گل/ ٣) دا نییە و لە سەرچاوەكانی: (با/ ١، ج، سجا، شح، ط، عن، ف، ق/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، ما/ ١، مس، مع، مك، ن، نع نم/ ١،ھ) دا یەكەمین تاكی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**تێبینی:**

وەك لە جیاوازییەكانی نێوان سەرچاوەكانی ئەم تاكەدا و تاكەكانی تری ئەم بەندی سێیەمەدا دەبینرێت كە لەهەر شەش بەندەكەی تری ئەم (حەوت بەندە لە سەرچاوەكانیدا پاشوپێش و لاواز و شێواوی زۆرن، بەڵام تاڕادەیەكی چاك بەهۆی زۆریی سەرچاوەكانەوە توانیم نزیكتریان بكەمەوە لە دەقی گوتنەكەی (كوردی)یەوەو واتادارتریان بكەم و شوێنی خۆیانیان پێ بگرمەوە و زنجیرەی مێژوویی خۆیانیان پێ بگرمەوەو هێشتاش هەندێ تاكە هەڵبەستیانم بەلاوە تەواونین.

هەرچۆنێ بێ، بەپێی توانام و ئەوی بۆم کرا تیایاندا کردم و باجاریێ بەم جۆرەبن کە پێشکێشم کردن، بەشکو سەرچاوەی ڕاستترو کەم شێواوتر سەر هەڵبدەن و ببنە مایەی جێگرتنەوەی تاکەکانی ئەم بەندی سێیەمە.

**جیاوازییەکان:**

(باز از) لە (عن، ما/ ا) دا نووسراوە (بازدر) کە لە کێشدا گرانییەک وە لە واتادا لاوازییەکی پێ دەدات.

(عکس) لە (گل/٥، گل/٦، مع) دا نووسراوە: (عکسی) کە ئەمەش لەنگی و بێ واتاییە.

(از آیینە) لە (مک، ط، ج) دا نووسراوە، دل را چە، کە ئەمەش لەنگی و بێ واتاییە:

– بەڵام لەم سێ سەرچاوەیەدا لە (مک)ەکەیان دا بەپاڵ (دل را چە)کەوە نووسراوە: (نوسخە: این را چە) واتە لە نوسخەیەکی تردا نووسراوە (این را چە) کە هەمیسان لە (مک)دا بێ واتاییە و بگرە پێچەوانەی مەبەستیشە.

(معنوی) لە (ص، شح، مع) دا نووسراوە (باطنی) ئەمەش دەگونجێت.

واتای ئەم تاکە:

دیسان لە ئاوێنەی دڵەوە، تیشکدانەوە و دەنگدانەوەیەک پەیابوو و، یا لە ئاوێنەی پەرتەوی یا لە پەرتەوی ئاوێنەی بەهرەداریی پێغەمبەر د.خ – وە ڕەخسا، کە گەواهیدەری خۆشەویستی و دولبەریی لێ هاتەدی کە درێژەدەر بە ڕاگەیاندنی پێوەندیداریتری (گەدایان)ە.

٥٠– باز آن: دیسانەوە ئەو، هەمدیس، هەمدیسان ئەو.

ئەم (دوو) وشەی (باز): دیسان، و (آن) کە ئەم وشەی (آن)ەیان نیشانە بۆ وشەی (جذبە) کە:

جذبە: بەواتە: (کێشش، ڕاکێشان) ڕاکێشراوی کە ئەم وشەی (جذبة)یە لە ناوچەی سوفییەکاندا زاراوە (مصطلح)ێکی تایبەتە بە خۆیان و واتای وشەکەیان بەلاوە جیایە لە واتا زمانییەکەی.

ئەوا دیسان ئا ئەو (جەزبە)یە:..

از دل خاشاک : لە ناو خشتوخاڵ، واتە ئەو (جەزبە): بۆ دڵی وەک پلوپووش لێهاتوو بە جۆرێکە، کە:

همچنان: هەروەها، مانەندی هەروەک، وەک، بەوێنەی.

کهرباء: کارەبا.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەگوێرەی ژمارەی تاکەکانی (حەوت بەند)ەکە (٥٠)مین تاک و بەپێی تاکەکانی ئەم بەندی دووەمە (دوومین) هەرئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

لە (با، ج، جم، حم، سجا، ص، صا، ط، ف، ق/ ٣، گل/ ٣، گل/ ٥، مع، مک، نم، نم/ ١) دانییە لە (شح، عن، گل/ ٦، گل/ ٨، ما/ ١، مس، ن، ه) دا دووەمی تاکە هەڵبەستی سێیەمە.

**جیاوازییەکان:**

(آن) لە (عن، گل/ ٦) دا نووسراوە: زان: بەواتە لەوەوە، کە ئەمیش دەگونجێ.

(ئان جــذبە) لە (گل/ ٨ ، شح)دا نووســراوە: (ازان جــاذب) واتە لەو کــێـشــەرە – ئەمــیش دەگونجێ بەڵام (جذبە)ە کە بابەتیانەترو پڕترە.
دل: دڵ.
(همچنان) لە (عن، ما/ ١)دا نووسراوە: بمثل = بە مەثەل و دەگونجێ.
(کەهربا، کارەبا) لە (ن، ما/ ١) دا نووسراوە: کاەرِوبا کەهرەبا، ئەمیش پاش و پێش کرانە و لەوانەیە لە هەڵەی نووسینەوەیەوە بێ.
واتای گشتی:
دیسانەوە ئەو کێشش (جذبە)ی بەبیراهاتنەوەو خۆشەویستیی پێغەمبەرو بەندیواری بۆ ئیسلامەتی ئەمانە لەسەر دڵی وەک پلوپووش بەوێنەی کارەبا وەهان کە هەرچی زۆرتر پلوپووشی (دڵی) شەیدا کێشتر دەکەن وەک چۆن کارەبا کا ڕای دەکێشێ، ئاوەها دڵ و (گیانی منیش) بەرەو لای تۆ کەوتوونەتە باری (جذبە) = حاڵ لێهاتنەوە.
٥١- باز چون گرد: دیسانەوە هەر وەک گەردی.
گرد: گەرد، گەردیلکە – هەرکاتێ لە کونی (کلاو ڕۆژنە) یالە (دەرگا) و (پەنجەرە)وە، تیشک و ڕووناکیی (خۆر) خۆی کرد بە ژووردا، دەبینرێ لەو (لیسپ)ە ڕووناکییەدا، (بە پڕی) گەردیلکەی (ورد ورد) بەناو ڕووناکییەکەدا لە گەردو خول و سووڕانەوەدان.
پرتو اختر: ئەو لیسپە کۆڵەکەییە ڕووناکییە، لەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) بە (پورتەو)ەکەی داناوە و لە (ئەختەر) ئەو سەرچاوەی ڕووناکییەیەی مەبەستە کە (خۆر)ەکەیە.
لەبەرئەوەی لەزۆر شوێنی ئەم پەڕاوییەدا وشەی (پەڕتەو)م بەتایبەتی لە تاکە هەڵبەستی ژمارە (١١)ی بەندی یەکەمی ئەم (حەوت بەند)ەدا بە درێژی لێک داوەتەوە، بۆیە لەوەندە پتری لەسەر (ڕاناگەیەنم) بۆ ئێرە.
اختر: ناوە بۆ هەریەکێ لە ئەستێرانەی کە بەئاسمانەوە دیارن و بەتایبەتی بۆ کۆمەڵە هەساری خۆری (المجموعة الشمسیة). بەو هۆیەوە کە ئەو کۆمەڵە هەسارەیەش تەنیا (خۆر)ەکەیانە کە بەڕۆژ ڕووناکییەکی ئەوتۆ دەدات کە ئەگەر لە کونی (کلاوڕۆژنە) یا (دەرگا) یا (پەنجەرە) یا لە هەر کەلێنێکی ترەوە چووە ژووری خانووەوە، و ئەستێرەکانی تری ئەو کۆمەڵەیە ئەو کاریگەرییەیان نییە و یان لەکاتی ڕۆژیشدا هەڵنایەن، بۆیە مەبەست لەم وشەی (اختر) ئەم تاکە هەڵبەستە لە (خۆر)ەکەیانە.
(کوردی) لەنیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا، ئەوەی ڕاگەیاندووە کە: (ئەوا هەمیسان وەک گەردیلکەی ناو پەڕتەوی خۆر) و لەنیوەی دووەمی ئەم تاکەدا چارەنووس و ئەنجامی (گەردیلکە)کەی دیاری کردووە کە:
جان سرگشتە: گیانی سەرگەشتە، گیانی دەربەدەر و حەیران.
سرگشتە: سەرسام، سەرسوڕماو، ئاوارە. سەرگەردان، دەربەدەر.
(کوردی) کە (گیان)ەکەی بە: (سەرگەردان)، سەرگەشتە، سەرسام، و ئاوارە دەربەدەر

ناوبردووه مەبەستی لە (حاڵ لێهاتن)ەکەی تاکی پێشووە کە حاڵ لێهاتوو لە شوێن و جۆرو باری خۆیدا نامێنێ و دەکەوێتە بارێکی گیان پەروازکردنەوە وەک پەرواز کردنی بێ بڕانەوەی گەردیلکەی ناولیسپە ڕووناکییەکە وەهایە، کە دیارە ئەوسایە بەڕاستی سەرگەشتەیەو لە (تەوەرە)ی خۆی دەرچوو

راه پیماشد: ڕێگەی ڕێبازەکەی خۆی گرتەبەر

(ڕاه): ڕێگە، شەقام، (پیما) برە (برینی ڕێبوارانە) و شد: بوو. ڕێبوارو ڕێگەکەی خۆی وەک گەردیلەکی ناو (پەرتەو)ەکە گرتەبەر و پەرتەوەکەیش دەقە پیرۆزە ئاینییەکانە و (اختر)یش مەبەست لە سەرچاوەی ئەو (دەق)انەیە و (مووسا پێغەمبەر-د.خ-ئاسایی) لەحاڵەتە گیانی بێخودییەیدایە لە کاریگەریی ئەو (پەرتەو)ەوە وەک چۆن (مووسا) بە پەرتەوەکەی لای (چیا طوور) کەوت و بوورایەوە، ئەمیش: (گیانەکەی) ئەوەتا وەک شاعیر ڕای گەیاندووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی هەر حەوت بەندەکە (٥١)مین تاکەو لەم بەندی سێیەمەشدا (٣)مینەو لەسەرچاوەکانیشدا ئەم تاکە هەڵبەستەلە (با/ ١، ج، جم، حم، سجا، مک، ط، نم/ ١ ، صا، ف، ق/ ٣ ، گل/ ٣) دانییە و لە : (گل/ ٥، مع، نع) دا دووەمین تاک و لە (شح، عن، گل/ ٦، گل/ ٨، ما/ ١، مس، ص، ن، ه) دا سێیەمین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

جیاوازییەکان

(اختر) لە (عن، شح) دا نووسراوە: خورشید - کە خورشید ناوی (خۆر) و ناوێکی تایبەتییەتی و (اختر)ەکە پڕ بە پڕترە، چونکە (اختر) وەک لێکم دایەوە لەسەرەوە هەر تەنیا ناوی تایبەتی خۆی نییە، بەڵام هەرچی وەک وشەی (خورشید)ەکەیانە زۆرتر بەکارهێنراوە و لە (اختر) کەمترە.

(گرد) لە (ص، شح، ما/ ١)دا نووسراوە: کرد - ئەمەش ڕێنووسی فارسییە کە زۆرجار سەری پیتی (گ) نانووسن.

(سرگشتە) لەک (ص، نع)دا نووسراوە: سرکشتە = دیسان ڕێنووسی فارسییە

(جان) لە (ن) دا نووسراوە: (دل)

واتای گشتی:

ئەوا دیسان (گیان)ی سەرگەردان وەک گەردیلکەی ناو لیسپە ڕووناکی خۆر، کەوتە ڕێ، لە حاڵەتی (جذبە) ئاسایدا.

٥٢- رهگذاری: ڕێ گوزارێ، ڕێبوارێک.

بەسوی : بەرەولا، بۆلای، ئەلای.

کوه نور: کێوی پڕ ئەوین (نوور)، کە مەبەستی لە (گیان)ە ئاوارەکەیە کە لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا ڕاگەیەنراوە کە کەوتووەتە ڕێ و لێرەشدا ئەو (گیان)ە لە ڕەودایە بەرەو بارەگای (پێغەمبەر) کە وەک کێوێکی پڕ ئەوین پڕ لە نوورە.

در رهش: لە ڕێگەیدا، واتە ئەو (گیانە)ە ڕێبوارە لەو ڕێگەیەیدا، لە ڕێبازەکەیدا،

گویی: هەر دەڵێیت، دەڵێی.
خود: خۆی واتە خودی گیانەکە
ثریاشد: بوو بە سوورەییا واتە گیانەکە لە خۆشییاندا و لە پەڕتەوی (اختر) کە بەو ڕێگەی ڕووەو کێوی پرتەوینەوەیە هەر خودی خۆی بووە بە سورەییایەک
ثریا: وشەیەکی عارەبییە و کوردییەکەی (پەروین)ە کە (فارسیش بەکاری دەهێنێت و لەشێوەی (پەرڤیێی Pervie) دا بەکارهاتووە.
پەروین: ناوی کۆمەڵە ئەستێرەیەکی جریوەدارە لە ئاسماندا لە جووڵەدان و لەوانەیە تەنیا شەش دانەیان بەچاو دەبینرێن لەشێوەی (گەردانە)یەکدان و بە ڕووناک و تیشکدار ناسراون.
لەهەمان کاتدا (پەروین) بەواتا (چل چرا) کە بۆ ڕازاندنەوە و جوانی و ڕووناککردنەوە لە ژوورو ناو خانوودا بەکار دەهێنرێت و بە عارەبی بەمیش دەگوترێ (ثریا) ، کە مەبەست لە (چرا) و (لاله) و (لەمپا) و (فانۆس)ە.
ئەم تاکە هەڵبەستە بە پێی ئەم حەوت بەندە (٥٢)مین تاک و بە گوێرەی زنجیرەی تاکەکانی ئەم بەندی سێیەمینە (٤)مین تاکە و بەپێی شوێن و ژمارەی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
لە (با/ ١، ج، حم، سجا، شح، ص، صا، عن، ف، ق/ ٢، گل/ ٣، گل/ ٦، ما/ ١، مک، نـع، نـع، نم/ ١) دا نییە و لە (جم) دا یەکەمین تاک و لە (ط) دا دوویەمین و لە (گل/ ٥، مع) دا سێیەمین تاک لە (گل/ ٨، مس، ن،) دا چوارەمین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

(ڕهگذار) لە (نع) دا نووسراوە (رە سپاری) ئەمەش ناگونجێ
(بەسوی) لە(نع) دانووسراوە. برای = بەرایی دەگونجێ.
(نور) لە (گل/ ٥، گل/٨، ه) دا نووسراوە (تو) کە ناگونجێ
(خود) لە (ن، مس) دا نووسراوە: (چون) ناگونجێ
(خود ثریا) لە (حم، جم، نع) دانووسراوە (همچولالا) ئەمیش دەگونجێ بەڵام وەک ئەوی جێگرم کردووە گونجاو نییە.

**واتای گشتی:**

ئەو گیانەی کە کەوتبووە ڕێ و لە تاکی پێشوودا ناوبراوە لە ڕێبازەکەیدا بەرە و کێوێکی وەک مەشخەڵانی نوور ئەو گیانە ئەوەندە تامەزرۆی لە هەرچی زووترا گەیشتن بوو بەرێگەوە وەک بڵێیت، خۆی بوو بوو بە ئەستێرەی (پەروین)ی شەوقدار ئەو کۆی (نوور)ە مەبەست لە پێغەمبەر بووە کە گوایە لە نووری پێغەمبەرێتییەوە ئەو (نوورە)ی پێ داوەو لە داستانە ئاینییەکاندا لەو (نوورین) کردنەی زۆر باس کراوە.
٥٣- باز آن: دیسانەوە ئەو:
شمع: لەرووی زمانییەوە واتای (مۆم) دەدات، بەڵام بەپێی باری ئەم تاکە هەڵبەستە مەبەست لە

(چرا)و (لاله) لەمپای زۆر ڕووناکە کە کۆڕێکی گەورە ڕووناک بکاتەوە، چونکە (مۆم) ئەو ڕووناکییە زۆرەی نییە... و مۆم هێما (ڕەمز)ە بۆ ڕووناکی.
بزم خلوت غیب: (بزم: جەژن، کۆڕو کۆبوونەوی دۆستانەو خۆش ڕابواردن. (مجلس). کە دوور بێ لە ئارەزووە (شەهوانی)یە جیهانییەکان.
(خلوت = خەڵوەت، دوای بەڵێندانی دوو خۆشەویست دوو دۆست، بووە بەیەک گەیشتن لە شوێنێکی دیاری (پشت پەردە)یی دووبەدوویی دا و بەخۆشی بەسەربردن. (غەیب) ئەمیش لەلایەنی زمانەوانییەوە. واتای بەچاونەدیتراوی، گوم، شاردراوە، نهێنی دەدات، بەڵام بۆ ئەم شوێنە مەبەست لە بیروڕاو بۆچوون و ڕەچاوکردنی فەلسەفەی سۆنیانەیە کە ئەمیش واتای زۆر پانوبەرین و فراوان دەدات وەک (ئەسراری حەقیقەت) (حەقیقەتی عیرفان، چییەتیی خوای مەزن، بوونێتییە هەر بووە (ئەزەلی) و هەر دەبێ (ئەبەدی)یەکەی و توانایییە لە ڕادەبەدەرەکانی و کردگارێتی و بێ هاوتایی و بێ هاوبەشی.... هتد
هەروەها (غەیب) ئەو پێوەندییە کاریگەرەی نێوان (پێغەمبەر) یا (شێخ) و پەیڕەویکارانیان کە کاریگەرییەکی دەروونی و گیانیی نهێنییە و لە کاریگەریی واقیعانە بە تەوژم وتین و درێژخایەنترە.
جگە لەمانەش ئەم (بزم خەڵوەت غەیب)ە دەتوانێ بەنیشانەی ئەوە دابنرێت کە گیانە ئاوارەکەی وەک گەردیلکەی ناو لیسپە پرتەوی (مەعنەوی) کە بەکێش (جذب = کەمەندکێش) کرابوو سەرگەشتەیانەو ئاوارە ئاسایی بە ڕێگەی گەیشتنە ئەو ( مجلس)ەوە بوو کە بارەگا مەزنە شکۆدارە خواستراوەکەی بوو بۆ بەهرەوەرتر بوون.
(کوردی) لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا دەگەڕێتەوە سەر ئەو (مۆم) مەبەست لە چرا، لالە، چلچرا، لەمپایەی ناو نیو باڵی یەکەم و لە کاریگەریی تیشک و پەرتەوە زۆرەکەی ئەو مۆمە دەدوێ کە:
(أفروز): داگیرسێنەر، ڕووناککار، هەڵایسنەر، هەڵگیرسێنی ڕووناکی. واتە ئەو تیشکی (مۆم)ی سەرچاوەی ڕووناکییە کە ئەو (دیوان)ەی ڕۆشن کردەوە کە (بەزمی خەڵوەتە نهێنی – غەیبی)یەکەی تیا ئەنجام دەدرێ.
(شمع)ەکەش هەرچەند بە (چراو لالە و لەمپاو فانۆس و چلچرا) لێکم دایەوە، مەبەست لەگەڵێ (هێما = ڕەمز)ی صۆفیانەیە بۆ ڕووناکی و پەرتەو، وەک:
(شمع)ەکە: دەقە ئاینییە پیرۆزەکانە
(شمع)ەکە: خودی پێغەمبەرە کە هێنەری ئاینی ئیسلامی و ئەو دەقە پیرۆزانەو بڵاوکردنەوەیان کە ڕووناکی خستە جیهانەوە.
(شمع)ەکە: هەریەک لەو گەدایانە بووە کە گەیشتبوون بەو مەجلیسەداو، لەو بە هرەوەرییانەوە بە پەیڕەوی کردنی دروستی ئەو دەقانە، شکۆداربوون و.... و.... هتد
(کوردی) کۆتایی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی بەوە کۆتایی هێناوە کە ئەو تیشکی

(مۆم)ە:
مـحفل: شـوێنی ئاهەنگ تیا گێڕان دیوانی تیا کۆبوونەوەی خۆشی، جێگەی تیا گردبوونەوەی کەسانێکی زۆر بەخۆشی و شادی و دۆستایەتییانەوە کە ئەو شوێنە بەو تیشکی (مۆم) ڕووناک بوویێتەوە.
مـحـفل اراشـد: کـۆڕی بەزم و ئـاهەنگەکـەی ڕازاندەوە. واتە تیـشک و ڕووناکـیی (مـۆم)ەکـە ڕازاندیەوە، ئارایشی شـوێنەکەی دا ڕووناک و خـۆشی کرد. ئەم تاکە هەڵبەسـتـەی سـەرەوە لە (حـەوت بەندەکەدا بەگشـتـی (٥٣)مین تاکە و بەپێی زنجیرەی تاکەکانی ئەم بەندی سـێیـەمـە (٥)مین تاکە هەڵبەستە هەر ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
لە (ص، گل/ ٨، مـع) دانیـیـە و لە (جم، مـا، گل/ ٣) دا یەکـەمین تـاکە و لـە : (با/ ١، ج، جم، سا، ف، ق/ ٣، مک، نم/ ٢) دا دووەمین و لە (ط، نع)دا سێیەمین تاک و لە :(شح، عن، گل/ ٥، ما/ ١) دا چوارەمین و لە (مس، ن، ه)دا پێنجەمین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.
جیاوازییەکان:
باز ان لە : (عن، مع، مـا/ ١) دا نووسـراوە: بازان، ئەمـەش هـەڵەی نووسـینە کـە نیـشـانەی درێژەپێدان (مەددە) لەسەر پێی (ئەلفا – أ)ی دووەمینی وشەکە نووسراوە.
شـمـع لە (گل/ ٣)دا نووسـراوە: جـمـع = بێگومـان ئەمـەش هـەڵەی نووسـینەوە یا سێ خـاڵ (نوقتە)ی پیتی (ش)ە کە بەپیتی شینەکە نووساوە.
خلوت لە (گل/ ٥، گل/ ٨، شح) دا نووسراوە: جلوەء = ئەمیش ئەگونجێ مـەجلیس لە (مع) دا نووسراوە:
مەحفەل لە (مع) دا نووسراوە (مجلس) دیسان پاش و پێشە.
مـحفل لـە (گل/ ٣، مـا/ ١) دا نووسـراوە (مـحمل)، ئـەمیش بەجـۆرێک دەگونجـێ، مـەحـمـەل = بریتییە لەو بەرگـی (کابە = کەعبە)یەی کە بە دیاری لە وەرزی (حەج) دا لەگەڵ حاجییـەکاندا نێـردراوە، بۆ شـاری (مـەککە) کە ئەو بەرگـەی سـاڵی پێشـوو لابـبـرێت و بەرگـە تازە بەدیاری نێردراوەکە لە چوارچێوەکەی (کابە) بچەسپێنرێت.
واتای گشتی:
وەک لە سەرەتای لێکدانەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەوە بەرەبەرە واتای ئەم تاکەم بەوردو درێژی لە چـەند لایـەنێـکەوە لـێک دایـەوە بـۆیە ئـەم چـەند دێرەی دوایـی بـە (بـەس) دەزانم لـە واتـای ئـەم تاکەدا،
ئەو چـرای بەزمی (خــۆبەخــۆیی)یـە دیوانی ڕۆشـن کـردەوە لـەو (خلوت غــەیب)یەدا کــە (زار گـوت)ێکی سـۆفیـانەیە کـە مـەبەست لە بەیـەک گـەیشـتنێـکی (میـعراج) ئـاسـاییـیـە کـە لەپشت پەردەوە لە (سەدرەتولموونتەها) لە بارەگای خوادا بەهرەوەری گردبوونەوە بوو... هتد.
٥٤– باز آن پردەدار: دیسانەوە ئەو پەردەدارەی، ئەو کەسەی کە پەردەکەی بەدەست بووە.
پەردەداری (نەریتێکی کۆنی گەلانە کە پاشایان هەندێ جار کە بە هەندێ کەس گەیشتوون لە

(ماڵ) و (دیوان)ی خۆیاندا، نەیانویستووە ئەو هەندە کەسە (بیانبینێ) لەبەرئەوەی لەنێوان ئەو ژوورەدا کە (پادشا)ی لێ بووە پەردەیەک هەر لەمەلاوئەولای ژوورەکەوە و لەبنەوە تا (بن میچ)ی ژوورەکەی داپۆشیوەو، پاشا خۆی لە دیوێکی پەردەکە وەک ئەو کەسانەی کە پاشا نەیویستووە ببینن لە دیوەکەی تری پەردەکەوە بوون و ڕازونیازی خۆیانیان بەدەمی بە پاشا گوتووەو، پاشایش وەڵامی پێویست و گونجاو بە بەرژەوەندی خودی خۆی داونەتەوە.

پەردەدار: کەسێکی گەورەپیاوی ناوداری سەردەم بووە لە پایەیەکی بەرزی (ئەفسەری) یا (وەزیری) یا سەرۆکی تەشریفاتداو هێزێکی چەکداری تایبەتیی لەبەر دەستدا بووەو (ئەو) چاودێری ئەو جۆرە لەو دیوانی بەردەمەوە (پاشا) گەیشتنی کردووەو، دادانەوەو هەڵدانەوەی پەردەکەی بەدەست ئەو بووە، بەپێی خواستی پاشا.

سۆفییەکانی ئیسلامی ئەم نەریتی پەردەدارییە یشیان گواستووەتەوە بۆ ناو بیروبڕوای ئیسلامەتی و کەسێکی چاک و پاک و خوا بەڕاستی ناس بە (پەردەدار) ناوبراوەو کە (جیبرەئیل)ی سەرۆک فریشتەکان پەردەداری هەرە بەرزترین شوێن ئاسمانەکە (سەدرەتول مونتەها)یە وە (عەرش) و (کورسی) و (لەوح) و (قەڵەم)ی لێیەو تەنانەت لە چوونە میعراجەکەی (پێغەمبەر - د.خ) - دا هەمان نەریت و پەیڕەوی کراوەو کە گوتن و بیستن لەودیو پەردەوە ڕووی داوە.

(جیبرەئیل) هەرجارێک سرووش (وەحی)یی بۆ پێغەمبەر - د.خ هێناوە لەتاو شکۆمەندیی ئەو فریشتەیەو لەپیرۆزی ئەو ئایەتە قورئانەی کە هێناویە، پێغەمبەر لەو کاتانەدا لەرزێک گرتوویەتی و لەهۆش خۆی چووە کە لێرەدا (کوردی) ئەو لەرز لێهاتن ولە هۆش خۆچوونەی لەو دەرکەوتنی ڕوخساری جیبرەئیلەوە لێی پەیابووەو ئەو بێ هۆشی و لەهۆش خۆچوونەی بە (شەیدابوونی عەقل) ناوبردووە.

هەر لەبیروباوەڕی سۆفیگەریشەوە واتای تری ئەم پەردەوارییە هەن:

پردەنشین: واتا ئەوی لەودیو پەردەکەوە کە وەک بە (پاشا) و (خودی خوای مەزن) یش لێکمدایەوەو... کە پەردەدارەکە چاودێریی دادانەوەی پەردەکە دەکات.

لە زاراوەی سۆفییاندا نهێنیی ئەو (پەردەیە) بەلای پەردەدارەکەوەیە کە بە نهێنی شاردراوە یا بەگەنجینەی ئەسراری دەزانن کە ئەو لەبوون و نەبوونی (پەردە نشین) واتە لەودیو پەردەوە دانیشتوون ئاگەدارە.

چهرە بنمود: (پەردەدارەکە ڕووی خۆی دەرخست).

شیدا: شیفتە، ئەڤینداری، دڵداری، بوونی هەستی خۆشەویستی لە دەروونی کەسێکدا بەرامبەر بەکەسێ یا شتێکی ترو ئاواتەخوازی بەیەک گەیشتن و... هتد کە لێرەدا مەبەستی لە ئارەزووی (شەهوانیی جیهانی (نییە) و (عەشق)ێکی گیانی (مەعنەوی)ی مەبەستە.

لەکاتێکا (عەقل)ی کەسەکە (شەیدا)ی بوونی بەسەردابێت، ئەوە خۆی حاڵەتێکی کەمەندکێش (مجذوب)ییە یا (جذبة) گرتوویی یا (حاڵ لێهاتن)ە لە ئاکامی بینینی ڕووی پروین یا پرتەوی

(چیـهـره: ڕوخـساری) پێـغـەمـبـەری ئیـسلام – د.خ) داوە لـە مـیـعـراجـەکەیدا وەیا لەکـاتی بێـهۆشکەوتنەکەی (مـووسا پێغـەمبـەر–د.خ–)یە لە کێوی طووری سینا لـە حەژمـەتی بینینی پەرتەوە خواییەکەدا.

ئەم نیـشـانـە بۆ کـردنـانەی (کـوردی) هەمـوو لەپێناوی دەرخـسـتنی کـارو، ڕووداوە لە ڕادەبەدەریـیـەکـاندایە کـە هەمـوو لە چوارچێـوەی ژیان و پێـوەندی و کـاریگەریی گـیـانی (مەعنەوی)دان کە بەو چەشنە خۆشەویستییە گیانییە گەشە دەسێنن.

ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـە لە (حـەوت بەند)ەکـەدا لەلای من و بەپێی ئەوەندە سـەرچاوەی دەسـتم کـەوتوون (٥٤)مین تاکـە هـەڵبـەسـتـە و پێم وایە لـە بەدەسـتـهـێنانی سـەرچاوەی تردا تاکـە هەڵبەستی تر دەربکەون کە من تا ئێرەی ئەم (حەوت بەند)ە هێشتە دەستم نەکەوتبن.

هەروەها ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەی دواییە.

لە سـەرچاوەکـانی: (با/ ١، جم، سـجـا، ص، ف، ق/ ٣، گل/ ٥، نم، مک، نم/ ١) دانیـیـە و لە (حم، گل/ ٣، صـا) دا دوەمین تاک و لە (گل/ ٦، ط، نـع)دا چوارەمین و لە (شـح، عن، گل/ ٨) دا پێنجەمین تاکی بەندی سێیەمینەو لە (ج) دا سێیەمینەو لە(مس، ن، هـ، دا) (٦)مینە.

**جیاوازییەکان**:

چهرە، لە (گل/ ١) دا نووسراوە: چشم = چاو ئەمەش ناگونجێ.

چهرە، لە (گل/ ٨) دا نووسراوە: ڕوی = ڕوو: دەگونجێ.

چهرە، لە (حم، شح) دا نووسراوە: شعلە. هەر دەگونجێ.

شیدا، لە (ک، شح)دا نووسراوە: پیدا.

**واتای گشتی:**

دیسان ئەو پەردەدار (خاوەن نهێنی)یە خواییەیە کە بەدیار پەردەی (پەردە نشین)ەکەوە خۆی بەدەرخست و لە بینینی ئەو ڕوخسارە (عەقلی) بینەرانی گۆڕدرا بە دێوانەیی، وشێتیی ئەڤینی ئەو پەردەدارەو خـۆشـەویسـتـییـەکـەی کە مـەبەست لە جیـبـرەئیل بووە، بەنیـسبـەت خـواوە و پێغەمبەری ئیسلام بووە بەنیسبەت ئاینەکەیەوە.

٥٥– باز از عشق و: دیسانەوە لە عیشق و خۆشەویستی و ئەڤینی.

شوق: ئارەزوومەندی، گێژ لێ بوون. آن چهرە ئەو ڕوخسارە، ئەو ڕووە،

کام: بۆ ئێرە ئەم وشـەی (کام)ە واتای: (دەم، دەم و لێو، ناو دەم، مەڵاشـوو) دەدات ئەگەر چی زۆر واتای تریش دەدات و بۆ ئێرە ناگونجێنن.

صهبا: بادە، مەی.

ئەم تاکە هەڵبەسـتـەی سـەرەوە لە (حـەوت بەند)ەکەدا (٥٥)مین تـاک و لەم (بەندی سێ)یەمـەدا (حەوتەمین) تاکە هەڵبەستە.

جیاوازییەکانی شوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەڵگەی شێواویی ئەم بەندی سێیەمەیە.

ئەم تاکە هەڵبـەسـتـە وەک درێژە پێدان و تەواوکاری تـاکی پێشووە کە لە سـەرچاوەکانیـدا بەم

جۆرەیە:

لە (ط، ق/ ٣) دانی بەو لە (جم، صا، با/ ١، حم، سجا، ف، گل/ ٣) دا سێیەمین تاک و لە (ج، ص، نع) دا چوارەمین و لە (گل/ ٥، گل/ ٦، ما/ ١، نم/ ١، مع) دا پێنجەمین تاک و لە (شح، عن، گل/ ٨، مس، ن، مک)دا شەشەمین ولە (مس، ن، ه) دا حەوتەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

عشق و شوق لە (مع) دا نووسراوە: شوق و عشق – کە پاش و پێش کراوە.

جان و دل لە (مع) دا نووسراوە: دل و جان– ئەمیش پاش و پێش کراوە.

**واتای کشتی:**

هەمیسان لە زۆری و تین و تاوی خۆشەویستی و ئارەزووکردنی بینینی ئەو ڕوخساری دڵخوازەوە دڵ و گیان سەرخۆشی ئەڤینەکەی ئەون وبەشکو خودی دەم و لێو و ناو دەم و هەتا مەلاشوویش بوونەتە بادە (مەی). بە سەرنجدانی ئەم وردەکارییەی (کوردی) ئەوپەڕی خۆشەویستییەکە بەدەردەکەوێت و ئەمەتا ڕای گەیاندووە نەک هەرە بەخواردنەوەی ئەو بادەی (گرتنی ڕێبازەی خۆشەویستەکەی بەشکو تەنانەت (دەم و لێو) ناو دەمیشی بووە بە (بادە و مەی) لەپیرۆزی ئەو دەقە ئاینیانەوە، بەدەم و لێو دەریان دەبڕن دەم و لێوەکەی خۆی مادەی سەرخۆشکارە چ جای ئەو دەقە پیرۆزانە.

٥٦– باز ز آن: دیسانەوە لەو (لەوەوە).

نوشخند: زەردەخەنە، پێکەنین، بزە، بزەو پێکەنینی خۆش و جوان و شیرین و دڵگیری، دەم بە پێکەنین.

هەروەها وشەی (نوشخند) بەواتای (تریاک)یش هاتووە، کە خۆشیی مەست بوون بە (تریاک)ەکەیە، جگە لەوەی کە (نوشخند) بەواتای (ئاوی حەیات) یش هاتووە کە هەرکەسێ لێی بخواتەوە، گوایە نامرێت کە هەموو بۆ ئەم شوێنە دەگونجێن.

شیرین وش: لەچێژدا شیرین، جوان، قشت، خۆش، دڵگیر، نازدار. (وش) وشەیەکە چەندین واتا دەدات وەک، چاک، دروست، باش، خاس، هەڵبژاردە، شەنگ، خۆش، جگە لەمانە وشەی (وش) پێشگرە بۆ چەندین وشەی لێکدراوی وەک (وەش گوفتار، وەش ڕەوشت)و....

وش: ناوی جۆرە کراسێکی ئاوریشمی ساغ و نایاب و زێڕ بافتە

شیرین وش: شیرین ئاسا.

ئەم واتایانە گشتیان بۆ ئەم تاکە هەڵبەستە لەبارو گونجاون.

عالمی: جیهانێک

پرز: پڕ لە، تەژی لە، ئاخنراو لە.

شور: زەڵەو، زایەڵە، جۆش، خرۆش،... هتد لەلایەن دۆستانەوە.

غوغا شد: غەوغابوو

غەوغا: هەراوهوریا، ئاژاوە و پشێوی و... هتد لەلایەن دوژمنانەوە.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی زنجیرەی تاکەکانی ئەم (حەوت بەند)ە (٥٦)مین تاکە و لە زنجیرەی ژمارەی تاکەکانی ئەم بەندی سێیەمەدا (٨)مین تاکە.
شوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم چەشنەیە:
لە (ف) دا نییە و لە (حم، ق/ ٣، مک) دا سێیەمین تاک و لە (با/ ١، جم، سجا، ص، گل/ ٣، نم/ ١) دا چوارەمین و لە (ج، ص، ط، نع)دا پێنجەمین تاک و لە (گل/ ٥، گل/ ٦، ما/ ١، نع) دا شەشەمین و لە (شح، عن، گل/ ٨) دا حەوتەمین تاک و لە (مس، ن، ﻫ) دا هەشتەمین تاکە هەڵبەستە.

**جیاوازییەکان:**

باز زان لە (حم، ق/ ٣، مک، با/ ١، جم، سجا، ص، گل/ ٢، نم/ ١، ج، ص، ط، گل/ ٥، گل/ ٨، شح، ما/ ١)دا نووسراوە (باز آن) واتە (ز = زو)ەکەیان تیا نەنووسراوە و من بە هەڵەی نووسینی ئەزانم و لە (لەیەکتری وەرگرتنی هەڵە) وەیە، تەنیا لە (مع، عن، مس، ن، ﻫ، صا)دا بەڕاستی نووسراوە (باز ز آن). کە بەبێ ئەو (ز)ە واتایەکەی هەڵە دەردەچێت.
نوشخند لە (گل/ ٣، مع) دا نووسراوە (نوجوان ) کە ئەمیش هەڵەیە. هەرچەند دەگونجێ، چونکە بۆ ئێرە ناشێ. باز زان (گل/ ٥، مع، ما/ ١) دا نووسراوە:
(باز دران) ئەمیش لە واتادا کووڕە.
شیرین وش لە (گل/ ٦، نع، مک، ط، ج) دا نووسراوە (شیرینیش)- کە ئەمیش واتا نادات و دیارە هەڵەی نووسینە.
شیرین وش لە (جم) دا نووسراوە (شیرین لب) کە ئەمیش کەم هێزە
عالمی لە (عن) دا نووسراوە (عالمین) کە ئەمیش دەگونجێ.

**واتای گشتی:**

هەمدیسان لەو شیرین خەندەو دەم بە پێکەنینەو جوان و شەنگەوە جیهانێک پڕبوو لە جۆش و خرۆش و زایەڵەی خۆشی بەگوێرەی دۆستان و هەروەک لەلایەن دوشمنانیشەوە هەراوهوریاو ئاژاوە و پشێوی دوشمنانی و گومڕایان سەری هەڵدا دژ بە ئاین و ڕێگەی ڕاستین، و ئەم جیهان پڕ لەجۆش و خرۆش کردبە نیشانەی بۆ بڕوای ئیسلامییە کە جیهان لەبەر خاتری پێغەمبەری ئیسلام دروست کراوە کە: (لَولاكَ لَمَا خُلقتُ الافلاك)...
واتە: ئەگەر لەبەر تۆ لەبەر خودی تۆ نەبووایە، ئەم بوونەوەریانەم دروست نەدەکردن، کە ئەم بیرە لە تاکە هەڵبەستی دواییدا ئەمە ئاشکراتر دەکات.
٥٧- باز از مهر: دیسان لەبەر خۆشەویستی.
(مهر) لەپێش ئاینی (زەردەشتی)دا ئەم وشەیە ناوی گەورەترین خواوەندەکان بووە و (مهر = خورشید) ڕواڵەتی ئەو خواوەندە مەزنە بووە.
(مهر): بەواتا (مۆر)= (شەقڵ) کە ناوی کەسێکی لەسەر هەڵکەندراوەو، لەجێگەی (ئیمزا)ی ئێستە بەکارهاتووەو بەکاریش دێ، ئەم (میهر = مۆر)ە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری

ئیسلام (مۆری پێغەمبەرێتی) بەناو شانیەوە دیاربووە ئەم واتایانەو گەلێکی تریش بەرامبەر بە وشەی (مهر) هەن و لەگرنگترین و گونجاوترینیانم بەپێی ئەم شوێنە ڕاگەیاند و لەتاکە هەڵبەستی (١١)مین بەندی یەکەمی ئەم (حەوت بەند)ەشدا بەدرێژی تر لەم وشەیەو لێکدانەوەو واتاکانی و مەبەستی بەکارهێنانی دواوم. کە بەتێکڕایی پێوەندییان بە (پێغەمبەر–د.خ) وە هەبووە.

(بهر): لەبەر، لەبۆ، ژبۆ، پەی، ئەڕای، لەبەر خاتری،.... و پیتی (ی)یەکەی بەواتە (هی ئەو)ە آن شاه: ئەو دڵخوازە، ئەو دلبەندە، ئەو دوڵبەرە، ئەو دڵگیرە، ئەو خۆشەویست، جوان، و.... هتد. ئەمانە لەلایەک و لەلایەکی ترەوە (شاهید) بەواتە (گەواهیدەر) کە ئەمیش نیشانەیە بۆ (پێغەمبە– د.خ) کە گەواهیدەری ڕاستی و دروستی ئاینی ئیسلام و ڕاڤەکاری خوایەتی و پێویستێتی ناسینی بوو.

آنکە: ئەوی، ئەوەی، ئەڤی کە مەبەست خودی زاتی خوای مەزنە کەوا:

(کن گفت و):(کون گوفت و) فەرمووی: (کُنْ = ببە) کُنْ: ئەم وشە عەرەبیە نیشانەیە بۆ سەرەتای فەرموودەیەکی پیرۆزی خوای مەزن لە (ئایەتەکانی) ژمارە (٥٩،٤٧) لە سوورەتی (آل عمران) و (٧٣)ی سوورەتی (الأنعام) و (٤٠)ی (النحل) و (٢٥)ی (مریم) و (٨٢)ی (یس) و (٦٨)ی (غافر) و (١١٧)ی (البقره)، کە لە هەموویاندا ڕستەی پیرۆزی (کُنْ فَیکوُن) واتە: ببەو دەشبێت کە فەرموودەی خوای گردگارە.

(کوردی) مەبەستی لەم وشەی (کُنْ)ی ناو ئەم نۆ ئایەتەی قورئانی پیرۆزە کە خوای مەزن لەبەر خاترو لەخۆشەویستیی ئەو (پێغەمبەر – د.خ) فەرموویەتی:

کون برپا شد: جیهان و ئاسمان و ئەوەی تیایەتی دروست بوون.

برپا شد: پەیابوو، هاتەدی، پێک هات، دروست بوو، دامەزرا، بووە بوونێتی، هەر بەوەندەی خوای مەزن فەرمووی: (کون) واتابیەو ئەو کائیناتە هاتەدی، ئەویش لەبەر خاتری پێغەمبەری ئیسلام–د.خ– کە دواترین ئاینی پێ سپارد، وەک دواترین پێغەمبەرێک پەیامی پێغەمبەرێتی خۆی بەچاکی ئەنجام دا.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە تێکڕای حەوت بەندەکەدا (٥٧)مین تاک و لەم بەندی سێیەمەشدا (٩)یەمین تاکە و لە سەرچاوەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەشدا بریتین لە:

لە (با/ ١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، ف، ق/ ٣، مک، نم/ ١) دانییەو : (هی، نع)دا شەشەمین تاک و لە (گلە/، گل/ ٦، مع، ما/ ١) دا حەوتەمین و لە (شح، عن، گل/ ٩٨دا تاکی هەشتەمین و لە (مس، ن، هـ) دا نۆیەمین تاکە کە هەڵبەستی ئەم بەندی سێیەمەیە. و لە (گل/ ٣) دا پێنجەمینە.

**جیاوازییەکان:**

باز از (حم، ص)دا نووسراوە: (باز آن) کە ئەمەش یەکجار هەڵەو بگرە کفریشە، چونکە (پێغەمبەر) دەکات بەخوای بێژەری ئایەتی: (کُن فَیکون) دەبێ هەڵەی نووسین بێ.

مهر و بهری له (حم، ص، مع)دا نووسراوه (بهرومهر) ئەمیش پاش و پێشەو دەگونجێ.
آنکه له (مع، گل/ ٣) دا نووسراوه: زانکه- ئەمیش واتایەکە لاواز دەکات.

**واتای گشتی:**

دیسان لە خۆشەویستیی فەرمانبەری و ڕاستیی (پێغەمبەر - د.خ) و هەروەها لەبەر خاتری ئەو پێغەمبەرە (دڵگر) و (پەسەند)ە کە: لە مەزنێتی و کردگاری و بێ هاوتاییی خوا، شایەتی (گەواهی)ی ڕاگەیاندووە، بۆیە ئەو خوای تواناو پەروەردگارە کە فەرمووی (کون) = ببە، دەستبەجێ هەرچی بوونەوەری هاتووتە بوون واتە (کائینات) بەجارێ هاتە دی و ئەم بیرو ڕایەش بۆچوونێکی نەگۆڕ و جێگیری موسڵمانە ڕاستەکانە.

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیشیدا بەتەواوی یەکلاییی کردووەتەوە کە ئەم (حەوت بەند)ەی لە خۆشەویستیی (پێغەمبەری ئیسلام- د.خ) وە داناوە.

ئەم تاکە هەڵبەستەی دواییش هەر درێژە پێدان و ڕوونتر کردنەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیە.

٥٨- ئەم تاکە هەڵبەستە پێکهاتەی کائینات (بوونەوەری)یەکەی تاکە هەڵبەستی پێشووی تیا ڕاگەیانراوە کە:

شش جهت: شەش لا، مەبەست لەوەیە کە هەرشتێک شەش لای هەیە وەک (لای ڕاست) و (لای چەپ) و (لای سەرەوە) وە (لای خوارەوە) و (لای پێشەوە) و (لای پشتەوە) وەیا بەپێی جوگرافیی (گۆی زەوی) ئەو شەش لایە بریتین لە (لای ڕۆژهەڵات) و (لای ڕۆژئاوا) و، (لای سەرەوە) و (لای ژێرەوە) لەگەڵ (لای باکوور) و (لای باشوور) کە ئەم (شەش لا)یەیش لە ڕواڵەتی ئەو (کەون = بوونێتی = کائینات)ە کە لە سەرەتای ئەم تاکە هەڵبەستەدا و، لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا (کەون)ەکەی ڕاگەیاندووە.

چار مام: بەپێی لێکدانەوەی سەرەتایی مرۆڤ، بوونێتی بریتی بووە لە (چوار شت) کە هەرشتێکیان (کوردی) بە (مام = دایک) ێک ناوی بردووە ئەو چوار شتەیش چوار توخم (عونصور)ە سەرەکییەکەی پێکهێنەری بوونێتین و ئەوانیش: (ئاو)، (با)، (خاک)، (ئاگر)ن کە بەپێی ئەو بیروبۆچوونە کۆنینەی ئەم چوار توخمە بوونێتییان لێ هاتووەتە دی واتە (العناصر الاربعة).

ئەو بوونێتییەی (کوردی) لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا ڕای گەیاندووە و لەم تاکەدا بوونێتییەکەی (شیتەڵ) کردووە. و ئەم (چوار مام)ە لەگەڵ (شش جهت)ە کە لەپێکهێنەرانی ئەو (کەون = بوونەوەری)یە ناویراوەن.

یک جوهر: (جوهر) عەرەبەکان لە وشەی (گەوهەر)ەوە وەریان گرتووە، مەبەست لەم (یەک جەوهەر)ە لێرەدا هەرە پوختەی هەوین و پێزی پێکهێنەری (بوونێتی = کائینات)ە کە بەپێی ڕاگەیاندنی بیروڕاو بۆچوونی زانا دێرینەکان (ئێرانی و یۆنانی) لە هەرە بایەخدارترین و گرنگترین و پێویستترین ماددەیە کە بە (ئەثیر) یا (ئێثەر: Etther) ناویان بردووە، ئەمیش

وشـەیەکی کۆنی زمـانی (یۆنانی)یە بەواتا: (ئاسـمـان) یا (با)ی ئەو بۆشـاییـیەی مـرۆڤ لەسـەر ڕووی گۆی زەوییەوە دەیبینێ و هەستی پێ دەکات.
هەروەها زانایانی کۆن پێیان وابووە کە ئەم بۆشایی (فەضا)یەی سەروو یا دەوراندەوری زەوی بەجۆرە هەڵمێکی یەکجار تەنک دەورە دراوە، ئەویش خۆی (ئێثەر-یا-ئەسیرە)کەیە کە هەوێنی بوونێتییە و بە عارەبی بە (جوهر الفرد) یش ناویان بردووە.
ئالێرەدا لەسەر لێکدانەوەی ئەم (جەوهەری فەرد)ە زانایان بوون بەدوو دەستەوە کە:
دەستیەیەکیان: پێیان وایە کە (ئەو- ئەسیر- یا- جەوهەری فەرد)ە بەخۆی خودی خوایە و بەو چەشنە بە (پێکهێنەر) ئەزانرێ، چونکە هەوین و پێزی هەموو بوونێتییە.
دەستـەکەی دیکەیان: زانا ئاینییە ئاسمـانییەکانن وەک: (زەردەشتی و مووسایی و عیسایی و محـەممەدی) ئەو (ئێثەر-یا-ئەسیر)ە نەک خودی خـوایە، بەشکو خوا دروستکار و پێکهێنەری ئەو ئێثەر- یا- (جەوهەری فەرد)ە کەیشە، ئەگەرچی خـوایش بە (جەوهەری فـەرد) ناو دەبرێ بەڵام هەریەکەیان بەجۆرێک.
(کـوردی) هـاوبۆچوون بووە لەگـەڵ زانا ئاینییـە ناوبراوەکـان، کـە بوونێـتیی لە تەنیـا یەک (جەوهەر)ی دروستکراوی خواوە ڕەخساوە.
سە موالید: لەڕووی زمـانییەوە: سێ (زاو)ەکان یا سێ لێ زاوەکـانە و بەڵام مـەبەست ئەو سێ شـتـەیە کـە هـەمـوو بوونەوەری سـەرزەوی لەسێ جـۆرە شت پێک هـاتووە، ئەوانیش بریتین لە وشکە (جـمـادات) وەک (بەرد) و (کانزایەکـان) و.... هـتـد، و (تەڕە) (ڕووەک = نـەباتات) وەک: (دارو درەخت و گژوگیاو گوڵ و سەوزە) وە زیندەوەر (ئەحیاء) وەک (هەمـوو گیانداران هەر لە مرۆڤ و ئاژەڵەوە تا دڕندە و مەل و ماسی و مارو مێروو مێش و مەگەز).
هفت آباشد: بووە حەوت ئابا= حەوت باوکان کە مـەبەست لە حەوت نهۆمـەی ئاسـمـانە کە هەریەکی لەو نهۆم (چـین)انەی بە باوکی ئەوی دوای خـۆی داناوە (ئابا=ئاباد= باوکـان) و، یا مـەبەست لەوەیە کە (باو)ە دەڵێن گۆی زەوی لە حەوت (چینی)ی یەک لەسـەر یەک پێک هـاتووە کە ئەمـانەش نیشـانەن بۆ یەکەمین کردکاریی خـوای مـەزن کە ئەم (شـەش جـهـەت) و (چوار دایک) و (یەک جـەوهەر)و (سێ لـە دایک بووان) و (حـەوت بـاوکـان) بە هەمـوویان پێکەوە ئەم (کـەون)ەیان پێک هێناوە کە لەتاکە هەڵبەستی پێشـوودا بە فـەرمـوودەی (کُن)ی خـوای مـەزن (کـەون = بوونێـتی)یان لێ پەیدا بووە کـە (کـوردی) لە تاکـە هـەڵبـەسـتی ئایندەدا (دەرباری) فـەرمـانبـەریی خـۆیان بەرامبـەر بە خـوای کردگـار ڕادەگـەیەنێ و لە تاکـە هەڵبـەسـتی دوای ئەویشـدا هەمان (دەرباری) بەرامبـەر پێغـەمبـەری ئیسلام (د.خ) (دروود) و (سـروود) دەرباریی خۆیان ڕائەگەیەنن.
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم (حەوت بەند)ەدا (٥٨)مین تاک و لەم بەندی سێیەمەدا (١٠)یەمین و لە شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە: لە (حم، ف، ق/ ٣، مک) چوارەمین تاکە و لە (با/ ١، حم، سجا، صا، نم/ ١) دا پێنجەمین و لە (ج، ط، گل/ ٣) دا شەشەمین تاک

و له (ص، نع) دا حەوتەمین و له (گل/ ٥، گل/ ٦، مع)دا هەشتەمین تاک و له (شح، عن، گل/ ٨، ما/ ١)دا نۆیەمین تاک و له (من، ن، ه) و له (من، ن، ه) دا دەیەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

جهت، له (گل/، ما/ ١) دا نووسراوە: جفت. بێگومان هەڵەی نووسینە.

بەڵام له (ما/ ١)ەکەیاندا له پەراوێزدا نووسراوە (نسخە/ جهت)، واتە له نوسخەیەکی تردا (جهت) نووسراوە کە ئەمەش ڕاستە.

جـهت، له (حم، صـا، گل/ ٣) دا نووسـراوە (طرف) ئەویش دەگـونجێ، بەڵام ڕاسـتـتـر (جهت)ەکەیە کە بووەتە زاراوەیەکی زانیارانەی جوگرافی.

مام، له(با/ ١، گل/ ٥، مع، گل/ ٣، گل/ ٦) دا نووسراوە (بام) کە هەڵەیەو واتا نادات. مام له (ص، مـا/ ١)دا نووسـراوە: (نام) و ئەویش هەڵەو بێ واتایەو له (مـا/ ١)ە، کـەیاندا بە دەستنووسێکی تر لەپاڵ (نام)ەکەدا نووسراوە (مام) ڕاستی کردووەتەوە مام له (گل/ ٨) دا نووسراوە: دام و ئەمیش هەڵەو بێ واتایە.

مواليدو، له (نع) دا نووسراوە: موارد– هەڵەیە واتا نادات.

ئابا له (سجا) دا نووسراوە (آیا) هەڵەیەو واتا نادات و، ڕەنگە هەڵەی نووسین بێ.

**واتای گشتی:**

ئەم تاکە هەڵبەستە درێژەدانە بە بیروڕای ناو تاکی پێشوو کە خوای مەزن فەرمووی (كُن) واتە (ببە) هەمـوو (کـون) واتە (بوونەوەر) هاتە دی، کـە خـواسـتی ئەو خـوا کـردگـارەن و ئەوەش یەکەمین کردگارێ بووە، کە ئەم بیروڕایەش له پەڕاوییە پیرۆزو ئاسمانییەکانی وەک (تەورات و ئینجـیل و قـورئان) و له بۆچوونی زانا هەرە کـۆنەکـان و تیـۆری (النظرية) کـانیـان و، له (کەلەپوور)ی نەتەوەکانی جیهاندا بە جۆرەها شێوە ڕاگەیەنراون.

(کوردی) بێگومـان شارەزایی ئەو بیروڕاو بۆچوونانە بووە و پوختەو ئاکامـەکەیانی بەم چەشنە بۆ ئێمـە بەجێ هێشـتـووە، له شـەش لا (جـهات)ی پێش و دواوەو سەرو خـوارو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو کـە لەچوار تـوخم (عـونصـور) یا(العناصـر الاربعـة)ی (خـاک) و (با) و (ئاگر) (ئاو) هاتوونەتە دی، بەسەر گۆی زەویشەوە سێ جۆرە پێکهاتەی وەک وشکە (جیمادات)ی وەک بەرد و مادده کانزاییەکان و، تەڕە یا (ڕوەک) = (نەباتات)ی وەک دارو درەخت و گژوگیاو گوڵ و له زیندەوەری (الحـیـاة)ی وەک هەر له (مـرۆڤ)ەوە هەتا جـۆرو ئاژەڵ و گـیـانداره دڕندەکـان و زیندەوەرە ئاوییەکانی وەک ماسی و فڕندەکانی وەک: باڵندە و جۆرەهای تری وەک مارو مێروو مێش و مەگەز. ئەمە جگە له حەوت (چین طبقە)کەی زەوی و حەوت نهۆمەکەی ئاسمانان کە خوا لەبەر خاتری پێغەمبەری ئیسلام دروستی کردن تا پەیڕەویکارانی لێیان بەهرەوەر بن لەم (أصل الخلقة)یانە.

هەر ئەم ناوەڕۆکی تاکە هەڵبەستە له تاکە هەڵبەستەکانی دواتریشدا درێژەی دەبێت.

٥٩– در میان: له نێوانی، لەمیانەی، لەناو، لەمیانی– هەر ئەم وشەی (میان – یا– میانەی)یە.

جمیع: هەموو ، گشت، سەرپاک.
مـخلوقـات: خـەلق کـراوان، دروسـتکراوانی خـوای گـەورە کـە لـە تاکی پێـشـوودا بـەدرێژی دەستنیشان کراون.
(کوردی) لەم نـیو ناڵی یەکەمـەیدا فـەرمـوویە کە لەنێوان ئـەو هـەمـوو دروسـتکراوانـە ئەو خـوا کردگارە ئەمی دوایی هەبوو کە:
جلوەء: پەرتەوی، تیشکی، جوانی و..... هتد.
(بڕوانـە لێکدانـەوە وردو فـراوان و درێژەکـەم لەسـەر وشـەی (جـیلوە) لە تاکـە هـەڵبـەسـتی (١٥)یەمی بەندی یەکەمی ئەم حەوت بەندە فارسییەی (کوردی) دا.
پاک: پاکی، بێ گەردی، بی خەوشی.
ذات: خودی، بە خودی خۆی، چێشتی، جەوهەری، کە مەبەست لە هی خوای پەروەردگارن.
شـد: بوو، هەبوو. ئەم وشـەی (بوون)ە مـەبەست لەوەیە کـە لەنێـوان سـەرپاکی هەمـوو دروسـتکراوانی خـوای مـەزندا پەرتەوێکی پاکی خـودی خـوای کـردگـار هەبوو کـە ئەویش (پێغەمبەر)ی ئیسلام- د.خ- بووە، کە (کوردی) ئەم (حەوت بەندە) بێ مانەندەی لەسەر داناوە. هەروەها ئەشێ مەبەست لە (جیلوە)کە (خودی خوا) بێ.
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندە دا (٥٩)مین تاک و لەم بەندی سێیەمەدا تاکی (١١)مین و بەپێی سەرچاوەکانی بەم جۆرەیە:
لە (ج، جم، سـجا، ف، گل/ ٣، ط، ق/ ٣، مک، نم/ ١) دانـییـە و، لـە (حم) پێنجـەمین تاک و لە (با، صا) دا شـەشـەمین تاک و لە (ص، نع) دا هەشتـەمین و لە (گل/ ٥، گل/ ٦، ما/ ١، مع) دا نۆیـەمین تاک و لـە (شح، عن، گل/ ٨) دا دەیەمـین و لە (مس، ن، ه)دا یـانزەیـەمین تاکـی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

جمیع، لە (جم، شح، مع) دا نووسراوە (عموم) ئەمیش دەگونجێ.
مخلوقات لە (گل/ ٨، صا، نع) دا نووسراوە (موجودات) کە دەگونجێ.
جلوەء، لە (ه) دا نووسراوە (پرتوی) ئەمیش دەگونجێ.
پاک زات، لە (ن) دا نووسراوە (ذات پاک) ئەمیش پاش و پێشە و دەگونجێ.

**واتای گشتی:**

لەنێوان دروسـتکراوەکانی خـودا (کە لەتـاکی پێشـوودا هـاتوون) پەرتەوی تـاکی خـودی خـوای مەزن ئاشکرا بوو لە جەستەی پێغەمبەری ئیسلامدا کە شایانی ئەم حەوت بەندە بووە.
٦٠- با سـرود: لەگـەڵ سـروود، بەدەم سـروود چڕینەوە، بەدەم گـۆرانیـی ئاینـیـیـەوە، (سـروود) وشەیەکی (پەهلەوی)یە و بەشێوەی سرووت = srut بەکارهاتووە.
سرود: ئاواز، ئاوازی جۆش و خرۆشهێن،
سـرود: چەشنە گۆرانییـەکی ئاینییـە کە تاکە کەسـێک یا چەند کەسـێک بـە سـۆزو ئاهەنگەوە

ئەیچڕن، لەبەر ئەوە سروود: ناوی گۆرانییە ئایینییەکانە، لەمەڕ هەڵنانی هێزی ئاینی و کەسەتییە ئاینییەکانەوە.
(درود). کە لەم تاکەدا مەبەست لەوەیە کە بەدەم (سروود)ەوە (درورد) ڕابگەیەنرێ، ئەمجا هەموو گۆرانییەک و لەوانە (سرود)یش بریتین لە (نەغمە = سازو ئاوازی گۆرانییەکە) و ناوەڕۆکی ئەو سروودەش جۆرەها هەڵبەستی (واتا) و (کێش) جیاوازن.
لێرەدا ئەو ناوەڕۆکی (سرود) بە (درود) دەستنیشان کراوە که جوره (ذکر)ێکیشە.
(درود)یش بەواتا: (ئیکلام (سەلام)، هەڵنانی (ئایینی)یانە، ستایش کردن)ە.
(درود) یش وشەیەکی کۆنی (پەهلەوی)یە و بەشێوەی drut بەکارهاتووە، (کوردی)ئەم (سرود) و (درود) چرینەی داوەتە پاڵ هەر بوونەوەرییەک کەبە (مەوجوودات) ناوی بردووە.
هرموجود: هەر بوون و بوونەوەرییەک کە بەجارێ سەرگەرمی (دەقە درودی)یەکانن کە بە (سرود)ەوە دەچڕن لە هەڵنان و ستایش کردنی پێغەمبەر – د.خ– دا.
(کوردی ئەو سروود چرینە بە ناوەڕۆکی درودەوەی لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا، بەم چەشنەی دوایی دەستنیشان کردووە:
آشکار: ئاشکرا، بە ئاشکرایی، بەدەنگ بەرزی
نهان: بە نهێنی، بەدەنگ نزمییەوە، لەژێر لێوەوە.
گویا شد: بووە بێژەر، کە مەبەستی لەوەیە هەریەکێ لەو مەوجوداتە (درود) بەدەم (سروود)ەوە بە ئاشکراو بە نهێنی دەچڕێت.
گویا: گوتەر، بێژەر، وە لەسەرێنی لکە زمانی پەهلەویدا لەکارا بووە بەشێوەی (گۆو ئاک Gow-ak) دا بەکارهاتووە.
هەروەها واتای: (وتە، گوتە، وتووێژ)یش دەدات.
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (٦٠)مین تاک و لەم بەندی سێیەمەشدا (١٢)مین تاک و بەپێی سەرچاوەکانیش بەم چەشنەی دواییە:
لە(ج، جم، سجا، ص، ط، ف، ق/ ٣، مع، مک، نم/ ١)دا نییە و لە (حم) دا شەشەمین و لە (با/ ١، صا، گل/ ٣) دا حەوتەمین تاک و لە (نع) دا نۆیەمین و لە (گل/ ٥، گل/ ٦، ما/ ١) دا دەیەمین تاک و لە (شح، عن، گل/ ٨) دا یانزەیەمین و لە (مس، ن، ه)دا دوانزەیەمین، تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە:

**جیاوازییەکان:**

باسرود و درود، لە (با/ ١، حم، ما/ ١) دا نووسراوە: (با درود و سرود) کە ئەمیش پاش و پێشەو واتایەکەی ناگونجێ و ناڕاستە.
هر موجود، لە (شح، نع، صا) دا نووسراوە: (موجودات) کە ئەمیش کوی وشەی (مەوجوود) و چونکە نیو باڵی دووەم دەنگ لە (تاک) دەدات بۆیە (موجودات) ناگونجێ لەڕووی دەستووری زمانییەوە.

گویا له (گل/ ٣) دا نووسراوه (جویا) كه واتاكەی جیاوازو دووره له واتای (گویا) و، لەگەڵ ئەم تاكەدا (جویا) ناگونجێ.

**واتای گشتی:**

هەر بوونەوەرێك لەلای خۆیەوە بەئاشكراو بەنهێنی سەرگەرمی سرود چڕینە، كە ناوەڕۆكی سروودەكەی (درود) بێت و بەسەر پێغەمبەر(د.خ)ی ئیسلامدا هەڵی دەدات.

٦١- به ظهورش: ئاشكرابوونی. مەبەستی له ئاشكرابوونی ئاینی ئیسلامە، یا دەركەوتنی پێغەمبەرێتییەكەی.

به ظهورش: به ئاشكرابوونی، بەدەركەوتنی، به بانگی ئیسلامەتی هەڵدانی، بەبڵاوكردنەوەی (ئیسلام).

رسالهء آدم: پەیامی (كە مەبەست لە- پێغەمبەرێتی)یە واته پێغەمبەرێتی باوكە ئادەم، (مەبەست لەوەیە كە: هەر لەو پەیامەی ئادەمەوە).

تا مسیحا: هەتا دەگات بە (مەسیحا) كە مەبەست له حەزرەتی (مەسیح، واتە: عیسا بێغەمبەر)ە-د.خ.

(كوردی) لێرەدا ئەوەی ڕاگەیاندووە كە هەر لە پێغەمبەرێتییەكەی باوكە ئادەمەوە بە هی هەموو پێغەمبەرەكانی ترەوە. هەتا سەر خودی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی عیسا(درودی خوایان لێ بێ)، پەیامی هەموانیان بە ئاشكرا بوونی ئاینی ئیسلام (ئەوانیكە) هەموویان پووچ كرانەوە.

كە مسح و الغا شد: هەڵوەشانەوەو ئاینی ئیسلام جێگە هەموانیانی گرتەوە. وەك ئەو (جلوە)یەی لەتاكی بێشترا ڕاگەیانراوە ڕووناكیی داوە بە هەردوو جیهان؛ چونكە لە (ئیسلامەتی)دا پێغەمبەری ئیسلام بە (رحمة للعالمین) نامزەدكراوە.

ئەم تاكە هەڵبەستە بە گوێرەی تاكەكانی ئەم (حەوت بەند)ە (٦١)مین تاك بەپێی ئەم بەندی سێیەمەش (١٣)مین تاكە.

وەبەپێی ئەم تاكە هەڵبەستەش لە سەرچاوەكانیدا بەم جۆرەیە: لە (ج، جم، حم، ط، مك) دا نییە و لە (ف، ق/ ٣) دا پێنجەمین تاك و لە (سجا، نم/ ١) دا شەشەمین و لە (صا، گل/ ٣) دا هەشتەمین و لە (ص) دا نۆیەمین و لە (مع، نم) دا دەیەمین تاك و لە (گل/ ٥، گل/ ٦، ما/ ١) دا یانزەیەمین و لە (شح، عن، گل/ ٨) دا دوانزەمین و تاك و لە (مس، ن، ھ) دا سیانزەیەمین تاكە هەڵبەستی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەكان.**

بە ظهورش، لە (با/ ١، حم) دا نووسراوە (بحظورش) ئەمەش ناگونجێ و شێواوییە

ڕسالهء، لە (صا، شح) دا نووسراوە: پەیامبەری، كە ئەمەش دەسكاری و شێواوییە.

مسح (كە بەواتا سڕینەوەیە) لە (ص، گل/ ٣) دا نووسراوە: (مسخ) (كە بە واتا گۆڕینی شێوەیە بۆ ناشرینی) و ئەمەش واتای هەڵەو شێواوییەو ناگونجێ.

**واتای گشتی:**

بە دەرکەوتنی ئاینی ئیسلام یا پێغەمبەرێتیی محەمەد- د.خ- ئیتر پێغەمبەرەکانی تر. هەر لە باوکە ئادەمەوە هەتا دەگاتە سەر حەزرەتی عیسا پێغەمبەر- د.خ- هەموو پێغەمبەرێتییەکانیان و، یا ئاینەکانیان سڕدرانەوەو پووچ کرانەوەو ئیسلامەتی جێگەی گرتنەوە.

٦٢- از ازل: هەر لە ئەزەلەوە.

(ازل) یەکێکە لە وشەی ئیسلامی بەواتا لە هەرە هەرەکۆنەوە، ئەمیش یەکێکە لە ڕواڵەتەکانی خوای مەزن کە (ئەزەلی) واتە هەر بووەو بەرامبەر بەم وشەیەش؛ وشەی (ئەبەد) هەیە کە بەواتا هەتاهەتاییەو ئەمیش دیسان وشەیەکی ئیسلامی و ڕواڵەتێکی خواییە کە هەر بووەو هەر دەبێت و سەرەتاو کۆتاییی نییە.

ثبت لوح شد:

ثبت: جێگیر، کە مەبەست لە (نووسرانە) و نووسینەکەیش لە

(لوح)دا نووسراوە، (لوح) لەڕووی زمانییەوە، بەواتا: کەڤاڵ= لەوح- ێکی تەخت و پان کە لە (دار) یا (ئێسک) یا (مادە کانزاییەکانی وەک (ئاسن، مس، زەردو... هتد...)

(لوح) لێرەدا مەبەست لە چەشنە (کەڤاڵ)ێیەکە لە بارەگای خوای مەزندا لەگەڵ قەڵەمداو کردەوەی چاکە و خراپەی هەر مرۆڤێکی تیا نووسراوەو دەنووسرێت تا لە ڕۆژی حەشردا بەپێی ئەو نووسینە پاداشی بەهەشت یا سزای جەهەننەم بەکەسان بدرێت.

ئەم سێ وشەی (ئەزەل) و (ئەبەد) و (لوح)ە... هتد لە زارە سۆفیگەرییەکانی (العلم الإهي) دان کە جارێ تر لەم پەڕاوییەدا بەدرێژیتر لێکم داونەتەوە.

(لوح) وشەیەکە بەلای هەندێ لەزانا پسپۆرەکانی ئاینی ئیسلامەوە مەبەست لە (قورئان)ە.

هەندێکی تریان لایان وایە (قەزاوقەدەر) لەو لەوحەدا بە درێژی نووسراون: وەک دەفتەر واتا: (سجل).

کە (الوح المحفوظ)یشی پێ گوتراوە.

بۆ مەبەستی ئەوەی کە (لوح) خۆی (قورئان)ە لە قورئانی پیرۆز، سوورەتی - البروج) ئایەتی، ٢٢دا هاتووە:

(فی لوحٍ محفوظ).

واتە: لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوە و پارێزراوە.

هرگاه: لە هەر گاوێک (کاتێک) دا کە مەبەست لەوەیە کە قورئان هەر لەڕۆژی (ئەزەل)ەوە لە (لوح المحفوظ) دا پارێزراوە ەو بەڵام هەرکاتێ یا ئەوکاتەی لەگەڵ دەرکەوتنی ئاینی ئیسلامدا قورئانیش دەرکەوت و پێغەمبەرێتی (محەمەد-د.خ)یش ئاشکرا کرا.

بەڵام چۆن دەرکەوتن و ئاشکرابوونێک؟؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدایە کە:

بە ظهـوری: بە دەرکـەوتنێکی ئـەوتۆی کە گـەشـەی بە (گیـان) دا و کـەوتە گەشـەکـردنی یەک لەدوای یەکی، کە لە سۆفیگەریدا چەندین پلەو پایەیان بۆ داناوە.

کە روح افـزا شد: کە گیان ئەفزا بوو. ئەفزا، زۆرتربوون، گەشـەکردن– واتە (گیـان) بەپێی ئەو پلەو پـایەیانەی کـە سـۆفـیگەرەکـان دیارییـان کـردووە بەرەبـەرە دەچێتـە پێـشـەوەو پتـر تا سـەردەکـەوێ و (گیـان)ەکـە لەو پەیکارییـەدا هـەر لە گـەشـەکردندا دەبێت بەپێی پـەیڕەویکردنی ڕاست و دروست و بە ئـەنجـامگەیاندنی هـەرچی زۆرتر لە فـەرمـایشـتـە ئاینییـەکان و تیـایاندا شـارەزاتر بوون.

لەم تـاکـە هەڵبـەسـتـەدا (هـەرگـاه) لە کـۆتایی نیـوباڵی یەکـەمـدا، هاتووە و (بـە ظهـوری) بەدەرکەوتنێک.

لەسەرەتای نیو باڵی یەکەمدا هاتووە، ئەم (هرگاه بە ظهوری) یە جارێکی تر واتایەکی تایبەتی دەدات کە جیـایە لە واتایەکـانی تر بە جیـاوازی لە شـوێنی خـۆیانداو واتاکـانیش لە دوو تاکی ئایندەدا ڕادەگەیەنم. ئەمەش (هرگاه بە ظهوری) وەک لەگەڵ هەریەکێ لە دوو تاکەکەی ئایندە وابێت وەهـایەو چەندین جۆرو لە چەندین جاردا پێغەمبەرو ئاینەکەی ڕادەگەیەنێت.

ئەم تاکە هـەڵبەستە بەپێی حەوت بەندەکە ٦٢مین تاک و بەپێی ئەم بەندی سێیەمە چواردەیەمین تاکیەتی.

ئەم تاکە هـەڵبـەستـە لە سـەرچاوەکانیدا (شـوێنی) بەم جۆرەیە: لـە (با/ ١، ج، جم، حم، سجـا، صـا، ف، ق/ ٣، ط، گل/ ٨، مـک، نم/ ١)دا نیـیـە و لە (گل/ ٣) دا نـۆیەمین تـاک و لە (ص)دا دەیەمـین و لە (مع) دا یانـزەیەمین و لـە (گل/ ٥، گل/ ٦، مـا/ ١، نـع) دا دوانزەیەمین تـاک و لە (شح، عن)دا سیانزەیەمین تاک و لە (مس، ن، هـ) دا چواردەیەمین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

از، لە (مع) دا نووسراوە: (در = دەر) زۆر گونجاو نییە.

ازل لە (شح، نع) دا نووسراوە: (أصل) ئەگەرچی ئەگونجێ بەڵام ئەوەندەی (ئەزەل)ەکە گونجاو و پڕ بە پڕ نییە.

هرگاه لە (عن، شح، مع) دا نووسراوە: (هردم): هەردەم، ئەمە دەگونجێ.

روح افزا: (عن، شـح، مع، ن، ما/ ١) دا نووسـراوە: (جلوه افزا)– کـە ئەمەش زۆر جێگیر نییە وەک (روح افزا)یەکە

**واتای گشتی:**

هـەر لە (ازل)ەوە لە (لـوح مـحـفـوظ) دا بەنووسـین جـێگیـر کـراوە، کـە ڕێبـاز و ئاڕاسـتـەکـاری ڕەوشت وخووی بەرزو سوودبەخشی ئەو پێغەمبەرە هەرجارەی– بەجۆرێک لێرەولەوێ دەتوانێ گیـانی مـرۆڤ ببووژێنێتـەوە، و گەشـەپێ بدات کە مـرۆڤـایەتی لەجیـهاندا بـەپاکی و بەچاکی و دەروون کـامـەران و بێـوەیی بژی و شـوێنی! باشـیش لەدوای مـردن و لە (بەهەشت)دا بـۆخـۆی دیاری بکات و خـوای گەورە لەخـۆی ڕازی بکات، بـەهـۆی ئەو گەشـەکردنـەی گیـانییـەیەوە کە

لەرێبازە چاکەکەی ئەو پێغەمبەرەو کاریگەرییەکەیەوە پێی بەهرەمەند بووە.
هەر ئەو (هرگاه بە ظهوری)یەش لە دوو تاکی ئایندەدا خۆی دەنوێنێتەوە و کاریگەریی خۆی جێگیر دەکات.

٦٣- گاه بر صورت خلیل آمد: کاتێ - یا - جارێ - لەشێوەی خەلیلدا دەردەکەوت.
واتای ئەم نیوباڵی یەکەمی تاکە هەڵبەستە بریتییە لە (کاتێک- یا جارێک لەسەر شێوەی (وێنەی، دیمەنەی) حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل، پێغەمبەری مەزن- د.خ- دا پێغەمبەری ئیسلام- د.خ- هات بەپێی (هرگاه بە ظهوری)= هەرکاتێ بە جۆرە دەرکەوتنێک - یا - هەر جارەی بە چەشنە دەرکەوتنێک خۆی نواندووە کە مەبەست لەوەیە رێبازو دەستوورەکانی ئاینی (حەنیف)ی حەزرەتی ئیبراهیم بە پوختەتری راگەیاندووە بە مرۆڤ کە هەر وەکو خۆی خودی (ئیبراهیم- د.خ) بێت ئاوەها دەرکەوتووە.
ئەمجا (کوردی) کە بەهۆی ئەو نیشانەیەی کە لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا رای گەیاندووە: (هرگاه بە ظهوری) واتە هەر جارەی، یا هەرکاتەی بەچەشنە دەرکەوتنێک کەوا لەم تاکە هەڵبەستەی ئێرەشدا فەرموویەتی: گاهێکیش و، یا دەمێکیش یا جارێکیش لەشێوەی خودی (خەلیل) دا خۆی نواندووە مەبەست لەوەیە کە پێغەمبەری ئیسلام رەوشت و خووە بەرزەکانی (ئیبراهیم)ی باپیر گەورەی خۆی هەبووەو هەروەها رێبازی ئاینە پیرۆزەکەی (ئیبراهیم) بە ئاینی (حەنیف) پێناسە کراوە، کە (حەنیف) بەواتە: (راست و دروست، جێگیر لە رێبازی خوای گەورە بەحەق و بە یەکتایی و بێ هاوتایی زانین (وەحدانیەت) دا) کە ئەم رواڵەتانەیش هەموو لە ئاینی ئیسلامدا هەن و هەروەک خودی (ئیبراهیم) هاتبێتەوەو بەناوی پێغەمبەری ئاینی ئیسلامەوە رێنمایی کردبن و، یا خودی (محەمەد) لە هەمان رێبازەکانی ئیبراهیم و رەوشت و خووی ئیبراهیمدا جارێکی تر بەناوی ئیسلامەتییەوە هاتبێتەوە، وەهایە. ئەمەیە کە پێغەمبەری (ئیسلام) لەشێوەو دیمەنی خەلیلدا هاتووە کە (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا رای گەیاندووە.

آمد هات: واتە (محەممەد) لەشێوەی (خەلیل) دا هاتەوە (درودی خوایان لێ بێ).
ئەم دەرکەوتنی پێغەمبەرە لە (شێوەی (خەلیل) دا یەکەم نموونەیەک بوو کە سەرەتایەکەی لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا بەدەقی (هرگاه بە ظهوری): هەرجارەو هەرکاتەی بەچەشنە دەرکەوتنێک بوو، هەروەها لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا بۆ جاری دووەم پێغەمبەری ئیسلام بەم چەشنە خۆی دەنوێنی وەک: (کوردی) فەرموویەتی:
گاه در جسم: کاتێکیش یا جارێکیش لە لەشی (جەستە)ی... دا دەر دەکەوێ. لێرەدا ئەو دەرکەوتنە لە لاشەی دووشتدا لەم نیو باڵی دووەمەدا دەرکەوتووە کە:
یەکەم :(لات): ناوی یەکێکە لە بتەکانی عەرەب و بەتایبەتی بەرەی (ثەقیف) بەر لەئیسلام، کە وەک خوایەکی هەرە مەزن پەرستوویانەو لە شێوەی (بت)ێکدا (نەک وەک ناسینی خوای یەکتا. شوێنی ئەو (بت)ە لەشاری (طایف) ی عەرەبستانی سعوودیەی ئێستادا بوو.

ئەو بتـە (لات)، زۆر بەلای عـەرەبەکـانی (جـاهیلی)یەوە گـرنگ و مـەزن بووە و لە قـورئانی پیرۆزیشدا دوو جار ناوی (لات) هاتووە.
دووەم دەرکەوتنەکەی پێغەمبەرو وئاینەکەی کە لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا ڕازی داداوە و لێرەدا (کوردی) ڕای گەیاندووەتەوە:
(عُزّا) ناوی یەکێکە لە بتەکانی عەرەبی کۆمەڵگایەکەی پێغەمبەرو پایە و شکۆمەندیی ئەم بتە بەلای ئەو عەرەبانەوە لەدوای پایەو شکۆمەندیی (لات)ەوە بووە.
شد: بوو، واتە: لەسەر لەش (جەستەی) ئەو (بت)ی (لات) و (عزا)یە؛ پێغەمبەرو ئاینەکەی خۆیان نواند.
هەروەها (شد) بەواتای (چوو)یش دێت کەواتە پێغەمبەر چووە سەر لاشەی ئەو جووتە (بت)ەی (لات) و (عزا)یە وەیا ئاینەکەی پێغەمبەر چووە جێگەی ئاینی ئەو بتەو پەرستنەکەیان و خەڵکی لە جێگای بتەکەیان ڕوویان کردە ئەو پێغەمبەر.
لەم نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەدا (کوردی) وریایانە، بیرەکەی دەربڕیوە کە بەسەر زاری وەها. دەردەکەوێ گوایە (خوانەخواستە) پێغەمبەر وەک چۆن لەشێوەی (خەلیل) دا خۆی نواندووە، ئاوەهایش چووتە لەشی ئەو جووتە (بت)ەوە کە لەڕاستیدا وەهانییە و، مەبەست لەوەیە کە ئاینەکەی جێگەی پەرستنی دوو بتەو، ڕێوڕەسمەکەیانی گرتەوە و، نەیهێشتن.
بەسەر زاری ئەم نیوباڵی دووەمەی سەرەوە وەک دەربڕینێکی بێ جێ و پێچەوانەی نیوباڵی یەکەمیەتی، بەڵام بەسەرنجدان و تێڕامان لێی دەردەکەوێ (کوردی) وردەکاری و، وەستا کارایی لە ڕاگەیاندنەکەیدا نواندووە، هەر وەک داوێکی چەواشەکارانەی بۆ خوێنەرەوانی ئەم نیو باڵە نابێتەوە، ئاوەهایە. چونکە کە (کوردی) فەرموویەتی (شد) (بوو)ە هەروەها و لێرەدا بەواتەی (چووە) دێت کەواتە پێغەمبەر نەچووەتە (ناو) جەستەی (بت)ەکانەوە کە وشەی (در) (لە، لەناو)ەکەش چەواشەکارییە بەشکو چووە سەریان هێرشی بردنە سەر و لەڕاستیشدا وەها بووە، کە لەو جارەیاندا یا لەو کاتەیاندا بەسەر بتەکان و پەیرەویکارانیدا سەرکەوت.
هەر بەو (ظهور) دەرکەوتنەی چووە سەر (بتەکان) و بت پەرستان و ئاینەکەی جێگەی ئەوانی گرتەوە و خوای ڕاستی بەو گومڕایانە ناساندو لای دان لەسەر بت پەرستی و خستنیە سەرڕێگەی حەقیقەت.
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم بەندی سێیەمەدا (١٥)مین تاکە هەڵبەست و لە حەوت بەندەکەشدا (٦٣)مین تاکە و شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکاندا بەم جۆرەیە:
لە (با/ ١، ف، نع) دانییە و لە (مک)دا پێنجەمین تاک و لە (ج، گل/ ٣)دا شەشەمین و لە (سجا، حم، ط، نم/ ١) دا حەوتەمین تاک و لە (صا) دا نۆیەمین و لە (ق/ ٣) دا دەیەمین و لە (ص) یانزەیەمین و لە (مع) دا (١٢)مین و لە (گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، ما/ ١) دا سیانزەیەمین تاک و لە (شح، عن) دا چواردەیەمین و لە (مس، ن، ه) دا پانزەیەمین تاکە هەڵبەستی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

بر: لە (شح، ص) دا نووسـراوە (در) کـە ئـەمـە زۆر بەجێ و پەسـەندە؛ چونکە تەنیـا لەم دوو سـەرچاوەیەدا هاتووە و لە (٢٠) سـەرچاوەی تردا (بر) نـووسـراوە، بۆیـە (بر)ەکەم لەسـەرەوە جێگیر کردو لەڕاستیدا ئەم (در)ەی ئەم دوو سەرچاوەیە شێواوی ئەم تاکە هەڵبەستە گەلێ کەمتر دەکاتەوە.

صورت، لە (مک، مع)دا نووسراوە: (سیرت) واتا (سیرەتی)، ئەمیش دەگونجێ و زۆر پەسەندە، بەڵام سـەرچاوەی کـەمی لەسـەرە بۆیـە، لەسـەرەوە، جێگیـرم نەکـرد، چونکە پێـغـەمـبـەر لە ( صورت)– (وێنە) خەلیل دا نەهاتووەو نازانرێ وێنـەی (خەلیل) یش چۆن بووە بەشکو مـەبەست ئەوەیە لەسەر ڕێباز (سیرەت)ی (خەلیل) بووە کە ئەمەش ڕاستترە.

در، لە (شح، ص) دا نووسـراوە (بر) کە ئەمـیش زۆر ڕاسـتـتـر و گـونجـاوترە و واتا شـێـواو و ئاڵۆزەکەی ئەم تاکە هەڵبەستە زۆر ڕوونتر دەکاتەوە و، وەها دیارە، ئەم جووتە وشـەی (بر)ی سەرەتای ئەم تاکە لـەگەڵ (در)ی نیوباڵی دووەمدا پاش و پێش کـەوتوون لە (١٧) سـەرچاوەکەی تردا و تەنیا لەم دووانەدا پاش و پێش نەبووەو ڕاستـەو پڕ بە پڕی ئەو لێکدانەوەیەیە کە لەسەر ئەم تاکە پێشکەشم کردووە، بەم ڕێنمـاییـیە. کە ئەم وشـەی (بر)ە بە واتا (لەسـەر)ەی ئەم دوو سەرچاوەیە لەنێو ناڵی دووەمدا بەتەواوی (چوونەسەر) (هەڵکوتانە سەر)،(سـەرکەوتن بەسەر)، (سـەروکـەوتنی): ئـاینی ئیـسـلام بـەسـەر بت پەرسـتـیـدا و سـەرکـەوتنـی بەرەی (ئیـسـلام)ی پەیڕەویکارانی پێغەمبەر بەسەر ئەو بتە ناڕەوایانەو، ڕێبازە نادروستەکەیاندا.

**واتای گشتی:**

وەک لەتـاکی پێـشـوو دا (ظهـوور)ەکـە ڕاگـەیەنراوە، ئەوا لـەم تاکـە هـەڵبـەسـتـەدا ئەو (ظهور=دەرکەوتن)ە جارێک یا کاتێک (گاە) پێغەمبەر لەسەر ڕەوشتی (خەلیل) و ئاینەکەی ئیـسـلام دوابەدوای ئـاینی (حـەنیف)ی ئیـبـراهیم خۆی نواندووە (ظهووری کـردووە) هـەروەهـا بەسەر بت و بت پەرستی و بت پەرستانیشدا جارێکی ترو کاتێکی تردا سەرکەوتووە.

٦٤– گاە چون شمع: جارێک وەک شەمع کە مەبەست لە چرایە.

کە مـەبەست لەوەیـە پێـغـەمـبـەر لەکاتی وادا، یا لە جاری وەهـادا بووە کە هـەروەک چرا (بەلای کـەمـەوە) کۆمـەڵگایەکـەی خـۆی ڕووناک کـردووەتەوە وەک ڕووناککردنەوەی تـاکی (١٥)مـینی نیشانە بۆکراوە، بەڵام لەهەمان کات و یا لەجاری تردا:

گاە پروانە: ئاوا لەکات و جاری تردا هەر خودی پێغەمبەر کە وەک چرا ڕۆشنکاری بیروبڕواو هۆش و هەستی خەڵکی بوو هەر ئەو لە هەمان کات و جاری تردا بووە بە (پەروانە).

مـەبەستی (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستـەیدا لـە چواندنی پێغـەمبـەر بە پەروانە کە ڕاسـتـترین شەیدای پەڕتەوی خـوایەتییە، وەک پەروانە کە چۆن شەیدای ڕووناکییە کە لە (ظهوور)ەکانیدا ئەمجارەیان پەروانە ئاساییە.

هـەروەهـا بـەرامـبـەر بـەم واتایەی دوایی کـە (پەروانە) واتای (فـرمـان = ئەمـر) و (ڕێگەدان =

ئیـجـازه) و (فـرمـانداری = حـوکم)،... هتـدیش دەدات کـە ئەم واتایانـەش هەمـوو بۆ ئەم تاکـە هەڵبەسـتە دەگونجێن و پێغـەمبـەر فەرماندەرو فـەرمانداری خاوەن و ڕێگەدەر و... هتدیش بووە کە ئەم ڕواڵەتانەیش پێم وایە (کوردی)ی شارەزای فـەرهەنگی زمـانی کوردی و فـارسی بووەو، وەنەبێ لێیان بێ ئاگا بووبێت بگرە لە مەبەستی (کوردی) بووە لەم تاکە هەڵبەستەیداو ئەمیش جـۆرێکە لـە (کـات) و (جـار) و (بار)ەکـانی ئەو (ظـهـوور)ەی کـە لـەتاکی پێـشـووتـریدا ڕای گەیاندبوو.

تائێرە لەمـەڕ (کات) و (جار)ەکانی (ظهوور)ە ناوبراوەکەوە بوو، لە نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەداو لەنیوباڵی دووەمیدا فەرموویەتی:

گاه خورشیدو: واتە جارێک پێغەمبەر بەخۆی بووە بە خورشید (خۆر) کە (خۆر)یش هەمیشە و لە پەیابوونییەوە بەلای هەرە کەمییەوە گۆی زەویی ڕووناک کردووەتەوە.

لێرەدا کە (کوردی) (پێغەمبـەر– د.خ)ی چواندووە بە (خۆر) لەوەیە کە لە قورئاندا خوای مەزن پێغەمبەری بە (رَحمةً للعالمين) پێناسە کردووە کە نیشانەی خێروبەرەکەت و خۆشی و تەبایی و خۆشەویستیی مرۆڤە لەسەر ڕووی زەوی وەک چۆن خـۆرەکە ڕووی زەویی ڕووناک کردووەتەوە، کە ئەوەندەی مرۆڤ بیزانێ خۆر هەرە ڕووناکی گەورەترینە بۆ ئەم گۆی زەمینەو چواندنەکەی (کوردی) لە جێگەی خۆیدا بووە.

(کوردی) کۆتایی نیوناڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەی وەها داناوە کە:

حـربـاء، جـانەوەرێکی خـشـۆک (زواحف)ە لە هەر شـوێنێکدا بژی یا لەشـوێنێکەوە بچـێـتـە شـوێنێکی ترەوە، دەسـتـبـەجێ ڕەنگی دەرەوەی لەشی بەتەواوی ڕەنگی ئەو شوێنە (ژینگەیەی) دەگرێت ئەم ناوە عەرەبییە و بە (کوردی) و فـارسی (خـورپا) یـا هفت ڕەنگ = حـەوت ڕەنگەی پێ دەگوترێ.

(کـوردی) تاکـو ئێـرە کـۆتاییی بەم بـواری بابەتی (ظهـور = خـۆدەرخسـتن) و (ئـاشکرابوون)ی (کات) و (جار)ە جۆربەجۆرەکانی و هەڵوێستەکانی پێغەمبەر هێناوە.

ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـە لەم (حـەوت بـەند)ە دا (٦٤)مین و بەپێی ئـەم بەندی دووەمـیش (١٦)مین تاکە و ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیش لە سەرچاوەکانیدا بەم چەشنەیە کە:

ئەم تـاکـە هەڵبـەسـتـە لـە (نع) دا نییـە و لـە (ف، مک) شـەشـەمین تاک و لـە (جم، ق/ ٣) دا حەوتەمین و لە (ج، حم، سجا، ط، نم/ ١) دا هەشتەمین تاک و لە (با/ ١) دا نۆیەمین تاک و لە (صا) دا دەیەمین تاکە هـەڵبەست و لە (گل/ ٣) دا یانزەیەمین تاک و لە (ص) دا دوانزەیەمین و لە (گل/ ٥، مع) دا سـیـانزەیەمین تـاک و لە (گل/ ٦، گل/ ٨، مـا/ ١) دا چواردەیەمین و لە (شح، عن) دا پانزەیەمین و لە (مس، ن، ه) دا شـانزەیەمین تاکـە هەڵبـەسـتی ئەم بـەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

گاه پروانە، لە (مک، ج) دا نووسراوە: (گاه چون پروانە) ئەمـەش دووبارە کردنەوەی (چون) و

(چو) لەم نیوباڵەداو، بارگرانکردنی کێشی تاکە هەڵبەستەکە زۆر گونجاو نییە.
حرباء (ما/ ١، ج) دا نووسراوە: (حَربا) کە ئەمەش هەڵەیەو لە هەموو فەرهەنگە عەرەبییەکاندا ئەم وشەیە بە (شێوەی: حرباء) نووسراوە و بۆ نموونە فەرهەنگی عەرەبی (المنجد) و لە (فەرنگی فارسی عمید) دا نوسخەی (مک، ج) دا هەڵەیە و تەنانەت واتایەکەیشی جیاوازەو، کە هەر (٢١) نوسخەکەی تری لای مندا بەشێوەی (حرباء)ە بە دانانی نیشانەی بزوێنی (ژێر= کەسرە) لەبن پیتی (ح)یەکەدایە. کە ئەوەش ڕاستەو نووسەری (ج) لەسەر ئەم دیاریکردنەم چی لەبارە نەنووسیوە، بۆیە لێم بێدەنگ بوو.

**واتای گشتی:**

دوابەدوای تاکی پێشووتر و لە درێژەدانبە تاکی پێشوو دا (کوردی) ڕای گەیاندووە کە پێغەمبەر جارێک وەک مۆم (چرا) ڕووناککەرەوەی کۆمەڵگایەکەی و جارێکی تریش بووە بە پەروانە بەرامبەر بە پەرتەوی خوایەتی لە جاری تردا لەوانەش تێپەڕ دەکات و لە (ظهور – دەرکەوتنەکەیدا) وەک (ئەستێرەی خۆر) نەک هەر کۆمەڵگایەکەی بەشکو هەموو جیهان لەسەر پێودانی (رحمةً للعالمین) بەجارێ ڕووناک دەکاتەوە بە بەهرەوەری ئاینەکەی دەکات.

٦٥- (أرنی): خۆتم پێشان بدە، خۆتم بۆ دەرخە (تاکو بتبینم) خۆتم لێ ئاشکراکە. ئەم وشەیە لێرەدا مەبەست هەر لەوەندە نییە، بەشکو نیشانەیە بۆ گفتوگۆیەکی حەزرەتی مووسا پێغەمبەر -د.خ- لەگەڵ خوای گەورەدا، لە چیایەکی (سینا)دا کە چل ڕۆژ بوو مووسا بەڕۆژوو بوو لەسەر فرمانی خوای مەزن و لەوێ خوا پەرستیی دەکرد و لەبیرکردنەوەدا بوو، دوای ئەوە ڕووی کردووەتە خوای کردگارو فەرموویەتی: (ربِّي أرِني أنظُر إلَيكَ) کە لە ئایەتی ژمارە (١٣٤) سوورەتی (الاعراف)ی قورئانی پیرۆزدا هاتووەو خوای گەورەش فەرموویە (نامبینی) و (بڕوانە ئەوکێوە) کە پەرتەوی خوای پەروەردگار گەیشتە کێوەکە، ئەو چیایە هاڕاندی و هەڵوری و بە فووتدا چوو.... هەتا کۆتاییی بەسەرهاتەکە، کە لە شوێنانی تری ئەم پەڕاوییەدا پێشکەشم کردووە. هەروەها وشەی (أرنی) لە ئایەتی ژمارە (٢٦٠) سوورەتی (البقرە)ی قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە، کە ئەم جارەیان حەزرەتی (ئیبراهیم پێغەمبەر – د.خ) لەخوای ویستووە کە پیشانی (ئیبراهیم) بدات، چۆن خوا مردووان زیندوو دەکاتەوەو.. هتد

(کوردی) مەبەستی لەم جارەیان نییە نیشانەکەی بۆ فەرموودەکەی مووسایە.

گو: بێژەر کە لەگەڵ وشەکەی (أرنی) دا دەبێتە (ارنی بێژ) کە مەبەست لە مووسایەک کە وەهای گوتووە.

بەطور یا بە (طور) واتە ئەم وشەی (طور)ە مەبەست لە (دوو) وشەی (طور)ە لەناوچەی (سینا)دا کە (پەرتەو)ەکەی خوای بەرکەوتووە و سووتاوە، لە گفتوگۆیەکەی مووسادا لەگەڵ خوای مەزندا. وەک: (بە طوور) لە (طور)دا...

(طور)ەکەیشیان بەواتە: (جۆر، چەشن....) وەک (بە طور) = بەچەشن.

کە هەردوو (وشەکە) بۆ هەڵبەستەکە دەگونجێن و ئەمەش جوانکارییەکی وێژەییی کۆنە لەم

ڕاگەیاندنەی (کوردی)دا.

شوق: ئارەزوو، ئارەزوومەندی، تاسە، هەڕەتی بەهێزیی دڵدار، خوشویستن.

آمد: هەرچەندە واتای (هات) دەدات، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (هاتێ)= وەک: شەوقی هاتێ، تاسەو ئارەزوومەندییەکەی زۆری سەند. خۆشەویستییەکەی گەیشتە هەرە ئەوپەڕی هێز و شەیدایی.

پرتو انداز: پەڕتەو پەخشکار، تیشک هاوێژ. ئەمە نیشانەیە بۆ ئەو پەڕتەوەی خوا دیاریدانەی دوای خواستەکەی مووسا پێغەمبەر- د.خ- کە خوا ببینێ و خواستەکەی نەهاتەدی، بەڵام پەڕتەوی خوا دەرکەوت و لە کێوی (طور)ی دا و سووتاندی و...

(کوردی) ڕای گەیاندووە ئەو پەڕتەو پەخشان بوو بە سەر شاخی (طور)دا. کە لە ناوچەی (سینا)یە وەک فەرموویەتی:

کوە سینا شد: کێوی سینا بوو کە مەبەست لەوەیە وەک ڕای گەیاند ئەو پرتەوە خواییە دای لە (کێوی سینا) و، یا کێوی (طور) لە سینادا. کە لەشوێنی تری ئەم پەڕاوەشدا ئەم باسەم بە درێژتر ڕاگەیاندووە، بەتایبەتی لەتاکی پێنجەمی ئەم (حەوت بەند)ەدا.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی هەر (حەوت بەند)ەکە (٦٥)مین تاک و لەم (بەندی سێیەم)ەدا (١٧)مین تاک و شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیش لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:- لە (مک، ف)دا حەوتەمین هەڵبەست و لە (جم، ق/ ٣) دا هەشتەمین و لە (ج، صم، سجا، ط، نم/ ١)دا نۆیەمین و لە (با/ ١) دا دەیەمین و لە (گل/ ٣) دا دوانزەیەمین تاک و لە (ص، صا، نع)دا (١٣)مین تاک و لە گل/ ٥، مع)دا (١٤)مین و لە (گل/ ٦، گل/ ٨، ما/ ١) دا (١٥)مین تاک و لە (شح، عم) دا (١٦)مین و لە (مس، ن، ه)دا حەڤدەیەمین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

گو لە (عن، ما/ ١، گل/ ٥، گل/ ٦) دا نووسراوە: (گفت) و (گوتی) و ئەمیش تەواوە و دەگونجێ و هەمان واتا دەدات.

شوق، لە (گل/ ٥، گل/ ٦، جم، نم/ ١، با/ ١، سجا، هم) دا نووسراوە (عشق). من جیاکردنەوەو چۆنێنیی ئەم جیاوازی و هەموو جیاوازییەکانی ئەم حەوت بەندەم وەک چۆن لێرەدا نووسیون، ئاوەها خستووەتە بەر دەستی نووسەری (ج)ەوە، بەرلەوەی کە نامیلکەی (ج)کەی لەسەر ئەو حەوت بەندە پێک بهێنێ، کەچی ئەوەتا لەنێوان ئەم حەوت سەرچاوەیەی کە ڕام گەیاندووە لە جێگەی وشەی (شەوق) تیایاندا نووسراوە (عشق) ئەو نووسەری (ج)ە نووسیوە.

انداز، لە (ما/ ١، ق/ ٣) دا نووسراوە: اندازی و ئەمیش دەگونجێ چونکە لە (فارسی)دا بەشێوەی (ئەنداز) و (ئەندازی)یش دەخوێندرێتەوە و یەک واتاو مەبەست دەدەن.

کوە، لە (مک، ط، ج)دا وانووسراوە: نخل. کە ئەمەش هەم هەڵەیە و هەم بۆ ئێرە واتا نادات. ئەم هاتنی وشەی (کوە)ە لام وایە لە تاکی پێنجەمی بەندی یەکەمدا کە باس لە دارخورماکەی

(حەزرەتی مریەم)ە بە هەڵەی نووسەری سەرچاوەی ئەو سێ نوسخەیەیە کە وەها شێوابێ.
واتای گشتی:-کاتێ کە حەزرەتی مووسا فەرمووی ئەی خوایە خۆتم پیشان بدە کە ئەوەندە شەیدای عەشقی خوایی بووم. بەڵام لە وڵامی خواستەکەیدا خوا پەرتەو (جەلا)ی خۆی ئاراستەی کێوی (سینا- طوور) کرد و... هتد...
٦٦- هدهد: بەکوردی (پەپووسلێمانکە، پەپووسڵێمانە)یە..
لە (تەورات) دا ناوی هاتووە و لە ئایەتەکانی (٢٠-٤٤)ی سووورەتی (النمل)ی قورئانی پیرۆزدا باسی کراوە: ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی) داستانی ئەو پێغەمبەرەو قەرالیچە (بەڵکیس)ە خاتوونی پاشای (سەبەء)ی یەمەنی مەبەستە، کە (کوردی) مێژووی ئاینی ئەم تاکە هەڵبەستە و تاکە هەڵبەستی دوایی وەک بناغەیەک بردووەتەوە سەر (پێغەمبەری ئیسلام) بابەتی (گەدایان)ەکەی (بەندی یەکەم و دووەم)ی ئەم حەوت بەندەی لەگەڵدا بەکانگیر کردووەتەوە، کە ئەمجارەیان لەو (سولەیمان پێغەمبەرەوە- درووی خۆیان لێ بێ) دەستی پێ کردووە.
خبر بەملک سبـاء : هەواڵ بە، بەنیشتمانی. سەبەء: ناوی شارێکی کۆنی هەرێمی یەمەنە کە پایتەختی فەرمانڕەوایی بووە لەو سەردەمەدا کە ئەم تاکە هەڵبەستە لێی دواوە.
لەسەرەتای ئەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) فەرموویەتی: (هودهودی = وەکو پەپووسلێمانە)و لێرەشدا فەرموویەتی: ئەو پەپووسلێمانەیە (هەواڵی بۆ وڵاتی پایتەختی سەبەء)... کە لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا ئەو (ڕاز دادان)ەی کۆتایی پێ دەهێنێت:
بردو چون جم: واتە هەواڵ (پەیام)ی سلێمانی پێغەمبەری وەک جەم گەیاند بە (خاتوو بەڵکیس) و (پەپووسلێمانە)کە.
جم: جەمشید -یا- جەم، چوارەمین پاشای خانەوادەی (پێشدادیان)ی مەزنترینیانە و پاڵەوانێکی بەناوبانگی ئەفسانییشە.
بە تخت صنعا شد: گەیشتە تەخت یا پایتەختی صەنعا.
واتە وەکو پەپووسلێمانکە (هەواڵی: نامەکەی، یا پەیامەکەی) حەزرەتی سلێمان بۆ نیشتمانی (سەبەء) بردو لەوێ جەم (جەمشید) ئاساییانە چووە (گەیشتە) سەر تەختی (صەنعا)ی وڵاتی یەمەن، کە ئەمە پوختەیەکی کورتی واتای ئەم تاکە هەڵبەستە بوو،
ئەمجا ئایا ئەو (نامە- یا- پەیام)ی حەزرەتی سلێمان لە خاکی (فەلەستین)ەوە بۆ خاکی یەمەن بۆ کێ و لەبارەی چییەوە بووە؟
تا ئێرە لە چەند لایەکی ئەم تاکە هەڵبەستەوە واتایەکم پێشکەش کردو پێم وایە توانیبێتم بابەتەکەم ڕوون کردبێتەوە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (٦٩)مین و لەم بەندی سێیەمەدا (١٨)مین تاک و بەپێی شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەی دوایییە. لە
(با/ ١، حم، سجا، ص، صا، ط، ف، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، نم/ ١)دا نییە و لە (جم، ق/

٣) دا نۆیەمین تاک و لە (گل/ ٣)دا سیانزەیەمین تاک و لە (مع) دا پانزەیەمین تاک و لە (ما/ ١) دا شانزەیەمین و لە (شح، عن، ن، نع)دا حەڤدەیەمین تاک و لە (مس، ه)دا هەژدەیەمین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

جیاوازییەکان:

هدهد لە (ما/ ١) دا نووسراوە (هد هد) کە ڕاستە

هد هدی لە (نع، مع) دا نووسراوە: (هد هد آسا) کە ئەمەش تاکە هەڵبەستەکە لەنگ دەکات

سەبەء، لە (مک، ط، ج) دا نووسراوە (سبأ) کە ڕاستییەکەی (سبأ – سەبەء)ە.

بە ملک لە (ص، جم، گل/ ٣)دا نووسراوە (بشهر): واتە بۆ شاری و ئەمیش دەگونجێ، بەڵام (بەملک)ەکە ڕاستترە، هەم (شار) و هەم (پایتەخت)یش دەگرێتەوە.

جەم لە (مع)دا نووسراوە: جسم – کە ئەمەش ڕاست نییە و لەنگە

صنعا لە، (ج، ط، مک) دا نووسراوە: (صفا)

**واتای گشتی:**

ئەگەرچی لە لاپەڕەکانی پێشەوەدا لەسەر ئەم تاکە هەڵبەستە واتایەکەیم پێشکەش کردووە، بەڵام بۆ ئەوەی کە ئەو واتایە لەگەڵ مەبەستەکەی (کوردی) دا بگونجێنم کەوا لەم تاکە هەڵبەستەیدا بە ڕواڵەت وەک لەپرێکا (کوردی) بابەتەکەی گۆڕیوە بۆ تواناییە لە ڕادەبەدەرەکانی (سلێمان پێغەمبەر – د.خ) کە مەبەستی (کوردی) ئەوە بووە: (تەنانەت سلێمانیش، بەو شان و شکۆو تواناییەوە هەتا دەگاتە سەر (جبرەئیل و عیسا پێغەمبەر–د.خ) هەموو دەنگیان لە مەزنایەتی و کەسەتییە گرنگەکەی (پێغەمبەری ئیسلام– د.خ) داوە، وەک ئەم مەبەستەی ناو ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە و مەبەستی تاکی ئایندەش ئەم ڕاگەیانەی سەرەوەی من ئەگەیەنن (بڕوانە تاکی ئایندە) بەکورتی لەم تاکەشدا ڕای گەیاندووە کە:

وەک باڵندەی (هدهد)ی تیژڕەو و، بەفەرمانی (حەزرەتی سلێمان) نامەی (سلێمان)ی بردە پایتەختی (سەبەء)و ئەو (پەپووسلەمانکە)یە وەک جەم (جەمشید) چۆن تەختنشین بوو، ئاوهایش ئەو (پەلەوەر)ە بە نامەکەوە چووە (گەیشتە) ناو شاری (صەنعا)یشەوە کە بەر لە پاشایەتییەکەی (بەڵکیس) ئەم قەڕالیچەیە لەم (شارە)یشیاندا بووە یا کاتی نامە بردنەکە (بەڵکیس) چووەتە، ئەم شارەیان و لەوێ نامەکەی داوەتێ.

٦٧– همچو روح القدس: هەر وەکو ڕوحول قودوس. (ڕوحول قودس) یەکێکە لە ناوەکانی (جبرەئیل)ی فریشتە، کە سەرۆکی فریشتەکان و نزیکترین لەخوای گەورەوەیە.

ئەم ناوی (جبرەئیل) لە (تەورات) و (ئینجیل) و (قورئان)یشدا هاتووە کە ئایەتی (٨٧ و ٢٥٣)ی سوورەتی (البقرة) و (١١٠)ی سوورەتی (المائدة) و ئایەتی (١٠٢)ی سوورەتی (النحل)ی قورئانی پیرۆزدا بەم ناوی (روح القدس)ەوە پێناسە کراوە و، لە هەرسێ پەڕاوی پیرۆزی (تەورات) و (ئینجیل) و (قورئان)دا شوێنێکی مەزنی هەیە لە کاروباری پێغەمبەرانداو لە بەجێگەیاندنی موعجیزەکانیاندا یاریکاریان بووە و هەر ئەویش وەحی (سرووش)ی بۆ

پێغەمبەری ئیسلام هێناوە و لەم بارەیانەوە لە تاکە هەڵبەستی (١٩)یەمی بەندی یەکەمی ئەم (حەوت بەند)ەدا بە درێژیتر نووسیومەو بڕوانە ئەوێ.

پیام از خویش: (پەیام، نامە، هەواڵ، سرووش، وەحی) کە مەبەست لە وەحی هێنانەکانی (جبرەئیل)ە کە بۆ پێغەمبەری ئیسلامی هێناوە.

خویش: خۆی، از خویش: لە خودی خۆیەوە، وەک نێردراوێکی خوای مەزن (وەحی = سرووش)ەکانی گەیاندوون وە لێرەدا (کوردی) نیشانەی بۆ ئەو پێشبینییانەی ئاینەکانی تر کردووە کە لەپەڕاوییە پیرۆزەکانیاندا نیشانەیان بوو پەیابوونی پێغەمبەری ئیسلام تیا هاتووە وەک ئاڤێستا، تەورات و ئینجیل کە زانا پاکەکانی ئەو ئاینانە لەو نیشانە بۆ کردنەی پەڕاوییە پیرۆزەکانیان گەیشتوون و ئەوانەیان کە بەسەرێنی پێغەمبەری ئیسلام کەوتن بەگورجی ئیسلام بوون وەک لەم تاکەدا.

پیام از خویش: سرووش و وەحی لە خۆیەوە کە (جبرەئیل)ەکەیە و ئەوە نیشانە بۆکردنی ئەو پەڕاوییانەی لەمەڕ پەیابوونی پێغەمبەری ئیسلامەوە پێ ڕاگەیاندوون کە هەر لە (باوکە ئادەم)ەوە هەتا حەزرەتی عیسا- د.خ کە دواترینی هەموو پێغەمبەرانە، جگە لە پێغەمبەری ئیسلام، ئەو پەیامە واتە مژدەی (وەحی) پەیابوونی پێغەمبەری ئیسلامە هاتووە، وەک (کوردی) ڕوونتری کردووەتەوەو فەرموویەتی:

داد: دای (وەحی)ی دا، وەحی ڕاگەیاند.

وانگە: ئەوکاتە مەبەست لەم نیو باڵی دووەمە ئەوەیە کە مژدە یا (وەحیی) پەیابوونەکەی گەیاند و ئەوسایە:

بە شکل عیسی شد: چووە شێوە (شکل)ی (عیسی) پێغەمبەر. وەک چۆن لەتاکی (٦٣)یەمی ئەم حەوت بەندەدا هاتووە کە لەویدا چۆن چووەتە (صورەت)ی (خەلیل) واتە (حەزرەتی ئیبراهیم)ەوە ئاوەهایش لێرەدا، چووەتە شێوەی حەزرەتی عیساوە، واتە (پەیامەم)ەکانی هەموو پێغەمبەران، کە لەیەک خواوە (وەحی) و پەڕاوییە پیرۆزەکانیان بۆ هاتووە کە واتە هەموانیان یەک شێوە و شکڵ و صورەتن و دواجار یان پێغەمبەری ئیسلام بووە پەیام (ریسالە) کەی خۆی ڕاگەیاند و، ئاینەکەی بڵاو کردەوە ئەم تاکەیش تەواوکەری تاکی پێشووە کە هەر لە (سلیمان پێغەمبەرەوە بوو) هەتا ئەم تاکە کە هەتا (عیسا پێغەمبەر)ەو گەیوەتە پەیابوونە کە پێغەمبەری ئیسلام کە مەبەستی (کوردی) لە ئاوێتەکردنی ئەم (دوو) تاکە هەڵبەستەی مەزنێتی پێغەمبەری ئیسلام ڕاگەیاندن بووە، لە تاکە هەڵبەستی ئایندەدا مەبەستەکەی خۆی بەوە ئاشکرا نەکات کە وەک لەتاکە هەڵبەستەکانی پێشوودا هەر لە باوکە (ئادەم)ەوە هێناونی و ناوی بردوون هەتا (عیسی) وەک لەم ئایەتەی (١٩)ی سوورەتی (مریەم) دا و لەم تاکەدا ئاوەهاو لەتاکی ئایندەدا مەبەستەکەی کۆتاییی بەوە دەهێنێ کە پێغەمبەری ئیسلام (خاتەم الا نبیا) بووەو کۆتایی بەوە هێناوە کە ئیتر پێغەمبەری تر لەدوای ئەمەوە نایەت. بۆ زۆرتر ئاگەداری لەم ڕاگەیاندنە بڕوانە تاکە هەڵبەستی (٦١) لەم بەندی سێیەمەدا.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی (حەوت بەند)ەکە (٦٧)مین تاک و لەم بەندی سێیەمەشدا تاکە هەڵبەستی ١٩مین شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستەش لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
لە (با/ ١، سجا، شح، ص، صا، ط، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨، دا نییە و
لە (ف)دا هەشتەیەمین تاک و لە(مک) دا نۆیەمین و لە (جم، حم، ق/ ٣، نم/ ١) دا دەیەمین و لە (ج)دا یانزەیەمین تاک و لە (گل/ ٣) دا چواردەیەمین تاک و لە (مع) دا شانزەیەمین تاک و لە (ما/ ١) دا حەڤدەیەمین تاک و لە (عن، نع)دا (١٨)مین و لە (مس، ن، هـ) و (١٩)مین تاکە.

**هەڵسەنگاندن:**

وەهای بۆ دەچم کە (شێواوی)یەک لە (پیام از خویش)کەدا هەبێ و، وەک دەقی فەرموودەکەی (کوردی) نەکەوتبێتە دەست من وەهایە.

**جیاوازییەکان:**

داد وآنگە، لە (ص) دا نووسراوە (داد از ان پس)- ئەمیش دەگونجێ و بەواتە (دای و، لەوەپاش).
داد و آنگە، لە (گل/ ٦، شح) دا نووسراوە: (دا دآنگە) ئەمیش دەگونجێ دادو آنگە، لە (گل/ ٣) دا نووسراوە: داد پس او- ئەمیش دەگونجێ.
داد وانگە، لە (نع) دا نووسراوە: دادو آنگاە ئەمیش دەگونجێ بەڵام قورسە.

**واتای گشتی:**

هەروەک چۆن فریشتە جبرەئیل سرووش (وەحی)ی هێناوە و بۆ پێغەمبەری ئیسلام کە بەدوای (عیسا) دا هاتووە وەک ئاینەکەی ئەم نوێ بکاتەوە- لە توێی لێکدانەوەی وشەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەدا بە درێژیتر لێکم داوەتەوە.

٦٨- همە امادە باش

- مەبەستی لەو هەموو پێغەمبەرانەیە کە لە تاکەکانی پێشوودا هەر لە باوکە (ئادەم)ەوە هەتا (عیسا) دروودی خوایان لێ بێت، (ئامادەباش = لە ئامادەبووندان)واتە ئەو پێغەمبەرانە، لە چاوەڕوانیدا بوون بۆ هاتنی پێغەمبەری ئیسلام
هنگامی: دەمێک، کاتێک، پێغەمبەری ئیسلامی تیا دەرکەوێ
(کاندران) کە ئا لەو، مەبەستی ئەو هەموو پێغەمبەرانە کە لەباری ئامادەبووندا بوون و ئەو کاتە کەوا:
خاتم: کۆتاییهێنەر (بە پێغەمبەرێتی کە مەبەست لە پێغەمبەری ئیسلامە) وەک لە تاکەکانی پێشوودا، لەم (خاتەمی)یە دواوم.
امر فرما شد: واتە ئەو (خاتەم)ە فرمانی خۆی ئەدات کە ئاشکراکردنی ئاینەکەیەتی و مەبەست لەوەیە کە هەموان لە چاوەڕوانی و ئامادەیی بیستنی فرمانی ئەوەدا بوون کە پەیرەوی بکەن.
ئەم بابەتی (خاتەم)ێتییە لە ئایەتی (٣)ەمینی سوورەتی (المائدة) دا هاتووە کە لەساڵی (١٠)ی

کۆچیداو لەرۆژی (هەینی)دا لە (عەرەفات) لە حەجکردندا ئەم ئایەتەی بۆ هاتووە، کە لەو (حەج)ەدا (٩٠) هەزار کەس بەشداری بەجێگەیاندنی بوون بە پێشەوایەتیی خودی پێغەمبەری ئیسلام-د.خ-.
لەو حەجەداو وتارە گرنگە بەناوبانگەکەی خۆی تیا پێشکەش کردووە بەو (حەج) کارانەو بەئیسلامیش بە تێکرایی.
لەو وتارەیدا نیشانەی بۆ (مردنی خۆی) کردووە، بەوەی کە بە دوا حەجی خۆی داناوە، بۆیە ئەو (حەج)ە بە (حجە الوداع) واتە (حەجی ماڵاوایی) ناونراوە.
ئایەتە نیشانە بۆ کراوەکەیش ئەمەیە:
(اليومُ اَكمَلتُ لَكمُ دينَكُم،... هتد)
واتە: ئەمڕۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواو کردن و کۆتاییم پێ هێناو... هتد.
من لە شارەزایەتی و وردیی (کوردی) وەها ڕەوا دەبینم کە ئەویش ئەم ئایەتەی مەبەست بووە لەم تاکە هەڵبەستەیدا و، لەتاکە هەڵبەستی (حەوتەم)ی بەندی یەکەمی ئەم (حەوت بەند)ە دا بە درێژتر لەم بارەیەوە دواوم. ئەم تاکە هەڵبەستە لەم (حەوت بەند)ەدا (٦٨)مین و لەم بەندی سێیەمەدا (٢٠)مین تاک و لە سەرچاوەکانیدا شوێنی بەم جۆرەیە:
لە (با/ ١، جم، ج، حم، سجا، ط، صا، عن، ف، ق/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٨، ما/ ١، مع، مک، نم/ ١)دا نییە و لە (ص) دا چواردەیەمین تاکە و لە (گل/ ٣)دا (١٥)مین و لە (گل/ ٦) و (١٦)مین و لە (شح) دا (١٨)مین و لە (نع) دا (١٩)مین و لە (مس، ن، ه)دا (٢٠)مین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

هنگامی، لە (گل/ ٣، گل/ ٦) دا نووسراوە (آن بودند) ئەوە بوون ئەمەش دەگونجێ.
کاندران، لە (گل/ ٣، گل/ ٦) دا نووسراوە: کە دران = کی دەران- ئەمەش کوورەو (کاندران)ەکە بەجێترە.

**واتای گشتی:**

هەموو پێغەمبەران چاوەڕوانی ئەو دەمە بوون کەوا (خاتەم) فرمانی خۆیان پێ ڕابگەیەنێت و دیسانەوە بەم جۆرەش لێک دەدرێتەوە کە لەو چاوەڕوانییانەدا پێغەمبەرێتیی (خاتەمی) یشی دراوەتێ کە ئاینی ئیسلام بوو بەدوا ئاینی و ئەوانیش ئەو فرمانەیان پێ گەیشتووە.
٦٩- پێشەکی ڕای دەگەیەنم، کە ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە تەواوکاری ناوەڕۆکی تاکی پێشووە.
نسخ: لابردن، لابران، نەهێشتن، پووچبوونەوە، هەڵوەشاندنەوە، لە هەمان کاتیشدا وشەی (نسخ) واتای جۆرە نووسینێک ئەدات کە (قورئان)ی پێ نووسراوەتەوە.
ئەو جۆرە نووسینە: (خواجە عیمادەدین یاقووتی موعتەصەمی) دای هێناو کە ئەمەش لەگەڵ واتای ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەگونجێ و، ئەوەی بە قورئان بگوترێ: (نەسخی ئاینەکان) بووە.
مەبەست لەم وشەی (نەسخ)ە پووچبوونەوەی ئاینەکانە بە پەیابوونی ئاینی ئیسلام؛ چونکە

ئیتر دوای ئەم ئاینە، ئاینێکی ترو پێغەمبەرێکی تر نەهاتووە و، نایەت و، ئاینەکان گۆڕدران بەوجۆرە نووسینەی ناوی (نسخ)ە و قورئانی پیرۆزی پێ نووسراوەتەوە و دەنووسرێتەوە هەڵوەشێنەری ئاینەکانە.

ادیان: ئاینەکان کە (نسخ) بوونەتەوە:

ختم: کوتاییهاتن، کە مەبەست لە کۆتاییهاتنی ئاینەکانە کە لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا بە درێژی لێکم داوەتەوە.

بەم کوتاییهاتنە وەک چۆن زۆر لە دەقەکانی ناو (تەورات) بە هاتنی عیسا پێغەمبەر- د.خ- لە (ئینجیل)دا ئەو دەقانە هەڵوەشێنرانەوە و کۆتاییيان پێ هات، هەروەها لە قورئانیشدا زۆر لە دەقەکانی ناو (ئینجیل) کوتاییيان پێ هات و دەقە ئیسلامییەکان جێگەیان گرتنەوە، چونکە بە تێپەڕبوونی ساڵەهای ساڵ، مرۆڤ و، شارستانێتی پێش دەکەون و پێویست بەوە دەکات کە گۆڕانێک بەسەر بەندوباو، نەریتدا بهێنرێت، ئاوەها ئەو ئاینانەی بەر لە ئیسلام ئەو گۆڕانەیان بەسەر داهات و دەقە ئیسلامییەکان پێویستیان بەو گۆڕانە بەسەردا هاتنە گشتییە نەما.

انها کرد و یا (اینها کرد) کە (آنها کرد): واتا کۆتاییی بەوان هێناو وشە (انها) بە (اینها)یش دەخوێنرێتەوە کە دیسان واتای کۆتایی دەدات : (انها = ئەوانە) و (ئینها = کۆتایی).

تائێرە لەمەڕ لێکدانەوەی وشەکانی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە بوو کە لەنێو باڵی دووەم دا:-

نور یزدان: نووری خوا، پەڕتەوی (جەلا)ی خوای مەزن کە مەبەست لە پێغەمبەری ئیسلامە کە نووری خوایی بووە.

شاهدما شد: بە واتە ئەو نووری خوایە (بوو بە خۆشەویستی ئێمە یا گەواهیدەر)ی ئێمە بوو، بۆ ئەم ڕاستییانەی ڕای گەیاندن، یا نیشانەیە بۆ ئەوەی کە دەڵێن شەقڵی پێغەمبەرێتی (ختم النبوە) بەناوشانی پێغەمبەرەوە بوو، کە ئەو (مۆر = شەقڵ)ە گەواهیدەری ڕاستیی ئەم ڕاگەیاندنانەیە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە زنجیرەی ژمارەی تاکەکانی ئەم (حەوت بەند)ە دا (٦٩)مین پێی ئەم (بەندی سێیەم)ە (٢١)مین تاکە هەڵبەستەو شوێنی ئەو تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە سەرچاوەکانیدا بەم چەشنەی دواییە:

لە (ج، ص، ط، عن، گل/ ٦، مک، نم/ ١، شح)دا نییە و لە (ف)دا (٩)یەمین تاکە هەڵبەستەو لە (سجا) دا (١٠)یەمین و لە (با/ ١، جم، حم، ق/ ٣) دا (١١)مین تاک و لە (مع)دا (١٧)ەمین و لە (ما/ ١)دا (١٨)ەمین و لە (نع) دا (٢٠)ەمین و لە (مس، ن، ه) دا بیست و یەکەمین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازی:**

ئەم تاکە هەڵبەستە تا ئێرەی ئەم بەندی سێیەمە، یەکەمین تاکێکە کە لە هەموو سەرچاوەکاندا چونیەکەو جیاوازیی نییە لە سەرچاوەکانیدا.

**واتای گشتی:**

دیاریکرانی پێغەمبەری ئیسلام بە (خاتەم) ئاینەکانی تری هەڵوەشاندنەوەو ئاینی ئیسلام جێگەیانی گرتەوە، بەڵێ، چونکە ئەو نوور (جەلا)ی خواییە کە (محەمەد -د.خ-) خۆیەتی و خۆشەویستی ئێمەو گەواهیدەری ئەو ڕاستییەیە.

٧٠- (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە و، لە پیشاندانی گەورەیی و ڕواڵەت و خۆشەویستیی پێغەمبەر -د.خ- دا دەوەستێ و؛ لادەکاتەوە بەرەو (گەدایان)ەکەی پێشووتری و دەگاتەوە سەر خودی خۆی وەک (گەدایەک) و کۆتاییی ئەم بەندی سێیەمەی پێ دەهێنێ.

ان گدائی: ئەو گەدایەی، ئەو بێ نەوایەی، ئەو سواڵکەرەی کە چاوی لە دەستی پێغەمبەرە، کە لەتاکە هەڵبەستەکانی لەمەوبەری ئەم (حەوت بەندە)ەدا بەدرێژی لێیان دوام، لەڕێی پەیڕەوی ئایندا (لە دنیا بڕاوە)،

کە ریزە خورش بود: کەوا (پاش خوان) و ئێسک و وردە نانی پاشماوەی سەر سینی و سفرەی ئەو پێغەمبەرە بوو، - کە مەبەست لەوەیە ئەوی ئەو پێغەمبەرە فەرموویەتی و لە (ئایەت) و (حەدیث) و بەکردەوەی خۆی ڕای گەیاندووە (گەدا)یش وشەیەکی صۆفیانەیە ئەو پەیڕەویکارەی کە (کوردی) لە ( گەدا) سواڵکەری ئەو پێغەمبەرەی ناوم بردووە - ئەو گەدایە بەو پەیڕەویکردنە، واتە وەک سواڵکەر پاشماوەی سەرخوانی ئەوی خواردووە، ئەو گەدایە بەو هۆیەوە:

گشت و مستغنی: واتە گەدایەکە (پێ گەیشت) و کەوتە (خۆشی خۆشی)ی هەڵپەڕکێ ئاساییەوە وەک بەدەوری خۆدا سووڕانەوەی مریدەکانی (جەلالەدینی ڕۆمی = (مەولەوی) جۆش دەسێنێ، هەروەها ئەو (گەدا)یە (موستەغنی بوو) واتە کەوتە بارێکی ئەوتۆوە کە چاوی تێربێ و بێ نیازبێ لە سامانی جیهانی و خەڵکی چاوی لە دارایی کەسانی ترەوە نەبێ ئەوە خۆی داراو دەست ڕۆیشتوو بووە، بە پەیڕەویکردنی دەقە ئاینییەکان ودڵی پێیان ناخۆشە؛ هەروەها (کوردی) پێی لەسەر ئەو (پێگەیشتن و موستەغنییەتییە داگرتووە) بەڕادەیەک ڕای گەیاندووە ئەو بارە خۆش و شکۆدارییەی ئەو گەدایە کە: ملک دنیا شد (مولک دونیا شود) واتە خۆشێتیی (مستغنی)یەتییەکەی لە ڕادەیەکدا تەنانەت چاوی لە موڵکی دنیاوە نەبێ، تەنانەت لە پادشایەتیشەوە.

(ملک)یش بە واتە: ئەوی کە لەژێر دەست و دەسەڵاتی کەسێکە بێت لە زەویوزارو سامان و دارایی و هەر شکۆداری و ڕێزو پلەوپایەو مەزنایەتیی جیهانی و تەنانەت پاشایەتیش کە مەبەستی (کوردی) لەوە بووە کە پێویستی بەو (ملک)ە نەبێ، کە (دنیا)یە، واتە گێتی، جیهان، ئەم جیهانەی کە تیا دەژین ئەو گەدایە هەرچی پێویستی بێ، بەم شتومەکە جیهانییانە نیەتی و سامانداری ژیانی پڕ کامەرانیی گیانییە، لە دنیا دابڕاوەو، تەنیا هەژارو چاو لەدەست و چاوێری خوای مەزنە و خۆی تەرخانی (بەڕاستی) ناسینی خواو بەپاکی پەرستنێتی و پەیڕەویکردنی ئاینی کردووە. (گەدا)یش وشەیەکی صۆفیانەیە کە بەتایبەتی لە سەرەتای

بەندی (دووەم)ی ئەم حەوت بەندەدا لێی دوام.
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم (حەوت بەند)ە دا (٧٠)مین تاک و لەم (بەندی سێیەم)ەدا (٢٢)مین و شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەی دواییە:
ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی: (با/ ١، ج، جم، حم، ط، ف، ق/ ٣، گل/ ٣، مک) دانییە و لە (سجا، نم/ ١) دا (١١)مین تاک و لە (ص، صا)دا (١٥)مین و لە (گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨) دا (١٦)مین و لە (مع) دا (١٨)مین و لە (شح، عن، ما/ ١) دا (١٩)مین و لە (نع)دا (٢١)مین و لە (مس، ن، ھ) دا (٢٢)مین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

ئان گەداتی، لە (مع) دا نووسراوە (آن گدایان) کە ئەمەش (کۆ)یەو لەڕووی ڕێزمانەوە (ریزە حورش بوو) کە (تاک)ە، ناگونجێ:
گشت: لە (ما/ ١)دا نووسراوە (همە) ئەمیش، دەگونجێ

**واتای گشتی:**

ئەو گەدایەی کە پەیڕەویی پێغەمبەر کرد، پێی گەیشت و پێویستی بەکەس نەما ئەو خۆی بووە ساماندارى شکومەندی خواپەرستی بەڕاست وە دەستبەرداری دنیا بوو.

٧١- ئەم تاکە هەڵبەستە وەک لە لێکدانەوەییدا دەردەکەوێ، تەواوکاری تاکە هەڵبەستی پێشوو، وەسەرەتای تاکە هەڵبەستی ئایندەیە. کە:
مدتی: سەردەمێک، لە سەرەتێکدا، کاتێک بوو.
مەبەستی لە خودی پێغەمبەرە کە لە سەردەمێکدا:
در رکاب بندهء خویش: لەڕووی فەرهەنگی و زمانییەوە (رکاب) بە واتە – ئاوەزەنگی، ئەو ئامێرەی کە سوار لەکاتی سواربوونی وڵاخدا پێی چەپی دەخاتە ناو ئەو (ئاوەزەنگی)یەوە کە بە هەردوو لای زینی ئەو (وڵاخ)ەدا شۆڕ بووەتەوەو) وەک پلیکانەیەک سوارەکە دەتوانێ بە ئاسانی سواری (وڵاخ)ەکە ببێ و لە (سواری)یشدا هەردو سنگی بێ بنی سوار لەناو ئەو ئاوزەنگی)یەدا دەبن – کە بەم واتا (زمانییە) ئەم وشەیە ناگونجێ بۆ ئێرە، و بەشکو ئەم وشەی (ڕیکاب)ە بەپێی مەبەست بۆ ئەم تاکە هەڵبەستە دەگونجێ کە مەبەست لەو (سوارە)یە، کە بەدوای سەرۆکێکەوە، بەسواری بڕوات کە لە عەرەبیدا دەڵێن (فی رکاب) = (بەسواری لە دەرباریتیی....) (مدتی در رکاب) مەبەست لەوەیە کە پێغەمبەر لەڕووی (خۆ بە گچکەی هەموان) زانین و (تەواضوع)ەوە وەک سوارەی دەربارەی پەیڕەوی کارەکانی خۆی بووبێ ئاوەها برایانەو یەکسانانە هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا کردووە.
بەپێی ئەو فەرمووده دیموکراتییانەیەی:
(سَيّد القوم خادمهم) واتە سەرۆکی کۆمەڵگایەک نۆکەر و کۆیلەی کۆمەڵگایەکەی خۆیەتی، خزمەتکاریشیانە. بەندەیی خویش: بەندەکانی خۆی، پەیڕەویکارانی ئاینە ئیسلامییەکەی کە خۆی پێشکەش کردبوون، ئەوانەی دوێنێ پێغەمبەر شوانی ئەوان بوو، ئەمڕۆ گەورەیانە واتە:

پێغەمبەر لەسەردەمێکدا کە وەک دەربارو سواری دوای بەندەکان (پەیڕەویکارانی) خۆی وەها بووەو، خۆی لەوان بە گەورەتر پیشان نەداوە و هەر ئەو پێغەمبەرە مەزنە:

مەهتری کرد: (مەهتر: مەیتەر – ئەو کۆیلەیەی کە کارو فرمانی ئەوەیە: چاودێری ولاخە سوارییەکانی گەورە (ئاغا)یەکەی خۆی بکات)، (کرد = کردی) واتە مەیتەرێتی کردو) کە مەبەستی (کوردی) لەوەیە تا ئەو کەسەتییە مەزنە کە پێغەمبەریش بوو خۆی بەدەربارو سوارە و ئەوەی (پێ لە ئاوزەنگیی سواریدایە بەدوای گەورەکەیەوە) ئەو خۆی بە کۆیلەی ئەو (بەندەو پەیڕەوی کاران = ئیسلامەکان) دادەنا و نەک هەر ئەوەندە بەشکو تەنانەت مەیتەرێتی ولاخەکانی ئەو (بەندە)یانانەی خۆی دەکرد ئەو خۆی وەک ئەوان ئەزانی و خۆی لەرووی توێژی کۆمەلایەتییەوە لێ جیا نەئەکردەوە کە گەورەی ڕاستی دەبێ وەهابێ، وەک:

باز مولا شد: دیسانەوە بوو بە مەولا، باز: ناوی باڵندەیەکی تیژڕەو و گۆشتخۆرە کە نێچیر بۆ خاوەنەکەی دەگرێت و لەوەیە ئەو پێغەمبەرە بە زمان شیرینی و ژیرانە ژمارەی کەسانی ئیسلامی زۆرتر دەکرد وەک (باز)ەکە ڕاوی دەکرد و دەیخستنە پاڵ ئەو (بەندە) یانەی خۆی وەک پەیڕەوی ئیسلامەتییان دەکردو (باز = دیسان) خۆی بەسوارەی دەرباری ئەوان دەر دەخست نەک بە گەورەی ئەوان.

هەروەها و لە هەمان کاتیشدا کە وەک ئاشکرا ئەو پێغەمبەرە ڕەوشت بەرزو نێردراوی خوایە وەک (مەولای) ئیسلامەکان بووە (گەورەیان بوو) لە هەمان کاتدا (مولای) یشیان بووە واتە (کۆیلەشیان بوو)

مولا = بە سەرنج دانە واتایەکانی ئەم وشەی (مولا)یە کە هەم واتای (سەردار، سەروەر، ئاغا، خودان (مالک)، دەدات و هەم واتای: (بەندە، کۆیلە، مەیتەر)یش دەدات. کەواتە ئەو فەرموودە عەرەبییەی کە لەپێشەوە ڕام گەیاند کە: (سيّد القوم خادمهم)ەکە لەم واتای وشەی (مولا)یەوە وەرگیراوە کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە هەم: سەرۆکی (گیانی)و پێشەوای کۆمەلایەتیی کۆمەڵگایەکەی بووەو، هەم بەندەو مەیتەرو سواری دەرباریشیان بووە کە (کوردی) ئەمانەی مەبەست بوو.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی تاکەکانی ئەم حەوت بەندەو تاکی (٧١)مینەو بەپێی ئەم سێیەمەیش تاکی (٢٣)مینەو شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە سەرچاوەکانیدا بەم چەشنەیە کە:

لە (حم، سجا، ف، ق/ ٣، مع، نع) دانییە و لە (مک) دا دەیەمین تاک و لە (ط) دا (١١)مین و لە (با/ ١، ج، نم/ ١) دا (١٢)مین و لە (ص، صـــا) دا (١٦)مین و لە (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦، گل/ ٨)دا (١٧)مین تاک و لە ( شح، عن، مـــا/ ١)دا (٢٠)مین و لە (مس، ن، ھ)دا (٢٣)مین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

مدتی، لە (عن، مس) دا نووسراوە (بارها) واتە زۆرجار، (بارها)، کە ئەمەش زۆر بەجێترە لە وشەی (مودەتێ) بەلام لەبەر ئەوەی لە (١٦) سەرچاوەکەی دیکەدا (مودەتێ) نووسرابوو، بۆیە

(مودەتێ)م لەسەرەوە جێگیر کرد ئەگەنا (بارەها)یەکە گونجاوترو پڕ بە پرترو بەهێزترە لە واتاو پاکێتی زماندا.

(مەھتری) لە (ج، ط، مک، نم/ ١، ف، ق/ ٣)دا نووسراوە (قمبری) واتە (قەمبەری)= وەکو (قەمبەر) یش (بەندە ، کۆیلە)یەکی (ئیمامی عەلی بووە) کە لەم (٦) سەرچاوەیەدا بە کاریگەریی شیعە وشەی (مەھتری)یە کە گۆڕدراوە بەم ناوی (قەمبەر)ی کە دەرفەتیان لەوە هێناوە کە لەکێشدا ئەم وشەی (قەمبەری)یە هاوکێشی (میهتەری) و هەروەها وشەی (مەولا) کە لێکم داوە ئەو لەم تاکە هەڵبەستەدا هەیە کە شیعەکان کردوویانە بە پێناسەیەکی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و بۆ ئەوەی ئەم (حەوت بەندە) کەم هاوتایە وەها لێ بکەن کە گوایە (کوردی) ئەم حەوت بەندەی بەو (عەلی)یەدا هەڵداوە. بۆیە ئەم حەوت بەندە شاکارەیان بەو (عەلی)یە شایانتر دیتووە.

(کوردی)یش کە زۆر خودی ئەو (عەلی)یەی خۆش ویستووە، بەڵام (شیعە)ی بە (نەیار) ڕاگەیاندووەو بە چەندین بەڵگەی ناو ئەم (حەوت بەند)ە ئاشکرایە کە بۆ پێغەمبەری گوتووە نەک بۆ (عەلی) و ئەو (قەمبەر)ەیش، ئەگەرچی خزمەتکاری (ئیمامی عەلی) بووە، بەڵام گومانی تیا نییە کە ئەوەندەی ئەو (قەمبەر)ە لە (سەحابە)یەک بووە دەرباری ئیسلامەتی و پێغەمبەر بووە، ئەوەندە دەرباری (ئیمامی عەلی) نەبووە و دیسان کە بووە بە خزمەتکاری ئەو (ئیمام)، ئەویش هەر بە ئیسلامەتییەوە بووە ئەگەنا ئیسلامەتی نەبووایە خۆی بە چەندین (عەلی) نە ئەگۆڕییەوە هەروەک بەر لە ئیمامی عەلی ئەو (قەمبەر) بەندەی خودی پێغەمبەر بووەو ئەویش لە بڕوای بە دڵ و بەگیان کردنیەوە خۆی بەبەندەی ئەوان داناوەو ئاینی ئیسلامەتی بووە کە (قەمبەر)ی بەوانەوە بوونی وشەی (قەمبەر) لەم تاکە هەڵبەستەدا ئەوەندەی بوونی (مهتر)ەکە بەجێ و پڕ بە پڕو گونجاو نییە.

مهتری – دیسانەوە لە (گل٥/، گل/ ٦،، گل/ ٨، ط) دا نووسراوە: قنبری.

**واتای گشتی:**

سەردەمی (جاروبارێک) ئەو پێغەمبەرە خۆشەویست و خۆ بە زلنەزانە، ئەوەندە گیانێکی بەڕاستی دیموکراتیانەی هەبووە، خۆی بە سوارەو دەرباری ئەوانە داناوە کە بەڕاستی ئیسلام بوون کە وەک بەندە (کۆیلە)ی ئەو، وەها بوون و بەڵام پێغەمبەر، ئەوەندە برایانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردن و وەک خزمەتکاریان بووبێ، ئاوا لەگەڵیاندا جووڵاوەتەوەو بگرە تەنانەت (مەیتەری) شی کردبن و، ئەو ئەو سەحابەی کە لە بەجێگەیاندنی کارێکی چاکەی ئیسلامیدا بە ماندوویی هاتبێتەوە ئەو پێغەمبەرە نەک هەر بەردەستی و خزمەتی سەحابەکەی خۆی کردووە، بەشکو وەک (مەیتەر) چاودێری وڵاخی سواریی ئەو سەحابەیشی کردووە هەمدیسانیش هەر ئەو پێغەمبەرە سەردارو پێشەوای ئەو سەحابانە بووە.

٧٢- گە ز دنبال ناقە:

گە: گاوێک، دەمێک، جارێک، (زو = لە، بە) ، (دنبال = دوا) ، (ناقە = وشتری مێنگە، حوشتری

مێ) (کوردی) لەم (گە زونبال ناقە)یەدا واتە: (گاهێک بەدوای وشتری مێ)وە نیشانی بۆ ژیانی سەرەتایی پێغەمبەر کردووە کەوا هەتیو بووە لە ماڵە خزمانیدا و کردوویانە (حوشترەوانی)ی خۆیان، ئەو ڕواڵەتەی شوانێتییەیش زۆربەی پێغەمبەران بەخۆیانە دیتووە و شوان بوون، ئەویش لەڕێگەی بوونیاندا بە پێغەمبەر، قۆناغێکی سەرەتایی پێویست بووە، چونکە شوان لەو دەشت و دەر و هەڵەت و شاخ و ئەشکەوتانەدا کەوا ئاژەڵەکەی دەلەوەڕێنێت و تەنیایە و کەس لەگەڵی نییە و ژیانێکی زۆر لەبارو گونجاوە بۆئەوەی لەو چۆڵەوانی و تەنیاییەدا بکەوێتە ئەندێشەوە لە (خوا)و (چییەتی خوا) و (یەکتایی)و (بێ هاوتایی) و (توانایی) و (کردگاری) خوا بیربکاتەوەو تێ ڕامینێ و بکەوێتە ئەنجامەی بڕوای بەو خوایە هەبێ و (هزر) لەوە بکاتەوە کە دەبێ مرۆڤ ئەو خوایە بناسێ و بەڕاستی بیپەرستن و ڕێبازی ئەو پەرستنەش دەبێ چۆن بێ و... هتد.

ئەو پێغەمبەرانە ئەم بیرکردەوانەیان بووەتە بناغەی تواناییان بۆ پێغەمبەرێتی کردن، هەروەک پێغەمبەری ئیسلامیش لەو حوشترەوانییەیدا ئەمانەی بەسەردا هاتوون و ئەوەبوو بۆ یەکەم جار لە ئەشکەوتەکەدا یەکەمین سرووش (وەحی)ی بۆ هات و پێغەمبەرێتییەکەی ئاشکرا بوو، بانگەوازی ئیسلامەتیی هەڵدا، (کوردی) لەو تۆزە ڕاگەیاندنەیدا مەبەستیشی لەمانە بووە کە لێکم دانەوە.

(کوردی) نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی بەوە کۆتایی هێناوە کە فەرموویەتی:

چون مـجنون: (چون = وەک، بەوێنەی، پابەندی، هەروەک) وەک (مـجنوون) لە چۆڵەوانی گەڕاندا نەک وەک (مەجنوون)ی شوان، چونکە مەجنوون وێڵ بووە نەک (حوشتروان).

(مەجنوون) کە وشەیەکی عارەبییە لەم شوێنەی ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەتوانرێ بەدوو جۆر لێک بدرێتەوە کە لەگەڵ ئەم تاکە هەڵبەستەدا بگونجێن کە ئەوانیش:

١- (مەجنوون) لەڕووی (زمانی)یەوە بەواتە (شێت، شێتووێت، دێوانە کە نەخۆشییەکی (چەقە دەماری = عصبی)یە، هەروەها زۆر لە (شێتی) لە ئاکامی دڵدارییەوە بووەو دەبێ، کە ئەم شێتیی دڵدارییە، بۆ ئەم شوێنە ئەگونجێ و مەبەستی (کوردی) بووە ئەویش پێغەمبەریی ئیسلام -د.خ- لە خۆشەویستی زۆریەوە بۆ خوای گەورەو شەیداییەکەی بۆ پەڕتەو (جەلای) خوای مەزن جۆرە شەیدایی و شێتییەکی دڵداریی گیانی بووە بەرامبەر بەخوا، نەک شێتییەکی پەتەڕەیی کە فەرموودەکەی (کوردی): (چون مجنون) = وەک مەجنوون (شێت).

٢- جۆرەکەی تری (مجنون) لە مەبەستی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا وەک نموونە بۆ هێنانەوەیەک وەهایە کە ئەو شەیدایی و ئەڤینییەی پێغەمبەر وەک هی ئەو دڵدارە بەناوبانگەی (عەرەب) کە (مەجنوون)ی دڵداری (لەیلا)ی دڵخوازی بووە کە داستانی ئەم مەجنوونە واتە قەیس کوڕی مەللوح و شەیدایی و چۆڵ نشینییەکەی لەتاو هێزی ئەڤینەکەی بۆ خاتو لەیلای ئامۆزای ئەوەندە (خۆش) و (ناخۆش) سەیر بووە کە دەیان

پەڕاوی (پەخشان) و (هەڵبەست) لەسەر ئەو دڵدارییە دانراوە، کەوا (کوردی) لەم ناوبردنی (مەجنوون)ە بە واتا قەیس و لەیلایەی بە نموونەی شیفتەییە پاک و ڕاستەی پێغەمبەر ڕاگەیاندووە کە ئەو دڵبەندییە لە ڕواڵەتی (گیانی)ی ڕاستیی پێغەمبەرێتییەکەیەوە بووە، کە (مەجنوون)یش وەک شوان و، پەتیارە بە چۆڵ و بیابانانەوە ژیاوە لە (هزر) کردنی دڵخوازەکەیدا کە (لەیلای عامیری) بووە.

تا ئێرە واتاو مەبەستی نیو باڵی ئەم تاکە هەڵبەستەم ڕاگەیاند و (کوردی) درێژەی بە ڕاگەیانەکەی داوە لە (نیو باڵی دووەم)ی ئەم تاکە هەڵبەستەیداو فەرموویەتی:

گە بەمحمل نشست:

محمل: بریتییە لە دروستکردنی کەرەستەیەکی تەختەبەندی گەورەیە لەسەر پشتی (حوشتر) یا وڵاخی بەرزە چەسپ دەکرێت و پەردە بە لایەکانی و سەرەوەیدا دەگیرێت لە ڕێوبانی کۆچباراندا ژن و منداڵ و پیاوی دەسەڵاتدار و سامانداران لە کاروانی ئەو کۆچبارەدا لەو ناو تەختە بەندەکەدا دادەنیشن و دەنوون بەدرێژایی ڕێگەکەیان و (مەحمەل) بە کوردی (کەژاوە) یا (تەختە ڕەوان)ی پێ دەگوترێ.

مەبەستی (کوردی) لەوەیە کە ئەو پێغەمبەرە جاری وەهایش هەڵکەوتووە کە لە (مەحمەل)دا بووە وەک (لەیلا) کە ئەم (لەیلا)یە دوو واتا دەدات یەکێکیان خودی دڵخوازەکەی (مەجنوون)ە کە (کوردی) مەبەستی ئەمەیان نەبووە بەڵام هونەرمەندانە تەڵەیەکەو ناویەتەوە، کە شارەزایانی وێژەی کۆن تێی گەیشتوون و تێی دەگەن، کەوا (کوردی) ئەو پێغەمبەرە مەزنە ناچوێنێ بە (چەتیوە عەرەبێکی وەک لەیلا) یا (بە هەتیوە عەرەبێکی خۆپەرستی وەک قەیس) بەشکو مەبەستی (کوردی) لەواتای ناوی (مەجنوون) و ناوی (لەیلا) کە مەبەست لە لەیلا (دڵخواز)کەیەتی کە چۆن مەجنوون خۆشی ویستووە ئاوەها خەڵکی پێغەمبەرەکەی خۆیانیان خۆش ویستووە. (لیلا شد) بووە لەیلایەکەی (کوردی)، کە فەرموویەتی پێغەمبەر بووە بە خۆشەویستی پەیڕەویکارو ئیسلامەکانی بگرە زۆریش لەوانەی کە ئیسلامیش نەبوون و پێغەمبەریان بەشکۆمەندو خۆشەویست دیاری کردووە.

بەم لێکدانەوەی ئەم تاک هەڵبەستە و (داونانەوە) چەواشە کارییەکەی (کوردی)م ڕوون کردەوە کە پێغەمبەری نەچواندووە بە (لەیلا) یا (مەجنوون) وەک بەسەر زاری ڕاگەیاندنەکەیەوە دەردەکەوێ، هەرگیز ڕایەیان نەکەوتووە پێغەمبەر بچوێنرێ بەو دوو خۆ پەرستەکەی خۆپەرستی زۆرەکەیان بە جیهانی ناساندوون.

**هەڵسەنگاندن:**

ئەم کارەی (کوردی) لە دەستووری وێژەی کۆن (کلاسیکی)دا بە کارێکی وەستایانەی سەرکەوتوو، جوان و پەسەند دادەنرێ کە ناوی (مەجنوون) و (لەیلا)ی خستووەتە ئەم تاکە هەڵبەستەوە و مەبەستی لەوان نەبووە،

ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (٧٢)مین و لەم بەندی سێیەمەدا (٢٤)مین تاکە و شوێنی

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا ئاوەهایە:
لە (شح، گل/ ٦، ما/ ١) دانییە و لە (ف) دا دەیەمین تاک و لە (مک)دا (١١)مین و لە (حم، سجا، ط، ق/ ٣)دا (١٢)مین و لە(با/ ١، ج، جم، نم/ ١)دا (١٣)مین و لە (ص، صا)دا (١٧)مین و لە (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٨)دا (١٨)مین و لە (مع) دا (١٩) هەمین تاک و لە (عن) دا (٢١)مین و لەک (نع) دا (٢٢)مین و لە (مس، ن، ه) دا (٢٤)مین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

گە زونبال، لە (عن، گل/ ٣، گل/ ٥، جم، نم/ ١، با/ ١، سجا، حم) دا نووسراوە: (گە بدنبال) (گەهـ بە دونبالی) و ئەمیش دەگونجێ و تەواوە.

ناقە چون مەجنوون، لە (گل/ ٣، گل/ ٥، مک، ط،ج) دا نووسراوە: (ناقەء مجنون) – ئەمیش ناگونجێ و هەڵەیە؛ چونکە وەک ڕام گەیاند، کە (مەجنوون) شوان یا حوشترەوان نەبووە بەشکو شێتێکی دڵداری بووە بەدەشت و دەرەوە ماوەتەوەو هەر لەبیری خۆپەرستیدا بووە.

چون مجنون، لە (عن، ما/ ١) دا نووسراوە: (مجنون وش) ئەمیش ناگونجێ و هەڵەیە.

بە محمل، لە (ط)دا نووسراوە: (بمحقل) ئەمیش هەڵەیەو ناگونجێ و دیارە هەڵەی نووسینەوەیە یا دەسکاریکردنی (بەهائیان)ە کە ئەوان (مەحمەل)یان هەیە.

بە محمل، لە (عن، گل/ ٣، گل/ ٨، نم، با/ ١) دا نووسراوە: (بمجلس) = بە مەجلیس کە ئەمەش واتای تەواوی نادات و هەڵەیە.

**واتای گشتی:**

وەک لە لێکدانەوەکانی پێشەوەدا ڕام گەیاندووە. کە لەم تاکەدا لە پێغەمبەر–د.خ– دواوە کە جارێک بەدوای وشترەوە بووە کە لەمناڵیدا خزمەکانی حوشترەوانییان پێ کردووە، وەک مەجنون واتە شێتی دڵداری و خوا ویستی بووە جاری تریش لە کەژاوەی چوونە میعراجدا بووە بۆ خزمەتی دڵخوازەکەی خۆی کە بە لەیلای ناوبردووە و لێرەدا لەیلا بووەتە هێما (ڕەمز)ێکی دڵخوازی و خۆشەویستی نەک لەیلای چەتیوە عارەبێک.

٧٣– ئەم تاکە هەڵبەستەیش وەک جۆرێک لە درێژە پێدانی تاکی پێشوو وەهایە کە لەوێدا ناوی (مەجنوون و لەیلا)ی بردووە و کە مەبەستی لە خودی ئەو جووتە دڵدار و دڵخوازە نەبووە، بەشکو وەک (پەردەک= موعەما)یەکی ڕێگە لێ تێکدەر، (لە خوێنەر)و سەرلێشێوێن وەهایە، چونکە، چ ڕایەی ئەو جووتە خۆ پەرست ڕەگەز بازە ناکەوی کە کەسەتیەتی مەزنی وەک پێغەمبەر بچوێنرێ بەوان.

لێرەشدا (کوردی) هەمان داوی ناوەتەوە کەوا ناوی جووتێ دڵدارو دڵخوازی تێکەڵ بەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە کردووە کە (وامیق)ی دڵدارو (عەذرا)ی دڵخوازیەتی کە دیسان بە خوێندنەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە بەسەر زاری وەها پێ دەچێ کە گوایە (کوردی) ئەو کەسەتییە گرنگەی پێغەمبەری چواندووە، بەو دوو کەسە بە پەنگبووەی لە خۆپەرستیدا (بەناو) بوون، کە ئەوەش هەرگیز ناگونجێ و تەنانەت دوشمنیش چواندنی ئاوای لەدەست نایەت و

بابزانین:

جیلوه گر شد :ئەم وشەیە گەلێ واتای جیاجیا دەدات و ئەوی بۆ ئەم شوێنە بگونجێ هەندێکی ڕادەگەیەنم کە:

جلوه -یا- جلوه = ئاشکراکردن، دەرخستن، پیشاندان،

جلوه: مشتومالکاریی دڵ و دەروون و گیان و، دوور خستنەوەیان لە بەدی و پیسی و چنۆکی و خۆپەرستی جیهانی، و پاککردنەوەی هەست و مێشک و گیان و دەروون لە خراپی و خراپکاریی جیهانی و خۆ ئامادەکردن بە بۆ چاکەو چاکە گوتن و چاکەکردن و ڕووناک کردنەوەی مێشک و گیان و پەرداخدانیان. کە بە عەرەبی (تَنَزهِ) و (تَرَفُّعْ) یش دەگرێتەوە کە بێ خەوش کردنی گیان و دەروون و مێشکە و شکۆدار کردنیان، هەروەها (واتای) مەزنێتی و ئاوەدان کاری و (شەوق)یش ئەگرێتەوە.

هەمــو ئەم واتایانە لە پەلوپۆیەکــانی ئەو، وشـــەیەوە وەردەگـــیـــرێن کـــە هـەمـــوو لەڕووی (زمانی)یەوەن.

بەڵام لەڕووی سۆفیگەرییەوە و بەلای (عارف)انەوە وشەیەکی تایبەت بە سۆفیگەرییە، واتە (زاراوە = مـــصـطلـح)ێکی (عـــارفـــانە)یە و، مـــەبەست لەو تـین و تاوی ئەڤـــینە پاکـــەیە، یا خۆشەویستیی (أنوار الهیة) = پەرتەوە خواییەکانە کە ئەو خۆشەویستییە سەرو دڵ و گیانی (عارف) شیفتەو شەیداتری بکات، بۆ هەرچی زۆرتر تیا سەرسام (واله) تر بوون، ببێ لە دەرباربوونیدا، بۆ پەرتەوی زاتی پاکی خوای تواناو کردگار و بێ هاوتاو، تێکۆشان بۆ هەرچی زۆرتر گەیشتنە چڵەپۆی لە خواو، خوایەتی گەیشتن و لێ نزیکبوونەوەی.

(کوردی) بەم وشە گرنگ و فرە واتایەی (جیلوه) ڕازی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی خۆی داداوە، وەک وریا کردنەوەیەک کە مەبەستی ئەم تاکە هەڵبەستە لە چوارچێوەی واتایەکی ئەم وشەیەدایە نەک مەبەستی لە چواندنی ئەو پێغەمبەرە مەزنەیە بە جووتە دڵدارو دڵخوازەی (وامق) و (عذرا)و بەشکو بەکارهێنانی ئەم دوو (ناو)ە مەبەست لە واتای ناوەکانیان بووە نەک لە خودی خۆیان وەک لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا کە مەبەستی لە (مجنون) و (لەیلا) نەبووە بەشکو دیسان مەبەستی لەواتای ناوەکانیان بووەو ئەمەیە کە وەک ڕام گەیاند (کوردی) لەم دوو تاکـە هەڵبـەسـتـەدا (داو)ی ناوەنەتەوە، بۆ خوێندەوار کـە دەبێ وریا بێ و بگاتە واتا و مەبەستی (کوردی) و کە فەرموویەتی:

بەصورت وامق (بە صورەتی وامیق) = لەشێوەی، وێنەی، هەر وەکو (وامق) ئەمجا:

وامق: لەسەر زاریدا پیاوێکی شێت و شەیدای ئەڤینی دڵخوازەکەی بووە کە ناوی (عذرا) بووە.

دیارە جۆرە (ئەڤینێکی ئاوەهای نێوان نێرو مێیەک خۆ پەرستییە کە (کوردی) مەبەستی لەناوبردنی ئەو جووتە دڵدارو خوازە بۆ ئاڵۆزکردنی (هزر)ی خوێندەوار ڕای گەیاندووە کە بەپێی دەستووری وێژەی کۆن ئەو کارە داونانەوەیەک وەیا وەستاکارییەکی پەسەندی وێژەیی و جوانکارییەو ئەو ئەڤینە جیاوازە لەگەڵ ئەڤینی پاکی خواناسی و شەیدابوونی پەرتەو

(جیلوە)ی خوایی کە (کوردی) مەبەستی بووە لەم تاکە هەڵبەستەیدا.
بڕوانە لێکدانەوەم لەسەر (جیلوە) لە تاکە هەڵبەستی (١٥)هەمدا لە بەندی (یەکەم)ی ئەم حەوت بەندە کە لەوێدا بە جۆرێکی ترو درێژتر دواوم.
(کوردی) کە ڕای گەیاندووە:
بە صورت وامق: لە شێوەی، بەوێنەی، وەک، بەچەشنی (وامق) وەک ڕام گەیاند مەبەستی ئەوە نەبووە کە ئەو پێغەمبەرە شکۆدارە وەک (وامق) یا (لە چەشنی) وامق جیلوەگەر بووە و تەنانەت (وامق)یش ڕای نەکەوتووە کە وەک ئەو پێغەمبەرە بووبێ و جگە لەوەی کە (وامق) جیلوەگەر نەبووەو (وامق) ئەو واتایانەی (جیلوە)ی تیا نەبووەو کابرایەک بووە ویستوویە هەرچی زووتر بگاتە (عذرا) دڵخوازەکەی و لەگەڵیدا (دروست ببێ) و ئەمیش هەر یەکجار زۆر دوورە لە (واتا) یا (ئەوەکەی) لەسەر جیلوە و (جلوەگر)ی(پێغەمبەر د.خ) لێکم دانەوەو، هەرگیز ناتوانرێ ببەسترێ بە ڕەوشتەکەی ئەو (وامق)ە بێ گیرو گرفت (کوردی) مەبەستی لە واتای (ناو) یا (وشە)ی وامیق ئەمجا.
وامق = دۆست، دڵدار (عاشق)، ڕوخسار، چارە، ڕووی (عذرا) بووە و دڵدارێکی ڕوو هەڵماڵراویش دەگرێتەوە. کە پێغەمبەر ڕوو هەڵماڵراوییەکەی لەو جۆرەی ئەو (وامق) دڵدارەی نەبووە بەشکو (کوردی) فەرموویە (پێغەمبەر-د.خ-) (دۆست)ی هەمووان و (دڵدار)ی گیانی) بەڕوخساریەوە دیاربووە. نەک وەک ئەو (وامق)ە وابووە.
(کوردی) لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا فەرموویەتی:
برقع افگند: (برقع: پەچە، دەمامک، چارشیو، پەردە) و، (افکند) = فڕێی دا، لای دا، لای برد، هەڵی دایەوە. واتا پێغەمبەر ئەو دەمامک یا پەردەیەی لەسەر ڕووی خۆی لادا کە مەبەستی لەوەیە (پێغەمبەر-د.خ) دوای (جیلوەگەری کردنەکەی) ئەڤیندارییە گیانییەکەی و خۆشەویستییەکەی بەرامبەر بە خەڵک هەموو خەڵک کە لە حوشترەوانییەکەیدا هزری لە خوایەتی و خواناسی و پێویستیی پەرستنی ئەو خوایەی لەلا جێگیر بوو بوو، هەر لەو شوانێتییەیدا یەکەم سرووش (وەحی)ی بۆ هات، دوای ئەوانە ئەو پەردەیەی کە وەک هەریەکێ لە کۆمەڵگایەکەی بت پەرستێک بووەو، وەک خۆیشی فەرموویەتی لەو سەردەمە (جاهیلی)یەیدا (مەڕ)ێکی بۆ قوربانی کردووە بۆ بتەکە و، پێغەمبەر دوایی بەڕاستی لە خوای ڕاستی گەیوە و ئەو پەردەیی بت پەرستییەی لەڕووی خۆی لابردووە و خۆی ئاشکرا کردووە کەوا بووە بە پێغەمبەرو پەیامی ڕاگەیاندنی ئاینی (ئیسلام) پێ بووەو (کوردی) ئەوەی بە پەچە و چارشێو. لەڕووی خۆ هەڵدانەوە (ناوبردووە)و، ئیتر کەوتووەتە بڵاوکردنەوەو بەلای پەیرەویکارانییەوە خۆشەویست بووە کە ئەو خۆشەویستییەی بە وشەی (عذرا) ناوبردووە کە مەبەستی لە واتای وشەی (عذرا) بووە نەک لەناوی خودی (عذرا) کە دڵخوازەکەی (وامق) بووە چونکە ناشێت (کوردی) ئەو پێغەمبەرەی کە ئەم (حەوت بەند)ەی بەسەر هەڵداوە بەو شکۆمەندییەوە چواندبێتی بە چەتیوێکی دڵخوازی (وامیق) و فەرموویەتی:

عين عــذرا شــد: هەروەک (عــذرا)ی لـێ هات، کـە (عــەین = چەشـن، بەجـۆر، وێنـەی، وەکـو، مانەندی) و (عذرا شد = بووە عەذرا).

عذرا: لەڕووی ڕواڵەتەوە ناوی (دڵخواز)ەکەی (وامق)ەو بێگومـان (کوردی) ئەمەیانی مەبەست نەبووە، لەم هەڵبەستەیدا کەواتە:

عذرا: لەڕووی واتای (زمانی)ی وشەکەوە و مەبەستی (کوردی)یەوە بریتییە لە گلەیی لەسەر هەڵگیراو، گونا لەسەر لابراو، لێبوردراو، بەخشراو لەبەر پاکیی ڕەوشت و ڕێڕەو و، بێ خــەوشـی و ئینصــافی، و... هتــد هـەروەها وشــەی (عــەذرا) لەڕووی (زمـانـی)یەوە بەواتا: بەڵگەهێنەرەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر بووەتە (حوججە) کە خاوەن بەڵگەیەو بانگ لە خەڵکی کردن بووە بۆ هاتنە سەر سفرە و خوانی ئەو لە ئاینەکەی بووە.

لە سەرنجدانی پێغەمبەریشدا ڕوون دەبێتەوە ئەو واتا زمانییانەی تیا هەبوون کە لە پێشەوە ڕام گەیاند کە لە واتای وشەی (عذرا) دان نەک لەبەر خۆپەرستیەکەیدا.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (حەوت بەند)ە کەدا (٧٣)مین و لەم بەندی سێیەمەدا (٢٥)مین و شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەی دواییە:

لە (شح، ط، گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٦)دانییە و لە (ف) دا (١١)مین تاک و لە (مک) (١٢)مین و لە (حم، سجا، ق/ ٣)دا (١٣)مین و لە (با/ ١، ج، جم، نم/ ١) دا (١٤)مین و لە (ص، صا) دا (١٨)مین و لە (گل/ ٨)دا (١٩)مین و لە (مع) دا (٢٠)مین و لە (مـــا/ ١) دا (٢١)مین و لەک (عن) دا (٢٢)مین و لە (نع) دا (٢٢)مین و لە (مس، ن، ه)دا (٢٥)مین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

بە صورت، لە (حم، با/ ١) دا نووسراوە (بهیئت) = بە هەیئەتی. و، ئەمەش دەگونجێ.

افگند لە (صا، گل/ ٨) دا نووسراوە: (اندافت)= ئەنداخت، بەواتا فڕێدا– ئەمیش دەگونجێ.

عین ، لە (ما/ ١، نع) دا نووسراوە (مثل) ئەمیش دەگونجێ

**واتای گشتی:**

کە پێغەمبەر لە شوانییەکەیدا مشتوماڵی دڵ و گیانی خۆی دەداو لە (هزر)ی تێگەیشتن تری چێیتیی خواو خواناسیدا بوو ئەوە، وەک خۆ ئامادەکردنێک وەهابوو. کە بتوانێ لە شێوەیەکی دۆست و خۆشەویستی هەمووانداو وەک پێغەمبەر خۆی ئاشکرا بکات پەردەی (بت پەرستتی) لەڕووی خۆی لاداو ببێتە خۆشەویستی هەمووان و ئەوانەی کە ئەو ئاینە بت پەرستییەی ئەوانی پووچ کردەوە و بتەکانی شکاند ئەمجا بەڕاستی دڵ و دەروونی پاکەوە، گازەندەیان لێ نەکردو لێی خۆش بوون، لەو دەمامک لەسەر ڕووی خۆلادانەیدا کە بە ئاشکرا بانگەوازی هەمووانی کرد بۆ هاتنە سەر سفرە و خوانی ئاینەکەی و لەو هەژاری و نەدارییەی زۆربەی ئەو عەرەبانەی کۆمەڵگایەکەیدا بە (غەزاکردن) هەمووانی و ناوچەکەی لەڕووی (ئابووری) و (بیری) و (ڕەوشت) و (کۆمەڵایەتی) و (ڕامیاری)یەوە بووژاندەوەو پێشی خستن و یەکەم

ئیمپراتۆرییەتی عەرەبی لێ دروست کردن.
٧٤- (کوردی) بە پێشکەشکردنی تاکە هەڵبەستی پێشوو ئاشکرابوونی پێغەمبەرێتیی (محەمەد- د.خ)ی ڕاگەیاندو لە بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی دوا، بە پەردە لادان لەسەر سەرێنی بەر ئیسلام (جاهیلی)ی عارەب، کە ئەو (جاهیلی)یە ناشێ بەباری نەتەوە ئیسلامییەکانی تر بگوترێ؛ چونکە چ نەتەوەیەک لەو سەردەمەدا ئەوەندەی نەتەوەی عەرەب دواکەوتوتر نەبوون.
بەڵام لەم تاکە هەڵبەستەیدا (کوردی) لای کردووەتەوە بەلای کۆچی دوایی کردنەکەی ئەو پێغەمبەرەدا کە (کوردی) ویستوویە کۆتایی بەم بەندی سێیەمە بهێنێ کە جگە لەم تاکە هەڵبەستە سێ تاکە هەڵبەستی تر لەم (بەند)ە ماوە، کە لێرەدا فەرموویەتی:
ساقی: ئەوەی کە بادە (مەی) دەرخواردی (مەینۆش)ەکان دەدات کە مەبەستی لەخودی پێغەمبەر بوو. وەک لە دواتر لێکدانەوەکانی ئەم تاکە هەڵبەسەدا دەر دەکەوێت
(بزم: میوانداری، کۆبوونەوە یا کەسان گردکردنەوە کە ئاهەنگ بگێڕن بە شادی خۆش ڕابواردنەوە و بادە نۆشی لەو (بەزم)ە دا- (بادەی گیانی)
(کوردی) وەک لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا بانگەوازی پێغەمبەری بۆ هاتنە سەر سفرەو خوانی خۆی ڕاگەیاندبوو، لێرەدا وەک
ساقییەک لە بادەی گیانیی (ئایەت و حەدیث و پەیڕەوی کردنی کردەوە ئاینییەکانی خۆی (سوننەت)ەکانی ئیسلامەکانی پێ مەست کردووە لەم (بەزم)ەی کە لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا دیاریی کردووە کە پەیڕەویکارەکانی وەک میوانی خۆی لەو بەزمەدا گرد کردوونەتەوە بۆ کەڵک و خۆشی وەرگرتن و لەژیانی برایانەی یەکسانیدا بەسەربردن بە درێژە دانیان بە بادە نۆشی گیانییەکەیان هەرچی زۆرتر مەست بوونە بەپێ زانینی دەقە ئیسلامییەکان و بەجێگەیاندنیان و پەیڕەوی کردنیان.
هەروەها لە کۆتاییی نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا (کوردی) ئەو ساقی و میوانداری بەرپاکردنەی بە:
میر مجلس بود: واتە ئەوا (پێغەمبەرە) ساقی و میوانداریکارە، میری ئەو کۆڕی بەزمەیە کە بە (میری مەجلیس پێناسەی کردووە
(بوود=بوو)، خۆی مییرەکە بوو... .
کە ئەویش وەک لە سەرەتای لێکدانەوەی ئەم تاکەدا هەڵبەستەدا جێگیرم کرد کە خودی پێغەمبەری ئیسلام- د.خ-(میر) بووە.
ئەمجا (کوردی) لە کۆچی دواییکردنەکەی پێغەمبەر دواوە لەم نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەداو بەم جۆرە دەری بڕیوە.
باز چون بادە سوی مینا شد: واتا (دیسانەوە) ئەو پێغەمبەرە دوای ئەوانەی کە لەمەوبەری تاکە هەڵبەستەکاندا هاتووە بەرەو لای (مینا) بووەوە یا ئەوە بوو لە تاکە هەڵبەستی (٦٩)میندا چووەوە ناو (مینا) پێغەمبەر بە (نووری یەزدان) ناوبرابوو، کەواتە ئەو (نووری یەزدان)ە

چووەوە شـوێنەکـەی خـۆی کـە مـەبەسـتی لەوەیە چووە ناو ئـاسـمـانەوە، چووە بەهـەشـتـەوە یا چووەوە ناو ڕەنگی شین کە هەر مەبەست لە (ئاسمان)ە وەیا وەک بادە چووەوە ناو شووشـەی بادەوە.

(کوردی) بەم چەشنە ڕاگەیاندنە مەبەستی لەوە بووە کە پێغەمبەر چووەتە بەر بارەگای خوای مـەزن لە (ئاسـمـان) لە (بەهـەشت) یا خـۆی (نووری یەزدان) بووە تێکەڵ بـە هەمـان (نووری یـەزدانی) بووەتەوە لـە بارەگـای خـوادا. ئەم کـۆچکردنەیش لە (زاراوە= مـوصطەلەح)ی سۆفییەکاندا بە (یەکگرتنەوە = الاتحاد) ناوبراوە کە یەکێکە لە (پلە)کانی ڕێبازی سۆفیگەری و ئەو چوونەی پێغەمبەریش بە چوونی گیانی پاکی بۆ ناو (مینا)یە کە (نووری یەزدان) بووە، و یا بۆ ناو ئاسـمـان یا، بۆ بەهەشت بەو (پلە)ی (الاتحاد) گەیشتنە دادەنێن. دەشتوانرێ ئەم چوونە ئاسمانە بە ڕوودانی چوونە (میعراج)ەکەش دابنرێت.

ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـە بەپێی یەک لـەدوای یەکی تاکـەکانی ئەم (بـەندی حـەوت)ەمـە (٧٤)مین و بەگوێرەی زنجیرەی تاکەکانی ئەم (بەندی سێیەمین)ەش ژمارەکەی (٢٦)مین تاکە.

هەر ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا شوێنی بەم جۆرەیە:

لە(ف، ق/ ٣، جم، گل/ ٨، ما/ ١)دا نییە و لە (ط، مک) دا (١٣)مین تاک و لە (حم، سجا) دا (١٤)مـین و لە (با/ ١، ج، با/ ١)دا (١٥)مین و لـە (گل/ ٦) دا (١٨)مین و لە (ص، صـا، گل/ ٣، گل/ ٥)دا (١٩)مین و لـە (مع، شح) دا (٢١)مین و لە (عن)دا (٢٣)مـین تاکـە هەڵبـەست و لە (نع) دا (٢٤)مین و لە (مس، ن، ﻫ)دا (٢٦)مین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

بزم، لە (حم، صـا) دا نووسـراوە (رزم) بەواتـە (جـەنگ لە، کـە ئەمـیش هەڵەیەو (جـەنگ) هـی ساقی نییە.

مییر، لە (نع، با/ ١) دا نووسراوە: (هی پیر– کە ئەمیش ئەگەر مەبەست لە (پیری موغان) لە گەورەی پێشـەوا ئاینییەکانی (زەردەشتی) بێت کە پێغـەمبـەر بە (پیری موغـان)ی ئیسـلامی دانرابێت، ئەوا دەگـونجـێت و لـەناو شـاعـیـرە کـۆنـەکـانی (کـورد)و (فـارس) دا ئەم چـەشنە چواندنە لە شیعرەکانیاندا زۆرە.

سـاقی بزم لە (صـا، مک، ق، ج) دا نووسـراوە (سـاقی میـر) ئەمـەش ئەگـەرچی هـەڵەیە، بەڵام دیارە لە نووسـینەوەدا دوو (وشـە)ی (بزم) و (میـر) پاش و پێش کـراون ئەو هەڵەیە کە (یەکـەم) نووسەریان کردوویەتی و (سێ) نووسەرەکەی تریان لـەبەر ئەوە (یەکەمە)یان نووسیویانەتەوە و ئەوانیش کەوتوونەتە هەمان هەڵەوە.

**واتای گشتی:**

بادەدەری ئەو بـەزمـە کـە خـودی(مـیـر) واتا سـەرۆکی (مـەجلیس)ەکـە بووە هەر خـۆی خـودی پێـغـەمـبـەر بووە، هەتا بەپێی ئەو ئایـەتەی کـە لە تاکـە هەڵبـەسـتی ژمـارە (٦٨) دا کـە کۆتاییهێنەری (ڕاگەیاندنی ئاینی ئیسلام بووە) (الیوم اکملت لکم دینکم...) دا کە پێغەمبەر

پێشبینی لە نەمانی خۆی کردووە کەوا بە (حەج)ێکی تردا ناگات و ڕاستیش وەها دەرچووە، ئەئاوەها دوای ئەو (بزم مجلس)ی میوانداری ڕاگەیاندنی هەموو ئایەتەکاندا وەک خوانێک کە میوانداریيەکەی کۆتایی پێ هێناو هەروەها خۆیشی کۆتایی هاتووە بە کۆچی دوایی کردنی و خۆی (نووری یەزدانی) بووە گەڕاوەتەوە بۆ ناو هەمان (نوور)ی (مینا) ئاسایی، گەڕاوەتەوە بۆ ناو ئاسمان کە (مینا)یشی پێ گوتراوە یا چووەتە (بەهەشت)ەوە کە مەبەست لە (مینا) بەهەشتیشە و (کوردی) ئەمانەی لەم دوا دوای بەندی سێیەمەدا ڕاگەیاندووە مەبەستی وەک ئامادەکارییەک بووبێ بۆ دەستکردن بە (بەندی چوارەم).

جگە لەمەندە لێکدانەوەو ڕاگەیاندنەش لەتوێی لێکدانەوەکانی وشەکاری ناو ئەم تاکە هەڵبەستەیشدا بەرەبەرە لێکدانەوەی گشتیی ئەم تاکەم پێشکەش کردووە.

٧٥- (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا ژیانی پاش مردنی پێغەمبەری ڕچاو کردووەو لە ئاسماندا وەک لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا چوار جۆرە باردۆخی ئەو پاش کۆچی دواییيەیم لێ لێک داوەتەوە کە:

١- گیانی چووەوە ئاسمان، وەک گیانی پێغەمبەرەکانی تری پێش خۆی کە لەکاتی چوونە میعراجەکەیدا لە ئاسمانەکاندا پێغەمبەرەکان لە پێشوازی کردنیدا بوون و (جبرەئیل)ی هاوڕێی ئەو پێغەمبەرانەی پێ ناساندووە و ئاسمانی بە (مینا) داناوە.

٢- گەڕانەوەی گیانی پاکی کە لە (نووری یەزدانی) بووە وەک لە پێشەوە ڕام گەیاندووە، ئەو گیانەی وەک بادە گەڕاوەتەوە ناو ئەو (نوور)ەی کە بە (مینا)ی ناوبردووە.

٣- چوونی گیانی بۆ ناو (بەهەشت) کە (مینا) یشی پێ دەگوترێ.

٤- لەوانەیە کە نیشانەیش بێ بۆ چوونە (میعراج)ەکەی پێغەمبەر.

کە هەرچوار لێکدانەوەکەم دەگونجێن لەگەڵ تاکە هەڵبەستی پێشووداو ئەمەتا لێرەشدا لە ژیانی پێغەمبەر دواوە لە ناو ئەو (ئاسمان)، یا: (گەڕانەوەی سۆفییانە لە (پلەی - الاتحاد)دا بۆ ناو (نوورە یەزدانییەکە)، یا: (گەیشتنە ناو (بەهەشت)ەوە، و یاخود لە (چوونە میعراجەکەیدا) و (کوردی) لەو بارودۆخانەدا بەم جۆرەی دوایی لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا دواوە فەرموویەتی:

پس از ان: کە مەبەستی لە دوای ئەو کۆچکردنەی ناو تاکە هەڵبەستی پێشووە،

جان برقص و گردش سار (جان بە ڕەقص و گەردش سار)= (جان = گیان)، (ڕقص = هەڵپەڕکێ) ، (گردش سار) (گردش= سەماکرن لە خۆشییاندا، بەدەوری خۆدا سووڕاندنەوە بە شادییەوە، بەڕیگەدا ڕۆیشتن بەدەم هەڵپەڕکێ و سەمای خۆشییەوە)

سار: ئامێرێکی دەستووری زمانیی (چواندن = تەشبیه)ە کە واتای: وەک، مانەند، چەشن، ئاسا، چون -دەبەخشی وەک: (خاکسار) هەروەها (سار= پاشگرێکە واتای: فرە، گەلێک، مشە، فراوانی دەدات وەکو: کۆسارو چەندین واتای تریش دەدات. کەواتە:

(گردش سار) بەواتە: (گردش ئاسای زەبەنگە)یە.

(کوردی) لەم باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا مەبەستی لەوە بووە کە:
دوای ئەو گەیشتنەی پێغەمبەر بە (پلە)ی (ئیتیحاد)و چوونی گیانی بۆ هەریەکێ لەو چوار شوێنەی کە ناوم بردن ئەوسایە لەخۆشی ئەو بەهرەمەندییەیدا گیانی کەوتووەتە هەڵپەڕکێ و سەما ئاسایەکی فرەوەو ئامادەی کردووە بۆ ئەوبارودۆخەی کە تیایدا لە (ئاسماندا بووە و لەنیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەکەیدا فەرموویەتی:
برج گردان:
(برج) = ڕێڕەوی ئەستێرەی مانگ (فولک)ە واتە ئەو ڕێگا لە گۆڕان نەهاتووە کە ملیۆن ساڵە مانگ لە سووڕانەوە پێیدا ئەڕوات و هەر مانگەی بەیەکێ لە قۆناغەکانی بۆشاییی ئاسماندا ڕێگە دەبڕێت و هەرمانگەی بەیەکێک لەو (بورج)انەدا تێ ئەپەڕێت کە ئەوانیش دوانزە (بورج)ن.
ئەمجا(برج گردان) واتە بە بورجەکاندا سووڕاندنەوە یا تێپەڕین پێیاندا.
کوکب آسا شد: بووە ئەستێرەیی، مانەندی ئەستێرە، ئەستێرە ئاسایی کە چۆن مانگ بەسەر بورجە ناوبراوەکاندا بە سووڕانەوە بەدەوری زەویدا لە هەر مانگێکداو بە سووڕانەوە بەدەوری (خۆر)دا لەهەر ساڵێکدا، ئاوەهایش گیانی پاکی پێغەمبەر لە کۆچ پێکردنەکەیدا بەرەبەرە لە بەرزبوونەوەدا بووە بە ئاسمانەکاندا بە (گەردان) کردن هەروەک هەریەکێ لە ئەستێرەکان و بەتایبەتی کۆمەڵە ئەستێرەی خۆری- (المجموعة الشمسية) کە هەمووانیان لە سووڕانەوە بەدەوری خۆیانداو لە سووڕانەوەشدان بە دەوری (خۆردا) بەرەو گەیشتنە بارەگای خوا کە لە (سەدرەتول مونتەها= درەختی کوناری هەرە کۆتایی) تێ دەپەڕی، چونکە لە چوونە میعراجەکەیدا (جبرائیل)ی هاوڕێی پێغەمبەر، لەو (دارکونار)ە تێ نەپەڕیوە و هەر خودی پێغەمبەر چووەتە ئەم دیو پەردەی(عەرش و کورسی و لەوح و قەڵەم)ەوە... .
تا ئێرە (کوردی) (پێغەمبەر- د.خ)ی گەیاندە شوێنی (حەق) و شایانی خۆی لەبەر بارەگای دلۆڤانێتی (بەبەزەیی) خوای مەزندا.
ئەم تاکە هەڵبەستە ژمارەکەی لەو (حەوت بەند)ەکەدا (٧٥)و لەم بەندی (سێیەم)ەدا (٢٧)مین و شوێنیشی لە سەرچاوەکانیدا بەم چەشنەیە:
لە (با/ ١، ج، جم، حم، سجا، ص، صا، ط، ف، ق/ ٣، مع، مک، نم/ ١)دا نییە و لە (گل/ ٦) دا (١٩)مین تاکە و لە (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٨) دا (٢٠)مین و لە (شح، ما/ ١)دا (٢٢)مین و لە (عن)دا (٢٤)مین و لە (نع)دا (٢٥)مین تاک و لە (مس، ن، ه)دا (٢٧)مین تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

پس از، لە (ما/ ١)دا نووسراوە: بعد ازان بەعدەزان هەمان واتای (پس از) دەداو دەگونجێ.
جان لە (شح، نع) دا نووسراوە: (تن) واتە لەش، جەستە کە ئەمەش هەڵەیەو ناگونجێ و پێچەوانەی مەبەستە.

سار، له (نع) دا نووسراوه (ساز) که ئەمەش هەڵە و نەگونجاوەو لەوانەیە هەڵەی نووسین بێت.
گردان له (شح، نع، ما/ ١)دا نووسراوه (کردان) که ئەم شێوەی (سەرەگاف) نەنووسینە له فارسیدا باوه.

**واتای گشتی:**

پاش کۆچی دواییەکەی (پێغەمبەر- د.خ) گیانی پاک و پیرۆزی بەرەو ئاسمان ڕووە و بارەگای خوای گەورە کەوتە گەردش ئاسایی شادمانیەوەو، له ئاسماندا بەسەر بورجەکانیدا تێ پەڕیوە، هەر وەک چۆن ئەستێرەکان له گەردوخولی خۆیاندان، ئاوەها ئەویش ئەو بە هەڵپەڕین و سەمای خۆشییەوە (ئەویش) ئاوەها له سووڕانەوەی خۆیدا بوو تا بارەگای خوای دلۆڤان و مەزن.

٧٦ – ئەم تاکە هەڵبەستە و تاکە هەڵبەستی دوایی، وەکو کۆتاییهێنان وەهایە بەم بەندی سێیەمە.
چونکە تاکو هەڵبەستی پێشوو (کوردی) (پێغەمبەر- د.خ)ی هەتا کۆچی دوایی و گەیشتنە شوێنی حەق و شایانی خۆی ڕاگەیاندووە.

لەم دوو تاکە هەڵبەستەیشدا (کوردی) هۆی کردووەتەوە بەلای خۆیدا کە فەرموویەتی:

طوطی: (تووتیی) سروشتم کە لێرەدا (کوردی) ئەو (پەڕندە)ە جوان و زیرەکەی چواندووە بە سروشتی (طەبیعەت)ی خۆی لەڕووی توانایی ئاخاوتنەوە. وەیا ئەو تواناییی ئاخاوتنەی خۆی بە تواناییی تووتی دەربڕیوە، چونکە وەک لەسەرەتای ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا ڕام گەیاندووە کە ئەو سروشتە (ئاخاوتنکارییە)ی تا ئێستەی ئەم بەندی سێیەمەی هەر بێدەنگ بووەو، وەهای ڕاگەیاندووە کە تاکو ئەم تاکە هەڵبەستە هێشتا (چیی) لە هەڵنانی پێغەمبەری خۆشەویستی نەگوتووەو هەر بێدەنگ بووە وەک خۆی لە کۆتاییی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەیدا فەرموویەتی:

از خموشی رست: (ئەز خەمووشی ڕەست)=

ئەز: لە

خموشی: بیدەنگی، خامۆشی نە ئاخاوتن لە خەفەتی مردنەکەی (پێغەمبەر د.خ).

ڕست: ڕستگاری بوو، قوتاربوو.

واتە: تازە لە بێدەنگی یا سروشتی ناتوانایی بێژینی (نوطق)ی خۆی لە (گوتن) ڕزگاری بوو هەر وەکو ئەو سروشت (طەبع: تەبع)ەی (تووتی)یەک بێ ئامادەی ئاخاوتن بووبێ و، لە نموونەدا فەرموویەتی:

باز شکر شکست- واتە دیسان شەکری شکاند، مەبەست لەو (کینایە) یا (ئیدیۆم)ە (کوردی) و (فارسی)یەیە کە بۆ هاتنە گفتوگۆ وەیا بە ئاخاوتن دەوترێ (شەکری شکاند، یا، شەکرت شکاند، ئەمیش دەربڕینێکی وێژەییی جوان و پەسەندە کە وەک ڕێز لێگرتنی ئەو (گوتەر)ە و، یا (بەتەوسەوە وەهای پێ دەگوترێ بەڵام مەبەست لە (بەتەوسەوەکەیان) نییە. و مەبەستی لەوەیە دوای خامۆشی و بێدەنگییەکەی لە خەفەت و داخی مردنەکەی (پێغەمبەر- د.خ)

تووتییەکەی سروشتی (کوردی) هاتووەتە گوتن (شەکر شکاندن) و بۆیەش شەکر شکاندنی بۆ (هاتنە دوو)ی خۆی بەکارهێناوە کە مەبەستی لە گوتنی ئەو دوو تاکە (فارسی) و (عارەبی)یەیە کە لە کۆتایی هەریەکێ لە (حەوت بەند)ەکەدا دووبارەی کردووەتەوە و لە بارەی هەڵنانی پێغەمبەرەوەیە کە دەبێ بە (شەکر شکاندن) ناوی ناوی گوتنەکە ببرێت.

گویا شد: هاتە دەنگ، هاتەوە دوو، کەوتەوە ئاخاوتن، وەدەنگ هاتەوە. کە مەبەستی لە دەربڕینی تاکە هەڵبەستی دواییە وەک پێشەکییەکی دوو تاکە (حەوت پاتەکردنەوە)کە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لەم (حەوت بەندە)ە دا (٧٦)مین و لەم بەندی سێیەمەدا (٢٨)مین تاکە و شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

لە (ف) دانییە و لە (ط، ق/ ٣، مک) دا (١٤)مین تاکە لە (جم، حم، سجا)دا (١٥)مین و لە (با/ ١، ج، نم/ ١)دا (١٦)مین و لە (ص، گل/ ٥)دا (٢٠)مین و لە (گل/ ٣، گل/ ٥، گل/ ٨) دا (٢١)یەمین تاک ولە (مع) دا (٢٢)مین و لە (شح، ما/ ١)دا (٢٣)مین لە (عن، نع)دا (٢٥)مین و لە (مس، ن، ه)دا (٢٨)مین تاکە هەڵبەستی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

طبعم، لە (جم، حم، مع) دا، نووسراوە (نطقم): (نطقم) هەرچەندە ئەمەش دەگونجێ و لەنگیشی ناکات، بەڵام وشەی (طبعم ) واتایەکەی فراوانترەو واتای (نطقم) یش دەگرێتەوە لە کاتێکدا وشەی (نطقم) وشەی (طبعم) پڕ ناکاتەوە.

از خموشی رست لە(گل/ ٣) دا نووسراوە: (از جموشی است) ئەمەش هەڵەیە و ناگونجێ.

از خموشی رست، لە (مک، ج) دا نووسراوە: (زخوشی است) ئەمیش هەڵەیەو ناگونجێ کێشی هەڵبەستەکەی لەنگ کردووە.

**واتای گشتیی ئەم تاکە هەڵبەستە:**

دوای ئەوەی (کوردی) کۆچی دوایی (پێغەمبەر- د.خ)ی ڕاگەیاند لە تاکی پێشوودا ئەمەتا لەم تاکەدا فەرموویەتی: دوای بێ دەنگبوونی لەداخی ئەو کۆچی دواییکردنە ئەوا (تووتی)ی سروشتم لەو بێدەنگیی خەمناکییە ڕستکاری بوو کەوتەوە شەکر شکاندن، واتا گوتەی چاک و جوان ڕاگەیاندنی ترو هاتەوە دوو.

کە لە توێی وشە و لێکدانەوەکانی ئەم تاکەدا زۆرتریشم لەمەندەی واتای تر پێشکەش کردوون.

لێرەدا نیشانە بۆ بەکارهێنانی (وشە) یا ناوی (تووتی) دەکەم کە باڵندەیەکەو لە تاکە هەڵبەستەکەی ئایندەدا ئەو تووتیی تەبعی (کوردی)یە گەیوەتە سەر لقە پۆپەی ئەو درەختی (سەدرە= کونار= نَبقْ)ەی پاڵ بارەگای خوای گەورەو لە (کوردی) بووەوە دەکەوێتە گوفتار (شەکر شکاندن):

٧٧- ئەم تاکە هەڵبەستە کە دوا تاکی (بەندی سێیەم)ی (حەوت بەندی)یەکە تەواوکاری تاکی پێشووە؛ چونکە لەوێدا کە ناوی (تووتیی تەبع)ی خۆی برزووە کەوا (تووتی) باڵندەیەو لەم

تاکـەیشـدا سـەرەتا بەوە دەست پـێ دەکـات کـە ئەو تـووتـیـیـە بەسـەر چڵـە پۆپەی درەخـتـی (سەدرەتول مونتەها)وەیە و فەرموویەتی:

بر سر شاخ (سدر): لە چڵەپۆپەی داری (سدرە)وە.

(کوردی) بەپاڵ ئەم وشەی (شاخ )ەوە فەرموویەتی:

(سدر) ناوی درەخـتی (کونار) کە بـە عـارەبی (نَبقْ = نەبق) یشـی پـێ دەگوترێ و لە زاراوەی ئاینـی و سـۆفـێـگەریدا نـەک هەر بە (سـدر) بەشکو بـە (سـەدرەتول مـونتـەها) واتە درەخـتـە (کونار)ە هەرە ئەوپەڕو کۆتایی ناوبراوە کە لەلای ڕاستی بارەگا (عەرش)ەوە ڕواوە.

(کوردی)یش ئەوەندە خـۆی بـە بەندیوار و نزیک و هـاوگـیـانی (پێـغـەمـبـەر د-خ) زانیـوە وەک لە تاکە هەڵبـەستی ژمارە (٧٥) دا نیشانەم بۆ (چوونە میـعراج) ی (پێغـەمبەر- د. خ) کردووە کە (جـبرەئیل)ی فـریشتـە هـەتا ئەو درەختـە هـاوڕێی (پێـغەمـبەر) بووەو ئەوەتا (کـوردی) مـان خـۆی گەیاندووەتە سەر هەر چڵەو پۆپەی ئەو درەختی (کونار= سەدرە)یەو کۆتاییی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی بەوە هێناوە کە:

روح: گیان، ڕەوان.

از دم روح: لە دەم (زار) و هـەناسـەی گـیانـەوەو، لە نـیـوباڵی دووەمیدا ئەم بیـرەی تەواو کردووە کە:

این سخن واتە ئا ئەم قسە ووتە)یەی دوایی.

بر زبانم القا شد

این سخـن بر زبانم القا شـد: ئا ئەم وتەیەی دوایی بە زوبانم داهات یا بەسـەر زمـانەوە بوو ڕام گەیاند، ئەو وتەیەم دەربڕی. ئەو وتەیەش بـریتـیـیـە لە جـووتە تاکـە (حـەوت پاتە کـردنەوە)کـەی دوای هـەریەکێ لەم (حـەوت بەند)ەی کـە یەکەمیان بە (فارسـی) و دووەمـەکەیان بە (عارەبی)یە و لەهـەمـان کـاتیـشـدا ئەم حـەوت بەندە بە سـەرەتـای تاکـە (عـەرەبی)یەکـەیان ناسـراوە کـە (ئەنتـە شـەسـەل هودا)یە.

لێـرەدا نیـشــانە بۆ ئەو داری (کـونار)ە دەکـەم کـە یـەکـەمین درەخـتـێکەو بـەس کـە هـەرچی دارەوانی زۆر پسپۆر هەیە ناتوانێ بەسـەریدا سـەربکەوێ ئەوەندە دڕکی درێژو ئەستوورو ڕەقی بە هـەمـوو لایەکی لقوپۆپەکانییـەوەیەتی و هـەر لەبەر ئەوە ڕواڵەتە دژوارییـەی ئەو درەخـتەیە کە کراوەتە پەرژینی بارەگای مەزن و پیرۆزی خوای گەورە و توانا (عەرش).

(کوردی) بەو سـەختی و دژوارییـەی ئەو درەختـەیشـەوە ئەمـەتا (تووتی)ی تەبعی فـڕیوەتە سـەر هـەرە لقە پۆپە (شـاخ)ی ئەو درەختە کە کەس ناتوانی پیا سـەربکەوێ و ئەوەتا ئەم گەیوەتە ئەو شـوێنـە.کـە مـەبەست لـەوەیە، ئەوەندە بەندیواری پێـغـەمـبـەرە و خـۆشی دەوێت کـە دەربـەسـتی دژواریی دارو دڕکی ژاراویی درەخـتـەکە نـەبووە و تەنانەت لە چوونە مـیـعـراجـەکـەیشی گـیـانی خـۆی وەهـا ڕەچاو کـردووە کـە هـەتا ئەو درەخـتـە وەک جبـرەئیل هـاوڕێی پێغـەمـبـەر بووەو خـۆی وەهـا زانیـوە کـە هـەر لەهـەرە مـناڵێـتـیی پێـغـەمـبـەرەوە هـەتا کـۆچی دوایی کـردنـی و چوونی بۆ

ئاسمان، بۆ بەهەشت بۆ بارەگای خوا بۆ ناو نووری خوایی لەگەڵیدا بووەو لێی جیا نەبووەتەوە لەوەپاش لەگەڵ گیانی پێغەمبەردا ژیاوە.

ئەم ڕاگەیاندنەیشم لەناو تاکە هەڵبەستەکانی ئەم حەوت بەندەدا ئاشکران کە ئەوەند (کوردی) بەوردی لە پێغەمبەر دواوە.

ئەم ڕواڵەتانەیش کە (کوردی) لە بارەی پێغەمبەرەوە ڕای گەیاندوون، هەرگیز نە (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و نە (کەسانی ئاینی بەهائی) ڕایەیان نەکەوتووە کە بووبێتیان و بەخۆیانەوە دیتبێ و هەر تەنیا پێغەمبەری ئیسلامە کە بەم ڕواڵەتانەوە پێناسە کرابێ و بەس.

ئەو درەختی کونار (سەدر)ەیش لە چوار ئایەتی ژمارە (١٦)ی سوورەتی (السبأ) وە (٢٨)ی سوورەتی (الواقعە) و (١٤، ١٦)ی سوورەتی (النجم) دا ناوی هاتووە، واتە ئەو درەختە ناوێکی ئەفسانەی دەماودەمیی خەڵکی نییە و بەشکو بوونێتییەکی ئاینییە بەپێی بەڵگەی پەڕاوییە پیرۆزەکانی ئاینە ئاسمانییەکان.

(کوردی) کە ئاوا بە وردی ڕۆچووەتە ئەم باسەوەو لە هەموو گۆشەو کەنارێکی هەر دوورو هانانەکراوی دواوە بەڵگەی ئەوەیە کە بەوپەڕی پەروازەوە لە ئاسمانی بیرو هزر (خەیاڵ) دا دوور فڕیوە لە بارودۆخە سۆفگەرییە ڕاست و پاکەکەیدا کە پێوەی نەنازیوەو ئەو بۆ ناسینی سۆفیگەریی نەکردووە و بەشکو لەبڕوای لە هەرە ناخی دەروونەوە ئەو ڕێگەیەی گرتووە و بەشەوق و سۆزو ئارەزوو و، تاسەی گیانییەوە گەیوەتە ئەو (سەدرە)یەی کە نزیکترین فریشتە لە خوای مەزنەوە (جبرەئیل) بووە لەوی بەولاوە توانایی چوونی نەبووە و، ( کوردی) وەک هاوشانی ئەم فریشتەیە نەک هەر گەیشتووەتە بن ئەو درەختەوە بەشکو گەیشتوویشەتە سەر هەرە چڵە پۆپەی بەرزی ئەو درەختە دژوارەی کە تەنانەت هەموو باڵندەیەکیش توانایی ئەو نیشتنەوەیەی نەبووە و نییە و نابێ ئاوا لەو درەختەوە نزیک بێتەوە کە لە خۆشەویستی پێغەمبەرەکەیەوە (باک) و (پەروا) ی لە دژواریی ئەو درەختە دڕکاوییە نەبووە کە نووکی هەر دڕکێکی ژارینی بە هەرکەسێکدا بچێت، چەند ڕۆژێک بە ئازاری ئەو دڕک پیا چوونەوە دەتلێتەوە.

بەمانەیشەوە (کوردی) چونکە چەکدار و زرێپۆش و قەڵغان هەڵگری (هێزی گیانی) بووە باکی بە چ سەختی و دژوارییەک نەبووە مەبەستی (جیانەبوونەوە) بووە لەو هێزە گیانییە نهێنی و خۆشەویستی و یادی ئەو پێغەمبەرە بووە، ئەمەتا (کوردی) لە دەمی (زارو هەناسەی) گیان (ڕوح) ی خۆیەوە داویەتە زایەڵە و چریکەو شیعر هەڵدان بەسەر پێغەمبەرداو لێی جیا نەبووەتەوە هەتا (سەدرە)کە تەنیا هەر لەوەیدا وەک چۆن ئیتر جبرەئیل (روح القدس) کە لەپێشترا ناوم برد، نەیتوانی لەوە بەولاوە بڕوات و ڕاوێستا (کوردی) یش وەک ئەو (روح القدس)ە و هاوشانێتی خۆی لەوێدا ڕاگەیاندووەو لە (دم) واتە گیانی خۆیەوە و تاکە هەڵبەستە (فارسی و عەرەبی) یە (حەوت پاتە)کەی فەرمووەتەوە بەڕووی (دم) کردنە پێغەمبەرەوە بەفەرمووە. بەهۆی ئەوەوە کە ئەو (درەختی کونار)ە لەو شوێنە پیرۆزەدا ڕواوە

ئەوەتا لە بەندو باوی کەلەپووری  کوردیدا ئەو درەختە بە پیرۆز دادەنێن و خواردنی بەروەکەی بە (شیفا) دەزانن و برینەوەی ئەو درەختە بە گوناهێکی گەورە دەزانن و (نە)ی لێ کراوەو گوایە مەترسی زۆر خراپ لە رێگە ئەوەدایە کە ئەو درەختە ببڕێتەوەو بەشکو چاندنی ئەو درەختە بۆ پیرۆزکردنی شوێنەکەیە کە تیا دەروێنرێت.

بەبیرکردنەوە لەم دوا تاکی بەندی سێیەمە دەردەکەوێ واتای قوولْترو ئاینییانەی زۆرتر هەڵدەگرێت من هەر ئەوەندەیم بە (بەس) زانی.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (حەوت بەند)ەکەدا (٧٧)مین تاک و لەم بەندی سێیەمەدا (٢٩)مین تاک و شوێنی ئەم تاکە لە هەر یەکێ لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆەی دوایە:

لە (صا) دانییە و لە (ط، ق/ ٣، مک) دا (١٥)مین تاک و لە( جم، حم، سجا)دا (١٦)مین و لە (با/ ١، ج، نم/ ١) دا (١٧)مین و لە (ص، گل/ ٦) دا (٢١)مین و لە (شح، ما/ ١) دا (٢٤)مین و لە (عن، نع)دا (٢٦)مین تاک و لە (مس، ن، ه) دا (٢٩)مین تاکە هەڵبەستی ئەم بەندی سێیەمەیە.

هەروەها لە هەموو سەرچاوەکانیشیدا دوا تاکی ئەم بەندی سێیەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

از دم روح ، لە ( عن، ن) دا  نووسراوە: (از دم غیب) واتە لە هەناسەی غەیبەوە – کە ئەمەش دەگونجێ.

**واتای گشتی:**

سەرباری ئەو هەموو لێکدانەوە ورد و قووڵەی پێشووم لەسەر ئەم تاکە هەڵبەستە بەدرێژی دووبارەی دەکەمەوە کە:

(کوردی) فەرموویەتی بەسەر چلە پۆپەی دار کونارەکەی پاڵ بارەگا (عەرش)ی خواییەوە لە زارو هەناسەی گیانمەوە ئەم (قسەیە) واتە ئەو تاکە حەوت پاتەییەکە لە زمانمەوە دەربڕدرا کە:

کای دمت نغمةء سرافیلي،
موردِ واردات جبریلي
أنتَ شمسَ الُهدی ونورَ الحَق
أظهِرِ الحقَّ یا ظُهورَ الحقْ

## بەندی چوارەم

٧٨- خیز جانا نوای دیگر زن
خرمنم را شرار فروهر زن
٧٩- دفع سودای فاسد غم را
بر رگ دل زغمز نشتر زن
٨٠- منکرانرا ز تاب شعلهء خویش
موّت نار و شدّت حّر زن
٨١- موسیٰ آسا به رغم سّحاران
یک عصای به نفس اژدر زن
٨٢- مست و مغرور کفرو بی باور
موج گرداب بحر احمر زن
٨٣- گمرهان را به زلزله و طوفان
سنگ باران و باد صرصر زن
٨٤- ضربت از تو، تن از تو، جان از تو
خواه شمشیر و، خواه خنجر زن
٨٥- تو شه تخت (ما عرفناک)ی
خیمه از ممکنات برتر زن
٨٦- شاهباز نشیمن قدسی
تا سر برج لا مکان پر زن
٨٧- ای که داری هوای دلبر ما
نقش مهرش به هر دلی بر زن
٨٨- بهرهء معنوی کزو بر گیر
رستم زال و مشت عنتر زن
٨٩- در ره آن حبیب نسخ آور
تیشهات بربت و بر آذر زن

٩٠- کـیـمـیـای سـعـادت ار خـواهی
بـر درش رخ چـو سـکـه بـر زر زن
٩١- دست کـوتاه کن ز دق البـاب
قـامـتت حلقـه سـاز و بر در زن
٩٢- گـر در آن آسـتـانه ره یابی
پشت پایی بقـصـر قـیـصـر زن
٩٣- ور نهندت بەجـبـهـه داغ قـبـول
داغ و غـم بـر دل سـکـنـدر زن
٩٤- سـر بەپاگـە سگان کـۆیش نـه،
دەست ردّ بر سـریر سنجـر زن.
٩٥- مـسـت لولاک باش بی پروا
بر سـر کـفـر شـیـر اکـبـر زن
٩٦- از سـر افگن خـیـال افـسـر و زر
سنگ درگـاه دوست بر سـر زن
٩٧- قلم نسخ بەپنج مـصـحف نه
کـزلک حک به چار دفـتـر زن
٩٨- بانگ حق آشکار فـرمـودند
نـعـرەء جـوش و رقص، آور زن
٩٩- جـرعـەای برکش و بدین آهنگ
شـور و غـوغـا بر اهل مـحـشـر زن

..............................................................

٧٨- خیز: ڕابە، هەڵسە، ڕاپەڕە، مەبەست لە دەنگ لێکردنێکە بۆ لە جێگەی خۆ (لە دانیشتوویيدا) هەستان و وریا بوونەوە، کە ئەمەش لەبەر هەڵستانی ڕێز لێگرتنە، کە (کوردی) دەنگی لە خۆی کردووە بۆ ئەوەی لەو بارەدا کە تیایا بووە (نەمێنی) و ڕاپەڕیت تاکو بکەوێتە بارێکی ترەوە.
جانا: ئەی گیانە، گیانەکەم، کە مەبەستی لە هەر ئیسلامێکی پاکیشە.
نوا: ئاواز، ئاهەنگ، ناوی ئاهەنگێکی مۆسیقییە، بەلای (ئاریانی)یەکانەوە، مەبەستیش لە چوونە بارێکی چاکی (ژیان)ە.

دیگر: هی که، هی تر، ئی تر، ئی که، دەدی.
زن: لێ بدە، ساز و ئاهەنگ و نەوایەکی تر لێ دە) بژەنە، پیامالە، بکوتە (وەک تەپڵ کوتان و پیامالینی و، بژەنە بۆ ئامێرە باییەکانی وەک شمشاڵ...
خرمنم را: خەرمانەکەم: خەرمانم، جۆخینم.
خرمن: مەبەست لە (تەمەن) واتە (تەمەنی خۆی)شی دەگرێتەوە و، یا ئەو بیروڕاو بۆچوون و بڕوایەیە لەکاتی دانانی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا بوویەتی کە ئەوانەی بە (خەرمانی خۆی) ناو بردوون.
شرار: ئەو پزیسک و پریشکە ئاگر کە لە شاخە و کڵپەوە بە ناو (با)دا بەرز دەبێتەوە، واتای (بەری)یش دەدات کە بە واتا سەرەبزووتک، یا، مەبەست لە پزیسکەکەیانە کە بەر بێتە ئەو خەرمانە ناوبراوەی گڕی تێ بەردات و لە زۆر خۆشەویستییەوە بۆ (پێغەمبەر – د.خ) یا لە تیشکی ڕووناکیی ئەوەوە ئەمیش گڕ بگرێت، بەڵام ئەو گڕ و کڵپە بڵێسەیەی کە:
فروهر: وشەیەکی زۆر دێرینەی کوردییە و لە پەهلەوێنیدا بە (فرەڤەهر:Frevehr) بەکار هاتووە بە واتا: تەنیا یەک گەردیلکە (ذرّة)یە لە گەردیلەکانی پەرتەوی ئاهۆرامردا: خوای چاکە بەخشییەتی بە لەشی هەرکەسێک کە ئەو گەردیلکە پەرتەوینە لە لەشی کەساندا ڕووناککەرەوەی ڕێگەی ڕاست و ئاراستەکردنی گیانی ئەو کەسەیە بەرەو ڕێگەی ڕاستی و چاکە و هەر ئەو پەرتەوەیش دوای مردنی کەسەکە ڕێنومایی گیانی ئەو کەسە دەکات بەرەو بالاّ: (ئاسمان)و سەرچاوەی ڕەسەنی گیانەکە، چونکە بەلای ئاینی زەردەشتییەوە ئەم لێکدانەوەیەی سەرەوە، دەستووری چارەنووسی کەسانە کە بەپێی کردەوەی (چاکە) یا (خراپە)یان، لە لایەن خوای مەزن (ئاهۆرا) وە پاداش دەدرێن کە بەرامبەر بەو خوای چاکە (ئاهۆر – یا – ئاهۆرا مەزدا)یش هێزی بەدکار ئاراستە کار بۆ بەدکاری هەیە کە ئەویش ژێر دەستە و دەستە و خوار و دروستکراوی خوای چاکە و مەزنەکەیە، کە لەو ئاینەد او لە ئاینە ئاسمانییەکانی تری وەک (مووسایی) و (عیسایی) و (محەمەدی) دروودی خوایان لێ بێ، ئەو هێزی خراپکارە بە (شەیتان) نامزەد کراوە.
جا (کوردی)کە ڕووی کردووەتە گیانی خۆی و داوای ڕاپەڕینی لێ کردووە بۆ ئەوەی ئەمجارەیان و لە سەرەتای ئەم بەندی (چوارەمین)ەیەوە بە ساز و ئاوازێکی نوێوە بێتەوە ئاراوەو، لە (گیانەکەی) خۆی خواستووە کە ئاگر بەربداتە جەستەی (کوردی) بەڵام ئاگرێک کە لەو گەردیلکەی پەرتەوینەی خوای مەزنەوە بێ لە پێناوی خۆشەویستی (پێغەمبەر – د.خ)دا گڕ بگرێ و، لەسەر ڕێبازی صۆفیگەرییەکەی خوای (فنا في الله) بێت.
زن: مەبەستی لە گڕ تێبەردانەکەی خۆیەتی.
هەروەها (فروهر) ناوی فریشتەیەکی نەتەوە (ئاریانی)یە کۆنەکانیشە، لە ئاینی زەردەشتیدا کە پەرتەوی (چاکە بەخشینی)ی بەدەستە، بەرامبەر بە چاکەکارانی کەسان، هەروەک ناوی مانگی (فەروەردین: ازار: مارت)ە کە ئەو مانگە بەو سپێردراوە کە سەرەتای ساڵی سروشتی

و سەرەتای دابەشکردنی چاکە و خۆشی و کامەرانییە لەو ساڵەدا، کە لە کاتی کۆتاییهاتنی ساڵی کۆن و سەرەتای ساڵی تازە و کردنەوەی ئاگری نەورۆز بەنیشانەی دوا ئاگری، ساڵی کۆن و یەکەم ئاگری پەڕتەو بەخشی ساڵی نوێ و (کوردی) خواستی ئەوە بووە کە بەو ئاگرە نوێیەی نەورۆز گڕی تێ بەربدرێت لە پێغەمبەر دۆستییەکەیدا کە نیشانەیشە بۆ پتر بەهێزبوونی ئەو دۆستایەتییەی بەو خەرمان گڕ تێبەربوونەی و لەوانە بێ ئەم سەرەتای بەندی چوارەمەی لە (ڕۆژی جەژنی نەورۆزی پیرۆز)ەدا دەست پێ کردبێ، کە هەروەکو ئەوە ئەم جەژنە بەلای کوردەوە پیرۆز بووە:

**هەڵسەنگاندن:**

نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە، چەشنە گرانی (قورسی)یەک لە (کێش)ەکەیدا هەیە، بەتایبەتی لە وشەی (فەرەوەهر)دا.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (جم) و (صا)دا نییەو، لە هەموو سەرچاوەکانی تردا (٨٧)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە و تاکی یەکەمینی ئەم (بەندی چوارەم)ەیانە.

هەروەها شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

لە (ص، ق/٣، مک)دا (١٦)یەمین و لە (با/١، ج، حم، سجا، نم/١)دا (١٨)یەمین تاک و لە (گل/٦)دا (٢٢)یەمین و لە (ف)دا (١٣)یەمین وە لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨)دا: (٢٣)یەمین و لە (مع)دا (٢٤)یەمین و لە (شح، ما/١)دا (٢٥)یەمین و لە (عن، مع)دا (٢٧)یەمین و لە (مس، ن، ه)دا (٣٠)یەمین. تاکە.

**جیاوازیی سەرچاوەکان:**

لە (عن، ن، ما/١)دا لە جێگەی (خیز) نووسراوە (خیزو) کە ئەمیش دەگونجێ.

فروهر، لە (نم/١، با/١، سجا، هم، گل/٣، فا)دا نووسراوە (نَوْ دَرْ)، کە ئەمەش واتا نادات – دەشێ ئەمەش جۆر، (موعەمما: پەردەک)ێک بێت و من بۆم ساغ نەکرایەوە و (ئەندامانی لیژنە)یش سەریان لێ دەرنەکرد.

فروهر لە (عن)دا نووسراوە (نودو) کە بەلای منەوە ئەمیش یا واتا نادات و ئەگەر (پەردەک)یش بێت ئەوا نەمن و نە (ئەندامانی لیژنە)یش بۆمان هەڵنەهێنرا.

لێکدانەوەیەکی هەڵە:

**واتای گشتی:**

(کوردی) ڕووی دەمی کردووەتە گیانی خۆی کە ئەمجارە دەم لە ساز و ئاواز و نەوایەکی ترە، ڕوچووە، دەربڕینی خۆشەویستی و هەڵنانە بەرامبەر بە (پێغەمبەر – د.خ) بەڕادەیەک نەک هەر ئاهەنگ ئاسایی بەشکو لە تاو، تاووتینی ئەو خۆشەویستییە خوازیاری گڕ تێبەربوونی خۆیشی بووە بە پەڕتەو (نوری خۆشەویستی)یە، وەک ڕۆژێکی نوێی (نەورۆز بێ) لەم تاکەیش بەدواوە جارجار ڕووی دەم لە پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)ە.

٧٩- دفع: لادان، لابردن، لێ ڕسگاربوون، چاککردنەوە، پاڵ پیوەنانی (سەوداسەرییەکەی خۆی).
سودای: سەودای.
سەودا: نەخۆشییەکی دەروونییە کە لە پزیشکیی کۆنی سەرێنی (کوردی)دا بە تێکەڵیی ڕەش ناوبراوە وە – (مالیخولیا)ی پێ وتراوە و، لەشێوەی جۆرە شێتییەکیشدایە، خەمۆکی ، شەمووله، ڕەچاوکردنی هەرشتێک بە خراپ لە تاو هێزی ئەو شێفتەیی دڵدارییە.
بەلای هەندێکیشەوە وایە: ئەو تووشبووە (خۆشی لە خەم و خەفەت) وەردەگرێت و بەلایەوە خەوێکە و نایەتە دی.
فاسد: پیس بوو، خراپ، گەنیو، ڕزیو، (کوردی) سەوداییەکەی چواندووە یا کردووە بە (فاسد).
غم را: لە خەمەوە، لە خەفەتەوە واتە ئەو سەودا فاسیدەی کە لە خەمەوە پەیا بووە.
بر رگ دل: ڕیشەی دڵ بدەرە بەر، لە دەماری دڵ بدە،
زغمز: لە غەمزەوە،
غمز: چاو هەڵتەکاندن، برۆ هەڵتەکاندن، بە تیلایی چاو ڕوانین کە جوانییەکی کاریگەر دەگەیەنێ. لە گۆشەی چاوەوە ڕوانین. (چاوی ناز)ی پێغەمبەر لە هەرچی زۆرتر جۆش بە هەستی (کوردی) بسێنێ.
(کوردی) کاریگەریی ئەم (غمزە)یەی ڕاگەیاندووە کە بدرێتە بەر نەشتەر.
نشتر زن: بەر نەشتەری بدە، واتە غەمزەکە، کە وەک نەشتەر کاریگەرە ئەو نەشتەری غەمزەیە بدە لە ڕەگی دڵ واتە چاوێریم بکە.
نشتر: تیغ یا (درەوشەیەکی پانی نووک و مەودا) تیژە پزیشک لە کاری نەشتەرگەری، یا دومەڵ هەڵدڕیندا بەکاری دەهێنێ. کە دیسان لەو نەشتەرە کە لە (غەمزە)ی چاوەکەوەیە، مەبەست لە (برژانگ)یشە.
خواستی (کوردی) بۆ ئەوەی ئەو نەشتەری غەمزە و برژانگە لە ڕەگی دڵ بدرێت، نیشانەیە بۆ خوێن بەردان (وەک چارە) بۆ زۆر نەخۆشی لە کوردەواریدا، کە بەخوێن گرتن (حەجامەت) دەکرێ و دەنگ وەهایە کە (خوێن بەردان) یا (خوێن گرتن) سوننەتی پێغەمەریشە لەبەرئەوە سەرەڕای ڕاستی کارەکە لەڕووی زانستیی پزیشکییەوە. هەروەها (پیرۆز)یشەو مەبەستی (بەردان)ی خوێنی پیسی ناو دەماری بۆگەن واتە خەیاڵی خراپە.
ئەم تاکە:
بەپێی ئەوەندە سەرچاوەیەی دەستم کەوتوون لە سەر ئەم حەوت بەندە، ئەم تاکە (٧٩)یەمین وە بەپێی ئەم (بەندی چوارەمین)ەش دووەمین تاکی ئەم بەندەیە، بەڵام شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا، واتا: (چەندەمینیەکەی) بەم جۆرەیە:
لە (جم، ص)دا نییە و لە (ف)دا (١٤)یەمین تاک و لە (ط، ق/٣، مک)دا (١٧)یەمین و لە (حم، سجا)دا (٥٨)یەمین و لە (با/١، ج، نم/١)دا (١٩)یەمین و لە (صا)دا (٢١)یەمین و لە

(گل/٦)دا (٢٣)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨)دا (٢٤)یەمین تاکە و لە (مع)دا (٢٥)یەمین و لە (شح، ما/١)دا (٢٦)یەمین و لە (عن، نع)دا (٢٨)یەمین و لە (مس، ن، ھ)دا (٣١)یەمین تاکە ھەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا.

**جیاوازییەکان:**

دفع، لە (ط)دا نووسراوە (رفع)

غم را، لە (عن)دا نووسراوە: ھم/١. دەگونجێ و یەک واتان

دل، لە (عن، گل/٣، ما/١، نم/١، با/١، سجا، حم)دا نووسراوە: (جان).

**واتای گشتی:**

بۆ لابردنی سەودای لە غەمدا گەنیودا وەک دەرکردنی دومەڵێک بۆ دەرچوونی چڵک و ڕزیوییەکە وەک (باو)ە لە نەشتەری کاریگەریی جوانیی تیلایی و نازی چاو یا لە برژانگەکەیەوە وەک نەشتەر پەتاوی و گەنیوی دڵ بەو نەشتەر کە لە ڕەگی دڵەکە بدرێت ئەو چڵکە دەرکەن ئەمەش نیشانەیە بۆ خواستراوان لە سونیگەریدا.

٨٠- منکرانرا: مونکیرەکان.

(منکر) ئەو کەسەیە کە ھەر شتێ خواستی خوای مەزنی لەسەر بێ (تیا بێ)، ئەو کەسە، بەزوبان و کردەوە ئەو خواستە بەجێ نەھێنێ و دژی بێ.

مەبەستی (کوردی) لێرەدا ھەر (نا فرمانی) خوای گەورە نییە بەشکو مەبەستی لەوانەیشە کە باوەڕ بە پێغەمبەرێتیی ئیسلام و بە ئاینەکەی ناکەن.

(کوردی) وەک لە سەرەتای ئەم بەندی چوارەمەوە دەنگی لە (گیان)ی خۆی کرد بۆ ھەڵگیرساندنی ئاگری نووری خوایی و فەرمایشتەکانی کە پێغەمبەری ئیسلام بە خەڵکی ڕاگەیاندوون لێرەدا (کوردی) بەو (گیان)ەی خۆی گوتووە کە ئا لەو (تین و تاو)ی مەشخەڵانی ئاگری پەڕتەوت.

زتاب شعلەء خویش: لەتاو پەڕتەوی خوایی خۆی. مەبەستی (کوردی) لە (تین و تاوی شوعلە)ی گڕی نووری خوایی (تێ بەربوونەکەی) خۆیەتی کە بەھەرەوەربوونە بە (پەیڕەو)کردنی (قورئان) و (حەدیث) و (سوننە) وەک ئیسلامێکی دروست و سۆفییەکی شەیدای لە ئەڤیندا سووتاو، بەو تیشکە.

خویش: خۆ، خۆت مەبەستی لە خودی گیانە گڕ تێبەر بووەکەیەتی کە لەو (گڕ)ەوە:

قوّت: ھێز.

نار: ئاگر، ئاور، ئاتەش.

شدّت: توندوتیژی، تین و تاوی،

حرّ زن: تاوی گەرمیی پێ بسێنە - ھی مونکیرەکان کە بەو ھێزی ئاگر و توندوتیژیی ئەو ئاگرە (مونکیر)ەکان بسووتێنە لە ئەڤیندا بیانھێنەوە سەر ڕێگەی ڕاست.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە حەوت بەندەکەدا (٨٠)یەمین و بەپێی ئەم بەندی چوارەمە سێیەمین و شوێنی لە سەرچاوەکاندا بەم شێوەیەیە:
لە (ف، صا، مک، ط، جم، نم/١، با/١، سجا، حم، ق/٣، ج)دا نییەو لە (ص)دا (٢٣)یەمین تاک و لە (گل/٦)دا (٢٤)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨)دا (٢٥)یەمین و لە (مع)دا (٢٦)یەمین و لە (شح، ما/١)دا (٢٧)یەمین تاک و لە (عن، نع)د (٢٩)یەمین و لە (مس، ن، ه)دا (٣٢)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە بەپێی ئەم سەرچاوەیانە.
جیاوازییەکان:
منکرنرا لە (ص) دا نووسراوە: (مشرکانرا) ئەمەش یەک واتایی نییە.
شعلەء، لە (عن، ما/١، مع) دا نووسراوە: (مشعل) ئەمیش دەگونجێ و جوانە و لە واتادا لە (شوعلە)کە بەهێزترە چونکە (مەشعەل) (گڕ تێ بەربوویی) و (شوعلە) تیشکی گڕ تێ بەربوونەکەیەو، لەبەر کەمیی ژمارەی ئەم سەرچاوانە لە تاکە هەڵبەستەکەی سەرەوەدا جێگیرم نەکرد.
خویش لە (عن، ما/١، مع)دا نووسراوە: (او) کە ئەمەش ناگونجێ.
قوت، لە (عن، ما/١، مع)دا نووسراوە (شدّت) کە ئەمەش پاش و پێشە.
شدّت، لە (عن، ما، مع)دا نووسراوە (قوّت) دیسان پاش و پێشە.
واتای گشتی:
(کوردی) بەگیانە گڕ تێ بەربووی ئەڤینە ڕاستەقینەکەی خۆی دەڵێت:
ئەوانەی کە (منکر)ن تو بە تین و تاوی ئەو ئاگرەی خۆت و هێزی ئاگرین و توندوتیژی گەرمایان ئاوقا بکە هەتا بسووتێن لە سزای (ئینکاری)یەکەیاندا و، یا بەشکو بێنە سەر ڕێگەی ڕاست و خواناسین و ئاین، چونکە ئەگەر ئەوانە (شفاعت)ی پێغەمبەریان بەرنەکەوێ ئەوا ئاگری دۆزەخ لەوە دنیایش هەر دەیانسووتێنێ و بەشی ئەوانە.
بەپێی شارەزاییم لە شیعری (کوردی) وەهای بۆ دەچم کە ئەم تاکە هەڵبەستەی نیشانە بێ بۆ (حەوت ڕۆژ) مانەوەی قەومەکەی (شوعەیب)، پێغەمبەر (د.خ) لەناو گڕی ئاگردا، چونکە لە خوا یاخی بووبوون؛ بەتایبەتی کە لە تاکی ئایندەدا (مووسا) پێغەمبەر (د.خ) دەدوێت.
٨١- موسی آسا: هەروەکو (مووسا) پێغەمبەر(د.خ) مەبەست لە گردبوونەوەکەی ئەو پێغەمبەرەیە لەگەڵ جادووگەرەکانی (میسر) لەلای فیرعەون.
بەرغم سحّاران: مەبەست لەوەیە لەگەڵ تواناییی ئەوانیشەوە، هێشتا هەر بەسەریاندا زاڵ بوو و، ژێری خستن و پەست و زەبوونی کردن.
ئا لێرەدا (واتە لە سەرەتای نیوباڵی دووەمدا) (کوردی) یا لەگەڵ گیانەکەی خۆیەتی و، یا ڕوو بەخودی پێغەمبەری ئیسلام گوتوویەتی تۆش وەک مووسا
یک عصایی: (داردەستێک ، گاڵۆکێک)
بەنفس اژدر زن: بماڵە بە خودی هەژدیهادا، کە (نفس) ذاتە، خود، گیان، لەش، جەستە، تەن،

خودی مرۆڤ پاراستنی بوونێتی هەر شتێک وەک لێرەدا مەبەست لەو پارچە (پەتک)انەیە کە جادووکارەکانی فیرعەون فڕێیان دان و بوون بە هەژدیها.
ئژدر: وشەیەکی کوردییە، واتە هەژدیهادی زۆر گەورە کە ئاگر لە دەمییەوە پژاوە، وەک لە ئەفسانە کۆنەکاندا هاتووە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (داردەست) یا (گاڵۆک)ەکەی حەزرەتی مووسا بووە کە فڕێی داوە بۆ هەژدیها جادووییەکان، ئەو دار دەستە بووەتە هەژدیهادیەکی یا مارێکی مارخۆر و مارە جادووییەکانی هەڵلووشیون. و (کوردی) گوتوویە: (یەک دار دەست بە خودی ئەو ئەژدیهایانەدا بماڵە)
زن: پیایان دا بماڵە.
داستانی ئەم جادووگەران و گاڵۆکەکەی مووسا پێغەمبەر لە ئایەتەکانی ژمارە (٧٥ – ٨٩)ی (یونس) و (٥٧ – ٧٦)ی (ط)، (٢٩ – ٥٢)ی الشعراء کە بەدرێژی لە (قورئانی پیرۆز)دا گێڕدراوەتەوە.
ئەم تاکە:
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی سەرچاوەکانم لە حەوت بەندەکەدا (٨١)یەمین تاک و لەم بەندی چوارەمەدا (٤)یەمین تاکە و بەپێی شوێن ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
لە (صا، جم)دا نییەو لە (ف)دا ش(١٥)یەمین و لە (ط، ق/٣، مک)دا (١٨)یەمین و لە (حم، سجا)دا (١٩)یەمین تاک و لە (با/١، ج، نم)دا (٢٠)یەمین و لە(ص)دا (٢٤)یەمین و لە : (گل/٦)دا (٢٥)یەمین و لە (گل/٣، گل٥، گل/٨)دا (٢٦)یەمین و لە (سجا، ما/١)دا (٢٨)یەمین دا و لە (عن، ن، نع)دا (٣٠)یەمین و لە (مس، ن، ھ)دا (٣٣)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە و لە هەموو سەرچاوەکانیشدا چونیەکن و جیاوازییان تیا نییە.
**واتای گشتی:**
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا ڕووی دەمی کردووەتەوە پێغەمبەر یان (گیان)ی خۆی کە خۆی بکەوێت، وەک مووسا پێغەمبەر –د.خ –
کە چۆن بەگاڵۆکەکەی جادووە ساختەکانی جادووگەرانی فیرعەونی میسری پووچ کردنەوە، ئاوەها تۆش بەو چەکی بەهرەمەندییەت لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئاوا وەک گاڵۆکەکەی حەزرەتی مووسا بماڵە بەدەروونی (مونکیر)ەکاندا دەروونیان لەو خشتوخاڵی بێ بڕوایی و گومڕایی پاک بکەرەوەو بیانهێنە سەر ڕێگەی ڕاست و، یا یەکسەر ڕووی دەمی لە پێغەمبەر کردووە کە چۆن (مووسا) ئەو موعجیزانەی دەنواند، تۆش ئەی پێغەمبەری ئیسلام بە گاڵۆکی بەهێزی ئایات و حەدیث و کردەوەکانت هەژدیهای ئەو مونکیرانە داپڵۆسە، یا بۆ هاتنە سەر ڕێگە یا بۆ تەفروتوونا کردنیان.
٨٢– ئەم تاکە هەڵبەستە درێژەدانە بە داستانەکەی حەزرەتی مووسا – د.خ – لەگەڵ فیرعەونی میسر و جادووگەرەکانی و، ڕەوکردنی ئەو پێغەمبەرە بە خۆی و پەیڕەویکارانی لە میسرەوە بۆ سەر زەمینی بەڵێن پێدراویان (فەلەستین) لەلایەن خوای مەزنەوە و کە ئەو ڕەوکارانە، گەیشتنە

گوێ دەریای (سوور) حەزرەتی مووسا – د.خ – دیسانەوە گاڵۆک (عەصا)یەکەی ماڵی بە ئاوی ئەو دەریایەدا بە فرمانی خوای گەورە لەو شوێنی گاڵۆک بە (ئاو) ماڵینەکەدا ئەو دەریایە (در)ی دا و مووسا و پەیڕەویکارانی لە بەنی ئیسرائیلییەکان لەو (در)ەوە بە وشکاییدا بەئاسوودەیی و بێ کۆسپ پەڕینەوەو لەو کاتەدا فیرعەون کە پێی زانیبوو مووساو نەوەی ئیسرائیلییەکان هەڵهاتوون بە سوپاوە بە دوای ئەو ڕەوکردووانەدا هاتبوو گەیشتە گوێ (دەریای سوور)، ویستی وەک ئەوان لەو شوێنی (در)ەوە کە لێی پەڕیونەتەوە، ئەویش بپەڕێتەوە، بەڵام بە پەڕینەوەی (جوولەکەکان) ئەو (در)ی ئاوە هاتەوە یەک و فیرعەون و سوپایەکەی کەوتنە بەر شەپۆل و گێژی دەریایەکە و خنکان (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا لەم داستانە دواوەو دوابەدوای تاکە هەڵبەستی پێشووی ڕووی کردووەتەوە (گیان)ی خۆی و فەرموویەتی:

مست و مغرور کفرو بی باور: کە ئەم وشانەیش واتایەکانیان ئەمانەن:

کفر: خوانەناسی ڕاگەیینەر، بێ ئاینی، ناسوپاس گوزاری خوای مەزن.

(کوردی) لە نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوەدا، ئەم ڕواڵەتانی وەک: (مەستی) و (مەغرووری) و (کوفر) و (بێ باوەڕ)یانەی کە لە (فیرعەون)و جادووگەران و دارو دەستەکەیدا هەمووی گرد کردوونەتەوە، لە گومڕاو خوانەناسانی سەردەمەکەی خۆی ا دەنگی لە (گیان)ەکەی خۆی کردووە کە ئەوان وەک چۆن حەزرەتی مووسا (د.خ) گاڵۆکەکەی خۆی ماڵی بەڕووی (دەریای سوور)، لە خۆرەڵاتی میسردا و، (در)ی بەئاوی دەریایەکە دا و، خۆی و پەیڕەویکارەکانی بەو ناو (در)ەدا ڕسگار بوون، ئەئاوەهایش (کوردی) بە پێغەمبەر یا بە(گیان)ی خۆی گوتووە کە تۆیش ئاوەها بماڵە بە شەپۆل (مەوج)ی دەریای سووری، واتە جیهانی تیا گومڕابوانی خوانەناسەکاندا و یا بیانهێنتە سەر ڕێگەی ڕاست و بڕواکردن یا لەناویان بەرن... کە فەرموویەتی:

موج گرداب بحر احمر زن

بماڵە بە شەپۆلی گەرداوی دەریای سووردا، کە:

گرداب: هەر شوێنێ لە ناو دەریا و ڕووباری گەورە و دەریاچە و گۆلدا کە ئاوەکە سوور بخوات و گێژێکی لوول خواردنی بەرەو ناوەوەی بنکی ئاوەکە دروست دەبێ کە هەرکەسێ یا هەرشتێ کەوتە بەر ئەو شوێنە و، ئەو سووڕخواردنی ئاوە بەرەو ناو بنکی ئاوەکە ئەو کەسە یا ئەو شتە بەرەو بنکی ئاوەکە ڕاپێچ دەکات دەرەتانی قوتاربوونی نامێنێ و ئەو کەسە یا ئەو شتە لەناو دەبات لەو (گرداب)ەدا.

(کوردی) کە بە (گیان)ەکەی خۆی گوتووە تۆش (مووسا) ئاسایی بماڵە بە شەپۆلی ئەو دەریایەدا بۆ ئەوەی (در) بوونەکەی ئاوەکە بێتەوە یەک و ئەو گومڕایانە بخنکێنێ لە دەریای سووردا. ئەو ڕسگاربوونی حەزرەتی مووسا و جوولەکەکانی بەپەڕینەوەیان لە دەریای سوور و خنکانی فیرعەون و لەشکرەکەی لە دەریایەکەدا کە سەرکەوتنی (حەق) بووە بەسەر پووچیی

گومڕاو خوانەناساندا لە (تەورات) و لە ئایەتەکانی: (١٣٦)ی سوورەتی (الاعراف) و (٩٠)ی سوورەتی (یونس) و (١٠٣)ی (الاسراء)وە (٧٥و ٧٨)ی (طه) و (٦٢، ٦٦)ی (الشعراء) و (٣٩، ٤٠)ی (القصص)و (٥٥)ی (الزخرف) و (١٧و ٢٤)ی (الدخان) و (٣٨, ٤٠)ی (الذاریات)ی قورئانی پیرۆزدا باس کراون، کە (کوردی) دیاریی ئەو کارەساتەی کردووە لەم کارەساتەیدا و بەپێی ڕێبازی صۆفییانە و خواناسیی.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی ئەوەندە سەرچاوەیەی کە لە سەری بە دەستم هێناون لەم (حەوت بەند)ەدا (٨٢)هەمین تاک و بۆ ئەم بەندی چوارەمە تاکی پێنجەمینە.

هەروەها شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە کە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی: (ف، ص، صا، مک، شح، مع، حم، جم، نم/١، ما/١، سجا، با/١، ق/٣، ج، ط)دا نییەو لە سەرچاوەکانی: (گل/٦)دا (٢٦)یەمین تاک و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨)دا (٢٧)یەمین و لە (عن، نع)دا (٣١)یەمین تاک و لە (مس، ن، ھ)دا (٣٤)یەمین تاکی ئەم بەندی چوارەمەیە.

جیاوازییەکانی:

مغرور، لە (مس، عن، ن)دا نووسراوە (مغرور) ئەمیش دەگونجێ.

خواستیاری (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا خنکاندنی کەسانی وەک فیرعەون و لەشکرەکەیەتی و مەغروور و کافرو بێ باوەڕ)ن وەک خنکاندنەکەی فیرعەون و سوپایەکەی لە دەریای سووردا ... ئەشێ مەبەستی لە داواکردن بێ لە پێغەمبەری ئیسلام کە ئەوانەی بۆ بکات.

٨٣- ئەم تاکە هەڵبەستە نیشانەیە بۆ نەهاتنە سەر ڕێگای خوانەناسیی بەرەی چەند پێغەمبەرێک کە خوا هەریەکەیانی بە جۆرە سزایەک لەناوبردوون؛ چونکە پەیڕەوی فەرموودەی پێغەمبەری خۆیانیان نەکردووە.

داستانی ئەو لەناوچوونانە و جۆری لەناوبردنەکانیان لە پەڕاوییەکانی (داستانی پێغەمبەران: قصص الانبیاء)دا لە (تەفسیر)ەکاندا بەدرێژی نووسراون و نیشانەیشیان تیا کراوە بۆ ژمارەی ئەو ئایەتی قورئانی پیرۆزی کە لەبارەی ئەوانەوەیە لە پەڕاوییە ئاینیەکاندا ناوبراون.

گمرهان را: گومڕایەکان، ڕێگە ڕاستی خواناسی و خواپەرستی بزرکردووەکان

مەبەست لەو گومڕایانە ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی کۆمەڵگایەکانی پێغەمبەران: (نووح) و (هوود)و (صالح) و (لووط)ە - د.خ - کە پەیڕەی فەرمایشی ئەو پێغەمبەرانەیان نەکردووە و نەهاتوونەتە سەر ڕێگەی خواپەرستی.

بەزلزلە بە (بوومەلەرزە) خاکی بەرەی هەردوو پێغەمبەر (صالح) و (لوط) د.خ - دا (تەپیوە)ی زەوی و ئاواییەکانیان وێرانی و نوقوم بوون.

طوفان: لافاو - کە هەڵسانی لێشاوی ئاوی زۆرە بەڕادەیەک کەسان و گیاندارانی ئەو شوێنە

لافاولێداوە، هەموو بەدەم شەپۆلی ئەو ئاوەوە بخنکێن.
لەم ناوهێنانی (لافـاوە)ەیش مـەبەسـتی لـە لافـاوە مـەزن و بەناوبانگەکەی سـەرێنی حـەزرەتی (نوح) – د.خ – یە کە خـەڵک ئامۆژگارییـەکانی ئەو پێغـەمبەرەیان وەرنەدەگرتن و سەرپێچییان لێ دەکردن و خـوای گەورەش فرمانی د بەوا پێغـەمبـەرە کە کەشتییـە مەزنەکەی خۆی دروست بکات و پەیڕەوی کارەکانی خـۆی خستـە ناویەوە و کاتێ لافـاوەکە هـەستا هەموو گومڕایەکان خنکان و پاش نیشـتنەوەی لافـاوەکە، ئەو کـەشـتییـە بەسـەر شـاخـی (گووتی: جـوودی)یەوە گیرسایەوە کە دەکەوێتە کوردستـانی ئێستـەی تورکیاوە و بۆ یەکەم جار لە مێژووی دوای لافاوەکەوە لەو بەشە کوردستانە مانەوە مرۆڤ جیابوونەوە بە جیهاندا.
سنگ باران: بـەرد بارین بەسـەر هەردوو گـەلی حـەزرەتی (صـالح) – د.خ – کە (ثمـود)یان پێ گوتراوەو هەروەها حـەزرەتی (لوط) پێغـەمبـەر – د.خ – کە (سـدوم)یان پێ گوتوون و، خـوای گـەورە لە سـزای یاخـیـبوون لـەو پێغـەمبـەرانەیاندا بە (بەرد بەسـەردا بارین) ئەو گـومـڕا و یاخییانەی لەناوبردووە.
باد صرصر زن: ئاوقای (با)ی (صرصر)یان بکە.
لەمەیش مەبەست نەهێشتنی گەلەکەی حەزرەتی (هود) پێغەمبەر – د.خ – یە کە نەهاتنە سەر ئەو رێگە ڕاستـەی کە پێغـەمبـەرەکەیان ڕێنومـایی نەکردن و خـوا لە تۆڵەی ئەو سـەر ڕەقی و گومڕاییەیاندا ئەو قەومە کە ناوی (عاد) بوو بە (با) سارد و سڕە (صرصر)ەکەی لەناوی برد – وشـەی (صرصر) لە سارد سارد، یا (ساردو سڕ)ەوەیە. (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستـەیداو لە زۆربەی تاکە هەڵبەسـتەکانی ئەم بەندی چوارەمەیدا لەوانەیە کە دەنگی لە (گیـانی خۆی) کردووە یا رووی دەمی کردووەتە پێغـەمبـەری ئیسـلام – د.خ – بە شـێوەی (گیـانا) واتە ئەی گـیـانەکـەم لەبارەیدا تکاکـار بووە کـە، لەهەمـان کـاتدا نیـشـانی بۆ ناوەڕۆک و بیـروڕاو کارەساتەکانی ناو بەندی پێشوو (بەندی سێیەم)یش کردووە کە لەو بەندی پێشووەدا (کوردی) هەر خـودی پێغـەمبـەرەکەمـانی هەر جارەی بەشـێوەیەک و بـەناوی پێغـەمبـەرێکەوە، یا لەگەڵ ناوبردنی پێغەمبـەرانی تردا و لە کات و شـوێنی جیاجیادا پێغەمبـەرمانی بەیاد کردووەتەوەو هەرجارەی تکای خـواستێکی لێ کردووە و، بەپێی پێویست بیروڕای گونجاوی بابەتییـانەی تێدا ڕاگەیاندوون.
ئەوەتا (کوردی) لێرەشدا تکا و خـواستی هێنانەوە دیی هەمان (موعجیزە)کانی ئـەو پێغەمبەرە ناوبراوانەی لێ دەکات بـۆ بنەبڕکردنی گومـڕاو خـوانەناس و یاخیـبـووان لە فـەرمـایشـتـەکانی خــوای گـــەورە و بۆ هێـنانـەوەی ئەوانـە بۆ خــواپـەرســتی و چاکــەکـاری و شـــارەزایانـە لە داستـانەکانی ئەو پێغـەمبـەرانە و گەلەکانیـان و چۆنیـتیی سـزادانیـانی بەجوانی و بەیەکەوە بەستنەوەیەکی وەستایانەوە ڕاگەیاندوون.
بەدووریشـی نازانم کـە (کـوردی) لە بـەهائییـەکـان بە تـەنگ هاتبێ و مـەبەسـتی لە سـزادان و لەناوبردنی ئەوان بێت بەپێچەوانەی ئەوانەوە کە لە تێنگەیشتنەوە لایان وا بووە یا لایان وەهایە

کە گوایە ئەم حەوت بەندە بۆ (بە هائوڵلا)یە، بەڵام ئەوە ڕاست نییە و بۆ پێغەمبەرە.
ئەم تاکە:
ئەم تاکە هەڵبەستە بۆ ئەم حەوت بەندە (٨٣)یەمین تاک و بۆ ئەم بەندی چوارەمە شەشەمین تاکە و بەپێی شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکاندا ژمارەکەی بەم چەشنەیە:
ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (با/١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نییە و لە (ص)دا(٢٥)یەمین تاک و لە (گل/٦)دا (٢٧)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨، ما/١، مع)دا (٢٨)یەمین و لە (شح)دا (٢٩)یەمین تاک و لە (عن، نع)دا (٣٢)یەمین و لە (مس، ن، ه)دا (٣٥)یەمین تاکە و لە هەموو سەرچاوەکانیشدا چونیەکەو جیاوازییان لە نێوان ناوەڕۆکی ئەم تاکەدا نییە.
واتای گشتی:
ئەم تاکە ڕووە بەگیانی خۆی یا پێغەمبەری ئیسلام – د.خ – یە کە گومڕایەکان وەک گەلانی پێغەمبەرانی پێشووتر کە سەرپێچییان لە فەرمایشتی خوا کردووە بە دەردی ئەو گەلانە بچن.
٨٤- ضربت از تو:
ضربت: دەستوەشاندن، داپڵۆساندن، پیاماڵین، لێدان، کوتاندن...
از تو: لە تۆوە، بە ئارەزووی خۆت، لە دەسەڵاتی تۆدا مەبەستی لەوەیە کە لێدانەکە بەدەست پێغەمبەرە.
تن از تو: ئەم (تو)یە پێغەمبەرە.
تن: لەش، جەستە
از تو: ئەمجارەیان ئەم (از تو)ە بە واتای (لە تۆوە) نەهاتووە بەشکو بەواتا و مەبەستی (هی تۆیە) دەربڕدراوە – واتە لەشیش هەر هی خۆتە ئەی پێغەمبەری ئیسلام – د.خ –.
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستی یەکەمەدا (لێدان و داپڵۆسین)ی خستووەتە دەست خودی پێغەمبەر لە هەمان کاتدا (لەش) و (گیان)یشی هەر بە هی ئەو پێغەمبەرە داناوە کە بەئارەزووی خۆی دەسکارییان بکات و لە ئاستی ئەودا سەری پێوە نییە و لە ناخەوە ئامادەی خۆبەختکردنە لە ڕێگای ئەو پێغەمبەرە خۆشەویست و ڕێنوماکارەیدا، گوێ لە مستە و بەرفرمان و دەربارە.
تا ئێرە لێکدانەوەی نیوباڵی یەکەم بوو، لە نیوباڵی دووەمدا هەر (کوردی) لە سەر هەمان ڕای تاکی یەکەمی سوورە کە:
خواه شمشیر: ئەگەر دەتەوێ بە شمشێر و – لێرەدا ئەو پێغەمبەرەی سەرپشک کردووە کە ئەو لێدانی لە سەر (گیان)ی (کوردی)یە کە بە هی پێغەمبەری داناوە چونت ئارەزوو لێیە یا دەتەوێ دەیدەیتە بەر شمشێر بیدە.
خواە خنجر زن: دیسان سەرپشککردنێکی دیکەیەتی بۆ پێغەمبەر کە ئەگەر دەتەوێ بەر (شمشێر)ی بدە و، یا بە خەنجەر دای دروو، کە ئەمەش پێ داگرتنترە کە سەری خۆی

(کوردی) بە شمشێر لێدان، یا بەر خەنجەردان پێی خۆشە، ئەوەندە بەرفرمان و گوێ ڕایەڵە بۆ ئەو پێغەمبەرە ڕەهبەرە. هەروەها مەبەست لە لێدانی گومڕایانە.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە (٨٤)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە لەم پەڕاوییەدا دەبێتە حەوتەمین تاکی ئەم بەندی چوارەمی ئەم پەڕاوییە.

بەڵام شوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیداو ژمارەکەی بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (صا، جم)دا نییە و لە (ف)دا (١٦)یەمین تاکە و لە (ق/٣)دا (١٧)یەمین و لە (ط، مک)دا (١٩)یەمین و لە (حم، سجا)دا (٢٠)یەمین تاک و لە (با/١، ج، نم/١)دا (٢١)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، ما/١، گل/٨، مع)دا (٢٩)یەمین تاک و لە (شح)دا (٣٠)یەمین لە (ص)دا (٢٦)یەمین و لە (عن، مع)دا (٣٣)یەمین و لە (مس، ن، ﻫ)دا (٣٦)یەمین تاکی ئەم بەندی چوارەمە یا ئەم حەوت بەندەیە و لە (گل/٦)دا (٢٨)یەمین تاکە.

جیاوازی:

ضربت، لە (نم/١، با/١، حم)دا نووسراوە: ضربت ئەمیش هەڵەیەو ناگونجێ.

ضربت، لە (ن)دا نووسراوە (خرّبت) ئەمیش هەڵەو لەنگییە.

تن، لە (مک، ط، ج)دا نووسراوە (دل) کە ئەمیش ناگونجێ؛ چونکە (دل) بەشێکە، ئەندامێکە لە لەش کەواتە

(تن) بەجێترو واتا فراوانترە کە گوترا (لەش) دڵیش دەگرێتەوە و لە (٢١) سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەدا (تن) واتە (لەش) نووسراوە، کە واتە (دڵ)ە کە بۆ ئێرە ناشێ.

واتای گشتی:

(کوردی) گوێ لەمستیی خۆی بەرامبەر بەپێغەمبەر ڕاگەیاندووە، لێدان بەدەستت خۆشە، چونکە لەش و گیانیش بەدەست خۆتەو چۆنت بوێت بەشمشێر یا بەخەنجەر، لێرە لە گومڕایان بدە بۆ هاتنەوە سەر ڕێگەی ڕاستی یا وەک پێغەمبەرەکانی تاکی پێشوو لەناویان بەرە.

٨٥- تو شە تخت: تو پادشای سەر تەختی.

شە: پادشای

واتە ئەی پێغەمبەر - د.خ - تۆ پادشای سەر ئەو تەختەی کە:

(ما عرفناک)ی: (نەمان ناسیوی).

ئەم (وشە لێکدراو)ەی (ما عرفناک)ە نیشانەیە بۆ ئەو فەرموودەی خودی پێغەمبەر:

«سبحانَکَ ما عَرَفناکَ حَقّ معرفَتَك...».

واتە ئەی خوای گەورە پاکژی و بەرزی و باڵادەستی، هەر بۆ خودی (ذاتی) پاکی تۆیە کە ئەی خوایە ئێمە تۆمان وەک ئەو ڕاستییەی بوونی خۆتە نەمانناسیت کە وا شایانی تۆ بێت.

کەواتە (کوردی) گوتوویەتی ئەی پێغەمبەر تۆ پادشای سەر تەختی فەرمایشی پیرۆزی (ما عَرفناکَ)یت و لە کاتێکا کە ئەوەند پادشایەکی مەزنی کەواتە دە:

بر تر زن: خێوەتەکەت لەسەروو گونجاوی و لە ژوورەوەی توانایی جێبەجێکردنەوەوە هەڵ بدە، چونکە تۆ (رحمە للعالمین)ی و دەسەڵاتی ئەوەت هەیە و لە بارتا هەیە ئەوەت پێ بکرێت بەهۆی ئەو خوا بەدروستی وەک شایانی خۆی دەناسێت و بەشێوەیەک (پەی)ت بەو راستییە برد کە بوویتە کۆتاییهێنەر بەپێغەمبەرێتی، چونکە هەموو پێویستییەکت تیا گرد بووەتەوە وەک لە تاکە هەڵبەستی ئایندەداو ناوەرۆکی ئەم تاکەی سەرەوە روونتری دەکاتەوە و لەویدا درێژە بەمی ئێرە دەدات.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لەم (حەوت بەند)دا (٨٥)یەمین و بەپێی ئەم بەندی چوارەمە، تاکی هەشتەمینە و شوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم شێوەیەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەی (صا، جم)دا نییە و لە (ف)دا (١٧)یەمین تاکە و لە (ق/٣)دا (١٨)یەمین و لە (ط، مک)دا (٢٠)یەمین و لە (سجا، نم/١)دا (٢١)یەمین و لە (با/١، ج)دا (٢٢)یەمین تاک و لە (ص)دا (٢٧)یەمین و لە (گل/٦)دا (٢٩)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، ما/١، گل/٨، مع)دا تاکی (٣٠)یەمین و لە (شح)دا (٣١)یەمین و لە (عن، نع)دا (٣٤)یەمین و لە (مس، ن، ھ)دا (٣٧)یەمین تاک ئەم حەوت بەندەیە و جیاوازی لە ناوەرۆکی ئەم تاکەدا نییە لە سەرچاوەکانیدا و لە هەمووواندا چونیەکە:

**واتای گشتی:**

ئەی پێغەمبەر – د.خ – تۆ کە پادشای سەرتەخت نوشینی، دەسەڵاتت ئەوەندە زۆرو فراوانە ئەم خێوەتی ئاینی ئیسلامە پیرۆزەتان نەک هەر لە ئاستی ئێستەی (سەرێنی کوردی)دا بەشکو لە ئاستی بەرتر و پێشتردا لە پلەی گونجاوی و شیاوی و، رەوایی، تریندا بۆ هەڵدا، بڵاوتری بکەرەوە بەجیهانی بوونێتیی فراوان و پان و بەرینتردا ئەو توانایی و دەسەڵاتەت هەیە، چونکە هەر تۆ بووی کە رووت کردەوە خوای مەزن و فەرمووت ئەی خوای مەزن و پاکژترین، ئێمەی مرۆڤ هێشتا ئەوەندەی شایان و پر بەپری زاتی پاکت و بەراستی تۆ ناسین بێت، هێشتا بەو تەواوییە نەمانناسیویت و تۆیەک ئەوەندە بە قووڵی خوات ناسیبێ، یارای ئەوەت هەیە ئەم خواستە تکاکارییەی منت پێ بەجێ بهێنرێت، لە تاکی ئایندەشدا درێژەی بەم بیرە داوە.

٨٦– شاهباز: شای بازان، مەبەست لە پەسەندی و پیرۆزیی ئەم باڵندەیەیە کە (کوردی) چواندوویەتی بەپێغەمەر، لە پێشتر لە رواڵەتی پیرۆزی (باز) دواوم.

نشیمن: نیشتگە، وڵات، شوێن.

قدسی: پاکژی و پیرۆزی، هەروەها نیشانەیشە بۆ فەرمووده (حەدیث)ەکانی خودی پێغەمبەر و، بەتایبەتی ئەوانەیان کە پربەپری ئایەتی قورئانن کە بە(حەدیث قودسی) ناسراون، وەک (کوردی) پێغەمبەر بەشابازی نیشتگەی ئەو حەدیثە قودسییانە ناساندووە.

تا سر: تا سەر، کە مەبەستی لە هەرە بەرزاییە (تاکو، تاوەکو، هەتاوەکو) ئەو بەرزترین شوێنە.

برج: کۆنگره، کەلوو.
لامکان: لەڕووی زمانی و فەرهەنگییەوە بە واتە (بەبێ جێ و شوێن)، بەڵام لەڕووی مەبەست و ئاینییەوە زارگوت (اصطلاح)ێکی تایبەتی خواناسی و، یا ڕواڵەتێکی خواییە کە خوای مەزنە، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەرچی بوونێتی هەیە لە خودی خواوەیە و هی خوایە بەڵام لەلایەنی ئاینی و صۆفیگەرییەوە (خوا) بە: (بێ جێ و بێ شوێن) واتە (لا مکان) ناوبراوە، چونکە لە تەنیا یەک ساتدا، لە هەموو شوێن و جێگەکانی بوونێتییەوە ئاگاداری هەموو شتێکێتی بۆیە بە (بێ جێ: لامەکان)یش ناسراوە.
(کوردی) ئەو (ئاسۆ)یانە (ئافاق)و پان و بەرینانەی بۆ پێغەمبەری ئیسلام ئەوەندە بەڕووبەرێکی بچووک ڕچاوکردوون کە بەماوەی (هەناسەی بورج)ێک ناونووس کردووە. و بۆیە فەرمووییەتی
پر زن: بفرە، پەرواز بکە لەو (ئافاق)ە ناوبراوەدا ئەمەش جارێکی کە، (دانان)ی کوردی بەڕاستی و بوونی (میعراج) کە پێغەمبەر لە کاتێکی هەرە کەمدا چووە (میعراج)و لە بارەگای خوای مەزندا دوای (بیستن) و (گوتن) گەڕایەوە و بۆیە ئەو (ناو بوونێتییە) بەربڵاوەی بە پەروازکردنێکی تاکو سەر (بورج) داناوە کە بەگوێرەی توانایی پێغەمبەر ئەو هەموو شوێنە (لا مکان)ە فراوانەی کورد گوتەنی ئەوەندە بەتەسک و نزیک ڕاگەیاندووە هەروەک بڵێ (ڕێگەی کانییە) و (ڕیشی ناوەتە سەر). یا وەک چۆن ئەو شوێنی بوونێتییە مەزنە لە هەمان کاتدا خوای لێیە ئاوەهایش پێغەمبەر – د.خ – ئاگەدار و پەیوەندیدارە کە لە هەمان کاتدا کە خوای لێیە.
ئەم ئاگاداری و پەیوەندییەش نیشانەیە بۆ بوونی ئەو (یەکبوونێتی – الأتحاد)ە صۆفیگەرییەی کە لەمەوبەر بەدرێژی لێی دواوم و کە توانایی پێغەمبەر لەو رادە (زەبەنگە)یەدا بێ، دەبێ ئەو (ئافاق)ە فراوانە لە هانای چاو بەربڵاوتر دەبێ و هەر لەم بیروبڕوا و بۆ چوونەوەیە کە (کوردی)مان ئاوا بەو پێغەمبەرەدا ڕاپەڕمووە و، ئەمەش بە قووڵایی ڕۆچوونی خودی (کوردی) دەگەیەنێ لەو (إتحاد)ە صۆفیگەرییە.
بیر بۆ ئەوەش دەچێت کە (کوردی) وەک دڵی بەخەڵقانی گومڕاو یاخیبووان لە فەرمایشی خوا، سووتابێ کە ئەو کەسانە لە پەیڕەویکردنی دەقە ئاینییەکان و لە خواناسی و لە خوا پەرستی دوور کەوتوونەتەوە و ڕوشتەی برایەتی و خۆشەویستیی ئاینییان لە نێواندا پچڕاوە و پەرت و بڵاو بوونەتەوە لە یەکتر، بۆیە ئەوەتا وەک ناچارێک هانای بۆ ئەو پێغەمبەرە ڕەهبەر و خۆشەویستەی بردووە و تکاکار و خواستیاری ئەوە بووە لەو پێغەمبەرە کە بەدڵسۆزیی خۆی، موعجیزە ئاسایی وەک موعجیزەی چوونە میعراجەکەی ئەو خەڵکە گومڕا و لە ڕێگە لاداوە، بەهرەوەری بەخۆداچوونەوە و هاتنەوە سەر ڕێگەی ڕاست بکات.
لێرەشدا بڕواکردنی (کوردی) بەبوونی (گیان) و توانایی لە ڕادە بەدەری (گیان) ئاشکرا دەبێ، کە (گیان) هەر دەمێنێ ئەگەرچی لەشی ئەو گیانە بووبێتەوە بەخۆڵ و کەواتە ئەم

خواستانەی (کوردی) لە پێغەمبەر لەبەر هێزی بڕوایەوە بە بوون و مانەوە و توانایی (گیان)
ئەم تاکە:
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی ئەمەندە سەرچاوەیەی کە لە سەر ئەم (حەوت بەندە) دەستم کەوتوون دەبێتە تاکی (٨٦)یەمین و بڕوام وایە کە سەرچاوەی تر ئاشکرا بکرێن کە تاکە هەڵبەستی تری ئەم (حەوت بەند)ەیان تیا بێ و ئەو سایە ئەم ژمارەی (٨٦)یەمینە زۆرتر دەبێ.
بەم پێیەیش ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە. لەم بەندی (چوارەمین)ەدا دەبێتە (٩)یەمین تاکە.
هەروەها ئەم تاکە هەڵبەستە لەسەرچاوەکاندا شوێنی لە حەوت بەندەکەدا بەم جۆرەی دواییە:
ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەی (صا، جم)دا نییە و لە (جم)دا (١٧)یەمین تاکە و لە (ف)دا (١٨)یەمین و لە (ق/٣)دا (١٩)یەمین و لە (ط، مک)دا (٢١)یەمین تاک و لە (سجا)دا (٢٢)یەمین و لە (با/١، ج، نم/١)دا (٢٣)یەمین و لە (ص)دا (٢٨)یەمین و لە (گل/٦)دا (٣٠)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨، ما/١، مع)دا (٣١)یەمین و لە (شح)دا (٣٢)یەمین تاک و لە (عن، نع)دا (٣٥)یەمین و لە (مس، ن، ه)دا (٣٨)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە

**جیاوازییەکان:**

برج، لە سەرچاوەکانی: (عن، گل/٣، ف، نم/١، سجا، جم)دا نووسراوە (اوج) کە مەبەست لە (هەرە بەرزایی)، یا (دوورترین شوێن)ە کە (مانگ) تیا بێ بەو دوورایییە لە (زەوی)یەوە و ئەمەش دەگونجێ، بەڵام (برج) بەجێترە.

**واتای گشتی:**

ئەی شابازی نیشتگەی پاکژی و پیرۆزی و تیژڕەو لە ڕاگەیاندنی (حەدیثی قودسی)یەکانتدا کە هاوواتای پڕبەپڕن لەگەڵ ئایەتە فەرموودەکانی خوای گەورە، لە قورئانی پیرۆزدا، دەسا (بفرە) هەتا سەر (بورج)ی (لامەکان) کە لە هەرە شوێنێکە بارەگای خوای لێیە و ئەو خوایەی شوێنێکی تایبەتی بۆ نییە، بەو توانایییەی خۆت فریای ئیسلامەکانت بکەوە.....

٨٧- ای کە داری: ئەی ئەوەی کە هەتە، (مەبەست لە پێغەمەر)ە و هەروەها مەبەستیشی لە (گیان)ەکەی خۆیە کە لە تاکی یەکەمدا بە (جانا) واتە (ئەی گیان) ڕووی دەمی تێ کردووە، یا مەبەستی لە هەر (ئیسلامێکە)

هوای دلبر ما: هەوای دولبەری ئێمە.

دلبر: دڵخواز، دڵبەند، خۆشەویست.

ما: ئێمە.

واتە ئەی پێغەمبەر، (ئەی گیانەکەی خۆم) ئەی هەر ئیسلامێک، ئەی ئەوەی کە تۆ هەتە، (گێز لێبوون)، ئارەزووکردن و، خۆشەویست و دڵبەندەکەی ئێمەت هەیە.
لێرەدا ئەگەر (کوردی) ڕووی دەمی لە (گیان)ی خۆی بوویێت، ئەوا ئەو خۆشەویست و دڵبەند و ئارەزووکراوە کە (دڵبر)ە، ئەوا ئەم دولبەرە خودی پێغەمبەرە. خۆ ئەگەر ڕووی دەمی لە

پێغەمبەر یا لە هەر ئیسلامێک بووبێ، لەم تاکە هەڵبەستەیدا ئەوا ئەو (دڵبر) مەبەست لە خوای گەورەیە.

لە نیوباڵی دووەمی ئەم تاکەدا رووی دەمی کردووەتە ئەو (پێغەمبەر) یا هەر ئیسلامێک (گیان)ی خودی خۆی (کوردی) و ئەوەندەیان توانا و دەسەڵاتدار دەبینێ کە پێی گوتوون.

نقش مهرش: (نەخشی خۆشەویستیی ئەو).

جوانکاری: بەرێنووسی کۆن وشەی (مهر) بەشێوەی (مهر: مۆر) و، (مهر: خۆشەویستی)یش دەخوێندرێتەوە، بەکارهێنانی وشەیەکی ئاوەها کە دوو واتای جیاجیا بدات لەرووی دەستووری وێژەی کونەوە جوانکارییەکی پەسەندی وێژەییە.

ئەمجا (کوردی) خواستوویە کە ئەو، (مهر)ی بوونە ئیسلامییە.

مهر: خۆشەویستیی پێغەمبەر یا خۆشەویستی ئیسلامەتییە:

**لێکدانەوە:**

بەهر دلی بر زن: بەهەر دڵێکدا بدە. مەبەستی لەوەیە ئەم مۆرە بەهەر دڵێکدا بنێ، یا هەر دڵێکی پێ مۆر بکە، چونکە جاران لە جێگەی (ئیمزا)کردن یا بە (پەنجە مۆرکردن) ئامێری (مۆر) بەکارهێنراوە کە ناوی کەسەکەی بەشێوەیەکی تایبەت وەیا ساڵی لە دایکبوونیشی لەگەڵ نازناویشیدا لەو مۆرە هەڵکەنراوە.

هەروەها مەبەستی لەوەبووە کە بەنەخشی خۆشەویستی هەر دڵێک بڕازێنەرەوە و ئاوەدانی بکات.

ئەم تاکە:

ئەو تاکە هەڵبەستە بە پێی سەرچاوەکان (٨٧)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە و (١٠)یەمین تاکی ئەم چواربەندەیشە.

بەڵام شوێنی ئەم تاکە بەپێی سەرچاوەکانی لە (صا، جم)دا نییە و لە (ف)دا (١٩)یەمین و لە (ص)دا (٢٩) یەمین تاک و لە (ق/٣)دا (٢٠)یەمین و لە (حم، ط، مک)دا (٢٢)یەمین و لە (ســجــا)دا (٢٣)یەمین و لە (با/١، ج، نم/١)دا (٢٤)یەمین و لە (گل/٦)دا (٣١)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨، ما/١، مع)دا (٣٢)یەمین تاک و لە (شح)دا (٣٣)یەمین و لە (عن، نع)دا (٣٦)یەمین و لە (مس، ن، ھ)دا (٣٩)یەمین تاکە لەم حەوت بەندەدا.

**جیاوازییەکان:**

دلبر ما: لە (عن، ف)دا نووسراوە (شاهد ما) کە هەمان واتا دەدات و دەگونجێ:

**واتای گشتی:**

کوردی لەم تاکە هەڵبەستەیدا رووی دەمی لە پێغەمبەری ئیسلام یا لە هەر ئیسلامێکی هاودڵی خۆی یا لە (گیان)ی خۆی کردووە کە ئەی ئەو کەسەی تۆش هەوای خۆشەویستیی دڵخوازەکەی منت هەیە دەسا تۆش بەمۆری خۆشەویستیی خۆت دڵی هەر کەسێکی تردا شەقڵی خۆشەویستی بکە لە پێناوی ئیسلامەتیدا.

لەم جۆرە بیروباوەڕەی ناو ئەم تاکە لە تاکە هەڵبەستی ئایندەشدا درێژەی هەیە.

٨٨- ئەم تاکە ئەگەرچی وەک درێژە پێدانێکە بەناوەڕۆکی تاکە هەڵبەستی پێشوو، بەڵام وەها پێ دەچێ کە هەر ڕووی دەمی لە هەر ئیسلامێک یا لە (گیان)ی خۆی بێت و فەرموویەتی

بهرەء معنوی کز و بر گیر: بەهرەو پیت و پیرۆزیی (حەقیقی) ڕاست و دروست لەوەوە وەربگرە.

ئەو وشەی (مەعنەوی)یە بەلای ئاینی و صۆفیگەرییەوە تایبەتمەندییەکی نوێی هەیە کە لە واتادا دژی وشەی (مەجازی)یە و لە ڕووی واتاوە مەبەست لە ناوەوەیی (باطن)یەو دژ بە وشەی (ظاهیری)یەو بەلای زۆرینەوە دەنگدانە لە هێزە نهێنییە خواییەکان و لە شوێنی تردا لەم وشەی (مەعنەوی)یە بەدرێژی دواوم لەم پەڕاوییەدا. کە مەعنەوی وشەیەکە لە غەیری مەعنای حەقیقیی خۆیدا بەکاربهێنرێت و بەڵام لەم یا لەو لایەنەوە نیسبەتێکی مەعنای ئەصلییەکەیەوە هەیە.

(کوردی) فەرموویەتی ئەم بەهرەی مەعنەوی لە؛

کزو برگیر: لەوەوە وەربگرە، واتە لەو خۆشەویستی و میهرەبانییەوە لەو نەخشبوونی دڵ و ئاوەدان بوونیەوەیە و (مۆر)کرانی خۆشەویستییەوە، لە دەقە باڵا و پەسند و مرۆڤایەتییە جوانەکانی ئیسلامەوە، وەربگرە بەڕادەیەک بەو بەهرە وەرگرتنە ئەوەندە بەهێز ببی کە بتوانی: ڕستم زال و مشت عنتر زن: (رستم زال) و مستەکۆڵە (سیخورمە) لە (عنتر) و لە خودی ڕۆستەمی زاڵیش بدە. کە مەبەستی لەوەیە وەک لە کوردەواریدا باوە دەڵێن: (شا بەسەپانی خۆی نازانێ) و، (کوردی)یش مەبەستی لەوەیە کە بەهرەی مەعنەوییەکە لە دەقە ئیسلامییەکانەوە و، یا لە پێغەمبەری ڕابەری ئیسلام وەربگرە و ئەوسایە، بێ خەم بە، دەگەیێتە ڕادەیەک لە (رستم زال) بدەو خۆتی پیادە لێی مەترسە و مشت لە (عەنتەر)یش بدە کە دوو پاڵەوانی بەتوانان و ئەم تواناییەی (کوردی) مەبەست لە توانایی وەرگرتنی مەعنەوییە.

کزو: لەوەوە، واتە لە ئیسلامەتی یا لە خودی پێغەمبەرەوە بەهرە وەربگرە.

برگیر: وەربگرە، بەهرەوەر ببە، بەدەست بهێنە، پێی بگە.

مشت: مست و مشت، مستەکۆڵە، سیخورمە، چەپەڵاک.

عنتر زن: واتە مشتی لێ دە، پیایماڵە، دای پلۆسە.

عنتر: پاڵەوان و هۆزێکی بەهێزی (عارەب)ە، بەئازایەتی لە چەند جەنگێکدا ناوی دەرکردووە، داستانی دڵداری و دڵخوازیشی لەگەڵ (عەبلە)ی دڵخوازیدا بەناوبانگە (عەنتەر کوڕی شەدداد) لە ساڵانی ٥٢٥ – ٦١٥ز دا ژیاوە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی (ن، ف، صا، مک، ط، حم، نم/١، با/١، سجا، جم، ما/١، ق/٣، ج)دا نییە و لە (ص)دا (٣٠)یەمین تاک و لە (گل/٦)دا (٣٢)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥ گل/٨، مع)دا (٣٣)یەمین و لە (شح)دا (٣٤)یەمین و لە (عن، نع)دا (٣٧)یەمین و لە (مس، هـ)دا (٤٠)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە بەپێی ئەم حەوت بەندە (٨٨)یەمین و لە بەندی چوارەمەدا (١١)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

کـزو، لە (مع، گل/٣، گل/٥)دا نووسـراوە (ازو): ئەمـیش دەگونجێ بەڵام (کـزو) بەهێـزترە بۆ ئێرە.

مـشت، لە (ص، عن، مع)دا نووسـراوە (چند) واتە چـەندێک لە مـەبەست لە چەند جـار لێـدانی (مشت)ەکەیە.

ئەمیش دەگونجێ.

**واتای گشتی:**

(کـوردی) بەئیـسلامـێکی پاک یا (گـیـان)ەکەی خـۆی فـەرمـووە کـە بەهرە (پیـرۆزی و پیت)ی مەعنەوی لەو پێغەمبەرەوە یا لە (ئیسلامەتی)یەوە وەربگرە و ئیتر بێ پەروایانە، بچۆ ڕۆستەمی زاڵ داپڵـۆسـەو مـسـتـەکـۆڵە بسـرەوێنە لە عـەنتـەر کـە دوو پاڵەوانی بەهێـز و ناودار بوون کـە مـەبەسـت لەوە ئەوەندە بەهێز دەبی دەتوانی لە پاڵەوانی وەک ڕۆسـتـەم و عـەنتـەر بدەیت، بەڵام ئەم هێزی مەعنەویی مەبەست بووە نەک، هێزی زۆری بازوو، جەنگی.

تاکە هەڵبەستی ئایندەش وەک درێژەدان بەواتا و ناوەڕۆکی ئەم تاکەی ئێرە وەهایە.

٨٩- در رە: لە ڕێگەی، لە پێناوی،

ان حبیب: ئەو خۆشەویستەدا، کە

نسخ آور: ئەوەی شـتـێکی تر پووچەڵ بکاتـەوە، هەڵی بووەشـێنێـتـەوە، کـە بەدرێژی ئەمـەم لە پێشترا لێک داوەتەوە.

هـەڵوەشـێنەرەوەی ئاینەکـانی پێش خـۆی، کـە (ئیـسـلام)یش لە دوای هـەمـوویانـەوەیە و هـەر (مـحـەمـەد) پێغـەمـبـەر - د.خ - بووە کە دواترین پێغـەمـبـەر و کۆتایی هێن بەپێغـەمـبـەرێتی و پوچکەرەوەی ئاینەکانی پێش خۆی بووە، سـەرەڕای ئەوەی کـە لە وشـەی (حـبیب) مـەبەست لە (حبیب الله)یە کە مەبەست لەو پێغەمبەرەیە.

هـەر لەبەرئەوەیە (کوردی) لێرەدا فەرموویەتی:

خۆشەویستێک کە پووچەڵکەرەوە بێت کەواتە لە پێناوی ئەودا:

تیشە ات: تەشوێیەکەت، تەورەکەت،

بربت و بر اذر زن بماڵە واتە (تەشـوێیـەکـەت بماڵە) بەسـەر (بت) داو بەسـەر ئەوەشـدا کـەبت (پەیکەر، خوای بت پەرستان) دروست دەکات وەک (ئازەر) کە بت دروستکار بووە.

اذر: ناوی ڕاستییەکەی ئەو (ئازەرە بت دروستکەرە)، (تارح) بووەو باوکی حەزرەتی (ئیبراهیم خەلیل)ی پێغەمبەر بووە کە ئەو تارحە (دارتاش)یش بووە.

ئەم تاکە هـەڵبـەستە بەپێی ئەوەندە تاکە هـەڵبەستـەی تائێرەی ئەم حەوت بەندە دەستم کەوتووە ژمـارەکـەی (٨٩)یـەمین و (١٢)یەمـین تاکی ئـەم بەندی چوارەمـەیشـە. شـوێنی ئەم تـاکـە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

لە سـەرچاوەکـانی (ف، صـا، مک، ط، مع، جم، نم/١، سـجـا، حم، ق/٣، ج)دا نییـەو لە (ص)دا

(٣١)یەمین تاک و لە (گل/٦، مـا/١)دا (٣٣)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، گل/٨)دا (٣٤)یەمین و لـە (شـح)دا (٣٥)یـەمـین و لـە (عن، نـع)دا (٣٨)یـەمـین و لـە (ن)دا (٤٠)یـەمـین و لـە (مـس، ه)دا (٤١)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە. و لە هەمووماندا چونیەکە و جیاوازییان نییە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) ڕوو بە هەر ئیسلامێکی پاک و بە (گیان)ی خۆی فەرموویەتی:
لە ڕێگە و پێناوی ئەو خۆشەویستەدا کە پێغەمبەری ئیسلامەو پووچەڵکەرەوەی ئاینەکانی پێش ئاینەکەی خۆی و کۆتاییهێنەر بـە پێغەمـبەرێتیدا هەرچی لە بەجێگەیاندنی دەقە ئاینییەکەیدا بکرێ و هـەوڵی جـێگیـرترکـردنی و سـەرکـەوتنیـدا بکرێ هـەر کـەمـەو کـەواتە (تەشـوێ) یا (تەورداس)، کـە بمـاڵە بەبتـدا ورد و خـاشی بکەو بیـشـیـمـاڵە بـەبت دروسـتکار و بـایەخـدەر بەخوانەناسی وەک (ئازەر)دا.

٩٠- کیمیای سـەعـادەت: زاراوەیەکی صۆفـییـانەیە، مـەبەست لەو بەهرە وەرگرتنە ئاینی و کەوتنە بەر پرتەوی خواییەیە کە لە ڕێگەی پاکژکردنی دەروون (نەفس)ەوە دەیگەیتێ.
کـیمـیـای سـەعـادەت: ناوی پەڕاوییـەکی گرنگ و بـایەخـداری ئاینییـەو لە کـۆڕە صـۆفیگەری و ئاینییەکاندا بەناوبانگ و مایەی کەڵک لێ وەرگرتنە و بۆیە نیشانەی بۆ ئەمیش کردووە.
کـیـمـیـای سـەعـادەت: هەوڵدانی زانایانی زانیـاری کۆنی (کـیـمـیـا)یە بۆ گـەیشـتن بەئەنجـامی دروسـتکردنی زێڕ (تـەلا: ئاڵتـوون) لـە مـادەیەکی وەک: گڵ، زەرد، مس، یا هـەندێ مـاددەی کانزایی یا شتی تر.
ار خـواهـی: ئەگەر دەتەوێت. مـەبەست لەوەیە ئـەی خـەڵکینـە ئەگەر (کـیـمـیـای سـەعـادەت)تان دەوێت لە بەهرەوە بوون لە ڕێبازی ئاینی و سۆفییـانە بۆ گەیشتنە بەر تیشکی پرتـەوی خوایی کە وەک پەڕاویی (کیمیای سەعادەت) لێ سوودمەند بن و توانایی ئەوەتان ببی کە ئاڵتوون لەو مـادانـەی لە پێـشـــەوە ناویانم بـردن دروست بکەن ئەوا هـەرچی زووە ڕووبکە بەر بارەگـای (دەرگای) ئەو ڕەهبەرە خۆشەویستەمان کە پێغەمبەری ئیسلامە وەک (کوردی) فەرموویەتی:
بر درش: بەر دەرگانەکەی، لەبەر دەرگانەکەی ئەو پێشەواترینەدا دەست بکەن بە:
رخ: ڕوو، ڕوخـسـار، – مـەبەست لەوە کـە ڕووی خـۆت لەوبەر دەرگـا پیـرۆزەی کـە (کـەعبـە) و (گۆڕی) پەرتەوینی پێغەمبەری ئیسلامدا هەڵبسوون بۆ ئەوەی کە:
چو سکە بر زر زن ئـەو شـێوەی ڕوو (ڕوخسـار)ەتان وەک قـاڵبی سککە لێـدان بەسـەر خـاک و خـۆڵی ئەو بەردەرگا پیرۆز (بارەگا)یە وەک نەخشی ڕووی سککە نەخش ببـەستی و جێگر ببێ لەسەر ڕووی زەڕ (ئاڵتوون)ەکە کە ئەو خاکی بەر دەرگایەی بە، زەڕ (زێڕ: تەلا) چواندووە.
هـەروەها هـەر خـودی خـاکی بـەر دەرگـایەکـەی خـۆی خـودی زێڕە و شـێـوەی ڕوخسـارەکـەی و نەخشی سککەی پارە بـەسـەر ئـەو خاکە زێڕینـەی بەر دەرگایەکەوە جێگر دەبیت، مـەبەست لە شکۆدار پشاندانی ئەو دەرگا، بارەگایەیە.
چو: هـەروەک

بر: لەسەر، بەسەر

زر: زێڕ، ئاڵتوون، تەڵا

زن: لێ بدە، بماڵە، سککەی لێ بدە، واتە هەر کورنووشێک سککە لێدانێکە، و ئەو ڕوخسار لە خاکی بەر دەرگا سوونەی بە دروستکردنی کارە سەختەکەی زێڕ لە مادە هەرزانەکانی تر و سککە لێدانی، (کردنی زێڕەکە) بەسککە لە زانایانی کۆنی کیمیا هێشتا نەیگەیشتوونەتێ.

هەروەها لەم ڕاگەیانەیش (کوردی) مەبەستی لەوەیش بووە کە ئەوی پەیڕەویی ئەو پێغەمبەرە بکات یا لە بارەگایەکەی نزیک ببێتەوە (حەج بکات)، نەک هەر تەنیا ئەو کەسە خۆی پێ دەگات و بەس، بەشکو تەنانەت ئەو شوێنی دەموچاو لێخشانەش لەو بەر دەرگایەیدا، دەچێتە پێزی پارەی ئاڵتوونییەوە وەک سککەلێدان.

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی ئەم حەوت بەندە (٩٠)یەمین و بەپێی ئەم بەندی چوارەمە (١٣)یەمین تاکە و شوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم چەشنەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (جم، صا، گل/٣، گل/٥، گل/٦)نییەو لە (ف، ق/٣)دا (٢٠)یەمین تاک و لە (ط) (مک) و (حم)دا (٢٣)یەمین و لە (سجا)دا (٢٤)یەمین و لە (با/١، ج، نم/١)دا (٢٥)یەمین و لە (ص)دا (٣٢)یەمین تاک و لە (مـــــا/١، مع)دا (٣٤)یەمین و لە (گل/٨)دا (٣٥)یەمین و لە (شح)دا (٣٦)یەمین تاک و لە (عن، نع)دا (٣٩)یەمین تاک و لە (مس، ھ)دا (٤٢)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

ار، لە گل/٨)دا نووسراوە (گر): ئەمیش دەگونجێ و ڕێنووسی فارسییە.

رخ چو سکە – لە (مک، ج)دا نووسراوە: چو سکە – ئەمەش ناتەواوی لەنگییە.

**واتای گشتی:**

ئەگەرچی لە پاڵ هەر وشەیەکی ئەم تاکە هەڵبەستە واتایەکان و مەبەست لە دەربڕینەکانیانم ڕوون کردوونەتەوە و، واتایەکانیانم دەست بەدەست بەستوون و بەیەکەوە بەڵام ئەم تۆزە واتای گشتییەیشی لەسەر پێشکەش دەکەم:

ئەگەر کیمیای کامەرانی و توانایی لە ماددەی هەرزان (زێڕ) دروستکردن بخوازی و بیکەی بەسککەی ئاڵتوون و... ئەوا لەبەر دەرگانە پیرۆزەکەی (پێغەمبەر) – د.خ دا رووی خۆت هەڵبسوو، تەنانەت نەخشی ڕوخسارت لەسەر ئەو خاکە سککەی زێڕ دەردەچێت و لە بەهرەی ئەو کارەتەوە دەبیتە خاوەنی سککەی تەڵایەک کە خۆت و بەناو خۆتەوە لێت دابێ و ئەمەش مەبەست لە بەهرەمەندتر بوو بە بەنزیک بوونەوە لەو پێغەمبەرە و ئاینەکەی. واتای تری ئەم تاکە هەڵبەستە لە تاکی ئایندەدا چەشنە درێژەیەکی هەیە.

لێرەدا وای بۆ دەچم کە لە یەک تاکە هەڵبەست پتر، دەست من نەکەوتبن لەم (حەوت بەندە).

٩١– ئەم تاکە هەڵبەستە چەشنە درێژە پێدانێکی تاکە هەڵبەستی پێشووە.

لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا (کوردی) هانی (گیان)ی خۆی و هەر ئیسلامێکی داوە بۆ نزیکتر

بوونەوە لە بارەگای پێغەمبەر – د.خ – و ڕێنومایی کردوون، تەنانەت کە گەیشتنە بەر دەرگانەکەی لە چوونە (حەج)دا یا لە پەیوەندیی گیانیدا بەکوڕنووشی ڕێز لێگرتنەوە دانەونەوە و ڕوو لە خاکی بەر دەرگانەکەی بخەن، بۆ ئەو سوودمەندییانەی لەو کارەدا ڕاگەیاندوون و ئەمجا (کوردی) وەک خۆی بە (گیان) لە (هزر)ی خۆیدا گەیشتبێتە بەر ئەو دەرگایەو ڕووی خۆی لە خاکی بەر دەرگانەکەی هەڵسووبێت و ئەمجا ویستبێتی بە (کەڵەشێرە) یا بە (ئەڵقە)ی دەرگانەکە، لەو دەرگەیە بدات و ئا لەو کاتەدا وەک کەوتبێتە باری (جذبە) و (وَجد)ی صۆفییانەی ساغ یا کە خۆی وەک پەرێک لەناو (با: هەوا)دا دیتووە بەدەم ئەو (هەوا) مەستییە لە خۆی یا لەو ئیسلامانەی هانی داون مەستانە (مەستێکی گیانی) هاتووەتە دەنگ و فەرموویەتی:

ئۆ هۆو نەکەی بەدەست لە ئەڵقەی دەرگایەکە بدەیت و..

(دست کوتاه کن ز دق الباب) دەستت بگێڕەرەو لەوە کە بەئەلقەی دەرگانە لە دەرگانەکە بدەیت.

خۆ کوردی ئەوەندە تامەزرۆ بووە کە بگاتە ئەو بارەگا پیرۆزە. یا ئەو خەڵکە هاندراوەی بگەنێ و کەچی ئەوەتا لێرەدا بەئاشکرا فەرموویەتی:

هێی، دەست بگێڕەرە لە بە دەرگادا ماڵین.

بۆچی؟؟

چونکە دوا بەدوای ئەم نیوباڵی (یەکەم)ەو لە نیوباڵی دووەمدا هۆی ئەو فرماندانی دەست گێڕانەوە لە دەرگادانەکەی، بەم جۆرەی دوایی ڕاگەیاندووە کە بەڕاستی (جەزیەگرتن)یکی (حەقیقی)یە کە فەرموویەتی: بەشکو

قامتت حلقە ساز و بر در زن: لە بەژن و باڵای خۆت ئەڵقەیەکی وەک ئەڵقەی ئەو دەرگەیە دروست بکە ئەو ئەڵقەیەی لەشی خۆت بماڵە بەدەرگایەکەدا.

حلقەساز: لەو قامەتەت ئەڵقەسازینە واتە خۆت بهێنەرەوە یەک وەک ئەڵقەیەک و ئەمجا

بر در زن: بە دەر (دەرگاکەدا) بماڵە: (زن) خۆتی پیا بکێشە.

بڕواننە ئەم فرینە گیانی و سۆفیگەرییەی (کوردی) لەم هەڵوێستەیدا (کە من ئەم تاکە هەڵبەستەی بەیەکێ لە (شابەیت)ەکانی حەوت بەندەکەی دەزانم لەڕووی سۆفیگەریی دروستەوە.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە بۆ ئەم (حەوت بەند)ە (٩١)یەمین تاک و بۆ ئەم بەندی چوارەمینە (١٤)یەمین تاک و شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکانیدا ئاوایە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی (صا، مک، ط، جم، ج)دا نییە و لە (ف، ق/٣)دا (٢١)یەمین تاک و لە (حم)دا (٢٤)یەمین و لە (سجا)دا (٢٥)یەمین و لە (با/١ونم (١))دا (٢٦)یەمین و لە (ص)دا (٣٣)یەمین و لە (گل/٣، گل/٥، ما/١، مع)دا (٣٥)یەمین تاک و لە

(گل/٨)دا (٣٦) و له  (شح)دا (٣٧)یەمین و له (عن، نع)دا (٤٠)یەمین و له (ن)دا (٤٢)یەمین و له  (مس، ه)دا (٤٣)یەمین تاکه و له (گل/٦)دا (٣٤)یەمین تاکه.
له هەموو سەرچاوەکانیدا چونیەکه و، وەک لەسەرەوە جێگرم کرد جیاوازییان له نێواندا نییه.
**واتای گشتی:**
کاتێ که (کوردی) به (گیان) دەگاته بارەگای پێغەمبەر وەیا ئەوانەی هانی داون بۆ چوونه (حەج) و خەریک دەبن له دەرگا بدەن وریایان دەکاتەوە که دەست له دەرگه لێدان بگێڕنەوەو له بالاّی خۆیان ئەڵقەیەک بسازێنن و ئەو ئەڵقەیەی لەشی خۆیان بماڵن به دەرگایەکەدا.
هەروەها له تاکی ئایندەشدا لەسەر ئەم چوونه بارەگای پێغەمبەرە دواوە.
٩٢- گر در ان استانه ئەگەر لەو بارەگایەدا،
استانه: بارەگا، بارەگاه.
رەیابی: (دەریابی) شوێن یا جێگەت دەست بکەوێت، ئەو سایه
پشت پایی: پشتی پێیەک واته شەقێک.
ئەو پشتی پێیه مەبەست له (شەق)ە که فەرموویەتی ئەو (شەق)ە هەڵدە له؛
بەقصر قیصر زن له کۆشکی (قەسری)
(قەڕاڵ) یا (چار: پادشا)ی (ڕووس) یا (چین) هەڵبدە: (شەق)ەکەی تێ هەڵبدە؛ چونکه ئەو بارەگایەی پێغەمبەرت دەست کەوتووە که له تاکی پێشوودا (له دەرگایەکەی دابوو). ئیتر چ پێویست بەکۆشکی ئەو (قەیسەر)ەیه که (ماڵ)ێکی (جیهانی)یه و نۆ: (ماڵ: بارەگا)یەکی هەردوو جیهانت دەست کەوتووەو لەو قەسرە هەڵدە.
ئەم تاکه:
ئەم تاکه هەڵبەستە (٩٢)یەمین تاکی ئەم حەوت بەنده و (١٥)یەمین تاکی ئەم بەندی چوارەمەیه و شوێنی ئەم تاکەیش له سەرچاوەکانیا ئاوەهایه:
ئەم تاکه هەڵبەسته له سەرچاوەکانی (صا، حم)دا نییەو له (جم)دا (١٨)یەمین تاک و له (ف، ق/٣)دا (٢٢)یەمین و له (ط، مک)دا (٢٤)یەمین و له (ج، سجا)دا (٢٦)یەمین و له (با/١، نم/١)دا (٢٧)یەمین و له (شح)دا (٢٨)یەمین و له (ص)دا (٣٤)یەمین و له (گل/٦/دا(٣٥)یەمین و له (گل/٣، گل/٥، ما/١، مع)دا (٣٦)یەمین و له (عن، نع)دا (٤١)یەمین تاک و له (ن)دا (٤٣)یەمین و له (مس، ه)دا (٤٤)یەمین تاکەیه و له (گل/٦)دا (٣٥)یەمین تاکه.
جیاوازییەکان:
در آن، له (ج)دا نووسراوە: در آن که ئەمەش لەنگی دەداو برگەیەکی زۆرترە.
پایی له (ج)دا نووسراوە (پای) ئەمیش برگەیەکی کەمترە و لەنگه. پایی: پای له (عن)دا نووسراوە (پایت) به واته پێت و دەگونجێ.
**واتای گشتی:**
ئەگەر لەو بارەگای (پێغەمبەر - د.خ -)دا جێگەیەکت دەست کەوت ئەوا شەق له کۆشکی

(قەیسەر) هەڵدە و لە تاکی ئایندەیش ئەم بیروڕایە درێژەی هەیە.

**هەڵسەنگاندن:**

لە وێژەی کۆندا ئەم یەکخستنی دوو وشەی هاوشێوە لە تاکە هەڵبەستێکدا وەک (قصر) و (قیصر) جیناس ئارایی و جوانکارییە لەلایەن هۆنەرەکەیەوە و مایەی هەڵنانی ئەو هۆنەرە و هەڵبەستەکەیەتی.

٩٣- ور نهندت بەجبهە داغ قبول: ئەگەر (داخ) بنێین بە ناوچەوانتەوە (نیشانەت بکەن وەک بەندەیەکی دیل، ئەوە پەسند و مایەی قوبووڵکردن و ڕازی بوونە و لە ڕێگەی خوا و ئاینەکەیدایە.

بەجبهە: بە ناوچەوان، بە (ئەنی)، گوایە مۆرەکە نرابی بەناوچەوانەوە (داخ کرابێ)

داخ: داخکردن، بەدروشمی سوورەوەکراو داخ و نیشانە کرانی ناوچەوان.

قبول: قوبوول، پەسەند، پێ ڕازی بوون، ڕێگە دراو بۆ مۆرکردن، ئەو مۆرکردنەی کە (کوردی) لەم نیوباڵییە هەڵبەستەیدا فەرموویەتی ئەگەر توانیت و گەیشتیتە ئەو بارەگا پیرۆزەی پێغەمبەر - د.خ - وەیا، واتە بوویتە ئیسلام و لەبەرئەوە مۆری داخ نرایە ناوچاوانتەوە ئەوا دەبێ ئەو مۆرکرانەت بەلاوە (قبول) بێت و چونکە مۆری دیلی و بەندەیی نییە و مۆری کامەرانیی هەردوو جیهانە. و دیسانەوە:

مەبەست لەوەیە کە بە ئیسلامبوون نابێ بە (دزی)یەوە بێ و دەبێ وەک (داغ)ی لێ درابێ، ئاوەها ئاشکرابێ و بەو داغکراوییەش دیسانەوە دەبێ ئەوەندە شانازی بکات و پێوەی بایی بێت تەنانەت کە:

داغ و غم بر دل سکندر زن: داغ و خەم بێ بە دڵی ئەسکەندەرەوە. ئەو سکەندەرە مەزنەی کە جیهان گیریی کردووەو بە هەزاران دیل و کۆیلەی هەبووەو دەسەڵاتی بەڕێوەبەرایەتی و سەرفەرماندەیی گەورەی هەبووە و بە ئەسکەندەری گەورە یا (ئەسکەندەری مەکدۆنی) یا (ئەسکەندەری زەمان) ناسرابوو.

ئەم تاکە هەڵبەستە ژمارەی بۆ ئەم حەوت بەندە (٩٣)یەمین و بۆ ئەم بەندی چوارەمینە تاکی شازدەمینە و شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

لە (جم، شح، ص، صا، ف، گل/٣، مع)دا نییە و لە (ق/٣)دا (٢٣)یەمین تاک و لە (حم، ط، مک)دا (٢٥)یەمین و لە (ج) (٢٧)یەمین و لە (با/١، نم/١)دا (٢٨)یەمین و لە (گل/٦)دا (٣٦)یەمین و لە (گل/٥، ما/١)دا (٣٧)یەمین و لە (گل/٨)دا (٣٨)یەمین تاک و لە (عن، نع)دا (٤٤)یەمین و لە (ن)دا (٤٤)و لە (مس، ه)دا (٤٥)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

نهندت، لە (گل/٥، گل/٦)دا نووسراوە: (ننهندت): کە ئەمەش پێچەوانەی مەبەست و هەڵە و لەنگیشە.

**هەڵسەنگاندن:**

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەدا بەپێی دەستووری وێژەی کۆن جوانکاری و جیناس ئارایی نواندووە لە بەکارهێنانی وشەی (داغ)دا لە هەریەکێ لە نیو باڵییەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەدا کە لە یەکەمیاندا بەمەبەستی (داغکردن) دروشم پێوەنان و نیشانەکردنە و لە دووەمیاندا بەمەبەستی (خەم و خەفەت)ە.

واتای گشتی:

ئەگەر بەرامبەر گەیشتنە بارەگای پێغەمبەری ئیسلام - د.خ - مۆری نیشانەکردنت بنێن بەناوچەوانتەوە هێشتا هەر پەسند و قبوولکراوە و شایانی ئەوەیە ئەوەندە شانازیی پێوە بکرێ تەنانەت وەک داخی پێ بنرێت بدڵی ئەسکەندەری گەورەدا وەهایە و یا ئەو مۆر بەناوچەوانەوە نانە بەرامبەر بوونە ئیسلامیش بێ هەر قبووڵە و سەربەرزییە.

هەروەها تاکی ئایندەیش درێژەدانە بەم بۆچوونەی ناو ئەم تاکەی سەرەوە.

٩٤- سر بەپاگەء (سەر بە پاگەی): سەر (بنێرە) جێگە پێی.

سگان کویش نە: سەگەکانی ئاستانەکەی ئەودا دابنێ:

کە بەتێکرایی نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستە ئەمەی دوایی ئەگرێتەوە، ئەم سووکایەتییە لە هەڵبەستی هۆنەرە ئیسلامییەکاندا سەرت بنێرە شوێن پێی سەگەکانی ئاستانەکەی ئەو پێغەمبەری ئیسلامە و ئا لەو بارەیشدا ئەمجا:

دست رد بر سریر سنجر زەن:

دەست: دەسی

ڕد: بەپاشەوەدان، بەپەسندنەکردن، نەویستن.

بر: بە، بەسەر...

سریر: تەختی لەسەر نووستنی، هەرزاڵە.

سەنجەر زەن: (سەنجەر)دا بماڵە، بدە، پیاماڵە.

بنێ، پیا بنێ بۆ بە پاشەوەدانی بکێشە:

سنجر: نازناوی (ئەحمەد کوڕی مەلیکشاە ناصر ئەلدین) بووە، یەکێ بووە لە (پادشا) هەرە مەزن و بەدەستەڵاتەکانی (سەلجووقی) و لە نێوان ساڵانی (١٠٨٦ - ١١٥٧ز)دا ژیاوە.

هەموو ژیانی پاشایەتییەکەی خۆی بەجەنگ و تیا سەرکەوتنیەوە بەسەر بردووە.

دەستی گرتووە بەسەر هەموو هەرێمەکانی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست)دا و بەئازایەتی و سەرکەوتن ناوبانگی پەیا کردبوو، هەتا چەند ساڵێکی کەم بەر لە مردنی بەو دەسەڵاتەوە ژیاوە، لەوە پاشی کەوتە شکستی و نەهامەتی و، دیلی.

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیشیدا کە نموونەی بە (سنجر) و لە تاکی پێشوویدا نیشانەی بۆ (ئەسکەندەر) و لە تاکە هەڵبەستی پێش ئەویشدا نموونەی بە (قەیسەر) هێناوەتەوە کە ئەم هەرسێ تاکە هەڵبەستە سەرپڕکردنی یەکترین وەک لە کۆتایی لەسەر نووسینی هەر

تاکێکیاندا نیشانەم بۆ ئەمە کردووە.
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا مەبەستی لەوەبووە کە ئەگەر کەسێ شوێنی سەری لە جێگەی قاچی سەگەکانی ئاستانەی پێغەمبەری (ئیسلام) - د.خ - دابێ، هێشتا ئەو ژیانە لە نووستنی سەر ئەو تەختەی کە سەنجەری مەزن لە کاتی دەسەڵاتیدا لەسەری دەنووست چاکترە، بۆیە فەرموویەتی: دەی جا سەر لە شوێن پێتی سەگەکانی ئاستانەی ئەو (واتە پێغەمبەر) دابنێ و ئەوەت ئەوەندە پێ خۆش و سەر: بەرزی بێت کە بەهەموو شانازییەکەوە دەست بماڵی بەتەختی لەسەر نووستنەکەی (سەنجەری سەلجووقی)داو نەتەوێ و ئەو تەختە بەسووکی و ڕیسوایی دابنێ لە چاو جێگەی سەرتدا لە شوێن پێی سەگەکانی بارەگای ئەو ڕابەرە بەڕێزەدا و بەو هەموو توانایی و دەسەڵاتەوە کە (سنجر) بوویەتی:
ئەم تاکە هەڵبەستە (٩٤)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندە و (١٧)یەمین تاکی ئەم بەندی چوارەمەیە و لە سەرچاوەکانیشدا بەم جۆرەیە.
لە (ف، صا، جم)دا نییە و لە (ق/٣)دا (٢٤)یەمین تاک و لە (ط، حم، مک)دا (٢٦)یەمین و لە (با/١، ج، سجا)دا (٢٨)یەمین و لە (شح، نم،/١)دا (٢٩)یەمین و لە (ص)دا (٣٥)یەمین تاک و لە (گل/٣، گل/٦، مع)دا (٣٧)یەمین و لە (گل/٥، گل/٨، ما/١)دا (٣٨)یەمین و لە (عن، نع)دا (٤٣)یەمین و لە (ن)دا (٤٥)یەمین و لە (مس، ه)دا (٤٩)یەمین تاکە.

**هەڵسەنگاندن:**

لە دەستووری وێژەی کۆندا ئەگەر چ وشە یا ناوێکی هاوچەشن لە تاکە هەڵبەستێکدا یەک بخرێن، وەک لەم تاکە هەڵبەستەدا (سەر، پێ، دەست)و، (شوێن پێی سەگ و تەختی لەسەر نوستن) کۆکراونەتەوە بە وەستاکاریی و توانایی هۆنەری دانراون.

**جیاوازییەکان:**

بە پاگە، لە (حم، با/١، شح)دا نووسراوە. (بپای) و سەر نانرێتە سەر پێی سەگ.
سگان: لە (ط)دا نووسراوە (مکان) و دیارە هەڵەیە. لە دەسنووسەرە.

**واتا گشتی:**

ئەگەر بۆت ڕێک بکەوێ سەر لە شوێن قاچی سەگەکانی بارەگای ئەو ڕابەرە دابنێی ئەوەت زۆر بەجێتر لەوە کە لەسەر تەختی نووستنی (سنجر) بنوویت و دەست بەو تەختەوە بنێ و لای بەرە.

٩٥- مست: سەرخۆشی، مەست.
لولاک: وشەیەکی ئەو (حەدیثی قودسی)یەی پێغەمبەرە کە لە زمانی خواوە فەرموویەتی.
«لولاک لولاک لما خلقت الافلاک»
واتە: ئەگەر تۆ نەبوویتایە، ئەگەر تۆ نەبوویتایە و، یا لە بەر تۆ نەبووایە، لەبەر تۆ نەبووایە، (ئاسمان و زەوی)م دروست نە دەکرد.
ئەم حەدیثەش دەبەستنەوە بە ئایەتی ژمارە (٥٦) لە سوورەتی (الذاریات)ی قورئانی پیرۆز کە

خوا فەرموویەتی:

«و ما خَلَقْتُ الجِن وإلانْس إلا ليعبدوني»

واتە: جنۆکە و مرۆڤم دروست نەدەکرد، ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە بمپەرستن و خۆیان بە بەندەگانی من بزانن، پێغەمبەری ئیسلامیش لە پێشەوایانی پەرستنی خوای مەزن بووە و بە «رحمە للعالمین» ناوبردووە و ڕێنومایی بۆ پەرستنی خوا کردووە.

لەبەرئەوەیە (کوردی) فەرموویە (مست لولاک باش) سەر مەستی (لولاک) ببە.

بی پروا: بەبێ پەرواو بێ باک و بێ دەربەستی کە مەبەستی لەو سەرخۆش بوونەیە بەبێ پەروا.

برسر: بەسەری.

کفر: کوفر، خوانەناسی ڕاگەیاندن.

شیر: شمشێر.

اکبر: گەورەترین، مەزنترین.

(ئەکبەر)یش دیسانەوە مەبەست لە پێغەمبەری ئیسلامە (د.خ) کە گەورەترین پێغەمبەر و ئاینەکەیشی گەورەترین ئاینە.

یا: (الله اکبر) کە خوا گەورەترین هەبوونێتییەکە و مەبەست لە شیری خوای گەورەترینە.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (مس، گل/٣، گل/٥، گل٦، ف، ص، صا، مک، ط، مع، حم، نم/١. با/١، سجا، جم، ق/٣، ج)دا نییە و، لە (شح، گل/٨)دا (٣٠)یەمین تاک و لە (ما/١)دا (٣٩)یەمین و لە (عن، نع)دا (٤٤)یەمین و لە (ن)دا (٤٦)یەمین و لە (ھ)دا (٤٧)یەمین تاکە.

بەپێی ئەم حەوت بەندە (٩٥)یەمین و بەپێی ئەم بەندی چوارەمە تاکی (١٨)یەمینە.

ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکانیدا چونیەک و جیاوازییان تیانییە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) بە (گیانی خۆی) یا بە هەر ئیسلامێکی چاکی گوتووە کە بەبێ پەروا مەستی حەدیثی (لولاک)بە کە خوای مەزن پێغەمبەرێکی ئاوا مەزنی داوینێ و مەترسە بیروبڕوای (کفر) واتە خوانەناسی بە دەربڕینەوەی تیا بیدە بەر شمشێری مەزنترین. کە خوا مەزنترینە لە بوونەوەریدا و پێغەمبەر مەزنترینە لە ناو پێغەمبەراندا و ئاینی ئیسلامیش لە ناو ئاینەکانیدا مەزنترین واتە (ئەکبەر) و بەو شمشێرە مەزنە شەڕی کوفراوی بپەڕێنە.

٩٦- ازسر افگن خیال افسر و زر: بیری تاج و زێڕ.

سنگ درگاه دوست بر سر زن: بەردی بەردەرگانەی دەست پێغەمبەر بکە بە سەری خۆتەوە بەجێ تاج و زێڕ یا بەردی ئەو بەردەرگانە بەسەر خۆتدا بدە، لە تۆڵەی ئەو گوناهانەی کردووتن.

ئەم تاکە هەڵبەستە (٩٦)یەمین ئەم حەوت بەندە و (١٩)یەمین ئەم بەندی چوارەمەیە و لە

سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
لە (با/١، جم، حم، سجا، ص، عن، ف، ق،/٣، گل/٣، ما/١، نم/١)دا نییە و لە (ط، مک)دا (٢٧)یەمین تاکە و لە (ج)دا (٢٩)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٣١)یەمین و لە (ص)دا (٣٦)یەمین و لە (گل/٦)دا (٣٧)یەمین تاک و لە (گل/٥، مع)دا (٣٨)یەمین تاک و لە (نع)دا (٤٥)یەمین و لە (مس، ن)دا (٤٦)یەمین و لە (ھ)دا (٤٨)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

دوست، لە (مک، ج)دا نووسراوە: (دست) کە ئەمەش هەڵەیە و دەبێ لە نووسین یا لە چاپکردنیەوە بێ.

**واتای گشتی:**

لە خەیاڵکردنەوە لە تاجی پاشایەتی و زێر و زیو، واز بێنە و بەردی بەر دەرگەی دۆست جێگەیان ئەو دەگرێت و مەگەر لە گوناهداریدا بیماڵی بەسەری خۆتدا.

٩٧- قلم نسخ: قەلەمی پووچ کردنەوە، هەڵوەشاندنەوە.

بەپنج مصحف نە: بە پێنج میصحەفدا

بنیێ (بکێشە، بهێنە)

واتە: خامە (قەڵەم)ی کوژاندنەوەو، پووچکردنەوە بهێنە بە سەر پێنج دانە میصحەف (موصحەف)دا، بەهۆی پەیابوونی قورئانی پیرۆزەوە کە ئەو پێنج پەڕاوییە پیرۆز و ئاسمانییەی سڕییەوە و جێگەی ئەوانی گرتەوە (نەسخ)ی کردن.

پێنج میصحەفەکان بریتین لە:

١- ئەو میصحەفەی کە لە لایەن خواوە بۆ باوکە (ئادەم) هاتووە، ئەویش بریتییە لە (٢١) سیفر، واتە پەڕاوی یا سیپارە. ئەم وشەی (سیفر)ەیش لە وشەی (سیپارە)ی کوردی کۆن و ڕەسەنەوە وەرگیراوە، کە بەواتە (پەڕاویی دانراو: الکتاب المؤلف)ە.

٢- ئەو میصحەفەیە کە بۆ (شیث)ی پێغەمبەر نێردراوە و (٢٩) سیپارەیە.

٣- ئەو میصحەفەیە کە بۆ حەزرەتی (نووح) لە (٣٠) سیپارە دا هاتووە.

٤- ئەو میصحەفەیە کە بۆ حەزرەتی (ئیبراهیم خەلیولڵا) هاتووە لە (١٠) سیپارەدا.

٥- ئەو میصحەفەیە کە بۆ حەزرەتی (مووسا) پێغەمبەر هاتووە لە (١٠) سیپارەدایە و لە ناو (تەورات)دان.

کۆی سیپارە (سیفر)ەکانی ئەو پەڕاوییە پیرۆزانە (١٠٠) دانەن کە بەزۆری بیروڕای زانا ئاینییەکانیان لەسەر یەک دەنگن و دەگەنە پێغەمبەرانی تر کە پەڕاوی پیرۆزیان هەبووە.

(کوردی) درێژەی بەم بابەتەی هێناوە و لە نیوەباڵی دووەمیدا کە: کزلک حک: قەڵەم بڕی بە (کڕاندن) کوژاندنەوەی

نووسین ئەمەش بەرامبەرە بە (قەڵەم پووچ کردنەوە) کەی نیوباڵی پێشوو.

بە چار دفتر زن: بە چوار دەفتەردا بهێنە، واتە بەو (کزلکی حەککردن)ە نووسراوی چوار

دەفتەر بکرێنە و بیسرەوە.
بەلێکدانەوەی من مەبەست لەو (چوار دەفتەر) یا چوار بەرگە لە پێست دروست کراوە: (چوار ئینجیلەکەی حەزرەتی عیسا پێغەمبەر - د.خ - یە کە چوار زانای ئاینی مەسیحی باوەڕپێکراو کە (مەتتا) و (لۆقا) و (یوحەننا) و (مەرقس) بوون و هەریەکەیان ئەوی پێی زانیوە لە ڕاستترین فەرموودە و کردەوەکانی (حەزرەتی عیسا - د.خ - (نووسیویەتی و نووسین هەریەکەیان لە یەک (بەرگ) یا (دەفتەر) دا بووە هی هەر چواریان (ئینجیل) واتە (مژدە)ی پەڕاوی پیرۆزی ئاینی مەسیحی هەرە مەزنترینیان پێک هێناوە کە وەک (کوردی) لە نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا، بە (چار دفتر) ناو بردووە کە هەریەکەشیان (ئینجیل)ێکە.
« لێرەدا مەبەست لە چوار دەفتەر، چوار کتێبە ئاسمانییەکانە:
تەورات بۆ مووسا، زەبوور بۆ داوود، ئینجیل بۆ عیسا و، قورئان بۆ محەمەد - د. خ - یە، ئەم هەڵبەستە بەلای مەلاکانەوە (کوفر)ە بەڵام بەلای (صۆفی)یەکانەوە کە (فنا في اللّه) دەبن، دروستە. ئەم هەڵبەستە نابێ بە گەواه، کە دەربارەی (بەها) وترابێ»
ئەم تاکە هەڵبەستە کە (٩٧)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندە و (٢٠)یەمین تاکی ئەم بەندی چوارەمیە بە پێی سەرچاوەکان و ئەم تاکەیش ژمارەکەی لە هەر سەرچاوەیەکدا بەم چەشنەیە.
لە سەرچاوەکانی (ف، ص، جم) دا نییە و لە (ق/٣)دا (٢٥)یەمین تاک و لە (حم)دا (٢٧)یەمین و لە (ط، مک)دا (٢٨)یەمین و لە (سجا)دا (٢٩)یەمین و لە (با/١، ج، نم/١)دا (٣٠)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٣٢)یەمین و لە (ص، گ/٣)دا (٣٧)یەمین تاک و لە (گل/٦) دا (٣٨)یەمین و لە (گل/٥، مع)دا (٣٩)یەمین وە لە (ما/١)دا (٤٠)یەمین تاک و لە (عن)دا (٤٥)یەمین و لە (نع)دا (٤٦)یەمین و لە (مس، ن)دا (٤٨)یەمین و لە (هـ)دا (٤٩)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

ئەم تاکە هەڵبەستە بەڕای مامۆستا ڕۆژبەیانی:
«ئەبێ موعەمما: پەردەک» بێت چونکە لە ڕاستیدا واتای ئەم تاکە هەڵبەستە ئاگاداری زۆر و سەرچاوەی باوەڕپێکراوی دەوێت و بۆیە لە لایەن نووسەرەکانی ئەم تاکەوە زۆر جیاوازی لە نوسخە (ڕوونووس)ەکانیدا پەیابووە وەک:
قلم، لە (حم، گل/٣)دا نووسراوە: خامەء: واتە کە ئەمیش (فارسییانە)ترە و دەگونجێ و ئەگەر لە زۆرینەی سەرچاوەکاندا وەها بووایە، لەسەرەوە جێگرم دەکرد:
نسخ، لە (حم، با/١، شح، مع، گل/٦، گل/٨)دا نووسراوە (ردّ) ڕەدد، چونکە لە تاکێکی پێشتردا ژمارە (٩٤)دا وشە (ردّ) هاتووە و شاعیرێکی بە توانای وەک (کوردی) ئەم (دووبارەکردنەوانە) ناکات، وشە (نسخ)یش کە لە پەڕاوییە ئاینییە ئیسلامییەکاندا لەم بارەیەوە هاتووە، بۆیە هەر وشەی (نسخ)ەکەم هێشتەوە.
بەپنج، لە (نم/١، با/١، سجا، حم)دا نووسراوە: (ببیخ: بەبێخ) ئەمەش ئەگەرچی دەشێت،

بەڵام لەواتادا کوورەو، وەک (بەپەنج)ەکە واتا فراوانتر و گونجاوتر نییە.
مصحف نە: لە (عن، گل/٣، گل/٨، نم/١، با/١، سجا، ما/١)دا نووسراوە: (مصحف کش) ئەمەش دەگونجێ و بەواتە (بکێشە) یە و جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ (نە)ەکەدا.
کزلک، لە (مک، ج)دا نووسراوە: (کرنگ). کە ئەمەیش واتای قوڵنگ دەدات و هەرگیز وشەی (کرنگ: قوڵنگ) بۆ ئەم شوێنە ناگونجێ؛ چونکە (کزلک) کە قەڵەمبڕی تایبەتە بە (کڕاندن)ی نووسینی هەڵەو، قوڵنگیش ئامێرێکی لە پۆڵای سەخت دروست کراوە و دەسکەکەی لە دارە و، وەک (تەور)ی دار قڵیشاندنەوەیە، کار و (قوڵنگ) بۆ بەردتاشی و کاری (کزلک) کە بۆ ئەم شوێنە بەجێ و پڕ بە پڕە، بەڵام کاری (قوڵنگ: کرنک) بۆ ئەم شوێنە نەبووە و نابێ و هەڵەیە.
واتای گشتی:
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا لە خۆشەویستیی قورئان و (نسخ)کردنی پەڕاوییەکانی تر، دواوە و بەو بۆنەیەوە، فەرموویەتی خامەی (نسخ)کردن بەسەر پەڕاوییە پیرۆزەکانی (ئادەم و شیت و، نووح، ئیبراهیم و مووسا) پێغەمبەراندا بهێنرێ و بە قەڵەمبڕیش چوار ئینجیلەکە بکڕێنرێت) و هەر پەیرەوی قورئانی پیرۆز بکرێت ئەمەیشی بۆ سەرێنیی ژیانی (کوردی) خۆی گوتووە.
٩٨- بانگ حق آشکار فرمودند: بانگی حەقیان بە ئاشکرایی فەرمووە - ئەم نیوباڵییە نیشانەیە بۆیە لە (پەندێکی پێشینیان) کە گوتراوە.
(بانگی حەق بە ئاشکرا خۆشە)، یا (بانگی محەمەد بە ئاشکرا خۆشە).
حەق: ڕاستی و حەقیقەت و زۆرم لە سەر لێکدانەوەی ئەم وشەیە لە پێشتری ئێرەی ئەم پەڕاوییەدا نووسیوە.
لەسەر ئەم نیوباڵیەیەوەیە کە دوابە دوای ئەم فەرموویەتی:
نعرەء جوش و رقص آور زن: کەواتە: نەعرەتەی جۆشهێن و ئارەزووی هەڵپەڕین (رقص)کردن بهرووژێنێ.
نعرە: نەعرەتە، نرکەی بە هێز و نەڕە لە خۆشیدا.
بە واتە دەنگی بەرز، فریاد و هاوارکردنی خۆشی.
جوش: جۆشش، هەڵچوونێکی دەروونیی خۆش و لە هەست بە خۆشیکردنەوەیە و مەبەستی لە بەجۆش هاتنە بەو نەعرەتەیە.
رقص: هەڵپەڕکێ و مەبەستی لە نەعرەتەی خرۆشاندنی دەروونە، بۆ هەڵپەڕین.
آور: هێن، وەک: جۆش هێن.
ئەم تاکە هەڵبەستە وەک پێشەکییەکی تاکە هەڵبەستی دواییە کە ئەویش دوا تاکی ئەم بەندی چوارەمەیە.
ئەم تاکە هەڵبەستە (٩٨)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندە لەم بەندی چوارەمەشدا (٢١)یەمینە و بەپێی سەرچاوەکانیش بەم چەشنەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (با/١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نییە و لە (مع)دا (٣٠)یەمین تاکە و لە (شح، گل/٨)دا (٣٣) یەمین و لە (گل/٣، ص)دا (٣٨)یەمین و لە (گل/٦)دا (٣٩)یەمین و لە (گل/٥)دا (٤٠)یەمین و لە (مـــا/١)دا (٤١)یەمین و لە (عن)دا (٤٦)یەمین تاک و لە (نع)دا (٤٧)یەمین و لە (مس، ن)دا (٤٩)یەمین و لە (ه)دا (٥٠)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

حق: لە (مس)دا نووسراوە (خوش) و ئەگەرچی دەگونجێ بەڵام بەپێی (پەندی پێشینان) نیشانە بۆ کراوە کە وشەی (حق) گونجاوترە و بەڵگەی ئەوەیە کە لە سەرێنی (کوردی)دا ئەو (پەندی پێشینان)دا لە بەکارهێناندا بووە و دیارە بەرتریش هەبووە ئەمە لە ڕووی تەمەنی پەندەکەوە.

**واتای گشتی:**

وەک ڕام گەیاند ئەم تاکە هەڵبەستە وەک پێشەکییەکی تاکی پێشووە وەهایە  کە لەو تاکەدا کۆتاییی بەم بەندی چوارەمە هێناوە.

لێرەدا وەک دەست بکات بەسەرەتای کۆتاییهێنان بەم بەندی چوارەمە بە ئاشکرا و بە نەعرەیەکی بەجۆش و خرۆشەوە بە دەم هەڵپەرینەوە فەرموویەتی: بۆ بانگی حەق هەڵدان گوتراوە کە دەبێ بە ئاشکرا بێت، بۆیە تۆش ئەی (گیانی کوردی) ئەی موسوڵمانێکی پاک تۆش نەعرەتەی خۆشیهێن و هەستی هەڵپەرین بزوێن لێ بدە و لە هەمان کاتیشدا (کوردی) مەبەستی لە نەعرەتەکە ئەم دوو تاکەی دواییە کە بەر لە ڕاگەیاندنی دوو تاکە دووبارەکردنەکەی دوای هەر بەندێک دەگوترێنەوە و یەکەمیان بە (فارسی)و (دووەمین) یان بە (عارەبی)یە کە لە کۆتاییی تاکی ئایندەوە پێشکەشیان دەکەمەوە.

٩٩- جرعەای برکش: قومێک لەو بادەیەی (لولاک لولاک) هەڵدە (بخورەوە) کە لە تاکی هەڵبەستی (٩٥)دا ڕای گەیاندووە

ئەو قومە بادە خواردنەوەیەت، لەو ئاهەنگەدا بی، کە لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا ڕای گەیاندووە.

بدین: ئا لەم مەبەستی (لە ئاهەنگەکەدا)یە.

آهنگ: لەم ئاهەنگەدا کە لە تاکی پێشووەوە بە هاتنە جۆش و هەڵپەڕکێ دەستی پێ کردبوو، ئەویش ئاهەنگی ڕاگەیاندنی دوو تاکە (دوو پاتەکرانەوەکەی کۆتاییی هەر بەندێکە).

ئاهەنگ وەک مەبەست لە جۆرە شایی و زەماوەندێکە لە هەمان کاتدا واتای (مەقام) و (گۆرانی)ش دەدا کە لەو جۆش و خۆشیی هەڵپەرکێیەدا گۆرانیبێژی دەنگ خۆش (بیانچڕێ).

ئەمجا (کوردی) بەم نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە کۆتایی بەم بەندی چوارەمە دەهێنێ و فەرموویەتی:

شور و غوغا بر اهل محشر زن:

شور: هەرا و زەنایەک لە ناخی هەست بەخۆشی کردنەوە سەری هەڵدابێ.
غوغا: ژاوە، دەنگە دەنگ، زایەڵە لە کۆبوونەوەیەکی جۆش و خرۆشی خۆشیدا نەک (غوغا)ی بە واتە هات و هاواری ناخۆش.
(کوردی) مەبەستی لەو بەرپاکردنی (شۆر) و (غەوغایە) لە کۆتاییی ئەم نیوباڵی دووەمەدا وشەی (زن) بە واتە (لێ بدە، هەڵبدە، بانگ بدە، بەرپا بکە) ڕایگەیاندووە بەڵام بۆ:
اهل محشر: مەبەست لە خەڵکانی ڕۆژی ڕەستاخێزی کۆتاییی ژیان و جیهان واتە (قیامەت) لە دەشتی مەحشەردا، بە واتایەکی تر مەبەستی کوردی لەو (ئەهلی مەحشەر)ە هەموو مردووە ئیسلامەکانە کە مژدەی پێ داون بەو خۆشیی ئاهەنگی شۆرو غەوغا پڕ جۆش و خرۆشە واتە بەر شەفاعەتی پێغەمبەر کەوتنە ئەو مژدەیەش لە فەلسەفەیەکی ئاینییەوە سەری هەڵداوە.
لە ئاینی ئیسلامدا بڕوا وەهایە کە خوا دەسەڵاتی شەفاعەتکردن (پاڕانەوە بۆ لێخۆشبوونی گوناهبارە ئیسلامەکانی) داوە بە پێغەمبەری ئیسلام کە لە ڕۆژی (قیامەت)دا بۆیان لە خوا دەپاڕێتەوە خوای مەزنیش مژدەی (قبوول)کردنی ئەو پاڕانەوەیە (شفاعت)ەی بەو پێغەمبەرەی داوە کە واتە ئیسلامەکان بەئاوات دڵخۆشی ئەو لێبوردنەوەیەن.
(کوردی) بەپشت بەستن و هیوا بەهێزییەوە بەم مژدەی شەفاعەتەی (پێغەمبەری ئیسلام) یا دڵخۆشی بەم فەلسەفە ئیسلامییەوە ئەو (شۆرو غەوغا)یە بەسەر مەستیی فەرموودەی (لولاک لولاک) کەوە کە لە تاکە هەڵبەستی (٩٥)دا لێی دواوم بە (نەعرەتە)وە مژدەیەک بە هەموو ئەهلی مەحشەر دەدات و هیوایان پتەو دەکات کە ئەی ئیسلامەکانی ئەهلی مەحشەر ترس لە سزادانتان لە دڵ دەرکەن؛ چونکە ئێمە پێغەمبەرێکمان هەیە (شەفاعەت)دان دەکات و خوای گەورەش بەپێی ئەو (شەفاعەت)ە لە گوناهانمان خۆش دەبێت.
ئەمە پوختەیەکی مەبەستی (کوردی)بوو لەو دەنگ لە (ئەهلی مەحشەر) کردنە کە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای مەزن یەک یەک لە چاکەی هەر کەسێکدا فرمانی چوونە بەهەشت دەدات و بەرامبەر بە خراپەیان فرمانی سزادانیان دەدات بە ئاگری دۆزەخ بەڵام (کوردی) لەگەڵ باوەڕکردنی بەم ڕاستییەشدا بەهۆی ورەی بەرزیەوە بەتوانای (شەفاعەت) کردنەکەی ئیسلام، مژدە بە ئیسلامە گوناهبارەکانی ئەو ئەهلی (مەحشەر)وە دەدات کە جێگەیان بەهەشتە؛ چونکە بەلای هەریەکەیەوە خۆیان بە یەکێ لە ئیسلامەکانی ئاینی ئەو پێغەمبەرەیان داناوە.
ئەم تاکە هەڵبەستە کە دوا تاکی ئەم بەندی چوارەمە و (٢٢)یەمین تاکی ئەم (بەند)ەیشەو لەم حەوت بەندەیشە (٩٥)یەمین تاکە و دوای ئەم (دووتاک) دووپاتکردنەوەکە دێت.
بەڵام بە پێی شوێنی تاکەکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە لە سەرچاوەی (ص، جم)دا نییە و لە (ف)دا (٢٣)یەمین تاک و لە (ق/٣)دا (٢٦)یەمین تاک و لە (حم)دا (٢٨)یەمین و لە (ط)و (مک)دا (٢٩)یەمین و لە (سـجـا)دا (٣٠)یەمین و لە (با/١، ج، مع، نم/١)دا (٣١)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٤١)یەمین و لە (ما/١)دا (٤٢)یەمین

و له (گل/٦)دا (٤٠)یەمین و له (گل/٥)دا (٤١)یەمین و له (مـا/١)دا (٤٢)یەمین و له (عن)دا (٤٧)یەمین و له (نع)دا (٤٨)یەمین و (مس، ن)دا (٥٠)یەمین و له (ھ)دا (٥١)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە.

**جیاوازییەکان:**

برکش و، له (ط)دا نووسراوه (سرکش و): بخۆرەوە، ئەمیش دەگونجێ و یەک واتا دەدەن.

جرعەای برکش، له (عن)دا نووسراوه: جرعەرا برکش و: قومە بادەکە بخۆرەوە و، ئەمیش دەگونجێ.

برکش و له (گل/٣، گل/٥، گل/٦، ف)دا نووسراوه (درکش و): دەرکەش – ئەمیش له واتادا، زۆر پڕبەپڕ نییە و ئەگەرچی واتا دەدات، بەڵام زۆرتر بەلای (دەربهێنە)دایە نەک (فڕی کە).

بدین له (عن، گل/٣، گل/٥، گل/٦، نم/١، با/١، سجـا، حم، ق/٣)دا نووسراوه، (باین) ئەمیش واتا دەدات بەڵام ئەوەندەی (بدین)ەکە تەواو نییە.

بدین له (ج)دا نووسراوه: (درین) و ئەمیش ئەگەرچی وەک (بدین)ەکە (تەواو) نییە کە زۆربەی سەرچاوەکان (بدین)یان تیا نووسراوه، بەڵام هەر واتا دەدات.

**واتای گشتی:**

(کوردی) له ڕێگەی ئامادەکاری، هەڵدانی (بانگە ئاشکرا)یەکەیدا کە دەربڕینی جووتە تاکە هەڵبەستە (فارسی و عەرەبی) بە باڵا و بە باونگەکەیەتی کە دوای هەر بەندێکەوە دووپاتەی کردوونەتەوە فەرموویەتی:

قومێک له بادەی (گیانی – و – مەعنەوی) بخۆرەوە و لەم ئاهەنگی خۆشییەدا بە دەم نەعرەتەوە هەراو زەنا و ئاواز و مژدەی خۆش بەمردووانی (ئەهلی مەحشەر) بگەیەنە کە گوناهکارەکانیان مەترسییان له سزای سووتانی ناو ئاگری دۆزەخ نەبێت؛ چونکە ئێمەی ئیسلام شەفاعەتی پێغەمبەرەکەمان مژدە پێ دراوه...

من ئەم بڕوایە ئاوا بەڕاشکاوی و بەبێ (پاڵاوتە تیاکردن) مەترسیدارە.

و له پاش ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە دوو تاکە (دووپاتەکردنەوە)کەی ڕاگەیاندووە کە:

کـای دمت نغـمـةء سـرافـیلي

مـورد واردات جـبـریلي

أنتَ شـمسَ الُهـدى ونورَ الحَق

أظهِـرِ الحقَّ يا ظُهـورَ الحقْ

## بەندی پێنجەم

١٠٠- وقت قـــرب وصــــال مـی بینـم
عــشق را در کــمــال مـی بینم
١٠١- بـا ندیمـان خــــســـرو اندر راز
شنگ و سـیـمـا غـزال می بینم
١٠٢- با وصـیـفـات بەخلوت شـیـرین
کــــوهـکن بـا جـــلال مـی بینم
١٠٣- با سرانی کە سـالک عشق اند
خـلـوتـی بـا دلال مـــی بـیـنـم
١٠٤- رازداران خـــــــاص آن خـلـوت
همـە (عیسی خـصـال) می بینم
١٠٥- همـە از عـشق آن شــە (لولاک)
عـــاقـــبت یک مـــآل می بینم
١٠٦- همـــە دربای کـوی او هـســتند
آنچــە فــرخندە حــال مـی بینم
١٠٧- آنچــە در کـارگـاە نقش صــور
ذرەای زان جـــمــــال مـی بینم
١٠٨- آنچە آوردو، کرد و، گفت و، بود
همـــە ســحــر حــلال مـی بینم
١٠٩- آنچــە در کـائنات کـردە ظهـور
مـظـهــــــر لایـزال مـی بـیـنـم
١١٠- پرتو مـــهـــر طـلـعت جـــانـان
بـی کـــســـوف و زوال مـی بینم
١١١- زاهدا! کـشک شـاە بینی و من
عـــرش آن مـــتـــعـــال می بینم

١١٢- مــجلس و خلوتگاه همــســـايه
كــوی آن قـــد نهـــال می بینم
١١٣- صـــف ارواح را در آن مــنــزل
جـــا بەصف النعـــال می بینم
١١٤- پاسخ و حـرف اهل آن مـجلس
همـــه رمــز و مـــثـــال مـی بینم.
١١٥- درس و بحث و بيـــان آن مكتب
عـاری از قــيل و قـــال می بینم
١١٦- حلّ اشكال و رمــز آن اســتـــاد
بیّ جـــواب و ســـوآل می بینم
١١٧- طوطی نطق را در آن مــحـضــر
پــشـت ئـايـنـه لال مــی بـيـنـم
١١٨- طـائر وهم را در آن مـــــجلس
خــســتـــه، بی پر و بال می بینم
١١٩- بخـــتی عـــقل را در آن هـامـــون
بردو زانو عــــقـــــال می بینم
١٢٠- تشنه را زير پای خـــضــر نبی
چشـــمــــهء بس زلال می بینم
١٢١- در ركـــاب مــحـــمـــدی خـــود را
هـندوئـيـی چون بلال مـی بـيـنـم
١٢٢- قطع آن راه جـــز بـه لطف دليل
رهروانرا مـــحـــــال می بینم
١٢٣- قـــدســـيـــان برفـــراز عليين
ذكـرشـــان اين مـقــال می بینم

.................................................................

١٠٠- وقت قرب وصال می بینم: كاتی نزيكبوونەوەی بەيەككەيشتن دەبينم.

قرب: نزیکیی، نزیکبوونەوە.
وصـال: بەیەکگەیشتن، ژوان، ئەو بەیەکگەیشتنەی کـە (کـوردی) لـە دوا تاکـاکـەنی بـەندی چوارەمیدا دەنگی لێ دابوو کە مەبەستی لە بەیەکگەیشتنی بەبارەگای پێغەمبەرە و دیارە وەهای ڕەچاو کردووە کە بە نیازەوە بووە بچێتە (حەج) و، یا کە لە لەبیر و بڕوای ئاینی ئیسلامدا یادکردنەوەی مردن و کاتی مردن بەنەریتێکی پەسندی داناوە و لەم ڕووەوە دەشێ کە (کوردی) لە کاتی دانانی ئەم بەندی پێنجەمەیدا بیری لە مردن کردبێتەوە و لە تەمەنێکی پیریدا بووبێ و ئەو بیر لە مردن کردنەوەش و مردنەیشی بەلاوە گەیشتن بە کۆڕ و کۆمەڵگای ئیسلام دانابێ کەوا مژدەی شەفاعەتی پێغەمبەریان دراوەتێ لە ڕۆژی قیامەتدا کە کۆتاییی بە بەندی پێشوو پێ هێناوە، و ئەو بەر شەفاعەت کەوتنەی بە گەیشتن بەو ڕەهبەرە خۆشەویستەی خۆی داناوە کە پێغەمەری ئیسلامی مەبەست بووە.
می بینم: دەبینم، ڕەچاو دەکەم، وام دێتە بەرچاو.
لە مەوە (کوردی) چووەتە سەر نیو باڵی دوومی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی و فەرموویەتی:
عشق را در کمال می بینم: عەشق لە پایەی (کەماڵ)دا دەبینم.
کمال: تەواوی، پڕ بەپری، ئەوپەڕی ڕادەی هەر شتێک، ئەم وشەیە (صۆفییەکان) وەک زاراوەیەکی تایبەت بە ڕێبازەکەی خۆیان بەکاریان هێناوە بەلایانەوە بریتییە لەوەی کە بۆنی شتێکی لێ دەکرێت و سروشتی ئەو شتەی پێ دێتە دی و، بەرامبەر بە بوونێتی (وجوود)ە کە کە کردگاری خوای مەزنە و جگە لەو بەکەسی تر (کەمال) پێک نایەت، ئەمەش ئەوپەڕی پێ داگرتنیانە بەبوونی کردگارێتی خوای مەزنەوە. لێرەدا عەشق (ئەڤینە پاک) لە خۆ بووردنەکەی خۆیان بەرامبەر بەخواوە گەیشتن بە پەڕتەوی خوایی و ڕابەرە هەرە خۆشەویستەکەی کە پێغەمبەری ئیسلامە کە ئای مەبەست لەو بە پێغەمبەر گەیشتنە ئای (حەج) کردن، ئای (مردن) بووە.
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا وەک چۆن میوەیەک بەتەواوی و بە چاکی لە ڕادەی باشی خۆیدا دەگات، ئاوەهاش خۆی و تەمەنی خۆی و نیازی (چوونە حەج) لەو پیریەییدا کەوا دیارە (نەگەیشتووە ئەو حەجە بکات و بەسەریدا مردووە وەیا (کوردی) ئەو عەشقە حەقیقییە خواناس و خواپەرستییە کە بوویەتی بەوپەڕی تەواوییەوە ڕەچاوی کردووە و کەوتووەتە هەرە کامەرانیی گیانییەوە کە لە تاکەکانی دوایی ئەم بەندی پێنجەمەیدا ئەم ڕاستییە دەردەکەوێت.
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم (حەوت بەند)داو بەپێی ئەوەندە سەرچاوەیەی کە دەستم کەوتوون دەبێتە تاکی (١٠٠) هەم لەم بەندی پێنجەمەدا یەکەمین تاکە.
بەڵام لەسەرچاوەکانی ئەم تاکەدا شوێنی (ژمارەی) ئەم تاکە بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەی (جم) دا نییە و نەک هەرئەوەندە بەشکو سەرپاکی ئەم بەندی (پێنجەم)م لەم سەرچاوەیەدا نەدی، وای بۆ دەچم کە هەموو ئەو لاپەڕانەی ئەم بەندەی تیا نووسرابن، لەبەر جزوبەند پچراوی پەڕی بن و نەکەوتبنەوە شوێنی خۆیان لەوانەیشە

لەگەڵ کەشکۆلی تردا، یا هەروا بەجیاوازی لە پەراویخانەی کەسێکەوە سەر هەڵبدات.
ئەم تاکە لە (ص)دا (٢٢)یەمین تاکە و لە (ف)دا (٢٤)یەمین لە (ق/٣)دا (٢٧)یەمین و لە (حم)دا (٢٩)یەمین و لە (ط، مک)دا (٣٠)یەمین و لە (سجا)دا (٣١)یەمین تاک و لە (با/ ١، ج، مع، نم/١)دا (٣٢)یەمین وە لە (شح، گل/٨)دا (٣٥)یەمین تاکە و لە (ص، گل/٣)دا (٤٠)یەمین تاک و لە (گل/٦)دا (٤١)یەمین و لە (گل/ە)دا (٤٢)یەمین تاک و لە (ما/١)دا (٤٣)یەمین و لە (عن)دا (٤٨)یەمین و لە (نع)دا (٤٩)یەمین تاک و لە (س، ن)دا (٥١)یەمین و لە (ه)دا (٥٢)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندیەوە.
واتای گشتی:
کاتی نزیکیی ویصال کە بە (حەج) یا بە (مردن) دەبینم، چونکە (ئەڤینی حەقیقی)م گەیوەتە ئەوپەڕی تەواوی و ڕێکوپێکی.
١٠١- باندیمان خسرو اندر راز: لەگەڵ هاودەمەکانی خوسرەو لە ڕاز و نیاز و خۆش ڕابواردنی جیهانیدا دەبینم.
با: لەگەڵ
ندیمان: یاوەرەکان، هاودەمەکان، هاواڵی خۆش ڕابوێرەکان:
خسرەو دا کە لە گوفتوگۆی ژیانی خۆشی جیهانیدا کە لەگەڵ خسرەودا بەسەری دەبەن.
خسرو: خوسرەو کوڕی هورمزی چوارەم، (٣٢)ەمین پاشای ساسانی بوو.
اندر راز: لە گوفتگۆی نهێنی و ڕازونیاز لە بادەنۆشی و ژنبازیدا.
(کوردی) نیو باڵی دووەمەکەی بەوەندە کۆتایی هێناوە لەمەڕ یاوەرانی (خسرو) ڕاز و نیازەکانی لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەیدا ئاوڕی لەو ئافرەتانە داوەتەوە کە (خسرو) و (یاوەر)ەکانی لەگەڵیاندا ڕایانبواردووە و فەرموویە ئەوانە:
شنگ و سیما غزال می بینم (شەنگ و سیما غەزال می بینەم) = لە نێو ئەوانەدا.
شنگ و سیما غزال می بینم: واتە ئەو (شەنگ و سیما غەزال)انە لەگەڵ یاوەرەکانی (خوسرەودا لە ڕازونیاز و ناز و نووزو نازکێشیدا دەبینم لەم لێکدانەوە فرەپەلوپۆیەمدا لە بارەی (خوسرەو) و ڕەوشتەوە مەبەستم ئەوەیە کە (کوردی) ئەمانەی مەبەست بوون کە وەک پێشەکییەک لە نموونەی خراپی و خراپەکاری و خوانەناسی و پەیڕەوی نەکردنی فەرمایشتەکانی خوای مەزندا لە پێناوی خۆپەرستی و گەوزاندا لە ژیانی داوێن پیسیدا و (کوردی) ئەوەندە دڵگران بووە لە (خوسرەو) و هەڵوێستەکانی تاکی ئایندەیش هەر لەسەر (خوسرە) ڕاگەیاندووە کە دوای ئەوە دەچێتە سەر نموونەی چاک چاکەکاران هێنانەوە، کە لە تاکی ئایندەشدا لێکدانەوەکەم دەبەستم بەم لێکدانەوەیەوە لەسەر ئەم تاکەی سەرەوە بەپێی بۆچوون و تێگەیشتنم لەم دووتاکە هەڵبەستە.
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی سەرچاوەکانم لەلای من گەیوەتە (١٠١)یەمین تاکە هەڵبەستێک کە توانیم لە (٢٤) سەرچاوەوە بە دەستی بهێنم و هەر ئەم تاکە مەبەستیش لەم (بەندی

چوارەم)ەدا دووەمین تاکێتی.
بەڵام شوێنی ئەم تاکە لەم (٢٤) سەرچاوەیەمدا لەسەر ئەم تاکە هەڵبەستە بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی: (با/١، جم، حم، سجا، صا، عن، ف، ق/٣، نم/١) نییە و لە (ط، مک)دا (٣١)یەمین تاک و لە (ج)دا (٣٢)یەمین و لە (مع)دا (٣٣)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٣٦)یەمین و لە (ص)دا (٣٩)یەمین و لە (گل/٣)دا (٤١)یەمین تاک و لە (گل/٦)دا (٤٢)یەمین و لە (گل/٥)دا (٤٣)یەمین و لە (ما/١)دا (٤٤)یەمین و لە (٤٤)یەمین و لە (نع)دا (٥٠)یەمین و لە (مس، ن)دا (٥٢)یەمین و لە (هـ)دا (٥٣)یەمین تاکی ئەم بەندی حەوتەمە ئەم تاکە (٢)یەمین تاکی ئەم (حەوت بەند)یە و دەتوانرێ بزانرێ. لە هەر سەرچاوەیەکدا چەندەمین تاکە لەم بەندەدا

**جیاوازییەکان:**

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (نک، شح، مع، ج)دا بەم جۆرەیە:
«خسروی باجمال می بینم»
هەروەها لە (ن، ص، ط)دا لە جێگەی (جمال)ەکە نووسراوە (جلال) کە ئەمەیان نیو باڵی دووەمی تاکی ئایندەیە و بە هەڵەی لەبەر نووسینەوە ئاوێتەی ئێرە بووە و، ئەم هەردوو جیاوازی بەسەرەوە بۆ ئێرە. ناگونجێ و هەڵە و شێواوییەو بە شێوەی (کوهکن باجلال می بینم)یش هاتووە.
لەم بەندی پێنجەمەیشدا وەکو بەندی سێیەمی ئەم حەوت بەندە ئاڵوگۆڕ و پاش و پێش و ئەوەندەی توانام و بەهۆی سەرچاوەکانەوە توانیم شێواوییەکان دەستنیشان و چارەی گونجاو بکەم.
لەم کارەشدا دەسەڵاتم هەر ئەمەندە بووە و ڕێگەم لە بۆچوون و ڕاستکردنەوەو لێکدانەوەی دروستتر نەگرتووە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) کە ڕازی ئەم بەندی پێنجەمەی لە تاکی یەکەمیدا بەوەدا داوە کە لە سەروبەندی (حەج) کردن یا (کۆچی دوایی) کردندا بووە بەوەی کە پیر و پەرپووت و پەککەوتوو و، نەخۆش بووە لەم بەندەدا دەستی داوەتە هێنانەوەی نموونەی خراپی (خراپ و خراپکارێکی) وەک (خوسرەوی پەروێز)ی پادشای ساسانی کە کابرایەکی هەڵەشە و بەدئەمەک و ( چاکە لەبەرچاو نەبوو) بووە لەگەڵ هاواڵ و یاوەرە بەدکارەکانیدا. لە ڕابواردنی جیهانی و بادەنۆش و داوێن پیسیدا بووە کە لە لێکدانەوەی ئەم تاکی یەکەمەدا هەندێکیم بەشیکردنەوەی هەڵویست و ڕەوشتییەوەوەیە (خوسرەوی پەروێز)م پێشکەش کردووە و لە تاکی ئایندەشدا کە هەر لە بارەی ئەم (خوسرەو)ەوەیە ئیتر نۆرەی ئەوەیە کە سەر پڕی ئەم ناوەڕۆکە ڕابگەیەنم.
١٠٢- وەک لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا نووسیومە، کە ئەم تاکە هەڵبەستەی (ئێرە - سەرەوە) درێژەدانە بەو تاکە هەڵبەستەی پێشوو، بەڵام لەودا یەکسەر لە خودی (خوسرەوی پەروێز) و

(یاوەر و هاوالّەکانی) دواوە و، لێرەدا (کوردی) لە (شیرین) و (کارەکەر و کەنیزەک)ەکانی و لەگەڵ (فەرهادی کوهکەن و زانا و بە توانا و هونەرمەند دواوە، کە ئەم لێداونەیشی دیسان (بەدڕەوشتی)ی ئەو (خوسرەو)ە ڕادەگەیەنێ.

باوصیفات بەخلوت شیرین: (شیرین) و کەنیزەک و کارەکەرەکانی (وصیفات)دا لە کۆبوونەوەیەک گۆفتوگۆ نهێنییەکانی (شیرین) لەگەڵ (فەرهاد)دا ئالەو کاتەدا فەرهاد بەشان و شکۆ و ڕێزمەند و سەربەرزییەوە دەبینم:

وصیفات: ئەو کارەکەر یا (کەنیز)انەی کە لە کارەکەران و (کەنیز)انی تر لە پێشتر و گەورەترن لە ڕێزدا لەلای خاوەنەکانیان؛ چونکە ئەو (کەنیز) و کارەکەرانە بە زۆری بە پارە کڕدراوان و ئەمجا ئەوانەیان کە هێژا و زیرەک و لێزان بوون توانیویانە ئەوەندە بچنە دڵ و دەروونی پیاوە کڕیارەکانیانەوە وەک ژنی (شەرعی)ی خۆیان مارەیان کردوون. لە هەر کۆمەڵگایەکدا بەپێی یاسای ئایینی خۆیان (مارەکراون)و ئەوانی تریان هەروەک کارەکەر و (کەنیز) لە ماڵە ئاغایاندا ماونەتەوە، کاری ژن و میردایەتیشیان لەگەڵدا کراوە، بەڵام وەک ژنی (بە شەرعی مارەکراو، نا).

لە ماڵە گەورە و پاشایانیشدا ژنەکانیان (کەنیز) و (کەنیزەک)یان هەبووە کاروباری ئاغا ژنەکانیان بەجێ گەیاندووە، شوێن نهێنی و باوەر پێکراو و ئاگەداری کاروباری تایبەتی و نهێنیی ئەو ئاغا ژنانەیان بوون وەک (شیرین) کە لە سەرەتادا (کەنیزەک)ێکی کۆشکی (خوسرەوی پەروێز) بووە، بەڵام ئەوەندە جوان و هێژا بووە کە خوسرەو بە یەکێک لە ژنەکانی خۆی داناوە ئەگەرچی (شیرین)یش دڵی لای (خوسرەو) نەبووە و شەیدای (فەرهاد) بووە.

(کوردی) وەک لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا لە (خوسرەو) لەگەڵ یاوەرەکانی و ژنە جوانەکانی کە (خوسرەو) و یاوەرەکانی لەگەڵیاندا ڕایانبواردووە، باس کردووە بە هۆی ئەوەوە کە (شیرین) دڵی لەگەڵ (خوسرەو)دا نەبووە و شەیدایی (فەرهاد) بووە لەم تاکەدا لەم کۆبوونەوەی (شیرین) دواوە لەگەڵ (فەرهاد)دا بە ئامادەبوونی کەنیزەک و کەنیزان و کارەکەر و (نزیکەکانی خۆی)

بە خلوت: شیرین کەنیز و کەنیزەکەکانی کە لەگەڵ (فەرهاد)دا کۆبوونەوەی نهێنییان هەبووە کە لە شوێنی تری پێشەوەی ئەم پەراوییەدا بە درێژیتر لە (خەڵوەت) دواوم. واتە (خەڵوەت) بە نهێنی و بە دوو بەدووریی یەک گرتنی (شیرین) و (فەرهاد)ی مەبەستە.

لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەدا باسەکەی ئاشکراتر کردووە کە ئەو (خەڵوەت)ی شیرینی لەگەڵ (فەرهاد)دا بەڕاشکاوی ڕاگەیاندووە بەڕادەیەک (فەرهاد)ی بە پڕ شان و شکۆ و کامەرانی ڕەچاو کردووە کە فەرموویەتی:

کوهکن با جلال می بینم:

واتە ئا لەو (خەڵوەتییەی شیرین) و بە ئامادەبوونی (کەنیزە) کە باوەڕ پێکراوەکانی لەگەڵ (فەرهاد)دا ڕای بواردووە و لێرەدا لە جێگە ناوی (فەرهاد) ناوی کوهکن هاتووە.

جلال: شکۆمەندی و ڕێز و کامەرانی و لەوپەڕی خۆشیدا کەوا لە سەردانەکانی (شیرین)دا بۆ لای (فەرهاد) کەوتووەتە خۆشی و (نازو نیاز هاتنە دی)یەدا.
(کوردی) لێرەدا و بەم دوو تاکە نموونەی خراپی لەسەر (خوسرەو) هێناوەتەوە و کۆتایی بەم نموونەیەی هێناوە کە لە تاکە هەڵبەستەکانی ئایندەدا چووتە سەر جۆرەها نموونەی چاکە هێنانەوەی دژی نموونەکەی (خوسرەو).
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (١٠٢)یەمین و لەم بەندی پێنجەمەدا چوارەمین تاکە و شوێنی ئەم تاکەیش بەپێی سەرچاوەکانی بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە لە سەرچاوکانی (مک، ط، حم)دا نییە.هەروەها ئەم تاکە هەڵبەستە لە (صا)دا (٢٢)یەمین تاک و لە (ف)دا (٢٥) مین و لە (ق/٣)دا (٢٨)یەمین تاک و لە (حم)دا (٣٠)یەمین تاک و لە (سجا)دا (٣٢)یەمین و لە (با/١، ج، نم/١)دا (٣٣)یەمین و لە (مع)دا (٣٤)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٣٧)یەمین تاک و لە (ص)دا (٤٠)یەمین و لە (گل/٣)دا (٤٢)یەمین و لە (گل/٦)دا (٤٣)یەمین و لە (گل/٥)دا (٤٤)یەمین و لە (ما/١)دا (٤٥)یەمین و لە (عما)دا (٤٩)یەمین و لە (نع)دا (٥١)یەمین و لە (مس، ن)دا (٥٣)یەمین و لە (ھ)دا (٥٤)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

ئەم بەندی پێنجەمە و بەتایبەتی ئەم تاکە زۆریان گۆڕان و پاش و پێش و ئاڵوگۆڕ و شێواوی بەسەردا هاتووە.
وەک لە کۆتایی تاکە هەڵبەستی پێشوودا ڕام گەیاند نیو باڵی دووەمی ئەوی بە شێوەی، خسرو با جمال می بینم
کە لە هەندێ لە سەرچاوەکانی ئەم تاکەی ئێرەشدا بە شێوەی:
(کوهکن با جلال می بینم) هاتووە.
بەڵام بە پشتیوانی (٢٤) سەرچاوەکەی ئەم حەوت بەندە و بە تایبەتی ئەم تاکەی ئێرە بەپێی شارەزاییم لە داستانی (شیرین و خوسرەو) و (شیرین و فەرهاد) توانیم ئەم تاکە هەڵبەستە بە شێوەی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە جێگیر بکەم و ئەوەندەی پێم کراوە وابزانم ئەم دوو تاکەم لە دەقی گوتنەکەی (کوردی)یەوە نزیک کردوونەتەوە.
با وصیفات، لە (عن، گل/ ٣، گل/٨، ف، ق/٣، ج)دا نووسراوە: (باندیمان).

**واتای گشتی:**

لە (خەڵوەت)ی (شیرین)دا بە ئامادەبوونی کەنیزە ئاشنا بەنهێنییەکانی (شیرین)، لەو خەڵوەتەدا کۆهکەن کە (فەرهاد) بووە لەگەڵ (شیرین)دا فەرهاد لە شان و شکۆدا دەبینم.

١٠٣- (کوردی) دوای ڕاگەیاندنی نموونەی خراپی و ڕابواردنی (شەهوانی)ی جیهانیی خوسرەو بەرامبەر بە شیرین و لەگەڵ فەرهاد، دێتە سەر ڕاگەیاندنی شەیدا و ڕێگای (ئەڤین)ی گیانی و پاک و سەرەتا لە سەرۆکەکانی ئەو ڕێگەی (ئەڤین)ە حەقیقی و مەعنەوییەوە دەستی پێ کردووە فەرموویەتی:

با سـرانی کـه سـالک عـشق اند: لـەگـەڵ سـەردارانێک کـە ئەوانـەی وا پەیڕەویکاری ڕێبـازی عـەشقن، کە مەبەسـتی (کوردی) لە عەشـقی حـەقیـقی و گیـانییە نەک عـەشـقە سـەرزارییەکەی (خوسرەو و نەدیمەکانی لەگەڵ دیمەنی ناسک و جوانەکاندا شەوانی سووریان بەسەربردووە یا ئەو عەشقە ڕواڵەتەی خوسرەو بەرامبەر بە (شیرین) کە هەر تەنیا بۆ کاتێکی دەمی بووە.

(کوردی) کە لەم نیوباڵی یەکەمەیدا لەگەڵ سەرۆک و سەردارانی ڕێبازی ئەڤیندا هەڵوێستی یا چۆنێتیی ئەو سەردارانەی لە نیو باڵی دووەمدا شی کردۆتەوە کە فەرموویەتی:

خلوتی با دلال می بینم: خەڵوەتی لەگەڵ دەلالدا دەبینم کە بە پێچەوانەی واتا، مەبەسـتی دوو هەڵبەسـتەکەی لەمەڕ (خوسرەو و شیرین و فەرهاد)دەوە، ئەم خەلوەتییەی ئێرە (ئەم تاکەی سـەرەوە) وەک خەڵوەتییە چنۆکی و جیهـانییەکەی (خوسرەو) و (کەنیزەک)ەکانی و (شیرین) نییـە کە لەوێدا (شـیرین) (خوسـرەو)ی نەویسـتـوە و، بەڵام خـوسـرەو بە زۆر بە دەسـەڵاتی پاشـایەتییە چنۆکییـەکەی لەگەڵ شیریندا ڕای بواردووە، پێی گەیوە کە بە بەڵگەی ئەوەی کە (شـیرین) زۆرجار لە کـاتی کێو تاشـینەکەی (فـەرهاد)دا سـەری (فـەرهـاد)ی داوە و تەنانەت جارێکیان ئەسپەکەی (شیرین) لەو ڕێگەی سـەردانەی (فەرهاد)یدا لاقێکی شکاوە و بەدرێژی لە داستانەکەی (نیظامی گەنجەوی)دا ئەمـانە نووسراون و ئەگەر ئەو (شیرین)ە خوسرەوی لە ناخـەوە خـۆش بویسـتـایە ئەو (دزە سـەردانانـە)ی (فـەرهـاد)ی نەدەکـردن هەروەک (کـوردی) ئاشکرای کردووە لەم تاکەدا نموونەی چاکەو پاکی پێچەوانەی تاکی پێشوو.

دلال: وەک پێخۆش بوونی نازونوز و لە نازی گوریشمە و لەنجەولار، کە لە سایەی پێغەمبەری ئیسـلامدا سـەرۆکە پەیڕەویکارەکـانی ڕێبازی پێغـەمبـەر کە دەقـە پیرۆزە ئیسـلامییـەکـانی و، گیـانی پاکی هەمـووان ئەو نازەی شـادمـانییە ئەنوێـن بەرامبـەر بەو خـۆشـەویسـتی و چوونە خـەڵوەتی صـۆفـیگەرانـەوە، وەک لە زیکر و خـەتم و چوونە خـەڵوەتەوە بەپێی دەسـتـوور و صۆفیگەرییەکانی هەر (طەریقەت)ێک.

ئەم جۆرە دەلالەیش گەورەیییـەکی پڕ خۆشەویستی (ویقار)ە نەک ژیانی (تەگەو بەرانی)یەکەی خوسرەو.

مەبـەست و واتای ئەم تاکە هەڵبـەسـتـەی سەرەوە لە تاکی ئایندەشـدا درێژەی هەیە و لێرەدا کە بەشـێوەیەکی گشـتییـە، بەڵام لـە تاکی ئایندەدا مـەبەسـتەکە بە تایبـەتییـانە ڕاگەیەنراوە و لە هەمان کاتیشدا پێوەندیی ناوەڕۆکی ئەم تاکە بەدوو تاکی پێشوویشەوە نەپچڕاوەتەوە.

(کوردی) وەک هـەموو تاکە هەڵبەسـتەکانی ئەم بەندی (پێنجەمـە) کە کۆتاییـان بە (می بینم) هاتووەتەوە لەم تاکەیشدا دیسان فەرموویەتی:

ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـە لەم حـەوت بەندەدا (١٠٣)یەمین و لەم بەندی پێنجـەمـینەدا تاکی پێنجـەم و شوێن ئەم تاکە لە هەریەکێ لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە.

لە سـەرچاوەکـانی: (با/١،ج، جم، حم، سجا، صـا، ط، عن، ف، ق/ ٣، مک، نم ١)دا نییـە و، لە (مع)دا (٣٥)یـەمین تاک لـە (شح، گل/٨)دا (٣٨)یـەمین و لـە (ص)دا (٤١)یەمین و لـە (گل/٥)دا

(٤٢)یەمـین و لە (گل/٣)دا (٤٣)یەمـین و لە (گل/٦)دا (٤٤)یەمـین و لە (مـــا/١)دا (٤٦)یـەمین تاک و لە (نع)دا (٥٢)یەمین و لە (مع، ن)دا (٥٤)یەمین تاک و لە (ھ)دا (٥٥)یەمین تاکە.
لە هەموو سەرچاوەکانیشدا ئەم تاکە هەڵبەستە چونیەکن و جیاوازی لە ناوەڕۆکیاندا نییە.

**واتای گشتی:**

چوونە خـەڵوەتـەوە لەلایەن سـەردارانی پەیڕەویکاری عـەشـقی گـیـانی و پاکـی ئاین دۆسـتـی و دەرنەچوون لە فـەرمـایشی خـوایە لەو ڕێگەی عـەشـقـەیاندا و خۆشـەویسـتـیـیـان بەرامـبـەر بە پێغەمـبـەر کـە بەهرەی ئاینی ئیسـلامی پێ بەخـشـیـون، (کوردی) ئەو خـەڵوەتەی ئەوانەی بە پێکگەیشـتنی گـیـانی و یەکگرتنی گـیـانیـان (الاتحـاد) لەگـەڵ پەرتەوی خـواییدا لە (جـذبە)ی صـوٚفـیگەرانەی ئەو سـەردارانـەدا ڕاگـەیـاندووە خـەڵوەتێکی ئارام و قـورس و بەویقـارەوەی ڕاگەیاندووە... کە بەپێچەوانەی چنۆکییەکەی خوسرەو لەگەڵ (شیرین) گیرخـواردنی (شیرین) بە دەست (خـوسـرەو)ەوە و ڕێگری (خـوسـرەو) و لە بە ئـاوات گـەیشـتنی (شـیـرین) لـەگـەڵ دڵخوازەکەی خۆیدا کە (فەرهاد) بووە.

١٠٤- رازداران خاص آن خلوت: ڕازدارە تایبەتییەکانی ئەو خەڵوەتە.

(کـوردی) لە نیـو باڵی دووەمی ئەم تاکـە هـەڵبـەسـتــەی سـەرەوە چـیـێـتی و چـۆنێـتـیـی ئەو سـەردارانەی ڕاگـەیاندووە کە لە هەمـان کاتدا ڕازدار (نهێنی هەڵگر و ڕازپارێزن لە خـەلوەتە پێگگەیشتنە گیانی صۆفیگەرییەکەدا کەوا هـەموویان یەک ئاهەنگن کە:

همە (عیسی خصال) می بینم هەموو ئەو ڕازدارانە لە تایبەتمەندییاندا وەک حەزرەتی عیسا - د.خ -) دەبینـم وەیا ئەوان وەک سـروشت و = ڕەوشـتـی بەرزی حـەزرەتی عـیـسـی وەهـان واتە (عیسی خصال)ن.

(کوردی) لەم نیـو باڵیی دووەمـەیدا ئـەو ڕازدارانەی بەوە دەسـتنیـشـان و جـێگیـر کردوون کە چواندوونی بە سروشت و ڕەوشتی بەرز و پاک و مرۆڤانەی دروستی حەزرەتی عیسا - د.خ - بە کـورتی ئەو سروشت و ڕەوشـتەی ئەو پێغەمبەر عیسـا - د.خ - یەش بریتییە لەو سـروشت بەرزە خـوایی و ڕەوشت پاک و پیـرۆزەی کـە لە ژیانیـدا شـتـێکی گـومـان لێکراو و خـراپی لێ نەدیتـراوە و بەو بێ باوکـیـیە لە ئاسـتـی هەرە بەرزی و چاکی و پاکـداوێنی دەروون و دەست و چاو و کـردەوە چاکـیدا بووە و بە تایبـەتی لەو خـۆشـەویسـتـیـیـە خـوایـیـیـەی کـە بە مـرۆڤی ڕاگەیاندووە بە گوفتار و بەکردار و لەوپەڕی نرخی دڵداریی گیانی و خواییدا بەو گەنجییەوە کە ژنیشی نەهێناوە.

(کوردی) سروشت و ڕەوشتی پاک و پیرۆزی ئەو سەردارە ڕازدارانەی بە سروشت و ڕەوشتی حەزرەتی عیسا - د.خ - چواندووە کە لەوە بەرزتر پڕ بەپڕتر (چواندن)ی بۆ نەدۆزراوەتەوە.

ئەم تاکـە هـەڵبـەسـتـەش وەک تەواوکـاری تا ئێـرە تاکـەکـانی ئەم بەندی پێنجـەمـەیە هـەروەها سـەرەتایەکیشە بۆ تاکە هەڵبەستی ئایندە.

ئەم تاکە:

ئەم تاکـە لەم حـەوت بـەندەدا (١٠٤)یەمـین تاکـە بەپێی سـاغکردنەوەی مـن و دەبێـتـە تـاکی شەشـەمینـی ئەم بەندی پێنجەمـە و هـەروەهـا شـوێن و ژمـارەی ئەم تاکە لە سـەرچاوەکانیدا بـەم چەشنەیە:

لە سـەرچاوەی (جم)دا کـە بەیەکجـارەکی ئەم بەندی پێنجـەمـەی تیـا نییـە، دیارە ئەم تاکـەیشـی هـەرتیـا نییـە و لە (صـا)دا (٢٣)یەمین تاکـەدا: (ف)دا (٢٦)یەمـین و لە (ق/٣)دا (٢٨)یەمـین و لە (حم)دا (٣١)یەمین و لە (ط، مک)دا (٣٢)یەمین تاک و لە (سجا)دا (٣٣)یەمین و لەک (با/١، ج، نم/١)دا (٣٤)یـەمـین و لـە (مـع)دا (٣٦) و لـە (شـح، گـل/٨)دا (٣٩)یـەمـین و لـە (ص)دا (٤٢) هـەمین تاک و لە (گل/٥)دا (٤٣)یەمـین و لە (گل/٣)دا (٤٤)یەمـین و لە (گل/٦)دا (٤٥) هـەمـین و لە (مـا/١)دا (٤٥)یەمین و لە (عن)دا (٥٠)یـەمین تاک و لە (نـع)دا (٥٣)یەمـین و لە (مس، نـع)دا (٥٥)یەمین و لە (ھ)دا (٥٦)یەمین تاکە و لە تاکی ئایندەشدا درێژەی هـەیە.

ئەم تاکە هـەموو لە سەرچاوەکانیدا چونیەکە و جیاوازی لە ناوەرۆکیاندا نییە.

**واتای گشتی:**

بە پێچـەوانەی نموونە هێنانەوە بۆ سەر (خـوسرەو) لێرە (کوردی) نهێنی پارێزەکانی خەڵوەتی خوانـاسـی و بەرفەرمـانی فەرمـایشـی خوای بە نموونە هێناونەتەوە کە هـەموویان لە سـروشت و ڕەوشتدا وەک سروشت و ڕەوشتی بەرز و پاکی حـەزرەتی عیسا – د.خ – ڕەچاوی کـردوون کە ڕوشتـەیەکی گیـانـی و پەڕتەوی یەزدانییـەکی تێ خستـوون و وەک یاوەرەکـانی (خـوسـرەو یا کـەنیـزەکـەکـانی شـیـرین نـەبوون کـە لە زەلکاوی چنـۆکیـی جیـهـانیـدا پەل بکوتن. ئەم تاکـە هـەڵبەستەش لە چوارچێوەی صۆفیگەریدایە.

١٠٥– (کوردی) هـەر لەو سەرداران و ڕازدارانی خەڵوەتی گیانییـەی چوار تاکە هـەڵبەستەی پێشوو دواوە و لێرەدا بـەم چەشنەی ڕاگەیاندوون:

همـه از عشـق آن شـه لولاک: هـەمـوو (ئەو سـەرداران و ڕازدارانەی کـە لە خـەلوەتەکـەدان) بە سـروشت و ڕەوشـتی عیسـا پێغـەمبـەر بـەرز و پاک ناوی بردوون، لێرەدا هـەمـوو ئەوانەی لەو کۆڕی خەڵوەتەدا وەها ناوبـردوون کە لە عـەشقـی هـەر ئەو شای پێغـەمەرانەی کە دەقی (لولاک لولاک)ی لە (حق) وتراوە کە لـە بەندی سێیـەمدا بە درێژی لەم دەقی حـەقـە دوام هـەموویان لە ئەڤینـی ئەودان کە پێغەمبـەری ئیسـلامە، هـەمـوو ئەوانەی وەها پێناسـە کردوون کە هـەموویانی لەو عەشق (ئەڤین)ی ئەو: (شە لولاک)ە پادشایەکی لە دەقی (لولاک)ی بەرانبەر گوتراوە.

کە ئەو (پادشـای لـولاک)ە مەبەست لە پێغـەمبـەری ئیسـلامی – د.خ – و ئـەم هـاوجووت کـردنـەی ئەم پێغـەمبـەرە بە (لولاک)ە گومـان لەوەدا ناهێڵێتـەوە کە ئەم حـەوت بەندە بۆ (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ی ئامۆزای پێغەمبەر – خوا بیبەخشێ – نەگوتراوە، چونکە ئەو حەدیثە نیشانـە نییە بۆ ئەو (عـەلی)یە و هـەروەهـا بۆ (بـەهـاییـەکـان)یش نەگـوتراوە، چونکە ئەو حـەدیثـە لە حـەقی پێشەوایانی (بەهایی)یەکان نەهاتووە و تەنیا تایبەتە بە (محـەمەد) – پێغەمبەری ئیسلام – د.خ – چونکە ئەوەتا (کوردی) لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هـەڵبەستەی سەرەوەدا فەرموویەتی کە:

عاقبت یک مآل می بینم: هەموو سەردارانی ڕێگەی حەقیقەت و ڕازدارانی خەڵوەتیی گیانی و بەهرەمەندانی پەرتەوی خوایی و سەربەستان بە کاریگەریی بادەی دەقە پیرۆزەکانی ئاینی ئیسلامی، هەموو شەیدایانی ئەڤینی ئەو پادشای سەرتەختی دەقی (لولاک)ەگشتیان لە ئەنجامدا یەک ئامانج دەبینم، ئەویش بڕوا بەبوونی خواو خوایەتی کردن و پەیڕەوی کردنی فەرمایشەکانی و بە ڕاستی و پاکی پەرستنی ئەو خوایە کە بە جارێ لەسەر ئەم ڕوانگە و خاڵە گرنگەی دواییياندا یەک ڕا و یەک بیر گرد دەبنەوە.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە کە (١٠٥)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە و دەبێتە تاکی حەوتەمی ئەم بەند پێنجەمینە و لە هەریەکێ لە سەرچاوەکانیدا شوێن و ژمارەی بەم جۆرەیە کە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (با/ا، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، عن، ف، ق/٣ ، مک، نم/ ١)دا نییە و لە (مع)دا (٣٧)یەمین تاکە و لە (شح، گل/٨)دا (٤٠)یەمین و لە (ص)دا (٤٣) و لە (گل/٥)دا (٤٤)یەمین و لە (گل/٣)دا (٤٥)یەمین و لە (گل/٦)دا (٤٦)یەمین تاک و لە (ما/١)دا (٤٨)یەمین و لە (نع)دا (٥٤)یەمین و لە (مس، ن)دا (٥٦)یەمین و لە (هـ)دا (٥٧)یەمین تاکە.

لە هەموو سەرچاوەکاندا ناوەڕۆکی ئەم تاکە چونیەکە و جیاوازی لە نێوانیاندا نییە.

**واتای گشتی:**

هەموو ئەو سەردارانەی ئەڤینی و دەرباری بۆ پێغەمبەری ئیسلام کە لێرەدا بە پاشای (لولاک) ناوی براوە، هەموویان لە ئەنجام و ئامانج و مرخ خۆشکردنیاندا لە گەورەترین یەک هیوا و ئاواتدا یەکگرتوو دەبینم کە ئەویش ناسین و پەرستنی خوای مەزنە سەر ڕێگەی ئاینی ئیسلام.

تاکە هەڵبەستی ئایندەش درێژەدانە بە ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە.

١٠٦- همە دربای: هەموو ئاتاجی، بارەگای ئەوان.

آنچە فرخندە حال می بینم: ئەوانەی کە کەوا من بە کامەرانیان دەبینم.

آنچە: ئەوەی، ئائەوەی، ئەوەی کەوا.

فرخندە: کامەران، پیرۆز، بەختیار.

حال: بار، چۆنێتی.

فرخندە حال: لە بارودۆخی بەرفرەهی و شادی و کامەرانی و پیرۆزی و شکۆمەندیدا.

ئەم تاکە لەم حەوت بەندە دا (١٠٦)یەمین و لەم بەندی پێنجەمەدا (٨)یەمین تاکە و شوێنی ئەم تاکە و ژمارەکانی لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (با/ ١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، عن، ف، ق/٣، گل/ ٣، گل/٥، مس، مک، نم/١)دا نییە و لە (مع)دا (٣٨)یەمین تاک و لە و (شح، گل/ ٨)دا (٤١)یەمین و لە (ص)دا (٤٤)یەمین و لە (گل/٦)دا (٤٧)یەمین و لە (ما/١)دا (٤٩)یەمین و لە (نع)دا (٥٥)یەمین و لە (ن)دا (٥٧)یەمین و لە (هـ)دا (٥٨)یەمین تاکە.

ئەم تاکە لە رووی ناوەرۆکەوە لە هەموو سەرچاوەکانیدا چونیەکە و جیاوازییان لە نێواندا نییە.

**واتای گشتی:**

هەموو ئەوانەی کە پێویستییان بە دەرباریی بارەگای (عەرشی خوایی) وەهەروەها ئاستانەی پیرۆزی پێغەمبەری ئیسلام هەیە، هەموو ئەوانە لە باردۆخی کامەرانی و پیرۆزی و بەختیاری و شکۆداریدا رەچاو دەکەم.

١٠٧- آنچە در کارگاه نقش صور: ئەوەی لە کارگەی نەخشی وێنەکاندا ذرەای زان جمال می بینم: تۆزقالێک لەو دیمەن و رجواڵەتە جوانە دەبینم.

لێرەدا (کوردی) وەک صۆفییەکی راست و دروست و پاک و بەبێ ئەوەی کە نیازی بووبێ بە صۆفییەک بناسرێ، ئەوەند بە قووڵی باسەکەی گرتووەتەوە و بە جۆرێ رۆچووەتە ناو پێناسەکردنی جوانیی پێغەمبەری ئیسلامەوە - د.خ کە تیایدا گەیوەتە دوا پلەی بەرزی صۆفیگەری و ئەوەندە چووەتە ناو ئەو جوانییە بێ هاوتایەوە کە ئاڵای (مەنصوری هەلاج) لە زۆر رۆچوونیەوە بە ناو (حەق)دا و ئەو (پرتەوی حەق تیشکی داوەتەوە کە تەنانەت خودی خۆی ئاوێتەی ئەو (حەق)و پەرتەوەیدا دیوە، وەکو گوتوویەتی: من خۆم خودی حەقم.

(کوردی)یش لێرەدا خۆی کە بوونێکە لەو بوونەوەرییەی کە هەموو (بوونەوەری)یش بە گەردیلەیەکی ئەو جوانییە رەچاو کردووە کەواتە خودی خۆیشی لەبەهرەوەرێکی ئەو رۆشنایی ئەو جوانییەدا دیتووتەوە.

لەلایەکی تریشەوە بەپێی دەقی (حەدیثی قودسی)ی (لولاک)؛ کە (بوونەوەری) = (وجوود) لەبەر ئەو پێغەمبەرە دروست کراوە کە (بوونەوەری) گەردیلەیەکی جوانیی ئەو بێت کەواتە (کوردی) خۆی بە گەردێکی رووناک بووەوە بە تیشکی ئەو رووناکی بیر لێ کردووەتەوە، چونکە خۆیشی شتێکی بەرهەم هاتووی ئەو (کارگە)یەی نەخشانەی شێوەکاریی دیمەنی مرۆڤ بووە لە بوونەوەرییدا.

جگە لەوەی نیشانەیشە بۆ ئەو ئاینەی کە ئەو (جوانە) جیهانی پێ بەهرەوەر کرد و بۆیە (کوردی) فەرموویەتی ئەوی لەو کارگایەوە بەرهەم هاتووە (وەک ئاینی ئیسلامەکە بێت) ئەوە گەردیلکەیەکی جوانیی فەرموودەو کردەوەی ئەو بوونەیە.

ئەم تاکە هەڵبەستە بۆ ئەم حەوت بەندە ژمارەکەی (١٠٧)یەمین و بەپێی ئەم بەندی پێنجەمەیش تاکی (٩)یەمین و ژمارەیشی لە هەر سەرچاوەیەکیدا بەم چەشنەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (جم)دا نییە وە لە (صا)دا (٢٤)یەمین تاکە و لە (ف)دا (٢٧)یەمین و لە (ق/٣)دا (٢٩)یەمین و لە (حم)دا (٣٢)یەمین و لە (ط، مک)دا (٣٣)یەمین و لە (سجا)دا (٣٤)یەمین و لە (با/١، ج، نم/١)دا (٣٥)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٤٢)یەمین تاک و لە (ص، گل/٥)دا (٤٥)یەمین و لە (گل/٣)دا (٤٦)یەمین و لە (مع)دا (٣٩)یەمین تاک و لە (گل/٨)دا (٤٢)یەمین تاک و لە (ما/١)دا (٥٠)یەمین و لە (عن)دا (٥١)یەمین و لە (نع)دا (٥٦)یەمین و لە

(ن)دا (٥٨)یەمین و لە (ھ)دا (٥٩)یەمین تاکــە و (گل/٦)دا (٤٦)یەمین تاکــە و لە هەمــوو سەرچاوەکاندا چونیەکە و بەبێ جیاوازییە.

**واتای گشتی:**

ئەوی لە بوونەوەریدایە کە لە کارگای نەخشی شێوەکار (صور) بەرهەم هاتوون، هەموو لە چاو جوانیی ئەودا وەک تەنیا گەردیلەیەک دەبینم.

ئەم واتایەیش دیسان لە تاکی ئاینەدا درێژەی هەیە.

١٠٨- آنچە: ئەوی، ئەو شتەی، ئەوەی کە.....

آورد: هێنای و، مەبەست لە هێنانی قورئانی پیرۆە بۆ ئیسلامەکان و بەوە جێگەی پەڕاوی ئاسمانییەکانی ئاینەکانی تر و ئاینەکان و پێغەمبەرانی گرتەوە، بەوەی کە کۆتاییهێنەر، بوو بە پێغەمبەرێتی (خاتم الانبیاء).

کرد: کردی و مەبەس لە کردەوەکانی ئەو پێغەمبەرەیە (د.خ) کە بە (سوننە) ناو دەبرێت و هەروەها مەبەست لە هەوڵدانەکانی و (غەزا) کردنەکانی و (کۆچ کردن = هیجرەت) بۆ مەدینە و هاتنەوەی بەهێز و توانایەوەو وەرگرتنی شاری (مەککە) و بەسەر دژەکانی لە بتپەرستان و خوانەناسان و جووەکاندا زاڵ بوون و... هتد.

گفت: گوتی، فەرمووی کە مەبەست لە فەرمایشتەکانی (حەدیث)ەکانیەتی.

بود: بوو، مەبەست لەو ڕووداوانەیە کە لە سەرێنی ئەو پێغەمبەرەدا ڕووی داوە، وەک (میعراج) و (مۆری) پێغەمبەرێتیی محەمەد - د.خ.

همە: هەموو ئەوانەی کە لە پێشەوە لەسەر لێکدانەوەی وشەکانی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا لێکم دانەوە - واتە ئا ئەوانە هەموویان:

سحر حلال می بینم: هەموو ئەوەک سیحری حەڵاڵ دەبینم و بەلامەوە سیحری حەڵاڵن و ئەمجا:

سحر: جادوو، کارێکی لە ڕادەبەدەرە و، ژیری و لێکدانەوەی بابەتییانە (پەی)یی پێ نابات و شوێن بڕوا نییە، جادووگەران بە جۆرها فرتوفێڵ و هونەرمەندی ئەنجامی دەدەن.

سحر: جادوو. بەلای هەموو ئاینەکانەوە، کارێکی قەدەغەو جادووگەران بەسەرپێچی لە ئاین و پەیڕەوی نەکردنی دەقە ئاینییەکان و بە خوانەناسی تاوانبار دەکرێن.

بەڵام پێغەمبەران (موعجیزات)یان نواندووە کە کارێکی لە رادەبەدەر بووە و کەسانی تر نەیانتوانیوە ئەو کارانە بکەن کە لە زاراوەی ئاینیدا (موعجیزە) بە (سیحری حەڵاڵ) و قەدەغە نەکراو پێناسە کراوە، هەروەها لە کۆڕ و کۆمەڵگا وێژەییەکاندا (دەقی ڕستەو وتار) یا (هەڵبەست)ی یەکجار جوان و باڵا و پەسند و دڵگیر و بەهێزی بێ هاوتا و کارێکی هونەرییە (سحر حلال: جادوویەکی قەدەغەنەکراو) لە ئاینەکاندا، ناوبراون.

ئەمجا (کوردی) هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری ئیسلام - د.خ -هێناونی و کردوونی و گوتوونی و لە خودی ئاینەکەیدا ڕوویان دابێ، هەموو ئەوانەی بەر سیحری حەڵال داناوە.

هەروەها چوونە (میعراج)ەکەیشی بەکردەوە و گوتن و هێنانەوەی فەرمایشتەکانی خوا لە (میعراج)ەوە. دیسان جۆرێک لە سیحری حەڵاڵ بووە و لە لێکدانەوەی ئەو تاکە هەڵبەستەدا من ئەوەندەیان تێ ڕۆچووم کە لە ئاسۆی ڕۆشنبیری و بیرو بیری بەرز و فراوانی (کوردی) وەها ڕەوا دەبینم کە لە مەندەیەش پتری مەبەست بووە و هێشتا من تێی نەگەیشتووم.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە (١٠٨)یەمینی ئەم جووت بەندەو دەیەمینی ئەم بەندی پێنجەمینە بەپێی ئەوەندە سەرچاوەیەی لەسەری دەستم کەوتوون کە لەو سەرچاوانەدا ژمارەو شوێنی ئەم تاکە بەم جۆرەی دواییە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (با/١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، عن، ف، ق/٣، مک، نم/ ١)دا نییە و لە (مع)دا (٤٠)یەمین تاک و لە (شح، گل/٨)دا (٤٣)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٤٦)یەمین و لە (گل/٣)دا (٤٧)یەمین و لە (گل/٦)دا (٤٩)یەمین و لە (ما/١)دا (٥١)یەمین تاک و لە (مس، نع)دا (٥٧)یەمین و لە (ن)دا (٥٩)یەمین و لە (ه)دا (٦٠)یەمین تاکە. لە هەموو سەرچاوەکانیدا چونیەک و بێ جیاوازییە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) ئەوەی پێغەمبەر (هاوردوویە) و (کردوویە) و (فەرمووویەتی) و (لێی روویداوە) هەمووی بەسیحری حەڵاڵ داناوە.

١٠٩- آنچە در کائنات کردە ظهور: ئەوەی لە کائیناتدا دەرکەوتووە و ڕووی داوە، هەموویان بە ڕواڵەتی خوا دەزانم.

**هەڵسەنگاندن:**

نیوباڵی یەکەمی سەرەوە لەم تاکی (١١)یەمین بەندی یەکەمی ئەم حەوت بەندەدا نیو باڵی دووەمینە. بە ئاشنایەتیی فراوان و وردم لەگەڵ (کوردی) و هەڵبەستەکانیدا وای بۆ دەچم ئەم نیو باڵی یەکەمەی سەرەوە بەم جۆرە نەبێت کە بەپێی سەرچاوەکانی جێگرم کردووە، چونکە (کوردی) ئەوەندە ناتوان نەبووە کە پەنای بۆ ئەم (دووبارەکردنەوەیە) بردبێ ئەگەرچی لێرەشدا زۆر پڕ بەپڕە و پێم وایە لەمەدواتر (ئەوەی بۆی دەچم) کە ئەم نیوباڵی یەکەمەی سەرەوە دەبێ چەشنێکی تر بێ و سەر هەڵبدات و جێگەی خۆی بگرێتەوە.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی ئەو (٢٠) سەرچاوەیەی کە تێیدا نووسراوە دەبنە تاکی (١٠٩)یەمینی ئەم حەوت بەندە و (١١)یەمین تاکی ئەم بەندی پێنجەمینەیە. ژمارە و شوێنی ئەم تاکەش لەو سەرچاوەیانەیدا بەم چەشنەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (مک، ط، ج، جم)دا نییە و ئەم سێ سەرچاوەیەش وەک لە سەرەتای ئەم حەوت بەندەوە، چەند جاری تر ڕام گەیاندوە هەرسێکیان سەرچاوەیان یەکە.

هەر ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ص)دا (٢٥)یەمین و لە (ق/٣)دا (٣٠)یەمین و لەک (ف)دا

(٢٨)يەمین و لە (حم)دا (٣٣)یەمین و لە (سجا)دا (٣٥)یەمین و لە (با/١، نم/١)دا (٣٦)یەمین و لە (مع)دا (٤١)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٤٤)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٤٧)یەمین و لە (گل/٣)دا (٤٨)یەمین تاک و لە (گل/٦)دا (٥٠)یەمین و لە (عن، مـا/١)دا (٥٢)یەمین و لە (مس، نع)دا (٥٨)یەمین و لە (ن)دا (٦٠)یەمین و لە (ھ)دا (٦١)یەمین تاکە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) ئەم تاکە هەڵبەستەی لە مەڕ خوای مەزنەوەیە کە ئەوی لە بوونەوەریدا دەرکەوتووە و پێ زانراوە هەمووی بەڵگەی بوونی خوان و ڕواڵەتی هەر بووەو هەر دەبێ ئەو (گەورەیە).

ئەم تاکە هەڵبەستە کە لە مەڕ خوای گەورەوەیە وەک سەروایە کە، بەپێی تاکە هەڵبەستی دوایی کە لەم پەڕتەوی بوونێتییە هەر بووە و هەر دەبێ ئەم خوایەوە بەسەر ئاینداران و خواناساندا ڕووناکییەکی بەهرەمەندی وا هەر لە برەودا تێدا ڕاگەیاندووە.

١١٠- پرتو مهر: پەڕتەوێک کە لە ڕووی وەک هەتاوی.

پرتو: تیشک، ڕۆشنایی، ئەو ڕووناکییەی کە لە شتێکی (پرشنگدەر)ەوە دەردەکەوێ، بەڵام (کوردی) لێرەدا مەبەست ئەم ڕووناکییە (ماددی) و (جیهانی)یە، نییە، مەبەستی لە بەهرەیەکە کە بڕواداران کە (لە تیشکی لە هی خۆر بەهێزتر)ی خواییەوە پێی گەیشتوون یا ڕۆشنایییەک لە ڕوخساری کەسانی نوورانیدا دەبینرێت.

مهر: ئەم وشەیە گەلێ واتای جیاجیا دەدات و جاری تر و بەرلێرە لە پێشەوەی ئەم پەڕاوییەدا بە درێژی لێی دواوم و ئەوا ئەوی بۆ ئێرە بشێت، کەمێکی پێشکێش دەکەمەوە:

مهر: دۆستی، خۆشەویستی، هەتاو (خۆر = خورشید).

هەروەها ئەم وشەی (مهر)ە لە شێوەی (مُهر)دا بە واتا (مۆر)ی شوێنی (ئیمزاکردن) بەکارهاتووە، بەو مەبەستەی ئەو بەهرەمەندییە بڕوای خواناسییانە لە لایەن خوای مەزنەوە (مۆرکراون) و جگە لەوەی نیشانەیشە بۆ (مۆری پێغەمبەرێتی - ختم النبوە)ی پێغەمبەری ئیسلام - د.خ.

طلعت جانان: دەرکەوتن (ئاشکرابوون)ی هەڵهاتنی وەک خۆری جانان خۆشەویستان.

جانان: جانان (خۆشەویستانی وەک خودی پێغەمبەر و هاواڵە پاک و ڕاستەکانی و کەسانێ بەڕاستی ئاینی پاکی ئیسلامی گرتووە، (جانان = گیانان = خۆشەویستان)

(کوردی) لە پێناسەترکردنی ئەوانەدا لەم تاکە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەدا فەرموویەتی ئەوانە هەموو:

بی کسوف و زوال می بینم: ئەوانە بەبێ تاریکایی بەسەراهاتنی وەک: (خۆرگیران) دەبینم و.

زوال: لاچوون، نەمان، بڕانەوە، کۆتایی پێ هاتن، کە مەبەستی (کوردی) لەوەیە ئەو:

(پەڕتەوی ڕووی (جانان)ە هەمیشە وەها دەبینم کە (نە) وەک خۆرگیران و، یا (نە) لە کۆتایی هاتندا دەبینم و، بگرە هەرگیز وەک خۆر ناگیرێن و، بڕانەوە بۆ تیشکەکەیان نییە کە بڕواداران، لێیانەوە بەهرەوەر بوون و دەبن (زوال = لاربوونەوەی خۆرە بەلای (نیوەڕۆژ)دا. ئەم

تاکە هەڵبەستەش وەک پەلوپۆیەکی تاکە هەڵبەستی پێشوو وەهایە.

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە (١١٠)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندە و (١٢)ەمینە لەم بەندی پێنچەمەدا بەپێی ئەوەندە سەرچاوەیەی بە دەستم هێناون.

هەر ئەم تاکە ژمارە یا شوێنی لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە تەنیا لە (جم)دا نییە و لە (صا)دا (٢٦)یەمین تاک و لە (ف)دا (٢٩)یەمین و لە (ق/٣)دا (٣١)یەمین و لە (حم، ط، مک)دا (٣٤)یەمین و لە (ج/سجا)دا (٣٦)یەمین و لە (با/١، نم/١)دا (٣٧)یەمین و لە (مع)دا (٤٢)یەمین تاک و لە (شح، گل/٨)دا (٤٥)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٤٨)یەمین و لە (گل/٣)دا (٤٩)یەمین و لە (گل/٦)دا (٥١)یەمین و لە (عن، ما/١)دا (٥٣)یەمین و لە (مس، نع)دا (٥٩)یەمین و لە (ن)دا (٦١)یەمین و (ه)دا (٦٢)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

طلعت، لە (مک، ج)دا نووسراوە (خلعت) دیارە ئەمەش لەوانەیە لە هەڵەی نووسینەوە بێت کە لە باتی (سەر)ی پیتی (ط)ی طلعت خاڵێک دانراوەو و پیتی (ط): کەی گۆڕیوە بە (خ) و ئەگەر وەهانەبێ هەڵەیە بۆ ئەم شوێنە و ناگونجێ.

**واتای گشتی:**

(کوردی) دوای لە خوای مەزن توانایی دواندنەکەی، لای کردووەتەوە بە لای ئەو (جانان)ەدا کە وەک خۆر لەو پەرتەوەی خواییەوە هەڵهاتوون و بەبێ ئەوەی کە وەک خۆر (خۆرگیران)ی لەرێدا بووە و هەیە، بەڵام هەڵهاتنی (پەیابوون)ی ئەوان لە خواییـیەوەیە، بۆیە هەرگیز تەگەرە و تاریکی وەک خۆرگیرانیان نایەتە رێگە و برانەوە و، نەمانیان بۆ کارەکەیان و بەهرەمەندییەکەیان و بەهرەمەندکردنیان هەرگیز لە برانەوەونەمان نایەت و هەر دەبێ بمێنێتەوە.

ئەمەیە کە (کوردی) رەچاوکردنی خۆی لەم (می بینم)ە راگەیاندووە.

هەروەها بۆ جێگر کردنی ئەم راو بیر و بۆچوونە ئەوەتا (کوردی) لە تاکە هەڵبەستی ئایندە وەک (نموونە) هێنانەوە درێژەی بەم بروایەی خۆی داوە.

١١١- زاهدا: ئەی زاهید.

زاهد: ئەوەی خۆشی و ژیانی خۆش رابواردنی جیهانی (واز لێ دەهێنێ) لە رێگەی خواناسی و خواپەرستیی صوفیگەرانەدا.

بەڵام (کوردی) لێرەدا مەبەستی لەو چەشنە (زاهید)ە رووکەش و سەرزارییە درۆزنانەیە کە هەر بەناو خۆیان لە بەرگی زاهیدێتیدا دەنوێنن و ئەم مەبەستەی (کوردی)یش لە زۆر هەڵبەستی شاعیراندا بە تایبەتی لە هەڵبەستی تری خودی (کوردی) و هی شاعیرانی هاوچاخیدا زۆرە.

کشک شاه بینی و من: تۆ (ئەی زاهید) کە کۆشکی پاشایی دەبینی و، وەک دەربارێکی (پاشا)

وەهایت و چاوت لە دەستکەوتی جیهانییە لەو کۆشکەوە؛ چونکە تۆ بەڕاستی (زاهید)نیت و، لە جێگە ئەو بینینەی تۆ، (من):

کُشك: تەلار، کۆشک و باڵەخانە (کۆشک)ی پاشایان کە خانوو یا ساختمانی بەڕێوەبەرایەتی و شوێن تەختی پاشایەتییەکەیەتی.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە بریتییە لە بەراوردکردنێکی خواناس و خواپەرست و پەیڕەویکاری دەقە ئاینییەکان بێ بڕوا و گومڕایان (کوردی) لەم بەراوردکردنەیدا نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی تەرخان کردووە باسی خۆ بەخواناس بە درۆ دەرخەرەکانی وەک هەندێ لە زاهیدان کە (کوردی) بە دەرباری کۆشکی پاشای جیهانیی ناوبردووە.

بەڵام نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستە لەو بەراوردەدا لە خواناس و خواپەرستی ڕاستی و لە ناخەوەی، دیاری کردووە کە (کوردی) خۆی بە نموونە هێناوەتەوە بەرامبەر بەو (زاهید)ە چێشتەو کولێرەکوژە دەرباری کۆشکی شایە و، ئەم لە جێی ئەوە کە ئەو (زاهید)ە هەر کۆشکەکەی پاشای بەلاوە هەرە بەرز و پیرۆزترە (کوردی) ئەمەتا بەرامبەر بەو (زاهید)ە درۆزنە، خۆی وەها دیاری کردووە کە لە جێگەبینینی ئەو کۆشکی شاهییە بارەگای (عەرش) ئەو خوا کردگار و پەروەردگار و بەرز و پیرۆزە دەبینێت هەروەها فەرموویەتی: عرش آن بارەگای ئەو:

عرش: بارەگای بەرز و پیرۆزی خوایی مەبەستە کە شوێن تەخت و بەرزترین شوێن لە بوونێتیدا کە لە پاڵ (سەدرەتول مونتەها): دار (کونار)ە پیرۆزەکەی کە لە کۆتایی هەر بەرزتریندایەو دوای ئەو تەنیا (عرش) هەیە لە بارەگای (خوای مەزن) بەپێی بڕوای ئیسلامی و باسکرانی لە قورئانی پیرۆز و فەرمووده (حەدیث)ەکانی پێغەمبەری خۆشەویستدا، چەند جاری تر لەمە دواوم لەم پەڕاوییەدا.

(کوردی) ڕووی دەمی لەو (زاهید)ە کولێرەکوژ و دەربارەیە کە ئەو تەنیا کۆشکی پادشای جیهانی دەبینێ لە چەند شەقاوێک لێوەی دوورە هەر (کوردی) فەرموویەتی ئەوەتا کە من دەستم لە خۆشی و شەهەوات و خۆش ڕابواردنی جیهانی هەڵگرتووە و بۆ خوا گونجاوم، ئەوەتا من ئا لەو هەرە دوورەوە وەک تۆ چۆن کۆشکی پاشایەکەت دەبینی ئاوا من بارەگای (عرش)ی خوایی دەبینم.

(کوردی) بەم نموونە بابەتییانە (واقیعی) و ڕاست و دروستە جیاوازیی خۆی و ئەو (زاهید)ەی ئاوەها جێگر کردووە و ئەمەیش وەک بانگەوازێکە بۆ بێ باوەڕ و گرمڕایان کە دوای ئەو چەشنە (زاهید)انە نەکەون و ڕێگەی ڕاست و ڕەوان و دروستی (کوردی) بگرن.

آن: ئەو، کە مەبەستی لەو بارەگا (عرش)ی خواییە.

متعال می بینم: زۆر بەرز و بڵند پایە دەبینم. هەرچەند ئەمە لێکدانەوەی فەرهەنگیی ئەم دوو وشە لێک دراوەیە، بەڵام مەبەستی (کوردی) لە وشەی (متعال): ڕواڵەتی بەرز و پیرۆزی زاتی

خوای مەزنە کە (کوردی) لە جێی کۆشکی پاشای جیهانی ئەوەتا (عرش)ی ئەو (متعال)ە دەبینێت.

**بەراوردکاری:**

لەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی) مانەوە، من تاکە هەڵبەستێکی خواجە (حافظی شیرازی)م بیر دەکەوێتەوە کە فەرموویەتی:

«جلوه برمن مفروش ای (ملک الحاج) کە تو
(حانه) می بینی و، من (خانەخدا) می بینم.

واتە: «جیلوە بە من مەفرۆشە، ئەی مەلیکولحاج کە ئەتۆ هەر تەنیا (خانوو) دەبینی و بەڵام من (خاوەنی خانوو) دەبینم»

ناشی (کوردی) ئەم تاکە هەڵبەستەی (حافظ)ی چەندین جار نەخوێندبێتەوە، و، یا بە واتە بە قوتابییانی نەگوتبێتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیری ناوەڕۆکی هەردوو تاکە هەڵبەستەکەی (کوردی) خۆی و ئەوەکەی (حافظ) دەچنەوە سەریەک، ئەوەتا (کوردی) لێرەدا لەوەی (حافظ) بەهێزتری ڕاگەیاندووە بەپێی دەستووری وێژەی کۆن ئەمەی (کوردی) بە(دزی) دانانرێ و بەشکو (بەکردنە هی خۆ) دەژمێردرێت و لە (حافظ) گەلێ جوانتر و کورتکراوەتری دەربڕیوە.

بۆ جێگرکردنی ئەو ڕاستییەی کە لێرەدا (کوردی) بەسەر (حافظ)دا سەرکەوتووە ئەو (حافظ)ە کەم هاوتا و یەکێ لە چەند پێشەوا شاعیرەکانی فارس دادەنرێت، ئەوەتا (کوردی) لە تاکی دواییدا نموونەی فراوانتری بۆ ئەم تاکە هەڵبەستەی خۆی هێناوەتەوە.

ئەم تاکە هەڵبەستە (١١١)یەمینی ئەم حەوت بەندە و (١٢)یەمینی ئەم بەندی پێنجەم و شوێنی ئەم تاکەیش لە سەرچاوەکانیدا ئاوەهایە:

ئەم تاکە سەرچاوەکانی (با/١،ج، جم، حم، سجا، صا، ط، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نییە و لە (مع)دا (٤٣)یەمین تاک و لە (شح، گل/٨)دا (٤٦)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٤٩)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٠)یەمین و لە (گل/٦)دا (٥٢)یەمین لە (عن، ما/١)دا (٥٤)یەمین تاک و لە (مس، نع)دا (٦٠)یەمین و لە (ن)دا (٦٢)یەمین و لە (ھ)دا (٦٣)یەمین تاکە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە ناوەڕۆکی سەرچاوەکانیدا جیاوازیی نییە و لە هەمووواندا چونیەکە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) لەم تاکەدا سۆفیگەرانەیەکی ڕاست و پاک هاتووەتە دەنگ و ڕووی کردووەتە (زاهید) کە هەر کۆشکی پاشای لە (سەر ڕووی زەوی) دیتووە چونکە چێشتەکەو کولێرەکوژە و دەربارەی ئەو کۆشکەیە چونکە خۆی خاوەن بڕوایەکی توندوتۆڵی ڕاستیی ئەوەتا لە جێگەی ئەو بینینەی (زاهید)ە کە بارەگای عەرشی خوای بەرز و مەزن و توانا و کردگاری دیتووە.

(کوردی) تاکی دواییشی وەک پەراوێزی ئەم تاکە ڕاگەیاندووە.

١١٢- مجلس: شوێن لێ دانیشتن و مەبەستی لە جێگە تیا کۆبوونەوەی پەیڕەویکارانی دەقە ئاینییە ئیسلامییەکانە.

خلوتگاه: ئەو شوێنانە کە ڕێورەسمی ئاینی وەک (خەڵوەکێشان) و جۆرەها (خەتمی طەریقەتە ئاینییەکان و چوونە خەڵوەوە کە بە تەنیا بەپێی خشتەی تایبەتی (تەریقەتەکە) چەندین جۆرە ناوی خوا و تۆبەکردن و ئایەت خوێندنەوەی تیا دەکەن.

همسایە: هاوسێ، دراوسێ کە مەبەستی لەوانەیە زۆر بە تۆخی پەیڕەوی صۆفیگەرییەکەی (کوردی)یان کردووە، بەڵام کەسانی چاک و خاوەن بڕوا بەجێگەیەنەری (فەرض)ەکانی ئاینی ئیسلامیان کردووە و بەس.

قد نهال می بینم: مەبەستی لە باڵای پێغەمبەری ئیسلام – د.خ –

نهال: ناوی درەختێکی جوان و شووش و ڕاست هەڵچوو و باریکە کە تازە ڕوابێت.

ئەم چواندنی (قد)ە بەو درەختە شووش و باریکە لەوەوەیە کە ئەو پێغەمبەرە، هەرگیز تێری نەخواردووە کە دەستی لە خواردن هەڵگرتووە، بۆیە هەمیشە ورگی هەڵنەهاتووە لە زۆرخۆردیدا بەشکو بەژن باڵا (قد)ی وەک درەخت باریک بووە. جگە لەوەی کە ئەم لە (قد) دواندنە باوێکی ناو هەڵبەستی هۆنەران بووە لەوێژەی کۆندا.

ئەم تاکە هەڵبەستە کە (١١٢)یەمین لەم حەوت بەندەدا (١٤١)ەمین تاکی بەندی پێنجەمەیە و لە سەرچاوەکاندا شوێنی ئاوەهایە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی (با/١،ج، جم، حم، سجا، صا، ط ، ف، ق/٣، ما/١، مع، مک، نم/١)دا نییە و لە (شح، گل/٨)دا (٤٧)یەمین تاک و (ص، گل٥)دا(٥٠)یەمین و لە (گل٣)دا (٥١) و، لە (گل٦) (٥٣) و لە (عن)دا (٥٥١)یەمین و لە (مس، نع)دا (٦١)یەمین و لە (ن)دا (٦٣)یەمین و لە (ھ)دا (٦٤)یەمین تاکە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە هەموو سەرچاوەکانیدا چوونیەکە و جیاوازی لە ناوەرۆکیاندا نییە.

**واتای گشتی:**

دوا بەدوای تاکە هەڵبەستی پێشوو (کوردی) لە (شوێن کۆبوونەوە جێی تیا دانشتن) و جێی خواناسی تیا کردن (خلوە) تەنانەت هاوسێیانی ئەوانیشی لە بارەگای ئەو قەد باریک (نیهالی)یەدا «دیتوون، کە خواناسییەکی خستوون»

دیسانەوە تاکی ئایندەش درێژپێ کێشانی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیە.

١١٣– صف ارواح را: ڕیزی (ئەرواح).

ارواح: گیانەکان، لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا (کوردی) مەبەستی لە کەسانی (مجلیس) و (خلوت) و (دراوسێ) خودی کەسانی مرۆڤی ئیسلام بوون و، یا گیانی پیاوچاکە مردووەکانی ئیسلام.

بەڵام لێرەدا کە کەسانی ئەو بارەگای پێغەمبەر (د.خ)ی بە (ارواح) ناوبردوون، مەبەستی گیانی پیاوچاکان و فریشتە واتە (مەلائیکە) و، یا بەپێی بڕوای ئیسلامی دیسان مەبەستی لە (جنۆکە)کانە کە قورئان ناوی (جن و انس)ی بردوون، واتە جنۆکە. (جن)ەکانیش لەگەڵ فریشتەکاندا چونکە ئەوان لەلایەن مرۆڤەوە هانا ناکرێن و نهێنین و بەڵام ئەوان مرۆڤ دەبینن.

در آن منزل: ئاله و نیشنگه (خانوو)، دیوانی پێغەمبەردا کە ئەمەش خانووەکە مەبەست لە ئاینی ئیسلامیش بێت کە وا مرۆڤ و فریشتە و جنۆکەی تیا گردبوونەتەوە،

منزل: خانوو (دیواخان) نیشنگە، بارەگای پێغەمبەر یا ئاینەکەی.

النعال: سۆل، ئەو پێڵاوەی دەکرێتە سەر پێوە.

جا بە صف النعال می بینم: شوێنان لە لای ڕیزی سۆل (پێڵاوی سەرپێیی)دا دەبینم.

چونکە ئەو پیاوە چاکانە ئەوەندە زۆرن جگە (ارواح)ەکان کەوتووەتە لای ڕیزی پێڵاوەکانەوە.

(کوردی) لە جۆرە بە سووکی ڕاگەیاندنی ئەو گیایی فریشتە و جنۆکانە نەبووە، بەڵام مەبەستی لە زۆر بەرزی پایەی بەڕێزی خودی ئەو پێغەمبەرە هەرە خۆشەویستەیە و، مەبەستی لەوەیە ئەوەندە گیانی مردووانی پێڵاوی چاکانی ئیسلام زۆرن، تەنانەت ڕێگەی ئەو فریشتە و جنۆکانە ئەمجا لە شوێنی تیا ڕیزی کردنی (سۆل)ەکاندا دەبێتەوە، نەک مەبەست لە سووکی پێکردنیان.

لە ناخەوە بەشکو جوانکارییەکی وێژەیی لەو ڕاگەیاندنەیدا پێشکەش کردووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (١١٣)یەمین و لەم بەندی پێنجەمدا (١٥)یەمین و شوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (جم، ف)دا نییە و لە (صا)دا (٢٧)یەمین تاک و لە (ق/٣)دا (٣٢)یەمین و لە (حم، ط، مک)دا (٣٥)یەمین و لە (ج، سجا)دا (٣٧)یەمین و لە (با/١، نم/١)دا (٣٨)یەمین و لە (مع)دا (٤٤)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٤٨)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٥١)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٢)یەمین و لە (گل/٦)دا (٥٤)یەمین و لە (مـا/١)دا (٥٥)یەمین تاک و لە (مس، نع)دا (٦٢)یەمین و لە (ن)دا (٦٤)یەمین و لە (ھ)دا (٦٥)یەمین تاکە و لە (عن) (٥٦)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

صف النعال، لە (نم/١، با/١)دا نووسراوە (صف نعال) لەنگە.

صف النعال، لە (ف)دانووسراوە (صف نعال) دیسان لەنگە

صف النعال، لە (عن)دانووسراوە (جا نعال) جگە لە لەنگی وشەی (جا): جێ دووبارەیەو ناگونجێ

صف النعال لە (ق/٣)دانووسراوە:(لصق النعال) کە هەرچەندە بەسەر زاری واتا نادات و هەڵەیە بەڵام لەوەدەچێ لە هەڵەی لەبەرنووسینەوە (ئیستینساخ) کردنیەوە بێت لە جێگە (نوختە)ی (ب)ی (بە صف) دوو (نوختە) خراوەتە سەر پیتی (ف)یەکەی بووە بە (ق)، چونکە دەبێ بزانین ئەوانی کەشکۆڵنووس بوون هەموو فەقێ و مەلا و وێژەوانان بوون کە بێگومان زۆر لە باری ئابووری و شوێنی تیا ڕابواردنەوە زۆر لە تەنگ و چەڵەمەدا بوون و هەڵەی لەمە گەورەتریش لە نووسنیاندا ڕەچاو دەکرێت.

**واتای گشتی:**

(کوردی) لە ژێرەوەی بایەخ بە ئیسلامدانی ئەوەندە بەفراوانی ڕەچاو کردووە کە بارەگای پێغەمبەر ئەوەندە سیخناخ بووە لە پەیڕەویکاران، تەنانەت جێگەی (گیانان) واتە فریشتەگەل و

جنوکەکانیش نەبووەتەوە و مەگەر لە شوێنی پێڵاو داکەندندا.
بیرۆکەی ئەم تاکە هەڵبەستەش لە تاکی ئایندەدا درێژەی هەیە.
١١٤- پاسخ: (وڵام)، (وەرام).
حرف: هەرچەند (حەرف) بەسەرزاری بە واتە (پیت)ە، بەڵام وەک لە فەرهەنگەکاندا جێگیرە مەبەست لە (وتە، قسە)یە.
اهل: کەسانی، خەڵقی
آن: ئەو
مجلس: شوێنی لێ دانیشتن، نیشنگە، و مەبەستی لە کۆڕی کۆبوونەوە، (دیوان)ە.
همە: هەموو، هەمووی، گشت، گشتی، سەرپاکی
رمز: هێما، نیشانە، وتەی پڕ واتای قووڵ کە سەر سەرزاری وشە، کە بە چەشنێک بێت لە ڕواڵەتدا لەگەڵ مەبەستدا ئەوەندە نزیک نەبن لە یەکتر و بگرە هەندێ جار لێک زۆر دووربن و بەڵام ئەوەی دەگونجێ مەبەستەکەیانە.
مثال: وێنە، هاوچەشن، نموونە و، یا (مثل) کە وتەی بەجێی پێشینان (پەندی پێشینیان)ە.
(کوردی) لەم پەنجە خستنە سەر (پاسخ: وەڵام) و (حرف: وتە) و (رمز: هێما) و (مثال: نموونە) و (امثال: پەندی پێشینیان)انانەی نیشانە کردنە بۆ دەیان (ئایەت)ی قورئانی پیرۆز کە هەموو ئەم ناوەرۆکی ڕاگەیاندنەی دەگەیەنن وەک:
ئایەتی: (٨٩)ی سوورەتی (الاسراء).
ئایەتی: (٥٤)ی سوورەتی (الکهف).
ئایەتی: (٥٨)ی سوورەتی (الروم).
ئایەتی: (٢٧)ی سوورەتی (الزمر).
ئایەتی: (١٧)ی سوورەتی (الرعد).
ئایەتی (٢٥)ی سوورەتی (ابراهیم)و... هتد
کە بە چاو پیاخشاندنیان مەبەستەکەی (کوردی) و ناوەرۆکی ئەم تاکە هەڵبەستەی ڕوونتر دەبنەوە.
(کوردی) ئەو (ڕەمز) و (مثال) انەی بە (می بینم) ڕاگەیاندوون.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی (جم)دا نییە و ئەم تاکە لەم (حەوت بەند)ەدا (١١٤)یەمین و لەم (بەندی پێنجەم)ەشدا لە (صا)دا (٢٨)یەمین تاک و لە (ف)دا (٣٠)یەمین و لە (گل/٣)دا (٣٣)یەمین و لە (حم، ط)دا (٣٦)یەمین و لە (ج، سجا)دا (٣٨)یەمین تاک و لە (با/١، نم/١)دا (٣٩)یەمین تاک و لە (مع)دا (٤٥)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٤٩)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٥٢)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٣)یەمین و لە (گل/٦)دا (٥٥)یەمین و لە (ما/١)دا (٥٦)یەمین و لە (عن)دا (٥٧)یەمین تاک و لە (مس، نع)دا (٦٣)یەمین و لە (ن)دا (٦٥) و لە (ه)دا (٦٦)یەمین تاکە.

**جیاوازی:**

حرف، له (ط، ص)دا نووسراو (حرف و) ئەمیش ناگونجێ.

پاسخ و حرف له (عن) نووسراوە: (گفت و گوهای) ئەمیش دەگونجێ.

مثال له (مک، ط، ج)دا نووسراوە (وصال).

**واتا گشتی:**

دوا بەدوای تاکی پێشوو (کوردی) لەو کۆبوونەوە یەکگرتنە ئاینییە بە دواوە، لە پڕ لە بابەتی (رەمزی) و میثالئامێزی پێناسە کردووە کە لە تاکە هەڵبەستی دواییشدا هەر لەسەر ئەم یەکگرتن و کۆبوونەوەیە دەدوێ.

١١٥- درس: وانە و مەبەست لە خوێندن فێربوونە لە ئیسلامەتیدا

بحث: لێکۆڵینەوە، بە دواداچوون، تۆژینەوە.

بیان: ڕوونکردنەوە، دەرخستن، ئاشکراکردن.

آن: ئەو

مکتب: قوتابخانە، (کوردی) ئاینی ئیسلام بە (قوتابخانەی پێغەمبەر) پێناسە کردووە. چی پێتی و ڕواڵەتی ئەو قوتابخانەیەدا لە مزگەوتەکانی وڵاتە ئیسلامییەکان بوون لە پلەی زانکۆی زۆر بەرزدا.

لە نیو باڵی دووەمدا ڕوونتر کراوەتەوە کە؛

عاری از: مەبەستی لەوەیە کە ئەو قوتابخانەیە ڕووتکراوەیە (عاریە)یە واتە ناتەواوی پێوەی نییە.

قیل و قال می بینم: واتە لەو قوتابخانەیەدا هەرچی واتە و لێکۆڵینەوەی ڕوونکردنەوەکانی هەن هەموویان دوورن لەوەوە کە هەرچی وشکەڕنییان بە دواوە بکرێ و خەڵکی لێیان بکەونە لەسەر دواندن و ئەم بڵێ: (قیل) و ئەوی تریان بڵێت (فلان، یا فیسارە کەس گوتوویە – چونکە ئەوەندە قوتابخانەکە ڕێکوپێک و تەواوە، بێ ناتەواوییە. کە (کوردی) بەڕاشکاوی وتوویە: ئەمەی لە قوتابخانەیەوە دەرچوو هەمووی بە (قیل و قال): ئەم گوتی و کوتراوەو، ئەویش و کوتی هەڵناگری ئەوەندە ئەو قوتابخانە تەواو دەبینم.

کە قوتابخانەی (ئیسلامەتی)یە؛ چونکە بناخەکەی لەسەر زانیاری و دەقی ئایەتەکانی قورئان و قورئانیش فەرموودەی خوای مەزنەو فەرموودەی ئەویش جێگرە و بڕاوەتەوە ئیتر سێ و دوو هەڵناگرێت بۆ (کوردی) بێ قیل و قالی دیتووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە کە (١١٥)یەمین تاکی ئەم (حەوت بەند)ەیە و (١٧)یەمین تاکی ئەم بەندی پێنجەمەیە.

لەسەرچاوەکانیشدا شوێنی هەر تاکێک بەم چەشنەیە:

ئەم تاکە لە (صا، جم) دا نییە و، دەبێ ئەوە بەبیردا بهێنمەوە ئەم بەندی پێنجەمە هەر لە یەکەمین تاکیەوە هەتا کۆتایی، وەک لە (جم) دانەبوو، هەروەها لەم تاکەیەی دوایشەوە لە

(جم)دا نییە.

جگە لەوە لەم تاکەیشەوە هەتا کۆتایی هەر (حەوت بەند)ەکە لە سەرچاوەی (صاد)دا نییە و، لەم تاکە هەڵبەستە و لە کەشکۆڵەکەی چەندین پەڕەی پەڕیون.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ف)دا (٣١)یەمین تاکە و لە (ق/٣)دا (٣٤)یەمین و لە (حم/٢، ط، مک)دا (٣٧)یەمین و لە (ج، سجا)دا (٣٩)یەمین و لە (با/١، نم/١)دا (٤٠)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٠)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٥٣)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٤)یەمین و لە (گل/٦)دا (٥٦)یەمین و لە (ما/١)دا (٥٧)یەمین و لە (عن)دا (٥٨)یەمین و لە (مس، نع)دا (٦٤)یەمین و لە (ن)دا (٦٦)یەمین و لە (مع) (٤٦)یەمین و لە (ه)دا (٦٧)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

آن، لە (مک، ط، ق،/ ٣)دا نووسراوە (این) و چونکە باسەکە لە (ڕابووردن) دواوە بۆیە وشەی (آن)ەکە کە بەواتە (ئەو)، ڕاستترە لە وشەیی لە واتە (این) و چونکە باسە لە ئێستادا نییە تا وشەی (این)ی بۆ بگونجێت.

**واتای گشتی:**

دوابەدوای تاکی پێشوو (کوردی) درێژەی بە باسەکە داوە لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەیدا لێرەدا (مجلس)ەکەی بە (قوتابخانە) ڕاگەیاندووە کە مەبەست لە خوێندنی مزگەوت و لە ئاینی ئیسلامە وەک قوتابخانەیەکی مرۆڤ فێرکردن و فەرموویەتی.

هەرچی واتە لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەی ئەو قوتابخانەیە هەیە هەموویان بە جارێ سێ و دوو هەڵناگرن، ئەوەندە تەواو و زانیارانە و بابەتییانەن.

هەروەک لە وشەی (درس) مەبەست (قورئانی پیرۆز) و لە وشەی (بحث)ەکەش مەبەستی لە حەدیثە جۆراوجۆرەکانی خودی پێغەمبەر و مەبەست لە (بیان)ەکەش کردەوەکانی خودی پێغەمبەرە لە ئاینەکەدا کە بە (سوننە) ناو دەبرێن و کردنیان لەلایەن ئیسلامەکانەوە وەک پێویستی (فرض)ێکی ئاینی وەهان کە لەو قوتابخانەیەدا بە (مرۆڤی) ڕاگەیاندووە، نەک بە تەنیا (عەرەب).

١١٦- حل اشکال: ساغکردنەوەی گیروگرفتەکان.

حەلل: ئەم وشەیە ئەگەرچی لە فەرهەنگە عەرەبییەکاندا بە وشەیەکی (عەرەبی) دانراوە بەڵام یەکێکە لەو، وشەگەلەی لە (هەڵهێنان)ی کوردییەوە وەرگیراوە.

ئیشکال و: گیروگرفتەکان و؛

رمز آن استاد: هێمایەکانی ئەو ئوستادە – مەبەستی لەوەیە کە ساغکردنەوە (هەڵهێنانی گیروگرفتەکان و هێمایەکانی ئەم ئاینە کە ئەو مامۆستایە کە خودی پێغەمبەری ئیسلام – د.خ ئەو گیروگرفت و دەقە هێمایی (رمزی)یەیانە لای ئەو مامۆستایەوە کە خودی (پێغەمبەرە)وە ئەوەندە ساغکراونەتەوە ئەوەندە بە پوختەیی بە هەمووانی ڕاگەیاندووە کە ئیتر سێ و دوویان تیادا نەمێنێ و کەس بەلایەوە وەک مەتەڵێکی هەڵنەهێنراو نەبێ و هەمووان تێی گەیوون وەک

(کوردی) فەرموویەتی:

بی جواب و سوآل می بینم: ئەو ساغکردنەوە پڕبەپڕە بەڕادەیەک کە ئیتر پێویستی بە پرسیار لەسەرکردن و وەڵامدانەوەی تر دەبێت.

ئەم تاکە هەڵبەستەکە بەپێی ئەوەندە چارەیەی لەبەر دەستدان، دەبێتە تاکی (١١٦)یەمین لەم حەوت بەندەدا و تاکی (١٨)یەمینی ئەم بەندی پێنجەمینە.

شوێنی هەریەکێ لە تاکەکانی و ژمارەیان بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە هەڵبەستە و لە هەتا کوتایی ئەم بەندی پێنجەمەیش لە (جم)دا نییە و هەروەها هەتا کۆتاییی ئەم (حەوت بەند)یش دیسانەوە لە (صا)دا نییە و لە (ف)دا (٣٢)یەمین تاکە و لە (ت/٣)دا (٣٥)یەمین و لە (حم، ط، مک)دا (٣٨)یەمین و لە (ج، سجا)دا (٤٠)یەمین و لە (با/١، نم/١)دا (٤١)یەمین و لە (مع)دا (٤٧)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥١)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٥٤)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٥)یەمین تاک و لە (ما/١)دا (٥٨)یەمین و لە (گل/٦) و (٥٧)یەمین و لە (عن)دا (٥٩)یەمین و لە (مس، نع)دا (٦٥)یەمین و لە (ن)دا (٦٧)یەمین و لە (هـ)دا (٦٨)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

آن لە (نم/١، با/١ گل/٣، /١)دا نووسراوە (این) کە لە رووی دەستووری زمانییەوە ڕاست نییە چونکە باسەکە لە ڕابوردووە کە وشەی (آن) واتە ئەو هەڵدەگرێت نەک (این).

**واتای گشتی:**

دوابەدوای بیری تاکی پێشوو لێرەشدا درێژەی پێ دراوە کە ساغکردنەوە و لێکدانەوەی (ڕمز)ەکانی ئەم ئاینە لەلایەن مامۆستایەکەیەوە کە خودی پێغەمبەری ئیسلام - د.خ - و پێشەوا ئاینییە زاناکانەوە ئەوەندە بەپوختەیی و بەتەواوی ڕاگەیانراوە تەنانەت ئیتر سێ و دووی تیا نەماوەتەوە پێویستی بە پرسیاری تر لەسەرکردن و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە نەماوە بە ڕادەیەک کە لە تاکە هەڵبەستی ئایندەدا ئەم (پێویست بە پرسیارکردن و وەڵام لەسەر گرتنەوە نەماوە)یە بە وردتری ڕاگەیەنراوە.

١١٧- طوطی نطق را: تووتیی نوطق.

(کوردی) بۆ پیتر سووربوون لەسەر ئەوەی کە ئەوی لە تاکی پێشوودا ڕای گەیاندووە کە ئەوەندە دەقەکانی ئاینی ئیسلام ڕوون و ئاشکران کە پرسیار لەسەرکردن و وەڵامدانەوەیان ناوێت، لێرەدا هەر لەسەر ئەو (پێدان)ە کە نەک هەر تووتی بەشکو تووتی ئاسایانەی سروشتی مرۆڤیش لەتوانایی لە ڕادەبەدەر بۆ فێربوونی چەند ڕستەیەک بەشکو بۆ فڕین چەندین زمان و ئایەت و سروشتی توانایی گفتوگۆکردن وەک تووتییەکەی پشت پەردەی هەیە (کوردی) ئاوەهایی دیتووە کە ئەم هەڵبەستەی پێ دەربڕیوە:

لال می بینم: لاڵ دەبینم، واتە ئەو تووتیی نوتقە لاڵ دەبینم، چونکە، لە تاکی (١١٦)دا وەهای هەموو شتی بە ڕەوانی و ڕاشکاوی و ڕوونکردنەوەی ڕاگەیاندوە کە ئیتر تووتیی هاتنە زمان

وەک لاڵە پرسیاری پێ نەماوە و. و، هەموو شتێکی زانیوە ئیتر بێتە دەنگی چی و وەک لاڵ (کوردی) ڕەچاوی کردووە.
در آن محضر: لەو شوێنی تیا ئامادەبوونەدا
ئەم بابەتی لە (تووتی) دواندنە بەهەزارەها جۆر و شێوە و واتا و بار لە هەڵبەستی هۆنەرانمان و هۆنەرانی وڵاتە ئیسلامییەکاندا هاتووە لەوانە ئەمەی ئێرەی (کوردی)یە کە جاری تریش لەم بارەیەوە دواوە وەکو لە پیرانم بیستووە کە چەند پاشایەکی بابان تووتییان پەیاکردووە (کوردی) بۆی فێرە دەربڕینی هەندێ ڕستە کردوون و گوایە لەم پسپۆڕێتی تووتی فێرکردنەوەش وەک لە مۆسیقا و گەردووناسی (فەلەک)یشدا پسپۆر بووە سەرەڕای شارەزایی لە پەروەرد و فێرکردنی منالدا و لە وێژەی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکیشدا و هەر بۆیە چەند ساڵ منالەکانی شای ئێرانی فێرە، نووسین کردوون.
ئەم بابەتانەی ژیانی (کوردی) پێویستییان بە لەسەر ڕۆیشتن و بەدواداچوون لێ دواننی دوورودرێژ هەیە، لەسەر چەندین ئاستێکی پلەی خوێندەواری.
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی سەرچاوەکانی لەم حەوت بەندەدا (١١٧)یەمین تاک و لەم بەندی پێنجەمەیشدا (١٩)یەمین و ژمارەی ئەم تاکە لەو سەرچاوەیانەدا بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (جم، صا)دا نییە و لە سەرچاوەی: (ف)دا (٣٣)یەمین تاکە و لە (ق/٣)دا (٣٦)یەمین و لە (حم، ط، مک)دا (٣٩)یەمین و لە (سجا، ج، نم،/١)دا (٤١)یەمین و لە (با/١)دا (٤٢)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٦)یەمین و لە (گل/٦)دا (٥٨)یەمین تاک و لە (ما/١)دا (٥٩)یەمین و لە (مس، نع)دا (٦٦)یەمین و لە (ن)دا (٦٨)یەمین و لە(ه)دا (٦٩)یەمین و لە(عن)دا (٦٠)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

محضر، لە (ف، نم، با/١، سجا، حم)دا نووسراوە (محفل) – مەحفەلیش برێتییە لە لیژنەی هەر کۆمەڵگایە (بابی – بەهائی)یەکان کە هەرچی گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و نێوان ژن و مێرد و ئابووری، ئاینی و تەندروستی پەروەردە و خوێندن و.... هتد ئەو (بەهائی)یانە بەپێی دەقی ئاینەکەیان و لە چوارچێوەی (سەدە: عصر)دا چارەسەر دەکات و پێموایە ئەم وشەیە لەم (٥) سەرچاوەیەدا دەسنگەیەتی و کاریگەریی ئەو بەهائییانە و سەرچاوەکانیانەوە پەڕیوەتە ناو ئەم (٥) نوسخەیەوە بەڵام لە (١٧) سەرچاوەی تری ئەم تاکە هەڵبەستەدا وشەی (محضر) نووسراوە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) دوابەدوای تاکەکانی بەر لەم تاکەی سەرەوەو بۆ جێگیرکردنی فەرموودەکانی خۆی ئەو تاکە هەڵبەستانەدا و بگرە لە چەندین تاکە هەڵبەستی تریشدا هەر پێی لەسەر ئەو جێگرکاری بەخۆیدا گرتووە، لێرەدا فەرموویەتی.
تووتیی ئاخاوتن لەم گردبوونەوەیەدا لە پشتی ئاوێنەکەی تووتی فێری ئاخاوتن دەربڕینەوە

(لاڵ) دەبینم کە ڕستەیەک ئاخاوتنێک نەماوە هەمووی لە کۆبوونەوە و فێرکردن کاری مامۆستاو... هتد ڕوون کراونەتەوە کە گیروگرفت لە تێگەیشتنیاندا نەماوە لە بارەی (ئاینی ئیسلامەوە).

١١٨- طائر: کە مەبەست لەو باڵندە ئەفسانەییەیە کە لە چیرۆکە گوێ ئاگردانییە ئەفسانەییەکاندا زۆرجار ناوی هاتووە و لە تاکە (سەرەتاکانی) بەندی (دووەم)ی ئەم (حەوت بەند)ەدا زۆر بە درێژی لەم باڵندەی (سیمرغ)ە دواوم.

لێرەدا (کوردی) نیشانە بۆ ئەو (سیمرغ)ە دەکات کە لەو بەندی دووەمەدا لێی دواوە و فەرموویەتی:

ئەو (سیمرغ)ە بەو هەموو توانایی و هێزەیەوە کە نەیدەتوانی تۆزی پێی پێغەمبەر بشکێنێ و بیگاتێ لەو ڕیگەبڕینەی میعراجدا و یا لەو بەزوویی تەنینەوەی ئاینە ئیسلامییەکەیدا بە جیهاندا.

لێرەدا (کوردی) نیشانە بۆ تیژڕەویی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام و تیژڕەویی چوونە میعراج دەکات و ئەو (سمرغ)ە بەیاد دێنێتەوە کە ئەو سیمرغە ئەوا نەخۆش و دەردەدار و بێ پەڕوباڵ بووە و هەروەک لە تاکی پێشوویش لە (مەل)ی تووتی دواوە.

ئەم لە (سیمرغ) دواندنەوەی ئێرەیە مەبەست لە (سیمرغ) گومڕایەکانە کە خوا ناناسن و پەیرەویی ناکەن، ئەوەتا لە ئاستی ئاینەکەی پێغەمبەردا وەک ترازووی پەت پچڕاون لە ئاکامی ئەو (وحی) بۆ هاتنانەی پێغەمبەرەدا کە دەست بەدەست بە خەڵکی ڕادەگەیاندن وەک کەسانی (محضر) و (مجلس)ەکانی کە پێشتر دەستنیشانی کردبوون و ئەوا لێرەشدا گەڕاوەتەوە سەریان و بە کەسانی:

در آن مجلس: ئا لەو (مەجلس)ەدا.

خستە: نەخۆش و، دەردەدار.

بی پرو بال می بینم - واتە سیمرغە نەخۆشەکە من ئەم سیمرغە لێرەدا بەو گومڕایان دەزانم کە ناتوان (نەخۆش)و چی لەباردا نەبوو (بێ پەڕ و باڵن) کەوا لەو مەجلیسەدا واتە ئەو ڕێز و شکۆیەی باوەڕهێنی و خواناسەکانیانی نییە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (١١٨)یەمین تاکە و لەم بەندی پێنجەمەدا (٢٠)یەمین تاکە و ژمارەی لەسەرچاوەکاندا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە لە (جم، صا، مک، ط)دا نییە و لە (ف)دا (٣٤)یەمین تاک و لە (ق/٣)دا (٣٧)یەمین و لە (حم)دا (٤٠)یەمین و لە (ج، نم/١، سجا)دا (٤٢)یەمین تاک و لە (با/١)دا (٤٣) و لە (مع)دا (٤٩)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٣)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٥٦)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٧)یەمین و لە (گل/٦)دا (٥٩)یەمین تاک و لە (ما/١)دا (٦٠)یەمین و لە (عن)دا (٦١)یەمین و لە (مس، نع)دا (٦٧)یەمین و لە (ن)دا (٦٩)یەمین و (ه)دا (٧٠)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

خستە، لە (عن، ج)دا نووسراوە: (خستەو): ئەمیش لەنگی دەکات و پیتی (واو: و)ەکەی زۆرترە و ئەگەر بەجۆرە دەربڕێنێکی گورج و تایبەتی دەرببڕدرێن ئەو (کێش)ەکەی تیک ناچێ و لەنگ نابێ.

**واتای گشتی:**

وەک لە تاکە هەڵبەستەکانی پێشوودا (کوردی) لە پێشەوایەتیی پێغەمبەر و جێگرکردنی دەقە ئاینییەکانی ئیسلامیی، لە دڵی موسڵمانە پاکەکاندا ڕاگەیاند و ئەوانی گومڕان وەک (تووتی) کە بە لاساییکردنەوە ئیسلامەتییان کردووە، نەک لە ناخەوە بە تێگەیشتنەوە، ئەوا لێرەشدا نموونەی بە باڵندی ئەفسانەیی (خەیاڵی - وەهم) کردووە کە بەو هەموو توانایی و هێز و تیژڕەوییەیشیەوە، چونکە وەک نموونەیەکی گومڕا پیشان دراوە. لێرەدا ئەو (مەل)ی (سیمرغ) لە چاو توانایی پێغەمبەر کاریگەریی دەقە ئاینییەکاندا و لە چاو بڕوا بەهێزەکاندا، ئەو (سیمرغ)ە نەخۆش و ناتوانە و بێ پەڕوباڵە و ئەم تاکە پەیوەندی بە تاکەکانی ئایندەیشەوە هەیە.

١٩- بختی (بوخت یی) بوختیی.

بوختی: ناوی چەشنە (وشتر)ێکی (دوولوول) واتە (دوو کۆپارەیی) بە سەر گازەرای پشتییەوە کە لە (دووگ) پێک هاتوون.

ئەم جۆرە حوشترە بە قەڵافەت و لە هێزدا زۆر زەبەللاحتر و بە تواناتر و لە چاو چەشنی حۆشتر یەک (کۆپارەییەکاندا).

ڕەنگی تووکی ئەم وشترە دوو کۆپارەییانە بە تێکڕایی (سوور)ە و لە خۆراساندا هەیە.

عقل را: هی عەقل.

عەقل: ژیری، هێژایی - (کوردی) لێرەدا ئەو چەشنە وشترە بەهێز و توانایی و لە چەندین ڕووەوە خۆڕاگرەی بە (عقل: هێژایی) چواندووە کە مەبەستی لە (عقل): ژیرییەکی یەکجار بەهێزە و، ورد و قووڵ بووە ئەو ژیرییەیشی لە

در آن هاموون (دەر ئان هاموون): ئا لەو (هامون)ەدا واتە ئەو ژیری و هێژایی (عقل)ە مەزنە لەناو ئەو (هامون)ەدا.

هامون: لە ڕووی فەرهەنگییەوە، وشەی (هامون) بە واتە: دەشت، بیابان، زەمینەی پان و بەرینی چۆڵەوانی و کاکی بەکاکی و تووناو توون.

هامون: لە ڕووی مەبەست و (بابەتی)یەوە ناوی دەریاچەیەکی (سیستان)ە کە هەرچی چەم و ڕووبارەکانی ناوچەی هندستان (هیندۆکش) هەن.

ئەڕژێنە ئەو دەریاچەیەوە.

دەریاچەی (هامون) دەکەوێتە نێوان (سیستان)و (ئەفغانستان)ەوە، لەبەرئەوەیە کە بە دەریاچەی: (هیلمەند) یا: (هیندمەند) ناو دەبرێت.

هاموون: وشەیەکە بە زۆر جۆر و مەبەست و واتا لە هەڵبەستی هۆنەرانماندا هاتووە وەک ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی).

(کوردی) لەم نیو باڵی یەکەمەی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا مەبەستی ئەوەی هەبووە، کە گیاندارێکی توانا و خۆڕاگری ژیریی ناو ئەو دەشت و بیابانی (هاموون ئاسایی)دا بەو شارەزایی و توانابیەیشیەوە کە وەها زانراوە (حوشتر) بافتی ڕێگەی دووردرێژی چۆڵەوانی و بیابانی وشکە بە باری گرانەوە و خۆی لەبەر سەرماو گەرماو دووری ڕێگەو باری گران و تینوێتیدا ڕادەگرێت و، ئەمجا ئەو جۆرە حوشترە زەبەلاح و و تواناو شارەزا و خۆڕاگری ژیری (عقل)ە بە هۆی قووڵی و وردی و فراوانیی واتای دەقەکانی ئاینی ئیسلامەوە وەک حوشتری (یخ) دراو وەهایە کە (یخ)دان بریتییە لەوەی هەرکاتێ دەست هێنرایە پشت ملی حوشتردا ئیتر ئەو حوشترە خۆی بەسەرپێوە بۆ ڕاناگیرێت لەگەڵ ئەو هەموو هێزە زۆرەیش دا چۆک دادەدات.

ئەوسا بەو لەو چۆکدانەدا ئەوی سواری ئەو حوشترە چۆک دادوە بووە، بە ئاسانی لەسەری دێتە خوارێ و ئەگەر باریش بەسەر پشتی ئەو حوشترە چۆک داداوە (یخ) دراوەوە، هەبوو دیسان بە ئاسانی بارەکەی لە کۆڵ دەکرێتەوە ماندووبونەکەی ڕێگەی درێژ و باری گران و ژینگەی (سارد) یا (گەرم) یا تەپ و (تۆز) و گەردەلوول و باران و بەفر و زریان دەحەسێتەوە بەلام (کوردی) لێرەدا فەرموویەتی:

بردو زانو عقال می بینم: بەسەر (یا – بە) هەردوو ئانیشکییەوە هی حوشترە (یخ) دراوە (عِقال) واتە پەتکەی عِقال (عەگال) دەبینم.

مەبەستی (کوردی) لە وەیە کە ئەو عەقڵی بە توانای چوێنراو بە حوشتری جۆری (بُختی) هێشتا لەبەر تەواوەتی تێگەیشتنی دەقە پیرۆزەکانی ئاینی ئیسلامدا کۆڵەو بە تەواوی تێی ناگات ئەوەندە قووڵ و فراوان واتادارە.

هەڵسەنگاندن:

نەک بەوردی بەشکو هەر تەنیا بە سەرنجدانێکی تۆزێ شارەزایانە لە وێژەی کۆن چۆنێتیی ئەم تاکە هەڵبەستە لە دەستووری وێژەی کۆندا دەردەکەوێ (کوردی) لە ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە کە یەکێکە لە تاکە زۆر قووڵ و واتا فراوانەکان، ڕاگەیاندنی مەبەستێکی زۆری لە یەک تاکە هەڵبەستی (دە برگەیی) و (دوانزە وشەییدا) ڕاگەیاندووە کە مەبەست و واتایەکانی لەگەڵ خودی (وشە)کاندا لە رووی فەرهەنگییەوە جیاوازی و لەیەک دووریان تیایە و سەرەنجامیش چەندین واتای بەهێز و پەسەندی نزیک بەیەکتری دەدەن، ئەوەش وەستاکارییەکی کەڵە شاعیرانەی ئەوتۆی تیایە کە مەگەر هەر لە مێشک و خامەی بلیمەتێکی وەک (کوردی)ی صاحێبقرانەوە دەرچووبن.

(کوردی) بەپێی فراوانیی ئاسۆی زانیاری ڕووشنبیرییە هەمەبابەتەکەی و بە ئارەزووە زۆرەکەی لە گەڕیدەیی و بە (شارەزایی)ی لە کۆچ و بارو کاروان و ڕێگەوبانی جۆراوجۆر و

ئاگەداربوونی لە باری جوگرافیی زۆر لە وڵاتان بە کردەوە کە خۆی دیونی و یا بە خوێندنەوەی پڕوچڕی لەم بابەتەوە بۆ تێگەیشتنی ئەو شوێنانە کە ئەگەر ڕێگەی تێیان کەوت وەک نەشارەزا نەبێ لەناویاندا و پێشەکی زانیاری لەبارەیانەوە بێت، ئەمانەی لەم تاکە هەڵبەستەی داو لە زۆر لە هەڵبەستی تریا ڕاگەیاندوون کە مایەی بەگەن کردنی وێژەییانەی هەڵبەستەکانین.
دەبینرێ لەم تاکەدا وردەکارییەکی بە پێچ و پەناو (داو) لە ژێردانانەوەوە لە (حوشتر) دەدوێت کە تەنانەت لە کوردەواریدا باوە بە کەسێک کە مەلەوانی نەزانێ دەڵێن:
«ئەڵێی حوشترە، تاکو قولە پێی لە ئاوا تەڕ ببێ دەخنکێ»
کەچی ئەوەتا هەر لە یەکەم نیو باڵی ئەم تاکە هەڵبەستەدا لە حوشتر دەدوێت بەڵام لە ناو (هاموون)دا، ئەمجا حوشتر کە هەتا قولەپێی لە جۆگە ئاوێکدا تەڕ ببی دەخنکێ، ئاخۆ دەبێ ئەو حوشترە چیی بەسەرهاتبێ، لە دەریاچەیەکی وەک (هاموون)دا کە کوردی ڕای گەیاندووە.
لەمەیش سەختتر (کوردی) ئەو حوشترەی بەهەردوو ئانیشکی بە پەتکە قولفە ڕێز کراون، ئەو حوشترەی بە واتە (یخ) درابێ لە کوێدا؟! لە ناو ئاوی دەریای (هاموون)دا.
لە هەمان کاتیشدا (کوردی) ئەو (هاموون)ەی بە مەبەستی بیابانەکانی دەوروبەری دەریاچەی هاموون مەبەست بووە کە وەک دەنگی لەسەر بڵاوە کە گوایە (وشتر – کەشتی –ی چۆڵ و بیابانەو دیارە کە ئاوەها شوێنێک جێگەی لە باری کۆچ بارتیاکردنی حوشترە کە لە سروشتیی وشترەکەدا شوێنی وەها زۆرلەبارە بۆ گەشتی دووروردرێژو بەباری گرانەوەوە لە جۆرەها کەشوتووشی و خۆشیان و باوباران و بەفر... هتد و ساردی و گەرمی و بێ ئاویدا کە ئەو بارودۆخانە ڕێکی توانایی سروشتی حوشترەکەن، کە ئەم بۆچوونە زۆر ئاسایی نییە بەپێی ئەو گیاندار و شوێنەکە.
بەڵام هەر (کوردی) ئەو گیاندارە کە زۆر بە بەهێز ناسراوە و تەنانەت جۆری (بختی) کە چەندین ئەوەندەی وشتری تری یەک کۆپارەیی بەهێز و توانا و خۆڕاگر تر و لە بارابووتر وایە، (کوردی) ئەو گیاندارە زەبەللاحە بەهێز و توانە لە ڕادەبەدەر و درێژخایەنەی چواندووە بە (عەقل) و ئەمجا ئەو ژیرییە مەزنەیشی بەدەستە پاچە داناوە، لە برینی ئەو بیابانەی (هاموون ئاسا)یەدا، یا لە ڕۆچوونە ناو دەریای زانین و دۆزینەوەی بەردی بە (نرخ)ی وەک مرواری و مەرجان و.. هتد. لەو گەوهەرا ئەو ئەمجا ئەو عەقڵە مەزن و بە توانایە پەل بەستە و بێ دەرەتانی وەکو حوشتری (یخ) دراوە، لەو دەریای قوول فراوانەی واتا گرنگ و کاریگەرە پیرۆزەکانی ئیسلامیدا کە مەگەر (عەقڵی) تەنیا کەسێکی وەک پێغەمبەری ئیسلام پەیی بەوە بردووە، ئەمەندە قووڵ و توند و تۆڵ فروانە.
ئەم تاکە هەڵبەستە:
ئەم تاک هەڵبەستە کە (١١٩)یەمین تاکی ئەم جووت بەندەیەو (٢١)یەمین تاکی ئەم بەندی پێنجەمەیە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە لە دوو سەرچاوە (جم، صـا)دانی و لە (ف)دا (٣٥)یەمین تاک و لە (ق/٣)دا

(٣٨)یەمین و لە (ط، مک)دا (٤٠)تاک و لە (صم)دا (٤١)یەمین و لە (ج، ســـجـــا، ن/١)دا (٤٣)مین و لە (با/١)دا (٤٤)یەمین و لە (مع)دا (٥٠)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٤)یەمین و لە (ص، گل/٦)دا (٥٧)یەمین و لە (کل/٦)دا (٥٨)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٠)یەمین و لە (مـــــا/١)دا (٦١)یەمین و لە (عن)دا (٦٢)یەمین و لە (مس، نع)دا (٦٨)یەمین و لە (ن)دا (٧٠)یەمین و لە (ھ)دا (٧١)یەمین تاکە.

جیاوازییەکان:

بُختی، لە (ف، نم/١، حم)دا نووسراوە: (کشتی): ئەمەش بە تەواوی ڕاست نییەو ڕەنگە لەوەوە نووسەر لە کاتی لەبەر نووسینەوەدا، وشەی (هاموون) لەم تاکەدا دەریاچەیەکە و لە وشەی (بختی) نەگەیشتووە کە جۆرە حوشترێکە، بۆیە ئەم نیوەڕاست و نیوە ناڕاستییە پەیابووە؛ چونکە ئەگەر بە ڕاستی دابنێین کە وشەی (کشتی) ڕاستە بەڵام لە نیوە باڵی دووەمی ئەم تاکەدا ئەو (کشتی) هەردوو ئانیشکی بازووی بە (عقال) قوڵفە ڕێز کراوە کە، (کشتی) دوو بازووی نییە کە قوڵفە بەندی (عقال) بکرێت و لێرەدا نیوە هەڵەدەر دەچێ.

بُختی لە (ق/٣) دانووسراوە: (یفا) – ئەمیش دیارە هەڵەیە و ناگونجێ و واتا نادات و لەنگیشە و دیارە هەڵەی نووسینە.

بردو زانو – لە (عن)دا نووسراوە، (سربزانو) واتە:

سەر بەئەژنۆوە و ئەمەش ئەگەرچی بە تەواوی ڕاست و پڕ بە پڕنییە بەڵام کەمێک دەگونجێ.

برد و زانو، لە (مک، ج)دا نووســـراوە، (همـــە دوراز) ئەمـــەش دیارە واتای تەواوی نادات و شێواوە.

١٢٠– ئەم تاکە هەڵبەستەیش هەر درێژەدانە بە تاکە هەڵبەستی پێشوو تا کۆتاییی ئەم بەندی پێنجەمەیش هەر لەسەر ئەم بیرە دەڕوات.

تشنەرا: بۆ تینوو

زیر پای خضرنبی: لە ژێر پێی حەزرەتی خضر پێغەمبەردا

مەبەست لەم نیوباڵی یەکەمە ئەوەیە کە لە بن (ژێر) پێی (خدری زیندە) بۆ ئەوانەی کەو تینوون و کۆتاییی ئەم مەبەستەیشی لە نیوباڵی دووەمدا تەواو کردووە.

جارێ با ئەو (خضرنەبی = خضر پێغەمبەر).

پێناسە بکەم.

خضر: ناوی ئەو کەسەیە لێرەدا بە پێغەمبەر – د.خ ناوبراوە کە لە کوردەواریدا بە (خدر) یا (خدری زیندە)یش ناودەبەن.

ئەم پیاوە ئەگەر چی لە پەڕاوییە مێژووییەکاندا بە پیاوچاکێک ناونووس کراوە. کە پیاوێک بووە هەبووە (لە بووندا). بەڵام لە داستـــان و چیـــرۆکـــە ئەفســـانەیی و گـــوێ ئاگـــردانییـــە کوردییەکانماندا ئەوەندە لە (شوێن) و (کات) و (بار)ی جۆراوجۆری سەیر سەیردا، هاتووە کە زۆرترەکەی چووەتە شێوەی کەسەتییەکی پیری نووراني و پیاو چاکی ئەفسانەیی کەوا سەر

لێی سوڕ دەمێنێ.

ئەو پیاوە لە هەندێ سەرچاوەدا پێغەمبەر و، لە هەندێکدا بە پیاوچاکێکی نهێنیی لە کۆنەوە هەر بە زیندوویێتی ماوەتەوەی دا دەنێن و گوایە لە (ئاوی حەیات)ی خواردووەتەوە بۆیە هەرگیز نامرێ و هەمیشە زیندووەو بە زیندوویێتی و لە ژیانی نهێنی و نادیاریدا کات بەسەر دەبات و تەنیا لە کاتی فریاکەوتنیدا بۆ ڕێوبان ڕێ گومکردوواندا و لێقەوماوان و تینووی چۆلەوانی و بیابانی وشک و بێ ئاودا خۆی لەو کەسانە ئاشکرا کردووەو خستوونیەتە سەر ڕێگە و بردوونیەتە سەر کانی و ئاوی سازگارو تێنوێتییانی شکاندووەو ئەگەر خواردنیان پێ نەبووبێ تێری کردوون و ڕێگەی دووری بۆ نزیک کردوونەتەوە و فریای داماوی لێقەوماوان کەوتووەو لەناکاوێکشدا لەو کەسانە گوم بووە.

خضر: کە گوایە ئاوی زیندەگانیی نۆشیوە و جگە لەو گوایە (نووح) پێغەمبەریش وەک ئەو هەر زیندووەو نامرێ.

خضر: ناوی ئیلیاس کوری ئیلیاس بووە و لە ساڵانی ٨٨٠ - ٨٥٠ پێش زایندا ژیایەوە و هاواڵی حەزرەتی مووسا پێغەمبەریش بووە - د.خ- بە ڕاو بۆچوونی صۆفیگەران ئەو (خدر)ە پێشەوا (نەقیب)ی ئەولیایانەو هاوچەرخی ئیلیا پێغەمبەر دادەنرێ و لەناو (بەنی ئیسرائیلییەکاندا) ژیاوە و پشتگیری کردوون و یاریدەی داون لە دژی (بت) و (فیرعەون) پەرستی و ڕێگەی خواناسی و خواپەرستیی بڵاو کردووەتەوە.

هەر لەو پەراوییە ئایینیانەی وەک (قصص الأنبیاء)دا هاتووە کە بە گالیسکەیەکی ئاگرین بە فرمانی خوا هەڵکێشراویشە بۆ ئاسمان و هەروەها (ئەلیشەع) پێغەمبەریش لە پێغەرێتیدا جێگەی (خدر)ی گرتووەتەوە.

هەر لە کوردەواریدا و لەبڕوا ئاینییەکاندا زۆر لەسەر ئەو (خدر)ە ئاگاداری هەیە و ئەمەندەی بۆ ئێرە بە (بەس) ئەزانم.

چشمەء بس زلال می بینم: واتە لە ژێر پێی ئەو (خدر)ەدا یا لەو شوێنەدا کە ئەوی لێ ڕاوەستاوە (کوردی) فەرموویەتی سەرچاوەیەکی یەکجار سازگار (زلال) دەبینم:

کە مەبەستی (کوردی) لەوەیە کەسانی ئاوەهایی هەن لە بۆ ڕێگەی خواناسی و خواپەرستی و چاکەکاریدا لە کۆشانی هەمیشەییدان نەک هەر لە نێوان کەسەتییەکانی ناو کۆمەڵگایەکانی ئاینی ئیسلامدا، بەشکو تەنانەت لە گیاندارە نهێنییەکان وەک (خدر)یشدا کە لە فریاکەوتنی خدردا بۆ تینوان، شوێن پێیەکەی یا جێگەی لێ ڕاوەستانەکەی کە خۆی لەو تینووانە ئاشکرا کردووە سەرچاوەی زۆر ساز پەیابووە کە (کوردی) ڕچاوی کردووە.

بس: زۆر، یەکجار، گەلێ.

زولال: سازگار

ئەم تاکە هەڵبەستە:

ئەم تاکە هەڵبەستە بە پێی ئەوەندە سەرچاوەیەی کە دەست من کەوتوون، گەیوەتە تاکی

(١٢٠)یەمینی ئەم حەوت بەندە کە دەکاتە تاکی (٢٢)یەمین ئەم بەندی پێنجەمە و دڵنیام دەیان سەرچاوەی تر ماون کە ئەم حەوبەندەیان تیا بێ و لەسەر هەڵدانیاندا ئەم ژمارەی حەوت بەندە ژمارەی ئەم بەندی پێنجەمە زۆرتر دەبن و ڕاستکردنەوەی بەجێتریشیان تیا دەبێت کە لە تاکەکانی ئەم حەوت بەندە و (ئەوانی شێواون) ڕاستتر بکرێتەوە.

ژمارەی ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە دوو سەرچاوەی (جم، صا)دا نییەو لە (ف)دا (٣٦)یەمین و لە (ق/ ٣)دا (٣٩)یەمین تاکە و لە (ط، مک)دا (٤١)یەمین و لە (حم)دا (٤٢)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٤٤)یەمین و لە (با/١)دا (٤٥)یەمین و لە (مع)دا (٥١)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٥)یەمین تاک و لە (ص، گل/ ٥)دا (٥٨)یەمین و لە (گل/٣)دا (٥٩)یەمین لە (گل/٦)دا (٦١)یەمین و لە (ما/١)دا (٦٢)یەمین و لە (ع)دا (٦٣)یەمین و لە (مس،نع)دا (٦٩)یەمین و لە (ن)دا (٧١) و لە (ه)دا (٧٢)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

خضر نبی، لە (حم، مع)د نووسراوە (خضربنە): بنیرە ژیر خضرەوە کە (نەبی)یە کە بەشێوەی (بنی ه): بنێ، بخە، وابنی، بنێرەو....یە...

ئەمەش دەگونجێ و بەڵام لاوازە

**واتای گشتی:**

دەتوانم بڵێم بە درێژاییەکی پێویست و ئەوەندەی من تێ بگەم، ئەم تاکەی لە وشەکانیدا لێک داوەتەوە کە بە تێکڕایی بەدواداچوونی تاکەکانی پێشووەو بە کۆتاییهاتنی ئەم بەندی پێنجەمەیش کۆتایی (بیرە)و (ناوەڕۆک)ی ئەم تاکە دێت کە مەبەستی لە زۆری کەسەتییەکانی ڕێگەیی خواناسی و خواپەرستییە و نابێ کەس (بێ هیواو ) بمێنێتەوە و خوای گەورە فریادرەسانی بۆ داماوان بڕیارداوە.

١٢١- در رکاب لەوانەی کە سوارەن بە دوای سوارێکی سەرۆکیانەوەن کە لە (فارسی)دا (در رکاب)یان پێ دەڵێن و لە کوردەواریدا (دربار) و بە (سوارەی...) ناودەبرێن. لە هەمان کاتیشدا کەسێک لە کاتێکدا بیەوێ سواری ولاخ ببێت و سواربوونیش لەلای چەپی ولاخەکەوە دەبێ.

کە پێی چەپ دەنرێتە ناو ئاوزەنگی لای چەپی ولاخەکەوە کە بەزینی ولاخەکەوە شۆڕبۆتەوە و کەسێکی تر وەک ڕێزی لێگرتن لە دیوی لای ڕاستی ولاخەکەوە ئاوزەنگی لای ڕاست توند دەگرێت تاکو ئەو کەسەی کە سوار دەبێت لە کاتی سواریدا زینەکە بە هۆی قورسایی سوار بوونەکەوە بەلای سواربوونەکەو سوارەکەدا لار نەبێتەوە، ئا ئەو کەسەی کە لای ڕاستی ولاخەکەوە ئاوزەنگیی لای ڕاست دائەگری بە (دەرریکاب) واتە بە (ئاوزەنگی داگر) ناو دەبرێت.

بەڵام ئاوزەنگی بۆ کام سوار ڕاگیرێ؟؟

له وەڵامی ئەم پرسیارەدا (کوردی) فەرموویە ئاوزەنگی بۆ داگری محەمەدی خۆی، یا (محەمەدی خۆمان، یا محەمەدی خۆم) – د.خ – ئەم وەڵامە وەک ڕاستە مەبەست لە ئاوزەنگی بۆ داگرێکی کاتی سواربوونی پێغەمبەری ئیسلامە هەروەها مەبەستی لە کەسێکە کە یاریدەدەر بووە لە ڕێگەی بەهێزبوونی ئاینی ئیسلامدا وەیا مەبەستی لەوە بووە کە ئاینەکە چونکە ڕاست و چاک و بەسوودی مرۆڤ بوو، بۆیە بێکەس نەبووە و هەمیشە پشتیوانیکاری بە دواوە بووە.. وەک (کوردی) نیو باڵی یەکەمی ئەم (دەرریکاب)ەی پێ تەواوکردووە کە وەک وەڵامێک فەرموویەتی:

محمد خودرا: محەمەدی خۆمان، خۆی کە ئەو (محەمەد)ە مەبەست کە کوڕی عەبدوڵڵا و پێغەمبەری ئیسلام بووە – د.خ.

ئەم دیاریکردنی ناوی پێغەمبەرە کە بە (محەمەد) گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە کە مەبەستی لە (عەلی کوڕی ئەبی تالیبی) ئامۆزای پێغەمبەر نەبووە کە ئەم حەوت بەندەی بەسەردا هەڵداوە، چونکە (عەلی) ناوی (محەمەد) نەبووە و هەروەها دەریش دەکەوێ کە بەم دەستنیشانکردنی ناوی پێغەمبەرە بە (موحەمەد) کە مەبەست لەم حەوت بەندە هەوڵدان نەبووە بەسەر (بەهائی)دا کە بەهائی موحەمەد دای نەمەزراندووە

کە (کوردی) ئەو (محەمەد)ەی بە هی خۆم، خۆیان خۆی ناوبردووە و کە خۆی واتە (کوردی) ئیسلام بووە و لە هەڵبەستی تریدا ناشیعەیەتیی خۆی دەربڕیوە و دژی شیعە بووە بە (گێرەشێوێن)ی ناوبردووە، کەواتە مەبەستی ئەم حەوت بەندە لەو (عەلی)یە نەبوو.

هەروەک ئەوەی کە لە (ریکاب ئەو پێغەمبەرەدا بووە) واتەی سوارە و دەرباری ئەو بووە و، یا ئاوزەنگی بۆ داگری پێشەوا پێغەمبەرەکەی بووە (کوردی) ئەو کەسەی بە (بلال) دەستنیشان کردووە. کە بیلال نە سوارەی (عەلی) و نە ئاوزەنگی بۆ داگری عەلی بووە و بەشکو عەلی ئاوزەنگی بۆ داگری پێغەمبەر بووە. هەر بەم پێیە هێنانی ناوی (بلال)دا ئاشکرایە کە (بلال) ناوێک سوارە یا ئاوزەنگی بۆداگری پێشەوای (بەهائی) نەبووە و بەپێی ڕواڵەتە (هندویی)یەکەی ئەو (بلال)یش (بلال) ناوێک لە سەرێنی پێشەوایی (بەهایی)دا نەبووە ڕواڵەتی (هیندویی بیلال)ی بووبێ.

کەواتە یەکسەر حەوت بەندەکە بۆ پێغەمبەر (مەحمەد) – د.خ – و بەهۆی باڵایەتی و کەم هاوتایەتیی ئەم حەوت بەندەوە شیعەکان و بەهائییەکان هەر یەکەیان ئەم (حەوت بەند)ەی بەلای پێشەوای خۆیدا ڕاکێشاوە کە ڕاست نەبوون.

(کوردی) لە نیوەی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا هەموو ڕاستییەکی بە ڕاشکاوی دیاری کردووە کە ئەو (سوارە) یا ئاوزەنگی بۆ داگرەی پێغەمبەر کەسێک بووە ناوی بلال بووە بە (هندو) یەکیشی ناوبردووە کە فەرموویەتی.

هندویی چون بلال می بینم: واتە (هیندی ئاسا)یەکی وەک (بلال) دەبینم بەڵام،

بلال: کەسێکی هندستانی نەبووە بەشکو قولەڕشێکی (حەبەشی) و (عەبد)ێکی بە پارەکڕدرا

بووه لەلایەن (ئومــەیــە کــوڕی خــەڵەف)ەوە بە هۆی ئەوەوە ئەو بەندە (عــەبد)ە قــولەڕەشــە حەبەشییە لە سەرەتای ئیسلامەوە بوو بە ئیسلام و لەسەر ئەوە (ئومەییەی) ئاغای (خاوەنی) زۆری سزاداوە و بەڵام لە ڕێگەی بە ئیسلام بوونەکەی خۆی لای نەداوە و کە (ابوبکر صدیق) بەوەی زانیوە و سامانداریکی مەزنی ناو (قورەیشییەکان)یش بووە، ئەو (بلال)ەی بەپارە لە (ئومەییە)ی (ئاغای بلال) کریوەتەوە و ئازادی کردووە بەو ئازادکردنە ئەوەندەی تر بیروباوەری بەهێز تر بووە بە ئیسلام.

هەرگیز بیر بەلای ئەوەدا ناچێت کەوا (کوردی) نەیزانیبێ ئەوە (بلال)ە (حەبەشی) بووە چونکە هەر لە کاتی بەندێتییەوە لە ناو ئەو کۆمەڵگای قورەیشییەدا (بیلال) بە (بلال حبشی) بەناوبانگ بووە و لە نزا (دوعا) بۆ کردنەکانی هەر لەسەرێتی پێغەمبەرەوە بەناوی (هیلالی حــەبەشی)یەوە ناوبراوە بەڵام کــە (کــوردی)یە (هیندی ئاســا ناوبردووە لە ڕەشــتــاڵەیەتی ڕەنگەکەیەوە بووە کە لەوێژەی کۆندا بە تایبەتی هەڵبەستی هۆنەرانی (عارەب، فارس و تورک و کوردی)یشدا وشەی (هندو) یا (هیندی) مەبەست لە وشەی (رەش)ەو تەنانەت کە خاڵی رووی خۆشەویستەکانیان کە (ڕەشە) چواندووە بە (هندو) کەواتە لەمەوە بووە کە (کوردی) بیلالی بە (هندو) ناوبردووە نەک (حــەبەشی)و چونکە زۆریش (بیــلال بە حــەبەشی) ناوبراوە (کــوردی) ویســتــوویەتی ئەو لاســایی کــردنەوە نەکــات کــە (بلال) بە (حــەبەشی ڕابگەیەنێت و بۆیە بە (هیندو) پێناسەی کردووە.

هۆی ئەوەی کە (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەدا کە بەتایبەتی ناوی (بلال)ی هێناوەتە ئاراوە، ئەوەیە کــە دوای ئــەم تاکــە دوو تاکی دوایــی کــە پێشــەکی دوو تاکــە (فــارســی) و (عــەرەبی)یە دووبارەکــردنەوەکــەن، ئەم تاکــە ببــێــتــە ســەرەتای بانگدانــی (کــوردی) بــەر لە دوو تاکــە دووبارەکردنەوەکە.

ئەم تاکە هەڵبەستە:

ئەم تاکە لەم حەوت بەندەدا (١٢١)یەمین و (٢٣)یەمین تاکی ئەم (بەندی پێنجەم)ەیە. و شوێن و ژمارەی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەن:

ئەم تاکە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٣٧)یەمین تاک و لە (ق/٣)دا (٤٠)یەمین و لە (ط، مک)دا (٤٢)یەمین و لە (حم)دا (٤٣)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٤٥)یەمین و لە (با/١)دا (٤٦)یەمین و لە (مع)دا (٥٢)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٦)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٥٩)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٠)یەمین و لە (گل/٦)دا (٦٢)یەمین و لە (ما/١)دا (٦٣)یەمین و لە (عن)دا (٦٤)یەمین و لە (مس، نع)دا (٧٠)یەمین و لە (ن)دا (٧٢)یەمین لە (ھ)دا (٧٣)یەمین تاکە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە هەموو سەرچاوەکانیدا چونیەکە و جیاوازی لە ناوەڕۆکیاندا نییە.

**واتای گشتی:**

لە ڕووی بێکەس نەبوونی ئیسلامەوە و دوابەدوای ناوەڕۆکی تاکە هەڵبەستەکانی پێشوو،

لێرەدا ئاینەکەی بەکەسدا ناو بردووە (بیلالی حەبەشی)ی بە پێشخزمەت ئاوزەنگی بۆ داگری پێغەمبەر داناوە.
ئەو بیلالەی کە یەکەم بانگدەری ئیسلام بووە، لێرەشدا بانگی دوو تاکە هەڵبەستەکەی کۆتایی ئەم بەندی پێنجەمەی پێ هەڵداوە گەلێ واتای تر هەڵدەگرێ کە لە شوێنی وشەکاندا بە درێژی لێکم داونەتەوە.
١٢٢- قطع آن راه: بڕینی ئەو ڕێگەیە، کە مەبەستی لە ڕێگەی ئیسلامەتییە.
جز: جگە، بێجگە، بەبێ، جگە لە
بە لطف: بە چاودێری، بەدڵسۆزیی، بە نەوازشی، بەلاواندنەوە، بەڕێنومایی.
دلیل: دەلیل، ڕێنومایی، ڕەهبەر کە مەبەست لە (دلیل) خودی پێغەمبەرەکەیە کە لە تاکی پێشوودا ناوبردووە بەپێشەوای ئاینی دروستە.
رهروانرا: ڕێبوارەکان، بۆ ڕێبوارەکان لە بڕینی ئەو ڕێگایەدا، بەهۆی ئەو رەهبەرانەوە...
محال می بینم: بەشتێکی مەحال، واتە بە کارێکی نەکردنی، یالەکردن نەهاتووی دەبینم، دادەنێم، دەزانم..
واتە بڕینی ڕێگە کە بە نەگونجاو دەبینم ئەگەر ڕێنوما (ڕەهبەر) نەبێ.
ئەم تاکە:
ئەم تاکە لە حەوت بەندەکەدا (١٢٢)یەمین و لەم بەندی پێنجەمەدا (٢٤)یەمین تاکە.
ئەم تاکە لە سەرچاوەکاندا ژمارە و شوێنی بەم چەشنەیە:
ئەم تاکە لە سەرچاوەی (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٣٨)یەمین و لە (ق/٣)دا (٤١)یەمین تاک و لە (ط، مک)دا (٤٣)یەمین و لە (حم)دا (٤٤)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٤٦)یەمین و لە (با/١)دا (٤٧)یەمین و لە (مع)دا (٥٣)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٧)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦٠)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦١)یەمین و لە (گل/٦)دا (٦٣)یەمین و لە (با/١)دا (٦٤)یەمین و لە (عن)دا (٦٥)یەمین لە (مس، نع)دا (٧١)یەمین و لە (ن)دا (٧٣)یەمین و لە (ه)دا (٧٤)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

آن، لە (مع، ط، ج، نم/ ١، سجا، حم)دا نووسراوە (این): ئەمیش لە ڕووی دەستووری زمانییەوە ناگونجێ، چونکە (این)، بوو (ئێستەکی: حاضر)ەو (آن) کە بۆ (ئەو)ی ڕابردووە کە باسەکەیش باس لە ڕابردووە.
جز: لە (نم/١)دا نووسراوە (خیر) و ئەمیش واتا نادات و هەڵەیە.

**واتای گشتی:**

بڕینی ڕێگەکی گرنگی وەک ئیسلامەتی بەبێ نەوازش و چاودێریی کەسێکی پێغەمبەر ئاسایی (کوردی) گوتوویەتی کە بەکارێکی لە کردنی (محال)ی دەبینم وەک بۆ فێربوونی هەر شتێک مامۆستا پێویستە بە گرتنی ئیسلامەتییەکی دروست و پاک ئەو (ڕەهبەر) یا (ڕێنوما)

شارەزایە پێویستە کە لە شوێنی تردا (کوردی) ئەو شارەزایەی بە (مامۆستا) ناوبردووە.
١٢٣- قدسیان: پاکژ و پیرۆزەکان - کە مەبەست لە فریشتەکان و لە گیانی پاکی پێغەمبەران و لە گیانی پیاوچاکانە کە خوا لە ئاسماندا جێگەی کردوونەتەوە، بەپێی بڕوای ئاینی ئیسلام.
(کوردی) فەرموویەتی ئەو پاکژ و پیرۆز (قودسیان)انە لە؛
برفراز: لە سەر بڵندایی.
١- بەرزی، بڵندی.
٢- گردبوونەوە، یەکبوون، (الاتحاد).
٣- تەنیشت، نزیک، کەنار، لەلای. بەپاڵ.
علیین: بەرزاییییەکان. مەبەست لە بە هەشتی بەرین یا بڵندترین شوێن لە بەهەشتدا یا شکۆدارترین جێگە لە بەهەشتدا یا بەرز و باڵاترین پایەی بە هەشتییەکانە کە بە لای صۆفیگەرانەوە (بەهەشتی مەلەکووتی ئەعلا) یا (ئەعلا علیین)یشی پێ دەگوترێت.
ئەمەش نیشانەیە بۆ ئایەتی ژمارە (١٨) لە سوورەتی (المطففین)ی قورئانی پیرۆز. کە لە شاری مەدینە هاتووەتە خوارێ و ئەمە دەقەکەیەتی:
«كَلاّ إنّ كِتَبَ ٱلأبرار لَفي عِليينَ».
واتە، پاک و پیرۆزەکان لە (عیلیین)ن لە ئاسمانی هەرەباڵا (حەوتەمین)دان.
ذکر شان: زیکری ئەوان - لێرەدا دوو واتا دەدات یەکێکیان : بیرکردنەوە یا ناوبردنی ئەو (عیلیین)انە زیکرکردنی خودی ئەو (عیلیین)انە کە:
ذکر: ناو بردنی بەدەم دەربڕینی (ناو) وە (ڕواڵەت)ەکانی زاتی خوای گەورە و خواستی لێبووردنی خوا لە گوناهیان کە ئەویش جۆرە تۆبەکردنێکە بەبۆچوونی دەروێش و مریدی ئەو صۆفیگەرانەوە بە پێی ڕەوشتی (طەریقەت)ەکەیان کە ئەمان لەسەر (زەوی) ئەو (ذکر)ە دەکەن و (عیلیین)ەکانیش لە ئاسمان (ذکر)ی خۆیان ئەکەن، لەسەر ئەم (ذکر) کردنانە لە قورئانی پیرۆزدا بە دەیان ئایەت هاتوون.
(کوردی) لە نیوەی دووەمی ئەم باڵی دووەمەدا هەم مەبەستەکەی خۆی لەم تاکە هەڵبەستە و تاکە هەڵبەستی پێشوودا ئاشکرا دەکات کەوا (ذکر)ی ئەو (قدسیان) و بە ئاسمانەوەو (ذکر)یە ئیسلامەکان و پەیڕەویکارانی (طەریقەت)ەکان هەموو بریتین لەوەی کە:
این مقال می بینم: ئەم مەقالە دەبینم.
این: ئەم، ئائەم.
مقال: گوتە، گوتن، وتن، کە مەبەستی لەو دوو تاکە هەڵبەستەی یەکەمیان (فارسی) و دووەمیان (عەرەبی)یەو لە دوای هەریەکێ لە حەوت بەندەکەوە دووپاتە و سێ پاتە و شەش پاتە و حەوت پاتە دەکرێتەوە لە دواوە هەردوو تاکەکە پێشکەش دەکەمەوە.
ئەم تاکە هەڵبەستە:
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی ئەوەندە سەرچاوەیەی دەستم کەوتوون ژمارەکەی دەبێتە (١٢٣)ەمین

تاکی ئەم حەوت و بەندەی (٢٥)یەمین واتە دووتاکی ئەم بەندە پێنجەمینە.
لە سەرچاوەکانیشدا ژمارەی ئەم تاکە بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (جم، صا)دا نییە و(ف)دا (٣٩)یەمین تاک و لە (ق/٣)دا (٤٢)یەمین و لە (ط)دا (٤٤)یەمین و لە (حم)دا (٤٥)یەمین و لە (ج، ســـجـــا، نم/١)دا (٤٧)یەمین تاک و لە (یا/١)دا (٤٨)یەمین و لە (مک)دا (٤٦)یەمین و لە (مع)دا (٥٤)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٨)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦١)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٢)یەمین و لە (گل/٦)دا (٦٤)یەمین و لە (ما/١)دا (٦٥)یەمین تاک و لە (عن)دا (٦٦)یەمین و لە (مس، نع)دا (٧٢)یەمین و لە (ن)دا (٧٤)یەمین و لە (ﻫ)دا (٧٥)یەمین تاکە لە هەمــوو ســەرچاوەکانیشدا چونکە و جیاوازی لە ناوەڕۆکیاندا نییە.

**واتای گشتی:**

گـیـانە پاک و پیــرۆزەکـان لە شــوێنەکــانی (بەهەشت)دا و پەیڕەویکارانی ئیـســلام و (طەریقـەت)ەکـان هەمــوو لە چەشنە (ذکـر) کـردنێکدان کـە ئـەویش ئەم گـۆشـەی دوو تـاکی (دووبارەکردنەوەی)ی ئەم بەندی پێنجەمەو هەموو بەندەکانی ئەم حەوت بەندەیە ئەویش:

کـــای دمت نغـمــةء سـرافـیلی
مــــورد واردات جــــبـــــریلی
أنتَ شـــمسَ الْهــدی ونورَ الحَق
أظهِـــرِ الحقَّ یا ظُهــــورَ الحق

## بەندی شەشەم

١٢٥- وقت عشق است و صبح موسم دی
خیز جانا بیار بربط و نی
١٢٦- از خراباتیان مست، طلب
جام جمشید و تخت و افسر کی
١٢٧- ترک تاتار و بادهء خلر
روسیەم، گر دهم بەملکت ری
١٢٨- نخوری بر ز نخل آزادت
نبری تا نهال کام از پی
١٢٩- نکنی تا طواف محمل لیل
نکشی تا تو زهر نیش از حی
١٣٠- ندهندت به بزم مستان جای
تا چو یاران نغلطی اندر قی
١٣١- پی کن اسب خیال رجعت را
تا بری سوی منزل او پی
١٣٢- پی ما گمرهان اگر گیری
پی بری سوی راه رشد از غی
١٣٣- ای پسر تا کی از پدر گوئی
جود (حاتم) چه می کند به(عدی)
١٣٤- مستی و خواب و بیخودی تاچند
هستی و عجب و سرکشی تا کی
١٣٥- بشنو این پند من از سمع قبول
گر زیان دیدی (الضَمانُ عَلَيْ)
١٣٦- شه ظهور الحق، از دو عالم دان
نائب و، فخر خاندان لؤی

۱۳۷- چون بساط عطایش شد مبسوط
گشت فرش سخای حاتم طی
۱۳۸- چند نقشرا نهان بەدل دارم
سوختم صبر عاشقی تاکی
۱۳۹- طور؛ از جلوه، من زحال خضوع
آن سیه گشت و، من به رنگ بی
۱٤۰- لیک؛ امید لطف: (وا) گفتند
رحمت هردو عالم است هی هی
۱٤۱- کف زنان رقص کن، مقام بخوان
خیز و مژده فرمود عیسا پی
۱٤۲- نی عجب؛ مست دست او هستم
ساقی او، ساز ازو، زخود را می
۱٤۳- ای خوشا، وقت آنکه حاصل کرد
دوستی باسگان درگه وی
۱٤٤- همه ذرات جسم و جان پر جوش
از پی ذکر اوست پی درپی
۱٤٥- خوانم این قصه برسر بازار
فاش گویم بەنغمەء دف و نی

---

۱۲٥- وقت عشق است: کاتی ئەڤینە.
عشق: ئەڤین، دڵداری.
صبح موسم دی: بەیانیی وەرزی زستانە.
موسم: وەرز، یەکێک لە چوار بەش (وەرز)ە کە ساڵ.
دی: زستان، زۆسان، زڤستان هەروەها وشەی دەی، بەواتەی مانگی دەیەمی ساڵ ڕۆژی واتە مانگی (کانوونی یەکەم) واتە مانگی (بەفرانباری)ی کوردی بەپێی ساڵنامەی ئاریانی یا سروشتی کە ڕۆژی نەورۆز ڕێکەوتی یەکەم ڕۆژی سەری ساڵ دەکات (۲۱ مارت) مانگی ئادار ئەوە بوو بەندی (پێنجەم) لە بەهارەوە دەستی پێ کردبوو، ئەو لێرەدا گەیوەتەوە کۆتاییی زستان.

(کوردی) له کاتی دانانی ئەم (بەندی شەشەم)دا له سەرەتای وەرزی زستاندا بووه، بەپێی سروشت و کەش تووشیی ئەو (وەرز)ه، دەرودەشتکردن کەم دەبێتەوه و بەزۆری خەڵکی له ناو ماڵدا دەمێننەوه و تەنانەت، جۆرەهای کارکردنیش یا دەوەستێنرێن یا کەم دەبنەوه و تەنانەت ئاژەڵیش لەبەر با و باران و بەفر و تەرزه و زوقم بەندان، نابرێنە دەرەوه بۆ لەوەڕاندن لە ناو ماڵدا ئاڵفیان دەدرێتێ.

له بارودۆخێکی ئاوەهادا، خەڵکی له ماڵەوه، دەرەتانی زۆرتری خواناسی و (ذکر) و بەجێ گەیاندنی گەلێ له (مەراسیمە تایبەتییەکانیان دەبێت).

(کوردی) ئەو کاتی بەدەم (هەڕەت)ی خواناسی (عەشق) داناوه و دوو هۆی ئەوەیشی ئاشکرا کردووه؛ چونکه (سات)ەکه، وەرز (مەوسیم)ی زستان بووه.

بۆیه له نێو باڵی دووەمی ئەم تاکه هەڵبەستەدا (کوردی) کەوتووەته خۆی و فەرموویەتی:

خیز جانا: هەڵسە گیانەکەم

بەڵام بۆچی هەڵبستێت؟

له وڵامی ئەو پرسیارەدا (کوردی) هەر خۆی فەرموویەتی:

بیار بربط و نی: بهێنه بەربەط و نەی.

بربط: بەربەت جۆره ئامێرێکی مۆسیقای (تار = تەل)یه وەک تار و عوود کە له هەڵبەستە گرینگەکەی (باسی مۆسیقا و گۆرانی و سووڕ و سەما)ی کوردیدا بەدرێژی لەو جۆره ئامێرانه دواوم.

نی: بلوێر، قامیش که ئەمیش ئامێرێکی تری مۆسیقیی فوو پیاکردنه و لەمیش بەدرێژی دواوم که (شمشاڵ)ی پێ دەگوترێ.

(کوردی) لەو کاتەدا وشەی (دەی) کە بەواتە زستانە، بەیاد کردووەتەوه کە (دەی) بەواتە (ئادەی، گورج بە) و هەروەها (دەی) بەواتەی کردگار: (خوای خالیق) کە ئەمە بەلای (ئاری)یە زەردەشتییەکانیانەوه، ڕواڵەتێکی ئاهۆرامزدا: (خوای مەزن) بووه (واته زستان)، و بۆیه هەر ساڵێک له ڕۆژی (نۆ = ٩)ی ئەم مانگی سەرەتای زستانەدا، ئەو (ئاری)یانە کردوویانەتە (جەژنی دەی).

(کوردی) کە فەرموویەتی: جانا (گیانه) ئەم مەبەستی له گیانی خۆی و هەم مەبەستی له هەر دۆستێکی خۆشەویستی ئیسلامیی خۆی بووه و بانگی وریابوونەوەی بۆ خواپەرستی (عەشقی خوایی)ی لێ کردووه.

بەپێویستی نازانم بگەڕێمەوه سەر دواتاکی بەندی پێنجەم (پێشوو) کە لەمەڕ (ذیکر)ەوه بوو، (ذیکر)یش بریتییه له دەربڕینی زۆر دەق وەک:

(الله)، (الله اکبر)، (لا اله الا الله)، (سبحان الله)، (الحمدلله) و ... هتد.

که سەرنج بدرێ له دەربڕینی ئەم دەقه ناوبراوانە، جۆره سازێکی ئاهەنگئامێزی مۆسیقییان هەیه له دەنگی گڕ و نەرم و باریکیاندا کە بەپێی خۆیان دەنگە بەگرمەیییەکانیان وەک دەنگی

گڕی (عوود) و دەنگە نەرم و باریکەکانیان وەک دەنگی (نی: شمشاڵ: بلوێر) دێنە بەرگوێ و ئەوەتا (کوردی) ناوی ئەو دوو ئامێرە مۆسیقییەی بەیاد کردوونەتەوە و لە گیانەکەی خواستووە کە ئەو دوو جۆرە ئامێرەی بۆ بهێنێ کە لە لێدانیاندا، هاوئاهەنگی لە نێوان دەنگی زیکرەکان و مۆسیقییەکەدا هەن، بەدەنگی نێرینەی (گڕ) و دەنگی مێینەی باریکی لەرزە لەرزی زۆر و گورجەوە. تەریقەتە ئاینییەکانیش ڕێگەی ئەم یانە و ئامێری مۆسیقییان داوە کە لە مەراسیمەکانیاندا بەکاربهێنرێن.

(کوردی)یش هەر لەسەر ئەم پێودانە لەو کات (عەشق) وەرزی خواناسیدا پەنای بۆ بەکارهێنانی ئەو ئامێرە مۆسیقییانەی خوابردووە و نەخوازەلا (کوردی) خۆی مامۆستای (گۆرانی) و (مۆسیقا) بووە لە زانکۆی سوپایی (نیظام)ی (سولەیمانی)دا و ناشێ دەنگیشی خۆش نەبووبێت. ئەم تاکە:

ئەم تاکە (١٢٥)یەمین تاکە هەڵبەستی ئەم حەوت بەندە و یەکەمین تاکی ئەم بەندی شەشەمەیە بەپێی ئەو سەرچاوەیەی کە لەسەر ئەم تاکە بەتایبەتی و لەسەر هەر حەوت بەندەکە بەگشتی کە دەستم کەوتوون.

ژمارەی ئەم تاکە و، شوێنی لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

لە سەرچاوەکانی: (جم، صا)دا ئەم تاکە هەڵبەستە نییە و لە (ف)دا (٤٠)یەمین تاک و لە (ق، ٣)دا (٤٣)یەمین و لە (ط)دا (٤٥)یەمین و لە (حم)دا (٤٦)یەمین و لە (ج، سـجـاب/ نم/١)دا (٤٨)ەمین و لە (با/١)دا (٤٩)یەمین و لە (مح)دا (٥٥)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٥٩)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦٢)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٣)یەمین و لە (گل/٦)دا (٦٥)یەمین و لە (ما/١)دا (٦٦)یەمین و لە (عن)دا (٦٧)یەمین و لە (من، ن)دا (٧٣)یەمین و لە (ن)دا (٧٥)یەمین و لە (ه)دا (٧٦)یەمین تاکە و لە (مک)دا (٤٧)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

وقت عشق است وصبح موسم دی لە (ط)دا نووسراوە: (وقت صبح است صبح موسم دی)، دیارە ئەمە هەڵەی کاتی نووسینەوەیە، کە کە (صبح)ی یەکەم بەهەڵە جێگەی (عشق) نووسراوە.

صبح موسم دی، لە (گل/٣، عن، نم/١)دا نووسراوە: (صُبْح عیسی پی) کە ئەمەش هەڵەی نووسین و لەبەر نووسینەوەی بەهەڵەیە.

**واتای گشتی:**

کاتی عەشق بازی و دڵداری کردنە؛ چونکە بەرەبەیانی وەرزی زستان و دەمی پەرژانە بەخەریکبوون بەم عەشقە خواییەوە، کە وەها دەخوازێ ئاهەنگی بۆ بگێڕدرێت بەبەکارهێنانی (بەربەت) و (نی: شمشاڵ)ەوە لەگەڵ برا هاوئاینییەکاندا بەبەستنی کۆڕی (ذکر) لەسەر ساز و ئاوازی مۆسیقی.

مەبەستی ئەم تاکە هەڵبەستە لە تاکە هەڵبەستی ئایندەشدا ڕوونتر ئەبێتەوە.

١٢٦- (کوردی) لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا کە بەکاتی عیشق بازیی گیانیی دیاریی کردووە و (بەربەت) و (نای)ی لە ئامێرە مۆسیقییەکاندا ئامادە کردووە، من وەهای بۆ دەچم بەلای کەمەوە یەک تاکە هەڵبەست لە نێوان (ئەو تاکە) و ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا دەست من نەکەوتووە و ئەویش دەبێ لە بارەی هێنانەدیی کۆڕێکی بادەی گیانی نۆشین و سەرخۆشیی خواییەوە بووە ئەوەبێ کە مەبەست بوون بەدەقی (ذیکر)ەکان و بەخوێندنەوەی ئایەتە قورئانییەکان و... سروودی ئاینی و... هتدە.

بەلای منەوە دوای ئەو، ئەمجا هاوئاینییەکانی کە لەو کۆڕەدا مەست کەوتوون (کوردی) ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی فەرمووە کە ئەو سایە ڕێچکەی بیرەکە پڕ بەپڕ و بێ پچڕانەوەیە کە ئەوەش شێوەی هەڵبەستی کوردییە.

از خراباتیان مست: لە خەراباتییە مەستەکان، واتە لەو خەراباتیانەوە بخوازە وەک لە دوایدا دەچمە سەر ئەم (بخوازە)یە.

خەراباتیان: کەلاوەیی، وێرانەییەکان و مەبەستی لەوە کە وەک سەرەتای ئەم (حەوت بەند)ە لە (گەدایان): هەژار و بێ نەواو بێ دەستمایە و دەستکورت و نەداراکان کە تەنانەت خانووی نیشتەجێ بوونیشیان نییە و لە (کەلاوە)وە (وێرانە) و (خەرابات)دا دەژین و دەنوون دیاری کردووە؛ چونکە خانوویان دەربەست نییە و هەڵپەی بۆ ناکەن و دەستیان لە جیهان بەرداوە.

ئەمجا ئەو (خەراباتی)یە گەدایانە کە لەو کۆڕی بادەی گیانی و دەقی ئاینی نۆشیدا مەست بوون (کوردی) دێتە گوتن و فەرموویەتی:

طلب: واتە طەلەب بکە، (بخوازە) وەک لەپێشەوە دیاریم بۆ ئەم (بخواز)یە کرد، و لەو مەست و کەوتووی ناو ئەو (خەرابات) خەرابەیانە (داوا) بکە.

داوای چی؟

داوای:

جام جمشید و تخت و افسر کی: لەو مەستییەی ناو کەلاوەکانی (گەدایەکان) ئەمانە بخوازە. مامۆستا ڕۆژبەیانی لە نامیلکەی (ج)ەکەیدا.

بابگەڕێمەوە سەر نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستە کە (کوردی) لە نیو باڵی یەکەمدا بە(بخوازە) کۆتاییی هێنابوو واتە ئەمانە بخوازە:

جام جمشید: لەوانەی کە لەو مەستە خەراباتییانەی خواستووە جامی جەمشید بووە کە بریتی بووە لە ئاوێنەیەکی زۆر گەورە بەبەرزییەوە چەسپ کراوە و ئاوێنەی تر بەرامبەر بەو دانراوە. ئەوی لە ئاوێنە گەورەکەوە دیاربووە جەمشید لە ئاوێنەی خوارتری ئەوەوە لە دیمەنی شارەکەی دیوییەتی و ئەو ئاوێنە گەورەیەی وەها بۆ دروست کراوە، کە توانراوە ڕووی بکرێتە هەموو لایەکی شارەکە، وەیا جامی جەمشید ئەو کاسە گەوهەری نەبووە کە خۆی بادەی پێ خواردووەتەوە کە ئەو جام (کاسە)یە لە نرخ نەهاتووە.

جگە لە خواستی ئەو جامی جەمشیدە هەروەها خواستی:
تخت: (تەختی پاشایەتی)یشی کردووە، هەروەها:
افسر کی: (تاجی سەری کەی)یشی خواستووە.
کی: ناوی دووەمین پاشای بنەماڵەی کەیانییەکان و پادشایەکی ئەفسانەیی (ئاریان) بووە کە (کوردی) فەرمووییەتی ئەمیش ئەو مەستە خەراباتییە (گەدا)یانە بخوازن. بەڵام ئەمە واتای سەرزاریی ئەم نیو باڵی دووەمەیە و مەبەستی (کوردی) ئەوەیە کە ئەو بە مەست و کەوتن لە خەراباتدا گەلێ مەزنتر و شکۆدارتر بووە لە (جامی جەم و تەخت و ئەفسەری کەی) چونکە ئەمانە ئەگەر هەرکەسێ بوویێت هەر لە ماوەیەکی کەمی ژیانیدا بوونی، بەڵام ئەو سەرخۆشی خواییە و ئەو گەدایانە نزیکبوونەوەیەکی گیانییە لە پەرتەوی (جەلا)ی خوایی و هەتا هەتاییە و ماددەی بۆ نییە و لەگەڵ گیانی ئەو گەدایانەدا هەر لە بوونێتیدا دەبێ و دەمێنێ خۆی لەخۆیدا جامی جەم و تەخت و ئەفسەری کەی بووە.
ئەم تاکە:
ئەم تاکە هەڵبەستە (١٢٦)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندەیە کە لە لای من و بەپێی سەرچاوەکانی گەیوەتە ئەم ژمارەیە و هەروەها ئەم تاکە دووەمین تاکی ئەم بەندی شەشەمەیە.
هەر ئەم تاکە بەپێی سەرچاوەکانی (ژمارە) و شوێنیان ئاوەهایە:
ئەم تاکە لە دوو سەرچاوەی (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٤١)یەمین و لە (ق/٣)دا (٤٣)یەمین تاک و لە (ط)دا (٤٦)یەمین و لە (حم)دا (٤٧)یەمین و لە (مک)دا (٤٨)یەمین و لە (ج، سـجـا، غم/١)دا (٤٩) هەمین و لە (با/١)دا (٥٠)یەمین و لە (مع)دا (٥٦)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٦٠)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦٣)یەمین تاک و لە (گل/١)دا (٦٦)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٤)یەمین و لە (ما/١)دا (٦٧)یەمین و لە (مس، نع)دا (٧٤)یەمین و لە (ن)دا (٧٦)یەمین و لە (هـ)دا (٧٧)یەمین و لە (عن)دا (٦٨)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

خراباتیان، لە (ف)دا نووسراوە (خرابانیان) و ئەمەش هەڵەی نووسینە کە یەک نوختەی پیتی (ت) بیرچووە.
از: لە (عن، گل/٢، نم/١)دا نووسراوە (وز) (لەو) ئەمیش دەگونجێ.
افسر لە (ف)دا نووسراوە (افسر) = ئەمەش مەبەست لە (ئەفسەری)یە و ڕاستە و ڕێنووسەکە وەهایە.

**واتای گشتی:**

دوای مانگێ خۆ ئامادەکردنەکەی (کوردی) و هێنانی دوو ئامێری مۆسیقای (بەربت) و (نەی) بەزمەکەی گەیاندووەتە کەوتنی مەست لە خەراباتدا و ئەو مەستە (گەدا)یانەی گەلێ لە (جام جەمشید) و (تخت) و (افسرکی)یی گەلێ بەچاکتر و مەزنتر زانیوە کە لەو بارودۆخە جیهانییانە پتر لە خۆشیدا بوون چونکە لە کامەرانییەکی هەتا هەتاییدا بوون، نەک گەورەیی

لە مـاوەیەکی کورتـی ژیانـدا. کوردی بـەجـۆرێکی ئـاوا ناوەڕۆکی ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـە لە تاکی ئایندەدا ڕادەگەیەنێت.

١٢٧- ترک تاتار: تورکی تاتاری.

تاتار: مـەبەست لە بەرە هێرشـهێن و داگیرکار و خـاپوورکاری وڵاتان و لەناوبەری نەتەوەکانە کە لە بنـەچەدا ئەویش (تاتار) و (مەغۆل)ییەکانی هۆلاکۆ و جەنگیـزخان کە ئەمـانیش دەچنەوە سەر نەتەوەی چین و لەگەڵ تورکدا هاوڕەگەزن و بەزۆرداری گەیونەتە ئەم ناوچەیە.

شـوێنگەی (تـاتار)یەکـان خـوارووی ڕۆژهـەڵاتی ڕووسـیـایە کـە دەنووسـێـتـەوە بـە(چین)ەوە، لە هەمـان کـاتـیـشـدا ئافرەتی ئەو (تاتـار)ییـانە بەجـوانی بەناوبـانگن، ئەمـجـا ئەو جـوانـیـیـە و ئەو تالانکارییـەی (تاتار)ییـانـە هۆی بەکارهێنانی (کوردی)ن لەم تاکە هەڵبـەسـتـەیدا کە (کـوردی) مەبەستی لە خودی (جوانی) و (تالانکاری) ئەوان نییە، بەشکو مەبەستی لە جوانیی پێغەمبەر، لە لایەک و فـڕاندنی دڵی (کـوردی) لـە لایەن پێـغـەمـبـەرەوە لە لایەکی ترەوە وای لە (کـوردی) کـردووە کە دەسـتـبـەرداری ئەو جوانیی (تورک) ئـاسایی و ئەو (تالانـکاری)ی تاتار ئاسـاییـیـەی پێغەمبەری ئیسلام ببێت -د.خ-

هـەروەها جگە لە ئەمیش لـەم تاکەیدا (کوردی) ڕای گەیاندووە کە دیسان دەستـبەرداری بادەی (خلر)یش نابێت کە:

بادەء خلر: (بادەی خوللەر): مەیی خوللەر.

بادە: مەی، ئەو خواردنەوەیەی کە بەخواردنەوەی سەرخۆشـی دەدات.

خلر: جـۆرە بادەی (مـەی)ێکە کـە لە چەشـنی (شـەراب)دا پەیا دەبی، شـەرابیش (سـرکـە)ی هەڵگەڕاوەیە کە بەپێـچـەوانەی کـاریگەری (سـرکـە)وە لە خـواردنەوەدا شـەرابە هەڵگەڕاوەکـە سـەرخـۆش ئەکات و (سـرکە)کە وەها نییـە، ئەمـجا خـوللـەر بەواتا شـەرابی کۆن و چاک و بێ خـەوشـە، کە زۆرتـر مـەست دەکات بۆیە پەسـندە بەلای مـەیخـۆرانەوە. هـەروەهـا (خلر) بەواتەی خـڵتـەی شـەرابیش دێت کـە ئەوانـەی گیـرۆدەی زۆر بادە خـواردنەوەن، تەنانـەت ئەو خـڵـتـە و خاشاکەیشی دەخۆنەوە.

شـاعیـران لە هەڵبـەسـتیانـدا زۆریان بەکارهێناوە لە (بۆنە) و لە واتای جۆراوجـۆردا (کـوردی) بەکاری هێناوە کە لە شوێنی تری پێش ئێرەی ئەم پەڕاوییەدا بەدرێژی لێی دواوم.

ڕەنگە ئـەم ناوی (خلر)ە لە نـاوی شـارۆچکەیەکی دەوروبەری (شـیـراز)ەوە پەیا بـووبێ کـە ئەو ناوچەیە ڕەزی مێوی یـەکجـار زۆری لێیە و شـەرابی ڕەشـی چاکی لێ دەگیـرێتەوە، لێرەدا و یا لەم جۆرە شوێنی وەک ئـەم هەڵبەسـتـەدا (خلر) بەهێمـای ئایەتەکـانی قـورئان و حەدیث و دەقـە ئاینیـیـەکـان ڕاگەیەنراوە بەتـایبـەتی (قـورئان) کـە دوا پەڕاوی پیـرۆزی ئاینی وەک (خـوللـەر)ە خڵتەکە لە دوا چۆڕی شەرابەکەیە.

(کوردی) ئەم نـیو باڵی یەکـەمەی ڕاگەیـاندووە، بەبێ ئەنجام و بێ دیاریکردنی ئەوەی کە بۆچی ئەو ناوەڕۆکـەی ڕاگەیاندووە، بەڵام بەنیـو باڵی دووەمـدا مـەبەسـتـەکەی خـۆی جێگر کـردووە کـە

فەرموویەتی:

روسیەم گردهم بملکت ری: ڕووڕەشم ئەگەر بیاندەم بەمەملەکەتی ڕەی.

ری: دەشتێکی پان و بەرینی کشتوکاڵیی زۆری بەراوی و دێمی و ئاوەدانە بەچەندین گوند و شارۆچکە و گەورەترین ئاوەدانییەکی شاری ڕەی یا (تاران)ی پایتەختی چەندین ڕژێمی ئێران بووە و هەیە.

(کوردی) لەبەر کێشی تاکە هەڵبەستەکە هەردوو وشەی (ڕوسیەم) وە (ملکت)ی بە کورتکراوەیی و سواوی ڕاگەیاندووە بەبێ ئەوەی هەڵبەستەکە لەنگ بکات.

ئەگەرچی (کوردی) و (سالم)ی ئامۆزای هەر دووانیان زۆر لە (ڕەی) یا لە (تاران)دا سزا و بەندکرانیان دیوە و لە هەڵبەستیاندا لێی بێزار بوون وەک (سالم) فەرموویەتی:

«لەگەڵ دڵ شەرتە، ئەمجارە نەجاتم بێ لە تارانا»

«بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی، بەئێرانا گوزەر ناکەم»

(کوردی) لەم پەڕاوییەدا لەم بارەیەوە، هەڵبەستیم، بەلێکدانەوە و بۆنەی (ڕەی) نەویستنییەوە هەن و پێویست بەدووبارەیان نابینم.

کەچی ئەوەتا لەم تاکە هەڵبەستەیدا (کوردی) بەپێچەوانەوە خۆی بەڕووڕەش دادەنێت، ئەگەر (تورکی تاتار و بادەی خوللەر) بدات بەمەملەکەتی (پاشایەتی) ڕەی.

ئەم تاکە هەڵبەستە کە (١٢٧)یەمینی ئەم حەوت بەندەیە و (٣)یەمینی تاکی ئەم بەندی شەشەمەیە ئەویش بەوەندە سەرچاوەیەم.

ژمارە و شوێنی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە بەگوێرەی سەرچاوەکانی بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٤٢)یەمین تاکە و لە (ق/٣)دا (٤٤)یەمین و لە (ط)دا (٤٧)یەمین و لە (حم)دا (٤٨)یەمین و لە (مک)دا (٤٩)یەمین و لە (ج، غم/١، سجا)دا (٥٠)یەمین و لە (با/١)دا (٥١)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٦١)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦٤)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٥)یەمین و لە (ما/١)دا (٦٨)یەمین و لە (عن)دا (٦٩)یەمین و لە (مع)دا (٥٧)یەمین و لە (مس، نع)دا (٧٥)یەمین و لە (ن)دا (٧٧) هەمین و لە (ه)دا (٧٨)یەمین لە (گل/٦)دا (٦٧)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

خلر – لە (نم/١)دا نووسراوە (خلار) و دیارە هەڵەی نووسینە.

گردهم – لە (نم/١)دا نووسراوە کردهم – ئەمیش دەگونجێ و نووسینەکە بەشێوەی ڕێنووسی فارسییە کە زۆرجار سەری پیتی (گ) نانووسرێت.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستە لە (عن) و پووکاوەتەوەی بەچ جۆرێک ناخوێندرێتەوە.

**واتای گشتی:**

لە وشەکانی ناوەڕۆکی ئەم تاکەدا و لێکدانەوەیدا، ئەوی لە توانا و تێگەیشتنمدا بووبێ ڕام گەیاند و مەبەستی گشتی لەم تاکە ئەوەیە کە خۆشی وەرگرتن لە جوانیی دەقە ئاینییەکان و

مەستبوون بەبادەی (خُلّر) ئاسایان، تەنانەت ئەگەر ڕووڕەشیش بکرێم، لەسەر ئەو ئەڤین و مەستییەم، هێشتا هەر سوورم و بەپاشایەتی و بەمەملەکەتی پڕ بەپێتی (ڕەی)ی ناگۆڕمەوە.

١٢٨- نخوری بر: ناخۆیت بەر، بەر ناخۆیت،

نەخوری: ناخۆیت

بر: بەر میوە، بەرهەم کە مەبەستی لەم بەرە (خورما)یە و خورمایەکەیش مەبەستی خواردنی (بەر) میوەی ئەو (باخ) و (ڕەز) و (بێستان)ەیە کە کەسێک هەیەتی و...

زنخل آزادت: لە دارخورمای ڕاست و ڕەوان هەڵچوو (ئازاد)ت وەک دەگوترێ (سەروی ئازاد): شووشی هەڵچوو.

واتە لە بەری ئەو دارخورمایەت ناخۆیت هەتا...

نبری تا نهال کام ازپی: هەتا (لق، وەچ، چووزەرە = نهال)ی بێ کەڵکی داوێنی قەدی ئەو دارخورمایە نەبڕیتەوە (دانە پاچی) لە بندا بۆ ئەوەی گەشە بکات لە (بالا) و لە (ئەستوورایی)، بنکەکەیدا بەپێی پێویست و ئارەزوو.

نبری: (نەبڕیتەوە، هەتا قەلەمی نەکەیت).

تا: هەتا، تاکو، هەتاوەکو...

نهال: چلۆچێو، وەچ، لقی بێ کەڵکی درەخت بەبنکەکەیەوە و نەمام.

کام: ئارەزوو، بەپێی خواست و پێویست.

از: لە

پی: بنکی، بنەوەی، هەر لە بنی داوێنی خوارەوەی ئەو لقوپۆپانە، وەک (قەڵەم کردن) یا (شێف بڕین) و...

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە (١٢٨)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندە و (٤)یەمین تاکی ئەم بەندی پێنجەمەیە لە لای من و ئەگەر سەرچاوەی تر دەربکەوێ ئەم ژمارانە بەرەو زۆرتر بوون دەگۆڕدرێن.

ژمارە و شوێنی ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا لای من بەم جۆرەن:

ئەم تاکە لە سەرچاوەی (حم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٤٣)یەمین و لە (ق/٣)دا (٤٥)یەمین تاک و لە (حم، ط)دا (٤٨)یەمین و لە (مک)دا (٥٠)یەمین و لە (ج، سجا، غم/١)دا (٥١)یەمین و لە (با/١)دا (٥٢)یەمین و لە (مع)دا (٥٨)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٦٢)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦٥)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٦)یەمین و لە (م/١)دا (٦٩)یەمین و لە (عن)دا (٧٠)یەمین و لە (مس، نع)دا (٧٦)یەمین و لە (ن)دا (٧٨) هەمین و لە (ه)دا (٧٩)یەمین و لە (گل/٦)دا (٦٦)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

آزادت، لە گل/٣، گل/٨)دا نووسراوە: (آزادی) و دیارە ئەمەش هەڵەی نووسینەوەیەو لەبەر یەکتر نووسینەوەوە پەیابووە و ناگونجێ.

**واتای گشتی:**

بەسەرنجدانی ئەم تاکە هەڵبەستە بیر بۆ ئەوە دەچێت کە بەدوو لادا واتا دەدات.

لای یەکەمیان:

لە بەری دارخورمای وەک سەروی ڕەوان هەڵچووت ناخۆین، ئەگەر چاودیری هەر ساڵەی، لقی ساڵی پار دا نەپاچی و ئاوی نەدەیت و تۆوی نێرەی دارخورما نەپرژێنی بەسەر دارخورما مێیەکانیاندا و... کە مەبەست لە هەمیشە چاودێریکردنی ئەم ئاینەیە نەک دوشمنان بەلایەکی خراپدا ئاڕاستەکاریی تیا بکەن.

لای دووەمیان:

صۆفیگەرییە ئەگەر پەیڕەویکارانی ئەم ئاینە و (دەروێش) و (مرید)ەکانی هەر (طەریقەتەی) دۆست لە جیهان پەرستی و لە ئارەزووە دەروونی و (شەهوانی) بەرنەدەن واتا (تزکیە النفس) نەکەن، ناگەنە ئەو ئاواتە مەعنەوییەی هەیانە لەوەی خوا لێیان ڕازی بێت و شایان ئەوە بن بەهرەمەند بن لە پرتەوی خوا و...

لە تاکە هەڵبەستەکانی ئایندەشدا (کوردی) درێژە بەم ناوەڕۆکی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە دەدات.

١٢٩– نکنی تا طواف: نەکەی هەتا طەوافی.

تا: هەتا، تاوەکو.

طواف: خۆ بەدەوردا گێڕانی، باڵا گەردانی بوون. وەک کەسێک بەکەسێ دەڵێت: لە دەورت گەڕێم، لە شێوەی بادینیدا (گوری) وەک: گوریێی تەمە، ئەم خۆ بەدەور گێڕانە بۆ:

محمل لیل: کەژاوەی لەیلای دڵخوازی (مجنون)، کە لە پێشتری ئەم پەڕاوییەدا (کەژاوەی لەیل)م بەدرێژتر لێک داوەتەوە.

(کوردی) لەم نیو تاکە هەڵبەستەی یەکەمدا فەرموویەتی هەتا نەبیتە باڵا گەردان کەژاوەکەی (لەیل) و ڕستەکەی تەواو نەکردووە و لە نیو باڵی دووەمیشدا فەرموویەتی:

نکشی تا تو: یا. چونکە نووسینی وشەی (نکشی) بەم شێوەی کۆنی (فارسی)یەی بەدوو جۆری (نەکەشی) وە (نەکوشی)یش دەخوێندرێتەوە.

نکشی: نەیکێشی= تاخۆتی لەبەرا ڕانەگری، وەیا هەتا نەیمژی، نەینۆشێ، نەیچێژی.

نکشی: نەیکوژیت.

تا: هەتا، تاوەکو.

تو: تۆ، تە، ئەتۆ.

زهرنیش ازحی ژاری چزوو یاگەزتنی مار (حەی)یەوە، کە (حەی): بەواتە زیندوو، مەبەست لە (خوای مەزنە) کە هەر بووە و هەر دەمێنی.

زهر: ژار، زەهر

نیش: چزوو.

ئەم تاکە هەڵبەستە:
بەپێی ئەم (٢٤) سەرچاوەیەی کە لەسەر ئەم حەوت بەندە بەدەستم هێناون ئەم تاکە هەڵبەستە لەم (حەوت بەند)ەدا گەیوەتە (١٢٩)یەمین و بەپێی ئەم بەندی شەشەمەیش پێنجەمین تاکە.
ژمارە و شوێنی ئەم تاکە لەو سەرچاوەیانەوە بەم چەشنەیە:
ئەم تاکە لە سەرچاوەی (جم، صا)دا نییە، لە (ف)دا (٤٤)یەمین و لە (ق/٣)دا (٤٦)یەمین تاکە و لە (حم، ط)دا (٤٩)یەمین و لە (مک)دا (٥١)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٥٢)یەمین و لە (با/١)دا (٥٣)یەمین و لە (مع)دا (٥٩)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٦٣)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦٦)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٧)یەمین و لە (گل/٦)دا (٦٩)یەمین و لە (ما/١)دا (٧٠)یەمین و لە (عن)دا (٧١)یەمین و لە (مس، نع)دا (٧٧)یەمین و لە (ن)دا (٧٩)یەمین و لە (ه)دا (٨٠)یەمین تاکە.
نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە وەک لە سەرەوە لێکم داوەتەوە تیا دەردەکەوێت کە دیسان (کوردی) ڕستەکەی تەواو نەکردووە، چونکە ئەم تاکە هەڵبەستە وەک درێژەدان یا (پاشماوە)ی تاکی پێشوو وەهایە و لە هەمان کاتیشدا ئەم (ڕستە) تەواونەکردنەش لەوەوەیە کە هەر ئەم ناوەڕۆک و مەبەستانە لە تاکە هەڵبەستەکانی ئایندەشدا درێژەی هەیە، تا دەگاتە تەواوکردنی ڕستەکە، لە دوا دوایی ئەم بەندی شەشەمەدا.
واتای ئەم چەند تاکە هەڵبەستە پێکەوە قولفە دراون، بەتێکڕایی لە (وێستگە)یەکی ڕێبازی صۆفیگەریدا دەگیرسێتەوە ئەویش تێکۆشانی هەر ئیسلامێکی پاک یا هەر مرید و دەروێشێکی (طەریقەت)ەکانە لە ڕێگەی بێ خەوشکردن و مشتومالدانی دەروون (تزکیە النفس)دا وەک لە تاکی پێشوو، وە چەندین تاکە هەڵبەستی دیکەی (کوردی)ی ناو ئەم پەڕاویەدا لێی دواوم.
**جیاوازییەکان**:
ئەم تاکە هەڵبەستە بەپێی سەرچاوەکانی، زۆر شێواوی و گۆڕینی تیا دەردەکەوێت، ئەویش دەستاودەست کردن و دەماودەم کردن و نوسخە بەهەڵە نووسین و نوسخەی تر لەبەر ئەو هەڵەیە وەرگرتنەوە، ئەم شێواوییە، ڕووی داوە، وەک لەم نموونەی جیاوازییانەی دواییدا ئاشکرایە:
تو زهرنیش از – لە (شح، گل/٣، ما/١)دا نووسراوە: (هزار لطمە ز): هەزار لەطمە زو: (هەزار چەپوک: شەپازللە لە) کە ئەمیش دەگونجێ و لەبەر ژمارە کەمیی سەرچاوە جێگیرم نەکرد.
وشەی (لطمە): لەطمە: چەپۆک و شەپازللە. لە (ف)دا نووسراوە (صدمە = صەدمە = پێکادان، بەیەکدادان).
**واتای گشتی**:
(هەتا باڵا گەردانی کەژاوەی لەیلا نەبی، هەتا ژاری چزوو) کە لە تاکەکانی ئایندەدا وەڵامی یا

تەواو کردنی ئەم ڕستەیە ڕاگەیەنراوە، بە وردی ناگەیتە ئەنجام و شوێنی ڕەزامەندی خوار بەهرەمەندبوون، بەپەڕتەوی خوایی و، تا ماندوو نەبی لە ڕێگەی تێگەیشتنی دەقە ئاینییەکاندا ناکەویتە سەر ئەو ڕێگە ڕاستەی لە دەقەکاندا هاتوون و لێرەدا (لەیلا) مەبەستی لە دڵخوازەکەی (مەجنوون) نییە، بەشکو پێغەمبەر دەقە ئاینییەکان پەیڕەوی کردنی فەرمایشی خوایە و چەشتنی ئەو ژارەی مار و مەبەستی لە ماندوویێتییە لە ڕێگەی پاکبوونەوەی دەروونەدا وەک، لە توێی وشەکانی ئەم تاکەدا لێکم داونەتەوە.

١٣٠- ندهندت به بزم مستان جای: ناتدەنێ لە بەزمی مەستاندا، جێگە - واتە لە کۆڕی مەینۆشاندا جێگەیەکت نادەنێ.

(کوردی تا ئێرە هەر ڕستەکەی تەواو نەکردووە و مەبەستی نەداوە بەدەستەوە، بەڵام ئەوا لەم نیو باڵی دووەمەدا ڕستەکەی کۆتایی پێ هێناوە و مەبەستی لە ڕاگەیاندنی ئەم (نیو باڵی یەکەم) و ئەوانی پێشتریدا ڕاگەیاندووە کە فەرموویەتی:

تا چو یاران نغلطی اندر قی: هەتا بەوێنەی (یاران) نەگەوزێیت لەناو ڕشانەوەدا).

یاران: دۆستان، یاران، خۆشەویستان - مەبەستی لەم (یاران) ئەربابی ئەو بەزمی مەی نۆشییە کە (گەدا) پێگەیشتووەکان کە لە ڕێگەی خواناسیدا بەهرەوەر بوون.

نغلطی: نەگەوزێیت: مەبەست لەوە هەتا تۆش وەک یاران نەگەوزێیت، خەڵتان نەبیت، تەپاوتل نەکەیت.

ئەندەر: لەناو

قی: ڕشانەوە، واتە لەناو ڕشانەوەکەدا وەک (یاران) نەگەوزێیت لە بەزمی بادەنۆشاندا جێگەت پێ نادەن، کە مەبەستی (کوردی) هاندانە بۆ پەیڕەوی کردنی ڕێبازی (گەدا)یەکان و ڕشانەوە، لابردنی گوناحەکان، تۆبە کردن، لێرەدا هاتنی وشەی (ڕشانەوەکە) لەسەر زاریدا وەک چەشنە بێ جێییەک دەنوێنێ، بەڵام لە ڕاستیدا بێ جێ نییە و ڕەوایە و مەبەستی لەم ڕشانەوەیە پاکبوونەکەی دەروونی (گەدا)یەکانە لە ئاکامی (تزکیە النفس)ەکەیانەوە کە دوورکەوتنەوەیان لە ئارەزووی جیهانیی شەهوانییەکان وەک ڕشانەوەیەک ڕەچاو کردووە کە ئەو گەوزاندن لەناو ڕشانەوەیاندا بەرەو پاکبوونەوەی دەروون بوو لە (بەڵخ)ی جیهانی و گوناهان ئەویش تۆبەی یەکجارەکی کردن و نەگەڕانەوە بۆ سەر ئەو گوناهانە و گرتنی ڕێگەی ڕاستی فەرمایشتی خوا لە قورئانی پیرۆزدا پەیڕەوی کردنی حەدیثەکانی پێغەمبەر و کردەوەکانی (سوننەت) و وەرگرتنی ئامۆژگاری و ڕێنومایی زانا ئیسلامییەکان، جگە لەوەی لە ڕشانەوەدا گەوزانی بادە خواردنەوەی ڕاستیدا زۆر جار کارێکی ئاساییە.

ئەم تاکە هەڵبەستە دەبێتە (١٣٠)یەمین تاکی ئەم حەوت بەندە و شەشەمین تاکی ئەم بەندی شەشەمە. هەروەها ئەم تاکە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٤٥)یەمین و لە (ق/٣)دا (٤٧)یەمین تاکە و لە (حم، ط)دا (٥٠)یەمین و لە (مک)دا (٥٢)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٥٣)یەمین و لە (با/١)دا (٥٤)یەمین و لە (مع)دا (٦٠)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٦٤)یەمین و

له (ص، گل/٥)دا (٦٧)یەمین و له (گل/٦)دا (٧٠)یەمین و له (ما/١)دا (٧١)یەمین تاک و له (عن)دا (٧٢)یەمین و له (مس، نع)دا (٧٨)یەمین و له (ن)دا (٨٠)یەمین و له (ه)دا (٨١)یەمین تاکه.

**جیاوازییەکان:**

ندهندت، له (ط)دا نووسراوه (نبری ره) نابڕی ڕێگه، ڕێگه نابڕی – ئەمەش لەگەڵ ئەم نیو باڵییەدا ناگونجێ و واتا نادات و شێواوه.

ندهندت به بزم، له (مک، ج)دا نووسراوه: (نه همدست): نەهەمدەست = نەهاودەست کە ئەمەش بەدیار چاوەوەیە کە هەڵە و شێواوی لەنگی و بێ واتاییەکی ئاشکرایە، بەڵام، چونکە وەک سەرچاوەکەی (ط)ی پێشوو و ئەم دوو سەرچاوەیەی (مک، ج)ە، هەرسێکیان لە یەک بنکە و بنەچەوەن.

به بزم، له (عن، گل/٣، ف)دا نووسراوه: بحلقەء = بەحەلقەی.

یاران، له (سجا)دا نووسراوه (ماران) و له پاڵی ئەم (مارانه)شدا نووسراوه (نوسخه، یاران) واته (ماران)ەکە لەو سەرچاوەیەدا بە(ئەسڵ) و ڕاستتر دانراوە کە ئەویش ڕاست نییە.

یاران له (غم/١، جا/١، ف، عن، گل/٣)دا دیسان نووسراوه (ماران) ئەمیش ناگونجێ لەم تاکە هەڵبەستەشدا (یاران) مەبەست لە چاکەکانە و (مار)یش لە هەموو چیرۆکە کەلەپوورییەکاندا گیانەوەرێکی خراپە.

**واتای گشتی:**

کوردی لەم تاکەدا کۆتاییی بەڕازدادانی تاکە هەڵبەستەکانی پێشوو هێناوە کە فەرموویەتی: لە بەزمی مەی نۆشی (قورئان خوێنی، ئیسلامەتیی ڕاستی)ی و (ذیکر کردن)ی ناو مەستانی ئەو بەزمەدا، جێگەت ناکەنەوە ئەگەر بە ڕشانەوە گوناهەکانی خۆتت ئافەرۆز نەکردبن، و تۆبەت لەسەر نەکردبن و بە یەق کردنەوەی کردارە خراپەکانت و لە جێگەی ئەوە چاکە نەکەی ئەوا ناخرێیتە ڕیزی ئەو مەستانەوە کە وەک (یاران) واتە گەدایان بن.

١٣١– پی کن: ببرە (بڕیی ڕێگا و بانی مەبەستە، باژۆ، لێخوڕە، ڕێی پێ ببڕە)

اسب: هەسپی، حەسپی، ئەسپی.

خیال: هزر، بیر، ئەندێشە.

رجعت را: هی ڕیجعەت.

را: پاشگرە بەنیشانەی ئەوێتی (هی ئەو = واتە ڕیجعەتەکە)

رجعت: گەڕانەوە لە خراپی و گوناه و بەدکاری و لە یاخیبوون لە فەرمایشتی خوا و ڕێبازی ئاینی ئیسلام لە فەرموودەکانی پێغەمبەر و لە ڕێنومایییەکانی پێشەوا ئاینییەکان، واتە: پاشگەزبوونەوە و هاتنە سەر ڕێگەی ڕاست و دروستی ئاینی بەدڵ و بەزوبان و بەکردەوە و هاتنە ناو ڕیزی (گەدا)یان، یاران، چاکان و... ئەمەش مەبەستی سۆفیگەرانەی (کوردی)یە.

مەبەست لەمەندەی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە ئەوەیە:

«ئەسپی هزر و بیرکردنەوە لە پاشگەزبوونەوە لە سەرپێچیی فرمانە ئاینییەکانت باژۆ (لێ خوڕە) ئەو ڕێگەیەی پێ ببڕە».
ئەم لێکدانەوانەم (ڕێگا و ڕێکی) فەرهەنگە زمانییە باوەڕ پێکراوەکانن.
(کوردی) دوا بەدوای ڕاگەیاندنی نیو باڵی یەکەم فەرموویەتی:
تابری سوی منزل ئو پی: هەتاکو ببەی (بچییە) لای نیشنگە (مەنزلی) ئەو بەتاودان.
بری: ببەی، بچیتە، بگەی، بڕۆیە.
سوی: لای، بۆ، بۆ لای، ئەلای.
منزل: نیشنگە، شوێنگە، بارەگا، جێگە، جێگەی تیا گیرساندنەوە.
مەبەست لەو: (خەڵوەنگا، مەجلیس، مەحضەر، مەحفەل، مەکتەب و... هتد. کە لە تاکە هەڵبەستەکانی بەڕووی ئەم حەوت بەندەدا ناویان هاتووە. کە هەموو شوێنی لێبوونی پێغەمبەرە و لە بڕوای صۆفیگەراندا مەرج نییە کە ئەو شوێنانە (مەککە) یا (مەدینە) بن، بەشکو مەبەست لە پێکگەیشتنی (گیانی)یە، لە هەر کات و شوێنێکدا.
او: ئەو کە مەبەستی لە پێغەمبەرە، وەک ڕام گەیاند.
پی: پەی: ساختمان، بونیادی ساختمان کۆشک و تەلاری مەزنی گەورە پیاوان. کە دیسان مەبەست لە (لای) پێغەمبەرە –د.خ. ئاستانەی ئەو، بارەگای ئەو.
جوانکاری:
کوردی لە تاکە هەڵبەستی ژمارە (١٢٨) بەر لێرەی ئەم بەندی شەشەمەیدا، (جارێک) و، لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەشدا لە سەرەتا و کۆتاییەکەیدا دووجار و تاکی ئایندەدا دووجار وشەی (پی)یی لەم سێ تاکە هەڵبەستەدا دووربڕیوە، کە هەریەکە لەو (پی)یانە واتایەکی جیاواز لەوی تری هەیە، ئەمەش زمانزانییەکی فراوان و تواناییەکی جیناس ئاراییی شاعیرانەی پەسند و کارێکی وێژەییی جوانکارییە و پایەی بەرزی (کوردی) دەگەیەنێت.
ئەم تاکە:
ئەم تاکی (١٣١)یەمین حەوت بەندە کە حەوتەمین تاکی ئەم بەندی شەشەمەیە لەو (٢٤) سەرچاوەیەوە هاتووەتە دی کە لە بارەی ئەم حەوت بەندەوە بەدەستم هێناون کە بێ گومان پەیابوونی سەرچاوەی تر لەم یا لەو کەشکۆڵەوە ئەم دوو ژمارەیە زۆرتر دەکات و ژمارە و شوێنی لە هەر یەکێ لەو سەرچاوانەدا بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٤٦)یەمین تاک و لە (ق/٣)دا (٤٨)یەمین و لە (حم، ط)دا (٥١)یەمین و لە (مک)دا (٥٣)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٥٤)یەمین و لە (با/١)دا (٥٥)یەمین و لە (مع)دا (٦١)یەمین و لە (شخ، گل/٨)دا (٦٥)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٦٨)یەمین و لە (گل/٣)دا (٦٩)یەمین و لە (گل/٦)دا (٧١)یەمین و لە (ما/١)دا (٧٢)یەمین و لە (عن)دا (٧٣)یەمین و لە (مس، نع)دا (٧٩)یەمین و لە (ن)دا (٨١)یەمین و لە (ه)دا (٨٢)یەمین تاکە.

شێواوی لە شوێنی تاکەکاندا:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (مک، ط)دا شوێنگۆڕکێ بەتاکەکانی ئەم بەندی شەشەمە کراوە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) لە تاکە هەڵبەستەکانی پێشوودا ئەوەی دەربڕیبوو کە ڕێگە بەچوونە ناو (کۆڕی یاران) و (بەزمی مەستان) واتە (مەجلیسی گەدایان) نادرێ، هەتا ئەو کەسە لە خۆی نەبوورێ و خۆی پاک نەکاتەوە.

ئەوا لێرەدا فەرموویەتی:

کەواتە ئەسپی خەیاڵت بڕانە (باژۆ)، بەرەو ڕێگەی پاشگەزی لە کردەوەی خراپت و ڕێگە بەرەو لای دۆستان بگرە، ئەو ڕێگەی (هزر = بیر لێکردنەوەی پەشیمانی لە گونا و لە سەرپێچی)یەوە کە ئەگەیتە بارەگای حەقیقەتی مەعنەوی ئەو پێغەمبەرە -د.خ- و پەی بەڕاستی ببەیت و پێ بگەیت و لە بەهرەیدا کامەران ببی و....

١٣٢- پی ما گمرهان: بەرەو لای ئێمەی گومڕایان.

پی: بەشوێن پێی، دوابەدوای، بەرەو لای، بۆ لای.

واتە ئەگەر بەرەو لای ئێمەی گومڕایان ڕێگە بگرێت، بکەویتە سەر ڕێگەی بەرەو لای ئێمەی ئەوانەی ڕێی ڕاست (حەقیقە)مان گوم کردووە....

اگر گیری: ئەگەر بگری، واتە ئەو ڕێگەیە بگریت ئەوا:

پی بری: پەی دەبەیت، تێ دەگەیت، دەگەیتە، هانای دەکەیت، وەدەیگەیتێ

پی: بۆ، قەلای تێگەیشتن.

بەری: ئەبەیت، ئەرۆیت.

سوی راه: بەرەو ڕێگەی، بۆ لای، بۆ ڕێگەی.

رشد از غی: تێگەیشتنی تەواوی لە گومڕایی.

رشد: تێگەیشتن، گەیشتە ڕاستی (حەقیقەت) و خوناسی.

از: لە

غی: گومڕایی، فریوخواردوویی، ڕێی خراپ گرتن.

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەدا کە خۆی بە(ئێمەی گومڕایان) ناوبردووە، لەوەوەیە کە خۆی بە(شاعیر)داناوە و بەرامبەر بەشاعیریش خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتی ژمارە (٢٢٤)ی سوورەتی (الشعراء)دا فەرموویەتی:

«الشعراءُ يَتَّبِعَهُم الغاوون»

واتە:

شاعیران، ئەوانە دوایان دەکەون کە گومڕاو فریوخواردوو و، ڕێگەی ڕاست نەگرتوون، ئەمەش لە سەرێنی پێغەمبەردا بەرامبەر بەچەند شاعیرێک هاتووە کە هەمیشە بەهەڵبەست لە دژی پێغەمبەر و ئاینی ئیسلام و دەقە پیرۆزەکانی وەک قورئان و حەدیث بوون وەک: عەبدوڵلای

سوفیان حیرث و هوبەیرەی ئەبی وەهەب و ئومەییەی ئەبی صەلت و... هتد کە دەیان گوت ئەوی (محەمەد) دەیلێ و بە (معجزەی) دادەنێ، ئێمەش دەتوانین بیلێین و کەوتبوونە هەجووکردن و بەخراپە دوان لە پێغەمبەر و لە ئاینەکەی و چەند کەسانێکیان دواکەوتبوون شیعرەکانی ئەوانیان دەگوتەوە و لەوەوە شاعیر و پەیڕەوی کارانەیان بە(گومڕا) ناوبراون.

ڕاگەیاندنی (رشد) لە (غی) ئەوە نیشانەیە بۆ ئەو (١٩) دووبارەکردنەوەی وشەی (روشد) وە (٢٢) جار دووبارەکردنەوەی وشەی (غی) لە قورئانی پیرۆزدا، لە (٤١) ئایەت کە (کوردی) مەبەستی لەمانە بووە و بەتایبەتی خوای گەورە فەرموویەتی:

«ولیؤمنوا بی لعلهم یرشیدون»

واتە: با باوەڕ بە من بهێنن، بێ گومان بەشکم تێ دەگەن و دەگەنە وریایی و کەوتنە سەر ڕێگە.هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٦)ی سووڕەتی (النساء)دا کە خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی:

«یهد إلی الرشد»

واتە: ڕێنومایی گەیشتن دەکات بۆ حەقیقەت.

ئەمانە و جگە لە چەندین نیشانە کردنی خوا بۆ (ڕێنومایی) کردنی حەزرەتی مووسا پێغەمبەر -د.خ- و، پێگەیین (گەیین = روشد)ی حەزرەتی ئیبراهیم -د.خ- و جگە لەمانەیش لە ئایەتی ژمارە (٢٥٦)ی سوڕەتی (البقرە)دا خوا فەرموویەتی:

«قد تبین الرشد من الغنی»

واتە: ڕێی تێگەیین گرتن، لە گومڕاییییەوە دەرکەوت.... هتد

جارێکی تر دەگەڕێمەوە سەر (کوردی) و ئەوەی کە خۆی بەشاعیری گومڕا دانەناوە، چونکە ئەوەتا وەک ڕێنومایی کارێک فەرموویەتی:

ئەی گومڕایان ئەگەر ئەم ڕێگەی حەقیقەتەی ئێمە بگرن و پەیڕەویی فەرمایشتە پیرۆزەکانی بکەن و لە گومڕا دابڕاوەکان جیا ببنەوە و بێنە سەر ڕێبازی خواناسی و پەرستنی، ئەوسا دڵنیا دەبن کە لەو یاخیبووانە دوور کەوتوونەتەوە و بەئاسمانی کامەرانی و سەرفرازیدا پەرواز دەکەن.

چونکە ئەو حەوت بەندە کە ئاشکرا کاری بیروڕا و بۆچوون و بڕوای (کوردی)ن ئەوەندە قووڵ و پان و بەرین و پڕ و چڕن، لە (عیرفان)ی بێ خەوش کە هەرچەندی لێ لێک بدرێتەوە، هێشتا هەر کەموکورتە.

ئەم تاکە هەڵبەستە:

ئەم تاکە هەڵبەستە کە جارێ بەپێی ئەم حەوت بەندە ژمارەکەی گەیوەتە (١٣٢)یەمین و دەبێتە تاکی (٨)مینی ئەم بەندی شەشەمە، هەروەها ژمارە و شوێنی لە سەرچاوەکانیدا بەم چەشنەیە:

ئەم تاکە لە (جم، صا، ف)دا نییە و لە (ق/٣)دا (٤٩)یەمین تاک و لە (حم، ط)دا (٥٢)یەمین و

له (مک)دا (٥٤)یەمین و له (ج، سجا، نم/١)دا (٥٥)یەمین تاک و له (با/١)دا (٥٦)یەمین و له (مع)دا (٦٢)یەمین و له (شح، گل/٨)دا (٦٦)یەمین و له (ص، گل/٥)دا (٦٩)یەمین و له (گل/٣)دا (٧٠)یەمین و له (گل/٦)دا (٧٢)یەمین و له (مـــا/١)دا (٧٣)یەمین و له (عن)دا (٧٤)یەمین و له (مس، نع)دا (٨٠)یەمین و له (ن)دا (٨٢)یەمین و له (ھ)دا (٨٣)یەمین تاکــه هەروەها ئەم تاکە هەڵبەستە لە ناوەڕۆکی هەر (٢١) سەرچاوەکەیدا چونیەکە و جیاوازی لە نێوانیاندا نییە.

واتای گشتی:

ئەی گومڕا ئەگەر شوێنی پێ و ڕێبازی خواناسیی ئێمەمانان بگری، بێ گومان پەی بەرەو بارەگای (عەرش)ی خوایی دەبەیت و بەلای کەمەوە دەکەویتە بەر پەرتەوی بەهرەوەریی ئەو، ڕێ ڕاســتــەت کــە ســەرچاوەی ئایەتی (ڕشـد) و (غی)یە کــە لە توێی وشــەکــانی ئەم تاکــە هەڵبەستەدا بەپێی تواناییم لێکم دانەوە.

١٣٣- ای پسر تاکی: ئەی (کوڕ) هەتاکەی؟

ای: ئەی، ئو هۆ.

پسر: (کوڕ) منداڵی نێرینە

تا کی: هەتاکەنگی، تاکەی

از پدر گویی: ئەی کوڕ هەتاکەی: لە باوک دەدوێی و مەبەستی ئەوەیە کە (پێوەی – بەباوکتەوە) دەنازیت.

پدر: باب، باوک، باڤ

گویی: دەڵێیت: (بەپێوەنازیتەوە)

جود (حاتم): بەخشندەییی حاتەم.

حاتم : ناوی کوڕی عەبدوڵڵای (طائی)ی خێڵی (طەی) بووە، بەبەخشندەیی بەناوبانگ بووە، گەلێک ڕووداوی سەیرسەیری بەخشندەییی یەکجار تۆخی لێ دەگێڕدرێتەوە، بەڕادەیەک بووە بەنموونەی (بەخشندەیی) و بەر لە پەیابوونی ئیسلامدا لە ژیاندا بووە و لە ساڵی ٦٠٥ز دا کۆچی دوایی کردووە.

چە می کند بە (عدی): ئایا ئەو دەسبلاوی بەخشندەییی‌ەی ئەو (حاتەم)ە چی بۆ (عودەی) ئەکات کە کوڕی حاتەم بووە.؟

عدی: ئەبو ظەریف کوڕی ئەو (حاتەمی طائی)یە بووە – دوای مردنی باوکی کراوەتە جێنوشین و سەرۆکی (خێڵی طەی).

بەبۆچوونی من (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا، ئەگەرچی ناوی (حاتەم)ی باوک و (عودەی)ی کوڕی بەڕاشکاوی ڕاگەیاندووە من بەپلاری دەزانم بەرامبەر بە (عەلی) و هاوپشتێتی لەگەڵ پێغەمبەردا، یا بەپلار لە (حسین)ی کوڕی عەلی بەباوک و دایک نازینیەوە بەڵام وەک هێمایەک بەناوی (حاتەم) و (عودەی)یەوە دەری بریوە کە جەنگەکانیان بێ ئەنجامی چاک و دیاری و بە

لەناوچوونی خـۆیان و (خـەلافـەت)ی شـوورایی ئیـسـلامی هـاتووە. کـە بەش بەش بـوونی ئیمپراتۆرییە هەرە مەزنەکەی پێغەمبەری ئیسلام کۆتایی هات و... ئەگەرچی (عەلی) و (حسین) زۆر خاوەن (فەضل) و پیرۆزی و شکۆمەند بوون.

(کـوردی) بـەسـەر زاری ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـەیدا ڕووی کـردووەتە ئەو (کـوڕی حـاتەم)ە وەک ئامـۆژگـاری کـارێک کـە بەباوکـیـیـەوە دەنازێ، بەشکو ڕێگەی ڕاسـتگرتن لـە بەباوکەوە نازاندن بەکەڵکترە.

ئەم تاکە هەڵبەستە

ئەم تـاکـە هەڵبـەسـتـە بۆ ئەم حـەوت بەندە (١٣٣)یـەمین تاکـە و (٩)یەمین تـاکی ئەم بـەندی شەشەمەیە و ژمارەی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکـە لە (جم، صـا)دا نییـە و لە (ف)دا (٤٧)یەمین تاک و لـە (ق/٣)دا (٥٠)یەمین و لە (ط، حم)دا (٥٣)یەمـین و لە (مک)دا (٥٥)یەمین و لە (ج، سـجـا، نم/١)دا (٥٦)یەمـین و لە (با/١)دا (٥٧)یـەمـین و لـە (مـع)دا (٦٣)یـەمـین و لـە (شـح، گـل/٨)دا (٦٧)یەمـین و لـە (ص، گـل/٥)دا (٧٠)یەمـین و لە (گل/٣)دا (٧١)یەمین و لە (گـل/٦)دا (٧٢)یەمین و لـە (عن)دا (٧٥)یەمـین و لە (مـا/١)دا (٧٤)یـەمـین و لە (مس، نـع)دا (٨١)یەمـین و لـە (ن)دا (٨٣)یـەمین و لـە (ه)دا (٨٤) هـەمین تاکە.

جیاوازییەکان:

بە (عدی)، لە (ف)دا نووسراوە (نَعَدَیْ): نەعەدەی و دیارە لە نووسینیدا نوختەی پیتی (ب)یەکە بەهەڵە لە بنی پیتەکەوە نەنووسراوە، خراوەتە سـەر پیتەکە؛ چونکە نووسـەری ئـەم سەرچاوەیە زۆر دەسنووسێکی خۆش خوێن و کەم هەڵەی هەبووە.

چە می کند – لە (مک، ج)دا نووسـراوە چە کند، ئەمـەش دیسـان بەهەڵەی نووسـینی دەزانم و لەنگیشە.

واتای گشتی:

ئەم تاکـە ئامـۆژگـاریی کـوڕە کە بەهـەر بابەتێکی سـەرکـەوتـنی باوکـیـیـەوە نـەنازێ و نموونەی بە(عودەیی) کوڕی (حـاتەمی طەی) هێناوەتـەوە کە بەباوکییەوە نەنازێ، کە ئەوەندە بەخشندە بووە و من بۆچوونی خۆم لەسەر مەبەستی (کوردی) لەم ئامۆژگاری ڕاگەیاندووە.

١٣٤– مستی: سەرخۆشی، مەستی.

خواب: خەو، خەولێکەوتن، خەوتن،

بیخودی: بێ هۆشی، ناسروشتی، بێهودەیی، بێخودی، بێ ئاگایی.

چند: چەندێک، تا چ ژمارەیەک

هستی: بوون – مەبەستی لە خۆ بەشت زانینە، و خۆپەرستییە.

عجب: خود پەسەندی و لە خۆبایی بوون و ڕازی بوونە

سرکشی: سەرچڵی، یاخێتی، سەرکێشی، گوێ بەکەس نەدان، بێ باکی.

تاکی: (تاکەی) هەتاکو کەی.
(کوردی) مەبەستی لەم شەش بارە دەروونی و جەستەیی و ڕواڵەتانە وریاکردنەوەی خەڵکە کە بۆچی گیرۆدەی ئەم بارە هەموارانە بوون و لێرەشدا وەک تاکە هەڵبەستی پێشوو جۆرە ئامۆژگارییەکی خەڵکی کردووە کە ئەم ڕواڵەتانە لەگەڵ ڕێڕەوی ئاینیدا ناگونجێن.
جوانکاری:
بەسەرنجدانی ئەم تاکەی سەرەوە دەردەکەوێت کە لە هەر نیو باڵێکیدا سێ جۆرە (بار)ی ناهەمواری مرۆڤی ڕاگەیاندووە. ئەوی لەم باسۆکەیەدا جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە (باری یەکەمی) نیو باڵی یەکەم لەگەڵ (باری یەکەمی) نیو باڵی دووەم و باری دووەمی نیو باڵی یەکەم لەگەڵ (باری دووەمی) نیو باڵی دووەم وە (باری سێیەم) هەردوو نیو باڵەکە (دژی ) یا (بەراوەژووی) یەکترین ئەم ڕێکردنەیش لە دەستووری وێژەی کۆندا بە(لەف و نەشر) ناو دەبرێت و بەوەدا (هەرسێ باری نیو باڵی یەکەم بەڕیزە لەگەڵ ڕیزی (هەرسێ بار)ەکەی تری نیو باڵی دووەمدا بەڕیزە (هاوبەراوەژووی یەکترن و پاش و پێشیان تیا نییە، کە ئەم چەشنە ڕیزەش بۆ (لەف و نەشر) جوانکارییەکە بە(لەف و نەشری) (مورەتتەب) واتە (ئاوڕیز ناو دەبرێت) و لە دەستووری وێژەییدا کارامەیی و لێهاتوویی شاعیر دەگەیەنێت کە بەرامبەر بەوەندە (بار)ەی نیو باڵی یەکەمی، کردووەتە بەرامبەر بەهەمان چەندێتی لە نیو باڵی دووەمدا و گرد کردوونەتەوە و مایەی هەڵنان و ڕێزە.
ئەم تاکە، لە (١٣٤)یەمینی ئەم حەوت بەندە و تاکی (١٠)یەمینی ئەم بەندی شەشەمەیە و ژمارەی ئەم تاکە هەڵبەستە لە هەریەکێ لە سەرچاوەکاندا ئاوەهایە:
ئەم تاکە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٤٨)یەمین تاکە و لە (ق/٣)دا (٥١)یەمین و لە (حم، ط)دا (٥٤)یەمین و لە (مک)دا (٥٦)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٥٧)یەمین و لە (با/١)دا (٥٨)یەمین و لە (مع)دا (٦٤)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٦٨)یەمین تاک و لە (ص، گل/٥)دا (٧١)یەمین و لە (گل/٣)دا (٧٢)یەمین و لە (ما/١)دا (٧٣)یەمین و لە (گل/٦)دا (٧٤)یەمین و لە (عن)دا (٧٦)یەمین و لە (مس، نع)دا (٨٢)یەمین و لە (ن) (٨٤)یەمین و لە (ه)دا (٨٥)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

پاشبەند (سەروا)ی ئەم تاکە و تاکی (١٤)هەمی ئەم بەندی شەشەمە چونیەک و دووبارە کراون کە لە هەردوانیاندا (تاکەی)ن و لەو بروایەدام کە بەهۆی گۆڕانەوە نەک دەقی گوتنی (کوردی)یەوە ئەمەش جۆرە شێواوییەکە بەسەر ئەم دوو پاشبەندە داهاتووە. هەروەک ئەم جۆرە دووبارەبوونەوەیە لە تاکی (یەکەم) و دوا تاکی ئەم بەندی شەشەمەدا ڕووی داوە کە لە توانایی (کوردی) ناوەشێتەوە. هیوابارم سەرچاوەی تر دەربکەوت ئەم ناتەواوییە ڕاست بکاتەوە.

**واتای گشتی:**

ئەم تاکە هەڵبەستەیش بریتییە لە ئامۆژگاریکردنی خەڵکی و سێ جۆرە باری جەستەیی و دەروونیی ناهەموار و ناپەسەندی لە هەریەکێک لە نیو باڵەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا ڕاگەیاندوون کە بەڕیزە (سێ جاری)ی نیوباڵی یەکەم بەرامبەر بەسێ باری (دژ) و بەراوەژوویان لە نیو باڵی دووەمدا، وەک:

مستی و هستی، خواب و عجب و بیخودی و سرکشی،

پرسیاری کردووە کە تاچەند، تاکەی ئاوا دەبن و ئەم پرسیارەش شوێنی ئافەرۆزکردنی هەر شەش بارە ناهەموارەکە دەگەیەنێت.

تاکی ئایندەش وەک سەرپڕکردنی ئەم تاکە هەڵبەستەی ئێرە وەهایە.

١٣٥- بشنو: بژنەوە، ببیستە.

این پند من: ئەم پەندەی من.

سمع: گوێ بیستی، بیستنی، گوێڕایەڵی.

قبول: وەرگرتن، پەسندکردن، بەگوێ کردن.

گر: ئەگەر، گەر، ئەر.

زیان: زیانی، زیانییەک.

دیدی: دیت، بینیت.

(الضَمانُ عَلَيْ): ضەمان (بارمتە)ییەکەی لەسەر من، خۆم بارمتەبم، خۆم لە بریتیدام ....

ئەم تاکە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (١٣٥)یەمین و لەم بەندی شەشەمینەدا (١١)یەمینە و بەپێی ژمارە و شوێن، لە سەرچاوەکانیدا، بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٤٩)یەمین و لە (ق/٣)دا (٥٢)یەمین و لە (حم، ط)دا (٥٥)یەمین تامە و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٥٨)یەمین و لە (با/١)دا (٥٩)یەمین و لە (مع)دا (٦٥)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٦٩)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٧٢)یەمین و لە (گل/٣)دا (٧٣)یەمین و لە (ما/١)دا (٧٤)یەمین و لە (مک)دا (٥٧)یەمین و لە (گل/٦)دا (٧٥)یەمین و لە (عن)دا (٧٧)یەمین و لە (مس، نع)دا (٨٣)یەمین و لە (ن)دا (٨٥)یەمین و لە (ه)دا (٨٦)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

این پندمن - لە (مک، ط، ج)دا نووسراوە- از پند من بەواتە لە پەندی منەوە و، لەبەر ئەوەی لە (١٩) سەرچاوەدا نووسراوە (این پندی من) بۆیە بەپێی ئەم زۆرینەی سەرچاوانە، لە تاکە هەڵبەستەکەدا لەسەرەوە جێگیرم کرد.

**واتای گشتی:**

ئەم پەند و ئامۆژگارییە لە منەوە ببیە بەبیستنێک کە بە(پەسەند) وەری بگرە (قبووڵی بکە) و

پەیڕەویی ئامۆژگارییە ڕاست و دروستەکەم بکە.
جا ئەگەر زیانێکت لەو پەیڕەویکردنەتدا (دی) ئەوا من بەخودی خۆم بارمتەم لەبەر دەستتدا و من دەربارو بەرپرسیاری ئەو زیانەتم کە دڵنیام (زیان) نابینی و ئەمجا من لە تۆڵەی ئەو زیانەتدام، چونکە ڕێگەیەکی بەرەو کامەرانی و بەختیارییە لە خواناسیی ڕاست و دروستە کە ئامۆژگاریت ئەکەم، وەک ئامۆژگارییەکەیشم تاکە هەڵبەستی پێشوودا.
١٣٦- شە: پادشا، پاشا، شا، مەبەستی لە (پادشایی)یە.
ظهور الحق: دەرکەوتنی (حەق - حەقیقەت) ڕاستەقینە.
دو عالم: دوو جیهان، دوو گێتی، دوو تونگەری، مەبەست لە (جیهانی ئێستەیی ژیانی سەر گۆی زەوی) کە ژیانی دەمی و کورتە وژیانی ئەم جیهان کە ڕۆژی ڕەستاخیز (کۆ هەستان، قیامەت) و حەشر - لێپرسینەوەی خوای گەورەیە لە چاکە و خراپەی مرۆڤ لە ژیانی سەرگۆی زەویدا و بەپێی چاکە (بەهەشت) پاداشتە و بەپێی خراپەیش سووتاندن و سزای ناو دۆزەخ، کە ئەو جیهانە یان جیهانی جاویدانی و هەتا هەتاییە. واتە پاشای هەردوو جیهانە (محەمەدی) کوڕی عەبدوڵڵای پێغەمبەری ئیسلام بزانە.
(کوردی) نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی بەبێ پێچوپەنا و بەبێ شاردراوەیی ڕاگەیاندووە، بەڵام نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی وەک (داونانەوە) یا (تەڵە)یەک وەهایە کە سەرنج و تێگەیشتنی ئەم نیو باڵی دووەمەی وەک (پەردەک - موعەمما) ئاسایی دەربڕیوە کە تێگەیشتنی واتای ئەم نیو باڵی دووەمەی بردووە، بەدوو لادا و، لە ڕاستیشدا واتایەکەی هەر بەتەنیا بەیەک لادایە و، جارێ با یەک یەک وشەکانی ئەم نیو باڵی دووەمە لێک بدەمەوە، ئەوسایە دەچینە سەر ئەو (داونانەوە)یەی (کوردی) لەم نیو باڵەی دووەمدا:
نائب: شوێن گر، جێگر. واتە ئەو پێغەمبەرە جێگر یان شوێنگری... یە.
فخر: جێی شانازی، مایەی لەخۆباییبوون، و شانازی پێوەکردنی ئەو شوێنگری (نائب)ەتییەمە لەناو:
خاندان: خانەوادەی، خانەدانی، فاملیای، بنەماڵەی، خێزانی، ئەو شوێنگر و ئەو مایەی شانازییەی ئەو پادشایەی هەردوو جیهان کە پێغەمبەری (مەبەست) بووە و لە خێڵی (قورەیش) بووە.
(کوردی) تاکو ئێرەی ئەم کۆتاییی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستە، هەر ڕاگەیاندنەکەی ئاشکرایە و شاردنەوە و (داو لەبن نانەوە)ی تێدا نییە لە وشە:
لؤی: ئەم وشەیە لە ڕووی فەرهەنگییەوە بەواتە درەخشان، درەوشاوە، ڕۆشنا، پرشنگدار ... بەڵام لە ڕووی مەبەستەوە، وشەی (لوئەی) نازناوێکی نوێ (واتە هی سەردەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیب)ە و مەبەست لە خودی ئەو عەلییەیە.
(کوردی) ئالێرەدایە کە (داوەکەی ناوەتەوە)؛ چونکە ئەوسایە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە دەبێتە:

(پێغەمبەرێک کە جێگر و مایەی پێوەنازاندنی خانەوادەی (لوئەی) بێت) کە ئەمەش ئاشکرایە هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە (عەلی) هەرگیز ڕایەی نەکەوتووە کە ئەو پێغەمبەرە مەزنەی کە (رحمە للعالمین) بێ و کە (خوا لەبەر ئەو بوونەوەری دروست کردبێ) بەپێی (دەقی لەولاک) و بەپێغەمبەرێکی کۆتایی هێنا بەپێغەمبەران هەڵی بژاردبێ) کە ئەو پێغەمبەرە (نائیبی) ئەو (عەلی)یە بێ. (کوردی شێوەی ئەم نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەی وەها داڕشتووە کە بەسەر زاری ئەو (محەمەد پێغەمبەر -د.خ-) بەشێوێنگر (عەلی) بووە، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی دەربڕین و داڕشتنەکەی (کوردی) گەلێ لەوە (کۆن)تر و زانیارییانەتر و ئاگەدارترانە بووە کە مەبەست لەو نازناوە نوێیەی (عەلی) نەبووە کە (لوئەی)ی پێ گوتراوە، بەشکو هەر لە باوکان و پشتاوپشتی پێغەمبەردا، واتە (نۆیەمین پشت)ی پێغەمبەر لە باوکانییەوە کەسێک بووە ناوی (لوئەی) بووە و (کوردی) مەبەست لەو ناوبردنی (لوئەی)یە ئەو هەرە باپیرەیە بووە.
بەچاوخشاندنەوەیەک بەسەر ئەو باو و باپیرانەدا دەردەکەوێ کە پێغەمبەر بەنۆ پشت لە باوکییەوە دەگاتەوە سەر ئەو (لوئەی)یە کە دەبێ بە (باپیری، باپیری، باپیری) خودی پێغەمبەری ئیسلام کە لانیکەم بەر لە پێغەمبەر بە(٣٦٠) ساڵ پتر لە ژیاندا بووە، و پیاوێکی ناودار و بەدەسەڵات بووە و، خوای گەورە لە ئایەتی ژمارە: (٢٨) لە سوورەتی (ئەلفەتح)ی قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:
«هوَ الذي أَرسَلَ رَسولَهُ بالهُدى وأنَّ الحَقَّ ليُظْهِرهَ عَلى الدينِ كُلِه».
واتە، ئەوەی کە (خوایە) ئەو پێغەمبەرەکەی خۆی هەنارد بۆ هیدایە (ڕێنومایی و ڕەهبەری) کردنی خەلق بۆ سەر ڕێگەی ڕاستی حەق کە ئاینی پاکی ئیسلامە تاکو ئەم ئاینە (حەق)ە دەربخات و سەربخات بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا.
کەواتە ناوبردنی (ظهور الحق)ە کە یەکسەر مەبەستی لە خودی پێغەمبەری ئیسلام بووە کە لە ڕاستیشدا ئاینەکە لەسەر دەستی پیرۆز و فەرموودەی پاکی ئەودا بڵاوبووەتەوە لە سەرەتایەوە، نەک لە (عەلی)یەوە، بەڵگەیەکی تر بۆ ئەوەی ئەو ناوبردنی (لوئەی)یەی (کوردی) وەک (داونانەوە) بووە کە مەبەستی (عەلی) نەبووە بەشکو مەبەستی ئەو نۆیەمین باپیرەی بووە کە خۆی ناوی (لوئەی) بووە. نەک وەک (عەلی) تەنیا نازناوەکەی (لوئەی) بووە، ئەو بەڵگەیە ئەوەیە کە کوڕی ئەو (لوئەی)یە کە ناوی (کەعب) بووە وەک لە پێشەوە دیاریم کردووە ئەو (کەعب)ە پیاوێکی زۆر قسەزان و زمان پاراو و وتاربێژ بووە و بەم ڕواڵەتەی بەناوبانگ بووە و تەنانەت زۆربەی لەو (وتار)انەی پەڕاوییە مێژووییە سەرەکییەکاندا نووسراوە کە ئەو پەڕاوییە مێژووییانە بە(أمهات الکتب = دایکانی پەڕاویان) ناوبردن و وتارەکانی ئەو (کەعب)ە لەو مێژووانەدا شوێنی سەر دەستە و ڕێزیان هەیە و تەنانەت لەو (وتار)انەدا ناوی (محەمەد)ێک وەک پێشبینی بەپێغەمبەر و لە نەوەی ئەوان هاتووە و لەوەوە خانەوادەکەی پێغەمبەر بە(بنەماڵەی لوئەی) ناسراون و ئەمەش وەک ڕام گەیاند کەسایەتییەکی ٣٠٠-٤٠٠ ساڵ بەر لە پەیابوونی پێغەمبەری ئیسلام بووە و کۆنە و هەر بۆیە من (نازناو)ەکەی (عەلی)م بە(لوئەی)یە

لە پێشـەوە بە(نوێ) داناوە دیارە (کۆنەکە) شوێن بڕواترە لە (نوێیـەکـە)، واتە مـەبەست لەو (لوئەی)یە نۆیەمین باپیـرەی پێـغـەمـبـەر بـووە کـە (کـوردی) ڕای گـەیاندووە و مـەبەسـتی لە نازناوەکـەی (عـەلی) نەبووە و، ئەو ناوبردنـی (لوئەی) بە(کـوردی) وەک (تەڵە لەبن دانانەوە)ی ڕاگەیاندنەکەی کـە لە وێژەی کـۆندا (باو) بووە، ڕاگـەیاندنی وەها قـووڵ پەسندتر و پێـویست بووە. لە هـەمان کاتیشدا بەپێویستی دەزانم سەرچاوەیەکی (بەڵگەیی) ئەوەی کە ئەم هەڵبەستە بەسـتـراوە بە(لـوئەی)یەکـەی (عـەلی)یەوە ئەم دەقـەی دواییـیـە کـە بەهۆیەوە هـەر(حـەوت بەند)ەکـەشیـان لکاندووە، بەوەوە کـە گـوایـە (کـوردی) لە هـەڵنانی (عـەلی)دا فـەرمـوویەتی ئەم پێـوەلکاندنەش ڕاست نییـە و ئـەمـەش ئەوە ناگـەیەنێت کـە (عـەلی) شـایانـی پیـاهـەڵکوتن و شکۆمەند دەرخستن نەبووە، بەشکو گەلێ ڕەوشت و سروشت و ڕواڵەت و فەرموودە و کردەوەی زۆر بەرزی هەن کە لە ئاینی ئیسلامدا نەک هەر بەلای شیعەوە بەشکو بەلای هەموو بەرەکانی ئیسلامییەوە مایەی سەربەرزی و پەیڕەوی کردنن.

ئەو سەرچاوە بەڵگەییەش ئەمەیە:

(سەید طاهری هاشمی) کە ئەو نوسخەی (ط)ی ناردووە بۆ بەڕێز (مامۆستا محەمـەدی مەلا کەریم) لەو نوسخەیەدا هاشمی ئەم پەڕاوێزە (فارسی)یەی دوایی نووسیوە:

«اگر غرض از نائب فخر خاندان (لؤی) حضرت علی باشد مدیحه دربارهء اوست».

واتە:

«ئەگەر مەبەست لە دەربڕینی نائیبی فەخری خانەدانی (لوئەی) لەم تاکە هەڵبەستەدا حەزرەتی عەلی بێت، ئەوا هەڵنانە (مەدیحە)کە لە بارەی ئەوەوەیە».

بەرامبەر بەم دەقەیش:

١- مامـۆستا هاشـمی وشـەی (ئەگـەر - گریمانە)ی لـە دەقـەکەیدا نووسـیوە، ئەمـەش بەڵگە بەتەواوی و بێ سێ و دوو جێگرکرانی دەقەکە نییە، چونکە مامۆستا (هاشمی) وێژەوان و زانایەکی ورد و قووڵ بووە و زانایەکی لە خۆوەیی نەبووە.

٢- دەبێ ئەوەش بزانرێ کـە وەک چەند جـاری تری لەمـەوبەر و بەتایبـەتی لە سـەرەتای ئەم حەوت بـەندەدا لەم پەڕاوییەدا نووسـیومـە کە شیعەکانیش دەستیان هەبووە لەوەدا کە ئەم حەوت بەندە هەرە بالآیان بەهەڵنانی (عەلی) داناوە.

**ئەم تاکە هەڵبەستە:**

لەم تـاکـە هـەڵبـەسـتـەدا ئـەم حـەوت بەندە (١٣٦)یەمـین تـاک و هـەروەهـا (١٢)یەمین تاکی ئەم (بەندی شەشەمەیە) ژمارە و شوێنی ئەم تاکەش لە سەرچاوەکانیدا وەهایە:

ئەم تاکە لە (جم، صـا)دا نییە و لە (ف)دا (٥٠)یەمـین تاک و لە (ق/٣)دا (٥٣)یەمین و لە (حم، ط)دا (٥٦)یەمـین و لە (ج، سـجـا، نم/١)دا (٥٩)یـەمین و لە (بـا/١)دا (٦٠)یەمین و لـە (مع)دا (٦٦)یـەمین و لـە (شح، گل/٨)دا (٧٠)یـەمین و لـە (ص، گل/٥)دا (٧٣) هـەمـین و لە (گل/٣)دا (٧٤)یەمین و لـە (مک)دا (٥٨)یەمین و لە (مـا/١)دا (٧٥)یەمین و لە (گل/٦)دا (٧٦)یـەمین و لە

(عن)دا (٧٨)یـەمین و لـە (مس، نـع)دا (٨٤)یەمین و لـە (ن)دا (٨٦)یەمـین و لە (ھ)دا (٨٧)یـەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

شـە، لە (نم/١، با/١، حم، سجا)دا نووسـراوە، (شـد) کـە ئەمـەش ھەڵـەی نووسـینە و بۆ ئێرە واتا نادات.

شە، لە (مک)دا نووسراوە (شو) کە لە ئۆفسێتەکەیدا کراوە بە(شە) و ئەم (شە)یە بەئاراستە و ڕێنووسی (فارسی)یە لە باتی (شەھ).

نائب و فـخر خـاندان، لە (مک، ج، سـجـا، نسـخـە ج)دا نووسـراوە (ئائب خـانەدان و فـەخـر) ئەمەش ھەڵە و شێواوییە.

**واتای گشتی:**

پادشای لێدەرکەوتنی حەق لە ھەردوو جیھانی پێش و پاش ڕۆژی ھەستان (قیامەت) ھەر تەنیا ئەو پێـغـەمـبـەرەیە کـە جـێگری نۆیەمین باپیـریـە کـە (لوئەی) بووە و مـایـەی شـانازیـی ئەو خانەوادەیەی ئەو (لوئەی)یە کۆنە و بگرە (لوئەی)یە، نوێیەکەش بووە کە نازناوی (عەلی) بووە و پێغەمبەر ھەرگیز نائیبی (عەلی) نەبووە و ئاواتە خوازیی (عەلی) و شیعە بووە کە عەلی نائیبی ئەو بێت.

١٣٧- چون ئەگەرچی ئەم وشەیەم لە شـوێنی پێشووتری ئێرەدا بەواتای (وەک، مـانەندی و... لێک داوەتەوە، بەڵام لێرە واتای (ھەریەکە)، (ھەر کاتێ کە)... دەدات.

چون: چون: ھەرکە، کە.

بساط: کراوەی، ڕایەخی، سفرە و خوانی،

بسـاط: ناوی جـۆرە بەڕەیەکـە، یا ناوی (سـوجـادە)ی زۆر درێژ و تەسکە و بەپاڵ دیوارەکـانی ژووردا ڕادەخرێت بۆ لەسەر دانیشتنی کەسان بەچوار لای ژوورەکەدا.

(کوردی) لە ڕاگەیاندنی ئەم وشەی (بساط)ە مەبەستی لەو سفرە و خوانە پڕ پیت و خۆرشتی گیـانییەیە خوای بەخشندە لە شێوەی (قورئـان) پیرۆزدا، مرۆڤی پێ تێری بەھرەمەندی کرد یا کە پێغـەمبەری ئیسـلام ئەو سـفرەیەی بۆ پەیڕەوی کـارانی ڕاخسـتووە. ئەمـەش نیـشـانەیە بۆ ئایەتی ژمارە (١٩)ی سوورەتی (نوح) لە قورئانی پیرۆزدا کە خوای گەورە فەرموویەتی:

«واللّهُ جَعَلَ لَکُمْ الأرضَ بِساطاً».

واتە «خوا ئەم سەر ڕووی گۆی زەوییەی بۆ کردنە ڕایەخێک».

ھەر لە مـەیشـەوەیە کە یـەکێ لە ناوی ڕواڵەتە پیـرۆزەکانـی خـوای مـەزن، وشـەی (باسط) بەواتا (ڕاخـەر)ی نیعمەتە بۆ گیانداران و، کە لە ئایەتی ژمارە (٢٤٥)ی سوورەتی (البقرە)دا خـوای بەخشندە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

اللّهُ یَبْسِطُ الرزقَ لِمَنْ یَشاء».

واتە «خوا ڕۆزی (رزق) بەفراوانی ڕادەخات، دەبەخشێ بەوەی کە زاتی پاکی خۆی دەیەوێت»

هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا خوای کردگار (٢٥)جار ئەم وشەی (بساط)ەی بەچەند شێوەیەکی لە ڕوخساردا جیاواز و لە ناوەڕۆکدا یەک مەبەست ڕاگەیاندووە.
بەلای صۆفییەکانەوە، وشەی (بسط) زۆر گرنگ و پیرۆزە و یەکێکە لە زاراوەکانی ڕێبازەکانیان. وشەی (بساط) لە بارەی فەرهەنگییەوە بەزەوییەکی پانوبەرین و بەرفرە دەوترێ.
ئەمانە و گەلێ واتا و مەبەستی تر لەم ڕاگەیاندنەی (کوردی)ی ناو ئەم تاکە هەڵبەستە، ئاشکران کە هەموشیان لەگەڵ لێکدانەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەگونجێن.
عطایش: عەطا (بەخشندەیی)ی ئەو، لە ڕێنووسی کۆندا بەشێوەی (عطایش) نووسراوە.
شد: بوو. مەبەست لە ڕاخرانی سفرە (بساط)ی بەخشندەییە. ڕووی داوە، پەیا بووە.
مبسوط: ڕاخراو، ئاواڵە کراوە، بڵاوکراوە، کە مەبەست لە بەخشندەیی ئەو کاتەی فەرش ڕاخستنەکەیە و (مەبسووط) بووە و تا ئێرە ئەوە دەگەیەنێت کاتێ ئەو سفرەی بەخشندەییە ڕاخراوە لێرە دواوە مەبەستەکە دەدات بەدەستەوە.
(کوردی) لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەدا، ئەنجامی نیو باڵی یەکەمی تاکە هەڵبەستەکەی ڕاگەیاندووە کە فەرمووویە ئەو کاتەی کە ئەوانە ڕوویان دا کە لە نیو باڵی یەکەمدا بن. ئیتر ئەوسایە:
گشت فرش: ئا ئەو کاتە (فەرش)... بوو بە.
گشت: بوو، بوو بە، بووە.
فرش: ئەم وشەیە لە ڕووی فەرهەنگییەوە ئاشکرایە بەواتە (ڕایەخی)، دیسان (کوردی) (داو لە بن دانانەوە) و (یاری بەوشەکردنی) هێناوەتە کایەوە لە بەکارهێنانی وشەی (فەرش)دا کە زۆر چاک و پڕ بەپڕ لەگەڵ وشەی (بساط) و (مبسوط)دا دەگونجێت بۆ ئەم تاکە هەڵبەستە.
بەڵام داونانەوەکەی (کوردی) لەوەدایە کە وشەی (فرش) بەواتە (بێچووە حوشتر) کە بەسەر زاری واتای (بێچووە حوشتر) لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەم تاکەدا ناگونجێ بەڵام لە دواتردا ڕوونی دەکەمەوە کە ئەم واتای (بێچووە حوشتر)ەش دیسان دەگونجێ.
سخای: (بەخشندەیەتی) بەڵام بەخشندەیەتیی کێ؟
(کوردی) دەستبەجێ و لێرەدا وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە و فەرموویەتی:
(حاتم طی)- حاتەم پێچرایەوە، واتە (فەرش)ەکەی حاتەمی طەی (طەی کرا - پێچراوەیە، (کوردی) دیسان یاریی بە وشە کردووەتەوە لە دەربڕینی (حاتەم طەی)دا کە وەها پێ دەچێ ئەم دەربڕینە (حاتەم طەی)، دەبێ (حاتمی طەی) واتە: حاتەم لە خێڵی (طەی) بێت، بەڵام (کوردی) لێرەدا سەری لە خوێنەر و بیستەری ئەم ڕاگەیاندنە تێک داوە، چونکە وشەی (طەی) لەم ڕگەیاندنەیدا مەبەست لە (خێڵی طەی) نییە وەک لەسەر زاریدا وەها دەنوێنێ بەشکو مەبەستی لەم (طەی)یەی وشەی (طەی)ی بەواتە (پێچرانەوە)ی زمانی عەرەبییە.
ئەوا گریمان سەرمان دەرکرد لەم وشەی (طەی)یەی ناو ئەم دەربڕینە و زانیمان (حاتەم طەی) بوو پێچرایەوە و واتە فەرشەکەی پێچراوەیە کە ئەم وشەی (فەرش)ە دەتوانرێ (بەڕایەخ) بۆ

مـیـوانـەکـانی حـاتەمی بەخـشـندە دابنرێ و بەڵام بەهۆی ڕاخـرانی (بسـاط)ە بـەخـشـندەیی (عطاش)ەکـەی (خـوا) یا (پێـەمـبـەر)ەوە کـە دەقـەکـانی ئاینی ئیسـلامـە ئیـتـر ئەو فـەرش - (ڕایەخی) حاتمی طەی پێچرانـەوە؛ چونکە بەخشندەییەکانی حاتەم لە چاو بەخشندەییەکەی (خوا یان پێغەمبەر)دا کە ئیسلامەتییە بووەتە پێچراوە واتە فەرشەکەی پێچراوەتەوە.

بەڵام من وشەی (فەرش)م لە فەرهەنگەکاندا بە(بێچووە حوشتر)یش گواستەوە، ئێرە و دەزانین (فەرش) کە (ڕایەخ)ە دەپێچرێتەوە، ئایا (بێچووە حوشتر) چۆن دەپێچرێتەوە کە (کوردی) زۆر وەستـاکارانە گوتوویەتی (فـەرشی سـەخـای حـاتـەم بوو طەی) بێـچـووە، حوشـتـرەکـەی حـاتـەم پێچرایەوە بۆ ئەمەش حاتەم کە لە بەخشندەییە زۆرەکەیەوە بێچووە حوشتری بۆ (مێوانەکان) سـەربڕیوە و لەسـەر سـفـرە و خـوان پێـشکەشی کـردوون، کـە دیارە بەخـواردنی گۆشـتی ئەو بێچووە حوشترانە دەتوانرێ بگوترێ ئەو (فەرش - بێـچوە حوشتر)انە پێچرانەوە، خوران وەیا ئەوی خـورا ئەوا خـوراو ئەوی مـایەوە لەگـەڵ سـفـرە و خـوانەکە پێـچـرایەوە واتە (نەواڵە کرا) و ئەمـەش سـەرشـێـواندن کـاریـیـەکی تری (کـوردی) بوو لـە (یاری بەوشـە کـردن) کـە ئـەمـیش جوانکارییەکی ترە و دەچێتە سەر ئەو جوانکارییەی لەسەر ئەم تاکە هەڵبەستە لە پێشەوە بەر لەوەی دەست لە لێکدانەوەی واتـا و مەبەسـتی وشـەگەلی ئەم تاکە هەڵبەسـتـە هەڵگرم لە بارەی بەخـشـندەیـیـەکی تری ڕاگـەیاندنی خـوای گـەورەوە دەدوێم، کـە خـوای بەخـشـندە لە ئـایەتی (٢٢)ی سوورەتی (البقرە)ی قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

«الذي جعل لكم الارض فراشا».

واتە: «ئـەوەی- ئەو کـەسـەی کـە خـوایە سـەر زەوی بۆ کـردنە ڕایەخ» واتـە بۆی ڕاخـستن لە بـەرهـەمـی و رزقی ئـاژەڵی و ڕووەکی و سـروشـتی بـەهرەوەر بـن. هەرچـەندە نـاوەڕۆکی ئـەم ئـایـەتەی سـەرەوەش لـەگـەڵ ئـایـەتەکـەی ژمـارە (١٩)ی سـوورەتی (نووح)دا کـە لـە پێـشـتـرا پێشکەشم کرد ، جیاوازییـەکی ئەوتۆیان نییـە، بەڵام لە مـەبەستی بەرامبەر بە(بسـاط) چەشنە جیاوازییەکیان تیا ڕەچاو دەکرێت. ئەم تاکە هەڵبەستە:

ئەم تـاکـە هەڵبـەسـتـە کـە (١٣٧)یەمـینی ئەم حـەوت بەنـدە و (١٣)یەمین تـاکی ئەم بـەندی شـەشـەمەیە بـەپێی ئەوەندە سـەرچاوەیەی کە لەسـەری دەسـتم کـەوتوون و ژمـارە و شـوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە لە (جم، صا)دا نییـە و لە (ف)دا (٥١)یەمین تاکە و لە (ق/٣)دا (٥٤)یەمین تاکە و لە (جـم، ط)دا (٥٧)یەمـین و لـە (مک)دا (٥٩)یـەمـین و لە (ج، سـجـا، نم/١)دا (٦٠)یـەمین و لـە (بـا/١)دا (٦١)یـەمـین و لـە (مـع)دا (٦٧)یـەمـین و لـە (شـح، گل/٨)دا (٧١)یـەمـین و لـە (ص، گل/٥)دا (٧٤)یەمین و لە (گل/٣)دا (٧٥)یەمین و لە (مـا/١)دا (٧٦)یەمین و لە (گل/٦)دا (٧٧)یەمـین تاک و لە (عن)دا (٧٩)یەمین و لـە (مس، نع)دا (٨٥)یـەمین و لە (ن)دا (٨٧)یـەمین و لە (ھ)دا (٨٨)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

چون، لە (نم/١، با/١، حم، سجا، مک، ط، ج)دا نووسراوە (شد) کە بەواتە بوو، بەڵام وشەی (چون) کە بۆ ئێرە گونجاوترە و لە زۆرترین سەرچاوەشدا هەر (چون) نووسراوە.

عطاش، لە (سجا، نسخە، مک، ط، ج)دا نووسراوە (سخاش) ئەمەش جگە لەوەی لە (١٨) سەرچاوەدا هەر (عطاش) نووسراوە و، ڕاستترە، هەروەها (عەطا) هی خوای گەورە و (سەخا) هی بەندەیەکی وەک (حاتەم)ە بۆیە لەسەرەوە وشەی (عطاش)ەکەم جێگیر کرد وەک لێکم دایەوە دوو واتای (بەخشندەیی) و (تینوێتی) دەدات.

شد، لە (نم/١، با/١، حم، سجا، مک، ط، ج)دا نووسراوە (چون) بەڵام بۆ ئێرە (شد)ەکە گونجاوترە لە زۆرترین (سەرچاوە)یشدایە.

گشت، لە (سجا – نسخە)دا نووسراوە، گشتە، ئەمەش لە ڕووی ڕێزمانەوە گونجاو نییە.

فرش سخای، لە (نم/١، با/١، سجا)دا نووسراوە (فرش عطا) ئەمەش وەک لە پێشەوە ڕام گەیاند ناگونجێ و واتایەکی کورتترە؛ چونکە وشەی (سخا) لەگەڵ حاتەمدا پڕ بەپڕترە نەک (فرش عطا) بۆیە لەسەرەوەدا بەشێوەی (فرش سخا)م جێگیر کرد.

فرشی سخا، لە (مک، ط، ج)دا (فرش بساط) ئەمەش ناگونجێ و هەڵەیە و شێواوییە کە وشەی (فرش) وە (بساط) هەردوو یەک واتا دەدەن.

**واتای گشتی:**

هەر کە ڕایەخ (بساط)ی سفرە و خوان ئاسایی (بەخشندەیی)ی خوای گەورە و (باسط) بەناردنی قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەری ئیسلام و، (تەیکە)ی خۆرشت لەسەر خواردن لە پێشی ئیسلامەکاندا ڕاخرا و، یا هەرکە پێغەمبەری ئیسلام سفرە و خوانێکی پڕ لە هەر خواستەمەنییەکی وەک قورئانی پیرۆز و فەرمووده (حەدیثەکانی) و کردەوەکانی کە لە لایەن ئیسلامەوە بە(سوننە) ناوبراوە و هاوشانی دەقە (فەرض)ە ئیسلامییەکانە (پێغەمبەر) ئەوانەی وەک خۆراک لە سەر شوێنی خۆرست خواردن (تەیکە) خستنە بەر ئیسلامەکان ئیتر ئا لەو کاتەوە ڕایەخی ژێر مێوانەکانی حاتەمی طایی بەخشندە پێچرانەوە و، ئەو بێچووە حوشترانەی کە (حاتەم) بۆ مێوانەکانی سەر دەبڕین ئەمانەی حاتەم هەموویان پێچرانەوە؛ چونکە خوانە چاکترەکەی خوا و پێغەمبەر هاتنە ناوەوە کە ئیتر پێویست بەوانی حاتەم نەمان.

١٣٨– چند: چەند ژمارە، چەندێک.

نقشرا: نەخشێک، نەخشەها، مەبەست لە چەندین (وێنە، دیمەن، شێوە، شێوەکار، نەخش، نەخش و نیگار)ە.

نهان: شاردراوە، بەشاردراوەیی، پەنهان، پەنهانی.

بەدل دارم: لە دڵمدا هەیە، لە هزرمدا هەیە، وا لە بیر و هۆش و (خەیاڵ)مدا مەبەست لەوەیە ئەو نەخشانە پەنهانن (شاردراوەن) لە دڵمدا.

دارم: هەمە، هەیتم.

(کوردی) دوای دەربڕینی ئەم مەبەستەی ناوەڕۆکی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستە، چووەتە سەر نیو باڵی دووەمەکەی و، لە وێدا وەک جۆرە سکاڵایەک ڕازی دەروونی خۆی بەم چەشنە دەربڕیوە:

سوختم: سووتام ئەو سووتانەیش لە ئاکامی پەنهانیکردنی ئەو هەموو نەخشەی ناو دڵییەوەی مەبەستە.

صبر عاشقی تاکی: صەبری عاشقی هەتاکو کەی

تاکی: تاکەی ئەم سەبری دڵداری، هەتا کەنگی، هەتاکەی، تاکو کەی

لە تاکی (١٣٤)یەمیندا دووبارەیە دەستووری وێژە ناکات.

ئەم تاکە هەڵبەستە

ئەم تاکە لەم حەوت بەندە (١٣٨)یەمینە و ئەم تاکە لەم بەندی شەشەمەدا (١٤)یەمینە و شوێنیشی لە سەرچاوەکاندا بەم جۆرەیە:

ئەم تاکە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٥٢)یەمین و لە (ق/٣)دا (٥٥)یەمین و لە (حم، ط)دا (٥٨)یەمین و لە (مک)دا (٦٠)یەمین و لە (ج، سجا، نم/١)دا (٦١)یەمین و لە (با/١)دا (٦٢)یەمین و لە (مع)دا (٦٨)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٧٢)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٧٥)یەمین و لە (ما/١)دا (٧٧)یەمین و لە (گل/٣)دا (٧٦)یەمین و لە (گل/٦)دا (٧٨)یەمین و لە (عن)دا (٨٠)یەمین و لە (مس، نع)دا (٨٦)یەمین و لە (ن)دا (٨٨)یەمین و لە (هـ)دا (٨٩)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

ئەم تاکە هەڵبەستە لەناو سەرچاوەکانیدا بەشێوای دەخوێندرێتەوە و پاش و پێشیان تێدا ڕوودەدا، نێوەی دووەمی ئەم تاکە لە (عن)دا لەناوچووە.

نەقشرا، لە (گل/٣، گل/٨)دا نووسراوە (نفسرا) = نەفس = دروون کە ئەمەش بەشێوەی (نەفس) و، یا بەشێوەی (نەفەس) واتا نادات کە لەگەڵ هەڵبەستەکەدا بگونجێ.

نقشرا، لە (مک، ط، ج)دا نووسراوە (عشقش) = عەشقی ئەو، کە ئەمەش نابێ، چونکە لە نیو باڵی دووەمیشدا دیسانەوە (عاشقی) هاتووە و لە سەرچاوەکانی تردا پشتگیریی ئەم سێ سەرچاوەیە نییە.

نقشرا، لە (سجا، نسخە)دا نووسراوە (تقشی) و ئەمەش ناگونجێ.

نهان بەدل دارم، لە (سجا، نسخە، مک، ط، ج)دا نووسراوە (بدل نیهان دارم) ئەمەش ئەشی و پاش و پێشە بەڵام زۆر بەهێز نییە.

صبر عاشقی، لە (نم/١، با/١، ف، حم، مک، ط، ج)دا نووسراوە (صبرو عاشقی) و ئەمەش دەگونجێ و چونکە لە (١١) سەرچاوەی تردا واتە دوو سەرچاوە زۆرتر لەم سەرچاوەیانەی ئەم جیاوازییە، وەک لە سەرەوە، جێگیرم کرد، نووسراون و ئەگەر سەرچاوەکانی ئەم جیاوازییە زۆرینە بوونایە ئەمم جێگیر دەکرد.

**واتای گشتی:**

سکالاّ و گازندەی (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدایە کە چەندین وێنەی خۆشەویستەکەی ئایا بەڕاستی و یا بەخەیاڵ گرتووەتە دڵی خۆی و ئاڵوگۆڕی تیا کردوون، بەلاّم هەر خۆی بە(سووتان) ڕەچاو کردووە و ئاخی لەدەست (صەبر) کردنی عاشقی کردووە، کە ئەم دوو (بار)ی (صەبر) و (عەشق)ە لەگەڵ یەکدا ناگونجێن.

١٣٩- طور از جلوه: کێوی (طوور) لە پەڕتەوی واتە (جیلوە)ی خواییەوە.

ئەمە نیشانەیە بۆ خواستی حەزرەتی مووسا پێغەمبەر -د.خ- لە خوای گەورە کە خۆی پیشانی مووسا بدات و (خوا)یش بە(لن ترانی - نامبینیت) وەڵامی دایەوە و لە ئەنجامدا (خوا) پەڕتەوی خۆی ئاڕاستەی ئەو کێوە کرد- وە لە بەندی یەکەم و سێیەمی پێشتری ئەم حەوت بەندەدا بەدرێژی و بەدەستنیشانکردنی ئایەت و دەقەکانی ئاینییەکانەوە ئەمەم نووسیوە.

من زحال خضوع: من لە بارودۆخی (حالی) دەرباری و، خۆ بە(بەندەی گوێڕایەڵ) زانییەوە.

حال: زاراوەیەکی صۆفییانەی گرنگە و بریتییە لە (بار) و بۆ نێتییەکی تایبەتی دەروونی و گیانی، کە (دەروێش) و، یا (مورید) لە کاتی (ذکر) کردندا ئەوەندە بیر لە خوا و خواناسی و بەهرەمەند بوون بە(پەڕتەوی خوایی) دەکەنەوە کە ئەو بارە ئەندێشەییەیان بەسەردا دێت بەڕادەیەک ئاگەدارییان بەسەر خۆیانەوە نامێنێ، ئەوەندە هەست بەو دەرباریی (خوضوع)ە بۆ خوا و پێغەمبەر و دەقە ئاینییەکان دەکەن، لە ڕواڵەت هاتنە جۆش و خرۆشی گیانییەدا هۆشیان بەسەر هەموو ڕوشتە و بەندیوارییەکی خواستە چۆکی و شەهوانی و خراپکارییەکی ژیانی جیهانییانەوە نامێنێت و پەیوەندییان پێیانەوە دەپچڕێت وەک لە جۆر لە هۆش خۆ چوونێکدا دەبن. ئەم بەسەرهاتانە وەک (سەرما بوون) یا (گەرما بوون) وەهایە گەلێ جار زوو بەسەر دەچێ یان کەوا زوو بەسەر دەچێ. لەناو (صۆفی)یەکاندا بە(حاڵ) ناوبراوە.

بەلاّم ئەگەر هاتو ئەو بارودۆخە دەروونی و گیانییە، زوو نەبڕایەوە و درێژەی کێشا ئەوا لە (زاراوە - مصطلح)ی صۆفیگەریدا بە(مەقام) ناوی دەبەن کە ئەمەیان پلەیەکی بالاّتر و لە پێشتر و بەپێشکەوتوویی و سەرکەوتوویی تری دادەنێن لە ڕێبازەکەیاندا. هەروەها، ئەو (بەرە)ی صۆفییانە هەردوو (بار)ەکەی (حاڵ) و (مەقام) بە لەنێوان (بوون) و (نەبوون)دای ئەزانن و، بەلایانەوە نە(بوونی تەواوەتی)یە و، نە(نەبوونی یەکجارەکی) بەشکوو خۆشی و کامەرانییەکی گیانیی نزیکتربوونەوەیە لە خوا و، بەهێزبوونی بڕوایە بۆ بەجێگەیاندنی فەرمایشتەکانی خوا، سەرۆکایەتیی پێغەمبەری ئیسلام کە بەگەورەترین ڕێباز (طەریقەت)ە کەیانی دەزانن و سەرۆکی لەو لەخوارتر و لەویش لەخوارتر هەتا دەگاتە سەر ئەو (شێخەی) تەریقەتەکە یان کە تۆبەی داداون و بڕوایان وایە کە هەر لەو شێخەیانەوە هەتا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر هەموویان لە (دەروێش) و لە (مرید) (بە ئاگان) و بێ ئاگانین لە بیر و گوتە و، کردارییاندا لەو کاتەوە ئەو ڕێگەی طەریقەتەیان لەو شێخە وەرگرتووە.

لە ڕووی (دەروون) و زانیـاریشــەوە ئەم بڕوایە جــۆرە هاندەرێکی کـاریگەرە بـۆ کـەوتنـە ســەر ڕێگەی چاکـە و دوورکـەوتنەوە لە خـراپە. هـەر لەو کـاتی (حـال) یا (مـەقـام)ەدا جـۆرەها باری هـەست بە(ئاهـەنگ) یا بـە(ماتەمینی) یا بە(کراوەیی – بسط) یا (گیراوی – قبض) دەکەن کە بەسەر دڵیاندا دێت، بەپێی نزیکی یا دوورییانەوە لە ژیانی جیهانەکی.
ئەو صۆفییـانە بەلایانەوە وایە کە (حال)ەکە لە خواوە (مەوهیبـە)یە و (مەقام)ەکەیش دەسکەوتە بەپێی ڕۆچوون لە صۆفێتیدا بەرهەم دێت واتە (کەسب) دەکرێت.
ئەم هـەمـوو وشــە عـەرەبییــەی کـە لەم نووسـینەمـدا لەســەر (حـال) پێشکەشم کـردوون لەناو کـەوانەدا ئەوانە و وشــەگەلی تر، هـەمـوو (زاراوە)ی صــۆفـیـانەن و لـە خـوێندنەوەیەکی زۆرەوە لەسەر (صۆفیگەر)ی بەدەستم هێناون کە ئەم پوختە کورتەیەم لەسەر ڕاگەیاند.
خـضـوع: خـۆبەدەســتــەوەدان، خـۆ بەڕامـدانـان، بەیدەست بوون، بۆ هێـزێکی (خـوایی) توانا و کاریگەر.
خضوع: یش دیسـان (زاراوە)یەکی صـۆفـیـانەیـە، بارێکی ئەندێشـەییـە بەخـۆ دانان بەدەرباری خـوای گـەورە و دەربەست بوون بە، بەجـێگەیاندنی فـەرمـایشـتـەکـانی بەسـەرۆکایەتـیی هـەر لە خودی (پێغەمبەر)ەوە کە بەهەرە گەورەترین شێخی طەریقەتەکەیانی دەزانن، هـەتا دەگاتە سـەر ئەو شــێـخــەی کــە طـەریقـەتـەکـەی پێ داون و، تۆبـەیان لەســەر دەسـتـی ئەودا کـردووە و خـۆ بەدۆسـتـی هـەمـوو پەیڕەویکارێکی دروسـتـی ئاینی ئیسـلامی بەگشـتـی، و هـاوطـەریقـەتەکـانیـان دەزانن بـەتایبــەتـی. ئەم باری (خــضــوع)ەشــیـــان بەلاوە یەکــێکی گــرنگی هـەرە پێـویسـتـی صـۆفیگـەرییـەکەیانە کـە بناغـەی ئەم بڕوایەیش یـا لە (ترسـاندن)ەوە یا لە (هیـوا‌باری)یەوەیە، بەرامبـەر بەو گیـانە ئاسـمـانییـانەی کە زووتر خـۆیانیـان بۆ بەدەسـتـەوە داوە و بۆی بەیدەست بوون.
(کوردی)، تاکو ئێرەی ئەم نیو باڵی یەکەمەی سەرەوە لە دوو جۆرە ڕواڵەت دواوە کە:
ڕواڵەتی یەکەمیان:
لە کێوی (طوور) دواوە کە باسیم کرد.
ڕواڵەتی دووەمیان:
لە خـودی خـۆی دواوە لە (حـاڵی خضـوع)یدا کـە (نظریـە) و بڕوای صـۆفـییـانەم لەسـەر ئەم دوو ڕواڵەتە ڕاگەیاندووە و (کوردی) چووەتە سەر نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە و کاریگەری و ئەنجامی هـەردوو ڕواڵەتەکەی تیا ڕاگەیاندووە کە:
آن سیه گشت: ئەو ڕەش هـەڵگەڕا و، ڕەش بوو، ڕەنگی ڕەش داگەڕا.
آن: ئەو کە مەبەستی لە (کێوی طوور)ەکەیە.
سـیە: ڕەش مـەبەسـتی لەوەیە کە وەک لە پێشـەوە ڕام گـەیاندووە کە کێوەکە جیلوە (پەرتەو)ی خـوایی بـەرکەوت و سـووتا و بـوو بەکۆی زووخـاڵ و دامرکایەوە و ڕەش هـەڵگەڕا و شـاخـەکە بوو بەماددەیەک کە بەکوردی (کل) و بە فارسـی (سرمە) بەعەرەبی (کحل)ی پێ دەوترێ.

ئەم ڕستەیەی سەرەتای نیو باڵی دووەمە بەرامبەر بەڕستەی سەرەتای نیو باڵی یەکەم.
من برنگ بی منیش بەڕەنگی بەهی کە (زەردە).
وەک ڕەشــیی کـێـوەکــە لەو پەڕتەو بەرکــەوتنەوە بووە (زەردی)ی وەک ڕەنگی بەهـێـیــەکــەی.
(کوردی)یش لـەو (حاڵی خوضـوع)ەوە ڕووی داوە کە لە پێشەوە تا ڕادەیەک بەدرێژی لە (حال) و لە (خوضوع) دوام.
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەدا، خۆی بە ڕەنگ زەرد و زەبوون و، هەڵقرچاوی داناوە کە لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا لەو سووتان و بەئاگری عەشقەی خۆی ڕاگەیاندووە.

**جوانکاری:**

(کـوردی) لـە نیـوەی یەکـەمی ئەم تاکـەدا دوو جـۆرە ڕواڵەتی (کـێـوی طوور)، لە نـاو پەڕتەوی خـواییدا ڕەش هەڵگەڕاوە و، ئەمجا باری (حـاڵی خـوضـوع)ەکەی خۆی لە خـواناسیی ناخـەوەی کە وەک بەهێ ڕەنگی زەرد کـردووە، ڕاگەیاندووە. لە ڕووی جـوانکاریی وێژەییـانەی ئەم تاکەوە ئەبینین لە هەردوو نیو باڵەکەدا لەم تاکە هەڵبەستـەی سەرەوەدا دوو جـۆر (بار) یا (ڕواڵەت)ی پێـشـان داوە، کـە بـاری کـێـوی طوور لە ســەرەتای نـیـو باڵی یەکـەمـدا، بەرامـبـەری کـردووە بەڕواڵەتـی سـەرەتـای نیـو باڵی دووەم و هـەروەهـا باری کـۆتاییی نیـو بـاڵی یەکـەمی بەرامـبـەر کـردووە بەڕواڵەتی کـۆتاییی نیـو باڵی دووەم بەڕیزە، کە ئـەمـەیش لە (زاراوە)ی وێژەی کـۆندا بە(لەف و نەشـری مـورەتتـەب) ناوبراوە و تـوانایی و لێـهـاتوویی و وەسـتـایەتی شـاعیـر پیشـان دەدات وەک لەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدایە.
ئەم تاکـە لەم حـەوت بەندەدا (١٣٩)یەمین و لـەم بەندی شـەشـەمـەدا (١٥)یەمین و ژمـارەی ئەم تاکەش لە هەر سەرچاوەیەکیدا بەم جۆرەیە:
ئەم تاکـە لە (با/١، ج، جم، حم، سـجـا، صـا، ط، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نـیـیــە و لە (مع)دا (٦٩)یـەمـین و لـە (شـح، گـل/٨)دا (٧٣)یـەمـین و لـە (ص، گـل)دا (٧٦)یـەمـین و لـە (گـل/٣)دا (٧٧)یەمـین و لە (مـــا/١)دا (٧٨)یەمین و لە (ن)دا (٨٩)یـەمین و لـە (هـ)دا (٩٠)یەمـین تاکـــە و تەواوکاری تاکی پێشووە لە واتای ناوەڕۆکدا.
جیاوازیی ناوەڕۆکی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا نییە و لە هەموویاندا چونیەکە.

**واتای گشتی:**

وەک تەواوکردنی واتای تاکی پێـشـوو (کوردی) لەم تاکەدا، باری خـۆی و باری (کێوی طوور) بەنموونەی بەهـرەمـەندی بەئاکـامی بـوونی خـوا و خـواناسـی دەسـتـنیـشـان کـردوون، کـە کێوی (طوور)ەکە، لـە تین و تاوی بوونی پەڕتەوی خـواییـیـەوە کە بەر ئەو کـێـوە کەوتـووە سـووتاوە و ڕەش هەڵگەڕاوە و بەرامـبــەر بەویشـــەوە لە بەهرەی خـواناسـی و گـەیشـتـنە باری (حـــاڵ) و (خـوضـوع)ەوە. ڕەنگی ئەمـیش (کوردی) وەک ڕەنگی بـەهـێ زەرد هەڵگەڕاوە لە ترسـی سـزا لە خـواوە لە خەریک بـوون بەخواناسـی و (ذکر)ەوە ڕەنگەکەی زەرد بووە. ئەم تاکە هەڵبـەسـتـەیش لە تاکەکانی ئایندەدا هەر درێژەی هەیە لە هاوتاییدا هەتا کۆتاییی ئەم بەندی شەشەمە.

١٤٠- لیک: بەڵام، وەیا، دیسانەوە، هەروەها..
امـیـد لطف: هـیـوای نەوازش (دڵسـۆزی) - مـەبـەست لە (هـیـوابارى) بەچاودێریی خـوای میـهرەبانە، ئەمەیش نیشانەیە بۆ (حەوت ئایەتی قورئانی پیرۆز) کە ئایەتی ژمارە (١٠٣) لە سوورەتی (الانعـام) و ئایـەتی ژمـارە (١٠٠) لە سـوورەتی (یوسف) و، ئـایەتی ژمـارە (٦٣) لە سـوورەتـی (الحج) وە ئایـەتی ژمـارە (١٦) لـە سـوورەتی (لقـمـان) و ئـایەتی ژمـارە (١٩) لە سـوورەتی (الشـورى) و، ئـایەتی ژمـارە (١٤) لە سـوورەتی (الملک) و ئایـەتی ژمـارە (٣٤) لە سـوورەتی (الاحـزاب) کـە لە هەمـوویاندا (دوو) وشــەی (لطیف و خـبـیـر) هـاتوون، بەواتا: (میهرەبانی، نەوازشکار و پسپۆڕی ئاگەدار)، ڕاگەیەنراون.
وا گفتند: کراوە (وا) یان گوت.
وا: کراوە، والآم، (بەڕاشکاوی)، (نەپێچراوە)، (ئاشکرایی)،..
گفتند: گوتیان، وتیان، فەرموویان.
(کوردی) مەبەستی لەم (پێنج) وشەیەی نیو باڵی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە ئەوە بووە کە: بەڵام لە بەرامبەر (ڕستەی) (ئومێدی لوطف)ی پێغەمبەری ئیسلامدا، شارەزایان وشەی (وا) واتا (والآ، کراوە، بێ نهێنی، بەئاشکرایی، ڕوونکراوەیی، کراوەیی، ڕاشکاوێتی، نەپێچراوەیی بەژێر لێوەوە نەکردن، پشتگوێ نەخستن) یان، فەرمووە و، (وا) بەواتە (فەتح) سەرکەوتنە
وا: هەروەهـا ئەم وشــەی (وا)یە واتای (ئاوەهـا)، (واواوایی) (بـەم جــۆرە).... یش دەدات کــە هەموو ئەم واتایانەی وشەی (وا)یە لەگەڵ مەبەست و ناوەڕکی ئەم تاکە هەڵبەستە دەگونجێن.
(کوردی) خۆی واتای تێکڕای وشەکانی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی بەشادمانییەوە لەم نیو باڵی دووەمەیدا بەڕاشکاوی پێشکەش کردووە کە فەرموویەتی:
(رحمت هردو عـالم است هی هی) واتە: بەهیـوا بـوون بەچاودێری و نەوازشی ئەو پێـغەمـبـەرە بەم جـۆرە والآییـە، کوتراوە کە خـودی ئەو پێـغـەمـبـەرە مـایەی ڕەحـمـەتی = مـیـهرەبانی و دڵسۆزیی:
هەردوو: (جیهان)ە و ئەم هەردوو جیهانەی ئێرە مەبەست لەم ژیانی جیهانی و لەو جیهانەی لە دوای ڕۆژی هەسـتـان (قیامـەت)ە و ژیانی ناو دۆزەخ بەرامـبەر بەخراپیی کەسـان و ژیانی ناو بەهەشت بەرامبەر بەچاکیی کەسان.
(کوردی) لەم پیرۆزییەی ئەو پێغەمبەرەوە کە مایەی ڕەحمەتی هەردوو جیهانە و لە خۆشییاندا کـەوا (کوردی) خـۆی (مـوسـڵـمـان) و لـە پەیڕەوکـارانی ئەو پێـغـەمـبـەرە بووە، بۆیە بەهەمـوو شادمانییەوە بانگی (هەی هەی)یی لێ هەستاوە لە کاتی زۆر کامەرانی و بەختیاری و خۆشیدا ئەم (هەی هەی) و ئەم بانگی خۆشـییـە هەڵدەدرێ، دەسـتنیشـانکردنی ئایەتی ژمارە (١٠٧) سوورەتی (الانبیاء) لە قورئانی پیرۆزدا کە خوای بەخشندە و میهرەبان فەرموویەتی:
«وما أَرسلْناكَ إِلاّ رَحمَةً للعالمِين».
واتە (ئەی پێغەمبەری ئیسلام ئێمە تۆمان نەناردووە بۆ سەر مرۆڤ بۆ ڕەهبەری و ڕێنومایی

کردنیان مەگەر لەوەوە بووە کە ئەو ڕەحمەتی هەردوو جیهانەکەیت).
کە (ڕەحمەت)یش پیرۆزی بەهرەوەرکردنی خەڵکە بەچاکە. کە خوای میهرەبان لە پتر لە دە ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هەمان بیر و ناوەڕۆکی ئەم ئایەتەی تیا ڕاگەیانراوە، ئەمەش چەشنە جەخت لەسەر کردنێکە بۆ هەرچی زۆرتر جێگیرکردنی ئەو (ڕەحمەتێتی)ی پێغەمبەرە، ئەگەر لە ڕووی زانیاری و (نا ئاینی)یشەوە لە ژیانی ئەو پێغەمبەرە و کردار و گوفتارەکانی بکۆڵینەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو کەسێتییە گرنگە بەڕاستی (ڕەحمەت) بووە لە جیهاندا بۆ هەموو مرۆڤ و، مرۆڤی ئاراستەی هەرچی زووتر چاکە بووە، کردوویەتی.
ئەم تاکە هەڵبەستەیش یەکێکە لە تاکە بەهێزترین بەڵگەییەکانی ئەم حەوت بەندە کە بەڕاشکاوی و یەکسەر بۆ پێغەمبەری ئیسلام کە (محەمەد) بووە دای ناوە نەک بۆ (عەلی) یا (بەهائوڵڵا) چونکە ئەم دوانە کەسیان بە(رحمة للعالمین) نەناسراون و ئەم نازناوەیان پێ نەدراوە نەلە لایەن خوا نە لە لایەن کەسانەوە و بەتەواوەتی لە ڕواڵەتە یشیان نەبووە.
ئەم تاکە بۆ ئەم حەوت بەندە (١٤٠)یەمین و بۆ ئەم بەندی شەشەمە (١٦)یەمین و شوێنی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم جۆرەیە:
ئەم تاکە لە (با/١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نییە و لە (مع)دا (٧٠)یەمین تاکە و لە (شح، گل/٨)دا (٧٤)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٧٧)یەمین و لە (گل/٣)دا (٧٨)یەمین و لە (مـ/١)دا (٧٩)یەمین و لە (گل/٦)دا (٨٠)یەمین و لە (عن)دا (٨٢)یەمین و لە (مس، نع)دا (٨٨)یەمین و لە (ن)دا (٩٠)هەمین و لە (ه)دا (٩١)یەمین تاکە.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە ناوەڕۆکدا وەک تەواوکاری تاکە هەڵبەستی پێشوو وەهایە و هەروەها تاکەکانی ئایندەیش تا کۆتایی ئەم بەندی شەشەمە هەموو درێژە پێدانی ئەم تاکەی سەرەوەن و، لە هەموو سەرچاوەکانیشدا ناوەڕۆکیان چونیەکە و جیاوازییان لە نێواندا نییە.

**واتای گشتی:**

بەرامبەر بەبوونی هیوا بە نەوازشی پێغەمبەری ئیسلام بەڕاشکاوی ڕاگەیانراوە کەوا هەرخۆی (رحمە للعالمین) بووە لە خۆشی ئەم ڕاگەیاندنەوە (کوردی) بانگی خۆشی و کامەرانیی خۆی بە(هەی هەی) هەڵداوە و لە تاکە هەڵبەستی ئایندەشدا ڕوونتری دەکاتەوە.

١٤١- کف زنان: چەپڵە ڕێزان، چەپڵە لێدان (کوردی) دوا بەدوای بانگی (هەی هەی) هەڵدانە خۆشی و، بەختیارییەکەی، تاکە هەڵبەستی پێشووی، ئەوا لێرەدا بەدەم ئەو (هەی هەی) کردنەوەوە دەنگی لە چەپڵە کوتان داوە و، نەک ئەوە و بەشکو:
رقص کن: ڕەقص بکە، هەڵپەڕە، سووڕ بدە، سەما بکە، لەگەڵ چەپڵە ڕێزانەکەدا بەوەندەیشە نەوەستاوە کە خواستی:
مقام بخوان: واتە مەقام بچڕەی دەربڕیوە. ئەمجا وشەکانی ئەم نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکی سەرەوە بەم جۆرەیە:
کف زنان: بەچەپڵەلێدان.

رقص: هەڵپەڕین، سووڕدان، سەماکردن بەخۆشییەوە.
کن: بکە مەبەستی لە کردنی (ڕەقص)ەکەیە.
مـقام، چەشنێکە لە گـۆرانی گوتن، بەڵام مـەقـام دەسـتـووری مـۆسـیـقـیـی تایبـەتی قـووڵتـر و ڕێکوپێکتری هەیە لە گۆرانی.
بخـوان: بخوێنە- مـەبەست لە خوێندنەوەی نامە و نامیلکە و پەڕاوی نییە، بەشکو مـەبەست لە چڕینی (مەقـام)ەکەیە و، ئەم وشەی بخـوێنە تەنانەت بۆ چڕینی (بلبل) و (پەلەوەر)ی تریش هەر خوێندن بەکار هاتووە.
تا ئێـرە لێکدانەوەی وشـەگـەلی نیـو باڵی یەکەمـی ئەم هەڵبـەسـتـەی سـەرەوە بوو، لە خـۆشـی ئەمـیــشــەوە ئەوەتا لـە نیـو بالی دووەمـی ئەم تاکـەدا دەنگ لـەو هەمـووە بە(ڕاپـەڕە) دەکـات بۆ بۆنەیەکی ئاینی کە تیایا فەرموویەتی:
خـیـز: ڕاپەرە و، هەسـتـە و، ڕابەو، کـاتـی دانیشتن نییـە، دەمی ئاهەنگگێڕان و بەزمی خۆشـی بەرپاکردنە چونکە:
مژدە فرمود: مژدەی فەرموو، مژدەی دا، مژدەی گەیاند.
مـژدە: لە ڕووی فـەرهـەنگـیـیەوە بـەواتە، هـەواڵی خـۆشـی، مەبـەست لە ڕاگەیـاندنی هـەواڵێکی زۆر خـۆشـە کە مـایەی شـادمـانی بێت و ئەوی هـەواڵەکـەشی دەگـەیەنێت شـایـانی (مـژدانە) واتە بەخشیش پێدانە، لە پاداشتی ئەو خۆشی گەیاندنەیدا.
مژدە: لە ڕووی کەلەپووری ئاینییەوە ناوی پەڕاوییە پیرۆزەکەی ئاینـی (فەلەیەتی)ی (ئینجیل)ی حـەزرەتی عیـسـا پێـغـەمـبـەرە کە لە لایـەن چوار کـەسـی فـەلەی (پاکـتـرین) و (شـارەزاترین) مـەسـیـحـییـەوە کە بەڕێزان (مـەتتـا) و (یووحـەننا) و (لۆقـا) و (مـەرقص) بوون و هـەریەکەیان هـەرچیی بەدڵنیـاییـیـەوە لە دەمی خـودی (عـیـسـا پێـغـەمـبـەر -د.خ-) وە بیـسـتـرابێ و لێ وەرگـێرڕدرابێت زۆر بەدەست و دڵی پاکەوە بەسـاغی و زۆر بەئەمـانەتەوە نووسـیـویانە هەر لەو ساوە تا ئێستە بەهەموو (فەلە)کانی جیهان ئەو چوار بەشە (ئینجیل)ەیان پاراستووە و، دەقی نووسینەکانی ئەو چوار فـەلە پیـاوچاکە پاراسـتوویانە و من چەندین نوسـخـەی هەرە کۆنیم لە پەڕاویخانە ئاوەدانەکەی (ڤاتیکان)ی شاری (ڕۆما)ی پایتەختی ئیـتالیادا لە ساڵی حەفـتاکانی چەرخی پێـشـوودا پێ زانیـوە و، لەمـەو پێشی ئەو پەڕاوییـەشـدا جـارانی تر لە (ئیـنجـیل) واتە (مژدە) دواوم و لەم حەوت بەندەیشدا (کوردی) جاری تر ناوی بردووە.
فرمـود: فەرمووی، گوتی و مـەبەستی لەوەیە (مژدەی دا). (کوردی) دوا بەدوای ئەو (فـەرمـوودە = مژدەی داوە)یە مژدەدەرەکەی ڕاگەیاندووە کە (حەزرەتی عیسا پێغەمبەر -د.خ-)ی مەبەست بووە لەبەر هـاتنی ئەم ناوی (عیـسا)یە بوو کـە وشـەی (مـژدە)کەم بە(ئـینجیلی) پەڕاوی پیـرۆزی (مەسیحی)یەکانیش لێک دایەوە.
عیساپی: (عیسایەی) لەم ڕاگەیاندنەدا (ناوی):
(عیسا)یەکـەیان ئاشکرایە کە دواترینی هەمـوو پێغـەمبەرانە جگە لـە پێغەمـبەری ئیـسلام و لەم

پەڕاوییەدا زۆریم لەسەر نووسیوە و بۆیە لێرەدا لەمەندە پتری لەسەر ناڕۆم.
پی – ئەم وشەیە کە لەمەوپێش بەدرێژی لە چەند تاکە هەڵبەستێکی تری ئەم بەندی شەشەمەدا لەسەریم نووسیوە و لەگەڵ ئەوەشدا چەند واتایەکی تری وشەی (پی) لێرەدا دیاری دەکەم کە بۆ ئەم شوێنە دەگونجێن وەک:
پی: پێ (پا = قاچ) هی ئەو، بۆ ئەو، ئەڕای، ژبۆ، شوێن پێی ئەو، کە (عیسا)یەکە بووە، شوێنەوار (ی عیسا یەسووع) نیشانە، هەروەها (پی) بەواتە (تەلی تار) کە (تار) ئامێرێکی مۆسیقییە کە (ژی)یش دەگرێتەوە، جگە لە واتاگەلی هەست = (دەرک = ئیدراک)، پیرۆز، موعجیزە و.... کە ئەمانە هەرکامێکیان بەجیاواز لەم تاکە هەڵبەستەدا واتای گونجاوی خۆیان دەدەن و ئەمەش وردی و قووڵیی (کوردی) دەگەیەنێ لە زمانەوانیدا کە لە چەندین شوێنی تری ئەم پەڕاوییەدا لەم جۆرە وشە فرە واتایانەی لە هەڵبەستەکانیدا ڕاگەیاندوون.
(کوردی) لەم (مژدەی عیسا)یەدا نیشانەی بۆ پێشبینییەکەی (حەزرەتی عیسا –د.خ–) کردووە کە ئەم پێغەمبەر هاتنەوەی جارێکی تری بەپێغەمبەرێتی کردووە بۆ هێنانەوەی گومڕایان بۆ سەر ڕێگەی ڕاستی خواناسی و پەرستنی و پەیڕەوی کردنی فەرموودەکانی خوا کە لە ئایەتی ژمارە (٦)ی سوورەتی (الصف)ی قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:
«ومُبَشّراً بِرَسوْلٍ يأتي مِنْ بَعُدي إِسْمُهُ أَحْمَدْ»
واتە «وە مژدە دەرم بەدەرکەوتنی پێغەمبەرێک کە لە دوای خۆمەوە دێت و ناوی ئەحمەدە».
ئاشکرایشە کە (ئەحمەد) و (محەمەد) هەردوو ناوی پێغەمبەری ئیسلامن و جگە لە چەندین پێشبینیی پێغەمبەرانی تری لەم بابەتە بەم یا بەو شێوەی تایبەتی خۆیان کە هەموو ئەم واتایەی سەرەوە دەدەن وەک لە لایەن (داوود، ئەشمیا، دانیال، زەکەریا و... هتد –د.خ–) جگە لە پێشبینییەکەی زەردەشت پێغەمبەر کە لە پێشترا زۆر بەدرێژی لێی دوام لە بارەی پەیابوونی (عیسا) و (محەمەد)یشەوە دروودی خوایان لێ بێت، و سەرەڕای پێشبینی کردنی چەندین کەسانی تری وەک (قەشە بوحەیرا) و (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)ی خاڵی (خاتوو خەدیجە)ی یەکەم خێزانی محەمەد و (کەعب کوڕی لوئەی)ی باپیرە گەورەی خودی (محەمەد) و (سەلمانی پاک)ی پیاوچاکی کورد و، کێ و کێ و.... هتد کە مژدە و پێشبینیی دەرکەوتنی ئەم پێغەمبەری ئیسلامەیان ڕاگەیاندووە و (کوردی) لەو مژدەیەوەیە کە بانگە (هەی هەی)یەکەی خۆی هەڵداوە و خواستی چەپڵەڕێزان و سووڕدان و سەماکردن و مەقام و گۆرانی و سروود چڕینی کردووە و لە خۆشییاندا کە وەک ئامادەکارییەک بۆ دووبارە کردنەوەی دووتاکە (فارسی) و (عەرەبی)یەکەی خۆی کەوا کۆتاییی هەریەکێ لە بەندەکانی ئەم حەوت بەندەوە دوو پاتە دەکرێتەوە.
**ئەم تاکە هەڵبەستە:**
ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (١٤١)یەمین و (١٧)یەمین تاکی ئەم بەندی شەشەمەیە و ژمارەی هەریەکێ لە تاکەکانی ئەم هەڵبەستە لە هەر سەرچاوەیەکدا بەم جۆرەی دواییە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی: (با/١، ج، جم، حم، سجا، ص، صا، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نییە و لە (مع)دا (٧١)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٧٥)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٧٨)یەمین و لە (گل/٣)دا (٧٩) هەمین و لە (ما/١)دا (٨٠)یەمین و لە (گل/٦)دا (٨١)یەمین و لە (عن)دا (٨٣)یەمین و لە (مس، نع)دا (٨٩) هەمین و لە (ن)دا (٩١)یەمین و لە (ھ)دا (٩٢)یەمین تاکە و، لە رووی ناوەڕۆکەوە لە هەموو سەرچاوەکانیدا چونیەکە و جیاوازییان لە نێواندا نییە.

**هەڵسەنگاندن:**

ئەم تاکە هەڵبەستە بەڵگەیەکی زۆر بەهێزە کە ئەم حەوت بەندە بەتایبەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام دانراوە، وەک حەزرەتی عیساش مژدەی هاتنی داوە و کەواتە بۆ (عەلی) یا (بەهائوڵڵا) دانەنراوە و عیسا پێغەمبەر ناوی (عەلی) یا (بەهائوڵڵا)ی نەبردووە و ئەوانی تریش کە پێشبینییان کردووە ناوی ئەو دووانەیان نەهێناوە.

ئاڵوگۆڕ لە نووسیندا:

کۆتاییی نیوەی یەکەمی تاکی یەکەمی بەندی (یەکەم) لەو حەوت بەندە کە (مەوسمی دەی)یە لەوێدا بەهەڵەی ئەم (عیسا پەی)یە نووسرابوو، کە ڕاستم کردووە بەهۆی سەرچاوەی بەهێز و باوەڕپێکراوی زۆرەوە.

**واتای گشتی:**

دوا بەدوای تاکی پێشوو لێرەدا (کوردی) خواستی چەپڵەڕێزان و سەماکردن و سووڕدان و مەقام چڕینی کردووە کە جۆرە گۆرانییەکە و دیارە (سروود ئاسایی)ی مەبەست بووە، چونکە حەزرەتی عیسا مژدەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامی داوە.

١٤٢- کوردی لە کۆڕی ئاهەنگە خۆشەکەی مژدەدانی (حەزرەتی عیسا -د.خ-)دا بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام -د.خ- بەگەڕاندنەوەی خودی عیسا... کەوا لە چەپڵەڕێزان و سەماکردن و سووڕدان و مەقام چڕیندا بوون وەک لە تاکی پێشوودا فەرموویەتی، ئەوا لێرەدا ڕای گەیاندووە کە: نی عجب: عەجایب نییە.

نی: نە، نییە.

عجب: سەرسامی، مایەی سەرلێسووڕمان نییە کەوا

مست دست اوهستم: واتە مەستم لە بادەی دەستی ئەوەوە کە پێغەمبەری ئیسلام -د.خ-یە بەڵام بۆ چ؟ چونکە لەو کۆڕ و خۆشیی ئاهەنگە خۆشەدا کە:

ساقی او: ئەو کە، بادەکە ئەوا (ساقی) مەیدەر هەر ئەو خۆشەویستەیە،

ساز ازو: ساز و ئاوازی مۆسیقە و گۆرانی لەوەوە کە خۆشەویستەکەیە.

زخود را می: بادە (مەی)ەکەیش هەر لە خودی خۆیەوە کە دیسان هەمان خۆشەویستە.

ئەوەی کە لەسەر یەک بەیەکی وشەکانی ناو ئەم تاکە هەڵبەستە لێکم داوەتەوە، لێکدانەوەیەکی فەرهەنگی بوو. بەڵام کە (کوردی) وەک صۆفییەک لە دانانی ئەم حەوت بەندەدا هاتووەتە جۆش

و خرۆشەوە. پێویستە کە ئاوڕێکیش لەم باری (صـۆفیگەرییـە) بدەمەوە لەم لێکدانەوەیەمدا کە بەپێی ڕەوشتی صـۆفیانە و (فەلسەفە) یا (بەرنامەی ڕێبازی صـۆفیگەری) دەتوانم وای دابنێم کە (کوردی) خۆی لە (پایە) یا (بارودۆخی مەقام)ی صۆفیگەریدا، دیوەتەوە، کە گەیوەتە دانانی ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە کە ئەوەتا لە نەبوو ئاهەنگێکی یەکجار خۆشی ئەوتۆی بە(هزر)ی خـۆی ڕاگـەیاندووە کـە هەرچی پێـویست بێ بۆ هـەرە خـۆشـتـرین ئـاهەنگ، هـەمـووی لەو ئاهەنگەیدا ڕەخسـاندووە و خۆی یەکسـەر لە بادەی دەسـتی خۆشـەویسـتـەکەی بەمـەسـتـترین زانیـوە کـە بەهـەمـوو بڕوایەکـەوە کـە (بادەدەر) (سـازو ئاواز ڕێکخـەر) و تەنـانەت خـودی (بادە)کەیش هەر لە هەمان خۆشەویستەوە بووە، کە ئەو (خۆی)یا ئەو خۆشەویستە مەبەست لە خـوای گەورە و بـادەدەر واتە فـەرمـاندەر بووە لە ئایـەتەکانی قـورئانی پیـرۆزدا و هـەر ئەو بۆ بڕواهـێنـان ئەو ژیانـە بەهرەمــەندیی پەیڕەوی کــاری ئەو ئایەتانەی وەک ســاز و ئـاوازی ئەو بەهرەوەرییە ڕەخساندووە و گەیوەتە ئـەو ڕادەیەی کە صۆفیگەران (قسە بزرکاندنی)ی خۆیان بە(شطحیات) ناوبردووە، (کوردی)یش کەوتووەتە (شطحیات) دەربڕین کە تەنانـەت ئەو خوایە یا ئەو فـەرمـایشــەی خـوا کـە قـورئانە بەخـودی (بادە – مـەی)یەکەی دیـاری کـردووە، لە لایەکی تری ئەو خۆشەویستـە دەتوانرێ بەپێغـەمبـەری ئیسـلام و ڕاگەیاندنی قـورئان و فەرمـوودەکانی خـۆی کردەوە (سـوننەت)ەکانی بە بادە و ئیسلامـەکان وەک خـۆی (خودی کوردی) سـەرخـۆشی ئەو دەقە ئاینییانە زانیوە و ساز و ئاوازی خۆشی گیانی، گوێی بڕوای زرنگاندووەتەوە.

**ئەم تاکە هەڵبەستە:**

ئەم تاکە هەڵبـەسـتە لەم حـەوت بەندەدا (١٤٢)یەمـینە و بۆ ئـەم بەندی شەشـەمـە (١٨)یەمـینە و ژمارەی لە سەرچاوەکاندا بەم چەشنەیە:

ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـە لە سـەرچاوەکـانی (با/١، ج، جم، حم، سـجـا، صـا، ط، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نییە و لـە (مع)دا (٧٢)یەمین تاکە و لە (شح، گل/٨)دا (٧٦)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٧٩)یەمـین و لە (گل/٣)دا (٨٠)یەمـین و لە (گل/٦)دا (٨٢)یەمـین و لە (مـا/١)دا (٨١)یـەمین و لـە (عـن)دا (٨٤)یـەمـین و لـە (مـس، نـع)دا (٩٠)یـەمـین و لـە (ن)دا (٩٢)یـەمـین و لـە (ه)دا (٩٣)یەمین تاکە.

**جیاوازییەکان:**

مست، لە شح، گل/٥، مع دا نووسراوە من کە مست.

او هستم، لە (شح، گل/٥، مع)دا نووسراوە: اوباشم.

ساقی او، لە (شح، گل/٥، مع)دا نووسراوە ساقی خود.

سازازو، لە (شح، گل/٥، مع)دا نووسراوە سازو اوازخود.

زخود را می، لە (شح، گل/٥، مع)دا نووسراوە: خودمی.

بەڵام لە سـەرچاوەی (مس)دا لەسـەر ئـەم تاکە هەڵبـەسـتـەی سـەرەوە ئەم پەراوێزە فـارسـیـیـە ڕوونکەرەوەیە پەسند و وێژەییـەی دوایی نووسـراوە کـە هەمـوو جیـاوازییـەکانی سـەرەوەشی

گرتووەتە خۆ و (شی)ی کردوونەتەوە کە:

«در نسخەئی کە اول امر بصورت آتی این بیت را بست اوردم موضع گمانم گشت:

نی عـجب من کـە مـست دست او باشم

ساقی خـود، ساز و آواز خـود، خودمی.

اما خوشبختانە بهمت (مستعد) و ادب دوست عزیزم ملا عبدالغفور الانی نسخە دیگر اتی را یافتم کە درستش می یابم:

نی عـجب مـست دست او هسـتم

سـاقی او، سـاز از و زخـودرامی

زیرا در (نسـخـەء اول) کلمـەء (أو بـاش)میـتـوان بـصـیـغـەء (أو بـاش) خـواند کـە بمعنی (مـرد فـرومـایـە و بی تربیت و پست) است و شـایسـتـەء شـاعـری غرای چون کردی نیسـت و کلمـەء (مست) با (دست و مست)، و (او) با (ازو) هماهنگند، زیادە از ناموزونی نسخەء أول).

واتە:

(لەو نوسـخـەیەدا کـە لە سـەرەتاوە بەم شـێوەیەی دوایی بـەدەستم هێنا، بوو بەمـایەی گومـان لێ کردنیم:

(نی عجب من کە مست دست او باشم،

ساقی خود، سازواواز خود، خود می)

بەڵام خۆشبەختانە بەکۆششی یەکێ لە قوتابییەکانم کە لە پلەی موستەعیدیدایە و، وێژەدۆستە (مـەلا عـەبدولغـەفووری ئالانـی) خـۆشـەویسـتم، نوسـخـەیەکـی تری دواییم پێ گـەیشـت، کـە من بەدروستی تێ دەگەم:

(نی عـجب مـست دست اوهـسـتم،

سـاقی او، سـاز ازو، زخـودرامی)

کە لە (نوسخەی یەکەم)دا (او باش) بەشێوەی (ئەو باش) بخوێندرێتەوە، کە بەواتا: (پیاوی بێ مایە و ناکەس و بێ پەروەردە و پەست و بەدسروشت)ە و ئەویش شایانی کەڵە شاعیرێکی وەک (کوردی) نییە و هەروەها وشەی (هەست)ی نوسـخـەی دووەم لەگەڵ (مست) و (دست) و وشـەی (او) لەگەڵ (ازو) هـاوئاهـەنگن و سـەرەڕای لەنگیی کێشـی نوسـخـەی یەکەم).

**جوانکاری:**

وەک لەم تاکـەی سـەرەوەداو ڕوونکردنەوەکـەی ئەم پەراوێزە فـارسـییەدا دەرکـەوت کـە (کـوردی) جیناس ئارایی لە وشـەی (مـست و دست و هست)دا وە، وشـەی (او) وە (ازو)دا کـردووە کـە لە دەستووری وێژەی کۆندا پەسند بووە.

**واتای گشتی:**

مایەی لێ سەرسام بوون نییە کە مەبەستی بادەی دەستی ئەوم و هەر ئەویش خۆی بادەدەر و

خۆی ساز و ئاوازی ئاهەنگی ئەو مەستییە و ئەو مەیەی خواردوومەتەوە و دەیخۆمەوە و لە خودی ئەو خۆشەویستەمەوەیە.

١٤٣- ای خوشا: ئەی خۆش بۆ...، ئەی خۆش لە...، ئەی بەو خۆشی (شادی)یەوە.

وقت: کات، دەم، سات، گاڤ و لێرەدا مەبەست خواستنی خۆشییە بۆ ئەو کاتەی وەک: (خۆشی بەو کاتەی کە). ئەو سایەی، ئەو سەردەمەی.

آنکه حاصل کرد: ئەوەی کە گەیشت، ئەوەی بەدەست هات و مەبەستی لەو کاتەی ئەو کەسەیە کە بەدەست هاتووە، کە بۆی ڕێککەوتوون ئەو کاتەی کە بەدەستی هێناوە. کام کات؟

دوستی باسگان: ئەو کاتەی کەوا بۆی ڕەخساوە کە تیایدا دۆستایەتیی گرتبێ لەگەڵ سەگەکانیدا...

درگەوی دەرگانەکەی ئەو، مەبەست لە ئاوات خواستنە بۆ ئەو کاتە خۆشەی کەوا بۆی هەڵکەوتووە کە توانیویە دۆستایەتی لەگەڵ سەگەکانی بەر دەرگانەی بارەگای خۆشەویستەکەیدا بگرێت.

(کوردی) لە زۆریی خۆشویستنی بۆ کەسە دڵخوازەکەیەوە ئەو ئاواتەی خواستووە کە ئەگەر توانیی ئەو دۆستایەتییە لەگەڵ سەگەکانی بەر دەرگانەکەی ئەو دڵخوازەیدا پەیا کرد، ئیتر ئەوسایە مەترسیی لەو سەگانە نابێت کە یا بەئاشکرا وە یا بەنهێنی بری پەلاماری (کوردی) بدەن.

ئەم ڕاگەیاندنی (کوردی) لەمەندە قووڵترە کە بەمەندە لێکدانەوەیەی پێشەوە ڕوونم کردەوە، چونکە لە چاو پیاخشاندنی هەڵبەستەکانی هەر شاعیرێکی ناوچەکەمان و بەتایبەتی هی شاعیرە کوردەکانمان ئەوە دەزانین کە ئەو شاعیرانە لە زۆربەی هەڵبەستە (دڵداری) یا (ئاینی)یەکانیاندا سکاڵایان لە کەسێک کردووە بەناوی (ڕەقیب)ەوە وە بەچەندین جۆر گازندەیان لەو (ڕەقیب)ە کردووە و لێرەدا (کوردی) بەپێی لێکدانەوەیەک ئەو ڕەقیبانەی چواندووە بەسەگی بەر دەرگانەی خۆشەویستەکەی و، ئیتر ڕێگای توانینی دیتنی دڵخوازەکەی بۆ ئاسان بووە، واتە سەگەکان (خودی ڕەقیبەکان)ن. لە لایەکی تریشەوە دەتوانرێت وەها لێک بدرێتەوە کە بەهۆی ئاشنایەتییەوە لەگەڵ ئەو سەگانەدا ئەو لە یەکێ لە خراپەکانی بەر ڕێگای دڵخواز بینیندا ترسی نامێنێ و بەلای کەمەوە (کوردی) بەهۆی ئەوەوە کە سەگەکان بەبێگانە و دوشمنی نازانن و لێی (ناوەڕن) کە بیکەن بەهەرای سەگوەڕ، بوونی (کوردی) لەبەر ئەو دەرگانەیەدا ئاشکرا بکەن و دەستوپێوەندی خۆشەویستەکەی (کوردی) بەدەنگی سەگوەڕەکەوە بێن و (کوردی) دەربکەن. هەروەها لە لایەکی ترەوە (کوردی) بەو ئاشنایەتییە لەگەڵ ئەو سەگانەدا دڵنیا دەبێت کە ئەو سەگانە پەلاماری نادەن و نایگەزن و بواری ئەوەی دەبێ لە کاتی هاتنە دەرەوە و چوونە ژوورەوەی دڵخوازەکەیدا، لەو بەر دەرگایەدا (کوردی) ئەو دڵخوازی ببینێ و دڵی دامرکێ.

ئەمجا لەبەر ئەوەی کە ئەو (باسی) ناوبردنی ڕەقیبانە لە هەڵبەستەکاندا یەکجار زۆرە،

(کوردی) بەشێوەیەکی تر لە (ڕەقیب) دواوە بەبێ ئەوەی کە ناوی (ڕەقیب) لە هەڵبەستەکەیدا بهێنێت و ئەمەش جۆرە دۆزینەوەیەکی بیرورِا دەربڕینە کە بەشێوەیەکی نوێ و، ئای ڕەقیبی بەسووک ڕاگەیاندووە کە کردوویەتی بەسەگ و، ئای خۆی ئەوەندە بەسووک زانیوە کە ئاواتی بەخۆشیی ئەو کاتە خواستووە کە دەرفەتی گەیشتنە بەر دەرگای خۆشەویستەکەی خۆی هەبێت ئەمەش لە لایەکی ترەوە وەک گوتبێتی: زۆر زۆرم ئەو دڵخوازەم خۆش دەوێت (وەهایە).... ئەم چەشنە شێوەی دەربڕینە نوێیەش توانایی شاعیرمان دەگەیەنێ.
وەیا بەم شێوە دەربڕینە (کوردی) ئاواتە خوازی (چوونە حەج) بووە و ئەو هۆیانەی چوونە حەجەکەیان دواخستووە بەسەگی داناون.
ئەم تاکە هەڵبەستە کە (١٤٣)یەمینی ئەم حەوت بەندەیە و هەروەها (١٩)یەمین تاکی ئەم بەندی شەشەمەیە و ژمارەی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم شێوەیەیە:
ئەم تاکە لە دوو سەرچاوەی (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٥٣)یەمین و لە (ق/٣)دا (٥٦)یەمین و لە (حم، ط)دا (٥٩)یەمین و لە (مک)دا (٦١)یەمین تاک و لە (سجا، نم/١)دا (٦٢)یەمین و لە (مع)دا (٧٣)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٧٧)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٨٠)یەمین و لە (عن)دا (٨٥)یەمین و لە (گل/٣)دا (٨١)یەمین و لە (گل/٦)دا (٨٣)یەمین و لە (ما/١)دا (٨٢)یەمین و لە (مس، نع)دا (٩١)یەمین و لە (ن)دا (٩٣)یەمین و لە (ھ)دا (٩٤)یەمین تاکە.
بەهۆی ئەوەوە جیاوازی لە ناوەڕۆکی سەرچاوەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەدا نییە، بۆیە هەموویان چوونیەکن.

**واتای گشتی:**

ئەی خۆشی لەو کاتەی کە بەدەست دەهێنرێ بۆ ئەو کەسەی کە بتوانێ دۆستی و ئاشنایی لەگەڵ سەگی بەر دەرگانەکەی دڵخوازدا بگرێت، تاکو بەبێ ڕێ لێگرتن ئەو کەسە بگاتە بەر ئەو دەرگانەیە و بەشکو ئەمە خوایە دەرەتانی ئەوەی هەبێ جار جارە خۆشەویستەکەی ببینێ بەبێ ترسی (سەگوەڕ) و ئاشکرابوونی و بەبێ مەترسیی قەپی ئەو سەگانە. لەوانەشە ئەم تاکە ئاواتە خوازی (کوردی) بێ بۆ چوونە حەج، بەڵام بۆ ڕێک نەکەوتووە کە حەج بکات، لەوانەیشە ئەم تاکە هەڵبەستەی بەر لە چوونە حەج دانابی و، پاشتر چووبێ بۆ (حەج)، بەڵام من ئەوەندەم بەڵگەم دەست نەکەوتوون کە بەڕاشکاوی بنووسم (حەجی کردووە).

١٤٤- همە ذرات: هەموو گەردیلەکانی

جسم و جان: لەش (جەستە) و گیان (ڕەوان).

پرجوش: پڕ جۆش و خرۆش.

پڕ: پڕی، تەژی، مشت.

جوش: ئارەزووی هەستانێکی زۆر بەهێز و تین و تاوی دڵداری گیانی.

(کوردی) ئا ئەمانەی پێشووی بۆیە ڕاگەیاندوون کەوا لەبەر یا بەهۆی:

از پی ذکر اوست پی درپی: بەردەوام لە زیکری ئەو دایە.

ذکر: جۆرە دووبارە کردنەوەیەکی صۆفیگەرییە لەناو، لە ڕواڵەتەکانی خوا و سوپاسگوزاری و بڕوایی بەخوا و بەئاینی ئیسلام دەربڕین و پاڕانەوە لە خوا و پێغەمبەر و خوێندنەوەی چەندین ئایەتی قورئان و گوتەی بەهێزی ئاینییە لە لایەن دەروێش و مریدان و شێخانی طەریقەتەکانەوە کە لەمەوبەر بەدرێژیتر لەم پەڕاوییەدا ئەم وشەی (ذکر)ەم (شی) کردووەتەوە.

اوست: هەی ئەوە، بۆ ئەوە ئەوی ئەوە وەک زیکرەکە... یا ئەوی زیکری بۆ کراوە

پی در پی: پەیتا پەیتا، یەک بەدوای یەکدا، لێگا لێگا، پەی دەرپەی.

(کوردی) لە کەلێنی ئەم تاکە هەڵبەستەیەوە، وەها دێتە بەرچاو کە لە بارێکی صۆفیگەری و پایەکانی صۆفیگەری وەک (مەقام، ویجد، جەذبە، ئیتیحاد)ی ئەوتۆدا بوو کە هەرچی گەردیلکەکانی پێکهێنەری (لەش) و (گیان)ی هەبوون، هەموو بەجارێ سیخناخی جۆش و خرۆشی زۆری خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەر و دەقەکانی ئاینی ئیسلامدا بووە و خۆی دانی بەوە داناوە، کە ئەو هەڵچوونی هاتنە جۆشەی لە زۆری (ذکر) کردنەوە و هەرچی زۆرتر ئارەزووی زیکر کردنی هەمیشەییەوە بووە. بەڕادەیەک کە لەش و گیانی خۆی بەجۆرە هەڵوەشاوەیەک دیوە کە تەنیا هەر لەشێوەی گەردیلکەدا بوون و بۆیە وەک ڕای گەیاند (کوردی) لەو چەشنە پلە و پایەی صۆفیگەرییانەیدا بووە و هۆشی بەسەر خۆیەوە نەماوە و چووەتە جیهانێکی گیانیی هەرە باڵای پاک و ڕاستەوە لە دەروازەی ئەوەدا بوو.... کە لە تاکی ئایندە بەدواوەوە جووتە تاکە هەڵبەستە (فارسی) و (عەرەبی)یەکەی خۆی کە ئەم حەوت بەندەیان پێوە ناسراون و لە دوای هەریەکێ لەم حەوت بەندەدا دووبارە کراونەتەوە کە لە دوای تاکی ئایندەوە دووبارەی کردوونەتەوە.

(کوردی) ئا لەوبەر دەروازەی ئەو دوو تاکە هەڵبەستەیدا کە خۆی لە هەموو کەس چاکتر زانیوە چی واتایەک دەدەن ئا لەویدا کەوتووەتە ئەو بارە گیانییە خۆشە صۆفیگەرییەوە. لەو زیکرە پەیتا پەیتا (دەست بەدەست)ەیدا کە چووەتە ئەوپەڕی جیابوونەوە، لە هەموو ئارەزوویەکی (جیهانەکی) و ئەو گەردیلکانەی لەش و گیانی ئەو هاتنە جۆشەیان لە زۆریی خۆشویستنی دڵخوازەکەیەوە بووە (کوردی) خستووەتە بارودۆخێکی هەرە قووڵ و لە ناخەوەی دڵداریدا کە هەر ئەوەندەی مابوو کە وەک (مەنصووری هەلاج) هاوار و بانگی گوتە بەناوبانگە (انا الحق)ەکەی هەڵبدات، چونکە ئەگەر لە ڕووی بیروڕا و بۆچوون و فەلسەفەی صۆفیگەرییەوە لەم تاکە هەڵبەستە لە خودی (کوردی)ی ئەو کاتی دانانی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا سەرنج بدەین دەبینرێ (کوردی) لە هەمان باری تیا گوتنەکەی (أنا الحق)ی (مەنصوور)دا بووە و هەموو گەردیلکەکانی لەشی خۆی بەپەڕتەوی (حەق) پرشنگدار دیتوون و لە ڕووی صۆفیگەرییەوە بۆی هەبووە کە (کوردی)یش بانگە گرنگەکەی (مەنصوور) هەڵبدات و بکەوێتە ڕاگەیاندنی وشەگەلی (شطحیات)ی صۆفییانەوە و بەڵام بەبێ بانگی (انا الحق) و لە بن پاڵی ئەو بانگەدا خۆی هێشتووەتەوە دوور نییە ئەمەیش لەوەوە بووبێ کە بانگ هەڵدانەکەی بە لاساییکردنەوە دابنرێت و لە هەمان کاتیشدا لە زۆر هەڵبەستیدا (کوردی) بەم یا بەو شێوە لەم بابەتە و لە

(مەنصوور) دواوە کە زۆر شیفتەی مەنصوور بووە.

**جوانکاری:**

لێرەشدا کوردی لە ڕووی جوانکارییەوە و لە بەکارهێنانی وشەی (پێ)یەوە جارێکی تریش یاری بەم وشەیە کردووە و هەرجارێ بەجۆرە واتا و مەبەستێک ڕای گەیاندووە کە لە پەسندکارییەکانی وێژەی کۆنە.

ئەم تاکە هەڵبەستە:

ئەم تاکە لەم حەوت بەندەدا (١٤٤)یەمینە و دەبێتە (٢٠)یەمین تاکی ئەم بەندی شەشەمە.

ژمارەی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا بەم شێوەیەیە:

ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (با/١، ج، جم، حم، سجا، صا، ط، ف، ق/٣، مک، نم/١)دا نییە و لە (شح، گل/٨)دا (٨٧)یەمین تاک و لە (ص، گل/٥)دا (٨١)یەمین تاک و لە (عن)دا (٨٦)یەمین و لە (گل/٣)دا (٨٤)یەمین و لە (گل٦)دا (٨٤)یەمین و، لە (مس، نع)دا (٩٢)یەمین و لە (مع)دا (٧٤)یەمین و لە (ن)دا (٩٤)یەمین تاک و لە (ھ)دا (٩٥)یەمین و لە (ما/١)دا (٨٣)یەمین تاکە.

بەبۆچوونی من دەبێ بەر لەم تاکە هەڵبەستە تاکە هەڵبەستێکی دیکە و یا زۆرتر هەبێ، دەست من نەکەوتوون، چونکە ئەو پری و یەک بەیەکەوە نووساوی و بێ پچڕاندنەوەیی و یەک بابەتەیی لە هەر پارچە هەڵبەستێکی (کوردیدا) ئەم بۆچوونەی داومەتێ، هەر ئەم تاکە هەڵبەستەش لە هەموو سەرچاوەکانیدا چوونیەکە و جیاوازی لە ناوەڕۆکی سەرچاوەکانیدا نییە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا هاتووەتە هەڵچوون و هەموو گەردیلکەکانی لەش و گیانی خۆی پڕ لە جۆش و خرۆشی خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەر و دەقە ئاینییەکان دیتووە کە لە ئاکامی زۆر زیکر کردنە پەیتا پەیتاکانیەوە ئەو پڕ جۆشییە سەری هەڵداوە.

١٤٥- خوانم: دەخوێنم، (چارڕەدەم) بەڵام مەبەستی (کوردی) لە خوێندنەوە نەبووە بەشکو نیازی لە (چڕین)، تێ چریکاندنی (گۆرانی) و (سرودی ئاینی) و (مەقام) بووە بەم حەوت بەندەی خۆیەوە کە نەک یەک چیرۆک (قصە) بەشکو لە هەریەکەیاندا چەندین چیرۆک و داستانی تێدا ڕاگەیاندوون کە ئەم سەرپاکی هەمووانی بە:

این قصە: ئەم قصەیە ڕاگەیاندووە.

قصە: چیرۆک کە زۆرترەکەی مەبەستی لەم دوو تاکە هەڵبەستە دووبارەکردنەوەیەی خۆی بووە کە لە کۆتایی ئەم تاکەوە، واتە لە کۆتاییی ئەم بەندی شەشەمەوە دووبارە دەکرێنەوە و، (کوردی) فەرموویەتی ئەم (قصە) واتە (گوتنەوەیە) بەئاوازەوە دەچڕم. (کوردی) زۆر جار چڕینی داوەتە پاڵ خۆی لە گەلێ لە هەڵبەستەکانیدا و لە گۆرانی و مۆسیقا دواوە تیایاندا و، وردترین و زۆرترین زاراوەکانی گۆرانی و مۆسیقای لە هەڵبەستەکانی ناو ئەم پەڕاوییەدا ڕاگەیاندووە کە ئەگەر خۆی کەسێکی دەنگخۆش و پسپۆڕی گۆرانی و مۆسیقا نەبووایە ئەوەندە لێیان نەئەدوا.

(کوردی) وای ڕاگەیاندووە ئەم (قصە)یە لە

برسـر بازار: لە چەقی سـەری بازاردا دەخوێنێ و بۆیە ئەو شـوێنەیشی هەڵبژاردووە، بۆ تیا چڕینی (خوێندنی) ئەم (قصە)یە کە ئەو شوێنە لەهەر شارێکدا قەڵەباڵغترین شوێنە و مەبەستی لەو ناو قەڵەباڵغییەش بیستنی ئەو زۆرترین خەڵکی قەڵەباڵغییە بووە لە تێچڕینی ئەم دوو تاکە هەڵبەستە (دووپاتکردنەوەیە) بەساز و ئاوازی تایبەتی و گونجاوەوە.

لە کۆتایی ئەم نیو باڵی یەکەمەی سەرەوەدا (کوردی) کۆتایی بەلێدوانی چریکاندنەکەی ئەم جووتە تاکە (دووپاتە)یەی بەدەنگی خۆی هێناوە لەسەری بازاڕدا و لە نیو باڵی دووەمی هەر ئەم تاکە هەڵبەستەیدا ئەو چڕینەی خۆی بەدەم مۆسیقە لێدانەوە ڕاگەیاندووە کە فەرموویەتی:

فاش گویم: بەئاشکرا دەیڵێم،

به نغمەء: بەدەم سازی تایبەتی و گونجاو لە ئاوازی چریکاندنی گۆرانییەکەدا، کە ئەویش بەدەم نەغمەی

نی: لە ڕووی زمانی و فەرهەنگییەوە بەواتە (قامیش)

ئەم تاکە هەڵبەستە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لەم حەوت بەندەدا (١٤٥)یەمین و لەم بەندی شەشەمیشدا تاکی (٢١)یەمینە. شوێنی ژمارەی ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانیدا ئاوەهایە:

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (جم، صا)دا نییە و لە (ف)دا (٥٤)یەمین و لە (ق/٣)دا (٥٧)یەمین و لە (حم، ط)دا (٦٠)یەمین و لە (مک)دا (٦٢)یەمین و لە (ج، سـجـا، نم/١)دا (٦٣)یەمین و لە (با/١)دا (٦٤)یەمین و لە (مع)دا (٧٥)یەمین و لە (شح، گل/٨)دا (٧٩)یەمین و لە (ص، گل/٥)دا (٨٢)یەمین و لە (گل/٣)دا (٨٣)یەمین و لە (گل/٦)دا (٨٥)یەمین و لە (عن)دا (٨٧)یەمین و لە (مس، نع)دا (٩٣)یەمین و لە (ن)دا (٩٥)یەمین و لە (ھ)دا (٩٦)یەمین و لە (ما/١)دا (٨٤)یەمین تاکە. هەروەها ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە هەموو سەرچاوەکانیدا دواترین تاکی ئەم بەندی شەشەمەیە.

**جیاوازییەکان:**

ئەم تاکە لە (١٧) سەرچاوەدا بەسەرچاوەی (ط)یشەوە لە هەموویاندا سەرەتایەکەی بەوشەی (خوانم): دەخوێنم کە مەبەست لە چڕینی ئەم دوو تاکە دووبارەکردنەوەی دواییە.

**واتای گشتی:**

(کوردی) لەم دوا تاکی بەندی شەشەمەدا فەرموویەتی:

دەمەوێ ئەم (چیرۆک) یا (داستان)ەی دوایی کە دوو تاکە هەڵبەستە دووبارەکردنەوەکەن لە چەقی بازاڕدا بەمەقامەوە پێ بەپێی سازی (دەف) و (نەی) بچڕم، کە ئەو دوو تاکەش بەبێ سێ و دوو لەگەڵ پێغەمبەری ئیسلامیەتی کە ئەمانەن:

کـای دمت نغـمـهء سـرافـیلی

مـورد واردات جـبـریلی

أنتَ شـــمسَ الُهـــدى ونورَ الحَق

أظهِـــرِ الحقَّ يا ظُهـــورَ الحق

هـەر ئەوەنـدەی بەدوادا دەچـم کـــە ئەوی پـەیوەنـدیی بـە(جـــبـــرایـل)ەوە هـەبووە نـە(عـــەلـی) و نە(بەهائوڵڵا) نەبوون و هـەر خـودی پێغـەمـبـەری ئیسـلام بووە کـە هـەمـوو ئایـەتەکانـی قـورئانـی پیرۆزی لە جیبرەئیلەوە پێ گەیەنراون (عەلی) و (بەهائوڵڵا) پەیوەندییان بەجیبرائیلەوە نەبووە. هـەروەها ئەگـەر پێغـەمـبـەری ئیسـلام نەبووایە (عـەلی) وەک بەمـلیـۆنەها کـەسـانـی تربێ ئەوسـا بەبێ سـەروشوێن ڕۆیشتبوو، بەبێ سەروشوێن دەمایەوە.

ئەم دوو تاکـە دووپاتەیەم لـە (بەندی یەکـەم)ی ئەم حـەوت بەندەدا بـەدرێژی لێک داوەتـەوە بۆیە لێرەدا لێکیان نادەمەوە.